

# هەزار و یەک شەو



سولەیمان ئیبڕاهیمزادە

لە فارسییەوە کردوویە بە کوردی

بەرگی یەکەم

# هەزار و یەک شەو

وەرگێڕانی: سولەیمان ئیبراهیمزادە



بەرگی یەکەم

منتدى إقرأ الثقافي

ADIBAN

## ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان نزیک ناوەندیی ڕۆژهەڵاتی کوران.
**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369
**Email:** bookadiban@gmail.com
**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

ناسنامەی کتێب

ناونیشان: هەزار و یەک شەو.

کۆکردنەوەی: عەبدول لەتیف تەسووجی.

بابەت: گێڕانەوە.

ژانر: کۆمەڵە چیرۆکی ئەفسانەیی فارسی، عەرەبی و هیندی.

وەرگێڕانی: سولەیمان ئیبراهیمزادە.

پێداچوونەوە: جووتیار قارەمان.

بڵاوکەرەوە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

دیزاینی دەق و بەرگ: ئارام مەلا محەمەد

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠ میلادی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٥٦٩) ساڵی (٢٠٢٠) پێ دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە،

# پێشەکی

**"هەزار و یەک شەو"**

چیرۆکەکانی "هەزار و یەک شــەو" لەســەر هێنانەبەرباســی پرســیارگەلێکی ڕیشــەیی تایبەت بە ژیان و ئەزموونەکانی مرۆڤ و هەندێک بابەتی گشــتگیری جیهانیی وەک: ئەڤین و خۆشــەویستی، ڕق و قین، مردن و ژیان، چارەنووس و هەوڵ بۆ مانەوە، چاکە و خراپە و ... ڕۆنراون. ئەو شــتە دژبەیەکانەش لە قالبی کەســایەتییە جیاجیاکانی ناو چیرۆکەکاندا پیشــان دەدرێن و هەســتی هەڵســەنگاندن و ســەنگوســووککردنی بایخەکان لە ناخی بەردەنگەکاندا دەورووژێنێ.

ژۆزێف کەمپبێل[1] دەڵێ: " 'هەزار و یەک شــەو' ملهوڕێک دەکاتە مرۆڤ." لە "هەزار و یەک شــەو"دا چۆنییەتیی داڕشــتن و گیانوەبەرنانی چیرۆکەکان پێوەندیی ڕاســتەوخۆی بە ژیان و مانی گێڕەرەوەی چیرۆکەکەوە و کەســانی دوای خۆیەوە هەیە. تا ڕادەیەک ئەگەر 'شــەهرزاد' چیرۆکەکەی خۆش و ســەرنجڕاکێش نەبایە، ئەوە بۆ خۆیشــی و کچانی دوای ئەویش دەکوژران. شــێوازی داڕشــتنەکەشــی وەک هەقایەتی "چل تووتی"ــــیە. کەســێک چیرۆکێک دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕووداوێکی مەترسیدار وە دوا بخا.

چیرۆکەکە لەوێوە دەســـت پێ دەکا کە "شــــازەمان و شـــەهریار" دەزانن خێزانیان خەیانەتیان لێ کردوون و لەگەڵ کۆیلەیەکی ڕەش دەســـتیان تێکەڵ کردووە. لەو ڕۆژە بە دواوە شــەهریارشــا باوەڕی بە ژنان نامێنێ و پێی وا دەبێ کە هەموو ژنێک وەک ژنەکەی خۆی خەیانەتی لێ دەکا—بە ســەر پاشــادا دەچێ لەگەڵ قولەڕەشــێک دەسـت تێکەڵ دەکا. هەر بۆیە پاشــا هەڵوێســت دەگرێ هەر شــەوەی ژنێک بخوازێ و تا بەیانی لەگەڵی بێ و بەیانییش بیکوژێ. ئەو کارە دوای ماوەیەک دەبێتە خووخدەیەکی خۆش و چێژبەخش و خووی پێ دەگرێ و تا ئاســتی حەزی ســێکســی کەیفی پێ دەکا. ئەو ڕەوتە ســێ ســاڵ دەخایەنێ تا ڕۆژێک دێ، سەرە دەگاتە "شەهرزاد"ی کچی وەزیر.

شەهرزاد کچێکی زانا و زیرەک و دواڕۆژبینە. وێژەڤانە و لە زانستە ئەدەبییەکانی پێش خۆیدا شارەزایە. کچێکی لەبەردڵان و خوێنشیرین و جوانکیلەیە. تا بڵێی وریا و چاوکراوە، باوەڕی بە خۆیەتی و هێندەی چیرۆک و بەســــەرهاتی پێشــــینیان لە بەرە کە لێی ڕوونە دەتوانێ بە لەبزی شیرین و چیرۆکی خۆشخۆش وای سەرقاڵ کا باسی کوشتنی لە بیر بەرێتەوە یان بە لای کەمەوە مردنەکەی وە دوا بخا تا بەشــکوو چارەنووس ڕێگایەکی

---

[1]. ئەفسانەناسێکی ئەمریکاییە و ساڵی ١٩٠٤ز. لە دایک بووە.

دیکەی بخاتە بەر، هەرچەندە دەزانێ کە پاشـــا چەندە لە ژنان بەقینە و چۆن بێبەزەییانە هەر شەوەی ژنێک دەکوژێ. تا ڕادەیەک خەڵک لە ترسان ژن و کەنیز و کچەکانیان دەبەن و هەڵدێن و دەڕۆن بۆ وڵاتێکی دیکە. لە ســەر ئەو حاڵە بە باوکی دەڵێ: "بابە خەمت نەبێ، من دەچمە پەردەیەوە. یان دەکوژرێم یان کۆتایی بەو کارەســاتە دێنم کە بەســەر ژنان و کچانی وڵاتەکەمدا هاتووە."

## کەشی چیرۆکەکان

ژینگە و کەش لە "هەزار و یەک شـــەو"دا تەواو خەیاڵییە و هەموو شــتێک دۆخێکی خەونی هەیە؛ هەرچی تۆ بیرت بۆی بچێ ئەگەری ڕوودانی هەیە و دەکرێ و جێبەجێ دەبێ. پڕە لە ستران و ئاواز و دەنگی مەل و پەلەوەر. ژینگەکە تەواو سرووشتییە. پڕە لە ئاو و دەریا و بەژ و کەژ و کێو. مرۆڤ وەڕەز نابێت و حەز دەکا لەو دۆخەدا بمێنێتەوە و بزانێ ئاکامی ڕووداوەکان بە کوێ دەگەن. جنۆکە و پەری و مرۆڤ پەیکەرەی ژیان پێک دێنن و پێوەندی هەمە چەشــنەیان هەیە. هاوکاری یەکتر دەکەن و شــەڕ دەکەن و ئاشــت دەبنەوە. عاشقی یەکتر دەبن و زەماوەند دەکەن و منداڵیان لێ دەکەوێتەوە. هیچ بەربەندێک لە نێوان جنۆکە و پەری و مرۆڤدا هەست پێ ناکەی و هونەری ئەو داڕشتنانە لەوەدایە کە بەردەنگ بە جۆرێک تێکەڵاوی ژیان و ڕووداوەکانی دەبێ و ئەو پێوەندییانە لە ناخیدا قەبووڵ دەکا، هەر لە بیریشـــی نابێ پرســـیار بکا و بڵێ: "چۆن شـــتی وا دەبێ؟" هەوێنی ســەرەکیی چیرۆکەکان خۆشــەویستی و دڵداری و چاوەڕوانین کە سێ پاڵنەری بەهێزن بۆ ڕاگرتنی خوێنەر.

## زمانی گێڕانەوە

کێشـــی لە چـاوەڕوانیـدا هێشـــتنەوە ئەوەنـدە بەهێزە خوێنەر بەردەوام تینووی خوێندنەوەی دەبێ. شتێکی دیکە کە زۆر زۆر گرنگە، ئەوەیە شـەهرزاد لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا بەردەوام خەریکی ئافراندنی کەسایەتی و ڕووداو و کارەساتی سەرنجڕاکێش بووە. ئەویش بە زمانێکی شـیرینی وا کە بتوانێ سـۆز و خۆشـەویسـتی و هۆگری بە مرۆڤ لە مرۆکوژێکدا بجووڵێنێ. هەمیشــە ناو مێشــکی شـــەهرزاد تژییە لە بگرەوبەردەی ئەوین و خۆشەویستی و ڕق و قین و مان و نەمان. شەهرزاد ئەو هەموو چیرۆکە دەهۆنێتەوە، یان دەگێڕێتەوە بێ ئەوەی یەک دانەیان ســـادە و بێنێوەڕۆک بێ. هەر چیرۆکەی پەیامێکی لەپشت بووە بۆ ئەوەی سێبەری ئەو هەورە ڕەشە لە سەر وڵات لا ببا. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ یەک چرکەش لایەنی ســەرنجڕاکێشــی و چێژی گێڕانەوەکانی لە بیر ناچێتەوە. کارێک دەکا

چاوەڕوانی بۆ ئاگاداربوون لە ئاکامی چیرۆک ببێتە خورەی گیانی بەردەنگەکەی تا شەوێکی دیکە. مەبەست لەو درێژکردنەوەیەش ئەوەیە کە لە ڕێی ئەو چیرۆکانەوە هەر وەک گوتمان سۆزی مرۆڤانەی وە خەبەر بێنێ. بۆ نموونە لە چیرۆکی بازرگان و دێودا بە هێز و کاریگەریی چیرۆک دێوە وا لێ دەکا دەروونی لە ڕق و قین پاک بێتەوە و ئەوەندە پێ بکەنێ لەسەر گازی پشت بکەوێ. لە دواییدا لە کوشتنی بازرگان پاشگەزی دەکاتەوە، ناڕاستەوخۆ بە پاشا دەڵێ: "یانی تۆ لە دێو و درنجیش دڵڕەقتر و بێبەزەتری؟"

### ژن لە هەزار و یەک شەودا

شەهریاری زوحاک هەر ڕۆژەی ژنێک دەکاتە قوربانیی حەز و ڕق و خولیاکانی و شەهرزاد دەیەوێ بە کەڵکوەرگرتن لە هێزی وشە و وتە و ئافرێنەریی خۆی بوونی ژنان لە مەترسیی تێداچوون بپارێزێ، چونکە پیاوێک لە لووتکەی دەسەڵاتدا بە ڕقدا کەوتووە و هەڵوێستی گرتووە ژن لە گۆڕەپانی بوون بسڕێتەوە. شەهرزاد لێرەدا بە زمانی خۆی دەیهەوێ خۆی بخزێنێتە هەناویەوە و بە هێزی ژنانە و جادوو و وردمی گێڕانەوەی خۆی کار لەسەر هەڵوێستی بکا و تێکی بدا و لە بەرژەوەندیی خۆیدا سەرلەنوێ دایڕێژێتەوە. لەو ململانێیەدا ژن لەگەڵ هێزی دژەژن و ناڕاستەوخۆ هێزی دژەژیان شەڕ دەکا. شەهریارشا و شازەمانشا کە ئەو نسکۆیەیان بەسەر دێ و سەری خۆیان هەڵدەگرن، دەڕۆن و دەست لە هەموو شتێک دەشۆن. لە ڕێگەدا تووشی دێوەکە دەبن کە ژنێکی لە یەغدانێک خستووە و لەنێو دەریا دێتە دەرێ ... دوایی کە ژنە سەرەڕای ئەوەی دیلی دەستی دێوەکەیە کەچی بە فێڵ کارێک دەکا لەگەڵ ئەوان نزیکی بکا. تا ئێستا بە قەولی خۆی لە داخی دێوە لەگەڵ ٥٧٠ کەسی دیکەش دەستی تێکەڵ کردووە. شازادەکان بۆیان دەردەکەوێ هەر ئەوان نین بەڵای ئاوایان بەسەر هاتووە و دێوە زۆر لەوان لێقەوماوترە. لە باری دەروونییەوە تۆزێک ئەهوەن دەبنەوە و دەگەڕێنەوە وڵاتەکەی خۆیان. ئیدی دوای ئەوە شەهریارشا ئەو بەڵایە بەسەر ژنان دێنێ کە لە چیرۆکەکەدا دەیخوێننەوە. بەو پێیە کاری شەهرزاد هەر ئەوە نابێ کارێک بکا بۆ خۆی نەکوژرێ. دەبێ کارێک بکا پاشا لایەنەکانی دیکەی ژن ببینێ و ڕوانگەی بۆ ژن و ژیان بگۆڕدرێ. هەر بۆیە بە تەواوی پەردە لەسەر لایەنەکانی بوونی ژن هەڵدەداتەوە و بە چاک و خراپ و خێر و شەڕیەوە لە چیرۆکەکاندا ژیانیان وێنا دەکا. ئەو زانیارییانەی کە لەو چیرۆکانەدا باس کراون بواری ئەوە دەدەن لێکۆڵینەوەی تێر و تەسەل لەسەر بارودۆخی ژن لەو سەردەمەدا بکرێ.

## تۆپەڵە بەفر

ئۆقلیدی[1] بەو شێوەیە ئاماژە بە پێشینەی کتێبی "هەزار و یەک شەو" دەکا و دەڵێ: "لە زەمانی زوودا پەرتووکێک بە ناوی 'هەزار و یەک شەو' نەبووە. چیرۆکەکانی سەرەتای ئەو کتێبە وەک تۆپەڵە بەفرێک لە کێوێک خلۆری کەیەوە، چۆن هەر دێتە خوارێ و بەفری دیکە لە خۆیەوە دەپێچێ و گەورە دەبێ، ئەو کتێبەش لەپێشدا چیرۆکێکی چکۆلە بووە. لە هێندەوە سەری هەڵداوە و هەر هاتووە گەورە و گەورەتر و پتەوتر بووە. بووە بە سەرمایە و کەلەپوورێکی مرۆڤایەتی."

کاتی خۆی کۆمەڵێک چیرۆک لە هیندەوە دێن بۆ ئێرانی ئەو کات و لە زمانی سانسکریتەوە دەکرێنە پەهلەوی. ئەو کات چیرۆککگێڕانەوە لەنێو ئێرانییەکاندا[2] باو بووە و شەوانە لە دیوانی پاشا و میران، تەنانەت لە ماڵان و شوێنە گشتییەکاندا لەدەوری یەک کۆ دەبوونەوە. یەکێک وەک چیرۆکبێژ چیرۆک و بەسەرهاتی خەوەڕۆژکی دەگێڕاوە و هاوکات لەگەڵ چیرۆککگێڕانەوەکەیدا لاسایی هێرش و پەلامار و هەڵسوکەوتی پاڵەوانی چیرۆکەکەی دەکردەوە و بەتام و چێژتری دەکرد. واتە چیرۆک و سەربهورده بەلایانەوە گرنگ و بایەخدار بوو. ئێرانییەکان ئەو چیرۆکانە تێهەڵکێشی قەوارەی چیرۆکەکانی خۆیانی دەکەن و کتێبی بە ناوی "هەزار ئەفسان" لێ ساغ دەکەنەوە.

ئیبنی ئیسحاقی نەدیم[3] کە بۆ خۆی کتێبی "هەزار ئەفسان"ی بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕاوە، لە کتێبێکیدا بە ناوی ئەلفەهرەست (الفهرست) دەڵێ: "ئێرانییەکان یەکەم کەس بوون کە چیرۆک و بەسەرهاتەکانیان وەک کتێب نووسی و کۆیان کردنەوە و لە کتێبخانەکانیاندا ڕایانگرتن."

## عەرەب و هەزار و یەک شەو

لەپێشدا باسمان لەوە کرد پێش ئیسلام و لە سەروبەندی سەرهەڵدانی ئیسلام لە نیمچەدوورگەی عەرەبستاندا چیرۆک و خەوەڕۆژک لە ئێرانی سەردەمی ساسانییەکان گرنگییەکی تایبەتی هەبوو. ئیبنی ئیسحاقی نەدیم لەو بارەوە باس لەوە دەکا عەرەبەکان کە بۆ بازرگانی هاتوچۆی ئێرانیان دەکرد، دەچوون کتێبەکانیان دەکڕی و دەیانبردنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و لەوێ بۆ زمانی عەرەبییان وەردەگێڕان و بۆ خەڵکەکەی خۆیان دەگێڕانەوە.

---

[1]. وەرگێڕی ئێرانیی هەزار و یەک شەو

[2]. ئێرانییەکان واتە ئەو نەتەوانەی لە جوگرافیای ئێرانی ئەو کاتدا بوون، واتە کورد و فارس و ئازەری و بەلووچ و گورج و ...

[3]. زانا و بلیمەتی سەدەی ٤ی کۆچی/١٠ی زایینی دانیشتووی بەغدا.

لێرەدا تۆپەڵە بەفرەکەی کە لە هیندەوە هات و لە ئێران چەند بەرابەر بوو، خلۆر بووەوە بۆ ناو وڵاتانی عەرەبی. لە وڵاتانی عەرەبییش شــتێکیان بە ناوی کۆڕی شــەوانە هەبوو کە لەوێدا چیرۆک و هەقایەتیان دەخوێندەوە و گرنگییەکی زۆریشــیان پێ دەدا. بە تایبەت ئەو کات کە لە مەککە چیرۆک و شــێعر و ... هتد. برەوی باشــی هەبوو. خەڵک پێشــوازییان لێ دەکرد و لە بازاڕەکاندا دەخوێندرانەوە. وەک دەیڤید پینالت، لێکۆڵەری هەزار و یەک شــەو ئاماژەی پێ دەکا، دەبێ لەو ســەروبەندەدا بووبێ کە ئایەتی ٦ی ســوورەتی لوقمان بۆ حەزرەتی موحەممەد هاتبێتە خوارێ. کە تێیدا هاتووە: "هێندێک کەس هەن دەچن چیرۆک و قســەی پڕوپووچ و خەوەڕۆژک دەکڕن، هەتا گەوجانە خەڵکی پێ بە لاڕێدا ببەن و گاڵتە بە هێما و نیشانەکانی خودا بکەن. ئەو جۆرە کەسانە زۆر بە توندی سزا دەدرێن.[١]"

وەک زمانزان و وێژەڤانان لێکی دەدەنەوە " لَهوالحدث " کە لەو ئایەتەیەدا هاتووە بە واتای وتوویژی شــەوانە و ئەو چیرۆک و خەوەڕۆژکانەیە کە فریان بە ڕاســتییەوە نییە، چیرۆکی جنۆکە و پەری و قســەی پێکەنینی و ئەو هەڵەوەڕییانەن کە دەیکەن بۆ ســەرقاڵکردن و خافڵاندنی خەڵک. کۆڕی بەزم و ئاواز و گۆرانی و شــتی واش دەگرێتەوە. دەبێ کاریگەریی گەرماوگەرمی ئەو ئایەتە بێ کە باســێک لەو کۆڕە ئەدەبی و بەزم و شادییانە نامێنێ یان بە لای کەم ئەوەندە نابێ کە بەرباس بێ تا وا دەبێ دوای چەند سەدە لە ســەردەمی دەســەڵاتدارێتیی بنەماڵەی عەباسییەکاندا، بە تایبەت خەلیفە هاروونە ڕەشید کە لەگەڵ ئێرانییەکان تێکەڵییەکی زۆری بوو، کرانەوەیەکی زۆری کۆمەڵایەتی و هزری و فەرهەنگی دێتە ئاراوە. دیســان چیرۆکخوێندنەوە و کۆڕبەســتی شیعر و ئاواز و مۆسیقا برەوی پەیدا کردەوە تا ڕادەیەک کە هەرچی چیرۆکی خۆش و سەرنجڕاکێشی نەتەوەکانی دیکەش بوو لە بارەگای خەلیفەدا دەخوێنرانەوە و کۆ دەکرانەوە. قســەی تێدا نییە لەو ســەردەمەدا ئەو چیرۆکە ئێرانی و هیندی و میســری و بە گشــتی بیانییانە بە تەواوی عەرەبێنران و ئیسلامێنران. بە جۆرێک لە هەندێک شوێندا وەک چیرۆکی "کەنیزی بێهاوتا" کە لە نیوەی شــەوی ٤٣٣ دەســت پێ دەکا و تا کۆتایی شــەوی ٤٥٩ درێژەی هەیە، زیاتر وەک کتێبێکی "فیقهی ئیســلامی" دەچێ تا کتێبێکی ئەدەبی. لە کۆتایی ئەو چیرۆکەدا ئاوا

---

١. قَالَ تَعَالَى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٦﴾ لقمان: ٦

واتا: کۆمەڵێک لەئادەمیزاد هەن لەجیاتی شــتی بەســوود شــتی زیانبەخش پەیدا دەکا، لەجیاتی گوێگرتن‌و پەیڕەویکردن قورئانی پیرۆزو شــیفابەخش‌و ڕەحمەت بۆ ئادەمیزاد، دەچن فێری ئەفســانەو چیرۆکە کۆن‌و قســەی تورەهات دەبێ‌و کۆڕو ســیمینار دەگرێ‌و خەڵکی پێ گومڕا دەکاو لەقورئانیان بێ ئاگا دەکا. هەڵیان دەنێ بۆ ئەوەی واز لەگوێگرتن بۆ قورئان بهێنن، ئەوانە ســزای ریســواکەریان بۆ ئامادەکراوە لەتۆڵەی بێ ئەدەبی‌و گاڵتەکردنیان بەئایینی خودا عەزابدانەکەیان بۆ ریسوا کردنە نەک بۆ پاککردنەوەیان لەگوناه.

نووســـراوە: "شـــەهرزاد کە چیرۆکەکەی تەواو کرد، گوتی: 'پاشـــا، جا چاو لە زانایی و بلیمەتیی ئەو کەنیزە بکە و دلاوایی و گەورەیی خەلیفە کە چەندی ماڵ دا بە خاوەنەکەی و کردیشـی بە هاونشـینی خۆی. گەورەیی ئاوا لە عەبباسـییەکان نەبێ لە کێ دەوەشـێتەوە؟ دلاواییان بیانخاتە بەر ڕەحمەت و لێبووردەییی خودا.' " بەو جۆرە هێندێک لە چیرۆکەکان کران بە ئامراز بۆ بانگەشـە و زەقکردنەوەی کەسـایەتییە بەرچاو و بە ناوبانگەکانی خۆیان و خزاندیانە ناو ئەو کتێبەوە. ئەو چیرۆکە هیندی و ئێرانی و میســـری و عەرەبییانە بە جۆرێک لێک دراون، وەک چێشـتی مجێوری لێ هاتووە. لەو سـەردەمەدا کتێبی "الف لیلة و لیلة" تا ڕادەیەک تەواو دەبێ. هەرچەند هێندێک لە خاوەنڕایان لەســـەر ئەو باوەڕەن کە ئانتوان گالان کاتێک "هەزار و یەک شـــەو"ی وەرگێڕا، چەند چیرۆکێکی پێوە زیاد کرد و دوای ئەوە تۆپەڵە بەفرەکە ڕاوەستا.

### وەرگێڕان و دەستاودەستکردن

چیرۆکی هەزار و یەک شـــەو بە هۆی نزیکی لە دڵ و ژیان و هەســـت و نەســـت و دابونەریتی مرۆڤەکانەوە دزەی کردووەتەوە ناو وڵات و نەتەوە جیاجیاکان و لەنێویاندا تواوەتەوە و خۆمـاڵی بووە. ئەو ئـاڵوگۆڕ و دەســـتـاودەســـتکردنە لەنێو وڵاتە ئەورووپاییەکانیشـــدا هاتووەتە ئاراوە. لێرەدا پێویســـتە بۆ ئەوەی زیاتر گرنگیی ئەم کتێبەمان بۆ دەرکەوێ، ئاوڕێک لەو دەستاودەستکردنە بدەینەوە کە بەسـەر هەزار و یەک شەودا هاتووە.

ئانتوان گالان[1] دەوروبەری ٣٠٠ ساڵێک لەمەو پێش لە ساڵی ١٧٠٤ز. تا ساڵی ز.١٧١٥ کاری وەرگێڕانی "الف لیلة و لیلة،" واتە هەزار و یەک شـــەوی تەواو کرد و بۆ زمانی فەڕەنســـایی وەرگێڕا. گالان لەو وەرگێڕانەدا زیاتر گرنگیی بەوە دا دەقە فەڕەنســـاییەکە شتێکی چێژبەخش و دڵگیر بێ و وردەکاری و ئەمانەتداریی کردە قوربانیی چێژی زمانی و شێوازی گێڕانەوەی زمانە فەڕەنساییەکەی. جۆزێف ڤۆن هامێری[2] ساڵی ١٨٠٦ز. دیسان لە چەند سـەرچاوەیەکی دیکەوە هەزار و یەک شـەوی بۆ زمانی فەڕەنسـایی وەرگێڕا. هەر بەدوای ئەوانەدا لە ســاڵی ١٨١٨ز.دا لە کەلکەتای هیند، ســاڵی ١٨٣٥ز. لە بولاقی میســر، ساڵی ١٨٤٣ز. لەلایەن ماکسیمیلیان هاوبیشت لە هەشت بەرگدا لە برێسلاڤی پۆڵەندا چاپ و بلاو بووەوە.

---

[1]. ڕۆژهەلاتناسی فەڕەنسایی (١٦٤٦. ١٧١٥).

[2]. ڕۆژهەلاتناسی نەمسایی (١٧٧٤. ١٨٥٦).

ئێدوارد ویلیام لێین١ که ئەو کات خەریکی کاری نووسین له سەر بەرد و سوالّەت و ... هتد. بوو، بۆ پەیداکردنی بژیو ڕوو دەکاته میسر که لەوێ کاری چاپ و نووسین و ... هتد. برەوی هەبوو. که له میسر دەگەڕێتەوە بۆ بەریتانیا، مەمنا پێی وا دەبێ چیرۆکەکانی هەزار و یەک شـەو هێما و پێناسـەی ژیانی مرۆڤی ڕۆژهەڵاتین، دێنێ وەک پێناسـەی کۆمەڵگەی عەرەب له سەدەکانی ناوەڕاستدا لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکا و به شێوەیەکی بەربڵاو بڵاوی دەکاتەوە. چونکه ئانتوان گالان هەر وەک لەپێشدا ئاماژەمان پێ دا، زۆری گرنگی دابوو به لایەنی چۆنییەتیی گێڕانەوە و چێژی زمـانیی گێڕانەوەکەی و هەنـدێک بـابەتی کردبووە قوربانی ئەو لایەنە، ئێدوارد ویلیام لێین لەسـەر ئەو بابەته لۆمەی گالان دەکا و دەڵێ دەقەکەی به لاڕێدا بردووە. ئەوە له کاتێکدایه دەقەکەی گالانیش له لای خەڵک پەسـندتر بوو.

هەر بەدوای ئەوانەدا دەبێ که بەهائوددەوله بەهمەن میرزا، یەکێک له شازادەکانی قاجار له ئێران، دوو کەس له زانا و هۆزانان، عەبدوڵڵەتیف تەسـووجی تەورێزی و سـرووش ئیسفەهانیی ڕاسپارد "الف لیلة و لیلة" له عەرەبییەوە بکەن به فارسی. وا بوو عەبدوڵڵەتیف تەسـووجی به یارمەتیی ژنەکەی چیرۆکەکانی له عەرەبییەوە کردنه فارسـی و میرزا محەممەدعەلی سـرووش ئیسـفەهانییش که شـاعیرێکی گەورەی ئەو کاتی ئێران بوو، شیعرەکانی بۆ فارسی وەرگێڕان یان شیعری شاعیرانی دیکەی فارسی له جێی ئەوان دانا. وەک تەسـووجی بۆخ ۆی ئاماژەی پێ دەکا له سـاڵی ١٢٦١ی کۆچی مانگی، واته سـاڵی ١٨٤٥ز.، تەواوی دەکەن.

هەر دوابەدوای تەواوبوونی وەرگێڕانه فارسـییەکەی له ئێران، له ئەسـتەنبووڵیش دەسـتیان کرد به وەرگێڕانی "الف لیلة و لیلة" بۆ زمانی تورکی و ده سـاڵ دواتر له سـێ بەرگدا چاپ بوو. بەو جۆره یەک بەدوای یەک نەتەوه جیاجیاکان بۆ زمانی خۆیـانیان وەریانگێڕا.

بەڵام به داخەوە، هۆکارەکەی هەر شتێک بێ، ئێمەی کورد لەو نیعمەته بێبەش بووین و ئەگەر تاک و تەرا لێره و لەوێ کوردێکی عەرەبیزان یان فارسـی و تورکیزان به زمانی دیکه خوێندبێتیەوە، ئەوه هاتووه وەکوو هەقایەت به شـێوەیەکی ناتەواو و نیوەچڵ له کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بۆ خەڵکی دیکەی گێڕاوەتەوە.

ئەو ڕەوته هەتا ١١٠ سـاڵ دوای وەرگێڕانه فارسـی و تورکییەکه بەردەوام بوو. تا له ٦ی ئایاری ١٩٥٩ی زایینیدا له تاران یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردسـتان دەرچوو که له هەر ژمارەیەکی ئەو ڕۆژنامەیەدا لەلایەن دەستەی نووسـەرانیەوە بەشێکی "هەزار و یەک

---

١. ڕۆژهەلاتناسی ئینگلیسی (١٨٠١ـ ١٨٧٦).

شـــەو" وەردەگێڕدرا و بڵاو دەبووەوە. "کـاک ئەحمەدی موفتیزادە" بەرپرســـیارێتیی وەرگێڕان یان دانانی شـیعری شـاعیرانی کوردی لە جێی فارسـییەکەی لە ئەسـتۆ بوو. وا بوو لە ماوەی سـێ سـاڵدا ١٣١ شـەو لەو "هەزار و یەک شـەو"ەی لێ بڵاو بووەوە. دوای ئەوە بێدەنگەی لێ کرا. لە ســـاڵی ٢٠١٢ز.دا مامۆســـتا جەوهەر مەحموود داراغاش لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی و چاپ و بڵاو بووەتەوە— بە داخەوە من بە دەســـتم نەگەیشتووە.

ئیدی من بەش بە حاڵی خۆمان ئەوەندەی هەوڵم داوە، نەمدیوە و نەمبیستووە کوردێک هاتبێ و لێی کۆڵیبێتەوە و شیو و وەردی دابێ و کاری زانستیی لەسەر کردبێ تا بەشکوو شـوێنپەنجەی کورد، وەک نەتەوەیەک لە داڕشـتنی "هەزار و یەک شـەو"دا ببینێتەوە تا لەو ڕێگەیەوە بتوانین ئاوڕێک لە دابونەریت و هەڵســـوکەوت و باری ئابووری و کۆمەڵایەتیی خۆمان لەو ســـەردەمەدا بدەینەوە. چونکە زۆر بە داخەوە هەر لە مێژەوە هاوماڵبوونی ماد و پارســـەکان و قەتیســـبوون لەنێو شـــوورەی ئێرانیبووندا بووەتە هۆی ئەوەی وەک براچووکەیەکی بێدەســـەڵاتی لارەمل و ژێرچەپۆکە هەموو شـتێک بە ناوی فارس لە قەڵەم بدرێ. کە من بە تەنیا بە ســـووچی ئەوانی نازانم و لە کەمکاری و کەمترخەمیی خۆمانی دەزانم.

گوتمان ئەو چیرۆکانە لە دەورانی دەسەڵاتی عەباسییەکاندا بە جۆرێک لێک دراون وەک چێشـــتی مجێوری لێ هـاتووە. لێرەدا لێزان و پســـپۆری خۆی دەوێ کە بە دیتنەوەی ســـەرەداوەکـان گلۆڵەکـان لێـک هەڵاوێرێ، دیـاریی بکـا کـام چیرۆک و بە چ هۆیەک ســـەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ فلان نەتەوە. لێرەدایە گرنگیی وەرگێڕان و لێوردبوونەوە و تێرامان لەو کتێبە دیرۆکییە دەردەکەوێ بۆ ئەوەی ئاوڕێکی زانســـتییانە لە کەلەپوور و ژیانی پێشینییان بدرێتەوە و فاکتەرە ناسەکانی نەتەوەیی بناسرێنەوە. ئێستا ئەوە من بەش بە حاڵی خۆم هەوڵی تەواوم لەگەڵ داوە و بە یارمەتیی "ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان" ئەو کتێبەم لە فارسـی و نوسـخەی "عەبدوللەتیف تەسـووجی"ـــیەوە بۆ کوردی وەرگێڕاوە. هیوادارم توانیبێتم شـــتێکی شـــیاوی کتێبخانەی کوردیم پێشـــکەشـــی بارەگای ئەدەبی گەلەکەمان کردبێ.

لە کۆتاییدا پێویســـتە ئاماژەیەک بە شـــێوازی وەرگێڕان یان باشـــتر بڵێم داڕشـــتن و هۆنینەوەی شـــێعرەکـان بکەم. ئەویش ئەوەیە تـا ئەو ڕادەیەی بۆم کراوە ویســـتوومە شیعرێکی ڕێک، هاوسەنگ و هاوتەریبی دەقەکە ئامادە بکەم. لە شیعرەکاندا خۆم بە شیعرە فارسییەکەوە نەبەستووەتەوە و تەنیا پەیام و ناوەرۆکەکەیانم لە بەرچاو گرتووە بۆ ئەوەی لە دەقەکە دانەبڕێم. کەڵکم لە شیعری هیچ شاعیرێکی کورد وەرنەگرتووە و هەمووی بەپێی زەوق و توانی خۆم داماناوە. ئەویش لەبەر چەند هۆ: یەک، شـــیعرەکان نزیکەی چوارهەزار

بەیتن و دیتنەوەی ئەو هەموو شـــیعرە، ئەویش وا بێ لەگەڵ وتوویژەکەی پێش خۆیـدا بگونجێ کارێکی ئاســـتەمە و دەبێ کاری ئاوا بە پشـــتیوانیی دەســـەلات و لە ماوەیەکی زەمانیی دەـــــدوازدە ساڵیدا بکرێ—ئەویش ئەگەر بکرێ. لەگەڵ تەواوی ئەوانەشدا نکۆڵی لەوە نـاکەم لە کـارێکی ئـاوا قورس و گەورەدا لاری و هەڵە و پەڵەم دەبێ و، هیوادارم یارمەتیم بدەن و بۆ چاپی دوایی لاریم لەگەڵ ڕێک و هەڵەم لەگەڵ ڕاســـت و پەڵەم لەگەڵ پاک بکەنەوە و، بەرهەمەکە بە سەرمایەیەکی نەتەوەیی بزانن.

**سولەیمان ئیبراهیمزادە**

## پێشەکی عەبدوللەتیف تەسووجی

### بەسەرهاتی شەهریار و شازەمانی برای

دەگێڕنەوە پاشایەک لە پاشا دەسەڵاتدارەکانی بنەچەکەی ساسان، پاشای دوورگەکانی هێند و چین بوو. ئەو پاشـایە دوو کوڕی ئازا و زانای بە ناوەکانی شـەهریار و شـازەمان هەبوو. شەهریار کە براگەورە بوو، بە ئازایەتی و دادپەروەری لە جیهاندا دەنگی دابووەوە. شازەمانیش پاشایەتی سەمەرقەندی دەکرد. هەریەکەی بۆ ماوەی بیست ساڵ لە سەر ملک و تاج و تەختی خۆیان بە خۆشـــی ڕایانبوارد. ڕۆژێک شــــەهریار بیری براکەی کرد و وەزیرەکەی نارد لە دوای بانگهێشتی بکا. وەزیر ڕۆیشت و ڕاسپاردەکەی بەجێ گەیاند.

شــــازەمان هەر ئەو ڕۆژە تاوڵ و هۆبەی ناردە دەرێ. بۆ ڕۆژی دوایی وڵاتەکەی بە وەزیرەکەی سـپارد و لەگەڵ وەزیری براکەی لە شـار وەدەر کەوتن و چوونە سـوپاگەکە. شـــەو وەبیری هاتەوە کە ئەو گەوهەرەی وەک دیاری هەڵی بژاردبوو بۆ براکەی بەرێ، لە بیری چووە. لەگەڵ دوو دانە لە پیاوماقووڵانی گەڕاوە بۆ شار و لە کۆشک وەژوور کەوت، دیتی ئەوە شاژن لە ئامێزی نۆکەرە قولەڕەشەکەیدا خەوتووە. وا بوو چاوی عەرزی نەدیت و هەڵی کێشا شیر و هەردووکیانی لە جێدا کوشت و گەڕاوە بۆ سوپاگە.

تـــاریـــک بـــوو دونـــیـــای ڕوونـــی لە بەر چـــاو
هەر دووکیـــانی کوشـــــــت وەک خواردنەوەی ئـــاو

بەری بەیانی، شـــەیپووری کەوتنەڕێ لێدرا. هەر بەدەم خەفەتی ئەو داخەوە ڕۆیشـت تا گەیشـتنە وڵات و ناوچەی ژێر دەسـەڵاتی براکەی. شـەهریار خێرا بە پێشـوازی براکەیەوە چوو. لە خۆشـیان هەر بە دەوریدا دەهات و لێکدالێکدا قسـەی دەکرد. بەڵام شـازەمان ئەو دیمەنەی خێزانی و نۆکەرەکەی لە بەر چـاوی لا نەدەچوو. هەر بۆیە مـات‌ومەلوول بوو. شەهریار وای دانا کە ماتی و مەلوولییەکەی لەبەر دووری وڵات و دەوروبەریانی بێ. ئیتر وازی لێ هێنا و نەیدواند. دوای چەند ڕۆژ گوتی: "ئەرێ براڵە، ئەوە چۆنە هەر کز و لاواز دەبی و ڕەنگت زەرد هەڵدەگەڕێ؟"

شازەمان گوتی:

ئەگەر بـێـتـو، بەســـەرهـاتــم وەگـێـڕم
کەس نـامـێـنـێ وەســـەر خـۆمـی نەگـێـڕم

خـویـنـــاوی دڵ لە دوو چـــاوم دەچــۆڕێ
بـڵـێـی ئەو بـیـرە قـــووڵە هەڵ نەچــۆڕێ؟
بـولـبـولاســـــا ئەگەر شـــــتـێـک دەبـێــژم
زووخـــــاوی دڵـــی زامـــدارمە دەیـــڕێـــژم

شەهریار گوتی: "هەر وا چاکە بچین بۆ ڕاو، بەشکو ئەو خەفەتەت لە دڵ بڕەوێ و شاد ببیەوە."

شازەمان گوتی:

"داری خەڵکی گەر بەری خـۆشــــــی بـگـرێ
داری بەختی من وشـــــــک بووە، بەر نـــاگرێ"

شــەهریار کە ئەوەی بیســت، لە دڵی خۆیدا گوتی: «وا باشــە بەینێک دەوری چۆڵ کەین بەشــکوو باشــتر بێ.» بۆخۆی چوو بۆ ڕاو. شــازەمانیش لەو بەرجەوەندەوە کە دەیڕوانییە باخ، بە ماتی دانیشـــتبوو. لەپڕدا ســـەیری کرد ئەوە براژنی لەگەڵ بیســـت کەنیزی وەکوو مانگ و بیســـت کۆیلەی قولەڕەش هاتنە باغەوە و بە ئیشـــتیا گەڕان، پاشـــان چوونە لای حەوزەکە و خۆیان ڕووت کردەوە و جلەکانیان داکەند. خانم بانگی کرد: "مەســـــعوودا!" کۆیلەیەک هات، یەکی زەلامی و بەخۆوە. خانم دەســتەملانی ئەو بوو. کاتێک خۆی بەســەر خانمدا کێشـــــا، دەتگوت حۆرییە و لە بن دێوێکی زەلامدایە. هەر کام لە کۆیلەکانی دیکەش باوەشیان بە کەنیزێکدا گرت و دەستیان کرد بە ماچ‌ومووچ.

قـــول و گـــوڵ لەنـــاو گـــوڵـــزارا
دەم لەنـــــاو دەمـــــی دڵـــــدارا
چـــیـــمەن بـــایەخـــی نەمـــابـــوو
قەل تـــاجـــی لە ســـــەری نـــابـــوو

کاتێک شــازەمان وەزعی ئەوی ئاوا دیت، لە دڵە خۆیدا گوتی: "حەح، خۆ براکەم زۆر لە من چارەڕەشترە. وا چاکە لەمە بەدوا خۆم نارەحەت نەکەم." ئیتر دوای ئەوە خەمی نەما و ڕووی کردە عەیش‌ونۆش و خۆش‌ڕابواردن.

کاتێک براکەی لە ڕاو گەڕاوە، دیتی ئەوە ڕەنگی شازەمان گەش بووەتەوە و کوڵمەکانی ســوور و جەســتەی بووژاوەتەوە. شــەهریار ســەری ســووڕ ما و گوتی: "کاکە، تێم‌گەیێنە

بۆچی لەپێشــدا هەر زەرد و لاواز دەبووی، کەچی ئێســتا بە پێچەوانەوە چاک بوویتەوە و کەیفت ساز بووە؟"

شــازەمان گوتی: "هۆکاری لێوبەبارییەکەمت بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام هۆی گەشــانەوەکەم پێویســت ناکا." ئیدی ڕووداوی ژنەکەی خۆی و کۆیلە ڕەشــەکە و کوشــتنیانی بۆ گێڕاوە. شــەهریار پێداگری کرد و لەبەری پاڕاوە هۆکاری گەشــانەوە و شــادبوونەکەشــی پێ بڵێ. شازەمان ناچار چیرۆکی براژنی و کەنیز و کۆیلەکانی بۆ گێڕاوە.

شەهریار گوتی: "ئەمن زۆرم باوەڕ بە خانمە. هەتا بە چاوی خۆم نەیبینم، باوەڕ ناکەم. ئەگەر بکرێ بە چاوی خۆت ببینی، بۆ باوەڕ بە قسەی ئەم و ئەو بکەی؟"

شازەمان گوتی: "باشە، دەستوور بدە بۆ چوونە ڕاوێکی دە ڕۆژە ساز بن. وای بنوێنە تۆش دەچی بۆ ڕاو. کاتێک داروودەســتەکەت ڕۆیشــتن بۆ ڕاو، ئەتۆ ڕاوەســتە با ئەوەی من دیتم ئەتۆش ببینی."

چۆنی براکەی گوتی، شــەهریار ئاوای کرد. پاشــان هەردوو برا پێکەوە لە شــوێنێک بۆ چاودێری خۆیان مات دا.

شــەهریار ئەوەی لە براکەی بیستبووی، بە چاوی خۆی دیتی و بە براکەی گوت: "ئیدی دوای ئەو ڕووداوە، پاشـــایەتی لە من حەرام بێ. ئیتر ســـەری خۆیان هەڵگرت و ڕێگای چۆڵییان گرتە بەر."

ماوەی چەند شــەو و ڕۆژێک ڕۆیشــتن، ڕۆیشــتن، هەتا ڕۆژێک لە کەنارەکانی دەریای عوممان لەژێر دارێک کە لەســـەر کانی و ئاوێک بوو، خەریکی پشـــوودان بوون. دێوێکی درێژ و زەلام کە یەغدانێکی١ ئاسنی لەسەر سەر بوو، لە دەریاکە هاتە دەرێ.

شــازادەکان لە ترســان چوونە ســەر دارەکە. دێوە هاتە لای کانی و ئاوەکە و ســەری یەغدانەکەی لابرد، کیژێکی وەک مانگی تێدا هێنا دەرێ و پێی گوت:

ئەی جەســـــتە مــرۆڤ و بە ڕوخســـــار پەری
تــۆ هــۆی ســــەرئێشـــەی نەقــاش و بــتــگەری

زۆر ماندووم، بۆخۆت دەزانی من هێندەم تۆ خۆش دەوێ لە شـــەوی بووکێنیدا هەڵم گرتی و تۆم ڕفاند. ئێستا ئاگات لێم بێ با تێر بخەوم و بحەسێمەوە. ئیدی سەری وە ڕانی کچە کرد و خەوی لێ کەوت. کە خەوی لێ کەوت، کچە گوێی لە هەســـتێک بوو، ســـەری

١. یەغدان: سندووق

بەرز کردەوە شازادەکانی لەسەر دارەکە دیت. سووکێک سەری دێوەکەی لە سەر عەرز دانا و بە ئاماژە تێی گەیاندن بەئەسپای لە سەر دارەکە بێنە خوارێ، وابێ دێوەکە وەخەبەر نەهێنن دەنا لەت و کوتیان دەکا. کچە دەتگوت مانگە دەدرەوشـێ کە هاتنە خوارێ هەر بە دەست بانگی کردن بچن نیزیکی لەگەڵ بکەن دەنا دێوەکەیان لێ وەخەبر دێنێ. لە ترسی گیانی خۆیان چوون لە بەری هەڵنیشتن. دوای ئەوە کیژەکە پرێسکەیەکی ئاورێشمی دەرهێنا و کردییەوە کە پێنجسەد و حەفتا ئەنگوستیلەی تێدا بوو. لێی پرسین: "دەزانن ئەو ئەنگوستیلانە چین؟" شازادەکان گوتیان: "نەخێر." کچە گوتی: "ئەوە خاوەنی ئەو ئەنگوستیلانە وەک ئێوە لە لای ئەو دێوە ئەو کارەیان لەگەڵ من کردووە و هەر کامیان ئەنگوستیلەیەکیان بە یادگاری داومێ. ئێوەش یەکی ئەنگوستیلەیەکم بدەنێ. با ئەوەش بزانن کە ئەو دێوە منی لە شەوی بووکێنیمدا ڕفاندووە و شەو و ڕۆژ منی لەو سندووقە خستووە لە دەریادا ئاگای لە منە. بێخەبەر لەوە کە:

بالندە و ژینی ناو قەفەس ستەمە
پەری و دێو ببنە هاونەفەس ستەمە
ئەوەی تاڵە مووبەکی کەمەندێکە
تۆ کەمەندی بکەیتە دەست ستەمە

شازادەکان بە بیستن و دیتنی ئەو قسە و ڕووداوانە واقیان وڕ ما و گوتیان: "چیرۆک و بەسەرهاتی ئەو دێوە لە بەسەرهاتی ئێمە سەیرتر و داخدارترە و ئەوەی ئێمە لەچاو ئەوە هەر هیچ نییە، کە وایە با بگەڕێینەوە بۆ وڵات و دیاری خۆمان." ئیدی گەڕانەوە.

شازەمان بە سەڵتی و ڕەبەنی ماوە و لە کونجێک خزا و لە هەموو خۆشییەک دابڕا. بەڵام شەهریار هەرچی ژن و کەنیز بوو هەموویانی بە شمشیر کوشتن و دەرخواردی سەگانی دان. لەمە بەدوا هەموو شەوێک کیژێکی دێنا و تا بەیانی لەگەڵی دەبوو و بەیانی دەیکوشت. هەتا سێ ساڵان ئەوە پیشەی بوو. خەڵک هەموو وە گیان هاتبوون و وای لێ هات خەڵکەکە ئەوەی کچی هەبوو، هەرکەسەی باری دەکرد و دەڕۆی بۆ وڵاتێکی دیکە. کچ لە شاردا قات بوو. وا بوو ڕۆژێک شەهریارشا بە وەزیری گوت: "کیژێکی شیاوم بۆ بێنە." وەزیر هەرچەندی سووڕاوە، کچی بۆ نەدیتراوە و ماندوو و شەکەت بە نارەحەتی گەڕاوە ماڵە خۆی و مات و مەلوول دانیشت. ئەو بۆخۆی دوو کچی لە ماڵێدا هەبوو. یەکیان ناوی شەهرزاد و ئەوی دیکەیان دنیازاد بوو. شەهرزاد کچێکی سەنگین و ژیر و زانا بوو، شارەزایی لە دنیای شاعیران و نووسەران و گەورە و زانایانی ڕابردوو هەبوو، کچێکی وردبین و پێشبین بوو. کاتێک باوکی بە مات‌ومەلوولی و پەرێشانی دیت، هۆیەکەی پرسی و گوتی:

"تـا کەی خەمی دنیـا لەســـەر دڵ کەڵەکە دەکەی؟
ویـڵ کە، چـی لە دنـیـادا، خەفەت و کەڵـکەڵەکەی
لەگەڵ خـۆشـــەویســـــتەکەتـدا پـیـاڵەیەک هەڵـدە
دنیـا جێی بەقـا نییە تـا مـاڵی لەســـەر بکەی"

وەزیر ڕووداوەکەی بۆ کچەکەی گێڕاوە. کچەکەی گوتی:

"وەزیـــری بـــیـــر فەڕ و پـــێوقەدەم پـــیـــرۆز
کـــۆڵەکەی پـــادشـــــایەتـــی و دڵســـــۆزی هـــۆز

"قەیناکا من بۆ پادشـــا بەرە، یا منیش دەکوژرێم یا بە زیندووی دەمێنمەوە و تەواوی کچان لەو بەڵایە ڕزگار دەکەم." وەزیر گوتی: "کچم، خۆخســتنە ئەو مەترســییەوە کارێکی ژیرانە نییە و دەترسـم ئەو بەڵایەت بەسـەر بێ کە بە سـەر ژنە جووتیارەکە هات." کچەکە گوتی: "چیرۆکی ژنە جووتیارەکە چۆناوچۆنە؟"

## چیرۆکی جووتیار و کەرەکەی

وەزیر گێڕایەوە: "بیســـتوومە کە جووتیـارێـک مەڕومـاڵاتێکی زۆری بوو، زمـانی گیاندارانیشـــی دەزانی. ڕۆژێکی چووە تەویلە و دیتی مانگاکە لە نزیک ئاخوڕی کەرەکە ڕاوەســـتاوە و چاوی لەو گژوگیا جوانە بڕیوە لە پێشـــیەتی و ئێرەی بەو جێگا وشـــک و برینگەی دەبات و دەڵێ: 'لەنێو ئەو هەمووە خێر و بێرەدا بۆ خۆت بیگوزەرێنە و، با منیش شـــەو و ڕۆژ لە ڕەنج و کوێرەوەریدا بم. ڕۆژێ دەبێ جووت و ڕۆژێک گێرە بکەم. ئەتۆ هیچ کـارێکت نییە جگە لەوەی جـارجـارێ خـاوەنمـان هەتـا هۆوەی ســـوارت دەبێ و دەتهێنێتەوە سەر ئاخوڕەکەت.'

خـۆت خەریـکـی خـواردن و خەوتـن و گەوزیـن
مـنـی کـلـۆڵ مـردووم بە دەســـــت مەیـنەتـی ژیـن

"گوێدرێژەکە لە وەڵامدا گوتی: 'بەیانی کە نێرەکەیان خستە ئەستۆت، خۆت لە خەو کە. هەرچەندی لێت دەن، لە جێی خۆت مەبزوو. هەرچییەکیان لە پێشـــت دانا، دەمی لێ مەدە. کاتێک یەک، دوو ڕۆژ ئاوا بکەی، تازە کاریان پێت نابێ و ڕزگارت دەبێ.' ئەوان ئاوا پێکەوە قســـەیان دەکرد و خاوەنماڵیش گوێی لێ گرتبوون. کاتێک بەیانی خزمەتکارەکەیان

هاته گەوەڕەکە، گایەکەی دیت کە هیچ ناخوات و هێزی لە بەردا نییە. چوو بە خاوەنماڵەکەی گوت. خاوەنماڵ گوتی: 'گوێدرێژەکە بەرە بۆ کار و نێرەکە لە ئەســتۆی ئەو کە.' خزمەتکار گوێدرێژەکەی لە جیاتی گایەکە برد بۆ کار.

"شەوێ کە گوێدرێژەکە لە کار گەڕاوە. گایەکە بە پێشوازییەوە هات و سپاسی کرد، بۆ ئەو چاکەیەی لەگەڵی کردووە. کەرە جوابی نەداوە و لە قسەکانی خۆی پەشیمان ببووەوە. ڕۆژێکی دیکە دیســان کەرەیان بردەوە بۆ جووت. ئێوارە کەرە ماندوو و مردوو لە کاتێکدا ملی لێ درێژ ببووەوە، هاتەوە. گایەکە دیسان بە ئەمەگناسییەوە پێشوازی لێ کرد. گوێدرێژ بە گایەکەی گوت: 'ئەورۆ شتێکی ناخۆشم بیست، گوێم لە خاوەنماڵ بوو بە خزمەتکارەکەی گوت: 'سبەینێ گایەکە بەرە دەرێ، ئەگەر زانیت هەر ناسازە، بە قەسابێکی بفرۆشە.' ئەمن خەمی تۆم بوو. بۆخۆت دەزانی من دڵســۆزی تۆم. گوتم با ئاگادار بی، پێم وایە ســبەینێ بچییەوە کار چاکترە. جا ئیدی کەیفی خۆتە.' گایەکە کە ئەوەی بیســـت، ڕازی بوو. گوتی: 'باشە، سبەینێ ناچار دەچم بۆ جووت.' ئەوان قسەیان دەکرد و خاوەنماڵیش هەر وا گوێی لێ ڕاگرتبوون.

"ســـۆزی خاوەنماڵ لەگەڵ خێزانی هاتنە گەوەڕ و بە نۆکەرەکەی گوت: 'ئەورۆ گایەکە بەرە بۆ کار.' گا کە چاوی بە خاوەنماڵ کەوت، کلکی ڕاوەشـــاند و هەســـتا ســـەر پێ و بۆڕاندی. خاوەنماڵ پێکەنی، ئەوەندە پێکەنی ژانی کرد. خێزانی پرسـی: 'ئەوە بۆ پێدەکەنی؟' کابرا گوتی: 'شـتێکە ناتوانم پێت بڵێم.' خێزانی گوتی: 'ئەوە بە من پێدەکەنی!' چونکە کابرا خانمی خێزانی زۆر خۆش دەویست، ناچار گوتی: 'خۆشەویستەکەم، نهێنییەک لەو کارەدایە کە بە تەما نەبووم پێت بڵێم، بەڵام لەبەر دڵی تۆ پێت دەڵێم، هەرچەند ئەگەر پێت بڵێم ئیدی بۆخۆم نامێنم.' ئەو جار کابرا خزم و کەسی لەدەوری خۆی کۆ کردەوە تا وەسـییەت بکا. بۆ دەستنوێژگرتن چووە نێو باخێک کە سەگ و مریشک و کەڵەشێر و شتیماڵی تێدا بوو. کابرا گوێی لێ بوو کە ســـەگ بە کەڵەشـــێر دەڵێ: 'چەند بەدبەختی، ئەوە خاوەنەکەمان دەمرێ و ئەتۆش دڵخۆشـــی؟' کەڵەباب وەڵامی داوە: 'خاوەنەکەی ئێمە گەوجە. ئەمن پەنجا ژنم هەیە و لەگەڵ هەموویان جارێک بە خۆشـی و جارێک بە توندی دەجووڵێمەوە، کەچی ئەو لە ژنێک زیاتری نییە و نازانێ چۆنی لەگەڵ بجووڵێتەوە. ئێستا بۆ چەند دانە شووڵ بە دەستەوە ناگرێ و ئەوەندەی لێ نادا هەتا یان بمرێ یان تۆبە بکا و ئیدی ئەوەندە لە بنج و بناوانی قســـەیەک نەکۆڵێتەوە.' هەر دەســـتبەجێ کابرا دەســـتی دا چەند دانە شـــووڵ و ئەوەندەی لە خانم دا هەتا لە هۆش خۆی چوو. کاتێک وە هۆش خۆی هاتەوە، پەشـــیمان بووەوە و داوای لێبووردنی کرد و خۆی بەسەر قاچی کابرادا خست هەتا لێی خۆش بێ.

"ئێستا من لەوە دەترسم ئەتۆش ئەو بەڵایەت بەسەر بێ کە بەسەر ژنی جووتیارەکەدا هات."

شەهرزاد گوتی: "تا بە ئاواتم نەگەم، دەست هەڵناگرم."

کاتێک وەزیر پێداگری ئەوی دی، هەستا، چوو بۆ بارەگای پادشا و خۆی لە بەرپێیدا خست، باسی کچەکەی لەگەڵ هێنا گۆڕێ و چۆن بوو، گێڕایەوە. بەڵام شەهرزاد دنیازادی خوشکە چکۆڵەکەی بانگ کردە لای خۆی و پێی گوت: "کاتێک منیان بردە لای پاشا، ئەمن داوا لە پاشا دەکەم، دەڵێم خوشکە چکۆڵەکەشم با بێتە ئێرە. کاتێک هاتییە ئەوێ، ئەتۆ لە بەرم بپاڕێوە چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە. بەشکوو نەجاتم بێ."

هەر کە شەو داهات، کچی وەزیریان ڕازاندەوە، بردیان بۆ کۆشکی پاشا. کاتێک پاشا بە دڵێکی خۆشەوە لە بووک وەژوور کەوت و ویستی سەرپۆشەکەی لا دا. شەهرزاد دەستی کرد بە گریان و گوتی: "پاشا، خوشکێکی چکۆڵەم هەیە کە بەبێ یەکتر هەڵمان نەدەکرد و شەو و ڕۆژ بە یەکەوە بووین. ئێستا ڕێمان بدە با بۆ دواجار چاومان بە یەکتر بکەوێتەوە." پاشا داوای کرد دنیازاد بێنن و بۆخۆی لەگەڵ شەهرزاد چوونە جێوە و کردی بە ژن. دوای ئەوە شەهرزاد لە تەختەکە هاتەخوارێ و لە لای خوشکی دانیشت. دنیازاد گوتی: "دادە، بێخەوی زۆرم ئازار دەدا، چیرۆکێکم بۆ بگێڕەوە با بخافڵێین." شەهرزاد گوتی: "ئەگەر پاشا ڕازی بێ، بۆت دەگێڕمەوە." پاشاش خەوی نەدەهات و زۆریشی حەز لە چیرۆک بوو؛ ڕێی دا شەهرزاد چیرۆکەکەی بگێڕێتەوە.

شەهرزاد لە یەکەم شەودا گوتی:

## چیرۆکی بازرگان و دێو

خاوەنشکۆ، بیستوومە بازرگانێکی دنیادیدەی تاڵ و سوێرچێشتوو، سارد و گەرمدیتوو لە ڕێگای دەریا سامناکەکانەوە هاتوچۆی شارە دوورەدەستانی دەکرد. جارێک سەفەرێکی بۆ هاتە پێش و لە ماڵ وەدەر کەوت و ڕۆیشت، ڕۆیشت هەتا گەرما و ماندووی لە پێیان خست. لای دا بن دارێک تا تاوێک وەحەسێ و پشوویەک بدا. کاتێک حەساوە، بوخچەکەی کە نان و خورمای تێدا بوو، دەرهێنا و نان و خورمای خوارد و دەنکە خورماکانی فڕێ دا ئەولاوە. هەر کە دەنکە خورماکانی فڕێ دا ئەولاوە، دێوێک بە شمشێرێکەوە ڕووبەڕووی پەیدا بوو، گوتی: "ئەو دەنکە خورمایانەت بۆ بە سینگی ئەو کوڕەی من دادا و کوشتت. تازە سەر بەریە ئاسمان، دەتکوژمەوە."

بازرگان گوتی: "ئەی دێوی دێوان، ئەمن ماڵ و سامان و کوڕێکی زۆرم هەیە، مۆڵەتم بدە بچمەوە ئەو ماڵ و سامانەیان بەسەردا دابەش کەم و وەسییەتیان بۆ بکەم. دوای ساڵێکی دیکە دێمەوە خزمەتت و بمکوژە." دێو داخوازییەکەی ئەوی قبووڵ کرد و مۆڵەتی

دا.

بازرگان گەڕاوە ماڵی و ماڵ و سامانەکەی بە سەر منداڵەکانیدا دابەش کرد و ڕووداوی دێوەکەی بۆ منداڵ و خزم و کەسانی گێڕاوە. کاتێک ساڵەکە تەواو بوو، گەڕاوە ئەو بێروونە و لە بن دارەکە دانیشت و خەریک بوو بۆ حاڵی خۆی دەگریا. وا بوو، پیرێک پەیدا بوو، مامزێکی پەت کردبوو و بە دەستییەوە بوو. سڵاوی لە بازرگانەکە کرد و پرسی: "کێی و بە تەنیا لە ملکی دێواندا چ دەکەی؟" بازرگان بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. مامە پیرە پێی سەیر بوو. زۆری خەم بوو، گوتی: "تازە بە سلامەت دەرناچی." هەر بۆیە لە پەنا بازرگان دانیشت و گوتی: "لێرە نابزووم تا نەزانم چارەنووسی تۆ بە کوێ دەگا."

بازرگان هەر وا لە بیر و خەیاڵی خۆیدا بوو کە پیرێکی دیکە بە خۆی و دوو گەماڵی ڕەشەوە دەرکەوتن و سڵاوی کرد و پرسی: "ئەوە بۆ لە ملکی دێواندا دانیشتووی چاوەڕێی چی؟" بەسەرهاتەکەی بۆ ئەویش گێڕاوە. هێشتا ئەو پیرەیان دانەنیشتبوو، پیرێکی یەسترسواریش پەیدا بوو. سڵاوی کرد و پرسی: "ئەوە بۆ لێرە دانیشتووی؟" ڕووداوەکەی بۆ ئەویش گێڕاوە. لەپڕدا هەڵی کردە گێژەڵووکەیەک و لەنێو گێژەڵووکەکەدا دێوەکەی کابرا چاوەڕوانی بوو، بە شیرێکی ڕووتەوە هاتە دەرێ. دەستی بازرگانەکەی گرت هەتا بیکوژێ. بازرگانەکە گریا و ئەو سێ پیرەش لەگەڵی دەستیان کرد بە گریان. پیری یەکەم کە مامزەکەی بە دەستەوە بوو، هەستا چوو دەستی دێوەکەی ماچ کرد و گوتی: "ئەی گەورەی دێوان، من و ئەو مامزە جوانە بەسەرهاتێکمان هەیە، بۆت دەگێڕمەوە، ئەگەر پێت خۆش بوو، لە سێیەکی خوێنەکەی خۆش بە." دێوەکە گوتی: "بیگێڕەوە".

**بەسەرهاتی کابرا پیرە و مامزەکەی**

پیری ژیر گوتی: "ئەی سەروەری دێوان، ئەو مامزەی تۆ دەیبینی، کچە پوورمە و ماوەی سی ساڵ هاوژینم بوو. منداڵی نەدەبوو. کەنیزێکم هێناوە. لەو کەنیزە کوڕێکم بوو. کاتێک کوڕە بوو بە پازدە ساڵ. سەفەرێکم بۆ هاتە پێش. بۆ بازرگانی چووم بۆ شارێکی دیکە. کچە پوورەکەم کە ئەو مامزەیە، هەر لە منداڵییەوە فێری جادوو ببوو. بە جادوو کەنیز و کوڕەکەمی کردبوو بە مانگا و گوێلک. بە گاوانەکەمانی سپاردبوون. کە من لە سەفەر گەڕامەوە و سۆراغی کەنیز و کوڕەکەمم گرت، گوتی: "کەنیزەکەت مرد و کوڕەکەشت سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت." ئەمنیش زۆریان بۆ گریام و زۆرم خەم بوو. ساڵێکی تەواو چۆکی خەمم لە ئامێز گرت. هەتا جێژنی قوربان هات. ناردمە لای گاوانەکە و گوتم مانگایەکم بۆ بنێرێتەوە بۆ قوربانی.

گاوان مانگایەکی هێناوە کە کەنیزەکەی خۆم بوو. ئەمن قۆڵم هەڵکرد و بەرهەڵبێنەم لە

خۆم شـــەتەک دا. کێردێکم دەســـت دایە هەتا بیکوژمەوە. مانگاکە دەگریا و دەناڵاوە و دەپاڕاوە. بەزەییم پێیدا هات و بۆخۆم نەمکوشتەوە. بە گاوانەکەم گوت، ئەو کوشتییەوە و کەوڵی کرد. سـەیرم کرد هەر ئێسـقان بوو. لە کوشـتنەوەی پەشـیمان بوومەوە، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو. ســوودی نەبوو دام بە گاوانەکە و گوتم: "گوێلکێکی قەڵەوم بۆ بێنن." گاوان گوێلکێکی هێنا کە هەمان کوڕەکەی خۆم بوو. هەر کە گوێلکە منی دی، پەتی پچڕاند و غاریدا بۆ لای من. لەبەر پێم دەگەوزی و دەگریا. ئەمن بەزەییم پێیدا هات و گوتم یەکی دیکە بێنن.

کە چیرۆکەکە گەیشتە ئێرە، ببوو بە ڕۆژ و شەهرزاد بێدەنگ بوو. دنیازاد گوتی: "چەند خۆشـت گێڕاوە، دادە!" شـــەهرزاد گوتی: "ئەگەر پاشـــا ئەوڕۆ نەمکوژێ، شـــەوێکی دیکە پاشماوەکەیت بۆ دەگێڕمەوە کە زۆر لەوە خۆشترە." چونکە شا بۆخۆی حەزی لە چیرۆک بوو، لە دڵە خۆیدا گوتی: "ئەوەیان جارێ ناکوژم، با چیرۆکەکەی تەواو بگێڕێتەوە."

کە تەواو ڕۆژ بووەوە شـــا خەریکی کاروباری بەڕێوەبەردنی وڵات بوو هەتا شــــەو داهات. وەزیریش هەتا ئێوارە هەر چاوەڕێی خەبەری کوژرانی کچەکەی بوو. کە هەواڵێکی نەبوو. پێی سەیر بوو.

وا بوو شـــا لە دیوەخان هاتە دەرێ و چوو بۆ حەرەمســـەرا تا گوێبیســـتی درێژەی چیرۆکی کچی وەزیر بێ.

## که شەوی دووەم هاتەوە

چوونە خەوگەوە و کاتێک شـــەهریار لە کچی وەزیر تێر بوو، کچی وەزیر هاتەوە پێش تەختی شـا و دانیشـت. دنیازاد گوتی: "دادە، چیرۆکی بارزگان و دێوەکەمان بۆ بگێڕەوە." شـەهرزاد گوتی: "ئەگەر پاشـا ڕێم بدا، دەیگێڕمەوە." پاشـا ڕوخسـەتی دا. شـەهرزاد گوتی: "خاوەنشـــکۆ، خاوەنی مامزەکە بە دێوەکەی گوت: 'ئەی ســـەروەری دێوان، کاتێک گوێلک گریا و خۆی بەســـەر کەوشـــەکانمدا دا، منیش بەزەییم پێیدا هات و بە گاوانم گوت کە ئەو گوێلکە بەڕەڵا کە و یەکی دیکە بێنن. ئەو مامزە کە کچە پووری منە، هاتە لام و هانی دەدام و پێـداگری دەکرد کە هەر دەبێ ئەو گوێلکە بکوژیەوە، چونکە زۆر قەڵەوە. بەڵام من نەمتوانی و ڕێم بە خۆم نەدا بیکوژمەوە. بە گاوانەکەم سپارد و بردییەوە ماڵە خۆیان.'

" 'ڕۆژی دوایە گـاوانەکەم هـاتە لام و موژدەی دامێ و گوتی: 'ئەمن کچێکم هەیە بە منداڵی لە لای پیرێژنێک فێری جادوو بووە. کاتێک گوێلکەکەم بردەوە مـاڵە خۆمـان، ئەو کچەم ڕووی خۆی داپۆشـــی و دەســـتی بە گریان کرد. دوای ئەوە پێکەنی و گوتی: 'بابە، ئەوە چۆنە پیاوی بێگانەت هێناوەتەوە ماڵێ؟' گوتم: 'پیاوی چی؟ ئەو پێکەنین و گریانەت لە چییە؟' گوتی: 'ئەو گوێلکە کوڕە ســـامانداره و باوەژنی بە جادوو ئەو و دایکی کردووە بە گوێلک و مانگا. لەبەر ئەوە پێکەنیم. بەڵام گریانەکەم لەبەر ئەوە بوو کە دایکیان سەر بڕیوە بۆ قوربانی.' '

" 'گەورە و سـەروەری دێوان، کاتێک ئەوەم لە گاوانەکە بیسـت، لە ماڵێ هاتمە دەرێ و لە خۆشیان نەمدەزانی چی دەکەم. یەکسەر ڕووم لە ماڵە گاوانەکەم کرد. کچی گاوان هات و سـڵاوی لێ کردم و دەسـتی ماچ کردم و لەو لاوە ڕاوەسـتا. دوایە هەر ئەو گوێلکە هاتە پێشـــێ و بۆنی بە بەر پێمەوە دەکرد. ئەمن بە کچە گاوانەکەم گوت: 'ئەوەی لە بارەی ئەو گوێلکەوە گوتووتە، ڕاســـتە؟' گوتی: 'بەڵێ، ئەوە منداڵی تۆیە.' گوتم: 'ئەگەر ئەو لەو دۆخە ڕزگار بکەی، ئەوەندەت ماڵی دنیا دەدەمێ کە پێویســـتیت بە هیچ نەمێنێ.' کچە بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'ئەمن پێویســـتیم بە ماڵی دنیا نییە. بەڵام بەڵێنیم دەیە کە ئەو جادوویەم لە سـەر ئەو کوڕەت بەتاڵ کردەوە، لێکمان مارە کەن و ڕێشـم بدەی تا ئەو کەسـەی جادووی لەو کوڕەت کردووە، جادووی لێ بکەم. دەنا تازە لە کۆڵم نابێتەوە و دەستم لێ هەڵناگرێ.' گوتم: 'ئەوە ئازادم کردی چی لە کچە پوورەکەم دەکەی بیکە.' ئینجا قاپێکی پڕ لە ئاوی هێنا و دۆعایەکی بە سەردا خوێند و بە سەر گوێلکەکەیدا هەڵیڕژاند. هەر لە جێوە گوێلکەکە بووەوە بە مرۆڤێک و خۆی لە باوەشـم هاویشـت. منیش تێرم لە ئامێز گرت و چاویم ماچ کرد و کچی گاوانەکەشم لێ مارە کرد. ئەویش خێزانمی بە جادوو کرد بە مامز و ئێستا بۆ

هەر کوێ بچم، ئەوە پێمە و لەگەڵ خۆم دەیگێڕم.

" 'کاتێک گەیشتمە ئێرە و بازرگانم لێرە دیت و بەسەرهاتەکەیم بیست، ڕاوەستام گوتم بزانم چارەنووسـی بە کوێ دەگا. ئەی پاشـای دێوەکان، ئەوە بوو بەسـەرهاتی من و ئەو مامزە.'

## چیرۆکی پیری دووەم و دوو گەماڵەکەی

"دێوە گوتی: 'بەسـەرهاتێکی سـەیرە. ئەوە لە سـێیەکی خوێنباییەکەی خۆش بووم.' لەو جەنگەیەدا پیری دووەم، خاوەنی گەماڵەکان، هاتە پێشێ و گوتی: 'ئەی سالاری دێوان، ئەو دوو گەماڵە برای منن. هەر کە بابم کۆچی دوای کرد، سـێ هەزار دیناری زێڕی لە پاش خۆی بەجێ هێشـت. ئەمن لە دووکانێک خەریکی کڕین و فرۆشـتن بووم، براکەی دیکەم چوو بۆ سـەفەر. دوای سـاڵێک بە دەسـتی بەتاڵ گەڕاوە. ئەمن ئەوم بردە دووکان و هەزار دیناریشم سەرمایە دایە. چەند ڕۆژێک پێکەوە بووین. پاشان هەردووک براکەم ساز بوون بۆ سـەفەر و داوایان لە منیش کرد لەگەڵیان بچم. من پێم خۆش نەبوو، لەگەڵیان نەچووم. باسی سەختی و دەردەسەری سەفەر و زیانەکەیم بۆ کردن و ئەوانیش پاشگەز بوونەوە.

" 'شـەش سـاڵ بەو شـێوەیە هەریەکەی لە دووکانێک دانیشـتین. دوای ئەوە ئەمنیش لەگەڵ ئەوان ڕێک کەوتم و دەسـتمایەکەمان بژارد، شـەش هەزار دینار بوو. ئەمن گوتم با نیوەی ئەوە لەژێر زەویدا بشارینەوە تا ئەگەر هاتوو دەستتەنگ بووین و کارمان پێی بوو. ئەو نیوەیەش بکەین بە سـەرمایە و بازرگانی پێوە بکەین. پێشـنیارەکەی منیان بە دڵ بوو. چۆنم گوت، ئاوایان کرد و ئەوجار سواری پاپۆڕ بووین بۆ سەفەر.

" 'یەک مانگی تەواو بەسـەر دەریاوە بووین هەتا گەیشـتینە شـارێک، کەلوپەل و شتەکانمان بە نرخێکی زۆر باش فرۆشت و یەک بە دە خێریان بۆ کردین. ئینجا چووینەوە قەراخ دەریا درێژە بە سـەفەرەکەمان بدەین. لەوێ کچێکمان دیت جلوبەرگێکی شـڕی لە بەردا بوو. کچە پێی گوتم: 'تۆ چاکەیەکم لەگەڵ بکە، چاکەت دێتەوە ڕێ.' گوتم: 'دەیباشـە، دەڵێی چی بکەم؟ چیم لە دەسـت دێ؟' گوتی: 'بمخوازە و لەگەڵ خۆت بمبە بۆ شـاری خۆت.' من زگم پێی سووتا و قەبووڵم کرد.

" 'لەگەڵ خۆم بردمە نێو پاپۆڕەکە. جلی زۆر جوان و بەنرخم لە بەر کرد. شـوێنێکی خۆش و جوانم بۆ تەرخان کرد و دڵم دایە و لە براکانم دابڕام و شـەو و ڕۆژ لەگەڵ ئەو ڕامدەبوارد. براکانم ئێرەییان پێ دەبردم و چاویان لە ماڵم بڕیبوو. لەسـەر کوشـتنم سـاخ ببوونەوە. کاتێک لەگەڵ ئەو کچە خەوتبووین، ئێمەیان لە دەریا هاویشت.

" 'ئەو کچە هەر لەڕێوە بوو بە دێوێک و ئەمنی هەڵگرت و بردمی بۆ دوورگەیەک داینام و ماوەی چەند کاتژمێرێک ون بوو. دوای ئەوە هاتەوە لام و گوتی: 'ئەمن لە تۆرەمەی[1] پەرییانم و کاتێک تۆم بینی ئۆگر و ئەڤیندارت بووم و لە بیچمی مرۆڤدا هاتمە لات. ئێستا دەمهەوێ براکانت بە تۆڵەی خراپەکاری بکوژم.' ئەمن زۆرم پێ سەیر بوو. داوام لێ کرد لە کوشتنی براکانم پاشگەز ببێتەوە و سوێندم دا و گوتم: 'ئەوان هەرچییەک بن، برای منن.' دوایە پەری لە چاولێکدانێکدا منی وە هەوا خست و لە بەردەرکیماڵی خۆمان داینام.

" 'ئیدی دەرگام کردەوە و چووم ئەو سێ هەزار دینارەم کە لەژێر خاک شاردبوومانەوە، دەرهێناوە و لە دووکان دانیشتم.

" 'کاتێک ئێوارە لە دووکان بۆ شێو هاتمەوە ماڵێ. ئەو دوو گەماڵەم دیت لە حەوشە بەسترابوونەوە. هەر کە ئەو دووانە چاویان بە من کەوت، دەستیان بە کلکەسووتە کرد و بە دەورمدا هەڵدەسووڕان و ئەسرین بە چاوەکانیاندا دەهاتە خوارێ. ئەمن نەمدەزانی چی ڕووی داوە. لە ناکاو ئەو کچە هاتە پێشێ و گوتی: 'ئەوانە براکانی تۆن و هەتا دە ساڵ هەر ئاوا دەمێننەوە.' هەر بۆیە من ئەو دوو گەماڵە لەگەڵ خۆمدا دەگێڕم هەتا دە ساڵەکە تەواو بێ و لەو بەڵایە ڕزگاریان بێ. کاتێک بێرەدا هاتم و بەسەرهاتی ئەو پیاوەم دی، لێرە نەڕۆیشتم گوتم بزانم چارەنووسی بە کوێ دەگا.

" 'کاتێک چیرۆکی پیرەکە لێرەدا کۆتای هات، دێوە گوتی: "چیرۆکێکی خۆش بوو. ئەوە لە سێیەکەی دیکەی خوێنی ئەو بازرگانە خۆش بووم.'

### چیرۆکی کابرا پیرە و پەسترەکەی

"کە چیرۆکی پیری دووەم تەواو بوو، پیری سێیەم بە دێوەی گوت: 'ئەمنیش بەسەرهاتێکم هەیە لە بەسەرهاتی ئەو دووانە سەرسووڕهێنەرتر. ڕێم بدە با بیگێڕمەوە، ئەگەر بە دڵت بوو، لە باقی خوێنی ئەو کابرایە خۆش بە.' دێو گوتی: 'بیگێڕەوە.'

"کابرا پیرە گوتی: 'ئەی پاشای دێوان، ئەو پەسترە ژنی من بوو. سەفەرێکم بۆ هاتە پێشێ. ساڵێک بە شاراندا سووڕامەوە. دوای ساڵێک گەڕامەوە، شەو بوو گەیشتمەوە ماڵێ. ژنەکەم دیت لەگەڵ کۆیلەیەکی ڕەشدا خەوتووە. ژنە کە منی دیت، هەستا گۆزەیەکی ئاو هێنا و دۆعایەکی بەسەردا خوێند و بە منیدا کرد. من لە جێوە بووم بە سەگ. ئەمنی لە ماڵێ دەرکرد. لە دەرگا هاتمە دەرێ و بە کۆڵان و شەقاماندا سووڕامەوە؛ هەتا تووشی قەسابییەک بووم، لەوێ کەمێکم ئێسک و شت خوارد. کاتێک قەساب ویستی بەرەو ماڵ

---

[1] . تۆرە: نەوە و نەتیژە، وەچە. ڕەچەڵەک.

بیتەوە، منیش بە دوایدا ڕۆیشـــتم. کە گەیشـــتینەوە بەردەرگای ماڵی قەســـابەکە، کچی قەسـابەکە ڕووی خۆی لێ گرتم و گوتی: 'ئەیرۆ بابە! ئەو پیاوە غەوارەیەت بۆ هێناوەتەوە ماڵێ؟!" قەســـاب گوتی: 'پیاوی غەوارە چی؟ کوا؟' کیژەکەی گوتی: 'ئەو ســـەگە پیاوێکە ژنەکەی جـادووی لێ کردووە و کردوویەتی بە ســـەگ. ئەمن دەتوانم وەک خۆی لێ بکەمەوە.' قەسابە بە کچەی گوت: «دا توخودا چاکی کەوە خێرت دەگاتێ.» کچە گۆزەیەکی ئاو هێنا و ودمی بە سەردا خوێند و بە منیدا کرد. من هاتمەوە سەر بیچمی خۆم و دەست و لاقی کچەم ماچ کرد و تکام لێ کرد بە جادوو ژنەکەی من بکا بە یەســـتر. لەو ئاوە کەمێکی بە من دا و گوتی: 'کاتێک ژنەکەت لە خەودا بوو، کەمێکی لەو ئاوە پێدا بکە. دەبێ بەو شـــتەی دەتهەوێ.' ئیدی منیش ئاوەکەم برد و پێمدا هەڵپرژاند و داوام کرد ببێ بە یەستر. لە ڕێوە بوو بە یەستر، کە یەسترەکە ئەو یەسترەیە. یەستر سەری جووڵاندەوە و وەک ئەوەی بە ئاماژە قسەکەی بسەلمێنێ. دێوە لەوپەڕی سەرسووڕماندا کەیفی ساز بوو و لە خوێنی بازرگان خۆش بوو و ئازادی کرد."

کە شەهرزاد چیرۆکەکەی گەیشتە ئێرە، بوو بە ڕۆژ و بێدەنگ بوو. خوشکە چکۆلەکەی، دنیازاد، گوتی: "دێدە، چیرۆکێکی خۆش بوو." شـــەهرزاد گوتی: "ئەگەر بمێنم و پاشـــا نەمکوژێ، سبەیشەو چیرۆکی ڕاوچیتان بۆ دەگێڕمەوە کە زۆر لەوەش خۆشترە." پاشا لە دڵی خۆیـدا گوتی: "چیرۆکێکی خۆش بوو. دەڵێم، نەیکوژم تـا چیرۆکەکەی دیکەش تەواو نەکا."

کە خۆر هاتە سەرێ، پاشا چووە دیوان و خەریکی کاروباری وڵاتداری بوو. درەنگانێک لە دیوانەوە چووەوە حەرەمسەراکەی.

## کە شەوی سێیەم هاتەوە

### چیرۆکی ڕاوچی

شـــەهرزاد گوتی: "خاوەنشـــکۆ، دەگێڕنەوە ڕاوچییەکی گەڕاوە[1]، ژنێک و ســـێ منداڵی هەبوو، لە دنیادا چی شـــک نەدەبرد. هەموو ڕۆژێک دەچوو بۆ قەراخ دەریا و لە چوار جاریش زیاتر تۆڕی لە ئاو نەدەهاویشت.

"ڕۆژێکیان چووە قەراخ دەریا و تۆڕی لە ئاو هاویشــت و ســەعاتێک ڕاوەســتا. پاشــان ویستی تۆڕەکەی دەرکێشێ، دیتی زۆر قورسە. زۆری هێز لە خۆی دا، بۆی دەرنەکشا. لە قەراخ دەریاکە ســـینگێکی داکوتا و تۆڕەکەی لێ بەســـتەوە و بۆخۆی چووە ئاوەکەوە. ئەوەندی هێزی تێدا بوو، هەوڵی دا و داوەکەی دەرکێشـــا دەرێ. تەماشـــای کرد کەلاکی کەرێک بە داوەکەوە بووە. مات بوو، گوتی: 'تەمەشـــا ئەو بەشـــەی بە قســـمەت من بووە.' ئیدی دیسان داوەکەی لە ئاوەکە هاویشتەوە و ماوەیەک ڕاوەستا. کاتێک ویستی داوەکەی دەرکێشێ، دیتی لە جاری دیکە قورسترە. گوتی: 'ڕەنگە ماسییەکی گەورەی پێوە بووبێ.' بۆی چووە نێو ئاوەکەوە، بە هەزار زەحمەت و دەردیســـەر دەریکێشـــا. ســـەیری کرد کە کووپەیەکی گەورەیە. پڕە لە خیز و گڵ. بە ناڕەحەتییەوە گوتی:

'ئەگەر بەخـــتەوەری، بە زۆر وەگـــیر کەوتـبـا<br>ئـاوی حەیـات دەبـوا بـۆ ئەســـــکەنـدەر بـووبـا'

"ئیدی کووپەکەی شـــکاند و تۆڕەکەی لە دەریا هاویشـــتەوە. پاش ماوەیەک تۆڕەکەی دەرکێشا، دیتی شووشە و سواڵەتی پێوە هاتووە، ئەو شێعرەی خوێندەوە:

'ئەگەر بە هەوڵ و تێکۆشـــان، کارێکت بۆ ڕانەپەڕا<br>لە بەرژەوەندی خۆتدایە، ئەو کارە بســـپێری بە خودا'

"دوای ئەوە ســـەری بەرەو ئاســـمان بەرز کردەوە و گوتی: 'خودایە! من لە چوار جار زیاتر تۆڕ لە ئاو ناهاوم و ئەوەش جاری چوارەممە.' ئیدی نێوی خودای هێنا و تۆڕەکەی هاویشتەوە نێو ئاوەکە.

ماوەیەک تێپەڕی، ویســـتی دەریبهێنێتەوە، دیتی زۆر قورســـە. دیســـان تۆڕەکەی بە

[1]. گەڕاوە: کەسێک تەمەنی ماماوندی تێپەڕاندووە و پیری هەنگاو دەنێ.

سینگێکەوە بەستەوە و و خۆی لە دەریاکە هاویشت. بە هێز و قووەتێکی زۆرەوە تۆڕەکەی دەرکێشا دەرێ. سەیری کرد ئەوە کووپەیەکی فافۆنە کە سەرەکەیان بە قەلایی و بە مۆری حەزرەتی ســـولەیمان مۆر کردووە. کە ماســـیگرەکە ئەوەی دیت، دڵی گەشـــاوە و بە کەیفسازییەوە گوتی: 'دەبێ سـەرەکەی بکەمەوە.' بە کێردێک قەلاییەکەی لەسـەر فافۆنەکە لا برد و سـەرەونخوونی کرد. کەمێکی ڕاوەشـاند بۆ ئەوەی ئەگەر شـتێکی تێدا بێت بڕژێتە خوارێ. دوکەڵێکی لێ هاتە دەرێ و بەرەو ژوور هەڵکشا.

"ڕاوچی سەری سووڕ ما و بە حەپەساوی لە دووکەڵەکە ڕاما تا ئەوەی کە لە ئاسماندا لە شوێنێکدا کۆ بووەوە و لە نێو ئەو دوکەڵەدا دێوێک هاتە دەرێ. دێوە سـەری لە هەوران دەخشـــا. ڕاوچی کە ئەوەی دیت، لە ترســـاندا دەلەرزی و تفی لە زاریدا وشـک بوو. بەلام دێوەکە کە ڕاوچییەکەی دیت، دەســـتی کرد، بە باســـی بێهاوتابوونی خودا و حەزرەتی سولەیمان و، گوتی: 'پێغەمبەری خودا، من مەکوژە. لەمە بەدوا بێفەرمانی تۆ ناکەم.' ڕاوچی گوتی: 'هۆی دێوەکە، ئێستا ئاخرزەمانە و هەزار و هەشتسەد ساڵ لە زەمانی سولەیمان تێپەڕیوە. بۆم بگێڕەوە بزانم چت بەسەر هاتووە.'

"دێوە کە گوێی لە ڕاوچییەکە بوو، گوتی: 'هۆی تۆ کێی؟ ئێستا دەتکوژم.' ڕاوچی گوتی: 'ئەوە پاداشی ئەوەیە، تۆم لەو زیندانە ڕزگار کرد؟' دێوە گوتی: 'بەڵێ، چونکە تۆ دەبێ هەر بمری. ئێســـتا بڵێ بزانم چۆنـت بکوژم؟' ڕاوچی گوتی: 'تـاوانی من چییە کە دەبێ هەر بکوژرێم؟' دێو گوتی: 'گوێ لە بەسـەرهاتی من بگرە.' ڕاوچی گوتی: 'باشـە بیگێڕەوە، بەلام زۆری درێژە مەدەیە کە لە ترسان خەریکە گیانم دەرچێ.'

دێوە گوتی: "من و 'سـەخرولجن' نافەرمانی سولەیمانمان کرد و باوەڕمان بە خوداکەی نەکرد. ئەو 'ئاســـەفی‌کوڕی بەرخیا'ی وەزیری خۆی ناردە شـــوێن من و منی بردە لای ســـولەیمان. پەرسـتن و گوێڕایەڵییان لە من ویسـت. ئەمن نافەرمانیم کرد. ئیدی داوای ئەو خومرەیەی کرد، بۆیان هێنا و منی لەوێ خســـت و بە قورقوشـــم زارکەکەی دادا و مۆری کرد. فەرمانی دا لە دەریایان هاویشتم.

" 'حەوتسەد ساڵ لەبن دەریادا مامەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: 'هەرکەس من ڕزگار بکا، لە ماڵی دنیا بێ نیازی دەکەم.' کەس منی لەو دۆخە ڕزگار نەکرد. حەوتســـەد ســـاڵی دیکە مـامەوە، لە دڵی خۆمـدا گوتم: 'هەرکەس ڕزگـارم بکـا، دەرکی تەواوی خەزێنەکـانی دنیای بە ڕوودا دەکەمەوە.' کەس منی ڕزگار نەکرد. چوارسـەد سـاڵی دیکە مامەوە، لە دڵی خۆمـدا گوتم: 'هەرکەس من ڕزگـار بکـا. بە هەر شـــێوەیەک ئەو بۆخۆی پێی خۆش بێ، دەیکوژم. لەو فکرانەدا بووم کە تۆ منت هێنا دەرێ و مۆرت لە خومرەکە کردەوە. ئێســـتا بڵێ بزانم چۆنت بکوژم؟'

"ڕاوچی کە ئەوەی بیست، واقی وڕ ما و دەستی بە گریان کرد و لە بەری پاڕاوە کە بیبەخشێ. دێوەکە گوتی: 'بێجگە لە کوشتن ڕێگایەکمان نییە.'

"ڕاوچی کە مەرگی هاتە بەرچاو، گوتی:

دۆستی خۆشەویست، بۆ بوویە دژمن
بۆ دەبوو تۆ وا بکەی لەگەڵ من
من تەواو پشتم بە تۆ بەستووە
ئەتۆ و کوشتنی منیان نەگوتووە

"دێو گوتی: 'دڵ بە دنیا مەبەستە، چونکە بێجگە لە مردن، ڕێگایەکت نییە.' ڕاوچی لە دڵی خۆیدا بە خۆی گوت: 'تۆ مرۆڤی و ئەو تۆرەمەی جنۆکە. تۆ دەبێ لە بیر کوشتنیدا بی.' ئیدی بە دێوەکەی گوت: 'ئێستا کە هەر دەمکوژی، تۆ ئەو خودایە پێم بڵێ ئەتۆ بەو قەلافەتەوە چۆن لەو کووپەیەدا جێگات بووەتەوە؟' دێو گوتی: 'یانی تۆ گومانت هەیە کە من لەو کووپەیەدا بووبم؟' ڕاوچی گوتی: 'هەتا بە چاوی خۆم نەیبینم، باوەڕ ناکەم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چوارەم هاتەوە

"گوتی: 'خاوەنشـــکۆ، کە ڕاوچی بە دێوی گوت تا بە چاوی خۆم نەیبینم باوەڕ ناکەم، دێوە بوو بە دووکەڵ و بەرەو ژوور هەڵکشـــا و لوول بووەوە بۆ ناو کووپەکە. ڕاوچی بە لەز مۆرەکەی بە ســەر کووپەکەدا گرتەوە و بانگی دێوەکەی کرد و گوتی: 'ئێســتا چت لێ بکەم؟' دێوە ویســـتی بێتە دەرێ، کەچی نەیتوانی. زانی ڕاوچییەکە بەندی کردووە و مۆری سولەیمانی پێغەمبەری لەســەر داوەتەوە. ئیدی ڕاوچی کووپە فافۆنەکەی هەڵگرت و بردییە قەراخ دەریـاکە. دێوە گوتی: 'دەتهەوێ چ بکەی؟' گوتی: "دەمهەوێ بتخەمە دەریـاوە تـا هەتایە لەوێدا بمێنییەوە.' دێوە هاواری کرد: 'مۆرەکە لە ســەر کووپەکە لا بە و ئازادم کە تا خەڵاتێکی باشـــت وە گیر کەوێ.' ڕاوچی گوتی: 'درۆ دەکەی. ئەو چیرۆکەی ئێمە وەکوو چیرۆکی وەزیری یوونانشا و حەکیم ڕوویان دەچێ، کە ئەویش ئاوا بوو:

### چیرۆکی یوونانشا و حەکیم ڕوویان

" 'لە وڵاتی فورس و ڕوویان پاشـایەکی لێ بوو، یوونانشـایان پێ دەگوت. ئەو پاشـایە تووشـــی نەخۆشـــی گولی ببوو. بە جۆرێک کە حەکیم و نۆشـــدارانی زەمانی خۆی لە چارەســـەربوونی دڵســـارد ببوون. ڕۆژێک حەکیمێکی پیر و بە نێوەوەچوو ڕێی کەوتە ئەو شارە. حەکیم ڕوویانیان پێ دەگوت. حەکیم ڕوویان شارەزای زمانەکانی یوونانی و ڕۆمی و عەرەبی و فارســـی بوو، هەروەها زانیاری لەســـەر تایبەتمەندی چاک و خراپی هەموو جۆرە گژوگیا و گەڵایەک بوو.

" 'وا بوو حەکیم چەند ڕۆژێک لەوێ ماوە و بیستییەوە کە پاشا گول بووە و نۆشداران و حەکیمان ناتوانن چارەسەری بکەن. هەستا چوو بۆ لای پاشا و کوڕنۆشی بۆ برد و پێی ڕاگەیاند کە حەکیم و نۆشدارە و گوتی: 'گەورەم، بیستوومە جەستەت ناساخە و تا ئێستا بۆیـان چـاک نەبووەتەوە. ئەمن دەمهەوێ چـارەســـــەرت بکەم، بەبێ ئەوەی گیراوەیەکت دەرخوارد بدەم و ڕۆنت پیا بساوم.'

" 'یوونانشـــا پێی ســـەیر بوو، گوتی: 'جا چلۆن دەتوانی بەبێ داوودەرمان چارەســـەر بکەی؟ ئەگەر وەها کارێکت پێ بکرێ، ئەوە لە ماڵی دنیا بێ نیازت دەکەم و هەر ئاواتێکی هەتبێ، وەدی دێنم. بەڵام چ ڕۆژ و سەعاتێک چارم دەکەی؟ حەکیم، تۆزێک لەو کارەدا پەلە بکە!' حەکیم کوڕنۆشی برد و گەڕاوە ماڵێ، خۆی بۆ چارەسەرکردنی ئامادە کرد.

" 'ڕۆژی دوایی هاتەوە لای پاشـا و گوتی: 'ئەورۆ دەسـت دە گۆ و گۆچانەکەت و بڕۆ

بۆ گۆڕەپانی گۆیێن.' کاتێک پاشـــا بە گۆ و گۆچانەکەیەوە چووە گۆڕەپان، حەکیم ڕوویان هاتە لای و دەرمانێکی دایە و گۆچانەکەی لێ وەرگرت و گوتی: 'ئاوا بیگرە و هەتا هێزت تێدایە لێی دە تا دەســتت ئارەق دەکا و وردەوردە تەواوی گیانیشــت شــەلاڵی ئارەق دەبێ. پاشــــان بچووەوە لە ماڵێ ئاوێک بە خۆتدا بکە و پاش گەرماوەکە تاوێک بخەوە و بزانە وردەوردە لە دەســـترا دەســـت بە چاک بوونەوە دەکات و هەموو گیانت چاک دەبێتەوە و تەواو بوو.'

" 'پاشـــای یوونان لەڕێوە ســـوار بوو، گۆچانەکەی بە دەســـتەوە گرت و بەردەوام لە گۆیەکەی دا. تا وای لێ هات دەســـــت و لەشـــی تەواو ئارەقی کرد. حەکیم ڕوویان زانی دەرمانەکە کاری خۆی کردووە، گوتی: 'ئێستا یەکسەر بڕۆوە ئاوێک بە خۆتدا بکە و پاشان لێی بخەوە.'

" 'پاشا گەڕاوە ماڵێ و یەکسەر چووە گەرماوەکە بۆ خۆ شوشتن. هاتە دەرێ و خەوت. کاتێک لە خەو هەستا، دیتی تەواو چاک بووەتەوە. لەشی وەک جاران سپی‌سپی بووەتەوە. ئیدی دڵخۆش و شادمان بووەوە.

" 'ڕۆژێکی دیکە حەکیم هاتەوە بارەگا و کوڕنۆشی برد و ڕوو بە شانشینەکە ڕاوەستا و گوتی:

جەســـــتەت پێویســـــتی بە نۆشـــــدار نەبێ
بێ وەی بێ و هیچکات، بارت لار نەبێ
ســـــــلامەتـــی تـــۆ، ڕەحـــمەتە بـــۆ مە
خەزان مـــیـــوانـــی، شـــــای بەهـــار نەبـــێ

" 'حەکیم شـیعرەکەی تەواو کرد. پاشـا هەسـتا حەکمی لە ئامێز گرت و لە پەنا خۆیدا داینا. دوای ئەوە سفرە ڕاخرا و خواردەمەنی جۆراوجۆر داندرا و دانیشتن نانیان خوارد. تا درەنگانێک خەریکی قسەوباس و خواردنەوە بوون. ئەوجار پاشا دووهەزار دیناری زێڕ و دیاری گرانبایی دا بە حەکیم. حەکیم گەڕاوە ماڵێ و پاشـاش بە دڵێکی خۆشـەوە دانیشت و سپاسی ئەو چاکەیەی دەکرد کە حەکیم لەگەڵی کردبوو.

" 'ڕۆژی دواتر پاشا چووەوە دیوەخان، حەکیمیش هاتە بارەگا کوڕنۆشی برد. پاشا لە لای خۆیەوە داینا. کە حەکیم ویســـتی بگەڕێتەوە، پاشــــا هەزار دیناری زێڕ و دیاری و خەڵاتێکی زۆری دایە. نێوانی پاشا و حەکیم ئاوای لێ هات.

" 'بەڵام وەزیری پادشا پیاوێکی بەرچاوتەنگ و ناجسن بوو. کاتێک ئەو دیاری و چاکە

و بەخشینەوەیەی دیت کە پاشا لەگەڵ حەکیمی دەکرد. ئێرەیی پێ برد و ڕقی لێ هەڵگرت. هەستا چووە خزمەت یوونانشا و کوڕنۆشی بۆ برد و گوتی: 'گەورەم، پاشا، دەست و پێوەند و پیاوەکانی تۆ لەســـەریانە لەوەی دەیبینن، جەنابت ئاگادار کەنەوە و ئەگەر پێشـــنیارێکی باشـــیان بە زەیندا بێ، بیدرکێنن.' پاشـــا گوتی: 'بڵێ بزانم چی بووە.' وەزیر گوتی: 'پێشـــینیان گوتوویانە هەرکەس دواڕۆژی خۆی لە بەرچاو نەگرێ، ماڵوێران دەبێ. ئەمن زۆر نیگەرانم لەوەی کە دەبینم پاشا بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، بە بەخشش و چاکە لەگەڵ دژمن و نەیاری خۆی دەکا و چاڵ بۆ خۆی هەڵدەقەنێ.' پاشـــا کە گوێی لەوە بوو، وێک هات و ڕەنگی پەڕی. لە وەزیری پرســـی: 'کێ نەیارە؟' وەزیر گوتی: 'حەکیم ڕوویان دژمنی قەستەسەری پاشایە.' پاشا گوتی: 'چۆن ئەوە نەیاری منە لە کاتێکدا ئاوا بە ئاسانی منی لەو هەمووە ئێش و ئازار و ناڕەحەتییە ڕزگار کرد؟ ئەگەر ئەو بکەمە شەریکە وڵات و پاشایەتییەکەشم، هێشتا ناتوانم وەڵامی یەک لە سەدی چاکەکانی بدەمەوە. پێم وایە هەر لەبەر ئێرەیی خۆت وا دەڵێی و دەڵێی بەشـــکم بیکوژێ. پاشـــان پەشـــیمان بمەوە هەروەک چۆن سیندبادپاشا پەشیمان بووەوە.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی پێنجەم هاتەوە

## چیرۆکی سێندبادپاشا

شـەهرزاد گوتی: "خاوەنشـکۆ، وەزیر گوتی: 'بەسـەرهاتی سـێندبادپاشـا چۆنە؟' گوتی: 'دەگێڕنەوە یەکێک لە پاشاکانی ولاتی پارس هەمیشە دەچوو بۆ ڕاو و سەیرانی پێ خۆش بوو. بازێکی هەبوو بۆخۆی دەسـتەمۆی کردبوو، شـەو و ڕۆژ لەگەلی بوو، لێی دوور نەدەکەوتەوە. قاپیلکەیەکی زێڕینی بۆ بازەکەی ساز کردبوو. بە ملیدا دەکرد، کاتێک تینووی دەبوو لەو قاپیلکەیە ئاوی دەخواردەوە.

" 'ڕۆژێک پاشـا، بازەکەی بە دەسـتەوە گرت و لەگەڵ پیاوەکانی چوو بۆ ڕاوگە، بۆسـەیان ناوە و مامزێک کەوتە ناو بۆسـەکەیانەوە. پاشـا گوتی: 'مامزەکە لەلای هەر کەسـەوە دەرچێ، دەیکوژم.' پیاوەکانی دەوری مامزەکەیان دا. مامز هات بۆ لای پاشـا و جیفرکی لە خۆی دا و بەسـەر پاشـادا بازی دا و دەرچوو. پیاوەکان چاویان لە یەکتر کرد. پاشا بە وەزیری گوت: 'دەڵێن چی؟' وەزیر گوتی: 'پاشا بۆخۆت فەرمووت مامزەکە بەلای هەرکەسدا دەربچێ، دەیکوژم. ئێستا مامزەکە لەلای تۆوە دەرچووە.'

" 'پاشـا گوتی: 'دوای مامزەکە دەکەوم، هەتا نەیگرم نایەمەوە.' ئیدی کەوتە شـوێن مامزەکە. بازەکە لەسـەر سـەری مامزەکەی نیشـت و ئەوەندەی بە دندووک لە چاوەکانی مامزەکە دا هەتا کوێری کرد و نەیتوانی هەڵێ. ئەو جار پاشـا گەیشـتێ و مامزەکەی سـەر بڕی و خستییە پاشـکۆی خۆی. زۆری تینوو بوو. چووە ژێر سـێبەری دارێک، دیتی ئەوە تکەتکە ئاو لە درەختەکەوە دەتکێ. قاپیلکەکەی لە ملی بازەکە کردەوە و پڕی کرد لە ئاو ویسـتی بیخواتەوە، بازەکە باڵێکی لە قاپیلکەکە دا و ڕشـتی. پاشـا دیسـان قاپیلکەکەی پڕ کردەوە و وەیزانی بازەکە توونییەتی بۆی بردە پێشێ، دیسان باڵێکی لێ دا و ڕشتی. پاشا دیسـانەوە پڕی کردەوە و بردی بۆ لای ئەسـپەکە. بازەکە ئەو جاریش باڵێکی لێدا و ڕشتییەوە. پاشا توورە بوو، گوتی: 'نە بۆخۆت ئاوت خواردەوە نە هێشتت من و ئەسپەکە بیخۆینەوە.' ئیدی چەقۆیەکی دەرهێنا و باڵی کرد. بازەکە بە ئاماژە پاشای تێگەیاند چاوێک لەسەر دارەکە بکە. پاشا چاوی لەسەر دارەکە کرد. مارێکی دیت کە تکەتکە ژەهر لە زاری دەتکا خوارێ. ئینجا لە باڵکردنی بازەکە پەشـیمان بووەوە و بازەکەی بە دەسـتەوە گرت و گەڕاوە قۆناخەکەی خۆی. مامزەکەی بە بەرپرسـی چێشـتخانە سـپارد و بۆخۆی لە سـەر تەخت دانیشـت. بازەکەشـی بە دەسـتەوە گرت. دوای ئیسـتێک بازەکە قیژەیەکی لێ هات و مرد. پاشا مات و مەلوول و پەشیمان بوو.'

"کە چیرۆکەکەی یووناندشا گەیشتە ئێرە، وەزیر گوتی: 'پاشا ئەگەر بە گوێی من بکەی،

ڕزگارت دەبێ، دەنا تێدا دەچی، هەر وەکوو چۆن وەزیر فێڵی لە کوڕی شـا کرد و بۆخۆی تێدا چوو.' پاشا گوتی: 'ئەو چیرۆکە کامەیە؟'

### چیرۆکی وەزیر و کوڕی پاشا

"وەزیر گوتی: 'بیستوومە پاشایەک لە پاشاکان کوڕێکی هەبوو. کوڕە ویستی بچێ بۆ ڕاو، پاشا وەزیری لەگەڵ نارد. ئەوان کە هەر وا لە نێچیر دەگەڕان تووشی مامزێک بوون. وەزیر گوتی:'ئەو مامزە بگرە.' شـــازادە ئەســـپەکەی تاو دا. مامزە وەک تیر دەرچوو، شـــازادەش بە دوایدا تا لە چاو ون بوون. شـــازادە مامزەکەی لێ ون بوو. لەو بێروونەدا ســـەرگەردان مابووەوە و نەیدەزانی بۆ کامە لا بچێ. لەو کاتەدا کچێکی دی دەگریا. پێی گوت: 'ئەتۆ کێی و بۆچی دەگری؟" کچە گوتی: 'ئەمن کچی پاشـای هێند بووم. سـوار بووم و چووم بۆ ڕاو، خەوم لێ کەوتبوو لەسـەر ئەسپ کەوتبوومە خوار. کە هاتمەوە سـەر خۆ و هەســـتامەوە پێم ســـەیر بوو، نەمدەزانی لە کوێم و دەبێ بەرەو کام لا بڕۆم. ئیدی لێرە ماومەوە.' شـازادە بەزەیی پێیدا هات و هەڵی گرت و خسـتییە سـەر زینەکەی و ڕۆیشـتن، ڕۆیشـــتن تا گەیشـــتنە دوورگەیەک. کچە داوای لە شـــازادە کرد لە زینەکە دایبەزێنێ. کە دایگرتە خوارێ، دیتی ئەوە دێوەزمەیەکی گەورەیە و هەرای منـداڵەکـانی دەکـا و دەڵێ: 'وەرن مرۆڤێکی قەڵەوم بۆ هێناون بیخۆن.' شـــازادە کە ئەوەی بیســـت، دەســـتی لە خۆی شـوشـت و لە ترسـان تەواوی گیان کەوتە لەرزە. دێوەزمە گوتی: 'بۆ دەترسـی؟ مەگەر تۆ شـازادە نی؟ بۆچی بە سـامانی بابت خۆت لە دەست دژمنت ڕزگار ناکەی؟' شـازادە گوتی: 'دژمنی من هەر گیـانی منی دەوێ، زێڕی نـاوێ.' دێوەزمە گوتی: 'بۆچی هـاواری خودا ناکەی.' شـــازادە ســـەری بەرەو ئاســـمان هەڵێنا و گوتی: *"ئەی ئەو کەســـەی هەر کات لێقەومـاوێک هـانـات بۆ بێنێ بە هـانـایەوە دێی، ئەوەم لە کۆڵ بکەوە. چونکە تۆ هەرچی بتهەوێ، لە دەسـتت دێ."* ١ *دێوەزمەکە کە ئەوەی بیســت، لەســـەر ڕێگای شـازادە لا چوو.*

---

١. قَالَ تَعَالَى: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ۝٦٢ ﴾ النمل: ٦٢

واتا: ئایا ئەو شتە هیچ لەبارا نەبوانەی بێ گیانو هەستن باشن بۆ خودایەتیو شیاوی پەرستش بۆ کردنن؟ یان ئەو خودایەی بەهانای لێ قەوماوو داماوانەوە دێ ئەگەر هاواری لێ بکەن، ناخۆشـــیو تەنگانەو بەلایان لەســـەر لادەباو دەیانکاتە جێگرو میراتگریی پێشـــینان، چین لەدوای چین دەیانکاتە میراتگریی یەکتریی! ئایا دەگونجێ ئەو خودایەی ئەوە زاتو صـــیفاتێ خودایەکی تری لەگەڵ دا بێ؟! ئایا جگە لەخودای زاناو داناو بەتوانا کەسێکی تر هەیە ئەو کردەوەو صیفاتانەی لێ بوەشێتەوە؟ کەسێکی تر هەیە شیاوی لێ پاڕانەوەو عیبادەت بۆ کردن بێ؟ ئای چەند بەکەمی یادی نیعمەتەکانی خوا دەکەنەوە، چەند ســـپڵەو پێ نەزانن؛ چەند غافڵو بێ ئاگان لەوکەسەی شارەزاییتان دەکا بۆ ڕێبازی حەقو ڕاستو زەوی بۆ ڕام کردون، هۆکاری تێدا

شازادە گەڕاوە لای بابی و بەسەرهاتی وەزیری بۆ بابی گێڕاوە.

" 'پاشـا، ئێستا تۆش ئەگەر بە قسەی حەکیم ڕوویان بکەی، ئەوە پیلانێک بۆ کوشتنت دادەڕێژێ و بەو زووانە دەکوژرێی. هەروەک چۆن بیری بۆ چـاکبوونەوەت کردەوە. یوونانشـا گوتی: 'ڕاسـت دەکەی، ئەو چۆن توانی ئاوا بە ئاسـانی من لە نەخۆشـی گولی ڕزگار بکا. ئاواش دەتوانی چەپکە گوڵێکم بداتێ بۆنی پێوە کەم و لە عەرزیم بدا. ئێستا بڵێ بزانم، چ بکەم باشـە؟' وەزیر گوتی: 'بیکوژە و با لە دەسـتی ڕزگارت بێ. پێش ئەوەی ئەو پەندێکێت بەسـەر بێنێ، ئەتۆ دەسـتی خۆتی لێ بوەشـێنە و تەواوی کە!' لە ڕێوە یوونانشـا حەکیم ڕوویانی بانگ کرد. حەکیم ڕوویان هات و کورنۆشی بۆ برد. تەخت و شاقەلی ماچ کرد و گوتی:

شـــای شـــایانــی تــۆ، خــودا یــارت بــێ<br>
خــۆشــــبەخــتــی ژیــان، لە ســـەر خــوانــت بــێ<br>
ســـــەرکەوی دایــــم بە ســــــەر دژمــــنـــــدا<br>
دژمـــن پـــێ مـــلـــی تـــۆ و بـــڕیـــارت بـــێ

" 'دیسان پێیدا هەڵگوت:

دەمار بفرۆشـــە بەســـەر شـــایاندا کە شـــایانی تۆ<br>
خۆ بگرە لە ئـاسـت میرانی تردا، میر میرانی تۆ<br>
خەمی شـــەڕ مەخۆ ســـەرکەوتنی تۆ ســـوور و عەیانە<br>
چون ویستی مەحموود، سنووری نییە و هەموو جیهانە

" 'دیسانەکە گوتی:

زۆر ژیـری تـۆ، هـاوتـات نـیـیە بـۆ وردبـیـنـی<br>
پـاڵەوانـی تـۆ لـێـت جـوانە ڕمـپ وەشـــێـنـی<br>
هـیـمـەتـی تـــۆ لە بەرزیـدا وەک هەتــاوە<br>
هەرچـیـت بـوێ لە بەر دەســتـتـدا تـولاوە

" 'کە حەکیم ڕوویان شـیعرەکانی تەواو کرد، پاشـا گوتی: 'دەزانی بۆ تۆم بانگ کردە ئێرە؟' حەکیم گوتی: جگە لە خوا کەس ئاگای پێوار نییە.[١] پاشـا گوتی: 'تۆم بۆ کوشـتن

---

ژیانی بۆ رەخساندون.

[١]. واتە: ' لا یعلم الغیب إلا الله تعالی'

بانگ کردووە.' حەکیم بەو قسـەی سـەری سـوورِ ما و حەپەسا. گوتی: 'بە چ تاوانێک بە تەمای بمکوژی؟' پاشـا گوتی: 'تۆ سـیخوڕی[1] و بە تەمای کوشـتنی من هاتووی. پێش ئەوەی تۆ من بکوژی، ئەمن تۆ دەکوژم.' لەو جەنگەیەدا پاشـا شـیروەشـێنی بانگ کرد و ئاماژەی بۆ کوشتنی کرد. حەکیم گوتی: 'من مەکوژە، با خودا تۆ نەکوژێ.' پاشا گوتی: 'تا تۆ نەکوژم، دڵم ناحەسـێتەوە و لە ئەماندا نابم. هەردەم دەترسـم بە شـتێکی هیچ لە نێوم بەری. هەروەک چۆن گۆچانت دا دەستم و منت لە دەست گولی ڕزگار کرد.' حەکیم گوتی: 'پاشا، جوابی چاکەی من ئەوە نییە.' پاشا گوتی: 'چار نییە، دەبێ بکوژرێی.' حەکیم ڕوویان کە لێی ڕوون بوو دەکوژرێ. نارەحەت بوو، دەستی کرد بە گریان و لەو چاکەیە پەشیمان بووەوە کە لەگەڵ پاشای کردبوو و گوتی:

لەم ئـاخـری زەمـانەدا قـاتـی و قـڕیـی وەفـایە
جێی زانـا و بلیمەتـان، سـووچ و کونج و پەنـایە
تـۆ خـافـلـی لە زەمـان، هەر ئەویش قـاتـلـی تـۆیە
زانـا و مەزن لـێ کەوتـوون، ڕۆژ ڕۆژی بەرەڵایە

" 'ئینجا شیروەشێن چووە پێشێ و هەڵی کێشا شیرەکەی، چاوەڕێی فەرمانی کوشتن بوو.

حەکیم ڕوویان گریا و بە پاشای گوت:

ئەی کە بەسـەر خەڵکەوە سـێبەری پەروەردگـار
شـیـاوی لێخۆشـبوونم، خۆش بە لە منی هەژار

" 'دوای ئەوە گریا و گوتی: 'پاشا، پاداشی من ئەو نییە، ئەو پاداشەی تۆ دەیدەیەوە بە من، وەکوو پاداشـی نەهەنگەکە وایە کە دای بە ڕاوچییەکە.' پاشـا گوتی: 'چیرۆکی نەهەنگ و ڕاوچی چۆناوچۆنە؟' حەکیم گوتی: 'پاشا! چۆن لەژێر تیخی شمشێردا چیرۆکم بۆ دێ؟ ئەتۆ لە منی غەوارە خۆش بە، خوداش لە تۆش خۆش دەبێ.' لەو دەمەدا یەکێک لە گەورەکانی دەربار پایەی شانشینی پاشای ماچ کرد و گوتی: 'ئەی پاشا، تکایە لێی خۆش بە ئێمە نافەرمانیمان لەو نەدیوە.' پاشـا گوتی: 'ئەگەر من ئەو نەکوژم، خۆم دەکوژرێم. ئەوێک کە دەتوانێ بە گۆچانێک من لەو نەخۆشـییە پیسـە ڕزگار بکا. دەشـتوانێ چەپکە گوڵێکم بداتێ بۆنی پێوەکەم و تێکەوە بگلێم. من پێم وایە ئەو شـۆفارێکە و هاتووە بۆ کوشتنی من. ناچارم بیکوژم.'

---

[1]. سیخوڕ: جاسووس، شۆفار.

" 'حەکیم کە زانی هەر دەکوژرێ، گوتی: 'پاشـــا، ئێســـتا کە قوڵت لە کوشـــتنی من هەڵماڵیوە، ڕێم بدە هەتا ماڵێ بچم و وەســـییەت بکەم و کتێبێکی هەڵبژاردەم هەیە دەیهێنم بە دیاری دەتدەمێ." پاشا گوتی: 'چۆن کتێبێکە؟' حەکیم گوتی: 'ئەو کتێبە سوود و قازانجی زۆرە. کەمترین ســـوودی ئەوەیە کە دوای ئەوەی من ســـەر دەبڕدرێم، پاشـــا ئەو کتێبە بکاتەوە لەلای چەپەوە سێ دێر بخوێنێتەوە، ئەو دەم سەری من وە قسە دێ و، پاشا هەر پرســـیارێک بکا، خێرا وەڵام دەداتەوە.' پاشـــا ئەو قســـەیەی پێ ســـەیر بوو. حەکیمی بە داروغەیەک سپارد، ڕێیدا بچێتەوە ماڵێ.

" 'حەکیم چووەوە ماڵی خۆی. دوو ڕۆژ لە ماڵێ ماوە. ڕۆژی سێیەم هاتەوە کۆشک و لەبەردەم پاشـــا حازر بوو. کتێبێکی کۆن و هەنبانەیەکی چکۆڵەی چەرمینی بە دەســـتەوە بوو. داوای کەشەفێکی١ کرد. لە هەنبانەکە کەمێکی دەرمان ڕشتە سەر کەشەفەکە و گوتی: 'ئەو کتێبە بگرە و ئەگەر سـەری منیان بڕی، ئەمر بکە لەســـەر ئەو کەشـــەفەی دانێن و لەو دەرمانە لێی دەن با خوێنەکەی ڕاوەســـتێ. دوایە کتێبەکە بکەوە، ســـێ دێری لێ بخوێنەوە، ئیدی هەر پرسیارێکت هەیە لەو سەرەی منی بکە.'

" 'پاشـــا کتێبەکەی وەرگرت و ویســـتی بیکاتەوە. دیتی پەڕەکانی کتێبەکە بە یەکەوە نووســـاون. قامکی لە دەمی نا کەمێکی تەڕ کرد و چەند پەڕێکی هەڵداوە. پەڕەکان خۆش لێک نەدەبوونەوە. شـــەش پەڕێکی هەڵداوە یەک دێڕیشـــی نووســـراوە تێدا نەدی. گوتی: 'حەکیم، خۆ دێڕێکم تێدا نەدی.' حەکیم گوتی: 'دەبێ چەند پەڕی دیکە هەڵدەیەوە.' پاشـــا هەر وا بە دمی قامکی تەڕ دەکرد و پەڕەکانی هەڵدەداوە، تا ئاخری ئەو ژەهرەی حەکیم لە کتێبەکەدا دەکاری کردبوو، کاری لە پاشا کرد و یەک بە خۆی هاواری کرد. حەکیم ڕوویان کە ئاوای دیت، گوتی: 'پاشا، پێم نەگوتی:

ئـــاگـــات لە دڵـــی، دڵ بە زامـــان بـــێ
ئـــێشـــــــی زامـــداران، دڵان ڕێـــش دەکـــا
تـــاکـــو بـــۆت دەڵـــوێ، مەئـــێشـــــێـــنە دڵـــێ
دڵـــێکـــی ئـــێشـــــاو، ژیـــن پـــڕ ئـــێش دەکـــا

" 'حەکیم هێشتا بەیتەکەکانی تەواو نەکردبوو، گیانی دەرچوو.'

"کاتێک ڕاوچی چیرۆکەکەی بێرە گەیاند، گوتی: 'دێوەکە، بزانە کە ئەگەر پاشا بە تەمای کوشـــتنی حەکیم ڕوویان نەبا، خودای مەزن ئەوی نەدەکوشـــت. ئەتۆش دێوەکە، ئەگەر نەتویستبا من بکوژی، خودای گەورە تۆی نەدەکوشت.' "

---

١. کەشەف: سینی بچووک.

*لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.*

١

# که شەوی شەشەم هاتەوە

***درێژەی چیرۆکی ڕاوچی***

*شەهرزاد گوتی: "خاوەنشکۆ، ڕاوچی بە دێوەی گوت: 'چونکە تۆ هەڵوێستت گرتبوو من بکوژی، ئێستا من تۆ لەو کووپەیەدا بەند دەکەم و لە دەریات دەهاوم.' دێو کە ئەوەی بیست، دەستی کرد بە گریان و هاتوهاوار و پاڕانەوە. خودای هێنا تکا کە نەیکوژێ و گوتی: 'ئەتۆ بە کرداری خۆم لەگەڵم مەجووڵێوە و خراپەی من بە خراپە پاداش مەدەوە و مەیکە بە نەقڵی 'ئەمامە' و 'عاتیکە.' ڕاوچی گوتی: 'نەقڵی ئەمامە و عاتیکە چییە؟ دا بۆم بگێڕەوە.'*

*"دێوەکە گوتی: 'چۆن دەتوانم لەنێو ئەو کووپەیەدا چیرۆکت بۆ بگێڕمەوە، ئازادم کە با بۆت بگێڕمەوە.' ڕاوچی گوتی: 'ناچارم لە دەریات هاوم تا ئیدی نەتوانی بێیەوە دەرێ. ئەمن زۆرت لە بەر پاڕامەوە و تکام لێ کردی، بەڵام تۆ بەزەییت بە مندا نەهات و هەر لە سەر کوشتنم سوور بووی. ئەوە بە خێر من چاکەم لەگەڵ تۆ کردبوو، ئەتۆش ئاوات پاداش دەدامەوە و دەتکوشتم. ئەوە منیش تۆ لە دەریا دەهاوم و ماڵێکیش لێرە دروست دەکەم و لە قەراخ دەریا دەمێنمەوە. هەرکەس هاتە ئێرە، ئەو ڕووداوەی بۆ دەگێڕمەوە، ناهێڵم کەس دەرت بێنێتەوە. با هەتاهەتا لەو نێوەدا ئێش و ئازار بکێشی.' دێو گوتی: 'ئێستا کاتی گەورەی و جوامێرییە. ئازادم بکە. بەڵێنت دەدەمێ قەتت خراپە لەگەڵ نەکەم و هەتاهەتایە پشتت بەر نەدەم و نەهێڵم پێویستیت بە کەس بێ.'*

*"ئیدی ماسیگر گفتی لە دێوە ستاند و سوێندی پێ خوارد بە خودای میری مەزن و ئەوجار مۆری سەری کووپەکەی لا برد. لەپڕ دوکەڵێک لە کووپەکە هاتە دەرێ و وە حەوا کەوت و لەوێ کۆ بووەوە. دێوێکی ناحەزی لێ هاتە دەرێ و شەقێکی لە کووپە قافۆنەکە دا و لە دەریای هاویشت. کە ڕاوچی دیتی دێوە کووپەکەی لە دەریا هاویشت، مەرگی بە چاوی و خۆی دیت و گوتی: 'لەوە ناچێ ڕزگارم بێ.' دوای ئەوە هاتە لای دێوەکە و گوتی: 'ئەی گەورەی دێوان، ئەتۆ بەڵێنت بە من دا و سوێندت خوارد کە کاری نارەوا لەگەڵ من نەکەی، چونکە خودا تۆڵەی مِنت لێ دەستێنێتەوە.' دێوە پێکەنی و گوتی: 'ڕاوچی، بەدوای مندا وەرە. ڕاوچی خۆی بۆ مردن ساز کرد و هەر ڕۆیشتن، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کێوێک، لە کێوەکە وەسەر کەوتن و لەوێوە دەگەڕان و بەسەر بێروونێکی بێ کۆتاییدا کەوتن. لەو بێروونەدا گۆلاوێکی لێ بوو. دێوەکە لە قەراخ گۆلاوەکەوە ڕاوەستا و بە ڕاوچی گوت: 'تۆڕێک لەو گۆلە هاوێ و چەند ماسی بگرە.' ڕاوچی کە دیتی ماسی سوور و زەرد و سپی و شینی تێدایە، پێی سەیر بوو. تۆڕی لە گۆلەکە هاویشت. دوای ماوەیەک دەری*

*کێشا. چوار ماسی بە چوار ڕەنگی جیاوازەوەی تێدا بوو. ئیدی دێوە بە ڕاوچی گوت: 'ئەو ماسیيانە بەرەوە بۆ سوڵتان تا لە ماڵی دنیایە بێ نیازت کا. گەردنی منیش ئازاد کە ئەگەر ئازارم پێت گەیشتبێ. داوای لێبووردنت لێ دەکەم، چونکە من هەزار و هەشتسەد ساڵ لەنێو دەریادا بووم و نێو خەڵکم نەدیوە. بەڵام تۆ هەموو ڕۆژێ جارێک لەو گۆلە ماسی بگرە.'*

*"ئیدی زەوی قەڵەشی و دێوە لە زەوی ڕۆچوو. ڕاوچی گەڕاوە شار و سەری لە بەسەرهاتی خۆی و دێوە سوورِ مابوو. ئەوجار هاتەوە ماڵێ. دەفرێکی هێنا و پڕی کرد لە ئاو و ماسییەکانی تێ هاویشت. چۆن دێوە پێی گوتبوو ئاوای کرد و چوو بۆ بارەگای پاشا، ماسییەکانی بردە خزمەتی. پاشا کە ماسی ئاوای نەدیتبوو، واقی وڕ ما و گوتی: 'ئەو ماسییانە بدەنە دەست کەنیزە چێشتلێنەرەکە.' ئەو کەنیزەش سێ ڕۆژ لەمەوبەر پاشای ڕۆم بە دیاری ناردبووی و هێشتا هیچی لێنەنابوو. کاتێک ماسییەکانیان دایە دەست کەنیزەکە، وەزیر بە فەرمانی پاشا چوارسەد دیناری زێڕی دا بە ڕاوچی. ڕاوچی زێڕەکانی هەڵگرت و بە دڵێکی خۆشەوە گەڕاوە بۆ ماڵەکەی خۆی.*

*"کەنیزەی چێشتلێنەر ماسییەکانی لە تاوە هاویشت و لەسەر ئاوری دانا تا لایەکیان سوور بووەوە و ئاوری بن تاوەکە هەر دائیسا کە دیتی دیواری چێشتخانەکە قەڵەشا و کچێکی وەک مانگ هاتە ژوورەوە کە لە دەلالییدا شاعر گوتەنی:*

*بەژن و باڵای هێندە ڕێکە، ناز ئێرەیی پێ دەبا*
*لارولەنجەی ڕەوتی ڕۆینی، یەک دەبات و یەک دەخا*

"ئەو کچە چڵە حەیزەرانێکی بە دەستەوە بوو. حەیزەرانەکەی لە تاوەکە دا و گوتی: 'ماسی، گەلۆ هەر وەک جاری جاران لە سەر گفت و بەڵێنی خۆتان ماون؟' کە چێشتلێنەر ئەوەی دی، بێهۆش بوو. کچە هەر ئەوەی دەگوت تا ماسی سەری هەڵێنا و گوتی: 'بەڵێ، بەڵێ.' دوای ئەو تەواوی ماسییەکان سەریان هەڵێنا و گوتیان:

دڵ لە غەیری مە، گەر پاک کەیەوە
هیوای تازەمان وەبەر نێیەوە
بەڵێن بێ ڕووح و گیانمان هی تۆ بێ
فەرمانی ژینمان بە دەستی تۆ بێ

"کچەکە کە ئەوەی بیست، تاوەکەی هەڵگێڕاوە و لە کوێوە هاتبوو، لەوێوە چووە دەرێ. دیوارەکە وێک هاتەوە. کاتێک کەنیشکە وە هۆش هاتەوە، دیتی ماسییەکان سووتاون و خەسار بوون. کەنیزە مات دانیشت و بۆ بەختی خۆی دەگریا و دەیگوت: 'بەزین لە یەکەم شەڕدا باش نییە.' کەنیزە هەر وا لەگەڵ خۆیدا دەدوا کە وەزیر هات بۆ ماسییەکان. کەنیزە دەستی بە گریان کرد و ڕووداوەکەی گێڕاوە. وەزیر پێی سەیر بوو، ڕاوچی بانگ کرد و گوتی: 'لەو ماسییانە چواری دیکەمان بۆ بێنە.' ماسیگر چووەوە سەر گۆلەکە و تۆڕی تێ هاویشت و پاش ماوەیەک تۆڕی دەرکێشا، دیتی دروست وەک جاری پێشوو چوار ماسی ڕەنگاوڕەنگ لەوانی دیکە پێوە ببوون. ماسییەکانی بۆ وەزیر هێناوە. وەزیریش دایەوە بە کەنیزەکە.

"کەنیزە ماسییەکانی هێناوە چێشتخانە و لە تاوەکەی خستن. لە ڕێوە دیوار قەڵەشا و هەمان کەنیشکی خۆرئاسا لە دیوارەکەوە هاتەوە چێشتخانە و چڵە حەیزەرانەکەی لە تاوەکە دا و گوتی: 'ماسی، گەلۆ هەر وەک جاری جاران لە سەر گفت و بەڵێنی خۆتان ماون؟' ماسییەکان سەریان هەڵێنا و هەر ئەو بەیتەیان گوتەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی حەوتەم هاتەوە

شــەهرزاد گوتی: "خاوەنشــكۆ، كە ماســییەكان ئەو بەیتەیان خوێندەوە، كیژە تاوەكەی نخوون كردەوە و لە كوێوە هــاتبوو، هەر لەوێوە وەدەر كەوت. وەزیر كە هــات بۆ ماسییەكان، كەنیزەكەی دیسان ڕووداوەكەی بۆ وەزیر گێڕاوە. وەزیر گوتی: 'ئەوە كارێكی زۆر ســەیرە. ناكرێ لە پاشــا بشــاردرێتەوە.' لە جێوە هەســتا چووە لای پاشــا و ئەوی لە ڕووداوەكە ئاگادار كردەوە. پاشــا گوتی: 'ئەوە دەبێ بۆخۆشــم ببینم.' ئیدی ماســیگریان بانگ كرد و ناردیان بۆ ســەر گۆلەكە. ڕاوچی هەڵات بۆ لای گۆلەكە و خێرا چوار ماســی هێناوە. پاشــا فەرمانی دا چوارســەد دیناریان دا بە ڕاوچی. ئیدی پاشــا بە وەزیری گوت: 'بێنن ســــووریان كەنەوە با بە چاوی خۆم ببینم.' وەزیر فەرمانی دا تاوەیان هێنا و ماســییەكانیان تێ هاویشــت. هێشــتا لایەكیان ســوور نەبووەوە كە دیوارەكە قەڵەشــا و كۆیلەیەكی ڕەش هــاتە ژوورێ و دارێكی بە دەســــتەوە بوو. بە زمــانێكی ڕەوان گوتی: 'ماسـی، گەلۆ هەر وەك جاری جاران لە ســەر گفت و بەڵێنی خۆت ماون؟' ماسـی سـەریان هەڵێنا و گوتیان: 'بەڵێ، بەڵێ' و هەر ئەو بەیتەی پێشوویان گوتەوە. كۆیلەكە هەر بەو دارە تاوەكەی نخوون كردەوە و هەر چوار ماســییەكە ســووتان و كۆیلەكە هەر لەو جێگەیەی لێوەی هاتبوو، چووە دەرێ.

پاشــــا گوتی: 'دەبێ ئەو نهێنییەم بۆ ڕوون ببێتەوە.' هەر لەوێ ڕاوچییان بانگ كرد و پرسیاری شوێنی ماسییەكانیان لێ كرد. ڕاوچی گوتی: 'گۆلێكە لەپشت ئەو كێوەیە.' پاشـا گوتی: 'چەند ڕۆژە ڕێیە.' ڕاوچی گوتی: 'قوربان، زۆر دوور نییە.' پاشــــا پێی ســــەیر بوو، ئەوەندەی پێ نەچوو، ســـپای ســـاز كرد و لەگەڵ ڕاوچی وەدەر كەوتن. ڕاوچی دۆعای لە دێوەكە دەكرد و دەیگوت:

چــاوەڕوانــی چــاكەت لە ڕەســــەنگــڵاو
قەت نەبـێ تـۆ، لەســــەر خـۆت مەنـێ كـڵاو

"ئیدی گەیشـتنە سـەر كێوێك. لەوێرا داگەڕانە بێروونێك كە لە نێوان چوار كێواندا بوو. پاشــا و ســپاكەی لە تەمەنیاندا ئەوێیان نەدیبوو. وا بوو چوونە ســەر گۆلەكە، چوار ڕەنگ ماسییان تێدا دی. پاشا بە سەرسووڕمانەوە لەوێ وێستا و لە سەربازەكانی پرسی: 'ئەرێ تا ئێستا ئەو كانییەتان لێرە دیوە؟' گوتیان: 'نا وەڵڵا!' پاشـا گوتی: 'ئەمن لێرە نابزووم هەتا نهێنی ئەو گۆل و ماســــییانەم بۆ دەرنەكەوێ.' ئینجا وەزیری بانگ كرد. وەزیر پیاوێكی وشیار و زانا بوو. هاتە لای پاشا و كوڕنۆشی برد. پاشا گوتی: 'ئەمن دەمهەوێ ماوەیەك

به تەنیا دانیشم و بیر لە چۆنییەتی ئەو گوڵە و ماسییەکانی بکەمەوە، مەهێڵە کەس بێتە لام، با نەزانن من خەریکی چیم.' وزیر چۆن پاشا گوتی، ئاوای کرد.

"کە بوو بە شەو، پاشا شمشێری بە دەستەوە گرت و دەستی کرد بە پشکنینی وڵات. لە ناکاو شتێکی ڕەشی زەلامی دیت. دڵی خۆش بوو. کە چووە پێشێ، کۆشکێکی دیت لە بەردی مەڕمەڕ کە دوو دەرگای ئاسنی هەبوو. یەکیان داخراو و یەکیان کراوە بوو. بە کەیفسازی لە بەردەرگا وێستا و ئارام لە دەرگاکەی دا. دەنگێک نەبوو. بۆ دووەم و سێیەم جار لێی دا. وەڵامێک نەبوو. بۆ چوارەمین جار بە توندی لە دەرگای دا. چ دەنگێک نەبوو. ئازایانە چووە ژوور و هەرای کرد: 'دانیشتووانی کۆشک، ئەمن ڕێبوارێکی هەژارم. بژیوێکم دەنێ.' دوو جار، سێ جار قاوی کرد. وەڵامێک نەبوو. ورەی وەبەر خۆی نا و چووە نێو کۆشکەکەوە. لەوێش کەسی نەدی، بەڵام سەیری کرد پڕ فەرش کراوە، حەوزێکی بلوور لە نێوەڕاستی کۆشکە. هەر چواردەوری حەوزەکە شێرەیە و هەمووشیان لە زێڕی سوور چێ کراون و لە جیاتی ئاو، دوڕ و گەوهەریان لە زاری دێتە دەرێ.

"پاشا زۆری بەلاوە سەیر بوو، بەڵام بۆ ئەوە بە داخ بوو کە کەسی نەدی کە لەبارەی ئەو ئەستێر و ماسییانەوە پرسیاری لێ بکا. هەر بۆیە لە سووچێک دانیشت و چوو لە فکرەوە و قامکی سەرسووڕمانی بە ددان گرتبوو. لە ناکاو گۆرانییەکی خەمگینی بیست کە ئەو شێعرەی دەگوتەوە:

کەس نییە دیواری بەندم تێک بدا، لە بەختی ڕەشم
کەس نییە فانۆسی چارە هەڵبکا بۆ کەشتییەکەشم
گیرانی من لە هەر شارێک بەڵایەکی بۆ چێ کردم
کەس نییە کە نەیبیستبێ چیرۆکێکی حاڵ و بەشم
تاڵی و سوێری و چەرمەسەری هەتا کەی دەبێ بچێژم
لە دەست خزم و کەسی خوێڕی و نەیاری هیچ و ڕووڕەشم

"پاشا کە ئەو ئاوازەی بیست، لە جێی خۆی هەستا و بەرە و دەنگەکە چوو. پەردەیەکی دیت دادرابووەوە. کە لای دا، لەپشت پەردەکەوە کوڕێکی وەک مانگی چواردەی لەسەر تەختێک دی کە دوو بستێک لە عەرزی بڵیندتر بوو، دانیشتبوو. ئەو کوڕە لە جوانی و خوێنشیرینیدا جۆرێک بوو وەک شاعیر دەڵێ:

هەر لە شێوەی خۆر و مانگە ئەو لەش چەرمووە
خۆری گەش لە ژێر کاکۆڵی ڕەشیا خەوتووە
ئەو دم و لووت و برۆیە، جێی سەرسامییە

"پاشـــا بە دیتنی ئەو کورە دڵی خۆش و ڕوخســـاری گەشــاوە، بەڵام گەنجەکە مات و مەلوول بوو. پاشـــــا ســـــڵاوی لێ کرد. وەڵامی داوە و لە بەری هەڵنەســـــتا. بەڵام بۆ هەڵنەستانەکەی داوای لێبووردنی کرد.

"پاشا گوتی: 'گەنجۆ، لە نهێنی ئەو ئەستێر و ماسییە ڕەنگییانە، ئەو چوار زنجیرە کێوە، ئەو کۆشکە و تەنیاییەی خۆت ئاگادارم کەوە. پێم بڵێ بۆ وا پەشێوی؟' لاوەکە کە ئەوەی بیست، دڵی پڕ بوو، ڕووی وەرسووڕاند. پاشا تەماشای کرد لە ناوقەدیڕا بۆ لای خوارێی بەردە و بۆ لای سەرێی مرۆڤە.

"گەنجەکە گوتی: 'ماسـییەکانی ئەو گۆلە بەسـەرهاتێکی سـەیریان هەیە. ئەویش ئەوەیە کە بابم پاشای ئەو شارە بوو، ناوی مەحموود و خاوەنی دوورگەی ڕەش بوو. حەفتا ساڵ بە خاوەنـدارییەتی ژیـا. دوایە مرد و وڵاتەکەی بۆ من مـاوە. لەگەڵ کچە پوورێکی خۆم زەماوەندم کرد. ئەو منی زۆر خۆش دەویســـت بەبێ من ســـفرەی ڕانەدەخســـت و هیچی نەدەخوارد. پێنج ساڵ ئاوا تێپەڕی. ڕۆژێک چوو بۆ گەرماو و بە بابنۆکەری گوت خواردنی بۆ ساز کەن. ئەمنیش چوومە سەر تەختەکەم بنووم. بە دوو کەنیزم گوت باوەشێنم کەن. یەکیان لەلای لاقم و یەکیشیان لەلای سەرم دانیشتن و هەر وا باوەشێنیان دەکردم. خەوم لێ نەدەکەوت، چاوم لەســـــەر یەک دانابوو، بەڵام هەر بەخەبەر بووم. گوێم لە کەنیزەکەی لەلای ســـەرم بوو، بەوی دیکەی گوت: 'بە ڕاسـتی ئەو ژنە بۆ هاوســەرێتی گەورەی ئێمە نابێ، هەر شـەوەی دەچێتە خەوگەی کەسێکەوە.' ئەوەی دیکە گوتی: 'ئەی بۆ گەورەم چی لێ ناپرسێ؟' ئەوی تر گوتی: 'گەورەم ئاگای لە کرداری ئەو نییە کە هەموو شەوێ کەمێک چەرس[١] لە پیاڵەی شــەرابەکەی دەکا و گەورەمان لە هۆش خۆی دەچێ، ئەویش کوێی پێ خۆش بێ دەچێ. بەری بەیانی دەگەڕێتەوە و گەورەمان وەهۆش خۆی دێنێتەوە.'

" 'کە من قسەی کەنیزەکانم بیست، باوەڕم نەکرد. هەتا کچە پوورەکەم لە گەرماو هاتە دەرێ. خوانیان ڕاخســت. نانمان خوارد و ماوەیەک بە قســەکردن تێپەڕی. دوایە شـەڕابیان هێنا. کچە پوورەکەم پیاڵەیەکی خواردەوە و پیاڵەیەکیشی دا بە من. وام پێشاندا کە خەریکم دەیخۆمەوە. بەڵام بە دزییەوە ڕشـــتم و نووســـتم. گوێم لێ بوو دەیگوت: 'بخەوە و هەڵنەســتییەوە. ئیدی هەســتا و کراســی حەریر و زێڕینی لە بەر کرد و خۆی ڕازاندەوە و دەرگای کردەوە و ڕۆیشــت. منیش بەدوایدا ڕۆیشـــتم. هەر وا ڕۆیشـــتین تا گەیشـــتینە دەروازەی شـــــار. شـــتێکی گوت و جادوویەکی کرد. کە من نەمزانی چی بوو، لە ڕێوە

---

١. چەرس: بەنگ، حەشیش.

دەروازە کراوە و لە شـار وەدەر کەوتین. ڕۆیشـتین، ڕۆیشـتین. تا گەیشـتینە حەوشـەیەک. خێزانم لەو حەوشـەیەدا چووە ماڵێکی قوڕینەوە. منیش خۆم گەیاندە سـەربانی و لە پشـت کولاوکەوە[1] خۆم مات دا. سـەیرم کرد کچە پوورەکەم سـڵاوی لە قولەڕەشـێک کرد و کوڕنۆشـی بۆ برد. کۆیلەکە سـەری هەڵێنا و بە تووڕەییەوە گوتی: 'ئەوە تا ئێستا لە کوێ بووی وا درەنگ هاتی؟ قولەکان لێرە بوون و هەرکەسـەی واشـتای[2] خۆی لەگەڵ بوو بادەیان دەخواردەوە. چونکە تۆ لێرە نەبووی، من بادەم نەخواردەوە.' کچە کوتی: 'گەورەم، خۆت دەزانی کە من مێردێکم هەیە زۆرم نـاخۆش دەوێ، ئەگەر لەبەر تۆ نەبووایە، ئەو شارەم ژێرە و ژوور دەکرد.' کۆیلەکە گوتی: 'تۆ درۆ دەکەی قەحبە، بە گیانی قولەکان تازە ڕووت تێ ناکەم و دەسـتم وە لەشـت ناکەوێ. ئەتۆ لە خۆشـەویسـتیان نایە لای من و تا ئیشتیات نەبزوێ، منت وەبیر نایەتەوە.'

" 'بە کورتی، کۆیلە لەو قسـانەی دەکرد و کچە لە بەرپێیدا ڕاوەسـتابوو دەگریا و دەیگوت: 'ئەی خاوەنی دڵ و سـۆمای چاوم، ئەمن جگە لە تۆ کەس شـک نابەم. ئەگەر لە دەرگاوە دەرم کەی، لە کولاوکەوە دێمەوە ژووری.'

" 'بەو جۆرە، کچە ئەوەندە گریا کە غولامەکە بەزەیی پێیدا هات و ڕێی دا دانیشێ. کچە خۆشحاڵ بوو، بە کۆیلەکەی گوت: 'شتێکی لێیە بیخۆم و بیخۆمەوە؟' غولامەکە گوتی: 'لەو گلێنەیەدا لەتە گۆشـتێکی مشـکی تێدایە و کەمێکیش مەی خەسـتەوەبوو لەبنی ئەو گۆزەڵەیەدایە، ئەوانە بخۆ.' کچە هەسـتا و ئەوانەی هێنا و خواردی و خواردیەوە، جلەکانی داکەند و لەسەر حەسیر و لەبن لباددا لە گەڵ غولامەکە تێخزا.

" 'ئەمن لە کولاوکەوە چاوم لێیان بوو، قسـەکانیانم دەبیسـت. ئینجا لە سـەربانی هاتمە خوارێ و شـیرم لێ کێشـان، ویسـتم هەردووکیان بکوژم. شـیرێکم داهێنایە ملی کۆیلەکە، وەم زانی کوژراوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. کولاوکە: کلاوڕۆژنە.

[2]. واشتا: گراوی، مەعشووقە.

# کە شەوی هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، گەنجە جادووکراوەکە بە پاشـــای گوت: 'ئەمن پێم وا بوو کە غوڵامەکە کوژراوە. بۆیە لەوێ هاتمە دەرێ و بە پەلە چوومەوە کۆشک و لە جێخەوەکەمدا خەوتم. کە ڕۆژ بووەوە، تەماشـا دەکەم کچە پوورەکەم بسـکی بڕیوەتەوە و ڕەشـپۆشـە. هاتە لام گوتی: 'دوێ شـــەو پێیان گوتم برایەکم مار پێوەی داوە، برایەکم لە ســـەربان بەربووەتەوە و، بابم لە شـەڕی دژمناندا کوژراوە و هەر سـێکیان مردوون.' گوتم: 'خودا لێیان خۆش بێ.' ماتەمبار بوو. دوای بەینێک گوتی: 'دەبێ لەنێو کۆشـکدا دیوێک درووست کەم و هێمای گۆڕێکی تێدا ســـاز کەم و نێوی بنێم 'ماتەمخانە' و خەریکی ماتەمداری بم.' گوتم: 'چۆنت پێ خۆشە وا بکە.' دیوێک و یەغدانێکی درووست دەکا. کۆیلەکە ڕەشەکە هەر مابوو، نەمردبوو. هەر بەو برینەوە بە زەجرەوە ژیابوو و توانیبوی قســـە بکا. ئیدی کچە پوورکەم هەموو ڕۆژێ بەیانی و ئێوارە دەچووە مـاتەمخـانە و برینی کۆیلەی دەرمـان دەکرد و شـەربەت و شـەرابی دەرخوارد دەدا. من کە بەو شـتەم زانییەوە، ڕۆژێک کە کچە پوورەکەم چووە ئەو شوێنە، منیش بەدوایدا چووم. سەیرم کرد، شین و واوەیلا دەکا و لە سینگی خۆی دەدا و ئەو شێعرە دەڵێتەوە:

هیـوای بە تۆ گەیشـــتنـم دەپشـــکوێ لە خەیـاڵمـدا
چەنـدە خۆشـــە ئەو خونچەیە بپشـــکوێ لە ژیـانمـدا
لە نـێـوان تـرس و هـیـوادا بە جـارێ گـیـرم کـردووە
بە ڕۆژدا ترســـی جودایی، شـــەو فڕین لەنێو نـاخمـدا
هێنـدە نـازی ڕوحتم کێشـــا لە زینـدەخەو و زەینمـدا
تەمـای ڕۆیشـــتـنـی نـیـیە لە وێـرانەی بـێ تـۆیـیـمـدا

" 'کە شێعرەکەی تەواو کرد، منیش بە شیری ڕووتەوە بۆی چوومە ژوور و پێم گوت: 'قەحبە، ئەوە بە کێ هەڵدەڵێی؟ دەڵێی لەو ژنە قەحبانەی کە حەز لە پیاوی دیکە دەکەن و لەگەڵیان جووت دەبن.' کە منی دیت و زانی بۆ کوشـتنی ئەو چووم و زانیشـی کۆیلەکەش من بەو ڕۆژەم گەیـاندووە. ئیدی لە بەر خۆیەوە ورتە ورتێکی لێ هـات کە من لێی تێ نەگەیشـــتم، بە منی گوت: 'جادووی من نیوەی لەشـــت بکا بە بەرد.' لە جێوە من ئاوام لێ هات. دوای ئەوە جادووی لە شـــار و خەڵکەکەی کرد. خەڵکی ئەو شـــارە لەســـەر چوار باوەڕی مەجووسی، مەسیحی، یەهوودی و موسوڵمانەتی بوون، بوونە چوار جۆرە ماسی، شـــاریش بوو بە ئەســـتێرێک. چوار دوورگە بوونە چوار کێو. لەو دەمەوە هەموو ڕۆژێ

کچەکە دێتە لای من و ڕووتم دەکاتەوە و بە قامچی ئەوەندەم لێ دەدا هەتا تەواوی گیانم خوێنی تێ دەزێ. دوایە بەرگی پەشمینەم لە بەر دەکاتەوە.'

"کە لاوەکە ئەو قسانەی دەکرد، دڵی پڕ بوو ئەو دوو بەیتەی گوت:

پێم دەڵێن هێمن بە تۆ، هێمنی بەری هەیە
بەڵێ بەری هەیە، بەڵام ئەویش نرخی هەیە
ئێمە هەموو ژیانمان بە هێمنی بردە سەر
ژیانی دیکەمان دەوێ، تا هێمنی بێتە بەر

"کە ئەو بەیتانەی گوت، پاشا گوتی: 'خەمت بۆ زیاد کردم. بڵێ بزانم ئەو کچە لە کوێیە؟' گەنجەکە گوتی: 'بەیانی و ئێوارە دەچێتە لای ئەو گۆڕە قەستییە کە ئەو کۆیلەیەی لێیە و، کاتی ڕۆیشتنەوەش دێتە لای من و بە قامچی لەشم ڕەش و شین دەکاتەوە.' پاشا کە ئەو وتانەی بیست، گوتی: 'گەنجۆ، ئەمن چاکە و گەورەیی وات لەگەڵ دەکەم کە دوای منیش لە کتێباندا بینووسن و بە چیرۆک بیگێڕنەوە.' ئیدی پاشا هەستا و گەڕاوە بارەگاکەی خۆی. ڕۆژی دوایی کاتی شێوان دەستی دا شیر و چووەوە ئەو شوێنەی کۆیلەکەی لێ بوو. دیتی ئەوە قەندیلیان بەرداوەتەوە و شەمیان هەڵکردووە و عوود دەسووتێ و غوڵامیش لە خەوگەدا خەوی لێ کەوتووە. کۆیلەکەی کوشت و لە چاڵێکی هاویشت. جلەکانی ئەوی لەبەر کرد و لە جێگاکەی ئەو خەوت و شیرەکەشی لە پەنا خۆی درێژ کرد. ماوەیەکی پێ چوو، ژنە هات بۆ کۆشک و کوڕە پوورەکەی خۆی ڕووت کردەوە و بە قامچی ئەوەندەی لێ دا هەتا گشت گیانی ڕەش و شین کردەوە. هەر لێی دەدا، ئەو دەیناڵاند و دەپاڕاوە و دەیگوت: 'بەزەییت پێم دابێ، هەر ئەو حاڵەی من تێیدام بۆ من زۆرە.' کچە دەیگوت: 'ئەی بۆ بەزەییت نەبوو ئەو دڵدارەی منت ئاوا لێ کرد؟' لە پاشان کچە جلوبەرگی جوانی لە بەر کرد و لەسەر ئەویشەوە عەبایەکی حەریریشی بە شانیدا دا. گەڕاوە لای کۆیلە ڕەشەکە. پیاڵەیەکی مەی هێنا پێش و بە گریانەوە گوتی: 'گەورەم، قومێک لەو مەیە بخۆوە و قسەم لەگەڵ بکە.' ئیدی ئەو دوو بەیتە شێعرەشی گوت:

کەسەکەم لەگەڵم بدوێ
دڵ وتەی جوانی تۆی دەوێ
بێ ئەوینی تۆ ناسرەوم
تۆی چرای ڕووناکی شەوم

"دوای ئەوە گریا و گوتی: 'سەروەرم، لەگەڵم بدوێ.' ئیدی پاشا بە زاراوەی حەبەشیان

و شـــێوەی قولەکان گوتی: 'ئاخ، ئاخ ســـوبحانەڵڵا.' کە کچە گوێی لە دەنگی ئەو بوو لە خۆشیان بێهۆش بوو. کە وەهۆش هاتەوە گوتی: 'گەورەم، هیوادارت کردم.' ئەو جار پاشا بە دەنگێکی خەمبارەوە گوتی: 'جندە[1]، تۆ بۆ ئەوە نابی قســەت لەگەڵ بکەن.' کەنیشــکەکە گوتی: 'لەبەر چی؟' گوتی: 'لەبەر ئەوەی هەموو ڕۆژێ بە قامچی لە مێردەکەت دەدەی و هاوار و ناڵەی ئەو خەوی لە من حەرام کردووە، دەنا ئەمن لە مێژ بوو چاک دەبوومەوە و ڕزگارم دەبوو.' کەنیشکە گوتی: 'ئەگەر تۆ ڕێم بدەی، ئازادی دەکەم .' پاشا گوتی: 'ئازادی کە با منیش بحەسێمەوە.' خێرا کەنیشکەکە چووە لای کوڕە پوورەکەی، قاپێکی هێنا و پڕی کرد لە ئاو و وردمێکی بە ســــەردا خوێند و بەســــەر لاوەکەیدا هەڵپرژاند. ئەو لاوە وەک سـەرەتای لێ هاتەوە. کچە ئەوی لە کۆشـک دەر کرد و گوتی: "بڕۆ ئیدی نەگەڕێیەوە، دەنا دەکوژرێی." ئەو جار کچەکە هاتەوە 'ماتەمخانە'ەکەی و گوتی: 'گەورەم، قسەم لەگەڵ بکە، ئەوە تەلیسمی کوڕە پوورەکەشم بەتاڵ کردەوە.' پاشا گوتی: 'ئەوەی دەبێ بیکەی، هێشتا نەتکردووە.' کچە گوتی: 'گەورەم، ئەوە چییە نەمکردووە و دەبێ بیکەم؟' پاشــا گوتی: 'ئەو شـــارە و خەڵکەکەی وەک خۆیان لێ بکەوە کە هەموو نیوەشــــەوێک تووک و دۆعام لێ دەکەن، ئاوا من قەت چاک نابمەوە.' ئینجا هەســـتا و هاتە لای گۆلە ئاوەکە و کەمێکی ئاو هەڵێنجا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتایی پێ هات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

[1]. جندە: موفلنگ، قەحبە.

## کە شەوی نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـکۆ، کیژەکە کەمێکی لە ئاوی ئەسـتێرەکە هەڵێنجا و ودمێکی بەسـەردا خوێند و ئینجا بەسەر ئەستێرەکەیدا پرژاند. هەر دەمودەست شار و بازاڕ وەک خۆیان لێ هاتەوە و ماسـیـیەکان بوونەوە بە مرۆڤەکانی جاران و کێوەکانیش بوونەوە بە دوورگە. کیژەکە هاتە 'ماتەمخانە' و ئەوەی کردبووی، بۆ پاشـای گێڕاوە. پاشـا بە هێمنییەوە گوتی: 'وەرە پێشتر.' کیژەکە هاتە پێشێ و گوتی: 'گەورەم.

پـادشـــای بێ هـاوتـا خۆڵی ژێر پـاتم
ئەوجـار لێـم خـۆش بێ سـەگی دەرگـاتـم

"خێرا پاشا شیرێکی لە ژنە دا و دوو قاشی کرد. پاشا هەستا و لە ماڵەکە چووە دەرێ. لاوەکەی دی کە چاوەڕێی پاشایە. کە چاوی بە پاشا کەوت، سپاسی کرد و دەست و لاقی ماچ کرد. پاشاش پیرۆزبایی ڕزگاربوونەکەی لێ کرد و پرسیاری لێ کرد: 'ئێستا لە شاری خۆت دەمێنییەوە یا لەگەڵ من دێی؟' لاوەکە گوتی: 'هەتا بمێنم لێت جودا نابمەوە.' ئیدی گەنجەکە لە پاشـای پرسـی: 'لێرەوە تا شـارەکەی ئێوە چەند ڕۆژە؟' پاشـا گوتی: 'نزیکەی دوو ڕۆژ دەبێ.' گەنجەکە گوتی: 'لێرە تا ئەو شـارەی ئێوە سـاڵێک دەخایەنێ.' پاشـا پێی سـەیر بوو. شـازادە خۆی بۆ سـەفەر سـاز کرد، بە وەزیرەکەی گوت: 'ئەمن بە نیازم بچمە مەککەی پیرۆز.'

"ئیدی شـازادە یک سـاڵی ڕەبەق پشـتمێری پاشـا بوو، ڕۆیشـتن، ڕۆیشـتن. تا گەیشـتنە شاری پاشا. سەرباز و خەڵکێکی زۆر بە پێشوازی پاشاوە چوون و سمی ئەسپەکەیان ماچ کرد، بە سلامەتی پاشا دڵخۆش و شادمان بوون.

"پاشا چووە کۆشکەوە و لە سەر تەخت دانیشت و داوای کرد ڕاوچی بێنن. دیاری دایە و لێی پرسـی چەند منداڵت هەیە. ڕاوچی گوتی: 'کوڕێک و دوو کچم هەیە.' پاشـا یەکێک لە کچەکانی لە خۆی و یەکیشـیانی لە شـازادە جادووکراوەکە مارە کرد. کوڕەکەشـی کردە سوپاسالار و دەسەلاتدارییەتی شاری شازادە، دوورگە ڕەشەکانیشی دا بە ڕاوچی و هەتا مردن بە خێر و خۆشی ژیانیان گوزەراند.

"بەڵام خاوەنشـکۆ، ئەو چیرۆکە هێشـتا بە قەد چیرۆکی کۆڵبەر و کەنیشـکەکان خۆش نییە. ئەویش ئاوا بوو کە:

## چیرۆکی کۆڵبەر و کەنیشکەکان

"لە بەغدا پیاوێکی سەڵت هەبوو، کۆڵبەری دەکرد. ڕۆژێک لە ڕۆژان لە بازاڕ ڕاوەستابوو. کچێکی جوان و ڕێکوپێک پەیدا بوو، وەک شاعیر دەڵێ:

میسک لە چاو زولفی ڕەشی، نە بۆنی خۆشە، نە ڕەشە
ڕێواس نە ناسکە نە شلکە، لە ئاستی ئەو لارولەشە
سیمای گەشە وەک مانگ و خۆر، وەک ئەستێرەی گەلاوێژە
ڕەزا سووک و گفت خۆشە، هەر بە بینینی دڵ خۆشە

"بە کۆڵبەرەکەی گوت: 'ئەو قرتاڵەیە[1] هەڵگرە و لەگەڵم وەرە.' کۆڵبەر قرتاڵەکەی هەڵگرت و لەگەڵ کیژەکە ڕۆیشت، ڕۆیشت تا گەیشتنە دووکانێک. کچە دینارێکی دەرێنا، کەمێکی زەیتوون کڕی و بە کۆڵبەرەکەی گوت: 'ئەوەی بخە قرتاڵەکە و لەگەڵم وەرە.' کۆڵبەرەکە زەیتوونەکەی لە قرتاڵە خست و ڕۆیشتن. هەتا گەیشتنە دووکانێکی دیکە. لەوێ سێو، شووتی، بەهێ عوممانی، قۆخی دیمەشقی و لیمۆی میسری و تورەنجی سوڵتانی، لە هەر کامیان مەنێکی کڕی. بە کۆڵبەرەکەی گوت: 'ئەوانە هەڵگرە و لەگەڵم وەرە.' کۆڵبەرەکە ئەوانیشی هەڵگرت و هەروا ڕۆیشت، تا گەیشتنە دووکانێکی دیکە. کچە کەمێکی ڕێحان و بەیبوون و یاسەمین و گوڵە خەشخاشی کڕی و بە کۆڵبەرەکەی گوت: 'ئەوانەش هەڵگرە و وەرە.' کۆڵبەر ئەوانیشی هەڵگرت و بەدوایدا ڕۆیشت تا گەیشتنە گۆشتفرۆشییەک. گۆشتی کڕی و گوتی: 'ئەوەش هەڵگرە.' ڕۆیشتن تا گەیشتنە شیرنیفرۆشییەک، کیژە هەموو جۆرە شیرنییەکی کڕی و گوتی: 'ئەوانەش هەڵگرە.' کۆڵبەرەکە گوتی: 'ئەگەر بە منت گوتبا، کەرێکم دێنا هەتا ئەو بارە قورسەی هەڵگرتبا.' کیژە بزەیەکی هاتێ و ڕۆیشت. هەر وا ڕۆیشتن تا گەیشتنە دووکانی هەزوێلەفرۆشی[2]، لە هەر بۆنێک شووشەیەکی کڕی و بە کۆڵبەرەکەی سپارد. دوای ئەوە گەیشتنە دووکانی مۆمفرۆشی، دە مۆمی کافووری کڕی و دای بە کۆڵبەرەکە. کۆڵبەرەکە هەموو ئەوانەی هەڵگرت. دەلالە لە نوا و کۆڵبەر لە دوا، ڕۆیشتن، ڕۆیشتن تا گەیشتنەماڵێکی کۆشکئاسا. دەلالە لە دەرگای دا. کچێکی جوانچاک دەرگای کردەوە. کۆڵبەر کە دیتی کچێکی مانگئاسای لەشزیوینە، هەروەک شاعیر دەڵێ:

سینگی هێلانەی دوو کۆتری ماڵین
سپی و سۆڵ، خڕپن، بابەتی گوشین

---

[1]. قرتاڵە: سەبەتەی میوەچنین.

[2]. هەزوێلە هەموو جۆرە گیایەکی دەرمانی و چێشتخۆشکەر وەکوو ئاڵات و زەردەچێوە و بیبەر و شتی وا دەگرێتەوە. ماناکەی لەگەڵ ئەوەدا زیاتر یەک دەگرێتەوە ئەو دەم لە بیرم چوو چاکی کەم.

بـــالآ بەرز و ڕێــــک، کەمەر بـــاریـــکە
ســـەر کـولـمەی ســــووری دەڵـێـی گـولـووکە
پـرچـی دوو ڕەشـــــمـار، پـێـچ و خـولـیـانە
لــــــەســـــەر شـــان و مـل مـلـومـۆیـانە

"کۆڵبەر بە دیتنی ئەو دڵی سیس بوو، خەریک بوو قرتاڵەی لەسەر شان بەر بێتەوە. بە خۆی گوت: 'ئەورۆ چاکم بۆ دێ.' ئیدی چووە ژووری، ســـەیری کرد خاوەنماڵ کچێکە لە هەردووکیان جوانتر، لەســەر تەختێک دانیشـتووە کە لە شـەنگ و شـەپاڵیدا شـتێکی تایبەتە وەک شاعیر دەڵێ:

یارەکەم لێو هەنگوینێکە سـێســەد چینی لە کەزیەدان
تێیدا نییە، لە چین و مـاچینـدا شـــتی ئەوەنـدە جوان
چاوەکانی مەســـت و خومار، ڕادەکێشــن دڵان بە زار
لێرەو لەوێ کەوتوون دڵدار، دڵ بریندار هەزار هەزار

"کچە لە تەخت هاتە خوارێ گوتی: 'ئەوە بۆ ئەو هەمووە شتەت بەو فەقیرە هەڵگرتووە.' ئیدی کچگەل پێکەوە یارمەتییان دا و قرتاڵەکەیان لەســـەر شـانی داگرت و هەر شـتەی لە جێی خۆیان دانا. دوو دیناریشـــان دا بە کۆڵبەرەکە و گوتیان ئەتۆ برۆ. کۆڵبەرەکە تەماحی لە کچەکان کردبوو. هەر ئەوەی کە پیاوێکیش لە ماڵ نەبوو. هەموو جۆرە خواردەمەنییەک و شەڕاب و شیرینی ئامادە بوو، پێی چوونەدەری نەبوو.

"کچەکان گوتیان: 'چییە بۆ ناڕۆی؟ ئەگەر پارەکەت کەمە با دینارێکی دیکەت دەینێ.' کۆڵبەرەکە گوتی: 'نا وەڵلا، دە هێندەی مافی خۆمم دراوەتێ.' ئەمن ســــەرم لە کاری ئێوە سـوور ماوە کە بۆ ئاوا دانیشـتوون و پیاوێکتان لەگەڵ نییە تا کۆڕەکەتان گەرم کا، عەیش و نۆشـی ژنان بەبێ پیاو تامی نییە. دەڵێن، میچ چوار دیواری دەوێ تا ڕاوەسـتێ. ئێسـتا ئێوە سـێ کەســن و پێویســتە چوارەمین دانەتان پیاوێکی جوامێر و ژیر و قســەزان و ڕازپۆش بێ.'

"کچەکان گوتیان: 'ئێمە ناوێرین نهێنی خۆمان بخەینە بەر دەســتی هەر کەسـێک. ئێمە لەو قسەیەی شاعیر سەرپێچی ناکەین کە دەڵێ:

یەکەم وتەی پـیـرانـی ژیـر هەر ئەوەیە بـۆ نەوەکـان
گەرەکتـانە حەســــاوە بن، خۆ ببوێرن لە ڕاز درکـان

"کوڵبەر گوتی: 'بە گیانی ئێوە، خەمتان نەبێ من زۆر جێی باوڕەم. چاکەکانتان دەڵێم و خراپەکانتان دەشارمەوە:

عـاشـــقـم و عـاشـــقـیـم وێـردی زمـانـی خەڵـکە
گەشـــبـینـم و ڕەشـــبـیـنـی لام شـــتـێکـی بێکەڵـکە
پرســـیـم پیری مەیـخـانە، چی لە لای تۆ پەســـەنـدە؟
پیـر بە مەســـتییەوە گـوتـی: 'پۆشـــیـنـی ڕازی بەنـدە

"کە کیژەکان ڕاوێژی خۆش و ڕەوانی ئەویان دیت، پێیان گوت: 'خۆت دەزانی ئەو کوڕە تێچوویەکی زۆری بووە، ئەگەر ئەتۆش زێرت نەبێ، ناهێڵین لێرە دانیشـــی و چاو ببڕییە ڕوخساری جوان و سپیوسۆڵی ئێمە. مەگەر نەتبیستووە کە خۆشەویستی بێ پارە هەر دەرد و خەمە، بەختەوەری ڕێی لە ماڵی ئەوینداری ڕووتوڕەجاڵ ناکەوێ؟' کۆڵکبەرەکە گوتی: 'بە خودا جگە لەو پارەیەی لە ئێوەم وەرگرتووە، هیچی دیکە شک نابەم.'

"ئیدی کیژە دەلالە گوتی: 'خوشـــکەکانم، هەر کات نۆرەی ئەو هات، ئەمن لە جێی ئەو خەرجییەکەی دەکێشـم.' ئەوان قسـەی دەلالەیان قەبووڵ کرد و کۆڵبەرەکەیان بە هاوڕێ و هاوپیاڵەی خۆیان حیساب کرد. دەستیان بە مەی خواردنەوە کرد. ئەو جار دەلالە کووپەی مەیەکەی هێنا بەرەوە و پیاڵەکەی ڕاگرت. یەکیان بۆخۆی خواردییەوە و دوو پیاڵەشـــی بۆ کچە مانگئاســـاکە و خاوەنماڵەکەی تێ کرد و پیاڵەیەکیشـــی بۆ کۆڵکێشـــەکە تێ کرد. کۆڵکێشەکە پیاڵەکەی وەرگرت و ئەو شێعرەی گوت:

'تێ کە شـــەرابی یاقووتی، مەســـتی نیگای ڕووگوڵان بە
بە کوێری چـاوی نەیـاران، نوقمی جوانی ســـەرچڵان بە[1]

"ئەو بەیتەشی گوت:

گەر بە بـادە خەمـی دڵـمـان ڕانەمـاڵـیـن
بێ شـــک ترس وێران دەکـا بنەمـای ژین

"دوای گوتنی شـێعرەکان، دەســـتی کیژەکانی ماچ کرد و پیاڵەکەی بە ســـەرییەوە نا. پیاڵەیەکی دیکەی پڕ کرد و ڕووبەڕووی خاوەنماڵ ویستا و گوتی: 'ئەمن کۆیلە و نۆکەری تۆم.'

---

[1]. سەرچڵ: واتە، هەڵبژاردە، نموونە.

خـاوەنـكەرەم، سـەرم بەردەبـازی ڕێـتە
پێی لێ دەنێی یـا لێی نـانێی کەیفی خۆتە

"خاوەنماڵ گوتی: 'بخۆوە، نۆشی گیانت بێ.' کوڵبەر دەستی ڕامووسی و گوتی:

خۆشـی باخی بەهەشـت کوا وەک ئەوە دێتەوە
یار پیاڵە مەی هەڵبدا و پێشـت بڵێ تێی کەوە

"بە کورتی، هەر بە مەیخواردنەوە و غەزەلگوتن و سـەماکردن ڕایانبوارد. هەتا مەسـت بوون. دەلالە هەسـتا خۆی ڕووت کردەوە و خۆی لەو حەوزە هاویشـت کە لە نێوەڕاسـتی کۆشـکەکەدا بوو. لە ئاوەکەدا مەلەی کرد و خۆی شـوشـت و پاشان پاک و خاوێن هات لە پەنا کوڵبەرەکەدا دانیشـت، پاشـان کچە مانگئاسـاکە هەسـتا چوو خۆی شـوشـت و هات لە لای کوڵبەردا دانیشـت. لە کۆتاییدا خاوەنماڵیش خۆی شـوشـت و هاتەوە کن ئەوان و دەستیان کرد بە گاڵتە و گەپ."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی دەیەم هاتەوە

شەهرزاد گوتی: "خاوەنشکۆ، کۆڵبەرەکە سەیری کرد ئەوە کچگەل لە پەنای دانیشتوون، کەیفی ساز بوو. لەگەڵیان دەستی کرد بە گاڵتە و گەپ. ئەوان پێدەکەنین و لێیان دەدا و نوقرچکیان لێ دەگرت و چنگەفلیقێیان لەگەڵ دەکرد. بەزمێک بوو سەیر، هەتا کاتی شێوخواردن. کچەکان گوتیان: 'ئێستا کاتی ئەوەیە ئەتۆ بچییە دەرێ و ئیتر سەرودڵمان نەگری.' کۆڵبەر گوتی: 'چوونەدەری گیان لە جەستە ئاسانترە لەوەی من لێرە بڕۆمە دەرێ. لێم گەڕێن با ئەم شەویش لێرە بمێنمەوە، بەیانی ڕۆژ دیاری دا، دەڕۆم و وەدوای کاری خۆم دەکەوم.' دەلالە گوتی: 'ئەمشەو دەکرێ لێرە بێ، جێبەجێ دەبێ.' دوو کچەکەی دیکە گوتیان: 'بەو مەرجەی هەرچی دیتی، پرسیار نەکا و تا قسەیەکیشی لێ نەپرسن، هیچ نەڵێ.' کۆڵبەر مەرجەکەی پەسەند کرد.

"ئینجا پێیان گوت: 'بچۆ ئەوەی لەسەر دەرانەکە نووسراوە، بیخوێنەوە.' کۆڵبەر هەستا سەیری کرد نووسراوە: 'هەرچی دیتت پرسیاری لە بارەوە مەکە و هەتا پرسیاریشت لێ نەکەن، هیچ مەڵێ.' کۆڵبەر بەڵێنی پێ دان.

"ئەوجار دەلالە هەستا عوود و شەمی هەڵکرد، سفرەی شێوانی ڕاخست و خواردەمەنی لەسەر ڕیز کرد. لەو جەنگەیەدا لە دەرگایان دا. دەلالە هەستا چوو دەرگای کردەوە، تەماشای کرد سێ سواڵکەری یەکچاوی چەنەتاشراو لە بەردەرگان. گەڕاوە بە خوشکەکانی گوت: 'دوو-سێ کەسن کە چاوی چەپیان کوێرە و چەنەیان تاشراوە، ڕواڵەتێکی سەیریان هەیە. ئەگەر بێنە ژوورێ جۆرێکن دەتوانن گاڵتەجاڕییەک ساز بکەن.' ئیدی ئەو دوو دوێتە[1] ڕێی هاتنە ژوورێیان دان. بەو مەرجەی کە هەرچییەکیان دیت، پرسیار نەکەن و تا لێشیان نەپرسن، هیچ نەڵێن. دەلالە هاتە دەرێ و گفت و بەڵێنی لەسەر ئەو مەرجانە لێ ئەستاندن و بردنییە ژوورێ.

"سڵاویان کرد و بە یارمەتی کیژەکان دانیشتن. کە کۆڵبەرەکەیان دیت، لە بنەوە بە یەکتریان گوت ئەوەش وەک ئێمە وایە. کۆڵبەرەکە گوێی لێ بوو، دەرهەڵبوو و گوتی: 'قسەی قۆڕ مەکەن و هیچ مەڵێن. مەگەر ئەوەی لە سەر دەرگاکە نووسرابوو، نەتانخوێندەوە؟' کچان بە قسەی کۆڵبەرەکە پێکەنین و لەبەر خۆیانەوە گوتیان: 'ئەمشەو کۆڵبەر لەگەڵ ئەو سیانە سەیریان خۆش دەبێ؛ کۆڕەکەمان دەڕازێننەوە.' ئیدی دەستیان کرد بە خواردن و قسەکردن هەتا مەییان هێنا. ئینجا خواردیانەوە و خواردیانەوە هەتا مەست بوون.

---

[1]. دوێت: کچ، کەنیشک.

"کۆڵبەرەکە بە سوالکەرەکانی گوت: 'قسەیەک، گۆرانییەک، بەزمێک، کەمێکمان دڵخۆش بکەن.' سوالکەرەکان بەو قسەیە کەیفیان ساز بوو، داوای ئامرازی موزێک و بەزمیان کرد. دەلالە دەفی موسڵی و عوودی عێراقی و چەنگی عەجەمی بۆ هێنان. هەرسێ سوالکەرەکە هەستانە سەر پێ و هەر یەکەی ئامرازێکی بە دەستەوە گرت و دەستیان بە ژەنین کرد. کیژەکان گۆرانییان دەگوت، ئاوازی مەستانە و دەنگی چەنگ و چغانە١ وڵاتی پڕ کردبوو کە لەپڕ دیسان لە دەرگایان دا. دەلالە چوو دەرگای کردەوە. تەماشای کرد، ئەوە سێ کەسی کۆک و پۆشتە کە ڕواڵەتیان وەک بازرگان و پلەدار دەچوو، لە بەردەگا وێستاون [لە ڕاستیشدا ئەوانە خەلیفە هاروونەڕەشید و جەعفەری بەرمەکی و مەسروری خزمەتکاریان بوون.] ئەوانە کاتێک بە بەردەرکی ئەو ماڵەدا دێن و گوێیان لەو دەنگ و بەزم و هەرایە دەبێ، خەلیفە دەڵێ: 'وەڵا پێم خۆشە بزانم ئەو دەنگ و هەرا و بەزمە چییە و بۆ چییە؟' ئیدی بە مەسرووری فەرموو لە دەرگا بدا. دەلالە گوتی: 'فەرموون چیتان دەوێ؟' جەعفەر گوتی: 'ئێمە سێ کەسین لە بازرگانەکانی تەبەرستان. میوانی هاوڕێیەکمان بووین. ئێستا کە گەڕاینەوە، ڕێمان لێ ون بووە. ئەگەر ڕێمان بدەن و منەتبارمان کەن، هەر ئەوشەو لێرە میوان بین و سۆزی دەڕۆین.' دەلالە کە ئەوانی وەک بازرگانێک دی، گەڕاوە ژووری بۆ خوشکەکانی گێڕاوە و ڕوخسەتی خواست ڕێیان بدا بێنە ژوورێ. کە هاتنە ناوەوە، کەنیشکەکان لە بەریان هەستان و بە ڕێزەوە وەڵای سەروویان خستن و گوتیان: 'بەو مەرجەی هەر شتێکتان دی، پرسیار نەکەن و هەتا لێتان نەپرسن، قسە لە هیچ شتێک نەکەن.' مەرجیان پەسەند کرد و دانیشتن. کە ئەوان دانیشتن، دەلالە دەستی کردەوە بە مەیگێران. پیاڵەیەکی بۆ خەلیفە تێ کرد، خەلیفە گوتی: 'ئێمە حاجین.' ئیدی کچەکەی دیکە چوو دەفرێک لیمۆ و شەکراوی هێنا و یەک-دوو لەتە سەهۆڵی تێ هاویشت و هێنایە خزمەت خەلیفە. خەلیفە لە دڵی خۆیدا گوتی: 'سۆزی خەڵاتێکی باش دەدەم بەو کیژە.' کە هاوڕێیان دانیشتن بۆ خواردنەوە و حەوت دەوریان مەی گێڕا، ئیدی هەموو بادەخۆرەوەکان بەو مەیە ڕەسەنە مەست بوون. کچەکان لە ژووری هاتنە دەرێ و لە قەراخ حەوزەکە ڕاوەستان، بانگی کۆڵبەرەکەیان کرد. کۆڵبەرەکە کە چوو بۆ لایان، سەیری کرد ئەوە دوو سەگی ڕەشیان زنجیر کردووە. خاوەنماڵ هەستا دەستی دا قامچییەک، بە کۆڵبەرەکەی گوت: 'یەکێک لەو دوو سەگە بێنە لای من.' کۆڵبەرەکە زنجیری یەکێک لەو دوو سەگەی گرت و بردی بۆ لای خاوەنماڵ. خاوەنماڵ بە قامچی کەوتە گیانی سەگەکە، هەر ئەو قروسکاندی و ئەو لێیدا، هەر ئەو بە زمانی خۆی پاڕاوە و هاواری کرد و ئەو لێیدا. هەتا دەستی شل بوو، قامچییەکەی لە دەستی بەر بووەوە. ئینجا سەگەکەی لە ئامێز گرت و ماچی کرد و چاوی بۆ سڕی، لەگەڵی گریا و لاواندییەوە. ئەو سەگەیانی بە کۆڵبەرەکە

١. چغانە: ئامرازێکی مووسقاە وەک کەوچک دەچێ کەمێکی زەنگولە و شتی پێوەیە.

ســپارد و گوتی: 'ئەوەیان بەرەوە جێگای خۆی و ئەوەی دیکەیان بێنە.' کۆڵبەر بە گوێی کرد. ئەوەیانی بردەوە جێگای خۆی و ئەوەی دیکەیانی هێنا. خانم دیســان دەســتی دا قامچی، چی لەوەی دیکەیان کردبوو، هەر ئاواشی لەوەشیان کرد. خەلیفە ئەو کارەی زۆر پێ ســەیر بوو. بە ئاماژە جەعفەری تێگەیاند بزانە ئەوە چییە؟ بۆ وایان لێ دەکا؟ جەعفەریش هەر بە ئاماژە خەلیفەی تێگەیاند کە هیچ نەڵێ. پاشــان خاوەنماڵ هات لەســەر تەختێک دانیشت و مانگئاساش لە خوار ئەوەوە لەسەر تەختێکی دیکە دانیشت. دەلالە چوو لە قوژبنێکی ماڵێ توورەکەیەکی ئاوریشمی هێنا کە تانوپۆکەی لە ئاوریمشی سەوز بوو. لەپێش خاوەنماڵ کردییەوە، عوودێکی لە توورەکەکە دەرهێنا و تێل و شــتەکەی ڕێکوپێک کرد و دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەو شێعرانە:

گەر بۆنی خۆشـــی کەزیەکەتم بۆ بێنێ بـا
ڕۆح و گیـانم لە مزگێنی دەدەم. بـا بێ بـا
هەر چەنـدە تۆ تۆزت لە ژینم هەســـتـانـدووە
تۆزی مـنـی خـۆڵـین، بە داوێـنـی تـۆ نـاگـا
لەو ڕۆژەوە ڕووت وەرگێڕا، ســـۆمـایی چـاوم
دونـیـا دەرکی بەختەوەری لە ڕووم گـاڵە دا
چـاوانم پڕ لە خوێنە بە هۆی یـادی جـاران
داوی زولفی خـاوی تۆ لە دەســـــت و پێم هـالا
نە لە بەر دیـدەیـت و نە لە بەر چـاو لا دەچی
نە یــادم دەکەیـت و نە دەر دەچـی لە یـادا

"دوایە ئەو بەیتانەشیان گوت:

هەزار تـانووتم لە خۆم دا ســـوڕی ئەوین بشـــارمەوە
دیـم نـاکـرێ مـنـی بەفـر لە ســـەر ئـاگـر نەتـوێـمەوە
وریـا بـووم لە ســـەرەتـادا دڵـم گـیـرۆدەی کەس نەبـێ
دیم کێوی وریـایی و ژیریم لە ئـاســـتـدا دەتوێتەوە
مـنـی گـیـرۆدەدڵ نـابـێ لە کـۆڕی عـاشـــقـانـدا بـم
ئەگەر بێـت و بە پێی خـۆم بێم، دەبێ بە کۆڵ بمبەنەوە

"کچەکە کە ئەو شێعرانەی بیست، جلەکانی لەبەر خۆی دادڕین و بێهۆش بوو، کەوت و جلەکانی لە بەریدا بڵاو بوو، لەشی وەدەر کەوت. جێگای قامچی لە سەر جەستەی وەدیار

کەوت. خەلیفە کە شوێنی قامچی لەسەر لەشی دیت، سەری سوور ما و وردورد تێی ڕامابوو. کیژی مانگئاسا هەستا و گوڵاوی بەسەردا هەڵپڕژاند و وە هۆشی هێناوە. جلەکانی لە بەر کردەوە.

"خەلیفە بە جەعفەری گوت: 'ئەمن خۆم پێ ڕاناگیرێ و ناتوانم هیچ نەڵێم و نەپرسم. هەتا ڕاستی ئەو کچە و ئەو قەمچیلێدانە و ڕاستی ئەو سەگانەم بۆ ڕوون نەبێتەوە، ناحەسێمەوە.' جەعفەر گوتی: 'خودا یارمەتی خەلیفەمان بدا، ئێمە بەڵێنمان پێ داون کە هەر شتێکمان دی، پرسیار نەکەین.'

دوای ئەوە دەلالە هەستا و عوودی لێ دا و ئەو شێعرانەی خوێندنەوە:

دوێ شەوێ باسی کۆڕی مە، چیرۆکی دەلالی تۆ بوو
تا نیوەشەو باسمان باسی ئاڵقە و قەفی بسکی تۆ بوو
دڵی کڵۆڵم کەوتە بەر تیری نیگات نوقمی خوێن بوو
کەچی دیسان دڵی لە لای کەوانخانەی برۆی تۆ بوو
دنیا لەو گێرە و کێشەدا، لە نێو گوێی گادا خەوت بوو
فیتنەگێری دنیا خەمزەی، جادووی چاوی جوانی تۆ بوو
منی سەرگەردان و عاشق دنیایەکی بێ خەمم بوو
ئەو داوەی وا پێیەوە بووم، تاڵێکی کەزیەکەی تۆ بوو

"کە کیژە مانگئاساکە ئەو شێعرانەی بیست، وەک کچەکە لە پێشدا جلەکانی لە بەر خۆی دادڕی و لە هۆش خۆی چوو. دەلالە هەستا گوڵاوی پێدا هەڵپڕژاند و دایپۆشی. دوای ئەو کچەکەی سەرەتا بە دەلالەی گوت: 'بێلێ، گورانییەکمان زیاتر نەماوە.' دەلالە تاڵەکانی عوودەکەی ڕێکوپێک کرد و ئەو بەیتانەی گوتن:

خۆزگەم بەو ئەڤیندارە کا، کە واشتاکەی لەگەڵدا بێ
نەک وەکوو من تاق و تەنیا، لە یاری خۆی دابڕابێ
سەروەی بلاوێنی دلان، تۆ پێی بڵێ بە شای گوڵان
کە جارێ لە ڕێی خودادا بە کوڵانی ئێمەشدا بێ
هێند تەنیا بووم، لە سەر دڵم، خەفەت هێلانەی کردووە
مۆتەکەی تەنیایی ساتێ، دەستی لە ئەوکم بەر نا بێ

"کچە، کە ئەو شێعرانەی بیست، زیقاندی و جلی لە بەر خۆی دادڕی و لە هۆش خۆی چوو. کە کراسەکەی لەسەر لەشی لا درا، شوێنی قەمچییەکە لەسەر جەستەی وە دیار

کەوت. سـوالکەرەکان گوتیان: 'خۆزگە ئێمە لە کەلاوەیەکدا دەخەوتین و نەدەهاتیینە ئێرە.' خەلیفە گوتی: 'مەگەر ئێرە ماڵی ئێوەش نییە؟' گوتیان: 'بیریشـمان لێ نەدەکردەوە ڕێمان لێرە کەوێ. دەڵێی ماڵی ئەو پیاوەیە.' ئاماژەیان بۆ کۆڵبەرەکە کرد. کۆڵبەرەکە گوتی: 'بە خودا منیش جگە لەمشەو، ئێرەم نەدیوە.'

"ئینجا گوتیان: 'ئێمە حەوت پیاوین و ئەوانە سێ ژن. ئێمە بە خۆشی ڕاستی ئەو شتانەیان لێ دەپرسین، ئەگەر بە خۆشی وەڵامیان، داینەوە ئەوە باشە، ئەگەر بە خۆشی وەڵامیان نەداینەوە، ئەوە بە زۆر پێیان دەدرکێنین.' هەموویان ڕازی بوون جگە لە جەعفەر کە ئەو لەگەڵیان نەبوو. گوتی: 'ئەوە کارێکی باش نییە. لێیان گەڕێن چ دەکەن با بیکەن. ئێمە لەلای ئەوان میوانین و گفتیان لێ ئەستاندووین کە قسە نەکەین. ئێستا ئەوەندەی شەو نەماوە. هەر کەسەی دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی. کە ڕۆژ بووەوە، پرسیار دەکەین.' خەلیفە قسەکەی جەعفەری پەسند نەکرد و گوتی: 'لەوە زیاتر ناتوانم دان بە خۆدا بگرم.' دەیانویست بپرسن و بەڵام هیچ کام نەیاندەتوانی. تیروپشکیان کرد و بە ناوی کۆڵبەر هاتە دەرێ. کۆڵبەر هەستا بە خاوەن ماڵی گوت: 'خانمەکەم، بۆ خاتری خودا پێمان بڵێ بۆ ئاوات لەو دوو سەگەت کرد و دوایە بۆ ماچت کردن و بۆیان دەگریای؟ شتێکی دیکەش ئەو شوێنی قامچییانە چن و بۆ لەسەر لەشی ئەو خانمانە بوون؟ وەڵامی ئەو پرسیارانەمان بدەوە و هیچی دیکە.' کچە گوتی: 'ئەرێ جەماعەت، ئێوەش لەسەر قسەی ئەو کابرایەن؟' هەموو گوتیان: 'بەڵێ، قسەی ئەو قسەی ئێمەشە.' جگە لە جەعفەری وەزیر کە هیچی نەگوت. کچە کە ئەوەی بیست، گوتی: 'ئەی میوانە بێبەڵێنەکان، ئێمەتان نارەحەت کرد و نەتانزانی کە هەرکەس قسەی نابەجێ بکا، بەشی ڕەنج و نارەحەتی دەبێ؟' ئیدی کچە بانگی کرد، لە جێوە حەوت کۆیلەی شیربەدەست هاتنە دەرێ. کچە گوتی: 'دەستی ئەو میوانە زۆربڵێیانە ببەستن.' کۆیلەکان دەستی میوانەکانیان بەست و گوتیان: 'خانم، فەرمان بدە با بیانکوژین.' کچە گوتی: 'ڕاوەستن، با هێندێک شتیان لێ بپرسم. دوایە دەڵێم بیانکوژن.' کۆڵبەرەکە گوتی: 'خانم، ئەمنیش بە ئاوری ئەوان مەسووتێنە، ئەوانە تاوانبارن کە کوتوپڕ خۆیان بێرەدا کرد. ئێمە بۆخۆمان شەوێکی خۆش و پڕ لە عەیش‌ونۆشمان بوو. خۆشییەکەیان لێ تاڵ کردین. ئیدی ئەو بەیتە شێعرەی گوت:

ئەوڕۆکە یار لە دژمە لە بیری تۆڵە دایە
تاوان چییە؟ نازانم، خۆزگە بمزانیبایە

"کە کۆڵبەر ئەو شێعرەی گوت، کچە پێکەنی."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی یازدەیەم هاتەوە

"شــەهرزاد گوتی: 'خاوەنشــکۆ، ســەرەڕای ئەوەی کچە زۆریش لە کۆڵبەر دڵپڕ بوو، بە قســـەکەی ئەو وە پێکەنین کەوت و بە جەماعەتەکەی گوت: 'ئێوە تازە ئەوەندەتان نەماوە، هەر کەسـەی قسـەی دڵی خۆی بکا.' دوایە ڕووی لە سـواڵکەرەکان کرد و گوتی: 'ئێوە ئەو سـییانە پێکەوە بران؟' گوتیان: 'نەوەڵا، ئێمە هەژارێکی سـەرگەردانین و جگە لەمشـەو قەت بە یەکەوە نەبووین.' دوایە ڕووی لە یەکێک لە سـواڵکەرەکان کرد و گوتی: 'تۆ زکماک ئاوا بە چـاوێکەوە لە دایـک بووی.' گوتی: 'نـا خـانم، ئەمن چـاوم هەبوو، کوێربوونی من بەسەرهاتێکی سەیرە.' لە دوو سواڵکەرەکەی دیکەی پرسی: 'ئێوە چی؟' ئەوانیش هەر وەک ســـواڵکەرەکەی دیکە گوتیان: 'ئێمە هەر کەســـەی خەڵکی شـــارێکین و بەســـەرهاتی سەیرسەیرمان هەیە.'

"کیژە گوتی: 'خەڵکینە، دانە دانە بەســـەرهاتی خۆتانمان بۆ بگێڕنەوە و بڵێن بزانم بۆ هاتوونەتە ئێرە؟' بەر لە هەموویان کۆڵبەر هاتە پێشـــێ و گوتی: 'ئەمن پیاوێکی کۆڵبەر بووم، ئەو دەلالە ئەمنی هێنـا ئێرە. ئەوڕۆ لەلای ئێوە بووم و لەگەڵ ئێوە ڕامـانبوارد و تەواو. ئەوە بوو بەســـەرهاتی من.' کچە گوتی: 'ئازادی کەن. با بڕوا.' کۆڵبەر گوتی: 'هەتا گوێم لە بەسەرهاتی هاوڕێکانم نەبێ، ناڕۆم.'

### بەسەرهاتی سواڵکەری یەکەم

"دوای ئەو ســواڵکەری یەکەم هاتە پێشــێ و گوتی: 'خانمەکەم، هۆی تاشـینی چەنەم و نابینایی من ئەوە بوو کە، بابم پاشای شارێک و مامم پاشای شارێکی دیکە بوو. ئەو ڕۆژە کە دایکم منی بوو، ئامۆژنیشـــم کوڕێکی بوو. چەند ســـاڵێک تێپەڕی و ئێمە هەردووکمان گەورە بووین. ئەمن چووم بۆ زیارەتی مامم. کوڕەمامەکەم زۆری بەخێرهاتن کردم. قەدر و ڕێزی باشی دەگرتم و بە هەموو جۆرێک خۆشـەویستی و دڵسـۆزی خۆی پێشـان دەدا. ڕۆژێک پێکەوە دانیشـتبووین بادەمان دەنۆشـی و مەسـت بووین. کوڕە مام گوتی:"کارێکم پێتە، نابێ بێقسـەییم بکەی.' ئەمن زۆرم سـوێند بۆ خوارد بێقسـەیی نەکەم. خێرا هەسـتا و ماوەیەک ون بوو. کە گەڕاوە، کچێکی مانگئاســـای لەگەڵ خۆی هێنا و بە منی گوت: 'ئەو کچە بەرە و لە فلانە گۆڕستان و فلان جێ لە سارداوەکە[1] چاوەڕێی من بە.' ئەمن نەمتوانی دژایەتی بکەم، کچەم هەڵگرت و چوومە ئەو شوێنە.

---

[1]. سارداو: ژێرخان، قوولکەی ژێر زەوی بۆ ئاوساردکردن.

" 'هێشــتا دانەنیشــتبووین کە کوڕە مامەکەم هات و کیســەیەک گەچ و تەشــوێیەک و تەشــتێکی ئاو هێنا. ســەری گۆڕێکی هەڵداوە کە لەنێو ســەرداوەکەدا بوو، گڵ و بەرد و شتەکەی لا دا. تاشە بەردێک وەدەر کەوت کە لەژێر ئەو بەردەوە کونێک و پەیژەیەکی لێ بوو. کوڕە مامەکەم ئاماژەی بۆ کچەکە کرد، کچە گورج چووە خوارێ. کوڕە مام ڕووی تێ کردم و گوتی: 'چاکەکەت لەگەڵ من تەواو بکە.' گوتم: 'چۆن بڵێی وا دەکەم.' گوتی: 'ئەگەر ئەمن لە پەیژەکە چوومە خوارێ، ئەتۆ بەردەکەی لەسەر ئەو کونە دانێوە و سەری گۆڕەکە داپۆشەوە. دوای ئەوە گەچەکە بگرەوە و گۆڕەکە بە گەچ دادە. بە جۆرێک کە کەس نەزانێ ئەو گۆڕە هەڵدراوەتەوە. با تۆش بزانی ئەوە ســاڵێکە ئەمن خەریکی ئامادەکردنی ئەو شــوێنەم و زەحمەتی پێوە دەکێشــم. هەتا ئێرەم ســاز کردووە. ئەو کارەم پێت بوو.' ئەوەی گوت و بە پەیژەکەدا ڕۆچووە خوارێ.

" 'ئەمن بەردەکەم لەسەر کونەکە داناوە و چۆنی گوتبوو ئاوام لێ کرد. ئیدی گەڕامەوە بۆ کۆشـکەکەی مامم. مامم چووبوو بۆ ڕاو. ئەو شـەوە بە هەزار خەم و دەرد و کەســەر ڕۆژم کردەوە. بەیانی بە پەشـیمانییەوە هەسـتام چوومە گۆڕسـتان. ســەرم داخسـت و ڕۆیشـتم بە تەواوی ولاتیدا گەڕام و بە سـەرسـوورماوییەوە چاوم دەگێڕا. بەلام سـارداو ببوو بە دڵۆپێک ئاو و بە زەوییدا ڕۆچووبوو. هەتا حەوت ڕۆژان هەموو ڕۆژێ دەچووم گۆڕسـتانم سـەنگ و سـووڕن دەدا، هیچ هەواڵێک لە گۆڕ و سـارداو نەبوو. لە تاوی کوڕە مامەکەم پرووکام و خەم دایگرتم. ناچار لە شار هاتمە دەرێ و گەڕامەوە بۆ لای بابم.

" 'کە گەڕامەوە دەروازەی شـارەکەی خۆمان، کۆمەڵێک هاتن و دەوریان دام و گرتیانم. قۆڵیان بەسـتم. ئەمن سـەرم لەو کارە سـووڕ مابوو. یەک لەوان کە لە خزمەت بابمدا بوو، منیش چاکەم لەگەڵ کردبوو، ســەری هێنا بن گوێم و گوتی: 'وەزیر و سـپا لە دژی بابت ڕاپەڕیون و بابتیان کوشتووە.' ئەمن بە بیستنی ئەو قسەیە گیانم دەرچوو. منیان بردە لای وەزیر. کۆنەقینێک لە نێوان من و وەزیردا بوو. بە منداڵی زۆر هۆگری تیروکەوان بووم. ڕۆژێک بە ڕێکەوت تیرێکم هاویشـــت، ڕاســـت لە چاوی وەزیر درا و کوێر بوو. بەلام لە ترسی بابم نەیوێرا هیچ بڵێ.

" 'بە کورتی و بە پوختی، وەزیر کە منی بە دەســتبەســتراوی دیت، ئاماژەی کرد کە بمکوژن. من گوتم: 'بۆ لە خۆڕا دەمکوژن؟' گوتی: 'ئەتۆ لە هەموو کەس تاوانبارتری' و ئاماژەیەکی بۆ چاوی خۆی کرد. منیش گوتم: 'خۆ بە ئانقەســـت ئەو کارەم نەکردووە.' گوتی: 'من بە ئانقەست ئەو کارە دەکەم.'

" 'ئەو جار گوتی: 'وەرە پێشێ' و بە قامکی خۆی چاوی چەپمی دەرهێنا و بە نۆکەرێکی خۆی گوت: 'بیبە لە دەرەوەی شـــار بیکوژە.' لەگەڵ نۆکەرەکە چووینە دەرەوەی شـــار.

دەست و پێم بەسترابوو. ویستی چاوم ببەستێ و بمکوژێ. من گریام، گوتم:

قەت پێم وا نەبوو ڕۆژێک بەینی من و تۆ وا بێ
هیوام بە کەس نەماوە چاکەی لە چاویدا بێ

" 'نۆکەرەکە کە گوێی لەو شێعرە بوو، بۆ ڕێز لە چاکەکانی من کە لەگەڵ ئەوم کردبوو، دەست و لاقمی کردەوە و گوتی: 'لەو وڵاتە بڕۆ و گیانی منیش و خۆشت مەخە مەترسییەوە، وەک شاعیر دەڵێ:

گوڵوڵەت لە شوێنێ کەوتە لێژێ
پێش ئەوەی ناکەس خراپەت بێژێ
بار بکە بڕۆ بۆ شوێنێکی تر
بۆ بەختەوەری و بۆ ژیانێکی تر
گەر دار و درەخت قاچی هەبوایە
لەو شوێنە دەڕۆی تەوری لێ بوایە

" 'کە ئەوەم لە نۆکەرەکە بیست، تەواو دڵخۆش بووم و نابینایەتیم بەلاوە سانا بوو. ڕێی شاری مامم گرتە بەر. هەر بە گەیشتنە کن مامم، ڕووداوەکە و ئەوەی بەسەرم هاتبوو، هەمووم بۆ مامم گێڕاوە. مامم دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'خەمبارترت کردم. بەینێکیشە کوڕە مامەکەشت دیار نییە.' ئیدی ئەوەندە گریا تا بێهۆش بوو. کە وە هۆشم هێناوە، چونکە هیچی دیکە نەمدەتوانی نهێنی کوڕە مامەکەم نەدرکێنم، بۆم گێڕاوە. مامم بە بیستنی ئەو ڕووداوە تۆزێک هاتەوە سەرەخۆ و گوتی: 'ئەو سارداوەم پیشان بدە.'

" 'هەر خێرا هەستاین و بەرەو گۆڕستان کەوتینە ڕێ هەتا ساردداوەکەمان دۆزییەوە. ئینجا گۆڕەکەمان داوە[1] و گڵ و بەردەکەمان خستە لاوە تا بەردەکە وەدەر کەوت. بەردەکەمان لەسەر کونەکە لا برد، بە نێردیوانەکەدا[2] پەنجا پلە چووینە خوارێ. گەیشتینە شوێنێکی بەربلاو، چەندین خانووی تێدا دروست کرابوو. لە هەرماڵێکدا یەک جۆر خواردەمەنی کۆ کرابووەوە، هەر لەو شوێنە تەختێکمان دی کە پەردەیان بەدەوردا کێشابوو. چووینە لای تەختەکە. مامم پەردەکەی لا دا، کوڕە مامەکەم لەگەڵ هەمان کچ لەسەر تەختەکە خەوتبوون و وا سووتابوون کە دەتگوت لە چاڵی ئاورت هاویشتوون. ئیدی مامم تفێکی لێ کرد و شەقێکی لێ دا و گوتی: 'ئەی ناپاک، لەوە خراپتر دەبووایە

[1]. دانەوە: هەڵقەندن، هەڵکەندن.
[2]. نێردیوان: پەیژە.

بەسەر بێ. ئەوە تۆڵەی ئەو دنیایەیە. ولعذاب الآخرة أشد وأبقى[1].' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. تۆڵەی ڕۆژی پەسڵان زۆر زۆر لەوە خراپترە و هەمیشەییە.

## کە شەوی دوازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ســـواڵکەرە نابیناکە گوتی: 'کە کوڕە مامەکەمم لەگەڵ کچەدا ئاوا دیت، زۆر ناڕەحەت بووم، لە قســـەکانی مامم ســـەرم ســـووڕ ما. پێم گوت: 'مامە، یانی ســـووتانی ئەوان بەو شـــێوەیە بەس نییە و ئەتۆش قســـەیان پێ دەڵێی و ســـەرکۆنەیان دەکەی؟' مامم گوتی: 'کوڕی خۆم، ئەو هەتیوە بە منداڵی حەزی لە خوشـــکەکەی خۆی دەکرد و هەمیشـــە دەنگم دەدان و دەمگوت منداڵن و چاک دەبن. کە هەردووکیان گەورە بوون، دەستیان تێکەڵ کردبوو. کە ئەوەم بیستەوە کوڕەکەم بیراز کرد١ و گوتم: 'وا مەکە، کارێک مەکە لە نێو خەڵکدا ئابڕوومان بچێ و ببینە گەپچاڕی خەڵک و سەرکۆنەمان بکەن.' کچەشم لێ دوور خستەوە و لێم شاردەوە. بەڵام کچەش دڵی پێیەوە بوو. کە زانییان من ناهێڵم وێک کەون و هەر لێکیان دوور دەخەمەوە، هاتوون بەپێی ڕێنوێنی شـەیتان ئێرەیان چێ کردووە و هەموو جۆرە خواردەمەنییەکیان هێناوەتە نێوی. لەو ڕۆژانەدا کە من چووم بۆ ڕاو، بە دەرفەتیـان زانیوە و هـاتوونەتە ئێرە. ئیـدی خودای گەورە لەو کـارەی ئەوان بێزراوە و ئاوای بەســـەر هێناون کە دیتت.' ئەو جار هەردووکمان بە گریان لە پەیژەکە هاتینە ســـەرێ. ســـەری کونەکەمان ناوە و گڵ و شـتەکەمان کردەوە سـەری و خەمناک و پەرێشـان هەر وا دەڕۆیشـتین کە دەنگی تەپڵ و دەهۆڵی سـپا بەرز بووەوە و تۆزی سـمی ئەسـپ بەری ئاسـمانی گرت. مامم گوتی: 'ئەوە چییە؟' گوتیان: 'وەزیری براکەت، براکەتی کوشـــتووە و ئێســـتا ڕوویان لێرە کردووە.' مامم کە توانای بەربەرەکانێی نەبوو، ناچار ملکەچ بوو. ئەمن لە دڵە خۆمدا گوتم ئەگەر بگەڕێمەوە، لە دەســـت وەزیر ڕزگارم نابێ. ناچار بۆ ئەوەی گومانم تێ نەکەن، چەنەگەم تاشـــی و جلێکی کۆنم لە بەر کرد. بەرەو داروسسەلام لە شار وەدەر کەوتم. بەشکوو ئەوە کەسێک بمگەیێنێتە لای خەلیفە. ئەوشەو گەیشتمە ئێرە، شوێن و مەبەستێکی تایبەتم نەبوو، ڕاوەستابووم و نەمدەزانی ڕوو لە کوێ بکەم کە ئەو ســـواڵکەرە یەکچاوەم لێ پەیدا بوو. ئەمن باســـی غەوارەیی خۆم بۆ کرد. ئەویش گوتی: 'وەڵا منیش غەریبم.' لەو قســـانەدا بووین کە ســـواڵکەرێکی دیکەش هات. ئەویش وەک باســـی کرد لە ئێمە نامۆتر بوو. وا بوو پێکەوە بووینە هاوڕێ و ســـەرگەردان دەخولاینەوە، هەتا بوو بە شەو و هەوا تاریک بوو. بێ مەبەست بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشتین هەتا ڕێمان کەوتە ئێرەی پرمەترسی.' کەنیشکەکە گوتی: 'دەستی بکەنەوە با بڕوا.' ئەویش گوتی: 'هەتا نەزانم چارەنووسی هاوڕێکانم بە کوێ دەگا لێرە ناڕۆم.'

---

١. بیرازکردن: قولکەقولکەکردن، گرنیگرنیکردنی بەردی ئاش و بەردی دەســـتاڕ بۆ ئەوەی باشـــتر کار بکا. واتە بۆ چاک کردنە. لێرەدا لێدا بە مەبەستی چاک کردن.

**بەسەرهاتی سواڵکەری دووەم**

"سـوالّکەری دووەم هاتە پێشـێ و گوتی: "خانمەکەم، ئەمن زکماک کوێر نەبووم، بەڵام بێچاویم بەسـەرهاتێکی سـەیری هەیە. ئەویش ئەوەیە کە من پاشـا و شـازادە بووم. لە تەمەنی دەساڵاندا قورئانم بە حەوت ڕێوایەت خوێند و هەموو زانستەکانم بە باشی خوێند. وتەی شـاعیران و گەورەپیاوان فێر ببووم، بەو شـێوەیە لە هەموو کەس لەسـەرتر بووم، ببوومە وێردی سـەر زمانی خەڵک و ناوبانگی وێژەزانی و نووسـەریم بە گوێی تەواوی پاشـاکانی ناوچەکە گەیشتبوو. وا بوو پاشـای هێند بانگی کردم بۆ ئەوەی کچەکەی خۆییم بداتێ. بابم چەندین کەشـتی دیاری و خەڵاتی پاشـایانەی ئامادە کرد و منی لەگەڵ چەند کەس لە پیاوەکانی سـواری کەشـتی کرد و بەڕێی کردین. مانگێکی ڕەبەق ڕۆیشـتین هەتا گەیشتینە وشکایی. خۆمان سواری ئەسپ بووین و بارەکانمان لە وشتران دا و ڕۆیشتین، ڕۆیشـتین تا لە دوور تەپوتۆزێک وە دیار کەوت. کە تۆزەکە نیشـتەوە، چەند سـوارێکمان لێ وە دیار کەوت. کە جوان سـەرنجمان دانێ، لە نەژادی عەرەب بوون. ئەسپی خوتەنییان لەژێردا و نێزەی خەتاییان بە دەسـتەوە بوو. تێمانگەیاندن کە ئەو دیارییانە هی پاشـای هێندن و ئێمە ڕاسـپێردراوین. گوتیان: 'ئێمە نە لەژێر فەرمانی پاشـای هێند و نە لە وڵاتی ئەویشداین.' ئیدی هێرشیان کردینە سەر، هێندێکیان لێ کوشتین. ئەوەی دی بەختیان هێنا و دەرباز بوون. ئەمنیش برینێکی قووڵم تێ بوو، هەڵاتم هیچ کوێشـم نەدەزانی. هەڵاتمە سـەر کێوێک و چوومە ئەشـکەوتێکەوە. تا بەیانی لە وێدا بووم. بەیانی هاتمە خوارێ و ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە شـارێکی خۆش. ئەوەندە بە پێیان ڕۆیشتبووم، ماندوو و شەکەت ببووم و ڕەنگم زەرد هەڵگەڕابوو. ڕووم کردە دووکانی بەرگدروویەک و سـڵاوم کرد. بە ڕوویەکی خۆشـەوە وەڵامی دامەوە و لێمی پرسـی کە بۆ کوێ دەچم. ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە. زۆری پێ ناخۆش بوو گوتی: 'ڕۆڵە گیان، لای کەس باسی ئەو ڕووداوە مەکە، نەکا کەسێک پێتان نەتەوی١ بێ و ئەو بەسـەرهاتە ببیسـتێتەوە.' پاشـان خواردمەنی هێنا و ئەو شـەوەمان پێکەوە بردە سـەر. هەتا سـێ ڕۆژان بەو شـێوەیە ڕابرد. ئەوجار بەرگدروو لە منی پرسـی: 'چ پیشـەیەک دەزانی؟' گوتم: 'زانام و هەموو زانسـتێک باش دەزانم.' گوتی: 'ئەو کووتاڵەی تۆ لێرە کڕیاری نییە و کەس حەز لە زانسـت و نووسـین و شـتی وا ناکا. دەست دە تەشوێیەک و گوریسێک لەگەڵ دڕووهەڵکەنان بکەوە و خەریکی دڕووهەڵکەندن بە.' ناردمی بۆ دەشتودەر و پێشی گوتم: 'خۆشت بە کەس مەناسێنە با نەکوژرێی.' ئیدی گوریس و تەشـوێی بۆ پەیدا کردم و لەگەڵ دڕووهەڵکەنان ڕۆیشـتم بۆ دەشـتودەر. ئەمن هەموو ڕۆژێک کۆڵێکم چرپیوچاڵ دێناوە و بە نیو دینار دەمفرۆشت. ساڵێکم ئاوا تێپەڕاند. ڕۆژێک چووم بۆ دڕوو هەڵکەندن، تووشـی جێگایەک بووم پڕ بوو لە داری قەدیمی،

---

١. نەتەوی: دژمن. دژمن.

سووتەمەنییەکی زۆری لێ بوو، دەستم دا تەشوێکە و خەریک بووم بنی دارێکم دەداوە کە ئاڵقەیەکی مسین وەدەر کەوت. گڵەکەییم لەسەر لا دا، دیتم ئەوە ئەو ئاڵقەیە لە تەختەیەک دراوە. ئیدی دەستم دا ئاڵقەکە و بە تەختەوە هەڵم گرت، سەیرم کرد لەبن تەختەکەوە پەیژەیەکی لێ بوو. لە پەیژەکە چوومە خوارێ، لەوێ بە دەرگایەکدا چوومە نێو کۆشکێکەوە، کۆشکێکی قایم و پتەو. لەنێو ئەو کۆشکەدا کیژێکی ژیکەڵەی تێدا بوو، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

جوانێک حۆری بەهەشتی عاشقی بێ
لێوی بە شەرابی بەهەشتی تەڕ بێ
مامزێکی سڕکە کەزیەکەی کەمەندە
کێ دەتوانێ دەرچێ لەو کۆت و بەندە؟

" 'کە ئەو کیژە چاوی بە من کەوت، گوتی: 'ئەتۆ جننی یا مرۆڤی؟' گوتم: 'مرۆڤم.' گوتی: 'ئەوە چۆناوچۆن بوو ڕێت لێرە کەوت؟ ئەمن ئەوە پێنج ساڵە چاوم بە مرۆڤ نەکەوتووە.' گوتم: 'ئەی پەریڕوو، سپاس شیاوی خودایە کە ئەمنی گەیاندە ئێرە تا بە دیداری تۆ خەم لە دڵم بڕەوێ.'

لە هەر کوێ تۆ لەگەڵما بی، ئەمن مەسروور و دڵشادم
ئەگەر بیرە ئەگەر بەندە، ئەمن سەربەست و ئازادم

" 'ئیدی بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە، لە تاوی من گریا و گوتی: 'ئەمنیش کچی پاشای دوورگەی ئابنووسم. ئەمنیش لە کوڕی مامم مارە کرابووم، لە شەوی بوکێنیمدا دێوێک منی ڕفاند و هێنامییە ئێرە. لێرە فەرشی چاکی بۆ هێناوم، هەموو جۆرە خواردنێکی بۆ داناوم. هەر دە ڕۆژ جارێکیش دێتەوە. شەو لەگەڵم دەخەوێ. فێریشی کردووم کە ئەگەر شتێکیش بوو، قامکم بنێمە بان ئەو دوو دێڕەی لەسەر ئەو قوببەیە نوسراوە. هەر کە من دەست لە سەر ئەو دێرە دانێم، خێرا دێوەکە لێرە ئامادە دەبێ. ئێستا چوار ڕۆژە ڕۆیشتووە و شەش ڕۆژی دیکە دێتەوە. ئەرێ بۆت دەکرێ پێنج ڕۆژ لەلای من بمێنیەوە و ڕۆژێک پێش ئەوەی دێوەکە بێتەوە، بڕۆی؟ بە تەنیا زۆر وەڕەزم.'

" 'گوتم: 'بەڵێ، سپاسگوزاریشت دەبم.' ئەو جار پەریڕوو گەشاوە و هەستا منی بردە گەرماو و جلوبەرگی داکەند، ئەمنیش جلەکانم داکەند. شەربەتی بۆ هێنام و دەرخواردی دام. پاشان چێشتی ساز کرد، خواردمان و دەستمان بە قسە کرد. ئینجا گوتی: 'کەمێک بخەوە.' ئەمنیش خەوتم. کاتێک هەستام، تەماشا دەکەم ئەو هەر لاقم دەشێلێ. ئیدی

دانیشـتم و دەسـتمان بە قسـە کردەوە. گوتی: 'بە تەنیا زۆر زۆر وەڕەز و نارەحەت بووم. سپاس بۆ خوا کە ڕێی تۆی لێرە خست.

قەت بـــاوەڕم نەدەکـــرد تـــۆ لە گەڵـــم بـــی
لەو دەشـــــت و بـیـــابـــانە ســــــوورەگـــوڵـــم بـــی
مـــن کە ســـــیـــس و ژاکـــاوی تــنــۆکـــێ ئـــاوم
کـــانـیـیـەکـــی فـــێـنـکـــی نـــاو دەشـــــت و دەرم بـــی

" 'کە ئەو شێعرانەم بیست، سپاسم کرد و سۆزی لە دڵمدا جێی گرت. ئەو ڕۆژەمان بە خۆشی و خواردن و خواردنەوە ڕابوارد و شەویش لە پاڵ یەک خزاین و نوستین.

شـــەوێک ســـــەرەتای خۆشـــــی و هەڵپەڕین
پـــاشـــــانیش مەســــتی و جـــا ئەوجـــار پەڕین

" 'بەیانی پێم گوت: 'ئەی ســــەرتۆپی خانمان، دەمەوێ لێرە ڕاتگوێزم و لە دەســـت ئەو دێوەت ڕزگار کەم.' بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'دێوەکە لە دە شەوان، شەوێک دێتەوە لای من و لەگەڵم دەنوێ، نۆ شەو بۆ تۆ دەبم.' گوتم: 'هەر ئێستا ئەو قوببەیە دەشکێنم و ئەو دێرە نووسراوەیە پرژ و بڵاو دەکەم، بەشکوو دێوەکە بێتەوە و بیکوژم.' کە ئەوەی بیست گوتی:

لەســــــەر مـــن خـــۆت مەخە مەیـــنەتەوە
دار و بەرد دژم چـــووەتە بـــۆســـــــەوە

" 'ئەمن گوێم نەدا بە قسەی ئەو و قوببەکەم شکاند.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سێزدەیەم هاتەوە

شەهرزاد گوتی:"خاوەنشکۆ، ئەو ڕوومانگە گوتی: ' 'کوڕی باش، بڕۆ دەرێ دوورکەوە. ئەوە دێوەکە ئێستا دەگاتێ.' ئەمن لە ترسان کەوش و تەشوێکەم لەبیر چوو، لە نێردیوانەکەوە هەڵاتمە سەرێ. کە تەماشام کرد دێوێکی ناحەز وەژوور کەوت و بە کیژەکەی گوت: 'چی بووە وا منت تۆقاند؟' کچەکە گوتی: 'جگە لەوەی بیری تۆم دەکرد، هیچی دیکە نەبووە.' دێوەکە گوتی: 'قەحبە، ئەوە درۆم لەگەڵ دەکەی؟' چاوێکی لە ڕاست و چەپی خۆی کرد و تەشوێ و کەوشەکانی دیت. گوتی: 'ئەوانە کەلوپەلی مرۆڤەکانن.' کچەکە گوتی: 'ئەمن تا ئێستا ئەوانەم نەدی بوو، ڕەنگە بۆخۆت لە دەرێڕا هێنابێتن.' دێوەکە گوتی: 'ئەی مەکرباز، دەتەوێ کەڵەکم لێ دەی؟' ئیدی هێنای هەر چوار پەلی بەستەوە و دەستی کرد بە لێدانی. ئەمن لە تاوان هەڵاتمە دەرێ و لە کارەکەی خۆم پەشیمان بوومەوە و سەری سەرسامیم بەر داوە و گەڕامەوە. کە چوومەوە لای بەرگدرووەکە، گوتی: 'دوێنێ شەو لە کوێ بووی؟ ئەوەندەت چاوەڕێ بووم، خەوم لێ نەدەکەوت.' من سپاسی دڵسۆزییم کرد و لە سووچێکی مزڵەکەی خۆم چۆکی خەمم لە باوەش گرت. وا بوو بەرگدروو هاتە لام و گوتی: 'پیاوێکی عەجەم لەسەر سەکۆیەک دانیشتووە و تەشوێیەک و کەوشەکانی تۆی پێیە، لە تۆ دەگەڕێ و دەڵێ: بەیانی بۆ نوێژ وە دەر کەوتم و ئەو تەشوێ و کەوشانەم لە ڕێگای مزگەوت دیتەوە. نەمزانی هی کێیە؟ کەسێک پێی گوتم بێم بۆ بازاری بەرگدرووان، بەرگدروویەکیش ناردمی بۆ لای تۆ. ئێستا ئەو لە دووکان دانیشتووە و چاوەڕێی تۆیە.' کە ئەوەم بیست، ڕەنگم زەرد هەڵگەڕا و پشووم سوار بوو. لەپڕ زەوی قەڵەشا و عەجەمێکی لێ هاتە دەرێ کە سەیرم کرد هەمان دێوە، تەشوێ و کەوشەکانی منی هەڵگرتووە و وەدوای من کەوتووە. هەر کە منی دیت، پڕی دامێ و بە هەوادا بردمی. دوای ماوەیەک نیشتەوە و لە زەوی چووە خوارێ و دروست لە هەمان کۆشک هاتە دەرێ. دیتم کچە ڕووتە و هەموو گیانی خوێنی لێ دەچۆڕێ. دێوەکە گوتی: 'قەحبە، ئەوە خۆشەویستەکەتە؟' کچە گوتی: 'ئەمن لەو جارە زیاتر ئەوم نەدیبوو.' دێوەکە گوتی: 'دوای ئەو لێدان و ئازاردانە دیسان درۆت کرد؟ ئەگەر ڕاست دەکەی و ئەو ناناسی، ها ئەوە شیر بیکوژە.' ئەو شیرەکەی لێ وەرگرت و بەرەو من هات، کە دیتی خوێن لە چاوم دەچۆڕێ، دڵی نەهات بم کوژێ و شیرەکەی فڕێ دا. دێوەکە شیرەکەی دا دەست من و گوتی ئەتۆ ئەو بکوژە و خۆت ڕزگار کە. ئەمن شیرەکەم لێ وەرگرت و چوومە پێشێ. کچە دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'ئەو هەمووە بەدبەختی و چارەڕەشییەت تووش کردم ئێستاش دەم کوژی؟' ئەمنیش شیرەکەم فڕێ دا و گوتم: 'دێوەکە، چ پیاوێک لە ژنان کەمتر بووە؟ ئێستا کە ئەو من ناکوژێ، چۆن من ئەو بکوژم؟

قەت ناتوانم بیکوژم.' دێوەکە گوتی: 'ئەڤین و خۆشەویستی ئێوە لە ئاستێکدا نییە بتوانن یەکتر بکوژن.' ئیدی بۆخۆی دەستی دا شیرەکە و دەست و قاچی کیژەکەی پەڕاندن. بە منیشی گوت: 'هۆی مرۆڤ، لە یاسای ئێمەدا ژنی بەدڕەوشت دەبێ بکوژرێ. ئەمن ئەو کچەم لە شەوی بووکێنیدا ڕفاند بوو. جگە لە من کەس دەستی لێ نەدابوو، ئێستا کە زانیم جگە لە من لەگەڵ کەسی دیکەش دەستی تێکەڵاو کردووە، ئەوە کوشتم. بەڵام لەلایەن تۆوە خەیانەتێکم لەگەڵ نەکراوە، ئەتۆ ناکوژم، بەڵام ناشهێڵم بە سڵامەت دەرچی. بۆخۆت بڵێ چیت لێبکەم؟' ئەمن زۆری لەبەر پاڕامەوە و لاڵامەوە کە ئەو جارە لێم خۆش بە خوداش لە تۆ خۆش بێ، بەڵام بێفایدە بوو. گوتی: 'زۆری لەسەر مەڕۆ، لە کوشتنت خۆش بووم.' بەڵام ناچارم بە جادوویەک بتگۆڕم. ئیدی لەپڕدا منی ڕفاند و بردمی بۆ ئاسمان دوایە لەسەر لوتکەی کێویک دانامەوە. مشتێکی خۆڵ هەڵگرتوو و ودمێکی لێ خوێند و بە سەر منیدا هەڵپرژاند، لەڕێوە بووم بە مەیموون. کە خۆم ئاوا دیت بە شینوگریان لە کێوەکە هاتمە خوارێ و یەک مانگی تەواو ئاوا ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە قەراخ دەریایەک، تاقمێکم دیت لەسەر کەشتی دانیشتوون و تەمایان بوو بڕۆن. ئەمن بێ ئەوەی بهێڵم بمبینن، بە فێڵێک خۆم لە کەشتییەکە هاویشت.

" 'ڕۆژێک خۆم شاردەوە و نەهاتمە دەرێ. دوایە کە منیان دیت، یەکێک گوتی: 'ئەوە بەدفەڕە[1]، لە دەریای هاوێن.' یەکێکی دیکە شیرێکی دا دەست کەشتیوان و گوتی: 'بیکوژە.' ئەمن بە هەردوو دەست خۆم بە شیرەکەوە هەڵاوەسی و ڕۆندکم باراند.

" 'کەشتیوان کە فرمێسکەکانمی دیتن، بەزەیی پێمدا هات و گوتی: 'کاکی بازرگان، ئەو مەیموونە پەنای بۆ من هێناوە، کەس ئازاری نەدا.' ئیدی من لەلای کەشتیوان مامەوە. هەر چی دەیگوت، خێرا لێی تێدەگەیشتم و بە گوێم دەکرد. ئەویش زۆرم بۆ باش بوو. ئاخری گەیشتینە وشکای و شارێکی گەورە و لە کەشتی دابەزین.

" 'لەڕێوە پیاوەکانی حاکمی ئەو شارە هاتنە پێشوازی بازرگانەکان و لەوحێکیان هێنا گوتیان: 'هەر کەسەی دێڕێک لەو لەوحەدا بنووسێ.' ئەمن هەستام لەوحەکەم لە دەست وەرگرتن. ترسان کە من لەوحەکە بشکێنم، لێیان دام و ویستیان لێم بستێنن. بە ئاماژە تێم گەیاندن دەمەوێ دێڕێک بنووسم. کەشتیوان گوتی: 'لێی گەڕێن با بینووسێ، چونکە ئەوم وەک منداڵی خۆم داناوە. ئەمن مەیموونی زانای وام نەدیوە.' پێنووسم لێ وەرگرتن و بە خەتی ڕیقاع ئەو شێعرەی خوارەوەم نووسی:

لە دەستت گەوراندا قەڵەم سەروەری
بە بۆنەی ئەوان ئەتۆ لە سەری
هەر کە مەزنێک دەستت دەداتێ

---

[1]. بەدفەڕ: شووم، ناموبارەک.

تــاجــی حــورمەتــت لە ســــەر دادەنـــێ
کە پــاڵ وە قــامــکــی گەورەیەک دەدەی
تــۆ مەیــدان بە بــێــهــونەر چــۆڵ دەکەی

" 'بە خەتی ڕێحانیش ئەو شێعرەم نووسی:
بە ڕواڵەت کــز و بــاریــک ڕەقەڵــۆکە و بــێــهــێــزی
کە بە ســــەر کــاغەزدا دێــی، فــرمــێســــک هەڵــدەڕێــژی
دەتــوانــی بە ئــامــاژە، کەســـــێــک بــبەیــتە ســــەر دار
یــان هەر بەو ئــامــاژەیە کەســـــێــک بــکەیــتە ســــەردار
بە کــورتــی هــێــز و تــوانــات، پــێــنــووس لە تــاریــف نــایە
ســــوکــانی کەشــــتــی ژیــان، لە بەر دەســــتــی تۆ دایە
ئەگەر بێــت و خــاوەنــت، خــاوەن خــووخــدەی بــاش بێ
بەهــاری خــۆشــــی و شــــادی، ئەو کــۆمەڵــگەیەش دادێ

" 'بە خەتی سولسیش ئەو دوو بەیتەم نووسی:
بە زیارەتــکــــەرت دەدەی لـــە کیسەی زیـــو بـــە سەخا
بە شـــــاعیرانیش دەدەی تــوورەکــــــەی زێڕ بە عەتــا
لــــــە دادگەری تــۆ نەبـێ، بــاڵــدار نــافــڕێــتە هەوا
هەر دادگەریــیەکەی تــۆیە بــاڵ و پەڕیــان پــێ دەدا

" 'دوایی لەوحەکەم داوە بە پیاوەکان. ئەوان لەوحەکەیان بردەوە بۆ لای حاکم جگە لە خەتی من، خەتی هیچ کامیانی پەســــند نەکرد و فەرمووی: 'جلکی گرانبای لە بەر خاوەنی ئەو خەتە بکەن و بە ســــواری بیهێننە کن من.' پیاوەکان پێکەنین. حاکم بە پێکەنینەکەیان نــارەحەت بوو، گوتی: 'بە چی پێدەکەنن؟' گوتیــان: 'قوربــان، ئێمە بە خــاوەنی ئەو خەتە پێدەکەنین کە مەیموونێکی مامۆســتایە، ئەوە لە کاتێکدایە ئاژەڵ شــت فێر نابێ.' حاکم پێی ســــەیر بوو، گوتی: 'ئەو مەیموونەی بۆ من بکڕن و جلوبەرگی باشــــی لە بەر بکەن و بە سواری بیهێننە لای من.' پیاوەکانی حاکم هاتن، ئەمنیان لە کەشتیوان کڕی و جلوبەرگێکی گرانباییان لە بەر کردم و بە سواری بردیانم بۆ خزمەت حاکم. من کوڕنۆشم برد و ئەویش ڕێی دام دانیشــــم. ئیدی لە ســــەر دوو ئەژنۆ دانیشــــتم. ئەوانەی لەوێ بوون ســــەریان لە نەجیبی من سووڕ ما.

" 'کە حاکم بازرگانەکانی بەڕێ کرد و بێجگە لە حاکم و گەورە گەورەکانی دەربار کەس نەمابوونەوە، سفرەیان ڕاخست و هەموو جۆرە خواردەمەنییەکیان لەسەر دانا. حاکم

ڕێی دام چێشت بخۆم. هەستام سێ چەلان١ زەویم ماچ کرد و بە ئەندازەی پێویستم خوارد. کە خوانەکەیان خڕ کردەوە و لایان برد، هەستام چووم لە سووچێک دەستم شوشت و پێنووس و کاغەزم دەست دایە و ئەو شێعرەم نووسی:

جێژنی وا پڕ پڕ لە شادی، تژی لە بەزم و هەڵپەڕین
کە باریوە بە سەرماندا، تیشک و گۆرانی و پێکەنین
کێ بیستوویە هەتا ئێستا دیلان و ئاهەنگ لەو جۆرە؟
ڕووحێکی شاد، لێو بە بزە، دڵ پڕ خۆشی هەمەجۆرە
هی گەورەیی سوڵتانمانە، ئەو هەموو بەزم و گوڤەندە
لە سای مەزنی ئەودایە، وڵاتمان پڕ بووە لە خەندە
حەساوەی هەر دوو دونیا بێ، خوایە بەو ماڵ و شکۆیە
بێ پارێزی لە چاو پیسان، لە هەرچی فێڵ و دەهۆیە

" 'ئەو جار دوور لە حاکم دانیشتم. حاکم سەری سووڕ مابوو. داوای کرد شەترەنج بێنن و گوتی: 'وەرە با شەترەنجێک بکەین.' ئەمن چوومە پێشێ و مۆرەکانم چنی، لە پیادە و سواران ڕیزەکانم ڕازاندنەوە و پیادەم جووڵاند و ئەسپم تاودا و وەزیرم هەڵگرت. حاکم لەڕێوە واقی وڕ ما و گوتی: 'ئەگەر ئەو مەیموونە مرۆڤ بایە، کەس تای نەدەکرد.' ئیدی بابنۆکەرەکەی نارد لە دوای کچەکەی، کچەکەی کە هاتە ژوورێ ڕووی گرت. حاکم گوتی: 'ئەوە چۆن بوو ڕووت داپۆشی؟' کیژەکەی گوتی: 'بابە، ئەو مەیموونە شازادەیەکە کە جەرجیس کوڕی ئیبلیس ئاوای لێ کردووە.' حاکم لە منی پرسی: 'ئەو قسەیە ڕاستە یان نا؟' ئەمن بە ئاماژە گوتم: 'بەڵێ، ڕاستە' و دەستم کرد بە گریان. حاکم لە کچەکەی پرسی: 'ئەوە ئەتۆ جادوو لە کوێ فێر بوی؟' کچەکەی گوتی: 'لە پیری زاڵ سەد و حەفتا جۆر جادوو فێر بووم کە کەمترینیان ئەوەیە: کە بەردەکانی ئەو شارەت هەمووی بۆ بەرمە پشت کێوی قاف و تەواوی خەڵکەکەی بکەم بە ماسی.' حاکم گوتی: 'ئەو گەنجەم بۆ ڕزگار بکە با بیکەم بە وەزیری خۆم.' کچەکەی قامکی بەڵێنی لە سەر چاوی دانا و دەستی دا وێردێک٢. بازنەیەکی لەسەر زەوییەکە کێشاوە.

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. چەلان: جاران (چەل: جار)

[2]. وێرد: کێرد، دمێکی وەک چەقۆی هەیە بەڵام دەسکەکەی نانوشتێتەوە، وێردی میوە. خواردن. وێردی چێشتخانە.

# که شەوی چواردەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەو ســـواڵکەرە یەکچاوە گوتی: 'خانمەکەم، کە کچە بە وێردەکە بازنەکەی کێشـاوە یەک-دوو تەلیسـمی تێدا نووسـی. ویرد و ودمی بەسـەردا خوێند. دیتم کۆشـکەکە تاریک بوو، دێوەکە پەیدا بوو. هەموو لە ترسـان سـام گرتینی. کچی حاکم پێی گوت: 'لا اهلا و لا سهلا!'[1]

" 'دێوەکە وەک شـــێر جوابی[2] داوە: 'ئەی خەیـانەتکـار! بۆ بەڵێنیـت لە بیر کرد و پەیمانشـــکێنیت کرد؟ ئاخر من و تۆ بەڵێنیمان دابوو یەکتر ئازار نەدەین. ئێســـتا کە تۆ ڕەچاوت نەکرد، خۆت بگرە.' ئیدی زاری کردەوە و وەک شێر نەڕاندی.

" 'کچە موویەکی لە بسـکی دەرکێشـا و ودمێکی بە سـەردا خوێند و فووی لێ کرد. لە جێوە بوو بە شیرێکی تیژ و شێرەکەی دووقاش کرد. سەری شێرەکە بوو بە دووپشک و کچەکەش بوو بە مـارێکی گەورە و بە گژ یەکتردا چوون. دوایە ئەو دووپشـــکە بوو بە هەڵۆیەک و کچەش بوو بە داڵ و ماوەیەک بەشـــەڕ هاتن. دێوە بوو بە پشـیلەیەکی ڕەش. کچە چووە قاڵبی گورگەوە. دێوە بوو بە هەنارێک و فڕێ درایە هەوا و بەر بووەوە. پرژ و بڵاو بوو. هەر دەنکەی چوو بۆ لایەک. دەنکە هەنـار وڵاتی داگرت. خێرا کچە بوو بە کەڵەشـــێرێک و هەموو دەنکە هەنـارەکـانی هەڵگرتنەوە، دەنکێک نەبێ کە چوو بۆ لای حەوزەکە. کەڵەشـــێرەکە بەرە و دەنکەکە باڵەپرژەی کرد. بەڵام ئێمە لێی تێنەگەیشـــتین. ویســـتی بیگاتێ و بە دندووک ئەو دەنکەش هەڵگرێتەوە، بەڵام فریای نەکەوت. دەنکەکە کەوتە ناو حەوزەکەوە و بوو بە ماسـی. کیژە خۆی لە ئاوەکە هاویشـت و بوو بە نەهەنگ. پێک هەڵپرژان، هاواریان کرد تا دێوەکە هاتە دەرێ. بوو بە یەک پارچە ئاگر و لە کونی زار و لووت و چاوییەوە گڕ دەهاتە دەرێ. کیژە بوو بە خەرمانی ئاگر. ئێمە لە ترسان ویستمان خۆمان لە حەوزەکە هاوێین.

" 'ئەو ئاگرانە بە شـــەڕ هاتن، یەکتریان ئاگرباران دەکرد. بڵێســـەکەیان دەگەیشـتە ئێمە، بەڵام بڵێســـەی کیژەکە ئازاری نەدەداین. لەپڕدا بڵێســـەیەک لە ئاگری دێوەکە لە چاوی منی دا و چاومی کوێر کرد. بڵێســـەی گڕێکیشـی لە حاکم درا و چەنەی ســووتا و شـەویلکە و ددانەکانی نەهێشـت. یەکی دیکەش وەبەر ســینگی بابنۆکەرەکە کەوت و لە جێوە مرد. ئێمە خۆمان بۆ مردن ســـاز کردبوو، هەر وا لە دڵەڕاوکێدا بووین کە وێژەر گوتی: خَذَل مَن کَفَرَ

---

[1]. چەند ناحەز و ناخۆش هاتی.

[2]. لە شێوەی شێردا وەڵامی داوە.

ويليۆن سيّد البشر."١

" 'ئەوەندەی پێ نەچوو، دیتمان کچی حاکم لەنێو گڕەکاندا هاتەدەرێ و دێوەش بوو بە خۆڵەمێش. دوای ئەوە کچە هاتە لای من و داوای ئاوی کرد، دۆعایەکی بە سەردا خوێند و بەسەر منیدا هەڵپرژاند. ئەمن وەک ئەوەڵم لێ هاتەوە، بەڵام چاوێکم نەبوو.

" 'کیژە بە حاکمی گوت: 'بابە، منیش دەمرم، ئەگەر فریا کەوتبام ئەو دەنکە هەنارەم هەڵگرتباوە و نەمهێشـــتبا بکەوێتە حەوزەکەوە، ڕزگارم دەبوو. بەڵام کەمتەرخەمیم کرد. هیچ لەگەڵ قەزا و قەدەر ناکرێ. دەڵێن ئەگەر قەزا هات، نۆشـداریش حۆل دەبێ. کچە هەر خەریکی قسـە و باس بوو کە گڕێک لە سـینگی درا و بوو بە خۆڵەمێش. هەموو واقمان وڕ ما. ئەمن دەمگوت خۆزگە من بام و ئەو پەیکەری جوانییە کە ئەو هەمووە چاکەیەی لەگەڵ من کرد، نەبایە. حـاکم کە کچەکەی خۆی ئـاوا دیـت، جلی لە بەر خۆی دادڕی. کچـان و کەنیزەکان دەستیان کرد بە شین و گابۆڕ و هاوار، ماتەمینی حەوت ڕۆژی خایاند.

"'دوای ئەوە حاکم خۆڵەمێشـــی دێوەکەی بە با دا و لەســـەر خۆڵەمێشـــی کچەکەی گومبەزێکی ســـاز کرد. هەموو ڕۆژێک دەچووە نێو قسـنەکەی٢ دەگریا، ئەوەندە گریا هەتا حاکم تووشی نەخۆشییەکی گران بوو. دوای مانگێک وردە وردە چاک بووەوە.

" 'ڕۆژێک منی بانگ کردە لای خۆی و گوتی: 'خۆزگە ڕووی نامبارەکی تۆم نەدەدی و تووشی ئەو دەردە نەدەبووم. بەو ڕۆژە نەدەگەیشتم. تۆ بوویتە هۆی تێداچوونی کچەکەم. ئێستاش هەستە و هەرچی زووترە بڕۆ و لە بەرچاوم ون بە. لەو شارە نەمێنی.'

" 'ئەمنیش هەستام چووم بۆ گەرماو، چەنەم تاشی و لە شار وەدەر کەوتم. نەمدەزانی ڕوو لە کوێ بکەم. سەرم لە بەختی خۆم ماسیبوو. بیرم لەو بەختە ڕەشەی خۆم دەکردەوە و دەگریام و ئەو شێعرەم دەگوت:

هـــاوارم لە دەســـــت، چەرخـــی دەورانە
وا مـــنـــی کـــردە پەنـــدی زەمـــانە
کـــاس و ســـــەرگەردان، گـــێـــژم لەو نـــاوە
بـــۆخـــۆشـــــم گـــیـــرم، بـــوام لـــێ قەومـــاوە
هـــیـــچ هـــیـــوام نەمـــا، بە چەرخـــی گەردوون
دەســـــتم شـــــوتووە هەر لە خوددی بـــوون

---

١. کەسێک پشت لە دینی سەروەری مرۆڤان بکا، ڕسوا دەبێ.
٢. قسن: مەزار.

" 'ئیدی چۆڵ و چیام بڕی و خۆم گەیاندە داروسسەلام بۆ ئەوە بکرێ و خەلیفە لە حاڵ و وەزعی خۆم ئاگادار کەمەوە. کە گەیشــتمە ئێرە تووشـــی ســـواڵکەری یەکەم بووم کە ئەویش تازە گەیشـتبووین. خەریک بووین قســەمان دەکرد، ســواڵکەری ســێیەمیش هات. پێکەوە بووینە هەواڵ و خەریک بووین دەگەڕاین، وا بوو قەزا و قەدەر ئێمەی تووشی ئێرە کرد.'

"خاوەنماڵ گوتی: 'دەســت و پێی بکەنەوە. ئازادە با بڕوا.' کە دەســت و پێیان کردەوە، گوتی: 'هەتا گوێم لە بەسەرهاتی ئەوانەش نەبێ، ناڕۆم.'

### بەسەرهاتی سواڵکەری سێیەم

"ئەو جار ســواڵکەری ســێیەم هاتە پێشــێ و گوتی: 'ئەمن بەســەرهاتێکم هەیە لە هی هەردووکیان ســـەیرترە. ئەویش ئەوەیە من شــــازادەیەک بووم. کە بابم فەوتی کرد، لە جێگاکەی دانیشــتم. دادپەروەر بووم. خەڵک و ســپام لێ ڕازی بوون. بەڵام زۆرم حەز لە گەشــت و گەڕانی ناو دەریا و دوورگەکان بوو. ڕۆژێکیان گوتم دە دانە پاپۆڕ ســاز کەن، دەچین بۆ گەڕان. بژیوی مانگێکمان لە پاپۆڕەکان دا و سوار بووین. بیست ڕۆژ لە دەریادا گەڕاین و ڕامانبوارد هەتا گەیشــتینە دوورگەیەک، دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە دیســان ســوار بووینەوە، بیست ڕۆژی دیکە لە دەریادا ماینەوە و ڕامانبوارد.

" 'شــەوێک لەو شــەوانە بای دژەڕەوت هەڵی کرد و هەتا بەری بەیانی دەریای بەیەکدا دا و شڵەقاندی. کە ڕۆژ بووەوە، بایەکەی خست و پاپۆڕەکە ئەهوەن بووەوە. بەڵام ئاوەکە گۆڕابوو. کەشتیوانەکە چووە سەر ئەستوندی کەشتییەکە و بە شڵەژاوی هاتەوە خوارێ. ســـەرپێچەکەی توند لە زەویدا دا و دەمانچەکەی ڕوو بە ســـەری خۆی ڕاگرت و گریان ئەوکی گرت. لێمان پرسی: 'چ بوو؟ بۆ وا دەکەی؟'

" 'گوتی: 'خۆتان ســاز کەن هەمووتان قڕ دەبین.' گوتمان: 'کەشــتیوان، پێمان بڵێ بۆ؟' گوتی: 'پاشــا، کە چوومە ســەرێ ڕەشــاییەک دیار بوو. جارێک ڕەش و جارێک ســپی دەچووەوە. ئەو کێوە کارەباییە، یازدە ڕۆژە ئێمە بە لاڕێدا ڕۆیشتووین. ئیدی ئەو پاپۆڕەی ئێمە ڕێگەی دەربـازبوون نـابینێتەوە. لەگەڵ زەردەی بەیـانی ئێمە دەگەینە ئەو کێوە. ئەو کێوە پاپۆڕەکە بۆ لای خۆی دەکێشــێ. ئەوەندە بە هێزە، هەرچی بزماری لەو کەشــتییەدایە دەری دەکێشــێ و کەشــتییەکە لەبەریەک هەڵدەوەشــێنێ. پاشـام، لەســەر لوتکەی ئەو کێوە گومبەزێکی مســینی لێیە. پەیکەری ســوارێکی لە مس چێکراو لەســەر گومبەزەکەیە. ئەو ســواره ڕمبێکی بە دەســتەویە. لەوحێکی بە ملییەوە هەڵواســراوە کە هێندێک تەلیســمی بەسەرەوەیە. ئەو تەلیسمە هی ئەوەیە کە هەر پاپۆڕێک بەو شوێنەدا تێپەڕێ، تێک بشکێ.

هیچ ڕێگایەکیش بۆ بەتاڵ بوونەوەی ئەو تەلیسمە نییە، جگە لەوەی ئەو سوارە لەسەر ئەو ئەسپە بهێندرێتە خوارێ.' کە کەشتیوانەکە ئەو قسانەی کرد، هەموو دەستیان کرد بە شین و گریان و خۆیان بۆ مردن لە دەسک نا[1]. کە ڕۆژ بووەوە، گەیشتینە کێوەکە. بزمارەکانی پاپۆڕەکە لە پاپۆڕەکە دەردەکشـــان و لە چاوترووکانێکدا بە بەردەکانەوە دەنووســـان و تەختەکـان بڵاو دەبوون. خەڵکەکە تـاقمێکیـان نوقم بوون و هێنـدێکیش ڕزگـارمـان بوو. ئەمنیش خۆم خستە سـەر تەختەیەک و شـەپۆل بەرەو کێوەکەی ڕادام. ئیدی چوومە سـەر کێوەکە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

[1]. خۆ لە دەسک نان: خۆ ئامادە کردن.

## که شەوی پازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، سوالکەری سێیەم گوتی: 'خانمەکەم، ئەمن بە کێوەکەدا هەڵگەڕام، شوکری خودام کرد، ڕزگارم بوو. چوومە نێو گومبەزەکەوە و لەوێدا خەوتم. لە پێوارەوە[1] دەنگێک هاتە گوێم، گوتی: 'فلانی، کە لە خەو هەستای، ئەو شوێنە بدەوە[2] کە لێی خەوتووی، کەوانێک و سێ تیر کە تەلیسمیان لەسەر نووسراوە، لەو قوڵکە دایە. دەریانهێنە، بە تیر لەو سوارە بدە کە لەسەر گومبەزەکەیە و وردوخاشی بکە. خەڵک لەو بەڵایە ڕزگار کە. کە لە سوارەکەت دا، دەکەوێتە دەریاوە، ئەتۆ کەوانەکە لە جێی خۆیدا بشارەوە. ئەگەر ئەو کارەت کرد، ئاوی دەریاکە هەڵدەستێ و هەتا ڕێکی لوتکەی شاخەکە دێ.

" 'ئەو جار گەمییەیەک دێتە لات، کەسێکی تێدایە. لەگەڵی سوار دەبی و بە دە ڕۆژ تۆ دەباتە قەراخ دەریا. لەوێش تووشی کەسێکی دیکە دەبی کە دەتباتەوە شارەکەی خۆت. بەڵام لەو دە ڕۆژەی کە لە لۆتکەکەدای، نابێ ناوی خودا بەسەر زارتدا بێت.

" 'ئیدی من بە دڵێکی خۆشەوە لە خەو هەستام، لە خەونەکەدا چییان پێ گوتبووم، ئاوام کرد. دە ڕۆژ بوو لە لۆتکەکەدا بووم کە لە دوورەوە دوورگەیەک وەدەر کەوت. من لە خۆشیان دەستم کرد بە شوکر و سپاسی خودا. لەڕێوە ئەو کابرایە منی لە دەریاکە هاویشت. هەرچۆنێک بوو بە مەلە خۆم گەیاندە دوورگەکە.

" 'ئەو شەوە لەوێدا خەوتم. بەیانی هەستام، بەڵام شارەزای هیچ کوێ نەبووم، بەدەوری خۆمدا دەخولامەوە. هەر جارەی ڕووم لە لایەک دەکرد. سەرگەردان دەخولامەوە لە خودا دەپاڕامەوە ڕزگارم بکا. وا بوو کەشتییەک لە دوورەوە وەدیار کەوت. لە ترسان چوومە سەر دارێک. کە کەشتییەکە گەیشتە کەناراوەکە، دە کۆیلە لێی دابەزین و هاتن لەنێو دوورگەکەدا جێگایەکیان هەڵداوە و گڵ و خۆڵ و شتەکەیان وەلا دا. دەرخۆنەیەکی[3] دارین وەدەر کەوت. دەرخۆنەکەشیان لا برد.

ئەو جار گەڕانەوە نێو کەشتییەکە، نان، کاڵەکە، ئارد، ڕۆن و هەنگوین و مەڕیان لێ داگرت و بردیانە ئەو قوڵکەیەوە. دوای ئەوەی کۆیلەکان لە قوڵکەکە هاتنە دەرێ. سەری قوڵکەکەیان ناوە. جلوبەرگی باشیان پێ بوو، پیاوێکی پیری باڵابەرزیان لەگەڵ بوو. لەبەر پیری بێهێز دیاری دەدا. دەستی منداڵێکی مووڕەشی سپیکەڵانەی گرتبوو. ڕۆیشتن،

---

١. پێوار: غەیب

٢. دانەوە: هەڵکەندن، هەڵقەندن.

٣. دەرخۆنە: سەری تەندوور و بیر و شت، شتێکە کە لە دار و ئاسنەواڵە و چیمەنتۆ و شت دروست دەکرێ، سەری بیر و تەندوور و قوڵکە و شتی پێ دەگرن.

ڕۆیشتن هەتا لە چاو ون بوون.

" 'ئەمن لە دارەکە هاتمە خوارێ. گڵەکەم لەسەر دەرخۆنەکە لا دا و دەرخۆنەکەم لا برد. کونەکە وەدیـار کەوت، پەیژەیەکی پێوە نرابوو، لە پەیژەکە چوومە خوارێ. گەیشـــتمە شـــوێنێکی بەربڵاو. لەوێ دەرگایەکی لێ بوو بەســـەر باخێکدا دەکراوە. لەو باخەشـــەوە دەرگایەک بەســـەر باخێکی دیکەدا دەکراوە. لەو باخەشـەوە دەرگایەک دەچووە باخێکی تر، بەو جۆرە هەتا سی و سێ باخ دەڕۆیشت. لە هەمووشیاندا داری بەری لە گشت چەشنێک و گوڵی ڕەنگاوڕەنگی واوای تێدا بوو کە زمانی نووســەری ئەم دێڕانە لە ئاســتیدا لاڵە. لە ئاخرین باخدا دەرگایەکی تێد بوو، پێوە درابوو. کە دەرگام کردەوە، ئەســـپێکی زینکراوم دیت. چوومە پێشـــێ و ســـواری بووم. ئەســـپ وە حەوا کەوت. بە حەوادا بردمی هەتا لە ســەربانیماڵێک دانیام. لەو جەنگەیەدا کلکی ڕاوەشـاند و لە چاوی منی دا و کوێری کردم. بۆخۆیشی خۆی ون کرد.

" 'لە سـەربانی ئەو ماڵە هاتمە خوارێ. دە گەنجی ڕووتم دیت، ویسـتم لە لایان دانیشـم، بەڵام ڕێیان نەدام. سەری خۆم هەڵگرت و ڕۆیشتم، ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە داروسسەلام. چوومە گەرماو و چەنەگەم تاشـــی. وەکوو ســـواڵکەر دەســـووڕامەوە تا تووشـــی ئەو ســـواڵکەرانە بووم. ســـڵاوم لێ کردن و باســـی غەوارەیی خۆم بۆ کردن. ئەوانیش گوتیان ئێمەش غەوارەین. ئیدی هەرســـێکمان بووینە هاوڕێ و دەســـووڕاینەوە کە وا بوو ڕێمان لێرە کەوت. هۆی کوێربوونی ئەو چاوەی من ئەوە بوو.'

"کچە گوتی: 'دەست و پێی ئەوەشیان بکەنەوە با بڕوا.' ئەو جار کچە ڕووی لە خەلیفە و جەعفەر و مەسروور کرد و گوتی: 'ئێوەش بەسەرهاتی خۆتان بگێڕنەوە.'

"جەعفەر گوتی: 'لە کاتی هاتنماندا گوتم کە ئێمە بازرگانی تەبەرســـتانین، لە میوانی بووین و ئێستا ڕێمان ون کردووە.'

"کچە کە قسەکانی جەعفەر و مەندوماقووڵییەکەی دیت، گوتی: 'ئێوەم بە یەکتر بەخشی.'

"بەو جۆرە هەموویان ئازاد بوون و هاتنە دەرێ. خەلیفە ســـواڵکەرەکانی بە جەعفەر ســـپارد تا میوانداریان بکات و بۆخۆی گەڕاوە بارەگای خۆی. کە ڕۆژ بووەوە، خەلیفە لەسەر جێگاکەی خۆی دانیشت. داوای کرد سێ کچە و سێ سواڵکەرەکە و ئەو دوو سەگە بێنن. کە هێنایانن، خەلیفە ڕووی لە کچەکان کرد و فەرمووی: 'چونکە ئێوە لە ئێمە خۆش بوون، ئێمەش لە ئێوە خۆش دەبین. ئەگەر منتان نەناســـیوە، بزانن من هاروونەڕەشـــیدم. جگە لە قسـەی ڕاست، هیچی دیکەتان لێ نەبیستم. ئێستا بڵێن بزانم، ئێوە کێن؟" کچەکان گوتیان: 'ئەی خەلیفە، ئێمە بەسەرهاتێکی زۆر سەیروسەمەرەمان هەیە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## چیرۆکی خانم و دوو سەگەکەی

شەهرزادە گوتی: "خاوەنشکۆ، کچە گەورەکەیان چووە پێشێ و کورنۆشی برد و گوتی: 'گەورەم، من بەسەرهاتێکی من زۆر سەیرە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو دوو سەگە لە بابەوە خوشکی منن و منیش لەوان گەورەترم. کاتێک باوکم مرد پێنج هەزار دیناری زێڕی بە میرات بەجێ هێشت. خوشکەکانم هەرکامیان بەشی خۆیان وەرگرت و دایان بە جیاز و شوویان کرد. پاش چەند ساڵ مێردەکانیان پارەکەیان لێ ئەستاندن و کەلوپەلیان پێ کڕی و لەگەڵ ژنەکانیان دەستیان بە بازرگانی کرد. چوار ساڵ لە هەندەران بوون. سەرمایەکەیان لە دەست چوو. مێردەکانیان لێیان جودا بوونەوە و ئەوانیش کەوتنە سواڵ و هاتنەوە لای خۆم. وایان لێ قەومابوو من بە زەحمەت ناسیمنەوە. کە لە بارودۆخیانم پرسی، گوتیان: 'پێویست ناکا. گێڕانەوەی، دەردمان دەرمان ناکا، چارەنووسمان ئاوا بووە.'

" 'ئەوانم ناردە گەرماو و جلوبەرگی شیاوم دانێ و قەدرم گرتن، گوتم: 'چم زۆرە ماڵی دنیا. تەواوی ئەو ماڵە هی من و ئێوەیە.' ئیدی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاترم چاکە لەگەڵ دەکردن، هەتا ساڵێک ئاوا تێپەڕی.

" 'ئەوان لە ماڵەکەی من پاشەکەوتیان کردبوو، هەڵیان پێچام مێردمان دەوێ. گوتم: 'پیاوی چاک لەو دنیایەدا زۆر کەمە. ئێوە مێردتان کرد و تاقیتان کردەوە. دیسان شووکردنەوە هیچ قازانجێکی نییە.' ئەوان قسەکەی منیان قەبووڵ نەکرد. ئەمن لە ماڵی خۆم جیازم بۆ کڕین و بە مێردم دانەوە. هەرکەسەی لەگەڵ مێردی خۆیدا ڕۆیشت. پاش ماوەیەک مێردەکانیان فریویان دان و ئەوەی بوویان لێیان ئەستاندن. بردیانن بۆ سەفەر و لە ڕێگادا لێیان جودا بوونەوە و بەرەڵایان کردن. ئەوانیش ڕووت و ڕەجاڵ گەڕانەوە لای من و پەشیمان بوونەوە. بەڵێنیان دا کە تازە باسی شووکردن نەکەنەوە. ئەمنیش پەنام دان و لە جاری پێشوو لەگەڵیان چاکتر بووم. هەتا ئەوەی دیسان ساڵێک بەسەر چوو. ئەمن هێندێکم کاڵا و شت کڕی، ویستم بچم بۆ بەسرە و ماڵەکەم بەوان سپارد. کەچی ئەوان گوتیان ئێمە تاقەتی دووری تۆمان نییە. ناچار ئەوانیشم لەگەڵ خۆمدا سواری کەشتی کرد. ڕۆیشتین، ڕۆیشتین هەتاکوو زانیمان کەشتیوانەکەمان کەشتییەکەی بە لاڕێدا بردووە. دوای چەند ڕۆژ شارێک وەدەر کەوت. لە کەشتیوانەکەمان پرسی: 'ئەوە کام شارە؟' گوتی: 'نازانم، تەمەنێکە پاپۆڕ دەئاژووم، چاوم بەو شارە نەکەوتووە و قەتم نەدیوە. ئێستا کە ڕێمان کەوتووەتە ئێرە، ئەتۆ بچۆ کاڵا و شمەکەکانی خۆت ورد کەوە. ئەگەر کڕیاریش نەبوو، ئەوە یەک-دوو ڕۆژ لێرە دەمێنینەوە و پێداویستی خۆمان دەکڕین و بەرەو شوێنی خۆمان وەڕێ دەکەوین.' دوای ئەوە کەشتیوان هەستا چووە ناو شار. زوو گەڕاوە و گوتی: 'هەستن بچینە ناو شار و توانای خوای مەزن ببینن.' ئیدی ئێمە چووینە ناو شار و

ســـــەیرمان کرد، ئەوە خەڵکی ئەو شـــــارە تەواوی بوون بە بەردی ڕەش. زێڕ و زیو و شـــتومەکی دیکەیان وەک خۆیان مابووەوە. ئێمە واقمان وڕ ما. هەریەکەی بە لایەکدا بۆ سەیر و تەماشای شار بڵاو بووینەوە، ئەمن چووم بۆ کۆشکی پاشا. سەیرم کرد هەموو دەفرەکانیان لە زێڕ و زیوە. پاشام دیت لە سەر تەختەکەی دانیشتبوو. وەزیر و ڕاوێژکار و فەرماندەی ســـوپا و خزمەتکارەکانی هەمووی لەدەوری ڕاوەســـتان بوون و هەر هەمووشیان ببوونە بەرد. سەر تەختەکەی بەردەمیشیان پڕ بوو لە زێڕ و جەواهێرات کە وەک گوڵئەســـتێرە دەدرەوشـــانەوە. ســـەرێکی حەرەمســـەرام دا. شـــاژنم دیت تاجی بە سەرەوە، ملوانکەی نەقیمدار و گەردانەی زێڕ لە ملدا و جلوبەرگ و خشڵ و شت هەمووی لە جێی خۆیان بوون. بەڵام شـاژن ببووە بەردێکی ڕەش. لەوێ چاوم بە دەرگایەک کەوت. لەو دەرگایەوە چوومە ژووری. نێردیوانێک١ لەوێ بوو، پێیدا ســـەر کەوتم. گەیشـــتمە هەیوانێک کە فەرشـــی ئاوریشـــمی لێ ڕاخرابوو. تەختێکی ڕازاوە بە دوڕ و گەوهەر لە ســـەرەوەی هەیوانەکە داندرابوو. کە زێڕ و جەواهێراتی درەوشـــاوەتر لە مانگی لەســـەر داندرابوو. دوای ئەوە چوومە شـــوێنێکی دیکە و شـــتی زۆر ســـەیرترم بینی. کە بە دیتنی ئەوان ترسم وەبەر نیشت و حەپەسام. کە بوو بە شەو، ویستم لە کۆشک بێمە دەرێ، بەڵام ڕێم دەرنەکرد. لەو شـوێنەی تەختە ڕازاوەکەی لێ بوو، نووستم. شـەو لە نیوە لای دابوو، گوێم لە دەنگی قورئانخوێندنەوە بوو. زوو هەســـتام بەرەو دەنگەکە ڕۆیشـــتم. پەرســـتگەیەکم دیتەوە، ســـۆڵەرمەی٢ تێدا هەڵواســـرابوو، مۆم داییســـا و بەرماڵی تێدا ڕاخرابوو. لاوێکی ڕووپاک خەریکی خوێندنەوەی قورئان بوو. ئەمن ســـەرم لەو گەنجە ســـــووڕ ما. گوتم ئەوە چۆنە خەڵکی ئەو شـــارە هەمووی بووە بە بەرد و هەر ئەو لاوە ماوەتەوە. هەر بۆیە چوومە پێشـــێ و ســـڵاوم لێ کرد. وەڵامی ســـڵاوەکەمی داوە! گوتم: 'پرسیارێکت لێ دەکەم، بەڵام تۆ ئەو قورئانەی دەیخوێنی، ڕاستیم پێ بڵێ.' لاوەکە بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'لەپێشـــدا پێم بڵێ ئەتۆ چۆن هاتوویتە ئێرە؟' ئەمن بەســـەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە و گوتم: 'جا ئەتۆش هۆکاری بەبەردبوونی خەڵکی ئەو شارەم پێ بڵێ.' قورئانەکەی وێک نا٣ و منی بانگ کردە لای خۆی و داینیشـــاندم. ســـەیرم کرد ئەو کوڕە لە جوانیدا شتێکی تایبەتە. وەکوو شاعیر دەڵێ:

پەریڕوویەکـــی ڕووگەش و جـــوانـــی
بـــالا وەک ســـەوڵ٤و لەبـــــەردڵانـــی

---

١. نێردیوان: پەیژە.

٢. سۆڵەرمە: قەندیل، چلوورە، لێرەدا لووستێرە بە فۆرمی سۆڵەرمە.

٣. وێک نان: بە یەکەوەنانی دوو لای شتێک، وەک کتێب، لێک نانی دم، واتە قسە نەکردن.

٤. سەوڵ: سەلو، ئەسرۆ، دارێکی هەمیشە بەرز و ڕێک و پێک و هەمیشە سەرسەوزە.

ئـازەر چـێـی کـردبـێ، بـوتـی وەکـوو تـۆ
یـاخـوا هەر شـــــاد بـێ، ڕووح و ڕەوانـی

" 'تیری خۆشـــەویســـتی ئەو کوڕە دڵمی پێکا و ئۆگری بووم. دیســـان پرســـیاری بەسـەرهاتی خەڵکی ئەو شـارەم لێ کردەوە. گوتی: 'بابی من پاشـای ئەو شـارە بوو. ئەو هەر ئەوەیە لەسـەر تەختەکەیە و بووە بە بەرد. دایکیشـم ئەوە لە حەرەمسـەرا دیوتە. دایک و بابم و خەڵکی ئەو شارە ئاوریان دەپەرست و باوەڕیان بە پەروەردگار نەبوو. سوێندیان بە مانگ و خۆر دەخوارد. بەڵام پیرێژنێک لە ماڵی ئێمە بوو، خودای دەپەرست و نەیدەوێرا بە ڕاشـکاوی باسـی بکا و بیدرکێنێ. باوکم باوەڕی بە دەسـتپاکی و داوێنپاکییەکەی بوو. هەر بۆیە منی بەو سـپارد هەتا پەروەردەم بکا و ڕێ و شـوێنی دینی مەجووسـم فێر بکا. ئەو ڕێ و شـوێنی ئیسـلام و خوێندنی قورئانی فێر کردم. ئەمنیش باوەڕەکەم شـاردەوە و بە دزییەوە دەمپەرەست. هەتا وای لێ هات خەڵک لە کفردا ڕۆچوون.

ڕۆژێک لە دەنگەژەیەکەوە[۱] بیسـتم، گوتی: 'ئەی خەڵکی شـار، ئەی دانیشـتووانی شـار، دەسـت لە پەرسـتنی ئاگر هەڵگرن و ڕوو بکەنە خوداپەرسـتی.' خەڵک ترسـان و هاتنە لای پاشـا. بابم گوتی: 'لە دەنگەژە و شـت مەترسـن و ڕێبازی باب و باپیرانتان بەر مەدەن.' خەڵکەکە بە قسەی پاشایان کرد. ساڵێکی دیکە بەو پێیە ئاگریان پەرست. بۆ ساڵی دوایی، دیسـان هەر ئەو دەنگەیان بیسـتەوە و دیسـان دەسـتیان هەڵنەگرت و نەگەڕانەوە. سـاڵی سـێیەم هات و هەمدیسـان ئەو دەنگەیان بیسـت و دیسـانیش دەسـتیان لە ئاگرپەرسـتی هەڵنەگرت و ڕوویان نەکردە خوداپەرسـتی. ئیدی ڕقی خودای مەزن گرتنی و هەموویانی کرد بە بەردی ڕەش. لەو ڕۆژەی ئەو ڕووداوە ڕووی داوە، ئەمن هەر خەریکی نوێژ و ڕۆژوو و قورئانخوێندنم و لە تەنیاییشدا تەواو وەڕس بووم.' ئەمن گوتم: 'لە بەغدا زانا و مامۆسـتاگەلێکی باشـی لێیە، ئەگەر تۆ بچییە ئەوێ و زانسـت فێر بی، ئەمنیش دەبم بە یەکێک لە کەنیزەکانی تۆ. ئەوەش بزانە ئەمن بۆخۆم لە بنەماڵەیەکی خانەدان و خاوەن کۆیلە و کەنیزم و چەنـدین کەشـتی کـاڵای گرانبـاییم لەگەڵ خۆم هێنـاوە. ڕێکەوت کەشتییەکەی ئێمەی بەرەو ئێرە هێنا، تا من و تۆ پێکەوە ئاشنا بین.'

" 'بەو جۆرە هانم دا بچێ بۆ بەغدا و، ئەویش پێشنیارەکەمی قەبووڵ کرد.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[۱]. دەنگەژە: دەنگێک کە سەرچاوەیەکی دیاریکراوی نییە؛ لە غەیبەوە بێت.

# کە شەوی حەڤدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کچە گوتی: 'شـازادەکەم هان دا بچن بۆ بەغدا، ئەو پێشنیارەکەمی پەسەند کرد و ئەو شەوەمان پێکەوە ڕابوارد. کە ڕۆژ بووەوە، هەردووکمان چوونیە لای کەشتیوانەکە. کەسانی نێو کەشتییەکە بە شوێن مندا دەگەڕان. کە منیان دیت، خۆشحاڵ بوون و پرسییان، لەکوێ بووم. ئەمن بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕانەوە. کە خوشکەکانم ئەو شازادەیان لەگەڵ من دیت، ئیرەییان گوڵی کرد١ و ڕقیان لێ هەڵگرتم.

" 'کە سواری پاپۆڕ بووین، بای خوازراو هات و پاپۆڕمان ئاژووت. بەڵام خوشکەکانم بەردەوام لێیان دەپرسیم: 'چی لەو کوڕە دەکەی؟' گوتم: 'زەماوەندی لەگەڵ دەکەم.' پێشم گوتن: 'ئەو شازادەیە بۆ من و ئەو کاڵا و شتەی لەو پاپۆڕەدایە بۆ ئێوە. بەڵام خوشکەکانم لەسەر کوشتنی من ساغ ببووەوە، من بەوەم نەدەزانی. دەمەو ئێوارە لە بەسرە نیزیک بووینەوە، دار و درەخت و باخەکانی وەدیار کەوتن. هەر لەوێ لەنگەرمان گرت. ماوەیەکی شەو خەوتین.

" 'خوشکەکانم کە من و شازادەیان دیتبوو بە یەکەوە لە جێیەدا خەوتووین، هەڵوێست دەگرن کە من و شازادە بخەنە ئاوەکەوە. شازادە کە مەلە نازانێ، دەخنکێ و تێکەڵی ڕووحپاکان دەبێ. بەڵام من تەختەیەکم هاتە بەردەست و خۆم پێوە گرت و بە مەلە هەتا دوورگەکە چووم. ئەو شەوە لەوێ ڕۆژم کردەوە. بەیانی لە دوورگەکە هەر جارەی بۆ لایەک دەچووم. بەشکوو ئەوە ڕێگایەک بدۆزمەوە. وا بوو شوێنپێی مرۆڤێکم دیتەوە کە لە دوورگەکەوە بەرەو بێروونێک دەچوو. ئەمن ئەو ڕێیەم گرتەبەر و بەرەو بێروون ڕۆیشتم. ماوەیەک بوو دەڕۆیشتم، دیتم ئەوە ئەژدیهایەک دم لەسەر پشت کەوتووەتە شوێن مارێک. بەزەییم بە مارەکەدا هات و دەستم دا بەردێک و ئەژدیهاکەم کوشت. ئیدی لە جێوە مارەکە وەک باڵندەیەک هەڵفڕی. ئەمن واقم وڕ ما. وا بوو ئەوەندە ماندوو بووم هەر لەوێ خەوم لێ کەوت. کە وە خەبەر هاتم، دیتم ئەوە کەنیشکێک قاچم دەشێلێ. لە شەرمان هەستام دانیشتم و پێم گوت: 'ئەتۆ کێی؟' گوتی: 'سەعاتێک نابێ ئەتۆ دژمنی منت کوشت و منت ڕزگار کرد. ئەمن ئەو مارەم کە ئەژدیهاکە کەوتبووە شوێنم و ئەتۆ ئەژدیهاکەت کوشت. ئەمن لە ڕەگەزی جنۆکەم و ئەو ئەژدیهایەش هەر لە ڕەگەزی من بوو. چونکە تۆ منت ڕزگار کرد، ئەمنیش چووم تەواوی کاڵا و کەلوپەلەکانتم بردەوە ماڵەکەی خۆت و خوشکەکانیشتم بە جادوو کرد بە دوو دانە سەگی ڕەش.' ئەو جار منی هەڵگرت و لەگەڵ دوو سەگەکە بردینییەوە سەربانی ماڵی خۆمان و داینایین. سەیرم کرد ئەوەی لە

---

١. گولکردن: گەشەکردن، پەرەستاندن.

کەشتییەکەدا بوو، هەمووی هێناوەتەوە ماڵێ دایناوە.

" 'دوای ئەوە مارەکە گوتی: 'ئەگەر هەموو رۆژێ یەکی سێسەد قامچی لەو دوو سەگە نەدەی. ئەوە بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی سولەیمان، ئەتۆش وەک ئەوان لێ دەکەم.'

" 'گەورەم، خەلیفە. ئەمن لە ترســی ئەو جنۆکەیە قامچییان لێ دەدەم و لەبەر سـۆزی خوشکایەتیش بۆیان دەگریم.'

"خەلیفە سەری لەو بەسەرهاتە سوورِ ما و ئەو جار بە کچەکەی دیکەی گوت: 'ئەتۆش بیگێڕەوە، بزانم بۆ شوێنی ئەو قامچییانە لە سەر جەستەتن.'

## بەسەرهاتی کیژە قامچیلێدراوەکە

"کچە گوتی: 'گەورەم، خەلیفە، کە باوکم کۆچی دوایی کرد، ماڵێکی زۆری لەپاش بەجێ ما. پاش ماوەیەک لەگەڵ پیاوێکی قورس و دەوڵەمەند و شـەاییبەخۆ زەماوەندم کرد. سـاڵ رابرد و ئەویش مرد. هەشـــتاهەزار دیناری زێڕی ســـوور لەپاش بەجێ ما. ئەمن هەموو رۆژێک کراسێکی گرانباییم لە بەر دەکرد و بەختەوەرانە ڕام دەبوارد.

" 'هەتا ڕۆژێک پیرێژنێکی بەســـاڵاچووی دەوچاو چرچ لێم وەژوور کەوت، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

زولفەکـانی زەرد و بـاریـک، خـانەخوێی خەزان
چین و چرووکـاوی بوو ڕووی ئەو پیری زۆرزان
کە دەبـینـی پەککەوتەیە و تـێـک چووە ئێســـتـا
هەر لە بن ســـەری ئەودا بوو، فیتنە و هەراکـان

" 'پیرێژنە هاتە لام و ســـڵاوی کرد و گوتی: 'کچێکی هەتیو لە لای منە و ئەمشـــەو جێژنێکی چکۆلانەم بۆ ڕێک خستووە. پێم خۆشە لەبەر دڵی ئەو لە ئاهەنگەکەیدا بەشداری بکەی.' ئەوەی گوت و ئیســـتێک هەر پاڕاوە و قاچی ماچ کردم و گریا. ئیدی زگم پێی ســـووتا. خۆم ڕازاندەوە و لەگەڵ چەند دانە لە کەنیزەکانم ڕۆیشـــتین. هەتا گەیشـــتینە بەر دەرکی ماڵێک کە ســـەری لە هەوران دەســـوو. کە چووینە ژوورێ، دیتم ئەوە فەرشـــی ئاوریشمیان ڕاخستووە و چلوورەی بلووریان هەڵواسیوە و مۆمی کافوورییان هەڵکردووە. لە لای ســـەرەوە تەختێکی مەرمەڕی ڕازاوە بە دوڕ و جەواهێراتیان داناوە. پەردەیەکی ئاوریشمیان بەدەوردا کێشاوە، کیژێکی ڕووئەستێرە کە بسکی بەسەر ڕوخساریدا پەخشان بوو هاتە دەرێ و سڵاوی کرد و ئەو شێعرەی گوت:

تــۆ لە هەر دەرکــێــکەوە بــێــی، بەو دەلالــی و جــوانــیــیەتەوە
دەرکەیەکــی دیــکەی بەهەشــــــت بە ڕووی خەڵــکــا دەکەیــتەوە
هەموو ســــەرســــــام و مەســـــت دەبن، لە جێی میوە دەســــتیان دەبڕن
ئەگەر بــێــتــو دەرخەی ســــــیــمــات، ڕووبەنــدەکەت هەڵــدەیــتەوە

" 'دوای ئەوە دانیشت و منیشی دانیشاند و گوتی: 'برایەکم هەیە لە من جوانتر و چاکتر لە شوێنێک چاوی بە تۆ کەوتووە و چوویتە دڵییەوە و عاشقت بووە. ببوورە ئاهەنگێکی وا لە گۆڕێدا نییە و ئەو پیرێژنە جادووبازە لەبەر تەماعی ماڵی دنیا هاتووەتە لای تۆ، بۆ ئەوەی بە هەر فێڵێک بێ بتهێنێتە ئێرە. ڕاســـتییەکەی ئەوەیە و پێم خۆشــــە ئاگادار بی کە براکەم پێی خۆشــــە زەمــاوەنــدت لەگەڵ بکــا. نــازانم تۆ دەڵێی چی؟' ئەمن بەبێ بڕوبیانووهێنانەوە پێخۆشــبوونی خۆم ڕاگەیاند. کچە خۆشــحاڵ بوو. لەپشــت پەردەکەوە دەرگــایەکی لێ بوو، کردییەوە، کوڕێکی قۆزی ڕێــک وەک عەرعەڕ دەرکەوت. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

پەیکەرێکی بڵێنــد و ڕێــک، وەکوو چنــار
هەتــا بــڵــێــی بێ گــرێوگــۆڵ، لــێــوی هەنــار
چــاوی پڕ لە ســــیحری مەســــتی، برۆ کەوان
بە هەنگــاوی قورس و قــایم، دەیبرد ڕەوان

" 'هەر کە من کوڕەم دیت، بە داوی ئەوینییەوە گیرۆدە بووم و دڵم چووە ســەری. ئەو کوڕە لەســەر کورســییەکەی کە لەلای ســەرەوە بوو دانیشــت. هەر لە ڕێوە قازی و شــایەد هاتنە ماڵێ و ئەمنیان لەو کوڕە مارە کرد و گەڕانەوە. ئەوجار کوڕە ڕووی تێ کردم و گوتی: 'دەبێ ســــوێندم بۆ بخۆی و بەڵێنم پێ بدەی کە خەیانەتم پێ نەکەیت و جگە لە من دڵ نەدەی بە کەســی دیکە.' ئەمنیش بەڵێنم پێ دا. پاشــان پێکەوە کەمێکمان قســە و گاڵتە و گەپ کرد هەتا بوو بە شــەو. ســفرەی تەعامیان ڕاخســت و خواردنی جۆراوجۆریان دانا. نانەکەمان خوارد و ئەو شــەوەمان بە خۆشــی ڕابوارد و شــەو لە ئامێزی یەکتردا ڕۆژمان کردەوە. هەتا مانگێک بەو شــێوەیە ڕامان بوارد. ڕۆژێک بۆ گەشــت و ســــەیرانێکی بازاڕ ڕوخسەتم خواست. ڕوخسەتی دام و پیرێژنەی لەگەڵ ناردم. من و وڕوڕەی جادوو پێکەوە چووین بۆ بازاڕ. لە دووکانی لاوێک کە لەگەڵ پیرێژنە پێشــــینەی ناســــیارییان هەبوو، دانیشــــتین. شــــتێکمان لەو لاوە کڕی و من پارەکەیم دا. ئەو لاوە پارەکەی وەرنەگرت و زێڕەکانی دامەوە و گوتی:

له بەرابەر جوانی تۆدا ماڵ و سامانم بۆ چییە؟
گەر بە قوربانی تۆ نەبێ، من ڕووح و گیانم بۆ چییە؟

" ' 'من ئەو نەختە شتەم وەک دیاری داناوە.' بەو پیرێژنەم گوت: 'ئەگەر بە پارە داینەنێ، ئەمن هەڵی ناگرم.' لاوەکە گوتی: 'ئەمن هیچیانم ناوێتەوە، ماچێکی تۆ بۆ من هەزار بەرابەری زێڕ و ماڵ خۆشترە.' پیرێژنە بە کوڕەی گوت: 'جا ماچێک چ خۆشییەکی هەیە؟' بە منیشی گوت: 'ئەتۆ بە ماچێک چت لێ دێ؟' گوتم: 'جا بۆخۆت دەزانی من بەڵێنم داوە و سوێندم خواردووە.' گوتی: 'ئەگەر هەر ئەو تۆ ماچ کا و تۆ هیچ نەڵێی، بە خەیانەت داناندرێ.' ئاوا ئەو پیرێژنە منی هان دا هەتا ماچی بدەمێ و منیش ئاخری بە قسەم کرد. سەرم بردە پێش و چاوم قووچاند. گەنجەکە لێوی بە لێومەوە نا و ماچی کردم. لێوی وا گەزتم خوێنی لێ هێنا و من بێهۆش بووم. پیرێژن منی لە باوەش گرت. کە وەهۆش هاتمەوە، سەیرم کرد ئەوە دووکانەکە داخراوە و پیرێژن مات دانیشتووە. بە منی گوت: 'هەستە بڕۆوە ماڵێ و لە جێیەدا بکەوە. ئەمن هەموو ڕۆژێ دێم دەرمانت دەکەم هەتا چاک دەبیتەوە.'

" 'ئیدی من و پیرێژن سەرگەردان و مات دەڕۆیشتین و دەشترساین. کە گەیشتینەوە ماڵێ، من وەک نەخۆش چووم لە جێگادا خەوتم. کاتێک مێردەکەم هاتەوە، گوتی: 'چی بووە؟ ئەوە بۆ درێژ بووی؟' گوتم: 'نەخۆشم.' کە هاتە پێش و جێ ددانەکانی لە سەر لێوم دیت، گوتی:

ئەی شەپاڵی لێو بە بزە، کێ لێوی لاڵتی گەزیوە؟
کێ لە نێو باخی گوڵاندا، گوڵی ڕووی جوانتی چنیوە؟

" 'گوتم: 'کۆڵانەکە تەنگەبەر بوو، چەند وشتر بارە چرپییان[1] پێ بوو، چیلکەیەک ڕووبەندەکەی کون کرد و لە لێوم هەڵچەقی و برینداری کرد.' گوتی: 'بەیانی دەچم لە لای حاکم شکایەت دەکەم و دەڵێم هەرچی چرپیفرۆشە بیکوژن.' گوتم: 'گوناحی ئەو خەڵکەش مەخە ئەستۆی خۆت. سواری کەرێک بووم، کەرە سڵمییەوە و من کەوتم و چیلکەیەک لە لێوم چەقی و برینداری کرد.' گوتی: 'دەبێ سبەینێ بە جەعفەری بەرمەکی بڵێم کە خاوەنی هەموو کەرەکان بکوژێ.' ئەمنیش گوتم: 'ئەوە قەزا و قەدەر بوو، دەبوو ئەمن ئاوام لێ بێ، ئیدی بۆ لەسەر من خۆت دەکەی بە دووژمنی هەموو کەس.' کە ئەو قسەیەی بیست، تووڕە بوو. گوتی: 'پێم نەگوتی:

[1]. چرپی: دار و شووڵی وشک هەڵاتوو. وەک سووتەمەنی کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

ڕوخســــارت گــوڵســــتــانــمه، ئەتــۆش بــاخەوانــی مــنــی
گــوڵــووک ئەمــانەتــن لە لات، بە بــێ پــرســـــی مــن نەیــچــنــی

" 'دیسان گوتی:

هەتــیــومەتــیــوان کە ســــۆســــە بــکەن
مــیــوەیەک گەیــوە دەچــن لــێــوەی کەن
شــــەمــزانــدوویــانە ســــێــو و هەنــارت
ئــیــتــر نــامەوێ، ســــەیــری دیــدارت

" 'پاشـــان هەرای کرد و کۆیلە ڕەشـــەکان هاتن. منیان لە جێگاکە هێنا دەرێ و فڕێیان دامە سەر زەوی. ئەو جار بە یەکیانی گوت لەسەر سەری دانیشە و بە یەکی دیکەی گوت قاچەکانی بگرە. بە ســـێیەمی گوت ئەو قەحبەیە بکە بە دوو کەرتەوە و لە دیجلەی هاوێن. کۆیلە شیری هەڵکێشا. ئەمن بیرم لە حاڵی خۆم کردەوە و دەستم کردە گریان و گوتم:

گەر ڕەوا بــێ خــوێــنــی عــالەمــێ بــڕێــژی
ئەوەی هــانــات بــۆ دێــنــێ، بــۆت نــیــیە بــیــکــوژی

" 'کە شێعرەکەمی بیست و گریانەکەمی دیت، تووڕە بوو، گوتی:

دەبــێ چــیــم کــردبــێ، ڕووت لــێ وەرگــێــڕام
وا بە ئــاســـــانــــی ئەو دەردەت پــێ دام
چــبــکەم دایــم بە ڕوومــدا دەپشـــــکــووی
مــانــگــئــاســــا لە نــاو شــــەوم دەرکەوتــووی

" 'دوای ئەوە لە بەر خۆمەوە گوتم: 'وا چاکە زۆریش لەخۆبای نەبم، با کەمێک بگریم و بپاڕێمەوە، هاتوو لە کوشتنم خۆش بوو.' ئیدی ئەو شێعرەم گوت:

بە کــوشـــتــنــی یەکــی وەک مــن، ڕەنــگە دڵــت ســـوکــنــایــی بــێ
مــن قەیــنــاکەم، بەڵام گەورەم، شـــیــرەکەت خــوێــنــاوی دەبــێ

" 'کە شێعرەکەم گوت، گریام. چاوێکی لێ کردم و جنێوی پێ دام و ئەو شێعرەی گوت:

هەســـــتە لاچووە لە بەر چـاوم بێ وەفـا
بـۆ دەبـوو کـاری ئـێـمە بـێـرە بـگـا؟
دڵـم تـژی لە خـۆشـــەویـســـتـی تـۆ بـوو
دڵـمـت شــــکـانـد ڕژا و چـی تـێـدا نەمـا

" 'کە شـێعرەکەی تەواو بوو بە غولامەکەی گوت: 'بیکوژە.' ئەمن خۆم بۆ مردن سـاز کرد و خۆم دایە دەسـت خودا. لەو جەنگەیەدا پیرێژن پەیدا بوو، خۆی بە سـەر لاقی مێردەکەمدا دا و گوتی: 'کوڕەکەم، لەبەر خاتری ئەو خزمەتانەی چەند ساڵە بە تۆی دەکەم لەو چارەڕەشـە خۆش بە. ئەوە گوناحێکی وای نەکردووە شـیاوی ئەو سـزایە بێ. ئەتۆش تازەلاوی و خوێنی ئەوەی مەهێنە ئەستۆی خۆت. چونکە من لەوە دەترسم:

گیـانەکەم هێشـــتـا تۆ گەنجی گوێ لە گەورەی خۆت گرە
مەکە کـارێـک کە بلەرزن پـیـر و لاو، دەســـت هەڵگرە

" 'لاوەکە گوتی: 'لەبەر خاتری تۆ لێی خۆش دەبم و نایکوژم. بەڵام دەبێ وای لێ بکەم و وای سزا بدەم هەتاهەتایە شوێنەکەی بمێنێتەوە.' ئەو جار بە نۆکەرەکەی گوت: 'جلەکانی لەبەر داکەنن.' فەرمانی دا شووڵێکی زۆریان لە دارەکان بڕی و هێنایان، ئەوەندەیان لێ دام هەتا بێهۆش بووم. کە وە هۆش هاتمەوە لە ماڵە خۆم بووم. دەسـتم کرد بە هەتوانکردن دەرمانکردنی هەتا چاک بوومەوە. بەڵام شـوێنی شـووڵەکان ئێسـتاش لە سـەر لەشـم هەر ماوە. هەر وەک بۆخۆشـتان دیتتان. ئیدی هاتمەوە لای ئەو خوشـکەم و ئەو دوو سـەگەم لەوێ دیت، بەسـەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە. ئەویش بەسـەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە. ئیدی هەردووکمان پێکەوە دانیشـتین. هەتا ئێسـتاش هیچمان ناوی مێردەکانمان نەهێناوە. ئەو دەلالەش هەموو ڕۆژێ پێداویسـتی ڕۆژانەمان بۆ دێنێ. لەمێژسـاڵ بوو ئاوا دەژیاین هەتا دوێنێ. ئەو خوشـکەی ئێمە وەک هەمیشـە چووبوو بۆ بازاڕ پێداویسـتی کڕیبوو. بە کۆڵکێشـدا هێنابوویەوە. کۆڵکێشـە هەر لەوێ دەبێ، ئەو سـواڵکەرانەش دێن، پاشـان ئێوەش وەک بازرگان دێن. ئەوە ئێسـتاش ئێمە لە بارەگای خەلیفەین. ئەوە بوو بەسـەرهاتی ئێمە.' خەلیفە بە بیستنی ئەو بەسەرهاتە سەری سووڕ ما و فەرمووی ئەو چیرۆکە بنووسنەوە و رایگرن."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی هەژدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــکۆ، خەلیفە فەرمووی: 'ئەو چیرۆکانە بنووســــنەوە و بە خەزێنەی بســــپێرن.' ئیجا بە کچە گەورەکەی گوت: 'دوای ئەوەی خوشــــکەکانتی جادوو کرد، ئەو دێوەت دیوەتەوە؟' کچە گوتی: 'نا نەمدیوەتەوە، بەڵام تاڵێکی لە بسکی خۆی دامێ و گوتی هەر کاتێک کارت پێم بوو، بیســــووتێنە دەگەمە ســــەرت.' ئینجا خەلیفە مووی دێوەکەی لە کچە ئەستاند و سووتاندی. لەڕێوە کۆشک کەوتە لەرزە و دێو پەیدا بوو. چونکە موسوڵمان بوو، سڵاوی لە خەلیفە کرد و گوتی: "خودا پشتیوانی خەلیفە بێت، ئەو کچە چاکەی لەگەڵ من کرد و دژمنەکەمی کوشت و منی لە مردن ڕزگار کرد. ئەمنیش لە وەڵامی ئەو چاکەیەی ئەودا، دوو خوشکەی کە ستەمیان لێ کردبوو، بە جادوو کردمنە دوو سەگی ڕەش. ئەگەر خەلیفەش پێی خۆش بێ لەو دۆخە ڕزگاریان بێ، ئەوە دەیانکەمەوە بە مرۆڤ.' خەلیفە گوتی: 'لەپێشــــدا ئەوان لەو جادووە ڕزگار بکە. پاشــــان من دەکەومە پێوشــــوێنی ئەو ســــتەمکارەی وا جەســــتەی ئەو کیژەی ئاوا لێ کردووە و ئازاری داوە.' جادووگەرە گوتی: 'من ئەویش دەناســــم. بزانە ئەو نیزیکترین کەســــی خەلیفەیە.' ئیدی جادووگەرە ودمی بە ســــەر قاپێک ئاودا خوێند و بەســــەر ســــەگەکاندا هەڵی پڕژاند. لە ڕێوە هاتنەوە بیچمی مرۆڤانەی خۆیان و بوونەوە بە کەنیشــــکێکی ڕووگەشــــی جوان. دوای ئەوە مارەکە گوتی: 'ئەی خەلیفە، ئەوەی جەســــتەی ئەو کچەی ئاوا لێ کردووە، ئەمینی کوڕی خۆتە.' خەلیفە واقی وڕ ما و گوتی: 'ســــپاس بۆ خوا کە ئەو جووتە جوانە بە هۆی منەوە ڕزگاریان بوو.' خەلیفە فەرمووی قازی بێنن. ئەو دوێتەی کە ساماندار بوو، لەگەڵ دوو خوشکەکەی کە لە شێوەی ســەگ بوون، هەر سێکیانیان لە سێ دانە شازادە بە ڕواڵەت سوالکەرەکان مارە کردن. شازادەکانیشی کردە هاودەمی خۆی و ئەو کچەی کە ژنی ئەمین بوو، دایەوە بەو و دەلالیشی لە خۆی مارە کرد.

### چیرۆکی کۆیلە دزۆزنەکە

"ماوەیەکی پێ چوو، شەوێک لە شەوان، خەلیفە بە جەعفەری بەرمەکی گوت: 'دەمهەوێ ئەمشــەو کەمێک بەنێو شــاردا بگەڕێم، هەواڵێکی پاشــا و بەگ و میران بزانم. ئەگەر بێتو خەڵک لێیان ناڕازی بن، لەســــەر کاریان لا دەبەم.' وا بوو خەلیفە و جەعفەر و مەســــروور هەستان و چوونە نێو شار و هەر وا خەریک بوون دەگەڕان، پیاوێکی پیریان دیت تۆڕێکی بە شــــانەوە و قرتاڵەیەکی لە ســــەر ســــەری و گۆچانێکی بە دەســــتەوە بوو. نەرمنەرم دەڕۆیشت و ئەو شێعرانەی دەگوتەوە:

له بەختی ڕەشم، چی گیر ناکەوێ
چۆن منال بنوون، بەبێ نان شەوێ
هەزار سال بێژی ئیشەو مەقیرنە
خۆ سکی برسی هیچێ ناژنەوێ

"خەلیفە کە ئەو شێعرانەی بیست، بە جەعفەری گوت: 'ئەو شێعرانە ئەوە دەردەخەن کە ئەو پیرەپیاوە زۆر هەژارە.' خەلیفە چووە پێشێ و پرسی: 'مامە گیان، پیشەت چییە؟' گوتی: 'ماسیگرم و خێزانێکی زۆریشم هەیە. لە نیوەڕۆوە هەتا ئێستا خەریک بووم، خودا چی بە قسمەت نەکردووم. منیش بێ هیوا بووم و گەڕامەوە. بە ڕاستی لە ژیان بێزارم و مەرگ بە ئاوات دەخوازم.' خەلیفە گوتی: 'ئەگەر بگەڕێیەوە بۆ دم چۆم و لە بەختی من تۆڕ باوێی، هەرچی پێوەی بوو بە سەد دینار لێت دەکڕم.' ماسیگر بەو قسەی ئەوان دڵخۆش بوو. لەگەڵ خەلیفە و ئەوان گەڕاوە بۆ سەر چۆم. تۆڕی لە دیجلە هاویشت. پاش ماوەیەک تورەکەی دەرکێشا. دیتیان یەغدانێکی گەورە بە تۆڕەکەوە هاتووە. خەلیفە سەد دیناری دا بە ڕاوچی و یەغدانەکەی لێ وەرگرت. یەغدانەکەیان هێناوە بۆ کۆشک. کە سەری یەغدانەکەیان کردەوە، بەڕەیەکی لوولکراوی تێدا بوو. بەڕەکەیان لێک کردەوە، چاویان بە چارشێوێک کەوت. چارشێوەیان کردەوە، تەرمی کچێکی تێدا بوو لەشی دەتگوت زیوە. خەلیفە کە ئەوەی دیت، گریا و گوتی: 'ئەی وەزیری بێسەلیقە، چۆن ئەمن ئەوەم پێ قەبووڵ دەکرێ کە لە سەردەمی مندا ئاوا خەڵک بکوژن و لە دیجلەی هاوێن و گوناحەکەشی بێتە ئەستۆی من؟! دەبێ بکوژی ئەو کیژە هەر بکوژمەوە. بە ڕووحی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ئەگەر بکوژی ئەو کیژە نەبینییەوە و نەیهێنییە ئێرە، تەواوی هۆزی بەرمەکی دەکوژم.' جەعفەر کە خەلیفەی بینی ئاوا تووڕە بووە، داوای دەرفەتی کرد.

خەلیفە سێ ڕۆژی دەرفەت دایە. جەعفەر لە بارەگای خەلیفە هاتە دەرێ، مات و مەلوول دەڕۆیشت و بیری دەکردەوە جا ئەوە چۆن بکوژی ئەو کیژە پەیدا کەم و کەسی بێتاوان لە جێی ئەودا بە کوشت نەچێ؟ ئیدی چووەوە ماڵەکەی خۆی و بە ترس و دڵەڕاوکێوە دانیشت. ڕۆژی چوارەم خەلیفە بانگی جەعفەری کرد و داوای بکوژی کچەکەی کرد. جەعفەر گوتی: 'بێ لە خودا کەس ئاگای لە پێوار نییە.' خەلیفە تووڕە بوو، گوتی: 'چونکە سوێندم خواردووە، ئەوڕۆ تۆ دەکوژم.'

"ئیدی بە جاڕچییان گوت لەناو شاردا جاڕ بدە کە جەعفەری وەزیری خەلیفە لە دار دەدرێ، هەرکەس پێی خۆش بوو بێ بۆ تەماشا.

"کە جاڕچی جاڕی دا، خەڵک پۆلپۆل بۆ سەیری دیمەنی لە سێدارەدانی جەعفەر بە

شین و گریانەوە بەرەو شوێنی سێدارە دەچوون. نەشیاندەزانی خەلیفە بۆ لە جەعفەری وەزیری بە ڕقدا چووە. کە خەڵکەکە کۆ بوونەوە، پیاوەکانی خەلیفە دارەکەیان ساز کرد و چاوەڕێی فەرمانی خەلیفەدا بوون. دیتیان ئەوە لاوێکی جوانچاک جلوبەرگێکی جوانی لە بەردایە و بە پەلە دڕ بە خەڵکە دەدا و بەرەو شوێنی سێدارەکە دێ. کە گەیشتێ، خۆی بەسەر لاقی جەعفەردا دا و گوتی: 'ئەی وەزیری زانا، ئەو کچەی لە یەغدانەکەدا بوو، من کوشتم. بە تۆڵەی ئەو دەبێ من بکوژن.' کە جەعفەر ئەوەی بیست، دڵی بە ڕزگاربوونی خۆی خۆش و بە گیرۆدەبوونی گەنجەکە نارەحەت بوو. هەر لەو جەنگەیەدا پیرێکی بەساڵاچوویان دیت کە خەڵکەکەی لا دەدا و بە پەلە بەرەو لایان دەهات. کە گەیشتە لای جەعفەر، گوتی: 'ئەی وەزیری ژیر، ئەو گەنجە تاوانی نییە و بوختان بە خۆی دەکا. ئەو کچە من کوشتوومە. دەبێ من بکوژنەوە.' لاوەکە گوتی: 'وەزیر، ئەو کابرایە پیر بووە و تێکەڵی کردووە. هۆشی لەسەر خۆی نەماوە. کەس نازانێ دەڵێ چی. ئەمن ئەو کچەم کوشتووە و دەبێ لە تۆڵەی ئەودا من بکوژنەوە.' پیرەکە ڕووی لە گەنجە کرد و گوتی: 'کوڕی خۆم، تۆ هێشتا چێژت لە گەنجێتی خۆت نەدیوە و هەزار ئاواتت هەیە. حەیفە تۆ بکوژرێی؛ ئەمن تازە بەشی خۆم ژیاوم و لە ژیان تێر بووم. با من ببمە فیدای تۆ و وەزیر.'

"وەزیر کە ئەو قسانەی بیست، سەری سووڕ ما و پیرە و گەنجەی بردە لای خەلیفە و گوتی: 'گەورەم، بکوژی دوێتەکە پەیدا بوو.' خەلیفە گوتی: 'کامەیانە؟' جەعفەر گوتی: 'ئەو لاوە دەڵێ من کوشتوومە و، ئەو پیرەش دەڵێ من کوشتوومە.' خەلیفەش لێی پرسین و هەر دووکیان هەر ئەو قسەیان کردەوە کە جەعفەر گوتبووی. خەلیفە گوتی: 'هەردووکیان بکوژن.' جەعفەر گوتی: 'خەلیفە، بکوژ هەر کەسێکە. چۆن ئێمە دوو کەس لە تۆڵەدا بکوژین؟'

"کوڕە گوتی: 'بەو خودایە کە ئاسمان و زەوی درووست کردووە، ئەو کچە من کوشتوومە، نیشان بەو نیشانە کە تەرمەکەم لە چارشێوێک پێچا و پاشان خستمە نێو بەڕەیەکەوە و جا لە نێو یەغدانەکەم خست.'

"ئیدی خەلیفە بۆی دەرکەوت گەنجەکە ڕاست دەکا و ئەو کوشتوویە. بە لاوەکەی گوت: 'ئەوە چۆناوچۆن بوو ئەو کیژەت کوشت و، بۆ ناتهەوێ بیشارییەوە و خۆت بە کوشت دەدەی؟'

"گەنجەکە گوتی: 'ئەو دوێتە ژنی من بوو. ئەو کابرا پیرە مامی من و بابی ئەوە. ئەو دوێتە لە ماڵە من سێ منداڵی بوو، منی زۆر خۆش دەویست. ئەمن هیچ خراپەیەکم لەو نەدیبوو. مانگێک لەوە پێش نەخۆش کەوت. نۆشدارم هێنا سەر، چاک بووەوە. ویستم بینێرم بۆ گەرماو، گوتی: 'حەزم لە بەهێیە.' ئیدی ئەمن لەڕێوە لە ماڵ هاتمە دەر و وە دوای بەهێ کەوتم. ئەو ڕۆژە زۆر گەڕام بەهێم وەگیر نەکەوت. شەویش هەر لە فکریدا

بووم. بەیانی کە ڕۆژ بووەوە، تەواوی باخەکان گەڕام و پرسیارم لە باخەوانەکان کرد. وا بوو باخەوانێک گوتی: 'ئەوەی تۆ دەتهەوێ، لە بەغدا وەگیر ناکەوێ. خەلیفە باغێکی لە بەسرە هەیە. هەموو جۆرە دارێکی تێدایە، باخەوانەکانی هەموو ڕۆژێ بەهێ دەچنن و بۆ خەلیفەی دەنێرنەوە.' ئیدی خۆشەویستی ئەو کیژە وای لێ کردم بچم بۆ بەسرە، پازدە شەو و ڕۆژ لە ڕێیەدا بووم هەتا چووم سێ دانە بەهێم بە سێ دینار کڕی و هاتمەوە. دوای چەند ڕۆژ چووم بۆ دووکان و خەریکی کڕین و فرۆشتن بووم. کۆیلەیەکم دیت بەهێیەکی پێ بوو. پێم سەیر بوو. گوتم: 'ئەو بەهێیەت لە کوێ کڕیوە، لەمێژە منیش لێی دەگەڕێم وەگیرم ناکەوێ؟' پێکەنی و گوتی: 'ئەو بەهێیەم لە خۆشەویستەکەم وەرگرتووە. چەند ڕۆژ بوو لە سەفەر بووم کە هاتمەوە دیتم خۆشەویستەکەم ناساخ و بێتاقەتە، سێ دانە بەهێشی لەپشت سەریەتی. ئەمن گوتم ئەو بەهێنانە بۆنیان خۆشە. یەکیانی دامێ و گوتی: 'مێردە گەوادەکەم لە بەسرەوە بۆی هێناوم.' کە ئەو قسەیەم لەو کۆیلەیە بیست، دنیام لە بەرچاو تاریک بوو. چوومەوە ماڵێ سەیرم کرد پشت سەری دوو بەهێی لێیە. گوتم: 'ئەوە ئەوی دیکەیان کوا؟' گوتی: 'نازانم کێ هەڵی گرتووە.' ئیدی باوەڕم بە قسەی کۆیلەکە کرد و دەستم دا چەقۆیەک و لەسەر سینگیم دا و کوشتم. پاشان لەو چارشێو و بەڕەیەم پێچا و لە یەغدانەکەم خست. یەغدانەکەشم لە سەر یەسترێک دانا و بردم لە دیجلەم هاویشت. خەلیفەی بەڕێز، هەرچی زووترە بمکوژن. چونکە من زۆر لە عەزابی ڕۆژی پەسلان دەترسم. لەبەر ئەوەی کە یەغدانەکەم لە دیجلە هاویشت و گەڕامەوە ماڵێ، کوڕەگەورەکەمم دیت دەگریا. لێم پرسی بۆ دەگریت؟ کەچی ئەو ئاگای لە کارەساتی دایکی نەبوو، گوتی: 'لەو سێ بەهێیەی دایکم یەکیانم هەڵگرت و چووم لە کۆڵان کایەم دەکرد، کەچی کابرایەکی ڕەشی زەلام لێی ئەستاندم و گوتی: 'ئەو بەهێیەت لە کوێ بوو؟' منیش گوتم: 'دایکم نەخۆشە و بابم لە بەسرە سێ دانەی بۆ هێناوە. دانەی بە سێ دینار. هەتا دایکم بۆنیان بکا.' هەرچی گریام کۆیلە گوێی نەدا قسەی من و بەهێکەی برد و ڕۆیشت. ئەمن لە ترسی دایکم دەگریم.' ئەو جار زانیم ئەوە ئەو کۆیلەیە درۆی کردووە و ئەمن ژنەکەم بە ناڕەوا کوشتووە. ئیدی مات و مەلوول دانیشتم و دەستم کرد بە گریان، هەتا مامم، ئەو پیرەپیاوە، هاتە لام. شتەکەم بۆ گێڕاوە، ئەویش دەستی کردە گریان و لە پەنام دانیشت. پێنج شەو و ڕۆژە لە ماڵی ئێمە شین و گریانە، داخ و کەسەری لەدەستدانی ئەو مرۆڤە زۆر گرانە. بیکە بۆ خاتری پشتاوپشتت زوو بمکوژە با ڕزگارم بێ.' خەلیفە گوتی: 'شتی وا نابێ. کەس ناکوژم جگە لەو کۆیلەیە.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، خەلیفە ســـوێندی خوارد کۆیلەکە بکوژێ و بە جەعفەری گوت: 'کۆیلەکەم لە تۆ دەوێ. بێتو نەیدۆزییەوە، لە جیاتی ئەو تۆ دەکوژم.' جەعفەر لە لای خەلیفە هاتە دەرێ و دەستی بە گریان کرد و گوتی: 'گۆزە هەموو جارێک بە ساخی لە ئاو نایەتە دەر.[١] جاری یەکەم ڕزگارم بوو، بەڵام ئەو جارە ڕووح دەرنابەم، چونکە قەتم ئەو کۆیلەیە بۆ نابیندرێتەوە.'

"هەر چۆنێک بوو، جەعفەر هاتەوەماڵێ و هەتا ســێ ڕۆژان خەریکی نوێژ و ڕۆژوو و خواپەرســـتی بوو. پاشـــان بانگی دادوەری کرد و وەســـییەتی نووســـی. لەو جەنگەیەدا ڕاســـپاردەی خەلیفە هات و گوتی: 'خەلیفە زۆر تووڕەیە و ســـوێند دەخوا دەڵێ ئەگەر جەعفەر کۆیلەکە نەهێنێ، ئەو دەکوژم.'

"جەعفەر کە ئەوەی بیست، ئاخێکی هەڵکێشا. ژن و منداڵ و کەنیزەکانی دەستیان کردە گریان. جەعفەر دانە دانە منداڵەکانی لە ئامێز دەگرت و بە خۆیەوە دەیگوشـــین. لە پڕ لە گیرفانی یەکیاندا دەستی وە شتێکی خڕ کەوت. گوتی: 'ئەوە چییە لە گیرافانتدایە؟' کچەکەی گوتی: 'ئەوە بەهێیە.' لێی پرســـی: 'ئەو بەهێیەت لە کوێ بوو؟' کچەکە گوتی: 'ئەوە ڕیحان دایمێ کۆیلەکەی خۆمـان، دوو دینـارم دایە و لێم کڕی.' کە جەعفەر ئەوەی بیســـت، سووکنایی بە دڵیدا هات و گوتی: 'دا ڕیحان بانگ کەن.'

"کە ڕیحان هات، جەعفەر دەســـتی کرد بە لێپێچینەوەی. کۆیلەکە گوتی: 'هەشـــت ڕۆژ لەمەوبەر لە کۆلانێکدا لە منداڵێکم ڕفاند. منداڵەکە گریا و گوتی: 'دایکم نەخۆشـــە و بابم لە بەسـرە بۆی هێناوە دەنکی بە ســێ دینار. ئەمن گوێم نەدایە و ڕۆیشـتم کە هاتمەوە خانمی کچت دوو دیناری دامێ و منیش ئەو بەهێیەم دایە.' جەعفەر کە ئەو قسـەیەی بیسـت، وەک گوڵ گەشـــاوە و گوتی: 'ئێســـتا من لە مردن ڕزگارم بوو، بەڵام کۆیلە زۆر بە ئاســـانی دەکوژرێ. چونکە باسی سەرە، هیچ قسەیەک ناکرێ.' دوای ئەوە کۆیلەیان هێنا بۆ بارەگای خەلیفە و ڕووداوەکەیان بۆ خەلیفە گێڕاوە. خەلیفە سەری سووڕما و گوتی: 'ئەو چیرۆکە بنووسنەوە و لە خەزێنەدا ڕایگرن تا بۆ بەرەکانی دوایە وانەیەک بێ.'

"جەعفەر گوتی: 'گەورەم، ئەو چیرۆکەت بەلاوە سەیر بوو، بەڵام لە چیرۆکی نوورەددین سەیرتر نییە.' خەلیفە گوتی: 'چیرۆکی نوورەددین چۆنە؟ دا بیگێڕەوە.' جەعفەر گوتی: 'هەتا

---

[١] "لا كل مرّة تسلم الجرّة." پەندێکی عەرەبییە.

چاوپۆشی لە کوشتنی ئەو کۆیلەیە نەکەی، نایگێڕمەوە.' خەلیفە لە خوێنی کۆیلەکەی خۆش بوو.

### چیرۆکی نوورەددین و شەمسەددین

"جەعفەر گوتی: 'پاشـــایەک لە میســـر هەبوو، دەســــتودڵکراوە و دادپەروەر بوو. وەزیرێکی زانا و بلیمەتی هەبوو، ئەو وەزیرە خاوەنی دوو کوڕ بوو. کوڕە چکۆڵەکەیان ناوی شـەمسـەددین و گەورەکەیان ناوی نوورەددین بوو. کاتێک وەزیر کۆچی دوایی کرد، پاشا زۆری بۆ بە پەرۆش بوو. کوڕەکانی بانگ کردن و یەکی خەڵاتێکی باشی دانێ. پێشی گوتن: 'خەم مەخۆن، ئێوە لە لای من ڕێزی بابتان هەیە.' کوڕەکانی وەزیر خۆشحاڵ بوون و کورنۆشـــیان برد. ئەوجار هەر حەوتووی یەکیان پلەی وەزیریان بەڕێوە دەبرد. کاتێک پاشا دەچووە سەفەر، هەر جارەی یەکیانی لەگەڵ خۆی دەبرد.

" 'شەوێک کە بڕیار بوو بەیانییەکەی پاشا بچێ بۆ سەفەر. نۆرەی شەمسەددینیش بوو لەگەڵی بچێ. ئەو دوو برایە دانیشـــتبوون و هەر جارەی باســـی شـتێکیان دەکرد. هەر وا قســـەیان دەکرد، شـــەمســـەددین بە براچکۆڵەکەی گوت: 'دەمهەوێ هەردووکمان لە یەک شـــەودا ژن بێنین. ئەگەر خودا بیهەوێ ژنی هەردووکمـان پێکەوە دووگیـان بن. هەر لە شـەوێکیشـدا ژنەکەی تۆ کوڕێکی بێ و ژنەکەی منیش کچێکی ببێ و ئیدی ئەمن کچەکەی خۆم لە کوڕەکەی تۆ مـارە کەم.' نوورەددین گوتی: 'مـارەییەکەی چەنـدە دادەنێی؟' شـەمسـەددین گوتی: 'لە سـەر هەزار دینار زێڕ، سـێ باخ و سـێ مەزرا مارەی دەکەم.' نوورەددین گوتی: 'ئەتۆ دەبێ کچەکەت هەر وا بدەی بە کوڕەکەم. هیچمان لێ نەســـتێنی. چونکە من و تۆ هەردووکمـان پلە و پایەمـان یەکە و کوڕەکەی من لە کچەکەی تۆ زۆر زیاترە و وەجاخی بنەماڵە بە کوڕەوە ڕوونە. ڕەنگە ئەتۆ بە تەما بی کچەکەت نەدەی بە کوڕەکەم. وەک پێشـینیان دەڵێن: 'کەسـێک ئیشـتیای لە شـەڕ نەبێ دەسـت دەداتە بەردی گەورە.' ' شەمسەددین گوتی: 'ئەوە تۆ گەوج بووی وا کوڕەکەی خۆت لە کچەکەی من بە زیاترە دەزانی؟ خۆشت بە هاوشانی من دادەنێی. ئیدی نازانی ئەمن بۆخۆم پێم خۆش بوو ئەتۆش لە وەزارەتدا بی. ویستم پشتیوانم بی نەک بارگرانییەک بە سەرمەوە. ئێستا کە وای لێ هـات، تـازە ئەمن کچی خۆم لە کوڕی تۆ مـارە نـاکەم ئەگەر بە خەروار زێڕ و جەواهێراتیشـــم بـدەیتێ. ئەگەر ســـەفەرم لە پێش نەدەبوو، دەم زانی چۆنـت لەگەڵ بجووڵێمەوە. ڕاوەستە با لە سەفەر بێمەوە، سزای ئەو قسانەت دەدەمەوە.'

" 'نوورەددین کە ئەو قســانەی بیســت، تووڕە بوو. بەڵام وە ســەر خۆی نەهێنا. هەتا شەمسەددین لەگەڵ پاشا ڕۆیشتن. نوورەددین تێرێکی پڕ کرد لە زێڕ و دوڕ و جەواهێرات.

قســـەکانی براکەی هاتەوە بیر کە خۆی لەو بە گەورەتر دەزانی و نوورەددینی بە کەمتر دەزانی. ئەو شێعرەی هاتەوە بیر.

هەرچەنـــدە تـــاڵە دەردی غەریـــبـــی
بـاشـــــترە لەوەی، بـێ ڕۆزی و ڕێـز بـێ

" 'داوای کرد مەیتەرەکەی ئەسپەکەی بۆ ساز کا. مەیتر خێرا چوو ئەسپی زین کرد و هێنای. نوورەددین تێرەکەی هاویشتە سەر کەڵوەی زینەکەی و بۆخۆشی سوار بوو. گوتی: 'نامهەوێ کەس لەگەڵم بێ، چونکە دەچمە دەرەوەی شـــار بۆ گەڕان.' تێشـــووی ڕێگەی هەڵگرت و ڕێگای دەشـت و چۆڵی گرتە بەر. ڕۆیی، ڕۆی هەتا گەیشـتە شـاری بەتلیس. لە ئەسـپەکەی دابەزی و نانی خوارد و شـەو لەوێ حەسـاوە. دیسـان تێشـووی هەڵگرت و ڕۆیشـت، ڕۆیشـت هەتا گەیشـتە قودس. لە ئەسـپەکەی دابەزی و نانی خوارد و ماوەیەک پشووی دا. قسـەکانی براکەی هەر وا ئازاری دەدا. ئەو شـەوە لەوێ خەوت. بەیانی هەسـتا وەڕێ کەوت هەتا گەیشـتە شـاری حەڵەب. لە کاروانســەرایەک لای دا. ســێ ڕۆژ لەوێ حەساوە. دیسان سواری ئەسپەکەی بووەوە و لە شار وەدەر کەوت. نەیدەزانی بۆ کام لا بچێ. هەر وا بێ مەبەســت ڕۆیشــت هەتا گەیشــتە بەسـرە، لە کاروانســەرایەک لای دا. تێرەکەی لە ئەســپەکە داگرت و لە شــوێنێکی خاوێن ڕاخەرێکی ڕاخســت و دانیشــت. ئەسپەکەشی بە زینی ڕازاوە بە زێڕ و خشڵی جۆراوجۆرەوە بە دەرکەوانی کاروانسـەرای سپارد و گوتی: 'بیگێڕە.' ئەویش ڕۆیشتە دەرێ و ئەسپەکەی دەگێڕا، بە ڕێکەوت وەزیری بەســرە کە لە بێلاکەی[١] خۆی دانیشــتبوو، چاوی بە ئەســپەکە کەوت و زین و لغاوە گرانبابییەکەی دیت. وای زانی ئەسپی یەکێک لە وەزیرەکان یا یەکێک لە شـازادەکانە. گورج خزمەتکاری کاروانســەراکەی بانگ کرد. پرســیاری لێ کرد: 'خاوەنی ئەو ئەســپە کێیە؟' خزمەتکارەکە گوتی: 'خاوەنی ئەو ئەســپە کوڕێکی هەژدەســـاڵەی جوانچاکەیە، لە کوڕە بازرگان و خاوەن پلەوپایە دەچێ.' وەزیرەکە ئەوەی بیســت، هەســتا ســوار بوو چوو بۆ کاروانسـەرا. نوورەددین کە زانی وەزیر بەرەو ئەوێ دێ، هەسـتا چووە پێشـێ و سـڵاوی کرد. وەزیر لە ئەســپەکەی دابەزی و نوورەددینی لە ئامێز گرت و پاشـــان دانیشــت و ئەویشـــی لە پەنا خۆی دانا و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، لە کوێوە و بۆچی هاتووی؟' نوورەددین گوتی: 'لە میسرەوە دێم. بابم وەزیری میسر بوو، کۆچی دوایی کرد.' ئیدی هەرچی لەنێوان ئەو و براکەیدا ڕووی دابوو. گێڕایەوە و گوتی: 'ئێســـتا بە تەما نیم بگەڕێمەوە، دەڕۆم بۆ ئەو شارە دوورانە.'

---

[١]. بەر هەیوان و پەنجەرە، کە باران نایگرێ، تراس .

" 'وەزیر کە گوێی لە قســـەکانی نوورەددین بوو، گوتی: 'ڕۆڵە گیـان، دوای هەوا و هەوەس مەکەوە، خۆت بە هیلاک مەدە.' نوورەددین ســەری داخســتبوو، هیچی نەدەگوت. ئینجا وەزیر هەستا و نوورەددینی بردەوە ماڵەکەی خۆی و شـوێنێکی خۆشی بۆ تەرخان کرد و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەمن ئەوە ئاخری تەمەنمە و منداڵی نێرینەشـم نییە. کچێکم هەیە لە جوانی و چاکیدا هەر وەک خۆت دەچێ. مرۆڤی پایەبەرز داوای کردووە و نەمداوەتێ. بەلام تۆم زۆر وەبەر دڵ کەوتووە و خۆشـــم دەوێی. دەمەوێ کچەکەی خۆمت لێ مارە کەم. ئەگەر پێت خۆشـــە، ئەمن دەچم بۆ لای پاشـــا و پێی دەڵێم کە ئەوە برازاکەم لە میسرەوە هاتووە، ئەو لە جیاتی من بکە بە وەزیر. من تازە پیر بووم.'

" 'نوورەددین کە ئەوەی بیست، سەری داخست و گوتی: 'زۆر باشە.' وەزیر خۆشحاڵ بوو. گەورە گەورەکانی کۆشک و دەمڕاست و ڕاوێژکار و بازرگانەکانی بانگهێشت کرد و پێی گوتن: 'براکەم لە میســـر وەزیر بوو، دوو کوڕی هەیە. ئەمنیش وەک دەزانن لەو کچە زیاتر نیمە. لەگەڵ براکەشـــم پەیمـانمان بەســـتووە کە من کچەکەم بدەم بە یەکێک لە کوڕەکانی. ئێســتا براکەم زانیویە کە دوێتەکەم کاتی شـووکردنی هاتووە، کوڕەکەی خۆی ناردووە بۆ لای من. ئەمنیش دەمەوێ کچەکەی خۆمی لێ مارە کەم. ڕای ئێوە بۆ ئەو کارە چییە؟' تێکڕا گوتیان پیرۆزە. شـــەربەتیان خواردەوە و گولاویان پرژاند و بلاوەیان کرد. ئیدی وەزیر جلی نوێی لە بەر نوورەددین کرد و ناردی بۆ گەرماو. کاتێک لە گەرماو هاتە دەرێ، چووە خزمەت وەزیر و دەستی ماچ کرد. وەزیریش تەوێڵی ماچ کرد.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی بیستەم هاتەوە

"گوتی: 'خاوەنشکۆ، کاتێک نوورەددین هاتە لای، وەزیر کچەکەی بەو سپارد و گوتی: 'ئەمشەو لەگەڵ ژنی خۆتدا بە ئاواتی دڵی خۆتان ڕابیوێرن و بەیانی دەچینە لای پاشا.' بەسەرهاتی نوورەددین ئاوای لێ هات. بەڵام شەمسەددین کە لە سەفەر گەڕاوە و نوورەددینی نەدیت، پرسیاری لە خزمەتکارەکان کرد. خزمەتکارەکان گوتیان: 'ئەو ڕۆژەی ئەتۆ لەگەڵ پاشا ڕۆیشتی، ئەویش بۆ گەشت و سەیران سوار بوو و ڕۆیشت، تا ئێستاش نەگەڕاوەتەوە.' شەمسەددین فکری ئاڵۆز بوو و خەمی براکەی دایگرت. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'هۆی ڕۆیشتنی براکەم هەر ئەو هەڵسوکەوت و قسە ناخۆشانەی من بووە.' دەمودەست هەستا و چووە لای پاشا. ئەوی لە ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە.

" 'پاشا نامەی بۆ هەموو لایەک نووسی و پیاوی وە دوا خست. بەڵام بێ ئەوەی هیچ سۆراغێکی بکەن، هاتنەوە. شەمسەددین لە دیتنەوەی براکەی تەواو هیوابڕاو ببوو. دایمە سەرکۆنەی خۆی دەکرد. لەو قسانەی کردبووی پەشیمان بوو. پاش ماوەیەک شەمسەددین کچی بازرگانێکی خواست. بە ڕێکەوت ئەو شەوەی شەمسەددین ژنەکەی گوێستەوە، نوورەددینیش لەو شەوەدا لەگەڵ کچی وەزیری بەسرە چوونە پەردەوە. سەیر لەوەدا بوو هەردووک ژنە پێکەوە دووگیان بوون. ژنی شەمسەددین کچی بوو، ژنی نوورەددینیش کوڕ.

" 'کە کەوتەوە بەیانی، نوورەددین لەگەڵ وەزیر چوونە لای پاشا. نوورەددین کە کوڕێکی بوێر و جوانچاک بوو، کوڕنۆشی بۆ پاشا برد و ئەو شێعرەی گوت:

ڕای سوڵتانی شکۆدار، ئەو پاشای دادپەروەران
بووەتە کۆڵەکەیەک بۆ، پارێزگاری لە جیهان
ڕای وەکوو تیشکی خۆرە، وڵاتی داگرتووە
هێزی دەسەڵاتی ئەو، گشت لایەکی گرتووە

" 'ئیدی پاشا ڕێز و قدری گرت و لە وەزیری پرسی: 'ئەو کوڕە کێیە؟' وەزیر گوتی: 'ئەمن برایەکم لە میسر وەزیر بوو. بۆخۆی مرد. دوو کوڕی هەیە. کوڕە گەورەکەی بە جێی بابی بووە بە وەزیر و کوڕە چکۆڵەکەشی ئەوەیە کە هاتووەتە لای من. ئێستا ئەمن کچەکەمم لێ مارە کردووە. کوڕێکی زۆر وشیار و زانا و لێهاتووە. ئەو لە سەرەتای لاوەتیدایە و منیش لە کۆتایی تەمەنم دام؛ سۆمای چاوم کەم بووە و شتم باش بۆ لێک نابێتەوە، هەر بۆیە تکا لە پاشای بەڕێز دەکەم کە ئەو لە جێی من بکە بە وەزیری خۆت.'

" 'پاشا داواکەی پەسەند کرد و ئەوی کردە وەزیری خۆی. جلوبەرگی بەنرخی دایە و ئەسپەکەی خۆی پێشکەش کرد. ئەو جار وەزیرە بەسرەیییەکە و نوورەددین هەردووکیان پێکەوە کورنۆشیان برد. بەوپەڕی دڵخۆشی و ڕەزایەتەوە لە خزمەت پاشا گەڕانەوە. ڕۆژی دوایی نوورەددین چووە لای پاشا و کورنۆشی برد و گوتی:

بوویتە قەڵغانی نەجاتم لە تیغی تیژی ڕۆژگار
جاماسا١، تەبعت ستریم، لە خشت و خاڵی ڕۆژگار

" 'پاشا نوورەددینی لەسەر کورسی وەزارەت دانا. نوورەددین لە پێگەی وەزارەت دانیشت و خەریکی کاروباری خەڵک و وڵات بوو. پاشاش چاوەدێری دەکرد. پاشا زانایی و لێهاتوویی نوورەددینی بە لاوە سەیر بوو. کە بوو بە ئێوارە، کاری دیوان تەواو بوو. نوورەددین گەڕاوە بۆ ماڵێ. چی کردبوو بۆ وەزیری پێشووی گێڕاوە. ئەوی لە دڵسۆزی پاشا ئاگادار کردەوە. هەردووکیان بە دڵێکی ڕازی و خۆشەوە پێکەوە دانیشتن. هەتا خێزانی نوورەددین کوڕێکی بوو. ناویان نا حەسەن بەدرەددین. ڕۆژانە باپیری هەر خەریکی پەروەردەی نەوەکەی بوو. نوورەددینیش بە ڕۆژدا هەر لە دیوەخان لەگەڵ پاشادا خەریکی کاری وەزارەت بوو. شەو و ڕۆژ لە پاشا جودا نەدەبووەوە، هەتا زۆربەی داخوازییەکانی وە دەست هێنا. پاپۆڕ پاپۆڕ کاڵا و شتی گرانبایی دەنارد بۆ شارەکانی دیکە. بازرگانی دەکرد. تا وای لێ هات بوو بە خاوەنی ماڵ و سامانێکی هەمەچەشن. کاتێک حەسەنی کوڕی تەمەنی گەیشتە چوار ساڵان. خەزووری مرد. نوورەددین خەم دایگرت. دوای حەوت ڕۆژ گومەزێکی لەسەر گۆڕەکەی درووست کرد و دەستی بە پەروەردەی حەسەن کرد. کاتێک حەسەن گەورە بوو، زانایەکی گرت و کردیە مامۆستای. حەسەن فێری قورئان بوو، خەتی دەنووسی، هەروەها فێری زۆر زانستی دیکەش بوو. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لە باری ڕەوشت و ژیرییەوە گەشەی دەکرد. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

جوانی، ئەڤینداری سیمای جوانی تۆیە
بۆیە لەنێو جوانانـدا هەر خەریکی تۆیە

" 'ڕۆژێک نوورەددین جلی ئاوریشمین و خەزی٢ لە بەر حەسەن کرد، سواری ئەسپێکی کرد. بردی بۆ لای پاشا. پاشا کە حەسەن بەدرەددینی دیت، سەری لەو هەمووە جوانی و ڕێکوپێکییەی سوورِ ما. بە نوورەددینی گوت: 'هەموو ڕۆژێ ئەو کوڕە بێنە

---

١. جام: ئاوێنە.

٢. خەز: بە کەوڵی ئاژەڵی وەک ڕێوی و سمۆرە و بەوەرز و شتی وا دەگوترێ.

ئێره.' نوورەددین کورنۆشی برد و هەموو ڕۆژێ حەسەنی لەگەڵ خۆی دەبردە دیوەخانی پاشا. هەتا حەسەن بوو بە پازدە ساڵ. نوورەددین ناساخ بوو. حەسەنی بانگ کردە لای خۆی و وەسییەتی کرد و فێری ڕێوشوێنی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵک و کاری وەزارەتی کرد. لەو جەنگەیەدا نوورەددین کەوتەوە یادی براکەی و وڵاتەکەی. دەستی کردە گریان و گوتی: 'کوڕی خۆم، شەمسەددین ناوێک هەیە برای منە و مامی تۆیە. وەزیری میسرە. ئەمن بە پێچەوانەی ویست و تکای ئەو لە میسر وەدەر کەوتووم. ئێستا تۆ دەست دە پێنووسێک و چۆنت پێ دەڵێم ئاوا نامەکە بنووسە.' ئیدی حەسەن بەدرەددین پێنووس و لێنووسی وەرگرت و ئەوەی نوورەددین دەیگوت، دەینووسی. هەتا تەواوی بەسەرهاتی خۆی لە هاتنەکەیەوە بۆ بەسرە و دیداری لەگەڵ وەزیر و هەر شتێکی لەو ماوەیەدا تووشی ببوو، هەمووی گوت. حەسەنیش نووسی. ئەو جار بە حەسەنی گوت: 'وەسییەت بێ ڕۆڵە گیان، هەر کات خەم و گرفت و ناڕەحەتیت بوو، بچۆوە میسر بۆ لای مامت. بە مامت بڵێ براکەت لە غەریبیدا ئاواتەکەی تۆی بەدی هێناوە.' ئیدی حەسەن وەسییەتنامەکەی پێچاوە و بەرگێکی جوانی بۆ دروو و لە قۆڵی خۆی بەست. زۆر بۆ بابی گریا و پەرۆشی بوو. ئەوەندەی نەخایاند باوکی مرد.

" 'شین و ڕۆڕۆی ماڵێ و کەنیزەکان بەرز بووەوە و پاشا و تەواوی گەورە گەورەکان و فەرماندەی سوپا ئەژنۆی خەمیان بۆ لە ئامێز گرت و پەژارە دایگرتن. دوای سێ ڕۆژ ناشتیان. حەسەن هەتا دوو مانگ هەر لە ماتەمدا بوو، نەچوو بۆ لای پاشا.

" 'پاشا کەسێکی دیکەی لە جیاتی ئەو کردە وەزیر و دەستووری دا ماڵەکەی لێ گاڵە دەن و مۆری کەن و ئەو ماڵ و سامانەی هەیەتی دەستی بە سەردا بگرن. وەزیری تازە بە دەست و پێوەندەکەیەوە بڕیاری دا لەسەر ماڵی نوورەددین بێ و وەک ڕاسپێردابوو دەست بەسەر ماڵ و سامانی نوورەددیندا بگرێ و حەسەن قۆڵبەست بکەن.

" 'یەکێک لە گەورەکانی دەربار، ملکداری یەکێک لە ملکەکانی نوورەددین کە ڕێی بە خۆی نەدا کوڕی نانبدەی خۆی بە شێوەیەکی ناحەز قۆڵبەست بکا. خێرا خۆی گەیاندە حەسەن بەدرەددین. سەیری کرد ئەوە مات و مەلوول دانیشتووە. ئاگاداری بابەتەکەی کردەوە. حەسەن گوتی: 'وا چاکە هەتا دەرفەت ماوە، بچم کەمێک شت کە دەمهەوێ، بۆ تێشووی ڕێگام وەلا خەم.' پیاوەکەی نوورەددین گوتی: 'لەوانە گەڕێ، گیانی خۆت دەرباز بکە.' حەسەن بەدرەددین کە ئەوەی بیست، سەر و چاوی خۆی بە قوماشێک داپۆشی، ڕۆیشت هەتا لە شار وەدەر کەوت. لە ڕێگە گوێی لێ بوو خەڵک بە داخ و کەسەرەوە بە یەکتریان دەگوت: 'پاشا وەزیری تازەی ناردووە هەتا ماڵی وەزیر نوورەددین دابخا و حەسەن بەدرەددین قۆڵبەست بکا.' کە ئەو قسانەشی گوێ لێ بوو، ڕێگەی دەشت و دەری گرتەبەر و نەیدەزانی ڕوو لە کوێ بکا. تا ڕێی کەوتە گۆڕستان. کە گۆڕەکەی بابی دیت، چووە نێو قسنەکەیەوە. هێشتا دانەنیشتبوو کە جوولەکەیەکی خەڵکی بەسرە گەیشتێ و

گوتی: 'ئەی وەزیری ژیر و بەلیمەت، بۆ ئاوا ئالۆز و شێواوی؟' حەسەن گوتی: 'ئێستێک خەوتم لە خەونمدا بابم لێم نارەحەت بوو کە خێر و خێراتم بۆ نەکردووە. منیش لەو کەمتەرخەمییەی خۆم ئەوەندە نارەحەت بووم، داچڵەکام. ئیدی هاتمە سەر گۆڕەکەی و بە تەمام کەشتییەک لە کەشتییەکان بفرۆشم و هەزار دیناری بۆ بابم بکەمە خێر، ئەتۆ ناتەهوێ؟' جوولەکەکە زۆری پێ خۆش بوو، خێرا هەمبانەی پارەی دەرهێنا و هەزار دیناری بۆ ژمارد و گوتی: 'گەورەم، بە خەتی خۆت کاغەز و نووسراوەیەکم بۆ بنووسە و موری بکە. حەسەن پێنووسی دەرهێنا و نووسی کە نووسەری ئەو خەتە حەسەن بەدرەددین یەکێک لە پاپۆڕەکانی بەو جوولەکەیە بە هەزار دیناری زێڕی سوور فرۆشتووە و پارەکەشی وەرگرتووە. ئیدی جوولەکەکە خەت و نووسراوەکەی وەرگرت و ڕۆیشت و، حەسەن مات و مەلوول دانیشت. کەمێک بۆ حاڵی خۆی گریا. هەتا بوو بە شەو.

" 'حەسەن هەر لەوێ لێی خەوت. چونکە گۆڕستان جێگەی جندۆکانە، جندۆکەیەکی ژنی موسوڵمان بە وێدا ڕابرد. دیتی ئەوە قسنەکە بە نووری حەسەن بەدرەددین ڕووناک بووە. جندۆکەکە سەری سووڕ ما و وەهەوا کەوت. دێوێکی دیت. سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'لە کوێرا دێی؟' دێوە گوتی: 'لە شاری میسرەوە دێم.' جندۆکە گوتی: 'ئەمن لە بەسرەوە دێم. لە گۆڕستانەکە کوڕێکی ئەوەندە جوانچاکی لێیە، لە دنیادا نموونەی نییە. وەرە با بچین پیشانت بدەم.' ئیدی هەردووکیان هاتنە قسنەکەی وەزیرەوە و چاویان لە جوانی حەسەن بەدرەددین بڕی. جندۆکەکە گوتی: 'ئەمن تا ئێستا کوڕی ئەوەندە جوانم نەدیوە.' دێوەکەش گوتی: 'ئەمنیش مرۆڤی ئاوام نەدیوە، بەڵام لە میسر شەمسەددینی وەزیر کچێکی هەیە زۆر وەک ئەو کوڕە دەچێ. پاشای میسر خوازبێنی لێ کرد. وەزیری میسر گوتوویەتی کە ئەو کچەم بۆ برازاکەم داناوە و سوێندم بۆ براکەم خواردووە نەیدەم بە کەس. کە پاشا ئەو قسەیە لە وەزیر دەبیستێ، تووڕە دەبێ و دەڵێ: 'ئەمن کچ لە شتی وەک تۆ دەخوازم و، ئەتۆش بیانووی پڕوپووچم بۆ دێنییەوە. بە خودا دەبێ ئەو کچەت بدەم بە هیچ و پووچترین کەسی ئەو شارە.' ئیدی پاشا ناردی قولەڕەشێکیان هێنا کە قەمبوور[1] بوو و سینگی تێک قووپا بوو. کچەیان لێ مارە کرد و گوتی: 'دەبێ هەر ئەمشەو کیژەکەی بدەنێ.' قولەڕەشەکان هەموو لەو قولە قەمبوورە کۆ ببوونەوە و مۆمگەلێکی زۆریان هەڵکردبوو و بە دەستیانەوە بوو. بۆ گەرماویان دەبرد. لە ڕێدا پێکەوە گاڵتە و جەفەنگیان دەکرد و پێدەکەنین. بەڵام کچەکەی وەزیر کە ئارایشگەرەکان خەریکی ڕازاندنەوەی بوون، دەگریا.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. قەمبوور: کووڕ و پشت دەرپەڕیو.

## که شەوی بیست و یەکەم هاتەوە

شەهرزاد گوتی: "خاوەنشکۆ، 'دێوە بەسەرهاتی کچی وەزیری بۆ جندۆکەکە گێڕاوە کە ئەویان داوە بە پیاوێکی ڕەشی قەمووری دزێو. ئەویش زۆر مات و پەشێو بوو. دەشیگوت: 'کەس وەک ئەو کچە شێوەی ئەو کوڕە نادات.' جندۆکەکە گوتی: 'ئەمن باوەڕ بە قسەی تۆ ناکەم، پێم وا نییە لەنێو مرۆڤدا کەسێک هەبێ لەو کوڕە بچێ.' دێوە گوتی: 'خوشکم، بە گیانی تۆ، ئەو دوو کەسە زۆر وەک یەک دەچن. جا یان خوشک و بران، یان ئامۆزان. هەزار حەیف و مەخابن کە دەبێ ئەو پەریزادەیە لەگەڵ ئەو قولە قەموورە بێ.' جندۆکەکە گوتی: 'براکەم، وەرە با ئەو کوڕە هەڵگرین و بیبەینە لای ئەو کچەی وەزیر، بزانین وەک یەک دەچن یان کامیان لە کامیان جوان و دەلالترە.' وا بوو هەردووکیان بەو کارە ڕازی بوون و کوڕەیان هەڵگرت و وە هەوایان خست و لە میسر هاتنەوە خوارێ. کوڕەیان لە زەوی دانا و لە خەویان هەستاند. حەسەن زانی کە ئەو شوێنە قسنەکەی بابی نییە و ئەو شارەش شارێکی دیکەیە. ترسا، ویستی هاوار بکا. دێوە گوتی: 'هیچ نەکەی، من تۆم هێناوەتە ئێرە و بە تەماین چاکەت لەگەڵ بکەین.' دێوە گورج مۆمێکی هێنا، هەڵی کرد و دایە دەست حەسەن و گوتی: 'بچۆ ئەو گەرماوەوە لەنێو خەڵکەکەدا ڕاوەستە کە ئەوان لە گەرماوەکە هاتنە دەرێ، ئەتۆش لەگەڵیان وەرە دەرێ و لەگەڵ ئەوان برۆ هەتا ماڵی زاوا. ئەوجار خۆت وە پێش خە و بچۆ لە لای ڕاستی زاوا ڕاوەستە. لە کەسیش مەترسە، ئەگەر ئاڕایشگەر و گۆرانیبێژەکان هاتنە پێشێ، دەست بۆ گیرفانت بەرە و زێڕیان بەسەردا هەڵخەوە.' حەسەن کە ئەو قسەیەی لە دێوەکە بیست، سەری ماسی. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بڵێی ئەوە چ بێ.' ئینجا مۆمەکەی بە دەستەوە گرت و چووە نێو گەرماوەکەوە. سەیری کرد، زاوایان هێنا و سواری ئەسپێکیان کرد و ڕۆیشتن. حەسەنیش وەک دەرکەوتنی مانگ لە جلوبەرگی وەزارەتەوە لە پێشەوەی ئەو کۆمەڵەوە دەڕۆیشت. هەر کاتێک ئاڕایشگەر و گۆرانیبێژەکان دەهاتنە پێشێ و شاباشیان دەویست، زێڕی بەسەردا هەڵداویشتنەوە. خەڵک لە دەستی و دڵکراوەیی ئەو واقیان وڕ مابوو. هەر ئاوا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی زاوا. بووک و زاوا، بەربووک و برازاواکان و دەوروبەریانی نەیانهێشت خەڵکەکە بچنە ژوورێ، بۆ حەسەن بەدرەددینیش هەروەتر. گۆرانیبێژەکان گوتیان ئەگەر نەهێڵن ئەو کوڕە بێ، ئێمەش نایەینە ژوورێ. ناچار ڕێی ئەویشیان دا و لە پەنا زاوا ڕاوەستا. ژنی گەورە گەورەکان هەریەکەی مۆمێکیان بە دەستەوە و بە ڕیز ڕاوەستابوون. ژنان کە چاویان بە جوانی حەسەن بەدرەددین کەوت، هاتنە پێشەوە، مۆمەکانیان لەپێش ڕاگرت و تێی ڕامان. عەقڵ و هۆش لە سەریاندا نەما و پەچە و ڕووبەندیان فڕێ دا. ڕووبەڕووی واقیان وڕ ما. هەموویان پێکەوە گوتیان خودایە ئەو کیژە جوانە بە قسمەت ئەو خورتە دەلالە بکەیت.

دوای ئەوە مۆسیقارەکان دەفیان لێدا. ئارایشگەرەکان لە حەرەمسەرا هاتنە دەرەوە. کچی وەزیریش بە زێڕ و زیو و جەواهێرات ڕازاوە و تیفتیفەدراو، بۆنخۆشکراو بە بۆنی جوراوجۆر، دڵڕفێن لە نێوەڕاستی ئەواندا بوو. هەر کە لە هەیوان هاتنە دەرێ، قولەی قەموور هەستا ماچی کا. کچە ڕووی لێ وەرگێڕا و لە لای حەسەنی ئامۆزای ڕاوەستا. ژنان هەموو پێکەنین. حەسەن دەستی لە گیرفانی ڕاکرد و مستێکی زێڕ دەرهێنا و بەسەر ئارایشگەرەکاندا هەڵی هاویشت. ئەوانیش هەموو بە دەنگێکی بەرز گوتیان: 'ئێمە لە خودامان ویست ئەو کچە بۆ تۆ بێت.' حەسەن بزەیەکی هاتێ. قولەی قەموور وەک مەیموون لەوێ ڕاوەستابوو.

" 'لە قەزاوە هەر مۆمێکی هەڵکراو دەدرایە دەست قولەی قەموور لە بەختی ڕەشی دەکوژاوە. بووک دەستی بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە و دەیگوت: 'خودایە ئەو لاوە بکەی بە مێردی من و لە دەست ئەو دێوەم ڕزگار بکەی.' ئارایشگەرەکان لەبەر ئەو هەمووە چاکەیەی حەسەن لەگەڵی کردبوون، ئەوانیش ئەوەندەی بۆیان کرا خەریکی بووک بوون و جوان ڕازاندیانەوە. ماوەیەکی پێ چوو هەموو خەڵکەکەیان دەرکردە دەرەوە. جگە لە بووک و قولە قەموورەکە و حەسەن بەدەردەدین. ئەوجار قولەی قەموور هاتە پێشێ و بە حەسەنی گوت: 'گەورەم، ئەمشەو بە گەورەی و چاکەی خۆت شەرمەزارت کردین. ئێستا کاتی ئەوەیە بڕۆی، پێش ئەوەی دەرکرێی.' حەسەن هەستا و لە ماڵەکە چووە دەرەوە، خێرا دێوە گەیشتێ و گوتی: 'لەجێی خۆت ڕاوەستە. هەر کە قولەی قەموور هاتە دەرێ بچێ بۆ ئاودەست، ئەتۆ خێرا بچووە پەردەی بووکەوە و پێی بڵێ زاوای ڕاستی منم. ئەوە پاشا بۆ ئەوەی بە چاوە نەبین ئەو فێڵەی کردووە. دەنا ئەوە یەکێک لە کۆیلەکانی خۆمانە. ئیدی ئەوجار پەردە لە ڕوخساری لادە و لە کەس مەترسە.' حەسەن خەریک بوو لەگەڵ دێوەکە قسەی دەکرد، قولەی قەموور لە ژووری هاتە دەرێ و چووە ئاودەست. دێوە بوو بە مشکێک لە پەنا حەوزەکەوە هاتە دەرێ. قولەی قەموور گوتی: "'بۆ هاتوویە ئێرە؟' لەجێوە مشکە گەورە بوو. بوو بە پشیلە، گەورەتر بوو، بوو بە سەگ و وەک سەگ دەستی کرد بە وەڕین. قولەی قەموور ترسا و هاواری کرد. دێوە گوتی: 'بێ دەنگ بە ،مەیموون.' خێرا بوو بە کەرەکێوی و وەک کەر دەستی بە زەڕەزەڕ کرد. قولەی قەموور ترسی ڕێ نیشتبوو و دەلەرزی. ئینجا بوو بە گامێش و جێگای بە قولەی قەموور تەنگ کرد. وەک مرۆڤ وەقسە هات و گوتی: 'ئاخر هیچ و پووچترین کۆیلە، هیچ کەس لەو دنیا پان و بەرینە نەمابوو بیهێنی، خۆشەویستەکەی من نەبێ.' قولە قەموور بە دیتنی ئەو دیمەنە خەریک بوو لە ترسان گیانی دەرچێ. هەر بە جلی زاواییەوە لە ئاودەستەکە کەوت و یەک قسەشی بۆ نەدەهات. دێوەکە گوتی: 'وەڵامم دەوە، دەنا دەکوژرێی.' قولە قەموور گوتی: 'تاوانی من نییە، تاوانی ئەو کەسەیە ئەو کارەی بە من کرد. من نەم دەزانی ئەو کچە

واشـتای گامێشـە. ئێسـتا کە زانیم، تۆبە دەکەم.' دێوە گوتی: 'سـوێند بخۆ هەتا تاوهەڵاتی بەیانی، لێرە نەیەیتە دەرێ و هیچ قسـەش نەکەی. کە تاویش هەڵات، لێرە دێیتە دەرێ و دەڕۆی وە دوای کاری خۆت دەکەوی.' قولە قەموور لێقەوماوانە سـوێندی دەخوارد. ئینجا دێوە قولە قەمووری گرت و سـەرەوبن لە کونی ئاودەسـتکەی هاویشـت و پێی گوت: 'هەتا بەیانی لێرە دەمێنییەوە.' کاری قولە قەموور و دێوە بێرە گەیشت.

حەسەن بەدرەددین چووە پەردەوە، ئەوجار پیرێژنێک بووکی نارده پەردەوە و بۆخۆی لەپشـت دەرگاکەوە ڕاوەسـتا، وەک ئەوەی بەردەنگەکەی قولەقەموور بێ گوتی: "هۆ بابی شـەهاب، بووکی خۆت وەرگرە.' ئیدی پیرێژن گەڕاوە. بووک ناوی سـیتتولحوسـن بوو. بە دڵێکی پڕ لە پەژارەوە بەرەو پەردە ڕۆیشـت. لە دڵی خۆشـیدا دەیگوت: 'ئەگەر بشـمرم، ناهێڵم قولە قەموور دەستم لێ بدات.' کە سیتتولحوسن چووە پێشێ و حەسەن بەدرەددینی لە پەردەدا دیت، گوتی: 'گەورەم، سـەیرە، ئەوە تۆ هێشـتا هەر لێرەیت! ئەمن وام دەزانی زاوا ئەو قولە قەموورەیە.' حەسـەن گوتی: 'قولە قەموور لەکوێ و تۆ لەکوێ؟! ئەوە کوا بۆ مێردی تۆ دەبێ.' کچە گوتی: 'ڕاسـتم پێ بڵێ، ئەتۆ مێردی منی یا قولە قەموور؟' حەسـەن گوتی: 'خانمەکەم، کاتێک ئارایشـگەرەکان سیمای جوان و دەلال و مانگئاسـای تۆیان دیت، ترسان بە چاوەوە بی، هەر بۆیە ئەو قولە قەموورەیان بۆ گەپچاڕ هێنا هەتا چاوە پیسەکان تەواو سەرنج نەدەنە سەر ئێمە. کە خەڵکەکە ڕۆیشت، ئەویش ڕۆیشت.' سیتتولحوسن کە ئەو قسانەی بیست، خۆشحاڵ بوو، بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'ڕوومانگەکەم، خودا لە هەموو بەڵا و مەترسـییەکان بتپارێزێ. وا تۆ ئاوری دڵی منت دامرکاند. بەڵام ئێسـتا تۆو خودا ڕامەوەستە وەرە هەرچی زووترە لە ئامێزم گرە.' حەسـەن چووە پێشێ و جلەکانی لە بەر بووک داکەند و بۆخۆشی هەستا کیسە پارەکەی کە لە بەرابەر پاپۆڕەکەدا لە جوولەکەکەی وەرگرت، لەنێو کەوا شـۆڕەکەی خسـت و لەو لاوەی دانا. دەسـرە و کڵاوەکەی لەسـەر کورسـییەکە دانان و، بێ لە کراسـێکی ژێرەوە هیچی لە بەر خۆیدا نەهێشـت. پاشـان ئەو شێعرەی گوت:

ئەمشـەو لە ئـامـێـزی گـەرمـی یـارەکـەمـدا بەخـتەوەرم
مـۆمـاسـا هەتـا بەیـانـی، هەر دەتـوێـمەوە و دەگـرم
چی شـک نـابەم تـا لەمپەر بێ، لە نێوانی من و ئەودا
کراسـێکی نەرم و تەنکە، پێویسـت بێ بیانووی پێ دەگرم

" 'دوای ئەوە کچەی لە باوەش گرت و جووت بوون. کچە لێی دووگیان بوو. لە باوەشی یەکتردا بە دڵخۆشی و کەیف سازی و کامەرانی خەوتن. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

قــوربــانــی ئەو شـــەوە بــم بــاڵا عەڕعەڕی لــێ بــوو
تــا بەیــانــی كــاری مــن هەر ئەمــر و نەهــی بەو بــوو
ئــاڵابــوو لە قەدی مــن، بەژنــی نــاســـــكــی لاولاو
تــۆمەز كە ئەو دنــیــایە، تــیــا نەمــابــوو ژن و پــیــاو
یــا خواردنەوە و مــاچومووچ، یــا هەر بەزم و ســـەمــا بوو
چی كەم نەبوو، ئەگەر بوو، ســـســـتی بوو، لە منــدا بوو

" 'حەسەن بەدرەددین كارەكەی بێرە گەیشت.

ئەو جار دێوە بە جندۆكەی گوت: 'هەســتە با كوڕە هەڵگرین بیبەینەوە جێگەكەی خۆی. ئەوە خەریكە ڕۆژ دەبێتەوە.' ئیدی جندۆكە حەسەنی هەڵگرت و وە حەوای خست. دێوەش بە دوایاندا وە حەوا كەوت. تا بە ویستی خودای مەزن فریشتە بەردێكی ئاسمانی لە دێوە دا و ســووتاندی و جندۆكەش هەر لەوێ حەســەنی دانا. ئەو شــوێنە دیمشــق بوو. وا بوو جندۆكەكە حەسەنی لە یەكێك لە دەروازەكانی شار دانا و بۆخۆی وە حەوا كەوت.

كاتێك ڕۆژ بووەوە، خەڵكی گەڕەكەكە هــاتنە دەرێ دیتیان ئەوە كوڕێكی وەك مــانگ جوان بە توێی كراســێكی ژێرەوە بەبێ دەســرە و ســەرپێچ لەو ســەر زەوییە وا خەوتووە، دەڵێی دەیان ســـاڵە نەخەوتووە. خەڵك كە ئەوەیان دی، گوتیان: 'خۆزگەم بەوەی تا بەیانی لە ئامێزی ئەوەدا خەوتووە.' یەكی دیكە دەیگوت: 'ئەو گەنجە تازە لە مەیخــانە هــاتووەتە دەرێ، هێندە مەســت بووە نەگەیشــتووەتەوە ماڵێ و لێرە كەوتووە.' ئیدی ئەو خەڵكەی لێی كۆ بوونەوە، هەریەكەی قســـەیەكی دەكرد و جۆرێكی بۆ دەچوو. حەســـەن بەدرەددین بە ئاگا هات، ســەیری كرد ئەوە لە دەركی ماڵێك كەوتوو و خەڵكی تێ ئاڵاوە. پێی ســەیر بوو، گوتی: 'خەڵكینە بۆ تێم ئاڵاون.' گوتیان: 'ئەتۆ لە بەیانییەوە لێرە كەوتووی. ئێمە نازانین تۆ لە كەیەوە لێرەی، یا شەو لەكوێ بووی.'

" 'حەســـەن گوتی: 'ئەمشـــەو من لە میســر خەوتبووم.' یەكێك گوتی: 'بەنگی كێشــاوە.' حەســـەن گوتی: 'بە خوا درۆ ناكەم، من دوێ شــەو لە میســر و پێرێ شــەویش لە بەســرە بووم.' یەكێك گوتی: 'وەڵا ســـەیرە.' ئەویدی گوتی: 'ئەوە شــێتە، بە ڕاســـتی حەیفیشـــە.' دەنكێكی دیش گوتی: 'خۆتمان لێ شــێت مەكە، ژیرانە قســە بكە.' حەســـەن گوتی: 'بە خوا! دوێنێ شــەو لە میسر زاوا بووم.' گوتیان: 'ڕەنگە خەونت دیتبێ.' ئیدی حەســەن ســەری لە كاری خۆی ســـوور مابوو. پێی گوتن: 'خوا شـــایەدە خەون نەبوو. دوێنێ شـــەو قولە قەمووریش لە لای ئێمە دانیشــتبوو. ئەمن توورەكەیەك زێڕ و ســەرپێچ و كەواشــۆڕەكەمم

پێ بوو لەسەر کورسییەکەم دانان و لەگەڵ بووک تێ خزاین.١ ئیدی نازانم چیم لێ بەسەر هات.' حەسەن هەستا لەوێ ڕۆیشت و لە گەڕەک و شەقاماندا دەسووڕاوە و خەڵک و منداڵان دوای دەکەوتن. بە پێکەنین و چەپڵەڕێزانەوە ئازاریان دەدا و بەردیان تێ دەگرت. هەتا حەسەن گەیشتە بەر دەرگەی چێشتخانەی پاڵەوان و خۆی بەوێدا کرد. چونکە خەڵکی دیمشق هەموو لەو چێشتلێنەرە ئازا و چالاکە دەترسان، ئیدی هەموو بڵاوەیان کرد. چێشتلێنەرەکە کە چاوی بە ڕوخساری پاک و جوانی حەسەن کەوت، بەزەیی بۆی بزووت و گوتی: 'کوێنەبیت٢؟' حەسەن بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە. باسی هەموو شتێکی بۆ کرد. چێشتلێنەر گوتی: 'شتێکی سەیرە، بەڵام ئەتۆ ئەوەی لە لای کەس باس مەکە. من تۆ بە کوڕی خۆم قەبووڵ دەکەم، چونکە من منداڵم نییە.' حەسەنیش گوتی: 'ئەمنیش تۆم بە بابی خۆم قەبووڵ کرد.' خێرا چێشتلێنەر چووە دەرێ و جلوبەرگی جوان و شیاوی بۆ کڕی و لە بەری کرد. هەستا بردیە لای قازی. قازی بە شایەد گرت کە ئەو حەسەنە کوڕی ئەوە. لە دیمشق حەسەنیان بە کوڕی چێشتلێنەری پاڵەوان دەناسی و پێیان دەگوت: 'حەسەن چێشتلێنەر.'

" 'بەڵام سیتتولحوسن، کچی وەزیر، کاتێک ڕۆژ بووەوە، بە ئاگا هات و حەسەنی لە پەنا خۆی نەدیت. وای زانی چووەتە ئاودەست. ماوەیەک چاوەڕوانی بوو. وا بوو لەپڕدا شەمسەددینی وەزیر، بابی بووک، هات بزانێ کچەکەی چی کردووە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'ئێستا کە پاشا لە داخان ئەو کچەی منی بە قولێکی قەموور داوە، منیش کچەکەم دەکوژم و ئەو پەڵە ڕەشەی لەسەر شانم لا دەبەم.' بە کورتی کاتێک وەزیر گەیشتە بەر دەرگایماڵی کچەکەی، کچەکەی بانگ کرد. کچەکەی بە 'بەڵێ، بەڵێ ... بابە ئەوە دێم.' بەرەو پیری چوو. وەزیر چاوی بە کچەکەی کەوت گوتی: 'قەحبە، ئەوە تۆ ئاوا دڵت بە قولە قەمووریک خۆشە؟!' سیتتولحوسن گوتی: 'گەورەم، گاڵتە و گەپە. قولە قەموورەکەیان هەر بۆ پێکەنین و سەرقاڵکردنی خەڵک هێنابوو.' ئەویش سەرکۆنەی کرد و گوتی: 'ئەو مێردی تۆیە.' کچەکەی گوتی: 'سپاس بۆ خوا ئەو مێردی من نەبوو، من مێردێکم هەیە هەزاری وەکوو قولە قەموور بە نینۆکێکی ئەو نابن کە کردوویە و فڕێی داوە.' وەزیر کە ئەوەی بیست، تووڕە بوو و گوتی: 'قەحبە، ئەو قسانە چییە دەیانکەیت؟ قولە قەموور ئەمشەو تا بەیانی لەگەڵ تۆ بووە.' دوێتە گوتی: 'بابە تۆ ئەو خوایە نێوی ئەو ناحەزە لە لای من مەهێنە و لەوە زیاتر گاڵتەم پێ مەکە. وەڵڵا ئەوەیان هەر بۆ سەرقاڵکردنی و قەشمەری هێنابوو. مێردی من ئەوە بوو وا دوێنێ شەو ئەوەندەی زێڕ دا بە گۆرانیبێژ و مۆسیقارە و ئارایشگەرەکان دا کە بێنیازی کردن. ئەو ڕووی وەک مانگ، چاوڕەش و برۆپەیوەست و

---

١. تێ خزاین: چووینە جێگاوە، پێکەوە خەوتین.

٢. کوێنەبیت: خەڵکی کوێیت، منال کوورەیت.

مووقەیتەرانی بوو.' وەزیر کە ئەوەی بیســـــت، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو. قەڵس بوو، دەستی بە جنێودان کرد. کیژەکە گوتی: 'بابە ئەتۆ بۆ توورە بووی؟ ئەو کورە رووماتگە کە میردی منە، چووەتە ئاودەســـت.' وەزیر ســــەری ســــوور ما. لەرێوە چووە ئاودەســـتەکە. ســــــەیری کرد ئەوە قولە قەموور ســـــەرەوبن لە گونجەکە کەوتووە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'مەگەر ئەوە هەر قولە قەموور نییە؟' ئەو جار بانگی قولە قەمووری کرد. قولە قەموور لەپێشدا هیچی نەگوت. پاشان وە شک کەوت گوتی: 'رەنگە دێوە بێ.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتایی پێ هات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'کاتێک قولە قەموور دەنگی وەزیری بیســـت، وای زانی ئەوە دێوەکەیە و لە وەڵامدا گوتی: 'ئەی سـەروەری دێوان، لەو کاتەوە منت لێرە هاویشتووە، نە سـەرم هەڵێناوە و نە قسـەشـم کردووە.' وەزیر گوتی: 'ئەمن دێو نیم، ئەمن بابی بووکم.' قولە قەموور گوتی: 'برۆ لە کۆڵم بەوە هەتا دێو دێتەوە. ئێوە واشتای گامێش و جندۆکانتان لە من مارە کردووە. خودای من ئەو کەســـە بگرێ ئەوەی لە من مارە کرد.' وەزیر گوتی: 'هەسـتە لەو شـوێنە وەرە دەرێ.' قولە قەموور گوتی: 'مەگەر من شـێتم بەبێ ڕوخسـەتی دێوەکە لێرە بێمە دەرێ. ئەو فەرمووی ئەگەر تاو هەڵات لێرە وەرە دەرێ و دوای کاری خۆت کەوە. ئێســـتا پێم بڵێ تاو هەڵاتووە یان نا؟ چونکە تاو هەڵنەهاتبێ، بۆم نییە بێمە دەرێ.'

" 'وەزیر بە قولە قەمووری گوت: 'کێ تۆی لێرە هاویشـــتووە؟' قولە قەموور گوتی: 'دوێ شـەو کاری دەست بە ئاوم بوو، هاتمە دەرێ بێمە ئاودەست، لەنێو ئاوەکە مشکێک هاتە دەرێ. قاوی کردم و گەورە بووەوە هەتا وەک گامێشـی لێ هات، قسـەی لەگەڵ کردم کە ئێســـتاش دەنگی لە بن گوێم دێ. ئەتۆ هەر لێم گەڕێ، بچۆ بە لای کاری خۆتەوە. خودا غەزەب لەو کەسـە بگرێ ئەو بووکەی لە من مارە کرد.' ئیدی وەزیر چووە پێشـێ و ئەوی لەو قولکەیە هێنا دەرێ. قولە قەموور لەڕێوە هەڵات بۆ لای پاشـــا و ئەوەی بەســـەری هاتبوو، بۆ سوڵتانی گێڕاوە.

" 'وەزیر ســـەری لە کـاری کچەکەی دەرنەدەچوو. چووەوە لا کچەکەی و گوتی: 'کچەکەم، جوان بڵێ بزانم چی بووە.' کیژە گوتی: 'بابە هەر ئەو کوڕە جوانخاســـەی کە منتان لەو مارە کردبوو، دوێ شـــەو هات لام. ئێســـتا لەو دووگیانم. ئەگەر باوەڕیشـم پێ ناکەن. ئەوە سەرپێچەکەی لەسەر کورسییەکەیە و کەواکەشی لە لای سەرینکەی منە. لەنێو کەواکەیدا شتێکی تێدایە کە نازانم چییە.' کە بابی بووکێ ئەو قسـەیەی بیست، هەستا هاتە دیوی بووک و زاوا. سەرپێچی حەسەن بەدرەددین کە لە سەرپێچی وەزیرەکانی بەسرە و موســـڵ دەچوو، لەســـەر کورســـییەک بوو. ســـەپێچەکەی هەڵگرت و بە وردی چاوێکی لەدەرەوە و ناوەوەی کرد. سـەیری کرد ئەوە نوشتوویەک لە سـووچێکی کڵاوەکەی دراوە. کەواکەی هەڵگرت توورەکەیەکی لە نێودا بوو، توورەکەکە هەزار دیناری تێدا بوو. چاوێکی دیکەی لە توورەکەکە کرد کـاغەزێکیشـــی تێدا بوو. کـاغەزەکەی خوێندەوە، دیتی ئەو فرۆشنامەی جوولەکەیەکە لەگەڵ حەسەن بەدرەددینی کوڕی نوورەددینی میسری. لەڕێوە شـــەمســـەددین هاواری کرد و بێهۆش کەوت. کە وە هۆش هاتەوە گوتی: 'پاک و بێگەردە

ئەو خودایەی بەســـەر هەموو شـــتێکدا زاڵە.' دوای ئەوە گوتی: 'کچم، دەزانی ئەوەی تۆی کردووە بە ژن کێیە؟' کچی وەزیر گوتی: 'نـا، نـازانم.' وەزیر گوتی: 'ئەوە برازای منە و ئـامۆزای تۆیە، ئەو هەزار دینـارە مـارەیی تۆیە.' خۆزگە دەمزانی ئەو کـارە چۆنـاوچۆن ڕووی داوە.' ئەو دەستی دا نوشتووەکە. لەبەر خۆیەوە گوتی:

بـۆنـی کـراســـــی جـگەرگـۆشـــــە نـادیـارەکەمە دێ
جگەرگۆشـــــەیەک کە وا هەنـاوم لە ســـــوێی دەســـــووتێ

" 'دوای ئەوەی نوشتووەکەی کردەوە و نووسراوەکەی خوێندەوە، ڕێکەوتی مارەکردنی کچی وەزیری بەســـرە و ڕێکەوتی لەدایکبوونی حەســـەن بەدرەددینی لەو نووســـراوەیەدا دیت. ئەوجار بۆی دەرکەوت ڕێکەوتی مارەکردنی هەردووک برا لە ســـاڵ و مانگێک و لە شـــەوێکدا بووە و هەر وەها ڕێکەوتی لەدایکبوونی حەســـەن بەدرەددین و ســـیتتولحوســـنی کچی وەک یەکە. خێرا کاغەزەکەی هەڵگرت و چوو بۆ لای پاشـا و چیرۆکەکەی بۆ گێڕاوە. پاشا زۆری پێ سەیر بوو، فەرمووی ڕێکەوتی ئەو ڕووداوە بنووسن.

" 'وەزیر ماوەیەکی زۆر چاونواڕی برازاکەی بوو. هیچ هەواڵێکی نەبوو. گوتی: 'شـەرت بێ، دەبێ کارێک بکەم تا ئێستا کەس ئەو کارەی نەکردبێت.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی بیست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کاتێک هیچ هەواڵێک لە حەسەن بەدرەددین نەزانرا، شەمسەددینی وەزیر گوتی: 'دەبێ کارێک بکەم لەپێش مندا کەس نەیکردبێ. پێنووس و لێنووسی هەڵگرت و هەرچی لە دیوی بووک و زاوادا بوو، یەک یەک هەموویانی نووسی کە چی لەکوێیە و چی لەکوێ نییە، فلانە شت لە فلانە جێگایە و فیسارە شت لە فیسارە جێگایە. شوێنی هەموو شتێکی لەو دیوەدا دیاری کرد و لە کاغەزەکەدا نووسینی. کاغەزەکەی پێچاوە و هەڵی گرت. گوتی: 'کەل‌وپەلی بووک و زاوا هەمووی لە یەغدانێکدا هەڵگرن.' بۆخۆیشی سەرپێچ و کەواکەی حەسەن بەدرەددینی لەگەڵ توورەکە زێڕەکەی هەڵگرت.

" 'لەو لاشەوە ماوەی دووگیانبوونی کچی وەزیر کۆتایی پێ هات و کوڕێکی بوو وەک مانگی چاردە. تەواو شێوەی دایک و بابی خۆی دەدا. ناوکیان بڕی و کلیان لە چاوی کرد. پاشان بە دایەنیان سپارد و ناویان نا 'عەجیب.' کە بوو بە حەوت ساڵان، وەزیر شەمسەددین ئەوی بە مامۆستایەک سپارد هەتا پەروەردەی بکا. چوار ساڵ بوو لە قوتابخانە بوو، لەگەڵ منداڵان بەشەڕ دەهات و جنێوی پێ دەدان و دەیگوت: 'ئێوە چۆن دەتوانن لەگەڵ من بەربەرەکانی بکەن لە کاتێکدا من کوڕی وەزیری میسرم؟!' منداڵەکان چوون لە لای مامۆستا شکایەتیان کرد. مامۆستا گوتی: 'ئەمن قسەیەکتان فێر دەکەم ئەگەر بە عەجیبی بڵێن، ئیدی نایەتە قوتابخانە. ئەویش ئەوەیە: ئەگەر هاتەوە، لێی کۆ ببنەوە و لە هەموو لایەکەوە باسێک بێننە گۆڕێ بە یەکتر بڵێن: ئەوەی ناوی باوک و دایکی خۆی نەزانێ، ئەوە زۆڵە و کایەی لەگەڵ ناکەین و نابێ لەنێوماندا بێ.'

" 'بەو شێوەیە کاتێک بەیانی منداڵان و عەجیب هاتنەوە قوتابخانە، منداڵان تێی ئاڵان و لە هەموو لایەکەوە قسەیان دەکرد. گوتیان: 'هەرکەس ناوی دایک و بابی بڵێ. ئەگەر ناوی دایک و بابی نەزانێ، کایەی لەگەڵ ناکەین و دەبێ بڕوا.' لەو جەنگەیەدا کوڕێک هەستا گوتی: 'ناوی من ماجیدە و باوکم عیزەددین و دایکیشم عولوایە." یەکی دیکەش بەو شێوەیە ناوی دایک و باوکی خۆی گوت، هەتا سەرە[1] گەیشتە عەجیب. 'ناوم عەجیبە، دایکم سیتتولحوسن و باوکم شەمسەددین، وەزیری میسر.' منداڵەکان گوتیان: 'وەزیر باوکی تۆ نییە.' عەجیب گوتی: 'بە خودا باوکی منە.' منداڵەکان پێی پێکەنین و گوتیان: 'بە خودا باوکی تۆ نییە، چونکە ناوی باوکت نازانی، نابێ لە نێو ئێمەدا بی و یاریت لەگەڵ ناکەین.' ئیدی هەموویان بە پێکەنین لێی دوور کەوتنەوە و بەجێیان هێشت. عەجیب نارەحەت بوو، دەستی کردە گریان. مامۆستاکە پێی گوت: 'مەگەر وات دەزانی شەمسەددین باوکی تۆیە؟

---

[1]. سەرە: نۆرە، کەشە.

کوری خۆم، شەمسەددین باوکی تۆ نییە. باوکی تۆ نە ئەتۆ دەیناسی و نە ئێمە. چونکە پاشا دایکی تۆی دا بە قولەیەکی قەموور، لە شەوی بووکێنیدا جنۆکە لەگەڵ دایکت دەخەون.' عەجیب کە ئەو قسەیەی بیست، هەستا بە گریان ڕۆیشتەوە بۆ لای دایکی. وا دەگریا قسەی بۆ نەدەهات. دایکی کە زۆری خەم بوو ئەو ئاوا دەگریا، گوتی: 'ڕۆڵە گیان، بۆ دەگری؟' عەجیب ئەوەی لە منداڵان و مامۆستاکەی بیست هەمووی بۆ گێڕاوە و پرسیاری ناوی باوکی کرد. سیتتولحوسن گوتی: 'باوکی تۆ وەزیری میسرە.' عەجیب گوتی: 'ئەو باوکی تۆیە و باوەگەورەی منە. ڕاستی بڵێ بابی من کێیە دەنا خۆم دەکوژم.' کاتێک سیتتولحوسن عەجیبی دیت کە باوکی بیر کەوتووەتەوە، ئەویش ئامۆزاکەی کەوتەوە بیر و دەستی کردە گریان و ئەو شێعرانەی گوت:

ڕۆیشتی و هەر وا لە خەیاڵمدای
وەک وێنە لە گلێنەی چاومدای
کۆشک بەبێ یار، وەک کەلاوەیە
لە نێو بەهەشتدا، مرۆ غەوارەیە
گەر یارت لەگەڵ نەبێ، خۆشی ژین
لات تفت و تاڵە ڕێواقی هەنگوین

" 'دوای ئەوە گریا و عەجیبیش هەر وا دەگریا کە شەمسەددینی وەزیر بە سەر گریانی ئەواندا هاتەوە. پرسیاری لە هۆکاری گریانەکەیان کرد. سیتتولحوسنیش ئەوەی لە قوتابخانە بۆ کوڕەکەی هاتبووە پێش و کوڕەکەی هاتبووەوە چی کردبوو، هەمووی گێراوە. شەمسەددین لە تاوی برازاکەی دەستی کردە گریان. دوای ئەوە هەستا چوو بۆ لای پاشا و بابەتەکەی بۆ گێڕاوە. ڕوخسەتی سەفەری خواست. داواشی لە پاشا کرد دەسەڵاتنامەیەکی بۆ بنووسێ کە لە هەر کوێ برازاکەی دیت، بتوانێ قۆڵبەستی بکا. ئیدی لە لای پاشا دەستی کردە گریان. پاشا زگی پێی سووتا و ڕێی دا وەدوای برزاکەی بکەوێ. وەزیر زۆری دۆعا خێر بۆ پاشا کرد و لە کۆشک هاتە دەرێ. خۆی بۆ سەفەر تەیار کرد و عەجیبیشی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و کەوتنە ڕێ. وا بوو بە سێ ڕۆژ گەیشتنە شاری دیمشق. وەزیر سەیری کرد دیمشق شارێکی زۆر خۆش و سەرسەوز و ئاوەدانە، داروباخێکی زۆر و چۆم و ڕووباری بەخوڕ و زۆری هەیە. لە خۆشیدا جۆرێکە کە شاعیر دەڵێ:

لە دەوری چیمەن دار و گوڵ ڕەشبەڵەکیان پێک هێناوە
هێرۆ و شیلان و گوڵەباخ دەستیان لە دەستی یەک ناوە
گوڵەباخی جوان و بۆنخۆش هاوڕێیان گشت دەکا سەرخۆش

لاولاو بەکەیف و پاراوە، لە سپیچنارێک ئالاوە
چەند کەروێشکی جوان و خڕین لەو ناوەدا دێن و دەچن
پەپوولەی ڕەنگاورەنگ و جوان خۆشارکێیانە لەو ناوە
هەر بریقەی ئاونگە دێ، چاوان بە شەوارە دەخەن
وەنەوشە ملکەچ وێستاوە، نازانم چی لێ قەوماوە

" 'وا بوو وەزیر لە گۆڕەپانی حەسبا دابەزی و باریان خست. هۆبە و تاوڵیان هەڵدا. وەزیر بە خزمەتکارەکانی گوت: 'دوو ڕۆژان لێرە بحەسێنەوە.' ئیجا خزمەتکارەکان بۆ کڕین و فرۆشتن و گەڕانی مزگەوت و گەرماوەکان چوونە شارەوە. عەجیبیش لەگەڵ خزمەتکارەکەی بۆ گەڕان و پیاسەیەک هاتە نێو شار. خەڵکی شار کە جوانی و ڕێکوپێکی بەژن و بالای ئەویان دی، هەموو چاویان تێ بڕی و کەوتنە دوای، ئەویش هەر وا دەڕۆیشت هەتا بە ڕێکەوت لە بەردەرکی دووکانی بابی، واتە حەسەن بەدرەددین کە چێشتلێنەر ئەوی وەک کوڕی خۆی هەڵگرتبووەوە، ڕاوەستا. حەسەن بەدرەددین چاوێکی لە عەجیب کرد و سۆزی لە دڵی چەقی. ئەوەندەی ڕەحم بۆی بوو، خێرا چووە پێشێ و گوتی: 'بەڕێز چۆنە هاتوویە دووکانی من و دڵی برینداری منت خۆش کرد، نان دەخۆی؟'

گشت عالەمی کردووە خەنی، پڕشنگی ڕوخساری جوانت
چی دەبێ لێم نەشارییەوە، تیشکی بزەی مێهرەبانت

" 'عەجیب کە قسەکانی بابی بیست، چووە دڵییەوە. ڕووی لە خزمەتکارەکەی کرد و گوتی: 'بەزەییم بەو چێشتلێنەرەدا دێ. دەڵێی لە منداڵەکەی جیا بووەتەوە. وەرە با تۆزێک لە خەمی کەم کەینەوە و چێشتی دەستی بخۆین. بەڵکو بەو شێوەیە خودا منیش بە دیداری باوکم شاد کا.' خزمەتکارەکە گوتی: 'شایانی وەزیرزادە نییە لە چێشتخانەیەکی ناو بازار چێشت بخوا.' و گوتی:

بەرز و بەڕێزی لە هەر دوو دنیا
بەلام مەخابن، ڕێز خۆت ناگری نا

"کاتێک حەسەن بەدرەددین زانی خزمەتکارەکە پێشی دەگرێ، ڕووی تێ کرد و بە گریان و پاڕانەوەوە گوتی: 'ئەی بە ڕەنگ ڕەش و بە دڵ سپی، بۆ بەزەییت بە مندا نایە؟' ئیدی بەو شێوەیە دەستی بە پێداهەڵگوتنی کۆیلەکە کرد:

به ڕوخساری سووتاوتدا دەڵێی
لە هەموو ئیش و کارێکدا قاڵی
مرواریيەکانت شایەدی دەدەن
تۆ بە سەر بوغز و کینەدا زاڵی
سۆز لە دەرونتا هەر قوڵپ دەدا
توو خوا لە دڵ من حاڵی بە حاڵی

" 'خزمەتکارەکە پەسن و پێداهەڵگوتنەکەی ئەوی بە دڵ بوو. دەستی عەجیبی گرت و چوونە دووکانەکەوە. حەسەن بەدرەددین چێشتی دەنکەهەناری[1] لێنابوو، زوو هەستا و دەفرێکی هێنا و دەنکەهەناری بۆ تێ کرد و کەمێکی لەوز[2] و شەکر تێکەڵ کرد و بە عەجیبی گوت: 'بیخۆ نۆشی گیانت بێ.' عەجیب گوتی: 'دانیشە نانمان لەگەڵ بخۆ، بەشکو ئەوە خودای مەزن ئێمەشی بە ئاوات گەیاند و بزربووەکەی خۆمان دیتەوە.' حەسەن بەدرەددین گوتی: 'ڕۆڵە گیان، مەگەر تۆش بەو منداڵییە خەمێکی وا قورست لەسەر شانە و لە کەسی خۆت دوور کەوتوویەوە؟' عەجیب گوتی: 'بەڵێ، ئەرێ وەڵا تەواوی جەرگم لە تاوی بابم کونکون بووە و لە سوێی دیداری خەمبار و لێوبەبارم. ئێستا لەگەڵ باپیرم بۆ دۆزینەوەی ئەو، ڕێگەی دەشتودەرمان گرتووەتە بەر و سەرگەردان دەسووڕێینەوە.' عەجیب ئەوەی گوت و دەستی کردە گریان. حەسەن بەدرەددین و خزمەتکارەکەش بە گریانی ئەو دەستیان کردە گریان.

" 'دوای نان خواردن، عەجیب هەستا و لە دووکانەکە چووە دەرێ. حەسەن بەدرەددین وای زانی خەریکە گیانی دەردەچێ. هەستا دووکانی داخست و دوایان کەوت. خزمەتکارەکە چاوی پێی کەوت و گوتی: 'کاکە، بۆ دوامان کەوتوویت؟' حەسەن گوتی: 'لەدەرەوەی شار کارێکم هەیە، دەچم بۆ ئەوێ.'

" 'خزمەتکارە گچکەکە توورە بوو، بە عەجیبی گوت: 'ئەو پارووەی کە ئێستا خواردمان بێفەڕ بوو، وا ئێستا چێشتلێنەرەکە کەوتووەتە شوێنمان و بست بە بست بە دوامانەوەیە.' عەجیب مۆڕەیەکی لە چێشتلێنەر کرد، بە خزمەتکارەکەی گوت: 'لێی گەڕێ، کارت پێی نەبێ. هەر کات لە کۆن و تاوڵەکان نیزیک بووینەوە و زانیمان هەر بە دوامانەوەیە، ئەودەم دەنگی دەدەین و دەری دەکەین.' حەسەن بەدرەددین گوتی:

---

[1]. دەنکە هەنار، چێشتێکی تایبەت بووە.

[2]. هەزوێڵەیەکی تایبەتە.

تۆ حەز دەکەی ڕووت گرژ کە، جوێنی پێ بـدە و تفی لێ بکە
مـێش لە شـــیرنیـخـانەڕا قەت، نـاچێتە شـــوێنێکی دیکە

" 'کورتی کەینەوە، عەجیب و خزمەتکارە گچکەکەی ڕۆیشـــتن و حەســـەنیش هەر وا بەدوایاندا دەڕۆیشت هەتا گەیشتنە تاوڵەکان. لەوێ عەجیب ئاوڕی داوە، سەیری کرد ئەوە حەســـەن هەر بەدوایانەوەیە. جنێوی پێ دا و بەردێکی هەڵگرت و لە تەوێڵی دا. حەســـەن سەری شکا و لەوێ کەوت. خوێن لە نێوچاوانی چۆڕاوگەی بەست. حەسەن و خزمەتکارە بچووکەکەی هەڵاتنەوە ناو هۆبەکەیان.

" 'حەســـەن خوێنەکەی ســـەر و چاوی ســـڕی و لەتێک لە پێچەکەی ســـەری بڕی و لە ناوچاوانی بەست. خۆی سەرکۆنە کرد: 'ئەمن ستەمم لەو منداڵانە کرد. دووکانم داخست و وە دوایان کەوتم هەتا بیری خراپیان بە زەین گەیشت.' ئیدی حەســەن گەڕاوە بۆ دووکان و کەوتەوە یادی دایکی و شاری بەسرە. دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی گوت:

دوای نوێژی شـــامی غەریبـان کە دەگریم و هەنیســـک دەدەم
بە دڵـێـکـی بە خەمەوە، چـیـرۆکەکەم دەســـــت پـێ دەکەم
بە یـادی یـار و وڵاتـم دەکەم شـــیـنـگـێـڕیـیەکـی ئەوتـۆ
داب و ڕەســـــمـی ســـەفەرکـردن لەســـەر دنـیـایە وەلا دەخەم

" 'شـــەمســـەددینی وەزیر ســـێ ڕۆژ لە دیمشـــق ماوە. ڕۆژی چوارەم بەرەو بەســـرە ڕۆیشت. کاتێک گەیشتە بەسرە، لە شوێنێک بارگە و بنەیان خست و حەسانەوە. دوای ئەوە چوونە لای پاشـای بەسـرە. پاشـا زۆری ڕێز لێ گرت و لە هۆی هاتنەکەی پرسـی. وەزیر تەواوی بەســـەرهـاتەکـانی گێڕاوە و بـاســـی ئەوەی کرد کە برایەکی بە نـاوی عەلی نوورەددینەوە بووە. پاشا بە بیستنی ناوی نوورەددین دوعای بە خێری بۆ ڕوحانەتی کرد و لە خودا داوای لێخۆشـبوونی کرد. گوتی: 'وەزیر، ئەو وەزیری من بوو. ئەمن ئەوم زۆر خۆش دەویســت. دوازدە سـاڵ لەمەو بەر کوڕێکی بوو کە ئێســتا بێســەروشـوێنە و هیچ هەواڵێکمـان لێی نییە. بەڵام دایکی ئەو کە کچی وەزیری پێشـــووی منە لە لای منە.' کە شـەمسـەددین لە پاشـای بیست براژنی زیندووە، خۆشـحاڵ بوو و گوتی: 'پاشـا، ڕێم بدە چاوم پێی بکەوێ.' پاشا فەرمانی دا. شەمسەددین هەستا بەرەو ماڵی براکەی کەوتە ڕێ و چاوی لە دەر و دیواری ماڵەکەی دەکرد و دەرگاکەی ماچ کرد. براکەی یادی نوورەدینی کرد و گریا و ئەو شێعرەی گوت:

تـاوڵەکەم چـۆڵ و هـۆڵە و یـارم نـابـینـم
ســـەولی ڕەوان دیـار نییە و چـاو بە ئەســـرینم
لە جـێـژوانە چـۆڵەکەیـدا کـونـد دەخـوێـنـێ
خەم و کەســـەری نـاهـێـڵـێ چـاو، ببـینـێ

" 'پاشان چووە نێو ماڵەکەیەوە. ناوی نوورەددینیان بە ئاوی زێڕ لەسەر دار و دیواری ماڵەکە نووسـیبوو. نوقمی ئەو ناوە ببوو، چووە پێشـێ و ناوەکەی ماچ کرد و گریا و ئەو شیعرەی گوت:

کە یـارەکەم لـێـی دا و ڕۆیشـــــت، لە تـاوانـی بـوورامەوە
میســـکم لێ بوو بەکـافوور و شـــمشـــــاد بووم و چەمـامەوە
بەهـارم لێ بوو بە زســـتـان، ژیـانیشـــم بوو بە ســـنـدان
هـۆش و ئـاوەزم لا نەمـان دەروونـم بـووە کـانـگـای خەمـان
تـازە بـۆ نـێـو خەڵـک نـابـم، دەبـێ بـڕۆم دوور کەومەوە
دەنـا دەبـێ ڕۆژێ جـارێـک ئەو چـیـرۆکە ببـیســـــتـمەوە

" 'ئینجا گەیشتە ئەو شوێنەی دایکی حەسەن بەدرەددینی لێ بوو. دایکی حەسـەن لەو ڕۆژەوەی حەسـەن دیار نەمابوو، شـێوە گۆڕێکی دروسـت کردبوو، بەردەوام لەسـەر ئەو گۆرە دەگریا. کاتێک شـەمسـەددین گەیشـتە ئەو شـوێنە، لەپشت دەرگاکە ڕاوەستا و دیتی دایکی حەسەن دەگری و ئەو شێعرەی دەڵێت:

بـیـنـای دوو چـاوم، چـێـژی ژیـانـم
یـادت بە خـێـر بـێ، ڕووحـی ڕەوانـم
بـۆخـۆت ڕۆیشـــتـی و ســـەرت نـایەوە
تەونـی خەفەتـت بـۆ مـن نـایەوە
لەســـەر گـــۆڕەکەت چەمەری[1] دەکەم
مـنـیـش دەمـرم بـێ تـۆ هەڵـنـاکەم

" 'ئیدی شـــەمســـەددین چووە ژوورێ. ســـڵاوی لە دایکی حەســـەن کرد و گوتی: 'شـەمسـەددینم، هێوەری تۆ.' ئیدی ئەو چیرۆکەی بۆ گێڕاوە و گوتی: 'حەسـەن بەدرەددین شـەوێکی لەگەڵ کچەکەی من ڕۆژ کردووەتەوە. کچەکەم کوڕێکی لە حەسـەن بووە. ئێستا

---

1. چەمەر: شیوەن و ڕۆڕۆ.

ئەو کوڕە لەگەڵ منە.'

" 'کاتێک دایکی حەسەن هەواڵی زیندووبوونی کوڕەکەیی، بیست هەستا خۆی بەسەر کەوشەکانی هێوەرەکەیدا دا و دەستی ماچ کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دڵەکەم موژدەم دەرێ، دەڵێی گاڵەی شەماڵ دێ
مزگێنی بەهاری دڵ، هەور گەواڵگەواڵ دێ
هێند لە مێژە چاوەڕێی بای وەعدەم سۆمام نەما
بە گوێی دڵم دەبیستم، کاروانێکە و هەواڵ دێ

" 'دوای ئەوە وەزیر فەرمووی: 'عەجیبی کوڕی بەدرەددین بێنن.' کە عەجیبیان هێنا، نەنکی ئەوی لە ئامێز گرت و دەستی کردە گریان. شەمسەددین گوتی: 'ئێستا کاتی گریان نییە. هەستە ساز بە لەگەڵمان وەر بۆ میسر.. بەشکو خوای مەزن لەو پرژوبڵاوییە ڕزگارمان کا و کۆمان بکاتەوە.' دایکی حەسەن لەڕێوە ڕابوو، کەلوپەل و کەنیز و تێشووی ڕێگایەی کۆ کردەوە. شەمسەددینیش چوو بۆ کن پاشای بەسرە و ماڵاوایی لێ کرد. پاشای بەسرە دیارییەکی زۆری بۆ پاشای میسر نارد. هەر ئەو ڕۆژە وەزیر لەگەڵ براژنەکەی کەوتنە ڕێ. ڕۆیشتن، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دیمشق و لەوێ دابەزین و بار و بنەیان خست.

" 'وەزیر بە خزمەتکارەکانی گوت: 'حەوتوویەکی تەواو لێرە دەمێنینەوە هەتا دیارییەکی شایانە بۆ پاشای میسر پەیدا بکەین.' عەجیب بە خزمەتکارە گچکەکەی گوت: 'گەڕان و سەیرانم پێ خۆشە. هەستە با بڕۆین بۆ نێو بازار و سەرێکی ئەو چێشتلێنەرەی چێشتەکەشیمان خوارد و سەریشیمان شکاند، بدەین. بزانین چی بەسەر هاتووە.' خزمەتکارەکەی گوتی: 'باشە.' لەڕێوە لە تاوڵ هاتنە دەرێ. سۆزی باوکایەتی خێرا بەرە و چێشتلێنەرەکەی ڕاکێشا. ئیدی ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە چێشتخانەکە. حەسەن بەدرەددینیان دیت لە دووکان ڕاوەستابوو.

" 'بە ڕێکەوت حەسەن بەدرەددین لەو ڕۆژەشدا دەنکەهەناری لێنابوو. کە عەجیب چاوی بە بابی کەوت و جێگای بەردەکەی لەسەر تەوێڵی دیت، سۆزی بۆی بزووت. سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'لەو ماوەیەدا هەر دڵم لە لای تۆ بوو.' کە بەدرەددین ئاوڕی داوە، دڵی وە لێدان کەوت، سەری داخست و ویستی قسەی لەگەڵ بکا. زمانی لە گۆ کەوتبوو. پاش ماوەیەک سەری هەڵێنا لە دڵی خۆیدا ئەو شێعرەی گوت:

هـاتـيـيەوە ديســـــان مـيـوانـی شــــيـريـن
دڵـم لە لات بـوو، زۆرم ڕشـــــت ئەســــريـن
دەڵـــێــی لە دڵـــمـــا، هــێــلانەت هەيە
خـۆشــــەويســــــتـيـيەكەت، بــێ ئەنـدازەيە
بە خــۆم نـيـيە نــا، كــارت تــێ كــردووم
بە يەكەم ديــدار لە خشـــــتەت بــردووم

" 'دوايە گوتی: 'كوڕی چاك، چ دەبێ بێن و كەمێك لە چێشتەكەم بخۆن و دڵی ناشادم شاد بكەن. بە خودا ئەو ڕۆژەش، دڵ و مێشكم دەسەلاتيان لێ ستاندبووم و بە دەست خۆم نەبوو، دەنا ئەمن دوای ئێوە نەدەكەوتم.' عەجيب گوتی: 'نە بە خودا، تۆ تەماحت تێ كردووم، بۆيە دوام كەوتی، دەتەويست ئابڕووم بەری. ئێستا دەم لە چێشتەكەت نادەم هەتا سوێندم بۆ نەخۆی كە لە دووكانەكەت نايە دەرێ و ناكەويية شوێنمان. دەنا تازە قەت بيرەدا نايەمەوە. ئێمە حەوتوويەك لێرە دەمێنينەوە.' بەدرەددين زۆری سوێند بۆ خوارد.

" 'ئيدی عەجيب و خزمەتكارەكەی چوونە دووكانەكەوە. بەدرەددين دەفرێكی پڕ لە ـمنكەهەناری شـيرينی لە پێش دانان. عەجيب گوتی: 'ئەتۆش لەگەڵ ئێمە بخۆ بەشكوو خێری پێوە بێ و خودا دەروويەكی ڕەحمەتمان بە سەردا بكاتەوە.' بەدرەددين دڵی خۆش بوو، لەگەڵيان دانيشت و دەستی كرد بە خواردن. سەير ئەوە بوو چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت. عەجيب گوتی: 'ئەگەر تەماحت تێ نەكردووم، بۆ چاوم لە سەر هەڵناگری؟' بەدرەددين لە دڵی خۆيدا گوتی:

دڵـم لای تـۆ نەبــێ و، ســــۆزت لە دڵـمـا نەبــێ
ئەی دڵم لە لای كێ بێ، ســۆزی كێ لە دڵمـا بێ

" 'دوايە ئەو شێعرەشی گوت:

تۆ دەبينم هەموو جارێ، بە خۆشـــەويســـتييەكەت مەســـــــــــــتـــــــــــــم
كە دەمبينی تۆ نـازانی پڕ لە دەرد و كوڵە هەســــتم؟
دەســـــتم بە داوێنـت نـاگـا، لە ژێر گڵی خەمـدا نەبێ
كە هاتيتە ســـەر گڵكۆكەم، داوێنی تۆ دەگرێ دەســـــتم

" 'بەو شـــێوەيە بەدرەددين جـارێـك پـارووەيەكی دەدا بە عەجيـب و جـارێـك بە

خزمەتکارەکەی هەتا تێر بوون. پاشان دەستی بە ئاوی گەرم بۆ شوشتن. پەڕۆیەکی هێنا بۆی وشک کردنەوە و گولاوی بەسەردا هەڵپرژاندن. ئینجا دوو دانە شەربەتی هێنا و گولاوی بۆ تێ کردن و گوتی: 'لەبەر دڵی من ئەو شەربەتەش بخۆنەوە.' عەجیب و خزمەتکارەکە ئەو شەربەتەشیان خواردەوە و تەواو تێر بوون لە حاڵەتی ئاسای تێرتر بوون. دوایە لە دووکانەکە هاتنە دەرێ و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە تاوڵەکانیان. عەجیب چووەوە لای نەنکی. نەنکی لە ئامێزی گرت و ماچی کرد. کوڕەکەی وەبیر هاتەوە و ئاخێکی هەڵکێشا و گریا. لە بەر خۆیەوە ئەو شێعرەی گوت:

ئەو ماوە کە تۆ لێم دوور کەوتییەوە
ژیانمت بە کەیفی دژمنانم کرد
ئێش و ئازاری، لە تۆ دوور بوونم
بۆت دەگێڕمەوە چی لە ژیانم کرد

" 'دوایە لە عەجیبی پرسی: 'ڕۆڵە گیان، لەکوێ بووی.' عەجیب گوتی: 'لە شاری دیمشق بووم.' ئینجا نەنکی هەستا و دەفرێکی چێشتی دەنکەهەنار بۆ هێنا کە شەکری کەم تێ کردبوو. لەپێش عەجیبی دانا و بە خزمەتکارەکەی گوت: 'دانیشە و لەگەڵ ئاغاکەی خۆت دەنکەهەنار بخۆ.' خزمەتکارەکە دانیشت. عەجیب پارووەیەکی خوارد، چونکە شیرنییەکەی کەم بوو. بۆخۆشی تێر بوو، پێی ناخۆش بوو. گوتی: 'ئەوە چ چێشتێکە؟' نەنکی گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەوە چۆنە چێشتی منت پێ خۆش نییە. خۆ کەس دەنکەهەنار وەک من لێ نانێ جگە لە بابی تۆ، حەسەن بەدرەددین.' عەجیب گوتی: 'نەنە ئەو چێشتەی تۆ خۆش نییە، ئێمە لەنێو شار چێشتلێنەرێکمان دیتووەتەوە کە بۆنی دەنکەهەنارەکەی هێندە خۆشە سەیر! مرۆڤی تێریش حەز لە خواردنی دەکا. ئەو خواردنە لەگەڵ ئەو هەڵناسەنگێندرێ.' کە نەنکی ئەو قسەیەی بیست، تووڕە بوو، چاوێکی لە خزمەتکارەکە کرد و گوتی: ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'نەنکی کە ئەو قسەیەی بیست قەڵس بوو بە خزمەتکارەکەی گوت: بۆ کوڕەکەی منت بردووەتە چێشتخانەی دەرێ؟' خزمەتکارە چکۆڵەکە ترسا و حاشای کرد و گوتی: 'نەچووینە دووکانەوە، هەر بە بەردەرگەکەدا ڕۆیشتین.' عەجیبب خێرا گوتی: نە بە خودا، چووینە ژووری و چێشتمان خوارد. تامی زۆر لەوەی تۆ خۆشتر بوو.' نەنک هەستا چوو ڕووداوەکەی بۆ شەمسەددین گێڕاوە.

" 'شەمسەددین گازی خزمەتکارەکەی کرد و گوتی: 'بۆچی عەجیبت بردووەتە ئەو چێشتخانەیە؟' خزمەتکارەکە لە ترسی وەزیر حاشای لەوە کرد کە کاری وای کردبێ. عەجیب گوتی: 'بە خودا درۆ دەکا. چووینە خواردنگە و تێرمان چێشتی دەنکەهەنار خوارد.' وەزیر توورەتر بوو، ڕووی کردە خزمەتکار و دیسان درۆی کرد. وەزیر گوتی: 'ئەگەر ڕاست دەکەی، وەرە دانیشە لەگەڵ ئێمە خواردنەکەت بخۆ.' خزمەتکارەکە دانیشت. دوو سێ پارووی خوارد و ئیدی نەیتوانی پتر بخوا. کشاوە و گوتی: 'گەورەم، من لە دوێشەوەوە تێرم، چم بۆ ناخورێ.' وەزیر زانی کە چوونەتە خواردنگە. ئیدی بانگی کەنیزەکانیان کرد و کەمێکیان لێ دا و جەزرەبەیان دا.

" 'ئەو جار شەمسەددین گوتی: 'ئێستا ڕاستییەکەمان پێ بڵێ.' خزمەتکارەکە گوتی: گەورەم، ئێمە چووینە چێشتخانە و دەنکەهەنارمان خوارد کە لە تەواوی ژیانماندا شتی ئەوەندە خۆشمان نەخواردووە.' ئینجا دایکی بەدرەددین توورە بوو، هەستا نیو دیناری زێڕی دایە، گوتی: 'هەستە بچۆ ئەو چێشتخانەیە و دەفرێک لەو دەنکەهەنارەی ئەو بکڕە، با سەروەرمان بزانێ تامی کام لەو دووانە خۆشترە.'

" 'خێرا خزمەتکار هەستا چوو بۆ چێشتخانەکە و پێی گوت: 'لە ماڵی گەورەم دەنکەهەناریان لێ ناوە و ئێمە گرێومان کردووە کە تامی ئەو دەنکەهەنارەی تۆ خۆشترە. ئێستا هاتووم بایی ئەو نیو دینارەم دەنکەهەنار بدەیەی. بەڵام چاکی ساز کە، چونکە لەسەر ئەو دەنکەهەنارەی تۆ زۆرم ئازار چێشتووە.'

" 'حەسەن بەدرەددین پێکەنی گوتی: 'بە خودا کەس وەک من و دایکم نازانێ ئەو چێشتە لێنێ. کە بە داخەوە ئەو ئێستا لێرە نییە.' ئینجا حەسەن بەدرەددین دەفرەکەی لێ وەرگرت و دەنکەهەنارەکەی بۆ تێ کرد و کەمێکیشی گوڵاو بە سەردا هەڵپڕژاند.

" 'خزمەتکار وەریگرت و بەرەو تاولەکان هەڵات. کە گەیشتەوە، دایکی حەسەن بەدرەددین چێشتەکەی لێ وەرگرت و کەمێکی لێ چێشت. بە تامەکەیدا لێنەرەکەی

ناسییەوە. هاواری کرد و بووراوە. وەزیر سەری سوور ما و گوڵاوی پێدا کرد تا وەهۆش هاتەوە. گوتی: 'ئەگەر کوڕەکەم مابێ، ئەو دەنکەهەنارە جگە لەو کەس لێی نەناوە، چونکە کەس ناتوانێ وەک من و ئەو ئاوا دەنکەهەنار لێنێ.' وەزیر کە گوێی لەو قســـەیەی بوو، خۆشحاڵ بوو،

" 'بۆخۆی سواری ئەسپ بوو، چووە کن جێنشینی دیمشق و ئەو نووسراوەیەی پاشای میسر نووسیبووی، پێشانی دا. جێنشینی دیمشق نووسراوەکەی ماچ کرد و لەسەر چاوی دانا. دوای ئەوە نامەکەی خوێندەوە کە تێیدا نووسرابوو لە هەر وڵاتێک وەزیر شەمسەددین ســـەرپێچیکاری خۆی دیتەوە، دەبێ بۆی قۆڵبەســـت بکەن و بیدەنە دەســـت وەزیر شـــەمســـەددین. جێنشـــینی دیمەشـــق گوتی: 'ســـەرپێچیکاری ئێوە کێیە؟' گوتی: 'پیاوێکی چێشتلێنەرە.' جێنشینی دیمشق پیاوەکانی ڕاسپارد چێشتلێنەر بگرن و بیدەنە دەست وەزیر. پیاوەکان هێرشـــیان بردە ســـەر چێشـــتخانەکە و هەرچی تێیدا بوو بەســـەر یەکیاندا دا و وێرانیان کرد. چتێشتلێنەریان قۆڵبەست کرد و هێنایان دایانە دەست وەزیز شـەمسـەددین. حەســـەن بەدرەددین لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'خۆزگە بمزانیبا چییان لە دەنکەهەنارەکەمدا دیوە کە ئەو بەڵایەیان بە سەر هێنام.'

" 'کە حەسـەن بەدرەددین چاوی بە شـەمسـەددینی مامی کەوت، گریا و گوتی: 'تاوانی من چییە گەورەم.' وەزیر گوتی: ' ئەتۆی دەنکەهەنـارەکەت لێنـاوە؟' گوتی: 'بەڵێ، من لێم ناوە. پێم بڵێن چی بوو گوناحم' وەزیر گوتی: 'هەر ئێستا پێت دەڵێین گوناحت چییە.' دوای ئەوە قاوی کرد پیاوەکانی چەند وشـتر بێنن. پیاوەکانی وشـتریان هێنا. حەسـەنیان خسـتە ناو یەغدانەوە و بارەکانیا لە وشترەکان نان و خێرا وەڕێ کەوتن. هەموو شەوێ حەسەن بەدرەددینیان لە یەغدانەکە دێنا دەرێ و خواردنیان دەدایە و دیســـان لە یەغدانەکەیان دەخستەوە. بەو جۆرە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە میسر و لە زەیدانییە باریان خست.

وەزیر فەرمووی: 'حەسەن بەدرەددین لەو یەغدانە بێننە دەرێ.' هێنایانە دەرێ. ئینجا بە دارتاشی گوت سێدارەیەکی بۆ چێ کەن. حەسەن گوتی: 'سێدارەتان بۆچی دەوێ؟' وەزیر گوتی: 'تۆ لە دار دەدەم.' حەســـەن گوتی: 'تاوانی من چییە؟' وەزیر گوتی: 'دەنکەهەنارەکەت چاک چێ نەکردبوو، بیبەرەکەی کەم بوو.' حەســـەن گوتی: 'بەندکردنی منت بەلاوە بەس نییە، وا دەتەوێ لەســـەر ئەو تاوانە بچووکە لە ســـێدارەم دەی؟' گوتی: 'بەڵێ، لەبەر ئەو تاوانە دەبێ بتکوژن'. حەســـەن بەدرەددین مات و خەمبار بیری لە چارەنووســـی خۆی دەکردەوە هەتا بوو بە شـــەو، شـــەو دەرمانێکی خەوی کاتییان دا بە حەســـەن. وەزیر حەسەنی لە یەغدانەکەی خۆی خستەوە و گوتی: 'سبەینێ لە دارت دەدەم.' ئیدی ڕاوەستان تا حەسەن خەوی لێ کەوت.

" 'وەزیر سـوار بوو ڕۆیشـت و یەغدانەکەشیان لەگەڵ خۆیان برد هەتا لە شـار چوونە دەری. کاتێک وەزیر گەیشتەوە ماڵێ، بە سیتتولحوسنی کچی گوت: 'سپاس و گەورەی هەر بۆ ئەو خودایەی کە تۆ و ئامۆزاکەتی پێک شاد کردەوە، ئێستا هەستە بڕۆ دیوی بووکێنیت. چۆن بوو، وەک خۆی بیڕازێنەوە.'

" 'سـیتتولحوسـن فەرمانی بە کەنیزەکانی دا ئەو کارە بکەن. ئینجا وەزیر پەڕەکەی کە ڕیزی کەلوپەلەکانی نێو دیوەکەی بووک و زاوای لەسـەر نووسیبوو، هەڵگرت و فەرمووی: 'هەر شتەی لە جێگای خۆی دانێنەوە، بە جۆرێکی وای دانێنەوە کەس لەگەڵ شەوی یەکەم لێکیان نەکاتەوە.'

" 'دوای ئەوە وەزیر بە سـیتتولحوسـنی گوت: 'بڕۆ خۆت بکەوە بە بووک و خۆ برازێنەوە وەک شـەوی بووکێنی و بچۆ دیوی بوکێنیت.' گوتیشـی کە ئامۆزاکەت هاتە دیوەکەت، بڵێ ئەوە بۆ لە ئاودەست ئەوەندەت پێچوو. دوایە لەگەڵی بخەوە هەتا تاوهەڵاتی بەیانی قسەی بۆ بکە.

" 'دوای ئەوە شـەمسـەددین حەسـەن بەدرەددینی لە یەغدانەکە هێنا دەرێ و پەت و شتەکەی لێ کردەوە، جلەکانی داکەند و کراسێکی شۆڕی ژێرەوەی لە بەردا هێشتەوە کە کاتی خەو لە بەری دەکرد. تەواوی ئەو کارانە کران، هێشتا بەدرەددین بە خەبەر نەهاتبوو. کاتێک بە ئاگا هات، سـەیری کرد ئەوە لە نێوکۆیەکی۱ ڕووناکدایە. بە تونێی کراسێک و دەرپێیەکەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خودایە ئەوە خەوە یان ڕاستییە؟!' پاشـان هەسـتا و وردەوردە ڕۆیشت گەیشتە دەرگایەک، شوێنەکەی بۆ ئاشنا بوو. زانی ئەوە ئەو ماڵەیە کە شەوی زەماوەندەکە لەوێ بوون. لە دەرکەکەوە چاوێکی لە ژوورەکە کرد. ژووری بووکێ! ڕاسـت خۆی بوو، سـەرپێچەکەی لەسـەر کەتەکە۲ بوو. کەوا شـۆڕەکەی کە توورەکەی زێرەکەی لەنێودا بوو، هەر لە لای سـەرینەکەیان بوو. جارێک دەچووە پێشـێ و جارێک دەکشاوە و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'ئەرێ من خەون دەبینم یان بە ئاگام کە ئێستا من لەنێو سندووقدا بووم؟'

" 'بەو جۆرە حەسـەن بەدرەددین لەوپەڕی سـەرسووڕماندا ڕاوەستابوو، سـەرگەردان نەیدەزانی چ بکا. لەو کاتەدا سیتتولحوسن سووچی پەردەکەی لا دا و پێی گوت: 'ئەوە بۆ نایەی، لەو دەمێوە لە ئاودەست چ دەکەی؟' کە بەدرەددین قسەی ئەوی بیست و دیتی ئەو پێدەکەنێ، وردەوردە چووە پێشـێ، وڕ و کاس بوو. سـیتتولحوسـن گوتی: 'بۆ وا کاس بووی؟ خۆ تۆ سـەر لە شـەوێ وا نەبووی؟' بەدرەددین پێکەنی و گوتی: 'دە سـاڵ زیاترە

---

. نیوکۆ: نیڤکۆ،دالان، ڕێڕەوێکە کە دیو و هۆدەی دیکەی بەسەرەوەیە.

. کەت: تەختی دوو کارە هەم بۆ دانیشتن دەبێ و هەم بۆ لە سەر خەوتن.

من له تۆ دوورم.' سیتتولحوسن گوتی: 'ئەو قسانە چییە؟ نێوی خودا بێنە و فوو لە خۆت بکە. ئەتۆ چوویتە ئاودەست.' بەدرەددین گوتی: 'ڕاست دەکەی، بەڵام کاتێک من چوومە ئاودەست، خەو بە سەرمدا زاڵ بوو. لە خەونمدا لە شاری دیمشق چێشتلێنەر بووم. منداڵێکی بە ڕواڵەت مەزنزادە لەگەڵ خزمەتکارێک هاتنە دووکانی من و ئاوا و ئاوام بەسەر هات.' ئینجا حەسەن بەدرەددین دەستێکی بە نێوچاوانی خۆیدا هێنا و دەستی وە شوێنی بەردەکە کەوت و گوتی: 'ئەهـ بە خودا بە خودا ئەوەتا جێگای بەردەکە. من درۆ ناکەم و ڕاستە ئەوەش جێگای بەردەکە کە ئەو منداڵە سەرمی شکاند. لە خەودا دەنکەهەنارم لێنابوو، گۆیا بیبەرم کەم تێ کردبوو. ئەمن دەڵێم قەت ئەوەندە لە ئاودەست نەخەوتووم، هەتا ئەو هەمووە خەوە ببینم.' سیتتولحوسن گوتی: 'توو خودا بۆم بگێڕەوە چی دیکەت لە خەوندا دیت؟' حەسەن تەواوی ئەو بەسەرهاتانەی بۆی هاتبووە پێشێ، بۆی گێڕاوە و گوتی: 'بە خودا ئەگەر من وە خەبەر نەدەهاتم، لە سێدارەیان دەدام.' سیتتولحوسن گوتی: 'لەبەر چی لە داریان دەدای؟' حەسەن گوتی: 'لەبەر ئەوەی دنکەهەنارەکەم بیبەری کەم بوو. چاوم لێ بوو دووکانەکەیان وێران کرد و دەفرەکانیان شکاند و منیشیان لە یەغدانێک نا و سەرەکەیان داخست. دوای ئەوە سێدارەیان چەقاند و ویستیان هەڵمواسن. ئەگەر وە ئاگا نەدەهاتمەوە، هەڵیان دەواسیم.'

" 'ئیدی سیتتولحوسن پێکەنی و ئەوی لە باوەش گرت و پێکەوە درێژ بوون. بەڵام حەسەن بەدرەددین هەتا بەیانی هەر وڕ و کاس بوو. عەلی سەبباح شەمسەددینی وەزیر چووە لای حەسەن بەدرەددین، سڵاوی لێ کرد. حەسەن کە چاوی پێی کەوت گوتی: 'ئەتۆ هەر ئەو کەسە نییت کە قۆڵی منت بەست و لە یەغدانەکەت خستم؟ لەسەر ئەوەی دەنکەهەنارەکە بیبەری کەم بوو خەریک بوو لە سێدارەم دەی؟' وەزیر گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ڕاستییەکان دەرکەوتن. نهێنی شاراوە ئاشکرا بوو. ئەتۆ برازای منی، ئەو کارانەم لەبەر ئەوە کرد کە بزانم لە شەوی بوکێنی کچەمدا تۆ لە لای کچەکەم بووی یان نا. ئێستا کە دیتم تۆ سەرپێچ و کەواکەی خۆتت ناسینەوە، زانیم کە بۆخۆت بووی و ئەتۆش برازای خۆمی. خەمت نەبێ، ئەوە دایکیشتم لە بەسرەوە هێناوەتە ئێرە.'

" 'دوای ئەوە وەزیر ئەوی لە باوەش گرت و گریا. حەسەنیش گریا. پاشان وەزیر فەرمووی عەجیب بێنن. حەسەن بەدرەددین ئەوی دیت و گوتی: 'ئەوەیە بەردی لە نێوچاوانی من دا.' وەزیر گوتی: 'ئەوە کوڕی تۆیە.' ئیدی حەسەن بەدرەددین ئەوی لە باوەش گرت و گوتی:

چاوەڕێ بووم چاوەکەم، ڕووی وەکوو مانگت هەڵێ
گیانەکەم، گیانی عەزیزم لە سینەتدا دەڵێ
خەم مەخۆ هاتینەوە، دوایی بڕا دەربەدەری

وا دەبینی دڵ گەشـــە و کۆشـــکی خەمیش دارمـی

" 'ئینجا دایکی حەسەن هاتە پێشێ و خۆی بەسەردا کێشا و ئەو شێعرەی گوت:

دڵ لە دووریتـا عەزیزم، فرمێســـکی خوێنی ڕشـــتووە
وا شـــوکـور ئەوڕۆ دەبـینـم خـۆری مـنە دەرکەوتـووە
هێنـدە تـاڵیم دی بە دەســـتی، شـــەوگـاری بێتۆییمەوە
سـەیرە لام چۆن بە سـاڵ و مانگ، بێ تۆ من سـەرم کردووە؟!
یـانـی تـازە ڕۆژ و شـــەوی بێـتۆیی قەت نـابینمەوە؟!
ســـەیرە بە خوا چۆن بەبێ تۆ ئەو هەموومە هەڵکردووە؟!'

" 'دوای ئەوە دایکی حەســەن بەســەرهاتی خۆی لەگەڵ کوڕەکەی گێڕاوە و شــوکری خودایان کرد.

" 'وەزیر هەستا چووە لا پاشـا و تەواوی ئەو ڕووداوانەی بۆ گێڕاوە. پاشـا پێی سـەیر بوو. فەرمووی تەواوە ئەوانە بنووســـنەوە و لە خەزانەدا بیپـارێزن. ئیـدی ئەو جـار شـەمسـەددینی وەزیر لەگەڵ برازاکەی و تەواوی دەسـتوپێوندەکانی لە خۆشـی و شـادیدا رایانبوارد. هەتاکوو تێکدەری هەموو خۆشـــی و کۆڕ و کۆبوونەوەی شـادی بە سـەریاندا زاڵ بوو.'

"کە جەعفەری بەرمەکی وەزیر، چیرۆکەکەی تەواو کرد. خەلیفە هاروونەڕەشید گوتی: 'جەعفەر، چیرۆکێکی خۆشــت بۆ گوتین.' دوایی خەلیفە یەکێک لە هەرە کەنیزە تایبەتەکانی خۆی دا بەو کوڕەی ژنەکەی خۆی کوشتبوو. لەسەر کارێکی باشیش دایمەزراند."

کاتێک شـــەهرزاد چیرۆکەکەی تەواو کرد گوتی: "خاوەنشــکۆ، ئەو چیرۆکە زۆر خۆش بوو، بەڵام هێشـــتا لە چیرۆکی بەرگدروو و قەموور و جوولەکە و کارگێڕ و مەســـیحی خۆشتر نییە. پاشا گوتی: "ئەو چیرۆکە چۆناوچۆنە؟"

### چیرۆکی بەرگدروو، قەموور، جوولەکە، کارگێڕ و مەسیحی

شەهرزاد گوتی: "پاشا، بیستوومە کە لە سەردەمی زوودا لە وڵاتی چین بەرگدروویەکی دەوڵەمەند و بەختەوەر دەژیا. حەزی لە ســەیران و گەڕان و بەزم و شــادی بوو. جارجار

لەگەڵ ژنەکەی دەچووە گەڕان. ڕۆژێک لە بەیانییەوە بۆ گەڕان چوونە دەرێ و کاتی شێو گەڕانەوە ماڵێ. قەمووریێکیان دی کە مرۆڤی بابمردووی وە پێکەنین دەخست یان کەسی قەڵس و لاساری ئەهوەن دەکردەوە. بەرگدروو لەگەڵ ژنەکەی لێی چوونە پێشێ تا ببینن. پاشان ویستیان بیبەنەوە ماڵێ پێی ڕابوێرن و بیکەنە گەپجاری ماڵێ. قەموور پێشنیارەکەی ئەوانی قەبووڵ کرد و لەگەڵیان ڕۆیشتەوە. بەرگدروو بە پەلە چوو بۆ بازاڕ. ماسی سوورەوەکراو و نان و لیمۆی کڕی و گەڕاوە و دەستیان کرد بە خواردن. ژنی بەرگدرووەکە لەتە گۆشتێکی گەورەی لە زاری قەموورەکە نا و دەستی بە دەمییەوە گرت و گوتی: 'بیخۆ. دەبێ ئەو پارووە نەجاوی و بە یەک کەڕەت قووتی دەی.' ناچار قووتی دا و ئێسکێک لە گەرووی گیرا و لە جێوە مرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە قەموور مرد، بەرگدروو ترسی ڕێ نیشت. ژنی بەرگدرووەکە گوتی: 'ئیدی خاوەخاو مەکە و کارەکەی مەخە سۆزی. مەگەر نەتبیستووە:

قەت کـارێـک مەکە لە کـۆتـایـیـدا
خوێری و پەسـت و هیچ، تـاوانبـار دەرچیت
بـڕوانە دوارۆژ لە گشـت کـارێـکـا
بـا لە لای خەڵـک هەر سـەربڵـینـد بیـت

"بەرگدروو گوتی: 'چ بکەم؟' ژنە گوتی: 'هەستە لە چارشێوێکەوەی بپێچە و بە باوەش هەڵیگرە. ئەمن لە پێشەوە و ئەتۆش بەدوامدا دەڕۆین. ئەتۆ بڵێ ئەوە منداڵی منە و ئەوەش دایکییەتی. دەمانەوێ بیبەین بۆ لای دکتور.' کە بەرگدروو ئەوەی بیست، هەستا و قەمووری لە باوەش گرت و کۆڵان بە کۆڵان ڕۆیشتن. ژنی بەرگدروو دەیگوت: 'ڕۆڵە گیان، ئەو دەردە چ بوو ڕووی تێ کردی؟!' ئاوا هەرکەس تووشیان دەبوو، وای دەزانی ئەوە منداڵە و دەیبەن بۆ لای دوکتوری.

"بە کورتی، ئەوان دەڕۆیشتن و پرسیاری ماڵی دکتوریان دەکرد. هەتا گەیشتنە ماڵی دکتور. کاتێک گەیشتنە ماڵی دکتورە جوولەکەکە، لە دەرگایان دا. کەنیزێکی ڕەش دەرگای کردەوە. تەماشای کرد ئەوە پیاوێک و ژنێک ڕاوەستاون و منداڵێکیشیان لە ئامێزدایە. کەنیزەکە پرسی: 'ئێوە کێن و چۆنە هاتوونە ئێرە؟' ژنی بەرگدرووەکە گوتی: 'منداڵێکی ناساخمان هێناوە دکتور دەرمانی بداتێ. ئەتۆ ئەو نیو دینارە وەرگرە و بە خاوەنەکەت بڵێ بێتە دەرێ.' کەنیز گەڕاوە لای خاوەنەکەی.

"ژنی بەرگدرووەکە بە مێردەکەی گوت: 'قەموورەکەی لەو دالانە دانێ هەتا خۆمان ڕزگار بکەین.' بەرگدروو قەمووری هەر لەوێ دانا و پاڵی بە دیوارەکەوە دا و گەڕاوە. کەنیزەش نیو دیناری بردە لای جوولەکە و شتەکەی بۆ گێڕاوە. جوولەکە بە دیتنی نیو دینارەکە خۆشحاڵ بوو، دەرپەڕێ دەرێ. یەکەم هەنگاو کە نایە دەرێ، لەسەر قەمووری دانا. لە ڕێوە قەموور بە لادا هات و کەوت. جووەکە چاوێکی لێ کرد، مردبوو. پەنای بە هاروون و یوشەعی کوڕی نون برد و قەمووری بردە لای ژنەکەی خۆی. ئەوی لە ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە. ژنە گوتی: 'دەی کەوایە ئەتۆ بۆ ڕاوەستاوی؟ خۆ ئەگەر ڕۆژ بێتەوە و موسوڵمانان ئەو تەرمە لێرە ببینن، ڕەچەڵەکی جوو لێرە ناهێڵن. هەستە با من و تۆ ئەو تەرمە بەرینە سەربان و بیهاوێینە ماڵی جیرانە موسوڵمانەکەمان کە کارگێڕی

چێشتخانەی سوڵتانە. لەوێ لەبەر گۆشت و ئێسک سەگ و پشیلەی لێ کۆ دەبێتەوە. ئەگەر ئەو تەرمە لەوێ ببینن تەواوی دەخۆن.' ئیدی نۆشــدار لەگەڵ ژنەکەی چوونە ســەربان و قەمووریان ڕۆهێشتە خوارێ بە جۆرێک کە دەتگوت بە پێوە ڕاوەستاوە.

"دوای ماوەیەک، کارگێڕ بە خۆی و مۆمێکەوە لە ماڵ هاتەدەر. دیتی کەســێک پاڵی بە دیوارەکەوە داوە و ڕاوەســتاوە. لە دڵە خۆیدا گوتی: 'ئەو گۆشــت و ڕۆنەی دەیهێننە چێشــتخانە، ئەگەر ســەگ و پشــیلەش نەیخۆن، دزان بە تەمان بیبەن.' ئیدی دەســتی دا بەردێک، لە ســینگی قەمووری دا و وەک مردوو بە لادا هات و کەوت. کارگێڕ پەشــۆکا و ترسا و گوتی: 'خودا غەززەب لە گۆشت و ڕۆن بگرێ. ئەمشەو پیاوێکم لە خۆڕا بە دەست کوژرا.' دوایە مۆمەکەی لێ هێنا پێشــێ و دیتی پیاوێکی قەموورە. گوتی: 'ئەتۆ قەمووریت بەس نەبوو، هاتووی بۆ دزی گۆشت و ڕۆنیش؟!'

"دواتر قەمووری هەڵگرت و ڕۆیشــت و دەیگوت: 'ئەی داپۆشــەر، بە پەردەی جوانی خۆت داپێۆشە'. کە گەیشتە بازاڕ، لەبن دیواری دووکانێک ڕاست بە پێوە ڕایگرت و گەڕاوە بۆ ماڵێ. بە ڕێکەوت مەسیحییەک کە کۆنە و شتی دەکڕی و دەفرۆشتەوە، سەرمەست لە لای ئەو دووکانەوە بەرەو گەرماو دەچوو. کە قەمووری دیت، وای زانی ئەوە کەســێک لەوێ ڕاوەســتاوە دەیەوێ ســەرپێچەکەی بفڕێنێ. لەڕێوە مەســیحییەکە مســتێکی لێ دا. قەموور کەوت. مەســیحی داڕۆغەی شــەوی بانگ کرد. ئەوەندەش مەســت بوو ســواری سەری قەموور ببوو، خێراخێرا لێی دەدا و توند قوڕگی گرتبوو کە داڕۆغەی شەو گەیشتێ. ســەیری کرد ئەوە مەســیحییەک موســوڵمانێکی کوشــتووە. بانگی کرد و گرتی و بردی بۆ لای پارێزگار. مەســیحی لە دڵە خۆیدا دەیگوت: 'یا عیســا! یا مریەمی پاکیزە! چۆن ئەو کابرایە بە مستێک مرد؟ ئەوە چ بوو، بۆ وام کرد؟!'

"وا بوو ئەو شــەوە نەســرانی و قەموور لە ماڵی پارێزگار بوون. کە ڕۆژ بووەوە. پارێزگار فەرمانی بە ئەشــکەنجەدەران دا ســێدارەیەک بۆ مەســیحی ســاز کەن. ئەشکەنجەدەران سازیان کرد. ئینجا پەتیان لە ملی کرد ویستیان هەڵی واسن. لە ناکاو کارگێڕی ســوڵتان پەیدا بوو، گوتی: 'کابرای مەســیحی مەکوژن، چونکە من قەموورم کوشــتووە.' پارێزگار گوتی: 'لەبەر چی کوشــتت؟' گوتی: 'دوێ شــەو کە چوومەوە ماڵێ، سەیرم کرد لە سەربانەوە هاتووە بۆ دزی گۆشت و ڕۆن و شت. بەردێکم لە سینگی دا، دەمودەست مرد. دوایی هەڵم گرت و هێنام بۆ بازاڕ و لە فڵان جێگە دامنا.'

"پارێزگار کاتێک قسەکانی کارگێڕی بیست، بە ئەشکەنجەدەرانی گوت: 'مەسیحییەکە بەر دەن و بەپێی دانپێدانانی خۆی ئەو کارگێڕە لە دار دەن.' ئەشــکەنجەدەران مەسیحییەکەیان بەر دا و پەتەکەیان لە ملی کارگێڕ کرد و ویستیان هەڵی واسن، دیتیان

ئەوە نۆشدارە جوولەکەکە لە دوورەوە دڕ بە خەڵکەکە دەدا و بە پەلە دێ. هەر لە دوورەوە قاوی کردە ئەشکەنجەدەران و گوتی: 'مەیکوژن، من ئەو قەموورەم کوشتووە. ئەو نەخۆش بوو، هێنایانە لای من. ئەمن دەهاتمە دالانەکە، پێم لێ نا و مرد.' پارێزگار گوتی: 'کارگێڕ بەر دەن و جوولەکەکە بکوژن.' ئەشکەنجەدەرەکان پەتەکەیان لە ملی کارگێڕەکە کردەوە و لە ملی جوولەکەکەیان کرد. دیتیان بەرگدروو لە دوورەوە دێ و هەرا دەکا: 'ئەو جوولەکەیە بەبێ تاوان مەکوژن. جگە لە من، کەس قەمووری نەکوشتووە.' پارێزگار هۆکارەکەی پرسی. بەرگدروو گوتی: 'لەگەڵ ژنەکەم لە گەشت و سەیران گەڕابووینەوە. لە ڕێگەدا ئەو قەموورەمان دیت سەرخۆش بوو، دەفێکی بە دەستەوە بوو گۆرانی دەگوت. من ئەوم هێناوە ماڵێ. ماسیمان هەبوو، دانیشتین بیخۆین. ژنەکەم لەتێک لە ماسییەکەی لە زاری خست و دەستی بە دەمییەوە گرت و گوتی: 'دەبێ ئەو پارووە بەبێ جووتن قووت بدەی.' ئەو پارووە لە گەرووی قەمووردا گیری کرد و مرد. دوای ئەوە ئەومان بردە ماڵی جوولەکەی نۆشدار. کەنیزەکە هاتە دەرێ و نیو دینارمان دایێ و ناردمانەوە کن خاوەنەکەی. دوای ئەوە قەموورمان لە نیزیک دەرکی دالانەکەوە دانا و گەڕاینەوە. ئەوە ڕاستی ڕووداوەکە بوو کە بۆم گێڕایەوە.' پارێزگار سەری لەو ڕووداوانە سووڕ مابوو، بە ئەشکەنجەدەرانی گوت: 'جوولەکەکە بەردەن و بەرگدروو بکوژن.' پەتیان لە ملی جوولەکە لا برد و لە ملی بەرگدروویان کرد و گوتیان: 'هەتا کەی هەر یەک بەردەین و یەکی دیکە بێنین؟ تازە کاری ئەمە ئاوای لێ هاتووە.'

"لە ڕاستیدا قەموور حەنەکی سوڵتان بوو. سوڵتان بێ ئەو هەڵی نەدەکرد و نەیدەتوانی ئیستێک لێی دوور کەوێتەوە. ئەو شەوە کە سەرخۆش بوو هەتا نیوەڕۆ سوڵتان چاوی پێی نەکەوت. سوڵتان هەواڵی قەمووری لە دەربارەکانی پرسی، گوتیان: 'گەورەم، پارێزگار قەمووری بە کوژراوی دیوەتەوە و ئێستا دەیەوێ بکوژەکەی بکوژێتەوە. بەڵام دوو سێ کەسی لێیە و هەمووشیان دەڵێن من کوشتوومە.' سوڵتان کە ئەو قسەیەی بیست، گازی بەردەستەکەی کرد و گوتی: 'بچۆ پارێزگار و هەموو ئەوانەی دیکە بێنە ئێرە.' بەردەستەکە خێرا هەڵات. تەماشای کرد ئەوەندەی نەماوە بەرگدروو بکوژن. بانگی لە ئەشکەنجەدەر کرد: 'مەیکوژە.' بە پارێزگارەکەی گوت: 'سوڵتان ئاگاداری ئەو ڕووداوەیە، داوای کرد هەمووتان بچنەی لای.' ئیدی پارێزگار قەمووری بە پشتی بکوژەکەدا دا و لەگەڵ بەرگدروو و جوولەکە و مەسیحی و کارگێڕدا بەرەو کۆشکی سوڵتان وەڕێ کەوتن.

"کە گەیشتنە بارەگای سوڵتان، پارێزگار ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. سوڵتان سەری سووڕ ما و ڕووی لە دەربارەکانی کرد و گوتی: 'ئەرێ تا ئێستا کەس چیرۆکی ئاوای بیستووە؟' مەسیحییەکە چووە پێش و کڕنۆشی برد و گوتی: 'ئەی سەروەری دنیا، ئەگەر ڕێم بدەن، ئەوەی بەسەر من هاتووە بیگێڕمەوە، لە بەسەرهاتەکەی قەموور خۆشترە.' سوڵتان

ڕوخسەتی گێرانەوەی دا.

### بەسەرهاتی مەسیحی

"گوتی: 'پاشـا، ئەمن کاتێک هاتمە ئەو شـارە، سـامانێکی زۆرم لەگەڵ خۆم هێنا و لێرە گیرسامەوە. لە میسر لە دایک بووم و بابم پیشەی سمساری١ بوو. کە بابم مرد، لە جێی بابم خەریکی ئەو کارە بووم. ڕۆژێک لە ڕۆژان کوڕێکی گەنجی پۆشتەوپەرداخ هاتە لام و سڵاوی کرد. من لە بەری هەستام و جوابی سڵاوەکەیم ئەستاندەوە. پەڕۆیەکی دەرهێنا کەمێکی ڕەشکە تێدا بوو، پیشانی دام و گوتی: 'لەو ڕەشکەیە خەرواری چەندە دەکا؟' گوتم: 'سەد درەم دێنێ.' گوتی: 'کڕیار بێنە و لە بابوننەفەر بەرەو کاروانسەرای جەوالی وەرە، لەوێ دەمبینییەوە.' پەڕۆکەی کە نموونە ڕەشکەکەی تێدا بوو دایە دەست من و ڕۆیشت. چووم گەڕام و کڕیارم بۆ پەیدا کرد. خەروارێکم لەو ڕەشکەیە بە سەدوبیست درەم بۆ فرۆشت. لەگەڵ کڕیارەکە چووین بۆ لای. سەیرم کرد ئەوە چاوەڕێی منە و لەوێ دانیشتووە. کە منی دیت، هەستا و ئەنبارێکی کردەوە و پەنجا خەرواری لەو ڕەشکەیە پێوا. ئەو گەنجە گوتی: 'بۆ هەر خەروارێک دە درەمی بۆ خۆت هەڵگرە. تۆ کڕیاری بۆ پەیدا کە و بیفرۆشە و پارەکەی لە لای خۆت ڕاگرە. منیش هەر کاتێک کاری فرۆشم تەواو بوو، دێمەوە پارەکەت لێ وەردەگرم.' من دەستیم ماچ کرد و گەڕامەوە. ئەو ڕۆژە هەزار درەمم لەو مامەڵەیە وەگیر کەوت. ئەو گەنجە هەتا مانگێک نەهاتەوە. دوای ئەوە هاتەوە و پێی گوتم: 'درەمەکان لە کوێن.' گوتم: 'ئەوە دەیانهێنم.' هەستام درەمەکانم بۆ هێنا. گوتی: 'ئاگات لێیان بێ.' ئەوەی گوت و ڕۆیشت. من هەر چاوەڕێی بووم، مانگێکی پێ چوو. دوای ئەوە هاتەوە گوتی: 'درەمەکان لە کوێن؟' هەستام درەمەکانم بۆ هێنا، گوتم: 'چ دەبێ پارووییەک نانم لەگەڵ بخۆی؟' کەچی لەگەڵی نەخواردم و گوتی: 'ئاگات لە درەمەکان بێ هەتا دەگەڕێمەوە.' دوو مانگی دیکەش لێم ون بوو. پاش دوو مانگ هاتەوە، عەبایەکی شکۆداری لە بەردا بوو دەتگوت ڕۆژە و بەو جۆرە بوو کە شاعیر دەڵێ:

دێت و ڕادەبرێ ناگیرسێتەوە
وەک هەوری بەهار دەڕشێتەوە
باڵای بەرز و ڕێک عەرعەڕاسایە
لە ژێر سێبەری فێنکت دێتەوە
سێبەرێکی هەس، فێنکی ئەوەخشێ

---

١. سمسار: کەسێکە کە کەلوپەل و شتی نیم داشت دەکڕێ و دەفرۆشێ، جاری واشە دانەوێڵەش دەکڕێ و دەفرۆشێ.

" 'کە چاوم پێی کەوت بە پیرییەوە چووم و دەسـتیم ماچ کرد و درەمەکانیم بۆ هێنا. گوتی: 'ئەو درەمانە لای خۆت ڕاگرە هەتا من کارەکانی خۆم تەواو دەبن.' ئەوەی گوت و پێی دا ڕۆیشت. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئەو کوڕە لە دەست و دڵبازیدا تای نییە. چونکە زۆرم خێر لە دەستی خواردووە دەبێ ئەوجار بێتەوە میوانداری بکەم.'

" 'کۆتاییەکانی سـاڵ بوو کە ئەو لاوە هاتەوە. عەبایەکی شکۆدارتر لە جارانی لە بەردا بوو. سوێندم دا دەبێ میوانم بێ. گوتی: 'بەو مەرجەی لەسەر ماڵی خۆم بێ.' گوتم: 'باشە، و' دەکەم. ئیدی دامنیشاند و چێشت و شەرابی شایانەم بۆ هێنا و لە پێشیم دانا. ئیدی لە سـفرەکە هاتە پێش و دەسـتی چەپی درێژ کرد و لەگەڵم دەسـتی کرد بە نان خواردن. پێم سـەیر بوو. کە نانەکەمان خوارد و دەستمان بە قسە کرد. لێم پرسـی: 'گەورەم، ئەوە بووە بە گرێ لەسـەر دڵم تکایە پێم بڵێ بۆ بە دەسـتی چەپت نانت خوارد؟' ئەو لاوە کە ئەو گوتەیەی منی بیست، ئاخێکی هەڵکێشا و ئەو شێعرەی گوت:

دەزانی ئـاوری عیشـقت هەنـاوم هەڵـدەقرچێنێ؟
بە دیـدارت دڵ دەلەرزێ و قەرار و ئۆقرە نـامێنێ؟
دەزانم خۆبەکوشـتـدانە تەمـای مـاچێکی دوو لێوت
هەر ئەو ئاواتم وەدی بێ، دەبا گیان دەرچێ و نەمێنێ

" 'دوایە دەستی لە قۆڵی هێنا دەرێ. سەیرم کرد، ئەوە لە مەچەکیڕا بڕاوە. واقم وڕ ما. گوتی: 'پێت سـەیر نەبێ، پەڕانی دەسـتم هۆکارێکی سـەیری هەیە. من لە بنەماڵە گەورە گەورەکانی شـاری بەغدام. لە کاتی تازەلاویمدا نێوی میسـرم لە بازرگان و گەڕۆکەکان بیستبوو. هەمیشـە بە ئاواتەوە بووم ڕۆژێک بێ بچمە میسـر. کە بابم مرد، بیانوویەکی پێکەڵکم دیتەوە و سـامان و تێشـوویەکی زۆرم لەو شـتانە لە بەغدا و موسـڵ هەبوو، کۆ کردەوە. باروبنەی سـەفەرم تێوە پێچا و بەرەو ئەو شـارە هاتم و هاتم هەتا گەیشـتمە موسڵ.' ئەوەی گوت و دەستی کردە گریان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

پەری بەهەشـتی بەرین بووم، سـەیر کە چۆن دەربەدەرم
هەمووی هی هەڵەی ئـادەمە، ئێسـتەکە لەو چۆڵ و دەرەم
هی ئەو دڵ و چـاوانەمە، قوربـان ئەوەی بە سـەرم دێ
شـیاوم هەرچیم بە سـەر بێ، چونکە هێندە سـەرەڕەوم

" 'پاشـــان گوتی: 'که چوومه نێو شـــار له کاروانســـه‌رای ســـروور دابه‌زیم. باره‌کانم کرده‌وه و چه‌ند دره‌مێکم دا به خزمه‌تکاره‌که تا خواردنمان بۆ بێنێ. کاتێک خزمه‌تکاره‌که خواردمه‌نی و شـــته‌که‌ی هێنا، نانه‌که‌م خوارد و که‌مێکم مه‌ی خوارده‌وه و خه‌وم لێ که‌وت. کاتێک به خه‌به‌ر هاتم، گوتم با بچم سه‌رێکی بازاڕ بده‌م به‌ڵکو شتێکم بێته ده‌ست.

"'ئه‌و جار بوخچه‌یه‌کم له شـــته‌کانی خۆم دا به خزمه‌تکاره‌که بۆم هه‌ڵگرێ و هه‌ر وا ده‌ڕۆیشتم هه‌تا گه‌یشتمه قه‌یسه‌ری جیرجیس. سمساران تێم ئالان. کالا و شتومه‌که‌کانمیان هه‌ڵگرت و هه‌رایان کرد. که‌چی به نرخه‌که‌ی خۆشـــیا نه‌یانکڕی. گه‌وره‌ی ده‌لاڵه‌کان پێی گوتم: 'ڕۆڵه گیان، وه‌ره با شتێکت پێ بڵێم به قازانجی تۆیه. ئه‌ویش ئه‌وه‌یه که شته‌که‌ت بۆ ماوه‌یه‌کی دیاریکراو به قه‌رز بفرۆشه. قسه‌ی خۆت ببڕه‌وه و شایه‌دی له‌سه‌ر بگره. هه‌موو پێنجشـــه‌ممه و دووشـــه‌ممه‌یه‌ک به‌شـــێک له پاره‌که‌ت وه‌رگره و بچۆ له قه‌راخ چۆمی نیل بۆخۆت ڕابوێره و ســـه‌یران بکه.' گوتم: 'پێشـــنیارێکی جوانه و به قســـه‌ت ده‌که‌م.' ئیدی ده‌لاڵه‌کانم له‌گه‌ڵ خۆم برد و ماڵه‌که‌م هێنا بۆ قه‌یســـه‌ری، به بازرگانه‌کانم فرۆشـــت. به‌ڵگه‌نامه‌یه‌کم لێ وه‌رگرتن و به سه‌ڕڕافیم سپارد و بۆخۆم گه‌ڕامه‌وه مزڵه‌که‌م.

" 'ڕۆژانه ماوه‌یه‌ک ده‌چووم له‌وێ داده‌نیشتم و هه‌موو ڕۆژێ پیاڵه‌یه‌کم مه‌ی ده‌خوارده و ڕانه‌گۆشـــتیـــان بۆ داده‌نـــام و به کـــامه‌رانی ده‌ژیـــام هه‌تـــا ئه‌و مـــانگه‌ی که کـــاتی قیســـتوه‌رگرتنه‌وه‌م ده‌گه‌یشـــتێ. ئیدی ئه‌و ده‌م له ڕۆژانی پێنجشـــه‌ممه و دووشـــه‌ممان له دووکانی بازرگانه‌کان داده‌نیشـــتم. ســـه‌ڕڕاف دره‌مه‌کانی له بازرگانه‌کان کۆ ده‌کرده‌وه و بۆی ده‌هێنام. هه‌تا ڕۆژێک که له گه‌رماو هاتمه ده‌رێ، چوومه‌وه ماڵێ پیاڵه‌یه‌کم شـــه‌راب خوارده‌وه و نووســـتم، پاشـــان که له خه‌و هه‌ســـتام، چاشـــتم خوارد و به گولاو خۆم بۆن خۆش کرد و چوومه دووکانی یه‌کێک له بازرگانه‌کان که نێوی به‌دره‌ددین بوو. که منی دیت، سلاوی کرد و ده‌ستی به قسه کرد. ئه‌وه‌نده‌ی پێ نه‌چوو، ژنێکی جوان هات و له په‌نا من دانیشت. بۆنی خۆشی ئه‌و بازاڕی پڕ کرد. ئه‌وه‌ڵجار له‌گه‌ڵ به‌دره‌ددین ده‌ستی کرد به قســـه‌کردن. که ئه‌و قســـه‌کردنه‌یم دیت، له دڵمدا جێی کرده‌وه. له به‌دره‌ددینی پرســـی: 'ئاهارت۱ هه‌یه تانوپۆیه‌که‌ی له زێڕی بێخه‌وش بێ.' به‌دره‌ددین ئاهارێکی ده‌رهێنا. ئه‌و ژنه گوتی: 'ئه‌وه ئه‌و ئاهاره ده‌به‌م پاره‌که‌ییت دوایه بۆ دێنم.' بازرگانه‌که گوتی: 'خانم، شتی وا نابێ. ئه‌و گه‌نجه‌ی لێره دانیشتووه، خاوه‌نه‌که‌یه‌تی و دوایه ئه‌و پاره‌ی خۆی له من ده‌وێت.' ژنه گوتی: 'تۆ زۆر خرابی، ئه‌من هه‌میشـــه هه‌ر وا ده‌که‌م. شـــته‌که به‌و نرخه‌ی که خۆت ده‌یڵێی هه‌ڵی ده‌گرم، پاشان پاره‌که‌یت به چواریه‌کی زیادیشـــه‌وه بۆ ده‌نێرم.' بازرگان گوتی: 'به‌ڵێ وایه، به‌لام ئه‌مڕۆ پێویستیم به پاره‌که‌یه.'

---

۱. قوماشێکی تایبه‌ت بۆ په‌راوێزی کراس و شت ده‌بێ.

" ' 'ژنە لەتە ئاهارەکەی فڕێ دا و گوتی: 'تاقمی بازرگانان سـپڵە و پێنەزانن.' دوای ئەوە هەستا بڕواتەوە. من وام هەست کرد خەریکە گیانم لەگەڵی دەردەچێ. گورج هەستام و پێم گوت: 'زەحمەت نەبێ بگەڕێوە.' خێرا گەڕاوە و بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'لەبەر تۆ گەڕامەوە.'

" ' 'ئیدی بە بەدرەددینم گوت: 'نرخی ئەو ئاهارە چەندە؟' گوتی: 'هەزار و سەد درەم.' گوتم: 'سەد درەمیشت خێر دەدەمێ. هەستە کاغەزێک بێنە با نرخەکەیت بۆ بنووسم.' ئیدی من نرخەکەییم بە خەتی خۆم بۆ نووسی و ئاهارەکەم لێ وەرگرت و دام بە ژنەکە و گوتم: 'برۆ ئەگەر ویستت پارەکەی بۆ من بێنە و ئەگەر پێشت خۆش بوو وەک دیارییەک لە منی قەبووڵ بکە.' ژنە گوتی: 'خودا پاداشـت بە چاکە بداتەوە و ماڵم بە قسـمەت تۆ بکا.' ئەمن پێم گوت: 'خانم ئەو ئاهارە بۆ تۆ و یەکی دیکەشـت دەدەمێ بەو مەرجەی پەچەکەت لا دەیت، تا ڕووی تۆ ببینم.' کە پەچەی لا دا و ڕوخسـاریم دیت، خۆشـەویسـتی وا لە دڵم چەقی، ئاوەز و هۆشم لە سەر پەڕی. ئەو جار پەچەکەی داداوە و لێی دا ڕۆیشت. من هەتا ئیوارە لە بازاڕ مامەوە، بەڵام هەر نەهاتمەوە سـەر خۆ. کاتێک هەسـتام بڕۆمەوە، هەواڵی ئەو ژنەم پرسـی. بازرگانێک گوتی: 'ئەوە ژنێکی خاوەن ماڵ و سـامانە. کچی میرێکە کە باوکی مردووە و ماڵ و میراتێکی زۆری بۆ بەجێ هێشتووە.'

" ' 'ئیدی من ماڵاواییم لێ کرد و گەڕامەوە بۆ مزڵەکەم. کە خواردنیان بۆ هێنام، بۆم نەخورا و ئەو شـەوە تا بەیانیش خەوم لێ نەکەوت. کەڕەی بەیانی لە خەو هەسـتام جلوبەرگێکی جوانتر لە ڕۆژی پێشـووم لە بەر کرد و پیاڵەیەکم مەی خواردەوە و کەمێکم نان خوارد و چووم بۆ دووکانی بەدرەددین دانیشـتم. لەڕێوە ئەو ڕووگەلاوێژە هاتەوە. چارشـێوێکی شـکۆدارتر لە ڕۆژی پێشـووی بەسـەردا دادابوو. کەنیزێکیشـی لەگەڵ بوو. سـلاوی کرد و بە زمانێکی خۆش و ئاهەنگینەوە گوتی: 'کەسـێکم لەگەڵ بنێرە با هەزار و دووسـەد درەمی نرخی ئاهارەکەی وەرگرێ.' پێم گوت: 'بۆ بە پەلەی؟' گوتی: 'ڕەنگە ئیدی نەتبینمەوە.' ئینجا من ئامازەیەکم بۆ کرد، زانی عاشقی بووم. زۆر ترسا و زوو هەستا. من کە بە داوی عیشـقیەوە ببووم. خۆزگە وە دوای کەوتبام و هەڵم نابایە١ لە ناکاو کەنیزێک هاتەوە لام و گوتی: 'بەڕێز، خانمەکەم کاری بە تۆیە.' سەرم سووڕ ما و گوتم: 'لەو شارەدا کەس من ناناسـێ!' کەنیزەکە گوتی: 'چ زوو خانمەکەمت لە بیر چوو، ئیسـتێک لەوە پێش لێرە بوو.' ئیدی من لەگەڵ کەنیزەکە هەتا بازاڕی سەڕرافان چووم.

" ' 'کاتێک منی دیت، بانگی کردمە لای خۆی و پێی گوتم: 'خۆشەویستەکەم، تۆش بزانە کە خۆشـەویستی تۆ لە دڵی مندا جێی گرت. هەر ئەو کاتەی کە تۆم دیت، خەو و خواردنم

. هەڵم نابایە: شوێنەکەیم زانیبا، بەڕێم کردباوە ماڵێ.

لێ حەرام بوو.' منیش گوتم: 'خۆشـــەویســـتی و مەینەتی منیش هەزار بەرابەرە.' ئەو گەلاویژڕووە گوتی: 'تۆ دێیتە لای من، یان من بێمە لای تۆ؟' گوتم: 'من لێرە غەوارەم و جگە لە کاروانسـەرا هیچ کوێ شـک نابەم. ئەگەر بێمە لای تۆ، زۆرم پێ خۆشـترە.' گوتی: 'سـبەینێ کاتێک نوێژی ئێوارەت کرد، سـوار بە وەرە بەرەو جوبانییە و پرسـیار بکە مالی ئەبوولبەرەکات نەقیب لە کوێیە. من لەوێ ئاکنیجم١. خۆت دەرەنگ مەخە، چونکە من لەوێ چاوەڕێتم.' ئەمن زۆر خۆشحاڵ بووم ئەو شەوە لە خۆشیان هەتا بەیانی هەر جێنگڵم دا.

" ' 'کە ڕۆژ بووەوە، جلوبەرگی شـــکۆدارم لە بەر کرد و بۆن و گولاوم لە خۆم دا و پەنجا دینارم لە پڕێسـکەیەک خسـت و چووم بۆ دەروازەی ڕەزیلە. لەوێ سـواری کەرێک بووم و چووم بۆ جوبانییە. بە خاوەنی گوێدرێژەکەم گوت: 'پرسـیاری مالی نەقیب بکە.' کە پرسیاری مالی نەقیبی کرد، گوتی: 'دابەزە.' ئیدی ڕێنوێنی کردم هەتا گەیشتمە مالی نەقیب. من نیو دیناری زێرم دایە و گوتم: 'سـوزی وەرەوە ئێرە من بەرەوە.' ئەو نیو دینارەکەی وەرگرت و گەڕاوە. لە دەرگام دا. کیژۆڵەیەکی ڕووپاک دەرگای کردەوە و گوتی: 'وەرە ژووری دوێنێ شـەو خانم لەبەر تۆ چاوی لەسـەر یەک دانەناوە.' چوومە ژووری. ماڵێکم دی وەک مەکۆی نیگارخانەی چین. لە هەر چوار لای ئەو مـاڵە هەیوانەکانی بە زێر ڕازاندرابووەوە و فەرشـی ئاوریشـمینیان لێ ڕاخرابوو. تەواوی ئەو هەیوانانە دەیانڕوانییە باخ و باخاتێک کە لە هەموو چەشـــنە دارێکی میوەی تێدا بوو، کانی و جۆگەلە ئاو بە تەواوی ئەو باخەدا بڵاو ببووەوە. لە نێوەڕاسـتی ئەو باخەدا حەوزێکی تێدا بوو لە بەردی مەڕمەڕ کە لە هەر چوار لای ئەو حەوزەوە مافووری ئاوریشـمی لێ ڕاخرابوو. کە چوومە ژووری دانیشتم.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. ئاکنجی بوون: نیشتە جێ بوون.

# که شەوی بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: 'خاوەنشــــکۆ، 'ئەو لاوە بازرگانە بە مەســـیحییەکەی گوتبوو: 'کاتێک چوومە ژووری دانیشـتم، لە ناکاو ئەو ڕوومانگەم دیت کە تاجی لە سـەری ناوە و بە لارولەنجەوە دێ.

" ' 'کە منی دیت، بزەی هاتێ و منی لە ئامێز گرت، بە خۆیەوە گوشـــیمی و لێوی مژیم و منیش زمانی ئەوم مژی. ئەو جار پێی گوتم: 'ئەوە تۆی لە لای منی و من لە باوەشی تۆ دام؟' گوتم: 'من بە قوربانی تۆ بم. من کۆیلەی تۆم. بە خودا لەو ڕۆژەوە تۆم دیوە، خەو و خۆراکم لێ حەرام بووە.' دوایە دەستمان کرد بە قسە کردن. بەڵام من لە شەرمان دەمم قووچاندبوو ئەویش هەر جارەی باســـی شــتێکی دەکرد. هەتا خوانیان ڕاخســـت و هەموو جۆرە خواردنێکیان هێنا. نانمان خوارد و دەســـتمان شـــوشـــت. خۆمان بە گوڵاو بۆنخۆش کرد و دەستمان بە قسە کرد. من ئەو شێعرانەم بۆ گوت:

وەک ئـاســـکی خوتەن خۆت لە گوڵ داوە
بســــک و کەزیەکەت جــوان داهــێــنـاوە
ئەو گشـــــتە فـڕوفــێـڵ و جــوانــکـاریـیەت
هەر بۆ کوشـــتنی من، نەخشـــەت کێشـــاوە

" ' 'پاشـــان چووینە خەوگە و خەوتین. کە ڕۆژ بووەوە، پرێســـکەکەی کە پەنجا دینارە زێڕەکەم تێ خستبوو، لە بن سەرینەکەم نا و ماڵاواییم لەو ڕوومانگە کرد. ئەو بە گریانەوە گوتی: 'ســـەروەرم، کەی بە ڕوخســـاری جوانی تۆ شـــاد دەبمەوە؟' گوتم: 'بۆ شـــێو دێمەوە لات.' کە هاتمە دەرێ، تەماشـــام کرد خاوەنی گوێدرێژەکە چاوەڕێی منە. ســـواری کەرەکە بووم و هاتمەوە کاروانســـەرای ســـرووور و نیو دینارم دایە و گوتم: 'ڕۆژاوابوون دیســـان وەرە.' بۆخۆم ماوەیەک لە مزڵەکەم دانیشـــتم. پاشـــان بۆ کۆکردنەوەی پارەی قیســـتەکانم چوومە دەرێ. ئێوارە گەڕامەوە مزڵ و دانیشـــتبووم، کەردارەکە کەرەکەی هێناوە. خێرا پەنجا دیناری زێڕم لە پرێســـکەیەک ناو ســـوار بووم و ڕۆیشـــتم هەتا گەیشـتمە ماڵی ئەو چـاوکەژاڵە. کە وەژوور کەوتم، وڵات هەموو مـاڵـدرابوو. ئـاوپرژێن کرابوو. مۆم لە مۆمدانەکاندا و چێشـــت لە بارِ داندرابوو، واشـــتای حۆریئاســـا مەی لە پیاڵە کردووە و چاوەڕێی منە. هەر کە منی دیت هەستا دەستی دەستۆ کردم، گوتی:

له تــۆ دوور بـم، عەزیــزم، تــاڵە بــۆ مــن
دوور لە تــۆ مــردنــیــش مەحــاڵە بــۆ مــن

" ' 'دوای ئەوە سـفرەیان ڕاخسـت و نانیان خوارد. ئەو جار کەنیزەکان بادەیان گێڕا. ئیدی هەر بە مەیخواردنەوە و غەزەلگوتنەوە خەریک بووین. هەتا شــەو درەنگ بوو. ئینجا پێکەوە خەوتین. کە ڕۆژ بووەوە، هەر وەک جارەکەی دیکە پەنجا دینارم خسـتە ژێر باڵنجەکەوە و هاتمە دەرێ. خاوەنی گوێدرێژەکە لەوێ چاوەڕێم بوو. سـوار بووم هاتمەوە مزڵ و مـاوەیەک خەوتم. کە خەبەرم بووەوە، چووم میوە و نوقڵ و ڕێحـانم کڕی و نـاردمەوە مـاڵی ئەو ڕوومـانگە و بۆخۆشـم دەمەو ئێوارە پەنجـا دینـاری زێڕم لە پڕێسکەیەکەوە پێچا و هاتم سواری کەر بووم و چووم بۆ ماڵی لەشزیوین. نان و شتمان خوارد و شــەرابمان نۆشــی، هەتا بەیانی پێکەوە تێخزاین. بەیانی زێڕەکەم خسـتە بن باڵنجەکە و ئیدی بەردەوام ئەوە کاری من بوو. هەتا ئەوەی کە دینارێکم درەم نەما. خۆمم سەرکۆنە کرد و گوتم:

تینم هەر کەمتر دەبێ، ئەوینیش لە هەڵچوونە
کیســەم پارەی لێ دەبڕێ، دڵیشــم پڕ لە خوونە
بۆخۆم لەو حاڵەدام و، ئەوینیش هەر پەل دەکوتێ
شــێتی ئەو جارەیانم، بڵێی ســەر لەکوێ بکوتێ؟

" ' 'ئەو جار لە ماڵێ هاتمە دەرێ و هەر جارەی ڕووم لە لایەک دەکرد. هەتا گەیشتمە دەروازەی زوێلە. خەڵکێکی زۆری لێ بوو، ئاپۆرە بوو، لەو نێوەدا پیاوێکی میریان تێدا بوو بە پەنایدا ڕۆیشــتم، دەســتم بەر گیرفانی کەوت دیار بوو کیســەیەکی زێڕ پێ بوو. تەماع گرتمی، دەستم برد و دەرم هێنا. پیاوەکە هەستی کرد گیرفانی سووک بووە، دەستێکی لە گیرفانی دا. کە دیتی تێیدا نەماوە. هەڵچوو، چاوێکی لە من کرد و گۆپاڵێکی لە سـەرم دا. لە هۆش خۆم چووم و کەوتم. خەڵک وایان زانی مردم. لغاوی ئەسـپیەکەیان گرت و گوتیان: 'هەر لەبەر ئەوە ئاپۆرەیە و ڕێگا نییە، نابێ لاوێکی ئاوا بکوژی.' پیاوەکە هاواری کرد: 'ئەو هەتیوە دزە.' لەو دەمەدا من وە هۆش هاتمەوە. گوێم لێ بوو، هێندێک دەیانگوت: لاوێکی جوانچاکیشــە، کاری وای نەکردووە.' دەســتەیەکی دیکە پشــتی قســەی کابرایان دەگرت. دەستەیەک دەیانویست من لە دەست ئەو کابرایە ڕزگار بکەن. لەو دەمەدا دارۆغەی شار گەیشتێ. کە ئەو خەڵکەی دیت، پرسی: 'ئەوە چییە؟' پیاوەکە گوتی: 'بیست دیناری زێڕم لە گیرفاندا بوو، ئەو گەنجە دزیوییەتی.' دارۆغە منی گرت و پشــکنیمی و کیســە زێڕەکەی دیتەوە. زێڕەکەی بژارد بیست دیناری تەواو بوو. دارۆغە تووڕە بوو، بە سەرمدا گوڕاندی

'راسـتی بڵێ.' من لە دڵی خۆمدا گوتم: 'ئێستا چۆن ڕاستی نەڵێم لە کاتێکدا لە بەر چاوی خەڵک توورەکە پارەی لە گیرفانی من دەر هێنا؟ ئەگەر ڕاستیش بڵێم، بە دەست یاساوە گیر دەکەم.' ناچار سەرم بەرداوە و ڕاستییەکەم گوت. داروغە ئەو خەڵکەی لەوێ بوون بە شایەد گرتن و فەرمانی بە ئەشکەنجەدەر دا کە دەستم بقرتێنن. ئەویش دەستمی پەڕاند.

" ' 'داروغە منی هەر لەوێ بەجێ هێشت و ڕۆیشت. خەڵک لێم کۆ بوونەوە، قاپێکیان مەی بۆ هێنام. پیاوەکەش بەزەیی پێمدا هات و بیست دیناره زێڕەکەی دامێ و گوتی: 'دیارە تۆ دز نییت، گرفتت بۆ هاتووەتە پێش.'

لەو ڕۆژەوەی کە دەستم بەو کیژە گەیشتووە
عالەمێ هەر وەک و داڵ لە دەورەی من نیشتووە
لەگەڵ ئەو چاوکەژاڵە هێلانمان چێ کردووە
دێر و کەنیسە و مزگەوت، گشتیم لە بیرەو چووە
عەبا و مەندیل و تەسبێح هەمووم وەبەر جەنجەڕ دا
ڕێگەی ڕابواردن و خۆشی و، فشە و گاڵتەم وەبەر دا

" ' 'کە پیاوەکە ڕۆیشت، هەستامەوە و دەستە پەڕێنراوەکەمم لە پەڕۆیەکەوە پێچا. بە زەلیلییەوە گەڕامەوە ماڵی واشتاکەم و خۆم لە جێیە هاویشت. کە واشتاکەم منی وا بە پەشێوی دیت، گوتی: 'ئەوە چ بوو؟ گوتم: 'بەو مەستییەی دوێشەو سەرم وە ژان کەوتووە.' ئەو پەریزادە لە قسەکەی من نارەحەت بوو، گوتی: 'گەورەم، دڵم تۆقی پێم بڵێ چ بووە، دیارە دەڵێی قسەیەکت پێیە.' گوتم: 'لێم گەڕێ، هیچم لێ مەپرسە.' ڕووپەرییەکەم دەستی کردە گریان و گوتی: 'ئەوە چۆنە وەک جاران نەماوی؟'

" ' 'بەو جۆرە، هەر ئەو قسەی لەگەڵ دەکردم و من توانایی وەڵامدانەوەم نەبوو، هەتا بوو بە شەو. لە ترسی ئەوەی پێم نەزانن، نانم نەخوارد. یارە دلۆڤانەکەم پێی گوتم: 'پێم بڵێ چ بووە؟ زۆر پەرۆش و نارەحەتت دەبینم.' جوابم نەداوە. پاشان بادەی هێنا و گوتی: 'بادە بخۆوە تا خەم و پەژارە لە دڵت ڕامالێ'. گوتم: 'ئێستا کە بادەم دەرخوارد دەدەی، دەبێ بە دەستی خۆت بمدەیتێ.' جا پیاڵەیەکی دەرخوارد دام و پیاڵەیەکی دیکەی تێ کردەوە. دەستی چەپم برد و پیاڵەکەم لێ وەرگرت. ئەسرین لە چاوم ڕژانە خوار. کە ئەسرینەکە بەسەر ڕوومەتمدا هاتە خوار و پیاڵەکەم بە دەستی چەپ گرت. هاواری لێ هەستا و گوتی: 'ئەیڕۆ! ئەوە چ بووە، بۆ دەگری و ئەو پیاڵەیەت بۆ بە دەستی چەپ لێ وەرگرتم؟' هیچم نەگوت و پیاڵەکەم خواردەوە و ئیدی هەر وا مەی دەدامێ هەتا تەواو سەرخۆش بووم و پاشان خەوم لێ کەوت. دوایی دەستی بێمەچەکی منی دیت و کیسە زێرەکەی لە گیرفانمدا دیت و نارەحەت بوو.

" ' 'بەری بەیان کە هەستام، پیاڵەیەکی مەی دامێ و نانی دانا. کەمێکم خوارد و هەستام

ویستم وەدەر کەوم. نەیهێشت و گوتی: 'دانیشە.' دانیشتم. گوتی: 'ئێستا کە خۆشەویستیی تۆ گەیشتووەتە ئاستێک هەموو ماڵ و سامان و تەنانەت دەستیشت لەڕێی مندا داناوە. خودا بە شایەد دەگرم کە لێت جودا نابمەوە.'

" ' 'ئەو جار چوو قازی و شایەدی هێنا و پێی گوتن: 'من لەو گەنجە مارە بکەن و ئێوە شایەد بن کە من مارەیی خۆم لەو کوڕە وەرگرتووە و تەواوی ئەو کۆیلە و کەنیزانە و گشت ماڵەکەم هی ئەو کوڕەیە.' کە قازی و شایەدەکان پارەی حەقدەستی خۆیان وەرگرت و ڕۆیشتن، ئەو ڕوومانگە قۆڵی منی گرت و بردمییە دیویکەوە، ئەو دیوە یەغدانێکی گەورەی تێدا بوو. دەرکی یەغدانەکەی هەڵگرت، سەیرم کرد پڕە لەو پڕێسکانەی من بردبوومن. گوتی: 'هەر پڕێسکەیەکی کە داوتە بە من پەنجا دیناری تێدا بووە و، لێرەمدا داناوە. ئێستاش ئەوە ماڵت، بزانە من لە گیانی خۆم خۆشتر دەوێی. ئەگەر گیانی خۆشم لە پێناوی تۆدا دانێم هێشتا لەبەرابەر ئەو لەخۆبردووی و خۆشەویستییەی تۆ دەرحەق بە من کردت هەر کەمە.' دوای ئەوە تەواوی ماڵەکەی بە زێڕ و مڵکەوە لە کاغەزێکدا بە ناوی منەوە کرد و دایمێ. ئیدی هەتا سبەینێ بەیانییەکەی هەر مات و ناڕەحەت و پەشێو بوو، وا بوو کە ڕۆژ بووەوە نەخۆش کەوت و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ نەخۆشییەکەی توندتر دەبوو. هەتا ئەوەی مانگێک تێنەپەڕیبوو کە ئەو یارە دلۆڤانە مرد. حەوت ڕۆژم ماتەم بۆ گێڕا. لەسەر گڵکۆکەی گومبەزێکم ساز کرد. ماڵێکی زۆرم بۆ کردە خێر. دوای ئەوە دەستم کرد بە ماڵەکەی و ئەو ئەنباری ڕەشکەیەی کە بە تۆم فرۆشت، یەکێک لە ئەنبارەکانی ئەوە. ئێستاش لە ئەنبارەکانی ئەو دەفرۆشم.

" ' 'هەر بۆیە تکات لێ دەکەم لە پارەی ئەو ڕەشکەیە گەڕێ و وەک دیاری لێم قەبووڵ بکە. بەو هۆیەوە بوو کە بە دەستی چەپ نانم خوارد. تکایەکی دیکەشم لێت هەیە. ئەویش ئەوەیە لەگەڵ من وەرە بۆ شارەکەمان.' ئەمن تکاکەی ئەوم قەبووڵ کرد و مانگێکم دەرفەت خواست. دوای ئەوە تەواوی ماڵ و سامانەکەمم فرۆشت و دام بە کەلوپەلی بازرگانی و لەگەڵ ئەو بەرەو شارەکەیان کەوتینە ڕێ.

" 'ئەو گەنجە شتومەکەکانی خۆی فرۆشتن و کەلوپەلی دیکەی کڕی و گەڕاوە بۆ میسر.

بەپێی داهاتی ئەو شارە منی گیرساندەوە. هەتا ئەو ڕووداوەم بۆ هاتە پێشێ.'

"سوڵتان گوتی: 'ئەوە بە قەد چیرۆکی قەموور خۆش نەبوو. ناچارم هەر چواریان بکوژم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی بیست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: 'خاوەنشکۆ، که سولْتان گوتی: 'هەمووتان دەکوژم،' کارگێڕ کورنۆشی برد و گوتی: 'سولْتان، ڕێم بده من چیرۆکێکت بۆ بلْێم. ئەگەر له چیرۆکی قەموور خۆشتر بوو، ئەوە له خوێنی هەر چوارمان خۆش به.' سولْتان ڕێی پێ دا.

## چیرۆکی کارگێڕ

"کارگێڕ گوتی: 'گەورەم، سولْتان! دوێ شەو لەگەلْ کۆمەلْێک له قورئانخوێنان له پرسەیەک بووین. دوای ئەوەی قورئان خوێندراوە، خوانیان ڕاخست. نانیان هێنا. دەفرێکیان زەڕپاچەش۱ لەسەر سفرەکه دانابوو. یەکێک له میوانەکان له سفرەکه کشاوە و لەو لاوە دانیشت و سوێندی خوارد که لەو زەڕپاچەیه نەخوا و گوتی: 'ئەوەی له دەست ئەوە چێشتوومه، بەسمه و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

لام سەیر نییه کەسێک سڵ بکا
دەمسووتاو به شیر، فوو له دۆش دەکا

" 'که ئێمه له نانخواردن بووینەوە، هۆی بێزارییەکەیمان پرسی. گوتی: 'ئەمن لەو زەڕپاچەیه ناخۆم هەتا چل جار به ئەسپۆن و چل جار به کۆنار و چل جار به سابوون دەستم نەشۆم.' خانەخوێ لەڕێوە به خزمەتکارەکانی گوت و، سابوون و ئەسپۆن و کوناریان بۆ هێنا، وەک کەسێک ترسی لێ نیشتبێ، دەلەرزی. پاشان هاته پێشێ و دەستی برد نانەکەی بخوا. دیتمان قامکه گەورەی نییه و هەر به چوار قامک شت دەخوا. ئێمه پێمان سەیر بوو، پرسیمان: 'ئەوە ئەو ئەنگوستەت هەر زکماک وا بووە یان له ڕووداوێکدا تێدا چووە؟' گوتی: 'برایان، نەک هەر ئەو قامکه گەورەیەمه، بەلْکو قامی گەورەی دەستی چەپ و هەردووک قامکه گەورەی قاچیشم ئاوایه.' ئەو جار ئەوەندەی دیکەمان پێ سەیر بوو. گوتمان: 'لەوە زیاتر تاقەتمان نییه و دەبێ بۆمان بگێڕییەوە، بزانین هۆی پەڕینی ئەو ئەنگوستانه و سەدوبیست جار شوتنی دەستت چییه؟'

---

۱ زەڕپاچە: خواردنێکه له جەرگ و پیواز و هەزوێله چێ دەکرێ. بۆنی ناخۆشه و تامی خۆشه.

## چیرۆکی بازرگان و زەڕپاچە

" 'گوتی: 'بۆ ئاگاداریتان، بابم لە دەورەی هاڕوونەڕڕەشـــید، بازرگانێکی بە توانا و لە گەورەکانی بەغدا بوو، هەمیشـە خەریکی مەیخواردنەوە و سـەما و خۆشـی بوو. کە کۆچی کرد، هیچی لەپاش بەجێ نەما. ئەمن ئەوم ناشت و شینم بۆ گێڕا و چەند ڕۆژێک ماتەممان گرت. دوای ئەوە دووکانم کردەوە. دووکان هیچی تێدا نەبوو. قەرزدارەکانی بابم لە سـەرم بوون. دەرفەتم لێ وەرگرتن، بۆخۆم خەریکی کڕین و فرۆشـــتن بووم. هەر حەوتووەی قەرزی یەکێـک لە قەرزدارەکـانم دەداوە. هەتـا وای لێ هـات هەموو قەرزەکـانم داوە و ماڵێکیشـــم وە ســـەر یەک نا. هەتا ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دووکان دانیشـــتبووم. کچێکم دی جل‌وبەرگی خـانمـانەی لە بەردا بوو ســـواری یەســـترێک ببوو لەگەڵ خزمەتکارەکانی دەڕۆیشـت. کە گەیشـتنە سـەرەتای بازاڕ، یەسـترەکەی ڕاگرت و دابەزی، لەگەڵ یەکێک لە خزمەتکارەکانی چووە نێو بازاڕ. گوێم لێ بوو کە ئەو خزمەتکارە پێی گوت: 'خانمەکەم، لە بازاڕ بڕۆ دەرێ و بە کەسیش مەڵێ، دەنا بە کوشتمان دەدەی.'

" 'ئیدی کاتێک کچە چاوی بە دووکانەکاندا گێڕا لە دووکانی منی باشـتر نەدیتەوە، هاتە ژووری و سڵاوی کرد و دانیشت. کەسی ئەوەندە قسەخۆشم نەدیبوو. دوایە ڕووبەندەکەی لە ڕووی لادا. دڵمی برد و ئەو شێعرەم گوت:

بەو دەلالی و جوانیتەوە بێتو گەر خۆت دانەپۆشـــی
دوو ڕۆژی دی لەو شـارەدا، شـێخ دەبینی بە سـەرخۆشـی
پێکەنین و بزەی لێوت، گەورە و چووکە ســـەرخۆش دەکـا
گەر بێتو پێی بڵێی مەیکە، حـاجی ڕوو لە قیبلە نـاکـا

" 'دوای ئەوە گوتی: 'گەنجۆ، کوتە قوماشـــێکی باشـــمان دەویســـت.' گوتی: 'خانم، مسـکێنی[1] تۆ هەژارن و کاڵای شـایانی تۆیان نییە. ڕاوەسـتە با بازرگانەکان دووکانەکانیان هەڵگرن ئەوەی دەتهەوێ دەیهێنمە خزمەتت. دوایە دەستمان بە قسە کرد. بەڵام من شەیدای ئەو ببووم و هۆشـم لە لا نەمابوو. کە بازرگانەکان دووکانیان هەڵگرت، هەسـتام و ئەوەی ئەو دەیویست بۆم پەیدا کرد. نرخەکەی پێنج هەزار درەم بوو.

" 'ئینجا کاڵاکانم دا بە خزمەتکارەکە. خزمەتکار کاڵاکانی لێ وەرگرتم و لە بازاڕ چوونە دەرێ و یەسـتریان هێنا بەرەوە و ئەو حۆریئاسـایە سـوار بوو. ئیدی نە پێی گوتم کێم و نە خەڵکی کوێم. منیش لە شەرمان شوێنی ئەوم نەپرسی، نرخی شتەکانم لە ئەستۆ گرت. ئەو پێنج‌هەزار درەمەم قەبووڵ کرد و بەرەو ماڵ گەڕامەوە. بەڵام خۆشـەویسـتی ئەو منی

[1]. مسکێن: ڕەعیەت.

سەرخۆش کرد.

" 'کە خواردنیان هێنا، نەمتوانی بیخۆم و ویســـتم بخەوم، نەشـــمتوانی بخەوم. هەتا حەوتوویەک ئەوە حاڵم بوو. هەتا بازرگانان داوای پارەکەیان لێ کردم. حەوتوویەکم مۆڵەت خواســت. کە حەوتووەکە تەواو بوو. ســەیرم کرد ئەوە گەلاوێژتەوێڵ بە ســواری یەســـتر و بە چەند قەرەواشـــەوە لەو لاڕا پەیدا بوو. کە منی دیت ســـڵاوی کرد و گوتی: 'گەورەم، نرخی شتەکانم درەنگ هێنا. ئێستا سەڕراف گاز کە با بێ پارەکەی بدەینێ.' ئەمن سەڕرافم بانگ کرد و پارەکەمان دایە و لەگەڵ ئەو پەریپەیکەرە دەستمان کرد بە وتووێژ. هەتا بازرگانەکان هاتن و دووکانیان کردەوە و بازاڕ گەرم بوو. ئەو جار پێی گوتم: 'کەمێکم شت دەوێ.' من ئەوەی دەیهەویست لە بازرگانانم کڕی. بای دەههەزار درەم بوو. شتەکانی لێ وەرگرتم و دای بە قەرەواشەکانی و بێ ئەوەی قسەم لەگەڵ بکاتەوە، ڕۆیشت و ون بوو. ئەمن لە دڵە خۆمدا گوتم: 'ئەوە چ کارێک بوو؟ ئەمن پێنجهەزار درەمم لێ وەرگرت و دەههەزارم دایە.' ئیدی ترسی تێداچوونی شتەکانی خەڵک وماڵوێرانی خۆم ڕێ نیشـــت. گوتم: 'خۆ ئەو بازرگانانە جگە لە من کەس ناناســـن. ئەو ژنەتیوە مەکربازە کەمئەزموونی منی بە هەڵ زانی. منی بە جوانی و دەلالی خۆی فریو دا و پێی نەگوتم ماڵەکەی لە کوێیە.'

" 'بەو جۆرە من هەر لە دڵەڕاوکێ و نیگەرانیدا بووم هەتا لە مانگیش تێپەڕ بوو. بازرگانەکان داوای پارەکەی خۆیان دەکردەوە و گوشاریان بۆ من دێنا. من ماڵ و مڵکەکەم فرۆشـت و کار لە مات و مەلوولی تێپەڕی و کەوتە هیلاک بوونەوە، سـەرم لە کاری خۆم سـوور ما. وا بوو لە نەکاو ئەو مانگڕوخسارە لە سـەری بازاڕ وە دەر کەوت و لە یەستر دابەزی. کە هاتە پێشـــێ، گوتی: 'چۆرتکەیەک[1] بێنە.' چۆرتکەم هێنا و زیاتر لە نرخی ئەو شتانەی بردبوونی، دایمەوە. بە ڕوویەکی خۆشـەوە قسـەی لەگەڵ دەکردم. پاشـان گوتی: 'ئەرێ ژنت هەیە؟' ئەمن گریام. گوتی: 'بۆ دەگری؟' گوتم شتێکم وەبیر هاتەوە بۆیە گریام. چاوکەژاڵ پێکەنی و هەستا ڕۆیشت. ئەمن مستێکم زێڕ هەڵگرت و دام بە قەرەواشـەکە کە بەڵکو دەلالیم بۆ بکا.

" 'قەرەواشـەکە پێکەنی و گوتی: 'ئەو تۆی زۆر لەوە خۆشـتر دەوێ کە تۆ ئەوت خۆش دەوێ. پێویسـتیشـی بە شتکڕین نییە، هەر بۆ ئەوەی تۆ ببینێ ئەوانە دەکا بە بیانوو. ئێستا هەرچیت لە دڵدایە بیڵێ، وەڵامت دەداتەوە.' کە ئەو چاوکەژاڵە چاوی لێ بوو زێڕم دا بە قەرەوشـاکەی، خێرا گەڕاوە دانیشـت. من بەوپەڕی خۆبەکەمگرییەوە هەرچیم لە دڵدا بوو پێم گوت. بە گوتەکانم خۆشـــحاڵ بوو، داواکەمی پەســـەند کرد. گوتی: 'ئەو خزمەتکارە

---

[1] چۆرتکە: ئامرازی حساباتی دووکانداران.

پەیامهێنی منە. ئەوەی ئەو پێت دەڵێ، وا بکە.' پاشـــان هەســـتا و ڕۆیشـــت. ئەمنیش قەرزی بازرگانەکانم داوە. ئیدی شــــەو و ڕۆژ خەیاڵی ئەو مانگڕوخســــارەم لە زەیندا بوو. دوای ئەوەی ماوەیەک تێپەڕ بوو، قەرەواشــــەکە هاتەوە. ئەمن ڕێزێکی زۆرم لێ گرت و هەواڵی ئەو لەشزیوینەم لێ پرســــی. گوتم: 'دەی باســــی ئەوم بۆ بکە.' گوتی: 'ئەو خـاتوونە پەروەردەی دەستی زبێدە خانمی خێزانی هارونە ڕشیدە. لەم ڕۆژانەدا ڕوخسەتی لە زبێدە خانم وەرگرتووە بێتە دەرێ. کە تۆی دیت، داوای لە خانم کرد لە تۆی مارە بکا.' زبێدە خانم گوتی: 'تا ئەو گەنجە نەبینم، تۆی لێ مارە ناکەم. جا ئێســـــتا هاتووم لە دوای تۆ کە بێی بۆ ماڵی خەلیفە. ئەگەر بێیە کۆشـــکەوە و کەس تۆ نەبینێ ئەوە بە ئاواتت دەگەی، دەنا دەکوژرێی. ئێســـتا دەڵێی چی؟' گوتم: 'دێم، هەرچی دەبێ با ببێ.' قەرەواشـــەکە گوتی: 'کە بوو بە شــــەو، بچۆ مزگەوتی زبێدە خانم و شــــەو لەوێ بخەوە. بەیانی چاوەڕێی من بە.' ئەمن قســەی قەرەواشـەکەم پەســەند کرد و شـەو چووم بۆ مزگەوتی زبێدە خانم و لەوێ نوێژم کرد و خەوتم.

" 'ســــۆزی دیتم دوو کەس لە کەنیزەکان بە بەلەمێک هاتن و یەغدانێکیان پێیە. کە لە دیجلە پەڕینەوە، یەغدانەکەیان لە مزگەوت دانا و گەڕانەوە. دوای ماوەیەک هەر ئەو کیژە پەریپەیکەرە هاتە مزگەوت و سڵاوی کرد. هەستام و یەکترمان لە ئامێز گرت. ماچی کردم و دەستی کرد بە گریان. دوای ئەوە منی لە یەغدانەکە نا.

" 'کاتێک چاوم هەڵێنا، سەیرم کرد لە کۆشکی خەلیفەم. دیاری و پێشکەشییەکی زۆریان بۆ هێنام کە بای پەنجاهەزار درەم زیاتر بوو. ئەو جار چاوم لێ کرد ئەوە بیســــت دانە کەنیز و زبێدە خانم کە وەک مانگ لە نێوەڕاســـتیاندا دەدرەوشــــاوە، وەدەر کەوتن. ئەمن هەستام و کوڕنۆشم بۆ برد و ڕاوەستام. فەرمووی کردم دانیشم و منیش دانیشتم.

کە دانیشتم، لە پیشە و پێشینیانمی پرسی. ئەمن پیشە و پێشینیانەکەمم پێ گوت. زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی: 'سپاس بۆ خودا کە زەحمەت و پەروەردەی من لەگەڵ ئەو کەنیشکە بە فیڕۆ نەچوو.'

" 'بە منی گوت با تۆش بزانی کە: 'ئەو کەنیشـــکە لە لای ئێمە وەک منداڵی خۆمان وایە. ئەوە بە ئەمانەت دەیدەین بە تۆ.' کە ئەو قســــەیەم بیســـت، لە ڕێوە کوڕنۆشـــم برد و سپاسگوزاریم کرد. زبێدە خانم فەرمووی دە ڕۆژ لەو شوێنە بمێنەوە. ئەمن دە ڕۆژ لەوێ مامەوە و لەو دە ڕۆژەدا ئەو کیژەم نەدیت، کەنیزی دیکە لە خزمەتمدا بوون.

" 'زبێدە خانم بە تەما بوو لە ماوەی ئەو دە ڕۆژەدا هارونەڕەشـــید ڕازی بکا تا ئەو کچە لە من مـارە بکەن. کە خەلیفە ڕێگەی ئەو کـارەی دا و ڕازی بوو، دە هەزار دینـاری زێڕیشــی دیاری دایە. دوای ئەوە زبێدە خانم، قازی و شـایەدی هێنا و کچەیان لە من مارە

کرد. دە ڕۆژی دیکە لە کۆشک مامەوە. دوای کەنیشکەیان بردە گەرماو و خوانێکی بۆ من ئامادە کرد کە هەموو جۆرە خواردەمەنییەکی لەســـەر ڕیز کردبوو. دەفرێکی زەڕپاچەش لەســـەر بوو. ئەمنیش بە پەلە دەســـتم دایە زەڕپاچە و ئەوەندەی توانیم خواردم. لە بیرم چوو دەستم بشۆرم و هەر بە پەرۆ سڕیم و چاوەڕوان مامەوە. لەپڕدا مۆمی هەڵکراویان هێنا لای من و گۆرانیبێژەکان دەســـتیان کرد بە دەفلێدان و ئارایشـــگەران بووکیان ڕازاندەوە. هەتا شەو درەنگ بوو.

" 'بووکیان هێنا لای من و پەردە لە خەڵک چۆڵ کرا. ویســـتم لە ئامێزی گرم، بۆنی زەڕپاچەی بۆ چوو. کەنیزەکانی بانگ کرد. لە هەموو لایەکەوە کەنیز کۆ بووە و ئەو لەبەر تاڕەحەتیان دەلەرزی. ئەمن نەمدەزانی چی بووە. کەنیزەکان گوتیان: 'خانم ئەوە چی بووە؟' گوتی: 'ئەو شێتە لە من دوور خەنەوە. ئەمن پێم وا بوو ئەوە ماقووڵە.' گوتم: 'خانم، هۆی شێتێتی من چییە؟' گوتی: 'بۆ زەڕپاچەت خواردووە و دەستت نەشتووەتەوە، بە خودا لەبەر ئەو کارەت مێردت پێ ناکەم.' دوای ئەوە قامچی وەرگرت، ئەوەندەی بە قامچی لێ دام تا لە زمانی خستم.

" 'پاشان بە کەنیزەکەکانی گوت: 'ئەوەی بگرن و بیبەنە لای داروغە هەتا ئەو قامکانەی کە زەڕپاچەی پێ خواردووە و نەیشـــتوونەتەوە، بپەڕێنێ.' ئەمن لە دڵە خۆمدا گوتم: 'چۆن دەبێ لەبەر زەڕپاچەخواردن و نەشوتنەوەی دەست، قامکم بپەڕێنن؟!'

" 'کەنیزەکەکان پێیان گوت: 'بۆ کارێکی خراپ کە لە جارێک زیاتر ڕووی نەداوە، ئەو سزایە زۆرە.' گوتی: 'بە خودا تازە قامکەکانی دەپەڕێنم.' دوای ئەوە ڕۆیشت و دە شەو و ڕۆژان نەمدیتەوە.

" 'دوای دە ڕۆژ هاتەوە و گوتی: 'ڕووڕەش، تۆ شـــیاوی ئەوە نییت ببیتە مێردی من. زەڕپاچە دەخۆی و دەســـتت ناشـــۆیەوە!' ئەوجار بانگی کەنیزەکەکانی کرد. ئەوان هاتن و قولی منیان بەســـت و بە گوێزانێک قامکەگەورەی دەســـتەکانم و قامکەگەورەی قاچەکانمی بڕی و ئـاوای لێ کردم کە دەمبینن. دوای ئەوە دەرمـانی بە برینەکـانمەوە کرد هەتـا خوێنەکەی ڕاوەســـتێ و بەڵێنیشـــی لێ وەرگرتم کە ئەگەر زەڕپاچەم خوارد، ســـەدوبیســـت جار دەستم بشۆم. ئێستا کە ئەو زەڕپاچەیەم دیت، لێی دوور کەوتمەوە. ئێوە کە پێداگریتان کرد، ناچار دەبێ بە بەڵێنییەکەم وەفادار بم و، دەستم بەو جۆرە شت کە دیتتان.'

"کارگێڕ گوتی: 'ئەمن لێم پرســـی کە ئەو کچە دوای ئەوەی قامکەکانی تۆی بڕی و بەڵێنی لێ وەرگرتی، چۆن بوو؟' گەنجەکە گوتی: 'دوای ئەوە لەگەڵم زۆر بەبەزەی بوو. ماوەیەک لە کۆشکی خەلیفە ماینەوە. ڕۆژێک کچە پەنجاهەزار دیناری زێڕی دامێ و گوتی: 'خانوویەک بکڕە.' ئەمن خانووم کڕی و ئەوەی لە کۆشک بوومان بردمانە خانووەکەوە.'

" 'گەورەم، ســـولّتان، دوای ئەوەی کە هۆکاری بڕینی قامکەکانی ئەو لاوەم زانی. هەستام و هاتمەوە ماڵێ. لەگەڵ قەمووریش ئەوەم بەسەرهات کە بۆم گێڕایەوە.' سولّتان گوتی: 'ئەو چیرۆکەش لە چیرۆکی قەموور خۆشـــتر نەبوو. ناچارم ئێوە بکوژم.' ئەو جار نۆشدارە جوولەکەکە هاتە پێشێ و کوڕنۆشی برد و گوتی: 'گەورەم، من چیرۆکێک دەزانم لە بەسەرهاتی قەموور خۆشتر و سەیرترە. ئەگەر ڕێم بدەی، دەیگێڕمەوە.' سولّتان گوتی: 'بیگێڕەوە.'

## چیرۆکی نۆشدارە جوولەکەکە

"گوتی: 'لە سەرەتای لاوەتیمدا لە شاری دیمشق نوشداریم دەکرد. ڕۆژێکی کابرایەک لە ماڵی پارێزگاری دیمشـــقەوە هات لە دوام و منی بردە ماڵی پارێزگار. کە چووینە ژووری. لە بەرهەیوانێک کەسێکی نەخۆش لەسەر تەختێک درێژ ببوو. چوومە سەری. کوڕێکم دی کە تا ئێستا قەت شتی ئەوەندە جوان و لەبەردڵانم نەدیتبوو. لە پەنای دانیشتم، ویستم بە دەست شواری١ بگرم، ئەو دەستی چەپی هێنا دەرێ. ئەمن ئەو بێئەدەبییەم پێ سەیر بوو. ئیدی شـــواریم گرت و دەرمانم بۆ نووســـی. هەموو ڕۆژێکیش دەچووم ســـەرم دەدا هەتا چاک بووەوە. ناردم بۆ گەرماو. لە گەرماو هاتە دەرێ و پاداشـــی منی دا. دوایی نەخۆشخانەی دیمشقی بە من سپارد. ڕۆژێک نەیهێشت کەس بێتە گەرماو و منی لەگەڵ خۆی بردە گەرماوەکەوە. کە جلەکانی داکەند، سەیرم کرد دەستی ڕاستی بڕاوەتەوە. واقم وڕ ما و نارەحەت بووم. لەسەر جەستەشی شوێنی قامچیم دیت. ئەنگوستی ڕامانم بە ددان گرتبوو، کاس بووم.

" 'ئەو کە ئەو وڕ و کاســـییەمی دیت، گوتی: 'زانای زەمان، ســـەرت لەو کارانەی من سوور نەمێنێ. با لە گەرماو بچینە دەرێ، بۆت دەگێڕمەوە.' کە لە گەرماو چووینە دەرێ و گەڕاینەوە ماڵێ، خواردنمان خوارد. گوتم: 'بۆم بگێڕەوە چی بووە؟' گوتی: 'با تۆش بزانی کە من خەڵکی موســـڵم. کە باپیرم مرد، دە کوڕی لێ بەجێ ما و یەکیان بابی من بوو. کە براکان گەورە بوون و ژنیان هێنا، خودا بابمی بەســـەر کردەوە و منیان بوو. براکانی دیکە منداڵیان نەبوو، هەموویان دڵیان بە من خۆش بوو. کاتێک من گەورە بووم، ڕۆژێک لە مزگەوتی گەورەی موسـڵ نوێژمان کرد و خەڵک لە مزگەوت چوونە دەرێ، جگە لە بابم و مامەکانم. لە زۆر بارەوە قسەیان کرد و باسی شاری سەیرسەیریان دەکرد، هەتا باسی میسر هاتە گۆڕێ.

" 'مامەکانم گوتیان: 'لە بازرگانەکانمان بیســـتووە کە لەســـەر گۆی زەوی هیچ کوێ لە

---

١. شوارگرتن: ژماردنی لێدانی دڵی نەخۆش بۆ پشکنینی نەخۆشی.

میسر و سەر چۆمی نیل خۆشتر نییە. شاعیر زۆر جوانی بە سەر میسردا هەڵگوتووە:

نییە وڵات لە میسر خۆشتر بێ
یان هەبێ چۆمێک لە نیل درێژتر بێ
ئاوەدان ئەمیان، شەتاوە ئەویان
ئەمیان سەر سەوز و ئەویان لە خوڕ بێ

" 'ئیدی ئەوان زۆریان پەسنی میسر دا. ئینجا خولیای دیتنی میسر کەوتە مێشکمەوە. ـ شان هەرکەسەی ڕۆیشتەوە ماڵی خۆیان. حەزی دیتنی میسر خەو و خۆراکی لێ حەرام کردم، هیچم بە گیان نەدەکەوت و نەمدەتوانی بخەوم. چەند ڕۆژێکی پێ چوو مامەکانم خۆیان ساز کرد بچن بۆ میسر. بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەوان بچم، لە لای بابم دەستم کرد بە گریان. بابم هێندێک کەلوپەل و ماڵی بۆ کڕیم و بە مامەکانمی گوت: 'ئەو لە دیمشق دانێن ـ مەیبەن بۆ میسر.' دوای ئەوە ماڵاواییمان لە بابم کرد و لە موسڵ وەدەر کەوتین، ـڕۆیشتین هەتا گەیشتینە حەڵەب. چەند ڕۆژ لەوێ ماینەوە و لەوێش ڕۆیشتین تا گەیشتینە ـیمشق. سەیرمان کرد شارێکی زۆر سەرسەوز و ئاوەدانە و پڕە لە دار و چۆمی بەخوڕ ـ. وەک بەهەشت دەچوو. لە کاروانسەرایەک لامان دا.

" 'مامەکانم شتەکانی منیان فرۆشت و لە هەر درەمێکی پێنج درەم خێریان کرد. بەو ـسوودە زۆر خۆشحاڵ بووم. دوای ئەو کارانە منیان هەر لەوێ بەجێ هێشت و بەرەو میسر ڕۆیشتن. ئەمن ماڵێکی چاکم بە مانگی بە دوو دینار بە کرێ گرت و تێیدا دانیشتم و خەریکی عەیش و نۆش و خۆشڕابواردن بووم. هەتا ئەو ماڵەی هەم بوو هەموویم لە ـدەست دا. ڕۆژێکی لە بەردەرگای ماڵێ دانیشتبووم. کچێکی ڕووپاک و جوان بە جلی ـئاوریشمییەوە لە بەردمم پەیدا بوو. ئاماژەیەکم بۆ کرد. بێ ملبادان وە ژوور کەوت. دەرکی ماڵی کردەوە، پەچە و ڕووبەندی وەلا نا و لەو لاوەی دانا. زۆرم پێ جوان بوو، ئۆگری بووم. دوای ئەوە هەستام میوە و حەلوا و شەرابیشم هێنا دامنا. پێکەوە پیاڵە پیاڵە خواردمانەوە هەتاکوو مەست بووین و بە لادا کەوتین و خەومان لێ کەوت. شەوەکەی دە دیناری زێڕم دایە. زێڕەکەی لێ وەرنەگرتم و دە دیناریشی دامێ هەتا بەو دینارانە نوقڵ و موم و مەی و عوودی پێ بکڕم. گوتیشی دوای سێ ڕۆژ بۆ شێو چاوەڕێی من بە. ئەو قسەی کرد و ماڵاوای لێ کردم و ڕۆیشت. ئاوەزی منیشی لەگەڵ خۆی برد.

" 'کە سێ ڕۆژ ڕابرد، ئەو پەریڕوخسارە هاتەوە و پتر لە جاری پێشوو خۆی تیفتیفە ـبوو. جلوبەرگی جوانتر لە جاری پێشووی لە بەر کردبوو. ئەمنیش هەموو شتێکم ئامادە کردبوو. نانمان خوارد و دەستمان کرد بە مەی خواردنەوە. کاتێک مەست بووین، لە

ئامێزی یەکتردا خەومان لێ کەوت. بەیانی دە دیناری زێڕی دامێ و گوتی: 'ڕۆژی سێیەم دیسان چاوەڕێی من بە.' ڕۆژی سێیەم شیرینی و بادە و خواردەمەنی و سەوزیم ئامادە کرد. کاتی شێوان مۆمم داگیرساند و عوودم هەڵکرد. چاوەڕێی ئەو بووم کە لە دەرگا وە ژوور کەوت. لە بەری هەستام و گوتم:

ئەوە تۆ هاتی کەسەکەم، چەند تامەزرۆی دیدارت بووم
لەو ڕۆژەوە کە ڕۆیشتی، من جەستەیەکی بێ گیان بووم

" 'کاتێک دانیشت گوتی: 'گەورەم، من جوانم؟' گوتم: 'هەر جوان؟ تۆ شای جوانانی.'

من دەلال و دڵکەشی وام نەدیوە
گوڵپەڕی تەڕ و ناسکی وام نەدیوە
شتی وەک تۆ هەر لە دونیادا نییە
مرۆ هیچ، پەریزادی وام نەدیوە

" 'گوتی: 'ئەگەر پێت خۆشە، جارێکی دیکە کچێکی منداڵتر لە خۆمت بۆ دێنم. ئەو کچە لە بەرم پاڕاوە گوتی: 'شەوێک لەگەڵ خۆت بمبە بۆ عەیش و نۆش و ڕابواردن.' '

" 'ئیدی ئەو شەوەشمان بە کەیف و خۆشی ڕابوارد. بەیانی بیست دیناری زێڕی دامێ و گوتی: 'لە شەوەکانی تر چاکتر سفرە برازێنەوە، چونکە میوان دێنینەوە.' کە ڕۆژی دیاریکراو گەیشت، ئەمن هەموو شتێکم ساز کردبوو، چاوەڕوان دانیشتبووم کە ئەو حۆریئاسایە هات و ڕوومانگێکی دیکەی لەگەڵ خۆی هێنا. من کەیفم ساز بوو، مۆمەکانم هەڵکرد. ئەوانیش چارشێو و ڕووبەندیان لەسەر لا برد. کچە چکۆڵەکەم دیت قژی نەرم و جوان وەک قەترانی ڕەش لەسەر ئەو پێستە سپییەی ڕوخساری کەرویشکەی دەکرد. دەمی دەتگوت مێلاقەیە و، بۆن و بەرامەی پیاوی مەست دەکرد. ئەو باڵایەی وەک سەوڵ ڕێک و لەبار، مەمکی قوت و قەدی باریکی مرۆڤی وادار بە کوڕنۆش دەکرد. ئیدی دەست و کوڵمەی گوڵووکیانم ماچ کرد و خواردنم هێنا و خواردمان. پیاڵەمان لێک درا و بادە نۆشکرا. من لێوی کیژە چکۆڵەکەم ماچ دەکرد و گەورەکە ئیرەیی پێ دەبرد و بەسەر خۆیشی نەدێنا. لێی پرسیم: 'میوانی تازە لە من لەبەردڵانترە؟' گوتم: 'ئەرێ وەڵڵا لە تۆ لەبەردڵانترە.' گوتی: 'دەمهەوێ ئەوشەو لەگەڵ تۆ بخەوێ.' کە بوو بە نیوەشەو ئەمن لەگەڵ کیژۆڵەکە خەوتم. کە وەخەبەر هاتم، تاو هەڵاتبوو. دەستم برد کیژۆڵەکە هەستێنم. کەچی دیتم سەری لە لەشی جیا کراوەتەوە و بە لادا کەوت. ئەمن پێم وا بوو کە کەنیشکە گەورەکە لەبەر ئیرەییان سەری بڕیوە. ماوەیەک مات بووم. دوایە جلەکانم داکەند و لەنێو

ـاڵەکەدا چاڵێکم هەڵکەند و تێم هاویشت و گڵ و خۆڵەکەم بەسەردا داوە. ئەو هەندە ماڵەی
ـابووم هەڵم گرت و لە ماڵەکە هاتمە دەرێ و چووم بۆ لای خاوەنماڵەکەم. کرێی ساڵەکەم
ـایە و گوتم: 'دەچمەوە لای مامەکانم.'

" 'دوای ئەوە هەستام چووم بۆ میسر. مامەکانم بە دیداری من شاد بوون و لێیان
پرسیم ئەوە چۆنە هاتووی؟ گوتم: 'بیری ئێوەم دەکرد.' وا بوو ساڵێک لە لای ئەوان
ـمەوە و لەو ماڵەی مابووم، خەرجم دەکرد و خەریکی گەشت و سەیرانی میسر و چۆمی
ـیل بووم. هەتا وای لێ هات مامەکانم خۆیان ساز کرد بگەڕێنەوە. ئەمن هەڵاتم، چووم لە
شوێنێک خۆم لێ شاردنەوە. ئەوان پێیان وا بوو من وە پێشیان کەوتووم و گەڕاومەتەوە
بۆ دیمەشق. کە ئەوان لە میسر وە دەر کەوتن، منیش لە حەشارگە هاتمە دەرێ و هەتا
سێ ساڵان لە میسر بووم. ئەو ماڵەی هەمبوو هەموویم خەرج کرد و هەموو ساڵێکیش
کرێ خانووەکەی کە لە دیمەشق گرتبووم، بۆ خاوەن ماڵەکەم دەناردەوە. دوای سێ ساڵ
ـەبەر تەنگدەستی ماتەم دایگرتم. ناچار لە میسر هاتمە دەرێ و گەڕامەوە بۆ دیمەشق،
چوومەوە خانووەکەی بە کرێم گرتبوو. خاوەن ماڵەکەش بە دیتنی من خۆشحاڵ بووم.

" 'شەوێک بە دڵمدا هات سەری چاڵەکە بدەمەوە و سەرێکی کیژەکە بدەم. بزانم چی
بەسەر هاتووە. هەستام چاڵەکەم داوە و سەیرم کرد کوژراوەکە ڕزیوە و چی وای لێ
ـەماوەتەوە. بەڵام ملوانکەکەی کە لە ملیدا بوو، وەک خۆی مابووەوە. ئەمن ملوانکەکەم
هەڵگرتەوە و ماوەیەک گریام و چووم لە فکرەوە. دوای ئەوە چاڵەکەم پڕ کردەوە و سەریم
ـەوە. هەتا دوو-سێ ڕۆژ لە ماڵ نەچوومە دەر. ڕۆژی چوارەم هەستام چوومە گەرماو،
جروبەرگەکەم گۆڕی. یەک درەمیشم پارە پێ نەبوو. ناچار ملوانکەکەم کە زێڕ و گەوهەری
گرانبایی تێدا بوو، بردە بازاڕ و بە دەڵاڵێکم سپارد. ئەو منی لە دووکانێدا دانا و بۆخۆی
ڕویشت و ملوانکەکەی بە بازاڕدا گێڕا، کڕیاری هەتا دووهەزار دیناری بۆ پەیدا کردبوو.
بەڵام من نەمدەزانی. کە گەڕاوە گوتی: 'ئەو ملوانکەیە مسە و هەزار دینارێک دێنێ.' گوتم:
ـەرێ مسە و ئێمە بۆخۆمان بە ئانقەست ئاوامان دروست کردووە. ئێستا دەمهەوێ
بیفرۆشم. ئەتۆ هەزار دینارم دەیە و هەڵی گرە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی
چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، لێرە دابووین کە بە دەلاڵەکەم گوت: ' تۆ هەزار دینارم دەیە و ملوانکەکە هەڵگرە.' کە ئاوام بە دەلاڵەکە گوت، ئەو زانی گرێیەک لە کارەکەدا هەیە. لە ڕێوە ملوانکەکەی برد بۆ لای قازی و گوتی: 'ئەو ملوانکەیەم لێ دزراوە و ئێستا بە دەست کورە بازرگانێکەوە دیومەتەوە.' ئەمن لە دووکانەکە دانیشـــتبووم و ئاگام لە مەحموودی بێزەواد نەبوو[۱]، لەپڕدا پیاوەکانی پارێزگار ڕژانە ســـەرم و قۆڵبەســـتیان کردم. بردیانم بۆ لای پارێزگار. پارێزگار لەبارەی ملوانکەکەوە پرســـیاری لێ کردم. ئەمنیش چیم بە دەلاڵەکە گوتبوو، هەر ئەوەشـــم بە پارێزگار گوت. پارێزگار پێکەنی و گوتی: 'ڕاســـتیت پێ نەگوتم.' ئەو جار جلەکانیان لە بەر داکەندم و بە قامچی تەواوی گیانیان ڕەش و شـین کردمەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: 'هەر بڵێم دزیومە چاکترە لەوەی بڵێم خاوەنی ئەو ملوانکەیەیان لەســـەر جێگاکەی من کوشـــتووە.' ناچار بووم بڵێم دزیومە. خێرا دەســـتمیان پەڕاند و لە ڕۆنی قرچاویان هەڵکێشـــا تا خوێنەکەی ڕاوەســـتێ. بێهۆش بووم. شـــەربەتیان دابوومێ و وە هۆشیان هێنامەوە. دەستە پەڕیوەکەی خۆم هەڵگرت و گەڕامەوە ماڵێ. خاوەن ماڵەکە هاتە لام و گوتی: 'چونکە تۆ لەســـەر دزی گیراوی و دەســـتیان پەڕاندووی، دەبێ ماڵەکەم چۆڵ کەی. بڕۆ ماڵێکی دیکە پەیدا کە و ئێرە چۆڵ کە. ســـێ ڕۆژیشـــت مۆڵەت دەدەم.' بەردەوام بۆ حاڵی خۆم دەگریام. ســـێیەمین ڕۆژ پیاوەکانی وەزیری دیمشـــق هاتن و قۆڵبەســـتیان کردم. گوتیان: 'ســـێ ســـاڵ لەمەوبەر کچی وەزیر بەو ملوانکەیەوە بێســـەروشـــوێن بووە. کەوتمە لەرزین و گوتم بە خودا تازە هەر دەکوژرێم وا چاکە هەرچی بووە، بۆ وەزیری بگێڕمەوە. ئەگەر کوشـــتمی، ئەوە وەزیرە و دەســـەڵاتی هەیە و ئەگەر نەشـیکوشـتم ئەوە بەزەیی پێمـدا دێ و جێی خۆیەتی. کە منیـان بردە لای وەزیر، گوتی: 'ئەوەیە ملوانکەی دەفرۆشـــت و بە ناڕەوا دەســـتیتان قرتاندووە؟' گوتیان: 'بەڵێ، ئەوەیە.' ئینجا بەرپرســـی بازاڕی خســـتە بەندیخانەوە و گوتی: 'زاڵم، تۆڵەی ئەو دەســـتەت لێ دەســـێنرێتەوە.' دوایێ وەزیر فەرمانی دا ئەوان بچنە دەرێ و پیاوەکان ڕۆیشـــتن. جگە لە من و وەزیر کەس لەو دیوەدا نەما. ئینجا پێی گوتم: 'ڕۆڵە گیان، ڕاســـتیم پێ بڵێ ئەو ملوانکەیەت لە کوێ بوو.' بەسەرهاتی خۆم و کچە گەورەکە و چۆنییەتی هێنانی کچە چکۆڵەکەم هەموو بۆ گێڕاوە.

" 'کە گوێی لەو بەســـەرهاتە بوو، ســـەری داخســـت و دەســـرێکی لە گیرفانی دەرهێنا و دەســـتی کرد بە گریان. دوای ماوەیەک گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەو کچە گەورەیە کچی من بوو. لە ئامۆزایەکی خۆییم مارە کرد و ناردم بۆ میســـر. کە مێردەکەی مرد، هاتەوە ئێرە. لە

---

[۱]. ئاگا لە مەحموودی بێ زەواد نەبوون: واتە خەبەری لە هەموو شتێک.

ژنـانی میســـر فێری قەحبەیی ببوو. دوو-ســـێ جـار هـاتە لای تۆ. دوای ئەوە کچە چکۆلەکەشـــمی فریو دابوو، هێنـابووی. کە کچە چکۆلەکەمـان ون بوو، مـاوەیەک هیچ هەواڵێکمان لێی نەبوو. پاش ماوەیەک کچە گەورەکەم لە لای دایکی دانی پێدانابوو. ئەویش بە منی گوت. ئێمە دایمە دەگریاین و دەنالاین. تۆ ڕاسـت دەکەی. پێش ئەوەی تۆ بیلێی، من ئاگاداری ئەو شتە بووم. ئێستاش لە ژنێکی دیکە کچێکی لەو چکۆلەترم هەیە بە تەمام لێتی مارە کەم. پێم خۆش نییە لێم دوور کەویتەوە و دەبێ لە جێی منداڵی من بی.' منیش گوتم: 'شانازییە.' گورج کەسێکی نارد بۆ موسڵ ئەو ماڵەی کە لە بابم بۆم بە میرات گەیشتبوو، هێنای و کچەکەی لە من مارە کرد و ماڵێکی زۆریشـی دامێ، ئێسـتا من زۆر بەختەوەرم و زۆر لە خۆشی و ئاسایشدام.' نۆشدارە جوولەکەکە گوتی: 'سوڵتانی مەزن، ئەمن سەرم لە بەســـەرهاتی ئەو ســـوورِ ما. ماوەیەکی دیکە لە لای ئەو لاوە بووم، دیاری و خەلاتێکی زۆری دامێ. ئیدی من لەوێ ڕۆیشــتم و هاتمە ئێرە. ڕۆژگارێکی خۆشـــم بوو هەتا دوێنێ شەو لەگەڵ ئەو قەمووورە ئاوا پێوە بووم کە بۆم باس کردی.'

"سوڵتانی چین گوتی: 'ئەو بەسـەرهاتەش لە هی قەموور سـەیرتر نەبوو. ناچارم دەبێ هەر بتانکوژم. بە تایبەت ئەو بەرگدرووە کە تاوانی ســـەرەکی ئەو کردوویە.' ڕووی لە بەرگدرووەکە کرد و گوتی: 'ئەگەر چیرۆکێکی ســـەیروســـەمەرەتر لە چیرۆکی قەموورت گوت، ئەوە باشـــە و لە هەمووتان خۆش دەبم، ئەگەر ســـەیرتریش نەبێ، ئەوە ناچارم هەمووتان بکوژم.' ئیدی بەرگدروو کوڕنۆشـی برد و گوتی: 'ئەوەی بەسـەر من هاتووە لە هی تەواوی هاوڕێکانم سەیرترە.'

### چیرۆکی دەللاک و ئەڤیندار

" 'ئەمن پێش ئەوەی قەموور ببینم، لە ماڵی یەکێک لە بەرگدرووەکان میوان بووم. لە هەموو خاوەن پیشـەیەکی لێ بوو. کاتی فراوێن سـفرە ڕاخرا و نانیان دانا. هێشـتا کەس دەستی لە نان نەدابوو، خاوەنماڵ لاوێکی جوانچاک و ڕێکوپێک کە جلوبەرگێکی شـکۆداری لە بەردا بوو لەگەڵ خۆی هێنا ژوورێ. ئەو لاوە جێی لە جێی جوانتر و لە بەر دڵانتر بوو، بەس قاچی نەبێ دەشەلی.

" 'سڵاوی لێ کردین و ئێمەش لەبەری هەستاین. لاوەکە کە ویستی دانیشێ، چاوی بە دەللاکێک کەوت کە لەنێو خەڵکەکەدا بوو. دانەنیشت و ویستی بگەڕێتەوە. ئێمە نەمانهێشت و خاوەنماڵ سوێندی لێ خوارد دەبێ دانیشێ. پرسی: 'باشە چی بووە؟' لاوەکە گوتی: 'لێم گەڕێن و نـاڕەحەتم مەکەن. لەبەر ئەو کابرا دەللاکە دانـانیشـــم و دەگەڕێمەوە و تەواو.' خاوەنماڵ پێی ســـەیر بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو لاوە خەڵکی بەغدا ئ ئەو دەللاکە لێرە

دەبێ چیان لە نێواندا بێ؟» ئینجا لێی پرسی: «ئەوە چۆناوچۆنە لەگەڵ ئەو دەللاکە نارەحەتیت بووە؟' ئیدی دانیشتووان ڕوویان لە لاوەکە نا هەتا هۆکاری ئەو بێزارییەی لە دەللاکەکە، بگێڕێتەوە. ئەویش گوتی: 'خەڵکینە ئەو بەسەرهاتە چیرۆکێکی زۆر دووردرێژ و سەیرە. ئەو شەلینەشم هەر هی ئەو دەمە. ئێمە هەر دووکمان پێکەوە لە بەغدا بووین. وابوو ناخۆشییەک کەوتە نێوانمانەوە و من لە داخان بەغدام بە جێ هێشت و لەوێ ڕۆیشتم. سوێندیشم خوارد ئەو لە هەر شوێن و شارێک بێ من لەوێ نابم. ئێستا کە ئەو لێرەیە ئەمن دەڕۆم.' ئێمە کە ئەو قسەیەمان بیست، سوێندمان خوارد کە دەبێ بۆمان بگێڕێتەوە چی بووە. کەچی سەیرمان کرد دەللاک ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. لاوەکە گوتی: 'خەڵکینە بابی من یەکێک لە بازرگانە گەورەکانی بەغدا بوو. جگە لە من، منداڵی دیکەشی نەبوو. کە گەورە بووم، بابم مرد و ماڵ و ماڵات و کۆیلە و کەنیزێکی زۆری بۆ بەجێ هێشتم. من هەر ڕۆژەی جلوبەرگێکم لە بەر دەکرد و خواردنی خۆشم دەخوارد و خەریکی خۆشی و ڕابواردنی خۆم بووم. بەڵام ژنان نەدەهاتنە دڵمەوە و هۆگریان نەبووم. هەتا ئەوەی ڕۆژێک لە بەغدا بە کۆڵانێکدا دەڕۆیشتم. دەستەیەک سەرخۆش و بەڕەڵا و شەڕفرۆش ڕێیان پێ گرتم. ئیدی منیش هەڵاتمە کوێرە کۆڵانێکەوە و لەو سەری کۆڵانەکەوە چوومە حەوشەی ماڵێکەوە و لە پەنایەکدا خۆم مەڵاس دا. ماوەیەک بوو دانیشتبووم. لە یەکێک لە دیوەکانی ماڵەکەوە کچێکی چاوکەژاڵ و ڕووگەش کە تا ئێستا قەت دڵڕفێنی ئاوام نەدیبوو، هاتە بەر پەنجەرە و چاوێکی لەملا و لەولا کرد و ڕۆیشتەوە ژوورێ و پەنجەرەکەی پێوە دا. ئیدی ئاوری لە من بەردا و ئارامیی لێ هەڵگرتم. خۆشەویستی ژنانیش هاتە دڵمەوە و هۆگریان بووم. هەتا تاریکان هەر لەوێ مامەوە. سەیرم کرد ئەوە قازی شار دێ و پیاو و کۆیلەکانی ئەمبەر و ئەوبەریان گرتووە و بەرەو لای من دێ. کە گەیشتنێ، لە بەردەرگای ئەو ماڵە دابەزین کە کیژەکەی تێدا بوو. پاشان چووە ژوورێ. گوتم: 'بە خودا ئەو کچە ڕووپاکە کچی قازییە.' ئیدی مات و مەلوول هاتمەوە ماڵی خۆمان و لە جێیەدا کەوتم. کەنیزەکان تێم ئاڵان و نەیاندەزانی لەبەر چی نارەحەتم. منیش ڕاستییەکەم پێ نەگوتن و هەرچی پرسیاریان کرد، وەڵامم نەدانەوە. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ نەخۆشییەکەم لێ پیستر دەبوو. خەڵک دەهاتنە دیمانەم. ڕۆژێک پیرێژنێک هاتە سەردانم. خەممی بوو و لەپشت سەرم دانیشت. لاواندمییەوە و گوتی: 'پێم بڵێ چی بووە؟' منیش شتەکەم بۆ گێڕاوە. گوتی: 'ئەو کچەی تۆ دیوتە، کچی قازی بەغدایە. ئەو دیوەی تۆ دیوتە، دیوی کچەکەیە. من زۆر ڕۆژ دەچم بۆ لای ئەو کچە. تۆ ئەو کیژەت لە من نەبێ لە کەست نەوێ.'

" ' 'بە بیستنی ئەو قسەیە تین و گوڕم هاتەوە بەر و، بووژامەوە. دەوروبەرەکەم خۆشحاڵ بوون. پیرێژنە ڕۆیشت. بۆ بەیانی هەستام، هێندە بێهێز نەبووم و بەرەو

چابوونەوە و هەســتانەوە بووم. کە پیرێژنە هات، ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، گوتی: 'ڕۆڵە گیان، مەپرسـە ئەو کچەتیوە چ دەردێکی دامێ. کاتێک پێم گوت، هەڵچوو و پێم هەڵشـاخا و گوتی: 'پیرێژنی گڵاو، دەزانی دەڵێی چی؟ ئەو قســـانە چییە؟' کە زانیم ئەوەندە تووڕەیە، گەڕامەوە. ناچارم جارێکی دیکە بچمەوە لای.'

" ' 'کە ئەو قسەیەم لە پیرێژنە بیست، نەخۆش کەوتمەوە و هەتا چەند ڕۆژ وەک مردوو کەوتبووم و چاوەڕێی پیرێژنەکە بووم. هەتا دیســـان پیرێژنەکە هاتەوە و گوتی: 'کوڕی خۆم مزگێنیم دەیە، هەواڵێکی خۆشم پێیە.' گوتم: 'هەرچی بڵێی لەسەر چاومی دادەنێم. پێم بڵێ چی بوو؟' گوتی: 'دوێنێ چووم بۆ لای کچە، کە منی بە نارەحەتی و گریانەوە دیت، گوتی: 'دایە، ئەوە چۆنە ئاوا مات و پەشێوی؟' کە ئاوای گوت، دەستم کردە گریان و گوتم: 'خانمەکەم، چەند ڕۆژ لەمەو پێش پەیامی کوڕێکم پێ گەیاندی، گوتم ئەو تۆی خۆش دەوێ و ئەوە لە تاوت خەریکە بمرێ. تۆش خۆت لێ قەڵس کردم. ئێستا ئەو کوڕە چەند ڕۆژە لە جێدا کەوتووە و لە تاوی خەریکە گیانم دەردەچێ.' کچە کە ئەوەی بیســـت، بەزەیی پێدا هاتەوە و ســۆزی بۆت بزووت، پرســی: 'ئەو گەنجە لە کوێیە؟' گوتم کوڕی منە. ماوەیەک لەمەو پێش تۆی لە پەنجەرەوە دیوە. عاشقی تۆ بووە و خۆشەویستی تۆی چووەتە دڵەوە. لە تاوت نەخۆش کەوتووە. ئەو ڕۆژەش کە ئاوا تووڕە بووی، چووم بۆم گێڕاوە، ئیدی نەخۆشییەکەی ئەوەندەی دی زیادی کردووە و ئێستا ئەوە دەمرێ.' کەنیشکەکە کە ئەوەی بیســـت، ڕەنگی تێک چوو، گوتی: 'یانی ئەوە لە تاوی من ئاوای لێ هاتووە؟' گوتم: 'بەڵێ.' گوتی: 'بچۆ بۆ لای ئەو کوڕە و ســـڵاوی منی پێ بگەیێنە و پێشـــی بڵێ ڕۆژی هەینی ماوەیەک پێش نوێژ بێتە ئێرە. ئەوە ئەمن ڕادەسپێرم دەرگای لێ هەڵگرن و بێتە ژووڕێ با ماوەیەک پێکەوە دانیشین.'

" ' 'کە ئەو هەواڵە خۆشــەم بیست، نەخۆشی و بێهێزی وا لێم دوور کەوتەوە دەتگوت قەت نەخۆشـــیش نەبووم. ئیدی پیرێژنەکەم خەڵات کرد و ئەندامان و دەوروبەرەکەمم بە خۆشی منەوە شادییان گرت، هەتا ڕۆژی هەینی هەر بە شادی و خۆشی ڕامانبوارد.

پیرێژن وە دەر کەوت. دیسـان لە نەخۆشـییەکەمی پرسـی. ئەمن گوتم شـکوور باشـم. هەســـتام جلوبەرگی گرانبای و ڕێکوپێکم لەبەر کرد و چاوەڕێی کاتی دیاریکراو بووم. پیرێژن گوتی: 'هەستە برۆ بۆ گەرماو سـەرت بتاشـە و با ئەو بێهێزی و نەخۆشـییەت لە لەشـدا نەمێنێ.' گوتم: 'قســـەیەکی جوانە، بەڵام لەپێشــدا ســـەرم دەتاشـم، دوایی دەچمە گەرماو.'

" ' 'ئیدی بە خزمەتکارەکەم گوت: 'دەللاکێکی ژیر و کەمقســـەم بۆ بێنە با بە زۆربڵێی بێزارم نەکا.' خزمەتکارە ڕۆیشـــت و ئەو دەللاکەی بۆ هێنام. کە هات ســـڵاوی کرد.

سڵاوەکەم ئەستاندەوە. گوتی: 'خودای تاک و بێ هاوتا و زانا خەم و دەرد و پەژارەت لێ دوور خاتەوە.' گوتم: 'خودا لە زارت بڕوانێ.' دوای ئەوە گوتی: 'سپاس بۆ خودا کە تۆی لە نەخۆشی ڕزگار کرد. ئێستا پێم بڵێ بە تەمای سەرت بتاشی یان کەڵەشاخ بگری کە لە ئیبنی عەباس دەگێڕنەوە: 'هەر کەس ڕۆژی هەینی مووی لەشی کورت کاتەوە، خودا حەفتا دەرد و نەخۆشی لێ دوور دەخاتەوە.'[1] دیسان هەر لەو دەگێڕنەوە: 'هەرکەس ڕۆژی هەینی کەڵەشاخ بگرێ، قەت سۆمای چاوی کەم نابێتەوە.'[2] گوتم: 'قسەی زیادی مەکە، زوو هەستە سەرم بۆ بتاشە.' هەستا بوخچەیەکی لە هەمبانەکەی دەرهێنا. بوخچەکەی کردەوە. ئوستۆرلابێکی[3] دەرهێنا و حەوت لەوحی ئوستۆرلابی بە دەستەوە گرت و لە هەر چوار لایماڵەکە ڕوو بە ڕۆژ ڕاوەستا. ماوەیەکی باش لە ئاسمانی ڕوانی و گوتی: 'سەروەرم، بزانە ئەوڕۆ ڕۆژی هەینییە. دەی مانگی سەفەری ساڵی ٤٦٣ی کۆچییە. 'جوانترین درووود و سڵاو بۆ کۆچکەرەکەی'[4] و بەختەکەی هەر وەک لە زانستژمێر بۆم دەرکەوتووە. ئەستێرەی بارامە کە حەوت پلە و شەش خولەک ڕەد بووە و دەکەوێتە ڕێکی ئەستێرەی زاوە[5]. تەواوی ئەوانە دیاردەی ئەوەن کە سەرتاشین کارێکی بە فەڕ و پیرۆزە، هەروەها باس لەوەش دەکەن کە دەتهەوێ لەگەڵ کەسێکی گەورەدا بەختەوەر بن. چۆنیەتییەکەییت پێ ناڵێم.' گوتم: 'بە ڕاستی جاڕزت کردم و مێشکمت خوارد. ئەمن جگە لە سەرتاشین هیچ کارێکی دیکەم لێت نەویستووە. هەستە سەرم بۆ بتاشە و لە سەری مەڕۆ.' گوتی: 'بە خودا ئەگەر تۆ بزانی من دەڵێم چی، شتەکەت بۆ ڕوون بێتەوە، گوێم لێ ڕادەگری و چۆنی بڵێم وا دەکەی. بەرژەوەندی تۆش لەوەدایە سپاسی خودا بکەی و دژایەتی من نەکەی، چونکە من چاکەی تۆم دەوێ و ئامۆژگاریت دەکەم و ساڵێکی تەواویش هیچ مووچەم لێت ناوێ.' کە ئەو قسانەم بیست گوتم: 'ئەوڕۆ ڕزگام نابێ بە دەستەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. من قصر شعره یوم الجمعه صرف الله عنه سبعین داء.

[2]. من احتجم یوم الجمعه لایأمن ذهاب البصر.

[3]. ئوستورلاب: شتێکە ئەستێرەناس و شت چاوی پێ لە ئاسمان و ئەستێرە دەکەن.

[4]. علی هاجرها افضل الصلوات و التحیة.

[5]. زاوە: ئەستێرەی عەتارد.

# كە شەوی بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'لاوەکە گوتی: 'من پێم گوت تۆ ئاخری دەمکوژی بەو هەمووە قسـەیە.' دەللاک گوتی: 'گەورەم، من هێندە کەمقسـەم کە خەڵک پێم دەڵێن: نەدوێن. براکانی دیکەم هەریەکەی شـتێکیان پێ دەڵێن. بە برا گەورەکەم دەڵێن: 'بەقبووق،' بە برای دووەمم دەڵێن: 'هەدار،' بە برای سـێیەمم دەڵێن: 'بلقەبلق'، بە چوارەمم 'هاتەرانپاتەران بێژ' و بە پێنجەمم دەڵێن: 'دەدە' و شـەشـەمم دەڵێن: 'شـەقلیپەقلی' و حەوتەمین براش کە بۆخۆمم، پێم دەڵێن: 'نەدوێن.'

" ' 'کـاتێـک دەللاک هەر بێ دەنـگ نەبوو، هەسـتم کرد خەریکە دیق بکەم. بە خزمەتکارەکەم گوت: 'چارەکە دینارێکی دەیە با بڕوا. نامەوێ سەرم بتاشم.'

" ' 'دەللاک گوتی: 'گەورەم، ئەوە دەڵێی چی؟ شـتی وا چۆن دەبێ؟ ئەمن چۆن بەبێ ئەوەی کارێک بکەم، پارە وەردەگرم؟ خزمەتی تۆ فەرزە بۆ من. ئەگەر هیچ پاداشـتێکیش وەرنەگرم قەی ناکا. تۆش ئەگەر ڕێزی من نەگری، من دەزانم تۆ کێی و قەدرت دەگرم. بابت، ڕەحمەتی خودای لێ بێ، زۆری چاکە لەگەڵ من کردووە. پیاوێکی زۆر دەسـت و دڵکراوە بوو. ڕۆژێکیـان ناردی لە دوام. چووم بۆ لای. کۆمەڵێکی لە لا بوو. پێی گوتم: 'کەڵەشـاخێکم بگرە.' ئوسـتورلابم دەرهێنا و بەرزایی خۆرم گرت. سـەیرم کرد کاتێکی بەدفەڕە و کەڵەشاخ گرتن باش نییە. پێم ڕاگەیاند. قسـەکەمی قەبووڵ کرد و سپاسیشی کردم. ڕاوەستا هەتا کاتێکی بەفەڕ هات و دژایەتیمی نەکرد. ئەو کۆمەڵەش دەستخۆشییان لێ کردم. بابت بە ڕەحمەت بێ بۆ کەڵەشاخگرتنێک سەد دیناری دامێ.'

" ' 'گوتم: 'خودا لێی خۆش نەبێ وا ئاشنای وەک تۆی هەبوو.' دەللاک پێکەنی و گوتی: 'سوبحانەڵڵا، من تۆم زۆر پێ ژیر بوو. وا دیارە نەخۆشی، ئاوەزی لە کەللەتدا نەهێشتووە. نازانم تۆ بۆ بە پەلەی؟ خۆ بۆخۆت دەزانی بابت بەبێ پرس و ڕاوێژی من هیچ کارێکی نەدەکرد، قەدیمیـان گوتوویـانە: 'ڕاوێژپێکراو جێی بـاوەڕە.'[1] لە من زانـا و وریـا و باوەڕپێکراوترت وەگیر ناکەوێ. بۆخۆم پێم سـەیرە من ڕاوەسـتاوم خزمەتت دەکەم و ناڕەحەتیش نابم، کەچی تۆ لێم تووڕە دەبی. بەڵام من دڵم لێت نایەشـێ، چونکە باوکت چاکەی زۆری لەگەڵ کردووم.' گوتم: 'بە خودا تۆ زۆرت ناڕەحەت کردم، چونکە لە خۆڕا زۆر درێژدادڕی دەکەی، ئەوە لە کاتێکدا من هەر ویستم سەرم بتاشی و بڕۆی.'

" ' 'ئیدی قەڵس بووم و ویسـتم هەسـتم و سـەریشـم نەتاشـم. گوتی: 'تازە زانیم لێم

---

[1]. المستشار مؤتمن.

نارەحەتی و دڵت ئێشــاوە. قەیناکا، چونکە دەزانم تۆ گەوجی و هێشــتا منداڵی. لەمێژ نییە تۆم لە باوەش دەکرد و دەمبردی بۆ قوتابخانە.' ئیدی ســوێندم دا و گوتم: 'تۆ ئەو خودایە لێم گەڕێ با وە دوای کاری خۆم کەوم.' لە داخان جلەکانی بەرم دادڕی. کە ئاوای دی، دەســتی دا گوێزانەکەی و بە هەســانەکەیدا هێنا، خەریک بوو گیانم دەرچێ. ئەو جار هاتە پێشــێ و کەمێکی لە ســەرم تاشــی. ئێنجا دەســتی ڕاگرت و گوتی: 'گەورەم، پەلە کاری شەیتانە'. پەلە مەکە کە ڕۆژگار جارێ زۆری بە بەرەوە ماوە.'

" ' 'دوای ئەوە گوتی: 'گەورەم، پێم وایە نازانی پلەوپایەی من چەندە! من شــایانی هاونشینی لەگەڵ پاشا و میر و وەزیر و مەلایانم. شاعیر لە پەسنی مندا دەڵێ:

پــیشــەکەی مــن کــاری کەم کەســانە
پــێــت وا نەبــێ کــارێــکــی ئــاســانە
کە مــن تــیــغ دێــنــم بەســەر ســەرێــکدا
ســەری گەورێــکە لە بەر دەســتــمــدا

" ' 'گوتم: 'بەسە قسەی قۆڕ مەکە، ئەمڕۆ شێتت کردم.' گوتی: 'هەر دەڵێی بە پەلەی.' گوتم: 'ئەرێ، ئەرێ، ئەرێ.' گوتی: 'لەســەرخۆ بە، پەلە کاری شــەیتانە و پەشــیمانی بەدواوەیە. پێغەمبەر ســڵاوی لێ بێ فەرموویەتی: 'باشــترین کار ئەو کارەیە بە هێمنی بکرێ.'١ بە خودا من ســەرم لەو هەموو پەلە پەلەیەی تۆ ســووڕ ماوە. دەبێ هۆی ئەو پەلەیەم پێ بڵێی، هاتوو بۆ تۆ باش نەبێ. هێشــتا ســێ ســەعاتی تەواوی ماوە بۆ نوێژ.' تووڕە بوو، گوێزانی فڕێ دا و دەســتی دا ئوســتورلابەکەی و ڕوو بە ڕۆژ ڕاوەســتا. ماوەیەکی چاو لێ کرد و گوتی: 'سێ سەعاتی تەواوی ماوە بۆ نوێژ.' تکام لێ کرد بێدەنگ بێ. دیســان دەســتی دا گوێزانەکە و وەک جاری یەکەم کەمێکی بە هەســانەکەدا هێنا و بە قســەکردنەوە هاتە پێشــێ، کەمێکی دیکەی لە ســەرم تاشــی و گوتی: 'من لەو پەلەیەی تۆ نیگەرانم، بە قازانجی خۆتە من لەو کارەت ئاگادار کردباوە. بابیشــت منی لە کارەکانی ئاگادار دەکردەوە.'

" ' 'ئەمن کە زانیم تازە ڕزگارم نابێ لە دەستی، لە دڵی خۆمدا گوتم: 'کاتی نوێژ نیزیک بووەتەوە، ئەگەر پێش هاتنەدەری خەڵکەکە خۆم نەگەیەنمە ئەوێ، تازە دواینیوەڕۆ ڕێی چوونە ماڵی خۆشەویستەکەم نابێ. ئیدی لە بەری پاڕامەوە و گوتم: 'بیکە بۆ خاتری خودا بێدەنگ بە و تەواوی کە. لە ماڵی هاوڕێیەکم بانگهێشت کراوم.'

" ' 'کە باســی میوانی هاتە گۆڕ، گوتی: 'باش بوو باســت کرد، ئەوە من کۆمەڵێک لە

---

١. خیر الامور ما کان فیه تأن.

هاوڕێکانم بانگهێشـــت کردووه، تازه بیرم کەوتەوه که هیچیشـــم بۆ ئەو میوانییه ســـاز نەکردووه. خەجاڵەتیان دەبم.' گوتم: 'خەمی ئەوەت نەبێ، من بۆخۆم میوانم، له ماڵی ئێمه هەر شتێکیان ساز کردبێ، دەتدەمێ بیبەوه بۆ میوانەکانت. تۆ زوو کارەکەی من ڕاپەڕێنه.' گوتی: 'خودا پاداشـــت داتەوه؛ چیتان بۆ میوانەکانی من ســـاز کردووه؟' گوتم: 'پێنج دەفر خواردنه، دە جووجەی سوورکراوه و کاوڕی برژاومان هەیه.' گوتی: 'بلێ ئامادەی کەن، با بچم به چاوی خۆم ببینم.' گوتم: 'هەموویان ســـاز کردووه، دڵت تۆقێ.' گوتی: 'بادەشـــم دەوێ.' گوتم: 'بادەشـــیان هێناوه.' گوتی: 'گەورەم، جگه له عوود هیچ نەماوه.' فەرمانم دا، مجرییەکیان١ هێنا که عوود و عەنبەر و میســـکی تێدا بوو و بای پەنجا دینار بوون. ئەو جار گوێزانەکەی دانا و دانەدانه عوود و عەنبەر و میســـکەکانی له مجرییەکه دەرهێنان و ئەوبەرەوبەری کردن. چاو لێ کردن و لەوێی خســـتنەوه. ئیدی من تەواو له ژیان بێزار ببووم، هەر ئەوەنده بوو شـــێت نەدەبووم. گوتم: 'بیکه بۆ خاتری پێغەمبەر! وەره ســـەرم بتاشـه و تەواوی که.' ئیدی هات کەمێکی دیکەی تاشـی و پشـتی ڕاسـت کردەوه و گوتی: 'نازانم سپاسی چاکییەکانی تۆ بکەم یان هی باوکت، چونکه من ئەمڕۆ له سایەی گەورەیی تووه له ئاســـت میوانەکانم ســـەربڵندم و میوانەکانیشـــم خۆشـــحاڵ دەبن. ئەگەر دەتەوێ میوانەکانم بناســـی: زەیتوون گەرماوی و ســـەلیع تونتاب و عەوکەلی ســـەوزیفرۆش و عێکرێشـــەی دووکاندار و حەمید زەبال و عەکارۆشـــی کورتاندروون. ئەوانه هەریەکەی به جۆرێک بەندبێژن و ســـەما دەکەن. پێم خۆش نییه زۆری له ســـەر بڕۆم و باســـی لێهاتووییەکانیان بکەم، بەلام هەر نەختێکیان باس دەکەم. گەرماوی پیاوێکی وێژەوانه. ئەو شـــێعرەشـــی خوێندەوه: 'ئەگەر نەچمه لای ئەو کیژه، ئەو دێته ماڵی ئێمه.'٢ بەلام زەبال پیاوێکی لەســـەرخۆ و ئارامه، ســـەما دەکا و دەڵێ: ' ئەو نانەی له لای خێزانم هەیه له سندووقدا نییه.'٣

" ' ' 'هەر کام له هاوڕێکانم تایبەتمەندییەکی جوانیان هەیه که لەوانی دیکەدا نییه. ئەگەر تۆ بێی بۆ لای هـاوڕێکـانی من و نەچی بۆ لای هـاوڕێکـانی خۆت، زۆر خۆشـــترت بۆ دەگوزەرێ. تۆ تازه له نەخۆشـــی هەســـتاوییەوه و دەترســـم لەنێو هاوڕێکانتدا دەنکێکی زۆربلێیان تێدا بێ و مێشـــکی ســـەرت بەرێ. ئەوەندەی دی نارەحەتت کا. وا چاکه بێی بۆ لای ئێمه و ئەو کۆڕەی ئێمه به دەرفەت بزانی و کەڵک له قســـه و بەزم و خۆشـــی ئێمه وەرگری. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

هەر خۆشـــییەکـت بۆ هـاتە پێش، به دەرفەتی بزانه

---

١. مجری: سندووقی زۆر چکۆله.

٢. ان لم اذهب الیها تجئني [الی] بیتي.

٣. الخبز عند زوجتي ما صار في صندوق.

" ' 'من هێندەم ڕق هەســـتابوو لە داخان پێکەنیم و گوتم: 'تۆ زوو کارەکەی من تەواو کە بـا بڕۆم، ئەتۆش بڕۆ بە لای میوانەکـانتەوە چـاوەڕێتن.' گوتی: 'من دەڵێم تۆ لەگەڵ هاوڕێکانی من ئاشـــنا بی، چونکە دەزانم جارێکیان ببینی، ئیتر ناتوانی لێیان جیا ببیەوە.' گوتم: 'جێی خۆیەتی، جارێک هاوڕێکانی تۆش بانگهێشت دەکەم. بەڵام ئەمڕۆ دەچم بۆ لای هاوڕێکانی خۆم.' گوتی: 'باشە، ئێستا کە تۆ هەر نایەی، ڕاوەستە من ئەو خواردن و شتەی تۆ گەورەییت کردووە و پێت بەخشـــیوم، بەرمەوە بۆ ماڵی خۆمان با میوانەکانم چاوەڕێ نەبن و نـانەکەیـان بخۆن. بۆخۆم دێمەوە و بۆ هەر کوێ بچی لەگەڵـت دێم.' گوتم: 'تۆ بچووەوە لای میوانەکانت و خەریکی قســـە و باســـی خۆتان بن. لە منیش گەڕێ، دەچم بۆ لای میوانەکانی خۆم.' گوتی: 'من ناهێڵم تۆ بە تەنیا بچی، تۆ لە هەموو جێیەک پێویســـتیت بە ڕاوێژکارێکی زانا دەبێ و کەسـیشـــت لە من زانا و دڵســـۆزتر دەســـت ناکەوێ.' گوتم: 'دەچمە جێگایەک کە بۆ ئەوە نـابێ کەســـی دیکە لەگەڵ خۆم بەرم.' گوتی: 'پێم وا نییە قەرارت لەگەڵ ژن و شـــت دانابێ، دەنا بۆ شـــوێنێکی ئاوا من لە هەموو کەس باشـــترم، هەڵبەت لەوە دەترسـم بچییە لای ژنێک و شـوێنەکە باش نەبێ و مەترسـی کوشـتنی تۆ لە گۆڕێدا بێ. ئێرە شاری بەغدایە و زۆری لەو فڕوفێڵانە لە بن سەر دایە. لەو شارەدا هەموو کەس هەموو کارێکی پێ ناکرێ.' گوتم: 'ئەرێ شـێخی بەدفەڕ، ئەو قسـانە چییە دەیانکەی؟' ئیدی کە زانی زۆر نارەحەتم، ماوەیەک بێدەنگ بوو هەتا سەرم تەواو بوو.

" ' 'ئەو جـار گوتم: 'ئەو خواردنـانەت هەڵگرە و بڕۆوە بۆ لای هـاوڕێکـانت. من لێرە دادەنیشـم چاوەڕێی تۆ دەبم هەتا دەگەڕێیەوە و پێکەوە دەچین بۆ شـوێنی دیدارەکەمان.' گوتی: 'ئەوە تۆ دەتەوێ من فریو دەی و بۆخۆت بچی بۆ ئەو شـــوێنە و خوت بە هیلاک دەیت.' ئیدی ســـوێندی دام کە لە جێگەی خۆم نەبزووم هەتا دێتەوە و پێکەوە بچین و ئاگاداری ئاکامی کارەکەم بێ. گوتم: 'باشە، ئەوە دادەنیشم، بەڵام زۆرت پێ نەچێ.'

" ' 'خواردەمەنی و شەراب و عوود و شتەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. شتەکانی دابوو بە کوڵکێشـــێک و ناردبوونییەوە بۆ مـاڵێ و بۆخۆی بە دزییەوە خۆی مـات دابوو. کە ئەو ڕۆیشت، منیش بە تەنیا چووم بۆ ماڵی قازی.

" ' 'دەلالاک بە دوای منەوە ببوو. منیش ئـاگـام لێی نەبووە و پێم نەزانیوە. کە دیتم دەرکی ماڵی قازی کراوەیە، یەکڕاســـت چوومە ژوورێ. لەو کاتەشـدا قازی کە لە مزگەوت دەگەڕێتەوە، دێتە ژوورێ و دەرگاکە دادەخا. ئەو دەلالاکە گەوادەش لە حەوشـــە دەبێ و خۆی مەڵاس دەدا.

" ' 'بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە یەکێک لە کەنیزەکانی قازی کارێکی ناڕەوای لێ بەسەر دێ و قازی بیرازی دەکا.١ کە کەنیزەکە هاتوهاواری لێ هەڵدەستێ و دەگری و دەپاڕێتەوە. دەللاکیش پێی وا دەبێ، ئەوە لە من دەدەن و هاوارهاواری منە. ئیدی لە حەشارگە دێتە دەرێ دەست دەکا بە هاتوهاوار و قیژەقیژ و لەخۆدان. جلەکانی بەری دادەدڕێ و دەچێتە بەر دەرگا و داوای یارمەتی دەکا. خەڵکی گەڕەک تێدەگەیێنێ. پاشان هەڵدێتەوە، ماڵی ئێمەش ئاگادار دەکاتەوە. بەو جۆرە کۆیلە و کەنیزەکانی خۆم و دەرودراوسێ بە دوای خۆیدا دێنێ بۆ ماڵی قازی. ئەو هەموو خەڵکە و خەڵکی گەڕەکی خۆیان لە بەردەرکی ماڵی قازی کۆ دەکاتەوە و هاوار دەکا: 'ئەی هاوار فریا کەون ئاغاکەیان کوشتم.' قازی بە شڵەژاوی هاتە دەرێ و کاتێک ئەو خەڵکەی دی پۆلپۆل لە دەرکی ئەوان ڕاوەستاون. پرسی: 'ئەوە چی بووە؟' کۆیلەکانی من گوتیان: 'تۆ گەورەی ئێمەت کوشتووە؟' قازی پرسی: 'گەورەی ئێوە کێیە؟ بە چ تاوانێک دەبێ کوشتبێتم؟' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

. بیراز کردن: تەمبێ کردن.

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ' 'قازی بە کۆیلەکانی گوت: 'بە چ تاوانێک دەبێ کوشـــتبێتم؟ ئەو دەللاکە بۆ ئاوا دەکا؟ بۆ جلەکانی خۆی دادڕیوە؟ چ بووە پێم بڵێن؟'

" ' 'دەللاک گوتی: 'تۆ خەریک بووی بە قامچی لە ئاغاکەمت دەدا، گوێم لە هاوارهاواری بوو.' قازی گوتی: 'باشە چی کردووە؟ و کێ هێناوییەتە ماڵی من؟ و لەوێ چ دەکا؟' دەللاک گوتی: 'دەتەوێ بە درێژکردنەوەی باسەکە خۆت لە خوێنی ئەو بدزییەوە! من هەموو شتێک باش دەزانم، ئەو دڵی بە کچەکەی تۆوەیە و کچەی تۆش ئەوی خۆش دەوێ. کە ئەو هاتە ماڵەکەی تۆوە، بە کۆیلەکانت گوت، لێی دەن. ئێســـتا یان دەبێ خەلیفە ببێتە قازی لە نێوانماندا یان ئەوە بۆخۆت گەورەکەی ئێمە بێنە دەرێ و ئازادی کە. دەنا ئێمە دەڕژێینە ماڵەکەت و دەیهێنینە دەرێ.'

" ' 'قازی لە لای خەڵکەکە تریق بووەوە و بە دەللاکەکەی گوت: 'ئەگەر تۆ ڕاســـت دەکەی، وەرە بچۆ ژووری و بیهێنە دەرێ.' من ڕێم نەبوو هەڵێم. ناچار یەغدانێک لەوێ بوو، چوومە یەغدانەکەوە و خۆم شاردەوە. دەللاک ڕووی لە هیچ کوێ نەکرد ڕاست هاتە دیوەکەی منی لێ بووم. کە هاتە ژووری چاوێکی لە ڕاســـت و چەپی خۆی کرد جگە لە یەغدانێک هیچی دیکەی لێ نەبوو. لە ڕێوە دەســتی دا یەغدانەکە و لەســەر شـانی دانا. من ڕووحم دەرچوو. ناچار دەرکی یەغدانەکەم هەڵگرت و خۆم فڕێدا خوارێ و لاقم لە جێ چوو. بە شەلەشەل هەڵاتم.

" ' 'کە گەیشـــتمە بەردەرگا، پۆلپۆل خەڵک لەوێ ڕاوەســـتابوون. من لە ترســـان و لە شـــەرمان نەمدەزانی چ بکەم. مســـتێکم زێڕ لە گیرفانم دەرهێنا و بە نێو خەڵکەکەدا بڵاوم کردەوە و هەڵاتم. ئەوانم ســـەرقاڵ کرد و بۆخۆم بە کۆڵان و شـــەقامی بەغدادا هەڵاتم. دەشـــچوومە هەر کوێیەک، ئەو دەللاکە لەوێ بوو و هاواری دەکرد: 'ئەی هاوار! بە تەما بوون گەورەکەم بکوژن. سپاس بۆ خودا بە سەریاندا زاڵ بووم و گەورەکەمم لە دەستیان ڕزگار کرد.' بە منیشی دەگوت: 'گەورەم، چاکیش هەڵاتی. ئەو پەندانەی بەسەرت هاتن، هی بێبەرنامەیی خۆت بوو. ئەگەر خودای نەکردە منت لەگەڵ نەبایەم و لەو دۆخە ڕزگارم نەکردبای، ئەگەری زۆر بوو قوتار نەبای و هەر وا بە ئاســـانی تێدا چووبای. لە خودا بپاڕێوە هەمیشە منت بۆ ڕاوەستاو کات. هەتا هەمیشە لە جەنگەی ئاوادا فریات کەوم. ئەو کارە قۆڕانەی تۆ منیان کوشـــتووە. تۆ دەتەویســـت بە تەنیا بچی. بەڵام قەیناکا، هیچت پێ ناڵێم و لێت خۆش دەبم. چونکە هەرزەکاری و ئەزموونت نییە و گەوجی.' پێم گوت: 'ئەو دەردەی بەســەر منت هێنا بۆ حەوت پشــتم بەســمە، ئێســتا بۆ وە دوام کەوتووی؟' هیچی

نەگوت، بەڵام لە هەموو کوڵان و گەڕەکێک بەدوامەوە بوو.

" ' 'کە زانیم لە کۆڵم نابێتەوە، پەنام بردە بەر خاوەنی دووکانێک. خاوەنی دووکانەکە ـەنگی دا و لێی تووڕە بوو. دەری کرد. لە کونجێکی دووکـانەکە مـات دانیشــتبووم و ـەمگوت ئەو دەڵلاکە لە کۆڵم نابێتەوە و دەستم لێ هەڵناگرێ. ناچار لەڕێوە هەستام چووم شــــایەدم کۆ کردەوە و وەســـیيەتم نووســـــی و ئەو ماڵەی هەمبوو، ئەوەی بەشـــی ـەوروبەرەکەم بوو ئەوە دامنێ، چکۆڵەکانم بە گەورەکان ســــپارد. ئەوەی دیکە لە ماڵ و زەوی و زار و باخ و هەرچی هەمبوو فرۆشــتنم. لە بەغدا وە دەر کەوتم تا لە دەســت ئەو جاکەشــە ڕزگارم بێ. بەپێنێکە لێرەم. خەریک بوو تۆزێک مێشــکم دەحەســاوە، کەچی ئەوە ئەمرۆ هاتمە ئێرە سـەیرم کرد ئەو ناحاڵییە لە لای ســەرەوە دانیشــتووە. ئیدی ناتوانم لێرە ـانیشـم. دڵم ناحەسـێتەوە، لاقی منی شـکاندووە و بیرەوەری خۆشـم لێی نییە و بە دیتنی ـارەحەت دەبم.'

" 'کە ئەو لاوە قســەکانی تەواو بوو، ڕۆیشــت. ئیدی ئێمە لە دەڵلاکەکەمان پرســی: 'ئەو گەنجە ڕاســــتی دەکرد یان درۆ؟' دەڵلاک گوتی: 'من ئەو هەموو چاکەیەم لەگەڵ ئەو کرد، کەچی ئەو پێی نـازانێ. ئەگەر من نەبـایەم، ئەو تێدا دەچوو. جگە لە منیش کەس ئەوی ـزگار نەکرد. هەزار جار شـوکری خودا وا هەر بە قاچشـکان ڕزگاری بوو و نەیانکوشـت. ئەگەر من خۆهەڵقوتێن بام، چاکەی ئاوام لەگەڵ ئەو نەدەکرد. ئێستا شتێکتان بۆ دەگێڕمەوە بۆ ئەوەی بزانن کە من زۆربڵێ و خۆهەڵقوتێن نیم. براکـانی من زۆربڵێن. بـا چیرۆکی شێخی نەدوێن و براکانیتان بۆ بگێڕمەوە، ئەو دەم دەزانن.

### شێخی نەدوێن و براکانی

" ' 'لە دەورەی خیلافەتی مونتەسیربیللا لە بەغدا بووم. خەلیفە فەقیر و هەژارانی خۆش ـەویســــت، لەگەڵ زانایان و پیاوچاکان دەژیا. بە ڕێکەوت ڕۆژێک ڕقی لە دە کەس لە ـانیشــتووانی بەغدا هەســتا و بە والی بەغدای گوت: 'ســـواری بەلەمێکیان کە. ئەمن کە لە ڕێگادا تووشــــیان بووم، گوتم: 'بە خودا ئەوانە لە خۆڕا کۆ نەبوونەوە، دیارە بە تەمای میوانییەکن، لەوێ خەریکی عەیش و نۆش و خۆشــــگوزەرانی بن. وا چاکە لەگەڵیان ببم بە هاوڕێ.' ئەمنیش لەگەڵ ئەوان سواری بەلەمەکە بووم. پیاوەکانی والی کۆت و زنجیریان لە ملی ئەوان کرد و پاشــــان لە ملی منیشــــیان کرد. ئەمن هیچم نەگوت، لەبەر جوامێری و کەمقسەیم نەمویست هیچ بڵێم.

" ' 'ئیدی هەموومانیان بردە لای خەلیفە. خەلیفە فەرمانی کوشــتنی ئەو دە کەســەی دا. بکوژ هەر دەیانی کوشت. خەلیفە کە منی دیت، بە بکوژی گوت: 'بۆ هەموویانت نەکوشت؟'

بکوژ گوتی: 'هەر دەیانم کوشــــت.' خەلیفە فەرمانی دا کوژراوەکان بژمێرن، بژاردیان دە کەس بوون. ئەو جار ڕووی لە من کرد و گوتی: 'ئەوە بۆ هیچت نەگوت؟ و چۆنە لەگەڵ تاوانبارانذای؟' گوتم: 'خەلیفە، من شێخی نەدوێنم و ژیری و بێدەنگییەکەم دەنگی داوەتەوە. پیشـــەی من دەللاکییە. دوێنێ بەیانی کە ئەو دە کەســـەم دی ســـواری بەلەم ببوون. پێم وا بوو بۆ میوانی دەچن. لەگەڵیان ســـوار بووم. ماوەیەکی پێ چوو، دیتم ئەوان تاوانبارن. کە فەرمانبەرەکە زنجیری لە ملیان کرد، لە ملی منیشـــی کرد. پێم جوان نەبوو هیچ بڵێم. هەتا هێنایانین بۆ ئێرە و خەلیفە فەرمانی کوشـتنی دە کەسـی دا. من لە بەر دەمی شـمشـیردا بووم خۆم پێشــــانی خەلیفە دا. خەلیفە ئەوە کارێکی جوامێرانە نەبوو کە هیچم نەگوت و خۆم کردە شەریکی ئەو تاوانبارانە؟ ئەوە من هەمیشە لەو جۆرە پیاوەتی و چاکانە دەکەم.

" ' 'خەلیفە کە ئەو قسانەی منی گوێ لێ بوو زانی من کەسێکی جوامێر و کەمقسەم و قەت درێژدادڕی ناکەم. ئیدی وەک ئەو گەنجەی بیر نەکردەوە کە پێی وایە من زۆر بڵێم. ئەوە بە خێر ئەوم لە مەترسـی ڕزگار کردووە. ئینجا خەلیفە پرسـی: 'براکانیشـت وەک تۆ کەمقســـە و زانا و تێگەیشـــتوون؟' گوتم: 'مەعازەڵلا، ئەوان قەت وەک من نین. خەلیفە، تۆ ئابڕووی منت برد؛ منت لە ڕیزی ئەوان دانا. هەر کام لەوان لەبەر خوێڕیتی و زۆربڵێی بەلایەکیان بەســـەر هاتووە: یەک شـــەلە، یەک خوارە، یەکی دی گێڕە، یەکی دیکە کوێرە، برایەکی دیکەم هەردووک گوێ و لووتی بڕاوە و یەکی تریش هەردووک لێویـان کەت کردووە. نامەوێ زۆری لە ســـەر بڕۆم . مەبەســـتم ئەوەیە تۆ تێگەیێنم کە من لە براکانی دیکەم ئازا و زانا و جوامێرترم. هەر کام بەســـەرهاتێکیان هەیە کە بووتە هۆی ڕۆژڕەشـی ئەو. ئەگەر پێت خۆش بێ، دانەدانە دەیان گێڕمەوە.

### بەسەرهاتی شەلەکە

" ' 'برا شـــەلەکەم لە بەغدا دووکانی بەرگدروونی هەبوو. دووکانەکەی لە پیـاوێکی دەوڵەمەند بە کرێ گرتبوو. ماڵی ئەو کابرایە ڕووبەڕووی دووکانەکە بوو. ڕۆژێک براکەم لە دووکان خەریکی کار بوو کە ســـەری هەڵێنا ســـەیری کرد ئەوە ژنێک ســـەری هێناوەتە دەرێ چاوەچاو دەکا.

" ' 'براکەم کە ئەوی بینی، دەسـتی نەچووە کار و هەتا شـەو بێکار دانیشـت و چاوێکی هەر لەو شـوێنە بوو. ڕۆژی دوایی بەیانی زوو چوو دووکانی کردەوە و دەسـتبەکار بوو. کاری دەرزیکاری دەکرد و چاوێکیشی هەر لەو دیوە بوو، بەشکوو ئەو ژنە دیسان سەرێک بکێشـــێتە دەرێ. ئیدی هەتا شـــەو بایی درەمێکی کار نەکرد. هەر چاوەچاوی بوو. هەتا ڕۆژێک خاوەن دووکانەکە قوماشـــێکی بۆ هێنا و گوتی: «ئەوەم بۆ ببڕە و بۆم بدروو.»

براکەم زۆری پێ خۆش بوو. سپاسی کرد و هەتا شەو هەر خەریکی بڕین و دروونی بوو. کە تەواو بوو، خاوەنماڵەکە پرسیاری حەقدەستەکەی کرد. براکەم گوتی: 'شایانی نییە و ـن چۆن پارە لە تۆ وەردەگرم.' ئەوە لە کاتێکدا بوو براکەم برسی بوو و درەمێکیشی لە ـالدا نەبوو. سێ ڕۆژی پێ چوو، هەتا جلوبەرگەکانی خاوەنماڵەکەی تەواو کرد و بۆی بردەوە. ژنە مێردەکەی ئاگادار کردەوە کە بەرگدرووەکە بەینێکە هەر چاوی لەسەر منە. ئیدی پێکەوە گوتیان وا چاکە ئێمەش گاڵتەی پێ بکەین. هەرچی قوماشی هەمانە، دەیدەینێ ـا بیدروێ، خۆ پارەش وەرناگرێ. کاتێک کارەکانیان تەواوە بوو، فێڵێکیان لە براکەم کرد. کەنیزێکیان دایە شەو لەگەڵی بێ. ئەو شەوەی دەیانویست کەنیزەکەی بۆ بنێرن، پێیان گوت: 'وا چاکە ئەمشەو لەو ئاشەدا بخەوی.' براکەم وای زانی مەبەستێکی باشیان هەیە. ئیدی بە تەنیا لە ئاشەکەدا خەوت. شەو لە نیوە لای دابوو کە ئاشەوانەکە هات و سەیری کرد کەسێک لەوێ خەوتووە، لە جیاتی گایەکەی نیری ئاشەکەی خستە ملی ئەوەوە. لای بەیانی کە مێردی ژنەکە هات، دیتی ئەوە ئاشەوان ئاشەکەی بە وەستای دروومان دەگێڕێ و جارجار بە قامچیش لێی دەدا. ئیدی مێردی ژنەکە گەڕاوە و کاتێک تاو هەڵات کەنیزەکە هاتە ئاشەکە و ئەوی ڕزگار کرد و گوتی: 'من و خانم زۆرمان پێ ناخۆش بوو کە بیستمان ناوات لێ بەسەر هاتووە.' ئەو فەقیرە ئەوەندەیان بە دەوری تەوەرەی ئاشەکەدا سووڕاندبووەوە، توانایی وەڵامدانەوەشی نەبوو.

" ' 'کە براکەم هاتەوە ماڵی خۆی، ئەو کابرایەی کەنیزەکەی لێ مارە کردبوو، چوو سڵاو و پیرۆزبایی لێ کرد، گوتی: 'پیرۆزت بێ ماچ و مووچ و ئامێزی بووک.' براکەم گوتی: 'خوا لە درۆزن خۆش نەبێ. هاتووی بمبەیەوە لە ئاشم خەنەوە.' کابرا گوتی: 'ئەو قسانە چین؟ بڵێ بزانم چی بووە؟' براکەم شتەکەی بۆ گێڕاوە. کابرا گوتی: 'ئەوە ئەستێرەی تو و ئەو ژنە یەکی نەگرتووەتەوە. بەڵام ئەگەر من پێم خۆش بێ، دەتوانم کارێک بکەم ئەستێرەی بەختتان یەک بگرێتەوە.' براکەم گوتی: 'دەی چ فێڵێکی دیکەت لەبن سەر دایە؟ من ژنم ناوێ و پەشیمان بوومەوە.'

" ' 'دوای ئەوە براکەم هاتەوە دووکان و چاوەڕێ بوو کارێک بێ و بەشی نانەکەی پەیدا بکا. وا بوو خانم دەهۆیەکی دیکەی ساز کرد و کەنیزەکەی نارده لای وەستای ـرووماـن و گوتی: 'پێی بڵێ کە من ئەو هەمووەم ئەو خۆش دەوێ، ئەوە بۆ ئاورم لێ ناداتەوە و ڕووحمی بۆم سارد بووەتەوە؟' براکەم چاوی لێ کرد، ئەوە خانم لە بەرپەنجەرە چاوی لەوە و ڕووبەڕووی ڕاوەستاوە و دەگری، دەڵێ:

نەهاتنە مەیدانی ئەڤینداری خەتا نییە

" ' 'براکەم وەڵامی نەداوە. ژنە هات بۆ لای ســویندی بۆ خوارد ئاگاداری ئەوە نەبووە کە لە ئاشـەکە بەسـەری هاتووە. براکەم دیسـان فریوی خوارد و ئۆگری بووەوە. دڵی چاک بووەوە و قســەی لەگەڵ کرد. جاریکی دیکە ژنە ســەری کیشـا ســەیری کرد ئەوە براکەم خەریکی دروومانە، پاش ماوەیەک کەنیزەکەی نارد و گوتی: ' خانمەکەم دەڵێ کە ئەمشــەو میردەکەم دەچیتە ماڵی هاورییەکی و هەتا بەیانی نایەتەوە. تۆش وەرە ماڵی ئیمە و هەتا بەیانی پیکەوە خەریکی عەیش و نۆش و بەزم و خۆشـــی دەبین.' ژنە و پیاوە کەڵەکێکیان لەبن ســـەردا بوو. بەڵام براکەم نەیدەزانی. کە بوو بە شـــەو، دیســـان کەنیزەکە هاتەوە و براکەمی برد بۆ لای خـانم. خـانم گوتی: 'زۆرم بیر دەکردی.' براکەشـــم گوتی: 'لە پیش هەموو شـتیکدا ماچیکم دەیە.' هیشـتا قسـەکەی تەواو نەکردبوو کە میردی ژنەکە وەژوور کەوت و براکەمی گرت. ویستی بیبا بۆ لای داروغە. فەقیرە دەستی کردە گریان و پارانەوە. بەڵام گریان و پارانەوە و لالانەوەی سوودی نەبوو. بردییە کن داروغە. لەپیشدا بە قامچی تەواوی گیانیان شـین کردەوە. دوایە سـواری وشـتریان کرد و کۆڵان بە کۆڵان گیرایان و گوتیـان هەرکەس دوای ژنی خەڵـک بکەوێ، ئـاوای لێ دەکرێ. لەو کـاتەدا لە وشـــتر بەربووەوە و قاچی شکا. دوای ئەوە داروغە لە شار دەری کرد. نەیدەزانی ڕوو لەکوێ بکا. من ڕقم هەســـتا و چووم دەســـتیم گرت و هینامەوە ماڵی خۆم هەتا ئیســـتاش خۆراک و پۆشاکی لەسەر خۆمە.

" ' 'خەلیفە بە قسەکەی من پیکەنی و گوتی: 'ئەی ئافەرم.' گوتم: 'من ئەو ئافەریمەت لێ قەبووڵ نـاکەم هەتـا گویم لێ ڕانەگری بەســـەرهـاتی ئەو پینج برایەی دیکەشـــمت بۆ نەگیرمەوە. بۆ ئەوەی نەفەرمووی من قسەی لە خۆڕا دەکەم و هەر زۆربلێم. خەلیفە گوتی: 'بەسەرهاتی ئەو پینج برایەی دیکەشت بگیرەوە و ئەو دوورەش بە گوێی ئیمەدا بکە.'

### بەسەرهاتی بەقبووق

" ' 'گوتم: 'خەلیفە، بە براکەی دیکەمیـان دەگوت: ' بەقبووق.' ڕۆژیـک کـاریکی هەبوو چووە کۆڵانیکەوە، پیریژنیک لێی دیتە پیشـــێ و دەڵێ: 'کاریک هەیە، ڕاوەســـتە پیت دەڵیم، ئەگەر پیت خۆش بوو بیکە.' براکەم ڕادەوەســـتێ. پیریژنە دەڵێ: 'پیت چۆنە ئەمشـــەو لە ماڵیکی خۆش لەگەڵ خانمیکی ڕووخۆش هەتا بەیانی سەرخۆش لە جیگایەی خۆش دانیشن و شــەرابی حەوتســاڵە بخۆنەوە و بە ماچ و ڕاموســان و دەســتەملان هەتا بەیانی پیکەوە ئەوەی پیتان خۆش بێ بیکەن؟ ئەگەر بیتو لای کەس باسی نەکەی، قازانجیکی زۆریشت بە

قسمەت دەبێ.' براکەم دەڵێ: 'دایەپیرە، ئەوە چۆناوچۆن بوو لەو شارەدا، لە نێو ئەو هەموو خەڵکەدا منت بۆ ئەو کارە هەڵبژارد؟ چی منتان بە دڵ بوو؟' پیرێژن دەڵێ: 'پێم نەگوتی زۆری لێ مەڵێ. ئێستا دمت گرێ دە و بەدوامدا وەرە.'

" ' 'ئینجا پیرێژن کەوتە ڕێ و براکەشم بە تەمای ئەو شتانەی بۆی باس کردبوو دوای کەوت. هەتا گەیشــــتە ماڵێکی گەورە و لە قاتێکەوە چوونە قاتێکی دیکە و لە دیوێکەوە بۆ دیوێکی دیکە. براکەم ســـەیری کرد ئەوە چوار دوێت دانیشــتوون. یەک لە یەک جوانتر، بە جورێک کە براکەم پێی وا بوو جوانی ئاوا لە دنیادا نییە، خەریکی گورانیگوتن و دەف و چەنگلێدان بوون.

" ' 'دوایی یەکێک لە کیژەکان پیاڵەیەک مەی خواردەوە و پیاڵەیەکیشــــی بۆ براکەم تێ کرد. هەر کە براکەم پیاڵە مەیەکەی خواردەوە. کچە زللەیەکی لە پشـــتملی دا. براکەم ڕقی هەستا و هاتە دەرێ.

" ' 'پیرێژن کەوتە شوێنی، بە چاو تێی گەیاند کە بگەڕێتەوە. براکەم گەڕاوە و دانیشت. هێشتا قسەیەکی نەکردبوو کە کچە دەنکێکی دیکەی لە پشتملی دا. براکەم هەستا بڕواتە دەرێ کە دیســــان پیرێژن ڕێی لێ گرت و گوتی: 'کەمێکی دیکەش دان بە خۆتا بگرە، هەتا بە ئاواتت دەگەی.' براکەم گوتی: 'نە دان بە خۆمدا دەگرم و نە دەشمهەوێ بە مرادم بگەم.' پیرێژن گوتی: 'هێمن بە، کاتێک ســـــەرخۆش بی بە ئاواتەکانت دەگەی.' ئەو جاریش گەڕاوە لەسەر جێی خۆی دانیشتەوە.

" ' 'کچگەل هەموویان هەستان. پیرێژن پێی گوتن: 'ڕووتی کەنەوە و گوڵاوی پێدا کەن.' کچگەل جلەکانیان لە بەر داکەند و گوڵاویان پێدا هەڵپرژاند. ئینجا کیژێک کە لە هەموویان جوانتر بوو، هاتە پێشــێ و گوتی: 'خودا دڵخۆشــت کا کە دڵی ئێمەت بە هاتنت خۆش کرد. ئەگەر بێتو بە گفتی خۆت بکەی و بەڵێنەکەت ببەیە ســــەر، بە ئاواتی دڵی خۆت دەگەی.' براکەم گوتی: 'خانم، من یەکێک لە مسکێنەکانی تۆم.' کیژە گوتی: 'تۆ بزانە کە من نیازم بە کەسێکە، هەرکەس یارمەتیم بدا، بە ئاواتی خۆی دەگا.'

" ' ' دوای ئەوە کچگەل دەستیان کرد بە گورانی و دەف و چەنگلێدان. کاتێک بەزمەکە خۆش بوو، ئەو جار کچە بە کەنیزەکەی گوت: 'تۆ بچۆ پیـاوی خۆت بەرە و کوڵوکۆی دامرکێنە و بیهێنەوە لای من.' کەنیزەکە براکەمی برد و ڕۆیشـــــت. نەیدەزانی چی لێ دەکا. پیرێژنە بەدوایاندا ڕۆیشــــت و بە براکەمی گوت: 'کەمێک دان بە خۆتا بگرە تا بە ئاوات دەگەی. هەر شـــتێک ماوە، ئەویش ئەوەیە چەنەگەت دەتاشــــن.' براکەم گوتی: 'ئەی چی جوابی خەڵکی دەمەوە؟ ئابڕووم دەچێ!' پیرێژنە گوتی: 'ئەو کچە تۆی زۆر خۆش دەوێ. دەیەوێ تۆ ســــادە بی و تووکی چەنەت وەک دروو ڕووی نەڕنێ. تۆ ئـارام بە تـا بە

ئارەزووت دەگەی.'

" ' 'براکەم ملی دا. کیژەکە چەنەی تاشـــی و هێنایەوە کوڕەکە، برۆ و چەنە و ســـمێڵی تاشـــــی بوو. کچە لەو ســـــیمایەی ترســـــا. دوای ئەوە زۆر پێکەنی گوتی: 'گەورەم، بەو ڕوخســارەت منت تەواو شـەیدا کردووە. ئێسـتا تۆو گیانی من هەسـتە کەمێک سـەما بکە.' براکەم گورج هەسـتا و دەسـتی بە سـەما کرد. کچ و کەنیز و هەرکەس لەو ماڵەدا بوو تێی ئاڵابوون ،سـەیریان دەکرد و نارنج و لیمۆ و پرتەقاڵیان پێدا دەدا و لە پشـتملیان دەدا هەتا کەوتە عەرزی. پیرێژنە گوتی: 'ئەوە بە ئاواتت گەیشـتی، تەنیا شـتێک ماوە ئەویش ئەوەیە کە ئەو کچە خووخدەی وایە تا سەرخۆش نەبێ، ناهێڵێ کەس دەستی بۆ بەرێ. ئینجا دەبێ خۆت ڕووت کەیەوە، دوایە ئەو بە قەستی هەڵدێ وەک ئەوەی لە دەست تۆ هەڵێ، ئەتۆش دەبێ بکەوییە شـــوێنی. بۆ هەر کوێ هەڵات، دوای کەوە تا دەیگری و ئەو جار چت پێ خۆشە لەگەڵی بکە.' براکەم کە ئەوەی بیست کەمێک بە نارەحەتییەوە هەستا خۆی ڕووت کردەوە و ڕاوەستا.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سی و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکو، 'دەللاک گوتی: 'براکەم جلەکانی داکەند و ڕاست ڕاوەستا. کچەکە هات پێی گوت: 'من هەڵدێم و تۆش دوام کەوە، ئەگەر منت گرتەوە ئەوە چت پێ خۆشە نەگەڵم بکە.' ئیدی کچە لەولا بۆ ئەولا هەڵدەهات و براکەشم هۆشی لە لای خۆی نەمابوو، بۆ هەر کوێ چووبا وەک شێت دوای دەکەوت. لە پڕدا سەیری کرد ئەوە لە بازاڕی دەباغانە. کە خەڵک ئەویان دیت، تێی ئالان، پێی پێکەنین و چەرم و ڕیخۆڵەیان پێدا دا و بە زڵلە لەو لەشە ڕووتەیان دەدا. هەتا وای لێهات ماندوو و شەکەت بوو و بێهۆش کەوت. خستیانە سەر گوێدرێژێک و بردیان بۆماڵی دارۆغە. دارۆغە پرسی: 'ئەوە چی بووە؟' گوتیان: 'ئەئاوا بەنێو بازاڕدا دوای ژنێک کەوتووە.' دارۆغە فەرمانی دا سەد قامچیان لێ دا و لە شار دەریان کرد. من بیستمەوە و دوای کەوتم و بە دزییەوە هێنامەوە ماڵی خۆم و ئیستا نان و ئاوی لەسەر منە. خەلیفە، ئەگەر من جوامێر نەبایەم، چۆنم ئەو کارە دەکرد؟

## بەسەرهاتی کوێرەکەیان

" ' 'بەڵام برای سێیەمم کە "قفە'ی ناوە، ڕۆژێک بۆ سواڵ لە دەرکی ماڵێک دەدا. خاوەنماڵ بە دەنگێکی بەرز هەرا دەکا: 'ئەوە کێیە لە دەرگا دەدا؟' براکەم هیچ ناڵێ هەتا خاوەنماڵ دێ و دەرگاکە دەکاتەوە و دەڵێ: 'چت دەوێ؟' ئەویش دەڵێ: 'لە ڕێی خوادا شتێکم دەیە.' خاوەنماڵ لێی دەپرسێ: 'تۆ کوێری؟' ئەویش دەڵێ: 'بەڵێ، کوێرم.' خاوەنماڵ دەستی دەگرێ و دەیباتە ژوورێ و لە پلیکانەکان دەیباتە سەرێ.

" ' 'براکەم پێی وا بوو کە خواردنێک یان شتێکی دەداتێ. کە گەیشتنە سەرێ، خاوەنماڵ گوتی: 'کوێرە چیت دەوێ؟ براکەم گوتی: 'لە ڕێی خوادا شتێکم دەیە.' خاوەنماڵ گوتی: 'خوا بتداتێ.' براکەم گوتی: 'ئەی بۆ لە سەرەتاوە ئاوات نەگوت؟' ئەو کابرایە گوتی: 'سواڵکەری هیچوپووچ، مەگەر کاتێک لە دەرگات دا، من بانگم نەکردی کێیە؟ بۆ هیچت نەگوت و دیسان لە دەرگات داوە هەتا منت لێرەوە هێنا خوارێ؟' براکەم گوتی: 'ئێستا چیت دەوێ؟' گوتی: 'لێرە هیچم نییە بتدەمێ.' براکەم گوتی: 'باشە بمبەوە خوارێ.' گوتی: 'ڕێم لێ نەگرتووی'. براکەم ویستی لە پلیکانەکان بچێتە خوارێ. بیست پلیکانی مابوو، لاقی خزی و کەوت و هەتا خوارێ خلۆر بووەوە و سەری شکا. کە لەو ماڵە هاتە دەرێ، نەیدەزانی بۆ کام لا بچێ. لەو جەنگەیەدا دەستەیەک لە هاوڕێ کوێرەکانی پەیدا بوون. گوتیان: 'ئەمڕۆ چت پەیدا کردووە؟' ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە و گوتی: 'ئەمڕۆ بە تەمام ئەو پارانەی پاشەکەوتم کردووە، خەرج بکەم.' خاوەنماڵەکە کە دوای کەوتبوو، گوێی لە

گوتەکانی بوو. براکەم نەیدەزانی کە ئەو کابرایە کەوتووەتە شوێنی، ئیدی هەر وا ڕۆیشت هەتا گەیشـــتەوە ماڵەکەیان. ئەو کابرایەش بەدوایدا چووە ماڵەکەوە و دانیشـــتن هەتا هاوڕێکانیشی هاتنەوە.

" ' 'کە هاوڕێکانی هاتنەوە، گوتی: 'دەرگاکە گاڵە دەن و جوان ماڵەکە بپشـــکنن نەوەک بێگانەیەک هاتبێتە ژوورەوە. ئەو پیاوە هەر کە گوێی لەو قســـەیەی براکەم بوو. پەتێک بە بن میچەکەوە بوو خۆی بە پەتەکەوە هەڵواسی و چووە سەرێ. ئەوان دەرگایان داخست و جوان ماڵەکە گەڕان، کەســیان نەدیتەوە. دوایە هاتنە لای براکەم دانیشـــتن و درەمەکانیان ژمارد. کە ژمارديان دەهەزار درەمیان لە پێویســـتی ڕۆژانەیان زیادتر بوو. ئەو دەهەزار درەمەیان لە ســـووچێک وە بن گڵ دا. ئەوەی دیکەشـــیان لەنێوان خۆیاندا بەش کرد. دوای ئەوە نانیان هێنا دایان نا. لەو جەنگەیەدا براکەم هەســـتی بە بوونی کەســـێکی دیکە کرد. دەســـتی بەولاولادا گێڕا و دەســـتی کابرای وەبەر دەســـتی هات. هاواری کرد: 'گرتم. کاکە بێگانەمان لەگەڵدایە.' ئیدی بە هەموویان بە مست و بە شەق دایگژانێ. هاواریشیان دەکرد: 'خەڵکینە، دز! دز! فریامان کەون.' خەڵکێکی زۆریان تێ ئالا. کابراش چاوی لەسەر یەک دانا و خۆی کردە کوێر، بە جۆرێک کەس گومانی تێ نەکا. هاواری دەکرد: 'ئەی هاوار خەڵکینە! من بەرنە لای شارەدار قسەیەکم لە دڵدایە.' لەو جەنگەیەدا پیاوەکانی شارەدار بەوێدا هاتن و هەموویانیان بردە لای شارەدار. شارەدار لێی پرسین: 'ئەوە چی بووە؟' ئەو پیاوە گوتی: 'بەڕێز شـارەدار، هەتا ئازار و جەزرەبەمان نەدەی، ڕاسـتییەکەت بۆ ڕوون نابێتەوە. ئەگەر دەتەوێ، لەپێشـدا لە من دە.' شـــارەدار فەرمانی دا ئەویان لەســـەر زەوی ڕاکێشـا و چەند قامچییان لێ دا. ئەویش چاوێکی هەڵێنا. چەند قامچی دیکەشـیان لێ دا، چاوەکەی دیکەشـی هەڵێنا. شـارەدار گوتی: 'مەبەسـتت لەو کارە چ بوو؟' گوتی: 'بەڕێز شـارەدار. لێم گەڕێن با ڕاسـتییەکەی بگێڕمەوە.' شـــارەدار گوتی: 'بیگێڕەوە.' پیاوە گوتی: 'ئێمە بە قەسـتی خۆمان کوێر کردووە. دەچینە مـــاڵانەوە و چـــاو لە ژنـــان دەکەین و بە فڕوفێڵێـــک ژنەکـــان هەڵدەفریوێنین. بە دزی و ســـواڵیش ماڵ کۆ دەکەینەوە، هەتا ئێســـتا دەهەزار درەممان لەو ڕێگایەوە کۆ کردووەتەوە. من دووهەزار و پێنجســـەد درەمەکەی خۆمم ویســـت، کەچی بە هەموویان لێیان دام و ماڵەکەشیان نەدامێ. من پەنام بۆ تۆ هێناوە. تۆ باشتر دەزانی مافی ڕەوای من چەندەیە. ئەگەر دەتەوێ ڕاسـتییەکەت بۆ ڕوون بێتەوە، لەپێشـدا لەوان بدەن با چاویان هەڵێنن.'

" ' 'ئیدی شـــارەدار فەرمانی دا هەتا ئەوان جەزرەبە دەن. یەکەم کەس کە ڕایانکێشـــا، براکەی من بوو. ئەوەندەیان لێ دا، چی وای نەمابوو بمرێ. شـــارەدار دەیگوت: 'ئەی کافر، چۆن ناشـــوکری بە نیعمەتی خودا دەکەی و دەیشـــارییەوە و خۆت وەک کوێر پیشـــان دەدەی؟' براکەم هاواری دەکرد و دەپاڕاوە و بە شـــارەداری دەگوت: 'بە زاتی ڕەسـووڵەڵڵا

ئیمە کوێرین و نابینین.' کە ئەویان کردەوە، ئەوانی دیکەیان هێنا بەو شێوەی ئازاریان دان و دیسان براکەی منیان هێنا، هەتا بێهۆش بوو هەر لێیان دا. شارەدار گوتی: 'بیکەنەوە.' کاتێک بە هۆش هاتەوە، دیسان بەستیانەوە. زیاتر لە سێ سەد قامچییان لە هەر کامیان دا. خاوەنماڵەکەی کە کەوتبووە شوێن براکەم. لۆمەی دەکردن و هەر دەیگوت: 'باشە، ئیدی چاوتان هەڵێنن دەنا ئەوەندەی دیکەشتان لێ دەدەن.' ئەو جار بە شارەداری گوت: 'کەسێکم لەگەڵ بنێرە هەتا درەمەکان بێنم. ئەوانە لەبەر ئابڕووچوون چاویان هەڵناهێنن.' شارەدار پیاوێکی لەگەڵ نارد. دەهەزار درەمەکەیان هێنا. دووهەزار و پێنجسەد درەمیان وەک بەشی خۆی دا بە کابرا. ئەوانیشیان دوای هەڕەشە و گوڕەشەیەکی زۆر لە شار دەرکرد. خەلیفە، من کە ئەو ڕووداوەم بیستەوە، لە شار وە دەر کەوتم و گەڕام هەتا براکەمم دیتەوە و هێنامەوە ماڵێ بژیو و پێداویستی ژیانیم لە ستۆ گرت. خەلیفە پێکەنی و گوتی: 'خەلاتێکی بدەنێ و بەڕێی کەن با بڕوا.' گوتم: 'بە خوا هیچ وەرناگرم و ناشڕۆم هەتا بەسەرهاتی براکانی دیکەشم نەگێڕمەوە و بۆ خەلیفە ئاشکرا نەبێ کە من زۆربلێ نیم.' خەلیفە گوتی: 'قوڕیاتەکانت بگێڕەوە.'

### بەسەرهاتی یەکچاو

" ' 'گوتم: 'یەکچاو برای چوارەمینم لە بەغدا قەساب بوو. گەورەکانی شار گۆشتیان لەو دەکڕی. ماڵ و سامانێکی زۆری لەو ڕێگایەوە بە دەست هێنابوو. خانوو و مەڕ و مالاتێکی زۆری کڕی. چەند ساڵێک گوزەرانی ئاوا باش بوو. ڕۆژێک لە دووکانەکەی خۆی ڕاوەستابوو کابرایەکی پیر هات و بایی چەند درەمێک گۆشتی کڕی. براکەم چاوێکی لە درەمەکانی کرد و سەیری کرد زۆر سپین. ئیدی بە جودا هەڵی گرتن. هەتا پێنج مانگ ئەو کابرا پیرە چەند درەمێکی دێنا و گۆشتی دەکڕی و دەڕۆیشت. براکەشم درەمەکانی بە جودا هەڵدەگرت. دوای ئەو ماوەیە سەری مجرییەکەی کردەوە بچێ بەو پارەیە مەڕ بکڕێ. دیتی ئەو درەمانەی لە کابرا پیرەکەی وەرگرتووە، هەموو کاغەزن. کە بە شێوەی درەم براون.

" ' 'ئیدی چەپۆکێکی بە خۆیدا دا و هاواری کرد. خەڵک تێی ئالان و ئەویش ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە. ئەوان پێیان سەیر بوو. براکەم هاتەوە دووکان و مەڕێکی سەر بڕی و هەڵی واسی. لەتێکیشی لێ کردەوە و بە قەنارەکەیدا کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خۆزگە پیاوە پیرە ئەو جاریش بێتەوە دووکان و بیگرم پارەی تەواوی ئەو درەمە چرووکانەی لێ بستێنمەوە.' ئەوەندەی پێ نەچوو کابرا پیرە پەیدا بوو. براکەم گرتی و هاواری کرد: 'ئەی موسوڵمانان! وەرن بزانن ئەو کابرایە چی لەگەڵ من کردووە.'

" ' 'کابرا پیره کە ئەو قسـانەی بیسـت، گوتی: 'بەرم دە، دەنا ئابڕووت دەبەم.' براکەم گوتی: 'چۆنم ئابڕوو دەبەی؟' کابرا پیرە گوتی: 'تۆ گۆشـتی مرۆڤ لە جیاتی گۆشـتی مەڕ دەفرۆشـی.' براکەم گوتی: 'خوێڕی، ئەوەی تۆ دەیڵێی هەموو کەس دەزانێ درۆیە.' پیرە گوتی: 'خوێڕی تۆی کە گۆشتی مرۆڤ لە دووکانەکەت هەڵداوەسی.' براکەم گوتی: 'ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێی ڕاسـت بێ، من ماڵ و گیانم حەلاڵی تۆ بێ.' کابرا پیرە گوتی: 'خەڵکینە، ئەو قەسـابە مرۆڤ دەکوژێ و گۆشـتەکەی لە جێی گۆشـتی مەڕ بە خەڵک دەفرۆشـێتەوە. ئەگەر پێتان خۆشە ڕاستییەکەتان بۆ دەرکەوێ، بچنە نێو دووکانەکەیەوە.'

" ' 'خەڵک ڕژانە نێو دووکانەکەیەوە سـەیریان کرد لە جیاتی بەران مرۆڤیان دی. ئەو جار براکەمیان گرت و بەسـەریدا گوڕاندیان: 'کافر، ئەوە چ کارێکەی دەیکەی؟' ئیدی هەرکەس دەگەیشتێ مست و چەپۆکێکی پێدا دەدا. ئەو کابرا پیرە مستێکی لە چاوی براکەم دا و کوێری کرد. خەڵـک بەرانەکەیـان کە وەک مرۆڤ دەچوو، هەڵگرت و چوون بۆ لای داروغە. کابرا پیرە گوتی: 'داروغە، ئەو کابرایە مرۆڤ دەکوژێ و گۆشتەکەی وەک گۆشتی مەڕ بە خەڵک دەفرۆشـێ. ئەوە ئێمە هێناومانەتە لای تۆ.' براکەم گوتی: 'ئەوە بوختانێکی گەورەیە. من لە گوناحی ئاوا بە دوورم.' داروغە باوەڕی بە براکەم نەکرد و فەرمانی دا پێنجسـەد قـامچی لێ دا و ئەو مـاڵ و شـتەی هەیبوو هەموویـان لێ زەوت کرد و شـاربەدەریان کرد. سـەری سـووڕ مابوو نەیدەزانی ڕوو لەکوێ کا. هەر ئاوا لە خۆڕا ڕۆیشـت هەتا گەیشـتە شـارێک لەوێ دووکانی پینەچێتی دانا. ڕۆژێک کارێکی هەبوو لە دووکان هاتە دەرێ، گوێی لە حیلەی ئەسـپ بوو. گوتی: 'ئەوە چییە؟' گوتیان: 'ئەوە پاشـا دەچێتە ڕاو.' ئەویش بوو بە پشـتمێر[١] و بۆ ئەوەی سـەیرانێک بکا، لە شـار وە دەر کەوت. بە ڕێکەوت پاشـا کە چاوێکی بە خەڵکدا گێڕا، لە بەختی ئەو برایەی من ڕاسـت چاوی بە چاوە کوێرەکەی کەوت. ماوەیەک سـەری داخسـت و بیری کردەوە و گوتی: 'خودایە لە بەڵای ئەورۆ پەنا بۆ تۆ دێنم.' ئینجا ئەسپەکەی گێڕاوە و پیاوەکانیشی گەڕاندەوە. پاشا بە پیاوەکانی گوت کە لە براکەم دەن و دووری خەنەوە و مەهێڵن بێ. پیاوەکانی ئەوەندەیان لە براکەم دا خەریک بوو بمرێ. ئەو نەیدەزانی ئەوە لەبەر چی بوو. ئیدی بە بریندارێ و نارەحەتی گەڕاوە بۆ دووکانەکەی خۆی و ڕووداوەکەی بۆ یەکێک لە دراوسـێکانی گێڕاوە. ئەو کابرایە ئەوەندە پێکەنی، لەسـەر پشـت کەوت، گوتی: 'کاکە، بزانە کە پاشـا ناتوانێ مرۆڤی یەک چاو ببینێ، بە تایبەت ئەگەر چاوی ڕاستی کوێر بێ هەر دەیکوژێ.'

" ' 'براکەم کە ئەوەی بیسـت، هەسـتا لەو شـارە ڕۆیشـت و چووە شـارێکی دیکە کە پاشـای نەبوو. ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوە. ڕۆژێک لە دوور گوێی لە حیلەی ئەسـپێک بوو، وای زانی ئەوە لە دارودەسـتەی پاشـایە. ترسـا و هەڵات لە شـوێنێک دەگەڕا خۆی تێدا

---

[١]. پشتمێر: بەو کەسانە دەڵێن کە بە پێیان دەکەونە دوای پاشا یان گەورەیەکی دیکە.

حەشار بدا. درگایەکی دیت. لەو دەرگایەوە چووە ژووری. لە دالانێکەوە ڕەد دەبوو کە دوو کەس ئاوقای١ بوون و گوتیان: 'ئۆخەیش، ئەوە دزەمان گرت. سێ شەوە ئاوا بە ئاسانی لە دەستمان هەڵدێی و خەوت لە ئێمە حەرام کردووە.' براکەم سەری لەو قسەیە سوورِ ما.

" ' 'دوای ئەوە گوتیان: 'ئەو کێردەی کە تۆ هەموو شەوێ ئێمەت پێ دەترساند، کوا؟' گوتی: 'بە خودا من کێردم نییە و کەسیشم نەترساندووە.' پشکنییان، دیتیان ئەوە کێردێک کە پینەی کەوشی پێ دەبڕی، لە پشتێندیدا بوو. براکەم گوتی: 'کاکە لەو خوایە بترسن. من بەلای سەیر سەیرم بەسەر هاتووە.' گوتیان: 'چیت بەسەر هاتووە بیگێڕەوە.' ئیدی بە هیوای ئەوە ڕزگاری دەبێ، بەسەرهاتی خۆی گێڕاوە. باوەڕیان پێ نەکرد و زۆریان لێ دا و جلەکانی بەریان دڕاند. کە جلەکانی دڕان و لەشی وە دەر کەوت، جێگای برینی قامچییەکانییان دیت. گوتیان: 'کڵاو، جێگای قامچییەکان هاوار دەکەن کە تۆ دز و تاوانباریت.' دوای ئەوە براکەمیان بردە کن شارەدار.

" ' 'شارەدار گوتی: 'خراپکار، ئەوە چیت کردووە وا بە قامچی ئاوایان لێ کردووی؟' ئیدی شارەدار فەرمانی دا سەد قامچییان لە براکەم دا و سواری وشتریان کرد و بە کۆڵان و گەڕەکەکاندا گێڕایان و گوتیان ئەوەیە چارەنووسی ئەو کەسەی بچێتە ماڵانەوە. پاشان شاربەدەریان کرد. کە ئەو ڕووداوە بە گوێی من گەیشتەوە، چووم دۆزیمەوە، هێنامەوە ماڵی خۆم و خەرجییەکەیم وەستۆ گرت.

### بەسەرهاتی گوێبڕاوەکە

" ' 'بەڵام خەلیفە برای پێنجەمم کە هەر دووک گوێچکەی بڕابوو. پیاوێکی هەژار و نەدار بوو. شەوانە دەچوو لە ماڵان دەگەڕا و داوای شتی دەکرد. ئەوەی بە شەو پەیدای دەکرد، بە ڕۆژ دەیخوارد. بابمان پیر و پەککەوتە بوو. کاتێک مرد، حەوتسەد درەمی لە پاش بەجێ ما. هەر کام لە براکان یەکی سەد درەممان هەڵگرت. ئەو برا پێنجەمییەمان کە بەشەکەی خۆی وەرگرت، نەیدەزانی چی لێ بکا و سەرگەردان بوو. هەتا ئاخری بە زەینی گەیشت بایی ئەو سەد درەمە شووشە بکڕێ و بیفرۆشێ و سوودەکەی هەڵگرێ. ئیدی وا بوو بایی ئەو سەد درەمەی شووشە کڕی و لەسەر شووشەڕاگرێکی دانا و لەبن دیوارێک دانیشتبوو چاوەڕێی کڕیار بوو.

" ' 'پاڵی بە دیوارەکەوە دابوو لە زەینی خۆیدا لێکی دەداوە و دەیگوت: 'سەرمایەی من لەو کارەدا سەد درەمە. بە دووسەد درەم دەیفرۆشم. دیسان دووسەد درەمەکە دەدەمەوە

---

ئاوقای بوون: سواری سەری بوون.

به شووشه. ئەویش دەفرۆشم به چوارسەد درەم. بەو جۆره هەر دەیفرۆشم و دەکڕمەوە هەتا ماڵێکی زۆر بەســـەر یەکەوە دەنێم. دوایی کەلوپەلێکی چاک و زۆر دەکڕم و شـــتی ڕازاوه و خواردەمەنی خۆش و خواردنەوە دەکڕم و تەواوی دەوڵەمەنـدەکـانی شــــار بانگهێشـــت دەکەم و کچی وەزیر دەخوازم. که گوێزتمەوە، دە دانه کۆیلەی منداڵکاری بۆ دەکڕم. دوای ئەوه جلوبەرگی بەشکۆ و شایانه لە بەر دەکەم و ئەسپەکانم به زینی ڕازاوه تەیار دەکەم. پێیان دەڵێم نۆکەر و کۆیله له ڕاســـت و چەپ و پێش و دواوه لەگەڵم برۆن. وا بێ کاتێک وەزیر منی دیت، له بەرم هەستێ و کوڕنۆشم بۆ بەرێ و من له جێگەی خۆی دانێ. بۆخۆشـــی چونکه خەزوورمه، له بەردەســـتی خۆمدا بێ. دوو نۆکەرم لەگەڵدا بێ که یەکی دوو هەنبانەیان به دەســـتەوە بێ که یەکی هەزار دیناریان تێدا بێ. یەکیان مارەیی کچەکەی بێ و یەکیشیان به خەڵات بدەن به خۆی. هەتا گەورەیی و پیاوەتی خۆمی پیشان بدەم. دوایه بگەڕێمەوە ماڵی خۆم. ئەگەر کەســـێک هات بۆ لای خێزانم، درەمێکی زۆری بدەمێ و خەڵاتی به شـــانیدا کەم. ئەگەر وەزیر دیاری نارد، لێی قەبووڵ نەکەم هەرچەند زۆریش گرانبای بێ. بۆ ئەوەی بزانێ من چەند قورس و شـــاییبەخۆم. ئەو جار له بیر ســـازکردنی ئاهەنگی شـــاییدا بم. دەبێ ماڵەکەم شـــایانه بڕازێنمەوە. جلوبەرگی زاوایەتیم دەبێ زۆر زۆر بەشکۆ بێ. وا بێ ئەگەر لەسەر تەخت دانیشتم و چاوم له ڕاست و چەپی خۆم کرد، لەو پیـاوماقوڵانه بچم. ئەو جـار که بووکیـان بۆ کردمه پەردەوە، من لەبەر گەورەی و حەیابەخۆییم چاوی لێ ناکەم. هەتا خەڵکەکه دەڵێن: 'گەورەم، ئەو بووکەیان بۆ تۆ هێناوه و یەکێک له کەنیزەکانی تۆیه وا ڕووبەڕووته. چاوێکی لێ بکه فەقیره شــــەکەت بووه، ئەوەنده ڕاوەســـتاوه.' ئیدی دەیان جار کوڕنۆش بەرێ، هەتا له کۆتاییدا ئاوڕێکی لێ بدەمەوه و چاوێکی لێ بکەم و ســـــەرم داخەمەوە. دەیان جارم پێ بڵێنەوە جا چاوێکی دیکەی لێ بکەم و دیســان ســەر داخەمەوه بۆ ئەوەی خۆم هەرزه پیشـان نەدەم. هەر بەو جۆره به حەیاوه دادەنیشم هەتا ئارایشتەکەی تەواو دەبێ.' ' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکه.

# که شەوی سی و دووەمین هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ' 'برای پێنجەمی دەللاک لە دڵە خۆیدا دەیگوت: 'ئاوا دادەنیشم هەتا ئارایشەکەی تەواو دەبێ. ئەو جار بە یەکێک لە خزمەتکارەکانم دەڵێم پێنج‌سەد دیناری زێڕ بدا بە ئارایشـــگەرەکان. ئارایشــگەرەکان کە ئەو زێڕانەیان دیت، دەســـتی بووک دەگرن و دەیهێنن دەیخەنە دەستی منەوە. من ئەو بە هیچ نازانم و بە چاوێکی سووک سەیری دەکەم و هەر قسەشی لەگەڵ ناکەم. هەتا خۆی بە شتێک نەزانێ و لە خۆی دەرنەچێ. ئینجا دایکی بووک دێ ســـەر و دەســـتی من ماچ دەکا و پێم دەڵێ:' گەورەم، تکایە چاوێک لەو کەنیزەی خۆت بکە و دڵخۆشـــــی بدەوە و لەگەڵی بدوێ.' ئەمن وەڵامی نادەمەوە و دەبێ هەر لە دەورم گەڕێ و بە قوربانم بێ و دەســـــت و پێم ماچ بکا. بڵێ: 'گەورەم، کچەکەم منداڵە و قەت مێردی نەدیوە. ئەگەر تۆ ئاوای لەگەڵ بجووڵێیەوە، دڵی دەشکێ و بێهیوا دەبێ. تکایە، قسەی لەگەڵ بکە و ڕووی خۆشی دەیە.' دوایی پیاڵەیەک مەی دێنێ بیدا بە کچەکەی، کچە پیاڵەکەی لێ وەردەگرێ و بۆ منی دێنێ. منیش لە کاتێکدا پاڵم داوەتەوە، ڕووی تێ ناکەم. دەڵێم جارێ با بە پێوە ڕاوەستێ. پێی وا نەبێ شتێکە و پلە و پایەیەکی هەیە. ئینجا لە بەرم دەپاڕێتەوە و ســـوێندم دەدا لێی وەرگرم و بیخۆمەوە. دەڵێ: 'پیاڵەیەک لەو کەنیزەی خۆت وەرگرە.' کەمێکی دیکە دێتە پێشێ پیاڵەکە لە دەمم نیزیک دەکاتەوە. منیش دمم واوە دەبەم. نووکە شـــــەقێک لە لاقی کچە دەدەم تـا لە خۆمی دوور خەمەوە.' کەچی شـــــریخە لە شووشەکان هەڵدەستێ و خرمە دەکا و تەواوی شووشەکان دەشکێن.

" ' 'براکەم بە ســەرســەری خۆیدا دەدا و دەســت دەکا بە هاوار و گریان و جلەکانی لە بەر خۆی دادەدڕێ. خەڵک پێیان ســـــەیر بوو، نەیان دەزانی ئەوە تەواوی دارونەداری ئەو برایەم بووە. لەو جەنگەیەدا کە براکەم ڕاوەســــتابوو دەگریا، خانمێکی جوان بە ســــواری ئەســـپێک هات کە بۆی عەنبەر و مســکەکەی کۆڵان و گەڕەکی پڕ کردبوو. ژنە شـــووشـــە شـــکاو و شـــتەکەی براکەم و ئەو خەڵکەی دیت لەوێ کۆ بوونەتەوە، زگی پێی ســـووتا و گوتی: 'ئەوە چی بووە؟' گوتیان: 'ئەوە ئەو کابرایە هێندێکی شـــووشـــە هێناوە بۆ فرۆش، بژیوی پێ پەیـدا بکـا، کەچی ئەوە هەمووی لێ شـــکـاوە.' لەڕێوە ژنە بە یەکێـک لە خزمەتکارەکانی گوت: 'هەرچی زێڕمان پێیە، بیدە بەو هەژارە.' خزمەتکارەکە توورەکەیەکی هێنا داین. توورەکەی کردەوە، دیتی ئەوە پێنج‌ســــەد دیناری زێڕی تێدایە. لە خۆشـــیاندا خەریک بوو گیانی دەرچێ. سپاسـی ئەو ژنەی کرد و دەستخۆشـی لێ کرد. ئینجا هەسـتا هـاتەوە مـاڵێ. هەر کە دانیشـــــت، لە دەرگایان دا. دەرگای کردەوە، پیرێژنێک بوو قەتی نەدیبوو. پیرێژنە بە براکەمی گوت: 'کـاتی نوێژە و منیش دەســــتنوێژم نییە. ڕێم بـدەی دەســــتنوێژەکەم بشـــۆم، مەمنوون دەبم.' براکەم ڕێی دا بێتە ژووری. هەر دووکیان هاتنە

ژوورەوە. لە خۆشیان براکەم ئاگای لە خۆی نەبوو. پیرێژن چوو دەستنوێژی شوشت و هات لە لای براکەم نوێژەکەی کرد و لە لای دانیشت. دۆعای خێری بۆ براکەم کرد و سپاسی کرد. براکەم دەری هێنا دوو دیناری زێڕی دایە. پیرێژن دینارەکانی داوە و گوتی: 'ئەگەر پێویستیت پێی نییە، بیدەوە بەو ژنەی کە بەزەیی بە تۆدا هات و ئەو زێڕانەی دایێ.' براکەم گوتی: 'بۆ تۆ دەیبینی؟' پیرێژنە گوتی: 'ڕۆڵە گیان، من ئەو ژنە دەناسم. ئەو تۆی زۆر خۆش دەوێت. ژنی پیاوێکی زۆر دەوڵەمەندە. تۆ تەواوی ماڵەکەت هەڵگرە و کاتێک ئەوت بینی، بە سۆزەوە بیدوێنە و قسەی خۆشی بۆ بکە. ئەگەر وا بکەی، لە ماڵ و جوانییەکەی شتێکت پێ دەگا.'

" ' 'لەڕێوە براکەم توورەکە زێڕەکەی هەڵگرت. پیرێژن پێشی کەوت، ئەویش بە دوایدا هەتا گەیشتنە ماڵێکی بڵند و خۆش. براکەم چووە دیوێکی پێشوازییەوە کە فەرشی ئاوریشمی لێ ڕاخرابوو. پەنجەرەکانی پەردەی دیبایان پێوە بوو. چووە لای سەرەوە دانیشت و توورەکە زێڕەکەی لە پێش خۆی دانا و سەرپێچەکەی لە سەری داکەند و لەسەر چۆکی دانا. لەو جەنگەیەدا کچێکی ڕووخۆش و جوانکیلە بە جلوبەرگێکی شکۆدارەوە وە ژوور کەوت. براکەم هەستا گوتی:

بەختەوەری من لەو دەرکەوە دێ کە تۆی لێوە دێ
خۆری ڕوخسارت لەکوێ هەڵبێ، تیشک لەوێوە دێ

" ' 'کچە بە ڕووی براکەمەوە پێکەنی و گەڕاوە دەرگاکەی داخست. هات لە لای براکەم دەستی گرت و بردییە دیوێکی دیکە کە فەرشی دیبای تێدا ڕاخرابوو. براکەم دانیشت. کچەش لە پەنای دانیشت. کەمێکیان گەمە کرد. دوای ئەوە کچە چووە دەرێ و براکەم لەوێ دانیشتبوو کە کۆیلەیەکی ڕەشی ناحەزی زەلام بە شیرێکەوە هات و بە براکەمی گوت: 'ئەی سووکترین مرۆڤی سەر زەوی، پەروەردەی دەست قەحبە و جندان، چۆناوچۆن ڕێت لێرە کەوت؟' براکەم کە ئەو گوتانەی بیست، نەیدەزانی بڵێ چی. کۆیلەکە جلەکانی لە بەر دادڕی و بە شیر زۆری لێ دا هەتا بێهۆشی کرد.

" ' 'کۆیلەکە وای زانی کە براکەم مردووە. هەر بۆیە هەرای کرد: 'مەلیحە!' گورج کەنیزێک هات سینییەک خوێی بە دەستەوە بوو. خوێی بەسەر برینەکانییەوە کرد. براکەم لە ترسی ئەوە نەکا بزانن ماوە و بیکوژن هەستی لە خۆی بڕی و نەجووڵاوە هەتا کەنیزەکە ڕۆیشت و کۆیلەکە هەرایەکی وەک جاری یەکەمی کرد و پیرێژن هات و لاقی براکەمی گرت و کێشایە ساردادوێکی تاریکەوە و هاویشتییە پاڵ کوژراوی دیکە کە لەوێ بوون. براکەم دوو شەو و ڕۆژ لەوێدا بوو. لە بەختی خۆی، خوێیەکە خوێنڕێژییەکەی

وەستاندبوو. هەر بۆیە نەمردبوو.

" ' 'براکەم کە زانی دەتوانێ بجووڵێتەوە، هەستا و کوونێکی لە دیواری سارداوەکەدا دیتەوە و چووە دەرێ. ئەو شەوە خۆی لە دالآنێکی تاریکدا شاردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، پیرێژن بۆ خستنە داوی یەکی دیکە لە ماڵە وەدەر کەوت. براکەشم بە دوای پیرێژنەدا ڕویشت بێ ئەوەی بهێڵێ پێی بزانێ. بەو شێوەیە لە ماڵەکە چووە دەرێ. ڕۆیشت هەتا گەیشتەوە ماڵەکەی خۆی و دەستی کرد بە دەرمانی خۆی هەتا برینەکانی چاک بووەوە. هەمیشەش ئاگای لێ بوو کە پیرێژنە خەڵکی فریو دەدا و دانەدانە دەیبردن بۆ ئەو ماڵە. بەڵام براکەم هیچی نەدەگوت. هەتا جوان خۆی گرتەوە و بەهێز بووەوە. کەمێکی توورەکە دروست کرد. پڕی کرد لە وەردە شووشە و لەتە سواڵەت. بە پشتێندێوە بەستی و عەبایەکی عەجەمی لە بەر کرد. شمشێرێکی لەژێر عەباکەیەوە حەشار دا و لە ماڵ وەدەر کەوت.

" ' 'کە پیرێژنەی دیت، بە عەجەمی گوتی: 'داپیرە، ئەرێ تەرازووی وات هەیە نۆسەد دیناری زێڕی پێ بکێشین؟' گوتی: 'من کوڕێکم هەیە سەڕافە و هەموو جۆرە تەرازوویەکی هەیە. لەگەڵم وەرە با بچین بۆ لای، با زێڕەکانت بۆ بکێشێ.' ئیدی پیرێژن لەپێشەوە و براکەشم بە دوایدا ڕۆیشت هەتا گەیشتنە بەر دەرگای ماڵەکە. لە دەرگایان دا کچە هاتە دەرێ و بە ڕووی براکەم پێکەنی. پیرێژنە گوتی: 'پاروویەکی چەورم هێناوە. عەجەمە.' کچە دەستی براکەمی گرت و بردییەوە ئەو دیوەی جاری دیکە. ماوەیەک پێکەوە دانیشتن. ئینجا کچە هەستا و بە براکەمی گوت: 'لێرە دانیشە تا من دێمەوە.' کە کیژە ڕۆیشت، هەر ئەو غولامە ڕەشەی جاری دیکە هاتەوە. شمشێری بە دەستەوە. گوتی: 'بەدفەڕ، هەستە.' براکەم هەستا. کۆیلەکە لەپێشەوە و براکەم لەدواوە بوو. شێری لە کالان دەرکێشا و لە ملی کۆیلەکەی دا. سەری کۆیلەکە وەک توپ کەوتە زەوی و خلۆر بووەوە. لاقی گرت و بردی لە سارداوەکەی هاویشت و بانگی کرد: 'مەلیحە لە کوێیە؟' کەنیزە کەشەفێک بە دەستەوە کە خوێی لەسەر بوو، هاتە ژوورێ. کە براکەمی بە شێرەوە دی، هەڵات. براکەم کەوتە سەری و گرتی و کوشتی و بردی لە سارداوەکەی خست. دوای ئەوە هەرای کرد: 'پیرێژن لە کوێیە؟' پیرێژن هاتە ژوورێ. براکەم گوتی: 'من دەناسییەوە؟' پیرێژن گوتی: 'ناتناسم.' براکەم گوتی: 'من خاوەنی پێنجسەد دینارە زێڕەکەم کە هاتییە ماڵەکەم دەستنوێژت شوشت و پاشان منت فریو دا و هێناتمە ئێرە.' ئەو جار ئەویشی دوو قاش کرد. ئینجا چوو بۆ کچەکە گەڕا. کە ئەوی دیتەوە، کچە گوتی: 'تکات لێ دەکەم، مەمکوژە و لێم خۆش بە.' لێی خۆش بوو. گوتی: 'کەنیشکە، تۆ بۆ لێرەیت و کێ تۆی هێناوەتە لای ئەو کویلەیە؟' کەنیشکە گوتی: 'من کچی بازرگانێک بووم، ئەو پیرێژنە هاتووچۆی منی دەکرد. ڕۆژێک پێی گوتم: 'ژنان لە ماڵی دراوسێیەکمان کۆڕێکی شادییان ڕێک خستووە، پێم

خۆشـە تۆش بێی و لەو بەزم و خۆشـییەدا بەشـدار بی و کەمێک خۆشـی ڕابوێری.' منیش هەسـتام و جلوبەرگی شیاوم کردە بەرم و توورەکەیەک کە سـەد دیناری زێڕی تێدا بوو. هەڵم گرت و لەگەڵ پیرێژنە هاتم بۆ ئەم ماڵە. کە هاتمە ئێرە، ئەو کۆیلە ڕەشـــەم لێرە دیت و ئەوە سـێ سـاڵە پێکەوە لێرەین.' براکەم گوتی: 'ئەگەر لەو ماڵەدا شـتێکی تێدایە، پیشـانم دە.' کیژە گوتی: 'ئێرە سـامانێکی زۆری تێدایە.' براکەم هەسـتا سـەری یەغدانەکانی کردەوە و پڕ بوون لە توورکە زێڕ. کچە گوتی: 'من لێرە دەبم. تۆ بچۆ کۆڵبەرێک بێنە و یەغدانەکان بەرە.'

" ' 'براکەم هاتە دەرێ و دە کەسی لەگەڵ خۆی برد. کە گەیشتە بەردەرگا سەیری کرد دەرگا کراوەتەوە. نە کچە لەوێ ماوە و نە یەغدانە زێڕەکان. هەر کەمێکی کەلوپەلی ماڵی لێ ماوە، لەگەڵ قوماشـە حەریرەکان. زانی کە کچە فریوی داوە. ناچار هەرچی لە ماڵەکەدا مابووەوە هەڵی گرت و لەگەڵ خۆی بردی و ئەو شەوە بە دڵی خۆش خەوت.

" ' 'کە ڕۆژ بووەوە، سـەیری کرد ئەوە بیسـت کەس لە پیاوەکانی شـارەداری لە بەردەرگا وەسـتاون. هەر کە ئەویان دیت، زوو گرتیان و بردیانە لای شـارەدار. شـارەدار لێی پرسی: 'ئەو ئاوریشمانەت لەکوێ هێناوە؟' براکەم بەسەرهاتەکەی گێڕاوە.

" ' 'ئیدی شارەدار تەواوی ماڵەکەی لە براکەم سەند و لە ترسی ئەوەی خەڵک بەو کارە نەزانن، کەمێکی ماڵ دایە و لە شار وەدەری نا. براکەم ڕێگای شـارەکانی دیکەی گرتە بەر. لە ڕێگا دزان پێشـیان پێ گرت و ڕووتیان کردەوە و گوێچکەشـیان بڕی. من کە ئەوەم بیسـتەوە، کەوتمە شـوێنی، دیتمەوە و بە دزییەوە هێنامەوە ماڵێ و هەتا ئێسـتاش ئەوە بە خێوی دەکەم.

### چیرۆکی لێوبڕاوەکە

" ' 'بەڵام خەلیفە، برای شەشەمینم کە هەردووک لێوی بڕابوو، پیاوێکی فەقیر بوو. ماڵی دنیای هیچ شـک نەدەبرد. ڕۆژێک وە دەر کەوت شـتێک پەیدا بکا و لە برسـان نەمرێ. لە ڕێگە خانوویەکی زۆر بڵندی دیت. داڵانێکی گەورەی هەبوو نۆکەر و خزمەتکارێکی زۆر لە بەردەرگەکەی وەسـتابوون. براکەم لە یەکیانی پرسـی و گوتی: 'ئەوە ماڵی کێیە؟' وەڵامیان داوە کە ئەوە ماڵی یەکێک لە کوڕەکانی پاشـایە. براکەم چووە پێشـێ و بە خوازەڵۆکی [١] داوای شتێکی کرد. خزمەتکارەکان گوتیان: 'بچۆ ژوورێ، ئەوەی دەتەوێ لە خاوەنماڵەکەی بستێنە.'

---

[١] . خوازەڵۆکی: پارسەکردن، سوالکردن.

" ' 'ئیدی چووە نێو دالانەکەوە. ماوەی سـەعاتێک ڕۆیشـت هەتا گەیشـتە حەوشـەی ماڵەکە. تەماشای کرد ماڵێکی گەورە و خۆش، لە نێوەڕاستی باخێکی خۆش و سەرسەوزدا. نەیدەزانی بچێ بۆ کام لا. هەتا لە سـەرەوەی ماڵەکەوە کابرایەکی ڕەنگپیاو و ڕووپاک و خوێنشیرینی دیت. ئەو پیاوە لە بەری هەستا. چاکوخۆشـی لەگەڵ کرد و هەواڵی پرسـی. هەژاری و نەداری بە سـیمای براکەمەوە دیار بوو. هەرکە قسـەی کرد، کابرا تێیگەیشـت. ئیدی نارەحەت و پەشێو بوو. لە نارەحەتیان یەخەی خۆی دادڕی و گوتی: 'چۆن شـتی وا دەبێ ئەمن لە شـارێکدا بم لەو شـارەدا هەژاری تێدا بێ و خەڵک بە برسـییەتی سـەر بنێنەوە؟'

" ' 'ئیدی زۆر بەڵێنی باش باشی بە براکەم دا و پێی گوت: 'ڕاوەستە با خواردن بێنن.' ئینجا فەرمانی دا تەشـت و مەسـینە١ بێنن. خزمەتکارەکان خۆیان وا دەردەخسـت ئەوە تەشت و مەسینەیان هێناوە. بەڵام هیچیشـیان نەهێنابوو. خاوەن ماڵەکەش دەستی کرد بە دەست شـوشـتن، هیچیشی لەپێش نەبوو. بە منیشـی گوت: 'دەسـتت بشـۆ، میوانی ئازیز.' دوای ئەوە بە خزمەتکارەکانی گوت: 'سـفرە ڕاخەن.' خزمەتکارەکان هەر دەهاتن و دەڕۆیشـتن تومەز ئەوە خەریکن سـفرە ڕادەخەن. بەڵام سـفرەیەک لە گۆڕێ نەبوو. دوای ئەوە براکەمیان بردە سـەر ئەو بە ناو سفرەیە. خانەخوێ دەستی دەکێشا و شـتی دێنا و دەیبرد بۆ دەمی و دەمی دەجووڵاندەوە، بەڵێ ئەوە شـتێک دەخوا. بە براکەشـمی دەگوت: 'شـەرم مەکە، بخۆ دیارە زۆرت برسـییە.' براکەشـم بە نابەدڵی دەسـتی دەبرد و لێوی دەبزاوت وای دەنواند ئەوە شتێک دەخوا. ئەو کابرایە بە براکەمی دەگوت: 'ئەو نانە هەڵگرە و چاو لە سـپێتییەکەی بکە.' براکەم هیچی لێ دیار نەبوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئەو پیاوە گاڵتەم پێ دەکا. بە خاوەن ماڵەکەی گوت: 'گەورەم لە تەواوی ژیانمدا لەوەی خۆشتر و سپیترم نەدیتبوو.'

" ' 'ئەو پیاوە گوتی: 'ئەو نانە کەنیزەکەم کردوویە و ئەویشم بە پێنجسەد دینار کڕیوە.' پاشـان خاوەنماڵ هەرای خزمەتکارەکانی کرد و گوتی: 'فڵان خواردن بێنن کە لە ماڵی هیچ پاشایەک وەگیر ناکەوێ.' بە براکەشمی دەگوت: 'بخۆ، زۆرت برسییە، بخۆ.' براکەشم دمی دەجولاندەوە و کاوێژی دەکرد. گوایە شـتێک دەخوا. خاوەنماڵەکەش هەر جارەی داوای خواردنێکی دەکرد، بەڵام لە ڕاسـتیشـدا هیچیان نەدەهێنا و هەر لە خۆڕا فەرمووی خواردنیشـی دەکرد. ئەو جارە بە خزمەتکارەکانی گوت: 'مەلی سـوورەوەکراو و بەرخی برژاو بێنن.' بە براکەشمی گوت: 'لەو شتە خۆشانە بخۆ.' براکەشم دەیگوت: 'گەورەم شتی ئەوەندە خۆشـم قەت نەخواردووە.' خاوەنماڵەکە وەک ئەوەی پاروو لە دمی براکەم بخا، دەستی لە دەمی دەبردە پێشێ و لێکدالێکدا باسی ئەو شتەخۆشانەشی دەکرد، بە جۆرێک

---

١. مەسینە: ئافتاوە.

براکەم بەردەوام زاری ئاوی دەکرد و هیچیش دیار نەبوو بیخوا. براکەم کشاوە. خاوەنمال گوتی: 'شەرم مەکە، زیاتر بخۆ.' براکەم گوتی: 'لەوە زیاترم بۆ ناخورێ، بە زیاد بێ.'

" ' 'ئەو پیاوە بە خزمەتکارەکانی گوت: 'حەڵوا بێنن.' خزمەتکارەکان خەریک بوون هەڵدەســـووڕان گۆیا ئەوە خەریکن حەڵوا درووســـت دەکەن و دەیهێنن. ئینجا خاوەنمال گوتی: 'لەو حەڵوا خۆش و لەو نوقڵە بۆن میسکیانە بخۆ.' براکەم هەر پەسنی ئەو خۆراک و حەڵوا و نوقڵانەی دەکرد. خـاوەنمـاڵ هەر لەبەر خۆیەوە دەیگوت: 'تەواوە، ئەوانە کەنیزەکانم لە ماڵێ سازی دەکەن و میسکی لێ دەدەن' و لەو جۆرە قسانە. براکەشم دەمی دەجووڵاندەوە و دەیگوت: 'بە زیاد بێ، چی دیکەم بۆ ناخورێ.' ئەویش بەردەوام دەیگوت: 'شـــەرم مەکە. ئەو خواردنانە زۆر خۆشـــن.' براکەم لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'بە خوا ئەو کابرایە بە کەرم دەزانێ. شـــەرت بێ دەبێ وای لێ بکەم، هەرگیز کاری وا نەکاتەوە.' دوای ئەوە خاوەنماڵ داوای شـــەرابی کرد. خزمەتکارەکان کەوتنە جووڵە و هاتوچۆوە گوایە شەرابیان هێنا. خاوەنماڵ ئاماژەی بۆ براکەم کرد و گوتی: 'پیاڵە هەڵگرە، تێکە.' واشی نواند کە ئەوە بۆخۆی خەریکە تێ دەکا و دەخواتەوە. پرسی: 'ئەرێ بە لاتەوە چۆن شـەرابێکە؟' براکەم گوتی: 'شـــەرابی ئەوەندە خۆشـــم نەخواردووەتەوە.' خاوەنماڵ هەر بە ئاماژە پیاڵەیەکی خواردەوە و پیاڵەیەکی بە دەمی براکەمەوە کرد. براکەم وای نواند کە شەرابەکەی خواردەوە.

" ' 'ئەوجار هەســـتا و وای پێشـــاندا کە مەســـت بووە، چەپۆکێکی وای بە ســـەری خاوەنماڵەکەدا دا، لەو ماڵەدا دەنگی داوە و دیسان بە هەموو هێزییەوە زللەیەکی لە پشتملی دا. خاوەن ماڵ گوتی: 'خوازەلۆکی هیچوپووچ، ئەوە بۆ وات کرد؟!' براکەم گوتی: 'گەورەم. تۆ چاکەت لەگەڵ ئەو کۆیلەیەی خۆت کردووە و هێناوتە لە ماڵی خۆتدا لەو شەرابە کۆنەت داوەتێ و ئێســـتا مەســـت بووە و ئاگای لە خۆی نەماوە، دە گوڕێنێ؟ پلە و پایەی تۆ لەوە بەرزترە لەگەڵ نەزانێکی ئاوا تێ کەوێ.' خاوەنماڵ کە ئەو قســـەی بیســـت، پێکەنی و گوتی: 'لە مێژە گەمە و گاڵتە بە خەڵک دەکەم، بەڵام کەسی وەک تۆم نەدیوە کە تاقەتی ئەو هەموو گاڵتەجارییەی هەبێ. من لە تۆ خۆش بووم و دەتکەم بە هاونشـــینی خۆم و نابێ لێم دوور کەوییەوە.' ئینجـا فەرمـانی دا خواردنی جۆراجۆریـان هێنـا و لەگەڵ براکەم دانیشـــتن خواردیان و بادەیان هێنا و خواردیانەوە مۆســـیقار و گۆرانیبێژی دەنگخۆشـــیان هێنا. کەنیزی جوان جوانیان هێنا و دەســـتیان کرد بە گاڵتە و گەپ و ســـەماو خۆشـگوزەرانی و مەیخواردنەوە. ئەو کابرایە وا لەگەڵ براکەم ڕێک کەوتبوون، دەتگوت لەمێژ ساڵە دۆست و هاوالن. پاشـــان کەوایەکی گرانبایی بە شـــانی براکەمدا دا و خەریکی خواردنەوە و خۆشـی بوون. بیســـت ســـاڵ بەو شـێوەیە بوون هەتا ئەو کابرایە مرد. ســـوڵتان دەســـتی بەســـەر ماڵەکەیدا گرت و براکەشـم لەو شـارە هەڵات. عەرەبان کەوتنە سـەر براکەم و گرتیانەوە و

ـە دیلیان گرت. هەموو ڕۆژێ ئەشـــکنجەیان دەدا و دەیانگوت: 'ماڵەکەمان دەیە و خۆت ـزگار کە، دەنا دەتکوژین.' براکەم دەگریا و دەیگوت: 'گەورەم، نە هیچم هەیە و نە هیچ جیگایەکیش شارەزام. من دیل و ژێردەستی ئێوەم.' عەرەبی ستەمکار گوێی نەدا قسەکانی ـو خەنجەرێکی دەرهێنا کە وشـــتری پێ دوو قاش دەکرا ئەوەندە تیژ بوو، هەردوو لێوی ـری.

" ' 'بە ڕێکەوت ئەو کێوییە ژنێکی هەبوو، کاتێک ئەو دەچووە دەرێ، خۆی بە دەســـت ـراکەمەوە دەدا، بەڵام شەرم لە خودا ڕێی لە براکەم دەگرت لەگەڵی جووت بێ. ڕۆژێک ژنە هاتبووە لای براکەم و خەریکی جەفەنگ و قســـە بوون کە لەپڕدا کێوییەکە هاتەوە و بە ـراکەمی گوت: 'گڵاو، ئەوە دەتەوێ ژنەکەم لە خشـــتە بەری؟' ئیدی کێردێکی دەرهێنا و ـەندامی نێرینەی براکەمی بڕی و هاویشـتییە سـەر یەسـترێک و بەرەڵای کردە نێو شـاخ و کێو. کاروانچییان تووشی بوون و ناسییانەوە، نان و ئاویان دایە و هێنابوویانە قەراخ شار ـو منیان ئاگادار کردەوە. منیش چووم ئەویشـــم بە دزییەوە هێناوە ماڵێ و ئێســـتا بژێوی ـەسەر منە.

" ' 'گەورەم، خەلیفە، من کە تازە هاتبوومە ئێرە، پێم کارێکی نادرووســـت بوو ئەو ـەسەرهاتانەت بۆ نەگێڕمەوە و بگەڕێمەوە ماڵێ.

" ' 'خەلیفە کە گوێی لەو بەســەرهاتەش بوو، پێکەنی گوتی: 'شـێخی نەدوێن، قســەکەت ـاستە و تۆ بێدەنگ و کەمقسـە و زۆربڵێ نییت. بەڵام لەو شـارە بڕۆ و بچۆ بۆ شـارێکی ـیکە.' ئیدی لە بەغدا چوومە دەرێ و زۆر شـار گەڕام هەتا ڕۆژێک بیسـتم گوتیان خەلیفە ـردووە و کەسێکی دیکە چووەتە جێگاکەی. منیش گەڕامەوە بەغدا. وا بوو چوومە لای ئەو کوڕە و چاکەیەکی زۆرم لەگەڵ کرد. ئەگەر من نەبایەم، دەشـــکوژرا و ئەوەی لەبارەی ـزوربڵێی و ناپیاویی منەوە گوتی، هەمووی درۆ و بوختانە و ڕاســـت نییە.' ' جا بەرگدروو ـاوای بە ســـوڵتانی گوت: 'کاتێک ئێمە چیرۆکەکەمان لە دەللاک بیســـت و زانیمان کە ئەو ـزوربڵێیە و ئەو لاوەی ئازار داوە، دەللاکمان گرت و خستمانە بەندیخانەوە و لەگەڵ لاوەکە ـانیشـتین و خواردمان و خواردمانەوە و هەتا شـەو قسـە و باسـمان کرد. دوای ئەوە من گەڕامەوە ماڵێ، خێزانم گوتی: 'ئەتۆ ڕۆژ هەتا ئێوارە خەریکی خۆشـی و ئاهەنگی خۆتی و ـنیش بە تاقی تەنیا مات و خەمبار لە ماڵێ دادەنیشم. ئەگەر هەر ئێستا نەمبەی بۆ سەیران ـو پیاسەیەک، لێت جودا دەبمەوە.' ناچار دەمودەست هەستام لەگەڵی چووم بۆ سـەیران و پیاسە و، کاتێک شەو گەڕاینەوە تووشی ئەو قەمموورە بووین کە مەست و کەلەلا کەوتبوو ـو لەبەر خۆیەوە ئەو شێعرانەی دەگوتەوە:

کێ لە منـی خـوازەڵۆکەوە پەیـامـێ بـۆ شـــا دەبـا؟

جـامـی جەم لـێرە کەوتـووە، جـامـی مەی غەوغـا١ دەکـا
تەرکەدنـیـا! خـەڕی کەوە، بـاوی ئەوانە نەمـا
ڕۆژی شـەراب و بـادەیە، مەی ئەورۆ غەوغـا دەکـا

" 'وا بوو ئێمە فەرمووومان کرد و ئەویش لەگەڵمان هاتەوە. من چوومە بازاڕ و ماسی سووورەکراوەم هێناوە. خێزانم پارووویەکی گەورەی لە گۆشتی ماسییەکە لە زاری قەمووورەکە نا و دەمی بە دەستی گرت و پێی گوت: 'قووتی دە.' ئیدی پاروووەکە لە گەرووی گیرا و مرد. پاشان هەڵمان گرت و بردمانەماڵی جوولەکە نۆشدارەکە.' کە بەرگدروو بەسەرهاتی دەللاکی لە سەرەتاوە تا کۆتای بۆ سوڵتانی چین گێڕاوە. سوڵتان ئاوای گوت: 'چیرۆکێکی خۆشت گێڕاوە، بەڵام دەبێ دەللاک بهێنییە ئێرە تا من ببینم و قسەی لێ ببیستم. ئێوەش ڕزگارتان بێ و، قەمووریش بنێژین. خێرا بەرگدروو لەگەڵ پیاوی سوڵتان چوون دەللاکیان هێنا. پیرەپیاوێک بوو تەمەنی لە نەوەد ساڵ تێپەڕ ببوو. پێستی ڕووی ڕەش و چەنەی سپی بوو، لووتی درێژ و گوێچکەی پان. سوڵتان کە ئەوی دیت، وە پێکەنین کەوت و گوتی: 'ئەی شێخی نەدوێن، لەو بەسەرهاتانەی خۆت بەسەرهاتێکمان بۆ بگێڕەوە.' دەللاک گوتی: 'ئەی پاشای جیهان! ئەو مەسیحی و جوولەکە و موسوڵمانە کێن؟ ئەو قەمووورە مردووە چییە؟ ئەو خەڵکە بۆ کۆ بوونەتەوە؟' سوڵتان گوتی: 'تۆ بۆ لەوانە دەپرسی؟' دەللاک گوتی: 'بۆ ئەوەی سوڵتان بزانی کە من زۆر قسە ناکەم و شتێک پێوەندی بە منەوە نییە خۆی تێ هەڵناقوتێنم. کە هەر بە ناوەکەشمدا دیارە و لەنێو خەڵکدا بە کەمقسە و نەدوێن ناسراوم و ناوی نەدوێنیان بە سەردا بڕیوم.' سوڵتان گوتی: 'بەسەرهاتی قەموور بۆ شێخی نەدوێن بگێڕنەوە.' ئیدی چیرۆکی قەموور و بەسەرهاتەکانی مەسیحی و جوولەکە و کارگێڕ و بەرگدرووویان بۆ گێڕاوە. دەللاک سەری ڕاوەشاند و گوتی: 'بەسەرهاتێکی سەیر بوون. دا سەری قەموور هەڵدەنەوە با ببینم.' سەریان هەڵداوە.

"دەللاک لە نزیک سەریەوە دانیشت. سەری بردە پێشێ و جوان چاوی لێ کرد. ئینجا دەستی کرد بە پێکەنین، ئەوەندە پێکەنی بە پشتدا کەوت و گوتی: 'هەر مردنێک هۆکارێکی هەیە، هۆکاریّ مردنی قەموور شتێکی سەیرە. دەبێ ئەوەی لە تۆمارەکاندا بنووسن هەتا ببێتە مایەی پەندی وەچەکانی داهاتوو.'

"سوڵتان گوتی: 'شێخی نەدوێن، مەبەستت لەو قسەیە چییە و بە چی پێدەکەنی؟'

---

١. غەوغا دەکا: ڕۆژێتی، دەسەڵاتدارە.

"گوتی: 'سـولّتان، قەسـەم بە کەرەمت! قەموور هێشـتا هەر زیندووە.' ئیدی کلدانەکەی دەرهێنا، بە نەختە ڕۆنێک کە لە هەنبانەکەدا بوو، کەمێکی قورگی قەموور چەور کرد و دایپۆشـی تا جوان گەرم داهات و ئارەقەی کرد. ئینجا مقاشـێکی دەرهێنا و لە گەرووی قەمووری ڕاکرد و ئێسکە ماسـییەکەی دەرهێنا. دەمودەسـت قەموور جوولاوە و پشـمی. پاش ئیستێک هەستا و گوتی: 'لااله‌الاالله محمد رسوالله.' دانیشتووان سەریان لەو ڕووداوە سووڕ ما. سولّتانی چین زۆر پێکەنی و گوتی: 'من شتی هێندە سەیر و سەرسووڕهێنەرم نەدیوە و نەمبیسـتووە.' پاشـان لەوانەی لەوێ بوون، پرسـی: 'تا ئێسـتا شـتی واتان دیوە کەسـێک بمرێ و زیندوو بێتەوە؟ ئەگەر خودا ئەو دەللاکەی نەکردبا هۆکار، ئەمڕۆ قەموور دەخرا ژێر گڵەوە.'

"دوای ئەوە فەرمووی: 'ئەو چیرۆکانە بنووسـن و لە خەزێنەدا ڕایانگرن.' جوولەکە و کارگێڕ و مەسـیحی خەڵات کرد و کەوایەکی شـۆڕیشـی لە بەر بەرگدروو کرد و کردی بە بەرگدرووی تایبەتی خۆی. قەمووریشـی خەڵات کرد و کردیە هاونشـینی خۆی. خەڵاتی لە بەر دەللاکیش کرد و ئەرکی بۆ دیاری کرد و کردیە کەیخودای دەللاکانی شـار. ئیدی پێکەوە ژیان هەتا تێکدەری خۆشـی گەیشـتە سـەریان. جا پاکی و بێگەردی بۆ ئەوەی قەت نامرێ. بەڵام خاوەنشکۆ! ئەو چیرۆکە لە چیرۆکی دوو وەزیرەکە خۆشتر نییە کە چیرۆکی «ئەنیسولجەلیس[1]»یشی تێدا گوتراوە." شەهریارشا پرسـی: "ئەو چۆناوچۆنە؟"

## چیرۆکی دوو وەزیر

شـەهرزاد گوتی: "خاوەنشـکۆ، بەسـرە پاشـایەکی هەبوو کە هەژاری خۆش دەویست و هەوڵی دەدا تێروپڕیان بکا و دایمە یارمەتی شـوێنکەوتووانی محەممەد [سـڵاوی خوای لێ بێ]ی دەدا و ناوی محەممەدی کوڕی سـلێمانی زەینی بوو. دوو وەزیری هەبوو. یەکیان موعینی کوڕی سـاوی و ئەوی دیکە فەزڵی کوڕی خاقان بوو. فەزڵی کوڕی خاقان کەسـایەتییەکی دڵاوا و بەڕەوشـت بوو. خەڵک زۆرتر ئەویان خۆش دەویسـت و پەسـنیان دەدا. لە دەهەندەی و دلۆڤانیدا جۆرێک بوو وەک شاعیر دەڵێ:

ئەگەر جاران پاشـا و گەورەی ئێرانییەکان دەیانکڕی
بە زەبـری دینـار و درەم کـۆیـلەی هەژار و پـێـپەتـی
لەو دەورەدا پـێشـەوایەک بـووەتە پـاشـای ئەو وڵاتە
هەر بە سـۆز و خۆشـەویسـتی هەموو خەڵک کۆیلەتی

---

[1] ئەنیسولجەلیس:هەڤاڵی هاونشین.

"بەڵام موعینی کوڕی ســاوییان خۆش نەدەویســت، ئەو خێری خەڵکی نەدەویســت و لەگەڵ خەڵک خراپ بوو، شیاوی ئەو بەیتە بوو:

کەســـێکی هەژار، لە بـرســـان بـمـرێ
هـێـنـدە دامــابــێ، بــێ یەخەت بـگــرێ
هـێـنـد بەرچـاوتەنـگـی یـارمەتـی نـادەی
گـیـانـیشـــی دەرچـێ ئـاوڕی وێ نـادەی
گەر بـێـتـو ســـکت بشـــێـلـێ ورچــێ
بـایەکی ســـووکیش لە ســـکت دەرنـاچێ'[١]

"بە هەڵکەوت ڕۆژێک پاشا لەسەر تەخت دانیشتبوو. ئەرکی بۆ سوپاکەی دیاری دەکرد. فەزلی کوڕی خـاقـانی قـاو کرد و گوتی: 'کەنیزێکم دەوێ ڕووگەش، کەزییەڕەش. ڕووحسووک، جوان و خاوەن ڕەوشتێکی بەرز بێ.' ئەوانەی لەوێ بوون گوتیان: 'کەنیزی ئاوا بە دەهەزار دیناریش وەگیر کەوێ پاشـا.' پاشـا لە جێوە خەزێنەداری گاز کرد و پێی گوت: 'دەهەزار دینار بەرە بۆ ماڵی فەزلی کوڕی خاقان.' خەزێنەدار دەهەزار دینارەکەی برد بۆ فەزڵ. وەزیر دەڵاڵەکانی ڕاســـپاردبوو کە هیچ کەنیزێک نەفرۆشـــن هەتا وەزیر نەیبینێ. هەر کەنیزێکیان هێنابایە بازاڕ، لەپێشـــدا پیشـــانی وەزیریان دەدا. ماوەیەکی زۆر ئەوە کاریان بوو. بەڵام وەزیر هیچ کەنیزێکی پەسن نەکرد.

"بە ڕێکەوت ڕۆژێک لە ڕۆژان یەکێک لە دەڵاڵەکان بەرەو ماڵی فەزلی کوڕی خاقان دەچوو کە ســەیری کرد ئەوە فەزڵ بەرەو کۆشـکی شـا دەچێت، پێشـی پێ گرت و گوتی: 'وەزیری بەڕێز! ئەو کەنیزەی دەتەویســت، پەیدا بووە.' وەزیر گوتی: 'کوا بیهێنە.' دەڵاڵەکە ماوەیەک ون بوو. دوای ئەوە کەنیزێکی هێنا وەک مانگ شـۆقی دەداوە، باڵای وەک سـەوڵ و چاوڕەش و کەمەرباریک و ســـمتپانوپۆڕ، جلی شـــکۆدار لە بەردا. کەنیز لە جوانیدا جۆرێک بوو، وەک شاعیر دەڵێ:

لەشولاری نەرم و شـــلک ڕێواس تای ناکا
باخی ســـینەی پڕ لە میوە، زار بۆی ئاو دەکا
قەفقەفی ئەگریجە و بســـکی داوە بۆ دڵم
چـۆن دڵ لەو داوە لا دەدا تـۆ بـڵـێ گـوڵـم
تیری نیگـای چـاوەکـانـت لەیزەرین[٢] بۆیە

---

[١]. مەبەست ئەوەیە هێند بەرچاوتەنگ و چاو چنۆکە.

[٢]. لەیزەر: تیشکێکی نادیارە و کاریگەرە.

"وەزیر کە دیتی، پەسندی کرد. ڕووی لە دەڵاڵەکە کرد و لە نرخەکەی پرسـی. دەڵاڵەکە گوتی: 'دەهەزار دینـاریـان داوەتێ، خـاوەنەکەی نەیداوە و گوتوویەتی: 'بە دەهەزار دینـار کەو و مراوی و شتی وا نادەن. ئەو دەهەزارە هەر خەڵاتی مامۆستاکەیەتی کە ئەوی فێری خەت و وشە و شیکردنەوە و بنەماکانی ڕێوشوێنی ئایینی و نۆشداری و ئەستێرەناسی و موسـیقـای کردووە.' وەزیر گوتی: 'خـاوەنی کەنیزەکە بێننە لای من.' دەڵاڵ خـاوەنی کەنیزەکەی هێنا لای وەزیر. پیاوێکی ئێرانی بوو کە لەبەر پیری هەر پێسـت و ئێسـکەکەی مـابووەوە. وەزیر پێی گوت: 'ڕازییت دەهەزار دینـاری نرخی ئەو کەنیزە لە سـولتـان محەممەدی کوڕی سـلێمانی زەینی وەرگری؟' ئەو کابرایە گوتی: 'ئەگەر داواکار سـولتان بێ. من وای دادەنێم هەر وەک دیاری پێشـکەشـی دەکەم.' وەزیر فەرمانی دا پارەکەی بۆ بێنن. کە پـارەکەیـان هێنـا، وەزیر پـارەکـانی بە خـاوەنی کەنیزەکە بێ ژمێرێ. دوای ئەوە دەڵاڵەکە گوتی: 'ئەگەر وەزیر ڕێم بدا، قسـەیەک دەکەم.' وەزیر گوتی: 'بیڵێ.' دەڵاڵ گوتی: 'وەزیری بەڕێز، ئەگەر بە قسـەی من دەکەی، ئەمڕۆ کەنیزەکە مەبە بۆ لای پاشـا، چونکە ئەو لەڕێی دوورەوە هاتووە و ماندووە، لەسەرخۆ نییە. هەتا دە ڕۆژێک لە کۆشکدا ڕایگرە بـا تەواو بحەسـێتەوە و بێتەوە سـەرخۆ و گەش و جوان بێتەوە، جا بیبەنە گەرمـاو جلوبەرگی شیاوی لە بەر کەن، ئەوجا بیبەنە خزمەت پاشا.'

"وەزیر پێشـنیاری دەڵاڵەکەی زۆر پێ باش بوو. کەنیزەکەی بردە کۆشـکی خۆی و دیوێکی تایبەتی بۆ دیاری کرد و هەموو پێداویسـتییەکی بۆ تەرخان کرد. خزمەتکاری لە بەردەسـت نا و ماوەیەک ئاوا بوو. فەزلی کوڕی خاقان کوڕێکی هەبوو تا بڵێی جوانچاک، بالاعەرعەڕ و بۆنعەنبەر. وەک شاعیر دەڵێ:

'تووله نەمامێکی لاوە، وەک دارچنار هەڵکشاوە
هێندە ڕێکوپێک و جوانە، تـا بڵێی لەبەردڵانە"

ئەو کوڕە ڕێکوپێکە ئـاگـاداری ڕەوتی کـاری ئەو کچە نەبوو. بـابی بە کەنیزەکەی گوتبوو: 'تۆم بۆ محەممەد پاشـای سلێمانی زەینی کڕیوە. من کوڕێکم هەیە ئەگەر ژنێک لە کۆلانیش ببینێ، سـواری دەبێ. تۆ بە هیچ جۆرێک نەچی خۆتی پێشـان بدەی ها.' کەنیزە گوتی: 'گوێڕایەڵ و بەرفەرمانتم.' هیچ نەهاتە پێشێ هەتا ڕۆژێک کەنیزە چوو بۆ گەرماو.

"کە لە گەرماو هاتە دەرێ، جلوبەرگی شـەنگ و شـەپاڵی لە بەر کردبوو و جوانییەکەی چەنـد هێنـدە ببوو. هـاتە لای ژنی وەزیر و دەسـتی مـاچ کرد. ژنی وەزیر گوتی:

ئەنیسولجەلیسم١، لە گەرماو چۆنت ڕابوارد؟' گوتی: 'خانم، جگە لە باسی خراپەی تۆ هیچ شـــتێک کەم نەبوو.' خانم بە کەنیزەکانی گوت: 'ســـاز بن، دەچین بۆ گەرماو.' کەنیزەکان هەســـتان لەگەڵ خانم چوون بۆ گەرماو و خانم دوو کەنیزی منداڵکاری لە بەردەرگای کۆشـک دانا و ئەنیســولجەلیســیش لە ژووریّ بوو. خانم بە کەنیزەکانی گوت: 'ڕێ نەدەن کەس بچێتە ژووریّ بۆ لای ئەنیسولجەلیس.' کەنیزەکان گوتیان: 'باشە، بەسەر چاو.'

"دوای ماوەیەک کوڕی وەزیر کە ناوی عەلی نوورەددین بوو، پەیدا بوو و لە دایکی دەگەڕا. کەنیزەکان گوتیان: 'چووەتە گەرماو.' ئەنیســـولجەلیســـیش لە ژوورەوە گوێی لە دەنگی عەلی نوورەددین بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خۆزگە دەمزانی ئەو کوڕە چ‌کارەیە وا وەزیر دەیگوت لە کۆلانیش تووشـــی ژنێک بێ، ئاوقای دەبێ. بە خودا پێم خۆشـــە ببینم.' ئینجا هەســـتا ســـەر پێ و چووە پێشـــێ بۆ لای عەلی نوورەددین تا ببینێ. ســـەیری کرد کوڕێکە دەڵێی مانگی چاردەیە. ئیدی عاشقی جوانییەکەی بوو، گوتی:

من عاشـقی ئەو لێوەم هەنگوین شـەرمەزاریێتی
عاشـقی ئەو لەشـە شـلکەم گوڵیش ئەویندارێتی
گەر حەزت لە گۆنگەڵە، خۆ لە گۆمی دڵی خە
دەریـای عیشـــقی بێبنە، تکـایە خۆی تێ مەخە

"کوڕەکەش کە چاوی بەو کەوت، گیرۆدەی ئەو ڕووگەشە بوو و گوتی:

شـــلکترە لە پەڕکی گوڵ ئەو ســـینگ و مەمکە جوانە لێت
دەڵێی خودا خۆشـــی ویســـتووی بە دزییەوە داوییە پێـت
نـیـگەرانـم کە ڕووڕەشـــی هەردووک دنـیـا بـم ئەمـن
بـێـتـو لەســـەر ئەو نەمـامە ڕەقـیـبـی مـن خـودا بـێـت

"کە کچە و کوڕە هەردووکیان بە داوی ئەوینی یەکدی گیرۆدە بوون. کوڕە ڕووی لە کەنیزەکان کرد کە ڕێی بدەن بچێتە ژووریّ. بەڵام کچەکان بە تەما بوون نەهێڵن بچێتە ژوور، ئەویش بەسەریاندا گوڕاندی. ئیدی کەنیزەکان ترسان و هەڵاتن و لەولاوە ڕاوەستان. ئینجا کوڕە چووە کۆشـکەوە و بە ئەنیســولجەلیســی گوت: 'تۆی وا بابم بۆ منی کڕیوی؟' ئەنیسـولجەلیس گوتی: 'بەڵێ.' دەمودەسـت کوڕەی سـەرخۆشـی بادەی ئەوین، بە ترسـەوە چووە پێشێ و نێوقەدی کچەی گرت، کچەش ئامێزی پێدا کرد. کوڕە زمانی کیژەی ئەوەندە مژی و خۆی تێ هەڵسوو هەتا پەردەی کچێنی لا برد.

١. هەوالی هاونشین: ئەنیسی جەلیس.

"که کەنیزەکان دیتیان کوڕەوەزیر لەگەڵ ئەنیسولجەلیس ئاویتەی یەک بوون، هاواریان کرد. عەلی نوورەددین ترسا و هەڵات. کە ژنی وەزیر گوێی لە زیقە و هاواری کەنیزەکان بوو، لە گەرماو هاتە دەرێ، لە کەنیزەکانی پرسی: 'ئەوە چی بوو؟' گوتیان: 'کە تۆ چووی بو گەرماو، کوڕی بەڕێزتان، عەلی نوورەددین، هات ویستی بچێتە لای ئەنیس خانم، ئێمە ڕێمان لێ گرت. ئەویش لێمان تووڕە بوو و ویستی لێمان دا، ئیدی ئێمەش هەڵاتین و ئەویش چووە لای ئەنیسولجەلیس و باوەشیان پێکدا کرد. ئیدی نازانین چییان کرد.' ژنی وەزیر کە ئەو قسەیەی بیست، چوو بۆ لای ئەنیسولجەلیس و شتەکەی لێ پرسی. ئەنیسولجەلیس گوتی: 'خانمەکەم، من دانیشتبووم کە گەنجێکی جوانچاک هات و پێی گوتم: 'تۆ هەر ئەو کەسەی وا بابم بۆ منی کڕیوە؟' گوتم: 'بەڵێ.' بە خودا خانمەکەم، من وام زانی ئەو بە ڕاستیەتی. ئەو جار هاتە پێشێ و لە ئامێزی گرتم.' ژنی وەزیر گوتی: 'جگە لەوەش کارێکی دیکەی کرد؟' ئەنیسولجەلیس گوتی: 'بەڵێ سێ ماچیشی کردم.' ژنی وەزیر گوتی: 'کردتی بە ژن یان نا؟' ئەنیسولجەلیس دەستی کرد بە گریان و ژنی وەزیریش لەگەڵ کەنیزەکان دەستی کرد بە گریان. لە خۆیان دەدا و ڕووی خۆیان دەڕنی. لەوە دەترسان کە وەزیر عەلی نوورەددین بکوژێ.

"لەو جەنگەیەدا وەزیر هاتە ژوورێ و پرسی: 'بۆ دەگرین؟' ژنی وەزیر ناچار ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. وەزیر جلەکانی بەری دادڕی و ڕدێنی خۆی هەڵقەندەوە. ژنی وەزیر گوتی: 'خۆت مەکوژە، من دەهەزار دیناری کەنیزەکە لە سامانی خۆم دەدەم.' وەزیر گوتی: 'من پێویستیم بە پارەی کەنیزەکە نییە. لەوە دەترسم گیان و ماڵم بکەوێتە مەترسییەوە.' ژنە گوتی: 'گەورەم، لەبەر چی؟' گوتی: 'مەگەر تۆ نازانی موعینی کوڕی ساوی لە شتێکی وا دەگەڕێ بۆ تێچێنییە، هەر ئەو شتە ببیستێتەوە، گورج دەچێ سوڵتان ئاگادار دەکاتەوە و پێی دەڵێ:' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سی و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، وەزیر بە ژنەکەی گوت: 'موعینی کوڕی ســـاوی دژمنمە، کە ئەو ڕووداوە ببیستێتەوە پاشا ئاگادار دەکاتەوە، پێی دەڵێ. دەڵێ: 'ئەو وەزیرەی کە پێت وا بوو خەیانەتکار نییە، چووە بە دەهەزار دینارەکە کەنیزێکی کڕیوە کەس کەنیزی وای نەدیوە، چونکە کەنیزەکەی پێ هەڵکەوتە و باش دەبێ، بە کوڕەکەی خۆی دەڵێ بۆ تۆ بێ باشـــترە هەتا شا. ئینجا کوڕەکەی کەنیزەکە لە کچێنی دەخا، ئێستا ئەو کەنیزە ئەوە لە ماڵە وەزیرە.' پاشـــاش بەو باوەڕەی بە منی هەیە، پێی دەڵێ: 'درۆ دەکەی.' ئەویش مۆڵەتی هاتنە ماڵم لە پاشـا وەردەگرێ و دێتە ماڵێ و کەنیزە دەبا بۆ پاشـا. کەنیزەش ناچار دەبێ ڕووداوەکە بۆ پاشا دەگێڕێتەوە. ئیجا موعینی کوڕی ساوی دەرفەرت دێنێ، بە پاشا دەڵێ: 'من ڕاوێژکاری دڵســـۆزی تۆم، بەڵام بە داخەوە قەدرم نازانن.' پاشـــا قســـەکەی قەبووڵ دەکا، ئەو دەکا بە کەسی یەکەمی خۆی و فەرمانی کوشتنی منیش دەدا.'

"ژنی وەزیر گوتی: 'خۆ هەموو کەس ئـاگاداری ئەو کەنیزە نییە. تۆ لای کەس دەنـگ مەکە و کارەکە بە خودا بســـپێرە.' وەزیر کەمێک ئارام بووەوە و هاتەوە ســـەرخۆ. بەڵام عەلی نوورەددین لە ئاکامی ئەو کارە دەترســـا. بە ڕۆژدا لەو باخانەدا دەســـووڕاوە و نیوەشـــەو دەهاتەوە لە لای دایکی دەخەوت. دیســـان بەیانی زوو پێش ئەوەی کەس بە دەرەوە بێ، وەدەر دەکەوت. هەتا مانگێک بەردەوام ئەوە کاری بوو. ڕۆژێک ژنی وەزیر بە وەزیری گوت: 'ئەگەر کارەکە هەر وا بچێتە پێشـــێ، ئەو کچ و کوڕە هەردووکیان لە تاوان دەمرن.' وەزیر گوتی: 'ئەی چ بکەین؟' ژنە گوتی: 'ئەمشـــەو مەخەوە. کە کوڕەکە هاتەوە، بیگرە و لەگەڵی ئاشـــت بەوە و کچەکەی دەیە. چونکە ئەوان هەردووکیان یەکتریان خۆش دەوێ. منیش نرخی کەنیزەکەت دەدەمێ.' وەزیر ئەو شەوە نەخەوت، کە کوڕەکەی هاتەوە، گرتی و ویســـتی بیکوژێ. دایکی گوتی: 'ئەوە چ دەکەی؟' وەزیر گوتی: 'دەیکوژم.' کوڕی وەزیر چـاوی پڕ بوو لە ئـاو و گوتی: 'پەلە مەکە ڕاوەســـت مەمکوژە، خۆ من هەر لە بەردەســـتی تۆ دام.' ئیدی وەزیر لەســـەر ســـینگی کوڕە هەســـتا و گوتی: 'کوڕم، ئەنیســـولجەلیســـت دەدەمێ. بەو مەرجەی نەیفرۆشـــی و بە مێردی نەدەی.' ئیدی ســـوێندی خوارد و بەڵێنی بە بابی دا کە نە بیفرۆشـــێ و نە بە مێردی بدا. دوایی، وەزیر کەنیزەکەی دا بە کوڕەکەی.

"عەلی نوورەددین و کەنیزە بە کەیف و خۆشـــییەوە ژیان و خودای مەزن کەنیزی لە زەینی پاشـــا دەرکرد هەتا ســـاڵێک بەو شـــێوەیە ڕابرد. موعینی کوڕی ســـاویش لە ترســـی فەزڵی کوڕی خاقان نەیدەوێرا قســـە لەگەڵ پاشـــا بکا. دوای ســـاڵێک ڕۆژێک فەزڵی کوڕی

خاقان له گەرماو هاتە دەرێ و ئارەقەی کردبوو، هەوا لێی دا، نەخۆش کەوت و ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ نەخۆشــییەکەی لێ پیســـتر دەبوو. ڕۆژێک نوورەددینی بانگ کردە لای خۆی و پێی گوت: 'کوڕی خۆم، ناتوانی لە دەســت ڕۆژی دیاریکراو ڕاکەی و میوەی نەگەیویشــت پێ ناخورێ. هەموو کەس ڕۆژێک دەمرێ. کوڕی من، وەســیییەتم بۆ تۆ ئەوەیە کە لە خراپە دووری بکە و دواڕۆژی کارت لە بەرچاو بێ.' ئیدی شـــایەدومانی هێنا، ڕۆحی فڕی و لە باخی بەهەشـــت هێلانەی چێ کرد. ئینجا هاوار و ڕۆڕۆی کەنیز و نۆکەر و کۆیلەکانی کۆشک بەرز بووەوە و پاشا و گەورە گەورەکانی وڵات هەموو زانیان. سـەرۆک و میر و فەرمانڕەوا و وەزیران و خەڵکی شـــار هەموو کۆ بوونەوە. یەکێک لەوان موعینی کوڕی ســاوی بوو. وا بوو فەزلی کوڕی خاقانیان ناشــت و گومبەزیان لەســەر درووســت کرد. قورئانخوێنان لەوێ دانیشـتن و نوورەددینیش چۆکی خەمی لە ئامێز گرت و هەتا ماوەیکی زۆر خەمی کۆچی بابی ئازاری دەدا.

"ڕۆژێک لە ماڵێ دانیشـــتبوو، یەکێک لە برادەرەکانی بابی لە دەرگای دا. کە کردییەوە، ئەو کابرایە دەســتی نوورەددینی ماچ کرد و گوتی: 'گەورەی من، کێ هەیە بابی نەمردبێ؟ ئەو دنیایە کاروانسەرای سەروەری یەکەم و کۆتایە. تۆش خەم و خەفەت وەلا نێ و ژیانی ئاســـای بژی.' ئەوە بوو ئەو قســـانە کاری تێ کرد و دیوەکەی پڕ فەرش کرد و لەوێ دانیشـــتن. دە کەس لە منالی گەورە گەورەکانی لە خۆی کۆ کردەوە و دەســـتیان کرد بە خۆشـــی و عەیش و نۆش. هەموو ڕۆژێ دەیخوارد و دەیخواردەوە و دەرخواردی خەڵکی دەدا و دەیبەخشـــییەوە. هەتا ڕۆژێک پارێزەری ماڵ و خەرجی بابی هاتە لای و گوتی: 'گەورەم، ئەو جۆرە خەرجانە ماڵەکەت تەواو دەکا. مەگەر نەتبیســـتووە دەڵێن: 'هەر کەس خەرج و داهاتەکەی خۆی نەزانێ، تووشـــی هەژاری دەبێ'؟' نوورەددین کە ئەو قســـەیەی بیســـت، خێســـەیەکی لێ کرد و گوتی: 'نە بەخیلی کەس دەوڵەمەند دەکا و نە بەخشـــینەوە کەس هەژار دەکا. ئەو قسانە بە گوێی مندا ناچن.'

"پـارێزەر لە لای نوورەددین هـاتە دەرێ. نوورەددینیش هەر وا بەردەوام بوو لە دەستبڵاوی و تەخشانوپەخشانی ماڵەکەی. هەر کام لە هاوڕێکانی گوتبای فڵان شت جوانە یان چاکە، نوورەددین دەیگوت ئەوە ئەوەم بە تۆ بەخشـــی. هەموو ژەمێک ســـفرەی بۆ برادەر و هاوڕێیانی ڕاخرابوو. هەتا ســـاڵێک ئاوا بوو. دوای ســـاڵێک ڕۆژێک نوورەددین لەگەڵ هاوڕێکانی دانیشتبوو کە پارێزەرەکەیان هاتە لای و لەبن گوێی گوتی: 'گەورەم، ئەو شـــتەی لێی دەترســـام هاتە دی. ئێســـتا بای یەک درەممان نە ماڵ ماوە و نە پارە.' کە نوورەددین ئەوەی بیست، سـەری داخست و مات و خەمین بوو. برادەرەکانی تێگەیشـتن. یەکیان هەسـتا و ڕوخســەتی ڕۆیشــتنی خواســت. نوورەددین گوتی: 'بۆ دەڕۆی؟' گوتی: 'ئەمشـــەو ژنەکەم منداڵی دەبێ، ناتوانم بە تەنیا بەجێی بهێڵم.' نوورەددین ڕێی دا و ئەو

ڕۆیشت. یەکی دیکە هەستا و گوتی: 'گەورەم، ئەمڕۆ حەوتووی ئەو کوڕەی براکەمە، دەبێ لە ئاهەنگەکەیدا لەوێ بم.' وا بوو یەک یەک ڕوخسەتیان خواست و ڕۆیشتن. نوورەددین بە تەنیا ماوە و ئەنیسولجەلیسی بانگ کرد و گوتی: 'دەزانی چم بەسەر هات؟' ئەوەی لە پارێزەرەکەی بیستبووی هەمووی بۆ گێڕاوە. ئەنیسولجەلیس گوتی: 'سەروەرم، ماوەیەک لەوە پێش ویستم ئەوەت پێ بڵێم. گوێم لێ بوو ئەتۆ ئەو شێعرەت دەگوت:

مەیگێڕ تێکە مەی، دنیا هەتا سەر بۆ کەس پێک نایە
ئەو زێڕ و زیوەی کە تۆ دەیبینی بەرەو فەنایە
چ بکەم لە زێڕ و زیوی سارد و سڕ، من شادیم دەوێ
دەیدەم بە بادە، خۆشی دونیایە لە شادبووندایە

" 'ئیدی بێدەنگ بووم و هیچم نەگوت.' نوورەددین گوتی: 'ئەنیسولجەلیس، تۆ دەزانی کە من ئەو ماڵەم لە پێناو برادەراندا داناوە. پێم وا نییە لە ڕۆژێکی ئاوادا پشتم تێ کەن و ئەو هەموو چاکە و گەورەییەی لەگەڵم کردوون، لە بیر بکەن. ئێستا دەچم پارە لە یەکیان وەردەگرم و شت دەکڕم و دەفرۆشم و لە هەڵخەرجی و بەڕەڵای دوور دەکەومەوە.' ئەنیسولجەلیس گوتی: 'ئەوانە خێریان بە نێوچاوانەوە نییە.' نوورەددین قسەکەی ئەوی بە گوێ نەکرد و چووە دەرێ و ڕۆیشت هەتا گەیشتە گەڕەکێک کە ماڵی دە کەسێک لەو هاوڕێیانە لەوێ بوون. ئینجا چوو لە بەردەرگای یەکێک لە برادەرەکانی ڕاوەستا و لە دەرگای دا. کەنیزێک هات دەرگای کردەوە. نوورەددین گوتی: 'بچۆ بە خاوەنەکەت بڵێ عەلی نوورەددین لە بەردەرگا ڕاوەستاوە و چاوەڕێی کەرەمی تۆیە.' کەنیزە چووە ژووری و خاوەنەکەی ئاگادار کردەوە، خاوەنەکەی لە کەنیزەکە توورە بوو گوتی: 'بچۆ بڵێ لە ماڵ نییە.' کەنیزە گەڕاوە و قسەکەی خاوەنەکەی بە نوورەددین گوت. نوورەددین لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر ئەویان هیچی لە چاودا نەبێ، بەو مانا نییە کە ئەوانی دیکەش وا بن. دەچم ئەوانیش تاقی دەکەمەوە.' ئیدی چووە ماڵی هاوڕێیەکی دیکەی. ئەویش هەر ئەوەی گوت کە هاوڕێکەی دیکەی گوتی. نوورەددین گوتی: 'تازە هەموویان تاقی دەکەمەوە بزانم هەموویان ئاوان. هاتوو لەو نێوەدا یەکیان چاکەی لە چاودا بوو و هەر هاورێکەی جاران بێ.' ئیدی چوو لە دەرکی هەموویانی دا و یەکیان خۆیان پیشان نەدا و فریای نەکەوتن. عەلی نوورەددین گەڕاوە بۆ لای ئەنیسولجەلیس و بۆی گێڕاوە. گوتی: 'من پێم نەگوتی هاوڕێیەتی ئەوانە قازانجی نییە؟' نوورەددین گوتی: 'هیچیان خۆیان پیشان نەدام.' ئەنیسولجەلیس گوتی: 'شتەکانی ماڵەوە بفرۆشە و خەرجی کە.' نوورەددین هەموو ڕۆژێک شتێکی دەفرۆشت هەتا هیچیان لە ماڵدا نەما و بە ئەنیسولجەلیسی گوت: 'ئێستا چ بکەین؟' ئەنیسولجەلیس گوتی: 'چار هەر ئەوەیە من ببەی بۆ بازاڕ و بمفرۆشی. تۆ دەزانی باوکت

منی بە دەهەزار دینار کڕیوە. بەشـــکو خودا گرێیەک لە کارت بکاتەوە. هاکا خودا کارێکی کرد ئێمەی بە یەک گەیاندەوە.' گوتی: 'ئەی ئەنیسولجەلیس، دووری لە تۆ بۆ من سەختە و مردنە، ناتوانم.' ئەنیسولجەلیس گوتی: 'بۆ منیش زۆر دژوارە، بەڵام چار نییە. چ بکەین؟'

"ئیدی نوورەددین دەستی ئەنیسولجەلیسی گرت و بە چاوی بە فرمێسکەوە بردی بۆ بازاڕ. ئەو جار ئەنیسولجەلیسی لە لای دەلاڵێک دانا و گوتی: 'بزانە چەندە دەکا، بیفرۆشە.' دەلاڵەکە گوتی: 'نوورەددین، مەگەر ئەوە ئەنیسولجەلیس نییە کە باوکت بە دە هەزار دینار لە منی کڕی؟' نوورەددین گوتی: 'بەڵێ ئەوە.' ئیدی دەلاڵەکە ڕاوەســـتا هەتا بازاڕ تەواو خۆش بوو. دەلاڵ هەسـتا و هەرای کرد و پەسـنی ئەنیسـولجەلیسـی کرد و پێیدا هەڵگوت هەتا یەکێک لە کڕیارەکان ئامادە بوو بە چوارهەزار و پێنجسەد دینار بیکڕێ. خەریک بوون قسـەیان لەبارەوە دەکرد کە موعینی کوڕی سـاوی وەزیر لەوێوە تێپەڕی. نوورەددینی دی کە لەوێ ڕاوەسـتاوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بۆ لەوێ ڕاوەسـتاوە؟ خۆ ئەو ئەوەندەی نییە کەنیز بکڕێ. ڕەنگە ئەوەندە دەستتەنگ بێ هاتبێ کەنیز بفرۆشـێ. ئەگەر وابێ دڵم ئۆخژنی دیتێ.' ئیدی بانگی دەلاڵەکەی کرد: 'ئەو کەنیزەی تۆ پەســـنی دەکەی، من دەیکڕم.' دەلاڵ کەنیزەکەی بردە لای وەزیر. وەزیر کە ڕوخسـاری پەریئاسـای ئەوی دی، دڵی گرتی و لە نرخەکەی پرســـی. دەلاڵەکە گوتی: 'تا ئێســـتا چوارهەزار و پێنجســـەد دیناریان داوە.' بازرگانەکان کە زانیان وەزیر بە تەمای کڕینێتی و دەیانزانی وەزیر چەند زاڵم و ملهوڕە، هەموو بڵاوەیان کرد و کەس نەما نرخەکەی بەرێتە ســـەرێ. ئینجا وەزیر بە دەلاڵی گوت: 'بۆ ڕاوەســـتاوی؟ ئەوە من بە چوارهەزار و پێنجســـەدەکە کڕیم.' دەلاڵ چووە لای عەلی نوورەددین و گوتی: 'کەنیزەکەیـان بە خۆڕای هەڵگرت.' نوورەددین گوتی: 'بۆ؟' دەلاڵ گوتی: 'ئەمن ویســتم نرخێک داندرێ بۆ دەسـتپێک. یەکەم بازرگان کە نرخی لەســەر دانا، چوارهەزار و پێنجســـەدی دا. نۆرەی زیادکردنی لەلایەن بازرگانێکی دیکەوە بوو کە ئەو زاڵمە هـاتە بـازاڕەوە و کەنیزەکەی دیـت و هەر بەو نرخە قەبووڵی کرد. پێم وا بێ کەنیزەکەی ناسـی. ئەگەر هەر ئەو نرخە بدا، ئەوە لە ڕوحمی خوداوە دەبێ. بەڵام من لەوە دەترســـم کە چەکی کەســـێکی دیکەت بداتێ و حەواڵەی ئەوت بکا و ئەویش فێر کا ئەم دەست و ئەو دەسـتت پێ بکا و ناڕەحەتت بکەن و لە دەرفەتێکدا چەکەکەت لێ وەرگرن و بیدڕێنن. لەو نێوەدا پارەکەی تۆ بخورێ و دەستت لە هیچ گیر نەبێ و کەنیزەکەشت بچێ. خۆ تۆ دەرەقەتی ئەو زاڵمەش نایەی.'

"نوورەددین کە ئەو قســـانەی بیســـت، گوتی: 'چ بکەین؟ چار چییە؟' دەلاڵ گوتی: 'من ڕێگایەکت پیشـــان دەدەم، ئەگەر بە قســـەم بکەی، ئەوە قازانج دەکەی. ئەویش ئەوەیە هەر ئێستا وەرە کەنیزەکە لە دەست من بستێنە و زللەیەکی لێ دە بڵێ هەر ویستم قسـەکەی خۆم بەرمە ســـەرێ و بت دەمە دەســت دەلاڵ بۆ ئەوەی بزانی ئەگەر بێتو گوێڕایەڵم نەبی

من ئەو کارە دەکەم؟ ئەم جاریش وەرە با بڕۆینەوە. نوورەددین، ئەگەر تۆ وا بکەی، وەزیر دەڵێ ئەوە هەر لەبەر سـویندەکەی هێناوییە بۆ بازاڕ.' نوورەددین گوتی: 'فکری چاکە و بە قسـەت دەکەم.' ئیدی دەڵاڵ چوو دەسـتی کەنیزەی گرت و بە وەزیری گوت: 'ئەو گەنجە خاوەنی ئەو کەنیزەیە، ئارەزووی خۆیەتی بەو نرخە دەیدا یان نا.' ئەو جار نوورەددین گەیشـتە لای دەڵاڵ و دەسـتی کەنیزەکەی لە دەسـت دەر هێنا و زللەیەکی لێ دا و گوتی: 'ئەوە لەبەر سـویندەکەم هێنامی بۆ بازاڕ، دەنا من پێویسـتیم بە پارەی تۆ نییە، ئیدی نەچی سـەرپێچی بکەی. وەرە با بڕۆینەوە ماڵێ. ئەگەر من شـتەکانی ماڵێ بفرۆشـم هەر جارەی نرخی تۆ شـت دەفرۆشـم.' موعینی کوڕی سـاوی ڕقی لە نوورەددین هەسـتا و پێی گوت: 'هەتیوە زۆڵە، هێشـتا شـتت ماوە بیفرۆشـی؟' نوورەددین کوڕێکی بە زیپک و زاکوون بوو، نەیتوانی هەر وا بە ئاسـانی بە سـەرییەوە بچێ. نێو قەدی وەزیری گرت و لەو سـەرەوە کێشـایە خوارێ و لە زەوی دا. کوڕی سـاوی لە نێو خۆڵ و خاکدا دەتلاوە و عەلی کوڕی خاقان بە مست لێی دەدا. یەکێک لە مستەکان لە دەمی درا و تەواوی ددانەکانی تێک شکاند و خوێن بە چەنەیدا هاتە خوارێ. دە کەس لە پیاوەکانی کوڕی سـاوی لەگەڵی بوون کە ئەوەیان دیت، هەڵیان کێشایە شیر و خەنجەر.

"خەڵک و بازرگانەکان کە عەلی نوورەددینیان خۆش دەویسـت، بە پیاوەکانی کوڕی ساوییان گوت: 'ئەگەر کوڕی سـاوی وەزیرە. عەلی نوورەددینیش کوڕەوەزیرە. جارێک بە شـەڕ دێن و جارێک ئاشـت دەبنەوە. ئەگەر بۆی بچن، ڕەنگە شـتێکی لێ بێ، ئەو دەم دەکوژرێن. وا چاکە ئێوە خۆ تێ هەڵنەقوتێنن، لێیان گەڕێن.' پیاوەکان بە قسەی خەڵکەکەیان کرد. عەلی کوڕی فەزڵ ئەوەندەی توانی لە کوڕی سـاوی دا و لە قوڕ و خۆڵی وەر دا. ئینجا دەستی کەنیزەکەی گرت و ڕۆیشـتنەوە ماڵێ. بەڵام کوڕی ساوی هەر وا بە لەشـی قوڕاوی و خویناوییەوە چوو بۆ لای پاشـا. پاشـا گوتی: 'ئەو چییە؟ بۆ ئاوای؟' گوتی: 'پاشـام، ئەمڕۆ لە بازاڕ دەگەڕام، ویسـتم کەنیزێک بۆ چێشـتخانە بکڕم. لەنێو کەنیزەکاندا کەنیزێکم دی کەس شـتی وای نەدیوە. دەڵاڵ گوتی: 'ئەوە کەنیزی عەلی کوڕی خاقانە کە کاتی خۆی پاشـا دەهەزار دیناری دا بە بابی، هەتا کەنیزێکی بۆ بکڕێ. کاتێک ئەو کنیزەی دیتەوە و زانی ئەوەندە جوان و ڕێکوپێکە، دای بە کوڕەکەی خۆی.' کاتێک فەزڵ کوڕی خاقان مرد کوڕەکەی دەستی کرد بە خۆشگوزەرانی و تەخشانوپەخشان و دەستبڵاوی هەتا هیچی نەما. کەنیزەکەی دابوو بە دەڵاڵ بیفرۆشـێ. بازرگانەکانیش نرخیان لەسـەر داناوە و زیادیان کردووە هەتا گەیشتووەتە چوارهەزار و پێنجسەد دینار. من لە دڵی خۆمدا گوتم: 'وا چاکە بۆ پاشای بکڕم.' ئینجا بە عەلی کوڕی خاقانم گوت: 'من ئەو کەنیزە دەکڕم ها ئەوەش پارەکەی.' گوتی: 'من کەنیزە بە جوولەکە و مەسـیحی دەفرۆشـم، بە تۆی نافرۆشـم.' گوتم: 'من بۆخۆم ناوێ، بۆ پاشـای دەکڕم.' هەر کە ئەو قسـەیەی بیست، منی

ئەســـەر زینەکە کێشـــا خوارێ و چونکە من پیر و کەمتاقەت بووم، ئاوای لێ کردم کە دەیبینی.' ئەوەی گوت و دەستی بە گریان کرد.

"کە پاشـــا وەزیری ئاوا دیت و ئەو قســـانەی بیســـت، ڕقی هەســـتا و چل کەســـی شـــمشـــیربازی ناردە ماڵی عەلی کوڕی خاقان و گوتی: 'ماڵەکەی تالان کەن و خانووەکەی بێ بڕووخێنن و لەگەڵ کەنیزەکەی قۆڵبەستیان کەن و بیانهێننە ئێرە.'

"پیاوەکان چوون بۆ ماڵی عەلی کوڕی خاقان. ســـەنجەر ناوێک کە فەزڵی کوڕی خاقان زۆری چاکە و گەورەی بۆی ببوو، ئەوەی لە چاودا هەر مابوو، نەیتوانی بێت و کوڕەکەی قۆڵبەست بکا. هەر بۆیە بە لایەکی دیکەدا خۆی گەیاندە ماڵی عەلی کوڕی خاقان، پێی گوت: 'ئەوە کوڕی ســـاوی داوی بۆ ناوییەوە. ئەگەر بتگرن، ڕزگارت نابێ. هەرچی زووە لەگەڵ کەنیزەکەت خۆتان دەرباز بکەن و هەڵێن. ئەوە پاشـــا چل کەســـی ناردووە بێن ماڵەکەت تالان کەن و ئێوەش بگرن و بتانبەنە لای پاشا.' دەستی لە گیرفانی ڕاکرد و چل دیناری بە عەلی نوورەددین دا و گوتی: 'باوەڕ بکە ئەگەر لەوە زیاترم هەبا، دەمدایەی.'

"ئیدی عەلی نوورەددین زێڕەکانی لێ وەرگرت و ئەنیســـولجەلیســـی ئاگادار کردەوە و گورج لە شـــار وەدەر کەوتن. ڕۆیشـــتن هەتا گەیشـــتنە قەراخ دەریا. ســـەیریان کرد ئەوە کەشـــتییەک بە تەمایە بڕوا و کەشـــتیوانەکە لە لای ڕاوەســـتاوە بە خەڵکەکە دەڵێ هەرکەس هەرشتێکی لە بیر چووە یان کارێکی هەیە، زوو جێبەجێی کا، دەڕۆین. هەموو گوتیان: 'هیچ کارێکمان نەماوە.' ئیدی کەشتیوان فەرمانی دا، گوریسەکانیان کردەوە و چارۆکەیان هەڵدا. نوورەددین زوو گەیشـــتێ و هاواری کرد: 'کاکی کەشـــتیوان! بۆ کام شـــار دەچی؟' گوتی: 'دەچم بۆ داوسسەلام—بۆ بەغدا.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کە کەشـــتیوان گوتی: 'دەچین بۆ بەغدا.' ئیدی نوورەددین و ئەنیسولجەلیس سوار بوون. کەشتی وەڕێ کەوت، بای خوازراو هات و کەشتی، وەک باڵ بگرێ، بەرەو ئامانج ئاژووت. با نوورەددین و ئەنیس برۆن بۆ بەغدا ئێمەش دەگەڕێینەوە لای پیاوەکانی پاشا.

"پیاوەکانی پاشـــا دەرگای ماڵی نوورەددینیان شـــکاند و ڕژانە ماڵەکەیەوە، دەرک و پەنجەرەیان شـــکاند و دیوەکانیان کاول کرد و کەلێن و کولێنی ماڵیان پشـــکنی، بەلام سۆراغێک لە نوورەددین نەبوو. دوای وێرانکردنی ماڵەکەی، چوونەوە لای پاشـا و گوتیان کە نوورەددین دیار نییە. پاشـــا تووڕە بوو گوتی: 'لە هەر جێیەک بێ، دەبێ بیبیننەوە و بیهێننە ئێرە.'

"کوڕی ساوی گوتی: 'کەس وەک من دەردی دەرمان ناکات.' پاشا فەرمانی دا لە شاردا جاڕیان دا هەرکەس نوورەددین ببینێتەوە یان جێگاکەیمان پێ بڵێ، هەزار دیناری زێری خەلات دەدرێتێ. هەرکەسیش بیشارێتەوە یان بە شوێنەکەی بزانێ و پێمان نەڵێ، لەلایەن پاشاوە سزا دەدرێ.

"نۆکەر و دەســتوپێوەندی پاشــا و خەڵکی شــار هەموو شــاریان پشـکنی و بەردەوام دەگەڕان، لە کاتێکدا ئەوە نوورەددین و ئەنیسولجەلیس بە ساخ و سلامەتی گەیشتنە قەراخ ئاوەکان. پێنج دیناریان دا بە کەشتیوانەکە و دابەزین. ملی ڕێیەیان گرت و ڕۆیشتن. وا بوو بە ڕێکەوت ڕێیـان کەوتە بـاغەکـانی بەغدا. ڕێیـان کەوتە کۆلانێکەوە کە جوان ئـاوپرژێن کرابوو، گســـک درابوو، ولاتێکی خاوێن، لەمبەرەوەوبەری کۆلانەکە ســـەکۆی لێ بوو. بەینابەینێک حەوزێکی لە بەرد چێکراوی تێدا بوو. کەســـیش دیار نەبوو، لەو ســـەری کۆلانەکە دەرگـایەکی تێدا بوو. نوورەددین بە ئەنیســـولجەلیســـی گوت: 'ئێرە جێگـای حەسانەوەیە. لەڕێوە دەست و دموچاویان شوشت و لەسەر سەکۆیەک دانیشتن و نانیان خوارد و خەوتن.

"دەرگایەک لەوێ بوو، بەسەر باخێکدا دەکراوە کە باخی 'باسەفا'یان پێ دەگوت. لە نێو ئەو باخەدا کۆشکێکی تێدا بوو، کۆشکی 'سەیران'یان پێ دەگوت. خەلیفە هاڕوونەڕەشید هەر کاتێک وەڕەز و دڵتەنگ بووایە، بۆ حەسانەوەی مێشکی دەهاتە ئەو باخ و کۆشکە. لەو کۆشکەدا خەلیفە هەیوانێکی ساز کردبوو، چل دەرگای تێدا بوو، هەشتا چلوورەی بلوورینی تێدا هەڵواسرابوو، هەشتا مۆمدانی زێڕینی کافووری تێدا بوو. کاتێک خەلیفە دەهات، لەوێ

نادەنیشت، ئیسحاقی مووسلی۱ و کەنیزە گۆرانیبێژەکان ئاهەنگیان بۆ دەگێڕا و خەلیفەیان دەگەشاندەوە و دڵخۆشیان دەکردەوە.

"کابرایەک بە ناوی شێخ برایم باخەوانی ئەو باخە بوو. خەلیفە باخەوانی ڕاسپاردبوو کە ئەگەر هاتو کەسێک هاتە نێو باخەکەوە، یان لەدەوری باخەکە هاتوچۆیان کرد، دەریان کا. لەو کاتەدا باخەوان بەوێدا هات و سەیری کرد ئەوە دوو کەس لەژێر یەکێک لە خێوەتەکاندا لەسەر سەکۆیەک خەوتوون.

"باخەوان گوتی: 'یانی ئەوانە نازانن کە من فەرمانم پێ کراوە هەرکەس بەو دەوروبەرەدا بێ، بیکوژم.' ئیدی چووە پێشێ و گوێزانەکەی دەرهێنا کە لێیان دا. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ڕەنگە غەوارە بن و بەو باسە نەزانن، وا چاکە سەریان هەڵدەمەوە بزانم کێن.'

"ئیدی سەری هەڵدانەوە کە ئەو ڕوومانگانەی دیت، گوتی: 'ئەوانە بۆ ئەوە نابن بیانکوژم.' ئیدی لە پەنا نوورەددین دانیشت و بە ئارامی دەستی بە قاچیدا هێنا و هەڵی ستاند. نوورەددین کە چاوی هەڵێنا، سەیری کرد ئەوە کابرایەکی پیر قاچی بۆ دادەماڵێ. تەریق بووەوە، قاچی هەڵکێشاوە و جوان دانیشت و دەستی باخەوانەکەی گرت و ماچی کرد. شێخ برایم گوتی: 'کوڕی خۆم، لەکوێوە هاتوون؟' نوورەددین گوتی: 'مامە، ئێمە غەریبین' و دەستی کرد بە گریان. شێخ برایم گوتی: 'ڕۆڵە گیان، پێغەمبەر وەسییەتی کردووە ڕێزی غەریبان بگرین. هەستن بچن لەنێو ئەو باخەدا بۆ خۆتان بگەڕێن و سەیران بکەن و بحەسێنەوە.' نوورەددین گوتی: 'مامە گیان، باخەکە هی کێیە؟' شێخ برایم بۆ ئەوەی ئەوان نەترسێن و بە ئاسوودەی تێیدا بگەڕێن و بحەسێنەوە، گوتی: 'ئەوە هی خۆمانە—هەر لە باب و باپیرانەوە بۆم بەجێ ماوە.'

"عەلی نوورەددین کە ئەوەی بیست، سپاسی کرد. ئێنجا شێخ برایم لەپێشەوە و ئەوان بە دوایدا چوونە ناو باخەکەوە. سەیریان کرد ئەوە باخێکە وەک شاعیر دەڵێ:

باخێک لە شێوەی باخی ئێرەم بوو
میوەگەل گشتیان جەمیان جەم بوو
سەوزایی و گوڵ و گەلایەیل دار
چنیانە فەرشێک وە ناوی وەهار

"باخەوان ئەوانی بردە کۆشکەکەوە. عەلی نوورەددین و ئەنیسولجەلیس لە هەیوانەکە دانیشتن. شێخ برایم هەموو جۆرە میوەیەکی هێنا و لەبەردمی دانان. ئەوان خواردنەکانیان خوارد و دەستیان شوشتەوە. عەلی نوورەددین بە شێخ برایمی گوت: 'بە ڕاستی دەستت

---

۱. شاعیر و مووسقاژەنی سالی (۲۳۵ک.م) بوو.

خۆش بێ. هەموو شتێک تەواوە، ئەگەر بادەشی لەگەڵ با، ئیدی دەیکوشت.' شێخ برایم لێوانێک ئاوی خۆشی بۆ هێنان. نوورەددین گوتی: 'ئەوەم نەدەویست.' شێخ برایم گوتی: 'مەگەر بادەش دەخۆیە؟' نوورەددین گوتی: 'بەڵێ.'

دەخـۆمەوە مەی، بـا دڵ بـپشـکوێ
دوور بـم لە خەم و خەمـدانـم بـدڕێ
مـن کە خەمـبـار بـم، بەرگە نـاگـرم
بە شـادی دەژیـم، هەتـاکـو دەمـرم

شێخ برایم گوتی: 'پەنا بە خوا! سێزدە ساڵیش دەبێ من لەو کارانەم نەکردووە. پێغەمبەر فەرموویەتی: 'نەفرەت لە ئەو کەسەی مەی دەنێتەوە، ئەو کەسەی دەیگوێزێتەوە و ئەو کەسەی دەیخواتەوە.' نوورەددین گوتی: 'با شتێکت پێ بڵێم، ئەگەر تۆ مەی نەنێیەوە و نەیگوێزییەوە و نەیخۆیەوە، ئەو نەفرەتە تۆ دەگرێتەوە؟' شێخ برایم گوتی: 'نا وەڵلا.' نوورەددین گوتی: 'ئەو دوو دینارم لێ وەرگرە و ئەو دوو درەمەش هەڵگرە و سواری گوێدرێژەکەت بە بچۆ بۆ مەیخانە و لە دوور ڕاوەستە. ئەگەر کەسێک هات بچێ مەی بکڕێ، بانگی کە و بڵێ ها ئەوە دوو درەم دەستخۆشانە و بایی ئەو دوو دینارم مەی بۆ بکڕە و بۆم لە تێڕی ئەو کەرە خە. بەو جۆرە نە مەیت ناوەتەوە و نە گواستووتەتەوە و نە خواردووشتەتەوە. ئاوا هیچ نەفرەتێک ناتگرێتەوە. شێخ پێکەنی و گوتی: 'تا ئێستا کەسی ئەوەندە قۆشمە و قسەخۆشم نەدیوە.' نوورەددین گوتی: 'گەورەم، ئێمە ئەمڕۆ میوانی تۆین و دەبێ دڵمان نەشکێنی.' شێخ برایم گوتی: 'ڕۆڵە گیان، بچۆ بۆ ساردادوەکە، ئەوێ پڕە لە کووپە مەی کە بۆ خەلیفە نراوەتەوە. ئەوەندەی دەتانەوێ بێنن.'

"نوورەددین چووە ساردادوەکەوە، دیتی ئەوە کووپە مەی پاڵیان وێک داوە و گۆزەڵەی گڵین و شووشەی و جام و پیاڵەی مەی بە ڕێکوپێکی لەوێ ڕیز کراون. یەک-دوو گۆزەڵەیان پڕ کرد لە مەی و لەگەڵ ئەنیسولجەلیس چوون لە جێگایەکی خۆش دانیشتن و شێخ برایمیش لەو لاوە دەیڕوانیە ئەو دوو نەمامە کە وەک چرا داییستان. کاتێک مەی کاری تێ کردن و سوور هەڵگەڕان و چاویان خومار بوو. شێخ برایم لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەرێ بۆ لە خۆڕا لێیان دوور کەوتوومەوە؟ هاونشینی لەگەڵ ئەو ڕووگەشانە کوا دیسان دەبێتەوە؟' ئیدی هەستا و هات لە نیزیک ئەوانەوە دانیشت. نوورەددین گوتی: 'مامە، توو گیانی من کەمێک وەرە پێشێ و ئە لێرە لە لای من دانیشە.' شێخ برایم هاتە پێشێ و لە پەنا ئەوان دانیشت. نوورەددین پیاڵەیەکی تێ کرد و دایە دەست شێخ. شێخ برایم گوتی: 'ئەعوزو بیللا، من سێزدە ساڵە کاری وام نەکردووە.' نوورەددین بۆخۆی پیاڵەکەی هەڵدا و بە لادا هات. وای نواند مەست بووە و دەسەڵاتی لە دەست داوە. ئیدی ئەنیسولجەلیس ڕووی لە شێخ کرد و گوتی: 'شێخ برایم، ئەوە هەمیشە ئاوا دەکا لەگەڵ من، ماوەیەک

بادەم لەگەڵ دەخواتەوە و دوایە دەخەوێ و من بە تەنیا دیلێتەوە. ئیدی ئەو دەم کەس نابێ پیاڵەیەکم بداتێ یان پیاڵەیەکم لێ وەرگرێ. یان گوێ لە گۆرانییەکانم بگرێ.'

شێخ تلیساوە[1] و هۆگری قسەکانی بوو، گوتی:

لە دوای چەنـدیـن سـاڵ مـن دەخـۆمەوە
لەبەر دڵـی تـۆ تـێ هەڵـدەچـمەوە
هەر چەنـد لە لای مـن حەرام کـرابـوو
دڵـم سـکـڵـێ بـوو، تـۆ گەشـانـدتەوە

"ئیدی لە دڵی خۆیدا گوتی: 'کوا تازە هاوپیاڵەی ئاوا دەبێتەوە.' ئینجا ئەنیسـولجەلیس فەرمووی پیاڵەیەکی کرد و سـوێندی دا گوتی: 'دەبێ لەبەر دڵی منی غەوارە ئەو پیاڵەیە بخۆیەوە.' شێخ برایم پیاڵەکەی لێ وەرگرت و خواردییەوە و گوتی:

لەناو خەڵکا بە شـێخ و پیاوی خودا ناسـرابووم
بە بۆنەی چـاوی جوانـت لە دین و لە دونیـا بووم
دوور بووم لە سـەرەڕۆیی، ملکەچی داب و نەریـت
ئێسـتە لەبەر دڵی تۆ، ڕوورەشـی دەرکی خوا بووم

"ئەنیسولجەلیس پیاڵەیەکی دیکەی تێ کرد. شێخ پیاڵەی لێ وەرگرت و هەڵی دا و گوتی:
گەر کەسێ وەرگرێ پیاڵە لەو خاتوونە پەریڕووە
بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ ئیمان و دین، گشـتی چووە
بێتو بـاسـی بزەی کرێ، چیرۆکی ئەوین دێتە گۆڕ
بەبێ دوودڵی لەڕێوە مام حاجی سـووجدەی بردووە
گەر بڵێن بـادەی گران کرد، ئەو دەلالە بێ بەزەیە
دڵنیا بە بۆ سـبەی ئەو، کەشـیدەی هەڕاج کردووە

"ئیدی پیاڵەیەکی زێوینی دا بە شێخ برایم. هەر کە شێخ ویستی بیخواتەوە، نوورەددین هەستا دانیشت."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1]. تلیسانەوە: ملکەچی دل بوون. دەسەلات لە دەست دەرچوون.

## که شەوی سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، عەلی کوڕی خاقان که دانیشت، گوتی: 'شێخ، ئەوە چیت کردووە بی من؟ من ئەو هەمووەم پێ گوتی و لە بەرت پاڕامەوە، لێت وەرنەگرتم. گوتت: 'سێزدە ساڵە دمم لێ نەداوە.' شـێخ برایم تریق بووەوە و گوتی: 'خەتای من نەبوو، هێندم لە بەر پاڕاوە و پێداگری کرد، تا ناچاری کردم.' نوورەددین پێکەنی و دەستیان کرد بە بادەنۆشی.

"ئەنیسـولجەلیس بە ئـامـاژە نوورەددینی حـاڵی کرد کە ئیـدی فەرمووی مەکە. ئەنیسـولجەلیس پیاڵەیەکی تێ کرد و خواردییەوە و پیاڵەیەکیشـی بۆ نوورەددین تێ کرد. شێخ چاوێکی لێ کردن و گوتی: 'ئەوە چ هاوپیاڵەبوونێکە؟ بۆ بەشی منی نادەن؟ من ئێستا هاوپیاڵەی ئێوەم.' بە قسـەکەی پێکەنین و ئەم جارە پیاڵەیەکیان دەخواردەوە و پیاڵەیەکیان دەدا بەو. هەتا لای بەیانی، ئەنیسـولجەلیس بە شـێخ برایمی گوت: 'ئەگەر ڕێم بدەی یەکێک لە مۆمەکان هەڵکەم.' شـێخ برایم گوتی: 'هەسـتە، بەڵام هەر مۆمێکیان هەڵکە.' کە هەسـتا، هەموو مۆمەکـانی هەڵکرد و دانیشـتەوە. ئینجـا نوورەددین بە شـێخ گوت: 'من لەو هـاوپیـاڵەبوونە چم پێ دەبڕێ، ئەگەر هیچ بە قسـەم نەکەی؟ ئەگەر ڕێم بـدەی، منیش چلوورەیەک هەڵکەم.' شـێخ برایم گوتی: 'هەسـتە و لە چلوورەیەک زیاتر هەڵمەکە. چاو لەو مەکە.' ئیدی نوورەددین هەسـتا و تەواوی چلوورەکانی هەڵکرد و دار و دیوار درەوشـاوە. شـێخ گوتی: 'ئێوە لە من شـێتترن.' خۆیشـی لەبەر مەسـتی هەسـتا و تەواوی دەرگاکانی هەیوانەکەی کردنەوە و دانیشت و هەر غەزەلی گوت و بادەی نۆشی.

"لەو دەمەدا خەلیفە خەریکی گەشـت و سـەیران بوو، لە قەراخ چۆمی دیجلە دانیشـتبوو سەیری ئاوەکەی دەکرد کە لەپڕ بریقە و شۆقی مۆم و چلوورەکانی کۆشکی لە چۆمەکەدا دیـت. ئیدی ئـاوڕێکی لە بـاخەکەی داوە. کەچی دیتی ئەوە تەواوی چلوورە و مۆمەکـان داییسـێن و دووکەڵیان لە دوور دیارە و باخ و کۆشـک ئاوەدانە. ئیدی بانگی جەعفەری بەرمەکی وەزیری کرد و گوتی: 'وەزیری گێژ و گەمژە و بێمشـوور، ئەوە تۆ من ئاگادار ناکەیەوە لەو ڕووداوانەی لە بەغدادا ڕوو دەدەن؟' جەعفەر بەرمەکی گوتی: 'چی ڕووی داوە، قوربان؟' خەلیفە گوتی: 'ئەگەر بەغدایان لێ نەگرتووم، ئەوە چۆناوچۆنە کۆشـک ئاوەدانە و تەواوی چلوورە و مۆمەکان دەگرێن و دەرگاکانی هەیوانەکەم کراوەنەتەوە و ئاهەنگ و خۆشـڕابواردنە؟ ئەگەر خەلافەتی بەغدایان لە من نەسـتاندووە، ئەو بەزمە چییە؟ کێیە دەتوانێ کاری ئاوا بکا و لاقی لە بەڕەی خۆی زیاتر ڕاکێشێ؟'

"جەعفەر ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و کەوتە لەرزە و ئاوڕێکی بۆ لای باخی سـەفا داوە. سـەیری کرد کۆشـک خەرمانی ئاورە و تیشـک و ڕووناکی کۆشـک بەسـەر تیشـکی مانگدا

ر ب بووه.

"جەعفەر ویســـتی شـــێخ برایم بکاتە بیانوو بۆ ئەوەی داوای لێ بووردن بکا. گوتی: خەلیفە، حەوتووی ڕابردوو شێخ برایم بە منی گوت: 'دەمەوێ جێژنی خەتەنە بۆ کوڕەکانم بگرم و پێم خۆشـــە ئێوەش بەشـــدار بن. تۆ چی دەڵێی؟' گوتم: 'من پێم باشـــە مۆڵەت لە خەلیفە وەرگری هەتا منیش لەگەڵ ماڵ و منداڵ و دەســـتوپێوەندەکانم بێمە باخی ســـەفا و کۆشـــکی ســـەیران.' دوایە گوتم: 'من بۆخۆم ئیشـــەڵڵا خەلیفە ئاگادار دەکەمەوە، بەڵام بە داخەوە لە بیرم چوو ئاگادارت کەمەوە.' خەلیفە گوتی: 'تۆ تاوانێکت هەبوو، ئێســـتا بوو بە دوو. یەکەم تاوانت ئەوەیە منت ئاگادار نەکردووەتەوە، دووەم تاوانت ئەوەیە ســـێخ برایم ویســـتوویە بەو بانگهێشـــتنە زێڕ و ماڵێکی وەگیر کەوێ و ئاهەنگەکەی پێ وەڕێ خا. تۆ بوخۆت هیچت نەداوەتێ و بە منیشـــت نەگوتووە.' جەعفەر گوتی: 'لە بیرم چوو.' خەلیفە گوتی: 'شێخ برایم زۆر پیاوی چاکە، هەژار و نەدارانی خۆش دەوێ و ڕێز لە پیاوماقووڵان و زانایانیش دەگرێ و چاکەکارە، بە ڕووحی باب و باپیرانم دەبێ هەر ئێســـتا بچم و ئەوەندەی لە شـــەو ماوە لە جێژنەکەیاندا بەشـــدار بم. ڕەنگە ئەمشـــەو نوێنەری تەواوی هوزەکانیش لەوێ بن. هەر دەبێ بچم. هاتو کەســـێکیش لەوێ یارمەتییەکی لە من بوێ، خێری ئەم دنیا و ئەو دنیاشی پێوە بێ. یان ڕەنگە بوونی من لەوێ خێری بۆ شێخ برایمیش پێوە بێ و ئەو بە بوونی من لەگەڵ برادەرانی خۆشحاڵ بێ.' جەعفەر گوتی: 'خەلیفە، زۆری لە شـــەو لا داوە، هەر بینا ئەوانیش بڵاوەیان کرد.' خەلیفە گوتی: 'نا، هەر دەبێ بچم.' جەعفەر مات و کاس ڕاوەستابوو.

"ئینجا خەلیفە هەســـتا و لەگەڵ جەعفەری بەرمەکی و مەســـرووری خزمەتکار لە دارولخەلافە وەدەر کەوتن و لە جلوبەرگی بازرگاناندا بە کۆڵاناندا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە بە دەرگای باخ. خەلیفە ڕوانی دەرکی باخ کراوەتەوە. بە جەعفەری گوت: 'تەماشـــا شـــێخ برایم هەتا ئەو دەمانەی شەو دەرکی باخی ئاوەڵا کردووەتەوە. شێخ برایم قەت وا نەبووە.' ئیدی چوونە نێو باخەکەوە و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کۆشکەکە و لەوێ ڕاوەستان.

"خەلیفە بە جەعفەری گوت: 'پێم خۆشە پێش ئەوەی بمبینن، لە کەلێنێکەوە چاوێکیان لێ بکەم با لەو شـــتانەی بە دڵیدا دێ و ئەو کەراماتانەی هەیەتی ئاگادر بم. وا ئەو لە تەنیاییدا کەیفی سازە.'

"ئیدی خەلیفە ســـەیری کرد ئەوە دارێکی ئەســـتوور و بڵیند لەوێیە. بە جەعفەری گوت: 'دەڵێم بچمە سەر ئەو دارە کە لک و پۆپەکانی لە هەیوانەکە نزیکە و دەڕوانێتە ئەوێ.'

"ئەوە بوو خەلیفە چووە ســـەر دارەکە و لکاولک ڕۆیشـــت هەتا گەیشـــتە ئەو لکەی کە دەیڕوانییە هەیوانەکە و لەوێ نزیک بوو. کە سەیری نێو هەیوانەکەی کرد، دیتی ئەوە کچ و

کوڕێک وەک خۆر و مانگ دانیشتوون و شێخ برایمیش پیاڵەیەکی بە دەستەوە گرتووە و بە ئەنیسولجەلیس دەڵێ: 'ئەی خۆری جوانان، بادەنۆشی بێ گۆرانی خۆشی ساقی تامی نییە. وەک شاعیر دەڵێ:

ئەسپ فیتووی بۆ لێ نەدەی، کوا ئاوی بە گیان دەکەوێ
وای دانێ ئەمنیش ئەسپێکم، با مەیەکەم بە گیان کەوێ

"خەلیفە کە شێخ برایمی ئاوا دیت، لە دارەکە هاتە خوارێ و بە جەعفەری گوت: 'ئەو کەراماتەی ئەمشەو لە شێخ برایمم دیت، هەتا ئێستا نەمدیتبوو. بچۆ سەر ئەو دارە بۆ ئەوەی من دیتم، تۆش ببینی هەتا کەمێکت لە خێر و بەرەکەتی شێخ برایمان بە قسمەت بێ.' جەعفەر کە ئەوەی بیست، سەری سوور ما و چووە سەر دارەکە. عەلی کوڕی خاقان و ئەنیسولجەلیسی دیت دانیشتبوون و شێخیش پیاڵەیەکی مەی بە دەستەوە بوو و ڕاوەستابوو. کە ئەوەی دیت، لێی ڕوون بوو کە دەکوژرێ و لە دارەکە هاتە خوارێ و لەپێش خەلیفە ڕاوەستا.

"خەلیفە گوتی: 'جەعفەر، سپاس بۆ خودا کە ئێمەی لە لایەنگرە ڕواڵەتییەکانی دین پاک کردەوە و لە گورگەمێشانی ڕێگای ڕاستی پاراست.' جەعفەر بەرمەکی لەبەر خەجاڵەتیان نەیتوانی هیچ بڵێ.

"خەلیفە گوتی: 'جەعفەر، ئەو کوڕ و کچە کێ هێناونییە ئەو کۆشکەوە؟ من کوڕ و کچی ئەوەندە جوانم هەتا ئێستا نەدیتبوو؟ وەرە با پێکەوە بچینە سەر ئەو لکەی ڕووبەڕوویان و لەو سەرەوە سەیریان بکەین.' وا بوو هەر دووکیان چوونە ئەو شوێنە و لەوێوە چاویان تێ بڕین. گوێیان لێ بوو کە شێخ برایم بەوانی دەگوت: 'بەڕێزان، من تەرکەدنیایی و خۆپارێزیم وەلا نا. تەسبێحم فڕێ دا و پیاڵەم گرتە دەست. دەزانم بۆ مەینۆشان بێ چەنگ و عوود خۆش ناگوزەرێ.' ئەنیسولجەلیس گوتی: 'شێخ، ئەگەر ئامێری مۆسیقات هەبا، ئێدی دەیکوشت. شێخ برایم کە ئەوەی بیست، ڕاستەوە بوو. خەلیفە بە جەعفەری گوت: 'ئەوە شێخ برایم بە تەمایە چ بکا؟' شێخ برایم ماوەیەک ون بوو، کە هاتەوە عوودێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو! خەلیفە جوان چاوی لە عوودەکە کرد، دیتی ئەوە عوودەکەی ئیسحاقی هاونشینێتی. خەلیفە گوتی: 'بە خودا ئەگەر دەنگی ئەو کەنیزە خۆش نەبێ، هەمووتان دەکوژم. بەڵام ئەگەر خۆش بێ، ئەوە لە هەموویان خۆش دەبم، بەس تۆ دەکوژم.'

"جەعفەر گوتی: 'خودایە کارێک بکە خۆش نەبێ!' خەلیفە گوتی: 'ئەوە بۆ وا دەڵێی؟' جەعفەر گوتی: 'هەتا هەموومان بکوژی و ئێمە پێکەوە هاوسۆز بین.'

"ئیدی ئەنیسولجەلیس عوودەکەی وەرگرت و تارەکانی توند کردنەوە و وای لێدا ئاسنی ـەتواندەوە. دوایی ئەو شێعرەی گوت:

دەوڵەمەنـدی و گەنـجی، ئەویـن و بـۆنـی بەهـار
شـــەراب و ســـەوزەزار و ئـاوی ڕوون و بزەی یار
چەنـد خۆشـــە کە ببیســـتی بە فیتکی بەری بەیـان
نەرمەدەنگی مۆســـیقـا و، جریوەی مەلی گوڵزار

"ئینجـا خەلیفە گوتی: 'جەعفەر، بە ڕاســتی لەوەتی هەم ئـاوازی ئەوەنـدە خۆشـــم نەبیســـتبوو.' جەعفەری بەرمەکی گوتی: 'هیوادارم ڕقەکەی خەلیفە نیشـــتبێتەوە.' خەلیفە گوتی: 'ئەرێ ڕقەکەم نەما، بەڵام پێم خۆشـــە بچم لە هەیوانەکە لەلایان دانیشـــم. هەتا ڕووبەڕوو گوێم لە دەنگی ئەو کچە بێ.'

جەعفەری بەرمەکی گوتی: 'خەلیفە، ئەگەر بچیتە ئەوێ، خۆشییەکەیان لێ تاڵ دەکەی و تێک دەچێ. بە تایبەت شێخ برایم کە ئەگەر تۆ ببینێ هەر لەوێ گیانی دەردەچێ.'

"خەلیفە گوتی: 'جەعفەر، دەبێ فێڵێکم بۆ ببینیتەوە بەجۆرێـک بچمە ژوورێ. وا بێ هەموو شـــتێکم بۆ ڕوون بێتەوە و، ئەوانیش ئاگاداری چوونی من بن بێ ئەوەی لێیان بشێوێ.'

"ئیدی خەلیفە لەگەڵ جەعفەر لە دارەکە هـاتنە خوارێ و چوونە ســـەر دیجلە و هەر بیریان لەو ڕووداوە دەکردەوە و پێیان ســـەیر بوو. کە چوونە قەراخ چۆمەکە، دیتیان ئەوە کەسێک لەوێ، هەر لە خوار کۆشکەکەوە خەریکی ماسیگرتنە. خەلیفە چەند جاری بە شێخ برایم گوتبوو مەهێڵە کەس لێرە ماســی بگرێ. شـێخ برایمیش چەند جاری دەنگ دابوون و پێی ڕاگەیاندبوون کە کەس بۆی نییە لەو دەوروبەرانە ماســی بگرێ. کەچی ئەوە ئەمشـەو ئەو کابرایە کە ناوی کەریم بوو، دیســـان بۆ ماســـیگرتن دەچوو بۆ قەراخ چۆمەکە. کاتێک دەبینێ ئەوە دەرکی باخی ســـەفا کراوەتەوە، لە دڵی خۆیدا دەڵێ: 'لێی گەڕێ ئەوە شـــێخ برایم لە بیری چووە دەرگا دابخا. با بچم لەو ماســـییانەی خوار کۆشــک کەمێک ماســـی بگرم.' کەچی هەرکە گەیشـــتە بەر دەرگا و هاتە ناو باخەکەوە و ویســـتی لە ماســـییەکانی خوار کۆشکەکە بگرێ، خەلیفە گەیشتێ و ئەوی ناسییەوە و گوتی: 'کەریم!' کەریمی ڕاوچی ئاوڕی داوە و خەلیفەی دیت، ئاوی ئەژنۆی چوو. گوتی: 'خەلیفە گەورەم، من لەبەر ئەوە نەهاتووم بۆ ماســـیگرتن تا ســـەرپێچی فەرمانی جەنابت بکەم. باوەڕ بفەرموون لەبەر دەستتەنگی و هەژاری هاتووم—مەجبوور بووم بێم.' خەلیفە گوتی: 'باشە، ئێستا لە بەختی من ماســـی بگرە.' ماســـیگرەکە ئەو جار خۆشـــحاڵ بوو، چووە پێشـــی و تۆڕی هاویشـــتە

دیجلەوە. پاش ماوەیەک تۆڕی هێناوە دەرێ ،دیتی ئەوە لە هەموو جۆرە ماسـیـیەکی پێوە بووە. خەلیفە دڵی خۆش بوو، گوتی: 'کەریم، جلەکانی خۆت داکەنە و جلەکانی من لە بەر کە.' کەوایەکی شۆڕی پەشمینی پینەکراو کە هەر جمەی دەهات لە کێچ و ئەسپێ و ئەوەندە قورس بوو هەڵنەدەگیرا. کڵاوپێچەکەی کە سێ ساڵ دەبوو نەکرابووە، لەبەر چڵکنی ڕەنگ و شـتی دیار نەبوو لە سـەری داکەند. خەلیفەش جلوبەرگە حەریرەکەی داکەند و بە ماسیگری گوت: 'ئەوانە لەبەر کە.'

"خەلیفە کەوا و کڵاوپێچەکەی لە سـەر کرد و دمی هەڵدا و بە ڕاوچی گوت: 'تۆ دوای کاری خۆت کەوە.' ماسیگر لاقی خەلیفەی ماچ کرد و سپاسی کرد. ئەسپێ کەوتنە گیانی خەلیفەوە. خەلیفە بە دەستی ڕاست و چەپی خۆی دەخوراند و ئەسپێ و کێچی لە لاملی دەکردەوە و فڕێی دەدا. بە ڕاوچی گوت: ' ئەو هەموو ئەسپێیە چییە لەو کەوایەدا؟' ماسیگر گوتی: 'گەورەم، ئەوپەڕی هەر حەوتوویەک ئاوا ئازارت دەدەن، دوایی لەگەڵیان ڕادێی و هەست بە گازگرتنەکانیان ناکەی.'

"خەلیفە پێکەنی و گوتی: 'ئـای چەنـد زۆر زانی! من چۆن دەتوانم یەک حەوتوو لەو حاڵەدا بم؟!' ماسـیگر گوتی: 'دەڵێم قسـەیەکت پێ بڵێم و ناوێرم.' خەلیفە گوتی: 'بیڵێ. مەترسـە.' ماسـیگر گوتی: 'دەڵێن خەلیفە بە تەمایە فێری ماسـیگری بێ و لەو ڕێگەیەوە قازانج بکا. ئەگەر خەلیفە بە تەمای ئەوەیە، هەر ئەو کەوایە زۆر باشترە.' خەلیفە بە قسەی ماسیگرەکە پێکەنی. ماسیگرەش ڕێی خۆی گرتە بەر و ڕۆیشت. خەلیفەش ماسییەکانی لە قرتاڵەیەک خسـت، کەمێکی گیاوگژ بە سـەردا دا و هەڵی گرت و هاتە لای جەعفەری بەرمەکی. جەعفەر وای زانی کەریمی ڕاوچییە. گوتی: 'کەریم، ئەوە بۆ هاتوویە ئێرە؟ زوو لێرە برۆ و خۆت بە کوشـت مەدە، ئەمشـەو خەلیفە لێرەیە.' خەلیفە کە ئەو قسـانەی جەعفەری بیسـت، ئەوەنـدە پێکەنی، ژانی کردبوو. جەعفەر گوتی: 'نەکا تۆ خەلیفە بی؟' خەلیفە گوتی: 'ئەرێ وەڵا بۆخۆمم. جـا ئەوە تۆ جەعفەری بەرمەکی و ئێسـتـا پێکەوە هاتووین و هەمیشـە لەگەڵ یەکین نامناسـیتەوە، دەی شـێخی فەقیر بە مەسـتی چۆن من دەناسێتەوە؟ تۆ لێرە بە هەتا دەگەڕێمەوە.'

"ئیدی خەلیفە هاتە بەر دەرکی کۆشک و لە دەرگای دا. شێخ برایم گوتی: 'کێیە؟' خەلیفە گوتی: 'منم.' شـێخ برایم گوتی: 'تۆ کێی؟' خەلیفە گوتی: 'ڕاوچیم. کە زانیم خەلیفە میوانی هەیە، ماسیم بۆ هێناون.' عەلی کوڕی خاقان و ئەنیسولجەلیسیش ماسیان پێ خۆش بوو. هەر کە گوێیان لێ بوو، خۆشـحاڵ بوون و گوتیان: 'دەرگای لێ بکەوە و ڕاوچییەکە بە ماسییەکانەوە بێنە ژوورەوە.' شێخ برایم دەرگای کردەوە، خەلیفە وەک ڕاوچییەک وەژوور کەوت و سـڵاوی کرد. شـێخ برایم گوتی: 'سـڵاو لەو دزە فێڵبازە وا بە دەهۆ هاتوویە ئێرە. ئەگەر ڕاست دەکەی ماسییەکانمان پیشـان بدە.' ئیدی خەلیفە ماسییەکانی پیشـان دان کە

هیشـــتا دەجووڵانەوە و زیندوو بوون. ئەنیســـولجەلیس گوتی: 'ماســـی چاکن، خۆزگە سـووریشت کردبانەوە.' شێخ برایم بە خەلیفەی گوت: 'ڕاوچی، هەستە زوو بچۆ سووریان کەوە و بیـانهێنەوە.' خەلیفە زوو دەرپەڕی و چوو بۆ لای جەعفەری بەرمەکی و گوتی: جەعفەر، بە سـوورکراوەی دەیانەوێ. جەعفەر گوتی: 'بێنە با سـووریان کەمەوە.' خەلیفە گوتی: 'بە ڕووحی باب و باپیرانم جگە لە خۆم کەس بۆی نییە ســـووریان کاتەوە.' ئیدی خەلیفە چووە دیوی باخەوانەکەوە و هەموو کەرەسـەیەکی ماسـیسـوورکردنەوەی دیتەوە. ئینجا ئاگری کردەوە و تاوەی لەسـەر ئاگر دانا و بە باشـترین شـێوە سـووری کردنەوە. گەڵای هەنجیری لەنێو کەشـەفێکدا ڕاخسـت و ماسـییەکانی لەسـەر دانا. لەنێو باخەکەی لیموی لێ کردەوە و لەسـەر کەشـەفەکە داینا و بۆی هێنان. کچ و کوڕە لەگەڵ شـێخ برایم خواردیان و دەسـتیان شـوشـتەوە. عەلی نوورەددین گوتی: 'کاکی ڕاوچی، دەسـتت خۆش بێ. گەورەییت نواند.' دەستی لە گیرافانی ڕاکرد و سێ دیناری زێڕی لەو زێڕانەی سەنجەر دابوویێ دەرهێنـا و گوتی: 'کـاکی ڕاوچی، ببوورە ئەگەر پێش ئەوەی بەو ڕۆژە بگەم دەهاتییە لام، تامی تاڵی هەژاریم لە زارتدا نەدەهێشت و لە هەموو شتێک بێنیازم دەکردی. بەڵام چ بکەم؟ چـار نییە ئەوانەم لێ وەرگرە.' ئیدی دینـارەکـانی بۆ خەلیفە هـاویشـــت. خەلیفەش هەڵی گرتنەوە و ماچی کردن و لە گیرفانی ڕاکرد.

"چونکە ئامانجی خەلیفە ئەوە بوو گوێی لە دەنگی ئاوازی ئەنیسـولجەلیس بێ، بە عەلی کوڕی خاقانی گوت: 'بە زیاد بێ ئەوە زۆرە بەڵام تکایە ئەگەر دەکرێ پێم خۆشـە گوێم لە دەنگی ئاوازی ئەو کەنیزەت بێ.' عەلی نوورەددین گوتی: 'ئەنیسـولجەلیس، تۆو گیانی من! لەبەر دڵی ئەو ڕاوچییە گۆرانییەک بڵێ، چونکە پێی خۆشـــە گوێی لە دەنگـت بێ.' ئەنیســولجەلیس لەبەر قسـەی گەورەکەی عوودەکەی هەڵگرت و دەسـتی کرد بە لێدانی و ئەو شێعرەی گوت:

ئەی نـازداری مووســـیقـاژەن، بەو پەنجەی نـاســـک و نەرمت
دڵـــی مـــن بـــهـێـــنە لەرزە، بـــا بـــکەوم لە بەر دەمـــت
بەیـانـانە یەکـجـار خـۆشـــە، بەتـایـبەت کـاتـی بەهـاران
گـوێ لە مـووســـیـقـایەک گـری، لەگەڵ خـرمە خـرمـی بـاران

"خەلیفە بە بیسـتنی ئەو ئاوازە لە ڕادەبەدەر خۆشـحاڵ بوو تا ئەو جێیەی نەیتوانی دان بە خۆیدا بگرێ و گوتی: 'ئافەرینی خودات لێ بێ.' عەلی کوڕی خاقان گوتی: 'کاکی ڕاوچی، دەڵێی بەو کەنیز و گورانی و ئـاوازانە کەیفـت کرد؟' خەلیفە گوتی: 'ئەرێ وەڵڵا.' عەلی

نوورەددین گوتی: 'ئەگەر پێت خۆشــە، ئەو کەنیزەت بە دیاری دەدەمێ. پێشــکەشــت بێ. خاوەن کەرەمان خۆ لە پێشکەشکردنی خۆیان پەشیمان نابنەوە.' هەستا و دەستی کەنیزەی گرت و لە دەســـت خەلیفەی-کە لە بیچمی ڕاوچی دا بوو-نا و گوتی: 'لێم قەبووڵ کە.' ئەنیسولجەلیس ئاوڕێکی لە عەلی کوڕی خاقان داوە و گوتی: 'گەورەم:

دیـــلـــی داوی ئەویـــنـــت، کـــوا دەیـــهەوێ ئـــازاد بـــێ
دیلی تۆ بوون، شـــــانســـێکە، بە قســـمەت کەمکەس دەبێ

"عەلی نوورەددین کە گوێی لەو شێعرە بوو، گوتی:

لـــێـــم دوور کەوی تـــۆ، مـــیـــوانە مەرگـــم
خـــواردنـــم خەفەت، کەســـــەرە بەرگـــم
بـــێ تـــۆ هەڵـــکـــێشـــم، تەنـــیـــا نەفەســـێ
یـــاخـــوا ئەو پشـــــووە، دواهەنـــاســـەم بـــێ

"خەلیفەش کە گوێی لە قسەی ئەوان بوو، جوێکردنەوەی ئەوانی لە یەکتر بەلاوە کارێکی ئاســـتەم بوو. هەر بۆیە ڕووی لە عەلی خاقان کرد و گوتی: 'گەورەم، مەگەر کارێکی ناڕەوات کردووە یان قەرزێکی زۆرت لە ئەستۆیە، ئاوا لە وڵاتی خۆت ڕات کردووە؟' عەلی نوورەددین گوتی: 'کاکی ڕاوچی، ئەو ڕووداوانەی بەســـەر من و ئەو کەنیزەم هـاتوون. ئەگەر بیانبیستی ڕەنگە سـەرت سـووڕ بمێنێ.' خەلیفە لە بەری پاڕاوە، گوتی: 'بەسـەرهاتی خۆتـانم بۆ بگێڕەوە. هیوادارم لە گیر و گرفـت ڕزگـارتـان بێ.' نوورەددین گوتی: 'بەسەرهاتەکە بە هۆنراوە بگێڕمەوە یان بە پەخشان؟' خەلیفە گوتی: 'جا دوانی بە پەخشان هەر قسەکردنە و دوانی بە هۆنراوە دوڕ سووانە.' ئیدی نوورەددین سەری داخست و ئەو هۆنراوەیەی بۆ خوێندەوە:

بـــابـــم لە بەســـــرە، دەســـــەلاتـــدار بـــوو
ئەو دڵســــــۆزتـــریـــن، بـــابـــی ڕۆژگـــار بـــوو
بـــۆ دڵـــخـــۆشـــــی مـــن، کـــڕی کەنـــیـــزێـــک
دەلال و ڕووگەش، تەڕوتەمـــــیـــــزێـــــک
شـــــۆق و تیشــــکی هۆی ڕوونـــاکی مـــاڵ بوو
خـــاڵـــی چەنـــاگەی، جـــوانـــتـــریـــن خـــاڵ بـــوو
بۆنی کەزیەکەی، میســـــکی مەســـــت دەکرد
مـــنـــی بـــێـــچـــارەی، هەر لە هـــۆش دەبـــرد

بابم کە نەما، ماڵم تەواو بوو
ئەو ماڵەی هەمبوو، گشت بە فیڕۆ چوو
ئەنیس پێمی گوت: من بفرۆشە
ئەو هەموو خەم و دەردە ناخۆشە
یەکجار زۆر تاڵە، هەر باسی بکەی
چ بگا بەوەی کە هەراجی بکەی
بیبەیتە بازاڕ، خۆشەویستەکەت
بیبەی بیدەیتە، دەست نەیارەکەت
کۆوە بوون کڕیار، وەکوو پوورەی هەنگ
تا بمژن شیلەی، سەر کوڵمەی گوڵڕەنگ
پیرێکی بەدفەڕ، ناحەز و دزێو
دژمنی باوکت لێی ببێ بە خێو
بژاردی دراو، گرتی دەستی یار
جا دڵ نەتۆقێ و نەبێ شێت و هار
گڕ بەر بووە جەرگم، یەکەم پەلامار
لە سەر ماڵی زین، بەرم داوە خوار
لە سەر ئەسپەکەی هێنامە خوارێ
هەتا ماندوو بووم، تێم هەڵدا جارێ
جا ئەوجار بەرەو ماڵێ چوومەوە
سەنجەر ناوێک، هات بە هاوارمەوە
پیاوی باوکت بووم، لە ڕابردوودا
بەبێ من قامکی لە ئاو نەدەنا
ئێستا لە حوزوور، پادشای دادار
هات بۆی تێ چاندی، گزیری بەدکار
سوڵتان فەرمانی، گرتنتی داوە
تالان دەکرێی زوو، بڕۆ لەو ناوە
دوای نوێژی شێوان، لە ترسی شووفار
بە هەزار زەحمەت، دەرچووین لەناو شار
ئەنیس ئەو کیژی، دڵڕفێن و جوان
دەلەرزی وەکو، لەرزی یەکەم ژوان
ئەو ڕووحی منە و، پێشکەش بە تۆ بێ
هەر چەند دوای ئەو مەرگ، میوانم دەبێ

"که شیعرەکەی بۆ گوت، خەلیفە گوتی: 'ئێستا بە تەمای بچییە کام شار؟' عەلی خاقان گوتی: 'شـــارەکانی خودا زۆرن.' خەلیفە گوتی: 'من نامەیەک دەنووســـم بۆ ســـوڵتان محەممەدی کوڕی سلێمانی زینی، کە ئەو خەتەی من ببینێ زیان بە تۆ ناگەیێنێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سی و شەشەم هات

گوتی: 'خاوەنشــکۆ، کە خەلیفە گوتی: 'من چەند دێڕێک بۆ ســولْتان محەممەدی کوڕی ســـلێمانی زەینی دەنووســـم،' عەلی نوورەددین گوتی: 'چۆن دەکرێ ڕاوچییەک نامە بۆ سـولْتانێک بنووسـێ؟! شـتی وا نابێ.' خەلیفە گوتی: 'ڕاسـت دەکەی، بەلام پێت دەلێم ئەوە چۆنە. ئێمە شاگردی مامۆستایەک بووین و لە هەمان خوێندنگە خوێندوومانە. ئەو خودا بە دەستییەوە دا و بوو بە سولْتانی بەسرە و منیش بووم بە ڕاوچی. بەلام ئەو زۆر بە ئەمەک و وەفادارە. تا ئێســـتا نەبووە من داوایەکی لێ بکەم و جێبەجێی نەکا.' عەلی خاقان کە ئەوەی بیسـت گوتی: 'بینووسـە.' خەلیفە پێنووس و جەوهەری وەرگرت و دوای نووسـینی بیســمیلا، نووســی: 'ئەو نامەیە لەلایەن هاڕوونەڕڕەشــید کوڕی مەهدییەوەیە بۆ ســولْتان محەممەد کوڕی سـلێمانی زەینی کە لە مووچەخۆرانی ئێمەیە و ئەوم وەک دەســـەلاتدار و بەڕێوەبەری کاروباری هێندێک ناوچە دیاری کردووە. دەبێ هەر کە ئەو نامەیەی پێ گەیشت و خوێندییەوە، گورج بۆخۆی لەسەر تەختی دەسەلات لاچێ و عەلی کوڕی خاقان لە جێگاکەی خۆی دانێ و دژایەتیش نەکا. وەسسەلام.'

"ئیدی نووسراوەکەی دا بە عەلی کوڕی خاقان. عەلی کوڕی خاقانیش نامەکەی وەرگرت و خێرا لە هەیوانەکە هاتە خوارێ و بەرەو بەسـرە ڕۆیشـت. ئینجا شـێخ برایم بە خەلیفەی گوت: 'ڕاوچی هیچ‌وپووچ، دوو ماسیت بۆ هێناین نیو دیناریشیان نەدێنا، کەچی سێ دینارت لێ سـەندین. ئێسـتا دەتەوێ کەنیزەکەشـمان لێ بسـتێنی؟' خەلیفە کە قسـەی باخەوانەکەی بیسـت، لێی توورە بوو، بانگی مەسـرووری بکوژی کرد و ئاماژەی بۆ باخەوانەکە کرد کە سزای باخەوان بدا.

"جەعفەری وەزیریش هەر ئەو کاتە کە خەلیفە جل‌وبەرگەکانی بە ڕاوچییەکە دابوو، کەســـێکی ناردبوو لە مالْی خەلیفە جل‌وبەرگی دیکەیان بۆ خەلیفە هێنابوو. خێرا خەلیفە جل‌وبەرگ و سـەرپێچی ڕاوچییەکەی داکەندن و دای بەو کەسـەی چوو جل‌وبەرگی دیکەی بۆ هێنابوو. بۆخۆی جل‌وبەرگی خەلافەتی لە بەر کرد و لەپێش شـێخ برایم ڕاوەسـتا. شـێخ برایم کە خەلیفەی دیت، واقی وڕ ما و نەیدەزانی چ بکا و بلێ چی. لە دلْی خۆیدا دەیگوت: 'ئەوە خەون دەبینم یان بە خەبەرم؟' خەلیفە گوتی: 'شــێخ برایم، دەزانی چۆنی و خەریکی چییت؟' شێخ مەستییەکەی لە سەری ڕەوی و هاتەوە سەر خۆ، لەسەر تەختەکە خۆی فڕێ دا خوارێ و کڕنۆشی برد و ئەو شێعرەی گوت:

دوو هـــۆ لە خشـــــتەیـــان بـــردم
ژیـــری کەم و بەخـــتـــی ڕەشـــــم

"ئیدی خەلیفە لە شـــێخ برایم خۆش بوو. فەرمانی دا کەنیزیان بردە 'دارولخەلافەت.' ماڵێکی جیایان بۆ تەرخان کرد و خزمەتکار و کەنیزیان بۆ دیاری کرد و خەلیفە پێی گوت: 'خاوەنتم ناردووە بۆ بەســـرە، بەو زووانە خەلاتیشـــی بۆ بەڕێ دەکەم و تۆش لەگەڵ خەلاتەکاندا دەنێرمەوە.' ئەنیسولجەلیس لە ماڵەکەدا دانیشت.

"عەلی کوڕی خاقانیش ڕۆیشت هەتا گەیشتە بەسرە و چووە کۆشکی سوڵتان و یەک بە خۆی نەڕاندی. ســـوڵتان گوێی لە نەڕەکەی بوو، گوتی: 'وەرە ژوورێ.' کە چووە لای سوڵتان، نامەکەی خەلیفەی دایە. کە دەستخەتی خەلیفەی دی، هەستا سەر پێ و سێ جاری نامەکە ماچ کرد و گوتی: 'فەرمانی خەلیفە لەســەر چاو و دڵمە.' ئیدی ناردی لە دوای چوار قازی و وەزیر و میرەکان بۆ ئەوەی خۆی لەســـەر کار لا ببا و دەســـەلات بداتە دەســـت نوورەددین. خێرا کوڕی ســـاوی گەیشـتێ. ســـوڵتان نامەکەی خەلیفەی دایێ. کە نامەکەی دیت، دڕاندی و لە زاری خست و جووتی.

"سوڵتان محەممەد تووڕە بوو گوتی: 'ئەوە چ کارێک بوو کردت؟' موعینی کوڕی ساوی گوتی: 'عەلی کوڕی خـاقـان خەلیفەی نەدیوە و نەچووەتە لای وەزیرەکەشـــی، بەڵکوو کاغەزێکی واژۆداری خەلیفەی دەست کەوتووە و بە کەیفی خۆی لەسەری نووسیوە. تۆ بۆ فریوی فرۆفێڵی ئەوت خواردووە و خۆت بێ دەســـەلات دەکەی؟ نە لە خەلـیفە نووســـراوەیەکت پێ گەیوە و نە کەســـی ناردووە. ئەگەر ئەو ڕاســت دەکا، دەبوو پیاوێکی خەلیفەی لەگەڵ خۆی هێنابا. ئێســـتا تۆ ئەو بە من بســـپێرە با لە زیندانی کەم و پیاوێک بنێرمە بەغدا شتەکە ڕوون کەمەوە.'

"ســـوڵتان محەممەد پێشـــنیارەکەی ئەوی پێ باش بوو. بە دەســـتوپێوەندەکانی گوت، عەلی کوڕی خـاقـانیان بە زەویدا دا و ئەوەندەیان لێدا هەتا بێهۆش بوو. دوای ئەوە بە فەرمانی ســـوڵتان کۆت و زنجیریان لە ئەســـتۆ و لاقی کرد و بە بەندیوانێک بە ناوی قۆتەیتیان سپارد. فەرمان درا شەو و ڕۆژ ئازاری بدەن. بەندیوان عەلی کوڕی خاقانی برد بۆ زیندان و ســـەکۆیەکی بۆ خاوێن کردەوە و ڕاخەر و پاڵپشـــتی بۆ دانا و زۆری لەگەڵ باش بوو.

"سوڵتانیش هەموو ڕۆژێک بەندیوانی بانگ دەکرد و پێداگری دەکرد کە ئازاری بدەن و، ئەویش دەیگوت: 'بەردەوام ئازاری دەدەین.' هەتا چل ڕۆژ تێپەڕی و دیارییەکانی خەلیفە هاتن. سـوڵتان محەممەد ســەری ســوورِ ما و لە دەســتوپێوەند و ڕاوێژکارەکانی پرســی:

ئەو دیاریانە چین و بۆ کێیە؟' هەموو گوتیان: 'ئەو دیاریانە بۆ سـوڵتانی تازەیە.' جگە لە موعینی کوڕی سـاوی کە گوتی: 'دەبووایە ڕۆژی یەکەم ئەوت کوشـتبا.' سـوڵتان گوتی: 'باش بوو بیرت هێنامەوە کە بیکوژم. ئێستا بچۆ بەندیخانە بیهێنە با بیکوژم.' کوڕی ساوی گوتی: 'دەڵێم جارچی لەنێو شـاردا جاڕ بدەن کە هەر کەس پێی خۆشـە چاو لە کوژرانی عەلی کوڕی خاقان بکا، بێتە بەردەرگای کۆشـک. با هەموو کەس دژمنی من ئاوا ببینێ.' سـوڵتان گوتی: 'چۆنت پێ خۆشـە وا بکە.' ئیدی وەزیر لە لای سوڵتان ڕۆیشت و چوو بە شـارەداری گوت: 'جارچی بنێرە لەنێو شـاردا جاڕ بدا.' کە جارچی ئەو هەواڵەی ڕاگەیاند، خەلک هەموو گەورە و چکۆلە دەسـتیان کرد بە گریان، تەنانەت منداڵانی خوێندنگە بە بیسـتنی ئەو هەواڵە دەسـتیان کرد بە گریان. تاقمێک هەڵاتن بۆ بەردەرکی کۆشـک، دەسـتەیەک لەگەڵ وەزیر چوونە بەردەرکی بەندیخانە کە نوورەددین بێنن. کاتێک وەزیر لەگەڵ پیاوەکانی گەیشتنە بەندیخانە، قاوی کردە قوتەیت و گوتی: 'ئەو بێژووە بێنە دەرێ.' قوتەیت گوتی: 'وەزیر، ئەوەندەم لێ داوە هێزی لە بەردا نەماوە و خەریکە دەمرێ.' ئیدی قوتەیت چووە نێو بەندیخانە و جلەکانی لە بەر نوورەددین داکەند و جلی کۆن و شـڕۆڵی لە بەر کرد و هێنایە لای وەزیر. نوورەددین سـەیری کرد ئەوە دژمنەکەی ڕاوەستاوە و بە تەمایە بیکوژێ. گریا و گوتی: 'تۆ وا دەزانی هیچ بەڵایەکت بەسـەر نایە؟' کوڕی سـاوی گوتی: 'کوڕی فەزڵ، من بەو قسانە دەترسێنی؟ ئەمڕۆ دەتکوژم و لووتی خەڵکی بەسرە لە بەرد دەدەم. گوێ لە قسەی تۆ ناگرم و بە قسەی شاعیر دەکەم کە دەڵێ:

لە دوای مرۆڤە سـووک و خوێڕییەکان، چەند سـاتێک ژیان
بـاشـترە لەوەی سـەدان سـاڵ بژی بەڵام لەگەڵ وان

"ئیدی بە پێی فەرمانی کوڕی سـاوی، عەلی کوڕی خاقانیان سـواری کەرێک کرد و بە کۆڵان و بازاڕدا گێڕایان و بە خەڵکیان ڕاگەیاند کە ئەوەیە سزای ئەو کەسەی درۆ بە زمان خەلیفەوە بکا و دووڕوویی بکا. کە بە تەواوی شـاردا گێڕایان، هێنایانەوە بەردەرگای کۆشـک و دایانە دەس بکوژەکان. بکوژ بە نوورەددینی گوت: 'فەرمانبەر بێتاوانە. ئەگەر ڕاسـپاردەیەکت هەیە، پێم بڵێ، چونکە ئەوەندەت کات نەماوە و هەر کە سـوڵتان بێتە بەر هەیوان دانیشێ، دەکوژرێی.' عەلی کوڕی خاقان چاوی لەملا و لەولای کرد و کەوتە گریان. خەڵکیش لەگەڵ ئەو گریان. بکوژەکە هەستا پەرداخێکی ئاو دایە.

"کوڕی ساوی کە ئەوەی دیت، لە جێوە هەستا و پەرداخەکەی شکاند و ئاوەکەی ڕشت و لە بکوژەکە توورە بوو و فەرمانی کوشتنی دا. خەڵکی بەسرە ئەو شێوە هەڵسوکەوتەی ئەویان بە لاوە زۆر ناڕەوا بوو. ئیدی هەموو تووک و دۆعایان لێ کرد. لەو جەنگەیەدا تەپوتۆزێک لە دوور پەیدا بوو. سـوڵتان کە ئەو تۆزوخۆڵەی دیت، گوتی: 'تەپوتۆزێک

دیاره بزانن ئەو تەپوتۆزە چییە.' وەزیر گوتی: 'جارێ فەرمان بدە با عەلی بکوژن.' سولتان گوتی: 'هەتا نەزانم ئەو تۆزە چییە، نایکوژم.' لە بەختی عەلی ئەو تەپوتۆزە جەعفەری بەرمەکی وەزیر و دەستوپێوەندەکەی بوون. هۆکاری هاتنی جەعفەری بەرمەکی ئەوە بوو کە خەلیفە سی ڕۆژ بوو عەلی کوڕی خاقانی ناردبووەوە بەسرە و لە بیریشی چووبووەوە کە ئەوە عەلی ناردووەتە بەسرە هەتا شەوێک ڕێی کەوتە ئەو کۆشکەی ئەنیسولجەلیسی لێ بوو. گوێی لە دەنگی ئەنیسولجەلیس بوو کە لە بەر خۆیەوە دەگریا و بە غەریبی خۆی هەڵدەگوت. ئیدی خەلیفە دەرگاکەی کردەوە. ئەنیس کە خەلیفەی دیت. هەستا سێ جاری کوڕنۆش برد. خەلیفە گوتی: 'تۆ کێی و بۆ دەگری؟' ئەنیس گوتی: 'من دیارییەکەی عەلی کوڕی خاقانم. تکات لێ دەکەم لەسەر گفت و بەڵێنی خۆت بی و من لەگەڵ خەڵاتەکانت بنێرییەوە بۆ عەلی کوڕی خاقان.' خەلیفە زگی پێی سووتا. بانگی جەعفەری بەرمەکی کرد و پێی گوت: 'ئەوە سی ڕۆژە هیچ هەواڵێکمان لە عەلی کوڕی خاقان نییە، پێم وایە سولتان محەممەد ئەوی کوشتووە. بە ڕووحی پاکی باب و باپیرانم! ئەگەر خراپی لەگەڵ جووڵابێتەوە، لە تۆڵەی ئەوەدا دەیکوژم. هەر ئێستا وەڕێ کەوە بچۆ بۆ بەسرە بزانە سولتان چۆن لەگەڵ عەلی کوڕی خاقان جووڵاوەتەوە و منیش ئاگادار کەوە.' جەعفەری بەرمەکی بە گوێی سولتانی کرد و بەرەو بەسرە کەوتە ڕێ. کە جەعفەر گەیشتە بەسرە و ئاپۆڕای خەڵکەکەی دیت، پرسیاری لە هۆکاری ئەو کۆبوونەوەیە کرد. بۆیان گێڕاوە کە: 'دەیانەوێ ئێستا عەلی کوڕی خاقان بکوژن و خەڵک هاتوون بۆ تەماشای کوشتنەکەی.' کە جەعفەر ئەو قسەیەی بیست، ئەسپەکەی تین دا و زووتر خۆی گەیاندە سولتان محەممەد. سڵاویان لە یەک کرد. جەعفەری وەزیر فەرمانی خەلیفەی بە سولتان ڕاگەیاند. ئینجا سولتان و موعینی کوڕی ساوی قۆڵبەست کرد و عەلی کوڕی خاقانی لەسەر کورسی دەسەڵات لە جێگەکەی ئەو دانا. سێ ڕۆژ لە بەسرە ماوە. بەیانی ڕۆژی چوارەم عەلی کوڕی خاقان گوتی: 'پێم خۆشە بێمە زیارەتی خەلیفە.' ئیدی جەعفەر و عەلی کوڕی خاقان، سولتان محەممەد و موعینی کوڕی ساوییان بردن و بەرەو بەغدا کەوتنە ڕێ. کە گەیشتنە بەغدا، چوونە خزمەت خەلیفە و بەسەرهاتی عەلی کوڕی خاقانیان بۆ خەلیفە گێڕاوە. خەلیفە ڕقی هەستا و بە نوورەددینی گوت: 'دەست دە ئەو شیرە و کوڕی ساوی بکوژە.' عەلی کوڕی خاقان دەستی دا شیرەکە و لە کوڕی ساوی چووە پێشی. کوڕی ساوی بە زەبوونییەوە چاوێکی لێ کرد و گوتی: 'ئەگەر من بە هۆی خووخدە و زاتی خراپی خۆم خراپەم لەگەڵ کرد، تۆ بە خووخدەی و زاتی پاکی خۆتم لەگەڵ بکە و لێم خۆش بە، مەمکوژە.' عەلی کوڕی خاقان شیرەکەی فڕێ دا. خەلیفە گوتی: 'نوورەددین. ئەوە فریوت دەدا.' ئیدی خەلیفە بە مەسرووری گوت: 'دەست ئەو شیرە و ئەو ناپاکە بکوژە.' ئینجا بە عەلی نوورەددینی گوت: 'چ ئاواتێکت هەیە بیڵێ، با بۆت بێنمە دی.' عەلی کوڕی خاقان بە خەلیفەی گوت: 'خودا خەلیفە ڕاوەستاو کات، پێویستیم بە پاشایەتی

بەسرە نییە و بە ئاواتی دەخوازم هەر لە خزمەت خەلیفەدا بمێنمەوە.'

"ئینجا خەلیفە ئەنیسولجەلیسی بە نوورەددین بەخشییەوە و کۆشکێک لە کۆشکە قایمەکانی دایە و کردی بە هاونشینی خۆی. ئیدی نوورەددین هەر بە ڕێز و حورمەتەوە ژیا هەتا ئیزرائیل بەربینگی گرت."

شەهرزاد کە ئەو چیرۆکەی لێرەد تەواو بوو، بە پاشای گوت: 'خاوەنشکۆ، هەرچەندە ئەو چیرۆکە زۆر خۆش بوو، بەڵام وەک چیرۆکی ئەیووب و کوڕەکانی نایەتەوە. ئەویش ئاوا بوو ...

## چیرۆکی ئەیووب و کوڕەکانی

"زەمانی زوو بازرگانێک بوو، دەستڕۆیشتوو، کوڕێکی جوانچاکی هەبوو، وەکوو مانگ دەدرەوشاوە. کوڕەکەی ناوی غانم بوو. ئەو کوڕە خوشکێکی بوو لەبەر جوانی پێیان دەگوت فیتنە. کە بابیان مرد، ماڵێکی زۆری لەپاش بەجێ ما."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که بازرگان مرد، ماڵێکی زۆری لەپاش خۆی بەجێ هێشت. سەد باری کەلوپەلی گرانبایی وەک: خەز و دیبا و مسک، ئامادە کردبوو بە تەما بوو بیانبا بۆ بەغدا. ناوی بەغداشیان لەسەر نووسرابوو. ماوەیەک دوای مردنەکەی، کوڕەکەی ئەو بارانەی هەڵگرت و بەبێ هیچ گرفت و سەرئێشەیەک گەیشتە بەغدا. ئەو دەم سەردەمی هاروونە ڕەشید بوو. دوای ئەوەی ماڵێکی گەورەی بە کرێ گرت و فەرشی جوانی تێدا ڕاخست، پاڵپشتی دیبای لێ دانا و پەردەی ئاوریشمی هەڵاوەسی، بارەکانی تێدا چنی و چەند ڕۆژێک حەساوە. گەورە و بازرگانەکانی بەغدا هاتنە سەردانی. دوای ئەوە بوخچەیەکی بە یەکێک لە پیاوەکانیدا نارد بۆ بازاڕ. بازرگانان لێی کۆ بوونەوە، سڵاویان لێ کرد و ڕێزیان لێ گرت. بەرپرسی دەڵاڵەکانی بانگ کرد و شتەکانی پێ فرۆشت. یەکاویەک خێریان کرد و زۆر زۆر خۆشحاڵ بوون. هەتا ساڵێک بەو شێوەیە لە ماڵەکەی فرۆشت. کە یەکەم ڕۆژی ساڵی تازە هاتە بازاڕ، دیتی ئەوە دەرکی قەیسەرییەکانی بازاڕ داخراوە. پرسیاری کرد. گوتیان: 'ئەوە یەکێک لە بازرگانەکان کۆچی دوایی کردووە و چوون بۆ ناشتنی. ئەگەر تۆش پێت خۆشە، خێر و پاداشتت بگاتێ، بچووە.'

"غانمی کوڕی ئەیووب پرسی : 'ماڵی ئەو بازرگانە کۆچکردووە لە کام گەڕەکە؟' ناونیشانەکەیان پێ گوت. خۆی گەیاندە سەر تەرمەکەی. لەگەڵ بازرگانان و خەڵکی دیکە نوێژیان لەسەر کرد و بردیان لە گۆڕستان ناشتیان. سەیری کرد ئەوە لەسەر گڵکۆکەی خێوەتیان هەڵداوە و مۆم و عوودیان هەڵکردووە. کە مردووەکەیان ناشت، قورئانخوێنان دەستیان کرد بە خوێندنەوەی قورئان و بازرگانەکانیش دانیشتبوون. غانمی کوڕی ئەیووب لە ڕووی هەڵنەهات هەستێ و بڕواتەوە لای شتەکانی. لەگەڵیان هەتا شەو دانیشت. ئینجا خواردەمەنییان هێنا، دایان نا و خواردیان و دەستیان شوشت. بەڵام غانمی کوڕی ئەیووب هۆشی هەر لە لای شتەکانی بوو؛ نیگەران بوو لەوەی بدزرێن.

"ئەو جارهەستا ڕوخسەتی لە دانیشتووان خواست و وە وەدەر کەوت. ڕۆیشت هەتا گەیشتە دەروازەی شار. دیتی دەروازە بەستراوە و کەس دیار نییە، بێ یان بڕوا و جگە لە دەنگی سەگ و لوورەی گورگ، گوێت لە هیچی دی نییە. گوتی: 'سوبحانەڵڵا، من کە لەوێ هاتمە دەرێ، خەمی ماڵەکەم بوو. کەچی ئێستا خەمی خۆمە.' ئەو جار لە پەنایەک دەگەڕا هەتا بەیانی خۆی تێدا حەشار بدا. گۆڕێکی وە بەر چاو هات. دیواری لە دەور کرابوو، دارێکیش لە پاڵ گۆڕەکەدا بوو. دەرگاکەشی کرابووەوە. چووە ئەوێوە ویستی بخەوێ. نەیوێرا بخەوێ و ترسی ڕێ نیشت.

"هەستا سەر پێ و ڕەق ڕاوەستا. چاوی لە دەرکی گۆڕەکە بڕیبوو کە لە دوور ڕووناکاییەکی دیت. لە گۆڕەکە هاتە دەرێ و کەمێک بەرەو ڕووناکاییەکە چوو. سەیری

کرد ڕووناکاییەکە بەرەو گۆڕەکە دێ. ترسا و گەڕاوە ناو گۆڕەکە و دەرگاکەی داخست و چووە سەر دارەکە. بە نیگەرانییەوە چاوی لە ڕووناکاییەکە بڕیبوو، ڕووناکاییەکەش هەر دەهاتە پێشێ. هەتا گەیشتە نیزیک گۆڕکە. غانم سەیری کرد ئەوە سێ کۆیلەی ڕەشن. بەدوو کەسیان یەغدانێکیان لەسەر شان داناوە و یەکیشیان تەشوێیەک و فانۆسێکی بەدەستەوەیە. کە گەیشتنە گۆڕەکە، یەکێک لەوانەی یەغدانەکەیان هەڵگرتبوو، گوتی: 'سەواب، بۆ ناچییە ژووری؟' ئەو وەڵامی داوە گوتی: 'کافوور، ئێمە کاتی شێو لێرە بووین، دەرگای گورەکەمان بە کراوەی بەجێ هێشت و ڕۆیشتین.' کۆیلەی سێیەم کە ناوی ئەڵماس بوو، گوتی: 'تۆ نازانی هێندێک لە خەڵکی بەغدا کە دێن بۆ گەشت و سەیران و ڕۆژیان لێ دەرەنگ دەبێ، ناتوانن بگەڕێنەوە. ئیدی لە ترسی ئێمەی قولەڕەش دەچنە ئەو قسنانەوە[1] و دەرگاکان لە خۆیان دادەخەن. دەترسن بیانگرین. بیانبرژێنین و بیانخۆین.' سەواب و کافوور گوتیان: 'ئەڵماس ڕاست دەکەی. تۆ لە ئێمە ژیرتری.' ئەڵماس گوتی: 'باشە گاڵتەم پێ بکەن. ئێوە باوەڕ بە من ناکەن هەتا نەچینە نێو قسنەکەوە، ئینجا بۆتان دەردەکەوێ. جا ئەگەر کەسێکی لێ بێ چاوی بە شۆقی چراکەی ئێمە کەوتبێ، یان هەڵاتووە یان چووەتە سەر دارەکە.' غانم کە وتووێژی کۆیلەکانی بیست، گوتی: 'حەک ڕووت ڕەش بێ ئەڵماس وا تۆ ئەوەندە پیتۆڵ و زۆرزانی. جا توو خودا ئەوە بڵێی چۆن ڕزگارم بێ؟!'

"ئیدی ئەوانەی یەغدانەکەیان پێ بوو، بەوەی دیکەیان گوت: 'ئەو یەغدانە بڕستی لێمان بڕیوە. تۆ بەسەر دیوارەکەدا بچۆ ئەودیو و دەرگاکەمان بۆ بکەوە، ئێمە لە پاداشتی چاکەکەتدا یەکێک لەوانەی لەنێو قسنەکەدان، وات بۆ دەبرژێنین ناهێڵین یەک تکەی ڕۆن لێ بتکێتە سەر زەوی.' ئەویش گوتی: 'من لەوە دەترسم کە دزان دزیان کردبێ و شەو هاتبنەوە نێو ئێرە.' ئەوانیش گوتیان: 'کەس ناتوانێ بێتە ئێرە.' ئیدی بە هەموویان یەغدانەکەیان لەسەر دیوارەکە دانا و بۆخۆیان بەسەر دیوارەکەدا چوونە ژووری. یەکیان گوتی: 'ئەمشەو ئەوەندەمان بار هەڵگرتووە و ڕێمان بڕیوە و دەرگامان کردووەتەوە و پێوە داوە، تەواو ماندوو بووین و ئێستاش ئەوە نیوەشەوە ئیدی توانایی دانەوەی گۆڕ و یەغدانە خستنە قوڵکەمان نییە. جارێ دوو-سێ سەعاتێک دادەنیشین و دەحەسێینەوە، دوایی هەڵدەستین و خەریکی کاری خۆمان دەبین.' ئیدی دەرگایان پێوە داو دانیشتن. یەکیان گوتی: 'دەبێ هەرکەسەی بەسەرهاتی خۆی و چۆنیەتی و هۆکاری بڕانی کیری خۆی بگێڕێتەوە.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. قسن: قەبرێک کە دەورەکەی دیواری بۆ چنراوە.

## کە شەوی سی و هەشتەم هات

**بەسەرهاتی سەواب (کۆیلەی یەکەم)**

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە کۆیلەکان کۆک بوون لەسەر ئەوەی هەموویان بەسەرهاتی خۆیان بگێڕنەوە، لە پێشدا ئەوەی فانۆسەکەی بە دەستەوە بوو دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی و گوتی: 'ئەمن تەمەنم پێنجسالان بوو بە فەرماندەرێکیان فرۆشتم و لە زێد و نیشتمانی خۆم دوور کەوتمەوە. ئەو فەرماندەرە کیژێکی سێسالانەی هەبوو. من هاویاری ئەو کیژە بووم و گۆرانیم بۆ دەگوت و سەمام لە بەر دەکرد. هەتا بوومە دوازدەسالان و ئەو بوو بە دە سالان و، لێیان دوور نەدەخستمەوە و لێیان دانەدەپۆشیم.

" 'ڕۆژێک چووم بۆ لای کچە و دیتم ئەوە بە تەنیا لە شوێنێک دانیشتووە. گۆیا تازە لە گەرماو هاتبووەوە و وەک ئەستێرە دەدرەوشاوە. بۆنی عەنبەر و میسکی لێ دەهات. کەمێکمان کایە کرد و خۆمان تێک هەڵسوو، کچێنیەکەی چوو. ئەمن هەستم بەوە کرد و هەڵاتم. دایکی کچە دێتە لای کچە و واقی وڕ دەمێنێ و دەچێ لە فکرەوە. دوای ماوەیەک لەگەڵ من ئاشت بووەوە، شتەکەیان لە باوکی شاردەوە و بە سۆز خۆشەویستییەوە هەڵسووکەوتیان لەگەڵ دەکردم. هەتا دوو مانگ تێپەڕ بوو. ئینجا دایکی کچەکەی لە دەللاکێک کە سەری باوکی دەتاشی، مارە کرد و مارەییەکەی لە ماڵی خۆی دا و جیازیشی لەگەڵ خست. سەرەڕای تەواوی ئەو کارانە، هەر نەیانهێشت باوکی بە کاری کچەکەی بزانێ. بەڵام بۆ ئامادەکردنی جیازی کچەکەی پەلەیان دەکرد. بۆ تۆڵەکردنەوە، ڕۆژێکی منیان گرت و کیریان بڕیم.

" 'کە کاتی گواستنەوەی هات. منیان لەگەڵ ئەو کچە خست و ناردیانم لە خزمەتیدا بم. ئیدی منی خواجە[1] هەر کات ئەو کچە دەهاتەوە ماڵە بابی یان دەچوو بۆ گەرماو لەگەڵی دەچووم. ئیدی گرفتەکەی ئەویان سرپۆش کرد و شەوی پەردەش کۆترێکیان سەر بڕی و خوێنەکەیان لە جیاتی خوێنی کچێنی پیشانی ژنان دا. کچە ماوەیەکی زۆر لە ماڵی دەللاکەکە ماوە و منیش ماچ و مووچ و دەستبازی خۆم دەکرد. هەتا وای لێ هات کچە و مێردکەی و دایکی مردن و من بێخاوەن مامەوە و هاتمە ئێرە و لەگەڵ ئێوە بوومە هاوڕێ. ئەوە بوو هۆی بڕانی چووکی من و، وەسسەلام.'

**بەسەرهاتی کافوور (کۆیلەی دووەم)**

"کۆیلەی دووەم گوتی: 'من هەشتسالان بووم، بە بازرگانێکیان فرۆشتم. خووم بەوە گرتبوو سالێ درۆیەکم لەگەڵ خاوەنەکەم دەکرد و لەگەڵ هاوڕێکانی بە شەڕم دەدا.

---

١. خواجە: کوڕ یان پیاوی خەساو.

بازرگانەکە ناچار بوو، لەبەر ئەو درۆیانە بمدا بە دەلال و بمفرۆشێ. دەلال منی بردە بازاڕ و گوتی: 'کێ ئەو کۆیلە دەکڕێ بە عەیب و ئیرادەوە.' بازرگانێک هات گوتی: 'عەیبی چییە؟' دەلال گوتی: 'سالێ درۆیەک دەکا.' بازرگان گوتی: 'بەو عەیبەوە داوای چەندی لێ دەکەی؟' دەلال گوتی: 'شەش‌سەد درەم.' وا بوو. فرۆشیار و کڕیار ڕێک کەوتن. کڕیارەکە پارەکانی ژمارد و منی بردە دووکانەکەی و جلوبەرگێکی جوانی لە بەر کردم. لە لای ئەو مامەوە تا سـال تازە بووەوە و ئەو سـالە سـالێکی پیرۆز بوو. بەهارێکی زۆر سـەرسـەوزی بوو. بازرگانەکان هەر ڕۆژەی میوانی یەکێک لە بازرگانەکان دەبوون هەتا نۆرە گەیشـتە خاوەنەکەم. لەگەڵ بازرگانەکان چوونە باخێک لە دەرەوەی شار. خواردن و خواردنەوەیەکی زوریان لەگەڵ خۆیان برد. گەلێکیان گاڵتە و جەفەنگ و قسـە کرد، پێکەوە خواردیان و خواردیانەوە هەتا بوو بە نیوەڕۆ. خاوەنەکەم کاری بە شـتێک بوو، بە منی گوت: 'سـواری پەستر بە و بچووەوە ماڵێ لە خانمی وەرگرە و زوو بگەڕێوە.' گوتم: 'بەسەر چاو.'

" 'کە لە ماڵێ نیزیک بوومەوە، هاوارم کرد و دەسـتم کرد بە گریان. خەڵکی گەڕەک لێم کۆ بوونەوە. خانم و کچەکانی کە گوێیان لە گریانی من بوو، سـەریان کێشـا دەرێ و پرسییان: 'ئەوە چ بووە؟' گوتم: گەورەم و هاوڕێکانی لەبن دیوارێک دانیشتبوون، دیوارەکە بەسەریاندا ڕووخا. ئەمن کە ئەوەم دیت، سواری پەستر بووم و زوو هاتمەوە ئێوە ئاگادار بکەمەوە.' ژن و منداڵەکانی گەورەم کە ئەوەیان بیسـت، بەسـەر سـەریاندا دا و یەخەی خۆیان دادڕی و دەسـتیان کردە شـین و ڕۆڕۆ. دراوسـێکانیان لێیان کۆ بوونەوە. خانم چووەوە ژوورێ و لە تـاوان تەواوی مـاڵەکەی بە یەکدا دا و دەفری بلوور و چینی و کەلوپەلی گرانبایی هەرچی بوو شکاندنی و پێکی دادان. تەشوێیەکی دا دەست من و گوتی: 'تەواوی ئەو فوارە و شـتانە بشـکێنە.' تەواوی وێنەکانی ماڵێ قوڕاوی کرد. بە منی گوت: 'ئەو دەرگا و دیمەن و شتە بشکێنە.' بەو جۆرە ئەوی بۆ شکان دەبوو شکاندمان و ئەوەی بو هەڵکەندن دەبوو هەڵمانکەند و ئەوەی بۆ ڕووخان دەبوو ڕووخاندمان. ماڵمان بە جارێک کاول کرد. ئیدی ژن و خێزانی خاوەنەکەم بە ڕوویەکی پەشـێوەوە هاتنە دەرێ و گوتیان: 'ئیستا لە کوێیە؟ پێمان بڵێ با بچین دەری بهێنینەوە و لە تابووتی خەین.' ئەمن وە پێشیان کەوتم و خەڵکی گەڕەک و چەند گەڕەک ئەولاتریش کە زانیبوویان، بە دوایاندا هاتن. منیش کوڵان بە کوڵان دەمگێڕان ئەوەی نەیزانیبوو زانی و ئەو هەواڵە بە گوێی والی شـار گەیشت.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، 'کە هەواڵەکە گەیشــتە والی شــار، والی فەرمانی بە پیاوەکانی د پیمەرە[1] هەڵگرن و بێن، خۆشـــی بە ســـواری بە دوای مندا هات. ئەمن هاوارم دەکرد 'گەورەم ڕۆ! خـاوەنم ڕۆ!' هەتـا گەیشـــتینە نێو بـاخەکە. خـاوەنەکەم کە دیتی من بە سەروسەکوتی خۆمدا دەدەم و هاوار دەکەم: 'گەورەم ڕۆ! خاوەنم ڕۆ!' وشک و مات بوو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و گوتی: 'کافوور، چ بووە؟ ئەوە بۆ وا دەکەی؟ گوتم: 'کە چوومەوە ماڵێ، دیتم دیواری ماڵێ رووخاوە و خانم و منداڵەکانت هەموو وە بن کەوتوون.' خاوەنم گوتی: 'خانم ڕزگاری نەبوو؟' گوتم: 'لەپێشـــدا خانم مرد.' خاوەنم گوتی: 'کچە چکۆڵەکەم ڕزگاری نەبوو؟' گوتم: 'ناوەڵڵا.' خاوەنم گوتی: 'ئەی یەســـترەکەم؟' گوتم: 'دیواری ماڵ و تەویلە و ئـاغەڵ هەموو کـاول بووە و ئەوەی تێیدا بووە وە بن کەوتووە و مردووە. لە مرۆڤ و پاتاڵ، مەڕ و مالات و قەل و مراوی و ســـەگ و پشـــیلە و ئەوەی گیانلەبەرە هەمووی وە بن کەوتووە.' خاوەنم کە قســـەکانی منی بیســـت، دنیای لە بەر چاو ڕەش و تاریک بوو، خۆی پێ ڕانەگیرا و ڕۆنیشتە زەوی. بە چەپۆک بە سەریدا دا و جلوبەرگی لە بەر خۆی دادڕی و ســـەر و ڕدێنی خۆی هەڵکەندەوە تا ئەو جێی خوێن بە ســـەروچاوید هـاتە خوارێ. هـاواری دەکرد: 'ئەی هەوار! کێ وەک منی لێ قەومـاوە لەو دنیـایەدا؟' بازرگانەکانیش کە هاوڕێی بوون و خەمیان بوو، دەستیان کرد بە گریان. خاوەنم بە گریان و هاتوهاوار و لەخۆدان لە باخ هاتە دەرێ. ئەوەندەی بە ســـەر خۆیدا دابوو نەیدەتوانی بە ڕێدا بڕوات.

" 'کە بـازرگـانەکانیش لەگەڵ خـاوەنم لە بـاخ هـاتنە دەرێ، تۆزێکیـان لە دوور دیت و گوێیان لە هاتوهاوارێک بوو. کە جوان تێیان ڕوانی، ســـەیریان کرد ئەوە خەڵکێک بەرەو باخ دێن و والیشیان لەگەڵدایە. خزم و کەس و ژن و منداڵی بازرگان ئەوە بە شین و گریان و ڕۆڕۆ دێن. کە نزیک بوونەوە، یەکەم کەس کە خاوەنم دیتی، خێزانی و منداڵەکانی بوون بە دیتنی ئەوان گەشـاوە و پێکەنی. ئەوانیش کە خاوەنمیان دیت: 'گوتیان شـوکری خودا بە زیندووی دیتمانییەوە!' خۆیان لە ئامێزی یەکتر هاویشت. گوتیان: 'چۆن ڕزگارتان بوو لەو بن دیوارانە؟' خاوەنیشـــم لەوانی پرســـی: 'ئەرێ ماڵەکەمان چی لێ هات؟ و ئێوە چۆن ڕزگارتان بوو؟' ئەوان گوتیان: 'سـپاس بۆ خوا هەموو سـاخ و سـلامەتین و ماڵەکەشمان هیچی لێ نەهاتووە. بەڵام کافووری غوڵامت بە ســـەری ڕووت و یەخەی دڕا و لەخۆدان هاتەوە ماڵێ و هەر دەیگوت: 'گەورەم ڕۆ! خاوەنم ڕۆ!' لێمان پرســـی: 'ئەوە چی بووە؟

---

[1]. پیمەرە: بێڵ ئاسن، خاکەناز.

گوتی: 'گەورەم لەگەڵ بازرگانەکان لەبن دیوارێک دانیشـــتبوون کە دیوارکە بەســـەریاندا ڕووخا و گەورەم مرد.' '

" 'بازرگان گوتی: 'سـوبحانەڵلا، کافوور ماوەیەک لەوەو پێش بە هاتوهاوار و شـین و ڕۆڕۆ هات.' گوتم: 'چی بووە؟ ئەوە بۆ وا دەکەی؟' گوتی: 'ماڵەکەتان ڕووخاوە. خانم و کچەکانت و مەڕ و ماڵات و یەســـتر و هەرچی هەتانە و نیتانە هەمووی تێدا چوون.' ئەوە وەک دەبینی سەرم ڕووتە، دەستم کرد بە شین و گریان و لەخۆدان لە تاوی ئێوە.'

" 'ئیدی بانگی کردم و گوتی: 'هەتیوە گلاوە، دا وەرە، ناپاکی هیچوپووچ ئەوە ئەو هەرا و کارەسـاتە چییە سـازت کردووە؟ بە خودا دەبێ پێسـتی سـەرت هەمووی لێ کەمەوە، بە زینـدووی کەوڵـت بکەم.' گوتم: 'بە خودا نـاتوانی هیچم لێ بکەی. چونکە هەموو خەڵـک شـایەدن تۆ بەو عەیبەوە منت کڕیوە کە سـاڵێ درۆیەک بکەم. تازە ئەوە نیوەدرۆش بوو با ســـاڵ تەواوە بێ، نیوەکەی دیکەش دەکەم.' خـاوەنم بە ســـەرمـدا نەڕانـدی و گوتی: 'نارەســـەنترین کۆیلەی دنیا! ئەو هەموو ئاژاوە و هەراوهوریایەت ســـاز کردووە و دنیات پێکدا داوە، هێشـتا ئەوە نیوەدرۆیە و نیوەکەی دیکەی ماوە؟! لاچۆ بڕۆ ئەوە ئازادم کردی. هەر لە کۆڵم بەوە، هیچی دیکەم ناوێ.' گوتم: 'ئەگەر تۆ ئازادیشـــم کەی ناڕۆم تا ســـاڵ تەواو نەبێ و نیوەدرۆکەی دیکەشـــم نەکەم. ئەو دەم بمبە بازاڕ و بە هەر نرخێک و هەر عەیبێکەوە کڕیوتم، هەر بەو مەرجەش بمفرۆشـەوە و ئازادم مەکە. خۆ من پیشـەیەکم نییە تا بژیوی خۆمی پێ پەیدا کەم. ئەوە بابەتێکی شەرعیشە کە عەرزم کردی و مامۆستایان و خاوەنڕایانیش لە بارەی ئازادی کۆیلەکانەوە باسی ئەوەیان کردووە.'

" 'بەو جۆرە ئێمە خەریکی وتوویژ بووین کە والی لەگەڵ تاقمێک لە دەستوپێوەندەکانی و خەڵکی دیکە گەیشـتنێ. خاوەنم چوو بۆ لای والی و شـتەکەی بۆ گێڕاوە و گوتی: 'ئەو هەتیوە گلاوە دەڵێ: 'ئەوەی کردم نیوەدرۆ بوو.' خەڵک کە ئەوەیان بیســـت، ســـەریان لەو درۆیە سووڕ ما و زۆریان جنێو بە من دا و تووک و دوعایان لێ کردم. کەچی ئەمن لەوێ ڕاوەســـتابووم و پێدەکەنیم و دەمگوت: 'چۆن دەتوانێ بمکوژێ لە کاتێکدا بەو عەیبەوە کڕیومی؟' کە خاوەنم هاتەوە ماڵێ و ماڵەکەی خۆی بە کاولی دیت، زانی من زۆربەی ئەو ماڵەم خراپ کردووە و چەندەم شـتی گرانبایی شـکاندووە. خێزانی پێی گوت کە فلان دەفر و فلان چینی و بلوور ئەو شـکاندوویەتی. خاوەنم هەڵچوو، گوتی: 'هەتا ئێسـتا زۆڵی ئاوام نەدیتووە، هێشتا ئەوە نیوەی درۆکەیەتی! ئەگەر نیوەکەی دیکەی بکا، چ دەبێ؟ دڵنیام شەڕ لە نێو خەڵکی شـــارێک یا لە نێوان دوو شـــاردا هەڵدەگیرســـێ.' دوای ئەوە خاوەنم لە تووڕەییاندا چوو لە لای والی شـــکاتی لێ کردم. والی فەرمانی دا. ئەوەندەیان لێ دام و ئەشـــکنجە کردم هەتا بێهۆش بووم. پاشـــان بردمیانە لای دەللاک و هێشـــتا بە هۆش نەهاتبوومەوە، کیریان بڕیم و دەیان شـوێنی جەسـتەیان داغ کردم. کە وە هۆش هاتمەوە،

خاوەنم پێی گوتم: 'ئەتۆ کە باشترین شتەکانی منت لە نێو برد، ئەمنیش باشترین ئەندامی تۆم بڕی.' ئیدی منیان دا بە دەلاڵ و بە نرخێکی باش فرۆشتیانم. ئەمن بەردەوام کام کار خراپ با ئەوەم دەکرد و پشێویم دەناوە و خەڵکم پێکدا دەدا. ئیدی ئەو خاوەنم بەوی دیکەی دەفرۆشتم و ئەویش بەوی هەتا خەلیفە منی کڕی. ئیدی ئەو جار درۆم نەکرد و کێشەم نەناوە، خەلیفە لێم ڕازی بوو.'

"ئەو کۆیلانەی دیکە بە قسەکەی کافوور پێکەنین و گوتیان: 'ئەتۆ گلاوی و لە گلاو بووی.'

"ئیجا بە غولامی سێیەمنیان گوت: 'ئەتۆش بەسەرهاتی خۆت بگێڕەوە.' گوتی: 'ئامۆزا ئەوەی ئێوە گێڕاتانەوە زۆر خۆش نەبوو، چیرۆکی بڕینی کێری من شتێکی سەیر و خۆشە. بەڵام ئەوەندە دووروودرێژە بۆ ئیستا نابێ. ئەوە خەریکە ڕۆژ دەبێتەوە و بۆ خۆشتان دەزانن ئەو یەغدانەشما دزیوە. بۆی ڕۆژ بێتەوە و ئێمە بە هۆی ئەو یەغدانەوە ئابڕوومان بچێ و بە کوشت چین. ئێوە هەستن با کارەکانمان جێبەجێ بکەین و نەجاتی دەین، ئەو دەم هۆی بڕینی کێری خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە.' ئیدی مۆمیان هەڵکرد و بردیانە پێشێ و لەنێوان چوار گۆڕدا قوڵکێکیان بۆ هەڵکەند و یەغدانەکەیان تێ خست و گڵیان بەسەردا کرد. لە قسنەکە چوونە دەرێ و لە بەرچاوی غانمی کوڕی ئەیووب بزر بوون.

" 'کە ئەوێ چۆڵ بوو و غانم بە تەنیا ماوە، شتی نێو یەغدانەکە مێشکی غانمی بە خۆیەوە خەریک کرد. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'بڵێی ئەو سندووقە چی تێدابێ؟' ئیدی ڕاوەستا هەتا کازیوەی بەیانی و وردەوردە وڵات ڕووناک بوو. غانم لەسەر دارەکە هاتە خوارێ و خەریکی دانەوەی سەر یەغدانەکە بوو، هەتا وەدیار کەوت. ئیدی یەغدانەی دەرهێنا و بەردێکی هێنا قفڵەکەی شکاند و سەرەکەی لا برد. دیتی کچێکی جوان لە یەغدانەکەدایە و بێهۆشە، جلوبەرگی ڕازاوە و ملوانکەی زێڕ و دوڕ و ئەڵماسی لە مل دا کە یەکیان تەواوی سەروەت و سامانی پاشایەکی دێنا. ئیدی غانم ئەو کچە پەریڕووەی لە یەغدانەکە هێنا دەرێ و لەسەر پشت درێژی کرد. کاتێک سۆزەبایەکی فێنک لە سەروچاوی درا، وە هۆش هاتەوە، کە وەهۆش هاتەوە پشمی و کۆخی و لەتە بەنگێک[1] لە قورگی هاتەوە دەرێ. بەڵام بەنگێکی وا بوو کە ئەگەر فیل خواردبای، دوو شەوڕۆژ بێهۆش دەکەوت.

"کە ئەو چاوگەشە چاوی کردەوە، گوتی: 'ئەیڕۆ! ئەوە چ بووە؟ ئەوە کێ منی لەو باخ و کۆشک و سەرسەرایانەوە هێناوەتە ئێرە و لەنێو ئەو قەبرانەدا داینام؟' غانم کوری ئەیووب گوتی: 'خانم، نە کۆشکم دیوە و نە باخ و سەرسەرا. ئەمنیش تۆم نەهێناوەتە ئێرە

---

١. بەنگ: جۆرە گیایەکە کە مادەی هۆشبەری لێ چێ دەکرێ، حەشیش.

بەلام خودای میری مەزن منی هێناوەتە ئێرە بۆ ئەوەی تۆ ڕزگار بکەم.' ئەو ڕوومانگە گوتی: 'کێ منی هێناوەتە ئێرە؟' غانم گوتی: 'خانم، سێ غولامی ڕەش ئەتۆیان لە یەغدانێکدا هێنا ئێرە.' ئیدی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە و گوتی ئەوەش یەغدانەکەیە. ئینجا پێی گوت: 'ئەتو خۆت بناسێنە.' کچە گوتی: 'سپاس بۆ خوا کە منی تووشی کەسێکی جوانچاکی وەک جەنابت کرد. ئێستاش هەستە من لە یەغدانەکە بخەوە و لەسەر ئەو ڕێگایە ڕاوەستە ولاخێک بە کرێ گرە و یەغدانەکەی لەسەر دانێ و بمبەوە ماڵی خۆت جا خۆمت پێ دەناسێنم.'

"غانمی کوڕی ئەیووب خۆشحاڵ بوو، لە قسنەکە هاتە دەرێ و چوو یەسترێکی لە پیاوێک بە کرێ گرت و هێنایە دەرکی قسنەکە و کچەی لە یەغدانەکە خست و یەغدانەکەی لەسەر یەسترەکە دانا. جا چونکە کچە زۆر جوان بوو و زێڕ و جەواهێراتێکی زۆریشی پێوە بوو، غانم لە خۆشیان خێراخێرا دەڕۆیشت هەتا گەیشتەوە ماڵێ و یەغدانەکەی داگرت و کردییەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چلەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'کە غانمی کوڕی ئەیووب یەغدانەکەی بردە ماڵێ و کردییەوە، ئەو بەژنسـەوڵەی هێنا دەرێ. کچە کە دیتی ماڵی غانم جێگایەکی خۆش و دلڕفێنە و مافووری ئاوریشـــمی لێ ڕاخراوە و بوخچە بوخچە دیبا لەوێ دانراوە، زانی غانم بازرگانە. چونکە غـانم کوڕێکی قۆزی لە بەر دڵان بوو، ئەو خـانمە گیرۆدەی داوی ئەوینی بوو. تیری خۆشـەویسـتی دڵی پێکا. گوتی: 'برسـیمە.' غانم چوو بۆ بازاڕ کاوڕێکی برژاو و حەڵوا و بادە و مۆمی کڕی و هاتەوە. کیژە کە ئەوی دیت، پێکەنی و لە ئامێزی گرت. تێری ماچ کرد و لاواندییەوە. دوای ئەوە چێشتیان خوارد و دانیشتن دەستیان کرد بە قسە. کە کاتی شێو هات، غانم هەستا مۆم و سۆڵەرمەکانی داگیرساند. ماڵ ڕووناک و خۆش بوو. دەرگاکانیان داخست و دەستیان کرد بە مەیخواردنەوە. غانم پیاڵەیەکی دەخواردەوە و پیاڵەیەکی بۆ ئەو تێ دەکرد. دەلالیش پیاڵەیەکی بۆ خۆی تێ دەکرد و پیاڵەیەکیشـــی بۆ ئەو تێ دەکرد. یاری و دەسـتبازی و هەڵمژین و تریقانەوە و هەڵشـێلانیان کرد و شـێعریان بۆ یەکتر گوت، هەتا کازیوەی بەیانی هەر ئاوا لە عەیش و خۆشیدا بوون.

"ئینجا خەو بەســـەریاندا زاڵ بوو و لە جێی خۆیان خەویان لێ کەوت تا خۆر کەوت. ئینجا غانمی کوڕی ئەیووب هەسـتا چوو بۆ بازاڕ و گۆشـت و شـەراب و نوقڵ و مۆمی کڕی و گەڕاوە بۆ مـاڵەوە و خواردنەکـانیـان خوارد. دوای ئەوە دەســـتیـان کردەوە بە مەیخواردنەوە و گـاڵتەوگەپ و دەســـتبـازی هەتـا کوڵمەیـان وەک گوڵووکی لێ هـات و شەرمیان شکا. غانمی کوڕی ئەیووب ئارەزووی ماچومووچ و ئامبازبوونی کردبوو. گوتی: 'خانم، ڕێم بدە با دەمت بمژم بەشکو کوڵوکۆم دامرکێ.' ڕووپەری گوتی: 'غانم، ڕاوەستە با ئەمن سـەرخۆش بم و بکەوم، ئەو دەم چی دەکەی بیکە با من ئاگام لە خۆم نەبێ. دوای ئەوە بالابەرز هەستا و هێندێک لە جلەکانی داکەند و تەنیا کراسێکی یەکسەرەی ناسکی لە بەر خۆیدا هێشتەوە و هات دانیشت. غانم پشووی سوار ببوو. خێرخێرا تفی قووت دەدا و ئارەزووی بزووتبوو. گوتی: 'خاتوون،

پـوورەی داوە لە ســـەرم بەخـتەوەری
ئەمـنـم و بـادە و یـار و دەربەدەری
کۆ وەبووین بە تەمـاین بەزمێـک بگێڕین
خەم لە دڵ دەرکەین و خۆشـــی وەگێڕین

"کیژە گوتی: 'شتی وا نابێ، چونکە لەژێرەوە پشتێنەیەکم بە قەدەوەیە کە شتێکی لەسەر

نووسراوه.' غانم پێی ناخۆش بوو، ئیدی هەتا شەوێکی دی هەر لە دڵیدا ماوە. غانم هەستا چلوورە و مۆمەکانی هەڵکردن و ماڵەکە خۆش بوو. خۆی بەسەر لاقی خانمدا دا و گوتی: 'دیلی ئەوینت بووم و بەزەییت پێمدا بێ. تینی ئەوینت هەناوم دەسووتێنێ.' ڕووگوڵ گوتی: 'گەورەم، بە خوا من لە تۆ گیرۆدەترم و پێش تۆ من دیلی داوی ئەوینت بووم. بەڵام دەزانم پێک ناگەین.' غانم گوتی: 'بۆ؟ پێم بڵێ بۆ؟' کچە گوتی: 'پێت دەڵێم و ئەتۆ بیانووەکەم لێ قەبووڵ دەکەی.'

"دوای ئەوە تۆپەگوڵ خۆی لە باوەشی غانم هاویشت و دەستی لە ملی کرد و ماچی کرد و بەڵێنی ئاوێتەبوونی پێ دا. هەتا کاتی خەو هات. لە دیوێکدا خەوتن و هەر کە غانم ئارەزووی دەبزووت، خانم داوای لێبووردنی دەکرد. هەتا مانگێک بەو شێوەیە ڕابرد. ئینجا دیزەی ئەوینی هەر دووکیان قوڵپی دەدا و توانای بەربەرەکانییان نەما، هەتا شەوێک هەردووکیان مەست لە دیوێکدا خەوتن. غانم دەستی بۆ مەمکە قوتەکانی برد و ئارامئارام هەڵیگوشین ئینجا دەستی بە پێدزە بەرەو خوار خزی تا گەیشتە سەر ناوکی. گورج خانم ڕاپەڕی و پزووی دەرپێکەی توند کردەوە و هەستا دانیشت و خۆی گورج کردەوە. دوای ئیستێک خەوتەوە. غانم خەوی لێ نەدەکەوت و دیسان دەستی بە لەشیدا هێنا هەتا دەستی لە پزووی دەرپێکەی دا و ویستی بیکاتەوە. چاوکەژاڵ هەستا دانیشت و غانمیش لە پەنای دانیشت.

"کیژی ڕوومانگ گوتی: 'چییە بە تەمای چیت؟' غانم گوتی: 'ئاورم گرت، ئاوری هەوەسم دامرکێنە.' کچە گوتی: 'ڕاوەستە با پێت بڵێم بابەتەکە چییە ، جا ئەو جار من دەناسی. ئیدی عوزرم قەبووڵ دەکەی.' دەستی برد پشتوێنەیەکی ناسکی لە قەدی بەسترابوو پیشانی دا و گوتی: 'ئەو دێڕە بخوێنەوە کە لەسەر ئەو پشتوێنە نووسراوە.' غانم کە چاوی لێ کرد، بە ئاوی زێڕ لە سەری نووسراوە: 'ئەی ئامۆزای پێغەمبەر، ئەتۆ هی من و، منیش هی تۆم.'

"غانم کە ئەوەی دیت، دەستی لەرزی و گوتی: 'ئەوە چۆناوچۆنە؟ بۆم بگێڕەوە.' کەنیشکەکە گوتی: 'ئەمن لە کەنیزە تایبەتەکانی خەلیفەم و نێوم ' قووەتولقولووب'ە. یەکێک لە دەستپەروەدەکانی ماڵی خەلیفەم. کە گەورە بووم، خەلیفە جوانییە خوداداوەکانی منی دیت. منی بە کەنیزی پەسەند کرد و لە خۆی مارە کردم و کۆشکێکی تایبەتی بۆ تەرخان کردم و دە دانە کەنیزیشی لە بەردەست دانام تا خزمەتم بکەن. ئەو هەموو زێڕ و زیو و ملوانکە گرانباییانەی کە دەیانبینی، هەموویانی بۆ کڕیم. دوایە خەلیفە بۆخۆی چوو بۆ شارێکی دیکە. زبێدە خانم بەو کەنیزانەی کە خزمەتکاری من بوون، گوتبوو: 'کاتێک قووەتولقولووب خەوت، لەتە بەنگێک لە لووتی نێن یان لە شەرابەکەی کەن.' کەنیزەکان بە قسەی زبێدە خانمیان کردووە و بەنگەکەیان دەرخواردی من داوە. ئەمن لە هۆش خۆم

چووم. دوایە چوون خانمیان ئاگادار کردووەتەوە. ئەویش هاتووە منی لە یەغدانێک ناوە و بە خەساوانی ماڵی گوتووە کە من لە جێگایەک وە بن گڵ دەن. ئەوانیش هەر ئەو شەوە کە تۆ چوویە سەر ئەو دارە، یەغدانەکەیان هێناوە و لەوێدا شاردوویانەتەوە، ئاوایان لێ کردووم کە خۆت دیوتە. ئیدی خودا تۆی کردە هۆکاری ڕزگاری من و ئەو چاکەیەت لەگەڵ کردم. ئەوە بوو بەسەرهاتی من.'

"کاتێک غانمی کوڕی ئەیووب ئەو قسانەی بیست و زانی کە قووەتولقولووب کەنیزی خەلیفەیە، لە ترسی خەلیفە چووە جێگاکەیەوە و لە سووچێکدا درێژ بوو. هەر خۆی سەرکۆنە دەکرد و بیری لە کاری خۆی دەکردەوە. لە تاوی خۆشەویستی ئەو گوڵڕوخسارەش هەر دەگریا. هەتا قووەتولقولووب هەستا و غانمی لە باوەش گرت و ماچی کرد. بەڵام غانم هەر لێی دەکشاوە و ئەوی لە خۆی دوور دەخستەوە. هەردووکیان شەیدای خۆشەویستی یەک و لە دەریای ئەوینی یەکتردا لە خنکاندا بوون. کە ڕۆژ بووەوە، غانم هەستا جلەکانی لە بەر کرد و هەر بەپێی ڕۆژان چوو بۆ بازاڕ و شتی خواردنی کڕی و هاتەوە ماڵەوە. سەیری کرد کچە دەگری. کە غانمی دیت، ژیر بووەوە، بزەی هاتێ و پێی گوت: 'ئەو ماوەیەی چوویتە دەرێ، بۆ من بە ساڵێک بوو. چۆن دەتوانم لە تۆ دوور بم! قسەکانی پێشوو بخە لاوە، وەرە با جووت بین و چی دەکەی بیکە.' غانم گوتی: 'پەنا بۆ خودا، شتی وا نابێ، چۆن سەگان شایانی جێی شێرانن. شتێک کە هی خەلیفە بێ، بۆ من حەرامە.' ئیدی غانم خۆی لەو دەپاراست و لە سووچێکدا دادەنیشت.

"ئەوەندەی ئەو دووری دەکرد، ئەڤینی قووەتولقولووب زیاتری کڵپە دەسەند. ئاخری هەستا چوو لە پەنا غانم دانیشت و دەستی کرد بە دەستبازی و پیاڵەپیاڵە مەی دەدایە هەتا کاتی خەو. غانم هەستا و دوو جێخەوی ڕاخست. قووەتولقولووب گوتی: 'ئەو جێخەوە بۆ کێیە؟' غانم گوتی: 'یەکیان بۆ تۆیە و یەکیان بۆ منە. لەمەو بەدوا ئاوا دەخەوین. ماڵی پاشایان بۆ مسکێنان حەرامە.' قووەتولقولووب گوتی: 'ئەو قسانە وەلا نێ، چونکە لەگەڵ چارەنووس چ ناکرێ.' غانم تکای ئەوی قەبووڵ نەکرد و بە جودا خەوت. قووەتولقولووب ئارەزوو و تینی زیاتر بوو. سێ مانگ بەو جۆرە تێپەڕی. ئەوەندەی قووەتولقولووب لێی نیزیک دەبووەوە، غانم هەر دوور دەکەوتەوە و دەیگوت: 'ماڵی پاشایان بۆ مسکێنان حەرامە.' کوڵ و کەسەری ئەوینی گوڵڕووخسار هەر دەهات و زیادی دەکرد و ئەو شێعرانەی گوت:

نە ڕێی ڕاکردنم هەیە، نە دەتوانم ئاوێتەت بم
نە دەکرێ جوێ بمەوە لێت، نە ڕێ دەدەی میوانت بم

"قووەتولقولووب و غانم ئەوە وەزعیان بوو. بەلام زبێدە خانم کە ئەو بەلایەی بەسەر قووەتولقولووبدا هێنابوو، لە کارەکەی خۆی پەشیمان ببووەوە و نەیدەزانی ئەگەر بێتو خەلیفە بێتەوە و هەوالی قووەتولقولووب بپرسێ، چی وەلام بداتەوە. ناچار پیرێژنێکی بانگ کردە لای، خۆی و شتەکەی بۆ گێراوە و پرسی پێ کرد کە چ بکا و چار چییە . پیرێژن گوتی: 'خاتوون، دارتاشێک بانگ کە، پێی بلێ لە دار سیمای مردووەکەت بۆ چێ کا و لە کۆشکدا گۆڕێک هەلکەنە و ئەو پەیکەرە کفن و دفن بکەن و لە گۆڕەکەی خەن. مۆم و چلوورە هەلکەن. ئەوەی لە کۆشک دایە بلێ جلی ڕەش لە بەر کا. بە کەنیزەکان بلێ چۆکی خەم لە ئامێز گرن. کە خەلیفە هاتەوە و گوتی: 'ئەوە چ بووە؟' بلێن: 'قووەتولقولووب تەمەنی درێژی بۆ تۆ بەجێ هێشت و خانمیش لێرە لە کۆشکدا ناشتی.' کە خەلیفە ئەو قسانە ببیستێ دەست دەکا بە گریان و خەم دایدەگرێ، قورئانخوێنان بانگ دەکا قورئانی لەسەر بخوێنن. بەلام ئەگەر دڕدۆنگ بوو لەوەی کە ڕەنگە ئامۆزا زبێدە ئێرەیی پێ بردووە و لەنێوی بردووە. فەرمان دەدا گۆڕەکە هەلدەنەوە. خاتوون، ئەتۆ لەوە مەترسە گۆڕەکە هەلدەنەوە. چونکە ئەگەر گۆڕەکە بدەنەوە و ئەو سیمایە لەنێو ئەو کفنە ئاوریشمییەدا ببینێ، ئارام دەبێتەوە. ئەگەر بیشیەوێ کفنەکەی لەسەر هەلداتەوە، ئەتۆ لەگەل یەک ـــ دوو کەسی دیکە دەنگی دەن و بلێن: 'حەرامە عەورەتی مردوو وەدەر کەوێ.' کە گوێی لەوانە بێ، بە قسەتان دەکا و باوەڕ دەکا کە ئەو مردووە. ئیدی سەری دادەپۆشێتەوە و دوعای خێر بۆ تۆش دەکا و ڕزگارت دەبێ.'

"زبێدە خانم پێشنیارەکەی پیرێژنی زۆر بە لاوە پەسەند بوو و خەلاتێکی باشی دا بە پیرێژنە و پێی گوت کە دلنیا بێ ئەو کارە دەکا. پیرێژن چوو دارتاشی هێنا و سیمای قووەتولقولووبی لە دار تاشی. پاشان بردییە لای زبێد خانم. زبێد خانم جوان کفنی لە بەر کرد و ناشتیان. مۆم و چلوورەیەکی زۆریان لەسەر گلکۆکەی و دەوروبەری هەلکرد. فەرشێکی زۆریان لە دەوروبەری گلکۆکەی ڕاخست. زبێد خانم ڕەشی پۆشی و فەرمانی بە کەنیزەکان دا ڕەش بپۆشن. لە کۆشکدا دەنگی داوە کە قووەتولقولووب مردووە. ماوەیکی زۆری پێ چوو کە خەلیفە لە سەفەر هاتەوە، هۆشی هەر لە لای قووەتولقولووب بوو، لە تاوی ئەو کەس نازانێ سەفەرەکەشی چۆن کرد. کە هاتەوە نێو کۆشک، کەنیز و کۆیلەکانی دی هەموو ڕەشپۆش بوون. پرسی : 'ئەوە چ بووە؟' پێیان گوت. هاوارێکی کرد و لە خۆ چوو. کە وە خۆ هاتەوە، پرسیاری شوێنی گۆڕەکەی قووەتولقولووبی کرد. زبێدە خانم گوتی: 'لای من زۆر خۆشەویست بوو، هەر لە کۆشکدا ناشتم.' خەلیفە هەر بە جلوبەرگی سەفەرەوە چوو بۆ زیارەتی گۆڕەکەی. سەیری کرد ئەوە دەوری گۆڕەکەیان پڕ فەرش کردووە و مۆم و چلوورەیان بۆ هەلکردووە. کە ئەوانەی دیت، سپاسی زبێدەی کرد و دەستخۆشی لێ کرد. بەلام سەریشی لەو کارە ماسی بوو. جارێک باوەڕی دەکرد و

جارێک درِدۆنگ دەبوو. چونکە زۆر زۆری خۆش دەویست، فەرمانی دا گۆڕەکەی بدەنەوە. کە گۆڕەکەیان داوە و دەموچاوی لێ وە دیار کەوت، ویستی کفنەکەی لەسەر لا دا، لە خودا ترسا و گوتی: 'دایپۆشنەوە' و قورئانخوێنی بانگ کردە سەر گۆڕەکەی و بۆخۆشی لە لایەکی قەبرەکەی دانیشت و زۆر گریا تا دڵی لە خۆ چوو. هەتا مانگێک لە لای ئەو گڵکۆیەی لا نەدەچوو هەر لە لای بوو. بەردەوام دەگریا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، خەلیفە هەتا مانگێک هەر لە قەراخ قەبرەکەیدا دانیشت و گریا. دوایە هەســـتا چووەوە دیوان، وەزیران و ئەمیران هاتنە حزووری. پاش ماوەیەک هەموو یانی بەڕێ کرد و بۆخۆی گەڕاوە حەرەمســەرا و کەنیزێکی لە لای ســەری و یەکی لە لای لاقی دانا و خەوت. دوای ماوەیەک بە خەبەر هات، گوێی لێ بوو کەنیزەکەی کە لە لای ســـەری بوو، بە کەنیزەکەی دیکەی دەگوت: 'ڕاوەســـــتە خەیزەران، بزانە چییان لێ دێ.' خەیزەران وەلامی داوە: 'قەزیب بۆ وا دەڵێی؟ خۆ گەورەمان ئاگای لەوانە نییە. دەنا بۆ لەســــەر ئەو گۆرە ئەو هەمووە دادەنیشــێ و دەگری. لە کاتێکدا لەو گۆڕەدا جگە لە دارێکی تاشــراو کە بە شێوەی ئەو تاشراوە، چی دیکەی تێدا نییە.'

"قەزیب گوتی: 'ڕاســتی بڵێ، خەیزەران. قووەتولقولووب چی لێ هات و چییان لێ کرد؟' خەیزەران گوتی: ' بە فەرمانی زبێدە خانم، کەنیزێک بەنگی دایە و بێهۆشی کرد. کە بێهۆش بوو، لە یەغدانێکی خســت و بە ســەواب و کافووری گوت بیبەن لە قەبرســتان لە قوڵکەی خەن و خۆڵی بەســەردا کەن.' قەزیب لە خەیزەرانی پرســی: 'ئەرێ قووەتولقولووب ئێســتا ماوە یان مردووە؟' خەیزەران گوتی: 'خودا نەکا. من لە خانمم بیستووە کە قووەتولقولووب لە لای غانمی کوڕی ئەیووبی بازرگانە دمشــقییەکەیە.' کەنیزەکان خەریک بوون قســەیان دەکرد و خەلیفەش گوێی دابوونێ. کاتێک کەنیزەکان قســـەکانیان تەواو کرد و خەلیفە بابەتەکەی بۆ ڕوون بووەوە. زانی کە گۆڕەکەیان هەر بە دەهۆ دروســــت کردووە، زۆر تووڕە بوو. هەســتا خێرا چووە دیوان دانیشــت و دەســتوپێوەند و میری دەوڵەتی هەموو بانگ کردن. ڕووی لە جەعفەری بەرمەکی کرد و گوتی: 'چەند کەسێک لەگەڵ خۆت بەرە و بچۆ بۆ مــاڵی غــانمی بــازرگــان و قووەتولقولووب بێنەوە.' جەعفەری بەرمەکی حزمەتکارەکانی بانگ کرد و دارۆغە و پیاوەکانی لەگەڵ خۆی بردن و چوون بۆ ماڵی غانمی بازرگان. غانم لەو کاتەدا کاوڕێکی ســوورەوەکراوی لە بازاڕ هێنابووەوە و خەریک بوون دەیانخوارد. قووەتولقولووب خەریک بوو پارووی لە زاری غانم دەنا کە وەزیر و دارۆغە و پیــاوەکــانی دەوری مــاڵەکەیــان دا. قووەتولقولووب زانی کە خەلیفە بە هەموو شــــتێکی زانیوە. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و وە دڵەتەپە کەوت. مەرگی هاتە بەرچاو، بە غانمی گوت: 'تۆ خۆت قوتــار کە.' غــانم گوتی: 'بەو جۆرەی کە دەوری مــاڵەکەیــان داوە، چۆن دەتوانم هەڵێم و بۆ کوێ بچم لە کاتێکدا دارونەداری من لەو خانووە دایە؟' قووەتولقولووب گوتی: 'ئەگەر نەڕۆی، ماڵیش و گیانیشــت لە مەترســیدان و تێدا دەچن. ئێســتا تۆ هەســتە جلوبەرگێکی کۆن بکە بەرت و قابلەمە گۆشـــت لەســــەر ســــەرت دانێ و ورکەنانی نێو سفرەکە بکە کۆشتەوە و بەو فێڵە دەرباز بە و کارت بە من نەدابێ.'

"ئیدی بەو جۆرە غانم قابلەمە گۆشتی لەسەر سەر دانا و خوداش یارمەتی دا و ڕزگاری بوو. کە پیاوەکان چوونە حەوشەوە، جەعفەر لە ئەسپەکە دابەزی و وە ژوور کەوت. قووەتولقولووب زێڕ و پارە و ملوانکە ڕازاوەکانی لە یەغدانێکدا قایم کردبوون. کە جەعفەری دیت، هەستا و کڕنۆشی برد و گوتی: 'ئەی وەزیری بێهاوتا، خودا چۆنی دەیویست، وا بوو.' جەعفەر پێی گوت: 'گەورەم، خەلیفە فەرمانی گرتنی غانمی داوە.' قووەتولقولووب گوتی: 'ئەو باری کرد و ڕۆیشتەوە بۆ دیمشق، ئەتۆ ئەو یەغدانە بۆ من هەڵگرە و بیبەوە بۆ کۆشکی خەلیفە.' جەعفەر بەرمەکی یەغدانەکەی دا بە خزمەتکارەکان و ماڵی غانمیان تاڵان کرد و قووەتولقولووبیان سوار کرد و بردیانەوە بۆ کۆشکی خەلیفە.

"جەعفەر بەسەرهاتەکەی بۆ خەلیفە گێڕاوە. خەلیفە فەرمانی دا قووەتولقولووبیان لە دیوێکی تاریک کرد و پیرێژنێکیان بۆ تەرخان کرد کە خزمەتی بکا. خەلیفە پێی وا بوو کە غانم لەگەڵی جووت بووە. ئیدی نامەیەکی بۆ سولتان محەممەدی کوڕی سلێمانی زەینی بەڕێوەبەر و دەسەڵاتداری بەسرە نووسی. تێیدا فەرمانی پێ کردبوو هەر کە ئەو نامەیەت خوێندەوە، خێرا غانمی کوڕی ئەیووب قۆڵبەست دەکەی و دەینێری بۆ ئێرە. کە نامەی خەلیفە گەیشتە دەست سولتان محەممەد، نامەی ماچ کرد و لەسەر سەری دانا. ئینجا جاڕی دا کە هەرکەس ماڵی دەوێ، بچێ ماڵی غانمی کوڕی ئەیووب تاڵان بکا. خەڵک دەستەدەستە ڕژانە ماڵی غانم، دیتیان ئەوە دایک و خوشکی لە ژوورێدا گڵکۆیەکیان دروست کردووە و لەسەری دەگرین. ئەوانیان گرت و ماڵەکەشیان تاڵان کردن، کەسیش نەیدەزانی بۆ. کاتێک دایک و خوشکی غانمیان برد بۆ لای سولتان، هەواڵی غانمی لێ پرسین. گوتیان: 'ساڵێکە هیچ هەواڵێکمان لێ نییە.' ئیدی ئەوانیان ناردەوە ماڵی خۆیان. لەو کێشەیە ڕزگاریان بوو. بەڵام غانم کە ماڵەکەیان تاڵان کرد، لێقەوماو و سەرگەردان لە شار وەدەر کەوت و ڕۆیشت هەتا بوو بە شەو و هەوا تاریک داهات، گەیشتە شارێک چوو لە مزگەوتێکدا لەسەر حەسیرێک دانیشت و مات و پەشێو پاڵی بە دیوارەکەوە دا. هەتا بەیانی هەر لەوێ دانیشت و لە برسان خەریک بوو بمرێ.

"شەوەکی[1] کە خەڵکی شار هاتن بۆ نوێژی بەیانی، غانمیان دیت لەوێ کەوتووە و لە برسان هێزی لە بەردا نەماوە. بەڵام شوێنەواری گەورەی و بەختەوەری لە سیمایدا دیارە. لێی چوونە پێشێ و پێیان گوت: 'گەنجۆ، لەکوێوە دێی و بۆ ئاوا پەشێو و ئاڵۆزی؟' غانم سەری هەڵێنا. چاوێکی لێ کردن و دەستی کردە گریان. ئیدی هیچ وەڵامی نەدانەوە. یەکێک لەو خەڵکە زانی کە لە برسان برستی لێ بڕاوە. چووە دەرێ و دوو نان و کەمێکی هەنگوێن بۆ هێنا. غانم نان و هەنگوینەکەی خوارد و خەڵکیش لەدەوری دانیشتبوون. هەتا تاو هەڵات. دوایە هەر کەسەی هەستا چوو بە لای کاری خۆیەوە. غانم هەتا مانگێک هەر لە

---

١. بەیانی زوو، مابەینی شەووڕۆژ، کازیوەی بەیانی.

مزگەوتی ئەو شارەدا ماوە. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ کز و لەڕتر دەبوو.

"خەڵکی ئەو شارە زۆری لەگەڵ چاک و دڵسۆز بوون، وا بوو ڕۆژێک بە باشیان زانی ببەن بۆ نەخۆشخانەی بەغدا. خەڵک لە لای غانم کۆ ببوونەوە و ڕاوێژیان دەکرد، سەیریان کرد دوو ژن هاتن بۆ ســـواڵ. ئەو دوو ژنە هەر دایک و خوشـــکی غانم بوون. غانم کە ئەوانی دیت، لەتە نانێکی پێ بوو لەژێر باڵنجەکەی دەریهێنا و داینێ و، ئەوانیش ئەو شەوە لە لای مانەوە. بەڵام هیچ کام یەکتریان نەناسییەوە. کە ڕۆژ بووەوە، خەڵک وشترەوانێکیان هێنا و غانمیان لەســـەر وشـــترەکە دابەســـت. بە وشـــترەوانەکەیان گوت: 'ئەوەی بگەیەنە نەخۆشـــخانەی بەغدا بەشـــکوو چاک بێتەوە.' کە خەڵکەکە کۆ ببوونەوە، دایک و خوشـــکی غانمیش هاتبوونە سەیری غانم کە لەســەر وشترەکە دایاندەبەست. لەوێ ڕاوەستابوون و دەگریان. دەیانگوت کە ئەو کوڕە زۆر وەک غانم دەچێ. غانمیش لەســـەر وشـــترەکە بوو. ئیدی وشـترەوان وشـترەکانی لێ خوڕی و وەڕێ کەوتن. دوای ئەوە دایک و خوشـکیشـی چوون بۆ بەغدا. وشـــترەوان، غانمی لە بەردەرگای نەخۆشـــخانە دانا و بەجێی هێشـــت و بوخۆی گەڕاوە. غانم ئەو شـەوە لە دەرگای نەخۆشـخانە کەوتبوو. کە ڕۆژ بووەوە، خەڵک لێی کۆ بوونەوە و خەمیان بوو کە ئاوا بە کەســـــاســـــی لەوێ کەوتبوو. لەو جەنگەیەدا «گەورەی بازاڕ» کە شێخیان پێ دەگوت پەیدا بوو، خەڵکەکەی لێ دوور خستەوە و گوتی: 'دەبێ من لە ڕێگای ئەو هەژارەوە بەهەشت بۆ خۆم بکڕم. ئەگەر ئەوە بەرنە نەخۆشـخانە، بە ڕۆژێک دەیکوژن. هەر بۆیە بە خزمەتکارەکانی گوت هەڵی گرن. غانمیان لە کۆڵ کرد و بردیانەوەماڵی شـێخ. شـێخ دیوێکی تایبەتی بۆ تەرخان کرد و مافووری باش و جێخەوی چاکی بۆ ڕاخست. بە خێزانی گوت: 'ئاگات لێی بێ و چاوت بەسەرییەوە بێ.' خێزانی شێخ هەستا ئاوی بۆ گەرم کرد و دەست و قاچ و گیانی بۆ شوشت و جلوبەرگی نوێی لە بەر کرد. پەرداخێک مەی دایە و گوڵاوی پێدا هەڵپرژاند. غانم تۆزێک وە هۆش هاتەوە و یادی قووەتولقولووبی کرد و گریا.

"بەڵام قووەتولقولووب کە خەلیفە لێی بە ڕقدا چووبوو."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی چل و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، کە خەلیفە رقی لە قووەتولقولووب هەڵگرت و لەو دیوە تاریکەی کرد، هەشتا رۆژ لەو دیوە ماوە. بە رێکەوت رۆژێک خەلیفە لەوێوە رادەبرد، گوێی لێ بوو قووەتولقولووب شیعری دەخوێندەوە. کە شیعرەکە تەواو بوو، گوتی: 'ئەی خۆشەویستی من و یاری وەفاداری من، چەند ئاکار جوان و پاکرەوشت بووی! چاکەت لەگەڵ کەسێک کرد کە خراپەی لەگەڵ کردی. پارێزگاریت لە ناموسی کەسێک کرد کە ئەو ئابرووی تۆی برد. ئاگاداریت لە کەسی کەسێک کرد کە کەسەکانی تۆی بە دیل گرت. رۆژێک خودا خۆی پاداشــتت دەداتەوە و جگە لە مەلائیکە شــایەدی دیکەی لێ نابێ. خودا خۆی لەنێوان تۆ و خەلیفەدا حەق بە حەقدار دەگەیێنێ و تۆڵەی تۆی لێ دەکاتەوە.'

"کاتێک خەلیفە قســـەکانی قووەتولقولووبی بیســـت، گەڕاوە کۆشـــک و فەرمانی دا قووەتولقولووبیــان هێنــا. قووەتولقولووب ســـەری داخســـتبوو، دەگریــا. خەلیفە گوتی: 'قووەتولقولووب، وا دیارە شکایەتت لە من هەیە و ئەمنت پێ ستەمکارە، پێت وایە خراپەم لەگەڵ کەسێک کردووە کە چاکەی لەگەڵ کردووم؟ کێیە وا ئاگای لە ناموسی من بووە و ئەمن ئــابرووم بردووە؟ کێیە ئەو کەســـەی ئــاگــای لە دەوروبەریــانی من بووە و من دەوروبەریانی ئەوم بە دیل گرتووە؟'

"قووەتولقولووب گوتی: 'ئەو غانمی کوڕی ئەیووبە. کە ســـوێند بە نیعمەتەکانی خەلیفە! ئەو چاوی خەیانەتی لە من نەکرد.' خەلیفە گوتی: 'قووەتولقولووب هەر داوایەکم لێ بکەی، بۆت وەدی دێنم. داوا بکە.' قووەتوولقولووب گوتی: 'جگە لە غانمی کوڕی ئەیووب، هیچی دیکەم ناوێ.' خەلیفە کە ئەوەی بیســـت، گوتی: 'ئیشـــەڵڵا دەیبینینەوە و رێزی لێ دەگرم.' قووەتولقولووب گوتی: 'ئەی خەلیفە، کــاتێــک دێتەوە، منی پێ ببەخشـــە.' خەلیفە گوتی: 'ئەتۆی دەدەمێ، هەرچەند کەس دەســـتی گەورەکان رەد ناکاتەوە.' قووەتولقولووب گوتی: 'رێم بدە بکەومە سۆراغی، هاتوو خودا بەوم شاد کاتەوە.'

"خەلیفە رێی پێ دا. قووەتولقولووب دڵی گەشاوە. گورج هەستا هەزار دیناری هەڵگرت و چوو بۆ لای شــێخ و مەشــایخان و زێری دا بە هەژار و نەداران. رۆژی دوای کەمێکی زێڕ و پارەی نارد بیدەن بە غەریبان. حەوتوویەکی دیکەش هەزار دیناری برد و چوو بۆ بازاڕی گوهەرفرۆشـــان. گەورەی بازاڕ(شــێخ)ی بانگ کرد و زێڕەکانی داێ و پێی گوت: 'ئەوەی بەســـەر غەریباندا بڵاو کەوە.' شــێخ پێی گوت: 'ئەگەر دەتوانی، وەرە لە ماڵی ئێمە دیمانەی غەریبێک بکە. دیمانەی غەریبێکی وەک مانگ جوان کە پێم وایە زۆر قەرزدارە و ماڵەکەیان لێ تاڵان کردووە و خۆشـــەویســـتەکەشـــیان لێ دوور خســـتووەتەوە.' کە

قووەتولقولووب ئەوەی بیســـت، ڕەنگی تێک چوو، وە دڵەکوتە کەوت. بە شـــێخی گوت: 'کەســـێکم لەگەڵ بنێرە باماڵەکەتم پیشـــان دا.' گەوەری بازاڕ منداڵێکی لەگەڵ نارد. کە قووەتولقولووب گەیشـتە ماڵی شـێخ و چووە ژووریّ، سـڵاوی لە ژنی شـێخ کرد. خێزانی شێخ ئەوی ناسـی و لە بەری هەسـتا و کڕنۆشـی برد. قووەتولقولووب پێی گوت: 'کوا ئەو نەخۆشەی لە ماڵی ئێوەیە؟' خێزانی شێخ گوتی: 'ئەوەتا خانمەکەم، ئاماژەی بۆ جێوبانەکەی کرد.' قووەتولقولووب چووە پێشێ و جوان تێی ڕوانی، سەیری کرد شێوەی غانمی کوڕی ئەیووب دەدا، بەڵام گۆنای زەرد و جەسـتەی زۆر لاوازترە. سـەری سـووڕ ما، تێدا مابوو غانمە یان نا. بەڵام قووەتولقولووب ڕەحمی بۆی بزووت و دەسـتی کرد بە گریان و گوتی: 'غەریبان ئەگەر لە شـاری خۆیان میریش بن، لە غەریبایەتی کەسـاسـن. خەڵک بە چاوی سـووکیان چاو لێ دەکا.' ئیدی ناردی شـەراب و دەرمانیان بۆ هێنا و ماوەیەک لەپێشـت سەری دانیشت. دوای ئەوە سوار بوو و گەڕاوە کۆشک. لەو ڕۆژەوە هەموو ڕۆژێ دەهاتە دەرێ بۆ غانم دەگەڕا.

بە ڕێکەوت دایک و خوشـکی کە هاتنە بەغدا، هاتنە لای گەورەی بازاڕ. شـێخ ئەوانیشـی هێنا لای قووەتولقولووب و پێی گوت: 'خانم، ئەوڕۆ ژن و کچێک هاتوون کە لە ڕواڵەتیاندا گەورەیی و شـکۆ دیارە. جلوبەرگی پەشـمینیان لە بەردایە. هەریەکەی توورەکەیەکی سـواڵیان بە ملیاندا کردووە و بەردەوام دەگرین. ئەوە ئەمن هێناومن بۆ لای تۆ هەتا لە سـواڵکردنن ڕزگاریان بکەی. هیوادارم بەو بۆنەوە خودا بەهەشـتت بە قسـمەت بکا.' قووەتولقولووب گوتی: 'شـێخ، بە خودا من بە ئاواتیان دەخوازم. خێراکە بیانهێنە.' شـێخی بازاڕ ئەوانیشـی هێنا لای قووەتولقولووب. قووەتولقولووب کە دیتی ئاوا جوان و لەبەردڵان و ماقووڵن، لە تاوانیان دەسـتی کرد بە گریان و گوتی: 'ئەوانە دیارە لە ماڵی خانەداندا گەورە بوون و گەورەیی لە سیمایاندا دیارە.' شێخ گوتی: 'خانم، دڵنەوای و دڵخۆشیدانەوەی هەژاران و لێقەوماوان پاداشـتی گەورە و چێژێکی جوانی هەیە. بە تایبەت هی ئەو دوو غەریبە کە ماڵەکەیان تاڵان کردوون و خانووەکەشیان وێران کردوون.'

"دایک و خوشـکی غانم کە گوێیان لە قسـەکانی شـێخ بوو، دڵیان پڕ بوو، غانمیشـیان وەبیر هاتەوە، دەسـتیان کرد بە شـین و ڕۆیەک سـەیر. قووەتولقولووبیش لەگەڵ ئەوان دەسـتی کرد بە گریان. دوای ئەوە ژنەکە بە قووەتولقولووبی گوتی: 'ڕۆڵەگیان، دۆعام بۆ بکە خودا بە دیداری غـانمی کوڕی ئەیووبم شـادم بکـاتەوە.' کە قووەتولقولووبی ئەو قسەیەی بیست و زانی ئەوە دایکی غانمە و ئەوەش خوشکێتی، ئەوەندەی دیش گریانەکەی توند کرد. هێند گریا هەتا بێهۆش بوو. کە هاتەوە سەر خۆ، ڕووی تێ کردن و گوتی: 'خەم مەخۆن کە ئەوڕۆ سەرەتای بەختەوەری و کۆتایی خەم و پەژارەتانە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قووەتولقولووب گوتی: 'لەمەوبەدوا ماتەمبار مەبن.' ئینجا بە شێخی گوت: 'ئەوانە بەرەوە ماڵی خۆت و بە خێزانت بڵێ بیانباتە گەرماو و جلوبەرگی شیاویان لە بەر بکا.' مستێک زێڕیشی دا بە شێخ. ڕۆژی دوایی قووەتولقولووب سوار بوو، چوو بۆ ماڵی شێخ و سلاوی لە خێزانی شێخ کرد. خێزانی شێخیش لەبەری هەستا و دەستی ماچ کرد. قووەتولقولووب سەیری کرد خێزانی شێخ ئەوانی بردووەتە گەرماو و جلی جوانی لە بەر کردوون. لەگەڵیان دانیشت و ماوەیەک قسەیان کرد. ئەو جار هەواڵی نەخۆشەکەی لە خێزانی شێخ پرسی. خێزانی شێخ گوتی: 'جارێ هەر وەک سەرەتا وایە. چی وای فەرق نەکردووە.' قووەتولقولووب گوتی: 'هەستن با بچین سەرێکی بدەین.' دایک و خوشکی غانم و خێزانی شێخ لەگەڵ قووەتولقولووب هەستان و چوونە لای غانم و لەبن سەری دانیشتن. غانم گوێی لێ بوو ناوی قووەتولقولووبیان هێنا. بە لەشی لاواز و سستییەوە سەری هەڵێنا و گوتی: 'قووەتولووب.' ئیدی قووەتولقولووب ئاوڕی لێ داوە و ئەوی ناسییەوە، یەک بە خۆی هاواری کرد: 'گیان خۆشەویستەکەم!' غانم گوتی: 'وەرە پێشێ.' قووەتولقولووب گوتی: 'نەکا تۆ غانمی کوڕی ئەیووب بی؟' گوتی: 'ئەرێ، ئەرێ، غانمی کوڕی ئەیووبم.' قووەتولقولووب هەر کە ئەوەی بیست، بە لادا هات و بێهۆش بوو. دایک و خوشکی غانمیش کە ئەوەیان بیست، قیژاندیان و بێهۆش بوون. کە وە هۆش هاتنەوە. قووەتولقولووب گوتی: 'سپاس بۆ خودا کە لەو پرش و بلاوییە ڕزگاری کردین.' ئیدی کەمێکی دیکە لە غانم چووە پێشێ و قسەکانی خۆی و خەلیفەی بۆ گێڕاوە و گوتی: 'چاکەکانی تۆم بۆ خەلیفە گێڕاوە و ئەویش باوەڕی پێ کردم و زۆر خۆشی لە تۆ هات و زۆر تامەزرۆی دیداری تۆیە و منیشی پێشکەشی تۆ کرد.' غانم لەو موژدە خۆشە خۆشحاڵ بوو. قووەتولقولووب گوتی: 'هیچ کامتان لە جێی خۆتان مەبزوون هەتا دێمەوە. دایک و خوشک و براش پێک شاد بوونەوە و دەستیان کرد بە دەردی دڵ. قووەتولقولووبیش دەستبەجێ هەستا چوو بۆ کۆشک لەو یەغدانەی لە ماڵی غانم بە جەعفەری بەرمەکی سپاردبوو، مستێکی زێڕ هێنا و دای بە شێخ و گوتی: 'بەو زێڕانە بۆ هەرکامیان یەکی دەستێک جلوبەرگی ئاوریشم و دیبا بکڕە و بۆیان بێنە.'

"ئەو جار قووەتولقولووب دایک و خوشکی غانمی بردە گەرماو، شەربەت و مەی ئامادە کرد. کە لە گەرماو هاتنە دەرێ، جلوبەرگیان لە بەر کرد و خواردنیان خوارد. سێ ڕۆژ قووەتولقولووب لەوێ ماوە و خواردنی چاک و وزەبەخش و بادەی دانێ هەتا تۆزێک بووژانەوە و هاتنەوە سەر خۆ. دیسان ناردنیەوە بۆ گەرماو. کە هاتنە دەرێ، دیسان جلوبەرگی لە جاری پێشوو چاکتر و جوانتری لە بەر کردن و بۆخۆشی گەڕاوە بۆ لای

خەلیفە و کڕنۆشی برد. خەلیفەی لە دۆزینەوەی غانم و دایکی و خوشکی ئاگادار کردەوە. خەلیفە جەعفەری بەرمەکی ڕاسپارد لەگەڵ پیاوەکانی بچن غانم بێننە کۆشک. قووەتولقولووب لەپێش جەعفەردا خۆی گەیاندە غانم و پێی گوت: 'ئەوە خەلیفە ناردوویە بەدواتدا، لەوێ دەست و دەمت تێکەڵ نەیە و من زۆرم تاریفی تۆ کردووە. بە بوێرییەوە قسە بکە. خۆت پیشان بدە کە کەسێکی زۆر گەورەی.' ئەو جار جلوبەرگێکی شکۆداری لە بەر کرد. کەمێکی زێڕ دایە و گوتی: 'ئەوەی بدە بە پیاوە خرمەتکارەکانی دەربار.' لەو قسانەدا بوون کە جەعفەری بەرمەکی هات. غانم هەستا و کڕنۆشی بۆ برد. جەعفەر غانم و ئەوانی لەگەڵ خۆی هەڵگرتن و ڕۆیشتن تا گەیشتنە کۆشکی خەلیفە. خەلیفە گوتی: 'با بێتە ژوورێ.' غانم چووە ژوورێ و سێ جار کڕنۆشی برد و بە زمانێکی پاراو و ڕەوان لەگەڵ خەلیفە دوا و باسی گیروفتەکانی خۆی کرد و سپاسی خەلیفەی کرد و ئەو شیعرانەی خوێندنەوە:

تۆ لە خۆر دڵاوا و دلۆڤانتری، پاشا
لاڵ بێ، ئەوەی نەڵێ تۆ لە بانتری، پاشا
گەورەیی جیهان هەر لە خۆت دەوەشێتەوە
بۆ ئەوە لە گشت کەسێ شایانتری، پاشا

"خەلیفە سەری لە زمانی پاراو و ڕەوانی سووڕ مابوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، خەلیفە کە زمانزانی غانمی کوڕی ئەیووبی دیت، واقی وڕ ما و پێی گوت: 'وەرە پێشتر.' چووە پێشتر. خەلیفە گوتی: 'بۆم بگێڕەوە. بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە بزانم چی بووە.' غانم بەسەرهاتەکەی بەبێ زیاد و کەم بۆ گێڕاوە. خەلیفە زانی کە ئەو ڕاست دەکا. خەلاتی زۆر باشی دایە و پێی گوت: 'غانم حەلاڵم کە و گەردنم ئازاد کە.' غانم گوتی: 'بەندە و دارونەداری هی خاوەنەکەیەتی.' خەلیفە کە ئەو قسەی بیست، بە لایەوە جوان بوو. ئیدی ئەوی کردە هاودەم و ڕاوێژکاری خۆی و کۆشکێکی بۆ تەرخان کرد. باخ و مەزرا و مڵکی دایە. غانم دایک و خوشکی هێنانە کۆشکەکەوە. کاتێک خەلیفە زانی کە فیتنەی خوشکی غانم هەر بە ڕاستی فیتنەی ڕۆژگارە، خوازبێنی کرد بۆ خۆی. غانم گوتی: 'فیتنە کەنیزتە و منیش کۆیلەتم.'

"ئیدی سەدهەزار دیناری زێڕی دایە و قازی و کەیخودایان بانگ کرد فیتنەیان لە خەلیفە مارە کرد. لە ڕۆژێکدا خەلیفە لەگەڵ فیتنە و، غانم لەگەڵ قووەتولقولووبدا چوونە پەردەوە. دوای ئەوە خەلیفە گوتی: 'ئەو چیرۆکە بنووسنەوە با خەڵک بزانن کە ناتوانن لە دەست قەزاوقەدەر هەڵێن. خۆیان و کارەکانیان بە خودا بسپێرن.' "

شەهرزاد دوای ئەوەی ئەو چیرۆکەی تەواو کرد، گوتی: "هەرچەند ئەو چیرۆک زۆر خۆش بوو، بەڵام لە چاو چیرۆکی نوعمانپاشا و منداڵەکانیدا چی وا نییە." ئەویش ئاوایە...

## چیرۆکی نوعمانپاشا و منداڵەکانی؛ شەرکان و زەوئولمەکان

"لە شاری دیمشق پێش خەلافەتی عەبدولپاشای کوڕی مەروان، پاشایەک هەبوو کە نوعمانپاشایان پێ دەگوت. زۆر نەترس و ئازا بوو کە بەسەر پاشای کەسرا و قەیسەرییەکاندا زاڵ بوو. پاشان دنیای داگیر کرد. وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و هیند و سیند و چین و یەمەن و حیجاز و حەبەشە و دوورگەکان و دەریاکانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. مسکێن و سپا بە هۆی دڵاواییەکەیەوە خۆشحاڵ و شادمان بوون.

"پاشا کوڕێکی هەبوو ناوی شەرکان بوو. هێند ئازا و دلێر بوو، بەسەر ناودارانی بەهێز و توانادا زاڵ ببوو. پاشا ئەوی کردە جێگری خۆی. کە شەرکان بوو بە بیست ساڵ. تەواوی مسکێن و سپا گوێبەفەرمانی بوون. پاشا سێسەد و شەست ژنی هەبوو، جگە لە دایکی شەرکان، هیچیان منداڵیان نەببوو. هەر کام لە کەنیز و ژنەکانی پاشا کۆشکی تایبەت بە خۆیان هەبوو. پاشاش هەر شەوەی لە کۆشکێک دەنوست. وا بوو کەنیزێکی پاشا

ـووگیان بوو، ئەو هەواڵە بە گوێی پاشـــا گەیشـــتەوە. پاشـــا زۆر دڵخۆش بوو، ڕێکەوتی ـووگیانبوونەکەی نووسی. هەموو ڕۆژێ بە خۆشی و دڵسۆزی و چاکییەوە لەگەڵی دەدوا و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد. کە شەرکان ئەو ڕووداوەی بیستەوە، مات بوو. پێی ناخۆش بوو."

لیرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە شەرکان زانی یەکێک لە کەنیزەکانی باوکی دووگیان بووە، مات و مەلوول بوو و گوتی: 'شەریک بۆ وڵات و دەسەڵاتەکەم پەیدا بوو. ئیدی شەرکان هەمیشە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'ئەگەر بێتو کەنیزەکە کوڕی بێ، دەیکوژم.' بەڵام کەنیزەکە لەو کەنیزە گرانە ڕۆمییانە بوو کە پاشای ڕۆم لەگەڵ دیاری زۆر گرانبایی ناردبووی. ئەو کەنیزە ناوی سەفییە بوو. لە باری ژیری و چاکی و تایبەتمەندی دیکەوە لە هەموو کەنیزەکانی دیکە لە سەرتر بوو. هەر شەوێک کە نۆرەی دەبوو، پاشا لە دیوەکەی ئەو بخەوێ، بەدەوری پاشادا دەهات و دەچوو دەیگوت: 'ئەمن بێت و نەبێت کوڕێکم لە خودا دەوێ هەتا دابونەریتی خزمەتگوزاری و ئەدەب و زانستی فێر کەم.' پاشا بەو قسانە دڵخۆش دەبوو و بە لاشییەوە سەیر بوو. هەتا وا بوو ڕۆژێک دووگیان بوو. نۆ مانگ و نۆ ڕۆژەی تێپەڕ کرد و کاتی زانی هات. لە بەر خودا پاڕاوە منداڵبوونەکەی بە لاوە ئاسان بکا و کوڕیشی بداتێ. خودا داخوازییەکەی قەبووڵ کرد و بە ئاسانی لێ بووەوە.

"مامانەکان تەماشایان کرد، کچێکی ڕووگەشە و وەک ئەستێرە دەدرەوشێ. چاوەڕوانەکانی بە دەرگای دیوەکەیان ئاگادار کردەوە، نوعمانپاشا لەوێ خزمەتکارێکی ڕاسپارد بوو ئەگەر کوڕی بوو، زوو مژدەی بداتێ. شازادە شەرکانیش قەرەواشێکی بە جودا لەوێ دانابوو. کە ئەو دووانە زانییان، خێرا نوعمانپاشا و شازادە شەرکانیان ئاگادار کردەوە. شازادە شەرکان خۆشحاڵ بوو. بەڵام سەفییە بە مامانەکەی گوت: 'کەمێک ڕاوەستن، هەست دەکەم شتێک لە زگمدا دەجووڵێتەوە.' دووبارە ژانی هاتێ و زۆر بە ئاسانی منداڵێکی دیکەشی بوو. کە مامانەکان سەرنجیان دایە، دیتیان کوڕێکی سپیوسۆڵە وەک مانگی چاردە. ئەوانەی لەوێ بوون، هەموو خۆشحاڵ بوون. ژنەکانی دیکەی پاشا مات بوون و ئیرەییان بە سەفییە دەبرد. دوای ئەوە هەواڵەکە بە پاشا گەیشتەوە. پاشا خۆشحاڵ بوو، هەستا و هات بۆ کۆشکی سەفییە و تەوێڵی ماچ کرد و کوڕەکەشی ماچ کرد. کەنیزەکان دەفیان لێ دا و کردیان بە شادی و ئاهەنگ. پاشا ڕای سپارد کوڕەکەیان ناو نا زەوئولمەکان و خوشکەکەشیان ناو نا نوزهەتوززەمان. پاشا بۆ هەر کامیان دایەن و کەنیز و خزمەتکاری تایبەتی بۆ دانان و شیر و شەربەت و پێداویستی خۆیانی بۆ تەرخان کردن. خەڵکیش بیستیانەوە کە خودا دوو منداڵی بە پاشا بەخشیوە. شاریان ڕازاندەوە و دەستیان کرد بە خۆشی و شادی و ئاهەنگگێران. وەزیران و میران و نزیکانی پاشا هاتن بۆ پیرۆز بای کردن. پاشاش خەڵات و دیاری دەدانێ و ڕێزی لە هەموو چین و توێژێک دەگرت. هەتا چوار ساڵان هەموو ڕۆژێک نوعمانپاشا دەچوو سەری سەفییە و منداڵەکانی دەدا و لێی دەپرسین.

"کە پێی نا ساڵی پێنجەمەوە، پاشا فەرمانی دا، زێڕ و ماڵێکی زۆریان لە بەر دەستی سەفییە نا و پێی ڕاگەیاند کە لە بیری پەروەدەکردنیاندا بێ. بەردەوام بۆخۆشی چاوی بەسەریانەوە بوو. لەو کاتەدا لە شازادە شەرکان وایە کە پاشا هەر کچێکی بووە و خەبەری لە بوونی زەوئولمەکان نەبوو. بۆخۆی ئازایانە هەر خەریکی شەڕ و پەرەپێدانی وڵات و شکاندنی سپا و گرتنی قەڵای دژمن بوو.

"ڕۆژێک نوعمانپاشا دانیشتبوو، پیاوەکانی نێو دەربار هاتن کڕنۆشیان برد و گوتیان: 'پاشای ڕۆم، خاوەنی قوستەنتەنییە، پیاوی ناردووە و دەیانەوێ بێنە خزمەتت.' پاشا ڕووخسەتی دان، هاتنە ژوورێ، کڕنۆشیان برد و گوتیان: 'پاشای جیهان، ئێمە ئافریدوونپاشا، خاوەنی یۆنان و پاشای سوپای مەسیحییان ناردوویەتە خزمەتت کە پێت ڕاگەیەنین لەگەڵ سولتانی قیسارییە لێیان بووە بە شەڕ. هۆکاری شەڕەکەش ئەوەیە کە یەکێک لە پاشاکانی عەرەب گەنجێکی دەورانی ئەسکەندەری دۆزیوەتەوە کە ماڵێکی زۆری تێدا بووە، وەک سێ گەوهەری سپی کە لە دنیادا تایان نییە و بە خەتی یۆنانی هێندێک نهێنی زۆر بەکەڵکی تێدا نووسراوە، یەکێک لەوانە ئەوەیە کە ئەگەر بە منداڵێکەوە بێ، ئیدی ئەو منداڵە نەخۆش ناکەوێ و لە تا بە دوور دەبێ.' کە گەنجەکە دەکەنەوە و ئەو گەوهەرە دەبیننەوە، پاشا عەرەبەکە لەگەڵ هێندێک ماڵی دیکە بۆ ئافریدوونپاشای دەکەنە دیاری و بارەکەی لە پاپۆڕێک دەنێت. پاپۆڕێکیش هێزی پارێزگاری لەگەڵ دەنێرێت، پێی وا بوو کەس ناتوانێ بە جۆرێک چاو لەو پاپۆڕانە بکا. بە تایبەت بە دەریایەکدا دەڕۆن کە ملکی ئافریدوونپاشاە و دیارییەکانیش بۆ ئەو دەچن. لە قەراخەکانیش جگە لە مەسکێنەکانی ئافریدوونپاشا، کەسی دیکەی لێ نییە.

" 'وا دەبێت، پاپۆڕەکان هەتا نزیکی شاری ئافریدوونپاشا دێن. چەتە دەریاییەکان لەگەڵ سوپای قیسارییە هێرش دەکەنە سەر پاپۆڕەکان و ئەوەی لە پاپۆڕەکاندا دەبێ بە تالانی دەبەن. جووقەواریش لەو سوپایە دەبڕن کە بۆ پارێزگاری کەشتییەکە هاتبوون و هەموویان دەکوژن. کە ئافریدوونپاشا ئەو کارەساتەی بیستەوە، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو، سوپای ناردە سەر، بەڵام ئەوانیشیان هەموو کوشتن. سوپایەکی زۆرتر و بەهێزتری نارد، بە داخەوە ئەوانیش تێدا چوون و شکستیان خوارد. ئیدی پاشا ڕقی هەستا و سوێندی خوارد هەموو سوپاکەم دەبەم و خۆشم دەچم بۆ شەڕ، هەتا قیسارییە وێران نەکەم ناگەڕێمەوە.

" 'تکا لە پاشای زەمان، نوعمانپاشاش دەکات کە سوپایەک بۆ یارمەتیان بنێری. تا ناوی باشی لەنێو پاشاکاندا دەنگ داتەوە، هێندێکیشی دیاری و خەڵات بۆ ناردووی. ئەگەر ئەوانەمان لێ قەبووڵ بکەی، سپاست دەکەین.' ئینجا ڕاسپێردراوەکان کڕنۆشیان بردەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی چل و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، راســپێردراوەکان دیارییەکانیان هێنا خزمەت نوعمانپاشــا. پەنجا کەنیزی ڕۆمی عەباپۆش و پەنجا غولامی کەوای دیبا لە بەر، پشتوێندی زێڕین لە پشت کە هەریەکەی ئاڵقەیەکی زێڕییان لە گوێدا و هەر ئاڵقەیەی گەوهەرێکی پێوە بوو کە هەزار دیناری زێڕی دێنا. پاشــا دیارییەکانی پەســەند کرد و لەگەڵ وەزیرەکانی راوێژی کرد، بۆ ئەوەی چ وەلامێکیان بداتەوە؟ وەزیرێکی بەســـالاچوویان تێدا بوو کە وەزیر دەندانیان پێ دەگوت. کڕنۆشی برد و گوتی: 'پاشا وا چاکە ئەتۆش بچی بە هانای ئافریدوونپاشاشاوە. سوپایەک برازێنییەوە و شازادە شەرکانیش بکەی بە سپاسالار. منیش لە خزمەت شازادەدا دەچم. ئەو کارە قازانجی زۆرە: یەکەم شــت ئەوەیە ئەگەر بێتو ســوپاکەت بەســەر دژمنی پاشـــای ڕۆمدا زاڵ بێ، لە هەموو جێیەکدا ئەو ســەرکەوتنە بە ناوی تۆوە بڵاو دەبێتەوە و دەبێتە هۆی ئەوەی دژمنان زیاترت لێ بترسن. لە دوورگەکانەوە دیاری و خەلاتێکی زۆرت بۆ بنێرن. قازانجی دووەم ئەوەیە کە چونکە پاشـــــای ڕۆم پەنای بۆ تۆ هێناوە، لە هەموو دنیادا جوامێری و گەوەرییت دەنگ دەداتەوە.' نوعمانپاشــا ئەو قســانەی لا پەســند بوو. خەلاتێکی دایە و گوتی: 'پاشاکان دەبێ راوێژکاری وەک تۆیان هەبێ.'

"ئیدی نوعمانشــەرکانپاشــای کوڕی بانگ کرد. باســی داوای یارمەتی لەلایەن پاشــای ڕۆمەوە و پێشنیارەکەی وەزیر دەندانی بۆ کرد و ناردی، تفاقی شــەڕ تەیار بکا و خۆی بۆ ســەفەر ســاز بکا. دەهەزار پیاوی شــەرکەریش لە سپادا هەڵبژێرێ و دژایەتی لەگەڵ وەزیر دەندان نەکا. شەرکان خێرا بە قسەی بابی کرد و چوو دەهەزار سواری لە سپادا هەڵبژارد و تفاقێکی زۆری بۆ ســپا تەرخان کرد. ســێ ڕۆژی دەرفەت دانێ بچن خۆیان بۆ ســەفەر ســاز بکەن. شــەرکانیش گەڕاوە بۆ کۆشــک و چەکی چاکی هەڵبژارد و ئەســپی کێوئاســای کێشـــا دەرێ. کە ڕۆژی چوارەم هات، شـــازادە لەگەڵ ســـوپاکەیدا لە دەرەوەی شـــار کۆ بووەوە و نوعمانپاشــایش بۆ بەرێکردنی کوڕ و ســوپاکەی هاتە دەرەوەی شــار و حەوت خەزێنەی دا بە شازادە و بە وەزیری گوت: 'شەرکان و سپام بە تۆ سپارد.' پاشان گەڕاوە بۆ ناو شــار. شــەرکان چاوێکی لە سوپاکەی کرد، دەهەزار کەس بێجگە وەدووکەوتووان و ڕەگەڵکەوتووان. ئیدی لە تەپڵی جمین لێ درا و فوو لە کەڕەنا کرا، ئاڵا هەڵدرا. شـــــەرکان لەسەر ئەسپە کێوئاساکەی دانیشتبوو، وەزیریش سوار بوو.

"راسپاردراوەکانی ڕۆم لەپێشەوە ڕۆیشتن. کە شــەو داهات لە شــوێنێک دابەزین و لەوێ مانەوە. کە ڕۆژ بووەوە بە ڕێنوێنی راســپێرداروەکان دیســـان کەوتنەوە ڕێ. بەو شــێوەیە هەتا بیست ڕۆژان ئاوا ڕۆیشتن. ڕۆژی بیستویەکەم شەوەکەی لە نیوە لای دابوو، ڕێیان

کەوتە مێرگوزارێک. شـەرکان فەرمانی دا لێرە بار بخەن و هەتا سـێ ڕۆژان بحەسـێنەوە. سـپا گیرسـاوە و دابەزین، لێرە و لەوێ تاوڵ و خێوەتیان هەڵدا و بەولاولادا بڵاو بوونەوە. وەزیر دەندان لەگەڵ ڕاسـپێدراوەکانی ئافریدوونپاشـا لە نێوەڕاسـتی سـپادا بوون. بەڵام شـازادە شـەرکان لەسـەر ئەسـپەکە نەهاتە خوارێ هەتا هەموو سوپاکە دانەبەزین. چونکە چووبوونە نێو ئاخی ڕۆمەوە و ئەو شـوێنە سـەر بە ڕۆم و وڵاتی دژمن بوو. شـازادە هەر بەدەوری سپادا دەسووڕاوە. نۆبەدار و شتی دیاری دەکرد. تا وای کرد شەو تەواو درەنگ ببوو. شـــەرکان شـــەکەت دەبێ، خەو بەســـەریدا زاڵ دەبێ. هەر لەســـەر زینەکەی خەو دەیباتەوە. ئەسپەکەی ڕووەو دەشتایی دەیبا. نیوەشەو دەگاتە بێشەڵان و دارستانێکی چڕ. شـەرکان هەر وەخەبەر نایە هەتا ئەسـپەکەی دەحیلێنێ و سـمکۆڵان دەکا. ئینجا شـازادە وەخەبەر دێ و سەیر دەکا، ئەوە لەنێو دارستانێکە و مانگ بە ئاسمانەوە دەبریسکێتەوە و نێو دارەکانی ڕووناک کردووە. کە چاوی لە دەوروبەری کرد، واقی وڕ ما و ترسا، نەیدەزانی چ بکا و ڕوو لە کام لا بکا. لە بەر تیشـــکی مانگشـــەوەکە ســـەیری کرد ئەوە چیمەن و مێرگوزارێکی ســـەرســـەوزە و دەنگی پێکەنین و ئاوازێکی خۆش و دڵڕفێن دێ کە کار لە ڕوحی مرۆڤ دەکا و ئاوەزی لە کار دەخا. هەر بۆیە بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت و گەیشتە مێرگەکە، ڕوانی لەو شوێنە باخ و باخاتێکی سەرسەوز و چۆمی بەخوڕ و ئاواز و جریوەی مەلی جواروجۆر دنیای ڕازاندووەتەوە. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

لەو دەشـــــت و دەرە، ڕۆژ ڕۆژی ڕەنـــگە
دار و ســـــەوزە و گـــوڵ، ســـــەرخـــۆشـــــی بەنـــگە
کـــیـــژگەل دەخـــوێـــنـــن، هەمـــوو کەواســـــا
قـــاســـــپە و قـــریشـــــکەی، دوێـــتـــی چەلەنـــگە
خـــۆشـــــی دەبـــارێ، لە هەمـــوو لایـــێ
هەر بـــزەی دێـــتـــێ، جـــێـــژنـــێـــتـــی ژیـــنـــگە

"شـــەرکان چاوێکی بەو ناوەدا گێڕا، ســـەیری کرد دێرێک لەوێیە و لە پەنا دێرەکەدا قەڵایەکی لێیە، سـەر لە ئاسـمان دەسـوێ. چۆمێک بە نێوەڕاسـتی دێرەکەدا دەهات و بەنێو ئەو ســـەوزای و زەونـدەدا بەرە و خوار دەخوشـــی. لە قەراخ چۆمەکە دە کەنیزی تـازەپێگەیشـــتوو وەک توولەنەمام کە خۆیـان لە گوڵ دابوو و هەر کامیـان وەک مـانگی چواردە دەدرەوشانەوە، دانیشتبوون. لە جوانی و دەلالیدا تایان نەبوو. وەک شاعیر دەڵێ:

بەژن بـــاریـــک و تـــوولە نەمـــامـــن
هـــێـــدی و هـــێـــمـــن و نەرم و ئـــارامـــن
تـــا بـــڵـــێـــی جـــوان و لەبەردڵانـــن

## ڕووخۆش و شەرمن، میوەی بەتامن

"ئیدی شەرکان جوان چاوی لە کچەکان کرد، لەنێو ئەواندا کچێکی تێدا بوو ڕووگەش و بسکڕەش. وەک شاعیر دەڵێ:

ئەو لەشچەرمووە هێند ڕێکە هەر دەڵێی ناژە
بە سوێسنە بڕازێتەوە، بەژنی ئەو نازە
ئەو سوێسنە کێوییە هەمووی ئاڵقەئاڵقەیە
ئامێزی ئاڵقەکانی پڕ لە میسکی تازە
جوانی نابینم لە کەسدا لەو ڕۆژەوە کە
دیومە بە جوانی، جوانی ئەو پڕ ڕەمز و ڕازە

"شەرکان گوێی لێ بوو ئەو چاو کەژاڵە بە کەنیزەکانی دیکەی گوت: 'کچینە وەرن تا مانگ ئاوا نەبووە، پێکەوە زۆران دەگرین.' ئەوانیش گوتیان: 'باشە.' ئیدی یەکیەک هاتنە پێش و ئەو ڕووگەشە دانەدانە باوەشی پێدا دەگرتن و دەیخستن و دەستی بە زوننار[1] دەبەستن. کە هەموویانی خست، ئەو جار پیرێژنێک کە ئەویش لەوێ نیزیک بوو، هات و هەر چەندە دەیویست وەسەر خۆی نەهێنی، بە ڕقەوە گوتی: 'قەحبە، ئەوە شاییت بە خۆتە دەرەقەتی ئەوانە دێی؟ ئەمن بەو پیری و کەنەفتییەمەوە، سەد جاریشم خستوون. ئەگەر لە خۆت ڕادەبینی، وەرە با زۆران بگرین و سەرت لەنێو لینگت نێم.' کیژە مانگئاساکە هەر چەند بەو قسەی وردە بزەیەکی هاتێ بەڵام لە هەناودا زۆر زۆری ڕق هەستا بوو، ڕابوو و پێی گوت: 'خانم، تۆو حەزرەتی مەسیح بە گاڵتەتە یان هەر بە ڕاست دەتەوێ زۆرانم لەگەڵ بگری؟' پیرێژنە گوتی: 'نە وەڵا گاڵتەی چی؟! بە ڕاستمە و دەبێ زۆرانم لەگەڵ بگری.' "

لێرەدا ماوە، چیرۆکی ئەوشەویش کۆتای هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی بۆ شەوێکی دیکەی هەڵگرت.

---

١. زوننار: پشتێندێکە تایبەتی مەسیحیانە.

گوتی: "خاوەنشــكۆ، پیرێژن گوتی: 'گاڵتە ناكەم و بە ڕاســتمە.' كیژە گوتی: 'جا ئەگەر ئەوەندە لە خۆت ڕادەبینی هەســتە بزانم چیت پێ دەكرێ.' پیرێژن بە قســەكەی ئەو تووڕە بوو، تووكی جەســتەی وەك ژیشـك قرژ بووەوە. بە گوڵسمیای گوت: 'قەحبە، ئەمن زۆران لەگەڵ تۆ نـاگرم هەتـا خۆم ڕووت نەكەمەوە.' هەســـتـا و لەچكەكەی داكەنـد. كراس و شـتەكەشـی داكەند و لە لەچكەكەی خسـتن و دەتگوت خێو و جنۆكەیە، بە كیژەكەی گوت: 'من چیم كرد، دەبێ تۆش وا بكەی.'

"شـــەركان چاوی لێ دەكردن، بەو لەشولارە دزێوەی پیرێژنە تێر پێكەنی. پاشـــان ئەو كیژە نەونەمامەكە هەسـتا جلەكانی داكەند و لەگەڵ پیرێژن ئاوقای یەک بوون. شـەركان لە بەر خودا پاڕاوە گوڵڕووخسارەكەی بەسەر ئەودا زاڵ بكا. هەتا كیژە دەستی چەپی خستە نێو هەر دوو لینگی پیرێژنەوە و بە دەســـتی ڕاســـت پشـــت ملی گرت و هەڵیهێنا حەوا و ســووڕێكی پێ دا. پیرێژن لە هەوا لینگەفرتەی بوو دەیویست خۆی ڕزگار بكا كە لەپڕدا بە پشتەوەدا كەوت. شەركان شیری هەڵكێشا و چاوی لەولا و لەولای خۆی كرد. سەیری كرد ئەوە شاجوان داوای لێ بووردنی لێ دەكا، جلەكانی لە بەر دەكاتەوە و دەشڵێ: 'خانمەكەم، زاتوددەوایی، ئەمن نەمدەویست تۆ بخەم، بەڵام بۆ خۆت پەلەقاژەت كرد. دیسان باش بوو شوكور هیچت لێ نەهات.' پیرێژن قسەی لەگەڵ نەكرد و وەڵامی نەداوە. هەستاوە، سەری بەرداوە و بە خەجاڵەتی دەســـتی دایە جلەكانی و ڕۆیشــــت. هەتا لە چاو ون بوو. ئەو كەنیزانە هەموو دەستبەستراو و ئەویش لەنێویاندا دەهات و دەچوو. شازادە لە دڵی خۆیدا گوتی: 'هیچ ڕزقێك لە خۆڕا دەســـت ناكەوێ. لە خۆڕا من خەوم لێ نەكەوتووە و ئەســـپە منی نەهێناوەتە ئێرە.' ئەوە بووە هۆی ئەوەی ئەو شـــاجوان و كەنیزانەم بە قســـمەت بێ. ئینجا بە شـــیری ڕووتەوە تاوی دا ئەســـپەكەی، خێرا گەیشـــتە ســـەریان. گوتی: 'ئەڵڵاهو ئەكبەر.' كە ڕوومانگ ئەوی دیت، هەســـتا و خێرا بازی دا ئەو بەری چۆمەكە كە نیزیک شەش باڵ پان بوو، لەوێڕا بە دەنگێكی بەرز گوتی: 'ئەتۆ كێی؟ خۆشـی و سـەیرانەكەت لێ تێک داین. وا بە شـمشـــیرەوە هاتووی دەڵێی هێرش دەكەیتە ســـەر ســـوپایەک. بڵێ بزانم لەكوێوە دێی و بۆ كوێ دەچی؟ ڕاســـتی بڵێ، چونكە ڕاســـتی ڕزگاری لە دووە. خۆ لە درۆكردن بپارێزە كە درۆزنان زیانكارانن. دڵنیام تۆ ڕێت هەڵە كردووە وا هاتوویتە ئێرە. ڕزگـاربوونـت ســـەختە. ئەوەت لەبەر چـاو بێ، هـاتوویتە وڵاتێكەوە ئەگەر هـاوار بكەم، چوارهەزار پیاوی ئازا و دلێرت وەســـەر دەكەوێ. ئێســـتا بڵێ بزانم چیت دەوێ؟ ئەگەر ڕێگات هەڵە كردووە، ڕێت پیشـــان بدەم و ئەگەر ماندووی و شـــوێنی حەســـانەوەت دەوێ بۆت دابین كەم.'

"شەرکان کە قسەکانی ئەوی بیست، گوتی: 'پیاوێکی غەوارەم و موسوڵمانم. ئەوشەو هاتمە دەرێ بەدوای دەسکەوتێکدا دەگەڕام و دیتم لەو کەنیزکانە دەسکەوتی باشتر وەگیر ناکەوێ. دەمەوێ ئەوانە بەرم بۆ لای هاوڕێکانم.'

"کچە گوتی: 'ئەو کەنیزانە دەسکەوتی تۆ نین. پێم نەگوتی ڕاستی بڵێ و درۆ مەکە؟ بە گیانی مەسیح قەسەم! ئەگەر نەترسابام لەوەی بە دەست من بەکوشت چی، ئێستا واد هاوار دەکرد کە وڵاتم پڕ دەکرد لە سوارە و پیادە. بەڵام من بەزەییم بە غەریباندا دێ و ئازاردانیانم پێ خۆش نییە. ئەگەر تۆ دەتهەوێ دەستکەوتت بێ، لە ئەسپەکە وەرە خوارێ و بەپێی دینی خۆت سوێند بخۆ کە دەست بۆ چەک نەبەی و زۆرانم لەگەڵ بگرە. ئەگەر تو من خست، ئەوە سواری ئەسپەکەتم کە و لەگەڵ ئەو کەنیزانەش هەموو دەستکەوتی تو دەبین. ئەگەر ئەمنیش تۆم خست، ئەوە هەرچی پێم خۆش بێ دەیکەم. بەڵام سوێندم بو بخۆ فرووفێڵم لەگەڵ نەکەی، جا دەپەڕمەوە ئەوبەری چۆمەکە و دێمە لات.' شازادە تەماع گرتی و گوتی: 'ئەو من ناناسێ و نازانێ کە چەندە ئازا و بەجەرگم.' هەر بۆیە بە کەنیشەکە جوانەکەی گوت: 'ئەتۆ بە چی باوەڕ دەکەی؟ سوێندت بۆ دەخۆم کە من ئەوەندەم ماڵ هەیە ئەگەر منت خست، ئەوە خۆمی پێ دەکڕمەوە و، ئەگەر منیش تۆم خست، ئەوە دەسکەوتێکی نایابی.' کچە گوتی: 'ئەمن لەسەر قسەی خۆم هەم. ئەتۆ سوێند بخۆ، بەو کەسەی ئێمەی ئافراند و ڕێوشوێنی ژیانی بۆ دانایین.' شەرکان بەو جۆرە سوێندی خوارد. بە پێکەنینەوە گوتی: 'هاوڕێکانت نیگەران دەبن هەتا زووە بگەڕێوە لای هاوڕێکانت. دەترسم ببێ بە ڕۆژ و سەربازان بێن و بتکوژن.' ئەوەی گوت و ڕووی لەولا کرد. شەرکان گوتی: 'خانم، ئەوە منی بێگانە و دڵشکاو هەر وا بەجێ دێڵی و دەڕۆی؟' ئەو بوتی چینە گەڕاوە و بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'چت لە دڵدایە پێم بڵێ.' شەرکان گوتی: 'کە هاتوومە وڵاتی تۆ، چۆن بێ ئەوەی شتێک بخۆم بگەڕێمەوە؟ ئێستا من غوڵامی تۆم.' کچە گوتی: 'چاوچنۆکەکان خۆ لە میوان دەشارنەوە. ئەتۆ سواری ئەسپەکەت بە، لەوبەرەوەی چۆمی برۆ و، منیش لەمبەرەوە دەچینەوە و میوانم بە.'

"شەرکان خۆشحاڵ بوو، زوو سواری ئەسپەکەی بوو. کیژە جوانەکە لەوبەری چۆمی و شازادەش لەمبەری چۆمی دەڕۆیشتن. تا گەیشتنە پردێکی دارین کە دارەکانیان بە زنجیری ئاسن پێکەوە بەستبوونەوە. شەرکان ویستا و چاوی لە پردەکە بڕی. سەیری کرد ئەو کەنیزانەی زۆرانیان دەگرت و قۆڵیان بەسترابوو. ئێستا دەستیان کراوەتەوە و لەوێ ڕاوەستاون. کیژەکە بە یەکیانی گوت: 'لغاوی ئەو ئەسپە بگرە و بیهێنە نێو دێرەکەوە.' ئیدی کەنیز لەپێشەوە و شەرکان بەدوایدا لە پردەکە پەڕینەوە. شەرکان دەشترسا و واقیشی وڕ مابوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: خۆزگە وەزیر دەندان لەگەڵم بایە و ئەو کەنیزانەی دیتبا. شازادە لە کیژە جوانەکەی پرسی: 'جا ئێستا مادام میوانی تۆم، دەبی

میوانداریشم بکەی و بە قسەم بکەی. ئەمن بەڵێنی خۆم بردە سەرێ. دەبێ گەورەییم لەگەڵ بکەی، لەگەڵم بێی بۆ وەڵاتی ئیسلام و ئازا و بەجەرگەکانی سوپایش خۆشحاڵ بکەی و منیش بناسی.'

"کە شاجوان قسەی شەرکانی بیست، توورە بوو و گوتی: 'بە حەزرەتی مەسیح! ئەمن ئەتۆم زۆر لا ماقووڵ و تێگەتیشتوو بوو. ئێستا لە مەبەستی گڵاوت گەیشتم. ئەو قسەیە لە تۆ نایە ئاوا خۆت نیشان دەی. ئەمنیش چۆن کاری وا دەکەم لە کاتێکدا دەزانم، ئەگەر ڕێم بکەوێتە لای نوعمانپاشا، تازە ڕزگاربوونم بۆ نییە. چونکە دەزانم ئەو لە کۆشکەکانیدا ژنی وەک منی نییە. هەر چەند سێسەدوشەست کۆشکی هەیە و هەر کۆشکێکیش ژنێکی ئەوی تێدایە وەک تیشکی مانگ. بەڵام من ببینێ، تازە بەرم نادا. بە پێی باوەڕی موسوڵمانان کە لە فورقاندا دەیخوێنن: 'یان کەنیزێک بکەنە هاودەمی خۆتان.'[1] دەڵێ ئەوە کۆیلەی خۆمە و، کەڵکم لێ وەر دەگرێ.' بەڵام ئەوەی گوتت بێمە سەیری سوپاکەتان، ئەو قسەیەش دروست نییە. بە حەزرەتی مەسیح! دوێنێ من سوپای ئیسلامم دی دەهاتن بۆ وڵاتی ڕۆم، بەڵام چ تەکووزییەکی[2] سوپاییم تێدا نەدیتن. بگرە تاقمێکی بێسەرەوبەرە و بەرەڵا کە لە شوێنێک کۆ ببوونەوە. ئەوەی گوتت کە ئەمن بناسە، ئەمن لەبەر ئەوە چاکەت لەگەڵ ناکەم کە تۆم پێ کەسێکی گەورە بووە یان تۆ من بە گەورە بزانی، مەبەستی من لەو کارە خۆرانانە و نابێ هی وەک تۆ قسە لەگەڵ من بکا، ئەگەر شەرکانی کوڕی نوعمانیش بێ، کە لەم سەردەمەدا بۆ ئازایەتی کەس تای ناکا.' شەرکان لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ڕەنگە ئاگای لە هاتنی سوپاکە بێ و هەواڵی ئەوەشی هەبێ کە بابم منی بۆ یارمەتیدانی پاشای قوستەنتەنییە ناردووە.'

"ئیدی سوێندی بە دینی ئەو خوارد و پێی گوت: 'بە ڕاستی قسەزانی.' پەریڕوو گوتی: 'بە حەقی دینی تۆ! ئەگەر لەوە نەترسابام کە بزانن من کچی ڕۆمیم، خۆم دەخستە مەترسییەوە و بەرەنگاری دەهەزار کەس دەبوومەوە و وەزیر دەندانی گەورەیانم دەکوشت و شەرکانی سپاسالارەکەشیانم بە دیل دەگرت. گەنجۆ، ئەوە بزانە من نامهەوێ بڵێم ئازا و نەترس و ئاوا و ئاوام، بەڵام ئەگەر ئەمشەو لە جێی تۆ شەرکان لێرە بایە، پێم دەگوت: 'دەبێ بازدەیە ئەو بەری ئەو چۆمە.' ئەو نەیدەتوانی و دانی بە کەمهێزییەکەیدا دەنا. لە بەر مەسیح دەپاڕێمەوە ڕێی شەرکان بخاتە ئەو دێرە، جا منیش بە جلی پیاوانەوە بەرەنگاری ببمەوە و بە دیل بیگرم و بیخەمە بەندی خۆمەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. أو ما ملکت أیمانکم.

٢. تەکووز: زۆر ڕێکوپێک.

# کە شەوی چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە کیژە مەسیحییەکە ئەو قسانەی بە شەرکان گوت، شەرکان غیرەتی بزووت و هەستی ئازایەتی و نەترسی وای لێ کرد خۆی بناسێنێ و لێی توورە بێ. بەڵام هێندەی پێ جوان بوو، لەبەرنابەریدا زمانی لاڵ بوو، چی لە دەست نەهات و گوتی:

ئەگەر تۆ بە شیری تیژ، هێرش کەی جێی خۆیەتی
ئەوەی کە لە دەست من بێ، مەتاڵ وەبەرگرتنە

"وا بوو کچە مەسیحییەکە چوو بۆ سەر دێرەکە و شەرکانیش بە دوایدا ڕۆیشت تا گەیشتنە دەرگای دێرەکە. کچە دەرگای کردەوە. لەگەڵ شەرکان چوونە دالانێکی دوور و درێژەوە، چلوورەیەکی زۆری تێدا هەڵکرا بوو وەک مانگە شەو دەتروسکانەوە. کە گەیشتنە ئەوسەری دالانەکە، تووشی دەستەیەک کەنیز بوون، مۆمبەدەست بە ڕیز ڕاوەستابوون. وا بوو کەنیزەکان وەپێش کەوتن و کیژە مەسیحییەکەش بەدوایاندا و شەرکانیش بەدوای ئەودا ڕۆیشتن تا گەیشتنە نێو پەرستگەکە. سەیری کرد کەتگەلێک[1] ڕووبەڕووی یەک داندراون و پەردەی دیبای لێ هەڵواسراوە، زەوییەکەی هەمووی بەردی ڕوخام و مەڕمەڕە و لە نێوەڕاستیدا حەوزێکی گەورەی لێیە کە بیستوچوار کوفارەی زێڕینی تێدایە. ئاو وەکوو زیوی کاڵ دەڕژێتە دەرەوە. لەلای سەرەوە کورسییەکیان داناوە فەرشی ئاوریشمیان لە سەر ڕاخستووە. کچە بە شەرکانی گوت: 'گەورەم، لەسەر ئەو کورسییە دانیشە.' شەرکان لەسەر کورسییەکە دانیشت و کچەی لێ ون بوو. شەرکان لە خزمەتکارەکانی پرسی: 'خانم بۆ کوێ چوو؟' گوتیان: 'چووەتە خەوگەکەی خۆی.' ئێمە لە خزمەتتداین. دوای خواردەمەنی جۆراجۆریان بۆ هێنا. شەرکان خواردنەکانی خواردن و دەستی شوشت. هۆش و بیری هەر لە لای سوپاکەی بوو. کە نەیدەزانی چیان بەسەر هاتووە. هەتا بەری بەیانی هەر نارەحەت و پەشیمان بوو و ئەو شێعرەی دەگوت:

خۆشی و شادی خۆم، گشتی دا بە خەم ئاوا دەبێ کار
لەخۆشی قەفەز، باڵم لوول دەکەم ئاوا دەبێ کار
هەرچەند لە کوورەی گیروگرفتی ژیانا قاڵم
نەغدی خۆم ئەوڕۆ بە قەرز دەدەم، ئاوا دەبێ کار

---

١. کەت: تەخت، تەختە خەو.

"که ڕۆژ بووەوە، دیتی ئەوە بیست کەنیزی ڕووگەش وەک ئەستێرە دێن و ئەو کیژەش لە ناوەڕاستیاندایە و وەک مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە. که نزیک بوونەوە، شازادە شەرکان بە خۆی نەبوو، لەبەرابەر جوانی و دەلالی ئەو کەنیشکە، قرچە پێ هەستا. ئەو رووگەلاوێژە ماوەیەکی باش چاوی لە شەرکان بڕی و تێی ڕاما. شەرکانی ناسییەوە و گوتی: 'شەرکان، گەورەت کردین و بوویە مایەی خۆشحالّیمان. دوێ شەو چۆنت بۆ گوزەرا؟' دوای ئەوە گوتی: 'درۆ بۆ شازادەکان شەرمە. بە تایبەت بۆ تۆ کە بەسەر هەموو پاشاکانی ناوەچەکەوەت هەیە. خۆت نەناس مەکە و بنەچەی خۆت مەشارەوە. جگە لە ڕاستی هیچ مەڵێ، درۆ دژمنایەتی دێنێ.' شەرکان کە زانی بواری درۆ نەماوە، گوتی: 'من شەرکانی کوڕی نوعمانم.' ئیدی کچە چاو کەژاڵەکە گوتی: 'هیچ مەترسێ، ئەتۆ میوانی و نان و نمەکی ئێمەت کردووە. تازە پێوەندی دۆستانە لەنێوان ئێمەدا دروست بووە. ئەتۆ لەژێر باڵی منداێ. بە حەزرەتی مەسیح! ئەگەر تەواوی دنیا بیانهەوێ ئازارت بدەن، ناتوانن مەگین من بمرم. ئەو دەمیش ئەتۆ لە پەنای مریەمی مەسیحدای.' ئیدی لە پەنا شەرکان دانیشت و دەستیان کرد بە شۆخی و دەستبازی. تا ئەو ڕادەیەی کە شەرکان ترسی نەما. پاشان ئەو کیژە مەسیحییە بە زمانی ڕۆمی قسەیەکی لەگەڵ کەنیزێک کرد. کەنیزە ماوەیەکی پێ چوو. کە هاتەوە، مەی و خواردنی هێنا. شەرکان هیچی نەخوارد و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ڕەنگە ژەهریان لە خواردنەکە کردبێ.' دوێتەکە زانی شەرکان دڕدۆنگە گوتی: 'بە حەزرەتی مەسیح! وەک بیری لێ دەکەیەوە وا نییە. ئەگەر من پێم خۆش بێ بتکوژم، زۆرم بۆ ئاسانە.' ئینجا بۆخۆی دەستی کرد بە خواردن و لە هەموو خواردنەکانی خوارد. ئیدی شەرکانیش دەستی کرد بە خواردن تا تێر بوون. ئینجا سفرە کۆ کراوە و دەستیان شوشت. کچە فەرمانی دا نوقڵ و گوڵ و ڕێحان و پیاڵەی زیوین و زێڕین و بلووریان لەگەڵ مەی ئامادە کردن. ئیدی دوێتە دانیشت و خۆی پیاڵەیەکی خواردەوە و پیاڵەیەکیشی بۆ شەرکان تێ کرد. هەر خواردییەوە و هەر بۆی تێ کرد. هەتا شەرکان مەست بوو و ئاوەزی تێکەڵ بوو."

کاتێک چیرۆکەکە گەیشتە ئێرە ڕۆژ بووەوە و شەهرزاد پاشماوەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی چل و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کچە هەر مەی دایە هەتا شەرکان تەواو سەرخۆش بوو. دوای ئەوە دوێتە بە کەنیزێکی گوت: 'مەرجانە، بچۆ مۆسیقا بێنە.' کەنیزە چوو عوود و چەنگ و نەی هێنا. کیژە دەستی دا عوودەکە و تارەکانی توند کردەوە، لێیدا و بە دەنگێکی خۆش دەستی کرد بە گۆرانی. پاشان کەنیزەکان دانەدانە هەستان و ئامێرێکیان هەڵگرت و لێیاندا و بە زمانی ڕۆمی شێعرگەلێکیان خوێندەوە. شەرکان کەیفی ساز بوو. ئینجا خانم لێی پرسی: 'بەچکە موسوڵمان، حاڵی بووی چیم گوت؟' شەرکان گوتی: 'نا، حاڵی نەبووم، بەڵام لەبەر جوانی ئەو ئەنگوستانەی تۆ دڵخۆش بووم.' کچە پێکەنی و گوتی: 'ئەگەر من بە زمانی عەرەبی گۆرانیت بۆ بڵێم، چ دەکەی؟' شەرکان گوتی: 'شێت دەبم.' ئینجا کیژە ئاهەنگێکی دیکەی لێدا و چەند شێعرێکی دیکەی خوێندەوە. شەرکان لە هۆش خۆی چوو. دوای ئەوە هاتەوە سەر خۆ و لەگەڵ کچە دەستیان کرد بە مەیخواردنەوە و گاڵتە و گەپ و جەفەنگ و ڕابواردن هەتا بوو بە شەو. کچە چووەوە بۆ خەوگەکەی خۆی.

"کە ڕۆژ بووەوە کەنیزێک هاتە لای شەرکان و پێی گوت: 'خانم کاری پێتە.' شەرکان هەستا و بە دوای کەنیزەدا ڕۆیشت و ڕۆیشت هەتا گەیشتنە دەرگایەکی عاجی گەورە کە بە دوڕ و جەواهێرات ڕازابووەوە. چوونە ژوورێ. ماڵێکی گەورە بوو، لەلای سەرەوە هەیوانێکی لێ بوو فەرشی ئاوریشم و دیبای تێدا ڕاخرابوو. پەنجەرەکانی هەیوانەکە دەیانڕوانییە باخێک و لە بەر دەرکی هەیوانەکەدا هێندێک پەیکەری لێ بوو کە با دەچووە نێویانەوە و دەنگیان دەداوە و بە جۆرێک فێڵێکیان ساز کردبوو هەتا خەڵک وا تێبگەن ئەوانە قسە دەکەن.

"خانم لەلای سەرەوەی هەیوانەکە دانیشتبوو کە ئەوی دیت، لە بەری هەستا و دەستی گرت و لە پەنا خۆی داینا و بە سۆز و خۆشەویستییە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد. باسی هەموو شتێکیان دەکرد. وا بوو کچە لێی پرسی: 'شێعری دڵداری و شت دەزانی؟' شەرکان گوتی: 'بەڵێ، شێعر زۆر دەزانم.' کیژە گوتی: 'چەند شێعرێکی خۆشم بۆ بخوێنەوە. شەرکان ئەو شێعرەی بۆ خوێندەوە:

یاری جوانم پەرژینی یاسەمەن بە سونبول دەکا
بوتگەری چین وا دەتاسێ، ئێرەییەکەی گوڵ دەکا
هەرکەسێ ئاگای لە ئێشی دڵم و نازی ئەو ببێ
باش دەزانێ من پەپوولە، یاریشم لە گوڵ دەکا

"کیژه که گوێی لەو شـیعره بوو، گوتی: 'شـاعیرانیش زمانێکی زۆر ڕەوان و پاراویان بووه. شاعیرێک لە شوێنێکدا لە پەسنی کەزییەدا زۆر زیادەڕۆی دەکا و دەڵێ:

تـا زولـفـت لە دەوری ئەو گـوڵـجـارە کەروێشـــکە بـکـا
هەر دڵـی عـاشـــقە دێ لە دەوری ڕووت خـرمـانە دەدا

"دوای ئەوه گوتی: 'شـــازاده، شـــیعرێکی دیکه بخوێنەوه.' ئەویش ئەم چوارینەیەی خوێندەوه:

قـوڵـی ڕقـت لـێـم هەڵـکـردووه بە هـێـمـنـی
وا بە کەمەنـد دڵـمـت گـرتـووه بە هـێـمـنـی
ئەگەر گـیـانـی مـنـت دەوێ، دەرنـاچـێ بە لەز
خۆشـــەویســـتیـت ڕێی لێم گرتووه، بە هێمنی

"کە دوێتە گوێی لەو چوارینەیە بوو، گوتی: 'بژی شـازادە، ئەوە، خۆشـەویسـتەکەی بە تەما بووه چی لەو عاشـقە بکا وا ئەو شـێعرەی بۆ گوتووه؟' شـەرکان گوتی: 'بە تەمای کوشتنی بووه، هەر وەک چۆن تۆ بە تەمای کوشتنی منی.' پەری‌سیما بەو قسەیە پێکەنی و سـەرقاڵی مەیخواردنەوه بوون. شـەو کیژه مەسـیحییەکە چووەوه خەوگەکەی خۆی لێی خەوت. شەرکانیش هەر لەوێ خەوت.

"کە ڕۆژ بووەوه، کیژێک هات، کڕنۆشـی برد و گوتی: 'خانم داوای تۆ دەکا.' شـەرکان هەسـتا، کەنیزەکەکان لەملا و لەولایەوه دەفیان لێ دەدا، هەتا بردیانە ئەو دیوەی کچەکەی لێ بوو. کە کچە شـەرکانی دیت، لە بەری هەسـتا و دەسـتی گرت، هێنای داینا و بۆخۆشـی لە پەنای دانیشت و پاش بەیانی‌باش و چاک‌وچۆنی، گوتی: 'شازاده، ئەتۆش شەترەنج باش دەزانی؟' شەرکان گوتی: 'بەڵێ.' ئیدی شەترەنجیان هێنا و دەستیان بە شەترەنج کرد. بەڵام شـەرکان هەر چاوی لەسـەر جوانییەکەی بوو، ئەسـپی لە جێی فیل و فیلی لە جێی ئەسـپ دەبزواند. کچە پێکەنی و گوتی: 'ئەگەر ئـاوا شـــەترەنج بکەی، ئەوه هیچی لێ نـازانی.' شـــەرکان گوتی: 'ئەمجارەش دەیکەینەوه.' ئیدی دیســـان مۆرەکانیان چنییەوه. شـــەرکان دیسان دۆڕاندی. هەتا پێنج جاران کچە هەر لە شەرکانی بردەوه. بە شەرکانی گوت: 'ئەتۆ لە هەموو شتێکدا هەر بە منی دەدۆڕێنی.' شەرکان گوتی: 'لەگەڵ جوانی وەک تۆ هەر دەبێ بدۆڕێم.' ئینجا داوای خواردن و مەی کرد. خواردنیان خوارد و بادەیان خواردەوه هەتا شاجوان بەسەریدا هات و ئەو چەند بەیتەی گوت:

بەیـانە، چـاو لە خـۆر کە وا تـیشـــک داوێ
دەســــت لە چـاکە و خـراپە هەڵـگـرە تـاوێ
یـار بە بـادە و شـــەرابەوە چـاوی لە ڕێـتە
خۆ لە دەریـای بێخەیـاڵی و شـــێتێتی بـاوێ

"هەتا شــەو هەر بە بادەنۆشــی گوزەرا و، شــەو شــاجوان چووەوە دیوەکەی خۆی و شـــەرکانیش هەر لەوێ نوســـت. کە ڕۆژ بووەوە، کەنیزەکان هەر وەک ڕۆژانی پێشـــوو بردیانەوە بۆ لای خانم. خانم هەستا دەستی گرت و لەکن خۆی داینا. هەواڵی پرسـی و بە ناز و کرێشـــمەوە خەریک بوو قســـەی لەگەڵ دەکرد، کە لەپڕ دیتیان ئەوە تاقمێک پیاو و گەنج شـــیریان لە کالان دەرکێشـــاوە و دێن، بە زمانی ڕۆمیش قســـە دەکەن. دەڵێن: 'ئەی شەرکان! بە لاقی خۆت هاتوویتە نێو تەڵەوە، خۆت بۆ مردن ئامادە بکە.'

"شـــەرکان کە ئەوەی دیت، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ڕەنگە ئەو کچە منی خاپاندبێت هەتا سـوپاکەی دەگاتێ. خەتای خۆشـم بوو خۆم تووشـی ئەو زەلکاوە کرد.' بەڵام کە سـەیری کرد گۆنا سـوورەکانی ئەو ڕەزاسـووکە زەرد هەڵگەڕابوو، هەسـتا و هەرای کردن: 'ئێوە کێن؟' بەرپرســـەکەیان گوتی: 'شـــازادە، مەگەر نازانی ئەوەی لە لاتە کێیە؟' کچە گوتی: 'نایناســـم، ئەتۆ پێم بڵێ کێیە.' ئەو پیاوە گوتی: 'ئەوەی لە لای تۆیە، پێشـــەنگی دلێران. شازادە شەرکانی کوڕی نوعمانە. حەردووبپاشای بابت لە زاتوددەوایی پیرێژنی وڕوڕەی جادووی بیستووە کە شـەرکان هاتووەتە ئێرە. ئێمەی بۆ گرتنی ناردووە. ئێستا دەمهەوێ ئەو لاوە قۆڵبەست بکەی و یارمەتی ڕۆمیان بدەیت.'

"کە شـازادە خانم قسـەی ئەو پیاوەی بیسـت، بە تووڕەییەوە چاوێکی لێ کرد و گوتی: 'چۆن بە بێمۆڵەتی من هاتوویتە ئێرە؟' ئەو پیاوە گوتی: 'شـــازادە خانم، کاتێک ئێمە هاتینە ئێرە، کەس ڕێی پێ نەگرتین. بەڵام وەختی ئەوە نییە لە ســـەری بڕۆین. پاشـــا چاوەڕێی ئێمەیە هەتا شـەرکان بە دەستبەستراوی بەرینە بەردەستی، بۆ ئەوەی بە خراپترین شێوە بیکوژێ.' کچە جوانکیلەکە بە فەرماندەرەکەی گوت: 'قسـەکردن بێسـوودە و زاتوددەواییش درۆ دەکا. بە حەزرەتی مەسـیح! ئەوەی لە لای منە نە شــەرکان و نە پیاوی ئەوە. پیاوێکی غەوارەیە و پەنای بۆ ئێمە هێناوە و ئێمەش پەنامان داوە. ئەگەر بشـــزانم ئەوە شـــەرکانە، دیسـان کارێکی جوامێرانە نییە، ئەمن بیدەمە دەست ئێوە، چونکە ئەو پەنای بۆ من هێناوە. ئێوە بڕۆن لە ناو خەڵکدا ئابڕووم مەبەن و بە بێبەڵێنم مەناســـێنن. ئەتۆ بچووەوە بۆ لای پاشـــا کڕنوش بەرە و بڵێ ئەو پیرێژنە درۆ دەکا.' ئەو کابرایە گوتی: 'شـــازادە، من ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ لای پاشـا هەتا شـەرکان قۆڵبەست نەکەم و نەیبەم بۆ لای.' پەریزادە تووڕە بوو، پێی گوت: 'ئەتۆ بگەڕێوە هیچت بۆ نایەتە پێش.' ئەو پیاوە گوتی: 'هەتا لەگەڵ خۆم

نەیبەم، ناگەڕێمەوە.' شازادە تووڕەتر بوو، ڕەنگی تێک چوو و گوتی: 'زۆری لەسەر مەڕۆ، چونکە ئەو گەنجە زۆری شایی بە خۆیەتی و لە خۆی ڕادەبینێ بەرەنگاری سەد کەسیش ببێتەوە. ئەگەر تۆ پێی بڵێی تۆ شەرکانی کوڕی نوعمانی، ئەویش دەڵێ بەڵێ هەوم، ئەو ـەم ئێوە دەرەقەتی نایەن و، هەتا هەمووتان نەکوژێ دەستتان لێ هەڵناگرێ. ئەگەر دەڵێن، ئەوە بە شیر و مەتاڵەوە دەینێرمە دەرێ.' ئەو کابرایە گوتی: 'ئەگەر ئەتۆ لێم گەڕێی، بە کورەکان دەڵێم قۆبەستی کەن و دەیبەین بۆ لای پاشا.' شاجوان گوتی: 'شتی وا نابێ سەد کەس ڕووبەڕووی کەسێک ببنەوە. ئێوە یەکیەک ڕووبەڕووی ببنەوە هەتا بۆ پاشایش ڕوون بێتەوە کە ئێوە کامتان ئازا و نەترسترن.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پەنجایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە ئەبریزە بە سەرداری سوارەکانی حەردووبپاشای گوت: 'ئێوە دانەدانە بۆی وەرنە پێشێ، با دەرکەوێ کامتان نەبەزترن.' ئەو کابرایە گوتی: 'بە حەقی مەسیح قسەکەت جوانە، بەڵام یەکەم شەڕکەر هەر بۆخۆم دەبم.' شازادە گوتی: 'باشە، ڕاوەستە با بچم ئەویش ئاگادار کەمەوە. ئەگەر ئەو تەمای شەڕی نەبێ، ئەوە ئێوە ناتوانن هیچ بکەن و ئەمن و کەنیزەکان و ئەوەی لەو دێرەدایە گیانی خۆمانی بۆ بەخت دەکەین.'

"شازادە ئەبریزە چوو شەرکانی ئاگادار کردەوە. شەرکان بزەیەکی هاتێ و زانی کە شازادە لەگەڵی بەدەهۆ نەبووە. ئینجا خۆی سەرکۆنە کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'چون خۆم خستە مەترسییەوە.' ئەوجار بە شازادەی گوت: 'یەکیەک کەمە، با دە، دە پێکەوە بوم بێن.'

"پاشان هەستا جلوبەرگی شەڕی لە بەر کرد و بە شێری ڕووتەوە بۆیان چووە دەری کە سەرداری سوارەکان شەرکانی دیت، هێرشی بۆ هێنا، شەرکانیش وەک شێر نەڕاندی شێرێکی لە نێوقەدی دا و کردی بە دوو کەرتەوە. شازادە کە نەترسی شەرکانی دی، لە لای بەڕێزتر بوو. ئەوجار شازادە بە سوارەکانی گوت: 'تۆڵەی سەردار بکەنەوە.' برای سەردار کە ئازایەکی بەناوبانگ بوو، هاتە پێشێ. شەرکان بواری پێ نەدا و لە ڕێوە دوو قاشی کرد. ئەو مانگرۆخسارە هەرای لێ کردن: 'تۆڵەی هاوارێکانتان ناکەنەوە؟' ئەوان یەک، یەک دەهاتن و شەرکان دەیکوشتن. هەتا پەنجا کەسی لێ کوشتن. سوارەکان توانایی بەربەرەکانییان نەما و هەموویان بە جارێک پەلاماریان هێنا. شەرکان ئەو پاڵەوانانەی هەموو کوشتوبڕ کرد و کەسیان بە پێوە نەما. شازادە هاتە پێشێ، شەرکانی لە ئامێز گرت و بردییەوە کۆشک. پێی گوت: 'شەرکان، دەست لە تۆ هەڵناگرم هەرچەند ڕۆمییان سەرکۆنەشم بکەن.' ئیدی شەرکان خوێنی شمشێرەکەی سڕی و ئەو چوارینەیەی گوت:

وەکوو دەهۆڵ تۆقێنەرە هاوارم
بە ڕمب کونکون دەکەم دڵی زۆردارم
بە سەرەوە بۆ شەڕ دەچم، تیراسا
دابڕدابڕ دەکەم ڕیزی نەیارم

"ئینجا شازادە دەستی ماچ کرد، بۆخۆشی زرێیەکی لە بەردا بوو، دایکەند. شەرکان گوتی: 'خانم، ئەوە بۆ زرێت لە بەر کردبوو و شێری ڕووتیشت بە دەستەوە و لەوی

ڕاوەستابووی؟' شازادە گوتی: 'نیگەرانی تۆ بووم.' ئیتر بانگی دەرکەوان و شتەکەی کرد و گوتی: 'ئەوە لەکوێ بوون وا ئەو سوارانە بێ بەربەست هاتنە کۆشکەوە؟' دەرکەوانەکان گوتیان: 'ڕاسپاردەی پاشا، بە تایبەت سەردار، پێویستی بە ڕێپێدان نییە.' شازادە گوتی: 'ئێوە هەر بە فێڵ ئەو کارەتان کرد هەتا میوانەکەم بکوژن'. ئیدی بە شەرکانی گوت: 'بیان کوژە.' شەرکان کوشتنی. شازادە ئەبریز گوتی: 'چونکە تازە هەموو شتێک کەوتە ڕوو، ئێستا بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە:

" 'ئەمن کچی حەردووبپاشام و ناوم ئەبریزە. ئەو پیرێژنە کە ناوی زاتوددەواییە، نەنکمە و بە بابمی گوتووە کە تۆ هاتوویە ئێرە و تازە من دەکوژێ. من وام پێ باشە لێرە بڕۆین. بەڵام لە تۆم دەوێ لەگەڵم باش بی. وەک من بۆ تۆ باش بووم.' شەرکان کە ئەوەی بیست، لە دڵەوە گەشاوە. خەریک بوو لە خۆشیان بفڕێ. گوتی: 'بە خودا سوێندت بۆ دەخۆم هەتا گیانم لە بەردا بێ، کەس دەستت بۆ ناهێنێ. ئیدی نازانم دەتوانی لە بابت دوور کەویتەوە یان نا؟' شازادە خانم گوتی: 'ئەرێ خوو بە دووری ئەویشەوە دەگرم. بەڵام تکایەکی دیکەم لە تۆ هەیە، ئەویش ئەوەیە کە تۆ بە سپاوە بگەڕێیەوە لای بابت.' شەرکان گوتی: 'خانمەکەم، بابم منی ناردووە بۆ شەڕی باوکی تۆ و لەبەر ئەو ماڵەشە کە لە عەرەبانی وەرگرتووە، بۆ نموونە گەوهەرێکی گرانبایی بووە.' شازادە گوتی: 'ئەگەر وای لێ هات، ئەمن بۆت دەگێڕمەوە کێشە و دژمنایەتی پاشای قوستەنتەنییە و حەردووبپاشا لەسەر چییە . ئەویش ئەویە کە:

" 'لەنێو ئێمەدا جێژنێک هەیە جێژنی دێری پێ دەڵێین. هەموو ساڵێک لەو ڕۆژەدا کچانی پاشا و گەورەکان و بازرگانان کۆ دەبنەوە و حەوت ڕۆژ لە دێر دادەنیشن. ساڵێک ئەمنیش یەکێک لەو کچانە بووم. کە ناکۆکی کەوتە نێوانمانەوە، بابم هەتا حەوت ساڵ نەیهێشت بچمە ئەو کۆڕەوە. بە ڕێکەوت ساڵێک کچی پاشا و گەورە و بازرگانان لەو جێژنەدا هاتنە دێر و یەکێک لەوان سەفییەی کچی پاشای قوستەنتەنییە بوو. حەوت ڕۆژ لە دێر مانەوە. ڕۆژی هەشتەم گەڕانەوە. سەفییە گوتی: 'ئەمن ناچمەوە قوستەنتەنییە ئەگەر لە دەریاوە نەبێ.' ئیدی پاپۆڕێکیان بۆ ساز کرد. سەفییە لەگەڵ کەسانی تایبەتی خۆیدا سواری پاپۆڕ بوو، کەوتنە ڕێ و ڕۆیشتن، ڕۆیشتن هەتا بای نەخوازراو هەڵیکرد و پاپۆڕی لە ڕێی خۆی لا دا. خۆیان و بەختیان، پاپۆڕێکی مەسیحییانی دوورگەی کافوور لەو دەریایەدا بوو کە پێنجسەد کەسی فەرەنگی[1] تێدا بوو. کە چاویان بەو پاپۆڕە کەوت وا سەفییەی تێدا بوو، فەرەنگییەکان پاپۆڕەکەیان بەرەو لای پاپۆڕەکەی ئەوان ئاژووت. هەتا نیزیک بوونەوە، کەندریان هاویشتە پاپۆڕی ئەوان و کێشایانە لای پاپۆڕی خۆیان. ڕۆیشتن بەرەو دوورگەی کافوور. ئەوەندەی پێ نەچوو بای نەخوازراو هات و پاپۆڕەکەی ڕادا هەتا

---

١. فەرەنگی: ئورووپایی.

گەیشـــتنە ناوچەی وڵاتی ئێمە. ئێمە چووینە دەرێ و ئەوانمان گرت و کەشـــتی و کەنیز و ماڵەکەیانمان بە تاڵان برد. لەو پاپۆڕەدا چل کەنیزی تێدا بوو کە سەفییە یەکێک لەوان بوو. ئیدی کەنیزەکانمان گرتن و بردماننە لای بابم. ئێمە نەماندەزانی کە کچی ئافریدوونپاشـــا لەنێو ئەواندایە. بابم دە کەس لەو کەنیزانەی هەڵبژارد و ئەوەی دیکەی بەخشـــین. لەو دە دانەیە پێنجیانی لەگەڵ دیاری گرانبایی نارد بۆ نوعمانپاشـــای بابت. نوعمانپاشـــا لەو پێنج کەنیزە ســـەفییەی کچی ئافریدوونپاشـــای بۆ خۆی هەڵگرتووە. لە ســـەرەتای ئەو ســـاڵدا ئافریدوونپاشـــا نامەیەکی بۆ بابم نووســـی، شـــتی وای تێدا نووســـیبوو کە بۆ گوتن نابێ. بابمی ترســـاندووە و ســـەرکۆنەی کردووە کە ئەوە دوو ســـاڵە دەســـتت بە ســـەر پاپۆڕی فەرەنگی و شـــتەکانی نێویدا گرتووە، یەکێک لەو شـــتە زۆر گرینگانەی کە لە پاپۆڕەکەدا بووە، سەفییەی کچمە کە شەست کەس لە کەنیزەکانی لەگەڵ بوون. کەست نەناردووەتە لای من و ئاگادارت نەکردوومەوە. ئەمنیش لەبەر پاراســـتنی ئابڕووی خۆم هەتا ئێســـتا لە لای کەس باســـم نەکردووە، پیاوم ناردە لای فەرەنگییەکان، گوتیان: 'ئێمە لە وڵاتەکەی تۆ نەمان بردووەتە دەرێ.' دیسان گوتبووی ئەگەر ئێوە تەمای دژمنایەتی لەگەڵ منتان نییە و ناتانەوێ ئابڕووی من بەرن، هەر ئێســـتا کە نامەکەی من دەخوێننەوە، کچەکەمم بۆ بنێرنەوە. ئەگەر بێتو لەو بارەوە کەمترخەمی بکەن و بتانەوێ ئازارم بدەن، بزانن هاکا تۆڵەی خۆم لێ ئەستاندنەوە.

" 'کە ئەو نامەیە گەیشـــتە دەســـت بابم، زانی کە ســـەفییەی کەنیشـــکی ئافریدوونپاشـــا لەگەڵ ئەو کەنیزانەدا بووە، ئیدی نیگەران بوو و پەشـــیمان بووەوە، ســـەری لێ شـــێوا و دەیزانی کە تازە ناتوانێ سەفییە لە نوعمانپاشا بستێنێتەوە. بە تایبەت ئێستا کە منداڵیشی لە ســـەفییە هەیە. بە کورتی، بابم دوای ئەوەی ئاگاداری ئەو دۆخە بووەوە، زانی تووشـــی کێشـــەیەک و زەلکاوێکی گەورە بووە کە ڕێگای ڕزگار بوونی نییە. ئیدی وەڵامی نامەکەی ئافریدوونپاشای داوە و نووسی کە نەمزانیوە و سەفییەم ناردووە بۆ نوعمانپاشا و ئێستا لە نوعمانپاشـــا منداڵی هەیە. کە وەڵامەکەی باوکم گەیشـــتە دەســـت ئافریدوونپاشـــا، ئەو ئەوەندە توورە بوو، هەڵدەســـتا، دادەنیشـــتەوە، دەهات و دەچوو و دەینەڕاند: 'چۆن دەبێ کچی من بە دیل بگیرێ و ئەو دەست، ئەو دەستی پێ بکرێ و بەبێ مارەیی وەکوو کەنیز بە کۆیلە دانرێ.' دوای ئەوە گوتی: 'بە حەقی مەسیح و بە حەقانەتی دینی ڕاست! دەست هەڵناگرم و ناحەسێمەوە هەتا ئەو پەڵە ڕەشە لەسەر شانم لا نەبەم. دەبێ کارێک بکەم بە چیرۆک دوای من بگێڕدرێتەوە.' وا بوو دوای ئەوە هەمیشە لە بیری سازکردنی کەڵەکێکدا بوو. هەتا ئاخری ئەو ڕاسپاردانەی ناردووەتە لای بابت و بە درۆ و دەلەسە بابتی ناچار کردووە و تینی داوە تا سپا تەیار و ئامادە بکا و بینێرێ. مەبەستی ئافریدوونپاشا ئەوەیە تۆ بە دیل بگرێ و سوپاکەت تار و مار بکا. بەڵام ئەو سێ گەوهەرە بەنرخەی کە بۆ بابتی

نووســـیوە، ڕاســـتییەکەی ئەوەیە کە ئەو ســـێ گەوهەرە گەورە و گران و بەنرخە لە لای ســـەفییە بوون. بابم ئەوانی لێ سەند و دای بە من. ئێستا ئەوان لە لای منن. ئەتۆ بگەڕێوە بۆ لای ســـوپای خۆت و پێش ئەوەی بچنە نێو شـــاری ڕۆمیان و فەڕەنگیان، بیانگێڕەوە. چونکە ئەگەر ئەوان بچنە نێو شار، تازە ڕزگاریان نابێ. شەرکان کە ئەو قسانەی بیست، دەســـتی شـــازادەی ماچ کرد و گوتی: 'پەســـن و ســـپاس بۆ ئەو خودایە کە ئەتۆی کردە هۆکاری ڕزگاری من و ســـوپاکەم.' شـــازادە گوتی: 'ئەتۆ لەگەڵ تیپی ســـواران بگەڕێوە. سوپاکەت بگێڕەوە و پەیامهێنەکانی ئافریدوونپاشا قۆڵبەست بکە هەتا ڕاستی ئەو وتەیەی منت بۆ ڕوون دەبێتەوە. ئەمنیش ســـێ ڕۆژی دیکە دەگەمە لای ئێوە و پێکەوە دەچینە شاری بەغدا.' کە شەرکان هەڵوێستی گرت بگەڕێتەوە، شازادە گوتی: 'لەسەر بەڵێنی خۆت بی و لە بیری نەکەی.' ئەوجار شازادە خانم بۆ بەڕێکردنی هەستا و دەستی کردە گریان. شـــەرکانیش هەســـتی خرۆشـــا و ڕۆندکی[1] لە چاوان هاتە خوار. شـــازادە ئەبریزە لەگەڵ گریانەکەی ئەودا هێندەی دی گریا و ئەو شێعرەی گوت:

بەیـانـی کە هەڵـوێســـتـی ســـەفەری گـرت
کەســـەر هـات و ئـاتەگـی دڵـمـی گـرت
ڕۆنـدکـم رایـکـرد ڕێـی پـێ بـگـرێ
نەیـگەیشـــتـێ و ئـاتەگـی خـۆمـی گـرت

"ئیدی شەرکان لێی جوێ بووەوە و لە دێر هاتە خوارێ و سواری ئەسپەکەی بوو. لە پردە دارینەکە پەڕییەوە و بەنێو دارســـتانەکەدا ڕۆیشـــت هەتا گەیشـــتەوە مێگزارەکە. ســـێ سوار لە دوورەوە وەدەر کەوتن. شەرکان لە خۆی ترسا و شیرەکەی هەڵکێشا. کە نیزیک بوونەوە، شـــەرکان ناســـینیەوە و ئەوانیش ئەمیان ناســـییەوە و لە ئەســـپەکەیان دابەزین. وەزیر دەندان لەگەڵ دوو میری دیکە سڵاویان لە شەرکان کرد. وەزیر دەندان لێی پرسی: 'ئەوە لەکوێ بووی؟' شـــازادە تەواوی ڕووداوەکەی مووبەموو بۆ گێڕاوە. وەزیر دەندان سپاسی خودای کرد و فەرمانی بە سپا دا بگەڕێتەوە.

"کەچی پەیامهێنەکانی ئافریدوونپاشا چووبوون هەتا ئافریدوونپاشا لە هاتنی شازادە شەرکان ئاگادار کەنەوە. پاشا دوای ئاگاداربوونەوە سوپای ناردبوو هەتا شەرکان بگرن و سوپاکەی لەنێو بەرن. بەڵام شەرکان لەگەڵ سوپاکەی خۆی گەڕانەوە و پاش بیستوپێنج ڕۆژ ئەو قۆناغە و قۆناغیان کرد هەتا گەیشـــتنەوە وڵاتەکەی خۆیان. بۆ حەســـانەوە لەوێ باروبنەیان خســـت. خەڵکی ناوچەکە خواردەمەنی خۆیان و ئەســـپەکانیان بۆ هێنان و هەتا

---

[1]. ڕۆندک: ئەسرین، فرمێسک.

دوو ڕۆژ لەوێ حەسانەوە. دوای ئەوە هەر هێزەی بەرەو شاری خۆی ڕۆیشتنەوە. بەلام شەرکان لەگەڵ سەد سوار لەوێ ماوە. دوای ئەوە سپا تەواو بڵاوەی کرد. شەرکانیش لەگەڵ سوارەکانی دوو فرسەخێک لەو شوێنە دوور کەوتنەوە، لەنێوان دوو کێودا گەیشتنە خڕ و دۆڵێک، چاویان لێ کرد ئەوە تەپوتۆزێک لە دوور دێ و بەری ئاسمانی گرتووە. کە هاتنە پێشی و تۆزەکە نیشتەوە، سەت سواری چالاک کە لە چەکدا خۆیان ڕەش داگیرابوو. وەدەر کەوتن و هەر لە دووڕا هەرای شەرکانیان کرد: 'بە ئاواتی خۆمان گەیشتین و نێچیری خۆمان وەگیر کەوت. ئێستا لە ئەسپەکانتان وەرنە خوارێ و چەکەکانتان دانێن هەتا ئێمە لێتان خۆش بین و نەتانکوژین.'

"شەرکان کە ئەو قسانەی بیست، تووڕە بوو، گوتی: 'هەی مەسیحی خوێڕی، چۆن وێراوتانە پێ بنێنە ناو ئاخ و وڵاتی ئێمە. بێنە ئێرە و ئەو قسانە بکەن؟ ڕەنگە پێتان وا بێ لە دەست ئێمە دەردەچن و دەچنەوە شارەکانی خۆتان!' ئیدی فەرمانی بە سوارەکانی دا: 'ئەو گلاوانە لەتوپەت کەن.' بۆخۆشی شیری هەڵکێشا و پەلاماری دانێ. فەرەنگییەکانیش ئازایانە لێیان وە دەست هاتن و بەرەنگاری یەک بوونە. تا بوو بە شەو زۆر ئازایانە شەڕیان کرد. کە شەو داهات و هەوا تاریک بوو، شەڕکەرەکان لێک بوونە و هەر کەسەی گەڕاوە بۆ شوێنی خۆی. شەرکان سەیری کرد سوارەکان هەموو ساغ و سلامەتن جگە لە چوار کەس کە بە سووکی بریندار ببوون. شەرکان گوتی: 'ئەمن ئەوەندەی وە بیرم دێ. هەر خەریکی شەڕ و کوشتار بووم، بەلام شەڕکەری ئاوا چالاک و نەترسم نەدیوە.' سوارەکان گوتیان: 'شازادە، سوارێکیان لەگەڵە ئەوەندە ئازایە، سەیرە، بەلام بەسەر هەر کام لە ئێمەدا کە سەر دەکەوێ، لێی خۆش دەبێ و بەجێی دێڵێ. بە خودا ئەوە ئەگەر سبەینێ بیەوێ، تاقمان بە دەستییەوە دەرناچین.' شەرکان سەری لەو قسەیە سووڕ ما و گوتی: 'سبەینێ باسی سبەینێ دەکەین.'

"فەرەنگییەکانیش بە فەرماندەی خۆیان گوت: 'ئەوڕۆ هیچ دەسکەوتێکمان نەبوو.' فەرماندەکەیان بەڵێی سبەینێی دانێ.

"ئەو شەوە هەردوو لا لە شوێنی خۆیان ڕۆژیان کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، شازادە شەرکان لەگەڵ جەنگاوەرەکانی سواری ئەسپەکانیان بوون و بەرەو شەڕگە چوون. سەیریان کرد ئەوە فەرەنگییەکان بەڕیز ڕاوەستاون. شەرکان گوتی: 'با دەست پێ بکەین.' فەرەنگییەکان هەرایان کردنێ: 'ئەوڕۆ شەڕی یەکە بە یەک دەکەین'. ئیدی یەکێک لە سوارەکانی ئەوان هاتە شەڕگەوە. کەمێکی شات و شووت کرد و گوتی:

کەپۆی دەشکێ و لە فڕە دەکەوێ
کەسێ بیهەوێ لە قەلام سەر کەوێ

که گــوررزم ڕادەوەشـــێـنـم بە جــاریٚ
ســـەگ و گورگ و نەیـارم گشـــت دەتـاریٚ
ســـەخــتە دارم، کــاری ئــاســـن دەکــا
گــورمــی چـێـوم شـــێـر لە خـۆڵ وەردەدا

"شۆڕەسوارێکی فەرەنگی کە هێشتا خەتی نەدابوو، بە ئەسپەوە هاتە گۆڕەپان و شەڕ و لێکدان دەستی پێکرد. وا بوو فەرەنگییەکە بە ڕمبێک سوارەکەی شەرکانی بەر داوە. خێرا گەیشتە سەری و قۆڵبەستی کرد و بە دیلی گرت. فەرەنگییەکان دەستیان کرد بە شادمانی و شــەرکەرێکی دیکەیان نارد. لە موســوڵمانەکانیش یەکی دیکەیان چووە بەرەوە. ماوەیەک لێکیان دا و ئاخری فەرەنگییەکە ئەوی خستە خواریٚ و دەستی بەست و بە دیلی گرتی.

"ئاوا بەردەوام یەکیەک لە موســوڵمانەکان دەچوونە شـــەڕ و فەرەنگییەکان بە دیلیان دەگرتن. هەتا بوو بە شەو و وڵات تاریک داهات. ئەو ڕۆژە بیست کەس لە موسوڵمانەکان بە دیل گیران. شـــەرکان کە ئەوەی دیت، زۆر نیگەران بوو، بە لایەوە کارەســاتێکی گەورە بوو. هەر بۆیە ســوارەکانی کۆ کردنەوە و پێی گوتن: 'بەیانی خۆم دەچمە مەیدان و داوای گەورەکەیان دەکەم تا بێتە مەیدان. لێی دەپرسم بۆ هاتوونە ئێرە و چیان دەویٚ. تۆزێکیشی ترس وەبەر دەنێم، ئەگەر ئاشت بووینەوە ئەوە باشە، دەنا بە شەڕ دێین.' ئیدی هەر لەویٚ نووستن. کە ڕۆژ بووەوە، هەردوو لا سوار بوون و ڕیز بوون. شەرکان چووە گۆڕەپانی شەڕ و گوتی:

مــن ئەو پــیــاوەم بەهــێــزە شـــــان و بــاهــۆم
بە هــێــزی بــازوو دەشـــکـێـنـم دژی خــۆم
بــریــنــی تـــیٚ دەکەم وەک زاری ئەشـــــکەوت
لە ســـیـنـگـی ئەو کەســـەی بــڵــیٚ دژمــنــی تــۆم

"سپاسالاری فەرەنگیانیش هاتە شەرەجەنگی شەرکان و کەمێکی خۆ ڕانا و گوتی:

ئــازایــی و نەتــرســـــی مــن وێــردی زارە
شـــەو و ڕۆژ دژمــنــی مــن بــیٚ قەرارە
بە نــهــێــنــیــش پــیــلانــێــک دارژابــیٚ
تــرســـــم نــیــیە هــێــزی مــن لە پــێــوارە

"کە خۆ ڕانانەکە تەواو بوو، شەرکان بە تووڕەییەوە هێرشی کردە سەری و ئەویش بۆ

شەرکان هات و ئاوقای یەک بوون. دەستیان کرد بە شەڕ هەتا شەو داهات و هەردووک ماندوو و شەکەت گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان. شەرکان بە سوارەکانی خۆی گوت: 'هەتا ئێستا مرۆڤی ئەوەندە ئازا و بەجەرگ و چالاکم نەدیوە. بەڵام ئەو تایبەتمەندییەکی هەیە. کاتێک بەسەر دژمنەکەیدا زاڵ دەبێ و دەرفەتی ڕم هاویشتنی هەبێ، ڕمبەکەی لە دەستیدا دەسووڕێنێ و بە قوونەکەی لێی دەدا. ئیدی نازانم لەگەڵ ئەوە بە کوێ دەگەین.' ئەوجا شەرکان خەوت. کە ڕۆژ بووەوە، سەرۆکی فەرەنگییەکان هاتە گۆڕەپان و ڕاوەستا و شەرکان بۆی ڕۆیشت، هەتا شەو یەکتریان هێنا و برد. دوای گەڕانەوە قۆناغەکەی خۆیان. هەرکەسەی لە شوێنی خۆیدا ڕۆژی کردەوە و بەیانی سوار بوون و هێرشیان بۆ یەک کردەوە هەتا نیوەڕۆ شەڕیان کرد، نیوەڕۆ فەرەنگی بە فێڵێک لغاوی ئەسپەکەی شەرکانی گرت. بەختی خۆی لەو دەمەدا ئەسپەکەی سەرسمێکی دا و فەرەنگی کەوت. شەرکان گەیشتە سەری و شیری داهێنایەوە بیکوژێ. فەرەنگی بە سەر شەرکاندا گوڕاندی و گوتی: 'کاتێک ژنان دەکەون، بۆ پاڵەوانان جوان نییە ئاوا لەگەڵیان بجووڵێنەوە.' شەرکان کە ئەوەی بیست و جوان تێی ڕاما، ناسییەوە کە شازادە ئەبریزە.

"ئیدی شیرەکەی فڕێ دا و کڕنۆشی برد و بە شازادەی گوت: 'ئەی ئەوە بۆ لەو دەمەوە شەڕم لەگەڵ دەکەی؟' شازادە گوتی: 'دەمەویست تۆ تاقی کەمەوە. بزانم لە گۆڕەپانی شەڕدا چەندە خۆڕاگری. ئەو سوارانەی تۆ دەیانبینی، هەموویان کەنیزەکانی منن کە بەسەر سوارەکانی تودا زاڵ بوون و ئەگەر ئەسپەکەم سەرسمی نەدەدا، ئەو دەم ئازایەتی منت بۆ ڕوون دەبووەوە.' شەرکان بزەیەکی بە قسەیەی هاتێ و گوتی: 'سپاس بۆ خودا کە گەورەیی گەیشتن بە تۆی بە قسمەت کردم.'

تیشکێک هات لە درزی بەختەوە
ماڵی دڵمی ڕووناک کردەوە

"ئیدی شازادە هەرای کەنیزەکانی کرد: 'ساز بن، دەڕۆین.' کەنیزەکان کڕنۆشی بەڵێیان برد. شەرکانیش هەرای سوارەکانی خۆی کرد: 'ئامادە بن، دەڕۆین.' ئیدی هەموویان پێکەوە وەڕێ کەوتن. شەش ڕۆژ بە ڕێوە بوون. ئینجا شەرکان بە شازادە و کەنیزەکانی گوت: 'جلکی فەرەنگی داکەنن.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پەنجا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شـەرکان بەوانی گوت: 'جلکی فەرەنگییان داکەنن و جلکی رۆمییان بکەنە بەرتان.' ئەوانیش وایان کرد. دوایی شـەرکان کۆمەڵێک لە سـوارەکانی نارد بۆ بەغدا هەتا هەواڵ بۆ نوعمانپاشـا بەرن کە ئەوە شـەرکان لەگەڵ شـازادە ئەبریز هاتنەوە هەتا خەڵکی شار و سپا بە پێشوازییانەوە بچن. سوارەکان رۆیشتن و شەرکان و شازادە هەر ئەوێ دابەزین و بار و بنەیان خست و شەویان لەوێ بەسەر برد. بەیانی هەستان و بەرەو شـار کەوتنە رێ. لە ناکاو وەزیر دەندان بە هەزار سـوارەوە وەدەر کەوت، کە بە فەرمانی نوعمانپاشـا بۆ پێشـوازی هەردوو شـازادە هاتبوون. کە نزیک بوونەوە، هەموو دابەزین و کرنۆشیان برد و بە یارمەتی شـازادە سـوار بوونەوە، وەرێ کەوتن هەتا گەیشـتنە بەغدا و چوونە ناو کۆشکی نوعمانپاشاوە. شازادە شەرکان یەکسەر چووە خزمەت بابی و سەری رێز و حورمەتی دانەواند و کرنۆشی برد. پاشا لە پاوەشی گرت و بەخێرهاتنەوەی لێ کرد و گوتی: 'چیت کردووە و چۆنت بۆ گوزەراوە، بۆم بگێرەوە.' شازادە تەواوی رووداوەکانی هەر لە رۆژی یەکەمی گەشـــتەکەوە هەتا هاتنەوەماڵییان بۆ گێراوە. کاتێک نوعمانپاشـــا پەسـن و سـتایشـی شـازادە خاتوونیان بۆ کرد و باسـی تایبەتمەندییە چاکەکانی ئەوی بۆ کرا، پلە و پایەی شـازادە خاتوون لە لای ئەو چووە سـەرێ، ویسـتی چاوی پێی بکەوێ و گوتی: 'شازادە خاتوون بێنن.' شەرکان چووە لای شازادە و گوتی: 'پاشا دەیەوێ بتبینێ.' شـازادە خانم بە قسـەی کرد و هەسـتا چووە لای نوعمانپاشـا. پاشـا لەسـەر تەختەکەی دانیشتبوو. ئەوانەی لەوێ بوون جگە لە نۆکەر سەرماڵەکان، ئەوانی دیکەیانی دەرکردن.

"کە شـازادە ئەبریز هات. سـەری رێزی دانەواند و کرنۆشـی برد. بە زمانێکی پاراو و رەوان و ئاهەنگینەوە قسـەی کرد. پاشـا سـەری لە زمانپاراوی و زمانشـیرنییەکەی سـوور ما، سپاسی ئەو چاکانەی کرد کە لەگەڵ شەرکانی کردبوو. دەستخۆشی لێ کرد و مۆڵەتی دا دانیشێ. شـازادە دانیشـت و رووپۆشـی لەسـەر رووی خۆرئاسـای لا دا. جوان و دەلالی ئەو بە جۆرێک بوو وەک شاعیر لە شێعرێکیدا دەڵێ:

دەڵـێـی شــیـلانە کەزیە و بســکەکەی
بـزەی هەســتبـزوێـن، پـێـوقەدەم بەفەر
لــوولــی بســکەکەی راوگەی دڵانە
بە داویــیەوە بــوون هەزاران نەفەر

"نوعمانپاشـــا هەر کە چاوی پێی کەوت، عەقڵ لەســەری پەری و لە خۆی نزیکتر

کردەوە، کۆشکێکی تایبەتی بۆ ئەو و کەنیزەکانی تەرخان کرد. دوای ئەوە کەوتە پێوشوێنی سێ گەوهەرە گرانباییی یەکە. شازادە گوتی ئەوان لە لای منن. ئینجا سەری قوتووەکەی هەڵگرت و سێ گەوهەری گرانباییی هێنا دەرێ و بە دیاری دانی بە نوعمانپاشای. لە لای پاشا هاتە دەرێ. بەڵام پاشا دڵی چووبووە سەری.

"دوای ئەوە نوعمانپاشا شازادە شەرکانی بانگ کرد و یەکێک لە سێ گەوهەرەکەی دایە. شەرکان گوتی: 'ئەی دوو گەوهەرەکەی دیکە؟' پاشا گوتی: 'یەکیان بۆ'زەوئولمەکان'ی برات و ئەوی دیکە بۆ'نوزهەتوززەمان'ـی خوشکت.' کە شەرکان بیستی برایەکی بە ناوی زەوئولمەکان هەیە، ڕووی لە بابی کرد و گوتی: 'ئەی پاشای جیهان! ئەتۆ بێجگە لە من کوڕێکی دیکەشت هەیە؟' پاشا گوتی: 'بەڵێ، هەمە و ئێستا شەشساڵانە. ناوی زەوئولمەکانە و برای نوزهەتوززەمانە، دوانەن و بە زگێک بوون.' شازادە شەرکان ئەو هەواڵەی زۆر پێ ناخۆش بوو، بەڵام وەسەر خۆی نەهێنا. گەوهەرەکەی داناوە و لە لای بابی هەستا و لە بەر نارەحەتیان سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت هەتا گەیشتە کۆشکی شازادە ئەبریزە.

"شازادە کە ئەوی دیت، هەستا و بەخێرهاتنی کرد. نزای خێری بۆ ئەویش بۆ بابیشی کرد. پاشان دانیشت و شازادەشی لە لای خۆی دانا. شازادە زانی کە شەرکان تووڕەیە. هۆکارەکەی لێ پرسی. ئەویش پێی گوت، گوتی کە نوعمانپاشا لە سەفییە کوڕێک و کچێکی هەیە بە ناوەکانی زەوئولمەکان و نوزهەتوززەمان. دیسان گوتی کە لەو سێ گەوهەرە یەکیانی داوە بە کوڕەکە و یەکیان بە کچەکە و یەکیشانی بۆ من داناوە. تا ئێستا من بە بوونی زەوئولمەکانم نەزانیوە و دەشترسم ئەتۆش لە خۆی مارە بکا. ئەمن هەست بەو تەماعە دەکەم.

"شازادە خاتوون گوتی: 'شازادە، بابت حەقی بەسەر منەوە نییە و لەژێر فەرمانی ئەودا نیم. ناتوانێ بێ ئەوەی خۆم پێم خۆش بێ، مارەم بکا. ئەگەر بیەوێ بە زۆر بیکا، ئەوە خۆم دەکوژم.' بەڵام لەوە دەترسم کە بابم بزانێ هاتوومە ئێرە و، لەگەڵ ئافریدوونپاشا ڕێک کەون و بە سوپایەکی زۆر و زەوەندەوە بێنە ئێرە.' شەرکان گوتی: 'خانمەکەم، ئەگەر ئەتۆ بێرە ڕازی بی و بمێنییەوە، هیچ گرنگ نییە با بێن. ئەگەر سوپای تەواوی دنیا لەگەڵمان بە شەڕ بێ، بەسەریاندا زاڵ دەبین.' شازادە گوتی: 'هەر شتێک بێتە پێشێ، باشە. بەڵام بەو مەرجە لێرە دەمێنمەوە کە ئێوە لەگەڵم باش بن، ئەگینا دەڕۆم.' دوای ئەوە شازادە بە کەنیزەکانی گوت: 'خواردن بێنن.' شەرکان کەمێکی خوارد و بە دڵێکی خەمبارەوە چووەوە ماڵەکەی خۆی.

"نوعمانپاشایش کاتێک شەرکان لە لای ڕۆیشت، ئەویش هەستا چوو بۆ لای سەفییەی کچی ئافریدوونپاشا و گەوهەرەکانیشی لەگەڵ خۆی برد. سەفییە کە پاشای دیت، لە بەری

هەستا و کڕنۆشی برد. پاشا دانیشت. زەوئولمەکان و نوزهەتوززەمان هاتنە لای. پاشا ماچی کردن و لە لای خۆی داینان و هەریەکەی گەوهەرێکی بە قۆڵیانەوە کرد. ئەوان خۆشحاڵ بوون و چوونەوە لای دایکیان. سەفییەش بەو دلاواییەی پاشا خۆشحاڵ بوو، نزای خێری بۆ کرد. ئیدی پاشا بە سەفییەی گوت: 'تۆ کە کچی ئافریدوونپاشا بووی، بۆ دەنگت نەکردووە هەتا پلەت بەرمە سەرێ و ڕێزی شیاوت لێ بگرم؟' سەفییە گوتی: 'جا لەوە زیاتر چیم دەوێ؟ ئێستاش گەورەیی و چاکەی ئێوە منی گرتووەتەوە و ئەوە خودا کوڕێک و کچێکی لە پاشا پێ بەخشیوم.'

"پاشا قسەکانی ئەوی زۆر پێ جوان و پەسەند بوو. ئیدی هاتە دەرێ و کۆشکێکی بەرزتر و بەرینتری بۆ سەفییە تەرخان کرد. خزمەتکاری بۆ دانا و زانای بۆ پەروەردەی منداڵەکانی دانا و مووچەشی بۆ زیاد کردن. بەڵام نوعمانپاشا دڵیشی هەر لە لای شازادە ئەبریز بوو. هەمیشە ئەوی لە خەیاڵدا بوو، هەموو شەوێ دەچوو بۆ لای قسەی لەگەڵ دەکرد و لە زۆر بارەوە دەدوان. لەناو قسەکانیدا ئاماژەیەکیشی بە مەبەستەکەی دەکرد. بەڵام شازادە وەڵامی نەدەداوە. بگرە دەشی گوت: 'پاشای جیهان، من پێویستیم بە پیاو نییە.' کاتێک نوعمانپاشا ئەو بەربەرەکانی و ملبادانەی ئەوی دەدی، ئەوەندەی دیکەی خۆشدەویست و لە بەر دڵی شیرینتر دەبوو. ناچار وەزیر دەندانی بانگ کرد و لە مەبەستەکەی ئاگاداری کردەوە. وەزیر دەندان گوتی: 'کە بوو بە شەو، کەمێک بەنگ هەڵگرە و بچۆ بۆ لای شازادە. پێکەوە مەی بخۆنەوە، لە کۆتای دا کەمێک بەنگی بۆ بکە مەیەکەیە و بیدەیە. هەر کە ئەوە بخواتەوە، بەنگەکە کاری تێ دەکا و بێهۆش دەبێ و ئاواتی پاشا دێتە دی.' پاشا پێشنیارەکەی وەزیری پێ باش بوو. لەتێکی بەنگ لە ئەنبار هێنا کە ئەگەر فیل بۆنی پێوە کردبا، هەتا ساڵێک مەست دەبوو. ئیدی ئەو بەنگەی لە گیرفانی خست. کە شەو کەمێک درەنگ بوو، هەستا چووە لای شازادە. ئەویش هەستا و کڕنۆشی بۆ برد. پاشا دانیشت و شازادەیشی لە لای خۆی دانیشاند. هەر جارەی باسی شتێکی دێنا گۆڕێ. هەتا داوای بادەی کرد. بادە و مەزە دابین کرا، سفرە ڕاخرا و دەفر ڕیز کرا و مۆم هەڵکرا. نوقڵ و میوە داندران. نوعمانپاشا لەگەڵ شازادە دەستیان کرد بە بادەنۆشی و هاونشینی هەتا سەیری کرد خەریکە شازادە مەست دەبێ. بەنگەکەی دەرهێنا و کردییە پیاڵەکەیەوە بە جۆرێک کە شازادە ئاگای لێ نەبوو. پیاڵەکەی داێ و ئەویش لێی وەرگرت و خواردییەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو کە بەنگەکە کار تێ کرد و هۆشی لە خۆی نەما. پاشا هەر ئەوەندەی زانی شازادە بە پشتدا کەوت و جلەکانی بەو لاو لادا بڵاو بوونەوە. پاشا خۆی پێ ڕانەگیرا لەبەری نیشت و کردی بە ژن. پاشان هەستا بەجێی هێشت.

"کەنیزێکی لە کەنیزەکان ناردە لای کە ناوی مەرجانە بوو. مەرجانە کە هاتە لای شازادە، سەیری کرد ئەوە بە پشتدا کەوتووە و خوێنی لە بەر دەڕوا. مەرجانە پەڕۆیەکی

هێنا و خوێنەکەی بۆ سڕی. کە ڕۆژ بووەوە، مەرجانە هەستا و دەست و قاچ و دەموچاوی شازادەی شوشت و پاشان بە گوڵاو و دەموچاوی شازادەی بۆنخۆش کرد. شازادە پژمی و پاشان ڕشایەوە و لەتە بەنگێکی هێناوە. وردەوردە وە هۆش هاتەوە و بە مەرجانەی گوت: 'پێم بڵێ چی بووە؟' مەرجانە گوتی: 'نازانم، نوعمانپاشا منی ناردە لای تۆ. کە هاتم بە پشتدا کەوتبووی و هەموو لاقولەتەرت خوێن بوو.' شازادە زانی کە نوعمانپاشا هاتووەتە جەستەی. ئیتر مات و مەلوول بوو، بە کەنیزەکانی گوت: 'هەر کەس ویستی بێ بۆ لام، بڵێن نەخۆشە.' پاشا هەموو ڕۆژێک شەربەت و دەرمانی و گیراوە و شتی بۆ دەنارد. هەتا چەند مانگ شازادە لە کونجێکدا خۆی لە خەڵک شاردەوە و دوورەپەرێز بوو. پاشایش ئاوری هەوەسی دامرکابوو، شازادەی لە بیر چووبووەوە. و بوو دیاردەی دووگیانبوون لە شازادەدا سەری هەڵدا. لە هیچ کوێ جێی نەدەبووەوە. مەرجانەی کەنیزی بانگ کرد و گوتی: 'مەرجانە، مریشک بۆخۆی خۆڵ وەسەر خۆی نەک بە کەس وەسەری ناکرێ. ئەوەی بەسەرم هاتووە، هەمووی تاوانی خۆمە کەس تاوانبار نییە. لە دایک و باب و شار و وڵاتی خۆم دوور کەوتمەوە. ئێستا هێز و توانام لێ براوە و ناتوانم سواری ئەسپیش بم. ئەگەر ئەمن لێرە منداڵم بێ، هەموو کەس سەرکۆنەم دەکا. کەنیزەکانیش هەموو زانیوانە کە پاشا هاتووەتە جەستەم و کردوومی بە ژن. ئەگەر بمهەوێ بگەڕێمەوە لای بابم، چۆن لە ڕووم بێ؟!' مەرجانە گوتی: 'فەرمان بە تۆیە، چۆن دەفەرمووی لە خزمەتتدام.' مەلەکە گوتی: 'دەمهەوێ بە نهێنی لێرە بچمە دەرێ و جگە لە تۆ کەس نەزانێ. کارە و هاتووە، دەچمەوە لای بابم.' مەرجانە گوتی: 'فکری چاکە.'

"وا بوو خۆی بۆ سەفەر ساز کرد و شتەکەشی لە لای کەس باس نەکرد. هەتا ڕۆژێک پاشا چوو بۆ ڕاو و شەرکانیش چووبوو بۆ سەر سنوور بڕیار بوو بۆ ماوەیەک لەوێ بمێنێتەوە. شازادە بە مەرجانی گوت: 'ئەوشەو دەمهەوێ بڕۆمە دەرێ، بەڵام چ لە چارەنووس بکەم کە کاتی منداڵبوون نزیکە؟ ئەگەر ماوەی چوار ڕۆژ لێرە بمێنمەوە و منداڵەکەم ببێ، ئەوە ناتوانم بڕۆم.' ئیدی ماوەیەک بیری کردەوە و بە مەرجانەی گوت: 'پیاوێک پەیدا بکە لەگەڵمان بێ. ئاگای لێمان بێ و کارەکانمان بۆ بکا.' مەرجانە گوتی: 'خانم بە خودا جگە لە کۆیلەیەکی ڕەش، بە ناوی غەزبان، کەس ناناسم. ئەویش کۆیلەی نوعمانپاشاە و دەرکەوانی ئەو کۆشکەی ئێمەیە. ئەمن ئێستا دەچمە دەرێ و قسەی لەگەڵ دەکەم و بەڵێنی ماڵی دەدەمێ و پێی دەڵێم ئەگەر لەگەڵمان بمێنێتەوە، کام کەنیزی بوێ لێی مارە دەکەین.' شازادە گوتی: 'بچۆ بیهێنە ئێرە با قسەی لەگەڵ بکەم.' مەرجانە چوو غەزبانی هێنا. غەزبان هات و کڕنۆشی برد.

"شازادە کە چاوی بە غەزبان کەوت، خۆشی نەویست و دڵی لێی ترسا. ناچار بوو پێشی گوت: 'غەزبان، دەتوانی لە کارەساتەکاندا یارمەتیدەرمان بی و ئەگەر نهێنی خۆمت

پێ بڵێم، لای کەس باســـی نەکەی؟' غوڵامەکە کە چاوی لێ کرد و ئەو هەمووە جوانییەی دیت، دڵی گرتی و گوتی: 'خانم، چی بفەرمووی سەرپێچی ناکەم.' شازادە گوتی: 'دەمهەوێ هەر ئێستا دوو ئەسپ لە ئەسپەکانی پاشام بۆ بێنی؛ یەک بۆ خۆم، یەک بۆ مەرجانە. هەر ئەسپەی خورجێنێکی بەسەردا دە و خورجێنەکان پڕ کە لە زێڕ و گەوهەر و ئێمە بەرە بۆ وڵاتی بابم—حەردووبپاشا. لەوێ ئێمە لە ماڵی دنیا بێنیازت دەکەین.

"غەزبان کە ئەوەی بیســـت، خۆشـــحاڵ بوو و گوتی: 'بە گیان و دڵ لە خزمەتتاندام.' گورج غوڵام ڕۆیشت و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بە ئاواتی خۆم گەیشتم. ئەگەر ئەوان وەڵامم نەدەنەوە، هەردووکیان دەکوژم و زێڕ و شتەکە دەبەم و دەڕۆم.'

"ماوەیەکی پێ چوو هاتەوە و ســێ ئەســپی هێنابوو. شــازادە ســواری ئەســپ بوو، هەرچەند لەبەر دووگیانییەکەی زۆریش ناڕەحەت بوو. مەرجانەش ســواری ئەســپێک و غوڵامەش سواری ئەسپێک. ئیدی وەڕێ کەوتن. شەو و ڕۆژ ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە نێوان دوو کێو کە لەوێڕا هەتا وڵاتەکەی خۆیان ڕێگای ڕۆژێکی تەواوی نەمابوو. شــازادە ئەبریز ئەوێ ژانی دەهاتێ و نەیدەتوانی لەســـەر ئەســـپەکە ڕاوەســـتێ. ئەوە بوو بە غەزبان و مەرجانەی گوت: 'ڕاوەستن، ژانم دێتێ و کاتی بوونییەتی.' ئەوان دابەزین و شــازادەشیان لەســـەر ئەســـپەکە داگرت. شــازادە لە تاو ئێشــی لەڕادەبەدەر ئاگای لە دنیا نەمابوو. لەو جەنگەیەدا کۆیلەکە هەڵیکێشا شیر و چووە سەر سەری شازادە و گوتی: 'خانم، دەستم لەگەڵ تێکەڵ دەکەی یان بتکوژم.' شازادە کە ئەو قسەیەی بیست، چاوێکی لێ کرد و گوتی: 'ئەمن شام بە سەپان نەدەگرت، ئێستا کۆیلە دەڵێ وەرە بەر نیرم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شازادە بە غەزبانی گوت: 'غەزبان، ئەوە وام لێهات ئەتۆ ئاوا قسە لەگەڵ من بکەیت و بە نیازی جووتبوون بی لەگەڵم؟' ئیدی شازادە بە گریانەوە گوتی: 'حەرامزادەی لە قەحبەبووا تۆ وا دەزانی خەڵک هەموو لە قوماشێکن؟' کە کۆیلە دل و ڕووڕەشەکە ئەو قسانەی بیست، تووڕە بوو شیرێکی لە شازادە دا و کوشتی، ئیدی خورجینە زێڕەکەی هەڵگرت و هەڵات و شازادە ئەبریز لەسەر زەوی کەوت.

"مەرجانە کوڕە تازەبووەکەی شازادەی بردە ئەولاوە و لەسەر شازادە دەستی بە گریان کرد، هەتا لەپڕدا دیتی تۆزێک بەری ئاسمانی گرت. کە هاتنە پێشی و تۆزەکە نیشتەوە، سوپایەکی زۆر زەبەلاحی ڕۆمیان وەدەر کەوت کە سوپای حەردووبپاشای بابی شازادە ئەبریز بوو. حەردووبپاشا کە بیستبوویەوە کچەکەی لەگەڵ کەنیزان چووە بۆ بەغدا و لەوێ لە لای نوعمانپاشاه، سوپایەکی هەڵگرتبوو هاتبووە دەرێ. کە گەیشتنە ئێرە، شازادە ئەبریزیان دی لە خاک و خۆڵ گەوزاوە و مەرجانەی کەنیزی لەسەری دەگری. حەردووبپاشا لەسەر ئەسپەکەی خۆی فڕێ دا خوارێ و بێهۆش بوو. سوارەکانیش دابەزین و دەستیان کرد بە شین و گریان. کە پاشا وە هۆش هاتەوە، چۆنیەتی ڕووداوەکەی لە مەرجانە پرسی. مەرجانە ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. پاشا حەدرووب بە بیستنی ئەو ڕووداوە دەستی کرد بە گریان و دنیا لە بەرچاوی ڕەش و تاریک بوو. ئیدی فەرمانی دا شازادەیان خستە تابووتەوە و گەڕانەوە بۆ قیسارییە و تابووتەکەیان بردەوە کۆشک.

"ئینجا پاشا چووە لای زاتوددەوایی دایکی و هەواڵەکەی بۆ باس کرد کە لەپێشدا نوعمانپاشا بە دەهۆ پەردەی کچێنی لا بردووە و پاشان کۆیلەیەکی ڕەش ئەوی کوشتووە. گوتی: 'بە حەقی مەسیح! یان تۆڵەی ئەو دەسێنمەوە و ئەو پەڵەی نەنگییە لە سەر شانم لا دەبەم، یان ئەوەتا خۆم تێدا دەبەم.' ئینجا دەستی کرد بە گریان و هاتوهاوار.

"زاتوددەوایی گوتی: 'کوشتنی کچەکەت کاری مەرجانە نەبێ، کاری کەس نییە. چونکە مەرجانە ناخۆشی دەویست.' دوایە زاتوددەوایی بە کوڕەکەی گوت: 'پەرۆش و ماتەمبار مەبە کە بە حەقی مەسیح ئەمن لە لای نوعمانپاشا نەگڕێمەوە هەتا ئەو و کوڕەکانی نەکوژم و کارێک نەکەم لە هەموو شارەکان دەنگ بداتەوە. بەڵام دەبێ بە قسەی من بکەی و جێبەجێی بکەی.' حەردووبپاشا بە دایکی گوت: 'بە خەزرەتی مەسیح! هێندەی تاڵەموویەک دژایەتی ناکەم.'

"زاتوددەواییگوتی: 'چەند کیژی تازەپێگەیشتووی جوان و دەلال و چەند مامۆستای زان

بینه و ماڵ و پارەیەکی باش بدە بە مامۆستاکان هەتا زانست و وێژە و شێعر و هەڵسوکەوت لەگەڵ پاشا و خانەدانانیان فێر کەن. بەڵام با مامۆستاکان لە موسوڵمانان بن هەتا چیرۆک و بەسەرهاتی عەرەب و خەلیفەکان و بەسەرهاتی پاشاکانی ئیسلامیان فێر کەن. کاتێک کچەکان هەموو شتێک فێر بوون، ئەو دەم بەسەر دژمندا زاڵ دەبین و تۆڵەیان لێ دەکەینەوە. نوعمانپاشا هۆگرییەکی سەیری بە کچانە. ئەو خۆی سێسەد و شەست کەنیزی هەبوو و سەد کەنیزی ڕووماتگی کەنیزەکانی شازادە ئەبریزیشی لە لایە. ئەگەر ئەو کچانە فێری ئەو زانستانە بن، ئەمن ئەو کچانە هەڵدەگرم و دەچم بۆ بەغدا.'

"کاتێک حەردووبپاشا ئەو بیرۆکەیەی لە زاتوددەوایی بیست، خۆشحاڵ بوو. لەڕێوە پیاوی نارد بۆ وڵاتانی دوور و نیزیک لە هەر کوێ زانا و مامۆستایەکی پێ شک هات، کۆی کردنەوە و بەڵێنی ماڵی زۆر و خواردەمەنی و جلوبەرگی پێدان. کچەکانیشی کۆ کردنەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پەنجا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، حەردووبپاشـــا گفتی ماڵی زۆری بە زانا و مامۆســـتاکان دا و کچەکانیشی بەوان سپارد و گوتی: 'زانست و وێژە و شێعر و مێژوو فێری کچەکان بکەن.' مامۆستاکان قەبووڵیان کرد و بەڵێنیان دا. ئەوە پاشا حەدرووب لێرەدا بەجێ دێڵین.

"نوعمانپاشـــا کاتێک لە ڕاو گەڕاوە، شـــازادە ئەبریزی لە کۆشـــک نەدی. بۆی گەڕا و پرسیاری کرد. هیچ هەواڵێکی نەبوو. زۆری پێ ناخۆش بوو. گوتی: 'چۆن کچێک لە کۆشک چووەتە دەرێ و کەس نەیزانیوە؟ ئەگەر وڵاتی من ئاوا بێ، دەســـەڵاتدارییەکەی من دەبێتە هیچ.' ئیدی لە تاوی شـــــازادە مات و مەلوول بوو، هەتا وا بوو شـــــەرکانیش هاتەوە. نوعمانپاشـــا شـــتەکەی بۆ شـــەرکان گێڕاوە و ئاگاداری کردەوە. شـــەرکان کەوتە دەریای خەمی شازادەوە و شەو و ڕۆژ لە تاوانی دەگریا.

"بەڵام نوعمانپاشا دوای چەند ڕۆژ شازادەی لە بیر چووەوە و دەستی کرد، چاوەدێری زەوئولمەکان و نوزهەتوززەمان، مامۆستای زانا و تێگەیشتووی بۆ گرتن هەتا ڕایانبێنێ و پەروەردەیان بکا. شەرکان بەو کارەی بابی تووڕە بوو، ئیرەیی بە خوشک و براکەی دەبرد و تا ئەو ڕادەیەی نەخۆش کەوت. ڕۆژێک نوعمانپاشا بە شەرکانی گوت: 'ئەوە بۆ هەر کز و ڕەنگزەرد و لاواز دەبی؟' شـــەرکان گوتی: 'بابە هەر کاتێک دەبینم ئەتۆ ئەو هەمووە لە خەمی منداڵەکانی سەفییە دای، ئەمن ئیرەییان پێ دەبەم. دەترسم ڕۆژێک بیانکوژم و ئەتۆش لە تۆڵەی ئەوان من بکوژی، هەر بۆیە هەمیشـــە بیر لەوە دەکەمەوە و ناڕەحەت دەبم. تکات لێ دەکەم شـــارێک بخە ژێر دەســـەڵاتی منەوە و بۆ خۆم بچم لەوێ بژیم.' کە نوعمانپاشـــا ئەو قســـەیەی بیســـت، زانی کوێی دێشـــێ، دڵخۆشـــی داوە و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، هەرچی تۆ بڵێی وا دەکەم و ئێســـتاش لە وڵاتی مندا هیچ جێیەک لە قەڵای دیمشـــق قایمتر نییە.' ئیدی نووسەرەکانیان بانگ کرد و دەستوور و یاسای ئەوێیان نووسی.

"شـــــازادە بەرەو دیمشـــــق کەوتە ڕێ و وەزیر دەندانیشـــــی لەگەڵ خۆی برد. ئیدی خوداحافیزیان لە بابی کرد و ڕۆیشـــتن هەتا گەیشـــتنە دیمشـــق. خەڵکی بە پێشـــوازییانەوە هاتن و دەهۆڵ و زوورنا لێ درا و شـــــار ڕازاندرایەوە و شـــــایی و هەڵپەڕکێ کرا هەتا شەرکان هاتە نێو شارەوە و گەیشتە بارەگاکەی خۆی.

"کە نوعمانپاشا کوڕەکەی بەڕێ کرد. مامۆستا و زانایان هاتنە لای، گوتیان منداڵەکان لە هەموو زانستێکدا شارەزا بوون. پاشا بەو هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوو، ماڵ و خەڵاتێکی زۆری دا بە مامۆســـــتا و زاناکان. ســـــەیری کرد زەوئولمەکان گەورە بووە و بووەتە چواردەساڵان و حەزی لە خواپەرستییە و تەمای دەستگیرۆیی هەژارانی هەیە و گرنگی بە

زانســـت دەدا. خەڵكی بەغدا ئەویان زۆر خۆش دەوێ. بە كورتی ئاوا بوو. هەتا ڕۆژێك لە بەغدا كاروانی عێراق بۆ ســــەردانی مەككەی پیرۆز و مەدینەی مونەووەرە ســـــاز بوو. زەوئولمەكان كە كاروانی حاجیانی دیت، حەزی چوونە ماڵی خودای بزووت. هەر بۆیە چوو بۆ لای بابی تا داوای لێ بكا ڕێی بدا ئەویش بچێ. نوعمانپاشـــا نەیهێشــت و گوتی: 'ڕاوەستە، ساڵێكی دیكە من خۆم دەچم و تۆش لەگەڵ خۆم دەبەم.'

"زەوئولمەكان كە زانی بەڵێنەكەی بابی زۆر دەخایەنێ، چوو بۆ لای نوزهەتوززەمانی خوشكی. دیتی خەریكە نوێژ دەكات. كە نوێژەكەی تەواو بوو، زەوئولمەكان پێی گوت: 'پێم خۆشە بچم بۆ سەردانی مەككە و گۆڕی پێغەمبەر، [درودی خوای لێ بێ.] چووم مۆڵەت لە بابم وەرگرم، كەچی مۆڵەتی نەدام. دەمەوێ كەمێك زێڕ و گەوهەر و شــت لەگەڵ خۆم هەڵگرم و بێ ئەوەی بهێڵم كەس بزانێ، بچم بۆ حەج.' نوزهەتوززەمـان لە بەری پاڕاوە، گوتی: 'منیش لەگەڵ خۆت بەرە و لەو خێر و ڕەحمەتە بێبەشـــم مەكە.' زەوئولمەكان پێی گوت: 'كە بوو بە شەو و وڵات تاریك داهات، لێرە وەرە دەرێ و مەهێڵە كەس بزانێ.'

"كە بوو بە نیوەشـــەو، نوزهەتوززەمان هەســتا و كەمێكی ماڵ لەگەڵ خۆی هەڵگرت و جلوبەرگی پیاوانەی كردە بەری و چوو بۆ لای دەركی كۆشـــك. ســـــەیری كرد ئەوە زەوئولمەكان دوو وشتری ئامادە كردووە و چاوەڕێیەتی. هەردووكیان سوار بوون و بەو شـــەوە كەوتنەڕێ. ڕۆیشــتن هەتا گەیشــتنە حاجییەكان. ئەوانیش چوونە ڕیزی كاروانی عێراقەوە. شـــەو و ڕۆژ ڕۆیشــتن هەتا گەیشــتنە مەككەی پیرۆز و چوونە نێو شـــار و حەجەكەیان كرد، پاشـــان چوون بۆ ســـــەردانی گۆڕی پێغەمبەر [درودی خوای لێ بێ.] حاجییەكان ویستیان بگەڕێنەوە. زەوئولمەكان بە نوزهەتوززەمانی گوت: 'پێم خۆشە بچمە بەیتولموقەددەس و ســـەردانی ئیبراهیمی خەلیلیش بكەم.' نوزهەتوززەمانیش گوتی: 'منیش لە تۆم پێ خۆشترە.' ئیدی چوارپێیان بە كرێ گرت و بەرەو بەیتولموقەددەس كەوتنە ڕێ. بەڵام نوزهەتوززەمـان ئەو شـــــەوە تای گرت، زوو بەری دا و چاك بووەوە. دوای ئەو زەوئولمەكان نەخۆش كەوت و خوشكی چاودێری دەكرد و بەدەوریدا دەهات و بە قوربان و ســـەدەقەی دەبوو، هەتا بەو حاڵەوە گەیشــتنە بەیتولموقەددەس. نەخۆشـییەكەی پیســتر بوو. چوونە دیوێكی كاروانسەرایەكەوە، ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ نەخۆشییەكەی لێ توندتر دەكرد. نوزهەتوززەمان هەر خزمەتی دەكرد و لەو ماڵەی پێیان بوو خەرجیان دەكرد. هەتا وای لێ هـات تەواو پـارەیـان لێ بڕا. بەشـــێك لە جلەكـانی خۆیـانی دا بە خزمەتكـاری كاروانســـەرانەكە و پێی گوت: 'بچۆ بۆم بفرۆشـــە.' ئەوانەشـــی بۆ فرۆشــت و هاتەوە و پارەكەی دایە و ئەویش بە یەك-دوو ڕۆژ تەواو بوو. ئیدی ئەم جارە هیچ شـــتێك نەما. نوزهەتوززەمـان دەســـتی كرد بە گریـان و پـاڕانەوە لە بەر خودا. زەوئولمەكـان گوتی: 'خوشـــكێ، دەڵێی بەرەو چـابوونەوە دەچم و حەزم لە گۆشـــتی ســـوورەوەكراوە.'

نوزهەتوززەمان گوتی: 'بە خودا لە ڕووم هەڵنایە ســـواڵ بکەم. بەڵام ســـبەی دەچمە ماڵی دەوڵەمەندێک کار دەکەم و شتێک بۆ بەهێزبوونەوەی تۆ پەیدا دەکەم.' زەوئولمەکان گوتی: 'چۆن دڵم نەتۆقێ، دوای ئەو هەمووە گەورەییە ئاوات لێ بێ؟' ئیدی هەر دووکیان دەستیان کرد بە گریان.

"نوزهەتوززەمان گوتی: 'براکەم، لێرە کەس نامانناسێ و غەریبین. ئەوە ساڵێکە لێرەین کەس سەری نەداوین. خۆ ناکرێ لە برسان بمرین. من جگە لەوە هیچ ڕێگایەکی دیکە شک نابەم. کە سبەینێ هەستم، وەدەر کەوم لە دەرگای ماڵە گەورەکان بدەم و داوای کار بکەم. هەتا شـــتێکت بۆ پەیدا کەم، کەمێک هێز بگریتەوە و لەو نەخۆشـــییە ڕزگارت ببێ. دوایی بگەڕێینەوە شاری خۆمان.' ماوەیەکی باش گریان. ئیدی هەستا و بە پەڕۆ کۆن و شت کە ئەو وشـترەوانانە فڕێیان دابوو، سـەروچاوی خۆی داپۆشـی. براکەی لە ئامێز گرت، ماچی کرد و بە گریانەوە لە ماڵ وەدەر کەوت.

"زەوئولمەکان چاوەڕێی خوشـــکەکەی بوو هەتا بوو بە شــــەو، کەچی نوزهەتوززەمان نەهاتەوە. زەوئولمەکان ئەو شــــەوە هەتا بەیان هەر چاوەڕێ بوو، نەهاتەوە. لە تاوی خوشـــکەکەی زۆر ناڕەحەت بوو، زۆریشـــی برســـی بوو. هەر چۆنێک بێ خۆی گەیاندە بەردەرکی دیوەکەی، هەرای کاروانســـەرادارەکەی کرد و گوتی: 'بمبە بۆ بازاڕ.' خاوەنی کاروانسـەرا هەڵیگرت و بردی بۆ بازاڕ. دانیشـتووانی قودس تێی ئاڵان، بۆی گریان و نزای خێریان بۆ کرد. زەوئولمەکان بە ئاماژە تێیگەیاندن کە برسییەتی. بازرگانەکان پارەیان دایە و خواردنیان بۆ کڕی و دایانێ. ئینجا هەڵیانگرت بردیانە دیوێکی چۆڵەوە لەسـەر حەسیرە کۆنێک دایاننا. قاپێکیان ئاو بۆ دانا. کە بوو بە شــــەو، خەڵک دەوریان چۆڵ کرد و هەرکەســـەی چوو بە لای کاری خۆیەوە. لە نیوەشـــەودا کە هەوا ســـاردی کرد، خوشـکی وەبیر هاتەوە و دەســـتی کرد بە گریان و ئەوەندەی دیش لەرزی هاتێ و بێهێز بوو تا بێهۆش بوو.

"بەیانی کە خەڵک دیتیان دۆخی زۆر خراپە، ســـی درەمیان کۆ کردەوە و دایان بە وشـترەوانێک، پێیانگوت: 'ئەو لاوە هەڵگرە و بیبە بۆ نەخۆشـخانەی دیمشـق بەشـکم چاک ببێتەوە.'

"پیاوە وشترەوانەکە کاتێک درەمەکانی وەرگرت، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خۆ ئەوە هێندەی نەماوە بمرێ. باشە چۆنی بگەیەنمە دیمەشق؟' ئیدی بردی لە جێگایەک شاردییەوە. کە بوو بەشـەویش بردی لە توونی گەرماوی هاویشـت و بۆخۆی لێی دا ڕۆیشـت. بەری بەیانی کە توونوان چوو ئـاوری گەرمـاوەکە هەڵکـا، دیتی ئەوە شـــتێک لە توونەکەدایە، کە لێی وردبووەوە دیتی مرۆڤە. لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەو تەرمەیان بۆ لێرە هاویشـتووە؟' کەمی

چووه پێشـــێ و لاقێکی لێ دا. دیتی جوولاوه. بانگی زەوئولمەکانی کرد و گوتی: 'بە خودا ئێوەش بەدبەخت و چارەڕەشن. بۆ نەختە بەنگێک هەموو بەلایەک بەسەر خۆتان دێنن.' کە جوان سـەیری زەوئولمەکانی کرد، دیتی ئەوە مێرمنداڵێکە هێشـتا خەتی نەداوە و لەوپەڕی جوانیدایە. زانی ئەوە نەخۆش و غەوارەیە. بەزەیی پێیدا هات و گوتی: 'خودایە! چۆن خۆم گوناهباری ئەو تفڵەش کرد! پێغەمبەر، [سـلاوی خودای لێ بێ] فەرموویەتی: 'دەبێ ڕێزی غەریب بگیرێ، بە تایبەت نەخۆش.'' ئیدی ئەوی هەڵگرتەوە و بردییەوە ماڵی خۆیان. بە خێزانی گوت: 'جوان پارێزگاری لێ بکە. ژنەکەی هەستا جێ خەوی بۆ ڕاخست و پاڵپشتی بو دانا و بە ئاوی گەرم دەست و لاقی بۆ شۆرد. توونوان چوو بۆ بازاڕ گولاو و شەکری هێنا. شـــەکریان دەرخوارد دا و بە گولاو بۆنخۆشـــیان کرد و جلوبەرگی خاوێنیان کردە بەری. ئیدی هاتەوە سـەر خۆ و پاڵی داوە. توونوان خۆشـحاڵ بوو، گوتی: 'خودایە! تکات ێ دەکەم بۆ خاتری پیاوچاکان ئەو گەنجەی بە دەستی من چاک کەیەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، توونوان گوتی: 'خودایە! تکات لێ دەکەم بۆ خاتری پیاوچاکان ئەو گەنجەی بە دەستی من چاک کەیەوە.' ئیدی هەتا سێ ڕۆژان لە لای زەوئولمەکان دوور نەکەوتەوە. شەکر و ئارەقی بیدمشک و گوڵاوی دەدایە و قسەی خۆشی بۆ دەکرد و دڵخۆشی دەداوە. هەتا شنەی سلامەتی هەڵیکرد و وردەوردە گەشاوە و بووژاوە. چاوی هەڵێنا. کاتێک توونوان هات بۆ لای، دیتی ئەوە دانیشتووە و شوکر باشە. گوتی: 'ڕۆڵە گیان! چۆنی؟' زەوئولمەکان گوتی: 'ئەلحەمدوولیللا شوکر باشم.' توونوان سپاسی خودای کرد و هەستا چوو بۆ بازاڕ دە مریشکی کڕی و هێنایەوە دای بە خێزانی و گوتی: 'هەموو ڕۆژێک دوو مریشکی بۆ سەرببڕە، یەک بۆ فراوێن و یەک بۆ شێو با بیخوا.' ئیدی خێزانی توونوان هەستا و مریشکی کوشتەوە و لە دیزەدا کوڵاندی و دەرخواردی دا. ئاوی گەرم کرد و دەست و قاچی شۆرد. زەوئولمەکان پاڵی بە پاڵپشتییەکەوە دا و خەوی لێ کەوت. دوای نوێژی ئێوارە خەبەری بووەوە. ژنی توونوان مریشکێکی دیکەی بۆ شێو ئامادە کرد و هێنای. زەوئولمەکان خەریک بوو دەیخوارد کە توونوان هاتەوە. سەیری کرد گەنجەکە شت دەخوا. کەیفی ساز بوو، هات لە لای دانیشت و هەواڵی پرسی. زەوئولمەکان گوتی: 'شوکری خودا زۆر باشم، چاک بوومەوە؛ خودا پاداشتی خێرت بداتەوە.' ئیدی توونوان چووە دەرێ و شەربەتی وەنەوشە و گوڵاوی هێنا و دەرخواردی دا. توونوان ڕۆژێ پێنج درەمی پارە لە گەرماو وەردەگرت، درەمێکی دەدا بە شەربەتی وەنەوشە و یەکی دەدا بە شەکر و گوڵاو. بەردەوام دڵخۆشی دەداوە و گاڵتە و جەفەنگی لەگەڵ دەکرد. هەتا مانگێک تێپەڕی و تەواو شوێنەواری نەخۆشی لە لەشیدا نەما و چاک بووەوە. توونوان و ژنەکەی خۆشحاڵ بوون. پاشان توونوان بردی بۆ گەرماو و خۆیشی چوو بۆ بازاڕ گەڵای دارکوناری کڕی و بردی بۆ زەوئولمەکان. زەوئولمەکان خۆی جوان بە گەڵای کونار شوشت و توونوانیش قاچی بۆ شۆرد.

"کە خاوەنی گەرماوەکە دیتی ئەوە توونوان قاچی زەوئولمەکان دەشوا، دەللاکی نارد. دەللاک هات و بە توونوانی گوت: 'مامۆستا بۆ تۆ باش نییە ئەو کارانە بکەی.' ئیدی دەللاک سەری زەوئولمەکانی تاشی و لەشی بۆ شوشت. ئینجا توونوان زەوئولمەکانی بردەوە ماڵی خۆیان و جلوبەرگی شیاوی لە بەر کرد. شەکر و گوڵاوی هێنا و دەرخواردی دا. خێزانی توونوان کە مریشکی کوڵاندبوو، بۆی هێنا پێشێ و پاروو پاروو گۆشتی مریشکەکەی دەدایە. کە تێر بوو، خێزانی توونوان ئاوی گەرمی هێنا و دەستی شوشت. زەوئولمەکان سپاسی خودای کرد و دوعای خێری بۆ توونوان کرد و گوتی: 'خودا ئێوەی کردە هۆکاری ژیانەوەم.' توونوان گوتی: 'لەو قسانە گەڕێ، پێم بڵێ بۆ هاتوویە ئێرە و

خەڵکی کام شـــاری؟ ئەمن وا هەســـت دەکەم ئەتۆ مرۆڤێکی گەورە و نەجیبزادەی.'
زەوئولمەکان گوتی: 'جارێ پێم بڵێ تۆ منت لەکوێ دیتووەتەوە؟ توونوان گوتی: 'ئەمن لە کاتی بانگی بەیانیدا تۆم لە توونی گەرماودا دیتەوە و هێنامییەوە ماڵێ. ئیدی نازانم لەوە پێش ئەتۆ لەکوێ بووی و کێ تۆی هێناوەتە ئەوێ. هەر ئەوەندە.' زەوئولمەکان گوتی: 'سـبحان الذی یحی العظام و هي رمیم.[١] کاکە گیان، تۆ چاکەی تەواوت لەگەڵ من کردووە، هیوادارم بە زووترین کات بە پاداشـتی چاکەکانت بگەیت.' ئینجا لە توونوانی پرسـی: 'ئێرە چ شارێکە؟' توونوان گوتی: 'ئێرە قودسە.'

"زەوئولمەکان کوێرەوەرییەکانی خۆی و خوشـکەکەی لە وڵاتی غەریبیدا وەبیر هاتەوە و دەستی کرد بە گریان. بەسەرهاتەکەی بۆ توونوان گێڕاوە و ئەو شێعرانەی گوت:

ئـاخ لە دەســـتـی ئەو ژیـنە تـاڵەی مـن
لە دەســـت ژینی پڕ ئـاهـــــ و نـاڵەی من
ژیـنـم هەر ژان بـووە، نەحەســـــاومەوە
بە دەســـت چـارەنـووس هەر تـلاومەوە
بە دەربەدەری لەمـــلا بـــۆ ئەولا
بـای قەدەر دەمـبـا هەر وەکـوو گەڵا

"دوایی بە بەکوڵ گریا. توونوان گوتی: 'مەگری، شـوکری خودا بکە کە دیسـان ساخ و سـلامەت بوویەوە.' زەوئولمەکان گوتی: 'ئا لێرەوە هەتا دیمشـق چەند ڕۆژەڕێیە؟' توونوان گوتی: 'شەش ڕۆژ.' زەوئولمەکان گوتی: 'دەتوانی بمنێری بۆ ئەوێ؟' توونوان گوتی: 'چۆن ئەتۆ بە تەنیا دەنێرم بۆ ئەوێ. هەر کاتێک ویستت، بۆ خۆم لەگەڵت دێم. ئەگەر خێزانیشـم بیهەوێ، با لەگەڵمان بێ. لەوێ لە لای تۆ دەمێنینەوە—تازە ئێمە خوومان بە تۆ گرتووە.'
وا بوو توونوان بە خێزانی گوت: 'پێت خۆشـە بچی بۆ دیمشق و شام یان لێرە دەمێنییەوە هەتا من شـازادە دەگەیەنم و دەگەڕێمەوە؟ ئەو پێی خۆشـە بچێ بۆ دیمشـق و ئەمن لەبەر ڕێگر و شـــتی وا دڵم نایە بە تەنیا بینێرم.' ژنی توونوان گوتی: 'ئەمنیش لەگەڵ ئێوە دێم.' توونوان گوتی: 'بژی بۆ ڕێککەوتنت و بژی بۆ هـاوڕێیەتیت.' ئیدی توونوان هەســـتا و دارونەداری فرۆشت."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. پاکە ئەو کەسەی ئێسکە وشک و بێ گۆشتەکان زیندوو دەکاتەوە.

# که شەوی پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، توونوان و ژنەکەی ساخبوونەوە لەسەر ئەوەی لەگەڵ زەوئولمەکان بچن بۆ دیمشق. گوێدرێژێکیان هێنا. زەوئولمەکان سوار بوو. دوای شەش شەو و شەش رۆژ چوونە نێو شاری دیمشقەوە. جەنگەی ئێوارە بوو لایان دا شوێنێک. توونوان چووە بازاڕ و خواردەمەنی هێنا. خواردنەکەیان خوارد و نووستن.

"پێنج رۆژ لەوێ مانەوە. رۆژی شەشەم ژنی توونوان نەخۆش کەوت، رۆژ لەگەڵ رۆژ نەخۆشییەکەی لێ گرانتر دەبوو. ئیدی ئەوەندەی پێ نەچوو ژنەکەی توونوان مرد. زەوئولمەکان کە ئەو ژنە لەو ماوەیەدا زۆری زەحمەت لەگەڵ کێشابوو، تەواو هۆگری ببوو. هەر بۆیە زۆرزۆر ناڕەحەت بوو. توونوانیش تەواو ماتەم دایگرت و خەمبار بوو. چەند رۆژێک خەفەت باڵی بەسەردا کێشابوون، وا بوو توونوان دڵخۆشی زەوئولمەکانی داوە و گوتی: 'رۆڵە گیان، هەستە با برۆین لەنێو شاری دیمشقدا بگەڕێین بەشکوو تۆزێک خەممان لەسەر شان سووک بێ.' زەوئولمەکان گوتی: 'چۆنت پێ خۆشە وا دەکەین.'

"وا بوو، دەستی یەکتریان گرت و وەدەر کەوتن، هەتا گەیشتنە لای پشتیری[1] والی دیمشق. سەیریان کرد ئەوە یەغدان و فەرشی دیبا و ئاوریشمیان لە وشتران ناوە و ئەسپیان زین کردووە. غوڵام و کۆیلەکان لەوێن. خەڵکێکی زۆریشیان لێ کۆ بووەتەوە. زەوئولمەکان لە یەکێک لە غوڵامەکانی پرسی: 'ئەوە ئەو بارە وشترانە هی کێن؟' غوڵامەکە وەڵامی داوە: 'ئەوانە دیاری میری دیمشقە بۆ نوعمانپاشا.' کاتێک زەوئولمەکان ناوی نوعمانپاشای بیست، چاوی پڕ بوو لە ئاو و ئەو بەیتانەی خوێندنەوە:

خۆشە لەگەڵ خزم و کەست پێک شاد بیتەوە
وەکوو جاران لە دەوری یەک کۆ ببینەوە
کۆتایی بێ دەربەدەری و دابڕان لە یەک
لە ماڵی خۆت بە لەشی ساغ، بدەی پشوویەک
یادی بەخێر سەردەمانێک لەگەڵ خوشکمدا
سەرقاڵی گەمە و یاری بووین و بەزم و هەرا
وەک تۆوی هەرزن چارەنووس لێکی دابڕین
تۆ بڵێی رۆژێ بێتەوە بە یەکتر شاد بین

---

١. پشتیر: تەویلەی ئەسپ.

"شێعرەکەی تەواو بوو، توونوان کە گوێی لە شێعرەکەی بوو وا بە دڵی پڕ خوێندییەوە، ئەویش دڵی پڕ بوو و گوتی: 'ڕۆڵە گیان! مەگری، خۆ تۆ هێشتا لە نەخۆشییەکەت تەواو چاک نەبوویتەوە؛ گریان بۆ تۆ باش نییە.' بەڵام زەوئولمەکان ئەوەندەی خەمی نوزهەتوززەمان بوو، خۆی پێ ڕانەدەگیرا، فرمێسکەکانی دەهاتنە خوارێ و ئەو شێعرەشی گوت:

هاتمە دنیای پڕ لە جەور و جەفا
دنیایەک بۆ من تێیدا نیە سەفا
ڕەنجم بێپایان وەک ستەمی ژین
لە ئاستی جەفا نیمە هیچ پەرژین

"توونوانیش هەم لەبەر زەوئولمەکان و هەم لە تاو خەمی خێزانی دەستی کردە گریان. بەڵام لە بەرەوە هەر دڵخۆشی زەوئولمەکانیشی دەداوە. هەتا وا بوو توونوان لە زەوئولمەکانی پرسی: 'بیری وڵاتی خۆتت کردووە؟' زەوئولمەکان گوتی: 'بەڵێ، لەوە زیاتر خۆم پێ ناگیرێ، ئێستا تۆ بە خودا دەسپێرم و لەگەڵ ئەو کاروانە وردەوردە دەڕۆمەوە، هەتا دەگەمەوە شاری خۆمان.' توونوان گوتی: 'ناتوانم بە تەنیان بەڕێت کەم و چاوم لێت نەبێ. ئەمنیش لەگەڵت دێم تا دەتگەیەنمەوە و ئەرخەیان دەبم.' زەوئولمەکان خۆشحاڵ بوو، گوتی: 'خوا پاداشتی خێرت بداتەوە.'

"ئیدی توونوان چووە دەرێ و گوێدرێژێک و پێداویستی و بژیوی ڕێگای کڕی و هاتەوە. زەوئولمەکان گوتی: 'خوا یارمەتیم بدا وەڵامی چاکەکانت بدەمەوە، بە ڕاستی تۆ ئەوەندەی بۆت کراو و لە دەستت هاتووە، چاکەت لەگەڵ کردووم.' ڕاوەستان هەتا شەو داهات و ئاسمان تاریک بوو، تۆشە و شتەکەیان لە کەرەکە نا و بەرەو بەغدا کەوتنە ڕێ. با ئەوان بڕۆن بەرەو بەغدا، [ئێمە سەرێکی نوزهەتوززەمان بدەین.]

"نوزهەتوززەمانی خوشکی زەوئولمەکان کاتێک لە ماڵ هاتە دەرێ و زەوئولمەکانی بەجێ هێشت، بە گریان لە کاروانسەرا دوور کەوتەوە. نەیدەزانی بۆ کام لا بچێ. هەر هۆشی لە لای زەوئولمەکان بوو، یادی ماڵ و وڵاتیشی دەکرد و لە خودا دەپاڕاوە و ئەو شێعرەی دەگوت:

دڵێکی خەمبارم هەیە، هەنگوینم بە زاری تاڵە
کەسێکم ئاگادار نییە بزانێ کەوتمە ئەو حاڵە
خەزان و شەختەی غەریبی پەندێکی هێنا بەسەرما
بەهارم بەبێ سەوزایی، باخچەم بەبێ گوڵی ئاڵە

"نوزهەتوززەمان هەر دەڕۆیشــت و چاوی لەملا و لەولا دەکرد. شـێخێکی ڕەوەندەی دەشــتەکی لەگەڵ پێنج عەرەب گەیشــتن و نوزهەتوززەمانیان دیت کە بە ڕووخســارێکی وەکوو مانگەوە عەبا کۆنێکی بەسەرەوەیە و هەر وا دەڕوا. شێخ لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو کچە زۆر جوانە. بەڵام وا دیارە هەژارە و ســەری لێ شـێواوە. ئەگەر خەڵکی ئێرە یان شــارێکی دیکەش بێ، لەگەڵ خۆم دەیبەمەوە.' ئیدی وردەوردە دوای کەوت هەتا چووە کۆڵانێکی تەنگەبەرەوە. شــێخ بانگی نوزهەتوززەمانی کرد: 'کچەکە، ئەتۆ ئازادی یان کۆیلەی؟'

"نوزهەتوززەمان بە گریانەوە وەڵامی داوە: 'بیکە بۆ خاتری خوا لەوە زیاتر کێشــەم بۆ زیاد مەکە.' دەشــتەکی گوتی: 'کچەکە، ئەمن شــەش کچم هەبوو، پێنجیان مردن و یەکی چکۆڵەم ماوەتەوە. من ویســتم بزانم تۆ خەڵکی ئێرەی یان غەوارەی. گوتم تۆ بەرمەوە تا لەگەڵ کچەم ببن بە هاوڕێ و هاونشــینی یەکتر. بەشــکم بە بۆنەی تۆوە ســەرقاڵ بێ و تۆزێک خەم و خەفەتی خوشکەکانی لە بیر بکا. ئەگەر کەست نەبێ، بە کچی خۆمت قەبووڵ دەکەم.' نوزهەتوززەمان کە ئەوەی بیست، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ڕەنگە لە لای ئەو شێخە بحەسێمەوە.' ئیدی لە شەرمان سەری داخست و گوتی: 'مامە، من کچێکی غەوارەم و برایەکی نەخۆشــم هەیە. بەو مەرجە لەگەڵەت دێم، بە ڕۆژدا لە لای کچەکەت بم. بەڵام کە بوو بە شەو، دەبێ بێمەوە لای براکەم. ئەگەر پێت خۆشە، ئەوە دێم. ئەوەش بزانە کە من لە ناز و نیعمەتدا بووم و لێم قەوماوە. من و براکەم لە وڵاتی حیجازەوە هاتووین. لەوە دەترسم ئەو بە جێگاکەم نەزانێ.'

"دەشتەکی کە قسەکەی ئەوی بیست، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەوەی دەمهەویست پێی گەیشتم.' ئیدی بە نوزهەتوززەمانی گوت: 'ئەمنیش هەر ئەو مەبەستەم بوو، بە ڕۆژدا لە لای کچەکەی من بی و بە شەویشدا بچییەوە لای براکەت. ئەگەر پێشت خۆش بێ، دەتوانی براکەت بهێنییە ماڵە من.'

"کورتی کەینەوە، دەشــتەکی بە هێمنی قســەی دەکرد و دڵخۆشــی دەداوە هەتا نوزهەتوززەمان قایل بوو و ڕەگەڵی کەوت. کە دەشــتەکییەکە گەیشــتەوە لای هاوڕێکانی، سەیری کرد ئەوە هەموویان باریان لە وشترەکانیان ناوە و ئامادەی ڕۆیشتنن. ئەو شێخە چەتە و ڕێگر بوو و هەموو قســەکانی درۆ و دەهۆ بوون. مەبەســتی ئەوە بوو کە نوزهەتوززەمان فریو بدا. ئیدی دەشتەکییەکە سواری وشترێک بوو و نوزهەتوززەمانیشی لە پاشــووی خۆی ســوار کرد و وشــترەی لێ خوڕی هەتا شــەو لە نیوەش لای دا. ئیدی نوزهەتوززەمان زانی کە کابرای دەشتەکی فێڵی لێ کردووە و فریوی داوە؛ دەستی کرد بە گریان و هاتوهاوار.

"لای بەری بەیانی لە وشـــترەکان دابەزین. دەشـــتەکی هاتە لای نوزهەتوززەمان و پێی گوت: 'کچەتیوە شـــارییە، ئەو قیژەقیژ و هـاتوهـاوارەت لە چی بوو؟ ئەگەر لەمە بەدوا بێدەنگ نەبی، ئەوەندەت لێ دەدەم، بمری.' نوزهەتوززەمان کە ئەو قسـەییەی ئەوی بیسـت، ئارەزووی مەرگی کرد و وەڵامی شـێخە ڕەوەندەکەی داوە و گوتی: 'ئەی پیری خەرەفاو، شێخی گڵاو، من زۆرم باوەڕ بە تۆ بوو؛ چۆن توانیت درۆم لەگەڵ بکەیت و فریوم دەی؟'

"ڕەوەندە لە وڵامی قسـەکەیدا گوتی: 'هەی شـــاری هیچوپووچ، ئەوە زماندرێژیش دەکەی؟' ئیدی دەســتی دا قامچییەکەی و کەوتە گیانی نوزهەتوززەمـان، گوتی: 'ئەگەر بێدەنگ نەبی و دەســت لەو گریانە هەڵنەگری، دەتکوژم.' نوزهەتوززەمان ماوەیەک نە گریا و نە قسەی کرد. دوایی برا نەخۆشەکەی بیر هاتەوە و دەستی کردە گریان.

"ڕۆژی دواتر نوزهەتوززەمان گوتی: 'ئەوە چیت لەبن ســەردایە وا منت هێناوەتە ئەو کێوە و بە تەمای چیت؟' ئیدی کابرای دەشتەکی دەستی دا قامچی و ئەوەندەی لە پشت و کەلەکە دا هەتا تەواوی لەشـــی ڕەش و شـــین بووەوە و خەریک بوو گیانی دەرچێ. تا نوزهەتوززەمان خۆی بەســـەر کەوشـــەکانیدا دا و قاچی ماچ کرد. ئەوجار دەشـــتەکی قامچییەکەی فڕێ دا ئەو لاوە و دەســتی لێ هەڵگرت. بەڵام جنێوی پێ دا و گوتی: 'ئەگەر ئەو جار گوێم لە دەنگی گریانت بێ، زمانت دەبڕم.' نوزهەتوززەمان بێدەنگ بوو و وەڵامی نەداوە. ئێشی جێگای قامچییەکان کاری لە دڵی دەکرد و بیری لە خۆی و براکەی دەکردەوە کە چۆن ئاوایان لێ هات و لە سەر ئەو هەموو ناز و نیعمەتە کەوتنە ئەو ڕۆژەوە، سەری سووڕ دەما. ئیدی بیری لە نەخۆشی و تەنیایی براکەی کردەوە و لەبەر خۆیەوە دەگریا و ئەو شێعرەی دەگوتەوە:

بەژنی تا بڵێی ڕێک و سەلواسام
چەماوەتەوە، بووم بە پیتی لام
خۆشی هەرچی بوو، لە ژیانمدا
پەژارە و خەفەت هەمووی بە با دا
نازدار بووم لە لای دایک و بابی خۆم
ئێستاش ڕەوەندە دەڵێ خودای تۆم

"کاتێک ڕەوەندەکە گوێی لەو شێعرانە بوو، بەزەیی پێیدا هات. هەستا فرمێسکەکانی بۆ ســڕی و گوتی: 'پێم خۆش نییە لە کاتی تووڕەبوونمدا کەس دمبەدمەم لەگەڵ بکا. لەمە بەدوا ئاوا قســەم لەگەڵ مەکە. ئەمن ئەتۆ بە پیاوێکی چاکی وەک، خۆم دەفرۆشـم. ئەویش وەک من زۆرت یارمەتی دەدا و لەگەڵت چاک دەبێ.' نوزهەتوززەمان گوتی: 'چۆنت پێ

چاکە وا بکە' ئیدی برسـێتی نوزهەتوززەمانی لە پێ خسـتبوو. لەو لەتە نانە جۆیە کەمێکی خوارد. کە ماوەیەک لە شـەو تێپەڕی، دەشـتەکییەکە بە هاواڵەکانی گوت، وشـترەکان ئامادە بکەن.

لێرەدا بەیان ئەنگوت و، شەهرزادیش کۆتایی بە بەشەچیرۆکی ئەمشەویش هێنا.

## كه شەوی پەنجا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شێخەکە بە هاوەڵەکانی گوت: وشترەکان ئامادە بکەن. دەشتەکی خۆی سواری وشترێک بوو نوزهەتوززەمانیشی لەگەڵ خۆی سوار کرد و ڕۆیشتن. وا بوو دوای سێ ڕۆژ گەیشتنە نێو شاری دیمشق و لایان دا کاروانسەرای سوڵتان. نوزهەتوززەمان لەبەر ماندوویی و خەفەت و گریان ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو. ڕەوەندە پێی گوت: 'کچەتیوە لادێییە، ئەگەر هەر ئاوا بگری، بە جوولەکە نەبێ ناتفرۆشم.'

"ئیدی کابرای ڕەوەندە نوزهەتوززەمانی لە شوێنێک دانا. خۆی چوو بۆ لای بازرگانەکان و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵیان و گوتی: 'ئەمن کەنیزێکم هێناوە، براکەی نەخۆشە و ئێستا لە دیمشقە و دەرمان و شت دەخوا. ئەمن دەمهەوێ ئەو کەنیزە بفرۆشم. بەڵام لەو ڕۆژەوە براکەی نەخۆش کەوتووە، بەردەوام دەگری و دەبارێنێ. دوورکەوتنەوە لە براکەی زۆری ئازار دەدا. ئەمن دەمهەوێ هەرکەس بە تەمای کڕینێتی، لەگەڵی لەسەرەخۆ بێ. پێی بڵێ کە ئەوە براکەت ئێستا ناساخە و نارەحەتە لە شاری قودس لە لای منە. ئەوم لە ماڵە خۆم داناوە هەتا دەرمان و شەربەت و شت بخوا چاک بێتەوە. هەر کەس حازر بێ ئاوای قسە لەگەڵ بکا، ئەمن کەنیزەکەمی بە هەرزان پێ دەفرۆشم.'

"ئینجا یەکێک لە بازرگانەکان هەستا پرسیاری لە تەمەن وساڵی کچەکە کرد. ڕەوەندە گوتی: 'کیژۆڵەیەکی تازەپێگەیشتووی ژیر و بەڕەوشت و جوان و شیرینە. بەڵام لەو ڕۆژەوە براکەیم ناردووە بۆ شار، ئێستا زۆر کز و لاواز بووە و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە.' بازرگانەکە کە ئەو تاریفانەی بیستن، لەگەڵ ڕەوەندە چوو بۆ لای نوزهەتوززەمان. بازرگانەکە بە ڕەوەندەی گوت: 'ئەمن کارێکم بە سوڵتانە، ئەگەر سوڵتان ئەو کەنیزەی پەسەند کرد و نامەی بۆ نوعمانپاشای بابی نووسی کارەکەم جێبەجێ بکا، ئەودەم من پارەی کەنیزەکە دەدەم، دەنا نامهەوێ.'

"ڕەوەندە ئەو مەرجەی پەسەند کرد. هەردووکیان پێکەوە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ئەو شوێنەی نوزهەتوززەمانی لێ بوو. ڕەوەندە لە بەردەرکی دیوەکە ڕاوەستا و گازی نوزهەتوززەمانی کرد. نوزهەتوززەمان وەڵامی نەداوە و دەستی کرد بە گریان. دەشتەکی بە بازرگانەکەی گوت: 'ئەوەیە کەنیزەکە. ئەتۆ بەو شێوەیەی کە من گوتم لەگەڵی بدوێ نەرمونیان بە.' بازرگانە چووە دیوەکەوە. نوزهەتوززەمانی دیت کە کچێکی شووش و لەبار و چەلەنگە، پێی گوت:

کیژی جوان لە نێو پەریانەوە هاتووی<br>
یان لە کۆشک و ماڵی خاقان هەڵاتووی؟!

دەرکـــی بەهەشـــــت کـــراوەتەوە ئەتـــۆش
بەدزی دەرکەوانـــی بەهەشـــــت دەرچـــووی؟!
دایک و بابت خـــــــــــــۆ زۆرت بۆ دڵسۆز بوون
چـــــــــــــۆناوچۆنە ئەی تۆ وەدوای چی کەوتووی؟!

"بازرگانەکە ســـڵاوی لێ کرد و بە ڕووی خۆشـــەوە دواندی و هەواڵی پرســـی. نوزهەتوززەمان چاوێکی لە بازرگانەکە کرد، دیتی ئەوە پیاوێکی قورس و لەســـەرخۆ و ڕووخۆشـــە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'پێم وا بێ ئەو کابرایە هاتووە بۆ کڕینی من. ئەگەر لەوە ناهۆمێد بم، دەبێ لە لای ئەو دەشتەکییە زاڵمە بمێنمەوە. ئەویش بە قامچی دەمکوژێ. جێی هیوایە لە لای ئەو کابرایە ڕزگارم بێ. ڕەنگە ئەو کڕیارە هاتبێ گفتولفت[1] و شێوی ئاخاوتنم ببینێ. وا چاکە ئەمن بە زمانێکی خۆش و پاراوەوە لەگەڵی بدوێم و وەڵامی بدەمەوە.' وا بوو بە زمانێکی ڕەوان گوتی: 'علیک الســـلام و رحمة الله و برکاته. لە چۆنیەتی حاڵی منت پرســـی، دەبێ بڵێم دژمنەکانیشـــت وەک منیان لێ بەســـەر نەیە.' ئەوەندەی گوت و بێدەنگ بوو. بازرگان سەری لە شێوەی قسەکردنی سووڕ ما و لە ڕەوەندەکەی پرسی: 'نرخی ئەو کەنیزە چەندەیە؟ ئەوە زۆر بەشـــکۆیە.' دەشـــتەکی تووڕە بوو، گوتی: 'کەنیزەکەم لێ یاخی مەکە و ئەو قسـانە مەکە، ئەو شـتێکی زۆر هیچوپووچە و هەر بە تۆی نافرۆشـم.' بازرگان کە گوێی لەو شێوە قسەکردنەی ئەو دەشتەکییە بوو زانی، زۆر گەوجە، پێی: 'گوت قەیناکا بەو عەیب و ئیرادەشـــەوە دەمهەوێ.' دەشـــــتەکی گوتی: 'بە چەندم لێ دەکڕی؟' بازرگان گوتی: 'جگە لە باب، کەس ناو بۆ منداڵەکەی نابینێتەوە. ئەتۆ قســەی خۆت بکە.' دەشــتەکی گوتی: 'نا، ئەتۆ دەبێ بیڵێی.' بازرگان گوتی: 'ئەمن دووسەد دینارت دەدەمێ. پیتاک و شتی سوڵتانیش لەسەر خۆم.'

"ڕەوەندە کە ئەوەی بیست، دەنگی هەڵێنا و لە بازرگانەکە تووڕە بوو، گوتی: 'هەستە بە ڕێی خۆت بڕۆ. بە دووســـەد دینار ئەو پەڕۆ کۆنەت نادەمێ کە بە ســـەریدا داوە. هەر نـایفرۆشـــم. ڕایدەگرم وشـــتری پێ دەلەوەڕێنم و ئـاشـــی پێ دەگێڕم.' ئیدی هەرای نوزهەتوززەمانی کرد: 'لادێیی زەبوون، ناتفرۆشـم.' ڕووی لە بازرگانیش کرد و گوتی: 'من تۆم زۆر بە پیاوێکی ژیر دەزانی. هەســـتە بڕۆ دەنا بە خودا قســـەی ناخۆش و نەشـــیاو دەکەم.' بازرگان لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو دەشـــتەکییە شـــێتە نرخی ئەو کەنیزە نازانێ و هیچیش ناڵێ کە بە چەندم دەداتێ یان نا. ئەو کیژە خەزێنەیەک زێڕ و جەواهێرات دێنێ. خۆ ئەو ماڵەی من هەمە نرخی ئەو کچە دەرناهێنێ. بەڵام دیســـــان ئەگەر ئەوەی هەمە هەموویم لێ بســـتێنێ، هێشـــتا حازرم بی کڕم.' ئیدی بازرگانەکە ڕووی لە ڕەوەندە کرد و

---

١. گفتولفت: چۆنییەتی قسە کردن و ئاخاوتن.

گوتی: 'شـــێخ، ئەوەندە دڵچکۆلە مەبە و زوو توورە مەبە. پێم بڵێ ئەو کەنیزە جلوبەرگی ئاوریشم و زێڕ و زیوەر چی هەیە؟' گوتی: 'گڵاو، ئەخە کۆیلە و ئاوریشم و زێڕ و زیو، بۆ چییانە؟! ئەو هەر شـــیاوی ئەو کوتە پەڕۆیەیە کە لە خۆی ئاڵاندووە.' بازرگان گوتی: 'بە یارمەتیت، ســـەری هەڵدەمەوە و هەر وەک لەنێو کڕیارانی کەنیزدا باوە چاوێکی لێ بکەم؟' رەوەندە گوتی: 'خودا بتپارێزێ، ئەوە خۆت و ئەوەش کەنیز. ســـەر و ژێری ببینە، حەز دەکەی ڕووتی کەوە.' بازرگان گوتی: 'معاذ الله، ئەمن جگە لە ڕوخســـاری، چاو لە هیچ کوێی ناکەم.' ئیدی بازرگان بە شەرمەوە چووە پێشێ."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی پەنجا و حەوتەمم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، بازرگان زۆر بە سڵ و شەرمەوە چووە پێشێ و لەکن نوزهەتوززەمان دانیشت و گوتی: 'خانم، ناوت چییە؟' نوزهەتوززەمان وڵامی داوەوە و گوتی: 'کام ناوم دەڵێی؟' بازرگان گوتی: 'مەگەر دوو ناوت هەیە؟' گوتی: 'لەپێشدا ناوم نوزهەتوززەمان بوو، ئێستا پێم دەڵێن، غوسسەتوززەمان[1].' بازرگان کە ئەوەی بیست، چاوی پڕ بوو لە ئاو و ئەسرینەکانی هاتنە خوارێ. پێی گوت: 'ئەتۆ برایەکی نەخۆشت هەیە؟' نوزهەتوززەمان گوتی: 'بەڵێ، بەڵام ڕۆژگار لێکی هەڵاواردووین. ئێستا ئەو لە بەیتولموقەددەسە و نەخۆشە.' بازرگان واقی وڕ ما لەو شێوە قسە کردنەی. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'وا دیارە دەشتەکی ڕاست دەکا.'

نوزهەتوززەمان کە بەو قسانە زێد و وڵات و کەس‌وکاری خۆی وەبیر هاتەوە، ڕۆندکی بەسەر گۆنایدا هاتە خوارێ و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بەشم لە چەرخی گەردوون هەر ستەم بوو  
هەر مەینەت و دەربەدەری و ماتەم بوو  
پەڕیوەی هەندەران و دوور لە وڵات  
ژینێکی تاڵ و تفت و چەند پاتەم بوو  
ئێستا کز و شڕۆڵ و چاو لە دەستم  
تا دوێنێ کار بێ ویستی من ئاستەم بوو

"بازرگان کە ئەو شێعرەی بیست، گریا و دەسرەی دەرهێنا چاوی نوزهەتوززەمان بسڕێ. نوزهەتوززەمان ڕووی داپۆشی و گوتی: 'گەورەم، ئەوە کاری تۆ نییە.' ڕەوەندەکە وەستابوو. کە دیتی ئەوە ڕووی داپۆشی سەری واوە برد، وای زانی ناهێڵێ بازرگان چاوی لێ کا. هەستا و بەو کەندرەی کە وشترەکەی پێ لێ دەخوڕی، ئەوەندەی لە نوزهەتوززەمان دا هەتا وا بوو نوزهەتوززەمان کەوت و سەری وە زەوی کەوت. بەردێک لە تەوێڵی چەقی و خوێن بە تەوێڵییدا هاتە خوارێ و هێند گریا هەتا بێهۆش بوو. بازرگانیش دڵی پڕ بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'دەبێ بە هەر نرخێک بێ ئەو کەنیزە بکڕم ئەگەر بە قەد قورسایی ئەوم زێڕ دابێ، بۆ ئەوەی لە چنگ ئەو زاڵمەی ڕزگار کەم.' نوزهەتوززەمان هاتە سەر خۆ و ناوچەوانی بە پەڕۆیەک سڕی و سەری بەرز کردەوە و بە دڵێکی خەمبارەوە ئەو شێعرەی گوت:

---

١. خەمی ڕۆژگار.

ئەی گـیـژ و حەپـۆل، ئەی چەرخـی گەردوون
تـا کەنـگـێ دەکەی کـاری سـەرەوقـوون
ئەتـۆ وەک پـیـرۆت فەرقـی پـێ نـاکەی
خـاس و خـراو و گەوج و زانـا بـوون
ڕێـگـر و چەتە، پـیـاوکـوژ و جەردە
شـازادە و نەجـیـب، زانـا و حەکـیـمبـوون

"کە شـێعرەکەی تەواو بوو، ڕووی لە بازرگانەکە کرد و گوتی: 'بیکە بۆ خاتری خوا لە دەسـت ئەو زاڵمەم ڕزگار کە. ئەگەر ئەمشـەو لە لای ئەو بمێنمەوە، خۆم دەکوژم. تۆ من ڕزگار کە، هیوادارم خوا تۆ لە هەموو کەند و کۆسپەکانی ئەم دنیا و ئەو دنیات ڕزگار بکا.' بازرگان هەستا و بە دەشتەکییەکەی گوت: 'شێخی عەرەب، دەی دەڵێی چی؟ ئەم کەنیزەکە بە چەند دەڵێی، پێم بفرۆشـە.' دەشـتەکی گوتی: 'لێم بکڕە و پارەکەیم دەیە، دەنا دەیبەمەوە بۆ دەشت با هەر لەوێ بێ و هەر خەریکی وشترلەوەڕاندن و تەرس و پشکەڵکۆکردنەوە بێ.' بـازرگـان گوتی: 'پەنجـا هەزار دینـاری زێڕت دەدەمێ. ئیـدی لێم وەرگرە، تەواوە.' دەشتەکی گوتی: 'خۆ ئەوە نرخی کڕینەکەی نییە، ئەوە لە کاتێکدا ئەو لە لای من بای نەوەد هەزار دیناری نانی جۆ خواردووە.' بازرگان گوتی: 'با ئەمن قسـەیەکت پێ بڵێم. ئەگەر بە قسـەم نەکەی، ئەوە بە والی دەڵێم کەنیزەکەت هەر وا بە خۆڕای لێ بسـتێنێ.' دەشـتەکی گوتی: 'دەڵێی چی؟ قسـەکەت بکە.' بازرگان گوتی: 'ئەمن سـەدهەزار دینارت دەدەمێ.' دەشتەکی گوتی: 'باشە، ئەوە پێم فرۆشتی.' بازرگان چووە ماڵێ پارەکەی هێنا و ژماردی.

"بازرگان کە نوزهەتوززەمانی کڕی. یەکێک لە جلەکانی خۆی بەسـەردا دا و بردییەوە ماڵێ."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی پەنجا و هەشتەم داهات

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە بازرگان نوزهەتوززەمانی بردەوە ماڵێ، جلوبەرگی ئاوریشم و بەشکۆی لە بەر کرد. چوو بۆ بازاڕ زێڕ و جەواهێراتی جوان و ڕازاوەی بۆ کڕی. بۆی هێناوە و گوتی: 'ئەمن هیچم لە تۆ ناوێ، تەنیا ئەوەندە کاتێک تۆم بردە لای سولتانی دیمشق، ئەتۆ خۆت نیشاندە کە بایەخ و نرخت چەندەیە. ئەگەر تۆی کڕی، باسی ئەوە بکە کە من چۆن لەگەڵ تۆ جووڵاومەوە. ئەو جار داوا لە سولتان بکە کاغەزێکم بۆ بنووسی و بە سولتانی بەغدام بناسێنێ و ڕاسپێرێ کە دە-یەکم لێ نەستێنێ.' کە نوزهەتوززەمان قسەکانی بازرگانی بیست، دەستی کرد بە گریان.

"بازرگان گوتی: 'خانم، ئەوە بۆ هەر کە ناوی بەغدام هێنا، دەستت کرد بە گریان؟ مەگە کەسێکت لەوێیە؟ ئەگەر خزمایەتیت لەگەڵ بازرگانەکانە، پێم بڵێ ئەمن هەموویان دەناسم و پەیامەکەی تۆیان پێ دەگەیەنم.' نوزهەتوززەمان گوتی: 'من بازرگانەکان ناناسم، بەلام نوعمانپاشا دەناسم.' بازرگان کە ئەوەی بیست، پێکەنی و دڵی خۆش بوو لە دڵی خۆیدا گوتی: 'پارووم لە ڕۆنی کەوت.'

"بازرگان گوتی: 'بۆ لەپێشدا تۆیان بە نوعمانپاشا فرۆشتبوو؟' نوزهەتوززەمان گوتی: 'نا وەڵلا، من لەگەڵ کچەکەی ئەو گەورە بووم. لە لای ئەو ڕێزی زۆرم هەیە و منی زۆر خۆش دەوێ. ئەگەر دەتەوێ نوعمانپاشا داواکەت جێبەجێ بکا، کاغەز و پێنووسێکم بۆ بێنە با نامەیەکی بۆ بنووسم. کە چووی بۆ بەغدا، ئەو نامەیە بگەیەنە دەست نوعمانپاشا، پێی بڵێ کەنیزەکەت نوزهەتوززەمان دەستی ڕۆژگار داویەتە دەست بازاڕەکان و ئەوە دەستاودەست دەگەڕێ. ئەگەر گوتی لەکوێیە، بڵێ ئەوە لە لای سولتانی دیمشقە.'

"بازرگان کە ئەو ڕوانین و ئاخاوتن و شارەزایی زمانیەی دیت، ئەوەندەی دیکە پلە و پایە و بایەخی لە زەینیدا چووە سەرێ و لێی پرسی: 'ئەی قورئان فێر بووی؟' نوزهەتوززەمان گوتی: 'بەڵێ، زانست و تۆشداریشم خوێندووە و دەزانم. لەسەر بەشەکانی هیپوکرات و گالینووس شیکردنەوەم نووسیوە و تەزکەرە و شرۆڤەی بورهانیشم خوێندووە. موفرەداتی ئیبن بەیتاریشم خوێندووەتەوە و قانوونی ئیبنیسیناشم بە لاوە زۆر گرنگە. لەبارەی ئەندازیاریشەوە ڕای خۆم هەیە و هێندێک نهێنیم دەرخستووە. کتێبی شافعییەم دیوە و فەرموودە و نەحویش فێر بووم. لەگەڵ زانایانی ئایینیش باسم کردووە و، لە زانستی مەنتیق و بەیان و جەدەلیشدا نووسراوەم هەیە. فێری زانستی ئوستورلابی ڕوحانیش بووم.' ئیدی بە بازرگانی گوت: 'کاغەز و پێنووسێک بێنە با نامەیەکت بۆ بنووسم خەمی دڵت برەوێنم.' بازرگان کە گوێی لەو وتانە بوو، پێی سەیر بوو، گوتی:

'خوزگەم بەو کەســە کە تۆ لە کۆشــکەکەیدا بی.' ئیدی بازرگان پێنووس و کاغەزی هێنا و لەپێش نوزهەتوززەمانی دانان و کڕنۆشــی بۆ برد. نوزهەتوززەمان دەســتی دا پێنووس و ئەو بەیتانەی نووسی:

لە ســـــوێــی دیــداری ئـێــوە، خــواردن و خەوم نەمــاوە
هــێــنــدە تــامەزرۆی ئـێـوەم، ئـۆقــرەم لــێ هەڵــگـیــراوە
بە ڕواڵەت لــێــتــان دوورم، دایــم لە خەیــاڵــمــدان
خەیـــــــــــــاڵتان بووەتە وزە، هێزی وەبەر من ناوە

" 'کەســێک کە بیر و خەیاڵ بەســەریدا زاڵ دەبێ و بەخەبەربوون لە پێی دەخا. ئیدی شــەوی تاریکی قەت ڕۆژی بەســەردا نایە و لە نوێنی دەربەدەریدا دەتلێتەوە و لە خۆشــی هاتنی ڕۆژی ڕزگاری چاوی دەڕێژێ و بەردەوام ئەســتێرە دەژمێرێ. ئیدی چیرۆکی ئەو کەسانە زۆر دەخایەنێ و جگە لە فرمێسک فریادڕەسێکیان نییە.' دوای فرمێسکی سەری کرد و ئەو بەیتانەی گوت:

دووری و بە قەد دووریــی ڕێ لــێــم بــێــخەبەری
کەس مــنــی لە بــیــر نــیە و کــراوم بــێــبەری
پشتم چەمــــا لەژێــــــــر باری دەرد و خەمـــــــا
بــێــرە هـــــــانام سەختە دەردی دەربـــــــــەدەری

"لە کۆتایی نامەکەیدا نووســی : 'لە نوزهەتوززەمانی غەریبی دوورەوڵاتەوە بۆ پاشــای زەمان، نوعمان‌پاشــــا.' ئیدی نامەکەی پێچاوە و دای بە بازرگان. بازرگانەکە نامەکەی وەرگرت و ماچی کرد. دەیزانی چی تێدا نووســراوە. دڵخۆش و بەدەماغ گوتی: 'پاکە ئەو خودایەی تۆی ئافراندووە.' "

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتــایی پێ هــات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی پەنجا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، بازرگان گوتی: 'پاکە ئەو خودایەی تۆی ئافراندووە.' چونکە پلە و پایەی نوزهەتوززەمانی دەزانی، هەتا جەنگەی شـــەو ڕێزی لێ گرت. بازرگان خزمەتکاری نارد خواردنیان هێنا و خواردیان. پاشـان هەریەکەی لە جێگایەک خەوتن. کە ڕۆژ بووەوە، بازرگان هەستا و نوزهەتوززەمانیشی هەستاند و ناردی بۆ گەرماو. کە لە گەرماو هاتەوە، جلی ئاوریشـــمی و دیبای بۆ هێنا لەگەڵ گوارەی لە دوڕ و مەرجان و ملوانکەی زێڕ و ملەبەندی عەنبەر. ئەو بازرگانە بە نوزهەتوززەمانی گوت: 'ئەوانە وە خۆت بخە.' ئەویش وە خۆی خست. بازرگان گوتی:

خەڵـک بە خشـــڵ جـوانـان دەڕازێـنـنەوە
تۆ هێنـدە جوانی، خشـــڵـت ڕازانـدووەتەوە

"ئیدی بازرگان لەپێشـەوە و نوزهەتوززەمانیش بەدوایدا ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە لای شەرکانپاشا. کڕنۆشی برد و گوتی: 'ئەی پاشای جیهان! دیارییەکم بۆ هێناوی تای نییە و نازانم چۆن پەســنی بدەم.' شـــەرکان گوتی: 'بیهێنە با ببینم.' بازرگان چووە دەری نوزهەتوززەمانی هێنا بەرچاوی شـــەرکانپاشـــا. کاتێک پاشـــا ئەوی دیت، ســـۆز و خۆشەویستی برایانەی گوڵی کرد و هەستی بە نزیکییەکی زۆر کرد. بازرگان گوتی: 'لەگەڵ ئەو هەمووە جوانییەی هەیەتی، هەموو زانستەکانیش دەزانێ.' پاشـا گوتی: 'نرخەکەیم لێ وەرگرە.' بازرگان گوتی: 'باشـە بەسـەر چاو، بەڵام ئەتۆ نامەیەکم بۆ بنووسـە پیتاکی دە-یەکم لێ نەستێنن.' پاشـا گوتی: 'بۆت دەنووسـم. ئەتۆ پێم بڵێ بە چەندت کڕیوە؟' بازرگان گوتی: 'بای سـەدهەزار دینارم جلوبەرگ و خشـڵ بۆ کڕیوە.' پاشـا گوتی: 'ئەمن زیاترت دەدەمێ.'

"ئیدی خەزێنەداری بانگ کرد و گوتی سـێسـەدوبیسـت هەزار دینار بدە بە بازرگان. دوایی چوار قازی بانگ کرد و گوتی: 'ئەوە شـــایەد بن کە ئەمن ئەو کەنیزەم ئازاد کرد و دەبێ بە خێزانم.' ئیدی قازییەکان نامەی ئازادییەکەیان نووســـی و دوای لێیان مارە کرد. پاشـــا زۆری زێڕ بەســـەر ئامادەبوواندا دابەش کرد. فەرمانی دا نامەیەک بەپێی ویســـتی بازرگان بنووسن. دوایەش کەوای شکۆداری دا بە بازرگان."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی شەستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە پاشا بازرگانی خەڵات کرد، ئیدی هەموو دانیشتووان بڵاوەیان کرد و جگە لە قازییەکان و بازرگان کەس لە لای پاشا نەماوە. پاشا بە قازییەکانی گوت: دەمهەوێ لە هەموو زانستەکان پرسیار لەو کەنیزە بکەن، بزانم بازرگان ڕاست دەکا یان نا.' ئیدی پاشا فەرمانی دا پەردەیان داداوە و هەموو ژنەکان و نوزهەتوززەمان چوونە پشت پەردەکە. ژنانی وەزیران و میران بیستیانەوە کە شەرکانپاشا کەنیزێکی کڕیوە لە جوانی و زانین و ئەدەبدا تای نییە، سێسەدوبیست هەزار دیناری پێ داوە و ئازادی کردووە و لە خۆی مارە کردووە. ئێستا قازییەکان ئەوە کۆ بوونەتەوە ڕادەی زانست و تێگەیشتوویيەکەی هەڵدەسەنگێنن. ئیدی مۆڵەتیان لە مێردەکانیان وەرگرت و هاتنە کۆشک. سەیریان کرد نوزهەتوززەمان دانیشتووە و خزمەتکار و کەنیزەکان گوێقوڵاخ لە دەوری ڕاوەستاون. کە نوزهەتوززەمان ئەوانی دیت، لە بەریان هەستا. هەرکەسەی بەپێی پلە و پایەی خۆی لەگەڵی جووڵاوە و بە ڕوویەکی خۆشەوە ڕێزی لێ گرت. بە جۆرێک کە ژنەکان هەموو سەریان لە جوانی و ڕێکوپێکی و ئەدەبی سووڕ مابوو؛ بە یەکتریان دەگوت: 'ئەوە وەک کەنیز ناچێ و حەتمەن کچە پاشایە.' ئیدی ژنەکان گوتیان: 'خانم بە خێر بێی. شارەکەت ڕووناک کردین. ئێوە خانم و ئێمە کەنیزتین.'

"دوای ئەوە شەرکانپاشا بانگی نوزهەتوززەمانی کرد و گوتی: 'ئەو بازرگانە پەسنی ڕادەی زانست و ئەدەبزانیتی کرد و گوتی: 'ئەتۆ لە هەموو زانستەکاندا شارەزای و لەسەر زانستی ئەستێرەناسیش شتت نووسیوە.' لە هەر کام لەو زانستانە شتێکمان بۆ باس بکە.' کە نوزهەتوززەمان قسەکەی شەرکانپاشای بیست گوتی: 'ئەی پاشام، هەنگاوی یەکەم سیاسەت و دابی قسەکردن و هەڵسوکەوتە. ئەوە بزانە خەڵک هەرچی بکەن، دەگەڕێتەوە سەر بابەتی دین و دنیا. چونکە ئەگەر دنیا نەبێ، دینیش نابێ. ڕۆژی پەسڵانیش بەدوای دنیادا دێ. کاری دنیاش کە بنەمای ڕۆژی پەسڵانە، لە ئاکاری خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ. ئاکاری خەڵکیش چوار جۆرە. سەرداری، بازرگانی، کشتوکاڵ و پیشەکانە. سەرداری پێویستی بە ڕامیاری و ژیری و تێگەیشتووی و سەرڕاستی هەیە. سەردار و فەرمانڕەوای باش هۆی ئاوەدانی و بەختەوەری دنیایە و گرتنەبەری ڕێگای ڕاستی ڕۆژی پەسڵانە. چونکە خودای بێنیاز دنیای داناوە هەتا بەندەکانی تێیدا هەوڵ بدەن، توشەی ڕۆژی پەسڵانی تێدا کۆ کەنەوە و دوای حەزی شەیتانی نەکەون. خەڵک لە دنیادا بە ویژدان و دادگەر بن، دەست لە دژمنایەتی و ڕق و قین هەڵگرن. جا ئەگەر بێتو خۆ لەوانە نەپارێزن، ئەوە پێویستیان بە سوڵتانێکی دادگەر دەبێ. هەتا نەهێڵێ مافی کەس پێشێل بکرێ. ئەگەر سەردار بیری ورد و بەئەندێشە نەبێ، ئەوە زۆرداران بەسەر هەژاران و بە دەسەڵاتاندا

زاڵ دەبن و ژیانیان لێ تاڵ دەکەن. ئەردەشـــیر لەو بارەوە گوتوویەتی: 'دین و وڵات هاوتەریبی یەکن. دین وەک گەنجە و پاشـــا پاســـەوانی ئەو گەنجەیە.' ئاوەز و شـــەرع هەردووکیان پێداگرن لەســـەر ئەوە کە دەبێ وڵات ســـوڵتانێکی دادگەری هەبێ، هەتا پارێزگاری لە ســـتەملێکراوان بکا لە بەرانبەر ســـتەمکاراندا و شـــەڕی ئەوانیان لێ دوور خاتەوە. بەڵام سوڵتان، ئەوە بزانە کە درووست بە قەد خوو و ڕەوشتی سوڵتان وڵاتەکەش تەکووز دەبێ. پێغەمبەر درورد و ســـڵاوی خودای لێ بێ فەرموویەتی: 'دوو دەســـتەن کە چاک و باشبوونیان دەبێتە هۆی ڕزگاری و چاکی و باشی خەڵک، خراپبوونیشیان کۆمەڵگە لە خشتە دەبا و پەرە بە خراپەی کۆمەڵگە دەدا. ئەو دوو دەستەیە زانایان و سەردارانن.' هێندێک لە دانایان و زانایان دەڵێن پاشـاکان سـێ دەسـتەن: 'دەسـتەیەک پاشـای دینین، دەستەیەکی دیکە پاشای پارێزگارەکانن، ئەوی دیکەشیان پاشای هەوا و هەوەسن. پاشای دین کەسێکە کە خەڵک بۆ دینداری بانگهێشت دەکا و خۆی لە هەموو ئەو کەسانە دیندارترە کە کەوتوونە شـوێنی. پێویسـتە بەپێی شـەرع خەڵک بانگهێشـت بکا. پاشـای پارێزگار و دوورەپەرێز لە حەرامکراوەکان کە ئەویش خەڵک هان دەدا هەتا خەریکی کاری دین و نەبن و ڕێوشوێنی دین لە بەرچاو گرن. بەرنامەی ژیانیان لەسەر بنەمای قەڵەم و شمشێر دادەڕێژن و بە قەڵەم ڕێوشوێن دیاری دەکرێ. ئەگەر کەسێکیش بیەوێ سەرپێچی بکا و لا بڕوا، بە شـمشـیر دەیهێننەوە سـەر ڕێ و ڕاسـتی دەکەنەوە. دادگەری کۆمەڵایەتی پێ دابین دەکەن. بەڵام پاشـــای هەوا و هەوەس دینی نییە، کارەکەی کەوتنە شـــوێن هەوا و هەوەســـە و لە خوداش ناترســـێ. ئەو جۆرە ســـەردارانە کۆتاییەکەیان هەر بەفیڕۆچوون و تیاچوونە بەرەو دۆزەخ.'

"زانایان گوتوویانە: 'پاشا پێویستی بە زۆر کەسە، بەڵام خەڵک هەر پێویستیان بە یەک کەس هەیە. هەر لەبەر ئەوەش ســـەرداران دەبێ کارێک بکەن کە خوو و ڕەوشـــتی خەڵک بناســـن و خۆیان لەگەڵ ڕێک بخەن. بۆ ئەوەی لە خەڵک نیزیک ببنەوە و بتوانن دەنگی هەژاران ببیستن و بە هانایانەوە بچن.'

"پاشـام، بابەتێکی دیکە کە پێویسـتە ئاگادار بن، ئەویش ئەوەیە کە ئەردەشـیر جیهانی گرت و کردی بە چوار بەشـەوە. بۆ هەر بەشـەی ئەنگوسـتیلەیەکی چێ کردبوو، وێنەیەکی تایبەتی بەســـەرەوە بوو. یەکەمین ئەنگوســـتیلەیان ئەنگوســـتیلەی دەریا و بای خوازراو و پشـتیوانی بوو کە وێنەی گژوگیا و ڕووەکی پێوە بوو. ئەنگوسـتیلەی دووەم ئەنگوستیلەی پیتاک بوو کە وێنەی بینایەکی بەسـەرەوە بوو. سـێیەمین دانە ئەنگوسـتیلەی ڕزق و ڕۆزی بوو کە هاتی[1] لەســـەر کێشـرابوو و چوارەمین دانە ئەنگوسـتیلەی سـتەملێکراوان بوو کە لەســـەری نووســـرابوو: دادپەروەری. ئیدی ئەو دابە لەنێو پاشـایانی فارسـدا مابووەوە تا

---

١. هات: خێر و بەرەکەت، ڕزق و ڕۆزی.

هاتنی ئیسلام. ئەو دەم کەسرا کوڕێکی لەنێو سپادا بوو کە بۆی نووسی: 'ئەوەندەیان مەدەیە کە حەوجێیان بە تۆ نەبێ و، ئەوەندەشیان گوشار بۆ مەهێنە لێت نارەحەت بن؛ لەگەڵیان مامناوەندییانە بجووڵێوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەست و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ ' کەسرا بۆ کوڕەکەی نووسی: 'ئەوەندەیان مەدەیە کە حەوجێیان بە تۆ نەبێ و، ئەوەندەشـــیان گوشـــار بۆ مەهێنە لێت نارەحەت بن؛ لەگەڵیان مامناوەندییانە بجووڵێوە.' دەگێڕنەوە کە چەند عەرەب هاتنە لای خەلیفە مەنســـوور و گوتیان: 'وا لەگەڵ سەگەکەت بجووڵێوە دوات کەوێ.' مەنسوور بەو قسەیە قەڵس بوو. ئەبوولعەباسی تووسی گوتی: 'مەبەســـتی ئەوەیە یەکی دیکە نانی نەداتێ تا ســـەگەکەت بڕوا دوای ئەو کەوێ.' مەنسوور کە ئەوەی بیست ڕقەکەی نیشتەوە.

" 'عومەری کوڕی خەتتـاب هەر کـاتێک خزمەتکـاری دەگرت، چوار مەرجی لەگەڵ دەبڕییەوە: سواری ئەسپ نەبێ، جلوبەرگی جوان لە بەر نەکا، کاری بە دەستکەوت نەبێ، کاتی خۆی نوێژەکانی بکا.

" 'پێشـینیان گوتویانە کە هیچ سـامانێک لە ژیری باشـتر نییە، ژیریش لە ڕاوێژ چاکتر نییە، ڕاوێژیش لە خۆپاریزی باشتر نییە. هیچ نیزیکییەکیش لە خولق و خووی باش باشتر نییە. هیچ هەڵســـەنگاندێک لە ئەدەب و هیچ بەرژەوەندییەکیش لە ســـەرکەوتن و هیچ بازرگانییەک لە ئاکاری چاک و هیچ قازانجێک لە ڕەزامەندی خودا باشـــتر نییە. هیچ خۆبواردنێک لە مانەوە لە ســـنووری ســـوننەت و هیچ زانســـتێک لە بیرکردنەوە و هیچ باوەڕێک لە بەحەیایی و هیچ شەرەفێک وەک زانست نییە.

" 'عەلی کوڕی ئەبووتالیب گوتوویەتی: 'لە ژنانی خراپ خۆ ببوێرن لە چاکەکانیشـــیان بترسن، پرسیان پێ مەکەن و زۆریشیان تەنگ پێ هەڵمەچنن با نەکەونە بیری فروفێڵەوە.'

" 'دەڵێن ژنان سێ جۆرن: ژنێک پاک و دڵسۆز و زایێ[1] بێت کە لە کارەساتەکانی ژیاندا پشـتی مێردەکەی دەگرێ. جۆری دووەم هەر بۆ زاوزێ دەبێ و بە کاری هیچی دیکە نایە. جۆری سێیەم، وەک زنجیر وایە، خودا کێی پێ خۆش بێ دەیکاتە ملییەوە.

" 'پیاوانیش سێ دەستەن: پیاوێک هەیە ژیرە و بە ڕاوێژ کار دەکا. پیاوێک هەیە ئەگەر گرفتێکی بۆ بێتە پێش، نازانێ چۆنی چارە بکا و لەگەڵ کەســـانی ژیر و بەئەزموون ڕاوێژ دەکا. پیاوێکیش هەیە کە گێژ و دەســـتەوەســـتانە، نە بۆخۆی کارێکی لە دەســـت دێ و نە پرس بە کەس دەکا.

" 'پاشای بەڕێز، دادپەروەری لە هەموو شوێنێک جێی هەیە و خەڵک دەبێ بە ویژدان و دادپەروەر بن. لە جەردە و ڕێگران دەگێڕنەوە کە ئەوان هەرچەند کـاریـان ســـتەمە لە

---

١. زایێ: ژنێک کە منداڵی دەبێت.

ڕێبواران، بەڵام لە کارەکەی خۆیاندا ئەگەر بێتو ویژدان و دادگەری لە بەرچاو نەگرن. کۆمەڵەکەیان دەشێوێ و لێک دادەبڕێن. بە کورتی جوانترین ڕەوشتی چاک دڵاوای و لەسەرخۆییە.'

"وا بوو نوزهەتوززەمان لەبارەی ڕێوشوێنی سەرداریەوە وای قسە کرد کە دانیشتووان گوتیان: 'بە ڕاستی تا ئێستا کەسیان نەدیوە لەو بارەوە ئاوا قسە بکا. خۆزگە ئەو کەنیزە لە بوارێکی دیکەشدا قسەیەکمان بۆ بکا. بەشکو ئێمەش شتێکی لێ فێر بین.' نوزهەتوززەمان کە ئەو قسەیەی بیست، گوتی: 'بەڵام بواری ئەدەب بەستێنێکی بەربڵاوی هەیە. چونکە کۆی هەموو تەواوییەتێکە.'

"دەگێڕنەوە کوڕی تەمیم هاتە لای موعاوییە، ئەحنەفی کوڕی قەیسیشی لەگەڵ بوو. پەردەداری موعاوییە مۆڵەتی بۆ وەرگرتن. موعاوییە مۆڵەتی دان و بە ئەحنەفی کوڕی قەیسی گوت: 'بابی بەحر، وەرە پێشتر با گوێم لە قسەکانت بێ.' ئەحنەف هاتە پێشەوە. موعاوییە پرسی : 'دەبێ چ بکرێ؟' ئەحنەف گوتی: 'سەرت بتاشە، سمێڵت کورت کەوە، نینۆکت بکە و تووکی بنهەنگڵ و بەرت خاوێن بکەوە، سیواکت لە بیر نەچێ، چونکە حەفتا و دوو قازانجی هەیە و، خۆ شوشتنی هەینی گوناهی ئەو حەوتووەت دەشواتەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەحنەف گوتی: 'خۆشوشتنی هەینی گوناهەکانی ئەو حەوتووەت دەشواتەوە.' موعاوییە پرسی : 'ئەتۆ چ دەکەی ئەگەر تووشی کەسێکی هۆزی خۆتان بی؟' گوتی: 'بە ئەدەبەوە سەرم دادەخەم و سڵاوی لێ دەکەم. باسی ئەو شتە ناکەم کە پێوەندی بە منەوە نییە و زۆربلێی ناکەم.' موعاوییە گوتی: 'ئەگەر تووشی کەسێکی وەک خۆت بی، چ دەکەی؟' ئەحنەف گوتی: 'ئەگەر قسە بکا، گوێی لێ ڕادەگرم. ئەگەر هێرشم بکاتە سەر، ئەمن جوابی نادەمەوە.' موعاوییە گوتی: 'ئەگەر لەگەڵ سەرداران تێ کەوی؟' ئەحنەف گوتی: 'سڵاو دەکەم و چاوەڕێی وەڵامەکەم دەبم. ئەگەر بانگیان کردمە پێشێ، دەچمە پێشێ. ئەگەر دەریان کردم، دەڕۆم.' موعاوییە گوتی: 'لەگەڵ ژنەکەت چی؟' ئەحنەف گوتی: 'وەڵامی ئەوەیانت لێم نەوێ.' موعاوییە گوتی: 'با سوێند نەخۆم دەبێ پێم بڵێی.' ئەحنەف گوتی: 'بەسەر و ڕوویەکی خۆشەوە سڵاو و چاک و خۆشی لەگەڵ دەکەم و نەفەقەکەی بۆ زۆر دەکەم، چونکە ژنیان لە کەلەکەی چەپ دروست کردووە.' موعاوییە گوتی: 'ئەی ڕات لەسەر جووتبوون چییە؟' گوتی: 'قسەی لەگەڵ دەکەم تا کەیفی ساز دەبێ، دەستبازی و عیشقبازی لەگەڵ دەکەم تا ئارەزووی دەبزوێ، ئینجا نزیکی لەگەڵ دەکەم. ئەگەر هاتم تۆوەکەی لەنێو کەم، دەڵێم: 'خودایە بەفەڕ و موبارەکی کە و دڵڕەقی مەکە و بە جوانترین شێوە سیمای جوان کە.'[1] دوایی هەڵدەستم ئاوێک بە خۆمدا دەکەم و دەستنوێژ دەگرم و ئینجا شوکری خودا دەکەم.'

"موعاوییە گوتی: 'وەڵامەکەکانت جوان بوون. جا ئێستا چت لە من دەوێ، بیڵێ.' ئەحنەف گوتی: 'ئەمن ئەوەندەم لە تۆ دەوێ لە خودا بترسە و لەگەڵ خەڵک دادگەر بە.' دوای ئەوە ئەحنەف هەستا و لەگەڵ کوڕەکەی موعاوییە چووە دەرێ. موعاوییە گوتی: 'ئەگەر لە عێراقدا جگە لەم پیاوە زانایەکی دیکەی تێدا نەبێ، هەر ئەوە بەسە.' نوزهەتوززەمان گوتی: 'ئەوە ئاماژەیەک بوو لە بواری ئەدەبدا.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. اللهم اجعله مباركا و لا تجعله شقيا و صورها احسن تصويرا.

## که شەوی شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوزهەتوززەمان گوتی: 'ئەی پاشای بەڕێز، موعەیقیب لە زەمانی عومەردا بەرپرسی بەیتولماڵ بوو. ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت تووشی کوڕەکەی عومەری کوڕی خەتتاب بوو و درەمێکی لە بەیتولماڵ دایە. موعەیقیب گێڕاویەتەوە کە دوای ئەوەی درەمەکەم دا کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب، چوومەوە ماڵی خۆمان. تەماشام کرد ڕاسپاردەی عومەر هات و منی برد بۆ لای عومەر. کە چووم، سەیرم کرد درەمێکی بە دەستەوە گرتووە، پێی گوتم: 'هۆی موعەیقیب، وریا بە! دەترسم لە ڕۆژی پەسڵاندا لەسەر ئەو درەمە خەڵک بەرەنگارت بنەوە.' عومەر نامەیەکی بۆ ئەبوومووسای ئەشعەری نووسی و پێی گوت: 'کاتێک ئەو نامەیەت خوێندەوە، ئەوەی کە دەبێ بیدەی بە خەڵک، بیاندەیە و پاشماوەکەشی بێنەوە لای خۆم.' ئیدی ئەبوومووسا ئاوای کرد کە عومەر پێی گوتبوو. کە خەلافەت گەیشتە دەست عوسمانیش، نامەیەکی لەوەی عومەری نووسی. ئەبوومووسا وەک پێشتر ئاوای کرد کە پێیان گوتبوو و پیتاکەکەی بە زیاددا ناردەوە. کە زیاد پیتاکەکەی هێنایەوە بۆ لای عوسمان، کوڕی عوسمان هات و درەمێکی لێ هەڵگرت. زیاد گریا. عوسمان گوتی: 'ئەوە بۆ دەگری؟' زیاد گوتی: 'من پیتاکم هێناوە لای عومەر، کوڕەکەی درەمێکی هەڵگرت، عومەر فەرمانی دا و لێیان سەندەوە. بەڵام ئێستا ئەو کوڕەی تۆ درەمێکی هەڵگرت و کەس کاری پێی نەبوو و لێی نەستەندەوە و هیچیشی پێ نەگوت.' عوسمان گوتی: 'تازە هی وەک عومەر نابینیتەوە.' زەیدی کوڕی ئەسلەم لە زمان بابییەوە دەگێڕێتەوە کە شەوێک لەگەڵ عومەر چووینە دەرێ. لە دوور ئاورێکمان دیت، عومەر گوتی: 'پێم وایە کاروانێک بێت و لە تاو سەرما ئاگریان هەڵکردبێت. وەرە با بچینە لایان.' ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ئەوێ. سەیرمان کرد ئەوە ژنێک قابڵەمەیەک ئاوی وە سەر ئاور ناوە و هەر ئاورەکەی بۆ خۆش دەکا و دوو-سێ منداڵی سەروپێچکەش لە لای دەگرین و دەکرووزێنەوە. عومەر گوتی: 'سڵاوت لێ بێ خاوەنی ڕووناکییەکە.' نەیگوت خاوەنی ئاگر. ژنە گوتی: 'ئەوە سەرما دەمانبا.' عومەر گوتی: 'ئەو منداڵانە بۆ دەگرین؟' ژنە گوتی: 'لە برسان.' عومەر گوتی: 'ئەو قابڵەمەیە چییە؟' ژنە گوتی: 'ئاوی تێدایە بۆ بێدەنگکردنی ئەو منداڵانە با وا بزانن ئەوە چێشتە. خودا حەقی ئەو منداڵانە لە عومەر بکاتەوە!' عومەر گوتی: 'دۆخی ئەوانە چ پێوەندییەکی بە عومەرەوە هەیە؟' ژنە گوتی: 'ئەی چۆن خۆی بە والی خەڵک دەزانێ و ئاگاشی لە حاڵی خەڵکەکەی نییە؟' ئەسلەم دەگێڕێتەوە کە عومەر ڕووی لە من کرد و گوتی: 'وەرە.' ئیدی گەڕاینەوە ماڵیخەرجی. عومەر تەلیسێکی ئارد هێنا لەگەڵ دەفرێک ڕۆن و گوتی: 'ئەوانەم بە کۆڵدا دە.' من گوتم: 'شتی وا نابێ؛ دەبێ من هەڵیانگرم.' گوتی: 'ڕۆژی پەسڵانیش گوناحەکانم بە کۆڵتدا دەدەی؟' ئیدی خۆی هەڵیگرتن و ڕۆیشتین

و ئـارد و ڕۆنەکەمـان برد بۆ ژنەکە. ژنە خەریکی چێشـــتلێنـانەکە بوو، عومەر بە فوو ئـاورەکەی دەگەشـــاندەوە بە جۆرێـک تەواوی ڕیش و گیـانی دووکەڵاوی بوو، هەتـا چێشتەکەیان ساز بوو. ئیدی ئارد و ڕۆنەکەمان بەجێ هێشت و گەڕاینەوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوزهەتوززەمان گوتی: 'ئەی پاشای جیهان، بەشی دووەم لە باسی ئەدەبدا لەبارەی چاکەکارانەوەیە. حەسەنی بەسری گوتوویەتی کە مرۆڤ دەمری سێ داخی لە سەر دڵە: یەکیان کەڵکوەرنەگرتن لەو ماڵەی کۆی کردووەتەوە، دووەمیان نەگەیشتن بە ئاواتەکانی، سێیەمیان پاشەکەوتنەکردنی شتێک بۆ ئەو سەفەرەی لە پێشیدایە. لە سوفیانیان پرسی: 'کەسێک ماڵی هەبێ، دەتوانێ پارێزکار و تەرکەدنیا بێ؟' سوفیان گوتی: 'بەڵێ، کاتێک بەڵایەکی بەسەردا دێ، لە سەرخۆ و هێور بێ. کاتێک بەسەریدا دەرژێ، سپاسگوزار بێ.' دەشگێڕنەوە دەڵێن: 'کاتێک عەبدوڵڵا شەدداد لە ئاویلکەداندا[1] بوو، بانگی کوڕەکەی کرد وەسییەتی بۆ بکا کە کوڕم ئەوا من دەمرم، تۆ لە رواڵەت و دەروونتدا خۆپارێز بە و سپاسگوزاری بەخششەکانی خودا بە. دایمە ڕاستگۆ بە.'

"دوای ئەوە نوزهەتوززەمان گوتی: 'پاشا، با ئەوەش بڵێم کاتێک خەلافەت گەیشتە دەست عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، خاوخێزانی خۆی کۆ کردەوە و ئەوەی بوویان لێی سەندن و لە بەیتولماڵدا داینا. ئەوان چوون لە لای پووری عومەر، کە فاتمەی کچی مەروان بوو، شکایەتیان کرد. فاتمە کەسێکی ناردە لای عومەر و گوتی: 'دەمهەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.' شەو چوو بۆ لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز. عومەر لە یەسترەکە دایگرت و پێکەوە دانیشتن. گوتی: 'پوورێ، وا دیارە کارێکت هەیە، بڵێ بزانم چ کارێکە؟' فاتمە گوتی: 'ئەتۆ ڕەنگە بۆ ئەوە بشێی قسەت لەگەڵ بکرێ.' عومەر گوتی: 'خودا محەممەدی وەک ڕەحمەت بۆ خەڵکی دنیا نارد و ئەوەی باش بوو بۆی هەڵبژارد. پاشان محەممەدی بردەوە لای خۆی.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. ئاویلکەدان: لە سەرەمەرگدا بوون.

## که شەوی شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە فاتمەی گوت: 'خودا پێغەمبەری بردەوە بۆ لای خۆی و چۆمێکی بۆ خەڵک بەجێ هێشـــت هەتا تێری لێ بخۆنەوە. کە ئەبووبەکر بوو بـە خەلیفە، چۆمەکەی وەک خۆی هێشـــتەوە، ڕێی بۆ خـاوێن کردەوە و جۆماڵی کرد و خودای پێ خۆشـحاڵ کرد. کە گەیشـتە عومەر، ئەویش زۆر کاری باشـی کرد و دەرد و زەحمەتی تووش بوو. کە نۆرەی خەلافەت گەیشتە عوسمان، ئەو لەو چۆمە هێنـدێک لقی لێ جیـا کردەوە. دوایی لەو لقەش چەنـدین لقی دیکەی جیـا کردەوە، دوای ئەویش یەزید و مەروانیش هەر ئاوایان کرد هەتا گەیشـتە من. من دەمهەوێ ئەو جۆگەلانە هەڵبڕم و بیانخەمەوە ســـەر چۆمەکە و وەک خۆی لێ بکەمەوە.' فاتمە گوتی: 'ئەگەر ئەوە قســەی تۆ بێ، ئەمن قسـەیەکم نییە.' ئیدی هەسـتا گەڕاوە لای خاوخێزانی عومەر و گوتی: 'عومەر هێندێ شتی گوت کە ئەمن نەمتوانی هیچ بڵێم.'

"نوزهەتوززەمان گوتی: 'لە بارەی عومەرەوە لەو جۆرە بەســـەرهاتانە زۆرن، بۆ وێنە دەگێڕنەوە یەکێـک لە بـاوەڕپێکراوان گوتوویەتی کە لە ســـەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا بە لای شـــوانێکدا تێپەڕیم، دیتم گورگ و مەڕی پێکەوە دەلەوەڕاند. پێم وا بوو ئەو گورگانە سـەگی شـوانەکەن، چونکە تا ئەو ڕۆژە گورگ و مەڕم پێکەوە نەدیتبوو. لە شـوانەکەم پرسـی: 'ئەو هەموو سـەگەت بۆ ڕاگرتووە؟' شـوانەکە گوتی: 'ئەوانە گورگن، خۆ ســـەگ نین.' گوتم: 'چۆن گورگ و مەڕ پێکەوە دەبن؟! ئەوە هیچیـان لێ نـاکەن؟!' شوانەکە گوتی: 'ئەگەر سەر ساخ بێ، لەش ساخ دەبێ.'

" 'دەگێڕنەوە ڕۆژێک عومەر لەســـەر مینبەرێکی قوڕین قسـەی دەکرد. دوای سـپاس و سـتایشـی خودا، دوو قسـەی لەگەڵ خەڵکەکە کرد. یەکەمیان ئەوە بوو گوتی: 'هۆ خەڵکینە، ناختان باش بکەن، تا ڕواڵەتیشـــتان باش ببێ.' دوای ئەوە گوتی: 'کاری ئەو دنیایەتان بە باشی بەڕێوە بەرن، با کاری دواڕۆژیشتان باش ببێ.' ڕۆژێک مەسلەمە بە عومەری کوڕی عەبدوللعەزیزی گوت: 'ئەگەر ڕێم بدەی پاڵپشتییەکت بۆ ساز دەکەم تا ئەگەر جارجار پێت خۆش بوو، پاڵی پێوە دەی.' گوتی: 'دەترسم ڕۆژی قیامەت بە بۆنەی منەوە تووشی گوناح بێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی شەست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوزهەتوززەمان پاشماوەی بەشی دووەمی ئاوا دەست پێ کرد: 'بە ڕێکەوت عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نامەیەکی بۆ حاجیانی ماڵی خودا نووسی و نامەکە ئاوا بوو: 'دوای خۆم، لە شەهرولحەرام و بەلەدولحەرام و ڕۆژی حەجی گەورەدا خودا بە شایەد دەگرم کە ئەمن دژی ئەو کەسەم ستەم لە ئێوە بکا. دیسان مۆڵەت بە کەسیش نادەم ستەم لە کەسی دیکەش بکا. چونکە لەسەر ستەملێکراوان لێپرسینەوەم لەگەڵ دەکرێ. وریاش بن ئەگەر دیتتان هەرکەس لە میران و سەرداران و دەستوپێوەندەکانی من لە ڕێی سوننەت و قورئان لای داوە، ئێوە مەکەونە شوێنی و بۆ لای ڕاستی بگەڕێنەوە.

" 'یەکێک لە باوەڕپێکراوان گێڕاویەتەوە، گوتوویەتی کە چوومە لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، دوازدە درەمم لەبەردەمیدا دیت. گوتی: 'ئەوانە هەڵگرن و بیانبەن بۆ بەیتولماڵ.' ئەمن گوتم: 'ئەی خەلیفە، ئەتۆ لە دەمی منداڵەکانی خۆت دەگرییەوە؟ شتێکیان بدەیە.' منی بانگ کردە لای خۆی و گوتی: 'ئەوەی دەڵێی شتێک بدە بە ژن و منداڵەکانت، قسەیەکی جوان نییە، چونکە خودا خۆی ڕسقی منداڵەکانم دەدا. بڵێی کەسی وا بێ لە ترسی خودا خۆ لە زۆر کار نەدا و خودا ڕسقی نەدا؟ ئایا کەسی وا هەیە لە گوناح و خراپە دوور کەوێتەوە، خودا گرێ لە ژیانیدا نەکاتەوە؟' ئیدی خاوخێزانی کۆ کردنەوە کە دوازدە کەس بوون، پێی گوتن: 'یان دەبێ ئێوە دەوڵەمەند کەم و بچمە دۆزەخ، یان ئێوە هەر ئاوا بن و من بچمە بەهەشت.' دوایە گوتی: 'هەستن، بڕۆن بە خوداتان دەسپێرم.'

" 'خالیدی کوڕی سەفوان گێڕاویەتەوە کە لەگەڵ یۆسفی کوڕی عومەر چووین بۆ لای هیشامی کوڕی عەبدولپاشا. هیشام لەگەڵ کەس‌وکار و نۆکەرانی لە دەرەوە خێوەتیان هەڵدابوو. کە خەڵکەکە لە کۆڕەکەیدا کۆ بوونەوە، خۆی لە گۆشەیەکی دۆشەکەکەدا دانیشت. ئەمن گوتم: 'خەلیفە، خودا سەد هێندەت داتێ، هیوادارم ئەو شادییەت لێ تێک نەدا. ئەمن لە چاو ئامۆژگاری پاشایانی پێشوو چی زیاترم پێ شک نایە، عەرزتی بکەم.' کە ئەو قسەیەی بیست، لەسەر دۆشەکەکە ڕاستەوە بوو، جوان دانیشت و گوتی: 'کوڕی سەفوان، بڵێ بزانم چییە؟' خالید گوتی: 'خەلیفە، پێش تۆ پاشایەک هاتە ئەو وڵاتە و بە دانیشتووانی کۆڕەکەی خۆی گوت: 'ئەرێ هەتا ئێستا کەسی وەک من گەورە و دەستڕۆیشتوو و دەسەڵاتدارتان دیوە؟' لەنێو خەڵکە بەردەنگەکەیدا پیاوێکی پیری گەڕیدە و دنیادیتووی تێدا بوو، گوتی: 'پاشا، پرسیارێکی زۆر گەورەت کرد. ئەگەر ڕێم بدەی، وەڵامت بدەمەوە.' پاشا گوتی: 'وڵامەکەت چییە؟ بیڵێ.' گوتی: 'ئەو ماڵ و دەسەڵات و گەورەییەی هەتە، هەتاهەتایە یا گۆڕانی بەسەر دێ؟' پاشا گوتی: 'گۆڕانی بەسەر دێ.'

ئەو پیاوە گوتی: 'دەی چۆن باسی شتێک دەکەی کە ماوەیەک هەیە و تەواو دەبێ و لەو سەرەوە مووبەمووو لێت دەپرسنەوە؟' پاشا گوتی: 'ئەی چار چییە؟' ئەو پیاوە گوتی: 'چار ئەوەیە لە وڵاتی خۆت دانیشی و خەریکی خودا پەرستی خۆت بی. یان ئەوە جلێکی کۆن لە بەر کەی و خەریکی عیبادەت بی تا دەمری.' ئیدی کابرا لە لای پاشا هەستا بچێتە دەرێ و گوتی: 'بەیانی دێمەوە لات.' خالید دەڵێ کە ڕۆژ بووەوە، ئەو کابرایە هەستا چووەوە لای هێشام. سەیری کرد ئەوە هەر بە هۆی ئەو قسەیەی ئەوەوە تاج و تەختی ناوەتە لاوە و خۆی بۆ سەفەر ساز کردووە. ئیدی هێشام ئەوەندە گریا، چەنەگەی تەڕ بوو. فەرمانی دا، کەلوپەلی دەسەڵاتداری لێ دوور خەنەوە. بۆخۆی لە سووچێکی کۆشکدا دانیشت. نۆکەر و شت هاتنە لای خالیدی کوڕی سەفوان و گوتیان: 'ئەوە چ کارێک بوو لەگەڵ خەلیفەت کرد؟ ژیانت لێ تاڵ کرد.' نوزهەتوززەمان کەمێک مات بوو، پاشان گوتی: پاشا، ئەو بوارە گەلێک پەند و ئامۆژگاری تێدایە کە لەو کۆڕەدا نایگێڕمەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوزهەتوززەمان بە شەرکانپاشای گوت: 'ئەو بوارە گەلێک پەند و ئامۆژگاری تێدایە کە لەو کۆڕەدا نایگێڕمەوە، بەڵام ئیشەڵڵا بەرەبەرە دەگێڕدرێنەوە.' ئیدی قازییەکان گوتیان: 'بەڕێز پاشـــا، لە دنیادا نموونەی وەک ئەو کەنیزە نییە و ئێمە ئەدیب و دانای ئاوامان نەدیوە.' ئەوجار قازییەکان پەسنی پاشایان کرد و ڕۆیشتنەوە. پاشا فەرمانی بە نۆکەر و قەرەواشەکان دا هەتا پێداویستی ئاهەنگێکی خۆش تەیار کەن و بانگی مۆسیقار و گۆرانیبێژ بکەن. هەموو جۆرە خواردن و حەڵوایەک ســـاز کەن. ئیدی هەموو کەس خواردنی خوارد. کە بوو بە شەو، لە دەروازەی قەڵاوە هەتا دەرکی کۆشک مۆمیان هەڵکرد. وەزیران و ئەمیران و گەورەکانی دەربار هەموو لە لای پاشا کۆ بوونەوە و ئارایشگەران خەریکی ڕازاندنەوەی نوزهەتووززەمان بوون، سەیریان کرد پێویستی بە ئارایش نییە. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

بۆن خۆشـــی و بســـکت شـــانە کراوە
کوا پێویســـتیت بە ســـووراو و ســـپیاوە

"ئیدی شـــەرکانپاشـــا هاتە پەردەوە و ئارایشـــگەرەکانیش بووکیان هێنا. چارشـــێویان لەســـــەر لا برد، ئەوەی لە شـــەوی یەکەمدا بە کچانی دەڵێن، فێری ئەویشـــیان کرد. شـــەرکانپاشـــا هەســـتا و لە ئامێزی گرت و ئاوێتەی یەکتر بوون، هەر ئەو شـــەوە نوزهەتوززەمان دووگیـان بوو، شـــەرکانیشـــی لە دووگیـانییەکەی ئـاگـادار کردەوە. شـــەرکانپاشـــا خۆشـــحاڵ بوو گوتی: 'ڕێکەوتی دووگیانبوونەکەی بنووســـن.' کە ڕۆژ بووەوە، شەرکانپاشا نهێنینووسی بانگ کرد و پێی گوت: کە نامەیەک بۆ نوعمانپاشای بابی بنووســـێ و ئاگاداری کاتەوە کەنیزێکی کڕیوە خاوەن وێژە و بەهرە و لێزانییە و زانســـتەکانیش دەزانێ. دەشـــینێرێتە بەغدا بۆ لای زەوئولمەکانی برای و نوزهەتوززەمانی خوشکی. بە نووسەرەکەی گوت: 'یەکجاری ئەوەش بنووسە کە لەگەڵ ئەو کەنیزە جووت بوون و ئێســـتا دووگیانە.' ئیدی نامەکەی پێچاوە و مۆری کرد. دای بە نامەبەر و بەڕێی کرد. نامەبەرەکە دوای مانگێک گەڕاوە و وەڵامی نامەکەی هێناوە و دای بە شـەرکانپاشـا. پاشا نامەکەی وەرگرت و خوێندییەوە. سەیری کرد ئەوە دوای 'بسم الله' نووسراوە: 'ئەو نامەیە لە لایەن لێقەوماو و سەرگەردان، نوعمانپاشا کە زەوئولمەکان و نوزهەتوززەمانی لێ ون بووە و تووشی نەگبەتی و ڕۆژڕەشی دنیا بووە، نووسراوە بۆ شەرکانی کوڕی کە دوای ڕۆیشـتنی ئەو تاریکی باڵی بەسـەر ژیانیدا کێشـا، بە جۆرێک کە هەر باسـی ناکرێ.

ڕووداوەکە ئاوا بوو: زەوئولمەکان تکای لێ کردم بچێ بۆ حەج، بە داخەوە من لە ترسی کارەساتی ژیان نەمویرا مۆڵەتی بدەم و نەمهێشت. دوای ئەوە چووم بۆ ڕاو و ماوەی مانگێک لە ڕاوگە بووم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەست و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوعمانپاشا نووسیبووی: 'من ماوەی مانگێک لە ڕاو بووم. کە هاتمەوە تەماشام کرد ئەوە براکەت و خوشکەکەت، زەوئولمەکان و نوزهەتوززەمان، کەمێکیان ماڵ هەڵگرتووە و لەگەڵ حاجیان بەرەو ماڵی خودا ڕۆیشتوون. کە زانیم ڕۆیشتوون، دنیام لە بەرچاو تەنگ و تاریک بوو. ناچار چاوەڕێی هاتنەوەی حاجیان بووم. کە حاجییەکان هاتنەوە و هەواڵی ئەوانم پرسی، کەس هەواڵیانی نەدەزانی. ئیدی دنیام لە بەرچاو تاریک بوو و شەو و ڕۆژ پیشەم بوو بە شین و گریان.

تیخ و تیر بوو دەدرا لە دڵ و جگەرم
شێت و شەیدا بووم لە تاوی کچ و کوڕم
نە هەواڵێکم لەوانەوە بۆ دەهات
نە دەمزانی بەرەو کوێ هەڵگرم سەرم

" 'ئێستا لە تۆم دەوێ کە کەمترخەمی نەکەی، بە پێوشوێنیانەوە بی و ئەو ئابڕووچوونە بشۆیەوە. وەسسەلام.'

کە شەرکانپاشا نامەکەی بابی خوێندەوە، بە ناڕەحەتی و خەمی بابی خەمبار بوو. بەلام بۆ ونبوونی خوشک و براکەی خۆشحاڵ بوو. ئیدی نامەکەی پێچاوە و هەستا چوو بۆ لای نوزهەتوززەمانی ژنی کە ئەو دەم نەیدەزانی نوزهەتوززەمان خوشکیەتی. ئەویش نەیدەزانی کە شەرکانپاشا برایەتی. کورتی کەینەوە، کاتێک نۆ مانگ بەسەر دووگیانبوونی نوزهەتوززەماندا تێپەڕی، ژانی هاتێ و خودا ڕەحمی پێ کرد و منداڵ بوونەکەی بۆ سانا کرد و کچێکی بوو. بە شەرکانپاشای گوت: 'ئەوە کچی خۆتە و هەر ناوێکی پێت خۆشە لێی بنێ.' پاشا گوتی: 'خەڵک ڕۆژی حەوتەم ناو لە منداڵ دەنێن.' شەرکان سەری بردە پێشێ و کچەکەی ماچ کرد. سەیری کرد ئەوە یەکێک لەو گەوهەرە گرانبایییانەی کە شازادە ئەبریزە لە وڵاتی ڕۆمەوە هێنابووی، لە ملی ئەو کچەدایە. ئەوەندە تووڕە بوو وەک شێتی لێ هات و هۆشی بە لای خۆیەوە نەما. بە نوزهەتوززەمانی گوت: 'کەنیزەکە، ئەو زێڕەت لەکوێ هێناوە؟' نوزهەتوززەمان کە ئەو قسەیەی بیست، تووڕە بوو بە شەرکانی گوت: 'من خانمی تۆ و تەواوی ئەو کەسانەم کە لەو کۆشکەدان. شەرم ناکەی بە من دەڵێی کەنیز؟ ئەمن نوزهەتوززەمانی کچی نوعمانپاشام.' کە شەرکان ئەو قسەیەی بیست، تەواوی گیانی لەرزی و وە دڵەکوتە کەوت و سەری بەر داوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی شەست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که شەرکان ئەو قسەیەی بیست، تەواوی گیانی لەرزی و وە دڵەکوتە کەوت و سەری بەر داوە. دڵەڕاوکێکەی ئەوەندە زۆر بوو، بێهۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە، بە سەرسووڕمانەوە چووە فکرەوە. ئیدی خۆی پێ نەناساند و لێی پرسی: 'خانم، تۆ کچی نوعمانپاشای؟' نوزهەتوززەمان گوتی: 'بەڵێ.' شەرکان هۆی دوورکەوتنەوەکەی لە بابی لێ پرسی. نوزهەتوززەمان هەر لە سەرەتای ڕۆیشتنیان بۆ حەج هەتا کۆتاییەکەی بۆ گێڕاوە، تێی گەیاند ئەوە زەوئولمەکان نەخۆشە و لە بەیتولموقەددەس ماوەتەوە. فریودانی لە لایەن دەشتەکییەکەوە و فرۆشتنی بە بازرگانەکە و ... هەموو شتێکی بۆ گێڕاوە. کە شەرکانپاشا ئەو بەسەرهاتەی بیست، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'چۆن خوشکی خۆم هێنا؟! وا چاکە بە مێردی بدەمەوە و بیدەم بە پەردەدارێک. دوای ئەوەی هەموو شتێک ڕوون بووەوە، بڵێم هەر ئەو دەم پێش ئەوەی نزیکی لەگەڵ بکەم، تەلاقم دا و لێی جودا بوومەوە و دام بە پەردەدارێک.' ئیدی شەرکان وڕ و کاس بوو. ئینجا سەری هەڵێنا و بە خەجاڵەتییەوە بە نوزهەتوززەمانی گوت: 'تۆ خوشکی منی. ئەمنیش شەرکانی کوڕی نوعمانپاشام. لە خودا دەپاڕێمەوە لەو هەڵەیەم خۆش بێ.' نوزهەتوززەمانیش کە ئەوی ناسییەوە، دەستی کرد بە گریان و لە خۆدان و خۆڕنین و دەیگوت: 'تووشی هەڵە و گوناحی زۆر گەورە بووین!'

"ئێستا ئەگەر دایک و بابم لێم بپرسن: 'ئەو کچەت لەکوێ بوو؟ من بڵێم چی؟' شەرکانپاشا گوتی: 'چارە هەر ئەوەیە کە تۆ بدەم بە پەردەدارێکی خۆم و کچەکە لە ماڵی پەردەدارەکە پەروەردە بکە و مەهێڵە کەس بزانێ کە خوشکی منی.' ئیدی دڵخۆشی نوزهەتوززەمانی داوە و دەست و ڕوومەتی ماچ کرد.

"نوزهەتوززەمان گوتی: 'دەبێ چ ناوێک لەو کچەم بنێم؟' شەرکان گوتی: 'ناوی بنێ 'قەزافەکان'[1].' ئیدی شەرکان خوشکەکەی بە سەرپەردەدارێک دا. ئەوی لەگەڵ 'قەزافەکان'ی کچی نارده ماڵی پەردەدارەکە. نوزهەتوززەمان کاری بێرە گەیشت.

"بە ڕێکەوت هەر لەو ڕۆژەدا پەیامهێنی نوعمانپاشا هات نامەیەکی هێنا کە تێیدا نووسرابوو: 'کوڕی خۆم، هەر وەک دەزانی من تووشی نەهاتی و دەرد و پەژارەی دووری منداڵەکانم بووم و لە تاوان خەو و خۆراکم نییە. جا ئەگەر ئەو نامەیەت بە دەست گەیشت، دەستبەجێ پیتاکی دیمشقم بۆ بنێرە لەگەڵ ئەو کەنیزەی کە کڕیوتە و لە خۆت مارە کردووە و تاریفی بەرزی پلەی خوێندەواری و وێژە و زانستی دەکەی. پیرێژنێکی چاکەکار

١. قضیفکان: لە قەدەرەوە بڕیار درا و بوو.

لەگەڵ پێنج کەنیزی تازەپێگەیشـــتوو هاتوونەتە ئێرە کە کەنیزەکان لە زانســـت و وێژە و دانایی دا تایان نییە و من ناتوانم پەسنیان بکەم و زمانێکی پاراویشیان هەیە. من کە ئەوانم دیت، پێم خۆش بوو لە کۆشـــکدا بن و کەنیزی خۆم بن. لەبەر ئەوەی لە وڵاتەکانی دیکە شـتی وای لێ نییە. لە پیرێژنەم پرسـی: 'نرخیان چەندەیە؟' گوتی: 'نرخیان پیتاکی دیمشـقە.' بەڵام ئەوانە زۆر لەوە زیاتر دێنن. هەر بۆیە من بە پیتاکی دیمشـق ڕازی بووم. کەنیزەکانم لێ کڕی و هێنامنە کۆشـــکەوە. جا بۆیە زوو پیتاکی دیمشـــقم بۆ بنێرە، چونکە پیرێژنە دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی ڕۆم. بەڵام ئەو کەنیزە کە کڕیوتە، بۆم بنێرە بـا لێرە لەگەڵ ئەوانە باس و خواسی زانستی بکەن.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەفتایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوعمانپاشا لە نامەکەدا نووسیبووی، 'ئەو کەنیزە کە کڕیوتە، بۆم بنێرە با لێرە لەگەڵ ئەوانە باس و خواسی زانستی بکەن.' ئەگەر بەسەر ئەو کەنیزانەدا زاڵ بێ، ئەوە پیتاکی بەغدا و کەنیزەکەت بۆ دەنێرمەوە. شەرکان کە ئەو قسەیەی بیست، زاواکەی واتە پەردەدارەکەی و خوشکی بانگ کردن. شەرکان خوشکی لە دەقی نامەکە ئاگادار کردەوە و پێی گوت: 'خوشکم، تۆ دەڵێی چی و چی وەڵام بدەینەوە؟' چونکە نوزهەتوززەمان بیری دایک و بابی دەکرد و پێی خۆش بوو بیانبینێ، بە شەرکانی گوت: 'من و مێردەکەم بنێرە بۆ بەغدا هەتا بۆ نوعمانپاشای بگێڕمەوە کە دەشتەکییەک منی دزی و فرۆشتی بە بازرگان و بازرگانیش منی فرۆشت بە شەرکانپاشا و ئەویش ئازادی کردم و لە پەردەدارەکەی خۆی مارە کردم.' شەرکان گوتی: 'فکری چاکە، کە وایە قەزیەفەکانی کچت بە دایەنێک بسپێرە و پیتاکی دیمشق ئامادە بکە.' پەردەداری ڕاسپارد هەتا لەگەڵ نوزهەتوززەمان پیتاکەکە بەرن بۆ بەغدا و یەکی کەژاوەیەکیش بۆ خۆیان ساز بکەن. دوای ئەوە نامەیەکی نووسی و دای بە پەردەدار و ماڵاوایی لە نوزهەتوززەمان کرد. بەڵام ئەو گەوهەرەی کە لە ملی قەزیەفەکانیان کردبوو، دەریانهێنا و هەڵیانگرت. ئیدی هەر ئەو شەوە پەردەدار و نوزهەتوززەمان کەوتنە ڕێ.

"لە بەختی خۆی، زەوئولمەکان کە ماوەیەک بوو لە دیمشق بوو، هەر ئەو شەوە لەگەڵ توونوان هاتنە دەرێ پیاسەیەک بکەن. وا بوو، ئەو وشتر و کەژاوە و مەشخەڵانەیان دیت. زەوئولمەکان لە بارەی ئەو وشتر و کەژاوە و خاوەن بارەکانەوە پرسیاری کرد. گوتیان: 'ئەوە پیتاکی دیمشقە و دەینێرن بۆ نوعمانپاشای بەغدا.' پرسیاری بەرپرسی بارەکانی کرد. گوتیان: 'پەردەداری مەزنە، مێردی کەنیزە زانا و داناکەیە کە پاشا کڕی بووی.' ئیدی زەوئولمەکان بە بیستنی نێوی نوعمانپاشا و بەغدا دەستی کرد بە گریان و بە توونوانی گوت: 'لەوە زیاتر ناتوانم لێرە بژیم و ناچارم دەبێت لەگەڵ ئەم کاروانەدا بڕۆمەوە.' توونوان گوتی: 'ئەمن نەمتوانی لە قودسەوە تۆ بە تەنیا بنێرمە دیمشق، چۆن دەتوانم لێرەوە بە تەنیا بتنێرمە بەغدا؟! ئەمنیش لەگەڵت دێم هەتا دەتگەیێنمەوە.' زەوئولمەکان سپاسی چاکە و دڵسۆزییەکانی کرد و چوون خۆیان بۆ سەفەر ساز کەن. توونوان گوێدرێژێکی هێنا و توێشووی ڕێگای لێ نا. کە کاروان بەڕێ کەوت. پەردەدار چووە نێو کەژاوەکەوە دانیشت. زەوئولمەکانیش سواری کەرەکە بوو. بە توونوان گوت: 'تۆش لەگەڵ من سوار بە.' توونوان گوتی: 'ئەمن سوار نابم، هەر بە پێیان لە خزمەتتدا دێم.' زەوئولمەکان گوتی: 'ناوەڵڵا، هەر دەبێ سوار بی.' توونوان گوتی: 'ئەتۆ بڕۆ، ئەگەر ماندوو بووم، ماوەیەک سوار دەبم.' ئیدی زەوئولمەکان بە توونوانی گوت: 'کاکە گیان، بەو زووانە

دەبینی چۆن وەڵامی ئەو هەموو چاکەیەت دەدەمەوە.'

"وا بوو هەر ئاوا ڕۆیشتن هەتا خۆر بڵند بوو و گەرما جاڕزی کردن. پەردەدار فەرمانی دا کاروان ڕاوەستێ و وچان بدا. کاروان ڕاوەستا و دابەزین و وشترەکانیان ئاو دان و ماوەیەک وچانیان دا. پاش پشوودان، پەردەدار فەرمانیدا بارەکان لێ دەنەوە و بکەونەوە ڕێ. باریان لێ داوە و ڕۆیشتن. هەر وا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شاری حەمما و دیسان لایان دا. باریان خست و سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی حەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاروانەکە دوای سێ ڕۆژ، دیسان کەوتنە ڕێ و سێ ڕۆژی دیکە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شارێکی دیکە. سێ ڕۆژیش لەوێ مانەوە. دوای ئەوە وەڕێ کەوتن و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ناوچەی بەکر و سروەی بەغدایان هەست پێ کرد. زەوئولمەکان کەوتەوە بیری دایک و باب و خوشکی و گوتی: 'باشە ئەوە چۆن بەبێ خوشکم بچمەوە لای دایک و بابم؟' ئیدی دەستی کرد بە شین و گریان و ئەو شێعرانەی گوت:

سروەی بەسۆزی بەیانی بۆنی گوڵزار بگەیێنە
وتەی شیرینی شیرینم بە گوێی مندا بچرپێنە
زارت بە میسک و مەی بشۆ کام حەڵوا شیرینە بیخۆ
ئینجا بەو زارە بۆنخۆشە، وتەی دڵمی پێ بگەیێنە

"توونوان گوتی: 'مەگری و مەناڵێنە، چونکە لە کەژاوەی پەردەدار نیزیکین، دەترسم پێی ناخۆش بێ.' زەوئولمەکان گوتی: 'بە خۆم نییە، ئەو شێعرانە نەڵێم دڵم دەتۆقێ.' توونوان بە زەوئولمەکانی گوت: 'توو خودا بەسە ئەوندە مەگری و مەناڵێنە تا دەگەینە شاری خۆتان، لەوێ کەیفی خۆتە هەر چی دەکەی بیکە.' زەوئولمەکان گوتی:

دەڵێن تەنگانە بەریان کورتە سەبرت هەبێ
من دەڵێم گیانم دەرچووە سەبری چیم هەبێ
لەش و گیان لێک دابڕابن هەیهات لەو ژینە!
لە پاش خوشکم چۆن بچمەوە، ئەو سەرزەمینە[1]

"دوای ئەوە ڕووی لە لای بەغدا کرد. هەر لەو جەنگەیەدا، بەو نیوەشەوە نوزهەتوززەمانیش نەخەوتبوو لە خەیاڵی براکەیدا بوو و دەگریا کە لە پڕدا گوێی لە دەنگی زەوئولمەکانی برای بوو، دەگریا و ئەو شێعرەی دەگوت :

بەرەو بەغدا دەڕۆم و دڵ لە دووم نایە
جێم هێشتووە، کزەی جەرگم لەو ڕێگایە
ئەوکە ناسکەکەی بە دەستی خەم دەگوشرێ
ئەو شازادەیەی وەک کەنیزێک دەفرۆشرێ

---

١. سەرزەمین: وڵات، ئاووئاخ.

ئەوێــک کە لەگەڵــم هــات و نەشـــــهــاتەوە
چــۆن دڵــم بــێ بــڵــێــم بە تەنــیــا هــاتــمەوە

"ئیدی هەسـتا و نۆکەرەکەی بانگ کرد و گوتی: 'برۆ ئەوەی ئەو شـێعرانە دەڵێ، بیهێنە لای من.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، نوزهەتوززەمان بە نۆکەرەکەی گوت: 'برۆ ئەوەی ئەو شــێعرانە دەڵێ بیهێنە لای من.' نۆکەرەکە چوو گەڕا، جگە لە توونوان کەســـی نەدی بەخەبەر بێ. زەوئولمەکـان لەوێ بێهۆش کەوتبوو، توونوانیش لە لای ڕاوەســـتـابوو. نۆکەرەکە بە توونوانی گوت: 'ئەتۆ بووی ئەو شــێعرەت دەخوێندەوە خاتوون گوێی لە دەنگت بوو؟' توونوان گوتی: 'ناوەڵلا. ئەمن شــێعرم نەگوتووە.' نۆکەرەکە گوتی: 'ئەتۆ بەخەبەری، پێم بڵێ کێ بوو شێعری دەگوت.' توونوان وای زانی کە خانم بە شێعرگوتنەکە وەڕەز و تووڕە بووە، ترسـا بڵێ زەوئولمەکان بووە. هەر بۆیە گوتی: 'نایناســم.' ترسـا شـتێکی لێ بکەن. کابرا گوتی: 'بە خودا درۆ دەکەی. خۆ لە تۆ زیاتر کەس بەخەبەر نەبوو.' توونوان گوتی: 'ڕاستی، ئەوەی شێعرەکانی گوت کابرایەکی ڕێبوار بوو، منیشی هەستاند خودا تۆڵەی لێ بستێنێ.' نۆکەرەکە چووە لای خانم و پێی گوت: 'کەسم نەدیتەوە. کابرایەکی ڕێبوار بووە.' خانم بێدەنگ بوو هیچی نەگوت.

"دوای ئەوە زەوئولمەکان وە هۆش هاتەوە، ســەیری کرد ئەوە مانگ بە پەڕپەڕۆچکەی ئاسمانەوەیە و شنەی بەیانی دەبزوێ. کوڵی دڵی هەستا و ویستی شێعرێک بڵێ. توونوان گوتی: 'ئەوە بە تەمای چی؟' زەوئولمەکان گوتی: 'دەمەوێ شــێعرێک بڵێم، بەشــکوو کوڵی دڵم دامرکێنم.' توونوان گوتی: 'ئەتۆ نـازانی و ئـاگـات لە هیچ نییە کە چۆن لە کوژران ڕزگـارمـان بوو.' زەوئولمەکـان گوتی: 'بۆ چی بووە؟' توونوان گوتی: 'گەورەم، کە تۆ بێهۆش بووی، نۆکەری پاشـــا هات. دارێکی بە دەســـتەوە بوو، گوتی: 'ئەوە کێ بوو ئەو شـــێعرانەی دەگوت؟' جگە لە من کەس بە دەرەوە نەبوو. لە منی پرســـی. گوتم: 'پیاوێکی ڕێبوار بوو.' کە وامگوت، نۆکەرە ڕۆیشـت و خودا لە مردن ڕزگاری کردین. بەڵام نۆکەرە بە منی گوت: 'ئەوجار ئەگەر دیتت کەســـێک شــێعر دەڵێ بیگرە و بیهێنە بۆ لای من.' زەوئولمەکان کە ئەوەی بیسـت گریا و گوتی: 'ئەوە کێیە ناهێڵێ بشـگریم؟ من ناچارم هەر دەیڵێم، چم بەسەر دێ با بەسەرم بێ. تازە ئەوە من گەیشتمەوە وڵات و شارەکەی خۆم و لە کەس ناترسم.'

"توونوان گوتی: 'دەتهەوێ سەری خۆت بە با دەی.' زەوئولمەکان گوتی: 'ناتوانم شێعر نەڵێم.' توونوان گوتی: 'ئەمن بە تەما بووم هەتا تۆ ڕادەســـتی دایکت و بابت نەکەمەوە بەجێت نەهێڵم، بەڵام ئاوا بکەی ناچارم بەجێت بێڵم. ئەوە ســـاڵ و نیوێکە لەگەڵ تۆم هیچ نـاڕەحەتییەکم بۆ تۆ نەبووە. ئەو هەموو ڕێپێوان و بێخەوی و نـاڕەحەتییە بەس نییە؟ بە تەمای لە خۆڕا شـێعر بڵێی و تووشـی کێشـەشـمان بکەی.' زەوئولمەکان گوتی: 'من پێشـی

خۆم پێ ناگیرێ' و دەستی پێ کرد:

سـارەوان تۆ بـارت مەخە، لە وڵاتی یـاری مـن نەبێ
بە خـوێنی سـوور و ئاڵی من، دە با وڵات ڕازاوە بێ
دێـم و تێرتێر دەبارێنم بەسەر شاخ و شار و دەرا
دە با ڕەنگین بکەم ژینگە و، وڵات سـووراوی ئەسـرین بێ

دوای ئەوە ئەم شێعرەشی خوێندەوە:

حەتـمەن دەزانـی کە دووری لەیـلا
چۆن مەجنوونی کردووە شـێت و شـەیدا
دووری نـوزهەتـوززەمـانـیـش ئـاوا
خـۆری زەوئـولـمەکـانـی کـرد ئـاوا

"کاتێک شـێعرەکە تەواو بوو، سـێ جار هاواری کرد و بێهۆش بوو. توونوان هەسـتا و ئەوی داپۆشـی. کاتێک نوزهەتوززەمـان ئەو شـێعرەی گوێ لێ بوو کە ناوی ئەو و زەوئولمەکانی تێدا بوو، دەسـتی کرد بە گریان و بانگی نۆکەرەکەی کرد و پێی گوت: 'ئەوەی ئەو شـێعرەی گوت، لێرە نیزیکە. ئەگەر خێرا بۆم نەهێنی، بە خودا پەردەدار هەڵدەستێنم تەمبێت کا و دەریشت کا. بەڵام تۆ ئەو سەد دینارە بگرە و کەسەکە بە خۆشی بێنە ئێرە و نارەحەتی مەکە. ئەگەر نەهات، ئەو توورەکە هەزار دیناریيەی بدەیە. ئەگەر هەر نەهات، ئەوە ناوی خۆی و شار و پیشەکەیم بۆ بێنە.'

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوزهەتوززەمان، نۆکەرەکەی نارد بە شوێن ئەو کەسەی شێعری دەگوت. چوو سەیری کرد هەموو کەس خەوتووە. تاکە کەسێکیش بەخەبەر نییە. ئیدی چوو بۆ لای توونوان و دیتی ئەوە بەسەری ڕووتی دانیشتووە. چووە پێشێ و قۆڵی گرت و گوتی: 'ئەتۆ بووی شێعرت دەخوێندەوە؟' توونوان ترسا و گوتی: 'نە بە خودا، من شێعرم نەخوێندووەتەوە.' نۆکەرەکە گوتی: 'بە خودا لە کۆڵت نابمەوە هەتا پێم نەڵێی کێ بوو شێعری دەگوت. چونکە ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ لای خانم.' توونوان خەمی زەوئولمەکانی بوو، گریا و بە نۆکەرەکەی گوت: 'بە خودا ئەمن شێعرم نەگوتووە، ڕێبوارێک بوو، شێعری دەگوت. ئەتۆ لە کۆڵ من بەوە، ئەمن پیاوێکی غەریبم و لە قودسەوە هاتووم لەگەڵتان کەوتووم.' نۆکەرەکە بە توونوانی گوت: 'هەستە با بچین بۆ لای خانم. ئەوەی بە منی دەڵێی، بەوی بڵێ. من جگە لە تۆ کەسم نەدیوە بەخەبەر بێ.' توونوان گوتی: 'ئەتۆ ئەوە من دەناسی و جێگاکەشم دەزانی، لە ترسی نۆبەدارەکان ناوێرم بێمە دەرێ. ئێستا تۆ بگەڕێوە، ئەگەر ئەو جارە گوێت لە شێعر و شت بوو چ نیزیک و چ دوور، وەرە لە کەس مەگەڕێ، ڕاست وەرە یەخەی من بگرە.' ئینجا سەری نۆکەرەکەی ماچ کرد و ڕازی کرد. نۆکەرە لێی خۆش بوو، بەڵام لە ترسی خانم نەیوێرا بچێتەوە و لە نیزیک توونواندا خۆی شاردەوە. توونوان هەستا و زەوئولمەکانی وریا کردەوە و گوتی: 'هەستە، جوان دانیشە با بۆت بگێڕمەوە چی بوو.' ئیدی ئەوەی ڕووی دا بوو، بۆی گێڕاوە. زەوئولمەکان گوتی: 'من لە کەس ناترسم.' توونوان گوتی: 'ئەتۆ بۆ بە قسەی ئارەزوو و غورووری خۆت دەکەی و لە کەس ناترسی؟ ئەمن لە تێداچوونی خۆم و تۆ دەترسم. بیکە بۆ خاتری خودا شێعر مەڵێ هەتا دەگەینەوە شارەکەی خۆت. مەگەر تۆ نازانی ژنی پەردەدار دیهەوێ ئازارت بدا؟ چونکە ئەو ماندوو و شەکەت خەوتبوو تۆ لە خەوت ڕاپەڕاندووە. ئەوە چەند جاری نۆکەرەکەی ناردووە و دەگەڕێ بزانێ کێیە دەنگەدەنگ دەکا و شێعر دەڵێ.' زەوئولمەکان گوێی نەدایە قسەکانی توونوان و بۆ جاری سێیەم بە دەنگی بەرز ئەو شێعرانەی گوت:

سەرکۆنەکەری عاشق نرخی نییە لای زانا
تێناگا بە هیچ جۆرێ، عاشق ژینی بۆ دانا
سەرکۆنە دەکا دایم، بەزەی دێ بە ئاخی وی
چون مەلی خۆشەویستی قەت نەچۆتە ناخی وی

"نۆکەرە لە گۆشەیەک خۆی مات دابوو گوێی لە دەنگی زەوئولمەکان بوو. هێشتا

شـــێعرەکانی تەواو نەکردبوو کە گەیشـــتێ. کە توونوان نۆکەرەی دیت، هەڵاتە ئەو لاوە و ڕاوەستا. ئیدی نۆکەرە سڵاوی کرد و زەوئولمەکان وەڵامی سڵاوەکەی داوە. نۆکەرە گوتی: 'گەورەم ...' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نۆکەرە بە زەوئولمەکانی گوت: 'گەورەم، ئەوە سێ جار هاتمە لای تۆ، خانم دەیهەوێ چاوی پێت بکەوێ.' زەوئولمەکان گوتی: 'خانم کێیە و پلە و پایەی چییە کە دەیهەوێ من بچم بۆ لای؟ خوا خراپ بۆ خۆی و بۆ مێردەکەشـــی بکا' و جنێوی بە نۆکەرەش دا. ئیدی نۆکەرە نەیدەتوانی هیچ بڵێ، چونکە خانم پێی گوتبوو بەبێ مۆڵەتی ئەو هیچ نەکا و هیچ نەڵێ. ئەگەر نەشیدەویست بێ، لێی گەڕێ و کیسە زێڕەکەشی بداتێ.

"ئیدی نۆکەرە بە نەرمییەوە گوتی: ڕۆڵە گیان، ئەمن چی خراپم نەکردووە و نەگوتووە و ناشیڵێم. ئەمن ویستم بە خۆشی لەگەڵم بێی بۆ لای خانم و بە دڵێکی خۆشیش بگەڕێیەوە و خەبەرێکی خۆشیشت دەدەینێ.'

"کاتێک زەوئولمەکان ئەوەی بیست، هەستا و لەگەڵ نۆکەرە ڕۆیشت. توونوانیش هەستا و دوایان کەوت و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'حەیف بۆ ئەو گەنجە، سبەینێ دەکوژرێ!' ئیدی زەوئولمەکان لەگەڵ نۆکەرە و، توونوانیش لەپشت سەریان هەر وا ڕۆیشتن تا گەیشتنە نیزیک تاوڵەکەی خانم. نۆکەرە چووە لای نوزهەتوززەمان و گوتی: 'ئەو کەسەی دەتهەویست، هێنام. لاوێکی جوانچاک و هێمای گەورەیی لە سیمایدا دیارە.' نوزهەتوززەمان کە ئەوەی بیست، دڵی کەوتە لێیدان و بە نۆکەرەی گوت: 'بڵێ بەیتی بە چەندم بۆ دەڵێ هەتا لە نزیکەوە گوێم لە دەنگی بێ. ئینجا بزانە ناو و نیشانی چییە و خەڵکی کام شارە.' نۆکەرە هاتەوە بە زەوئولمەکانی گوت: 'لەپێشدا پێم بڵێ بەیتی چەندە وەردەگری هەتا خاتوون لە نزیکەوە گوێی لە دەنگت بێ. دوایەش ناو و نیشانی خۆتم پێ بڵێ و، خەڵکی کام شاری؟'

"زەوئولمەکان گوتی: 'باشە بە چاوان. بەڵام من بەسەرهاتێکی سەیرم هەیە کە بە هۆیەوە وەک بادەخۆران مەستم و وەک لێقەوماوان سەرگەردان و نوقمی دەریای خەیالاتم.' کە نوزهەتوززەمان گوێی لەوە بوو، دڵی پڕ بوو و بە نۆکەرەکەی گوت: 'لێی بپرسە لە کێ هەڵبڕاوی؟' نۆکەرە لە دەرەوەی تاوڵەکە لێی پرسی: 'لە کێ هەڵبڕاوی؟' زەوئولمەکان گوتی: 'لە دایک و بابم و کەسوکارم، بەڵام لە هەموویان خۆشەویستتر خوشکێکم بوو کە ڕۆژگار لەوی دوور کردمەوە.' نوزهەتوززەمان کە ئەوەی بیست گوتی: 'خودا پێکتان شاد کاتەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی حەفتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ، نوزهەتوززەمان گوتی: 'خودا پێکتان شـــاد کاتەوە.' دوای ئەوە نوزهەتوززەمان بە نۆکەرەی گوت: 'پێی بڵێ چەند بەیتێک لە بارەی جیاییەوە بڵێ.' نۆکەرە ئەوەی خانم گوتبووی بە زەوئولمەکانی گوت. زەوئولمەکان ئاخێکی هەڵکێشـــا و ئەو بەیتانەی گوت:

کەس بە قەد مـــن دەردی دووری نەچـێشـــتـــووە
زۆربەی ژیـــنـــم لە غەریـــبـــی ڕابـــردووە
بە غەریبی و بە نەخـــــــــــــۆشـــی، هەڵوەدا بووم
هەرچـــــــــــــی ئـێش و دەرد و ژانە، لەگەڵـم بـووە

"دوایی ڕۆندکی هاتە خوارێ و ئەو چەند بەیتەشی گوت:

ئەی کەســـی هەموو کەســـان هـاوار لە دەســـت تەنیایی
دڵ لە ســـوێت وە گیـان هـاتۆ، ئـاخ لە دەســـتی جودایی
دەبێ تاسەی دیـــــــــــــدارت لە دڵـــــــدا بێنم و بەرم
هێندەم چاو بڕییە ئاســــــــــــــۆ، بێبەش بوو لە بینایی

"کاتێک نوزهەتوززەمان ئەو بەیتانەی بیســـت، داوێنی چادرەکەی هەڵداوە و چاوی لە زەوئولمەکـان کرد و نـاســـییەوە و یەکبەخۆی قیژانـدی و نـاوی زەوئولمەکـانی هێنـا. زەوئولمەکانیش چاوی لێ کرد و ناســـییەوە و قیژاندی و ناوی نوزهەتوززەمانی هێنا، یەکتریان لە باوەش گرت و بەلادا هاتن و هەردووکیان بێهۆش بوون. نۆکەرەکە کە ئەوەی دیت ســـەری لە کاری ئەوانە ســـووڕ ما. کە وە هۆش هاتنەوە، نوزهەتوززەمان، نەیدەزانی بڵێ چی. خەم و خەفەتی نەما و لە خۆشـــیان خەریک بوو باڵ بگرێ. ئینجا ئەو شـــێعرەی گوت:

خـــوایە ئـــاخـــری مەیـــنەتـــی بەرۆکـــی بەردام
مەزرایەکـــی تـــیـــنـــووم و لە بەر بـــاران دام
مـــنـــێـــک کە ڕۆژی ژیـــنـــم تـــاریـــک داهـــاتـــبـــوو
ئـــێســـــتە خـــۆرم دەرکەوتـــووە وەدەزانـــم شــــام

"کە زەوئولمەکان ئەو شێعرانەی بیست، لە خۆشحاڵیان خوشکەکەی لە ئامێز گرت و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

پـــیـــرۆزە ئەوڕۆ ڕۆژی هـــاتـــمە
ڕۆژڕەشـــــی تەواو بـــوو، کـــاتـــمە
وا چـــاوم بە خـــوشـــکـــم کەوت
خـــــــەم و خەفەت بـــاری کەوت[1]

"ئیدی ماوەیەک لە دەرکی خێوەتەکە دانیشتن و دوای ئەوە نوزهەتوززەمان بە براکەی گوت: 'هەســتە با بچینە تاوڵەکەوە بەســەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە، با منیش بەســەرهاتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە.'

"هەســتان چوونە ژووری و زەوئولمەکان گوتی: 'تۆ لەپێشــدا بەســەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە. نوزهەتوززەمان تەواوی ئەو شتانەی بەسەری هاتبوو، لە سەرەتاوە هەتا کۆتای هەموویانی بۆ گێڕاوە. دوای ئەوە گوتی: 'دیســان ســپاس بۆ خودا کە تۆی داوە بە من و چۆن پێکەوە لە بەغدا هاتبووینە دەرێ، ئاوا پێکەوە دەچینەوە بەغدا.' دوایە گوتی: 'براکەم شــەرکان منی دا بەو پەردەدارە هەتا بمگەیەنێتەوە لای بابم. ئەوە بوو بەســەرهاتی من. ئێســتا تۆ هی خۆتم بۆ بگێڕەوە.' زەوئولمەکان تەواوی ئەو ڕووداوانەی گێڕاوە کە بۆی هاتبووە پێشێ، لە کۆتای دا گوتی: 'خوشکێ، ئەو توونوانە هەموو دارونەداری خۆی بۆ من خەرج کرد و شــەو و ڕۆژ پارێزگاری لە من کردووە. من بە ســوارە و خۆی بە پیادە شــەکەت و برســی بەدوامدا هاتووە و ئاگای لێم بووە.' نوزهەتوززەمان گوتی: 'ئیشــەڵلا پاداشتی باشی دەدەینەوە.'

"دوای ئەوە نوزهەتوززەمان نۆکەرەکەی بانگ کرد و پێی گوت: 'ئەو توورەکە زێڕەی لە لاتە، ئەوە مزگێنی دام بە تۆ، هەڵیگرە بۆ خۆت. ئێســتا بڕۆ ســەرپەردەدار بانگ کە.' نۆکەرە بە خۆشــحاڵییەوە هەڵات بۆ لای پەردەدار و پەیامەکەی نوزهەتوززەمانی پێ ڕاگەیاند. پەردەدار هاتە لای نوەزهەتوززەمان، ســەیری کرد ئەوە لەگەڵ زەوئولمەکانی برای دانیشــتووە. پەردەدار گوتی: 'ئەوە چۆناوچۆن بوو بەو شــەوە و لەو بێروونەدا یەکترتــان دیتەوە؟' ئەوانیش چۆنیەتییەکەیــان بۆ گێڕاوە. ئیــدی نوزهەتوززەمــان بە پەردەداری گوت: 'وریا بە، تۆ کەنیزت نەهێناوە، بەڵکو کچی نوعمانپاشــات هێناوە و ئەوەش زەوئولمەکانی برامە.' پەردەدار کە ئەو قســەیەی بیســت و ڕاســتی شــتەکەی بۆ ڕوون بووەوە و لێی ڕوون بووەوە کە زاوای نوعمانپاشــایە، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'کە

١. بارکەوتن: لێقەومان.

گەیشتمە بەغدا، جێگری خەلافەتی لێ دەستێنم.' دوای ئەوە ڕووی لە زەوئولمەکان کرد، بۆ چاکبوونەوەکەی پیرۆزبایی لێ کرد. بە غولامەکانی گوت: 'یەکێک لە باشترین ئەسپەکانی بۆ بێنن و تاوڵێکی جودای بۆ ئامادە کەن.' نوزهەتوززەمان بە پەردەداری گوت: 'پێم خۆشە لەگەڵ زەوئولمەکان پێکەوە بچینە هۆدەیەک و دووبەدوو قسە و باس و بیرەوەرییەکانمان بۆ یەک بگێڕینەوە تا لە قسەکردن تێر دەبین. خۆت دەزانی زۆر لەمێژە لە یەکتر دوورین.' پەردەدار گوتی: 'دەسەلات بە خۆتە. چۆنت پێ خۆشە وا بکە.' ئیدی پەردەدار لە لای ئەوان ڕۆیشت و مۆم و حەڵوای بۆ ناردن و سێ دەست جلکی دیبای بۆ زەوئولمەکان نارد. نوزهەتوززەمان بە پەردەداری گوت: 'فەرمان بدە توونوان بێنن و ئەسپێکی بۆ ئامادە کەن. پێشیان بڵێ بۆ چاشت سفرەمان بۆ ڕاخەن.' پەردەدار گوتی: 'باشە بە چاوان.' و فەرمانی پێویستی دا. نۆکەرەکان چوون لە توونوان گەڕان، کە دیتیانەوە سەیریان کرد ئەوە تۆشە و شتی لە کەرەکەی ناوە و خەریکە سوار دەبێ هەڵێ، لەبەر جیابوونەوە لە زەوئولمەکانیش دەگری و دەڵێت: 'حەیف بۆ ئەو کوڕە! چەند جارم پێ گوت، بە قسەی نەکردم هەتا ئاوای لێ هات.' هێشتا قسەکەی توونوان تەواو نەببوو کە نۆکەرەکان تێی ئاڵان. توونوان کە ئەو نۆکەرانەی دیت تێی ئاڵان، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شه‌وی حه‌فتا و شه‌شه‌م هاته‌وه

گوتی: "خاوه‌نشـــکۆ، توونوان ڕه‌نگی زه‌رد هه‌ڵگه‌ڕا و به‌ده‌نگێکی به‌رز گوتی: 'قه‌دری چاکه‌کانی منی نه‌زانی و وا دیاره منیشی چاره‌ڕه‌ش کرد.' له‌ پڕدا نۆکه‌ره‌که‌ گوتی: 'درۆزن، گوتت من شـێعرم نه‌گوتووه‌ و ئه‌وه‌ی شـێعره‌که‌شـی گوتووه‌ نایناسـم. مه‌گه‌ر وێژه‌ری شێعره‌کان هاوڕێکه‌ی تۆ نه‌بوو؟' توونوان که‌ نۆکه‌ره‌که‌ی دیت زۆر تووڕه‌یه‌، له‌ دڵی خۆیدا گوتی: 'به‌ خودا ئه‌وه‌ی لێی ده‌ترسام به‌سه‌رم هات.' ئینجا گوتی بۆیه‌ ده‌ڵێن:

' هـاوڕێی قه‌له‌نـده‌ری له‌ ڕیش و سـمێلان ده‌بێ بێبه‌ری '

"ئیدی نۆکه‌ره‌که‌ هه‌رای کۆیله‌کانی کرد و گوتی: 'دایبه‌زێنن.' کۆیله‌کان توونوانیان له‌ که‌ره‌که‌ دابه‌زاند و سواری ئه‌سپیان کرد. کۆیله‌کان له‌ده‌وری پارێزگارییان لێ کرد و له‌گه‌ڵ کاروان ڕۆیشـتن. نۆکه‌ره‌ به‌ کۆیله‌کانی گوتبوو که‌ به‌ڕێزه‌وه‌ له‌گه‌ڵی هه‌ڵسـوکه‌وت بکه‌ن، ئه‌گه‌ر موویه‌ک له‌ سـه‌ری ئه‌و که‌مبێته‌وه‌، یه‌کتان له‌ جێی ئه‌و تاڵه‌ مووه‌ ده‌کوژرێن. کاتێک توونوان ئه‌و کۆیلانه‌ی له‌ده‌وری خۆی دیت، ده‌ستی له‌ ژیان شوشت و به‌ نۆکه‌ره‌ی گوت: 'سه‌رتیپ، به‌ خودا ئه‌من که‌سم نییه‌ و کاریشم به‌ که‌س نه‌داوه‌. ئه‌و لاوه‌ش هیچی من نییه‌. من کابرایه‌کی توونوانم. ئه‌و لاوه‌ له‌نێو پرزه‌وپاڵدا[1] که‌وتبوو و هه‌ڵمگرتووه‌ته‌وه‌.'

"کورتی که‌مه‌وه‌، توونوان له‌گه‌ڵ ئه‌وان ده‌ڕۆیشـــت و هه‌زار خه‌یاڵی جۆراوجۆری ده‌کرده‌وه‌. نۆکه‌ره‌ ده‌یترسـاند و ده‌یگوت: 'ئه‌و گه‌نجه‌ خاتوونی خراپ له‌ خه‌و کرد.' که‌ له‌ شـوێنێک لایان ده‌دا، نۆکه‌ره‌ داوای خواردنی ده‌کرد و له‌گه‌ڵ توونوان ده‌یانخوارد. دوایی قاپێکیان شـه‌کری تواوه‌ هێنا که‌ سـه‌هۆڵی به‌سـه‌ردا کرابوو. نۆکه‌ره‌ به‌ توونوانی گوت: 'بخۆوه‌' و توونوان له‌ ترسان هه‌ر ده‌گریا و فرمێسکی وشک نه‌ده‌بووه‌وه‌. هه‌ر ئاوا قۆناخه‌ و قۆناخ ڕۆیشتن هه‌تا گه‌یشتنه‌ شوێنێ که‌ سێ قۆناخیان مابوو بگه‌نه‌ به‌غدا. له‌وێ لایان دا و حه‌سانه‌وه‌ و چێشتیان خوارد و خه‌وتن.

"به‌یانی زوو ویسـتیان هه‌سـتن و باره‌کانیان لێ ده‌ن و که‌ژاوه‌کان ببه‌سـتن، له‌ پڕدا گێژه‌ڵووکه‌یه‌ک هات و وڵاتی داگرت. په‌رده‌دار هه‌رای غوڵامه‌کانی کرد که‌ که‌ژاوه‌کان قایم که‌ن. ئیدی په‌رده‌دار له‌گه‌ڵ غوڵامه‌کان سوار بوون و چوون بۆ لای ته‌پوتۆزه‌که‌. سه‌یریان کرد ئه‌وه‌ سـوپایه‌کی زه‌به‌لاحه‌. په‌رده‌دار واقی وڕ ماو ڕه‌ق ڕاوه‌سـتا. سـوپاکه‌ که‌ ئه‌وانی دیت، ڕاوه‌سـتا و پێنجسـه‌د سـواریان هاتن بۆ لای په‌رده‌دار و هاوڕێکانی. که‌ هاتن، وه‌ک

---

١. پرزه‌وپاڵ: زبڵ، ئه‌شغاڵ.

نەقیمی ئەنگوستیلە دەوری پەردەدار و هاوڕێکانیان دا. هەر بە پێنج کەسی سوپاکە دەوری غولامێکیان دا. پەردەدار پێی گوتن: 'ئێوە کێن و کوێنەرین کە ئاوا لەگەڵ ئێمە دەجوولێنەوە؟' یەکێک لەوان گوتی: 'ئەتۆ کێی و لەکوێوە دێی و بۆ کوێ دەچی؟' پەردەدار گوتی: 'ئەمن پەردەداری شەرکانپاشای ئەمیری دیمشقم و پیتاکی دیمشق بە دیاری بۆ نوعمانپاشای بەغدا دەبەم.' کاتێک قسەی پەردەداریان بیست، هەموو دەستیان کرد بە گریان و دەسرەیان[1] بە دەستەوە گرت و بە پەردەداریان گوت: 'ئەوە تۆ بۆ وا بێخەمی؟ نوعمانپاشایان ژەهرخوارد کرد و کوشتیان. ئەتۆ وەرە با بچینە لای وەزیر دەندان.' پەردەدار ناڕەحەت بوو، دەستی کرد بە گریان و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە سوپاکە و وەزیر دەندانیان لە هاتنی پەردەدار ئاگادار کردەوە. وەزیر دەندان فەرمانی دا خێوەتەکانیان هەڵدا و خۆی لەسەر دۆشەکێک پاڵکەوت و پەردەداری بانگ کردە لای خۆی و دەنگوباسی لێ پرسی. پەردەدار وەزیری تێگەیاند کە پەردەداری میری دیمشقە و پیتاک و دیاری بۆ نوعمانپاشا دەبا.

"وەزیر دەندان کە ناوی نوعمانپاشای بیست، دەستی کردە گریان و گوتی: 'نوعمانپاشایان بە ژەهر کوشت. دوای کوژرانی ئەو ناکۆکی کەوتە نێوان خەڵکەوە کە وڵات بە کێ بسپێرن و کێ پاشایەتی بکا و ناکۆکییەکەیان لێ بوو بە شەڕ و کێشە. کوڕی قازییان کە چوار کەسن، نەیانهێشت شەڕ بێ. دوایی لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەوەی کوڕی قازییان بڕیاری لەسەر نەدەن، نەیکەن. وا بوو کوڕی قازیان لە سەر ئەوە ساغ بوونەوە، بنێرن بەدوای شەرکانپاشادا تا بێت و دەسەڵات بە دەستەوە بگرێ. بەڵام کۆمەڵێک گوتیان: 'دەبێ کوڕە چکۆلەکەی دەسەڵات بە دەستەوە بگرێ.' بەڵام چونکە ئەویش لەگەڵ خوشکەکەی ماوەی چەند ساڵە چوونەتە سەفەر و نەگەڕاونەوە و کەس بە هەواڵیان نازانێ، ناچار ئێمەیان نارد بۆ لای شەرکانپاشا.' پەردەدار کە زانی ژنەکەی ڕاستی گوتووە، بۆ مەرگی پاشا ناڕەحەت بوو. بەڵام بۆ پەیدابوونی زەوئولمەکان زۆر خۆشحاڵ بوو؛ چونکە ئەو لە بەغدا لە جێی بابی دەسەڵات دەگرێتە دەست."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. دەسرە: دەستسڕە، پەڕۆیەکە لە گیرفانی دەخەن بۆ سترینی دەست و دموچاو.

# که شەوی هەفتا و حەوت هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که پەردەدار زانی زەوئولمەکان لە جێی باوکی دەسەڵات دەگرێتە دەست. بە وەزیر دەندانی گوت: 'بە خودای سەیرە!' وەزیر پرسی: 'چی سەیرە؟' پەردەدار گوتی: 'خودا ئێوەی بەسەر کردووەتەوە، کارێکی وای کردووە کە ئێوە دەتانەوێ.' وەزیر گوتی: 'چۆن؟' پەردەدار گوتی: 'کورە خودا زەوئولمەکانی بۆ ناردووەنەتەوە و ئێستا لەگەڵ نوزهەتوززەمانی خوشکی لەگەڵ منن.' وەزیر دەندان کە ئەوەی بیست، زۆر خۆشحاڵ بوو. بە پەردەداری گوت: 'دا بۆم بگێرەوە لەکوێ بوون و چیان بە سەر هاتووە.' ئیدی پەردەدار باسی نوزهەتوززەمانی بۆ گێڕاوە هەتا زەماوەندی لەگەڵ کرد. بەسەرهاتی زەوئولمەکانیشی ئەوەندەی دەیزانی و بیستبووی، بۆی گێڕاوە. کە پەردەدار وتەکانی تەواو بوو، وەزیر دەندان کەسێکی نارد میران و وەزیران و گەورەکانی دەرباری بانگ کرد. ئەوەی ڕووی دابوو بۆ ئەوانیشی گێڕاوە و ئاگاداری کردن. ئیدی هەموویان سەریان سووڕما و هەستان هاتنە کن پەردەدار و کڕنۆشیان بۆ کرد. پەردەدار لەگەڵ وەزیر دەندان دانیشتبوون. وەزیر دەندان بە هەموو بەرپرسانی گوت: 'دانیشن.' ئینجا پرسی گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن زەوئولمەکانەوەی هێنا گۆڕێ. پاش ڕاوێژ و بیروراگۆڕینەوە، هەموو بە باشیان دەزانی زەوئولمەکان دەسەڵات بگرێتە دەست. پەردەدار ڕووی لە وەزیر دەندان کرد و گوتی: 'وا چاکە بچم بۆ لای زەوئولمەکان، ئەویش لە هاتنی ئێوە ئاگادار کەمەوە و پێشی بڵێم کە شتێکی ئاوا لە گۆڕێ دایە و بە تەمان دەسەڵات ڕادەستی تۆ کەن.' وەزیر دەندان بیرۆکەکەی پەردەداری پێ جوان بوو. پەردەدار هەستا و وەزیر و داروودەستەکەی بە حورمەتی ئەو هەستان و کڕنۆشیان کرد و پەسنی پەردەداریان دا هەتا ئەویش لە لای زەوئولمەکان تاریفی ئامادەیی خزمەتگوزاری ئەوان بکا. وەزیر دەندان بە دەستوپێوەندەکەی گوت: 'بچن لە قۆناخێک پێش بەغدا تاوڵ و هۆبە هەڵدەن و ئامادە بکەن.'

"پەردەدار هاتەوە لای زەوئولمەکان و نوەزهەتوززەمان، ئەوانی لە بارودۆخەکە ئاگادار کردەوە. وەزیر دەندان و سوپاکەیشی هەموو سوار بوون و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە قۆناخێک پێش بەغدا. لەوێ لایان دا و باریان خست. پاشان وەزیر دەندان ڕوخسەتی خواست چووە لای زەوئولمەکان و نوزهەتوززەمان و بەخێرهاتنەوەی لێ کردن و ئەوانی لە مردنی بابیان ئاگادار کردەوە و مۆژدەی ئەوەشی دانێ کە خەڵک زەوئولمەکانیشیان وەک پاشای بەغدا هەڵبژاردووە. ئەوان بۆ مردنی بابیان زۆر بەپەرۆش بوون. پاش کەمێک شین و گریان هۆکاری مردنەکەیان پرسی.

"وەزیر دەندان گوتی: 'گەورەم پاشا، نوعمانپاشا کە لە ڕاو گەڕاوە و ئێوەی نەدی و زانی چوون بۆ زیارەتی ماڵی خودا، تووڕە و ناڕەحەت بوو هەتا شەش مانگیش هەر بۆتان دەگەڕا. هیچ سۆراخێکی ئێوەی نەکرد. کە ساڵێک بەسەر نەهاتنەوەی ئێوەدا تێپەڕی، ڕۆژێک پیرێژنێک کە ڕوخسارێکی پاک و لەخوداترسانەی هەبوو، هاتە خزمەت پاشا و کڕنۆشی برد. پاشا کە سیمای پاک و نوورانی ئەوی دیت، بانگی کردە لای خۆی. پیرێژن گوتی: 'پێنج دانە کەنیزم بۆ هێناوی، هیچ پاشایەکی دیکە لە دنیادا کەنیزی وای نییە کە ئاوا جوان و زانا و ژیر و بەئەدەب و تێگەیشتوو بن.' پاشا فەرمانی دا کەنیزەکان بێنن. بە دیتنی دەلالییان خۆشحاڵ بوو. پێی گوتن: 'هەر کام لە ئێوە چی دەزانێ بۆم باس بکا.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی حەفتا و هەشتم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوعمانپاشا بە کەنیزەکانی گوت: 'یەکی بەشێک لە زانیارییەکانتانم بۆ باس بکەن.' یەکێک لەو پێنج کیژە هاتە بەرەوە و کڕنۆشــی برد و گوتی: 'ئەی پاشــای گەورە، پێویســـتە خاوەنی ئەدەب فەرزەکانی بەجێ بێنێ و خۆ لە گوناح بپارێزێ. بنەمای ئەدەب، ڕەوشـــتی جوانە و باشـــترین ڕۆزیش ژیانە. ژیانیش بۆ ئەوەیە ســـتایش و سپاسگوزاری خودای تێدا بکەی. کە وایە شایانە لەگەڵ خەڵکدا بە ڕووی خۆش و بە باشی هەڵســوکەوت بکەی. بە هیچ جۆرێک لەو ڕێگەیە لا نەدەی و پیاوانی گەورە زۆر لە خەڵکی دیکە پێویستیان بەو ڕەوشتە جوانەیە. پاشا زۆر پێویستی بە پەردەدار زیاترە تا مسکێن. ئەی پاشا، بزانە کە دەبێ ماڵ و گیان لە ڕێی خوا دا بەخت بکەی. کە دەبینی دژمنەکەت بە ئاشــکرا دژمنایەتیت دەکا، هێشــتا دەبێ تۆ خۆتی لێ ببوێری. ئەوەش بزانە کە دیاردەیەک جگە لە ڕەوشــت بەرزی، بۆ هەڵبژاردنی هاوڕێیەتی نییە. کەوایە لەپێشــدا تاقی کەوە، دوایە لەگەڵی ببە بە هاوڕێ. ئەگەر هاوڕێکەت برادەری ڕۆژی پەســـڵانە، دەبێ ئەوەی شـــەرع دەیڵێ ڕەچاوی بکا و لە ناوەڕۆکی دەســتووراتی شــەرعیش بگا. ئەگەر برادەری دنیاییشــە، ئەوە دەبێ ئازا و نەترس و ڕاستگۆ بێ، نەک نەزان و خراپەخواز و درۆزن. چونکە درۆزن شایەنی هاوڕێیەتی نییە. هاوڕێ لەگەڵ یەکدا هاوتەریببوون. دۆستایەتی دەبێت بە پاکی لە دڵەوە بێت. کەســـێک کە درۆ دەکا، ناتوانێ لەگەڵت دۆســـت بێ. کەوایە ڕێگاتان یەک ناگرێتەوە. بۆ هاوڕێیەتی نابێ. پاشا، بزانە کە گرتنەبەری ڕێگای شەرع کارێکی زۆر باشە. هەرکەسێ ئەو تایبەتمەندییەی هەبێ، خۆشت بوێ. هەرچەندە کارێک بکات کە پێشت خۆش نەبێ، چونکە هـاوڕێ وەک ژن نییە تەڵاقی دەیت و پاشـــان بیهێنیتەوە. بەڵکو دڵ وەک شووشە وایە، کە شکا، یەک ناگرێتەوە. وەک شاعیر دەڵێ:

بـــزانە تـــۆ لەگەڵ کـــێ دادەنـــیشــــــی
لەگەڵ کـێـدا دەدوێـی و چـی دەبـیســــــتـی
بە دەســــــت خۆت نییە چون هــاوڕێ هەوایە
هەوای نـاپـاک، هەر نەخـۆشـــــی لە دوایە

"دوای ئەوە کەنیزەکە لە کۆتـایی قســــەکـانیدا ئـامـاژەی بۆ لای ئێمە کرد و گوتی: 'ئاوەزمەندان گوتوویانە: 'باشـــترین هاوڕێ ئەوانەن کە لە ئامۆژگاریدا پێداگری دەکەن. باشترین کار ئەوەیە کە ئاکامێکی باشی هەبێ. باشترین نزا ئەوەیە کە لەسەر زاری خەڵک بێ.' گوتووشـیانە: 'جێی خۆیەتی بەندە خۆی لە سـپاسـگوزاری خودا نەبوێرێ و بەردەوام

سـپاسگوزاری دوو نیعمەتی خودا بێ: یەکیان لەشساخی و ئەوەی دیکە ئاوەزە.' گوتووشیانە: 'هەرکەس گرفتی چکۆلە زۆر گەورە کاتەوە، تووشی گرفتی گەورەتر دەبێ. هەرکەسیش دوای ئارەزوو کەوێ، حەق پێشێل دەکا. هەرکەسیش گوێ بداتە کەسانی دووزمان، ئەوە هاوڕێکانی لە دەست دەدا. هەرکەس چاکەکانت دەبینێ، چاکەی لەگەڵ بکە. هەرکەس دژمنایەتی زۆر گەورە کاتەوە، تاوانبارە. هەرکەسیش گوێ نەداتە ستەم و زۆرداری، لە دەست شمشیر ناحەسێتەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی حەفتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کەنیز گوتی: 'پاشـای بەڕێز، با کەمێک باسـی قازییەکان بکەم. دەبێ قازییەکانی شار بە چاوێک بڕواننە تەواوی خەڵکی شارەکە، جیاوازییان لەنێواندا نەکەن، بۆ ئەوەی زۆرداران چاو لە ماڵی هەژاران نەبڕن و، هەژاران دەســـت لە دادوەری نەشـــۆن. قازیش دەبێ شایەدی لە داواکار بوێ، نکۆڵیکاریش سوێند بدا و پەرە بە ئاشتی کۆمەڵایەتی بدا. مەگین ئاشـــتییەک بێ کە حەڵاڵ حەرام بکا و حەرام حەڵاڵ بکا. ئەگەر قازییەکیش لە بابەتێک بە گومان بوو، دەبێ بگەڕێتەوە بۆ لای حەق. چونکە حەق فەرزە و بەرەوحەقچوون باشـــترە لەوەی هەر لە ســـەرگەردانیدا بمێنیتەوە. کە وایە دەبێ قازی بە چاوێک چاو لە دژمنایەتییەکە بکا و شـــایەدی لێیان بوێ. ئەگەر شـــایەد هات، ئینجا دەبێ بەپێی قســـەی شـــایەدەکە حوکم بدا. ئەگەر شـــایەدیشـــی نەبێ، ئەوە دەبێ شـــکایەتکەرەکە ســـوێند بدا و ســـەرچاوەی ســـوێندی موســـوڵمانانیش قەبووڵ بێ. چونکە ئەوە فەرمانی خودایە کە دەبێ لەســـەر ڕواڵەت حوکم بدرێ، چونکە جگە لە خودا کەس ئاگای لە مەبەســـت و ناخی مرۆڤەکان نییە. قازی بۆی نییە کاتێک زۆر نارەحەتە یان زۆر برســـییە حوکم دەرکا، لە حوکمدەرکردنیشدا دەبێ هەر ڕەزای خودای مەبەست بێ. چونکە ئەگەر ویست و مەبەستی خۆی لەگەڵ خودا پاک کاتەوە و جگە لە حەق و ڕەزایەتی خودا هیچ مەبەســـتێکی دیکەی نەبێ، خەڵکیش ڕازیتر و پێملتر دەبن. زوهەری[1] گوتوویەتی: 'ئەگەر ئەم شـــتانە لە قازیدا هەبن، دەبێ لەســـەر کار لا ببرێ: ڕێز لە مرۆڤی خوێڕی و بێئابڕوو بگرێ بۆ ئەوەی تـاریفی بکەن و زۆریش نیگەرانی لەســـەرکـارلادرانی بێ.' دەگێڕنەوە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز قازییەکی لەســـەر کار لا برد. قازی گوتی: 'بۆ لام دەبەی؟' عومەر گوتی: 'بیســـتوومە زۆر لەوەی پێویســـتە زیاتر قســـە دەکەی.' دوای ئەوە کەنیزی یەکەم لا چوو، کەنیزی دووەم هاتە بەرەوە. "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. حەدیسزانێکی بە ناوبانگە کە لەگەڵ هەر چوار هاوڕێکەی پێغەمبەر(د. خ) هەڵسوکەوتی بووە.

# کە شەوی هەشتایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، وەزیر دەندان بە زەوئولمەکانی گوت: 'کەنیزی دووەم هاتە پێشێ و حەوت جاری کڕنۆش برد. دوای ئەوە گوتی: 'لوقمان بە کوڕەکەی گوت: 'سێ شتن کە ناناسرێن مەگین لە سێ کاتدا: یەکەمیان لەسەرخۆییە کە ناناسرێ لە کاتی تووڕەی دا نەبێ. دووەمیان ئازایەتی و نەترسییە دەرناکەوێ مەگین لە کاتی شەڕدا نەبێ. سێیەمینیان هاوڕێیە کە ناناسرێ هەتا ڕۆژی تەنگانە نەبێ.' لە زووەوە گوتراوە کە ستەمکار زەرەمەندە، هەرچەندە خەڵکیش پێیان هەڵبڵێن. ستەملێکراوان ئاسوودەترن هەرچەندە خەڵک خراپەشیان بڵێن. خودای جیهانیان فەرموویەتی: 'ئەوانەی کە دڵیان خۆشە بەو کارانەی کردوویانە و بە تەماشن لە بەر ئەو کارانەی نەشیان کردووە، هەر دەستخۆشیان لێ بکرێ. پێیان وا نەبێ ئەوانە لە عەزابی خودا ڕزگاریان دەبێ، ئەوان عەزابێکی سەخت و ناخۆشیان لە پێشدایە.'[1] پێغەمبەری ئیسلامیش گوتوویەتی کارەکان بە نییەتن.

" 'پاشا، باشترین شت کە لە مرۆڤدا هەیە دڵیەتی. کاتێک دڵی مرۆڤ پڕ بوو لە ئێرەی و تەماع، دڵی دەتوقێ. ئەگەر دڵی پڕ بێ لە بێ هیوایی ، دڵی دەتوقێ. ئەوانە هەمووی مردنیان بەدواوەیە. کاتێک تووڕەیی مرۆڤێک زیاتر بێت، ئەوا خۆشی ناڕەحەتتر دەبێ. کاتێک مرۆڤ هەست بە بەختەوەری بکا، لە نەخۆشی و شت بەدوور دەبێ. ئەگەر ترس و نیگەرانی بەسەر مرۆڤدا زاڵ بێ، هەردەم ناڕەحەت دەبێ و لە کاتی گیروگرفتەکاندا داد و هاواری زۆر دەبێ. ئەگەر بەسەر ماڵ و ساماندا بکەوێ، لە یادی خودا خافڵ دەبێ. ئەگەر تووشی هەژاری و دەستکورتی بوو، ئەوە مات و مەلوول دەبێ. کە وایە هیچ شتێک لەوە چاکتر نییە سپاس و ستایشی پەروەردگار بکەیت و خەریکی کارێک بی کە ڕزق و ڕۆزی و

---

١. قَالَ تَعَالَى: ﴿ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ ﴾ آل عمران: ١٨٨

واتا: ئەی موحەممەد! وا گومان مەبە کە ئەوانەی وا دڵخۆشن بە کردەوە نالەبارەکانی خۆیان‌و شانازی دەکەن بەوەی کە توانیویانە سەر لە خەڵکی بشێوێنن، ڕاستییەکەیان هەڵگێڕاوەتەوە، زانیاری ڕاست‌و دروستیان شاردۆتەوە، خۆیان بە خاوەن پلەو پایەی علیم‌و زانست دەزانن، پێیان وایە: کە شیاوی ئەوەن کە سوپاس بکرێن، چونکە تەورات‌و ئینجیل خوێنن‌و ڕاڤەکەری دەقەکانیانن دەیانەوێ تۆ سوپاسیان بکەی لەسەر شتێک کە نەیان کردووە، - تۆ ئەی موحەممەد! وا مەزانە ئەوان لە سزای جیهانی ڕزگاریان دەبێ، ئەوانە هەرگیز ڕزگاریان نابێ‌و بەختەوەر نابن، بەڵکوو سزای بە ئێشیان بۆ دیاری کراوە لە دونیادا ڕیسوا دەبن، تووشی جۆرەها بەڵاو موصیبەت دێن، جۆرەها بومەلەرزەو زریان‌و لافاو دەردو بەڵاو تاعون‌و نەخۆشی سامناک ڕوویان تێ دەکا! لە قیامەتیشا ڕاپێچی دۆزەخ دەکرێن‌و تۆڵەی بوختان‌و سەرپێچییان لێ دەسێنرێ، لەسەر گۆڕانکاری دەقەکانی تەورات‌و ئینجیل‌و هەڵەو گێڕانەوەی مەبەست‌و ماناکانیان سزا دەدرێن.

پەوکردنی بنەماکانی ژیانی ئەم دنیا و ئەو دنیاتی بە دواوە بێ. لە زانایەکیان پرسی: 'بەدفەرترین و ناجسنترین مرۆڤ کێیە؟' لە وەڵامدا گوتی: 'ئەو کەسەی ئارەزووەکەی بەسەر جوامێرییەکەیدا زاڵ بێ. غیرەتی کاری گەورەی نەبێ. دوای ئەوە گوتی: 'بەڵام لەبارەی تەرکەدنیای و خوداپەرستییەوە بەو جۆرەیە کە هیشامی کوڕی بەشەر دەڵێ: 'لە عومەری کوڕی عوبەیدم پرسی کە ڕاستی تەرکەدنیایی چییە؟' وەڵامی دامەوە: 'پێغەمبەر درووود و سڵاوی خودای لەسەر بێ، فەرمووی: 'تەرکەدنیا ئەو کەسەیە کە گۆڕی لە بیر نەچێتەوە. ئەوەی لەدەست دەچێ، لەگەڵ ئەوەی هەتاهەتاییە نەگۆڕێتەوە و سبەینێ بە تەمەنی خۆی دانەنێ و خۆی بە مردوو بزانێ.' ' دەگێڕنەوە کە ئەبووزەڕ دەیگوت: 'هەژاری بە لای منەوە لە تێری چاکتر و نەخۆشیش لە سڵامەتی بە بەرەکەتترە' هێندێک لەو کەسانەی ئەو قسەیەیان بیست، گوتیان: 'خودا لێی خۆش بێ. بەڵام وا چاکە مرۆڤ بەو شتەی خودا پێی داوە ڕازی و خۆشحاڵ بێ، جا هەر چۆنێک بێ.' هێندێک لە باوەڕپێکراوان گوتوویانە: 'لەگەڵ کوڕی ئەبووئەوفا نوێژی بەیانیمان دەکرد. سوورەتی 'یا أیها المدثر'ی دەخوێندەوە. کاتێک گەیشتە ئایەتی 'فاذا نُقر في النّاقور،'[1] کەوت و مرد.' دەشگێڕنەوە دەڵێن: 'سابتی بەنانی ئەوەندە گریا هەتا کوێر بوو. پیاوێکیان هێنا چاوی دەرمان کا و ئەگەر بکرێ چاکی کاتەوە. ئەو کابرایە گوتی: 'بەو مەرجە چاکت دەکەمەوە کە ئیدی نەگریت.' سابت گوتی: 'ئەگەر ئەو چاوانەی من نەگرین، ئەی بە کاری چی دێن.' ' پیاوێکی دیکە بە پێغەمبەر [سڵاوی خودای لێ بێ]ی گوت: 'ئامۆژگارییەکم بکە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. ئەو جار کە فوو بە کەڕەنادا دەکرێت.

## که شەوی هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'کەسـێک ڕکای لە پێغەمبەری خودا کرد ئامۆژگارییەکی بکا. پێغەمبەر فەرمووی: 'ئامۆژگاریم ئەوەیە لەم دنیادا دەستڕۆیشتوو و لەخوداترس بە و لەو دنیادا ژێردەســته و چاولەدەســت بە.' ئەو کابرایە گوتی: 'جا ئەوە چۆن دەبێ؟' پێغەمبەر فەرمووی: 'هەرکەس لەم دنیایە لەخوداترس بێ، لەم دنیا و لەو دنیاش دەســتڕۆیشــتوو دەبێ.'

" 'غەوس کوڕی عەبدوڵلا گوتی: 'لە بەنی ئیسرائیل دوو برا بوون، یەکیان بەوی دیکەی گوت: 'چ کارێکت کردووە کە لێی بترسـی؟' گوتی: 'ڕۆژێک مریشـکێکم لە مریشـکفرۆشـێک کڕی و هێنامەوە ماڵێ، خستمە نێو ئەو مریشـکانەوە کە لەوم نەکڕی بوون.' ئەویان گوتی: 'تۆ بڵێ چت کردووە کە بوویێتە هۆی ئەو ترس و نیگەرانیەت؟' گوتی: 'هەر کاتێک دەمەوێ نوێژ بکەم، ترس و نیگەرانیم لەوە هەیە کە ئەو نوێژە لەبەر پاداش بکەم.' بابیان گوێی لەو وتووێژەیان بوو، گوتی: 'خودایە! ئەگەر ئەوانە بە ڕاستیانە، ئەوە گیانیان بکێشە و بیانبەوە لای خۆت.' عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر گوتوویەتی: 'بە فەزاڵە گەیشــتم، داوای ڕاوێژ و ڕێنوێنیم لێی کرد. گوتی: 'دوو تایبەتمەندی فێر بە: یەکیان ئەوەیە کە خودا بە تاک بزانە. دووەمیان ئەوەیە کە هیچ کەس ئازار مەدە. کە شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

که گەورەی، چـــووکە مەچـــرووســـێـــنەوە
پـــاشـــــای، مســـــکـێـنـــان مەچەوســـێـنەوە
ســــەر پەنـچەی بـێـهـێـز مەشــــکـێـنە بە هـێـز
بەهێزێـک دەبـــــــــــــــــــــێ بتشـــکێنێتەوە

" 'کە کەنیزی دووەم باســەکەی تەواو بوو، کشــاوە و کەنیزی ســێیەم هاتە بەرەوە و گوتی: 'تەرکەدنیایی و ڕووڵەخوداکردن بەســتێنێکی پان و بەرینی هەیە. بەڵام من هەر ئەو شــتانەی کە لە پیاوچاکانی پێشــوو بیســتوومە، باس دەکەم. ئەویش ئەوەیە کە یەکێک لە عارفان گوتوویەتی: 'من مردنم لە ژیانم پێ خۆشــترە، چونکە لە ژیاندا لەنێوان من و ئاکارەکانمدا پەردەیەک هەیە'. عەتا ســـەلما عادەتێکی هەبوو کاتێک لە پەند و ئامۆژگاری دەبووەوە، ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕا و گیانی دەلەرزی. لەو بارەوە هۆکارەکەیان پرســـی. گوتی: 'کارێکی گەورەم لەپێشـــدایە و دەمەوێ گوێڕایەڵی پەروەردگار بکەم.' هەر لەبەر ئەوەش زەینولعابیدینی کوڕی حوسێن کاتێک هەڵدەستا نوێژ بکا، دەلەرزی. لێیان پرســی: 'بۆ دەلەرزیت؟' گوتی: 'دەزانن من لەبەر چی هەڵدەستم و دەمەوێ لەگەڵ کێ قسـە بکەم؟'

سوفیانی سەوری گوتوویەتی: 'چاو لە ستەمکاران کردن تاوانێکی گەورەیە.'

" 'پاشـــان کەنیزی ســـێیەم لا چوو و کەنیزی چوارەم هاتە پێشـــێ. پێچکەی تەختی پاشـایەتی ماچ کرد و گوتی: 'دەگێڕنەوە بیشـری حافی گوتوویەتی: 'لە خالیدم بیسـتووە کە دەیگوت: 'لە شیرکی شاراوە خۆ بپارێزن.' گوتم: 'شیرکی شـاراوە چۆنە و چییە؟' گوتی: 'ئەوەیە کە نوێژ بکەن و ڕکووع و ســـووجدەکەتـان درێژ بکەنەوە.' ' عـارفێـک دەڵێ: 'کارەچاکەکان قەرەبووی کارە خراپەکانن.' یەکی دیکە لە عارفەکان گوتوویەتی کە داوام لە بیشـــری حافی کرد ڕاســـتییەکم پێ بڵێ. گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەو زانســـتە بۆ ئەوە نابێ بە هەموو کەسی بڵێی. مەگین لە هەر پێنج سەد کەس کەسێک. وەکوو زەکاتی سکەی زیوین.' ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم دەڵێ: 'ڕۆژێک بیشـر ڕاوەسـتابوو نوێژ بکا، منیش چوومە پشـت سـەری و نوێژەکەم دابەست و نوێژمان کرد. دوایە کابرایەکی شـڕۆڵ هەسـتا و قسـەیەکی کرد زۆرم پێ جوان بوو. گوتی: 'خەڵکینە خۆ لە قسـەی ڕاسـتی کێشـەساز بپارێزن، بەڵام درۆی باش قەیناکا و ئیرادی نییە. قسـەی زلزل بۆ کەسێک کە هیچ شـتێک شک نابا، هیچ قازانجێکی نییە. هەر وەک چۆن لە لای خاوەنی خۆت بێدەنگی کێشـــەی نییە.' ' ئیبراهیم گوتوویەتی: 'چاوم لێ بوو بیشـری حافی پشـیزێکی[1] لێ کەوت. هەسـتام درەمێکم دایە. لێی وەرنەگرتم. گوتم: 'ئەو درەمە تەواو حەڵاڵە.' گوتی: 'من نیعمەتی پەســـڵان بە نیعمەتی دنیا ناگۆڕمەوە.' ' دەشگێڕنەوە خوشکی بیشری حافی چووە لای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. پشیز: دراوێکی زۆر کەمی قەدیمە.

گوتی: 'خاوەنشكۆ، كەنیزەكە بە نوعمانپاشای گوت: 'خوشكی بیشری حافی چووە لای ئەحمەد كوڕی حەنبەڵ و گوتی: 'ئێمە هۆزێكین بە شـــەو خەریكی تەشـــیڕێســـی و خوریشیكردنەوە و شتین و، بە ڕۆژدا خەرجی بژێوی خۆمانی دەكەین. زۆر شەو كە ئێمە لە سـەربان دادەنیشـین، شـەوقی ماڵە دەوڵەمەندەكان بەرچاومان ڕووناك دەكاتەوە و كار دەكەین. ئایا ئەوە بۆ ئێمە حەرامە یان نا؟' ئەحمەد گوتی: 'تۆ كێی؟' گوتی: 'خوشـــكی بیشـــری حافیم.' ئەحمەد گوتی: 'هۆزی بیشـــر، من لە خوا داواكارم ئەو پارێزكاری و تەركەدنیاییەی ئێوەم بە قسمەت بكا.' عارفێكیش گوتوویە: 'ئەگەر خوا بیهەوێ بەرەكەت بە قسـمەت كەسـێك بكا، دەركی گوێڕایەڵی بە ڕوودا دەكاتەوە.' مالیكی كوڕی دینار كاتێك بە بازاڕدا دەڕویشت و حەزی دەچووە شتێك، دەیگوت: 'ئەی نەفس! بۆ ئەوەی داوای دەكەی، وەڵامت نادەمەوە.' لە جێگایەكی دیكەدا گوتوویەتی: 'ســـلامەتی لەوەدایە لەگەڵ نەفســـتدا دژایەتی بكەیت و چارەڕەشیش لەوەدایە شوێنی بكەویت.'

" ' 'مەنسووری كوڕی عەممار گوتوویەتی: 'سـاڵێك ویسـتم بە كووفەدا بچم بۆ مەككە. شـەوێكی تاریك دەڕۆیشـتم، كەچی گوێم لە دەنگی قورئانخوێندن بوو، هەتا گەیشـتە ئەو ئایەتەی دەڵێ: 'ئەی ئەو كەســانەی ئیمانتان هێناوە خۆتان و بنەماڵەكەتان لە شــەڕێك كە ئاوردووەكەی خەڵك و بەردەكانن خۆ بپارێزن.'[1] كە ئەو ئایە خوێندرایەوە دەنگی كەوتنی كەســـێك هات. ئیدی نەمزانی چۆناوچۆن بوو. كە ڕۆژ بووەوە. تەرمێكم دیت پیرێژنێك بەدوایدا دەڕۆیشـــت. لە پیرێژنەم پرســـی: 'ئەوە تەرمی كێیە؟' گوتی: 'ئەوە پیاوێك بوو بە لای ماڵی ئێمەدا هات و كوڕەكەم نوێژی دەكرد. ئایەتێكی لە قورئان خوێندەوە، كەچی كابرا دڵی تۆقی، كەوت و مرد.' '

" 'ئیدی كەنیزی پێنجەم هاتە پێش و كڕنۆشـــی برد و گوتی: 'مەسـلەمەی كوڕی دینار گوتوویەتی: 'كـاتێـك دڵەكـان پـاك بنەوە، تـاوانی گەورە و چووكە دەبەخشـــرێ. ئەگەر

---

١.قَالَ تَعَالَى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦ ﴾ التحريم: ٦.

واتا: ئەی ئەو كەســانەی ئیمانتان هێناوە، بڕواتان بە تاك وتەنهایی خوداو راسـتی پێغەمبەرایەتی موحەممەد هەیە؛ خۆتان رێك وپێك بكەن، بە تاعەتو خوداپەرستیو بەندایەتیكردنی دڵسۆزانە خۆتانو خێزانو منداڵتان بپارێزن لە ئاگرێك سـوتەمەنیەكەی ئادەمیزادو بەردە، بتپەرسـتەكانو بتەكانیان. بەسـەر ئاگری دۆزەخەوە هەن چەند فریشتەیەكی دڵرەق، بەزەییان بەكەس دانایە، سەر پەرشتی دۆزەخو سزادانی تاوانباران دەكەن، دیمەنیان ترسناكو پێكهاتەیان سەر سوڕهێنەرە، خودا خوڵقاندوونی بۆ سزادانی تاوانباران، ژمارەیان نۆزدە فریشتەیە.

بەندەیەکیش تۆبە بکا و نەچێتەوە سـەر گوناهەکانی، خودا کارەکانی بە دەسـتەوە دەدا.'[1] گوتووشـیتی: 'هەر هاتییەک[2] مرۆڤ لە خودا نیزیک نەکاتەوە، ئەوە نەهاتییە[3]. لە جێیەکی دیکەدا دەڵێ: 'کەمی دنیا ڕۆژی پەسـڵان لە بیری مرۆڤ دەباتەوە و سـەر قاڵی دەکا.' لە باوکی حازمیان پرسـی: 'تێروپڕترین کەس کێیە؟ گوتی: 'ئەو کەسـەیە کە تەمەنی لە ڕێی بەندایەتی خوادا بردووەتە سەر.' گوتیان: 'ئەی گەوجترین مرۆڤەکان کێن؟' گوتی: 'ئەوانەی وا قیامەتی خۆیان لەگەڵ دنیای خەڵکدا دەگۆڕنەوە.' دەگێڕنەوە کە مووسا سڵاوی خودای لێ بێ کاتێک گەیشتە ئاوی مەدیەن پرسی : 'پەروەردگارا! ئەمن پێویستم بەو بەرەکەتەیە کە بۆم دەنێری.'[4] ئیدی مووسـا داوای لە خودا کرد و دەسـتی بۆ لای خەڵک درێژ نەکرد. کە دوو کەنیشـکەکەی شـوعەیب هاتن، ئاوی دانێ. کاتێک ڕۆیشـتن شـتەکەیان بۆ باوکیان گێڕاوە، شـوعەیب گوتی: 'ڕەنگە ئەو برسـی بێ.' ئیدی بە یەکێک لە دوو کچەکەی گوت: 'بگەڕێوە و بیهێنە لای من.' کە کیژەکە چوو، ڕووی خۆی گرت و بە مووسای گوت: 'باوکم بانگت دەکا و دەیەوێ حەقی ئاوەکەت بداتێ.' مووسـا ئەو قسـەیەی پێ ناخۆش بوو. بۆ سـاتێک ویسـتی نەچێ. هەر زووش پەشـیمان بووەوە. سـمتی ئەو کچە زۆر گەورە بوو، باشـی دەهات و کراسـەکەی پێوە دەنووسـاند و ئەوەندەی دی سـەرنجڕاکێشـتری دەکرد. مووسا چاوی بەو دیمەنە کەوت، لەپێشدا چاوی داخست. دوای بە کیژەی گوت: 'تۆ لەدوای منەوە وەرە.' ئیدی مووسا لەنواوە و کیژە لەدوایەوە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە لای شوعەیب. چێشتیان بۆ شێو هێنا.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی هەشتا و سێیەم هاتەوە.

---

١. بەدەستەوەدان: کاراسانی بۆ کردن، جۆرێک یارمەتیدان.

٢. هاتی: نیعمەت، خێر و بەرەکەت.

٣. نەهاتی: بەدبەختی، چارەڕەشی.

٤. قَالَ تَعَالَى:﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ القصص: ٢٤

واتا: مەڕو بزنی دووئافرەتەکەی ئاوداو دوایی بەردەکەی خسـتەوە سـەر بیرەکە. بەمەش شـەهامەتی خۆی نواند، تەرازوی لاری بێ دەسـەڵاتانی ڕاست کردەوە. ئەمجار: کەمەڕو بزنەکەی ئاودان، چووە ژێرسـێبەری درەختێکەوە بۆپشـوودانو حەسـانەوە، ئەمەش ئاماژەی ئەوەی تێدایە: کەسـەفەرەکە لەکاتی گەرمادا بووە. ماندوویی‌و شـەکەتی زۆری بینیوە، لەخودا پاڕایەوە پێویسـتیم بەهەندێ خوراکو بژێو هەیە، ئاتاجی هەندێ خواردەمەنیم، ئازاری برسیایەتیمی پێ فەرامۆش بکەم، بەم شێوە پەنای بردە بەرسێبەری درەخت بۆئەوەی جەسـتەی لەتینی گەرما بپارێزێ، هانای بردە بەرسـێبەری پەروەردگارو بەگیانو دڵی، پاڕایەوە وتی: خودایە من موحتاجم، خودایە من تەنهام، خودایە من زەبوونم، خودایە من پێویسـتم بەفەچلو بەخشـشـی تۆ هەیە، ئاتاجی کەمێک لەنیعمەتی تۆم!! هێشـتا حەزرەتی موسـا سـەرگەرمی موناجاتو پاڕانەوە بوو، کاتێکی زانی دەرووی خێری لێ کرایەوە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کەنیزی پێنجەم بە نوعمانپاشای گوت: 'مووساو سڵاوی خودای لێ بێ گەیشتە کن شوعەیب و چێشتیان بۆ شێو هێنا. شوعەیب بە مووسای گوت: 'دەمەوێ حەقی ئاوهەڵێنجانەکەت دەمێ.' مووسا گوتی: 'من لە بنەماڵەیەکم کە کاڵای قیامەت نادەن بە کاڵای ئەم دنیایە و بە زێڕ و زیویشی نادەن.' شوعەیب گوتی: 'کوڕی چاک، تۆ میوانی منی. خووخدەی منیش و باب و باپیرانی منیش وایە ڕێز لە میوان بگرین.' وا بوو مووسا دانیشت و نانەکەی لەگەڵ خواردن. دوای ئەوە شوعەیب قەراری لەگەڵ دانا و هەتا هەشت ساڵان کاری بە مووسا کرد و پاشان کرێکەشی یەکێک لە کچەکانی خۆی دایە. ئەوەش مارەی یەکەی بوو. هەر وەک لە قورئانی پیرۆزیشدا باسی کردووە: 'دەمەوێ یەکێک لەو دوو کچانەی خۆمت دەمێ، بەو مەرجەی تۆش هەتا هەشت ساڵ کارم بۆ بکەی.'[1] دەگێڕنەوە کەسێک تووشی هاوڕێیەکی خۆی بوو کە لە مێژ بوو نەیدیبوو، لێی پرسی: 'تۆ کوڕی شەهاب دەناسی؟' ئەو کابرایە گوتی: 'ئەرێ دەیناسم. ئەوە هەشت ساڵە دراوسێمانە، بەڵام قسەم لەگەڵ نەکردووە.' گوتی: 'ئەو گوتی تۆ ئەوت پشتگوێ خستووە، کەواتە خودات پشتگوێ خستووە. ئەگەر خودات خۆش ویستبا، دراوسێکەشت خۆش دەویست. مەگەر نەتزانیوە دراوسێ مافێکی گەورەی وەک خزم و کەسی بەسەر مرۆڤەوە هەیە؟' حوزەیفە گوتوویەتی: 'لەگەڵ ئیبراهیمی ئەدهەم لە مەککە بووین و شەقیقی بەلخیش لەو ساڵەدا هاتبوو بۆ حەج. لە تەوافدا لەدەوری یەک کۆ بووینەوە. ئیبراهیم بە شەقیقی گوت: 'دا باسی گوزەرانی خۆتانم بۆ بکە؟' شەقیق گوتی: 'جا باسی چی بکەم، ئەگەر خواردنمان وەگیر کەوت، دەخۆین و ئەگەر نەشمان بێ، خۆمان ڕادەگرین و دان بە خۆماندا دەگرین.' ئیبراهیم گوتی: 'جا سەگەکانی بەلخیش وا دەکەن. بەڵام ئێمە ئەگەر شتێکمان وەگیر کەوێ، بەسەر هەژاراندا دابەشی دەکەین و، ئەگەر وەگیریشمان نەکەوێ، سپاسی خودا دەکەین.' ئیدی شەقیق تەریق بووەوە خۆی بەسەر لاقی ئیبراهیمدا دا و گوتی: 'ئێوە مامۆستای منن.' '

" 'کەنیزی پێنجەم بێدەنگ بوو. پیرێژن هاتە پێشەوە و نۆ جار کڕنۆشی بۆ نوعمانپاشا

---

١. قَالَ تَعَالَى: ﴿ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍۖ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ۝٢٧ ﴾ القصص: ٢٧

واتا: وتی: من دەمەوێ بتکەمە کوڕی خۆمو خۆم بکەم بەخەزورتو یەکێ لەکچەکانمت لێ مارە بکەم، خۆت سەرپشک بە. تۆش هەشت ساڵ شوانیم بۆ بکە. ئەگەر هەشتەکەیشت کرد بەدەساڵ ئەوە پیاوەتی خۆتە، من زۆرت لێ ناکەمو نامەوێ زەحمەتت بدەم بەتەواو کردنی دەساڵ، تەنانەت هەندێ کەمو کوڕیشت هەبێ چاوپۆشیت لێ دەکەم، خودا پشتیوان بێ من دەبینی لەپێڕی پیاوچاکان دەبم لەگەڵت داو خزمایەتیمان تاسەر دەبێو لێک عاجز نابین. وێدەچێ پیرەمێردی زاناو دووربین هەستی بەمەیلێکی سروشتیو نێوان کچەکەیو حەزرەتی موسا کردبێ، زانیبیەتی کەبتمانەیان بەیەکتر هەیەو شیاوی ئەوەن کەبەیەکەوە خێزانێک دروست بکەن. حەزرەتی موسا پێشنیارەکەی قبوول کردو وەڵامی دایەوە.

برد و گوتی: 'له بابەت ڕووڵەخودابوون و خۆپارێزییەوە قسەکانی ئەو کەنیزانەت بیست. منیش هێندێک لەو شتانەی لە گەورە و زانایانی پێش خۆمەوە بیستوومن، عەرزی ئێوەی بەڕێزی دەکەم.

" ' 'گوتراوە کە ئیمام شافعی شەوی کردووەتە سێ کەرتەوە. کەرتی یەکەمی بۆ فێربوون. کەرتی دووەم بۆ خەو. کەرتی سێیەم بۆ پەرستش. ئیمام حەنیفەش دابی وا بوو هەتا نیوەشەو هەر بەخەبەر بوو، خەریکی عیبادەت بوو. ڕۆژێک بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت، دوو کەس پێکەوە قسەیان دەکرد و ئاماژەشیان بۆ ئیمام حەنیفە کرد، گوتیان: 'ئەوە شەوانە هەتا بەیانی هەر بەخەبەرە و عیبادەت دەکا.' ئەبووحەنیفە کە گوێی لەوە بوو، گوتی: 'من شەرم لە خوا دەکەم کە بە جۆرێکم تاریفم دەکەن کە وا نیم.' دوای ئەوە تەواوی شەوەکان بەخەر دەبوو. ڕەبیعی گوتوویەتی: 'شافعی لە مانگی ڕەمەزاندا حەفتا جاری قورئان تەواو دەکرد و هەر حەفتاشی لە نوێژدا دەگوتەوە.' شافعیش گوتوویەتی: 'دە ساڵیشە تێر نانی جۆم نەخواردووە، چونکە تێری دڵ ڕەش دەکا، وریای و وشیاری کەم دەکاتەوە و خەو دێنێ.' دەگێڕنەوە عەبدوڵڵا کوڕی مەعد گوتوویەتی: 'کەسم نەدیوە لە محەممەدی کوڕی ئیدریسی شافعی خۆپارێزتر بێ.' ڕۆژێک حارسی خوێندکاری موزەننی کە دەنگێکی خۆشی هەبوو، ئەو ئایەتەی خوێندەوە: 'هذا يومُ لا يَنطقون و لا يُؤذن لهم فيَعتذرون.'[1] ئەمن چاوم لێ بوو ئیمام شافعی ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و دەلەرزی و نیگەران بوو، ئیدی کەوتە سەر زەوی.' کەسێکی جێی باوەڕ گێڕاوییەتەوە: 'کە چووم بۆ بەغدا، شافعی لەوێ بوو. من چووم لە ڕۆخ دیجلە دەستنوێژ بشۆم، کەسێک بە لای مندا ڕابرد و گوتی: 'کوڕە دەستنوێژ جوان بگرە.' کە ئاوڕم داوە و تێم ڕوانی، سەیرم کرد پیاوێکە و تاقمێکیش بەدوایدا دەڕۆن. منیش خێرا دەستنوێژەکەم گرت و بەدوایاندا ڕۆیشتم. ئەو پیاوە چاوێکی لێ کردم و گوتی: 'کارت بوو؟' گوتم: 'بەڵێ، لەوەی خودا فێری کردوویت، فێرم بکە.' گوتی: 'ئەوە بزانە کە هەرکەس لەگەڵ خودای خۆی ڕاست بێ، ڕزگاری دەبێ و، هەرکەس دڵسۆزی دینی خۆی بێ، تێدا ناچێ. هەرکەس لە دنیا ڕوو لە خودا کا و تەکەرکە دنیا بێ، ئەوە چاوی بە ڕۆژی قیامەت ڕوون دەبێتەوە.' گوتیشی: 'پشت لە دنیا و ڕوو لە ڕۆژی پەسڵان بکە. لە کاروبارتدا هەمیشە سەرڕاست بە، بۆ ئەوەی ڕزگارت بێ.' ئەو قسانەی کرد و ڕۆیشت. من پرسیم: 'ئەو کابرایە کێ بوو؟' گوتیان: 'ئیمامی شافعی بوو.' ' ئیمامی شافعی دەیگوت: 'لە زانستی من کەڵک وەرگرن، بەڵام بە ناوی منەوەی مەکەن.' ' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. ئەوە ڕۆژێکە کە کەس ناتوانێ قسە بکا، دەرفەتی ئەوەشیان نادرێتێ داوای لێبووردن بکەن.

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'شافعی گوتوویەتی: 'تکایە هەرکەس شتێک لە منەوە فێر دەبێ، بە ناوی منەوە بڵاوی نەکاتەوە.' لە جێیەکی شـافعی گوتوویەتی: 'من مشـتومڕم لەگەڵ کەس نەکردووە، مەگین ویسـتبێتم خودا پەنچەرەی حەقی بەسـەردا بکاتەوە، جا لە زمان منەوە بێ یان لە زمان خۆیەوە.' بە ئەبوو حەنیفەیان گوت: 'خەلیفە مەنسـوور تۆی کردووە بە قازی و مانگێ دەهەزار درەمیشـی بۆ دیاری کردووی.' ئەبوو حەنیفە ڕازی نەبوو. هەتا ڕۆژێک خەلیفە دەسـتووری دا پارەکەیان بۆ برد. کە نێردەی خەلیفە هات و لەگەڵ ئەبوو حەنیفەدا قسـەی کرد، هیچی نەگوت. نێردەی خەلیفە گوتی: 'ئەوە مـاڵی حەڵاڵە.' گوتی: 'دەزانم ئەو ماڵە حەڵاڵە، بەڵام دەترسـم سـتەمکاران کارم تێ بکەن و لێیان نیزیک بمەوە.' ڕاسپاردەکەی خەلیفە گوتی: 'لەگەڵیان بسـازێ، بەڵام خۆشـت نەوێن.' ئەبوو حەنیفە گوتی: 'چۆن دەبێ من لە دەریا دەم و جلەکانیشم تەڕ نەبن؟'

" ' 'سوفیانی سەوری وەسییەتی بۆ عەلی کوڕی حەسەنی لەمی کردووە: 'لە تۆم دەوێ ڕاسـت و دروسـت بی. لە درۆ و خەیانەت و خۆبەزلزانی بەدوور بی، چونکە هەر کارێکی چاکیش بە هۆی ئەو کارە ناڕەوا و سـووکانەوە سـووک دەبێ. باوەڕ بە باوەڕەی کەسـێک بکە کە لەسەر باوەڕەکەی خۆی سوور و بۆی دڵسۆز بێ. لەگەڵ کەسێکیش هەڵسوکەوت بکە کە دنیات لە بەرچاو بخا و یادی گۆڕ و ڕەسـتاخێز لە دەروونتدا زیندوو بکاتەوە. هەر باوەڕدارێک پرسـیاری لەبارەی دینەکەیەوە هەبوو، ئامۆژگاری بکە. ناپاکی لە باوەڕداران مەکە، چونکە هەرکەس نـاپـاکی لە بـاوەڕدارێـک بکـا، وەک ئەوە وایە نـاپـاکی لە خودا و پێغەمبەری خودا کردبێ. هەمیشـە لە شـەڕ و کێشـە و دژمنایەتی دوور بکەوە و خەریکی ئـامۆژگـاری و ڕێنوێنی خەڵـک بە بۆ لای کـاری چـاک و لە کـاری خراپ و دزێویـان بپرینگێنەوە. هەسـت و مەبەسـتی خۆت پاک و خاوێن کەوە، بەشـکو خودا ڕەحمت پێ بکا. هەرکەس ویستی پاساوێک بۆ شتێک بێنێتەوە، لێی قەبووڵ بکە و لەگەڵ موسوڵماناندا شت لە دڵ مەگرە. بە جۆرێک لە خودا بترسە، وەک ئەوەی تۆ مردووی و لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا زیندوو بوویتەتەوە و لە مەحشەردای.' '

" 'ئیدی پیرێژن چوو لە لای کەنیزەکان دانیشت. کاتێک نوعمانپاشای باوکت گوێی لەو قسـانە بوو، بۆی دەرکەوت ئەوانە بە ڕاسـتی زانای ڕۆژگارن. ئەوە بوو فریوی جوانی و چاکی و ڕەوشـتبەرزی ئەوانی خوارد، ڕێزی لە پیرێژن گرت و کۆشـکی تایبەتی، کە هەر کۆشـکەکەی شـازادە ئەبریز بوو، دانێ و بۆی ڕێکوپێک کردن و پێداویسـتی بۆ ئامادە کردن. هەر کاتێک دەچووە لای، دەیدیت ئەوە پیرێژن خەریکە نوێژ دەکا و بە ڕۆژووشـە.

هەر لەبەر ئەوەش پیرێژنەی کەوتە بەر دڵی. بە منی گوت: 'وەزیر ئەو پیرێژنە لەو هەرە چاکانەی ڕۆژگارە.'

" 'کە دە ڕۆژ بەو جۆرە تێپەڕی. پاشـــا پیرێژن و کەنیزەکانی بانگ کردنە کن خۆی، هەتا نرخی کەنیزەکان بە پیرێژنە بدا. پیرێژنە گوتی: 'پاشـــا، با ئەوەت پێ بڵێم کە نرخی ئەوانە زێڕ و زێو و گەوهەر نییە.' کە نوعمانپاشـا گوێی لەوە بوو، پێی سـەیر بوو، گوتی: 'خانم، نرخی ئەو کەنیزانە چییە؟' پیرێژن گوتی: 'ئەوانە نافرۆشم، مەگین بە مانگێک ڕۆژوو نەبێ. ئەویش دەبێ شـــەوەکانی هەتا بەیانی خەریکی خواپەرســـتی بێ. ئەگەر ئەو کارەت کرد، ئەوە کەنیزەکان هەموویان بۆ خۆت. هەرچییان لێ دەکەی، بیکە.' پاشـــا ســـەری لەو هەموو پارێزکاری و لەخواترســـییەی ســـووڕ ما و ئەوەندەی دیکەش پیرێژنەی لە بەرچاو شیرین بوو. ئەوە بوو گوتی: 'هیوادارم خودا قازانجێکی زۆرم لە ڕێی ئەو ژنە چاکەکارەوە بە نسیب کا.'

" 'ئیدی لەگەڵ پیرێژنە ڕێک کەوتن کە یەک مانگ بەڕۆژوو بێ و، مەرجی پیرێژنەکەی قەبووڵ کرد. ئینجا پیرێژنە داوای گۆزەڵەیەک ئاوی کرد. دۆعایەکی بەســـەردا خوێند و فووی لێ کرد و مـاوەیەکی بـاش ودمی لەســـەر خوێند. ئێمە نەمـانـدەزانی چی دەڵێ. ئەوەندەمان دیت سـەری گۆزەڵەکەی بەست و نیشـانەی کرد و دای بە نوعمانپاشـا و پێی گوت: 'دە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبی و، سـەری ڕۆژی یازدەیەم ڕۆژووەکەت بەو شـتەی نێو ئەو گۆزەیە دەشکێنی. ئیدی خۆشـەویستی و بەسترانەوە بە دنیات لە دڵ دەباتە دەرێ و پڕی دەکا لە تیشـــکی باوەڕ. منیش بۆ بەیانییەکەی دەچم بۆ لای هاوڕێکانم کە پیاوی غەیبین. دوای دە ڕۆژ، دەگەڕێمەوە. کاتێک پاشـــا گۆزەڵەکەی وەرگرت، پیرێژن ڕۆیشـــت. پاشـــا لە کونجێکدا دانیشت و گۆزەڵەکەشی لەوێ دانا و دەرگای لەسەر خۆی داخست. کلیلەکەشی لە گیرفـانی خۆی نـا و خەریکی ڕۆژووگرتنەکەی خۆی بوو. پیرێژنیش بە ڕێی خۆیـدا ڕۆیشت.' لێرەدا بوو، لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، وەزیر دەندان بە زەوئولمەکانی گوت: 'پاشـــا دەســـتی کرد بە ڕۆژووگرتن. پیرێژنیش بە ڕێی خۆیدا ڕۆیشت. کاتێک پاشا دە ڕۆژەی یەکەمی تەواو کرد، ڕۆژی یازدەیەم دەســـتی دا گۆزەڵەکە و نیشـــانەکەی لەســـەر هەڵگرت بۆ بەربانگ لەوی خواردەوە. هەستی بە گۆڕانێک کرد لە دەروونیدا؛ هەستی بە کاریگەری و گۆڕانێکی خۆش دەکرد. کە دە ڕۆژەی دووەم تەواو بوو، پیرێژن گەڕاوە، نەختێکی حەڵوای لەسەر گەڵایەکی ســـەوز دانابوو، لەگەڵ خۆی هێنای. ئەو گەڵایە وەک گەڵای دار نەبوو. کە پیرێژن هاتە پێشـــێ، پاشـــا لە بەری هەســـتا و ســـڵاوی لێ کرد. پیرێژن گوتی: 'پاشـــا، پیاوانی غەیبی سڵاویان لێ دەکردی. کە من باسی تۆ و هەڵوێستەکەتم کرد، ئەوان خۆشحاڵ بوون و ئەو حەڵوایەیان بۆ ناردی. ئەو حەڵوایە لە حەڵوای بەهەشتە. ئەمشەو بەو حەڵوایە ڕۆژووەکەت بکەوە.' نوعمانپاشا زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی: 'سپاس بۆ خوا کە برایانی غەیبی بوون بە هاوڕێ و برادەری من.' ئیدی ســـپاســـی چاکە و کردەوەکانی پیرێژنی کرد و دەســـتی ماچ کرد. ڕێزی لەو و لە کەنیزەکانی گرت.

" 'کاتێک پاشـــا دە ڕۆژی دیکە بەڕۆژوو بوو، ڕۆژی بیســـتویەکەم پیرێژن پێی گوت: 'پاشا، ئاگادار بە من باسی خۆشەویستی و متمانەی نێوان خۆم و خۆتم بۆ پیاوانی غەیبی کرد و پێم گوتن کە کەنیزەکانم لە لای تۆ بەجێ هێشـــتووە. ئەوان پێیان کارێکی باش بوو، خۆشـــحاڵیش بوون کە ئەوان لە لای تۆی پاشـــا و پاشـــای ڕەوشـــتدا بمێننەوە. بەڵام ئێســـتا دەمەوێ کەنیزەکـــان بەرمەوە لای پیـــاوە غەیبییەکـــان هەتـــا لەژێر ودمی ئەوان خێر و بەرەکەتیان بەســـەردا برژێ و، ئینجا دۆعایان گیرۆدە بێ. ئەگەریشـــی هەیە کاتێک بێنەوە خزمەتت، کلیلی گەنجی گۆی زەوی لەگەڵ خۆیان بێننەوە خزمەت جەنابت.'

" 'کە پاشا ئەوەی بیست، سپاسی پیرێژنەی کرد و گوتی: 'من لەبەر خەزێنەکانی زەوی نەمدەتوانی دەســـت لەوان هەڵگرم، بەڵام چ بکەم ڕووی تۆ دەمگرێ و ناتوانم لە قســـەت دەرچم. بەڵام پێم بڵێ کەی دەیانبەیت و کەی دەیان هێنیتەوە؟' پیرێژن گوتی: 'لە شـــەوی بیســـتوحەوتەم دەیانبەم و کۆتایی مانگ دەیانهێنمەوە. وا بێ ئەو دەم تۆ ڕۆژووەکەت تەواو کردبێ. ئیدی ئەو کاتە ئەوان دەکەونە ژێر فەرمانی تۆوە. بەڵام بزانە کە نرخی هەر کام لەو کەنیزانە لە تەواوی وڵاتەکەی تۆ زیاترە.'

" 'پاشا گوتی: 'ئەی خانمی ئاکاربەرز، منیش ئەوە دەزانم.' پیرێژن گوتی: 'ئێستا کە من ئەوان دەبەم، تۆ دەبێ یەکێک لە هەرە ژنە خۆشـــەویســـتەکانت لەگەڵیان بنێری هەتا هەم لەگەڵ کەنیزەکانت ببنە هـاوڕێ و نێوانیـان گەرم کەن، هەم ودمی هەناســـەی پیاوانی

غەیبیشیان بەسەردا بێ.' پاشا گوتی: 'من کەنیزێکم هەیە، ناوی سەفییەیە و دوو منداڵم لێی هەیە، بەڵام منداڵەکانمان دوو ساڵە بزر بوون. ئەو لەگەڵ کەنیزەکان بەرە بەشکو دەرکی ڕەحمەت بە ڕووی ئەویشدا بکرێتەوە.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی هەشتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، 'پاشــا گوتی: 'ســـەفییە لەگەڵ کەنیزەکان بەرە بەشـــکو دەرکی ڕەحمەت بە ڕووی ئەویشدا بکرێتەوە. بەشکوو پیاوانی غەیبی لە لای خودا تکای بۆ بکەن، منداڵەکانی بۆ وەدی بێنێ.' پیرێژن گوتی: 'قسەیەکی جوانە.' مەبەستی سەرەکی پیرێژنیش بردنی سەفییە بوو.

" 'کە کاتی ڕۆیشتنی پیرێژن هات، گوتی: 'ئێستا دەچم بۆ لای پیاوانی غەیبی، سەفییە ساز کەن.' خێرا سەفییەیان ساز کرد و بەویان سپارد. پاشان پیرێژن چووە نوێژگەکەی خۆی و قاپێکی سەرگیراوی درۆشمکراوی بۆ پاشا هێنا و گوتی: 'کە مانگ نوێ بووەوە، بچۆ بۆ گەرماو. کە لە گەرماو هاتییە دەرێ، ئەوەی نێو ئەو قاپە بخۆ و بخەوە هەتا بە ئاواتی خۆت بگەی.' پاشا شادمان بوو. دەستی پیرێژنەی ماچ کرد. پیرێژنە دۆعای بۆ کرد و لەگەڵ کەنیزەکان و سەفییە کەوتنە ڕێ.

" 'پاشا سێ ڕۆژی دیکەش بەڕۆژوو بوو هەتا مانگ تەواو بوو. هەستا چوو بۆ گەرماو خۆی شـــوشـــت. کە لە گەرماو هاتە دەرێ، چووەوە دیوەکەی خۆی و فەرمووی کەس نەچێتە لای. وا بوو دەرگاکانی لە خۆی داخســـت و ســـەری قاپەکەی لا برد؛ ئەوەی لە قاپەکەدا بوو خواردی و خەوت. ئێمەش هەتا شـــەو بە دیاریەوە دانیشـــتین. لە دیوەکەی نەهاتە دەرێ. گوتمان: 'ڕەنگە لەبەر ڕۆژووی ئەو ماوەیە و بەخەبەربوونی دوێنێ شـــەو یان گەرماوەکەی بەیانی و شەکەتی ماندوویی بێت، بۆیە تا ئێستا هەڵنەستاوە.' هەتا ڕۆژی دوای هەر لەوێ ڕاوەســـتاین. دیســـان هەر نەهاتە دەرێ. ئینجا چووین لە بەردەرگای دیوەکەی دەنگەدەنگمان کرد بەشـکو وە خەبەر بێ. دیسـان بێ ئاکام بوو. ناچار بووین لە دەرگاکە بدەین. هەر بێســـوود بوو. ئیدی دەرگاکەمان شـــکاند و چووینە ژوورێ. کەچی سەیرمان کرد تەواوی گۆشتەکەی داڕزاوە و پێشە و شتەکەی بەرداوە. کە ئەوەمان دیت، هێند ناڕەحەت بووین، خەریک بوو دڵمان بتۆقێ. قاپەکەمان هەڵگرت چاوی لێ بکەین بزانین چ باسە. دیتمان لەنێو ئەو پەڕۆیەی سەری قاپەکەی پێ بەسترابوو، نامەیەکی تێدایە کە لەسەری نووسرابوو: 'پاداشتی ئەو کەسەی کە بە فێڵ کچی پاشا فریو دەدا و دەیکا بە ژن، هەر ئەوەیە. ئەگەر دەشـــتـانهەوێ بـاش لە بـابەتەکە تێبگەن، ئەویش ئەوەیە کە شـــەرکانپاشـــا هاتووەتە وڵاتی ئێمە و شـــازادە ئەبریزی فریو داوە و هێناوییەتە ئێرە و نوعمانپاشایش بە فێڵ کردوویە بە ژن و پەردەی کچێنی دڕیوە. بەوەش ڕاناوەستن لەگەڵ کۆیلەکی ڕەشـدا بەڕێی دەکەن و لە ڕێگادا کۆیلە ڕەشـە دەیکوژێ و ئێمە تەرمەکەییمان لە دەشت و دەردا دیتەوە. ئەو کارانە لە پاشایەک ناوەشێتەوە. ئێوە لە کەس بە گومان مەبن.

ئەم کارە کاری زاتوددەوايیە. لەگەڵ ئەوەشـدا سـەفییەی ژنی نوعمانپاشـاشـی لەو ستاندووەتەوە و بردوویەتەوە بۆ لای باوکی، واتە ئافریدوونپاشا. ئێستا ئێوە شەڕکەر و پیاوکوژەکانتان ساز کەن کە ئافریدوونپاشا سپا دێنێتە سەرتان یەکدانەتان بە زیندووی ناهێڵێتەوە. ئەگەر کەسێکیش بمێنێتەوە، دەبێ ببێتە مەسیحی.'

" 'کە ئەو پەڕەمان خوێندەوە، زانیمان ئەو پیرێژنە کڵاوی لەسەر ناوین. ئیدی دەستمان کرد بە شین و گریان و سەر و بسکی خۆمان ڕنییەوە. بەڵام گریان و شیوەن بێ ئاکام بوو. لەنێو سپاشدا ناکۆکی هاتە ئاراوە. هێندێکیان تۆیان هەڵبژارد بۆ پڕ کردنەوەی جێگای باوکت. هێندێکیان دەیانویست شەرکانی برات جێگای بابت بگرێتەوە. هەتا مانگێک ئاوا بە دووبەرەکایەتی تێپەڕی. دوای ئەوە ئێمە لە شار وەدەر کەوتین بچین بۆ لای شەرکانپاشا کە وا بوو شوکری خودا ئەوە تووشی تۆ بووین. ئەوە بوو، هۆکاری مردنی نوعمانپاشا.'

"کە وەزیر ئەو باسەی ئاوا گێڕاوە، زەوئولمەکان و نوزهەتوززەمان دەستیان کرد بە گریان و پەردەداریش گریا. دوای ئەوە پەردەدار بە زەوئولمەکانی گوت: 'پاشـام، گریان هیچ سوودێکی نییە. بەهێز و تواناوە وەڕێ کەوە.' ئیدی زەوئولمەکان ژێر بووەوە و گوتی: 'تەختێک بێنن.' تەختیان هێنا چووە سەر تەختەکە دانیشت و فەرمووی کە پەردەدار لە پەنای تەختەکەوە ڕاوەستێ و لەمبەرەوبەریەوە باڵباز[1] ڕیز بن. ئینجا زەوئولمەکانپاشا پرسیاری خەزێنەکانی بابی لە وەزیر دەندان کرد. وەزیر دەندان شیایی ئەو زێڕ و زیو و گەوهەری لە خەزێنەدا هەبوو، هەمووی خستە خزمەتی پاشاوە. پاشا زێڕ و زیوێکی زۆری بە سپا دا. تەواوی گەورە گەورەکانی ناو دەسەڵاتی خەڵات کرد. بە وەزیری گوت: 'تۆ هەر لە شوێنی خۆتدا دەمێنیتەوە.' وەزیر کڕنوشی کرد و سپاسگوزاری دەربڕی و پەسنی پاشای تازەی دا.

"پاشا بە پەردەداری گوت: 'پیتاکی دیمشق بێنە لای خۆم.' پەردەدار یەغدانگەلی زێڕ و زیو و دیاری و خەڵاتەکانی هەموو لەپێش ڕیز کرد. پاشا ئەوانیشی بەسەر سپادا دابەش کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. باڵباز: هێزی چەکداری میر و پادشای زەمانی زوو، سەرباز.

## کە شەوی هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، زەوئولمەکانپاشا پیتاکی دیمشقیشی بەسەر سپادا دابەش کرد و هیچی نەگێڕاوە. فەرماندەکان کڕنۆشیان برد و ستایشی پاشایان کرد و گەڕانەوە بۆ خێوەتەکانی خۆیان. بۆ ڕۆژی دواتر پاشا فەرمانی دا سپا و کاروان وەڕێ کەون. وا بوو سێ ڕۆژی تەواو ڕۆیشتن و، ڕۆژی چوارەم گەیشتنە بەغدا. سەیریان کرد ئەوە تەواوی شاریان ڕازاندووەتەوە. زەوئولمەکانپاشا یەکسەر چووە کۆشک و لەسەر تەخت دانیشت. وەزیر دەندان و فەرماندەکان و پەردەداری دیمشق لەپێشی ڕاوەستان. ئینجا نووسەریان بانگ کرد و گوتی: 'نامەیەک بۆ شەرکانپاشا بنووسە.' پێی گوت: ڕووداوەکەی لەسەرەتاوە هەتا کۆتای بۆ شی بکەوە و لە کۆتای دا بنووسە: 'دوای ئاگاداربوون لە بابەتەکە، سپا بۆ شەڕ لەگەڵ کافران ساز کە هەتا خوێنی بابمان بستێنین و ئەو پەڵە ڕەشەی نێوچاومان بسڕین.' ئیدی نامەکەی پێچاوە و مۆری کرد و بە وەزیر دەندانی گوت: 'ئەو نامەیە جگە لە تۆ، کاری کەس نییە بیگەیێنێ. بەڵام بە سۆز و خۆشەویستییەوە پێشی بڵێ کە ئەگەر ئەو دەیەوێ لە جێی بابم دانیشێ، ئەوە من لە دیمشق لەژێر فەرمانی ئەودا دەبم. منیش ئاگادار کاتەوە با سەرپێچی لە فەرمان نەکەم.' وەزیر دەندان هاتە دەرێ و فەرمانی پاشای قەبووڵ کرد. ئینجا زەوئولمەکانپاشا فەرمانی دا جێگایەکی شیاو بۆ توونوان تەرخان کەن و فەرشی گرانبایی لێ ڕاخەن. دوای ئەوە زەوئولمەکانپاشا چوو بۆ ڕاو. چەند ڕۆژێک لە ڕاوگە ماوە. کاتێک گەڕاوە، فەرماندەکان ئەسپ و کەنیزیان بە دیاری بۆ هێنا. کەنیزێکی خۆش ویست و چووە دڵییەوە و ئەو شەوە پێکەوە تێخزان[1]. هەر ئەو شەوە کەنیزەکە دوو گیان بوو. ماوەیەکی پێ چوو، وەزیر دەندانیش لە سەفەر هاتەوە و زەوئولمەکانپاشای ئاگادار کردەوە کە شەرکانپاشا دێ و دەبێ بە پیرییەوە بچێ بۆ دەرەوەی شار و یەکتر ببینن.

"زەوئولمەکان لەگەڵ کەسە تایبەتییەکانی دەوڵەت ماوەی ڕۆژەڕێیەک لە بەغداوە بەرەو پیری شەرکانپاشاوە چوون. لەوێ تاولی هەڵدا و چاوەڕێی شەرکانپاشای برای بوو. کەوتەوە بەری بەیان، شەرکانپاشا لەگەڵ سوپای شام پەیدا بوو. زەوئولمەکان لەگەڵ پیاوە تایبەتەکانی بە پیرییانەوە چوون. کە چاوی بە شەرکان کەوت، ویستی لە ئەسپەکە دابەزێ. بەڵام شەرکان سوێندی لێ خوارد و نەیهێشت. ئیدی بە پێ چووە پێشێ و زەوئولمەکانیش لە سەر ئەسپەکەوە خۆی لە باوەشی خست و یەکتریان لە ئامێز گرت. هەردووکیان گریان و دڵخۆشی یەکتریان داوە. دوایی سوار بوونەوە و هاتن هەتا گەیشتنە

---

١. تێخزان: پێکەوە خەوتن.

بەغدا. هەردوو براكە چوونە كۆشک و ئەو شەوە هەتا بەیانی پێكەوە بوون.

"كە ڕۆژ بووەوە، زەوئولمەكان هاتە دەرێ و فەرمووی: 'سـپا لە هەموو لایەكەوە كۆ بنەوە، دەچین بۆ جیهادی كافران. جارچییەكان جاڕیان دا. ئیدی چاوەڕێی سپا بوون. بەڵام لە هەر لایەكەوە كە سپا دەهات، زێڕ و زیو و شتەكەیان دەداوە و ڕێزیان لێ دەگرت. هەتا مانگێک ئاوا بوو، لە هەموو لایەكەوە سـوپا دەهات. ئیدی شـەركانپاشـا بە براكەی گوت: 'ئەوە چۆناوچۆنە؟ چ بووە؟ بۆم بگێڕەوە.'

"زەوئولمەكان هەموو شـتێكی لە سـەرەتاوە موو بە موو بۆ گێڕاوە. پیاوەتییەكانی توونوانی دانەدانە گێڕاوە. شـەركانپاشـا گوتی: 'هەتا ئێسـتا وەڵامی چاكەكانی توونوانت داوەتەوە یان نا؟ زەوئولمەكان گوتی: 'كە لە جیهاد هاتمەوە، ئیشـەڵڵا پاداشـتی باشـی دەدەمەوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەمشـەویش كۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

# کە شەوی هەشتا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، زەوئولمەکان گوتی: 'کە لە جیهاد هاتمەوە، ئیشەڵڵا پاداشی باشی چاکەکانی دەدەمەوە.' ئیدی لێرەدا شەرکانپاشا زانی، نوزهەتوززەمانی خوشکی ئەوەی گوتوویەتی، هەمووی ڕاست بووە. بەڵام ئەوەی لەنێوان ئەواندا ڕووی دا، بێدەنگی لێ کرا. لە ڕێی پەردەدارەوە سڵاوی بە نوزهەتوززەمان گەیاند. نوزهەتوززەمانیش سڵاوی بۆ ناردەوە. پاشان نوزهەتوززەمان بانگی شەرکانپاشای کرد و هەواڵی 'قەزیەفەکان'ی لێ پرسی. شەرکان پێی گوت کە ساخ و سڵامەتە و نیگەرانی مەبە. دوای شەرکان لەگەڵ زەوئولمەکان باسی کاتی وەڕێکەوتنی کرد. زەوئولمەکان وەڵامی داوە کە جارێ دەبێ خەریکی پاشەکەوت و تێشوو بین هەتا تەواوی سپا ساز دەبێ.

"پاش ماوەیەک سپا لە هەموو لایەکەوە کۆ بووەوە. سەرداری سوپای دەیلەم ناوی ڕۆستەم و سەرداری سوپای تورک ناوی بەهرام بوو. زەوئولمەکان لە نێوەڕاستی سپادا بوو. لای ڕاست بە شەرکان و لای چەپی بە پەردەداری مێردی نوزهەتوززەمان سپارد. لە بەغداوە کەوتنە ڕێ و مانگێکی ڕەبەق بەڕێوە بوون، هەتا گەیشتنە وڵاتی ڕۆم. خەڵکی گوند و مەزرا و شتەکانی سەر ڕێگا ڕایان کرد و هەڵاتن بۆ قوستەنتەنییە. با لێرە سوپای ئیسلام بەجێ بێڵین و سەرێکی زاتوددەوایی بدەین.

"زاتوددەوایی کاتێک کارەکانی جێبەجێ کرد و کەنیزەکانی هێنا بەغدا و نوعمانپاشای هەڵخەڵەتاند و کوشتی، دوایی کەنیزەکانی لەگەڵ شازادە سەفییە بردنەوە بۆ شاری حەردووبپاشا. ئینجا بە کوڕەکەی گوت: 'چاو و دڵت ڕوون، تۆڵەی شازادە ئەبریزی کچتم لە نوعمانپاشا کردەوە و کوشتم. شازادە سەفییەشم ڕزگار کرد و هێنامەوە. ئێستا ساز بە با شازادە سەفییە بەرینەوە بۆ قوستەنتەنییە و ئافریدوونپاشایش ئاگادار بکەینەوە. ئەویش ساز بێ بۆ شەڕ، چونکە موسوڵمانان بۆ کوشتوبڕی ئێمە دێن.'

"ئیدی سوپای ساز کرد و سەفییەیان هەڵگرت و بەرەو قوستەنتەنییە ڕۆیشتن. کاتێک ئافریدوونپاشا ئاگاداری هاتنی حەردووبپاشا بوو. بە پیرییەوە چوو و گوتی: ' ئەوە چۆنە تەشریفتان هاتووە؟'

"حەردووبپاشا باسی نەخشە و کارەکانی دایکی بۆ گێڕاوە و گوتی کە سەفییەشمان بۆ هێناویەتەوە. تکاشی لێ کرد. لەبەرابەر سوپای ئیسلامدا یەکانگیر بن. وا بوو ئافریدوونپاشا لە هاتنەوەی کچەکەی و کوژرانی نوعمانپاشا خۆشحاڵ بوو. ئیدی داوای لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی کرد کە هێز کۆ کەنەوە. سوپای مەسیحییان بە دەنگییەوە هاتن. سێ مانگی نەخایاند کە سوپای ڕۆم تەواو کۆ بووەوە. دوای ئەوە سوپا

له فرانسـه و نهمسـا و دویره و جورنه و ڤینسـیا و تهواوی سـوپاکانی ناوچهی بهنولئهسـفهر[1] ئاماده بوو. سـوپاکه ئهوهنده زۆر بوو، ولات ههڵینهدهگرت. ئافریدوونپاشـا فهرمانی بزووتنی دا. سوپاکه له قوستهنتهنییه کهوته ڕێ و ههتا ده ڕۆژ بهردهوام ڕۆیشتن تا گهیشـتنه شـوێنێکی بهربلاو و خۆش و لهوێ مۆڵیان خوارد.[2] سـێ ڕۆژ بوو لهوێ مابوونهوه. ڕۆژی چوارهم ویستیان بڕۆن، ههواڵیان هێنا که سـوپای ئیسـلام و لایهنگرانی حهق و دادگهری گهیشـتێ. سـێ ڕۆژی دیکهش لهو شـوێنه مانهوه. ڕۆژی چوارهم تهپوتۆزێک بهری ئاسـمانی گرت و دنیای وهک شـهو تاریک کرد. ئهوهندهی پێ نهچوو تهپوتۆز نیشتهوه و ئینجا بریقهی ئهستێرهئاسای ڕمب و زهرگ و شیری تازهسوو و ئاڵای ئیسـلام دیاری دا و سـوارچاکی ئازا و نهترس و زرێپۆش گهیشـتنێ. دوو سـپا ڕوو به ڕووی یهک ڕاوهسـتان. وهک دهریا شـهپۆلیان دهدا. یهکهم کهس که پێی نایه ناو گۆڕهپانی شهڕهوه، وهزیر دهندان بوو به سێ ههزار سواری شامییهوه. سهردارانی تورک و دهیلهم، ڕۆستهم و بههرام یهکی بیستههزار سـواریان پێ بوو. بهدوای ئهواندا چالاکانی زرێپۆش له لای دهریای خوێوه هاتن. جا سوپای مهسیحییان هاواریان له عیسا و مریهم و خاچ کرد و لهبهرابهر وزیر دهنداندا وێسـتان. تهواوی ئهوانه به ڕا و تهدبیری پیرێژنی کلکهنهفتینه، زاتوددهوایی، بوو. چونکه ئافریدوونپاشـا پێش ئهوهی بێته دهرێ، چووه لای زاتوددهوایی و داوای ڕێنوێنی و نیشـاندانی ڕێگهچارهی کرد. زاتوددهوایی پێی گوت: 'پاشـا، من کارێکت پێ دهڵێم که به شهیتانیش جێبهجێ نابێ.' "

لێرهدا بوو، مـاوهی چیرۆکی ئهمشـهویش کۆتـایی پێ هـات و شـههرزاد درێژهی چیرۆکهکهی ههڵگرت بۆ شهوێکی دیکه.

---

١. بهنولئهسفهر: بهشێک له ئورووپایه وهک یۆنان و دهورووبهرهکهی. فهرهنگستان.

٢. مۆڵ خواردن: لادان بۆ حهسانهو. ئاکنجی بوونی کاتی.

## که شەوی هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، زاتوددەوایی گوتی: 'پاشا، من کارێکت پێ دەڵێم کە بە شەیتانیش جێبەجێ نابێ. پەنجاهەزار پیاوی چالاک و ئازا سواری کەشتی کە و بیان بە بەرەو چیاکانی دۆخان و لەوێ ڕاوەستن. کاتێک سوپاکەی ئێوە و سوپای ئیسلام پێکیاندا دا، ئەو کات ئێوەش لەپشتەوەڕا هێرشیان بکەنە سەر و لەپاش و لەپێش لێیان دەن هەتا جووقەواریان لێ دەبڕن. ئەو کاتە کوڵوکۆی دڵمان دادەمرکێ.' ئافریدوونپاشا ڕاوێژەکەی زاتوددەوایی زۆر پێ باش بوو. هەر بۆیە کاتێک سوپای بەغدا و خوراسان کە سەدوبیست هەزار سوار بوون و لەژێر فەرمانی زەوئولمەکاندا هێرشیان کردە سەر سوپای ڕۆم. ئەو بەشەی سوپای کافران کە لە دەریادا بوو، هاتنە دەرێ و لەپشتەوەڕا هێرشیان کردە سەر سوپای ئیسلام. زەوئولمەکان ئەو سوپاەی کافرانی دیت کە لە دەریاوە دەهاتن هێرش بکەنە سەریان. هەر بۆیە دەنگی سوپاکەی دا و گوتی: 'بۆ ئەو سوپاەی شەیتان بگەڕێنەوە و تاروماریان کەن و مەیانهێڵن.' لەو لاشەوە شەرکانپاشا بە سەدوبیست هەزار کەس سوپای ئیسلامەوە گەیشتێ. سوپای کافران شەش‌سەد هەزار کەس بوون. ئیدی بە شیر و ڕمب هێرشیان کردە سەر یەک. شەرکانیش لەولاوە وای دڕ بە ڕیزی سوپاکەیان دا و هەڵبڕ دابڕی تێخستن کە هیچ توانای بەربەرەکانی و خۆڕاگرییان نەما و هەموو تارومار بوون. دردێکی وای دانێ منداڵی سەر بێشکە بە دیتنی پیر دەبوو. بەو جۆرە هەمووی لە دەریا کردنەوە. شەرکان لەو هێرشەدا بە شیر و ڕمب شەڕی دەکرد و نزیکەی چل و پێنج هەزار سواری لێ خستن و موسوڵمانەکانیش سێ‌هەزار و پێنج‌سەد کەسیان لێ کوژرا.

کە بوو بە شەو، لایەنەکان لێک جوێ بوونەوە و هەرکەسەی گەڕاوە بۆ تاوڵەکانی خۆیان و ئەو شەوە تا بەیانی شەرکان و زەوئولمەکان نەخەوتن و هەر سەری برینندارەکانیان دا و دڵخۆشی خەڵکەکەیان داوە و ورەیان وە بەر دەنان. ئەوە لای موسوڵمانان بوو.

"بەڵام ئافریدوونپاشا و حەردووبپاشا و دایکی هاتن فەرماندە و هێزەکەیان کۆ کردەوە و گوتیان: 'ئێمە بە ئاواتمان گەیشتبووین، بەڵام پەلەمان کرد و هەر ئەو پەلەیەش ئێمەی بەو دەردە برد.' زاتوددەوایی پێی گوتن: 'ئێستا هەر دەبێ مەسیح و باوەڕی ڕاستەقینە بێتە هانامانەوە. بە مەسیح! ئەگەر شەرکان نەبا، قەت ئەوان نەیاندەتوانی سەرکەون.' ئیدی ئافریدوونپاشا گوتی: 'کە سبەینێ ڕووبەڕووی یەک بووینەوە، لۆقای شەملووتی ئازا و بەناوبانگ دەنێرمە شەڕی شەرکان. تا نەک هەر شەرکان بگرە هەموو پاڵەوانەکانیان بکوژێ و کەسیان نەهێڵێ. بەڵام ئەمشەو دەبێ بە «هەڵمی گەورە» خۆمان

پیرۆز بکەین. فەرماندەکان کە ئەو قسەیەیان بیست، سوجدەیان برد. هەڵمی گەورە، پاشەرۆی راهیبی گەورە بوو، کە مەسیحییەکان گەرمیان دەکردەوە تا هەڵمەکەیان بە سەردا بچێ و لە بەلا دوور بن. پەنایان بۆ دەبرد و لەبەری دەپاڕانەوە. ئەوەندەیان خۆش دەویست میسک و عەبیریان تێکەڵ دەکرد و لە پرێسکەی ئاوریشمیان دەنا و هەڵیان دەگرت و بە دیاری دەیان نارد بۆ ئەملاوئەولا. تاقە درەمێکیان بە هەزار درەم دەکڕی. جاری وابوو پیاویان دەنارد شارە و شار و وڵاتە و وڵات دەچوو کەمێکی بۆ متفەڕک پەیدا دەکرد و دەیهێناوە بۆ بووک و زاوا تا هەڵمەکەی بەسەریاندا بچێ. مەمنا پاشەرۆی راهیبی گەورە بەشی ئەو هەموو خەڵکەی نەدەکرد، جاری وا بوو. راهیبەکانی دیکە پاشەرۆی خۆیان تێکەڵ دەکرد. هەر بەو پاشەڕۆیە کلەیان پێ دەگرتەوە بە تایبەت بۆ پادشاکانیان، لە چاویان دەکرد. دیسان ئەو کەسانەی تووشی زگێشە دەبوون لەوەیان دەدایە. کورتی کەینەوە کە ڕۆژ بووەوە و خۆر دەرکەوت و وڵات ڕووناک بوو. پاڵەوانەکان خۆیان بۆ شەڕ ساز کردەوە. "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە ڕۆژ بووەوە و جەنگاوەران خۆیان ساز کرد. ئافریدوونپاشا فەرماندەکانی سوپاکەی بانگ کرد و خەلاتی دانێ و خاچی لە سەرشانیان دا و هەڵمی پاشەڕۆی ڕاهیبەکەیان بە سەردا گێڕان. ئینجا لۆقای کوڕی شەملووت، کە پێیان دەگوت 'شێری مەسیح،' بانگ کردە پێشێ و لەو پاشەڕۆیەی وەک متفەرک دەرخوارد دا. ئەو لۆقایە لە ڕادە بەدەر ئازا بوو. لە تەواوی ولاتی ڕۆمدا کەسی ئاوا تیرهاوێژ و ڕمبهاوێژ و بەقەلافەتی تێدا نەبوو. قەلافەتێکی هەبوو دەتگوت دێوە و سەروچاوی بەقەد فیلێک دەبوو. لۆقا لاقی پاشای ماچ کرد و لەپێشی ڕاوەستا. پاشا گوتی: 'دەمەوێ لەگەڵ شەرکان ملبەملە بکەی و لە کۆڵمانی کەیەوە.' لە پاشا وا بوو خێرا بەسەر شەرکاندا زاڵ دەبێ. ئینجا لۆقا ڕۆیشت و سواری ئەسپێکی شێ بوو. لەگەڵ دەوروبەریانی ڕووی لە مەیدان کرد و جارچییەکەیان هەرای کردە سوپای ئیسلام: 'هۆی ئۆممەتی موحەممەد، جگە لە شمشێری ئیسلام،' واتە شەرکان، 'کەس سەر نەهێنێتە دەرێ.'

"کاتێک شەرکانپاشا و زەوئولمەکانی برای، لوقایان لە گۆڕەپاندا دیت و گوێیان لەو دەنگە بوو، زەوئولمەکان بە شەرکانی برای گوت: 'داوای تۆ دەکەن.' شەرکان گوتی: 'جا کەوایە چ باشتر.' ئیدی شەرکان وەک شێر لە بێشە دەرپەڕی و سوار بوو. ئەسپی بەرەو لۆقا ئاژووت هەتا لێی نیزیک بووەوە. ڕمب لە دەستیدا وەک مار دەسووڕا و دەگەڕا و دەیگوت:

خوانەکا ئەسپی سەرکێشی ڕقم هەڵم گرێ
کەس نییە بتوانێ لەو دەمەدا بەرگەم بگرێ
تکا و پارانەوە کار لەسەر هەڵوێستم ناکا
شەرابی سەرکەوتن گەر بمگرێ بەرم نادا

"لۆقا مانای ئەو بە خۆداهەڵدانەی نەزانی، بەلام بۆ مەزنڕاگرتنی خاچەکەی کە بە بەرۆکیەوە بوو، دەستێکی بە خۆیدا هێنا و دەستی خۆی ماچ کرد. ڕمبێکی داهێنایە شەرکان، بەلام شەرکان خۆی لە ڕمبەکەی لا دا. ئینجا زەرگێکی دوونووکی تێ هەڵکرد. وەک تیر بە ئاسماندا دەڕۆی . خەڵک هاواریان لێ بەرز بووەوە و خەمی شەرکانیان بوو. کە زەڕگەکە لە شەرکان نیزیک بووەوە، شەرکا لە هەوادا پڕی دایە و گرتی. خەڵک سەریان لەو نەترسی و لێزانییەی سووڕ ما. ئیدی شەرکان کە نێزەکەی گرتەوە وای هەلاویشت لە چاو ون بوو و دوای ئیستێک بە دەستەکەی دیکەی گرتییەوە و وای لە لۆقا گرتەوە کە

هاژەی دەهات. لۆقا ویستی وەک شەرکان بیگرێتەوە، کەچی شەرکان مۆڵەتی نەدا و زەرگێکی دیکەی هاویشتێ و لە خاچەکەی بەرۆکی هەڵچەقی و لەڕێوە کوشتی. کە کافران دیتیان لۆقای کوڕی شەملووت کوژرا، لە سەروسەکتی خۆیان دا و دەستیان کرد بە پاڕانەوە لە ڕاهیبانی ئایینییان."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نەوەد و یەکەم هات

گوتی: خاوەنشــــکۆ، کافران لە ســــەروســــەکوتی خۆیان دەدا و لە ڕاهیبانی خۆیان دەپاڕانەوە. ئیدی هەموویان لە شوێنێک کۆ بوونەوە و شیر و زەرگ و ڕمبیان بە دەستەوە گرت و هێرشیان کردە سەر سوپای ئیسلام. هەر دوو سپا پێک هەڵپڕژان و بوو بە شەڕی تاک بە تاک. سنگی دەیان پاڵەوان وە بن پێی ئەسپ و ولاغان کەوت و کەللەی دەیان ئازا بوو بە کالانی شــــیران. ئەوەندەی لە توانایاندا بوو، هەر لە یەکتریان کوشــــت. هەتا تەواو پەکیان کەوت و هەموو ماندوو و شەکت بوون. کە شەو داهات و دنیا تاریک بوو. ئەوجار هەردووک سوپا لە بەر یەک کشانەوە، ئازا و بەجەرگان ئەوەندەیان کوشت و ئەوەندەیان وەشــــاندبوو وەک مەســــتیان لێ هاتبوو. هەر بە لادا دەهاتن. گۆڕەپان پڕ بوو لە تەرمی مردوو و نیوەزیندووان. دوای ئەوە شــــەرکان و زەوئولمەکان و پەردەدار و وەزیر دەندان لە شــوێنێک دانیشــتن. شــەرکان گوتی: 'ســپاس بۆ خودا کە لەو شــەڕەدا ســەرکەوتنی بە دەست منەوە دا.' زوئولمەکان گوتی: 'دەبێ شوکری خودا بکەین کە هەتاهەتا خەڵک باسی ئەو شــەڕ و ســەرکەوتنەی تۆ بەســەر لۆقای کافردا دەکەن و دەبێتە وێردی ســەر زمانان.' ئیدی شەرکان بە پەردەداری گوت: 'لەگەڵ وەزیر دەنداندا بیستهەزار سوار بەرن و بچن بۆ قەراخ دەریا و خۆتان حەشار بدەن. ئەگەر ئەو کافرانەی کە لە پاپۆڕەکاندان هاتنە دەرێ و لەگەڵ سوپاکەی ئێمە بە شەڕ هاتن، سوپاکەی ئێمە وای دەنوێنێ کە شکستی خواردووە و لە بەریان هەڵدێین. ئەو دەم ئێوە لە پشــتەوەڕا هێرشــیان بکەنە ســەر و لە هەردوو لا دەیانخەینە گەمارۆوە و ناهێڵین بگەڕێنەوە دەریا و تاقیان لێ دەبڕین.' پەردەدار دەســــتی بەڵێی لەســــەر چاوی دانا و ســــەری بەڵێی دانەواند. دەســــتبەجێ وەزیر دەندانی لەگەڵ بیستهەزار سوار ئامادە کرد و وەڕێ کەوتن. کە ڕۆژ بووەوە، کافران هاتنە ڕۆخ دەریا و ســواری ئەســپ بوون و غاریان دا و بە تەمای پەلاماردان و دەربازبوون بوون. زەرگ و ڕمب دەدرەوشــانەوە، ئاشــی شــەڕ و خوێن بە جەســتەی پاڵەوان و چالاکاندا دەگەڕا. هەر سەر و دەست و قاچ بوو، دەپەڕا، بە دەیان دڵیان دەتۆقی و ئەسپەکان لە خوێن دەگەوزان. سوپای ئیسلام سڵاوەتیان لە دیداری محەممەد لێ دەدا و سپاسگوزاری خودایان دەکرد. بەڵام ســــوپای کافران بە خاچ و زووننارایان هەڵدەگوت و پەســــنیان دەکردن و لە بەریان دەپاڕانەوە. ئەوجار زەوئولمەکان و شەرکان لەگەڵ سوپاکە پاشەکشەیان کرد و گوتیان: 'دەکشێینەوە.' ئیدی سوپای کافران فریان سوار بوو و دەستیان کرد بە تانە و تەشەر و تەپڵی سەرکەوتنیان لێ دا. جارچییەکەیان جاڕی لێ دا: 'ئەی ئەوانەی مەسیح دەپەرستن و شوێنکەوتووانی باوەڕی ڕاستین و نۆکەرانی قەشە! مزگێنی، مزگێنی کە سوپای ئیسلام هەڵات. بکەونە شوێنیان و دەستیان لێ مەپارێزن تا بێرەدا نەیەنەوە، دەنا لە دینی مەسیح

بەری دەبن.' ئافریدوونپاشا وای زانی ئەوە سوپای ئیسلام تێک شکاوە، نەیزانی ئەوە بیر و تەدبیری موســـوڵمانانە. ئیدی ئافریدوونپاشـــا خەبەری ناردەوە بۆ ڕۆم و هەواڵی سەرکەوتنی بەسەر سوپای ئیسلامدا پێ ڕاگەیاندن. گوتیان: 'ئەو سەرکەوتنە هی پاشەڕۆی ڕاهیبی گەورە بوو.' ئینجا کافران تێک ڕاخوڕین کە تۆڵەی خوێنی لۆقا بکەنەوە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کافران دەنگی یەکیان دا کە خێرا کەن تۆڵەی لۆقا لە سوپای ئیسلام بکەنەوە.' پاشـــای رۆمیش دەینەڕاند: 'تۆڵەی شـــازادە ئەبریزیش بکەنەوە.' لەو کاتەدا زەوئولمەکان قاوی لە موسوڵمانان کرد: 'ئەی ئەو کەسانەی خودای بەدیهێنەر دەپەرستن! بزانن کە بەهەشت لەژێر سێبەری شمیشـرەکانتاندایە. کارێک بکەن خودا لە خۆتان ڕازی کەن و دژمنانی دینەکەتان لەنێو بەرن.' لەو جەنگەیەدا شـەرکان بە سـوپاکەیەوە هێرشـی کردە سـەر کافران و ڕێگەی هەڵاتیان لێ گرتن، شـــەرکان هەر وا لە نێو ســـوپاکەدا هەڵدەسـووڕا کە لە ناکاو لاوێکی وەک تووله نەمام هێرشـی کردە سـەر کافرەکان و وەک شاعیر دەڵێ:

هەر پـــاڵەوانـــێـــک کە لە خـــۆی ڕادی
هـــاتە مەیـــدانـــی و وەک شـــــێـــر نەڕانـــدی
بـــڕی و دڕی، شـــــکـــانـــدی و بەســـــتـــی
مـــل و ورگ و پشــــــت و لاق و دەســـــتـــی

"کە شـەرکان ئەوی دیت، گوتی: 'گەنجۆ، تۆو قورئان پێم بڵێ تۆ کێی کە خوداش لە تۆ ڕازی بوو؟' ســـوارەکە گوتی: 'چەنـد زوو منـت لەبیر چووەوە! دوێنێ من لەگەڵ تۆدا پەیمانمان نەبەسـت؟' ئیدی دەمامکەکەی لەسـەر دوومای لا برد و مانگ هەڵات. شـەرکان سـەیری کرد ئەوە زەوئولمەکانە و خۆشـحاڵ بوو. نیگەرانیشـی بوو، گوتی: 'ئەی پاشـای زەمان، خۆت زۆر مەخە مەترســـییەوە کە دژمنان هەر چاویان بەســـەرتەوەیە و تیرێکت ئاراسـتە دەکەن.' زەوئولمەکان گوتی: 'من ویسـتم لە شـەڕدا وەک تۆ بێمەوە. لە بەرچاوی تۆ لە گیانی خۆشـم ببوورم.' پاشـان سـوپای ئیسـلام لە هەموو لایەکەوە سـوپای کافرانی گەمارۆ دا و ئەوەندەی کە شـــایانیان بوو، لێیان کوشـــتن. بنەمای کوفریان هەڵتەکاند. ئافریدوونپاشـا کە ئەوەی دیت، پەشـیمان بووەوە و پەرۆش بوو. ئیدی بە تەمای ڕاکردن بەرە و کەشـــتییەکان هەڵاتن کە لە پڕدا ســـوپای ئیســـلام کە لە ڕۆخ دەریادا بۆســـەیان نابووەوە، لێیان دەرپەڕین و دەوریان دان. تاقمێک لە موســـوڵمانان هەڕایان کردە نێو پاپۆڕەکان کە هێندێکیان لە ترســـان خۆیان لە دەریا هاویشـــت و هێندێکیشـــیان بە دەم شـــیرەوە چوون. نیزیکەی ســـەدهەزار کەس لەو بەرازانە کوژران و موســـوڵمانان جگە لە بیسـت کەشتی، هەموو کەشـتییەکانیان بە ماڵ و ئازوقەوە گرت. لەو ڕۆژەدا موسـوڵمانان ئەوەندەیان دەســـتکەوت وەگیر کەوتبوو تا ئەو ڕۆژە کەس دەســـتکەوتی ئاوای وەگیر

نەکەوتبوو. بۆ وێنە دەستکەوتی پەنجاهەزار سەر ئەسپ بوو. شتەکانی دیکە ئەوەندە بوون کە لە بژاردن نەدەهات. ئەوە لە باسی موسوڵمانەکان.

"بەڵام بێینە سەر کاری هەڵاتووەکان. ئەو دەمەی ئەوان گەیشتنە قوستەنتەنییە، کاتێک بوو کە ئافریدوونپاشا بە قسەی زاتوددەوایی فەرمانی دابوو شار برازێننەوە. خەڵکیش شاریان ڕازاندبووەوە و خەریکی خۆشی و شادمانی بوون. کە هەواڵی تێکشکانیان پێ گەیشت و بیست پاپۆڕی هەڵاتوویان دیت کە پاشاشیان لەنێودا بوو، خۆشی و شادییەکەیان لێ بوو بە شین و شەپۆڕ. کە پاشا و خەڵک زانییان لۆقاش کوژراوە، هەموو دەستیان کرد بە گریان و ڕۆڕۆ. ئیتر هەموو زانییان کە ئەو شکستە قەرەبوو نابێتەوە و ئەو خوارییە ڕاست نابێتەوە. کاتێک پاشای ڕۆم و ئافریدوونپاشا یەکترییان دیت، ڕاستی شتەکەی بۆ ڕوون کردەوە و پێی گوت: ئەو هەڵاتنەی موسوڵمانان بە کەڵەک و دەهۆ بووە. تازە جگە لەوانەی گەیشتوونەوە ئێرە، بە تەمای کەسی دیکە مەبە، چونکە هەموویان یا کوژراون یا بە دیل گیراون. ئافریدوونپاشا بێهۆش بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نەوەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئافریدوونپاشا بێهۆش کەوت. کە وە هۆش هاتەوە، هەستا چووە گیانی زاتوددەوایی، چونکە پێی وا بوو ئەو زۆر مەکرباز و فێڵبازە. پێڵووەکانی سوور، ڕووی زەرد و چاوی خێل و لەشێکی لاواز و مووی سوور و سپی و پشتی کۆم بوو. بەردەوام ئاویش لە لووتی دەتکا. بەڵام کتێبی ئیسلامی خوێندبوو و چووبووە ماڵی خودا و بەیتولموقەددەس و دوو ساڵ لەوێ مابووەوە. زانیاری لەسەر نەتەوەکان دەست خستبوو و هەموو فڕوفێڵێک فێر ببوو.

"کورتی کەمەوە، ئەو ژنە بەڵایەک بوو لەو بەڵایانەی ڕۆژگار کە باوەڕی بە هیچ ئای نێک نەبوو. هەردەم لە کۆشک لە لای حەردووبپاشای کوڕی بوو. لەگەڵ کچە تازەپێگەیشتووەکانی کۆشدا ڕایدەبوارد. چونکە هێندەی پانپانۆکە[1] پێ خۆش بوو، جاری وا بوو لە کاتی زاوێربووندا[2] بێهۆش دەبوو. ئەو کەنیزانەی کارەکەیان لەگەڵ دەکرد، ئەوە زۆر بۆیان باش بوو. ئەو کەنیزانەش کە وڵامیان نەدەداوە، لەگەڵیان زۆر خراپ بوو. تەنانەت جاری وا بوو هەوڵی کوشتنیانی دەدا. شازادە ئەبریز ئەو پیرێژنەی زۆر ناخۆش دەویست و قەت دانی لەگەڵی نەدەکولا و لە پەنای نەدەخەوت. چونکە بۆنی زاری لە بۆنی کەلاک ناخۆشتر و لەشی لە پنجە دڕوو زبر و دڕتر بوو. لەوە گەڕێین و بگەڕێینەوە سەر فڕوفێڵەکانی.

"ئەو مەکرباز و فێڵبازە لەگەڵ گەورەکانی سوپای کافران هەستا چوو بۆ لای سوپای ئیسلام. دوای ئەوە حەردووبپاشا بە ئافریدوونپاشای گوت: 'لەمەو دوا پێویستیمان بە نزای ڕاهیبی گەورە نییە. ئێمە بەپێی پێشنیار و بەرنامەکانی دایکم دەجوولێینەوە. بزانین چ پەندێک بەسەر موسوڵمانان دێنێ و چۆن داو و کەڵەکیان بۆ دەنێتەوە. چونکە زیرەکی و چالاکی موسوڵمانان گەیشتووەتە جێگایەک کە خەریکە هەر بە جارێک دەورمان بگرن.'

"کە ئافریدوونپاشا ئەو قسەیەی بیست، زۆر ترسا و نیگەرانییەکەی زیاتر بوو. لەڕێوە نامەی بۆ هەموو هەرێمەکان نووسی کە دەبێ بەبێ سەرپێچی خاچپەرستان و زوونناپەرستان و ناوچەکانی ئۆمەتی مەسیحایەتی، بە تایبەت دانیشتووی ناو قەڵاکان و پارێزکاران، دەبێ بە سواری و پێیان لە پیاو و ژن و منداڵ لێرە کۆ ببنەوە، چونکە سوپای ئیسلام هاتووەتە نێو وڵاتەکەمان و دەبێ پارێزگاری لە وڵاتەکەمان بکەین، هەتا کار لەوە خراپتر نەبووە. ئافریدوونپاشا خەریکی ئەوە بوو.

---

١. پانپانۆکە: واتە هاوڕەگەزبازی ژنان.

٢. زاوێربوون: ڕەحەت بوونی ژن.

"بەلام زاتوددەوایی لەگەڵ هاوڕێکانی لە شـــار هاتنە دەرێ و جلوبەرگی شـــێوەی بازرگانە موسـولمانەکانی لە بەر کرد. سـەد باریشـی کالای ئاوریشـمی ئەنتاکی و دیبای پاشـــای هەلگرت و نامەیەکی لە ئافریدوونپاشـــا بەو نێوەرۆکەوە وەرگرتبوو کە ئەوانە بازرگانانی شـامن و لە شـاری ئێمە بوون. کەس کاری پێیان نەبێ و ئازاریان مەدەن و دە یەکیان لێ وەرمەگرن هەتـا دەگەنەوە ولاتی خۆیـان، چونکە بـازرگانـان مـایەی ئـاوەدانی شـارەکانن و ئەوان کاریان بە شـەڕ و کێشـەوە نییە. دوای ئەوە ئەو گلاوە بە هاوڕێکانی گوت: 'من دەمەوێ موســـولمانان قڕ بکەم.' ئەوانیش گوتیان: 'بە تەمای هەر کارێکی، هەر فەرمان دە لە خزمەتتداین.' ئینجا جلولەرگێکی سـپی و پەشـمینی لە بەر کرد و نێوچاوانی خۆی بریندار کرد. وەک ئەوەی داخ کرابێ. دوای ئەو ڕۆنی بۆ خۆی ئامادەی کردبوو، تێی هەڵسوو هەتا تەوێلی شۆق بداتەوە، ئەو گلاوە جەستەیەکی کز و لەڕی هەبوو. ئەو کەڕەتە لاقی بە پەتێک توند بەسـت و هەتا نیزیک سـوپای ئیسـلام چوو. ئینجا پەتەکەی کردەوە و شوێنی بەستنەکە و پەتەکە لەسەر قاچی مابوو، ڕۆنی لێ دا و دایمالی. بە هاوڕێکانی خۆی گوت: 'زۆر چاکم لێ دەن و لە یەغدانێکم خەن.' گوتیان: 'ئێمە چۆن دەتوانین لە تۆ دەین لە کاتێکدا ئێوە خانم و گەورەی ئێمەن؟' دایکی حەردووبپاشـــا گوتی: 'الضـــرورات تبیح المحظورات.[1] دوای ئەوە من بخەنە ناو یەغدانێکەوە سواری ولاخێکم کەن و بەنێو سـوپای ئیسـلامدا بڕۆن و لە کەس مەترسـن. هەر کات یەکێک لە موسـولمانان پەلاماری دانێ یان دەسـتدرێژی کردە سـەرتان. ئێوە ولاخەکانتان بە بارەوە بدەن بەوان و بۆخۆتان بچن بۆ لای زەوئولمەکانی پاشـــایان و ســـکالا بکەن و بلێن: 'ئێمە لە ولاتی کافران بووین، کەس هیچی لێ وەرنەگرتین. بگرە نووســـراوەیەکیشـــیان داینێ کە کەس کاری پێمان نەبێ و ئازارمان نەدەن. کەچی ئێوە مالەکەشـــمان لێ دەســـتێنن؟' ئەگەر لێیان پرســـین: 'لە ولاتی کافرانەوە چ ســـوودێکتان وەگیر کەوتووە؟' بلێن: 'باشـــترین قازانجمان ئەوە بوو پیاوێکی لەخوداترس کە ماوەی پازدە سـال لە ساردراوێکدا بەند کرابوو و ئازار دەدرا و دەپاڕاوە و کەس فریای نەدەکەوت، ڕزگارمان کرد. ئەویش ئاوا بوو کە ئێمە ئاگامان لە هیچ شـــتێک نەبوو. ماوەیەکی زۆر بوو لە قوسـتەنتەنییە مابووینەوە و شـتەکانی مان فرۆشـت و شـتی دیکەمـان کڕی و لە تەدارەکی ڕۆیشـــتنەوەدا بووین، شـــەو خەریـک بووین بـاســـی ســـەفەرەکەمانمان دەکرد کە لەپڕدا ســـەیرمان کرد ئەوە ڕوخســـارێک لەســـەر دیوارەکەیە. کەمێکی لێ چووینە پێشێ، سەیرمان کرد وە جوولە کەوت و گوتی: 'ئەی موسولمانان، لەو نێوەدا کەســـی وای تێدایە لەگەڵ خودا دانوســـتان بکا؟' گوتمان: 'چۆن دانوســـتانێک؟' ئەو ڕوخســـارە گوتی: 'خوا منی ئاشـــکرا کرد و وە قســـەی هێنام تا بۆ ئێوە ڕوون بێتەوە و لەســـەر کاری خۆتان پێداگر بن. هەوڵ بدەن لە ولاتی کافران بڕۆنە دەرێ و بچن بەرەو

---

١. واتە: ناگوزیری، شتی ناڕەوا ڕەوا دەکات.

سـوپای موسـوڵمانان کە لەنێو ئەواندا شـێری دلۆڤان و ئازای زەمان، شـەرکانپاشـایان تێدایە. هەتا قەڵای قوستەنتەنییە داگیر کا و تاقمی مەسیحییان لەنێو بەرێ. ئەگەر سێ ڕۆژ بە ڕێدا بڕۆن، دێرێکتان لێ دەردەکەوێ کە دێری مەترووحەی پێ دەڵێن. لەوێدا خانەقایەکی لێیە. ئێوە بە نییەتێکی پاکەوە بچنە ئەو خانەقایە و لە چوونەژوور مەترسن. لەوێدا پیاوێکی لەخوداترس و تەرکەدنیای تێدایە خەڵکی بەیتولموقەددەسـە و ناوی عەبدوڵلایە و مرۆڤێکی زۆر باوەڕدارە و زانسـتی پێواری لایە. ڕاهیبێک فریوی داوە و لەو سـارداوەدا بەندی کردووە. ڕزگـارکردنی ئەو مـایەی ڕەزامەنـدی و خۆشـحـاڵی خودایە.' دوای ئەوە بە شـەرکانپاشـا بڵێن: 'کاتێک ئێمە ئەو قسـانەمان لە ڕوخسـارەکەی سـەر دیوارەکە بیست، زانیمان کە ئەو خواپە—'

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی نەوەد و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاتێک ئێمە ئەو قسانەمان لە ڕوخساری سەر دیوارەکە بیست، زانیمان ئەو، لەو لەخوداترس و پیاوچاکانەیە. ئیدی سێ ڕۆژ بە ڕێدا ڕۆیشتین و ئەو دێرەمان دیتەوە، لەوێ شارۆچکەیەکی لێ بوو بەپێی پیشەی بازرگانانەی خۆمان ڕۆژێک لەوێ خەریکی کڕین و فرۆشتن بووین. کە بوو بە شەو و دنیا تاریک بوو، چووین بۆ خانەقاکە و ساردواوەکەمان دیتەوە. لە ساردواوەکەوە دەنگی قورئانخوێندنمان بیست. دوای تەواوبوونی قورئانخوێندنەکە، ئەو شیعرانەی خوێندەوە:

لێقەوماو وەک، چلپارەی ماڵی بێ ئیمان
بێبەش وەکوو ئەسکەندەر لە ئاوی ژیان
لەو خەمەدا من بێ هاوبەش ماومەتەوە
لەو کارەشدا بەبێ هاوکار و پشتیوان

"کاتێک پیرێژن زاتوددەوایی قسەکانی بێرە گەیاندن، بە هاوڕێکانی گوت: 'ئێوە کە منتان گەیاندە سوپای ئیسلام، چۆنم پێ گوتن ئاوا قسەتان لەگەڵ کردن، ئەو دەم بۆ خۆم دەزانم چ کڵاوێکیان لەسەر دەکەم.'

مەسیحییان زۆر چاکیان لە پیرێژنە دا و دەستیان ماچ کرد و لە یەغدانێکیان نا. ئەو یەغدانەیان لەگەڵ یەغدانی ئاوریشم و دیبا لە وڵاخەکانیان دا و بەرەو سوپای ئیسلام کەوتنە ڕێ. ئەوە ڕێگا و بەرنامەی ئەو پیرێژنە گڵاوە بوو.

"سوپای ئیسلامیش کە خودا یارمەتی دان و بەسەر دژمندا زاڵ بوون، دەستکەوتێکی زۆریان لە کەشتییەکان وەگیر کەوت و بردیان. شەرکان و زەوئولمەکان پێکەوە دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. شەرکان بە زەوئولمەکانی گوت: 'خودا لەبەر دادپەروەری و ویژدان یارمەتی ئێمەی دا. ئێستا دەبێ ئێمە لە خواپەرستیدا کەمترخەم نەبین و لەوەی پێتان دەڵێم لاری نەکەی.'

"زەوئولمەکان گوتی: 'بە گیان و دڵ گوێ بە فەرمانتم.' ئیدی شەرکان دەستی برد و دەستی زەوئولمەکانی گرت و گوتی: 'ئەگەر خودا کوڕێکی دایتێ، قەزییەفەکانی کچی خۆمی دەدەمێ.' زەوئولمەکان بەو قسەیە خۆشحاڵ بوو. دوایی وەزیر دەندان پێی گوتن: 'ئێوە ئەوە بزانن کە خودا لەبەر ئەوەی ئێمە ماڵ و وڵاتی خۆمان بەجێ هێشت، یارمەتی داین. ئێستا بە بڕوای من بکەوینە دوای کافران و گەمارۆیان بدەین و شەڕ بکەین، بەشکو

خودا به ئاواتمان بگەیەنێ. ئەگەر پێتان خۆشـــه ئێوه ســـواری ئەو پاپۆڕانه بن و بچن له دەریاوه، ئێمەش به بەژدا دەڕۆین بەشکو شەڕێک هەڵایسێنین.' ئیدی وەزیر دەندان ئەوانی بۆ شەڕ و کوشتار هان دا و، ئەو شێعرەی گوت:

ئـێـمه ســـەری دژمـــن له بەردی دەدەیـــن،
یا ئەوان لەشی ئـــــــــــــــــێمه له سێداره
یـاســـــای دنـیـایه و بـــــــــــــه لایەکی دەدا
تـــرســـــم نــیــیه بشـــــدرێـم له قەنـــاره

"که وەزیر دەندان شێعرەکەی تەواو کرد، زەوئولمەکان سوپاکەی بەرەو قوستەنتەنییه ڕادا. ڕۆیشتن، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنه مێرگزارێکی خۆش. چونکه شەش ڕۆژ بوو به بەژ و بێرووندا دەڕۆیشتن و له ئاو و گژوگیا دوور بوون، هەر که گەیشتنه ئەوێ و ئەو کانی و دار و باخ و دەشته سەوزەیان دیت، له خۆشیاندا شاگەشکه بوون. وەک شاعیر دەڵێ:

هەوای خـــــۆش و بـــێـشـــــەی بەریـــن
ســـــــەوزایـــی و گـــوڵ نەخشــــــی زەویـــن
بـــــــــــــۆنی گـــــــــــــوڵ و ناڵەی بولبول
ئـــــاوێـــــــــــــتەن وەک دڵ و ئەویـــــــــــــن

"زەوئولمەکان گازی براکەی کرد و پێی گوت: 'له دیمشـــقیش ســـەیرانگای وای لێ نییه. دەبێ ســـێ ڕۆژ لێره بمێنینەوه.' ئیدی دابەزین و باریان خســـت. لەپڕدا گوێیان له دەنگی زەنگۆڵەیەک بوو. زەوئولمەکان گوتی: 'ئەوه دەنگی درایه[1]، بلێی چی بێ؟' گوتیان: 'کاروانی بازرگانانی شـــــامه، ئەوانیش لەبەر خۆشـــی لێره لایان داوه.' ئەوەندەی پێ نەچوو که بازرگانەکان به هاتوهاوار پەیدا بوون. بۆ شکایەت هاتنه لای پاشا و گوتیان: 'خاوەنشکۆ، ئەوه چۆنه له وڵاتی کافران کاریان به ئێمه نەبوو، لێره برادەرانی ئاینی تالانمان دەکەن؟' ئیدی نامەی پاشـــای قوســـتەنتەنییەیان دەرهێنا. شـــەرکانپاشـــا نامەکەی وەرگرت و خوێندییەوه و گوتی: 'هەر زوو ماڵەکەتان دەدەینەوه، بەڵام لەمەو دوا له وڵاتانی کفردا بازرگانی مەکەن.' گوتیان: 'پاشـا، خوا ئێمەی هێنایه وڵاتی کفر، دەسـتکەوتێکمان بوو، هەتا ئێستا غەزای ئاوا نەکراوه و تەنانەت ئێوەش لەو سەفەرەتاندا دەستکەوتی ئاواتان نەبووه.' شەرکانپاشا پێی گوتن: 'چیتان دەست کەوتووه؟'

"بازرگانەکان گوتیان: 'ئەو نهێنییەت پێ ناڵێین مەگین له جێگایەکی چۆڵ نەبێ، چونکه

[1] درا: جۆره زەنگوڵەیەکه.

ئەگەر بێتو ئەوە ئاشـکرا بێ، دەبێتە هۆی تێداچوونی ئێمەش و تەواوی ئەوانەش کە لەمەو دوا بچنە ڕۆم.' ئیدی زەوئولمەکان و شـەرکان و ئەوانیان بردە جێگایەکی چۆڵ و چیرۆکی خواپەرسـتەکەیان بۆ گێڕاوە و، گریان و گریان هەتا زەوئولمەکان و شـەرکانیشـیان گریاندن."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

کە شەوی نەوەد و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـکۆ، کاتێک مەسـیحییەکان گریان و شـەرکان و زەوئولمەکانیش بە گریـانەکەی ئەوان دڵیـان پڕ بوو و گریـان، ئیتر چیرۆکەکەیـان هەر وەک ئەوەی پیرێژنە گڵاوەکە فێری کردبوون، بۆ شـەرکان و زەوئولمەکانیان گێڕاوە و گوتیشـیان کە ئەو پیاوەمان ڕزگار کرد و دێرەوانەکەشمان کوشت و خێرا ڕامان کرد. بیستیشمانەوە کە ئەو دێرە پڕە لە زێڕ و زیو و گەوهەر. شـەرکان زگی بەو خواپەرسـتە سـووتا و بەزەیی پێیدا هات و گوتی: 'ئا بیهێنن.' بازرگانەکان یەغدانەکەیان هێنا و کردیانەوە و ئەو گڵاوەیان هێنا دەرێ.

"چونکە ڕواڵەتێکی ڕەش و کز و لاوازی هەبوو، شـوێنی پەت و زنجیر لەسـەر پووز و بەلەکە ڕەقەڵەکەی دیار بوو، زەوئولمەکان و ئەوانەی لەوێ بوون گوتیان: 'وەڵا ئەوە دەبێ لە هەرە بەندە چاک و لەخواترس و پارێزکارەکان بێ. بە تایبەت نووری تەوێڵی دیاردەی ئەوەیە کە پیاوێکی نووراني و گەورەیە.' ئیدی زەوئولمەکـان و شـەرکـان کەوتنە ژێر کاریگەرییەوە و دەسـت و قاچیان ماچ کرد. دوایی ئەو گڵاوە بە ئاماژە تێیگەیاندن کە مەگرین و گوێ لە من ڕاگرن. ئینجا ئەوان بێدەنگ ڕاوەسـتان و گوێیان دا وتەکانی. ئەو گڵاوە گوتی: 'من ڕازیم بەوەی کە خودا بەسـەر منی هێناوە و داویە بە من، چونکە ئەوە بەشـی من بووە و تاقیکردنەوەی من بووە. هەرکەس لەبەرابەر گیروگرفتەکاندا خۆڕاگر نەبێ، چاوی بە بەهەشت ناکەوێ. من بەو ئاواتەوەم خوا یارمەتیم بدا و لەبەرابەر سەختی و ناخۆشـییەکاندا هێدی و هێمن بم هەتا یان بە خۆشـحاڵی بچمەوە شـارەکەی خۆم، یان لەژێر سمی ئەسپی موجاهیدەکاندا بمرم.' ئەو جار ئەو دوو بەیتەی خوێندەوە:

غـازی ئەو غـازیـیەیە کـاتـی غەزا
هەمـوو فـکـر و زکـری ڕەزای خـودا بـێ
غـازی نـیـیە ئەو خـوێـڕیـلە پـیـاوەی کە وا
لە بـیـر دزی و ڕازیـکـردنـی سـەردار بـێ

"پاشـان ئەوەندە گریا، ڕۆندکی خوێنی داباراند. شـەرکان هەسـتا و دەسـتی ماچ کرد و گوتی: 'چێشتی بۆ بێنن.' ئەو گوتی: 'من پازدە ساڵە بە ڕۆژووم، چۆن ئێستا خودا ڕزگاری کردووم و لە شـەڕی کافران دووری خسـتوومەوە، بیشـکێنم؟! هەتا شـەو هیچ ناخۆم.' کە کاتی شـێو هات، زەوئولمەکان و شـەرکان چێشـتیان بۆ هێنا و گوتیان: 'شـتێک بخۆ.' ئەو گڵاوە گوتی: 'ئێستا کاتی خواردن نییە، کاتی خواپەرستییە.' ئیتر دەستی کرد بە نوێژکردن و هەتا بەیانی هەر بەردەوام بوو. هەتا سـێ شـەو و ڕۆژان ئاوای کرد. کە زەوئولمەکان ئەوەی دیت، تەواو باوەڕی پێ هێنا و بە شـەرکانی گوت: 'فەرمان بدە با خێوەتێکی بۆ ئامادە کەن و خزمەتکاریشی بۆ دانێ با خزمەتی بکا.'

"کە بوو بە ڕۆژی چوارەم، پیرێژنی کلکەنەفتینە داوای خواردنی کرد. هەموو جۆرە خواردنێکیان بۆ ساز کرد و لەپێشـیان دانا. هیچی نەخوارد جلگە لە لەتەنانێک بە خوێوە و هەسـتا دەسـتی کردەوە بە نوێژکردن. ئەو شـەوەش هەتا بەری بەیان هەر خەریکی نوێژ بوو. شـەرکان بە زەوئولمەکانی گوت: 'ئەو کابرایە هەموو حەزێکی وەلا ناوە و لە خەڵک دابڕاوە و تەرکەدنیا بووە، ئەگەر ئەو شـەڕ و غەزایە نەبایە، منیش تەرکەدنیا دەبووم و لە خزمەتیدا خەریکی بەهێزکردن و تەواوکردنی دەروونم دەبووم. ئێسـتا دەچم بۆ تاوڵەکەی کەمێکی قسە لەگەڵ دەکەم.'

"زەوئولمەکان گوتی: 'منیش زۆر هۆگری دینم، بەڵام چونکە ئێمە سـبەینێ دەچین بۆ شـەڕی کافران و گەمارۆدانی قوسـتەنتەنییە، جگە لەو سـەعاتە کاتی دیکەم نییە.' وەزیر دەندانیش گوتی: 'منیش پێم خۆشـە ئەو کابرا خواناسـە ببینم بەشـکو دۆعایەکم بۆ بکا شـەهید ببم، چونکە لە ژیان تێر بووم.' هەر بۆیە کاتکێک وڵات تاریک داهات و بوو بە شـەو، هەرسـێکیان پێکەوە چوون بۆ لای ئەو گڵاوە، سـەیریان کرد ئەوە خەریکی نوێژە. ئەوان چـاویـان لێ دەکرد و دەگریـان، کەچی ئەو ئەوانی بە هێند نەدەگرت هەتـا بوو بە نیوەشـەو. ئینجا لە نوێژ بووەوە. سـڵاوی لێ کردن و بەخێرهاتنی لی کردن. لێی پرسـین: 'ئەوە چۆنە هاتوون؟ و کەی هاتوون؟' گوتیان: 'ئەی عابید، ئاگات لە گریانی ئێمە نەبوو؟' گوتی: 'ئەوەی لە حزووری خوادا ڕاوەسـتێ، ئاگای لە خۆی نامێنێ، ئیتر چۆن گوێی لە دەنگی دیکە بێ؟' ئەوان گوتیان: 'هۆی بەدیلگیرانی خۆتمان پێ بڵێ. ئەو شـەویش دۆعامان بۆ بکە، چونکە دۆعای تۆ لە تەواوی وڵاتی قوسـتەنتەنییە باشـترە.' کە پیرێژن گوێی لەو قسـەیە بوو، گوتی: 'بە خودا ئەگەر ئێوە گەورەی موسـوڵمانان نەبایەن، جگە لە خودا، نەمدەهێشت کەس بە هۆکاری گیرانم بزانێ و ئەو شـکایەتەم هەر دەبردە لای خودا. بەڵام لە لای ئێوە باسی هۆکاری بەدیلگیرانی خۆمتان بۆ دەکەم.

" 'ئەمن لە شـاری قودس لەگەڵ چەند کەسـێکی ئەودال و خوداپەرسـت لەدەوری یەک کۆ ببووینەوە و خەریکی پەروەردەی نەفسـی خۆمان بووین. بە ڕێکەوت شـەوێکی ڕێم

کەوتە دەریا و هەر وا لەسەر ئاوەکە دەڕۆیشتم. کە لە ناکاو هەستێکی لەخۆبای بوون و خۆبەزلزانی بە دڵمدا هات. لە دڵە خۆمدا گوتم: 'کێ دەتوانێ وەک من بەسەر ئاودا بڕوا و قاچی تەڕ نەبێ؟' ئیتر تووشی دڵڕەقی بووم. خودا حەزی سەفەری خستە دڵمەوە و بەرەو وڵاتی ڕۆم ڕۆیشتم. ساڵێک لە شارەکانی ڕۆمدا سووڕامەوە، چوومە هەر کوێیەک هەر خەریکی خواپەرستی بووم. کە ڕۆشتمە ئەوێ، چوومە ئەو شوێنە و لە کێوەکە چوومە سەرێ و لەوێ دێرێک و ڕاهیبێکی لێ بوو. کە ڕاهیب منی دی، لە دێرەکە هاتە دەرێ و دەست و قاچی منی ماچ کرد و گوتی: 'من تۆم لەو کاتەوە کە هاتوویتە وڵاتی ڕۆم، دیوە. چاکی تۆ منی هۆگری وڵاتانی ئیسلامی کردووە. ئیتر دەستی منی گرت و بردییە نێو دێرەکەوە. دوای ئەوە منی بردە دیوێکی تاریکەوە. کاتێک چووینە ئەوێ، ئیدی دەرفەتی هێنا و دەرگای لەسەر داخستم. هەتا چل ڕۆژ منی بەبێ نان و ئاو لەوێدا هێشتەوە و مەبەستی بوو لە برساندا بمکوژێ. لە بەختی من قەشەیەک هاتە ئەو دێرە کە ناوی دەقیانووس بوو. دە کەسی خزمەتکاری لەگەڵدا بوو. کچێکیشیان لەگەڵ بوو ناوی تەماسیل بوو لە جوانیدا هاوتای نەبوو. کە هاتنە ناو دێرەکەوە، ڕاهیبەکە ئەوانی لە بوونی من لەو دیوەدا ئاگادار کردەوە. قەشە گوتی: 'دەرگای لێ بکەوە، چونکە لەو دەمەوە تا ئیستا ئەوەندەی گۆشت لێ نەماوەتەوە باڵندەیەک بیخوا.' وا بوو، دەرگایان کردەوە. منیان دیت خەریکم نوێژ دەکەم و لە خودا دەپاڕێمەوە و دەلاڵێمەوە. کە منیان ئاوا دیت، ڕاهیب گوتی: 'ئەوە جادووگەرە.' کە ئەوان گوێیان لە قسەی ڕاهیبەکە بوو، بە هەموویان تێروپڕیان لێ دام. ئەوەندەیان لێ دام مەرگم بە ئاوات دەخواست. دەروونی خۆم سەرکۆنە کرد و زانیم ئەوە وەڵامی ئەو خۆبەزلزانی و لەخۆبایی بوونەمە. دەمگوت: 'نەفسی خوێڕی، ئەوە هۆی ئەو لەخۆبایی بوون و خۆبەزلزانینەتە کە دێتەوە ڕێت. هەر ئەوەشە خەڵک تووشی دۆزەخ دەکا. دوای ئەوەی لێیان دام، بردیانمە ساردادوێکەوە. هەر سێ ڕۆژ جارێک لەتە کولێرەیەکی جۆ و قومێکیان ئاو دەدامێ. هەر بە مانگێک دوو مانگ ئەو قەشەیە دەهاتە ئەوێ. بەڵام تەماسیلی کچی گەورە ببوو. چونکە ئەو دەم کە من دیتم نۆساڵان بوو، ئەمنیش پازدەساڵ بوو لە زینداندا بووم، بە گشتی تەمەنی تەماسیل دەبوو بە بیستوچوار ساڵ، بەڵام لە وڵاتانی ڕۆم و ئیسلامیدا شتی ئەوەندە جوانم نەدیبوو. بابی نیگەران بوو کە ئافریدوونپاشا کچەکەی لێ بستێنێ. ئەو کچەکەی خۆی دابوو بە مەسیح. جلوبەرگی پیاوانی لە بەر کردبوو. لەگەڵ خۆی سواری کەشتی دەکرد. بابی تەواوی ماڵەکەی خۆی لەو دێرە دانا. چونکە هەرکەس شتێکی بە بایەخ و گرانبایی هەبا، لەوێی دادەنا. ئەمن بە چاوی خۆم زۆر شتی بە نرخ و گرانبایم دیوە کە لە ژمار نایەن. ئەوانە شایانی ئێوەیە نەک کافران. ئێوە ئەو دێرە بگرن و بۆ موجاهیدە موسوڵمانەکانی خەرج کەن. کاتێک ئەو بازرگانانە دەچنە قوستەنتەنییە و شتەکانی خۆیان دەفرۆشن، بە قسەی خۆیان ڕوخسارێک دێتە سەر دیوار و باسی کەڕامەتێک دەکا کە خودا داوییە بە من و، ئەوان لە حاڵی من

ئاگادار دەکاتەوە. ئیدی بازرگانەکان دێنە دێر و دوای ئازاری زۆر، ڕاهیب دەکوژن و من هەڵدەگرن و هەڵدێن. بۆ سبەی شەو تەماسیل بە پێی عادەتی خۆی دێتە دێر و بابیشی کە نیگەرانی ئەو بوو، بە دوایدا دێ. ئەگەر پێتان خۆشــە بیانبینن، ئەوە من هەڵگرن و بچن بۆ دێرەکە کە تەواوی ماڵ و ســـامانی دەقیانووس و ئەو زێڕ و زیو و گەوهەرانەی لەوێدان، نیشـــانتانی بدەم. ئەمن کەنیزێکی دەقیانووســـم دیت، ئای لەو دەنگەی ئەگەر قورئانی پێ بخوێنێ! ئەگەر ئێوە پێتان خۆشـــە لە دێرەکەدا خۆتان مات دەن، کە دەقیانووس لەگەڵ کچەکەی هاتن، ئێوە کچەکەی لێ بستێنن کە ئەو کیژە هەر بۆ شای جیهان باشە. جا چ بۆ شەرکانپاشا بێ، یان بۆ زەوئولمەکان، جیاوازی نییە.'

"ئەوان کە قســەکانی ئەویان بیست، خۆشحاڵ بوون، جگە لە وەزیر دەندان کە باوەڕی بە قســەکانی نەکرد. بەڵام لەبەر دڵی پاشــا گوێی دەدایە و ســەری لە قســەکانی ئەو گڵاوە سووڕ مابوو. شوێنەواری باوەڕنەکردن لە هەنیەیدا[1] دیار بوو.

"پیرێژنی گڵاو گوتی: 'ئەمن لەوە دەترسم کە قەشە بچێ بۆ دێر و لە ڕێگەدا ئەو سوپاە لەو مێرگزارەدا ببینێ و نەوێرێ بچێتە نێو دێرەکەوە.'

"شـەرکانپاشـا دەنگی سـوپای دا بەرەو قوسـتەنتەنییە ببزوێ و زەوئولمەکانیش گوتی: 'من دەمەوێ لەگەڵ ســەد ســواری چالاک و ئازا، ئەســپێکی زۆر لەگەڵ خۆمان بەرین و بچین بۆ سـەر ئەو کێوە و ئەو شـتەی لێیەتی، هەمووی بار کەین و بیهێنینەوە.' ئیتر گورج پەردەداری مێردی نوزهەتوززەمان و فەرماندەکانی تورک و دەیلەمی بانگ کرد و گوتی: 'بەری بەیان بەرەو قوســـتەنتەنییە بکەونە ڕێ. تۆش پەردەدار، بۆ ڕا و ڕاوێژ لە جێی من بە، ڕۆستەمیش لە شـەڕدا جێگری کاکم بێ. کەسـیس تێمەگەیەنن کە ئێمە لەگەڵ ئێوە نین. دوای سێ ڕۆژ دێینەوە لاتان.' دوای ئەوە سەد سواری ئازا و نەترسی هەڵبژارد. شەرکان و زەوئولمەکان و وەزیر دەندانیش بە ســەد ســوارەوە ئەســپ و یەغدانێکی زۆریان لەگەڵ خۆیان بۆ هێنانی شتەکان برد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. هەنییە: تەوێڵ، ناوچاوان.

## که شەوی نەوەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شەرکان و زەوئولمەکان و وەزیر دەندان سەد سواریان برد و لەگەڵ پیرێژنە بەرەو ئەو دێرە ڕۆیشتن کە ئەو گڵاوە بۆیانی باس کردبوو. وڵاخ و سندووقیشیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ هێنانەوەی خەزێنەکان. مەسیحییەکانی هاوڕێی پیرێژنە کلکەنەفتینەکەش کە خۆیان کردبوو بە بازرگانی دیمشقی، ڕۆیشتن.

"کە ڕۆژ بووەوە، پەردەدار فەرمانی دا سوپا بەرەو شوێنی دیاریکرا بکەوێتە ڕێ. سوپا بزووت و پێشیان وا بوو کە شەرکان و زەوئولمەکانیشیان لەگەڵدایە.

"شەرکان و زەوئولمەکان و وەزیر دەندان و پیرێژنەش ڕۆیشتن هەتا داوێنی ئەو کێوەی کە دێرەکەی لەسەر بوو. ئەو ڕۆژە لەوێ مانەوە. کە تاریکی بەسەر وڵاتدا زاڵ بوو، زاتوددەوایی بە زەوئولمەکانی گوت: 'هەستن لەگەڵ من وەرن بۆ دێرەکە و سوپایکی کەمیش لەگەڵ خۆتان بێنن.' زەوئولمەکان بە قسەی کرد. ئەو گڵاوە ئەوەندە خۆشحاڵ بوو، هێزی هاتبووە بەر. زەوئولمەکان دەیگوت: 'پاکە ئەو خودایەی کە ئەو سۆفییەی خۆشحاڵ کرد و هێزی وەبەر نا. ئێمە باوەڕمان نەدەکرد ئاوا بێ.'

"ئەو گڵاوە لەپێشدا بە مەلێکدا نامەیەکی بۆ پاشای قوستەنتەنییە ناردبوو، ئەوی لە ڕووداو و کار و بەرنامەکانی ئاگادار کردبووەوە و پێشی گوتبوو کە بۆ ڕۆژی دوایی دە هەزار سواری دلێر و ئازای ڕۆم بنێرێ لە داوێنی کێوەکەدا بۆسە بنێنەوە هەتا من پاشای موسوڵمانان و براکەی و وەزیرەکەی بێنمە بەر دەستیان. نووسیبووشی کە دەبێ ڕاهیب بکوژم دەنا کارەکەم سەر ناگرێ. ئەوەش بزانە ئەگەر فێڵەکەم سەر بگرێ، تاکە کەسێک لە موسوڵمانان ناچێتەوە وڵاتەکەی خۆیان. کە نامەکە گەیشتە دەست پاشای قوستەنتەنییە، خێرا فەرمان درا سوپا ئامادە بێ و بڕوا بەرەو شوێنی دیاریکراو.

"بەڵام شەرکان و زەوئولمەکان و وەزیر دەندان کە گەیشتنە دێرەکە، ڕاهیبەکە هاتە پێشی بزانێ کێن و چییان دەوێ. فیتنەگێڕ فەرمانی دا: 'ئەو گڵاوە بکوژن.' ئەویان کوشت. دوای ئەو پیرێژنە گەمارە ئەوانی بردە ئەو شوێنەی کە خێر و سەدەقات و هەروەها ئەو زێڕ و زیو و خەزێنانەی بۆی باس کردبوون، پیشانی دان. نەک هەر ئەوەندەی ئەو گوتبووی، بگرە زیاتریشی تێدا بوو. ئەوان دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی زێڕ و گەوهەر و یەغدانەکانیان لێ ئاخنی و لە وڵاخەکانیان دان. بەڵام قەشە دەقیانووس و تەماسیلی کچی لە ترسی سوپای موسوڵمانان نەهاتنە ئەوێ.

"زەوئولمەکان هەتا سێ ڕۆژان لەوێ ماوە و چاوەڕێی تەماسیلی کچی دەقیانووس

بوو. شەرکان گوتی: 'براکەم من هەر هۆشم لە لای سوپاکە مانە و نازانم چیان لێ بەسەر هاتووە.' ئیدی زەوئولمەکان گوتی: 'ئێمە ئەو هەموو ماڵ و خەزێنە چاوەڕواننەکراوەمان وەگیر کەوتووە. تاز تەماسیل و بابیشی دوای بیستنی ڕووداوی سوپای ڕۆم، پێم وا نییە بوێرن بێنە ئێرە. وا چاکە بەو دەستکەوتەی خودا بەشی داوین، ڕازی بین و بڕۆین. بەشکو خودا یارمەتیمان بدا و قەڵای قوستەنتەنییەش بگرین.'

"پاشـــــان لە کێوەکە هـاتنە خوارێ. پیرێژن لەبەر ئەوەی لە فێڵەکەی نەگەن، نەدەکرا پێشـیان بگرێ و شـتێک بڵێ. وا بوو هەر ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە دۆڵێکی زۆر تەنگەبەر، لەپڕدا دیتیان دەهەزار کەس لە سوپای ڕۆم لێیان ڕاپەڕین و دەوریان دان و بە شمشێر و ڕمب و زەرگەوەوە هێرشیان کردە سەریان. زەوئولمەکان کە ئەو سپا بێئەندازەیەی دیت، گوتی: 'ئەوانە چۆنیان بە ئێمە زانیوە؟' شـەرکان گوتی: 'ئێستا کاتی قسـەکردن نییە، ڕۆژی شـیر و ڕمبوەشـاندنە.' غیرەت وەبەر خۆتان نێن و بەرەو پێشـەوە بڕۆن. ئەو دۆڵە وەک کۆلانێـک وایە، هەر بە دوو لادا ڕێگەی هەیە. بە گەورەی عەرەب و عەجەم، ئەگەر ئەو گەلووگەیە ئەوەندە تەنگ نەبایە، ئێستا جووقەوارم لێ دەبڕین. ئەگەر سـەد هەزاریش بن.' زەوئولمەکان گوتی: 'ئەگەر بمانزانیبایە ئاوای لێ دێ، پێنج هەزار ســـەربازمان لەگەڵ خۆمان دێنا.' وەزیر دەندان گوتی: 'خۆ لە جێگای ئاوا تەنگەبەردا ئەگەر دە هەزاریش بێ، هەر بێســـوودە. بەڵام خودامان لەگەڵە و من ئەو دۆڵە شـــارەزام و ڕێگەی دەرباز دەزانم. لەگەڵ نوعمانپاشـا کاتێک قوسـتەنتەنییەمان گەمارۆ دابوو، بێرەشـدا هاتین. لێرە کانی لێیە ئاوەکەی لە بەفر ســـاردترە. لەگەڵم وەرن پێش ئەوەی ســـوپای دژمن تەواوی ڕێگەکان بگرێ، با لەو گەلووگەیە تێپەڕین. دەترســـم ســوپای دژمن لێمان وەســـەر کێوەکە کەون و لەوێڕا بەردبارانمان کەن، ئەو دەم چمان پێ ناکرێ.'

"وا بوو پەلەیـان کرد لە گەلووگەکە ڕەد بن، پیرێژنی گۆرین کە ئەوان بە زاهیدیـان دەناسـی، چاوێکی لێ کردن و پێی گوتن: 'بۆ ئەوەندە دەترسن؟ ئێوە کەسـانێکن کە لە ڕێی خودا و بە تەمای بەهەشت دەستتان لە گیانتان شـوتووە. قەسـەم بە خودا، من پازدە سـاڵ لەژێر زەویدا زیندانی بووم، قەتم نەناڵاند و بۆڵەم لێ نەهات، بەو بەشـــەی خودا پێی داوم. ئێوەش لە ڕێی خوادا شـــەڕ بکەن. هەر کەســـتان بکوژرێ، جێگەی بەهەشـــتە.' کە ئەو قسـەیەیان لە زاهید بیسـت، ئیدی ترس و نیگەرانییان ڕەوی و هێور بوونەوە، هەتا سـپا لە هەموو لایەکەوە دەوریان دان. زەوئولمەکان زۆر دلێرانە شەڕی دەکرد، دەیان کەڵەسواری لێ لە زەوی دان و ســـەریان وەک گۆ لە مەیداندا دەکەوت، هەتا کوشـــت و کوشـــتارێکی باشیان لێ کردن. لەو کاتەدا پیرێژنە گڵاوە بە شمشیر ئاماژەی بۆ کافرەکان دەکرد و هانی دەدان هەتا شەرکان بکوژن. کافرەکانیش دەستەدەستە هێرشیان دەبرد هەتا شەرکانپاشا بکوژن. شەرکانیش وەک شێر درێ پێ دەدان و دەچووە پێشێ و کەس نەبوو خۆی لە بەر

ڕاگرێ. ئەویش پێی وا بوو ئەوە هی دۆعای ئەو زاهیدەیە وا بەســەر کافراندا زاڵ دەبێ. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: 'ئەو زاهیدە زۆر لە خودا نزیکە و ئەوە هەموو هی پاکی ئەوە وا خودا دۆعای لێ قەبووڵ دەکا و بەسەر ئەو کافرانەدا زاڵ دەبین، خودا ئەوەندەی ترس خستوونە دڵەوە بەرگەمان ناگرن.' ئەو ڕۆژە هەتا شەو هەر بە شەڕ و کوشت و کوشتار تەواو بوو. کە شـــەو پەردەی تاریکی داداوە، لە ئەشـــکەوتێکی ئەو دۆڵەدا کۆ بوونەوە کە چل و پێنج کەس لە ئازا و دلێرەکانی ئەوانی تێدا کەوتبوو.

"کە لەو ئەشـــکەوتەدا کۆ بوونەوە، چاویان گێڕا زاهید دیار نییە. هەر بۆیە ناڕەحەت بوون و گوتیان ڕەنگە ئەویش شەهید بوو بێ! شەرکان گوتی: 'من ئاگام لێ بوو بە ئاماژە ســـوارەکانی ئێمەی هان دەدا و ورەی وەبەر دەنان، ئایەی قورئانی بەســـەردا دەخوێندن.' لەو قسـانەدا بوون کە پیرێژنی فێڵباز پەیدا بوو. سـەری فەرماندەیەکی کافران کە گەورەی بیسـتهەزار سـوار بوو، بە دەسـتەوە گرتبوو و هێنای. ئەو فەرماندەیە یەکێک لە سـوارە تورکەکان کوشتبووی و ئەو پیرێژنە گڵاوە سەرەکەی هێنابوو و کردبوویە دیاری دەستی خۆی. ئەو سەرەی لەپێش شەرکاندا بە زەویدا دا. شەرکان کە ئەوەی دیت، هەستا و گوتی: 'ایها العابد الزاهد المجاهد، سـپاس بۆ خودا کە چاوی ئێمەی بە دیداری تۆ شـاد کردەوە.' ئەو فێڵاوییە گوتی: 'ڕۆڵە گیان، من ئەوڕۆ پێم خۆش بوو شـــەهید بم. ئیدی ڕۆیشـتمە نێو شـــەڕەکەوە، کەچی ئەوان لێم دەترسـان و لە بەرم هەڵدەهاتن. کاتێک دوو ســـوپاکە لێک جوێ بوونەوە، ئەمنیش غیرەتی دینداری هەڵیگرتم و هێرشم کردە سەر ئەو فەرماندەیە کە لەگەڵ هەزار ســوار نەیاندەگۆڕییەوە، ســـەریم پەڕاند. ســـەیر لەوە دابوو یەک دانەشــیان نەیوێرا لیم بێتە پێشێ! ئیدی ئەمنیش سەرەکەیم هەڵگرت و هێنامەوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی نەوەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، ئەو جادووگەرە دەیگوت: 'ئەمن ســەری ئەو فەرماندەیەم بڕی و هێنام بۆ ئێوە هەتا ورەتـان بەرز بێتەوە و نەترســـانەتر جیهاد بکەن و خودا و خەڵک خۆشحاڵ بکەن. دەڵێم ئێوە خەریکی شەڕ و جیهاد بن، من دەچم بۆ لای سوپاکەی ئێوە و بیســـتهەزار ســـواری دیکە دێنم بۆ یارمەتیتان بۆ ئەوەی ئەو کافرانە بە تەواوی لەنێو بەرن.' شـــەرکان گوتی: 'تۆ چۆن دەتوانی بچیتە ئەوێ لە کاتێکدا ســـوپای کوفر تەواوی وڵاتی تەنیوە؟' ئەو گەمارە گوتی: 'خودا من لە بەرچاوی ئەوان نـادیـار دەکـا و نـامبینن. ئەوەی منیش ببینێ، بە قودرەتی خودا ناتوانێ هیچ بەسەر من بێنێ، چونکە من لەگەڵ خودا تێکەڵ بووم و دژمنی من دژمنی ئەویشە. ئەو دەتوانێ دژمنی خۆی بکوژێ.'

"شـــەرکان گوتی: 'زاهید، راســـت دەکەی. من کەراماتی لەوەش گەورەترم لە تۆ دیوە. ئەگەر هەر ئێستا دەتوانی بچی، بۆ ئێمە باشترە.' پیرێژنە گوتی: 'هەر ئێستا دەچم. ئەگەر تۆش بێی چ باشتر، چونکە کەس ناتوانێ بتبینێ. ئەگەر براکەشت دێ، قەیناکا. بەڵام کەسی دیکە نابێ بێ.' شەرکان گوتی: 'من هاورێکانم بەجێ ناهێڵم، بەڵام براکەم ئەگەر پێی خۆشە بێت، کێشە نییە. هەم بۆخۆی لەو گەمارۆیە دەرباز دەبێ و هەم سوارەکانیش زووتر دێنێ. ئەگەر وەزیر دەندانیش ویستی، بیبەن.' لەسەر ئەوە رێک کەوتن. پیرێژن گوتی: 'رێم بدەن با ئەمن بچم ســـەرێک لەو کافرانە بدەم، بزانم خەوتوون یان بەخەبەرن.' ئەوان گوتیان: 'ئێمەش لەگەڵ ئێوە دێین و، خۆمان دەدەینە دەســـت خوا.' ئەو کەڵەکبازە گوتی: 'ئەمن بە قسـەتان دەکەم بەڵام هەر شـتێکتان بەسـەر بێ، لۆمەی من نەکەن و بزانن خەتای خۆتانە. من وام پێ باشە لێم گەڕێن، هەواڵێک بزانم.' شەرکان گوتی: 'برۆ، بەڵام زوو بێیتەوە، ئەوە چاوەڕێی تۆین.'

"ئیدی خێرا کلکەنەفتینە چووە دەرێ. دوای ئەوەی ئەو رۆیشـــت، شـــەرکان بە براکەی گوت: 'ئەو زاهیدە بە ئاشکرا کەراماتی هەیە، بۆ نموونە کوشتنی ئەو فەرماندەیە کە پشتی کافرانی پێ شـکا.' ئەوان خەریکی وتووێژ بوون کە پیرێژنە هاتەوە و مزگێنی سـەرکەوتنی دانێ. ئەوان وەک زاهیدێک بە پیرێژنەیـان هەڵگوت و نەیـانزانی، ئەو دەیـانخاپێنێ. ئیدی زاهیـد بـانگی زەوئولمەکـانی کرد و ئەویش بە بەڵێ بەڵێ بە دەنگییەوە هـات. گوتی: 'وەزیرەکەت هەڵگرە و وەرە بەدوامدا.' ئەو پیســـەکەیە کافرانی ئاگادار کردبوو کە ئەوە پاشای موسوڵمانان دێنم. ئەوانیش گوتیان: 'زۆر باشە، داخی لەدەستدانی فەرماندە خۆش نـابێتەوە، مەگین پاشـــای موســـوڵمانان بکوژین یان بە دیلی بگرین و بیبەین بۆ لای ئافریدوونپاشا.'

"زاتوددەوایی کەوتە ڕێ و زەوئولمەکان و وەزیر دەندانیش بە دوایدا ڕۆیشتن. پیرێژن ئەوانی برد هەتا گەیشتنە نێوەڕاستی سوپای کافران. کافرەکانیش چاودێرییان دەکردن، بەڵام هێرشیان نەکردە سەریان. پیرێژنی مەکرباز سوپای تێگەیاندبوو کە تا شوێنی دیاریکراو لە جێی خۆیان نەبزوون و کاریان پێیان نەدابێ.

"زەوئولمەکان و وەزیر دەندان کە کافرەکانیان دەدی وا بە بەرچاویاندا دەڕۆن و کاریشیان پێیان نییە و هێرش ناکەنە سەریان، بە یەکترییان گوت: 'بە خودا، ئەوە هی کەراماتی زاهیدە و گومانی تێدا نییە کە زاهید لە پیاوانی خودایە.' زەوئولمەکان گوتی: 'گومانی تێدا نییە کافران لە ئاستماندا کوێر بوون. ئێمە ئەوان دەبینین و ئەوان ئێمە نابینن.' هەر بۆیە سپاسی پیرێژنە جادووگەرەکەیان دەکرد و پێیاندا هەڵدەگوت و باسی پەرستش و کەرامات و لەخواترسی ئەویان دەکرد کە لەپڕدا پەلاماریان دان. قۆڵبەستیان کردن و گوتیان: 'ئەوانی دیکە کوان؟' وەزیر دەندان گوتی: 'ئەی ئەو کابرایە نابینن کە ڕووبەڕوومان ڕاوەستاوە؟!' کافرەکان گوتیان: 'نە بە حەزرەتی مەسیح و ڕاهیبان! ئێمە جگە لە ئێوە کەسی دیکەمان نەدیوە.' زەوئولمەکان گوتی: 'قەسەم بە خوا ئەوە هەر لە ئاکاری خراپی خۆمان وا ئێمە گیرۆدە بووین.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نەوەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کاتێک کافران سوێندیان خوارد کە جگە لە زەوئولمەکان و وەزیر دەندان کەسی دیکە نابینن. ئەوانیان لەوێ بە قۆڵبەستکراوی بە چەند پاسەوان سپاردن. جا ئەوان جارێ با لێرە بن.

"بەڵام شەرکان و سوارەکانی بەیانی کە هەستان و بۆ شەڕ ئامادە بوون، سوپای دژمن لە دوور ئاگایان لێ بوو. وا بوو هەرایان کردنێ کە: 'ئەی تاقمی موسوڵمانان، ئێمە پاشا و وەزیری ئێوەمان بە دیل گرتووە. ئەگەر ئێوەش دەست هەڵنەگرن، ناچارین هەمووتان بکوژین. ئەگەر بەبێ شەڕ خۆتان ڕادەست دەکەن، ئەوە دەتانبەین بۆ لای ئافریدوونپاشا کە بە شێوەیەکی ئاشتییانە لەگەڵتان دەجووڵێتەوە. بەو مەرجە لە وڵاتی ئێمە بچنە دەرێ و زیانتان بۆ ئێمە نەبێ. ئەگەر باوەڕ بە ئێمە بکەن و بە قسەمان بکەن، ئەوە ڕزگارتان دەبێ، دەنا هەمووتان تێدا دەچن. ئەوە ئێمە ئێوەمان ئاگادار کردەوە، ئێدی ئارەزووی خۆتانە.' کە شەرکان گوێی لەو قسەی ئەوان بوو، زانی براکەی و وەزیر دەندانیان بە دیل گیراون. زۆر نارەحەت بوو. دەستی کرد بە گریان و هێزی لە بەردا نەما و لێی ڕوون بوو کە دەکوژرێن. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خۆزگە دەمزانی هۆی بەدیلگیرانیان چ بووە. بڵێی ئەوان بێئەدەبییەکیان لەگەڵ زاهید کردبێ یان شتی دیکە ڕووی داوە؟!' ئینجا دەستیان کرد بە کوشتار و خەڵکێکی زۆریان لێ کوشتن. سوپای کافران وەک مێش لە شیرینی بئاڵێ، ئاوا دەوری ئەو چەند موسوڵمانەیان دا. بەڵام شەرکان لەگەڵ ئەو چەند کەسەش ئەوەندەیان لە کافران کوشت کە لە هەموو لایەکەوە خوێن وەک سێڵاو سەری کردبوو. ئەوەندە لاشە کەوتبوو، ئەو دۆڵەی پڕ پڕ کردبوو. کە بوو بە شەو، لایەنەکان لێک بوونەوە و موسوڵمانەکان هەر چوونەوە ئەو ئەشکەوتەی شەوی پێشوو. جگە لە چەند کەسێک، کەسیان لێ نەمابووەوە. ئەو ڕۆژە سیوپێنج سواریان لێ کوژرابوو. هەرچەند، چەند هەزاریش لە کافران کوژرابوون. کاتێک شەرکان ئەو حاڵەی دیت، دنیای پێ تەنگ بوو، بە هاوڕێکانی گوت: 'ئێستا چی بکەین؟' ئەوان گوتیان: 'خودا چۆنی پێ خۆش بێ، هەر وا دەبێ.' کە ڕۆژی سێیەم هاتەوە، سوارەکانی ئیسلام لە دوو لاوە دەوری دەرگای ئەشکەوتەکەیان گرت و هەر کافرێک بیویست با بێتە ژوورێ، لێیان دەدا و دەیانکوشت و بە ڕمب لاشەکەیان لە دەرگاکە دوور دەخستەوە. بەو شێوە تا هەوا تاریک بوو، شەو باڵی بە سەر وڵاتدا کێشا، هەر چۆنێک بوو، خۆیان ڕاگرت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی نەوەد و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، سوپای ئیسلام خۆیان ڕاگرت هەتا بوو بە شەو، لە کاتێکدا شەرکان هەر بیستوپێنج کەسی بەدەورەوە مابوو. کافرەکان بە یەکتریان دەگوت: 'کەی ئەو شەڕە تەواو دەبێ؟ زۆری ماندوو و شەکەت کردووین.' تاقمێکیان گوتیان: 'هەستن با هێرشیان بکەینە سەر. ئەگەر نەشمانتوانی بۆیان بچینە ژووری، نێو دەرکی ئەشکەوتەکە ئاور دەدەین. ئەگەر خۆیان بە دەستەوە دا، ئەوە باشە بە دیلیان دەگرین، ئەگەر خۆشیان بە دەستەوە نەدا، نێو ئەشکەوتەکە پڕ دەکەین لە ئاور و دووکەڵ، وایان قانگ دەدەین بۆ بەرەکانی داهاتووشیان تەمبێ دەکەین.' وا بوو لە سەر ئەو بیرۆکەیە ڕێک کەوتن. سووتەمەنییان بردە دەرکی ئەشکەوتەکە. شەرکان مەرگی بە چاوی خۆی دیت. ئینجا فەرماندەکەیان بەو کەسەی پێشنیاری ئاورتێبەردانەکەی کردبوو، گوت: 'کوشتنی ئەو چەند کەسە لە بەرچاوی ئافریدوونپاشا نەبێ، ڕەوا نییە؛ کوڵوکۆی پاشا دانامرکێ. چارە ئەوەیە هەموویان بە دیل بگرین، بیانبەینە قوسەنتەنییە بۆ بەردەستی ئافریدوونپاشا. تا چۆنی پێ خۆشە ئاوایان لێ بکا.' ئیتر سپا و فەرماندەکان قسەکەیان پەسەند کرد و بە لێشاو خەڵکێکی زۆر خۆیان کرد بە ژوورێدا بە جۆرێک باشاریان[1] نەکردن و بەسەریاندا زاڵ بوون. گرتنیان و دەست و لاقیان بەستن. زەوئولمەکان و وەزیر دەندانیشیان هێنا و لە لای ئەوان دایاننان و پاسەوانیان بۆ دانان.

"شەو کافرەکان دەستیان کرد بە خۆشی و خواردن و خواردنەوە و ئاهەنگگێڕان هەتا وای لێ هات هەموویان مەست بوون و بە لادا کەوتن.

"شەرکان و براکەی و موسوڵمانەکانی دیکە هەموویان لە بەندا بوون و دەست و پێیان بەسترابوو. شەرکان چاوێکی لە براکەی کرد و گوتی: 'براگیان، چۆن خۆمان ڕزگار کەین؟' زەوئولمەکان گوتی: 'کاکە، هیچ ڕێگەیەکم پێ شک نایە، وەک مەل کەوتووینە قەفەسەوە.' شەرکان وای ڕق هەستا و خۆی لە بەر یەک کێشاوە کە زنجیرەکانی پێی هەمووی پچڕپاند و ڕزگاری بوو. ئینجا هەستا و کلیەکانی لە گیرفانی پاسەوانەکان دەرهێنا و زەوئومەکان و وەزیر دەندان و ئەوانی دیکەی یەک بە یەک ئازاد کرد. پێی گوتن: 'دەڵێم هێندێکیان بکوژین و جلەکانیان لە بەر بکەین، با نەمان ناسنەوە.' زەوئولمەکان گوتی: 'ئەوە بیرۆکەیەکی باش نییە—سەگی نووستوو نابێ بەخەبەر بێنی. بەخەبەر بێن، هەموومان دەکوژن. وا چاکە لەو دۆڵە دەرباز بین.' هەموویان ئەوەیان پێ باش بوو.

"کە لە گەلووگەکە پەڕینەوە، سەیریان کرد ئەسپی لێیە بەستراونەتەوە و

---

١. باشار کردن: دەرەقەت هات.

خاوەنەکانیشــیان خەوتوون. شــەرکان گوتی: 'دەبێ هەر کام لە ئێمە یەکێک لەو ئەســپانە بەرین.' ئیدی هەر کامیان ئەســپێکیان برد و بە ڕەحمی خودا کەســیان وە خەبەر نەهات. شــەرکانیش بە ئەندازەی پێویســت چەکوچۆڵی کۆ کردەوە و، ســواری ئەسپەکان بوون و کەوتنە ڕێ. لە ڕێیەدا شــەرکان گوتی: 'ئیدی مەترسن، خودا سرِی ئێمەی شــاردەوە، بەڵام من شــتێکم بە زەین گەیشــتووە، ڕەنگە باش بێ. ئەویش ئەوەیە دەڵێم بچینە ســەر ئەو کێوە هەموو پێکەوە بڵێین ئەڵڵاهوئەکبەر و بەســـــەریاندا بگوڕێنین و بنەڕێنین کە 'ئەی کافرەکان ئەوە سوپای ئیسلام دەوری داون.' ئیدی هەموو ڕادەپەڕن و لەبەر مەستی و بێهۆشییان و لە ترســـان تێک دەگلێن و دەکەونە گیانی یەکتر.' زەوئولمەکان گوتی: 'ئەوە بیرۆکەیەکی چاک نییە، بێدەنگ بڕۆین بۆ لای سوپاکەی خۆمان لە هەمووی باشترە. ئەگەر بەخەبەریان بێنین، دەڕژێنە ســەرمان و تاقمان دەرناچین.' شــەرکان گوتی: 'بە خودا ئەگەر بەخەبەریش بێن، من ترسم نییە و پێم خۆشە ئێوە بە قسەم بکەن.' ئیدی هەموویان هاتنە سەر قسەی شــــەرکان و چوونە ســــەر کێوەکە و یەک بە خۆیان بە دەنگێکی بەرز هاواریان کرد: 'ئەڵڵاهوئەکبەر!' دار و بەرد و شاخ و کێو دەنگی داوە و دنیای لەرزاند."

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هــات و شــــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە موسولّمانەکان لە کێوەکەڕا نەڕاندیان: 'ئەڵلاهوئەکبەر!' کافران بە دەنگی ئەوان وە خەبەر هاتن و دەستیان دا چەک و شیر و تا بەیانی کەوتنە گیانی یەکتر. بەیانی کەوتنە سۆراغی دیلە موسولّمانەکان و نەیاندیتنەوە. سەدارەکەیان گوتی: 'ئەو کارە ئەو دیلانە بە ئێمەیان کرد. بکەونە سەریان با بیانگیرنەوە.' ئیدی سوپای کافران سوار بوون و کەوتنە سەریان هەتا گرتنیاننەوە. زەوئولمەکان کە ئەوانی دیت، گوتی: 'ئەوە ئەو ڕۆژەیە من لێی دەترسام. ئیستا جگە لەوەی دەبێ بە گیان و دڵ شەڕ بکەین، ڕێگەیەکی دیکەمان لەپێشدا نەماوە.' ئیدی بە 'ئەڵلاهوئەکبەر! ئەڵلاهوئەکبەر!' لە کێوەکە هاتنە خوارێ. لەو جەنگەیەدا دەنگی ئەڵلاهوئەکبەر و سلاو لە بەشیر و نەزیر لە دوورەوە دەهات. کە جوان سەرنجیان دایە، سوپای موسولمانان و دلێرانی یەکتاپەرستان بوو. کە ئەوان گەیشتنێ، بەهێز بوونەوە و شەرکان بە 'ئەڵلاهوئەکبەر! ئەڵلاهوئەکبەر!' پەلاماری دان. سوپای کافران لە بەر یەک هەڵوەشا و تەفروتوونا بوو. سوپای ئیسلام هەتا کاتی شێو هەر بە شمشێر خەریکی کوشت و کوشتار بوون. کە بوو بە شەو، سوپای ئیسلام لە شوێنێک کۆ بوونەوە و ئەو شەوەیان بە خۆشحالّی ڕابوارد. کە ڕۆژ بووەوە، سەیریان کرد ئەوە بەهرامی فەرماندەی تورکان و ڕۆستەمی فەرماندەی دەیلەمان بە بیستهەزار پیاوی چالاک و نەترسەوە هاتوون. هۆی هاتنەکەشیان ئەوە بوو، کاتێک ئەمیر بەهرام و ئەمیر ڕۆستەم لەگەڵ پەردەداری دیمشق گەیشتنە قوستەنتەنییە، سەیریان کرد ئەوە تۆشە و ئازووقە و پاشەکەوتی پێویست و سوپایێکی زۆریان بردووەتە نێو قەلا و لە هەموو لایەکەوە لەسەر بورجەکانی قەلا چاودێریان داناوە.

"کاتێک سوپای ئیسلام گەیشتێ و ئەو تەیاری و سازییەی دیت، ئەمیری تورک و ئەمیری دەیلەم گوتیان: 'وەلا ئێمە دەرەقەتی ئەو سپا لەژمارنەهاتوو و تەیارە نایەین. وا چاکە خۆمانیان لێ نەدەین. بە تایبەت ئەگەر بزانن کە شەرکانپاشا و زەوئولمەکانپاشا و وەزیر دەندانمان لەگەڵ نییە، ئەوە بەسەرماندا زاڵ دەبن و هەمووومان تێدا دەچین. سەلاح لەوە دایە؛ ئێمە یەکی دەهەزار سوار هەڵگرین و بەرەو ئەو مێزگزارەی نزیکی دێرەکە بچین.' ئەمیر دەیلەم ئەو بیرۆکەیەی پێ باش بوو. هەستان یەکی دەهەزار سواری چاکیان هەڵبژارد و چوون بۆ لای دێرەکە. ئەوە بوو هۆی هاتنی ئەوان بۆ دێرەکە.

"زاتوددەوابیش کاتێک زەوئولمەکان و وەزیر دەندانی پێوە کرد. سواری ئەسپێک بوو، گوتی: 'ئەوە دەچم بۆ قوستەنتەنییە بەشکو لەوێ فلێک ساز کەم و بە سوپای ئیسلام بلێم کە شەرکانپاشا و زەوئولمەکانپاشا و وەزیر دەندان بە دیل گیراون، ئیدی سوپاکەیان

لەبەریەک هەڵدەوەشــێ. ئەودەم ئافریدوونپاشــا و حەردووبپاشــا ئاگادار دەکەمەوە کە ســوپاکەیان بێننە دەرێ و موســوڵمانان تارومار بکەن و قڕیان تێ بخەن. ‹ئەو گڵاوە هەتا بەیانی بە ڕێوە بوو. کە ڕۆژ بووەوە و ســـوپای بەهرام و ڕۆســــتەم وەدەر کەوتن. ئیتر هەڵاتە نێو قامیشــەڵانێک و ئەســـپەکەی لەوێدا بەســـتەوە و بۆخۆی هاتە دەرێ و گوتی: ‹ڕەنگە ســوپای ئیســلام بێ و لە قوستەنتەنییە شکستی خواردووە و واوە هەڵاتوون.› کە نزیک بوونە، دیتی ئالاکانیان ســەرەوبن نین. زانی کە شــکســتیان نەخواردووە و ئاگاداری بەدیلگیرانی پاشــایش نین. ئیدی بە پرتاو بەرەوڕوویان هەڵات، پێی گوتن: ‹ئەی ســـوپای خودا! خێراکەن خۆتان بگەیەننە براکانتان و لە دژی ئەو کافرانە جیهاد بکەن.› بەهرام هەر کە ئەوی دیت، لە ئەسپەکەی دابەزی و کڕنۆشی بۆ برد، گوتی: ‹ئەی پیاوی خودا! دەنگ و بـاس چییە؟› ئەو گڵاوە گوتی: ‹لە بەختی ئێمە، کـاتێـک مـاڵەکەمـان لە دێر هێنـا و لە وڵاخەکانمان دا و لە کێوەکە هاتینە خوارێ بێین بەرەو قوســـتەنتەنییە، لە پڕدا بەســــەر بۆســــەی ســـوپای کوفردا کەوتین. ئیدی شـــتەکەی بۆ بەهرام گێڕاوە و بەهرامی تۆقاند. بەهرام گوتی: ‹زاهید! کەنگێ لێیـان جیـا بوویتەوە؟› پیرێژنی جـادووگەر گوتی: ‹هەر ئەو شـــەو لێیان جوێ بوومەوە.› بەهرام گوتی: ‹پەنا بە خوا، ئەی چۆن ئەو ماوەیەت بڕیوە لە کاتێکدا بە پێیان هاتووی و گۆچانێکیشـــت پێ نییە؟ پاشـــان گوتی: بەڵام ئەوە لە کەراماتی پیاوچاکی وەک تۆ بەدوور نییە.› دوای ئەوەی بەهرام ســواری ئەســپەکە بوو. ســەری لەو شتانە سووڕ مابوو کە ئەو جادووگەرە بۆی گێڕابووەوە. چوو لە فکرەوە و گوتی: ‹مخابن کە زۆرمان ڕەنج کێشــا و بەفیڕۆ چوو.› هەر وا بە ناچاری دەشــت و بێروونیان بڕی هەتا گەیشـــتنە داوێنی کێوەکە و لە کـازیوەی بەیـانـدا لەســـــەر کێوەکە بوون کە گوێیـان لە ئەڵڵاهوئەکبەر و تەلیلەی شـــەرکان و زەوئولمەکان بوو. ئیدی دەورەی کافرانیان دا، هەر وەک چۆن ســێڵاو دەوریان بگرێ. کە ڕۆژ بووەوە، لەبەردەمی شــەرکان و زەوئولمەکاندا چۆکیان دادا و کڕنۆشیان برد. ئیدی شەرکان زۆر خۆشحاڵ بوو، باسی نێو ئەشکەوتەکەی بۆ گێڕانەوە کە ئەوان سەریان سووڕ ما. ئیدی گوتیان: ‹با خێرا بڕۆینەوە بۆ قوستەنتەنییە، چونکە ســـوپاکەمان لەوێ بەجێ هێشـــتووە و نیگەرانیانین.› ئینجا نێوی خودایان هێنا و بەرەو قوستەنتەنییە کەوتنە ڕێ، زەوئولمەکان ورەی وەبەر سوپای ئیسلام دەنا:

ئیماندارانی هاوڕێم، ڕوژی شـــــــــــەڕ و غەزایە
تـا ئەو شـــــوورەیە نەبـڕیـن نـاگەڕێـینەوە دوایە
ئەو کوێلانە شـــەڕ دەکەن، خۆشـــیان نازانن بۆ چی
تەنیا مەبەســتی ئێـــــــــــــمەش ڕەزایەتی خودایە

ئەوجار لەگەڵ شـــەرکان بە بۆنەی ســـلامەتیانەوە پیرۆزباییان لێک دەکرد و بە لەز

دەڕۆیشتن."

که گەیشــتە ئێرە بوولێڵەی بەیانی بوو، شــەهرزاد کۆتای بەمبەشــەش هێنا و درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، براکان بە بۆنەی سلامەتیانەوە پیرۆزباییان لە یەکتر کرد و زۆر بە لەز بەرەو قوستەنتەنییە غاریان دا. با ئەوان برۆن بۆ قوستەنتەنییە.

"پیرێژنی گڵاو، زاتوددەوایی، دوای ئەوەی ئەوانەی بە بەهرام و ڕۆستەم گوت، بۆخۆی گەڕاوە بۆ بێشـــەڵانەکە. ســـواری ئەســـپەکەی بوو خۆی گەیاندە ئەو موســـوڵمانانەی کە دەوری قوستەنتەنییەیان دابوو. لە ئەسپەکەی دابەزی و چووە خێوەتی پەردەدار. پەردەدار کە ئەوی دیت، لە بەری هەســـتا و ســـڵاوی لێ کرد. پێی گوت: 'بۆم بگێرەوە چ بووە؟' ئەو حیلەبازە هەواڵی تۆقێنەر و دڵتەزێنی ساز کرد و بۆی گێڕاوە: 'من زۆر نیگەرانی بەهرام و ڕۆســـتەمم، چونکە ئەوان بیســـتهەزار ســـواریان پێیە، لەبەرابەردا کافران دەریایەکن و دەترسم هەموویان تێدا چن. ئەمن ویستم تۆش ئاگادار بکەمەوە ئەگەر خۆیان نەگەیێنی و فریایان نەکەوی، تاقیان دەرناچن.'

"کە پەردەدار ئەو قســـانەی بیســـت، دنیای لە بەر چاو تاریک بوو و دەســـتی کرد بە گریـان. زاتوددەوایی پێی گوت: 'یـارمەتیتـان لە خودا بێ. لە ڕۆژی تەنـاگـانەدا ئـارام و لەســـەرخۆ بن. چاو لە ڕابردووانی ئۆمەتی محەممەد، درووود و ســـڵاوی خودای لێ بێ، بکەن. خۆت دەزانی لە بەهەشـتدا کۆشـکگەلێکی زۆر بۆ شـەهیدا چێ کراون. مردن لەپێش هەمووشمانە، بەڵام چ باشتر کە شـەهید بین.' کە پەردەدار ئەو وتانەی بیست، بانگی برای ئەمیر بەهرامی کرد و دەهەزار سواری هەڵبژاردەی دایە و ناردی بۆ یارمەتی پاشا. ئەوان ئەو ڕۆژە هەتا شەو ڕۆیشتن، ڕۆیشتن و شەویش ڕانەوەستان. کە ڕۆژ بووەوە، شەرکان تۆزێکی لە دوور دیت و گوتی: 'ئەو تۆزە زۆرە، بێتوو نەبێت ئەو سوپایە بەرەو ئێرە دێ. ئەگەر لە لایەن موســـوڵمانانەوە بێت، ئەوە هاتە و بەخێر بێ. ئەگەر لە لایەن کافرانیشـــەوە بێ، ئەوە لەگەڵ چارەنووس هیچ ناکرێ.' دوای ئەوە چووە لای زەوئولمەکانی برای و پێی گوت: 'هیچ مەترســـە، من خۆم فیدای تۆ دەکەم. ئەگەر ســـوپای ئیســـلام بێ، ئەوە حەجی دووبارە حەجە و ئەگەر هی کوفر بێ، ئەوە چار نییە، دەبێ بەشەڕ بێین. بەڵام پێش ئەوەی بمرم، ئاواتەخوازم جارێکی دیکە زاهید ببینم، دۆعام بۆ بکا کە شـــەهید بم.' ئەو دوو برایە لەو قســـانەدا بوون کە ئاڵا و هێماکانی ئیســـلام وەدەر کەوتن. شـــەرکان هەرای کردنێ و هەواڵی ســـوپای ئیســـلامی لێ پرســـین. وەڵامیان داوە کە ســـوپای خودا هەموو ســـاخ و ســـڵامەتن، ئێمە بۆ یارمەتی ئێوە هاتووین. ئیدی ســـەرۆکی ســـوپا لە ئەســـپەکە دابەزی و ئاوزەنگی پاشای ماچ کرد. پاشا لێی پرسی: 'ئێوە چۆناوچۆن هەواڵی ئێمەتان زانی؟' گوتی: 'دوێنێ زاهید ئێمەی ئاگادار کردەوە و لە ڕێگا تووشـــی ڕۆســـتەم و بەهرامیش بووو،

ناردبوونی بۆ لای ئێوە. زاهید دەیگوت: 'کافران دەوری سوپای ئیسلامیان داوە و هێزەکانی کافران زۆر لە هی موسوڵمانان زیاترن.' ئەمن شتەکە وا نابینم و بە پێچەوانەی قسەی زاهیدەوە ئێوە بە سەرکەوتووی دەبینم.' لە سەرۆکیان پرسی: 'زاهید چۆن هاتە لای ئێوە؟' گوتی: 'بە پێیان لە شەو و ڕۆژێکدا ڕێگای دە ڕۆژی بڕی بوو. گومانی تێدا نییە کە زاهید پیاوی خودایە. ئێستا ئەو لە کوێیە؟' گوتی: 'ئەومان لە نێو سوپای ئیسلام بەجێ هێشت هەتا ئەوان بۆ شەڕ هان بدا.' شەرکان دڵخۆش بوو، لەبەر سلامەتی سوپای ئیسلام و لەشساخی زاهید شوکری خودای کرد.

"دوای ئەوە بەرەو قوستەنتەنییە وەڕێ کەوتن و هەر وا دەڕۆیشتن کە تۆزێک لە دوورەوە دیار کەوت و بەری ئاسمانی گرت و ڕۆژی ڕوونی وەک شەو تاریک کرد. شەرکان گوتی: 'نیگەرانی ئەوەم کە ئەو تەپوتۆزە هی تێکشکاوەکانی سوپای ئیسلام بێ.' چەند کەسی چالاکی نارد بۆ لای تۆزەکە بزانن چ باسە. سەیریان کرد هەر ئەو زاهیدەیە. هەڕایان کردێ دەستیان ماچ کرد. ئەو گازی کردن: 'ئەی ئۆمەتی باشترین بوونەوەران! ئەی سوپای ئیسلام! خێرا کەن کافران پەلاماری خێوەتەکانی موسوڵمانانیان داوە؛ فریایان کەون.' شەرکان کە ئەوەی بیست، لە ناڕەحەتیان کەوتە دڵەڕاوکێ و دابەزی دەست و لاقی زاهیدی ماچ کرد. زەوئولمەکان و سوپاکەش هەر وا، بێجگە لە وەزیر دەندان کە لە ئەسپەکەی دانەبەزی و دەیگوت: 'ئەو زاهیدە وەبەر دڵم ناکەوێ و هێندەم ئەو نەسیحەتکار و تەرکەدنیا و زاهید و شتە بە فێڵبازی و دەغەڵی دیوە، باوەڕی پێ ناکەم. لەوە گەڕێن فریای موسوڵمانان کەون.' شەرکان گوتی: 'لێی دڕدۆنگ مەبە، مەگەر نەتدی سوارەکانی هان دەدا بۆ شەڕ و لە شیر و تیریش نەدەترسا؟ قەت قسەی ناحەزی پێ مەڵێ. ئەگەر خودا ئەوی خۆش نەویستبا، ئەو ڕێگە دوورەی بە پێیان لەو ماوە کورتەدا نەدەبڕی.' پاشان شەرکان گوتی: 'ولاخێک بۆ زاهید بێنن با سوار بێ.' گوتی: 'زاهید سوار بە.' ئەو سوار نەبوو و گوتی: 'ئەمن پێویستیم بەوانە نییە.' بەڵام ئەو لە بیر فێڵ و کەڵەکی خۆیدا بوو بۆ ئەوەی بە ئاوات بگا. ئەوانیش نەیاندەزانی کە کارەکانی هەمووی لە ڕووی نەخشە و بەرنامەوەیە. شاعیر لە پەسنی وەها گڵاوێکدا دەڵێ:

که به قسەی ئەو کۆمەڵە ڕیاکارانەت کرد
لە پێناو خواردنەکانی بەهەشتا سوژدەت برد
ئەو نوێژ و ڕۆژووە بە هیچ کوێت ناگەیێنێ
دەست هەڵگرە لێی، هیشتێک ئەوەندە ناهێنێ

"ئیدی زاهید پێبەپێی سوپا دەڕۆیشت و ئایەتی دەخوێندەوە هەتا گەیشتنە سوپای ئیسلام. شەرکان سەیری کرد ئەوە پەردەدار و سوپا هیچ ورەیان نەماوە و خەریکن ڕا

دەکەن.“

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، شەرکان سەیری کرد ئەوە پەردەدار و سوپای ئیسلام بە تەمان هەڵێن. هۆی ئەو پێملبوونەش ئەوە بوو، ئەو گڵاوە، واتە زاتوددەوایی، دوای ئەوەی زانی ڕۆستەم و بەهرام بە بیستهەزار سوارەوە چوون بۆ لای شەرکان، بە فێڵ هاتە نێو سوپای ئیسلام و ئەمیر ترکاشی برای بەهرامی، هەر وەک لەپێشدا باسمان کرد، بە دەهەزار سوارەوە ناردە لای شەرکان. مەبەستی ئەوە بوو کە سوپای ئیسلام پەرەمپەرەم بکا و لە بەر یەکی بڵاو بکا. دوای دەچێ بۆ قوستەنتەنییە و لەوێ بانگی ڕۆمییەکان دەکا و دەڵێ: 'پەتێک شۆڕکەنەوە تا نامەیەکتان بۆ بەڕێ دەکەمە سەرێ. بیدەن بە ئافریدوونپاشا با لەگەڵ کوڕەکەم بیخوێننەوە و بەپێی ئەو نامەیە بجووڵێنەوە.' ڕۆمییەکان پەتیان بەر داوە. نامەکەی لە پەتەکە بەست و ناردییەوە سەرێ. نێوەرۆکی نامەکە ئاوا بوو: 'ئەوە نامەیەکە لە زاتوددەواییەوە بۆ ئافریدوونپاشا. ئاگادار بن کە ئەمن کڵاوێکم لەسەر موسوڵمانان ناوە و پاشا و وەزیرەکەیانم لێ بە دیل گرتوون. دوایە هاتمەوە نێو سوپا و ئەوانم لەو ڕووداوە ئاگادار کردەوە. ئیدی ورەیانم شکاند. فریوم دان و زیاتر لە دوازدەهەزار سوارم بە ئەمیر ترکاشدا بۆ لای بەدیلگیراوەکان بەڕێ کرد. ئێستا جگە لە تاقمێکی کەم، کەسی لێ نەماوە؛ بە هەموو سوپاکەتانەوە وەرنە دەرێ و هێرشیان بکەنە سەر و هەموویان بکوژن. مەسیحتان لە پشتە و خەمتان نەبێ. دەبێ ئەو کارانەی منیش لە بیر نەکەن، تەواو.'

"کاتێک نامەکە گەیشتە دەست ئافریدوون، دڵی خۆش بوو. لەڕێوە بانگی پاشای ڕۆم، کوڕی زاتوددەوایی کرد و نامەکەی بۆ خوێندەوە. ئەویش دڵخۆش بوو، گوتی: 'چاو لە فێڵ و کەڵەکی دایکم بکە کارێکی کردووە، پێویستیم بە شمشێر نەبێ.' ئیدی کاتێک ئافریدوونپاشا فەرمانی دا سوپا بڕواتە دەرێ، سوپای مەسیحیان هەموو بە شیری ڕووتەوە و بە سروودی تایبەتی خۆیانەوە چوونە دەرێ. پەردەدار کە ئەوەی دیت، گوتی: 'ڕۆمییان زانیویانە کە پاشا و سەردارمان لەگەڵدا نییە وا نەترسانە هێرشمان بۆ دێنن.' ئیدی ڕقی هەڵسا و قاوی سوپای ئیسلامی کرد و گوتی: 'ئەگەر هەڵێن، هەموو دەکوژرێن. ئەگەر خۆراگر بن، سەر دەکەون و یارمەتیمان بۆ دێ.' ئینجا سوپای ئیسلام دەستیان کرد بە ئەڵڵاهوئەکبەر و ئاشی شەڕوشووڕ دەستی پێکرد و شمشێر و ڕمب و زەرگ کەوتنە کار. سێڵاوی خوێن لە هەموو لایەکەوە هەستا. شەڕ بەردەوام بوو هەتا بوو بە شەو و تاریکی باڵی بەسەر زەویدا کێشا. کافران سوپای ئیسلامیان گەمارۆ دابوو.

"کازیوەی بەیانی، پەردەدار بۆخۆی سوار بوو و فەرمانی سواربوونی سوپای دا و

هیوای ســــەرکەوتن بە یارمەتی خودای وەبەر نان. ئیدی دوو لایەن بە گژ یەکدا چوون و شــەڕ دەســتی پێکرد. هەر ســوار بوو لەســـەر زین فڕێ دەدرا و بەبێ ســـەر دەتلاوە. هەر سەر بوو بەبێ سوار فڕکەی دەکرد. سوپای موسوڵمانان کشابوونەوە و ڕۆمییان دەستیان بەسەر خێوەتەکانیاندا گرتبوو. موسوڵمانان بە تەما بوون هەڵێن کە لەو جەنگەیەدا شەرکان بە ســوپایەکەوە و بە ئاڵا و هێمای ئیســلامەوە پەیدا بوون. هێرشــیان کردە ســەر کافران. هەروەها زەوئولمەکان و وەزیر دەندان و بەدوای ئەوانیشدا ئەمیر بەهرام و ئەمیر ڕۆستەم پەلاماریان دان و کشــاندیاننەوە. موســوڵمانان لە شــوێنێک کۆ بوونەوە. شــەرکان چاوی بە پەردەدار کەوت، دەســـــتخۆشـــــی لێ کرد بۆ ئەو بەربەرەکانی و خۆڕاگریەی کردبوویان. موسوڵمانان خۆشحاڵ بوونەوە و تین و گوڕیان هاتەوە بەر و هێرشیان کردە سەر دژمن. کە کافران ئاڵای محەممەدیان دیت، خۆیان بۆ مردن ســـاز کرد و دەســـتیان شــل بووەوە. هاواری قەشـــەی دێرەکانیان دەکرد[1]، هەروەها هاواری ئینجیل و مریەم و خاچیان دەکرد. ئافریدوونپاشا ڕووی لە حەردووبپاشا کرد و گوتی: 'یەکمان لە ڕاست و یەکمان لە چەپ دەبین.' پاڵەوانێکی نەترس و ئازا بە ناوی لاویا ڕووبەڕوویان وێستا و ڕیزەکانی ڕاســت و تەکووز کرد.

"شـــەرکانیش بە زەوئولمەکانی گوت: 'کافران بە تەمان بەربەرەکانی بکەن و ئەوەش گەورەترین ئاواتی ئێمەیە. بەلام دەمەوێ من لە نێوەڕاســـــتی ســـــوپا و وەزیر دەندان و ڕۆســـتەم لە لای چەپەوە و تۆ و بەهرامیش لە لای ڕاســتەوە بن. بەڵام تۆ، پاشــای گەورە، لەژێر ئاڵاکاندا ڕاوەســتە، چونکە تۆ کۆڵەکەی ئێمەی و ئێمە پشت بە تۆ دەبەستین و تێکڕا گیانی خۆمانت بەخت دەکەین.' زەوئولمەکان ســپاســی کرد. لە پڕدا بوو بە هەراوهوریا و شـــیریان ڕاکێشـــا، وا بوو لەنێو جەرگەی دژمنەوە ســـواری هاتە دەرێ، کە هاتە پێشـــێ یەسترسوارێک بوو کە کورتانەکەی لە ئاوەریشم چێ کرابوو. بەرماڵێکی کاری کشمیری بەســەردا دابوو. ئەو ســوارە شــێخێک بوو کە ڕدێنێکی زۆر جوان و ڕواڵەتێکی بە شــکۆی بوو. عەبایەکی خوری سپی لە بەردا بوو. بە پەرتاو دەهات هەتا گەیشتە پێشەوە و گوتی: 'پەیامێکم بۆ هێناون. و ما علی الرســــول الا البلاغ.[2] ئێوە مۆڵەتم دەنێ پەیامەکەتان پێ ڕاگەیەنم.' شەرکان گوتی: 'پارێزراوی.' ئینجا شێخە دابەزی و خاچەکەی لە ملی دەرهێنا و لەبەردەمی پاشــادا وەک لیقەوماوان چۆکی دادا و بە کەنەفتییەوە دەســتی پێ کرد و گوتی: 'ئەمن نێردەی ئافریدوونپاشام. زۆرم بە ئافریدوون گوت کە با لە خۆڕا ئەو هەموو خەڵکە نەکوژرێ و لە جیاتی ئەوە دوو کەس حازر بن خۆیان بەختی ئەو خەڵکەی دیکە بکەن. ئەو بە قســەی منی نەکرد و گوتی: 'ئەمن حازرم گیانی خۆم بەختی ســوپاکەم بکەم. با پاشــای

---

١. هاوار لە کەسێک کردن: داوای یارمەتی کردن لە کسێک.

٢. واتە: 'پەیامبەریش جگە لە گەیاندنی پەیامەکەی هیچ ئەرکێکی دیکەی لەسەر نیە.'

موسـولمانانیش گیانی خۆی بەختی سـوپاکەی بکا. ئەگەر ئەو منی کوشـت، ئەوە سـوپای ئێمە لە بەر یەک هەڵدەوەشـێ، ئەگەر من ئەوم کوشـت، ئەوە سـوپای ئیسـلام لە بەر یەک هەڵدەوەشێ.' '

"کاتێک شەرکان ئەو قسەیەی بیست، گوتی: 'راهیب، ئەوە ئێمەش ئەوەمان قەبووڵ کرد و ویژدانیش هەر ئەوەیە. ئێستا من دێم بۆ ملبەملە و ئەویش خۆی ساز کا بۆ شەڕ. ئەگەر ئەو منی کوشـــت، ئەوە موســـولمان جگە لە هەلاتن چ رێگایەکی دیکەیان بۆ نامێنێتەوە. راهیب، تۆ بچووەوە بۆ لای ئەو، پێی بڵێ سـبەینێ ئێمە شـەڕەکەمان دەسـت پێ دەکەین، چونکە هێشـتا ماندوویێتی رێگەم هەر لە لەشـدا ماوەتەوە.' ئیدی راهیب بە خۆشـحاڵییەوە گەڕاوە و ئافریدوونپاشا و حەردووبپاشا ئاگادار کردنەوە. ئافریدوونپاشا خەمی لە دڵدا نەما و زۆر خۆشـحاڵ بوو. بە خۆی گوت: 'قسـەی تێدا نییە کە ئازا و نەترسـەکەی ئەوان شەرکانە. کە ئەو بکوژم، ئیسلام شکست دەخوا و هێزیان نامێنێ.' هەرچەندە زاتوددەوایی ئافریدوونپاشـای ئاگادار کردبووەوە کە شـەرکان سـوارێکی ئازا و نەترسـە و کەس تای ناکا. بەڵام ئافریدوونپاشـا ئازا و نەترســـترین پاڵەوانی زەمانی خۆی بوو. هەموو جۆرە شـارەزای و فێڵێکی شـەڕی دەزانی و باوەڕێکی زۆری بە خۆی بوو. دەیزانی کەس ناتوانێ شـان لە شـانی بدا. هەر بۆیە بە بیسـتنی قسـەکانی راهیب خۆشـحاڵ بوو. ئەو شـەوە تا بەیانی تەواوی کافران دڵخۆش بوون. کاتێک رۆژ بووەوە، دوو لایەن رووبەڕووی یەکدی ریز بوون و ئامادەی شـەڕ بوون. لە ناکاو سوارێک هاتە گۆڕەپانی شـەڕەوە کە ئەسـپێکی کێوئاســـای لەبن دا و شـــمیشـــری یەمەنی بە قەدەوە بوو. ئیدی دەمامکەکەی لەســـەر روخســـاری لا برد و گوتی: 'ئەوەی من ناناســـێ، بزانێ من ئافریدوونپاشـــام.' هێشـــتا قســـەکانی تەواو نەبیوون کە ســـوارێک لە لای ســـوپای ئیســـلامەوە هاتە گۆڕەپانەکەوە ئەسـپێکی بۆری فیلئاسـای لەبندا بوو. شـیرێکی هیندی بە کەمەرەوە بوو. ئینجا ئەسپەکەی بەڕێ کردەوە بۆ نێو ریزی سـوارەکان و هەرای ئافریدوونپاشـای کرد و گوتی: 'گلاو، تۆ پێت وایە منیش وەک ئەو سوارانە وام کە دیوتن و لە گۆڕەپانی شەڕدا تخلت کردوون؟'

"ئیدی هەردووکیان هێرشیان بۆ یەکتر برد و وەک دوو کێو خۆیان لێک دەدا و چەشنی دوو دەریا بە سـەری یەکتردا دەڕژان. لێک دوور دەکەوتنەوە، خۆیان پێکدا دەدا و پێکەوە دەنووســـان و لێک جوێ دەبوونەوە. تانەیان لێک دەدا و رێک دەکەوتن. لە بەر یەک هەڵدەهاتن. خەڵکەکەش، یەک دەیگوت شـــەرکان ســـەر دەکەوێ و ئەوی دیکە دەیگوت ئافریدوون ســـەر دەکەوێ. ئەو دەیگوت ئەو ئازاترە و ئەوی دی دەیگوت ئەویتر ئازاترە. ئەوان بەردەوام ملبەملە و پاڵەوپەستۆیان بوو. بەو شـێوە ئەو رۆژە تا رۆژئاوابوون هەر ملەیان بوو. کاتی شێو هات. ئینجا ئافریدوونپاشا هەرای شەرکانی کرد و گوتی: 'بە حەقی دینی مەسیح و باوەڕی راست، تۆ بێبەڵێن و فێڵزانی و ئاکاری باشت نییە؛ سـوارەکانت بە

تەمان ئەسپەکەت بۆ بگۆڕن و ئەسپێکی دیکەت بۆ بێنن. ئەگەر دەتەوێ لەگەڵ من ملبەملە بکەی، نابێ چەک و ئەسپەکەت بگۆڕی تا ئازا و خوێڕی دیاری بدا.'

"شـــەرکان کە گوێی لەو قســـەیە بوو، تووڕە بوو و ڕووی لە ســـوارەکانی کرد کە بڵێ ئەسپی دیکەم بۆ مەهێنن. کە لەپڕدا ڕمبەکەی سووڕاند و هاوێشتی بۆ شەرکان. شەرکان کە ئاوڕی داوە و چاوی لە ســوپاکەی خۆی کرد، ئەســـپ و شـتی نەدی و زانی ئەو گڵاوە فریوی داوە. بەلەز بەرەو ئافریدوون وەرسووڕا، کەچی ڕمبەکە لەسەر سنگی شەرکان درا و سینگی بریندار کرد. شەرکان هاوارێکی کرد و بێهۆش بوو. سەری وە قەڵپۆزی زینەکەی کرد. کاتێک ئافریدوون زانی کە شەرکان ئەنگاوە، گازی سوپاکەی کرد و بە خۆشحاڵییەوە هەواڵی کوژرانی بە کافران دا. ئیدی ڕۆمییان دەستیان کرد بە شادمانی. موسوڵمانانیش بە شـین و ڕۆڕۆ. کە زەوئولمەکان براکەی ئاوا دیت، سـواری ناردنە ســەری. یەکەم کەس کە گەیشتە سەری، وەزیر دەندان بوو. ئیدی جەنگاوەران چوون شەرکانیان هێناوە. کافرانیش هێرشیان کردنە سەر و هەردوو لا پێک هەڵپرژاند. ئیدی ڕیزی سوپاکان شێوا."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، یەکەم کەس کە گەیشتە سەر شەرکان، وەزیر دەندان بوو. دوایەش ئەمیر بەهرام و ئەمیر ڕۆستەم. شەرکانپاشا کە لەسەر ئەسپەکە شۆڕ ببووەوە، گرتیانەوە و هێنایانە لای زەوئولمەکانپاشا و خۆیان گەڕانەوە بۆ شەڕ. ئاگری شەڕ جار لەگەڵ جار چاکتری پەرە دەسـتاند و دوو لا زیاتر ڕقی تۆڵەیان هەڵدەسـتا. زەوی لە خوێندا وەک دەریای عوممانی لێ هاتبوو. هەتا بوو بە نیوەشـەو، ئیدی لایەنەکان شـەکەت بوون و بۆخۆیان لێک بوونەوە. هەرکەسـەی گەڕاوە بۆ نێو خێوەتەکانی خۆیان. کافران دەوری ئافریدوونپاشایان دا و کوڕنۆشیان بۆ برد و ڕاهیباتنە لای و دەستخۆشیان لێ کرد. دوای ئەوە ئافریدوونپاشا چووەوە نێو قوستەنتەنییە و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشت. پاشای ڕۆم چوو بۆ لای و گوتی: 'مەسـیح یارمەتی دای و بازووی تۆی بەهێز کرد و دۆعاکانی دایکە پاکەکەی منی بۆ تۆ قەبووڵ کرد. تازە دوای شـەرکانپاشـا سـوپای ئیسـلام خۆی ناگرێ.' ئافریدوونپاشا گوتی: 'بەیانی کە چوومە گۆڕەپان، زەوئولمەکان دەکێشمە شەڕەوە و بانگی دەکەمە مەیدان و دەیکوژم. ئیتر شەڕی ئێمە و ئاوان تەواو دەبێ و سوپای ئیسلام شکست دەخوا.' ئافریدوونپاشا خەریکی ئەو قسانە بوو.

"بەڵام سـوپای ئیسـلام و زەوئولمەکان کاتێک بۆ تاوڵەکانیان گەڕانەوە. زەوئولمەکان سـەیری کرد براکەی حاڵی باش نییە. بانگی وەزیر دەندان و ڕۆسـتەم و بەهرامی کرد. کە ئەوان هاتن، نۆشـدارەکانیشـیان هێنا تیماری کەن. لەسـەر شـەرکانپاشـا دەگریان و ئەو شـەوە هەتا بەیانی ئەوە حاڵیان بوو. لای بەیانی زاهید بە گریانەوە هات. زەوئومەکان کە ئەوی دیت، لە بەری هەستا و دەستی گرت و بە لەشـی شـەرکانیدا هێنا. ئەویش تا بەیانی چەند ئایەتی قورئانی لەسـەر خوێندەوە. کە تاو هەڵات، شـەرکان وە هۆش هاتەوە و چاوی هەڵێنا و قسـەی کرد. زەوئولمەکان خۆشـحاڵ بوو، گوتی: 'دۆعای زاهید کاری خۆی کرد.' ئیدی شـەرکان تەواو وە قسـە هات و گوتی: 'شـوکور بۆ خودا ئێسـتا زۆر باشـترم. ئەو گڵاوە فێڵی لێ کردم. ئەگەر من وەک تیشک خۆم لا نەدابا، ڕمەکەی لە سنگم هەڵدەچەقی و بە پشـتەوەدا فڕێی دەدامە خوارێ. سـپاس بۆ خودا لە سـەگێتی ئەو ئەگڵاوەی ڕزگاری کردم. پێم بڵێن موسـوڵمانان چۆنن؟' زەوئولمەکان گوتی: 'ئەوان لە تاوی تۆ هەموو ناڕەحەتن.' شەرکان گوتی: 'من باشم، زاهید لە کوێیە؟' زاهید لەپشت سەری ڕاوەستابوو. زەوئولمەکان گوتی: 'زاهید لە پشـت سـەرت ڕاوەسـتاوە. چاوی لێ کە و دەسـتی ماچ کە.' زاهید گوتی: 'ڕۆڵە، هێمن و لەسـەرخۆ بە، چونکە پاداشـی هێمنبوون بە ئەندازەی سەختییەکەیەتی.' شەرکان گوتی: 'دۆعام بۆ بکە.' زاهید دۆعای بۆ کرد.

"کە ڕۆژ بووەوە، موسـولمانان خۆیان بۆ شـەڕ سـاز کرد و ڕۆیشـتنە گۆڕەپانەوە. کافرانیش خۆیان بۆ شـەڕ کۆک کرد. ئیدی زەوئولمەکان یەکسـەر بەرەو گۆڕەپان ئەسـپی تاو دا. وەزیر دەندان و پەردەدار و بەهرام لەنێو سوپا هاتنە دەرێ و گوتیان: 'ئێمە لە جێی تۆ دەچینە گۆڕەپان و گیان بەختی تۆ دەکەین.' زەوئولمەکان گوتی: 'بە بەیتولحەرام و زەمزەم و پێگە پیرۆزەکان سوێند دەخۆم! من دەست لە شەڕ لەگەڵ ئەو گلاوە هەڵناگرم.' ئیدی بۆی چووە شـەرگەوە و کەوتە هاتوچۆ. کە ڕووی لە لای ڕاسـت کرد، دوو فەرماندەی لێ کوشتن و ڕووی لە لای چەپ کرد، دوو فەرماندەی دیشی لەو لایە کوشت. ئینجا لە ناوەندی شەڕگە چەقی و گوتی: 'کوا ئافریدوون؟ هەتا شەربەتی ڕەزیلی دەرخوارد دەم.' ئیدی ئەو گەمارە بە شیری ڕووت و بە سواری ئەسپێکی ڕەش هاتە گۆڕرەپانەوە و پەلاماری یەکتریان دا. زۆریان هونەری شـەڕ نواند و یەکتریان هێنا و برد هەتا لە پڕدا زەوئولمەکانپاشا هەڕای کردێ و بە شیرێکی ئاودار سەری لە جەستەی کردەوە. هەر کە کافران ئەوەیان دیت، هەموویان پێکەوە هێرشـیان کرد. زەوئولمەکان بەرەنگاریان بووەوە و لەگەڵیان بە شەڕ هات. لە هەموو لایەکەوە خوێنی سوارە ئازاکان وەک سێلاو بە زەویدا دەڕۆیشت. سوپای ئیسلام دەستیان کرد بە ئەڵلاهووئەکبەر و لائیلاهەئیلەڵلا و سلاوات بۆ بەشیر و نەزیر. گڕی شەڕ لە دەروونیاندا بڵێسەی دەدا. بەدیهێنەری مەزن کافرانی شکست دا و موسولمانانی سەر خست. وەزیر دەندان بانگی موسولمانانی کرد: 'تۆڵەی نوعمانپاشا و شـەرکانپاشـا بکەنەوە.' ئینجا وەزیر سـەری بەرز کردەوە و قاوی ترکانی کرد. پاشـان بیسـتهەزار سـوار لەگەڵ وەزیر پێکەوە ڕژانە سـەر کافران. کافران جگە لە ڕاکردن ڕێگایەکی دیکەیان بۆ نەمابووەوە. پشـتیان لە سـوپای موسـولمانان کرد و تەقڵەکوت ڕایان کرد. موسـولمانان کەوتنە سـەریان. جا وەرە لێان دەن و بیانکوژن. هەتا کار گەیشـتە جێگایەک پەنجاهەزار سـواری کافران کوژرا و زیاتر لە پەنجاهەزاریش بە دیل گیران. تاقمێکی زۆریش لە دەروازەی شـار بە هۆی گوشـار و ئاپۆرەوە و ڕەوەوە وە بن پێ کەوتن و تێدا چوون. دوای ئەوە دەروازەی شاریان داخست و چوونە سەر بورجەکانیان. سـوپای ئیسـلامیش سـەربەرز و سـەرکەوتوو گەڕانەوە بۆ تاوڵ و خێوەتەکانیان. زەوئولمەکانپاشا چووە لای شەرکانپاشای برای و پیرۆزبایی ئەو سەرکەوتنەی لێ کرد. شەرکان گوتی: 'براگیان، ئێمە هەموو لەژێر کاریگەری دۆعای زاهیددایین. سەرکەوتنی ئێمە هی دۆعاکانی ئەو بوو، لە لای خودا قەبووڵ بوون، ئاخر ئەمڕۆ ئەو دانیشـتبوو دۆعای بۆ موسولمانان دەکرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، شـــەرکان گوتی: 'ســـەرکەوتنی ئێمە هی بەرەکەتی زاهید بووە کە لێرە لە لای من دۆعای سەرکەوتنی بۆ سوپای ئیسلام دەکرد. هەرکە دەنگی ئەڵلاهوئەکبەرم بیســت، دڵم خۆش بوو و زانیم بەســەر دژمندا زاڵ بوون. ئێســتا بۆم بگێڕەوە بزانم حاڵت چۆن بوو.' ئیدی زەوئولمەکان بۆی گێڕاوە و هەواڵی کوژرانی ئافریدوونپاشـــای دایێ. شەرکان دەستخۆشی لێ کرد و سپاسی ئەو چالاکیانەی کرد.

"کاتێک زاتوددەوایی لەوێ گوێی لە هەواڵی کوژرانی ئافریدوونپاشـا بوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و چاوی پڕ بوو لە فرمێســک. بەڵام وە ســەر خۆی نەهێنا و گوتی: 'لە خۆشـیان گریـانم دێ.' لە دڵی خۆیـدا گوتی: 'قەســـەم بە مەســـیح! ئەمن هیچ نەبم، ئەگەر دڵی زەوئولمەکان بە کوشتنی ئەو شەرکانە نەتەزێنم.'

"وەزیر دەندان و پەردەدار و زەوئولمەکان دەوا و دەرمـانیـان بۆ شـــەرکان هێنا و شـــەربەتیان دایێ و تەواو چاک بووەوە. ئامادەبووان هەموو دڵخۆش و شـــاد بوون و ســـوپاشـــیان لەو هەواڵە خۆشـــە ئاگادار کردەوە. ســـوپاش خۆشـــحاڵ بوون. دوای ئەوە شـــەرکان پێی گوتن: 'ئێوە ئەمڕۆ لە شـــەڕدا زۆر ماندوو و شـــەکەت بوون؛ هەرکەســـەی بچێتەوە جێگای خۆی و بحەســـێنەوە.' بە قســـەیان کرد و هەرکەســـەی چووەوە شـــوێنی خۆی. لە لای شـــەرکان جگە لە چەند غوڵام و زاتوددەوایی جادووباز، کەســـی لێ نەمابوو. کاتێک غوڵامەکان خەوتن، زاتوددەوایی نەخەوتبوو و چاوێکی لە شـــەرکان کرد. ئەویش لە خەوی شـــیریندا بوو. هەســـتـا خەنجەرێکی ژەهراوی هێنا کە ئەگەر لە بەردت دابایە، دەیکوڵاند. چووە سەر سەری شەرکان و سەری بڕی. زۆر چالاکانە سەری کۆیلەکانیشی بڕی. ئینجا چوو بۆ لای تاوڵەکەی زەوئولمەکان، دیتی پاســـەوانەکانی بە خەبەرن. لەوێوە چوو بۆ تاوڵەکەی وەزیر دەندان کەچی ئەویش خەریکی قورئانخوێندن بوو. وەزیر چاوی پێی کەوت: 'سـڵاو لە خواناس و زاهید!' کە پیرێژنە ئەو قسـەیەی لە وەزیر بیسـت. ترسـی ڕێ نیشـت و دڵی وە لێدان کەوت. گوتی: 'بۆیە هاتم، گوێم لە دەنگی قورئانخوێندنی یەکێک لە پیاوچاکان بوو، دەچم بۆ لای ئەو.' وەزیر لە دڵی خۆیدا گوتی: 'وەڵلاهی ئەو شەو دوای ئەو زاهیدە دەکەوم.' ئیدی هەســـتا و دوای کەوت. کاتێک ئەو گەمارە زانی ئەوە وەزیر دوای کەوتووە، لە ئاشـــکرابوون و ئابڕووچوون و کێشـــە ترســـا و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر فێڵێک نەکەم، کارەکانم ئاشکرا دەبن و ماڵوێران دەبم.' ئیدی ڕووی لە وەزیر کرد و گوتی: 'وەزیر، من بۆ ئەو پیاوچاکە دەگەڕێم. ئەوە ئیزن لە جەنابت وەردەگرم، دەترســـم ئەگەر ئەتۆش بێی و ئەو تۆ لەگەڵ من ببینێ، ڕەنگە نەیە بۆ لام و پێی ناخۆش بێ و بڕوا.'

وەزیر کە ئەو قسەیەی گوێ لێ بوو، پێی عەیب بوو هیچ وەڵامێکی بداتەوە. ئیدی بەجێی هێشت و گەڕاوە خێوەتەکەی خۆی. ویستی بخەوێ نەیتوانی، دنیای لێ تەنگ بوو.

"دوای هەستا و لە تاوڵەکەی چووە دەرێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'دەچم بۆ لای شەرکانپاشا و هەتا بەیانی لەوێ دەبم.' ڕێ کەوت، ڕۆیشت هەتا گەیشتە تاوڵەکەی شەرکان. سەیری کرد خوێن لە هەموو لایەکی تاوڵەکانەوە لیزگەی بەستووە. کۆیلەکان بە سەربڕاوی لەوێ کەوتبوون. ئیتر وای قیژاند کە هەموو خەوتوویەکی لە خەو ڕاپەڕاند. خەڵکەکە هەموو هەڵاتن بۆ ئەو شوێنە. سەیریان کرد ئەوە خوێن لەبن خێوەتەکانەوە جۆگەلەی بەستووە. ئیدی هەموو لە شین و گابۆڕیان دا. زەوئولمەکانپاشا بە زیقە و گریانی ئەوان لە خەو ڕاپەڕی. پرسی: 'ئەوە چییە؟' گوتیان: 'شەرکان و غولامەکانیان کوشتووە.' زەوئولمەکان هەڵات بۆ تاوڵەکەی شەرکان. چاوی بە وەزیر دەندان کەوت کە دەگریا و دەلالاوە و براکەی دی کە بێ سەر لەوێ کەوتبوو. لەڕێوە بێهۆش بوو. ئەوانەی لەوێ بوون ماوەیەک بەدەورییە بوون هەتا وە هۆش هاتەوە. چاوی لە براکەی کرد و گریا. هەروەها وەزیر و ڕۆستەم و بەهرامیش دەگریان. بەڵام پەردەدار بە کەس ڕانەدەوەستا و شین و ڕۆڕۆیەکی بوو سەیر. بەسەریدا هەڵدەگوت و دەیلاواندەوە. ئینجا پاشا گوتی: 'ئەوە زاهید کوا هەتا لە سای بەرەکەتی ئەوەوە بکوژ بناسرێتەوە؟' وەزیر گوتی: 'من هۆی ئەو کارەسات و ڕۆژڕەشیە لە کەس نازانم جگە لەو زاهیدە شەیتانسفەتە. من قەت باوەڕم بەوانە نەبووە، چونکە من تەواوی ئەو زاهید و عابید و شتانەم پێ کەڵەکباز بووە.' ئیدی تەواوی خەڵکەکە دەگریان و دەپاڕانەوە ئەو زاهیدەیان وە چنگ کەوێ. دوای شەرکانپاشایان کفن کرد و هەر لەو کێوە بە خاکیان سپارد و کۆڕی ماتەمیان لەدەوری گرت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، موسوڵمانان شەرکانیان ناشت و کەوتنە خەم و پەژارەوە. بەڵام زاتوددەوایی تەڵەکەباز کە زانی فێڵ و کەڵەکەکانی سەریان گرت. کاغەز و قەڵەمی هێنا و نامەیەکی بۆ موسوڵمانان نووسی، نامەکەی ئاوا بوو: 'لە زاتوددەواییەوە بۆ موسوڵمان. بزانن من لەوەو پێش هاتم بۆ کۆشکەکەی ئێوە و نوعمانپاشام کوشت. لە شەڕەکەی گەلووگەکەدا تاقمێکی زۆرم لێ کوشتن. لە کۆتاییشدا ئەوە بە فێڵێک شەرکانپاشا و غوڵامەکانیم کوشتن. ئەگەر خودا یار بێ و مەسیح یارمەتیم بکا[1]، ئەوە زەوئولمەکانپاشا و وەزیر دەندانیش دەکوژم. ئەمن هەر ئەو زاهیدەم کە بەو شێوە ئێوەم خستبووە داوی خۆمەوە. ئەگەر لەمەو دوا دەتانەوێ سلامەت بن، لەو وڵاتە بڕۆنە دەرەوە. ئەگەر حەزیشتان لە مردنە، ئەوە بمێننەوە. ئەوەش بزانن ئەگەر دەیان ساڵ لێرە بمێننەوە، بە ئامانج ناگەن.'

"دوای ئەوەی نامەکەی نووسی، سێ ڕۆژان بۆ ئافریدوونپاشا لە ماتەمدا بوو. ڕۆژی چوارەم داوای کرد پاڵەوانێکی ئازا و بەهێز لەنێو ڕۆمییەکاندا بێت. بە پاڵەوانەی گوت: 'ئەو نامەیە بە سەری تیرێکەوە کە و بیهاوە بۆ لای سوپای ئیسلام.' بۆخۆشی چووە کەنیسە و دەستی کرد بە گریان بۆ ئافریدوون.

"موسوڵمانانیش سێ ڕۆژیان ماتەمینی گرت. ڕۆژی چوارەم چاویان لێ بوو، ڕۆمییەک تیرێکی بۆ لای سوپای ئیسلام هاویشت کە نامەیەکی پێوە بوو. زەوئولمەکانپاشا گوتی: 'با وەزیر دەندان نامەکە بخوێنێتەوە.' کاتێک پاشا نێوەرۆکی نامەی بیست، فرمێسکی هاتە خوارێ. وەزیر دەندان گوتی: 'پاشا، من هەر لە یەکەم ڕۆژەوە دڵم لەو گڵاوە دەترسا.' زەوئولمەکانپاشا گوتی: 'ئەو قەحبەیە چۆن دوو جار ئێمەی فریو داوە؟ بەڵام بە خودا لێرە نابزووم هەتا قورقووشمی کوڵاو لە قوزی نەکەم و لە قەفەسی ئاسنیندا نەیبەستمەوە. دوای تەواوی ئەوانەش بە پرچ لە دەروازەی قوستەنتەنییەدا هەڵیداوەسم.'

"ئیدی سوپای ئیسلام ڕووی لە دەروازەی قوستەنتەنییە کرد. پاشا بەڵێنی پێ دان ئەگەر شارەکە بگرن، ئەو سامانەی لەو شارە دایە هەمووی بەسەر سوارەکاندا دابەش دەکەم.

"کورتی کەینەوە، باسی هەموو شتێک دەکرا، بەڵام ئەسرینی چاوی پاشا ڕانەدەوەستا لە تاوی براکەی. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ کز و لاوازتر دەبوو. وەزیر دەندان پێی گوت: 'بەسە

---

١. لە فارسییەکەدا نووسراوە ئەگەر ڕۆژگار یار بوار بدا و شەیتان یارمەتیم بدا. کە من پێم وایە چونکە ئەوانیش باوەڕدارن و مەسیحین ناڵێن شەیتان یار بێ و چونکە ئەوانیش پێیان وایە لەسەر حەقن.

خۆت ئەوەندە ئازار مەدە. براکەت ئەجەلی هاتبوو. خودا ڕەزای لەســەر ئەوە بوو. هێندە بیری لێ مەکەوە با وا نارەحەت نەبی. گریانی تۆ هیچ قازانجێکی نییە. خۆ بە گریان هیچ ناکرێ. تۆزێک ورە و وزە وەبەر خۆت بنێ و خۆت بۆ شــەڕ ســاز کە.' زەوئولمەکان بە وەزیری گوت: 'دڵم بۆ بابم و براکەم و وڵاتەکەشم ناشادە و یادی خەڵکەکەم هیچ کات لە دڵم دەرناچێ.' ئیدی ئەوانەی دەوروبەری لەگەڵ ئەو دەستیان کرد بە گریان.

"بە کورتی، ســوپای ئیســلام ماوەیەکی زۆر بوو قوســتەنتەنییەی گەمارۆ دابوو، هەتا ڕۆژێک لە بەغداوە هەواڵێک هات کە خێزانی زەوئولمەکان منداڵێکی نێرینەی بووە و نوزهەتوززەمانی خوشکی زەوئولمەکان ناوی ناوە 'کانەماکان.' بەڵام وەک ئەستێرەناسان و کاهینان دەڕواننە چارەنووسی ئەو منداڵە و باسی دەکەن، دەبێ پلە و پایەی زۆر بەرزی ببێ. هەر لەو نامەیەدا نووســیبوویان کە خێزانی پاشــا و نوزهەتوززەمان زانایان و وتارخوێنانیان بانگ کردوون و پێیان گوتوون لەپاش هەر نوێژێک داوای سەرکەوتنی ئێوە لە خودا بکەن. دیســان نووســیبوویان: 'شــوکر توونوان هاوڕێی زەوئولمەکان ســاغ و سلامەتە و جگە لە خەمی دووری ئێوە، هیچ خەم و پەژارەیەکی دیکەی نییە. لەگەڵ سڵاوی دووبارەمدا.'

زەوئولمەکانپاشا کاتێک نیوەرۆکی نامەکەیان بۆ خوێندەوە، گوتی: 'ئێستا پشتم تین و گوڕی هاتێ و باسکم بەهێز بووەوە کە خودا منداڵی نێرینەی دامێ.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتایی پێ هات و شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی سەد و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــكۆ، زەوئولمەكان كە ئەو هەواڵەی بیســت، خۆشــحاڵ و بەدەماخ بوو گوتی: 'ئێســتا پشــتم تین و گوڕی هاتێ و باســكم بەهێز بووەوە.' ئیدی ڕووی لە وەزیر دەندان كرد و گوتی: 'دەمەوێ دەست لەو پەرۆشی و خەمبارییە هەڵگرم و كۆتایی ماتەمنی ڕاگەیەنم. خێر و خێرات بۆ براكەم بكەم.' وەزیر گوتی: 'كارێكی زۆر باشــە.' ئیدی پاشـــا دەستووری دا لەسـەر گۆڕی شـەركانپاشا تاوڵیان هەڵدا و قورئانخوێنەكانی نێو سوپایان كۆ كردنەوە، دەســتەیەک قورئانیان دەخوێند و دەســتەیەكیش نزا و وێردیان دەخوێندەوە. دوای زەوئولمەكان هاتە سەر گڵكۆی براكەی گریا و ئەو شێعرەی خوێندنەوە.

غەریـبـانـیـش لە ســـوێـت دڵ پـڕ زووخـاون
كەس و كـارت لام ســـەیـرە چـۆنە مـاون
لغاوی ئەو گـــــــــــــریانە چـــۆن دەگـــیرێ؟
لەســـەرخـۆیـانـیـش خـۆیـان پـێ نەگـیـرێ

"كە شێعرەكەی تەواو بوو، لە قوڵپی گریانی دا و دەوروبەریانیشی لەگەڵ ئەو دەستیان كرد بە گریان. دوای ئەوە وەزیر هات خۆی بەسەر گڵكۆكەیدا دا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هەڵـیـكەنـد بـنـچـكە گـوڵـمـان گـێـژەڵـووكە
لەپـاش ئەو مـا هەرا و گـریـان و نـووكە
شـــتی وا تـازە كــــــــوا دەبێ لەنـاومـان
كەســـــــی هێندە بە بیر و ژیـــــــــــر و ڕامان

"كە وەزیر دەندان شێعرەكەی تەواو بوو، ئەو كە هاوڕێی نیزیكی شـەركان بوو، چووە پێشێ و ئەوەندە گریا، ڕۆندک لەسەر زەوی لووزەوی بەست و ئەو بەیتانەی خوێندنەوە:

دڵـپـاكـان زۆر جـار فـێـڵـیـان لـێ كـراوە
بـــــــۆیە بـاوەڕ بە گشت كەسێ خـــــــــراوە
چـــــــــــاوەكەم، چۆن هەســـتت پێ نەكردبوو
وەهـــــــا مـــــــــارێـــک لە باخەڵتا خزاوە
فـیـتـنەگـێـڕی وا خـراپەی بـێـتە ڕێ
ســـەری ســـەرداری وای لە خـوێـن وەرداوە

"کاتێک هاونشینەکەی شەرکان شێعرەکەی تەواو کرد، زەوئولمەکان و وەزیر دەندان و فەرماندەکانی سوپا هەموو دەستیان کرد بە شین و گریان.

"دوای ئەوە گەڕانەوە بۆ خێوەتەکانیان. زەوئولمەکانپاشا لەگەڵ وەزیر دەندان دانیشتن لەبارەی شەڕوشۆڕەوە ڕاوێژ بکەن. چەند شەو و ڕۆژ ئەوە کاریان بوو. بەڵام خەم ئەوکی زەوئولمەکانپاشای بەر نەدەدا. هەتا ڕۆژێک بە وەزیر دەندانی گوت: 'پێم خۆشە گوێ لە چیرۆکی پاشا و ئەویناری و شتی و وا بگرم، بەشکوم تۆزێک مێشکم سەرقاڵ بێ و خەفەت لە دڵم دەرچێ.' وەزیر گوتی: 'جا خوا دەکا تۆ بەوە چاک دەبیتەوە، ئەوە زۆر ئاسانە. چونکە لە سەردەمی نوعمانپاشای بابتدا کاری من ئەو چیرۆک و شێعر و شتە بوو. هەر ئەمشەو چیرۆکێکی ئەویناریت بۆ دەڵێم با خەم لە دڵت بڕەوێنێ.'

"کاتێک زەوئولمەکان وتەی وەزیری بیست، دڵی بە گفتەکەی خۆش کرد. ئیدی زەوئولمەکان هەر خوداخودای بوو شەو بێتوو وەزیر دەست بکا بە چیرۆکەکەی. وا بوو شەو هات و پاشا فەرمانی دا مۆم و چلوورەکانیان هەڵکردن و عوودیان داگیرساند. خواردن و خواردنەوەیان هێنا. ئینجا گازی کرد، وەزیر دەندان و ئەمیر بەهرام و ئەمیر ڕۆستەم و ئەمیر ترکاش و پەردەدار بێن. کاتێک هەموویان هاتن، کوڕنۆشیان برد. زەوئولمەکان ڕووی لە وەزیر کرد و گوتی: 'وەزیر، ئەوە شەو هات و ئێمە چاوەڕێین کە ئەو بەڵێنەی دابووت بیبەیتە سەر و چیرۆکەکەمان بۆ بڵێی.' وەزیر گوتی: 'بە گیان و دڵ لە خزمەتتاندام.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و حەوتەم هاتەوە

گوتی: خاوەنشـــکۆ، وەزیر گوتی: 'بە گیان و دڵ لە خزمەتتاندام. پاشـــای بەڕێزم، چیرۆکێکی ئەوینـداری دەزانم کە بـاس و وتووێژی نێوان دڵـدارەکـان، چـارەنووس و بەســەرهاتەکانیان ئەوەندە خۆشــە کە خەم لە دڵی مرۆ لا دەبا و دەیگەشـێنێتەوە. ئەویش چیرۆکی تاجولملووکە.

### چیرۆکی تاجولملووک

" 'سەردەمانی زوو لەپشت کێوەکانی ئیسفەهانەوە شارێکی لێ بوو شاری 'خەزرا'یان پێ دەگوت. پاشـــایەکی هەبوو پێیان دەگوت: 'سـلێمانپاشــا.' سـلێمانپاشـا پاشـایەکی دادپەروەر و دەست و دڵباز و چاکەکار بوو. ئەو ماوەیەی لە دەسەلاتدا بوو، ولاتی ئاوەدان کردەوە و مسـکێن و هەژارانی بووژاندەوە. بەلام ژن و منداڵی نەبوو. وەزیرێکی هەبوو لە ئاکارجوانیدا وەک پاشا دەچوو.

" 'بە ڕێکەوت، ڕۆژێک وەزیری بـانگ کرد و پێی گوت: 'لە بێژنومندالیدا وەڕەز و دڵتەنگ بووم و هەست دەکەم نەخۆشم. خۆ نە پاشا و دەسەلاتداران ئاوان و نە پارسەک[1] و کۆیلە. بەڵکوو هەموویان چاویان بە منداڵ ڕوون بووەتەوە. پێغەمبەر درووود و سـلاوی خودای لە سەر بێ دەفەرمووێ: 'تناكحوا تناسلوا تكثروا فأني مباه بكم الأمم يوم القيامة.'[2] وەزیر، تۆ دەڵێی چی؟'

" 'وەزیر گوتی: 'چۆن من بڵێم سـەڵتی و ڕەبەنی بۆ تۆ باشـە لە کاتێکدا مانەوەی وەچە بە ژن هێنانە؟' پاشا گوتی: 'وەزیر، ئەگەر کەنیزێک بکڕم خۆ من نایناسم، لەکوێ بزانم بەر و پشـــتی کێیە. ڕەســـەنە یان نا، بۆ ئەوەی لەگەڵی تێکەوم یان خۆمی لێ بپارێزم. ئەگەر نارەســـەن بێ، ڕەنگە منداڵێکی لێ بێتەوە ســتەمکار و دووڕوو و خوێنڕێژ. ئەوە وەک ئەو شۆرەکاتەی لێ دێ کە هەرچی لێی بچێنی لە دڕوو و داڵ زیاتری لێ شین نابێ. هەر بۆیە دڵم بەرایی نادا کەنیزێک بکڕم و بیکەمە هاوســـەری خۆم. من دەڵێم کچە پاشـــایەک کە پشـــتاوپشـــتی ناســـراون و ناوبانگی جوانی و چاکی هەیە، بێنم. ئەگەر تۆ لەو جۆرە کچانە کەسێکت پێ شک دێ، من دەیهێنم.'

" 'وەزیر گوتی: 'خەمت نەبێ و ئاواتەکەت دێتە دی.' پاشـا پرسـی: 'چۆن؟' وزیر گوتی:

---

١. پارسەک: سوالکەر.

٢. ژن بێنن با منداڵتان بێ تا زۆر بن، چونکە من لە ڕۆژی پەسلان بە زۆربوونی ئێوە سەربلندم.

'پاشا، بیستوومە دەڵێن کە زەهرشاپاشای خێوی زەوی بەیزایە[١]، کەنیشکێکی هەیە وەک دەڵێن ئەوەندە جوانە، لە دنیادا تای نییە و لە چاکی و جوانیدا بە جۆرێکە کە شاعیر دەڵێ:

کیژێکی نازدار و لەبار، قەدبارێک و سمت خڕە
باڵا بەرز و سەلواسایە، مەلێکی ئارام و کڕە
بزەی هەر باسی ناکرێ، هێندە جوانە دڵ شێتییە
لە جوانیدا هاوتای نییە، گوڵی بێروونی قاقڕە
دارستان ئێرەیی دەبا ئەو خانمە سەلوی ئەو نییە
چاکتر لە ناویانا نەبوو، ئەخە ئەو زۆر جەرگبڕە

" 'کاتێک وەزیر ئاوا بەسەر جوانی و چاکی کچی زەهرشاپاشایدا هەڵگوت، سلێمانپاشا گوتی: 'من دەڵێم کەسێکی ژیر و زیرەک و کەیخودایەکی وا بنێرییە لای باوکی کیژەکە بۆ خوازبێنی کە بزانێ بە شێوەیەکی شیاو بدوێ و بە ئەدەبەوە داوای ئەو کیژە پەریسیمایە بکا کە وەک باس دەکەی لە دنیادا تای نییە. ئیدی پاشا کەیفی ساز و سەر و دڵ خۆش بوو، بە وەزیری گوت: 'کەس بۆ ئەو کارە لە تۆ شیاوتر نییە. ئێستا بڕۆوە ماڵی خۆت بۆ سەفەر ساز کە. بەیانی بچووە خوازبێنی ئەو کیژە مانگئاسایەی وا فکری منت بەوەوە سەرقاڵ کرد. هەتا نەشیهێنی، نەیەیتەوە ئێرە. جا پێغەمبەریش فەرموویەتی: 'تەرکەدنیا لە ئیسلامدا جێی نابێتەوە.'

" 'وەزیر کورنوشی بەڵێی کرد و یەغدانەی دیاری شایانەی لە ئاوریشم و دیباوە بگرە هەتا زێڕ و گەوهەر و جەوشەنی داوودی ساز کرد و لە یەسترانی دان. سەد کۆیلەی سادە و سەد کەنیزی ڕوومانگی هەڵگرتن و لەگەڵ سوارەکان کەوتنە ڕێ. سلێمانپاشا ڕایسپارد: 'زوو وەرنەوە و ئەو فریشتەیە لەگەڵ خۆتان بێننەوە.'

" 'ئیدی وەزیر شەو و ڕۆژ ڕۆیشت هەتا شوێنێک کە ڕێگەی ڕۆژێکی تەواوی نەمابوو بگەنە شاری زەهرشا. لەوێ لە قەراخ ڕووبارێک لایان دا و گەورە گەورەکانی کۆ کردنەوە و کەسێکی ناردە لای زەهرشا بۆ ئەوەی هەواڵی هاتنی وەزیری پێ ڕاگەیەنێ.

" 'نێردەی وەزیر چووە لای زەهرشاپاشا. لە سەیرانگەیەکی دەرەوەی شار هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند و ئاگاداری کردەوە کە وەزیری سلێمانپاشا دێ. پاشا خۆشحاڵ بوو. نێردەی سلێمانپاشای لەگەڵ خۆی بردە کۆشک و لێی پرسی: 'لەکوێ لە وەزیر جوێ بوویتەوە؟' نێردە گوتی کە قەراخ فلان چۆم و سبەینێ دەگاتە ئێرە. ئیدی زەهرشا بە وەزیرەکەی خۆی گوت کە لەگەڵ گەورەکانی دەربار و پەردەدارەکان بچن بە پێشوازیانەوە. وەزیری

---

١. سپی.

سلێمانپاشا هەتا نیوەشەو لە قەراخ چۆم حەساوە. دوای ئەوە بەرەو شار کەوتنە ڕێ. کە ڕووناک بوو، وەزیری زەهرشا لەگەڵ کەسانی تایبەت وەدەر کەوتن لە دوو فرسەنگی شار پێک گەیشتن. وزیری سلێمانپاشا سڵاو و هەواڵپرسی کردن و خەڵاتی دانێ. ئەوانیش کورنۆشیان برد و سپاسیان کرد. وەزیر لێی ڕوون بوو کە ڕووی لە زەوی نادەن. ئیدی هەردوو وەزیر پێکەوە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە کۆشکی پاشا. وەزیر هەتا دالانی حەوتەم بە ئەسپ ڕۆیشت کە تا ئەو کاتە کەس هەتا وێ بە ئەسپەوە نەچووبوو. لەوێ لە ئەسپەکەی دابەزی و چووە بەردەمی تەختەکەی زەهرشا. کاتێک چووە خزمەت پاشا، دڵی حەساوە و بە زمانێکی جوان و پاراوەوە دەستی بە قسە کرد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کاتێک وەزیر چووە خزمەت پاشا و دڵی ئارام بووەوە، بە زمانێکی پاراو و خۆشەوە دەستی بە قسە کرد، ئاماژەی بۆ پاشا کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

کەڵەپیاوی هەڵکەوتە لەو دەور و زەمانەدا
ڕۆژگار شانازی دەکا ئەو پلەیەی بە تۆ دا
گەردوون چارەخێری وای نەدیوە لە داوێنیا
لە هەڵمەتا وەکوو شێر، لە بەزەییدا دەریا
دڵاوا و دڵۆڤانی، بڕاون بە بەژنی تۆ
خەڵک تێر و ئاسوودەن لە سای دەسەڵاتی تۆ
خێر و بێرت دەبارێ بەسەر نەدار و دارا
تۆ شایانی گەورەییت لەو دەور و زەمانەدا

" 'کاتێک ئەو شێعرەی خوێندەوە، پاشا بانگی کردە لای خۆی و ڕێزی لێ گرت و لە لای خۆی داینا. بە ڕووی خۆشەوە زۆری قسەی نەستەق و جوان لەگەڵ کرد و وەزیریش وەڵامی شیاوی ئەوی دەداوە. تا کاتی شێو خواردن خەریکی قسەکردن بوون. دوای ئەوە خوانیان ڕاخست و شێویان کرد و سفرە کۆ کراوە. خەڵکەکە چوونە دەرێ و جگە لە کەسانی تایبەت کەس نەماوە. وەزیر کە زانی هەل هەڵکەوتووە، هەستا و کڕنۆشی برد و دەستی پاشای ماچ کرد. پەسنی گەورەیی دا. پاشان گوتی: 'گەورەم، پاشای مەزن، ئێمە مەبەستێکمان لە هاتنەکەمان هەیە کە خێر و بێری تۆش هەر لەوەدایە. ئەگەر مۆڵەت بفەرموون، لە خزمەتتاندا دەیخەمە ڕوو.' پاشا گوتی: 'فەرموون، بە خێر بێن.' وەزیر گوتی: 'ئێمە هاتووین عەرزت بکەین کە کچەکەت بدەی بە سلێمانپاشا، چونکە بەڕێزیان زۆریان پێ خۆشە ببێتە زاوای جەنابت.'

" 'زەهرشا لەبەر شکۆی ناوی سلێمانپاشا هەستا و کڕنۆشی برد. دانیشتووان پێیان سەیر بوو. دوای ئەوە پاشا سپاسی خودای کرد و بە وەزیری گوت: 'وەزیری پێوقەدم بە خێر، ئێمە هەموو مسکێنی سلێمانپاشاین و کچەکەشم کەنیزی ئەوە. خزمایەتی لەگەڵ ئەو گەورەترین ئاواتی منە.' ئیدی دەستووری دا قازی و شایەدیان هێنا. وەزیری سلێمانپاشا بە وەکیلی ئەو و زەهرشاش بە گەوەری و سەرپەرشتی کچەیان لە سلێمانپاشا مارە کرد. دانیشتووان نزایان بۆ هەردووک پاشا کرد. ئینجا وەزیر هەستا و دیاری و پێشکەشییەکانی هێنا خزمەت پاشا و ئەویش دەستخۆشی لێ کردن و قەبووڵی کردن. دوای ئەوە خەریکی

تەدارەکی جیـازی کچەکەی بوو. ڕێزی زۆر لە وەزیر گیرا و خواردن و خواردنەوەی باشیان بۆ دادەنان و ئامرازی موسیقا و خۆشحاڵی ئامادە بوو. بە گشتی هەتا دوو مانگ لە خۆشی و شادیدا بوون.

" 'کاتێک کاری ئامادەکردنی بووک تەواو بوو، جیاز و شـتەکەیان بۆ سـاز کرد. پاشـا فەرمانی دا، لە دەرەوەی شار تاوڵیان هەڵدا و ئاوریشم و دیبایان بەسەر یەغدانەکاندا دان. کەنیزی ڕۆمی و تورکیان سـاز کردن و بە زێڕ و زیو و گەوهەری جۆراوجۆر بووکیان ڕازاندەوە. کەژاوەکەشـیان هەر بە خشـڵ و زێڕ و زیو ڕازاندەوە. نێو کەژاوەکەیان وەک بەهەشت لێ کرد. کیژە مانگڕووەکەیان بردە نێو کەژاوەکەیەوە. یەغدانەی جیازیەکانیان لە یەستر و وشتران دان. زەهرپاشا هەتا سێ فرسەنگی ڕێگا بەڕێی کردن. ئینجا ماڵاوایی لە کچەکەی و وەزیر کرد و بە دڵێکی خۆش بۆ شارەکەی خۆی گەڕاوە.

" 'وەزیری سلێمانپاشا کچی پاشای برد و بە دەشت و کێو و کەند و لەندا ڕۆیشت.'"

لێرەدا ڕۆژ دیـاری دا، شـەهرزادیش دەسـتی لە چیرۆکەکە هەڵگرت و درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'وەزیری سلێمانپاشا هەر وا قۆناغە و قۆناغ شەو و ڕۆژ ڕێیان بڕی هەتا گەیشتنە شوێنێک کە ڕێگەی سێ شەو و ڕۆژیان مابوو بگەنەوە شارەکەی خۆیان.

" 'ئینجا وەزیر کەسێکی ناردەوە لای سلێمانپاشا هەتا هەواڵی هێنانی بووکی پێ ڕابگەیەنێ. کاتێک نێردراوەکە گەیشتە کن سلێمانپاشا و هەواڵەکەی دایە، پاشا زۆر خۆشحاڵ بوو. خەڵاتی شیاوی بە موژدەهێنەکە دا. هێندێک سوارچاکی شەڕی لەگەڵ خەڵکێکی زۆر ناردە پێشوازی و گوتیشی: 'کەرەستە و ئامرازی شایی و شادی لەگەڵ خۆتان بەرن.' لە شاریشدا جاڕیان کێشا کە هەموو ژن و کچ و پیرێژنەکانیش بچنە دەرەوەی شار. وا بوو هەموو بە گوێیان کرد و چوون. گەورەکانی کۆشک ڕێک کەوتن لەسەر ئەوەی ڕێگەکان بە خشڵ و زریوە برازێننەوە. مۆمەکان هەڵکەن و سۆڵەرمە و چلوورەکانیش داگیرسێنن و شەویش بووک بێننە ناو شارەوە.

" 'وا بوو گەورەکانی دەوڵەت و وەزیر و فەرماندەکان لەسەر ڕێگە بۆ پێشوازی ڕیزیان بەستبوو. شاژن هاتە نێو شارەوە. کەنیز و خزمەتکارەکان لە پێشەوە و سوپاش لە ڕاست و چەپی کەژاوەکەوە دەهاتن.

" 'کەس لە شاردا نەمابوو. تێکڕا هاتبوون بۆ سەیر و خۆشی. تەپڵ لێ درا و چەنگ و چەغانە و دەفیان ژەنی هەتا گەیشتە ناو کۆشکەوە، کۆشک بە تیشکی ئەو ڕووناک بوو. ئینجا شاژن چووە سەر تەختێک کە بە دوڕ و مرواری و گەوهەر خەملا بوو. پاشاش هات لە لای دانیشت. کورتی کەینەوە، ئەو شەوە چوونە پەردەوە و دمی بە دمییەوە نا و ئۆخژنی هاتێ و تا ڕۆژ ڕایانبوارد. هەر ئەو شەوە شاژن دووگیان بوو. ماوەی مانگێک پاشا لە ماڵ نەچووە دەرێ. دوای ئەو ماوەیە، پاشا لە ماڵ چووە دەرێ و لەسەر کورسی دەسەڵات دانیشت و خەریکی وڵاتداری بوو. بەو شێوەیە ڕۆژەکان بەدوای یەکدا تێپەڕین. شاژن مانگ و ڕۆژی خۆی هات و نۆ مانگەی تەواو بوو. ڕۆژێک ژانی هاتێ و مامانیان هێنا سەری. حەزرەتی کارساز کاری بوونەکەی بۆ ئاسان کردەوە و منداڵێکی نێرینەی بوو. کە هێماکانی بەختەوەری لە سیمایدا دیار بوو. کاتێک بە پاشایان ڕاگەیاند کە منداڵێکی نێرینەت بووە، زۆر خۆشحاڵ بوو. موژدەی باشی بە موژدەدەر دا، هێند خۆشحاڵ بوو، بۆ خوی هەستا هات بۆ دیتنی منداڵەکەی و تەوێڵی ماچ کرد. سەری لە جوانییەکەی سووڕ ما و ئەو شێعرەی لە هەنییەیدا خوێندەوە:

خۆری ڕوخساری لە کەل سەرکەوت، تیشکی واوە دێ

ولاتی ئێمەش لەو بێ هیوایییە ڕزگاری دەبێ
چرۆی دەرکردووە پیرەداری ژین، نەونەمامەکەم
پێکەنی قاقا تاجی شایی وا، پەیدا بوو سەرێ
دین ئەرخەیان بوو، نارمێ کۆڵەکەی خەسارەی بۆ هات
کۆڵەکەی ژینی من دارمابوو ئەو وزەی دامێ
ڕادەمالێ ئەو، فیتنە و بەڵا بە هزر و ئاوەزی
تا سەلاحەددین نەوەی ئاوای بێ، وەجاخ ڕوون دەبێ

" 'دوای ئەوە دایانەکان ناوکیان بڕی و ناویان نا تاجولملووک. ژەک و شیریان دایە و لە ناز و نیعمەتدا گەورەیان کرد. هەتا تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵان.

" 'ئینجا سلێمانپاشا، حەکیم و ئەدیبی بانگ کردن. فەرمووی: 'فێری زانست و حیکمەت و خەتی کەن.' چەندین ساڵ خەریکی فێرکردن و بارهێنانی بوون. هەتا هەموو جۆرە زانیارییەکیان فێر کرد. دوایی پاشا سوارچاک و تیر هاوێژە ئازا و بەجەرگەکانی بانگ کردن هەتا فێری ئەو چالاکیانەشیان کرد. تا تەمەنی بوو بە چواردە ساڵ، هەر کاتێک لە ماڵ وەدەر دەکەوت خەڵک نوقمی جوانییەکەی دەبوون.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی سەد و دەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'تاجولملووک هەر کاتێک لە کۆشـــک دەچووە دەرێ، مەمنا زۆر جوان و لەبەر دڵان بوو، بینەرانی نوقمی تەمـاشــــای دەبوون و لە بەر خۆیـانەوە ئەو شێعرانەیان دەگوتەوە:

ئەوە کـێـیە ئەو نەمــامە وا بـێـرەدا دێـت و دەچـێ
تیـنـوو چـاوی لە دوویەتی و کـانیـاســـا هەڵـدەقوڵێ
ســـەلو ئەگەر بێتوو بڕوا، لە شـــوێنێ بۆ شـــوێنێکی تر
کوا دەتوانـێ بەو ڕەوتەی ئەو، قورس و قـایم تێبپەڕێ؟
نییە کەســـێـک هەتـا ئێســـتـا چێژێـــــکی لەو لاوە دیبێ
مەگەر هەر شنەی بەیـــــــانی کوڵـــم و ملی ڕامووسیبێ

" 'کاتێک تاجولملووک بوو بە هەژدە ســاڵ، ســمێڵی بۆر بوو. ئینجا شــتێکی دیکەی بە جوانییەکەیەوە زیاد بوو هەر وەک شاعیر دەڵێ:

وردە چـیـمەنـێـکـی ڕەش لە ســـیـمـای دەرکەوتــووە
ئەو پێســـتە نەرم و ســـپییەی، ســـەد هێندە جوان کردووە
بەژن و بــاڵا قـیـت و قـۆز، دەڵـێـی خەدەنـگە دەڕوا
بـۆ لاوچـاکـی و کەشـــخەیـی نـاوبـانـگـی دەر کـردووە

" 'دیسان دەڵێ:

دڵـــی مـــن هەر بە لای ئەو تـــاڵە مـــووە جـــوانەوەیە
وەکـــوو مـــێـــرووڵە بەســـەر گـــوڵە شـــــێـــلانەوەیە

" 'کە چەند ساڵێک تێپەڕی، بوو بە پیاوێکی خۆش‌سیما و جوان‌چاک. دۆست و هاڤاڵێکی زۆر دەوریان دا. ئەو هاوڕێیانەی بە تەما بوون دوای مردنی بابی بچێتە ســـەر تەختی پاشایەتی، ئەوانیش هەر کەسەیان ببنە فەرماندەیەک.

" 'دوای ماوەیەک، هۆگری ڕاو بوو. دایمە دەچووە ڕاو. بەڵام سلێمان‌پاشا دەیزانی ئەو دەشـــت و بێروونە جێی مەترســـییە. پێی خۆش نەبوو کوڕەکەی بچێ و ڕێی لێ دەگرت. تـاجولملووک قســـەی بـابی بە گوێـدا نەدەچوو. بە ڕێکەوت ڕۆژێـک تـاجولملووک بە

غوڵامەکـانی گوت: 'تویشـــوی دە ڕۆژ دانێن' و چوون بۆ ڕاو. چوار ڕۆژان بە کێو و بێرووندا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە مێگزارێک. سەیریان کرد پڕە لە داری سەرسەوز و کانی پڕ ئاو و مامز و گیانلەبەری کێوی. تاجولملووک بە غوڵامەکانی گوت: 'داو و تەپکە بنێنەوە و بچنە بۆســـەوە.' وا بوو ئاژەڵ و باڵندە و پەلەوەرێکی زۆری کێویان ڕاو کرد. ئینجا شازادە لەسەر کانییەک دانیشت و نێچیرەکانی بەش کردن. بەشێکی بۆ سلێمانپاشا نارد. شـــەویش هەر لەوێ مانەوە. کە ڕۆژ بووەوە، کاروانێکی زۆر گەیشـــتنە ئەوێ کە بریتی بوون لە بـازرگـانـان و کۆیلە و کەنیزان. وا بوو کـاروانەکەش هەر لەوێ لە قەراخ ئەو سەوزایی و لەوەڕ و ئاوە لای دا و باریان خست. کاتێک تاجولملووک ئەوەی دیت، پیاوێکی ناردە لایان بزانێ ئەوە بۆ لێرە لایان داوە. ئیدی کابرا چوو بۆ لایان و لێی پرســـین. ئەوانیش گوتیان: 'ئێمە بازرگانین و ئێرەمان پێ شـوێنێکی پارێزراو بوو. لە سلێمانپاشـا و کوڕەکەیمان ڕادیوە. چونکە هەر کەس لە وڵاتی ئەو دابەزێ، زیانی پێ ناگات. هەر بۆیەش ئێمە دیاری و خەڵاتێکی باشـــمان لە قوماشـــی ئاوریشـــم و دیبا و زێڕ و گەوهەر بۆ تاجولملووکی کوڕی هێناوە.'

" 'ئیدی پیاوەکەی شـــازادە گەڕاوە و ئەوەی دیبووی و بیســـتبووی بۆ تاجولملووکی گێڕاوە. شـــازادە گوتی: 'جا کە شـــتیان بۆ من هێناوە، وەڵا هەتا نەیبینم لێرە ناڕۆم و ناچمەوە شـار.' ئینجا هەسـتا سـواری ئەسـپەکەی بوو و غوڵام لە ڕاسـت و چەپیەوە، ڕۆیشـــتن هەتا لە کاروانی بازرگانەکان نیزیک بوونەوە. بازرگانەکان لە بەری هەســـتان و پەسنی شازادەیان کرد. تاوڵێکیان لە ئەتڵەسی سوور بۆ هەڵدا و فەرشی دیبا و ئاوریشمیان بۆ ڕاخســـت. تاجولملووک دانیشـــت و کۆیلەکانی بە دیاریەوە ویســـتان. فەرمانی بە بازرگانەکان کرد کالا و شـــت چیان هەیە بیانهێننە دەرێ. تاجولملووک هەرچی دڵی گرتی، هەڵیگرت و پارەکەی دا. ئینجا ســـوار بوو تا بگەڕێتەوە. ئەوە بوو لەنێو کاروانەکەدا چاوی بە لاوێکی جوانچاک کەوت کە وەک مانگی چواردە وا بوو، جلوبەرگێکی شـــکۆداری لە بەردا بوو. بەڵام ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو. توومەز لەبەر دووری ئازیزانی ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كه شەوی سەد و یازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'تاجولملووک چاوی بە گەنجێکی جوان و ڕێکوپێک کەوت کە لە تاو دووری ئازیرانی زەرد هەڵگەڕابوو، فرمێسـک لە چاویدا قەتیس مابوو. ئەو شـیعرەی دەخوێندەوە:

لەو ڕۆژەوە نەمـدیـتـووە گـراوی جـوانـی خـۆم
پیشـەم بووەتە، شـین و ڕۆڕۆ لە تـاوی یـاری خۆم
خـۆشـەویسـتـیم هـاوڕێیەتی، زووخـاوی هـاوڕێمە
لاوانـدنەوەم هـاودەمـێتی، زووخـاوی دۆسـتـی خـۆم

" 'کاتێک ئەو لاوە بە گریانەوە شـیعرەکەی تەواو کرد، بووڕایەوە. تاجولملووک کە چاوی لەو دیمەنە بوو، سەری سووڕ ما. کاتێک ئەو لاوە حاڵی باشتر بوو، بە تیلەی چاوی نەخۆشانە چاوێکی لەملا و لەولا کرد و ئەو دوو بەیتەی گوت:

لە سـوێـی ئەو کـۆچەی کـردی هەتـاوی شـار
لەڕ و بـاریـک بـووم و زەرد، بـۆ تـیشـکـی یـار
چەنـدی ویسـتـم وەشـارم، نـەهـێـنـی ئەو
کـێ دەتـوانـێ وەشـارێ خەفەتـی یـار

"دوای ئەوە قیژاندی و بێهۆش کەوت. کاتێک تاجولملووک ئەوەی دیت، واقی وڕ ما و چوو بەلایەوە. کە کوڕە جوانچاکەکە وە هۆش هاتەوە و سـەیری کرد شـازادە لەپشـت سەریەتی. خێرا ڕاستەوە بوو، کوڕنۆشی برد. تاجولملووک گوتی: 'تۆ بۆ کاڵا و شتی خۆت نەهێنا لای من؟' گەنجەکە گوتی: 'بە داخەوە ئەمن شـتێکی وام پێ نەبوو شـیاوی جەنابت بێ.' تاجولملووک گوتی: 'دەبێ ئەو شـتەی پێتە بیهێنیتە لای من و پێم بڵێی دۆخی تۆ بۆ ئاوایە. من تۆ بە ناڕەحەتی دەبینم. ئەگەر سـتەمەت لێ دەکەن، تا سـتەمت لەسـەر لا بەم. ئەگەر قەرزباری تا قەرزەکەت بۆ بدەمەوە، چونکە من بە ڕاسـتی خەمی تۆمە.' ئیدی تاجولملووک فەرمانی دا کورسـییەکیان لە شـفرە و دارئاونووس بۆ چێ کرد و بە دوڕ و گەوهەر ڕازاندیانەوە. فەرشی ئاوریشمیان بۆ ڕاخستن.

" 'تاجولملووک لەسـەر کورسـییەکە دانیشـت و لاوەکەش لەسـەر فەرشـەکە. پێی گوت: 'کاڵاکانت بێنە ئێرە.' گەنجەکە گوتی: 'شتی وا مەفەرموو کە من شـتی وام پێ نییە شـایانی

تۆ بێت.' تاجولملووک گوتی: 'هەر دەبێ بیانهێنی.' ئینجا بە غولامەکانی گوت: 'بەبێ مۆڵەتی خۆی شتەکانی بێنن.' کە لاوەکە ئاوای دیت، ئەسرین لە چاوی هاتە خوارێ و بە گریانەوە ئەو بەیتانەی گوتن:

جێ دمی تیخی جودایی پیسە زوو وە بن دەدا
برینی دووری بەژانە، کار لە جەرگی دڵ دەکا
هەڵوەدا و دوورە وڵاتم، لەیزۆکم بە دم باوە
بای خەفەت زۆر بێ ڕەزایە، کوێ دوورە بۆ وێت دەبا

" 'دوای ئەوە لاوەکە کاڵا و شتەکانی دەرهێنا و دانەدانە و تیکەتیکە پێشانی تاجولملووکی دا. بۆ وێنە جلی ئاوریشمی تاڵزێڕی هێنا دەرێ کە بایی دووهەزار دینار بوو. کە کراسکەی کردەوە، قوماشێکی ئاوریشمی لێ کەوتە خوارەوە. ئەو کوتە قوماشەی هەڵگرتەوە و لەبن ئەژنۆی نا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تا من لەوێ بم بەلا هاوڕێیەتی کەس ناکا
تا من لەوێ بم ئاشنا، ئاشنایەتی کەس ناکا
من بەلا زووتر دەبینمەوە، تا بەلا خەڵک
تا من مابێتم لە ژین هاوژینێتی کەس ناکا
گەر بەلا خودایە و خۆشەویستیش بەلایە
جگە لە بەلا دڵم خۆشەویستی کەس ناکا

" 'تاجولملووک زۆری پێ سەیر بوو، نەیزانی لەبەر چی بوو، لێی پرسی: 'ئەو کوتە قوماشە چ بوو؟' لاوەکە گوتی: 'شازادە، چ کارت بەوەی داوە؟' شازادە گوتی: 'دا بیدە بە من.' لاوەکە گوتی: 'ئەمن هەر لەبەر ئەوە شتەکانم نەدێنا، ناتوانم ئەوەی بە تۆ دەم.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'تاجولملووک گوتی: 'دەبێ من ئەو قوماشە هەر ببینم.' ئیتر پێداگری کرد و لە گەنجەکە تووڕە بوو. گەنجەکە قوماشەکەی لەژێر ئەژنۆی دەرهێنا و بە گریانەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

دەردی نـــامـــۆیـــی و عەشــــــق و دووری یــــار
بـــوون بە بەڵای گـیـــان، ئەو ســـــێـیە وەک مـــار
بە شــــەودا لە ســــــوێـــی ئەڤـیـنـــی ســـــاوام
دەســــــــووتــێــــم وەک مـــۆم بە یــــادی دڵـــدار
کەســـــێ عـــاشـــــق بـــێ، وەک گەڵای پـــایـــیـــز
بە دەم بــــــای خەزان، نــــیــــیەتـــــی قەرار
جـــا چـــۆن نەنـــاڵـــێ دڵـــــــــەی کـــوڵـــۆڵـــم
دابـــــڕاوە لە یــــــار، ژیـــــنـــــی پـــــڕ لە زار

" 'کە شێعرەکەی تەواو کرد، تاجولملووک گوتی: 'من زۆر پەرۆشت دەبینم. پێم بڵێ بۆ بە دیتنی ئەو کوتە قوماشە ئاوا کەوتیتە گریان؟' لاوەکە کە ئەوەی بیست، ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی: 'شـــازادەی بەڕێز، ئەمن بەســــەرهاتێکی خۆش و ســــەیرم لەگەڵ ئەو قوماشــــە و خاوەنەکەی و لەگەڵ ئەو وێنانە هەیە.' ئیدی قوماشـــەکەی کردەوە، لەو قوماشـــەدا وێنەی مامزێکی تێدا بوو کە بە تاڵی زێڕی ســـوور تێیدا نەخشـــێنرابوو. ڕووبەڕووی ئەو وێنەی مامزێکی دیکە بە نوقرە کێشـرابوو. لە ملی ئەو دوو مامزەشـدا تۆقێکی زێڕی ڕازاوەی تێدا بوو. کـاتێک تـاجولملووک ئەو وێنەیە و کـارەجوانـانەی دیت، گوتی: 'پـاکە ئەو خودایەی مرۆڤی فێری زانســــــت و هونەر کردووە.' ئیـدی تـاجولملووک پێی خۆش بوو لاوەکە بەسەرهاتی خۆی و ئەو مامزانەی بۆ بگێڕێتەوە. هەر بۆیە لاوەکە گوتی:

## چیرۆکی عەزیز و عەزیزە

" ' 'شـازادە، بابی من بازرگانێکی گەورە بوو، جگە لە من منداڵی دیکەشـی نەبوو. ئەمن ئامۆزایەکم هەبوو بابی نەمابوو. هەر لە ماڵە ئێمە و لەگەڵ من گەورە کرابوو. پێش ئەوەی مامم بمرێ، باب و مامم بڕیاریان دابوو، ئەو کچە بدەن بە من. کاتێک هەردووکمان گەورە بووین، ئیدی لێکیان نەدەشـاردینەوە. ئینجا دایکم و بابم قسـەیان کردبووە یەک و بڕیار وا

بوو که ئەو ســـاڵ عەزیزە بدەن بە من. بابم بەردەوام خەریکی ســـازکردنی تەدارەکی ئاهەنگی ئێمە بوو. جگە لە مارەکردنەکە هیچ نەمابووەوە.

" ' 'بابم هەڵویســـتی گرت کە دوای نوێژی هەینی لێکمان مارەمان لێک ببڕێ. ئیدی چووە لای بازرگانان و بانهێشـتی کردن و دایکیشـم ژنە بازرگانەکانی بانگهێشـت کرد. کە ڕۆژی هەینی هات، ماڵەکەیان لە فەرشـی ئاوریشـم و دیبا پڕ کرد و گشـت جێیەکیان تەواو ڕازاندەوە و عوودیان هەڵکرد و عەنبەریان لە دار و دیوار هەڵسـوو. چاوەڕێ بوون دوای نوێژی هەینی خەڵکەکە بێن و لێکمان مارە کەن. ئینجا منیان بردە گەرماو. کاتێک لە گەرماو هاتمە دەرێ، جلوبەرگی شـــکۆداریان کە بە بۆن و گوڵاو بۆنخۆش کرابوو، لە بەر کردم. ویســـتم بچم بۆ مزگەوت نوێژ بکەم. یەکێک لە هاوڕێکانم وەبیر هاتەوە کە بانگهێشـــتم نەکردبوو. گەڕامەوە بچم پێی بڵێم. ئیدی هەر وا ڕۆیشـتم ڕێم کەوتە کۆڵانێکەوە، قەتم ئەو کۆڵانە نەدیبوو. هێشـــتا گەرمای گەرماوم هەر لە جەســـتەدا مابوو، هەواش گەرم بوو، ئارەقەم کردبوو، کۆڵانەکەم پڕ کردبوو لە بۆنی خۆش. هێندەم گەرما بوو لە سەر کۆڵانەکە پەڕۆیەکم لەسـەر سـەکۆیەکی بەر سـێبەر ڕاخسـت و دانیشـتم کەمێک بحەسـێمەوە. مەمنا زۆریش گەرم بوو، گشت گیانم ببووە ئارەقە. پەڕۆکەشم ڕاخستبوو لەسەری دانیشتبووم. ئیدی هیچم پێ نەبوو تەوێڵمی پێ بســـترم. ناچار ویســـتم بە داوێنی کەواکەم بیســـترم، لە ناکاو دیتم ئەوە قوماشێکی سپی و خاوێن لە سـەرەوەڕا کەوتە سـەر کۆشـم. قوماشـەکەم هەڵگرتەوە و ســـەرم هەڵێنا بزانم کە هی کێیە لێی بەربووەتەوە، کەچی چاوم کەوت بە چاوی ئەو مامزە.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و سێزدەیەم هاتەوە

گوتی: 'خاوەنشکۆ، 'ئەو لاوە بە تاجولملووکی گوت: 'سەرم هەڵێنا تا بزانم ئەو کوتە قوماشە چ بوو بەر بووەوە. چاوم بە چاوی ئەو مامزە کەوت کە لە پەنجەرەی ماڵێکەوە دیار بوو. تا ئێستا شتی وام نەدیتبوو. کە دیتی چاوی لێ دەکەم، قامکی شادەی نایە سەر لێوی. دوای ئەوە قامکی نێوانیشی لەگەڵ قامکی شادەی جووت کرد و خستییە بەینی جووت مەمکیەوە. دوایی لە بەر پەنجەرەکە واوە چوو. پەنجەرەکەشی پێوە دا. ئیدی ئاوری تێ بەردام و ئەو داخەی خستە سەر دڵم. من سەرگەردان بووم و نەمزانی گوتی چی و مەبەستی لەو ئاماژەیە چ بوو. ئیدی هەر جارناجارێ چاوم لە سەرێ دەکرد و پەنجەرەکەم بە داخراوی دەدیت. هەتا نوێژی شێوان دانیشتم. نە کەسم دیت و نە دەنگێکم بیست. کە لە دیتنی بێ هیوا بووم، دەستم دا دەستماڵەکەی و لە جێی خۆم هەستام. دەسماڵەکەم کردەوە بۆنی میسک و عەبیر کۆڵانی پڕ کرد. کە جوان پشکنیم، کوتە کاغەزێک بەربووەوە. ئەو دوو بەیتەی تێدا نووسرابوو:

قەزای ئەو سەر و کاکۆڵەت گرم
تا دەمرم دەستت لێ هەڵناگرم
لە تاوت لێرە وەک مۆم دەسووتێم
کەنیزت بم شای بە سەپان ناگرم

" ' 'کاتێک ئەو دوو بەیتییەم خوێندەوە، دەستماڵەکەم بە دەستەوە گرت و چاوم لێ کرد لە لایەکی دیکەوە ئەو دوو بەیتەش نووسرابوو:

ڕووگەشتری تۆ لە مانگی چاردە
بۆت لە بۆسەدام لەو سێپە و پاردە
ژیانم یەکسەر سوورانەوەیە
لەو شاخ بۆ ئەو شاخ، لەو بەرد بۆو بەردە

" ' 'لە لایەکی دیکەشەوە ئەو دوو بەیتە نووسرابوو:

لەو سیما جوانەت وێنەیەکتم دەست کەوێ، بەسمە
حەز نەکەی بشهێنیتە لام، تۆزیشتم بۆ بێ، بەسمە
گەر ڕێگەش نەدەن، بێم و زیارەت کەم دەرکی ماڵەکەت

" ' 'کە ئەو شیعرانەم لەنێو دەستماڵەکەشدا دیت، ئەوەندی دیکە ئاوری خۆشەویستیم کڵپەی سـەند و عاشـقی بووم. ئیدی دەسـماڵەکەم هەڵگرت و گەڕامەوە ماڵێ. نە دەمتوانی لێی دوور کەومەوە نە ڕێگایەکیشم پێ شک دەهات بچمە لای. سەرگەردان و شێواو کۆڵان بە کۆڵان و گەڕەک بە گەڕەک دەڕۆیشـتم هەتا شـەو لە نیوە لای دابوو گەیشـتمەوە ماڵێ. سـەیرم کرد کچە مامەکەم دانیشـتووە و دەگری. کە منی دیت، فرمێسـکەکانی سـڕین و هەسـتا و هات بۆ لام. کەواکەی لە بەر داکەندم و پرسـی: 'ئەوە لە کوێ بووی؟' گوتیشـی: 'تەواوی کەیخودا و بازرگانان و گەورە گەورەکان کۆ بوونەوە و قازی و شـــایەدیش هاتبوون. خواردنیان خوارد و ماوەیەکی زۆریش دانیشــتن و چاوڕێی تۆ بوون. کاتێک زانیان تۆ هەر نایەوە، ئیدی هەرکەسـەی بەرەو ماڵی خۆی بووەوە.' ئەوەشـی گوت: 'بابت زۆر تووڕە بووە و سـوێندی خواردووە هەتا سـاڵێکی دیکە لێکمان مارە نەکا. چونکە لەو میوانییەدا ماڵێکی زۆری خەرج کردووە.' دوای ئەوە دیسـان پرسـی: 'ئەوە لە کوێ بووی؟ بۆ نەهاتییەوە؟' منیش دەســـماڵ و کاغەزەکەم دەر هێنا و تەواوی ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە. کچە مامەکەم دەسماڵ و کاغەزەکەی لێ وەرگرتم و ئەوەی تێیدا نووسرابوو، خوێندییەوە. ڕۆندکی هاتنە خوارێ و ئەو شیعرەی گوت:

خۆ لە دەریـای جوانـان مەدە، قووڵن جێگەی بەقـا نین
پشـــــت بە بەڵێنیـان مەبەســـتە، هێنـدە جێگەی بڕوا نین

" ' 'دوای ئەوە پێی گوتم: 'خاوەنی دەســـماڵ و کاغەزەکە چی گوت و ئاماژەی بە چی کرد؟' گوتم: 'قسەمان پێکەوە نەکرد و هیچ ئاماژایەکیشی نەکرد، جگە لەوەی قامکی لەسەر لێوی دانا و دوو قامکیشـــی خســـتە بەینی مەمکی و ئاماژەی بۆ زەوی کرد. دوای ئەوە پەنجەرەکەی پێوە دا. هەتا ڕۆژئاوابوون دانیشتم، هەر نەمدیتەوە. کە زانیم نایەتەوە دەرێ، ئیدی هەستام هاتمەوە. ئەوە بوو هۆکاری نەهاتنەوەم. بەڵام ئەتۆ دەبێ یارمەتیم بدەی.'

" ' 'کچە مامەکەم رووی تێ کردم و گوتی: 'خۆشەویستم، ئەگەر داوای چاویشم بکەی، نکۆڵی ناکەم. یارمەتیت دەدەم بە ســـەر چاو، چونکە ئەویش عاشـــقی تۆ بووە. وەک تۆ عاشـقی ئەو بووی.' ئیدی مانای ئاماژەکانی بۆ لێک دامەوە و گوتی: 'قامکدانان لەســەر لێو بە مانای ئەوەیە کە تۆ بۆ ئەو وەک گیان وای لە جەسـتەیدا. دەسـماڵەکەی مانای سـڵاوی عاشـقانەی گراوە. قاغەزەکە دیاردەی ئەوەیە کە گیانی لە گرەوی تۆ دایە. دوو قامکی سـەر مەمکی دەڵێ ئەتۆ دوای دوو ڕۆژی دیکە وەرەوە با خەم و خەفەتم لە دڵ بڕەوێ. ئامۆزا

ئەو کیژە عاشـقی تۆیە و ئاماژەکانیش باس لەوە دەکەن. ئەگەر من بمتوانیبایە بێمە دەرێ، کارێکم دەکرد ئێوەم لە شـوێنێک کۆ دەکردەوە تا تێر دەردی دڵ و کردبا و لای کەسـیش باسم نەدەکرد.' '

" 'لاوە بازرگانەکە بە تاجولملووکی گوت: 'کە ئەو قسەیەم لە ئامۆزاکەم بیست، سپاسم کرد و لە پەنای درێژ بووم. ئەو دڵخۆشـــی دەدامەوە و دەیلاواندمەوە و دەیگوت: 'خۆت نارەحەت مەکە و هیوادار بە.' ' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و چواردەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'ئەو لاوە بە تاجولملووکی گوت: 'کاتێک دوو ڕۆژەکە تێپەڕی، ئامۆزاکەم پێی گوتم: 'جلوبەرگی جوان لە بەر کە و هەســـتە بە کەیفســـازی و باوەڕ بەخۆبوونەوەبڕۆ بۆ ژوان.' ئیدی هەســـتا جلوبەرگی لە بەر کردم و گوڵاوی لێ دام. ئەمنیش بە ورەی بەرزەوە لە ماڵ چوومە دەرێ و ڕۆیشـتم تا گەیشـتمە ئەو کۆڵانەی ئەو ڕۆژە. لە سـەر سـەکۆکە دانیشـتم. ماوەیەکی پێ چوو، پەنجەرەکە کراوە و چاوم بەو کیژە پەریزادە کەوت. دڵم لە بوورەوە هات و بێهۆش بووم. کە وە هۆش هاتمەوە، دیســـان لە پەنجەرەکەم ڕوانییەوە. دیسان دڵم سیس بوو، هەر چۆن بوو خۆم گرتەوە و سەیرم کرد، ئەوە ئاوێنە و دەسـماڵێکی سـووری بە دەسـتەوەیە. کە زانی تێی دەڕوانم، قۆڵی هەڵکرد و پێنج قامکی کردەوە و لەسـەر سـینگی دانا. ئینجا بە هەردووک دەسـت ئاوێنەکەی گرت و سێ جاری لە پەنجەرەکەوە نیشان دام. ئەوجار دەستماڵێکی سووری هێنا و سێ جاری لە پەنجەرەکەوە شۆڕ کردەوە و هەڵیکێشاوە سەرێ. پاشان دەسماڵەکەی خڕ کردەوە و توند گوشی. سەری لە پەنجەرەکە هێنا دەرێ. چاوێکی لە ڕاست و چەپ کرد و سەری بردەوە ژوورێ و پەنجەرکەی پێوە دا و ڕۆیشـــت. هیچ قســـەیەکی لەگەڵ من نەکرد. ئیدی ئەمن سەرگەردان و عەوداڵ، بێ ئەوەی لە ئاماژەکانی تێبگەم، هەتا نوێژی شێوان لەوێ مامەوە. نیوەشـەو بوو کە گەیشـتمەوە ماڵێ. سـەیرم کرد ئامۆزاکەم ئەوە چاوی لە دیوارەکەیە و دەگری و دەبارێنێ و ئەو شێعرە دەڵێ:

چـاوم ســـوور و پڕ لە خوێنە هێنـدە لە دووریـت گریـاوم
بـۆ ئەوەنـدەم ئـازار دەدەی؟ ســـوور دەزانـی بـۆت نەمـاوم
کـاتێـک بەرەو مـاڵ دێیەوە، لە دوورەوە هەســـت پێ دەکەم
ڕوونـاک کە ژووری تـاریـــــکم، خۆت دەزانی تۆی هەتـاوم
کـاتێـک لە مـاڵ دەچیتە دەر، خەم و خەفەت، دەرد و کەســـەر
یەک بە یەکـیـان ســـەرم دەدەن، دەزانـن بە تەنـیـا مـاوم

'کاتێک ئەو شێعرەم بیست، ئەوەندەی دی ناڕەحەتییەکەم زیاتر بوو. لە سووچێکی ماڵێ کەوتم. ئامۆزاکەم هەســـتا و منی هەڵگرتەوە. جلکەکانی لێ گۆڕیم. بە قۆڵی کراســـەکەی چاوی ســـتڕیم و پرســـی: 'چیت کردووە؟ بۆم بگێڕەوە.' چی ببوو، بۆم گێڕاوە. گوتی: 'ئامۆزا، مەبەســـتی لەو پێنج قامکە ئەوەیە، دوای پێنج ڕۆژ وەرە. ئاوێنەپیشـــاندان و سـەرهێنانەدەرێ لە پەنجەرەوە و دەسـماڵە سـوورەکە و گوشـینی، ئاماژەیە بۆ ئەوەی لە

دووکانی بۆیاخچییەکە دانیشە هەتا ڕاسپاردەی من دێتە لات.' کە قسەکانی کچە مامەکەم بیست، ئاوری ئەوین لە هەناومدا زیاتر بڵێسەی گرت. دەستم کردە گریان و گوتم: 'ئامۆزا، بە خودا ڕاست دەکەی. من لەو گەڕەکە دووکانی بۆیاخچییەکی یەهوودیم دیت.' کچە مام گوتی: 'تۆزێک ورەت هەبێ و لەسەرڕێ بە. زۆرکەس ئاوا گیرۆدەی ئەوین بوون و بە ساڵ تاڵی و ڕەنج و دووریان چێشتووە. ئەتۆ هێشتا حەوتوویەک نییە. بۆ وا بێقەراری؟'

" ' 'ئیدی هەر لەو جۆرە قسانەی کرد و دڵخۆشی دامەوە هەتا هەستا خواردنی هێنا و پارووی بە دەممەوە کرد. ئەمن هیچم بۆ نەدەخورا و لە خەو و خواردن ببووم. ڕەنگم زەرد هەڵگەڕا بوو. تا ئێستا عاشق نەببووم و دەردی تاڵی جیایم نە چێشتبوو. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ کز و لاوازتر دەبووم. ئامۆزاکەشم بە بۆنەی منەوە لە ناڕەحەتیدا بوو. ئەویش کز و لاواز دەبوو. هەموو شەوێ چیرۆکی ئەوینداری و دڵداری بۆ دەگێڕامەوە، هەتا من بخافڵێم و وردە وردە خەوم لێ کەوێ. هەر کە وە خەبەریش دەهاتم، سەیرم دەکرد ئەوە ئەو بە خەبەرە و چاودێری من دەکا و فرمێسک بەسەر گۆنایدا دێتە خوارێ. هەتا پێنج ڕۆژ ئەوە کاری ئێمە بوو. ئەو جار کچە مامەکەم هەستا و ئاوی گەرم کرد. زۆر جوان منی شوشت. جلوبەرگی خاوێنی لە بەر کردم و گوتی: 'هەستە برۆ بۆ لای گراوە پەریسیماکەت، بەشکو خودا ئاواتت وەدی بێنێ.'

" ' 'ئیدی لە ماڵ هاتمە دەرێ چوومە گەڕەکی ئەوان. ئەو ڕۆژە شەممە بوو، دووکانی بۆیاخچییەکە هەڵنەگیرابوو. هەتا بانگی ئێوارە لەوێ دانیشتم. وردەوردە خۆر بەرەو ئاوابوون چوو. کاتی نوێژی شێوان هات و شەو تاریک بوو. هیچ هەواڵێک لەو گوڵئەندامە نەبوو. ئەوەندە بە تەنیا بووم، دەترسام. هەر ئاوا بە لۆژەلۆژ ڕۆیشتم هەتا گەیشتمەوە ماڵێ. کچە مامەکەم دیت دەستێکی لەسەر سەری دانابوو دەستێکیشی لەسەر سینگی. هەر دەگریا و ئەو بەیتانەی دەگوتن:

لە بەینی ئەمن و تۆدا کوا بەڵێن بوو،
بچی یارێکی دیکە بگری تۆ زوو
لە بیر کەی کۆنەیاری دەستەمۆی خۆت
وەلا نێی ئەو هەموو بیرەوریە زوو
دەزانی بێ تۆ هەر کاری گرینە؟
دڵ کەیلی من لە خۆزگە و ئارەزوو

" ' 'کە ئەو شێعرەی تەواو کرد. ڕووی لە من کرد و فرمێسکەکانی منی بە سەرقۆڵی سترِی و بە ڕوومەوە نەرمەبزەیەکی هاتێ و پێی گوتم: ئامۆزا گیان، پیرۆزت بێ کەیف و

خۆشــی و ژوانی ئەورۆت. بۆچی ئەوشــەو لە لای خۆشــەویســتەکەت نەمایەوە و ئاواتت وەدی نەدێنا؟' کاتێک ئەو قســەیەی ئەوم بیســت، پێلاقەیەکم بە ســینگیدا دا و لە هەیوانەکە خستم. بزمارێک لەوێ بوو، نێوچاوانی پێیدا کەوت، شکا و خوێنی پێدا هاتە خوارێ.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و پازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ، 'ئەو لاوە بە تـاجولملووکی گوت: 'کـاتێـک کەوت. تەوێڵی بە بزمارەکەدا کەوت و شکا. خوێن بە سـەروچاویدا هاتە خوارێ. بێدەنگ بوو هیچی نەگوت. هەسـتا پەڕۆیەکی هێنا سـووتاندی، سـووتووی[1] بۆ دروسـت کرد و لە سـەری دانا. بە دەسماڵێک بەستی. ئەو خوێنەی ڕژابووە سەر زەویەکە ستری و خاوێنی کردەوە. تا ئێستا من قەت کاری ئاوام لەگەڵ ئەو نەکردبوو. ئیدی هاتە لام و بە پێکەنینەوە بە ئارامی گوتی: 'ئامۆزا، بە خودا خۆ من ئەو قسـەیەم بۆ گاڵتەپێکردنی ئەو خانمە یان تۆ نەکرد. سـەرم دێشا، ئێستا بە شکانی هەنییەم و ئەو خوێن لەبەر ڕۆینە چاکترە و سـەرم سـووک بووە. باشـە بۆم بگێڕەوە بزانم ئەوڕۆ چۆنت بۆ گوزەرا؟' شـتەکەم بۆ گێڕاوە و دەسـتم کرد بە گریـان. ئینجا گوتی: 'مزگێنیم دەیە، ئەوە دیـاردەی ئەوەیە کە تۆ بە ئـاوات دەگەی. تۆ لە کارەکەتدا سـەرکەوتووی، چونکە ئەو ویسـتوویە تۆ تاقی بکاتەوە بزانێ لەسـەر قەول و قەراری خۆتی و بە ڕاسـتی خۆشـت دەوێ. ئەتۆ سـبەینێ بچۆوە ئەو شـوێنە و هەر لەو دووکانە دانیشە کە ڕۆژی خۆشی تۆ نێزیک بووەتەوە.'

" ' 'کورتی کەینەوە، ئەو دڵخۆشـــی دەدامەوە و من زیاتر نارەحەت دەبووم. هەسـتا خواردنی هێنـا. من نووکەشـەقێکم لە مەجۆعمەکە دا و نخوونم کردەوە. هەر دەفرێکی لەسـەری بوو هەر یەکەی بۆ لایەک ڕۆیشـت. خواردن خواردنەوە بۆ ئەڤینداران حەرامە. ئیدی بە گریانەوە لەتی شـکاوی دەفرەکانی کۆ کردەوە. خواردن و شـتەکەی لا برد و هات لە پەنام دانیشـت و دەسـتی کرد بە دڵنەوایم. ئەمنیش دەپاڕامەوە هەرچی زووتر ڕۆژ بێتەوە. هەر کە شـەو تێپەڕی و ڕۆژ بووەوە، خێرا خۆم گەیاندە گەڕەکی ئەوان و لەسـەر سـەکۆکەی کۆڵانەکەیان دانیشـتم. وا بوو ئەوەندەی پێ نەچوو پەنجەرەکە کراوە و ئەو گوڵڕوخسـارە بە پێکەنینەوە سەری لە پەنجەرەکە هێنا دەرێ. ئاوێنەیەک و توورەکەیەک و هێلەگێکی پڕ لە چەپکە گەڵای بە دەستێکەوە بوو و بە دەسـتەکەی دیکەی سـۆلەرمەیەکی[2] پێ بوو.

" ' 'یەکەم کار کردی ئەوە بوو ئاوێنەکەی دەسـتی لەنێو توورەکەکەی نا و زارکەکەی بەست و لەولای دانا. دوای ئەوە قژ و بسکی بەسەر شانی و سنگیدا پەخش کردەوە. ئینجا سـۆلەرمەکەی لەسـەر هێلەگەکە ڕاگرت کە چەپکە گەڵاکانی تێدا بوون. ئەوجار هەموو

---

١. سووتوو: خەڵووزی قوماشی سووتاو بۆ ڕاوەستانی خوێنی برین کەڵکی لێ وەر دەگیرێ. هەڵبەت دەبێ قوماشکە پەشم بێ.

٢. سۆلەرمە: چرایەک کە بە بن میچ یان بە شتێکەوە شۆڕی دەکەنەوە.

شـــتەکانی کۆ کردەوە و واوە چوو و پەنجەرەکەشـــی پێوە دا. بەو ئاماژە بێدەنگانەی و قسەنەکردنەی ئەوەندەی دیکە هەست و خۆشەویستی منی بزواند و سەرسوورمانی منی پتر کرد. ناچار بە چاوی گریانەوە گەڕامەوە مالێ. چاوم لێ کرد ئەوە کچە مامەکەم دانیشـــتووە و ڕووی لە دیوارەکە کردووە و ئاوری ئێرەی و ناڕەحەتی خەریکە هەناوی دەســـووتێنێ. بەلام ئەوەندەی من خۆش دەوێ، ئەو ئیرەیییەی بەســـەر خۆی ناهێنێ. کە چاوم لێ کرد، دیتم ئەوە دەســـمالێکی لە تەوێلی بەســـتووە و دەســـمالێکیشـــی لە چاوی بەستووە. مەمنا ئەوەندە گریا بوو، چاوی ئێشابوو. لەبەر ناڕەحەتیان ئەو شێعرەی دەگوت:

لاوچـــاکە دلـــرفـــێـــن و دلـــتەزێـــن و دلـــبەرەکەم
پـێـم بـلـێ کـوا لە کـوێـیە بەلـێـنە دلـخـۆشـــکەرەکەم
ئـــازاری خـــۆشـــەویســـــتـیـت، تەزانـــدمـــی بەزانـــدمـــی
وەرەوە بـــۆ ئـــامـــێـــزی خـــۆشـــــــیـنەدیـــو و تەرەکەم
ســـڕ بووە هەســـت و ســـۆزم، پیشـــەم بۆتە شـــین و گرین
ئەویـــنـــت دەردێـــکـــی وای داوە بە مـــن دلـــتەڕەکەم
ڕاســـــتە مـــن کەوتـــوومەتە تـــۆڕ و داوی ئەویـــنـــتەوە
بە دلـــتـــا نـــایە بـــلـــێـــی چـــاوێـــک لەو دەرک و بەرە کەم
دلـڕەقـیـش حەددی هەیە، چـۆن دلـت دێ وام لـێ بـکەی
بەتەمـــام مـــن بـــڕنـــم لە بـــاخـــی بەژنـــت بەرەکەم

" ' 'کە شـێعرەکەی تەواو بوو، ئاوڕی بۆ دامەوە. کە منی دیت، چاوی سـتڕی و هەستا هاتە لام. بەلام لەبەر خۆشحالبوون بە دیتنی من، نەیتوانی قسە بکا و هەتا ئیستێک هیچی نەگوت. دوایە داوای لێ کردم، بۆی بگێڕەوە چ بووە. ئەمن ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە. گوتی: 'هەر لەســـەرخۆ بە، کارەکەت خەریکە ســـەر دەگرێ و پێک دەگەن. ئەوەی کە ئاوێنەی بە دەســـتەوە گرتووە و لە توورەکەی ناوە، مەبەســـتی ئەوە بووە کە هەتا ئێوارە ڕاوەســـتە. ئەوەی کە سەروبسکی بە سـەر شـان و ملیدا پەخشـان کردووە، مەبەستی ئەوە بووە کە کاتێک پەردەی شەو بە سەر ڕۆژدا کشا، وەرە. بەلام هێلەگ و گەلاکان ئاماژەیە بەوەی کە هاتی، بچووە نێو باخەکەوە. مەبەســـتی لەو ســـۆلەرمەیەش ئەوەیە کاتێک چوویتە ناو باخەکەوە، بڕۆ هەتا شۆقی سۆلەرمەکانت لێ وەدیار دەکەوێ، لەوێ دانیشـە چاوەڕێی من بە.'

" ' 'کاتێک گوێم لە قسـەکانی کچە مامەکەم بوو، لە خۆشـیان زیقاندم و پێم گوت: 'هەتا کەنگی هەلمدەخەلەتێنی و دەمنێری بۆ ئەوێ و هیچیش؟ تەواوی لێک دانەوەکانت هەلەن.' ئەویش پێکەنی و پێی گوتم: 'ئەتۆ ئەوڕۆش ڕاوەســـــتە هەتا ڕۆژ ئاوا دەبێ و هەوا تاریک

دادێ، ئەو دەم بزانە پێی دەگەی یان نا. ئەتۆ باوەڕم پێ بکە و ئەرخەیان بە.' ئینجا ئەو شیعرەی خوێندەوە:

تـــێـــدەپەڕن ئەو ڕۆژە تـــالانە
دێـــنەوە ئەو ڕۆژ و ســـــالانە
ئەو ڕۆژە تـــالانەی نەهـــاتـــمە
ئەو ڕۆژە خـــۆشـــــانەی ئـــاواتـــمە

" ' 'دوای ئەوە ڕووی تێ کردم و بە زمانێکی نەرم و خۆش دڵخۆشی دامەوە. بەڵام لە ترســـان نەیتوانی خواردن بێنێ. ئینجا هەســـتا جلوبەرگەکەی لە بەر من داکەند و گوتی: 'دانیشە با چیرۆکێکت بۆ بگێڕمەوە. ئیشەڵڵا کاتێک بوو بە شەو، بە گراوی خۆت شاد دەبی و لە پەنا یەک دەبن.' ئەمن چ ڕوویەکی وام نەدایە و هەر چاوەڕێی ڕۆژئاوابوون و هاتنی شەو بووم. کە بوو بە شـەو، کچە مامەکەم زۆر گریا و کڵۆیەکی میسکی ڕەسـەن دامێ و گوتی: 'ئامۆزا، ئەو میســـکە بخەرە زارتەوە و کاتێک کەوتنە لای یەک و بە ئاواتی خۆت گەیشتی، ئەو شیعرەی بۆ بخوێنەوە:

ئەوەی کـۆیـلە و گـوێـلەمســـــتـی ئەویـنـی دڵـبەران بـێ
هـــاواری دەبـــاتە لای کـــێ خـــوایە کە لـــێـــی بـــقەومـــێ؟

" ' 'دوای ئەوە ماچی کردم و ســـوێندی دام، هەتا کاتی هاتنەدەر لە لای گراوەکەم، ئەو بەیتە نەخوێنمەوە. ئەمن بەڵێنم دا و لە تاریکی شــــەودا لە ماڵ هاتمە دەرێ و ڕۆیشـــتم، ڕۆیشـتم هەتا گەیشـتمە باخێک کە لە گەڕەکی ئەوان و لە لای ماڵیان بوو. دەرگای باخەکە کرابووەوە. چوومە ناو باخەکەوە و لە دوور شـۆقێکم دیت. بەرەو شـەوقەکە ڕۆیشـتم. کە چووم، سەکۆیەکی گەورە و خۆشم دیت کە گومەزێکی لێ بوو کە لە دارئاونووس و شفرە چێ کرابوو. چلوورەیەکیان لە نێوەڕاسـتی گومەزەکە هەڵواسـیبوو. ئەو ناوە یەکســـەرە بە فەرشـــی ئاوریشـــم و دیبا ڕاخرابوو. مۆمێکی گەورەیان لەنێو دەفرێکی زێڕین و لەژێر چلوورەکەدا هەڵکردبوو. لە نێوەڕاســـتی ئەو شــــوێنە حەوزێـک و لە قەراخ حەوزەکە ســفرەیەکی گەورە ڕاخرابوو. قوماشـی حەریریشـیان بەسـەردا دابوو. لە پەنا سـفرەکەش کووپەیەکی گەورەی پڕ لە مەی لەعلاسای لێ بوو. کە بە قەدی کووپەکەوە پیاڵەی بلووری پێوە هەڵواسـرابوو. لەکن ئەویشـەوە مەجۆعمەیەکی زیوینی سـەرداپۆشـراوی لێ بوو. کە ســـەریم هەڵداوە، دیتم لە هەموو جۆرە میوەیەکی لەســـەر داندراوە و نێوەنێوە ڕیحانەیان لەنێوان میوەکان خستووە. وا بوو ئەو شوێنە خەمی لە دڵی من ڕەواند و خۆشحاڵی کردم،

بەڵام کەسم لەوێ نەدی.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سەد و شازدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ‹ئەو لاوە بە تاجولملووکی گوت: ‹ئەو شوێنەم زۆر پێ خۆش بوو، هیچ گیانلەبەرێکی لێ نەبوو. لەوێ دانیشتم چاوەڕێی گراوەکەم بووم. دوو-سێ دەمژمێری پێ چوو ئەو چاوکەژاڵە هەر نەهات. برسییەتی تەنگی پێ هەڵچنیبووم بە تایبەت لەمێژ بوو لە تاو سۆزی ئەوین و دووری دڵدار چی واشم نەخواردبوو. بۆنی خۆشی ئەو خواردنانەشم ئەوەندە بە سەردا هاتبوو، تەواو ئیشتیای خواردنم بزووتبوو. ئیدی چوومە پێشێ، پەڕۆیەکی جوان بەسەر سفرەکەدا درابوو، پەڕۆکەم لا برد. دیتم ئەوە کەشەفێکی زێڕین لە نێوەڕاستی سفرەکەدایە و چوار مامری برژاوی لەسەرە. شیرینی جۆراوجۆری لە پەنا داندراوە. پلە گۆشتێکم خوارد. ئینجا چووم بە لای شیرینییەکانەوە. لە هەرکامیان کەمێکم خوارد. نیوە مریشکێکی برژاویشم خوارد. کە تێر بووم، مەمنا زۆر ماندوو بووم، سەرم خستە سەر باڵنجێک و درێژ بووم. چەند ڕۆژیش بوو لە تاوان خەو و خۆراردنم نەبوو، خەو دڵی گرتم و ئاگام لە خۆم نەما. کاتێک وەخەبەر هاتم، گەرما تەوژمی بۆ هێنابووم. کلۆ خوێیەک و کلۆیەک ڕەژی لەسەر سکم بوون. ئیدی هەستام خۆم تەکاند و چاوێکم لە ڕاست و چەپی خۆم کرد، کەسم نەدیت. فەرش و شتەکە لەوێ نەمابوون. منیش لەسەر زەوی درێژ بووم. سەرم سووڕ ما و دڵم تەنگ بوو. گێژ و کاس بووم و فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارێ. سەرم لەو کارە دەر نەدەکرد. بەرەو ماڵ بوومەوە. کە گەیشتمەوە، کچە مامەکەمم دیت دەگریا و لە سینگی خۆی دەدا و ئەو شێعرانەی دەخوێندەوە:

ئەو لاوە شۆخ و شەنگ و باڵا بەرزە لە کوێیە؟
من لە سوێی ئەو دەسووتێم، ئەو دڵی لە لای کێیە؟
ئێستە مەست و سەرخۆشە، لە ئامێزی کێدایە؟
ڕووح و گیانم فیدای ئەو بەژن و قەد و باڵایە
منی عەوداڵ هاودەمی دەرد و داخ و کەسەرم
بێ هیوا نیم، دەزانم کە مردم دێتە سەرم

"‹ ‹کە منی دیت، هەستا. ڕۆندکی لە چاوی سترِی و هاتە لام و بە نەرمی گوتی: ‹ئامۆزا گیان، تۆ بۆ خۆت خەریکی خۆشی و عەیش و نۆشی خۆتی و، منیش لێرە لە سوێی تۆ دەسووتێم و دەبرژێم. هیوادارم ئاهی من تۆ نەگرێ.› ئیدی بە تووڕەیەوە بە ڕوومەوە پێکەنی. دوایی بە سۆز و خۆشەویستییەوە جلوبەرگەکەی لێ داکەندم و گوتی: ‹بە خودا! ئەتۆ بۆنی ئەو کەسەت لێ نایە کە لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا خەوتبێت. بۆم بگێڕەوە چی

بووه.'ئیتر من شـتەکەم بۆ گێڕاوە. بزەیەکی هاتێ وەک بزەی کەسـانی تووڕە و پێی گوتم: 'ناڕەحەتت کردم، خۆشـــی نەبینێ ئەو کەســـەی تۆ ناڕەحەت بکا. ئەو ژنە کەڵەکێکی لە بن سـەردایە وریای خۆت بە. ئامۆزا گیان، من زۆر نیگەرانی تۆم. خوێ هێمایە بۆ ئەوە کە تۆ نوقمی خەوی، هەر لەبەر ئەوەش بێتامی و لەبەردڵ نیت و خەڵک لێت دوور دەکەونەوە. دەبێ شـیرینتر بی، بۆ ئەوەی خەڵک لێت نیزیک ببنەوە. لەکنە خۆی تۆ عاشـقی! عاشـقان دەبێ خەویـان لێ حەرام بێ، ئەتۆ درۆم لەگەڵ دەکەی وا دەنوێنی گیرۆدەی من بووی. ئامۆزا ئەویش لەوەی کە وا نیشان دەدا تۆی خۆش دەوێ، ڕاست ناکا. چونکە ئەو تۆی لە خەودا دیت هەڵینەســـتاندی. ئەگەر ئەو ڕاســـت دەکـا و تۆی خۆش دەوێ، دەبووایە هەڵتبســـتێنی. بەڵام ڕەژییەکە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خودا ڕووت ڕەش کا، چونکە ئەتۆ بە درۆ پێشـانتدا منت خۆش دەوێ، لە کاتێکدا هێشـتا منداڵی. ئەتۆ جارێ حەزت لە خواردن و خەوتنە. کوڕە مام، ئەو لێکدانەوانە ئاماژەکانی ئەون، هیوادارم خودا لە دەست ئەو ڕزگارت کا.'

" ' 'کاتێک قسـەکانی کچە مامەکەم بیسـت، لە سـەر و سـینگی خۆم دا و گوتم: 'بە خودا ئەو ڕاست دەکا، چونکە من خەوتم لە کاتێکدا عاشقان ناخەون، ئەمن بۆ خۆم خۆڵم وەسەر خۆم کرد. لە ڕاســـتیدا دژمنی من خواردن و خەوتن بووە.' ئیتر گریام و بە کچە مامەکەم گوت: 'ڕێیەکم بۆ ببینەوە و بەزەیت پێمدا بێ، خودا بەزەیی پێتدا بێ. دەنا دەمرم.' چونکە کچە مامەکەم منی زۆر خۆش دەویست ...' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سەد و حەڤدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەو لاوە بە تاجولملووکی گوت: 'کچە مامەکەم منی زۆر خۆش دەویست، گوتی: 'بە چاوان، منەتباریشتم. بەڵام ئامۆزا ئەوە چەند جاری دیکەشم پێ گوتی، ئەگەر من بمتوانیبا لەگەڵ تۆ بێمە دەرێ، لە ماوەیەکی کەمدا ئێوەم بە یەکتر دەگەیاند. ئێســـتا هەوڵی خۆم دەدەم بۆ ئەوە پێکتان بگەیەنم. جا ئەوەی پێت دەڵێم، بە گوێم بکە و هەر بچووەوە ئەو شوێنە دانیشە. ئەگەر کاتی خواردنیش هات، هیچ مەخۆ. چونکە خواردن خەو دێنێ، نەکا خەوت لێ کەوێتەوە. چونکە چارەگێک لە شـــەو تێپەڕێ، ئەو دێ. خودا لە فرۆفێڵی ئەوت بپارێزێ.'

" ' 'کە قسەکانی ئامۆزاکەم بیست، دڵخۆش بوومەوە و لە بەر خودا دەپاڕامەوە زووتر شەو بێتەوە. کە شەو داهات، خۆم ساز کرد بچم بۆ ئەوێ. ئامۆزاکەم گوتی: 'ئەگەر پێکەوە دانیشـتن، لە کاتی هەسـتان و جیابوونەوەدا ئەو شـێعرەی کە دوێنێ شـەو پێم گوتی، بۆی بخوێنەوە.' ئیدی منیش گوتم باشـــە و هاتمە دەرێ. ڕۆیشـــتم هەتا گەیشـــتمە ئەو باخە و چوومەوە ئەو شوێنە. هەموو شتێک وەک شەوی ڕابردوو ساز و ئامادە بوو. لەوێ هەموو شـــتێک، لە خواردەمەنی و مەیەوە بگرە هەتا شـــیرینی و ڕیحانەی لێ داندرابوو. لەوێ دانیشـتم. بۆنی ئەو خواردنانەش بەسـەرمدا دەهات. چەندین جار شـەیتان دنەی دام کەمێک بخۆم، بەڵام خۆم ڕاگرت و بەسەر خۆمدا زاڵ بووم تا ماوەیەکی پێ چوو.

"دوای ئەوە نەوس بەسـەرمدا زاڵ بوو. خۆم پێ ڕانەگیرا و لە سـفرەکە چوومە پێشـێ. سەیرم کرد، چوار دەفر چێشتی جۆراوجۆر لەسەر سفرەکەن. مریشکی برژاو و حەڵواشی لەسەرە. لە هەر خواردنەی پارووێکم خوارد و لە حەڵواکەش ئەوەندەی توانیم خواردم. لە مریشـــکە برژاوەکە و چێشـــتی دەنکەهەناریش کە لیمۆیان تێکەڵ کردبوو برێکم خوارد. بە کورتی ئەوەندەی بۆم خورا، خواردم و تێر بووم. خەوم دەهات، باڵنجێکم خستە ژێر سەرم و درێژ بووم، بەڵام بڕیـارم دا نەخەوم. کەچی بێ ئەوەی ئـاگـام لێ بووبێ، خەوم لێ کەوتبوو. کە سـۆزی وە خەبەر هاتم، تاو و بان گەرم ببوو. سـەیرم کرد ئەوە ئێسـک و پێسـت و دەنکە خورمای کاڵ لەسـەر سـکم داندراون و ئەو شـتانەی شـەو لەوێ بوون، هیچیانی لێ نەماوە. نە فەرش و نە سفرە و نە هیچ شتێک، وەک ئەوەی کە شەویش هیچی لێ نەبووبێ. ئیدی هەستام ئەو شـتانەی سەر سکمم فڕێ دان و خۆم تەکاند و بە قەڵسی بەرە و ماڵ بوومەوە. کە گەیشـــتمەوە، ســـەیرم کرد ئەوە ئامۆزاکەم دەگری و دەناڵێنێ و ئەو شێعرەش دەڵێ:

بەخـــتەوەرێـــک گـــراوەکەی دڵـــۆڤـــان و بەســـــۆز بـــێ

هەموو کاتێکی ژیانی پڕ لە خـــــــــێر و بێر دەبــــــێ
بێـتـوو گەر هەڵـوا بـخـوا دەشـــکـێ ددانـی یەک بە یەک
ئەو عەوداڵەی خۆشـــەویســـتی مەیلی نـاســـازی هەبێ
تۆزی بەدبەختی بە جـارێ ڕووی گەشـــی پەشـێو دەکـا
دەســـــت بۆ هەر کـارێ بەرێ حەتمەن گرفتی دێتە ڕێ
خۆڵی بەدبەختی بە دەســـتی خۆم بەســــەر خۆمـا دەکەم
خۆشەویستان پێم بڵێن تۆخودا شتی وا چۆن دەبـــــــــێ
دایـمە گـیـرۆدە و ئەســــیـری ئەو دڵەی پـڕ ســــۆزمـم
بۆ دەبێ کـارێ بکـا ڕووحم هەدادانی نەبـــــــــــــێ؟

" ' 'ئیدی جنێوم پێ دا و گوتم: 'هەســـتە بڕۆ دەرەوە.' کەچی خێرا فرمێســـکەکانی پاک کردەوە و هات لە ئامێزی گرتم و ڕایمووســـیم. من لێی دوور دەکەوتمەوە خۆم ســـەرکۆنە دەکرد. ئیدی گوتی: 'ئامۆزا، وا دیارە ئەوشـەویش خەوتووی.' گوتم: 'ئەرێ خەوتم.' گوتی: 'دەی چی بوو؟' گوتم، کاتێک بەیانی هەســـتام، ســـەیرم کرد ئێســـقان و چەرم و دەنکە خورمای کاڵ لەســـەر زگم داندراوە. نازانم مەبەســـت لەو کارانە چییە!' بەخۆم نەبوو بە گریانەوە ڕووم لە کچە مامەکەم کرد و گوتم: 'پێم بڵێ ئەوانە هێمای چین؟ توخوا یارمەتیم بدە با نازانم چی بکەم. ' کچە مامەمەکەم گوتی: 'مەبەســتی لەو کوتە پێســتە ئەوە بووە کە تۆ بە جەســـــتە لێرەی و بە ڕووح و گیان لە شـــوێنێکی دیکەی. بۆ خۆت بەرچاو و دڵت نادیارە. گۆیا ویســـتوویە بڵێ خۆت بە ئەڤیندار مەزانە. دەنکە خورماکەش دەڵێ ئەگەر تۆ ئەڤیندار بایەی، ئەوە دڵی تۆ بە ئاوری خۆشـــەویســـتی دەســـووتا و خەوت لێ نەدەکەوت. چونکە هەرکەس تامی ئەوین بچێژێ، دڵی بە ئاوری ئەو ئەوینە گڕ دەگرێ و وەک خورما گەرم دادێ. ئێستا تۆ دەبێ خۆڕاگریی ئەیوبت بێ.'

" ' 'کاتێک گوێم لە وتەکانی کچە مامەکەم بوو، ئاگری خەم و پەژارە لە دڵم بەر بوو. لە دڵە خۆمدا گوتم خودا خەوی بۆ چارەڕەشی من داناوە. ئینجا بە ماموزاکەمم گوت: 'تۆو گیانی من فکرێکم بۆ بکەوە با پێی بکەم.' ئیتر ئەو گریا و گوتی: 'ئازیزەکەم، ئامۆزاکەم. هەزار قسەم لە دڵیدایە ناتوانم بیانکەم. ئەوشـەویش بچۆوە ئەوێ، بەڵام مەنوو، بەشکو بە ئاواتت بگەی. ئەمن هەر ئەوەم بە زەین دەگا و تەواو.' پێم گوت: 'ئیشـــەڵڵا ناخەوم.' ئینجا کچە مامەکەم هەســـتا خواردنی هێنا و گوتی: 'ئەوەندەی دەتوانی، ئێســـتا بخۆ.' ئیدی تێرم خوارد.

" ' 'کە بوو بە شـــەو، کچە مامەکەم هەســـتا و جلوبەرگی خاوێن و جوانی هێنا و لە بەری کردم. سوێندی دام کە ئەو بەیتەی لە بیر نەکەم. زۆریشی پێ گوتم وریا بم نەنووم.

دوای ئەوە لە لای کچە مامەکەم وەدەر کەوتم و چوومە نێو باخەکە. لەوێ دانیشـــتم و چاوم لەنێو باخەکە بڕی. کە خەونووچکەم دەهات، بە دەســـت چاوم دادەپچڕی و ســـەرم ڕادەوەشاند.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و هەژدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'ئەو لاوە بازرگانە بە تاجولملووکی گوت: 'لە ترسی خەو بە قامک چاوم دادەپچڕی و سەرم ڕادەوەشاند. جار لەگەڵ جاریش برسییەتییەکەم زیاتر دەبوو، بۆنی ئەو خواردن و شتەش ئیشتیایان دەبزواندم. ئاخری هەستام چووم لەسەر سفرە دانیشتم و سەری خواردنەکانم هەڵداوە و لە هەموو خواردنەکانم خوارد. هەستام چووم بەلای دەفری مەیەکەوە و گوتم لە پیاڵەیەک زیاتر ناخۆمەوە. کە یەکەم پیاڵەم خواردەوە، حەزم چووە یەکی دیکەش، دوایە یەکی دیکەش هەر ئاوا هەتا دە پیاڵەم خواردەوە و پاشان مەست و کەلەلا وەک مردوو درێژ بووم.

" ' 'کاتێک خەبەرم بووەوە، سەیرم کرد دنیا گەرم بووە و من لە دەرەوەی باخ کەوتووم و وێردێکی[1] تیژ و درەمێکی ئاسن لەسەر سکمە. هەستام ئەوانەم هەڵگرتن و هاتمەوە ماڵێ. گوێم لێ بوو کە کچە مامەکەم دەیگوت: 'من لەو ماڵەدا خەمبار و لێوبەبارم و جگە لە گریان و لالانەوە، هاوڕێ و هاودەمێکم نییە.'

" ' 'کە چوومە ژووری وێرد و درەمەکەم فڕێ دان و بێهۆش بووم. کاتێک وە هۆش هاتمەوە، ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە و باسی نارەوابوونی ئەو کارەم کرد. کاتێک گریان و ماتەمی منی دیت، ئەویش مات و خەمبار بوو و گوتی: 'ئەمن ماندوو بووم ئەوەندی پێت بڵێم و ڕێت بۆ بکێشم. تۆ قسەی منت بە لاوە گرینگ نییە و بایەخی بۆ دانانێی. چەند جارم پێ گوتی خۆ لە خەو بپارێزە، ها؟ بە گوێت نەکردم.' پێم گوت: 'بیکە بۆ خاتری خودا! پێم بڵێ ئەو وێرد و درەمە هێمای چین؟' گوتی: 'مەبەستی لە درەمی ئاسن چاوی خۆیەتی. ئەو سوێندی خواردووە کە بە چاوی ڕاستی خۆم قەسەم ئەگەر لەمەو بەدوا بێیت و لەو باخە بخەوی، بەو وێردە سەرت لە لەشت جوێ دەکەمەوە. بەڵام ئامۆزا ئەمن زۆر نیگەرانی تۆم و لە مەکری ئەو ژنە دەترسم و دڵم پڕە لە قسە و ناتوانم بیدرکێنم. ئیستاش ئەگەر دەزانی لە خۆت ڕادەبینی دیسان لەوێ نەخەوی، ئەوە بگەڕێوە ئەو شوێنە. بەشکو بە ئامانجت بگەیت. بەڵام ئەگەر دەزانی بچییە ئەوێ دیسان دەخەوی، وەک پیشەی خۆتە، ئەوە مەچۆوە، چونکە دەکوژرێی.'

" ' 'بە کچە مامەکەمم گوت: 'چ بکەم؟ تۆو خودا یارمەتیم بدە. پشتم تێ مەکە.' گوتی: 'بە گیان و دڵ هەوڵ دەدەم. ئەگەر گوێم لێ بگری و بە قسەم بکەی، ئەوە ئاواتت دێتە دی.' گوتم: 'بە قسەت دەکەم و ڕێنوێنییەکانت لە گوێ دەگرم.' ئیتر گوتی: 'کاتی ڕۆیشتن پێت دەڵێم دەبێ چ بکەی.'

---

١. وێرد: چەقۆیەک کە دمەکەی نانوشتێتەوە، وەک وێردی چێشتخانە و میوەخواردن و خەنجەر و شتی وا.

" ' 'ئیدی منی لە باوەش کرد و بردی بۆ خەوگە و دەست و لاقمی شێلا هەتا خەوم لێ کەوت. باوەشێنێکی هەڵگرت و باوەشێنی کردم هەتا نوێژی شێوان. ئینجا منی هەستاند. سەیرم کرد باوەشێنێکی بە دەستەوەیە و لە پەنام دانیشتووە و دەگری. کە وەخەبەر هاتم، ئەسرینی چاوی سڕی و خواردنی هێنا. ویستم شت نەخۆم. گوتی: 'مەگەر پێم نەگوتی بە قسەم بکە؟' ئیدی پێداگریم نەکرد و خواردنەکەم خوارد. دواتر شەربەتی ترێی بە شەکر گرتبووەوە ئەویشی دەرخوارد دام. دەستی بۆ شوشتم و بە دەسماڵ وشکی کردەوە. سەر و گوێلاکی بە گوڵاو بۆنخۆش کردم. کاتێ تاریکی وڵاتی داگرت، جلوبەرگەکانی لە بەر کردم و گوتی: 'ئامۆزا، ئەوشەو هەتا بەیانی هەر بە خەبەر بە، هەر چەند ئەو هەتا لای بەیانی نایە بۆ لای تۆ. ئیشەڵلا بە ئاوات دەگەیت و ئارەزووت وەدی دێ. بەڵام پەیامەکەی منت لە بیر نەچێ.' گوتم: 'پەیامی تۆ چییە؟' گوتم: 'لە کاتی گەڕانەوەتدا ئەو بەیتە شێعرەی پێم گوتی بۆی بخوێنەوە.'

" ' 'وا بوو لە ماڵ چوومە دەرێ و چوومە باخەکە و هەر لەو شوێنە دانیشتم. بەڵام تێر بووم و هەر بە ئاگا بووم هەتا چواریەکی شەو ڕابرد. هەر چەندم دەکرد شەو لە بەری نەدەڕۆیشت. هەر بە خەبەر بووم هەتا وای لێ هات چواریەکی شەوی مابوو. برسێتی هێرشی بۆ هێنام. هەستام لەسەر سفرەکە دانیشتم. ئەوەندەی پێویست بوو لە هەموو خواردنەکانم خوارد. سەرم لێ قورس بوو. خەریک بوو خەوم لێ کەوێ، دەنگێک لە دوور هات. هەستام دەست و دموچاوم شوشت و خەوەکەم پەڕی. لە پڕدا دیتم ئەوە ڕوومانگ هات و دە دانە کەنیزی لەگەڵ خۆی هێنابوو. سەرعەبایەکی دیبای سەوز کە هەودای زێڕی سووری تەرازی تێدا بوو، لە بەر کردبوو، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

هێند شیرین دەڵێی هەنگە
ئەو یارە شۆخ و شەنگە
زولفی قەفقەف و لوێلوێ
چەند جوان و چەند چەلەنگە
چاوی پڕ لە مەکر و ناز
ڕێکوپێک وەک خەدەنگە
لێو سوور وەک دەندووکی کەو
کراسی هەزار ڕەنگە
بۆنی میسک و عەنبەری
دێ لەو گوارە و پەرەنگە

" ' 'کاتێک منی دیت گوتی: 'ئەوە چۆنە خەوت لێ نەکەوتووە؟ ئێستا کە ئەو شەو

نەخەوتووی، دیارە بە ڕاستی ئەوینداری و پیشەی ئەویندارانیش شەوبێداریە.' دوایی بە تیلەی چاو ئاماژەی بۆ کەنیزەکانی کرد کە بڕۆنەوە و بۆخۆی هاتە لای من و لە ئامێزی گرتم. بە خۆیەوە گوشیمی و ماچی کردم. منیش ئەوم ماچ کرد. ئەو لێوی منی مژی و منیش لێوی ئەوم مژی. ئینجا دەستم برد نێوقەدیم گوشی و درێژ بووین و دەرپێکەیم لە سمتییەوە هەتا پامووروەکانی داکێشا. دەستپێداهێنان و قسەی کەسنەکردوو و خۆتێهەڵسوون لێخە و ڕێخە دەستی پێ کرد. تا کار گەیشتە ئەو جێیەی کە ئەو دەماری شل و هێندێک شوێنی سوور هەڵگەڕا و منیش هەوسارم لە دەست دا و لینگیم نایە سەر شانم و لە بەری نیشتم. ئەو شەوە هەتا بەیانی لە خۆشی و شادی چاو و دڵڕوونیدا بووین. هەر وەک شاعیر دەڵێ:

دوێ شەو دڵێکی ئارام و هەستێکی وشیارم بوو
تاکوو کازیوەی بەیانی، چاوم لەسەر یارم بوو
نازونووزی، تلانەوەی، خەوتنی، هەستانەوەی
شام بە سەپانم نەدەگرت خاوەن لەنجە و لارم بوو
لارولەنجەی خۆشەویستم، ڕێک ئەو شتە بوو ویستم
باخەوانی ناو گوڵان بووم، بەهێ و سێو و نارم بوو
تا ئەو کاتەی کە شەو پشتی بە شوقی مانگ بەستبوو
مانگ لە پەنام، مانگ لەپێشم، مانگ لە جێگە و وارم بوو

کاتێک ڕۆژ بووەوە و ویستم هەستم بێمەوە، گرتمی و گوتی: 'مەڕۆ، با شتێکت پێ بڵێم.' ' '"

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و نۆزدەیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو لاوە بە تاجولملووکی گوت: 'منی گرت و نەیهێشت برۆم گوتی: 'راوەستە با شتێکت پێ بڵێم.' منیش راوەستام. ئیدی بوخچەکەی کردەوە و ئەم پارچە ئاوریشمەی دەرهێنا و لە بەرچاوی من کردیەوە. وێنەی ئەو مامزە هەر بەو شێوەیەی کە دەیبینن لەنێو ئەو قوماشەدا بوو. ئیتر پارچەکەم لێ وەرگرت و پێکەوە پەیمانمان بەست کە هەموو شەوێ لەو شوێنە یەکتر ببینین. دوای ئەوە بە خۆشحاڵی گەرامەوە و لەبەر شادمانی لە بیرم چوو بەیتە شێعرەکەی کچە مامەکەم رایسپاردبووم، بۆی بخوێنمەوە.

" ' 'کە قوماشەکەی دامێ پێی گوتم: 'ئەوە کاری خوشکمە.' منیش لێم پرسی: 'خوشکت ناوی چییە؟' گوتی: 'ناوی نوورولهودایە' دوایەش گوتی: 'ئەو قوماشە لە لای خۆت راگرە.' ئیدی بە دڵێکی خۆش و شادەوە مالاوایم لەو کرد و گەرامە لای ئامۆزاکەم.

" ' 'ئامۆزاکەم کە منی دیت، هەستا. فرمێسکی هەر وا بە چاوەوە بوو. دوایی هات سینگی منی ماچ کرد و گوتی: 'بەڵێنییەکەت بردە سەر؟ شێعرەکەی گوتم بۆت خوێندەوە یان نا؟' گوتم: 'لە بیرم چوو؛ هۆکارەکەشی وێنەی ئەو مامزە بوو.' ئیدی قوماشە ئاوریشمەکەم لەبەردەمی دانا. لە جێوە هەستا و کشاوە. دەستی کرد بە گریان و گوتی:

ئاوەز رێشاندەری هەرکەسێ بێ
قسەی دڵی ناکا گیانیشی دەرچێ
سفرەی دڵی خۆی قەت ناکاتەوە
دەزانێ کەس گرێی ناکاتەوە
درۆ و دەلەسە بڵقی سەر ئاوە
کۆشکی بەردین بێ بەفری بەر تاوە
رێکەوتیش دیارە بێ بنەمایە
شتی بێبنەما بە کەڵک نایە

" ' 'گوتی: 'کورمام، ئەو قوماشە ئاوریشمەم بدەیە.' منیش دامێ. قوماشەکەی کردەوە وێنەی مامزەکەی تێدا دیت. کە بوو بە شەو و کاتی رۆیشتنی من بوو، ئامۆزاکەم گوتی: 'برۆ، بەلام ئەو بەیتە شێعرەی پێم گوتی بۆی بخوێنەوە و لە بیرت چوو، بۆی بخوێنەوە.' وا بوو من رۆیشتمەوە ئەو باخە و شوێنەکەی خۆم. کچە ماچی کردم و لە پەنا خۆی دایناِم. کاتێک خواردن و خواردنەوە تەواو بوو، خەریکی ماچ و مووچ و بەزمی خۆمان بووین وەک شەوی رابردوو. هەتا بەری بەیانی. هەستام بێمەوە، شێعرەکەم بۆ خوێندەوە.

که ئەوەی بیست، فرمێسک بە چاویدا هاتە خوارێ و لە وەڵامدا ئەو شێعرەی گوت:

خۆشەویستی، هێمنی و سۆرشاردنەوە و خۆخواردنەوەیە
جەرگی دەوێ کە گۆی ئەڤین لەو مەیدانە بەریتەدەر

" ' 'ئەمن شێعرەکەی ئەویشم لە بەر کرد. لەوەی کە پەیامی ئامۆزاکەم گەیاند و بەڵێنییەکەم بردە سەر، خۆشحاڵ بووم. بە دڵێکی خۆشەوە لە باخ هاتمە دەرێ و هاتمەوە لای ئامۆزاکەم. سەیرم کرد خەوتووە و دایکم لەپشت سەری دانیشتووە و بۆی دەگری. که دایکم منی دیت، گوتی: 'ئەوە لە کوێی؟ هەی نەمێنی! چۆن ئەو ئامۆزایەی خۆت بەو حاڵەوە بەجێ هێشتووە و لە خەمیدا نی؟' کاتێک کچە مامەکەم منی دیت، سەری هەڵێنا و دانیشت و گوتی: 'ئازیزم، ئەو بەیتەت بۆ خوێندەوە یان نا؟' گوتم: 'ئەرێ، بۆم خوێندەوە.' که بیستی، گریا و لە وەڵامدا ئەویش بەیتێکی دیکەی خوێندەوە. کچە مام گوتی: 'شێعرەکەیت لە بەرە؟ دا بۆم بخوێنەوە.' بەیتەکەم بۆ خوێندەوە. لە قوڵپەی گریانی دا، پاشان ئەو بەیتەی خوێندەوە:

گەر کەسێ هێمن نەبێ و نهێنی هەڵنەگرێ
چۆن لەبن باری ئەڤین، دەتوانێ خۆی بگرێ؟!

" ' 'بە منی گوت: 'کاتێک چوویتەوە بۆ لای ئەو پەریزادەیە، ئەو بەیتەی بۆ بخوێنەوە.' گوتم: 'ئیشەڵڵا بۆی دەخوێنمەوە.' هەر بەپێی ڕۆژان چوومەوە باخ و چمان کرد و چۆنمان ڕابرد لە باسکردن نایە. که ویستم بێمەوە، بەیتە شێعرەکەم بۆ خوێندەوە. ئەوەندە گریا تا خوێن لە چاوی هات و ئەو بەیتەی خوێندەوە:

هەر کەسێ سەبری نەبێ و سۆری ئەڤین بدرکێنێ
بمرێ باشە چونکە ئەو، بوونی قرووشێک ناهێنێ

" ' 'بەیتەکەی ئەویشم لە بەر کرد و بەرەو ماڵ گەڕامەوە. کاتێک گەڕامەوە لای کچەمامەکەم. سەیرم کرد ئەوە بێهۆش کەوتووە و دایکم لە لای دانیشتووە. کە کچە مامەکەم گوێی لە دەنگی من بوو، چاوی کردەوە و گوتی: 'ئازیزم، بەیتەکەت بۆ خوێندەوە؟' گوتم: 'ئەرێ، بۆم خوێندەوە. کە شێعرەکەی تۆی بیست، دەستی کرد بە گریان و بەو شێعرە وەڵامی دامەوە.' شێعرەکەم بۆ ئامۆزاکەم خوێندەوە. ئەویش کە شێعرەکەی بیست، دڵی لە بوورەوە چوو. پاشان ئەو بەیتەی گوت:

گوێمان گرت و قەبووڵمان کرد، بە ئاســـانی گیانیشـــمان دا
ئەڤیندار دەبێ لەو ڕێیە گیانی بدا ســووک و ســانـــــــــــا

" ' 'کە شـــەو هاتەوە، هەر بە هەوای جاران چوومەوە باخ. ســـەیرم کرد ئەوە ئەو چاوکەژاڵە لەوێ دانیشـــتووە و چاوەڕێی منە. دانیشـــتم. چێشـــتمان خوارد و مەیمان خواردەوە و دەســـتەملان بووین هەتا بەیانی نەهاتمەوە و هەر لەوێ خەوتم. کە ویســـتم بگەڕێمەوە، شـــێعری ئامۆزاکەمم بۆ خوێندەوە. کە شـــێعرەکەی بیســـت، هاواری کرد و ئاخێکی هەڵکێشــا و گوتی: 'بە خودا خاوەنی ئەو شـــێعرە مردووە.' ئیدی دەســـتی کرد بە گریان و گوتی: 'خودا بڵێم چت لێ بکا! خاوەنی ئەو بەیتە خزم و کەسـت بوو یان بێگانە؟' گوتم: 'ئامۆزامە.' گوتی: 'درۆ دەکەی. ئەگەر ئەو ئامۆزات بایە، خۆشت دەویست، هەر وەک چۆن ئەو تۆی خوش دەوێ. ئێستا تۆ بکوژی ئەوی. خودا بتکوژێ وەک ئەوت کوشت. بە خودا ئەگەر من بمزانیبا ئەتۆ ئامۆزایەکی ئاوات هەیە، قەت نەمدەهێشت لێم نیزیک بییەوە.' منیش پێم گوت: 'ئەمن پێم گوتی دانەری ئەو شـــێعرە ئـامۆزامە و هەر ئەوە کە ئەو ئاماژانەی تۆم بۆ لێک دەداتەوە. ئەوە بیری ورد و لێزانانەی ئەو بوو منی بە تۆ گەیاند.' کچە ڕووهەیڤەکە گوتی: 'ئەی منی ناسـی؟' گوتم: 'بەڵێ.' گوتی: 'خۆشـی لە گەنجیت نەبینی وا نەتهێشـت خۆشـی لە گەنجێتی ببینێ. ئێسـتا برۆ بزانە چۆنە.' من ڕۆیشـتم و زۆریش نیگەران بووم. کە گەیشتەمە سەری کۆڵانکەی خۆمان، گوێم لە شین و ڕۆڕۆ بوو. پرسیارم کرد. گوتیان: 'عەزیزەیان لەپشت دەرگاکە بە مردووی هەڵگرتووەتەوە.' کە هاتمەوە ماڵێ و دایکم دیت، بەسەرمدا گوڕاندی: 'خودا تۆڵەی خوێنی ئەوت لێ بکاتەوە.' ' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و بیستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــكۆ، ئەو لاوە بە تاجولملووكی گوت: 'كە چوومە ماڵێ، دایكم گوتی: 'خوێنی ئەو بێچارەیە لە ئەســـــتۆی تۆیە. خودا حەقی ئەوت لێ بســـــتێنێتەوە.' دوای ئەوە باوكم هات. كفنمان كرد و بردمان ناشـتمان. سـێ ڕۆژان لەســـەر گۆڕەكەی بووین. دوای ئەوە هاتینەوە ماڵێ و من زۆرم خەم بوو. دایكم هاتە لام و گوتی: 'هاتووم پێت بڵێم چیت لە ئامۆزاكەت كرد وا دڵت تۆقاند و كوشـــــتت؟ ڕۆڵە، ئەمن هەر كاتێك لێم دەپرســـــی بۆ نارەحەتی و ڕەنگت زەرد هەڵگەڕاوە؟ هیچی پێم نەدەگوت. ئەتۆ لە ڕێی خودا پێم بڵێ چت لێ كرد.' گوتم: 'ئەمن هیچم لێ نەكردووە.' دایكم گوتی: 'خودا حەقی ئەوت لێ كاتەوە! ئەو چەوساوەیە هەتا مرد هیچی لای من نەدركاند و هەر دەیشـاردەوە، وای نیشـان دەدا لە تۆ ڕازیە. لە ئاویلكەداندا چاوی هەڵێنا و گوتی: ' ئامۆژن، ئەوە من دەمرم خودا لە خوێنی من خۆش بێ و گەردنی كوڕەكەت ئازاد بێ.' من گوتم: 'كچم، قســـەی وا مەكە! خودا ڕەحم بە گەنجییەكەت بكا و شـــفات بدا.' زۆرم لێ پرســـــی: 'باشـــە ئەتۆ چیتە؟' هیچی نەگوت و بزەیەكی هاتێ و گوتی: 'ئامۆژن، ئەگەر كوڕەكەت هەر هاتوچۆی ئەو شـــوێنەی كرد كە خووی پێ گرتووە، پێی بڵێ لە كاتی هاتنەوەی لەو شـوێنە ئەو وتەیە بڵێتەوە: 'ئەمەك باش و پیرۆزە و، كەڵەك و دەهۆ گلا و نەشـــیاوە.' من بۆیە ئەوەت پێ دەڵێم ڕایســـــپاردبووم. خۆشـەویسـتی و دڵسـۆزییە لەگەڵ ئەوی دەكەم، بۆ ئەوەی سـەلماندبێتم كە بە زیندووی و مردووی هەر سـۆزم بۆی بووە و هەیە.' ئینجا شـتێكی دامێ و سـوێندی دام كە نەتدەمێ هەتا نەتبینم ئەوە شـین و گابۆڕی بۆ دەكەی و دەیلاوێنییەوە. ئێستا ئەوە لە لای منە. هەر كاتێك ئاوات ببینم، ئەوە دەتدەمێ.' ئەمن بە دایكمم گوت: 'ئەو شـــــتەم دەیە.' نەیدامێ. ئەوەندەش گەوج و نەفام بووم، لەو كاتەشـدا هەر لە بیری گراوەكەی خۆمدا بووم. هەست و ســۆزم بۆ ئامۆزاكەی خۆم زۆر نەبوو. حەزم دەكرد بچمەوە لای دڵدارەكەم و شـــەو و ڕۆژ لە لای ئەو بم.

" ' 'دوای چوار ڕۆژ، كە شـەو داهات، چوومەوە باخ و سـەیرم كرد ئەوە كچە شـۆخ و شـەنگەكە لەوێیە. كە منی دیت، هەسـتا و دەسـتی لە ملم كرد و هەواڵی كچە مامەكەمی لێ پرسـیم. گوتم: 'مرد و ناشـتیشـمان. ئەوە چوار ڕۆژی لێ ڕادەبرێ و ئەوشـــەو شـــەوی پێنجەمیەتی.' كە ئەوەی بیســت، دەســتی كردە گریان و تووڕە بوو، گوتی: 'پێم نەگوتی تۆ ئەوت كوشــت؟ ئەگەر پێش ئەوەی بمرێ بە منت گوتبا، پاداشــی چاكەكانیم دەداوە. چونكە ئەو چاكە و گەورەیی لەگەڵ من كرد و تۆی بە من گەیاند. ئەگەر ئەو نەبایە، ئەمن قەت بە تۆ نەدەگەیشتم. ئێستا نیگەرانی تۆم كە ئاهی ئەو بتگرێ و تووشـی بەڵایەك بی و شـتێكت بەســـەر بێ.' پێم گوت: 'كچە مامەكەم پێش ئەوەی بمرێ گەردنی منی ئازاد كردووە و لێم

خۆش بووه.' ئیدی ئەوەی دایکم بۆی گێرامەوە، هەمووم بۆ گێراوە. گوتی: 'کە چوویەوە لای دایکت، هەوڵ بدە بزانە ئەوە چییە لە لای دایکت داینـاوە.' ئەمن پێم گوت: 'لە دایکمم بیست کە کچە مامەکەم پێش ئەوەی بمرێ، وەسیەتی کردووە و گوتویەتی: 'ئامۆژن، ئەگەر کوڕەکەت هەر هـاتوچۆی ئەو شـــوێنەی کرد کە خووی پێ گرتووە، پێی بڵێ لە کـاتی هاتنەوەی لەو شـــوێنە ئەو وتەیە بڵێتەوە: 'ئەمەک باش و پیرۆزە و، کەڵەک و دەهۆ گڵا و نەشـیاوە.' ' کە ئەو قسـەیەی لێم بیسـت گوتی: 'خودا لێی خۆش بێ، ئەوە ئەو بوو تۆی لە دەسـت من ڕزگار کرد. تازە بێخەم بە.' ئەمن ئەو وتەیەی ئەوم پێ سـەیر بوو، گوتم: 'بە تەما بووی چم لێ بکەی لە کاتێکدا سـۆز و خۆشـەویسـتی لەنێوانماندا بوو؟' گوتی: 'ئەتۆ منت خۆش دەوێ، لە ئاسـت من چاوچڵێسـی، لە کاتێکدا تۆ هێشـتا منداڵ و دڵپاکی و لە فڕوفێڵی ژنان ناگەی. ئەگەر کچە مامەکەت مابا، ئێسـتا یارمەتی دەدای و تۆی دەپاراسـت. هەر وەک تۆی لەو بابەتەی گوتم ڕزگار کرد. ئێسـتا من پێت دەڵێم خۆ لە ژنان بپارێزە و دووریـان لێ بکە. هەر وەک گوتم، تۆ لە مەکر و کوولەی ئەوان نـاگەی. ئەوە دەیزانی و ئاماژەکانی بۆ لێک دەدایەوە، تازە لە دەسـتت چوو. ئەمن لەوە دەترسـم کە تووشـی چەرمەسەری و گرفتاریەکی وا ببیت، ڕێی دەربازبوونت نەبێ.' ' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و بیست و یەکەم هات

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'ئەو لاوە بازرگانە بە تاجولملووکی گوت کچەکە گوتی: 'ئەمن لەوە دەترسم تووشی بەڵایەک بی و دوای کچە مامەکەت کەس نەبێ ڕزگارت کا. هەزار حەیف بۆ ئەو ئامۆزایەت. خۆزگە من پێش مردنەکەی دەمناسی و پاداشی ئەو چاکانەیم دەداوە. خودا لێی خۆش بێ وا ئەو نهێنی خۆی شاردەوە. ئەگەر ئەو نەبا، ئەتۆ قەت بە من نەدەگەیشتی. ئێستا من چاوەڕوانییەکم لێت هەیە، ئەویش ئەوەیە کە گڵکۆکەی ئەوم پیشان بدەی تا سەردانی بکەم و چەند بەیتێک لەسەر کێلەکەی بنووسم.' گوتم: 'ئیشەڵلا سبەینێ گڵکۆکەیت پیشان دەدەم.' ئیدی ئەو شەوە لەگەڵ ئەو خەوتم. بەڵام هەر جارناجارێک دەیگوت: 'خۆزگە پێش ئەوەی بمرێ، ئەو ئامۆزایەتت پێ دەناساندم.' ئیتر لێم پرسی: 'مانای ئەو دوو وشەیەی کە، 'ئەمەک پیرۆزە و کەڵەک گلاوە' چییە؟' وەڵامی نەدامەوە. کە ڕۆژ بووەوە، توورەکەیەکی زێڕ هەڵگرت و پێی گوتم: 'هەستە گۆڕەکەیم پیشان دە با چەند بەیتێکی بۆ بنووسم. گومبەزێک لەسەر گۆڕەکەی دروووست دەکەم و خێر و خێراتی بۆ دەکەم. ئەو زێڕانەی هەموو بۆ خەرج دەکەم.' ئیتر من هەستام پێشی کەوتم و ئەو کچە کوڵمە گەشەش بەدوامدا دەهات. خێر و خێراتی دەدا بە هەژاران و دەیگوت: 'ئەو خێرە هی ئەوەیە کە ئەو نهێنی ئەوینی خۆی نەدرکاند تا ئەو کاتەی گیانی دەرچوو.'

" ' ' ئیدی، هەر ڕۆیشتین کچە لەو توورەکەیە بەخشییەوە گوتی: 'ئەوە خێری عەزیزە بێ.' تا گەیشتینێ و زێڕەکانی تەواو بوون. کە چاوی لە گۆڕەکە کرد، خۆی بەسەردا دا و دەستی کردە گریان. دوای ئەوە قەلەمێکی دەرهێنا و لەسەر کێلەکە ئەو شیعرەی نووسی:

ڕۆیشت ئەو گوڵە نۆپشکووتووە، لە بەرچاو نەما
سیس بوو ژاکا زوو، لە تاو ئازیزی گوڵزار دۆش داما
لە کاتێکدا کە، وڵات زەلی بوو لەبەر تیراوی
خنکا لە توونیان، تازە نەمامێک لە لێوار چەما

'دوای ئەوە بەگریانەوە هەستا و گەڕاینەوە باخ. لەوێ پێی گوتم: 'تۆ ئەو خودایە پێم لێ نەبڕی[1].' منیش گوتم: 'بالسمع و الطاعة.[2]' ئیدی هەمیشە هاتوچۆم دەکرد و هەر شەوێک کە لەوێ دەبووم، زۆر بەدەورمدا دەهات و ڕێزی دەگرتم و ئاگای لێم دەبوو. خەریکی خواردن و مەی و ماچ و مووچ و تێخزان، لەبەرکردنی جلی ئاوریشم و ئەوانە بووم هەتا

---

١. پێ لێ بڕین: لەبیربردنەوە. هاتوچۆنەکردن.

٢. دەبیستم و بە گوێت دەکەم.

قەڵەو و زەلام بووم و خەم و خەفەتی کچە مامەکەم لە بیر چووەوە. بە کورتی، تا ساڵێک خەریکی عەیش و نۆش و ڕابواردن بووم. لە سەرەتای ساڵدا بووم، ڕۆژێک چوومە گەرماو، کە هاتمەوە دەرێ، پیاڵەیەکم مەی خواردەوە. خۆم بە میسک و عەنبەر و گوڵاو بۆنخۆش کرد. چ ئاگام لە فرۆفێڵ و داو و تەپکەکانی ڕۆژگار نەبوو. کە بوو بە شەو، بە هەوای دیداری گوڵئەندام ویستم بچم بۆ باخ. بەڵام مەست و سەرخۆش بووم و ئاگام لە خۆم نەبوو کە بۆ کوێ دەچم. بە سەرخۆشی ڕووم لە گەڕەکێک کرد کە گەڕەکی نەقیبیان پێ دەگوت. هەر وا بە کۆڵانێکدا دەڕۆیشتم، لە ناکاو پیرێژنێکم لێ پەیدا بوو، بە دەستێک مۆمێکی هەگرتبوو و بە دەستەکەی دیکەی نامەیەکی پێچراوەی پێ بوو.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و بیست و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'عەزیز گوتی: 'پیرێژنێکم لێ پەیدا بوو، بە دەســـتێک مۆم و بە دەستێک نامەیەکی پێچراوەی پێ بوو. گریا و ئەو شێعرەی گوت:

له خەوما دوێشـــەو کە مـــانـگـێـک هەڵات
لە سیمای ئەودا شێوەی تـــــــــــــۆ دەرهات
لـێـکـیـان داوە بـۆم غەریـبـێـک دێـتەو
ئەو ڕۆژە کەی دێ، بـڵـێـن عەدیە[1]ت هـات؟

" ' 'که منی دیت، گوتی: 'ڕۆڵە، دەتوانی نووســراوە بخوێنیتەوە؟' گوتم: 'دەتوانم.' ئیدی نـامەکەی دامێ و گوتی: 'ئەوەم بۆ بخوێنەوە.' ئەمن نـامەکەم وەرگرت و خوێنـدمەوە. ناوەرۆکەکەی ئاوا بوو: 'ئەوە نووسـراوەیەکە لە دوورکەوتەیەکەوە بۆ خۆشـەویسـتانی...' کە پیرێژنە ئەوەی لە من بیســـت، خۆشـــحاڵ بوو. زۆری دوعا بۆ کردم و گوتی: 'خودا خەمت لە دڵی دەرهاوێ. وەک خەمت لە دڵی مندا نەهێشت.' ئیتر نامەکەی لە من وەرگرتەوە و یەک-دوو هەنگاوێک ڕۆیشــت و گەڕاوە و دەســتمی ماچ کرد و گوتی: 'گەورەم، چێژ لە گەنجێتی خۆت ببینی یا خوا! دوو-سێ هەنگاو هەتا دەرکی ئەو ماڵە لەگەڵم وەرە؛ دەترسم ئەگەر ئەوەی گوتت لەو نووسراوەیەدا نووسراوە، بەوانی بڵێم باوەڕم پێ نەکەن. ئەو چەند شـــەقاوە[2] لەگەڵم وەرە و نامەکەیان بۆ بخوێنەوە.' ئەمن لێم پرســـی: 'ئەو نامەیە لە کوێوە هاتووە؟' گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەوەیان لە لای کوڕەکەمەوە بۆ هێناوم کە دە ســاڵە چووە بۆ ســـەفەر و هیچ هەواڵێکمان لێی نەبوو و دەســـتمان لێ شـــوتبوو، وامان دەزانی نەماوە و مردووە. ئێستا ئەو نووسراوەیە لەوەوە گەیوەتە دەستمان. خوشکێکی هەیە، ئەو ماوەیەی ئەو ڕۆیشـــتووە، شـــەو و ڕۆژ دەگری. ئەگەر ئێســـتا پێی بڵێم براکەت زیندووە و ســـاغ و سـڵامەتە، باوەڕم پێ ناکا. دەڵێ دەبێ کەسـێک بێنییە ئێرە نووسـراوەکەم بۆ بخوێنێتەوە و دڵم بحەســـێنێتەوە و ئاســـوودەم کا.' دوای ئەوە گوتی: 'ڕۆڵە گیـان، بۆ خۆت دەزانی ئەوینداران و چاوەڕوانان دڕدۆنگن و باوەڕ بە زۆر شـــت ناکەن. ئەتۆ منەتبارم بکە و لەگەڵم وەرە لەپشت پەردە ڕاوەستە و نووسراوەکە بخوێنەوە تا ئەو کچە هەناسەساردەم گوێی لە دەنگی تۆ بێ. ئەتۆش خێرت بگاتێ وەک پێغەمبەر درووود و ســـڵاوی خودای لێ بێ فەرموویەتی: 'هەرکەس گیروگرفت و خەم و خەفەتی دەردەدارێک کەم کاتەوە، خودا

---

١. عەدیە: کاتی شتێک هاتن.

٢. شەقاو: هەنگاو،پێنگاف.

حەفتا و دوو خەم و خەفەت لە ژیانیدا کەم دەکاتەوە.' ئەمنیش پەنام بۆ تۆ هێناوە. بە دڵشـــکاوی مەمگێڕەوە.' ئیتر دڵم نەشـــکاند و لەگەڵی کەوتم. ڕۆیشـــتین و گەیشـــتینە بەردەرگەی ماڵێکی زۆر خۆش. ئەمن لەپشـــت دەرگاکە ڕاوەســـتام. پیرێژن بە زمانی عەجەمانە قاوی کرد. لە ناکاو کچێکی ڕووگەش و شـــاد هات کە دەرپێکەی هەتا ئەژنۆی هەڵکردبوو و بەلەکی وەک بلووری وەدەر خستبوو. وەک شاعیر دەڵێ:

دەلیـــــــــــنگت هەتا ئەژنۆت هەڵکردووە
دڵی پـــــــــــــیر و لاوت سست کردووە
هێند سپی و تورتن، دەڵێی کەلەمن
بێ قولاپ ماسی دڵمیان گرتووە

" ' 'پووز و بەلەکی بلوورینی پڕ لە پوورە و خرخاڵی زێڕین و ڕازاوە. قۆڵ و بازنی سپی، ئاوری لە خەرمانی دڵ و دینی بینەرانی بەر دەدا. گوێچکەی گوارەی لوئلوهی تێدا و ملی ملوانکەی گەوهەری گرانبایی پێدا کردبوو. ئارەقچنێکی کووفی ڕازاوە بە نقیمی گرانبای لە سەردا بوو. وەک کەو بە ناز و کرێشمە و لەنجەو لارەوە دەهات هەتا گەیشتە بەردەرگە. کە منی دیت، بە زمانێکی پاراو و شـــیرینەوە گوتی: 'دایە ئەوەیە هێناوتە نووســـراوەکە بخوێنێتەوە؟' پیرێژن گوتی: 'بەڵێ ئەوەیە.' ئیدی کیژە نامەکەی لە پیرێژنەکە وەر گرت و دەستی کێشا بمنداتێ. ئەمنیش دەستم کێشا نامەکەی لێ وەرگرم. سەر و شانم بردە ژووری لێی نیزیک بوومەوە. پیرێژن سەری لەسەر نێوقەدم دانا و پاڵی پێوە نام تا وای لێ هات سەیرم کرد ئەوە لە حەوشەی ئەوانم. دیتم پیرێژنیش وەک بریسکە خۆی لە ژووری کوتا و دەرگاکەی داخست.' ' "

لێرەدا، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش تەواو بوو، شەهرزادیش درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و بیست و سێیەم هات

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'عەزیز بە تاجولملووکی گوت: 'پیرێژن پاڵی بە منەوە نا و خستمیە دیوی حەوشـــەوە. خۆشـــی خۆی دەژووری ڕاکرد و دەرگاکەی گاڵە دا. کەنیشـــکە پەریڕووەکە کە زانی من لە حەوشـــەم و دەرگەش داخراوە، ئامبازم بوو، خســـتمی و ســـواری ســـەرم بوو. دەســـتی کردە هەڵگلۆفین و شـــێلان و ماچکردن و قتیلکەدانم. ئینجا هەڵیستاندم و وای بە باوەشەوە گوشیم، گوتم بە خودا تازە ڕزگارم نابێ. دوایی بردیانمە ژووری. پیرێژنە مۆمێک بە دەستەوە لەپێشـمانەوە دەڕۆیشـت و ئێمەش بەدوایدا. هەتا لە حەوت داڵان تێپەڕین و گەیشـــتینە دیوێکی گەورە، چوار هەیوانی لە چوار لاوە دەهاتەوە سەر، تەواوی بەردی مەڕمەڕ و ڕوخامی تێ گیرابوو. بە فەڕش و مافووری دیبا و پەردەی ئاوریشـــم و تەختی ڕازاوە بە زێڕ و زیو و گەوهەر بە جۆرێکی وا ڕازێندرابووەوە کە شـــایانی شـــایان بوو. پێی گوتم: 'ئازیزم، حەزت لە مردنە یا لە ژیان؟' گوتم: 'جا دیارە، لە ژیـان.' گوتی: 'جـا کە حەزت لە ژیـانە، دەبێ من بە ژنی خۆت قەبووڵ بکەی.' گوتم: 'پێم ناخۆشـــە، من شـــایانی تۆ نیم، شـــتی وا نابێ.' گوتی: 'ئەگەر لەگەڵ مندا زەماوەند بکەی، لە دەســـــت ئەو دەلالی مەکربازە بە ســـــلامەت ڕزگارت دەبێ.' گوتم: 'دەلالی مەکرباز کێیە؟' پێکەنی و گوتی: 'یانی تۆ نایناســـی؟! ئەوە ســـاڵێک و چوار مانگە هاوســـەری تۆیە. خودا لەنێوی بەرێ! لەو دنیایەدا کەس لەو چەچوولتر و فێڵبـازتر نییە. ئەوە بەر لە تۆ زۆری گەنج و لاوی دیکە کوشـتووە و کاری وای کردووە سـەیر. پێم سـەیرە لەو ماوەیەدا چۆنە تۆی نەکوشتووە؟!'

" ' 'ئەمن کە گوێم لەو قسـانەی ئەو بوو، سـەرم سـووڕ ما و گوتم: 'تۆ ئەو لە کوێوە دەناسی؟' گوتی: 'ئەمن ئەو چاک دەناسم، بەلام پێم خۆشە ئەتۆ بەسەرهاتی خۆت و ئەوم بۆ بگێڕیوە با بزانم چۆناوچۆنە تا ئێستا تۆی نەکوشتووە و بۆم ڕوون بێتەوە.'

" ' 'ئیدی من بەسەرهاتی خۆم لە نووکەوە تا کۆتای و، بەسەرهاتی عەزیزەی ئامۆزاشم بۆ گێڕاوە. ئەو کچە کە هەواڵی مردنی عەزیزەی بیســـت، زۆری خەم بوو، فرمێســـکەکانی هاتنە خوارێ و بە داخ و کەسـەرەوە دەستەکانی هەڵدەگلۆفت گوتی: 'خودا ئارامت کاتەوە، ئەو بووەتە هۆی ئەوەی تا ئێســـتا تۆ نەکوژێ. ئەگەر ئەو نەبایە، تا ئێســـتا ئەو بەڕەڵای فێڵبازە تۆی کوشـــتبوو. ئەمن لەمەو بەدواش لە فێڵ و کەڵەکەکانی ئەو دەترســـم. بەلام نـاتوانم هیچ بڵێم.' ئەمن گوتم: 'تـازە ئەوەی بووە بووە، چارەیەک نییە.' ئیدی ســـەری ڕاوەشـاند و گوتی: 'شـتی وەک عەزیزەت وەگیر ناکەوێ.' ئەمن بۆم گێڕاوە کە ئامۆزاکەم لە ئاویلکەداندا وەســـیەتی بۆ کردووم و بە منی گوتووە کە دوو وشـــە بەو بڵێم و دوو

وشەکە ئەمانە بوون: 'ئەمەک باش و پیرۆزە و، کەڵەک و دەهۆ گڵا و نەشیاوە.'

" ' 'کە کچە ئەو قسـەیەی لە من بیسـت، گوتی: 'گیانەکەم بە خودا ئەوە هەر لەبەر ئەو دوو وشـەیەیە کە تۆی نەکوشـتووە. خودا لە کچە مامەکەت خۆش بێ کە بە زیندووی و مردووی هەر ئاگای لێتە و دەتپارێزێ. بە خودا هەمیشـە بە ئاواتەوە بووم ڕۆژێک لەگەڵ تۆ بم. بەڵام جێبەجێ نەدەبوو مەگین بە فێڵ. ئەوە ئەوڕۆ هێنامی بۆ ئێرە. جارێ هێشـا منداڵی و لە فڕوفێڵی ژنـان و جادووی پیرێژنـان نـاگەی.' گوتم: 'نـا وەڵڵا.' گوتی: 'لەمەو بەدوا دڵخۆش بە، ئەگەر ئامۆزاکەت نەماوە، ئەوە من لە جێی ئەو هەم. تۆ لاوێکی جوانچاک و لەبەردڵانی و هەر بۆیە لەسـەر فەرمانی خودا و پێغەمبەر ئەتۆ بە مێردی خۆم قەبووڵ دەکەم و هەرچی لە ماڵی دنیاش بتهەوێ لە شـتی گرانبای، بۆت ئامادە دەکەم. تۆ لە من ئەرخەیان بە و ترسـت لە هیچ نەبێ. پێویسـت ناکا هیچم بۆ خەرج کەی. هەمیشـەش نانی گەرم و ئاوی سـارد ئامادە دەبێ. دڵنیا بە هیچ ناڕەحەتی و بارگرانییەکم بۆت نابێ. ئەتۆ بەس بەڵێنم پێ بدە لەگەڵ من بی و بەجێم نەهێڵی و باوەڕت بە خۆت بێ.' ئینجا ڕووی لە پیرێژنە کرد و گوتی: 'دایە، کێت لە لایە بیهێنە.' پیرێژنە لەڕێوە چوار شـایەدی هێنا و چوار مۆمی داگیرساند و دایانان. شایەدەکان هاتنە ژووری، سڵاویان کرد و دانیشتن. کچە هەستا چارشـێوێکی بەسـەریدا دا و یەکێک لە شـایەدەکانی کردە وەکیلی خۆی و لێکیان مارە کردین. کچە ئەوانی بە شـایەد گرت کە تەواوی مارەییەکەی وەرگرتووە و، بێجگە لەوەش دەهەزار درەمی منیشی بە ئەمانەت لە لایە.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كه شەوی سەد و بیست و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــكۆ، 'كچە دانیشـــتووانی بە شـــایەد گرت كە تەواوی مارەیەكەی وەرگرتووە و دەهەزار درەمی كوڕەشـــی بە ئەمانەت لە لایە. ئیدی شـــایەدەكان هەموو شتەكانیان نووسی و پاداشی خۆیان وەرگرت و ڕۆیشتنەوە. دوای كیژە هەستا و جلەكانی داكەند و كراسێكی یەكسەرەی كە تاڵتاڵی زێڕینی تێدا بوو لە بەر كرد و هات دەستی منی گرت و گوتی: 'دڵنیا بە لەوەی كە من بۆ تۆ ژنێكی وەفادار دەبم، هیوادارم ئەتۆش ڕاســتاڵ و یەكدڵ بی و هەتا ئەوەندەی لە ژیاندا ماوین بە خێر و خۆشی پێكەوە ڕایبوێرین. بەشكم خودا منداڵی چاك و نەجیبیشمان بە قسمەت بكا. ئیدی هەر خەریكی پەروەردە و بارهێنانی ئەوان بین و تەمەنێك لە پەنا ئەو نیعمەتە خواداوانەدا بێ خەم و نارەحەتی بژین. ئەمنیش هەوڵ دەدەم وەك كچە مامەكەت ژنێكی وەفادار بم و لە كەند و كۆسپەكانی ژیان ئاگادارت كەمەوە و لە بەڵاكانی ڕۆژگار بتپارێزم.'

" ' 'دوای ئەوەی ماوەیەكمان بەو قســانە تێپەڕ كرد، پێكەوە هەســتاین چووینە جێوە و خەوتین. بەیانی ویســـتم بڕۆمە دەرێ كە ئەو كچە بە پێكەنینەوە هاتە لام و گوتی: 'پێم وا بێ ئەتۆ ئەمنت وەك بەرەڵایەك هاتە بەر چاو. هەڵەی وا نەكەی و بیری وا بە زەینتدا نەیە. ئێســـتا ئەتۆ بە حوكمی قورئان و ســـوننەت مێردی منی. ئەوەش بزانە ئەوماڵەی كە تۆ تێیدای، ساڵی جارێك دەرگاكەی دەكرێتەوە. هەستە چاو لە دەرگاكە بكە.' هەستام چاوێكم لە دەرگاكە كرد. تەمەشـــا دەكەم ئەوە دەرگا داخراوە و بە بزماری گەورە و قایم دەرگاكە دابەســـتراوە و تەواوی قایم كراوە. گەڕامەوە لای كچە و پێم گوت كە دەرگاكەیان بە بزماری ئاسن و شت قایم كردووە. گوتی: 'ئازیزم، لێرەدا ئارد و برنج و میوە و شـەكر و گۆشـــتی پەلەوەر و مەڕی ئەوەندە لێیە بەشـــی چەند ســـاڵی دیكەش دەكا. هەر بۆیە هەتا ســاڵێكی دیكە ئەو دەرگایە ناكرێتەوە. ئەمن دەزانم كە لەو ماوەیەدا ئەتۆ بە جەستە لێرە و بە ڕۆح لە جێگایەكی دیكە دەبی.'من گوتم: پەنا بە خوا.'

" ' 'پاشان بە پێكەنینەوە گوتی: 'جا مانەوەی تۆ لێرە چ زیانێكی هەیە، ئەویش بۆ تۆ كە پیشەی كەڵەشێر دەزانی؟' ئەمنیش پێكەنیم و ملكەچی بووم و هەستام لێی چوومە پێشێ و خەریكی پیشـەی كەڵەشێرانە بووم، هەتا دوازدە مانگی ڕەبەق. وابوو دووگیان بوو، منداڵی بوو. كە بوو بە سەری ساڵی تازە، سەیرم كرد دەرگایان كردەوە و ئارد و نان و شەكر و شتی وایان هێنا. ئەمن ویستم بچمە دەرێ، كچە گوتی: 'ڕاوەستە هەتا شـەو مەچۆ دەرێ.' هەتا شەو دانیشتم و ویستم بچمە دەرێ. ترس و دڵەڕاوكێم بوو، كچەكە پێی گوتم: 'دەبێ ســـوێندم بۆ بخۆی پێش ئەوەی دەرگاكە داخەن دێیەوە. دەنا بە خودا ناهێڵم بڕۆیە دەرێ.

سوێند بە شمشیر و قورئان و تەلاق خوارد کە پێش ئەوەی دەرگا داخەن دێمەوە کنی.

" ' 'دوای ئەو ڕێی دام، هاتمە دەرێ. یەکســـەر چوومەوە بۆ باخ. ســـەیرم کرد ئەوە دەرگای باخ کراوەتەوە. پێم ناخۆش بوو و گوتم: 'یانی ئەمن ســـاڵێکە نەهاتوومەوە؟ بڵێی ئەو کچە هەر وا لەســـەر بەڵێن مابێ؟ لە دڵی خۆمدا گوتم: 'دەبێ پێش ئەوەی بچمە لای دایکم، بچمە نێو ئەو باخەوە بزانم چ باسە.' کە چوومە نێو باخەکە نوێژی شێوان بوو.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و بیست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ’ئەو لاوە بە تاجولملووکی گوت: ’ئیدی چوومە ناو باخەکەوە و ڕۆیشـتم هەتا گەیشـتمە ئەو شـوێنە. سـەیرم کرد، کچە دۆش داماوە و سـەری وە ئەژنۆی کردووە، ئەوەندەش گریاوە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە و تەواو تێک چووە. هەر کە منی دیت، گوتی: ’سـپاس بۆ خودا کە سـلامەتی.‘ ویسـتی هەسـتێ، بەڵام ئەوەندە خۆشـحاڵ بوو کەوتەوە. ئیدی من خەجاڵەت بووم و چوومە پێشێ ماچم کرد و پێم گوت: ’چۆنت زانی من لەو کاتەدا دێمە ئێرە، وا چاوەڕێی منی؟‘ گوتی: ’نەمدەزانی دێیە ئێرە. بەڵام بە خودا ئەوە یەک ساڵە خەو نەچووەتە چاومەوە. لەو ڕۆژەوە کە تۆ ڕۆیشتی و قەرار بوو شەو بێیتەوە لام، ئەمن هەموو شـەوێک هەتا بەیانی هەر چاوەڕێت بووم. عاشـق دەبێ ئاوا بێ. ئێسـتا دەبێ بۆم بگێڕیەوە کە لەو سـاڵەدا چت کردووە و چت بەسـەر هاتووە وا دیار نەبووی.‘ بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕاوە. کاتێک زانی کە ژنێکی دیکەشم هێناوە، ڕەنگی پەڕی.

" ' ’پێم گوت: ’ئەوشـەو هاتوومەوە لات و دەبێ پێش کازیوەی بەیانی بڕۆمەوە.‘ گوتی: ’ئەوەی خۆی بەسـەردا سـەپاندی و بە فێڵ سـاڵێک لە ژوورێدا بەندی کردی، بەوەندەش تێری نەخواردووە وا تەلاقی پێ خواردووی کە دەبێ پێش کازیوەی بەیانی بچییەوە لای؟! ئیدی ئەوەندەی پێ ڕەوا نەدیتی شەوێک لە لای دایکت و شەوێکیش لە لای من بمێنیتەوە؟! ئەی بیرت لەوە نەکردووەتەوە بڵێی حاڵی ئەوەی سـاڵێک بەجێت هێشـت چۆن بووبێت؟ ئینجا خوالێخۆشبووی ئامۆزات کە ئەو ستەمەی لەو کرا تا ئێستا لە کەس نەکراوە، کەچی ئەو ئارامییەی ئەو هەیبوو تا ئێسـتا کەس نەیبووە. ئەو ڕۆژەی لە لای من ڕۆیشـتی، وام زانی خێرا دێیتەوە، دەنا قەت نەمدەهێشت بڕۆی و، لێرە زیندانیم دەکردی یان دەمکوشتی.‘ ئیدی توورە بوو، بە ڕقەوە چاوێکی لێ کردم. لەو جەنگەیەدا ئەمن ترسـام و تەواوی گیانم لەرزی. هەر وا کە بە ڕقەوە چاوی لێ دەکردم، گوتی: ’ئێسـتا کە ژن و منداڵت هەیە، بە کاری من نایەی ـــکوڕێکی هەرزەکار و تازەپێگەیشـتوو بە کاری من دێ. دەچی قەحبەم بەسـەر دێنی؟! شـەرت بێ دەبێ وای لێ بکەم لە چاوەڕوانی تۆدا کوێر بێ. کارێک بکەم نە بۆ ئەو بی و نە بۆ من.‘ ئیدی فەرمانی دا دە دانە کەنیزی دەوریان دام و خستیانم. کچەش هەستا و وێردێکی بە دەستەوە گرت و پێی گوتم: ’وەک بەرخ سـەرت دەبڕم و تۆڵەی ئەو خراپەیەت لێ دەکەمەوە کە لەگەڵ ئامۆزاکەت کردت.‘ کە ئاوا خۆم لە بەردەسـتی ئەو کەنیزانەدا بە زەبوونی لەسەر زەوی دیت و ئەو کێردەم لە دەست ئەودا دیت، ئەو دنیام بە چاوی خۆم دیت.‘ ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و بیست و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'عەزیز گوتی: 'کە خۆم لەو دۆخەدا دیت، مردنم هاتە بەر چاو. هەرچەندی پاڕامەوە و لالامەوە، هیچ. هەر توورەتر بوو. فەرمانی دا دەســـت و قاچیان بەستم و درێژیان کردم. بۆخۆی هات لەســەر سـینگم دانیشـت. دوو کەنیز قامکی لاقیان گرتم و دووش لەســەر ئەژنۆم دانیشـتن و ئیتر فەرمانی بەوان دا لێم دەن. ئەوەندەیان لێ دام هەتا لە هۆش خۆم چووم. کە وە هۆش هاتمەوە، لە دڵە خۆمدا گوتم خۆ ســـەرم بڕن چاکترە لەو جۆرە ئازار و جەزرەبەدانانە. لەو جەنگەیەدا قسەی ئامۆزاکەمم هاتەوە بیر کە گوتی: 'خودا لە شـــەڕی ئەوت بپارێزێ.' دەســـتم کرد بە شـــین و گریان و هاتوهاوارێک ســـەیر، ئیدی ئەو کچە دەســـتی داوە کێردەکە و بە کەنیزەکانی گوت: 'بیهێننە پێشـــەوە.' ڕایانکێشـامە پێشـــەوە. ئەو قســـەیەی کچە مامەکەمم هاتەوە بیر کە گوتی: 'کاتێک چوویتە لای، ئەوەی پێ بڵێ: 'ئەمەک باش و پیرۆزە و کەڵەک و دەهۆ گلا و نەشـیاوە.' ئیدی خێرا ئەوەم پێ گوت. کە ئەوەی بیســـت، دەســـتی کرد بە گریان و نارەحەت بوو، گوتی: 'ئای عەزیزە! خودا لێت خۆش بێ وا بە زینـدووی و مردوویش هەر بوویە مـایەی ڕزگـاری ئامۆزاکەت.' دوای ئەوە پێی گوتم: 'بە هۆی ئەو دوو وشەیەوە لە دەست من ڕزگارت بوو. بەڵام دەبێ کارێکت لەگەڵ بکەم و نیشـــانەیەکت پێوە نێم هەتا داخێک لەســـەر دڵی ئەو قەحبەیە دانێم کە تۆی لە من کرد.' ئیدی لە کاتێکدا ئەمن دەســـت و لاقم بەســـترابوو. بە یەک-دوو کەنیزی گوت توند دەست و پێم بە گوریس ببەستنەوە و بمگرن، خۆی هەستا ئاسنێکی خستە ئاگرەوە. هاتە کنم. سیرەتی بڕیم و، وەک ژنانی لێ کردم. شوێنی بڕینەکەی بە ئاسنی سوورکراوە داخ کرد بۆ ئەوە خوێنەکەی ڕاوەستێ. ئیدی ئەمن لە جێوە بێهۆش بووم. کە وە هۆش هـاتمەوە، پیاڵەیەکی مەی دامێ و گوتی: 'ئێســـتا بچۆوە بۆ لای ئەو کەســـەی تۆی کردە مێردی خۆی و چاوی بەرای نادا شـــەوێک لە لای من بمێنییەوە. خودا ڕۆحی ئامۆزاکەت شـاد کا کە تۆی ڕزگار کرد. ئەگەر ئەو دوو وشـەیەت نەگوتبا، حەتمەن دەمکوشتی. ئێستا بڕۆوە بۆ لای ئەو کەسەی تۆی دەوێ. ئەمن هەر ئەوەم لە تۆ دەویست وا بڕیومە. ئێستا کارم پێت نەماوە.' نووکەشەقێکی لێ دام. ئەمن هەستام، بەڵام نەمدەتوانی بڕۆم. وردەوردە بە لارەلار ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە بەردەرگای ماڵێ. دەرگاکە کرابووەوە و چوومە ژوورێ. خێزانم هات بردمیە ژوورێ. سەیری کرد ئەوە سیرەتیان بڕیوم. ئیدی من بە دەم ئێش و ئۆفەوە خەوم لێ کەوت. کاتێک بە ئاگا هاتم، لە بەردەرگای باخ کەوتبووم.'

' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و بیست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'عەزیز گوتی: 'کاتێک بە ئاگا هاتم، سەیرم کرد ئەوە لە بەردەرگای باخ فڕێ دراوم. هەستام نەختەنەختە ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە بەردەرگای ماڵی خۆمان. دایکمم دی دەگریا. ئیتر چوومە پێش و خۆم لە باوەشی هاویشت. سەیری کرد ناساخم و ڕەنگم زەرد هەڵگەڕاوە. ئەمن کەوتمەوە یادی کچە مامەکەم و دڵسۆزییەکانی. زۆری بۆ گریام و دایکیشم لەگەڵ من دەستی کردە گریان و پێی گوتم: 'بابت مرد.' ئیدی لە تاوان دەستم کرد بە شیوەن و زاری هەتا لە هۆش خۆم چووم. کە وە هۆش هاتمەوە، ئینجا لە جیاتی کچەمامەکەشم گریام. ئیدی هەر گریام، گریام هەتا بوو بە نیوەشەو. دایکم گوتی: 'دە ڕۆژە بابت مردووە.' پێم گوت: 'جگە لە کچە مامەکەم، کەس لە بیری مندا نییە. ئەوەی بە سەرم هاتووە حەقی خۆمە، چونکە ئەو منی خۆش دەویست و ئەمن لەگەڵی باش نەبووم.' دایکم پرسی: 'ئەوە تۆ لە کوێ بووی؟ ئەو ماوەیە چت لێ بەسەر هاتووە؟' ئیدی ئەوەی بەسەرم هاتبوو، هەموویم بۆ گێڕاوە. دایکم ماوەیەک گریا و پاشان هەستا چوو نان و چای ساز کرد. کەمێکم نان و چای خوارد و دیسان بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕاوە. دایکم گوتی: 'سپاس بۆ خودا کە ئاواش ڕزگارت بوو. بەس نەبوو نەیانکوشتی.' ئیدی دەستی کرد بە دەرمانکردنم هەتا چاک بوومەوە و دایکم گوتی: 'ڕۆڵە گیان، کچە مامەکەت سپاردەیەکی لە لای من دانا بوو، سوێندی دام هەتا بە چاوی خۆم نەبینم کە تۆ یادی دەکەی و بۆی پەشیمان بوویتەوە و لە خەمی دای، نەتدەمێ. ئێستا کاتێک تۆم دیت کە دەستت لە هەموو کەس شتووە و یادی ئامۆزاکەت دەکەی و بۆی دەگری، دەتدەمێ.' ئیتر هەستا و سەری یەغدانەکەی هەڵداوە و ئەو پارچەیەی کە وێنەی ئەو مامزەی لەسەرە و لەپێشدا بۆ خۆم دابوومێ، دایمێ. کە وەرمگرت، ئەو شێعرەی لەسەر نووسرابوو:

قەت باوەڕم نەدەکرد تۆ ئاوا زوو
دادەیەوە پەردە لەسەر ڕابردوو
هێ نێرگزی دوو چاوم، نەپشکوتبوو
هێ سوێسنەی دڵم چیمەنی نەدیتبوو
منت دایە دەست گڵ و دەستی ئەجەل
کەچی لە من بژاردەترت نەبوو
جەستەی گوڵینم لە ناو دڵی گڵدایە
لە ئامێزی تۆشدا کچانی پەریڕوو
کەس یادێک لە من تازە ناکاتەوە
نایە بە دەوری مندا لاوێکی خۆشڕوو

" ' 'کاتێک ئەو شـــیعرەم خوێندەوە تێر گریام و زۆرم لە ســـەروچاوی خۆم دا. لە پڕ لەنێو قوماشـــەکەدا کاغەزێک بەربووەوە. کاغەزەم هەڵگرتەوە و خوێندمەوە. لەو کاغەزەدا نووســـرابوو: 'ئامۆزا، ئاگادار بە کە من لە تۆ خۆش بووم و گەردنت ئازاد بێ. هیوادارم لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا بەختەوەر بن. بەڵام هەر کاتێک لە لایەن ئەو کچەتیوە بەڕەڵایەوە بەڵایەکت بەســەر هات، ئەوە تازە خۆ لە قەرەی ئەو و کەسـی دیکە مەدە. هێمن بە و بزانە ئەوە ئەجەلت نەهاتووە دەنا دەبوو لەپێشـدا کوژرابای، بەڵام شـوکری خودا وا مەرگی من وەپێش مەرگی تۆ کەوت. ئێســتا ئەو قوماشــە کە ڕوخســاری مامزی تێدایە لە لای خۆت ڕاگرە و کەمترخەمی مەکە، چونکە ئەو ڕوخســتارە لە ماوەی دیارنەبوونی تۆدا ئەوە تەنیا هاودەمی من بوو.' ' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی سەد و بیست و هەشتم هات

گوتی: "خـاوەنشـــكۆ، 'عەزیز گوتی: ' 'لەو بـارەوە كەمتەرخەمی مەكە، چونكە ئەو ڕوخســـارە لەو مـاوەیەدا كە تۆ دیـار نەبووی، هـاودەمی من بوو. بیكە بۆ خـاتری ئەو خودایەش ئەگەر تووشـــی وێنەكێشـــی ئەو وێنەیەش بووی، دووری لێ بكە و خۆتی لێ بپارێزە و مەهێڵە لێت نیزیك بێتەوە و هاوســـەرگیری لەگەڵ مەكە. بێجگە لەو، لەگەڵ ژنی دیكەش هەر زەماوەند مەكە. ئەوەش بزانە كە وێنەكێشی ئەو وێنەیە هەموو سـاڵێك وێنەی خۆی دەكێشـێتەوە و بە وڵات و شـارە دوورەكاندا بڵاوی دەكاتەوە، تا وای لێ دێ تاریفی دەســـترەنگینی دەنگ دەداتەوە. ئەگەر ئەو قوماشـــە كە وێنەی ئەو مامزەی تێدایە بگاتە دەست خۆشەویستی تۆ، كچی ئەو بەرەڵایە، ئەوا وێنەكە پێشانی خەڵك دەدا و دەڵێ ئەمن خوشكێكم هەیە كە ئەو سیمایانە دەكێشێتەوە. كە ئەو كچە بەرەڵایە لەوەدا درۆ دەكا. خودا سوری هەڵماڵێت. ئەمن ئەوەم هەر لەبەر ئەوە داناوە دەمزانی كە دوای من ژیان تەنگت پێ هەڵدەچنێ. ڕەنگە ڕێگـای غەریبی بگریبە بەر، شـــارگەلێكی زۆر بگەڕێی و نـاوبـانگی وێنەگەری ئەو سیمایە ببیستییەوە و پێت خۆش بێ ببینی. بزانە كە وێنەكێشی ئەو سیمایە كچی پاشای دوورگەكانی كافوورە.'

" ' 'ئیدی كاتێك ئەو كاغەزەم خوێندەوە و زانیم بابەتەكە چییە، دەستم كرد بە گریان و دایكیشـم لەگەڵم گریا. هەر سـەیری كاغەزەكەم كرد و گریام هەتا بوو بە شـەو. بەردەوام شـەو و ڕۆژ هەر دەگریام. هەتا سـاڵێك ئەوە وەزعی من بوو. كاتێك سـاڵ تەواو بوو ئەو بازرگانانە خۆیان بۆ ســـەفەر ســـاز كرد. دایكم پێی باش بوو لەگەڵ ئەو بازرگانانە بڕۆمە ســـەفەر و دوو-ســـێ ســـاڵ بگەڕێم بەشـــكو كەمێك خەمی دڵم ســـووك بێ. ئەمنیش پێشنیارەكەی دایكم پێ باش بوو، خۆم ساز كرد و لەگەڵ ئەو كاروانە وەڕێ كەوتم. بەڵام قەت چاوم بێ فرمێســـك نابێ. لە هەر كوێ بار دەخەین، چاو لەوانە دەكەم و ئامۆزاكەمم وەبیر دێتەوە كە ئەو منی خۆش دەویست و من بە ستەمەم لە ناوم برد. ئەمن جگە لە خراپە هیچم بۆ ئەو نەبووە و ئەویش جگە لە چاكە لەگەڵ منی نەكردووە. هەر كاتێك ئەو كاروانە بگەڕێتەوە، ئەمنیش لەگەڵیان دەگەڕێمەوە. ئێســـتا ئەوە سـاڵێكە لە گەڕانداین و هەر دەرد و خەمم لێ زیاتر دەبێ. هۆی زیادبوونی خەم و كەسەرم ئەوە بوو كە ئەمن چوومە دوورگە بەهەشـــتەكانی كافوور و قەڵای بلوور گەڕام. حاكمی ئەو دوورگانە ناوی شـــەهرمانپاشـا بوو. كچێكیشـــی هەبوو ناوی دنیانام بوو. بە منی گوت كە ئەو وێنەكێشـــی وێنەی ئەو مامزەیە و ئەو وێنانەی هەتە هی دەســـترەنگینی ئەو كچەی منە. كە ئەوەم زانی، خەم و پەژارەم زیاتر بوو. ســـەرم ســـووڕ ما و چوومە دەریای بیر و هزرەوە و زگم بە خۆم دەسووتا كە نێرینەیم نەمابوو، وەك ژنان وا بووم. ئیدی داو و فێڵ و ئامرازەكەیم نەمابوو.

شـــازادە، لەوەتای لە دوورگەکانی کافوور دوور کەوتوومەوە، ئیدی جار لەگەڵ جار ناڕەحەتتر و خەمبارتر دەبم. جا نازانم دەتوانم بگەمەوە شـــارەکەی خۆمان لە لای دایکم بمرم یان نا، چونکە بە ڕاستی لە ژیان بێزار بووم و پێم خۆشە بمرم.' پاشان دەستی کرد بە گریان و چاوی لە مامزەکە کرد و ڕۆندکی لە چاوی ڕژا و ئەو شێعرەی گوت:

نە ڕۆژ و نە شـــەو، نە مـانـگ و نە ســـاڵ
نـــــــــە کفر و ئیسـلام، نە پیشـە و نە ماڵ
نە حەســـــــانەوە نە گەڕانەوە
پێیـان نەکرا من تـاوێ بکەن خۆشـــحـاڵ

" 'تاجولملووک سەری لە بەسەرهاتی ئەو لاوە سوور مابوو.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و بیست و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'تاجولملووک سەری لە بەسەرهاتی ئەو لاوە سوور مابوو، بەو لاوەی گوت: 'بە خودا ئەوەی بەسەر تۆ هاتووە، پێم وا نییە بەسەر کەس هاتبێ. دەمهەوێ شتێکت لێ بپرسم.' عەزیز گوتی: ' فەرموو شازادە؟' تاجولملووک گوتی: 'دەمهەوێ بزانم چۆناوچۆن بەو کچە گەیشتی کە ئەو وێنەیەی کێشابووەوە؟' گوتی: 'شازادە، ئەمن بە فێڵێک گەیشتمە ئەو کچە، ئەویش ئاوا بوو کە:

" ' 'کاتێک کاروانەکە گەیشتە ئەو شارە، من لێیان جوێ بوومەوە و چوومە نێو باخەکان و خەریک بووم دەگەڕام، تووشی باخێکی خۆش و ڕازاوە بووم. پیاوێکی بەساڵاچوو باخەوانی ئەو باخە بووم. لە باخەوانەکەم پرسی: 'ئەو باخە هی کێیە؟' گوتی: 'هی کچی پاشایە، ناوی خانمیدنیایە کە هەموو حەوتووان دێتە ئێرە بۆ سەیران و گەڕان.' بە کابرا پیرەم گوت: 'پیاوی چاک بە، ڕێم بدە تاوێک لێرە دانیشم تا کچی پاشا بێرەدا دێ و چاوێکم پێی دەکەوێ.' کابرا گوتی: 'کێشەیەک نییە.'

" ' 'کاتێک قسەی باخەوانە پیرەکەم بیست، چەند درەمێکم دایە و گوتم کە بیدە بە شتی خواردن. کاتێک درەمەکانی وەرگرت، خۆشحاڵ بوو. لەگەڵ شێخ لەنێو باخدا خەریکی گەڕان بووین تا گەیشتینە شوێنێکی زۆر خۆش و لەبەردڵان. هەموو میوەیەکی لێ بوو. گوتی: 'لێرە دانیشە تا دەگەڕێمەوە.' ماوەیەکی پێ چوو، کە گەڕاوە کاورێکی سوورەوەکراوی لەگەڵ خۆی هێنابوو. ئیدی دەستمان کرد بە خواردن، بەڵام من هەر لە بیری کچی پاشادا بووم. کە لە پڕدا دەرگا کراوە و شێخ هاتە ژوورێ، گوتی: 'هەستە خۆت بشارەوە.' من خێرا هەستام و خۆم شاردەوە. سەیرم کرد ئەوە پیاوە ڕەشەکانی دەربارن هاتنە ژوورێ و پرسیان: 'خاڵە، کەس لەنێو باخەکەدایە یان نا؟' کابرا گوتی: 'ناوەڵا.' ئیدی بابۆکەرەکەیان گوتی: 'دەرگاکە داخەن.' باخەوانەکە دەرگاکەی داخست.

" ' 'باخەوان خەریک بوو دەرگاکەی دادەخست کە لە پڕ خانمیدنیا لەنێو دەرگاکە وەدەر کەوت. هەر دیتم عەقڵم لە کەللەیدا نەما و کاری لە دڵم کرد. ئیدی ئەوەندەم بە ئاوات خواست وەک تینوویەک کە چەندە ئاوی زوڵاڵ بە ئاوات دەخوازێ. وا بوو ماوەیەک پیاسە و سەیرانی کرد، دوایە لێیدا ڕۆی. ئەمنیش بەدوایدا لە باخ هاتمە دەرێ و گەڕامەوە بۆ مزڵەکەی خۆم. زانیم بەو ناگەم. ئەو کچە پاشایە و من بازرگانزادە، بە تایبەت ئەوەی کە من وەک ژنان وابووم و سیرەتم نەمابوو. هەر بۆیە کاتێک هاوڕێکانم ساز بوون درێژە بە سەفەرەکەیان بدەن لەگەڵ ئەوان ساز بووم و بەرەو ئێرە هاتین. وا ئێستا لە خزمەت تۆ داین. ئەوە بوو بەسەرهاتی من.'

" 'کاتێک تاجولملووک ئەو قسانەی بیست، دڵی چووە سەر خانمیدنیا. ئیدی سواری ئەسپەکەی خۆی بوو، گەڕاوە بۆ شارەکەیان.ماڵێکی بۆ عەزیز ئامادە کرد و کەلوپەلی پێویستی بۆ دابین کرد. بۆخۆی چوو بۆ کۆشک. بەڵام بەردەوام فرمێسکی دەڕشت و پەرێشان بوو هەتا بابی هات بۆ لای و سەیری کرد ئەوە کوڕەکەی ڕەنگی بە ڕووەوە نەماوە و تێک چووە. زانی ئەو خەمبار و لێوبەبارە. پێی گوت: 'ڕۆڵەگیان، باسی خۆتم بۆ بکە بزانم بۆ ئاوا تێک چووی؟ چت بەسەر هاتووە؟' تاجولملووک چیرۆکی خانمیدنیای، کچی پاشای کۆمەڵە دوورگەی کافووری لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕاوە و باسی گیرۆدەبوونی خۆی بۆ کرد. پاشا گوتی: 'ڕۆڵە، باوکی ئەو یەکێک لە پاشاکانە و شارەکەشیان لە ئێمەوە زۆر دوورە؛ لە بیر خۆتی بەرەوە و بچۆوە بۆ کۆشکەکەی دایکت.'
' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و سیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، وەزیر دەندان بە زەوئولمەکانی گوت: 'بابی تاجولملووک گوتی: 'رۆڵە گیـان، لە بیر خۆتی بەرەوە و بچۆوە بۆ کۆشـــکەکەی دایکت کە لەوێ نیزیکەی پێنجسـەد کەنیزی جوانی وەک مانگی تێدایە. ئەگەر یەکێک لەوانت بە دڵ بوو، ئەوە باشـە، دەنا کچە پاشـــایەکت بۆ دێنم کە زۆر لە خانمیدنیا جوانتر بێ.' تاجولملووک گوتی: 'بابە، جگە لەو کەسی دیکەم ناوێ. ئەو، ئەو کەسـەیە کە رووخساری ئەو مامزەی کێشـاوەتەوە. عەرز و ئاسمان لێک بدەن من هەر ئەوم دەوێ. یان ئەو یان دەنا سەری خۆم هەڵدەگرم و روو لە دەشـــت و ســـارا دەکەم و خۆم تێدا دەبەم. بابە گوتی: 'رۆڵە، روخســـەتم دەیە با کەسـێک بنێرمە لای و داوای بکەین و تۆ بە ئاوات بگەیێنم. هەر ئاوا داوای دایکیشـتم کرد. ئەگەر نەیدا، ئەوە سـوپایەکی وای بۆ دەنگ دەدەم کە ســەرێکی بگاتە شـارەکەی ئەوان و سەرێکی لێرە بێ.' دوای ئەوە پاشا عەزیزی قاو کرد، لێی پرسی: 'ئەتۆ رێگای دوورگەگەلی کافوور پێ دەزانی؟' عەزیز گوتی: 'بەڵێ.' پاشـــا گوتی: 'دەمهەوێ لەگەڵ وەزیرەکەی من بچی.' عەزیز قەبووڵی کرد. پاشـــا ناردی لە دوای وەزیر و گوتی: 'کارێک بۆ تاجولملووک بکە و بچووە بۆ دوورگەگەلی کافوور و داوای کچی پاشـای ئەوێ بکە.' وەزیر چوو خۆی سـاز کا. ئیدی تاجولملووک گەڕاوە مزڵەکەی خۆی و خەم و دەرد و دڵەڕاوکێی ئەوەندەی دیکە زیادی کرد. کاتێک بوو بە شـەو و تاریکی باڵی بەسـەر وڵاتدا کێشـا، تاجولملووک ئەو شێعرەی خوێندەوە:

کەی شـــــیـاوی ئەوەم تـۆ بـێـیە خەیـاڵـم
یـا ئەو رۆژە خـۆشــــە بێ تـۆ بێیە مـاڵـم
دڵـی خـۆم خـۆش دەکەم بە پـێـگەیشـــتـنـت
خەیـاڵە، کەرەم کە تـۆش بـگـۆڕە حـاڵـم

" 'کاتێک ئەو شـــێعرانە تەواو بوو، ئیدی لەســـەر هۆش چوو. وە هۆش نەهاتەوە هەتا بەیانی. کاتێک بەیانی هات، بابی هات بۆ لای سەیری کرد ئەوە ڕوخساری ئەوەندەی دیکە زەرد هەڵگەڕاوە. دڵخۆشـــی داوە و پێی گوت: 'ئەوەندەی نەماوە بە دڵدارەکەی بگا.' ئینجا عەزیزی لەگەڵ وەزیر بە کۆڵێک دیاریەوە نارد. ئەوان چەند شـــەو و رۆژ بە ڕێوە بوون هەتا گەیشـــتنە نیزیک دوورگەگەلی کافوور. لە پەنا چۆمێک لایان دا. وەزیر پیاوێکی ناردە لای پاشـــا. دوای چەند کاتژمێرێک وەزیری شـــەهرمانپاشـا لەگەڵ فەرماندە و پەردەداران هاتن بە پێشـــوازی وەزیرەوە و لە یەک فرســـەخی ڕێگەوە یەکتریان بینی. ئیدی پێکەوە

ڕۆیشــتن هەتا گەیشــتنە لای شــەهرمانپاشــا و دیاریەکانیان دانا. چوار ڕۆژان لەو شــارە مانەوە. ڕۆژی پێنجەم وەزیر لەگەڵ عەزیز چوونە خزمەت پاشــــا. بە ئەدەبەوە لەبەردەمی وێستان و داواکاریەکەیان پێ ڕاگەیاند. گوتیان کە لەبەر ئەوە هاتووین. پاشا سەری سووڕ ما و نەیدەزانی چیان پێ بڵێ. چونکە کچەکەی پێی خۆش نەبوو مێرد بکا. ماوەیەک سەری داخســت و پاشــان ســەری بەرز کردەوە و بە یەکێک لە خزمەتکارەکانی گوت: 'بچۆ لای شازادە دنیا و ئەوەی لێرە بیستت، بۆی بگێڕەوە کە وەزیر هاتووە بۆ خوازبێنی ئەو.' ئیدی خزمەتکارەکە هەســتا و ڕۆیشــت. ماوەیەکی پێ چوو هاتەوە کن پاشــا و گوتی: 'پاشــای جیهان، کاتێک ئەو قسـانەی لێرە بیسـتمن، بۆ خانمیدنیام گێڕاوە و پێم گوت کە مەبەسـتی وەزیر لە هاتنەکەی چییە، زۆر توورە بوو و خەریک بوو لێشــــم دا. ئەمن لە بەردەســــتی هەڵاتم و ئەو هەرای کردم و گوتی: 'ئەگەر بەبێ ڕەزایەتی من بە مێردم بدەن، ئەو کەســـە دەکوژم کە دەبێتە مێردم.' پاشــا ڕووی لە وەزیر و عەزیز کرد و گوتی: 'ســـڵاوی پاشــا بگەیەنن و چۆن بوو بۆی بگێڕنەوە و ئاگاداری بابەتەکەی بکەن. عەرزی بکەن کە ئەو کچەی من پێی خۆش نییە مێرد بکا.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و سی و یەکەم هات

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'شەهرمانپاشا بە وەزیر و عەزیزی گوت: 'ئەوەی بیستتان بۆ پاشای بگێڕنەوە کە ئەو کچەی من پێی خۆش نییە شوو بکا.' ئیدی وەزیر و هاوڕێکانی هێشتا بە تەواوی نەگەیشتبوونێ، گەڕانەوە و یەک وچان ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە لای پاشا و شتەکەیان بۆ گێڕاوە. لەجێوە پاشا فەرمانی بە فەرماندەکان دا کە سوپا بۆ شەڕ ئامادە کەن. وەزیر گوتی: 'ئەو کارە مەکە، خۆ شەهرمانپاشا گوناهێکی نەکردووە. ئەوە کچەکەی ئەوە کە لە مێرد نەبانە و ناوێرێ مێرد بکا. چونکە ئەو کچە هەر کە ناوی مێردی بیست، خێرا پەیامی نارد کە ئەگەر بەبێ ویستی من بە مێردم بدەن، ئەوە لەپێشدا مێردەکەم دەکوژم و دوایە خۆم دەکوژم.' پاشا کە ئەوەی بیست، نیگەرانی تاجولملووک بوو، گوتی: 'ئەگەر ئەو شەڕەش بکەم و بەسەر شەهرمانپاشایشدا زاڵ بم، ئەوە خانمیدنیا خۆی دەکوژێ.' وا بوو تاجولملووکیشی لەو ڕاستییە ئاگادار کردەوە.

" 'کاتێک تاجولملووک ئاگاداری ئەو شتە بوو، بە بابی گوت: 'ئەمن ناتوانم چاوپۆشی لێ بکەم و لە بیری بکەم. هەر بۆیە ناچارم بۆ خۆم دەچم بۆ شارەکەیان و هەوڵ دەدەم بیبینم و ڕازی بکەم. بشمرم لەو کارە زیاتر ناکەم.' بابی گوتی: 'چۆن دەچییە ئەوێ؟' گوتی: 'وەک بازرگانێک دەچم.' پاشا گوتی: 'جا ئەگەر هەر دەچی، کەوایە وەزیر و عەزیزیش لەگەڵ خۆت بەرە.'

" 'ئینجا پاشا ماڵێکی زۆری لە خەزێنە هێنا دەرێ و بابی سەدهەزار دیناری ماڵی بازرگانی ئامادە کرد. کە بوو بە شەو، تاجولملووک لەگەڵ عەزیز چوونە ماڵی عەزیز و شەو لەوێ ماوە. تاجولملووک زۆر ناڕەحەت و نیگەران بوو، خەو و خواردنی وە گیان نەدەکەوت. لە دەریای بیر و خەیاڵدا نوقم ببوو. بە یادی کچە ڕۆندکی دەڕشت و دەگریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بە چاو نەمدیوە هێشتا، دڵ هەدادانی نییە
چ بکەم چی لەگەڵ ناکرێ، دڵ حاڵی بوونی نییە
ئەگەر پێویست بێ دەبڕم، ڕێی دووری هات و نەهات
ئاخری دەبێ پێی شاد کەم، دڵی کوڵۆڵم بە ئاوات
کاڵەی ئاسنم بدڕێ و گۆچان بنوشتێتەوە
هەتا بەو کیژە نەگەم دڵم ناحەسێتەوە

" 'عەزیزیش کچە مامەکەی هاتبووە یاد و بۆی دەگریا، ئەو شەوە هەر بەدەم گریانەوە

ڕۆژیان کردەوە. دوای ئەوە تاجولملووک جلوبەرگی ســـەفەری لە بەر کرد و چووە کن دایکی. دایکی هەواڵی پرســی، ئەویش باســی دۆخی خۆی بۆ کرد. دایکیشــی پەنجاهەزار دیناری دایە و ماڵاواییان لە یەک کرد و تاجولملووک لە لای دایکی هاتە دەرێ و چووە لای بابی و ئیجازەی ڕۆیشــتنی وەرگرت. پاشــاش ئیجازەی ســەفەری دا و پەنجاهەزار درەمی زێڕی دایە و فەرمانی دا لە دەرەوەی شار خێوەت هەڵدەن. دوو ڕۆژ لەوێ مانەوە و ڕۆژی ســـێیەم کەوتنە ڕێ. تاجولملووک ببووە هاودەمی عەزیز و پێی گوت: 'ناتوانم لە تۆ جیا بمەوە.' عەزیز گوتی: 'ئەمنیش ئاوام و پێم خۆشە لە ڕێی تۆدا بمرم. بەڵام براکەم، لە تاوی دایکم حەجمینم نییە.' تاجولملووک گوتی: 'کاتێک بە ئاوات بگەم، هەموو شـــتێک جێبەجێ دەبێ.'

" 'وەزیر دڵخۆشــی تاجولملووکی دەداوە و عەزیز شــێعری بۆ دەخوێندەوە و باســی شــتی ســەیر و ســـەمەرە و ڕووداوە مێژوویەکانی بۆ دەکرد. دوو دانە مانگ بەو شــێوە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شاری گراوەکەی. هەوری خەم و تەم لەسەر تاجولملووک ڕەوی و کەیفی ساز بوو.

" 'ئیدی لە بیچم و ڕواڵەتی بازرگاناندا چوونە نێو شـــارەوە. چوونە کاروانســـەرایەکی گەورە کە تـایبەتی بـازرگـانـان بوو. تـاجولملووک لە عەزیزی پرســـی: 'ئێرە شـــوێنی بازرگانانە؟' عەزیز گوتی: 'بەڵێ، بەڵام ئێرە ئەو شـــوێنە نییە کە ئەمن لێی دابەزیم. ئێرە لەوێ خۆشــترە.' ئیدی وشــترەکانیان یخ دان و بارەکانیان داگرتن و هەرچی پێیان بوو لە دووکانەکاندا دایان نان. وەزیر فەرمانی دا خانوویەکی گەورەیان بۆ ببیننەوە، وا بوو خانوو دیتراوە و بۆخۆیـان چوونە خـانووەکەوە. وەزیز لەگەڵ عەزیز دانیشـــتبوون بیریـان لە کاروباری تاجولملووک دەکردەوە کە چ بکەن و چ نەکەن. تاجولملووکیش ســـەرگەردان لە دەریای خیاڵاتی خۆیدا بوو.

" 'وەزیر وای بە بـاش زانی کە لە دەوروبەری کوتـاڵفرۆشـــەکـان دووکـانێـک بۆ تاجولملووک دانێن تا لەوێ خەریکی کوتاڵفرۆشـــتن بێ. ئیدی ڕووی لە تاجولملووک و عەزیز کرد و گوتی: 'خۆ ئەگەر ئێمە هەر ئاوا دانیشـــین، هیچمان بۆ ناکرێ. ئەمن بیرێکم کردووەتەوە ڕەنگە بمـانگەیێنێتە ئـامـانج.' تـاجولملووک و عەزیز گوتیان: 'ئەتۆ چۆنت پێ باش با وا بێ. دەفەرمووی چ بکەین؟' وەزیر گوتی: 'چونکە هەموو کەســێک ڕێی دەکەوێتە دووکانی کوتاڵ و کوتاڵفرۆشییەوە، وام پێ باشە دووکانێکی کوتاڵفرۆشی بۆ تاجولملووک دانێن. بۆ خۆت لەوێ خەریکی کڕین و فرۆشـــتنی قوماش بە. چونکە لاوێکی جوانچاک و بەرچاویشــی، هەموو کەس ڕووت تێ دەکا. بەڵام لە بیرت نەچێ با عەزیزیشت هەر لەگەڵ بێ، لە دووکان لە پەنایەکدا دابنێ.' تاجولملووک کە گوێی لە پێشـــنیارەکەی وەزیر بوو، زۆری بە دڵ بوو. هەر لەجێوە تاجولملووک جلوبەرگی بازرگانانی لە بوخچەکە دەرهێنا و

لە بەری کرد و یەکسەر چوو بۆ بازاڕی کوتاڵفرۆشان. کۆیلە و خزمەتکارەکانیش وەدوای کەوتن. بازرگانەکان کاتێک تاجولملووکیان دیت بەو هەمووە جوانی و دلالییەوە، هەموو سەریان سووڕ ما و واقیان وڕ ما. گوتیان: 'بڵێی دەرگای باخی بەهەشت کرابێتەوە وا ئەو حۆریە هاتووەتە دەرێ.' یەک دەیگوت:

حەک بـــابە لەو هەمـــوو جـــوانـــیـــیە
دونـــیـــا شـــــتـــی وای تـــێـــدا نـــیـــیە
لانەوازە و پەڕیـــــــــــوەیە
زۆر هەڵـــکــــــــەوتە و ئەنـــتـــیـــکەیە

" 'یەکی تریش دەیگوت:

تـاکـــــــی لەنێو جوانانا، قســـەخۆش و خۆشڕەوت
کـاتـــــــێـک کە هـاتیتە دەر، مـانگیش لە برەو کەوت
کە تـــــــــــــۆ دەڕۆی بە ڕێدا کەو ئێرەییت پێ دەبا
عەقڵ نەما لە ســـــــــــەرما کە چاوم کەوت بە چاوت

" 'لەو نێوەدا پیاوێکی بەساڵاچووی لێ بوو، چاوێکی لێ کرد و گوتی:

لە چـاوی پـیـس بە دوور بـی تـۆ، وا ئەونە قـۆزی
یـــــــــــاری من و مۆمی کۆڕ و شازادەی هۆزی
وا بە لەنـــجە دێـــیـــت و دەچـــی و دەگەڕێـــیـــتەوە
گورگ زۆرە، زۆر وریا بە تـــــــۆش بەرخی کـــــــۆزی
هـــاتـــنـــی تـــۆ بـــۆ ئەم شـــــــارە، لە خـــۆڕا نـــیـــیە
تۆی مـنـــداڵکـــار، ئەڤینـــداری و هەڵوەدای ســــۆزی

" 'ئیدی ئەوان چوون بۆ ماڵی ســەرۆکبازاڕ. ســەرۆکبازاڕ لە بەریان هەســتا و ڕێزی لێ گرتن و کرنۆشـــــی بۆ بردن، بە تایبەت بۆ وەزیز کە پێی وا بوو تاجولملووک و عەزیز کوڕی ئەون.

" 'سەرۆک پرسی: 'چ کارێکتان پێمە؟' وەزیر گوتی: 'ئەمن پیاوێکی بەساڵاچووم و ئەو دوو کوڕە گەنجەم هەیە. ئەوانە شـار بە شـار دەگێڕم و لە هەر شـارێک سـاڵێک دەمێنمەوە بۆ ئەوەی فێری داب و نەریت و هەڵســـوکەوتی جۆراجۆر بن و چاو و گوێیان بکرێتەوە.

ئێســـتا هاتووم دووکانێکی باشـــی وامان لە شـــوێنێک بۆ پەیدا کەی کە هاتوچۆی زۆری خەڵک و گەشـتیارانی بەســەرەوە بێ و بەرچاو بێ. وا بێ چاک و خراپی پێدا بێ، ئەوەندە سەرەڕێ بێ. بۆ ئەوەی بازاڕی خۆش بێ و سەروکاریان لەگەڵ خەڵکدا زۆر بێ هەتا ئاکار و ڕەوشـــتی جۆراوجۆر ببینن و پەندی لێ وەرگرن.' ســـەرۆک بازاڕ گوتی: بەســـەر چاو.' پاشـان چاوێکی لە کوڕەکان کرد و چووە ناخیانەوە. ئینجا هەســتا و لە باشـترین شـوێنی بازاڕدا جێگایەکی زۆر باشـــی بۆ دیتنەوە. دووکانێکی گەورە و خۆش، بە جۆرێک کە لەو دووکانەی خۆشـــتر تێدا نەبوو. کلیلەکانی دا بە وەزیر و گوتی: 'خودا لێیان پیرۆز کا.' وەزیر کلیلەکانی وەرگرت ئ چوون بە لای دووکانەوە و بە غوڵامەکانیان گوت: 'خێرا پڕی کەن لە کوتاڵی ئاوریشم و دیبا.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و سی و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'وەزیر کە لەوێ لە بیچمی بازرگانێکدا بوو، فەرمانی دا هەرچی کاڵای ئاوریشـــم و دیبای هەیانە بیانهێنن. ئەوەندەیان هێنا بە قەد گەنجی شـــایەک. ئیدی دووکانیان لێ ڕازاندەوە و ئەو شـــەوەیان تێپەڕ کرد. کە ڕۆژ بووەوە، وەزیر تاجولملووک و عەزیزی بردە گەرماو. ئەو دوو لاوە هەردووکیان ئەوەندە جوان و لەبەردڵان بوون، وەک شاعیر دەڵێ:

ڕوخســـــاریـان دوو خۆری بچووک شـــۆقیـان دەداوە
زەردە خەنە لەو نـــاوەدا دەبـــریســـــکـــاوە
لەســـەر بســـتووی پشـــتی مـانگیـان پەلکەزێڕینە
خـۆی کـێشــــاوە بە ئـاســـمـانـا، دەڵـێـی پەروینە

" 'پاش ماوەیەک لە گەرماو هاتنە دەرێ. سـەروکبازاڕ کاتێک زانی ئەوان لە گەرماون، لەوێ دانیشـــتبوون چاوەڕێیان بوو. کە لە پڕدا وەک دوو مامز لەســـەرەخۆ لە کاتێکدا پێستیان دەتگوت بەفری سپی و کوڵمەیان وەک گڵووک سوور هەڵگەڕابوو، چاویان وەک چاوی ئاسک، مەست بوو، پەیدا بوون، ســەروکبازاڕ گوتی: 'ڕۆڵە گیان، یا خوا هەمیشـە لەشـــتان ســـاغ بێ و لە ناز و نیعمەتدا بن.' تاجولملووکیش شـــەکر لە زاری باری و بە لەبزێکی جوان وەڵامی داوە، گوتی: 'خۆزگە تۆشـــمان لەگەڵ بایە.' ئیدی تاجولملووک و عەزیز هەردووکیان دەستی سەروکبازاڕیان ماچ کرد و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دووکان. سەروکبازاڕیش بەدوایاندا چووە دووکان و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ئەو خـــۆڵە پـــیـــرۆزە تـــۆ بەســـــەریـــا بـــڕۆی
بـــــازاڕێـــــک بە ڕزقە بـــــازرگـــــانەکەی تـــۆی
ئەو کـــــــــــــــۆیلە ئازادە لە خـــــــــزمەت تودا بێ
ئەو وڵاتە خـــۆشـــــبەخـــتە تـــۆ ســـــەفەر بـــکەی بـــۆی

" 'ئیدی ســـەروکبازاڕ دوعای بۆ کردن و لە پەنا وەزیر دانیشـــت. زۆریان قســـە کرد. باســـی هەموو شـــتیان کرد. مەبەســـتی ســـەروکبازاڕ زیاتر دیتن و چاولێکردنی ئەو دوو گەنجە بوو. لە بەر خۆیەوە دەیگوت:

دڵـــم لای تـــۆ و چـــاوم لە شـــــوێـنـــێ تـــر بـــوو

ئەو شــوێنە وا عەقڵ لە ئـاســتی ســڕ بوو

" 'وەزیر بە ســـەروکبازاڕی گوت: 'گەرماو یەکێک لە نیعمەتەکانی ئەو دنیایەیە.' ســـەروکبازاڕ گوتی: 'خودا لە تۆ و منداڵەکانتی پیرۆز بکا و لە چاوی پیسـیان بپارێزێ. ئەتۆ لە زمان شاعیرانەوە هیچت لە سەر گەرماو بیستووە؟'

" 'تاجولملووک گوتی: 'من لە تاریفی گەرماودا ئەو دوو بەیتەم لە بیرە:

چـوویـتە گەرمـاو ئـاونـگـت لـێ دەتـکـێ
چــوارپەلــت لە پــۆلا کـــراوە چـــێ
لەژێـر ســـێبەری تـۆ دان دێـو و پەری
پـیـر و لاو بە خەیـاڵـی تـۆوە دەژی

" 'کە تاجولملووک ئەو شـێعرەی خوێندەوە، عەزیز گوتی: 'ئەمنیش لەســـەر گەرماو شێعرێکم لە بیرە.' سەروکبازاڕ گوتی: 'دا بیخوێنەوە.'

جـوانـان لە گەرمـاو دەتـریـقـێـنەوە
لە نـاو گەرمـی ئـاو دەحەســێـنەوە
لەش وەک پەڕکی گوڵ، شـلـک و نـاسـکن
قەد بـاریـک و شـووش دەڵێی ئـاسـکن

" 'ســـەروکبازاڕ ســـەری لە زمانپاراوی و زمانزانی ئەوان ســوورِ مابوو، پێی گوتن: 'ماشـەڵڵا، لە زمانزانی و پاراویدا گەیشـتوونەتە لووتکە. با منیش چەند بەیتێک بڵێم.' ئیدی بە پێکەنین و سەروروویەکی خۆشەوە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تـیـن و ئـاو پەیـمـان دەبەسـتـن
نـازی نـازداران بـکـێشـن
ئەهـوەن کەن جەســتەی نـاسـکیـان
مـاچ کەن زەڕڕە زەڕڕەی لەشـیـان
دەڵـێـم خـۆزگە تـکـێ ئـاو بـام
ڕێـک لەســـەر مەمـکـی دەوەسـتـام

" 'دوایە چاوێکی لەو دوو گەنجە حۆریزادانە کرد. لە باخی جوانیاندا پیاسـەیەکی کرد و

ئەو شیعرەشی خوێندەوە:

پەری بەهەشـــت ڕێی لێرە کەوت شـــادی هێنا
مـانگی ڕەحمەت لە کەل دەرکەوت جێژنی هێنـا
گەر بڵێ هـات پـاشـــای جوانـان، موژدەدەرت
سەرم دەدەم لە مزگێنی تۆ بــــــــــە سەرت
گەرمە بـازاڕی گەوجـێـتـی کە ئەڤـیـن هـات
دەشێوێ و ناکرێ دوو شـــــــا لە یەک وڵات
کە ئەڤین هــات دڵ تـاڵان کـا ئـیـدی عەقـڵ
وڕ و کاســـە دەســـتەوســـتان لێی دەکا ســـڵ

" 'دوای ئەوە سەروکبازاڕ فەرمووی کردن بۆ ماڵی خۆیان. ئەوانیش دەستخۆشیان لێ کرد و نەچوون. چوونە ماڵە خۆیان. مەمنا چووبوونە گەرماو، ماندوو بوون. دوای ئەوەی کەمێکیان نان خوارد و خواردنەوەیان خواردەوە، ئەو شەوە لە ماڵی خۆیان بە ئاسوودەی حەسانەوە.

" 'بەیانی زوو هەســـتان نوێژیان کرد و بەیانیانەیەکیان خوارد. کاتێک تاو و بان گەرم بوو، دووکان و بازاڕ کرانەوە و لە ماڵ چوونە دەرێ. ڕۆیشـــتن بۆ بازاڕ. ســـەیریان کرد ئەوە غوڵامەکان دووکانیان کردووەتەوە و فەرشـی ئاوریشـم و دیبایان ڕاخسـتووە. ئینجا تاجولملووک و عەزیز لەوبەرەوبەری دووکان و وەزیر لە نێوەڕاســتی دووکان دانیشــت. غوڵامەکانیش دەستەونەزەریان ڕاوەستان. خەڵک لەنێو خۆیاندا هەر باسی ئەوانیان دەکرد و بە یەکتریان دەناسـاندن. وا بوو ئەوەندەی پێ نەچوو خەڵکێکی زۆر ڕوویان تێ کردن و فرۆشـــێکی باشـــیان بوو. تا وای لێ هات لەنێو شـــاردا دەنگیان داوە و هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەک نەما باســـی ئەوانی لێ نەکرێ. ماوەیەک ئاوا بوون و لە هەموو لایەکەوە خەڵک دەســـتەدەســـتە دەهاتن بۆ لایان. وەزیر بە تاجولملووکی گوت: 'خۆت ڕاگرە.' بە عەزیزیشـــی گوت: 'هیچ شـــتێک نەدرکێنی.' ڕۆژێک چوونەوە ماڵێ عەزیز و تاجولملووک پێکەوە قســـەیان دەکرد. تاجولملووک دەیگوت: 'خۆزگە کەســـێک لە لای خانمیدنیا وە بێتە لامان.'

" 'هەردەم لەو بیر و خەیاڵانەدا بوو. شـــەو و ڕۆژ لە تاوان خەو و خواردنیان نەبوو. ڕۆژێک تاجولملووک لە دووکان دانیشـتبوو کە لە ناکاو پیرێژنێک لەگەڵ دوو کەنیز وەژوو کەوتن.' "

# كە شەوی سەد و سی و سێیەم هات

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'ڕۆژێک تاجولملووک لە دووکان دانیشـــتبوو، لە ناکاو پیرێژێک لەگەڵ دوو کەنیز هاتنە دووکان و ڕاوەستان. پیرێژن کە جوانی و ڕەزاسووکی و بەژن و باڵای دیت، لەگەڵ ئەو هەمووە جوانچاکیەی سـەری سوورِ ما و هەر وا چاوی تێ بڕی و گوتی:

کێ شـــێوەی تۆ دەدا پێـت بڵێم لەو دەچی
کەســـی وام بە زەیـن نـاگـا بـێ بەڵا بـی
گـوڵـی کـامە گـوڵسـتـانـی بە دەم بـاوە
ســـەرت هەڵـگـرتـووە و هـاتـوویە ئەمـلاوە

" 'ئەو جار پیرێژنە لە تاجولملووک چووە پێشـــێ و ســـڵاوی لێ کرد. تاجولملووک لە بەری هەستا. بە بزەوە وەڵامی سـڵاوەکەی داوە لە پەنا خۆی داینا و باوەشـێنی کرد هەتا بحەســـێتەوە. تاجولملووک ئەو کارانەی بە ئاماژەی عەزیز دەکرد. دوای ئەوە پیرێژن بە تاجولملووکی گوت: 'ســـەری ماقوڵان بە قوربانت، ئەوە تۆ خەڵکی ئێرەی؟' تاجولملووک گوتی: 'خانم، من قەت ناهاتوومە ئێرە.' پیرێژنە گوتی: 'کاڵا چت لەگەڵ خۆت هێناوە؟ کاڵای باش کە شـایانی باشـان بێ. پێشـانم بدە.' تاجولملووک هەر کە ئەو قسـەیەی لە پیرێژنە بیست، دڵی وە لێدان کەوت و ئارامی لێ برِا. بە پیرێژنەی گوت: 'هەر کاڵایەک کە شـایانی پاشـا و شـازادە و کچانی پاشـا بێ، لەو دووکانەی مندا هەیە. ئەتۆ بڵێ شـتت بۆ کێ دەوێ هەتا کاڵا و شـــتی بابەتی ئەوت دەمێ؟' پیرێژنە گوتی: 'دیبایەکم دەوێ کە شـــایانی خانمیدنیای کچی شـەهرمانپاشـا بێ.' کە تاجولملووک نێوی گراوەکەی بیست، خۆشـحاڵ بوو و بە عەزیزی گوت: 'باشترین کاڵای دووکان بێنە.' عەزیز بوخچەیەکی هێنا و کردیەوە. تاجولملووک بە پیرێژنەی گوت: 'کامیان دەزانی شـــیاوی کچی پاشـــایە، بۆی هەڵگرە و دڵنیاش بە لەو شارەدا کەس شتی منی نییە.' ئیدی پیرێژن قوماشێکی کە بایی هەزار دینار بوو، هەڵگرت و گوتی: 'ئەوە بایی چەندەیە؟' تاجولملووک گوتی: 'قابیلی تۆی نییە ئەوە هەر شـیرینی ئاشـنابوونی من و تۆیە ' پیرێژن گوتی: 'چەند ژیر و زمانخۆشـی. خودا لە چاوی پیست بپارێزێ، خۆزگەم بەو کەسـە لەگەڵ تۆدا دەخەوێ و تۆ لە باوەش دەگرێ و ئەو کوڵمە جوانانەت ڕادەمووسـێ. بە تایبەت کە ئەویش وەک خۆت جوان و شـەپاڵ بێ.' تاجولملووک ئەوەندە بە قسەی پیرێژنە پێکەنی، خەریک بوو بە پشتدا بکەوێ.

" 'دوای ئەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەی بەدیهێنەری ئاوات! ئاواتی ئێمەش بە دەســـتی

ئەو پیرێژنە بەدی بێنە.' ئینجا پیرێژنە پرسی: 'ناوت چییە؟' گوتی: 'ناوم تاجولملووکە.' پیرێژنە گوتی: 'ئەو ناوە شازادانەیە و تۆ بازرگانزادەی؟' عەزیز گوتی: 'چونکە لە لای دایک و باب و خزمانی زۆر خۆشەویستە، بۆیە وای پێ دەڵێن.' پیرێژن گوتی: 'ڕاست دەکەی. خودا لە چاوی چاوچنۆکان و ئێرەییبەرانتان بپارێزێ.'

" 'ئینجا پیرێژن قوماشە ئاوریشمەکەی هەڵگرت و بردییە لای خانمیدنیا و پێی گوت: 'خانمەکەم، قوماشێکی تازەم بۆ هێناوی.' کە خانمیدنیا قوماشەکەی لێ وەرگرت و چاوی لێ کرد، گوتی: 'دایە، من لەو شارەدا قوماشی وام تا ئێستا نەدیتووە.' پیرێژن گوتی: 'فرۆشیارەکە لەوەش جوان و لەبەردڵترە، ئەمن بە ئاواتی دەخوازم هەر ئەوشەو لە ئامێزی تۆدا بێ و لەگەڵ تۆدا بخەوێ، چونکە بە ڕاستی لە جوانیدا ئاژاوەگێڕی ئەو شارەیە. بۆ گەڕان هاتووەتە ئەو شارە و ئەو شتانەشی لەگەڵ خۆی هێناوە.' خانمیدنیا بە قسەی پیرێژنەکە پێکەنی و گوتی: ' پیرێژنی فەقیر، ئەوە تۆ شێت بووی؟!' ئینجا قوماشەکەی دەست دایە و دیسان جوان چاوێکی دیکەی لێ کردەوە. سەری لە چاکی و جوانی ئەو قوماشە سووڕ ما، چونکە تا ئێستا شتی وای نەدیبوو. پیرێژنە گوتی: 'ئەگەر فرۆشیارەکەی ببینی، بۆت دەردەکەوێ کە لە دنیادا کەس ئەوەندەی ئەو جوان نییە.'

" 'خانمیدنیا بە پیرێژنی گوت: 'ئەی پرسیت پێویستییەکت هەیە تا بۆت دابین بکەین؟' پیرێژن سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: 'بەخێر بێیەوە ئەوە لە کوێیە. ئەی دیارە ئامانجێکی هەیە. هیچ کەس بێ ئامانج و ئاوات نییە.' ئیدی خانمیدنیا گوتی: 'ئێستا بچۆوە لای و سڵاوی منی پێ بگەیەنە و پێشی بڵێ بە هاتنتان خێر و خۆشیتان خستە شارەکەمانەوە و هەر نیاز و مەبەستێکیشت هەبوو، دەنگ بکە هەتا بۆت دابین بکەین.' پیرێژنە گورج گەڕاوە بۆ لای تاجولملووک. تاجولملووک بە دیتنی پیرێژنە دڵی وە لێدان کەوت و خێرا لە بەری هەستا. دەستی گرت و لە پەنا خۆی داینا. کە پیرێژن تاوێک دانیشت و حەساوە، پەیامەکەی خانمیدنیای بە تاجولملووک ڕاگەیاند. کە تاجولملووک ئەو پەیامەی بیست، دڵی حەساوە و لە ڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو. گرێی نیگەرانی کراوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەوە ئاواتم وەدی هات.' دوایی بە پیرێژنەی گوت: 'دەمەوێ نووسراوەیەکم بۆ بەری و وەڵامەکەیم بۆ بێنییەوە.' پیرێژن گوتی: 'بەسەر هەردووک چاوم.' تاجولملووک بە عەزیزی گوت: 'قەڵەم و کاغەزم بۆ بێنە.' عەزیز هەردووکیانی بۆ هێنا. تاجولملووک ئەو بەیتانەی نووسین:

بوتی من! بۆ کەرەمێک ڕێی دوور و سەختم بڕیوە
بە هەزار خۆزگە و بریا کاڵەی ئاسنین[1]م دڕیوە
خاک و خۆڵ شایەدن کە لەو ڕێگای دوور و درێژە

---

١. کاڵەی ئاسنین: جۆرە پێڵاوێک کە لە ئاسن درووست کرێ.(مەبەست سەختی ڕێگاکەیە)

" 'لە سەردێڕەکەیشی نووسی: 'ئەوە نامەی سووتاوێکی ئاوری خۆشەویستییە کە گیرۆدەی خەمی دیدارە و ڕێی بە یارگەیشتنی بۆ نالوێ و تێدا ماوە چۆن شوورەی نێوانیان بڕووخێنێ. بە ئاوری ئەوەوە دەوروبەریانیشی دەسووتێن.' دوای ئەوە ئەسرین لە چاوانی لیزگەیان بەست و ئەو دوو بەیتەشی نووسی:

بینینی ڕووی تۆ، خەون و خەیاڵە
هەتا نەتبینم، ژینم هەر تاڵە
دڵ گیرۆدەیە بە ئەڤینی تۆ
هانام هێناوە، نەمکەی ڕەنجەڕۆ

" 'نووسراوەکەی پێچاوە و مۆری کرد و دای بە پیرێژنە. هەزار دیناری زێڕیشی لە مستی پیرێژنە نا و گوتی: 'ئەوەم وەک دیاری لێ وەرگرە.' پیرێژنە هەستا و زێڕەکانی هەڵگرت و زۆریشی سپاسی تاجولملووک کرد. بەدەم دۆعای خێرەوە بۆ تاجولملووک، ملی ڕێیەی گرت. هەتا گەیشتە لای خانمیدنیا. کاتێک خانم دیتی، گوتی: 'ئەی دایەی دڵسۆزتر لە دایک! ئەو لاوە چ ئامانجێکی هەبوو هەتا بۆی وەدی بێنم؟' پیرێژن گوتی: 'نووسراوەیەکی ناردووە، نازانم چی تێدا نووسیوە.' ئیدی نووسراوەکەی دا بە خانم. خانم نووسراوەکەی وەرگرت و کردیەوە. کە خوێندییەوە، لە مەبەستەکەی گەیشت و گوتی: 'ئەوە بازرگانزادەیەک چۆن وێراویەتی و ڕێی بە خۆیداوە نامە بۆ من بنووسێ؟ بە خودا ئەگەر لە ترسی خودا نەبایە، هەر لە دووکانەکەیدا دەمکوشت.' پیرێژنە گوتی: 'چی بۆ نووسیبووی وا تووڕە بووی؟ شکایەتی لە کەسێک بوو یان نرخی کاڵایەکی ویستووە؟' خانم گوتی: 'لەو بارانەوە نەبوو، تەنیا باسی ئەوین و خۆشەویستی و ئەو جۆرە قسانە بوو، ئەویش هەمووی لە تۆ دەزانم. دەنا چۆن ئەو گڵاوە دەتوانێ قسەی وا بکا.' پیرێژن گوتی: 'خانمەکەم! ئەتۆ لەنێو ئەو کۆشک و قەڵا قایمەدا دانیشتووی، باڵندە ڕێی لێرە ناکەوێ، مرۆڤ چۆن دەستی بە تۆ ڕابگا؟! لەوەی کە گەماڵێک بوەڕێ، خۆ تۆ چت لێ نایە. قسەی ناحەزیش بە من مەڵێ، خۆ ڕاستە من نووسراوەکەم هێناوە، بەڵام نەمزانیوە چی تێدا نووسراوە. ئێستا ئەگەر بە من دەکەی، وەڵامی نووسراوەکەی بۆ بنێرەوە و زۆر بە توندی هەڕەشەی لێ بکە و تەنانەت هەڕەشەی کوشتنیشی لێ بکە هەتا لەمەو دوا لەو جۆرە قسانە نەکا.' خانم گوتی: 'لەوە دەترسم ئەگەر وەڵامی بدەمەوە، ئەویش شتێک بنووسێتەوە و ڕووی بکرێتەوە.' پیرێژنە گوتی: 'وا نییە، ئەگەر بزانێ تۆ هەڕەشەی لێ دەکەی و جوابی دەکەی، ئەویش فکری تۆ لە سەری دەباتە دەرێ.' ئیدی خانم گوتی: 'دا قەڵەم و کاغەزێکم

دەنێ.' قەڵەم و کاغەزیان بۆ هێنا و ئەو بەیتەی نووسی:

تـــــــــــۆ لە کوێ و بە من گەیـــــــــــشتن لە کوێ؟!
کـوا بـۆ یەک دەبـن چەکـچەکـیـلە[1] و خـۆر؟!'

" 'دوایە ئەو بەیتەشی نووسی:

مێشـــــووله! ئـاســــمـان شـــوێنی فڕینی تۆ نییە
زۆر زۆر ســــووکی تۆ چووزانی هێزی بـا چییە

" 'ئیدی نامەکەی پێچاوە، دای بە پیرێژنە و گوتی: 'ئەو نامەیەی بۆ بەرەوە و پێشی بڵێ ئەو قسانە نەکاتەوە.'

" 'پیرێژن نووســراوەکەی وەرگرت و بە خۆشــحاڵییەوە ڕۆیشــتەوە ماڵی خۆی. هەتا بەیانی حەســاوە و بەیانی زوو چووەوە دووکانەکەی تاجولملووک و ســەیری کرد ئەوە چاوەڕێیەتی.

" 'کاتێک تاجولملووک پیرێژنەی دیت، خۆشــحاڵ بوو. لە بەری هەســتا و لە پەنا خۆی داینا. پیرێژن نووســـراوەکەی دەرهێنا و دای بە تاجولملووک. پێشـــی گوت: 'کاتێک خانم نـامەکەی تۆی خوێنـدەوە، تووڕە بوو. بەڵام هەر بە زمـانی گـاڵتە و گەپەوە دوانـدم و دڵخۆشــیم داوە هەتا دڵی نەرم بوو و وەڵامەکەی تۆی نووســـییەوە.' تاجولملووک زۆری دەستخۆشی لێ کرد و لەبەر ئەو زەحمەت و دڵسۆزیانەی کردوویەتی سپاسی کرد. ئینجا بە عەزیزی گوت: 'هەزار دیناری زێڕی نەقد بدە بە دایە پیرە.'ئەو جار نامەکەی کردەوە و خوێندییەوە. کە تەواو بوو، دەستی کرد بە گریان سەیر. پیرێژنە زۆری زگ پێی سووتا و پێی گوت: 'ڕۆڵە ئەوە چی نووسـیبوو وا ئاوا دەگری؟' تاجولملووک گوتی: 'هەڕەشــەی لێ کردووم کە ئەگەر نامەی بۆ بنووســـمەوە بمکوژێ. گوتوویە قســـەی ئاوای لەگەڵ نەکەم. منیش مردنم پێ باشــترە لەوەی بێ ئەو بژیم. هەر بۆیە، ئەوە شــتێکی بۆ دەنووســم ئەتۆ بۆی بەرەوە. جا چیم لێ دەکا با لێم بکا.' پیرێژن گوتی: 'بە جوانیت قەســـەم! یان منیش لەگەڵ تۆدا تێدا دەچم، یان بە ئاواتت دەگەیێنم. تاجولملووک گوتی: 'هەر چاکەیەکم لەگەڵ بکەی، بە سەدان قات چاکەت لەگەڵ دەکەمەوە.'

" 'ئەو جار دەستی دا قەڵەم و کاغەز و ئەو بەیتانەی بۆ نووسی:

ڕوو وەر مەگـێـڕە مـن بـۆ وەی نـابـم

---

١. چەکچەکیلە: شەمشەمەکوێرە.

له سـوێی عەشـقی تۆ جەرگ کەبابم
لەگەڵ عاشـقی هەڵوەدا و شـەیدا
بـۆ دەخەیـتە رێ لەشـکری جەفـا
خـۆزگە دەتـزانـی لە کـوێـرا هـاتـووم
چـۆن لەگەڵ سـەخـتـی رێـگـا راهـاتـووم

" 'دوای ئەوە ئاخێکی هەڵکێشـا و ئەوەندە گریا تا پیریژنیش لەگەڵی دەسـتی کرد بە گریان. ئەو جار کاغەزەکەی لە تاجولملووک وەرگرت و گوتی: 'نارەحەت مەبە، بە ئاواتت دەگەیێنم.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سەد و سی و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'پیرێژنە زگی بە تاجولملووک سووتا و پێی گوت: 'ناڕەحەت مەبە و بە ئاواتت دەگەیێنم.' دوای ئەوە هەستا و چووەوە بۆ لای خانم. سەیری کرد ئەوەندە لەو نامەیە ناڕەحەت بوو و ڕەنگی تێک چووبوو. کە پیرێژنە نامەکەی دایە، ئەوەندی دیکەش تووڕە بوو، گوتی: 'نەمگوت ئەگەر وەڵامی بۆ بنووسمەوە، ڕوودار دەبێ؟' پیرێژن گوتی: 'ئەو کوا شایانی ئەوەیە چاو ببڕێتە تۆ؟' خانم گوتی: 'بچووەوە پێی بڵێ ئەگەر ئەم جارە نامە بنووسێ، دەیکوژم.' پیرێژنە گوتی: 'هەر ئەوەی گوتت بینووسە با بۆی بەرم، بەشکو ترسەکەی زیاتر بێ.' ئیدی خانم کاغەزێکی وەرگرت و ئەو بەیتەی نووسی:

ئەو تەوارە بە داوی تۆوە نابێ
پیاوی ژیرم دەوێ لێم حاڵی بێ
کۆ کەوە داوت و هەستە بڕۆ
ڕێگەی خۆت بگرە تا نەبووی ترۆ

" 'دوایە ئەوەشی نووسی:

مەلیچک تینووی وتوویژ لەگەڵ باز و شەهێنە
چارەڕەشە پەلەیەتی بۆو ساتە دڵتەزێنە

" 'پاشان نووسراوەکەی پێچاوە و دای بە پیرێژنە. پیرێژن نووسراوەکەی وەرگرت و چووەوە بۆ لای تاجولملووک. کە تاجولملووک دیتی لەبەری هەستا و گوتی: 'خودا پێ و قەدەمی خێری تۆم لەسەر کەم نەکا.' ئیدی پیرێژنە نووسراوەکەی دایە و تاجولملووک لێی وەرگرت و خوێندییەوە. پاشان زۆر گریا و گوتی: 'ئەمن مردن بە ئاوات دەخوازم. ئەوە کێیە وا دەیهەوێ من لەو هەموو مەینەتییە ڕزگار بکا؟ با بێ و زوو بمکوژێ.' ئیدی دەستی دا قەڵەم و کاغەز و باسی ئاواتەخوازی مردنی لەڕێی ئەڤیندا بۆ نووسی:

ئەگەر بمکوژی دڵم خۆش بکەی
ڕێگەی خۆشبەختیم مسۆگەر دەکەی
بەو جۆرە دایم لە دڵتدا دەبم
لە بیرم ناکەی دەڵێی بۆ کوشتم
ڕووحیشم دایم هەر لە لات دەبێ

" 'ئیدی نامەکەی پێچاوە و دای بە پیرێژنە و گوتی: 'ببوورە، تۆشـم خسـتە زەحمەت و مەینەتەوە و ئاکامێکیشـی نەبوو.' بە عەزیزیشـی گوت کە هەزار دیناری زێڕی نەقد بدا بە پیرێژنە. دیسـان ڕوی لە پیرێژنە کردەوە: 'دایە، ئەو نامەیە یا دەمکا بە خانی خانان، یان دەمکا بە تۆزی بانان.' پیرێژنە گوتی: 'ئاواتی من ئەوەیە خێرت وەڕێ بێ، پێشـم خۆشـە ئەو ڕووگەش و هەتاوسـیمایە بۆ تۆی ڕووپاک و هەیڤڕوو بێ. ئەگەر من نەتوانم ئەو دووانەتان پێک بگەیێنم، ئەی بە کاری چی دێم؟ ئەوە شەست ساڵم بە فرتوفێڵ و کەڵەک و خاپاندن بردووەتە سـەرێ، یانی بڵێی نەتوانم دوو کەس پێک بگەیێنم؟' داوی ئەوە زۆری دڵخۆشی تاجولملووک داوە و ماڵاوایی لێ کرد و ڕۆیشتەوە بۆ لای خانم. نووسراوەکەشی لە پرچی خۆیدا شاردبووەوە.

" 'کاتێک لە لای خانم دانیشـت، سـەری خۆی خوراند و گوتی: 'خانمەکەم، ماوەیەکی زۆرە نەچوومە گەرماو.' ئیدی خانم قۆڵی هەڵکرد و دەسـتی کرد بە دۆزینی سـەری. کە نووسـراوەکە لە سـەری بەربووەوە، خانم کاغەزەکەی دیت. گوتی: 'ئەو کاغەزە چییە؟' پیرێژن گوتی: 'نازانم! ئەوە لە دووکانی ئەو بازرگانزادەیە دانیشـتبووم، ڕەنگە لەوێ خسـتبێتیانە نێو قژمەوە. دا بمدیە با بۆی بەرمەوە.' ئیدی خانم کاغەزەکەی کردەوە و خوێندییەوە. بە پیرێژنەکەی گوت: 'ئەو فێڵە هی تۆیە. ئەگەر تۆ منت پەروەردە نەدەکرد، ئێسـتا دەمزانی چم لێ دەکردی. خودا ئەو بازرگانەی بۆ کردە بەڵای گیانی من؟ هەرچی بەسەریشـم دێ، هەر لەبن سەری تۆدایە. ئێستا نازانم ئەو لاوە لە کام وڵاتەوە هاتووە. تا ئێستا کەس نەیتوانیوە ئاوا لەگەڵ من قسە بکا. دەترسم قسە و نهێنیم بڵاو بێتەوە. ئەویش لەگەڵ ئەو غەوارەیە کە هاوشـانی منیش نییە.' ئیدی پیرێژنە ڕووی لە خانم کرد و گوتی: 'لە ترسـی بابت و سـامی تۆ، کەس ناتوانێ باسـی ئەو قسـانە بکا. ئەگەر تۆ وەڵامیشـی نەدەیەوە، کێشە نییە.' خانم گوتی: 'دایەی دڵسۆز، ئەو گڵاوە زۆر نەترسە! پێم سەیرە چۆن وێراویە لە بابم نەترسێ و ئەو قسانە لەگەڵ من بکا؟! بە ڕاستی من سەرم لە بوێری ئەو سوورِ ماوە! ئەگەر بیکوژم، ئەوە کارێکی باش نییە. ئەگەر لێی گەڕێم هەر وا بڕواتە پێشێ، ئەوە هەر ڕوودارتر دەبێ.' پێرێژنە گوتی: 'تۆ نامەیەکی دیکەی بۆ بنووسە. هاتوو ترسـا و دەسـتی هەڵگرت.' ئیدی خانم پێنووس و لێ نووسـی هەڵگرت و داوای جەوهەری کرد و ئەو چەند بەیتەی نووسی:

هەر کەسـێ پەرپەرۆکاسـا[1] قەسـتی سـوـوتانی نەبێ
پێی بڵێن بـا هەر لە خۆڕا هەڵسـووڕ و داسـووڕی نەبێ
خۆ لە مەڵبەند و هەواری جوان و نەشـمـیلان نەدا
شـوێنی وا جەرگی دەوێ بە تەمـای دەرچوونـی نەبـێ

" 'دوای ئەوە کاغەزەی پێچاوە و دای بە پیرێژنە. پیرێژنە نووسـراوەکەی وەرگرت و چوو بۆ لای تاجولملووک. کاتێک نامەکەی دا بە تاجولملووک و زانی چی لێ نووسـراوە، ئیتر زانی کە خانمیدنیا دڵڕەقە و گەیشـتنی تاجولملووک بەو کارێکی سـەختە. پەنای بۆ وەزیر برد و داوای یارمەتی لێ کرد. وەزیر گوتی: 'فڕوفێڵ قەت کار جێبەجێ ناکا. چار ئەوەیە نامەیەکی بۆ بنووسە و لە بەری بپاڕێوە و بە زمانی خۆش لەگەڵی بدوێ.'

" 'تاجولملووک بە عەزیزی گوت: 'برا گیان، لە زمان منەوە نامەیەکی بۆ بنووسە.' ئیدی عەزیز کاغەزێکی هێنا و ئەو بەیتانەی بۆ نووسی:

ئـاورم لـێ دەوە، دڵـبـریـندارم
بەزەت بـبـزوێ، عـاشـقـی زارم
ئـازاری دڵـدار، شـانـازی نـیـیە
لە عەشـقـت زیـاتـر خـۆ هـیـچـی نـیـیە
عەشـقـی تـۆی نەبـێ ئەو چـارەڕەشـە
بـمـرێ چـاتـرە لەو بەخـتە ڕەشـە
غەریـب و نـامـۆ بـێ پەنـام لـێـرە
بـریـنـداری تـۆم چـارم کە خـێـرە

" 'عەزیز نامەکەی نووسـی و دای بە تـاجولملووک. تـاجولملووک نووسـراوەکەی خوێندەوە، زۆری بە دڵ بوو. هەر بۆیە مۆری کرد و دای بە پیرێژنە. پیرێژنە نـامەکەی وەرگرت و گەڕاوە بۆ لای خانم و نامەکەی دایە. کە خانم نامەکەی خوێندەوە، زۆر زۆر تووڕە بوو و گوتی: 'ئەوەی بەسـەرم دێ، هەمووی هی ئەو پیرێژنە گلاوەیە.' ئیـدی کەنیزەکـانی گـاز کرد و گوتی: 'ئەو پیرێژنە گلاوە بگرن و ئەوەنـدەی لێ دەن هەتـا ڕێی خۆشـی نەبینێتەوە.' کەنیزگەل داگژانە پیرێژنە و بە لینگە پێلاو و مسـت و زللە ئەوەندەیان لێ دا هەتا بێهۆش بوو. کە وە هۆش هاتەوە، خانم پێی گوت: 'کەلاک، ئەگەر لە ترسی خودا نەبایە و بمویرابایە، لێرە دەمتۆپاندی.' ئەوەندەی ڕق هەسـتابوو کە دیسـان دەسـتووری دا

---

[1]. پەرپەرۆک: پەپوولە.

کەمێکی دیکەشــی لێی دەن. ئەوەندەیان لێ دا هەتا بێهۆش بووەوە. ئەو جار خانم فەرمانی دا ڕایانکێشـــا و فڕێیان دایە دەرێ. کە وە هۆش هاتەوە، هەســـتا، نەیدەتوانی بڕوا. هەر کەمێک ڕۆیشت و کەمێک دانیشت هەتا گەیشتەوەماڵەکەی خۆی. هەتا بەیانی لە ماڵەکەی خۆی نەهاتە دەرێ. دوای ئەوە هەستا و چوو بۆ لای تاجولملووک و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە.

" 'گرێ کەوتە کارەکەی تاجولملووکەوە. بە پیرێژنەی گوت: 'ئەوەی بەسەر تۆ هات، بۆ من زۆر ناخۆش بوو. بەڵام چ بکەین چارەنووســە.' پیرێژنە گوتی: 'نارەحەت مەبە، ئاخری کارێک دەکەم ئێوە پێک بگەن، هەرچەند ئەو قەحبەیە زۆری ئازار دام.' تاجولملووک بە پیرێژنەی گوت: 'باشـــە لەبەر چی ئەوەندەی ڕق لە پیاوە؟' پیرێژن گوتی: 'ئەوە دوای خەونێک وای لێ هات.'

" 'تاجولملووک گوتی: 'خەونەکەی چۆناوچۆن بوو وا ئەوەندەی کار تێ کرد وای لێ بێ؟'

" 'پیرێژنە گوتی: 'شـــەوێک خەون بە ڕاوچییەکەوە دەبینێ کە تەبکەی ناوەتەوە و لەو لاوە چووەتە بۆســەوە. مەل تێی دەئاڵێن و دێنە دەوری تەبکەکە. لەنێو باڵندەکاندا جووتێک کۆتریان تێدا بوو کە نێر و مێی یەکتر بوون. لە پڕدا کۆترە نێرەکە لاقی لە داوێک گیر بوو و پێوە بوو. دەســـتی کرد بە پەلەقاژە و فڕکەفڕک بە جۆرێک کە تەواوی مەلەکانی دیکە ترسان و هەڵاتن. تەنانەت کۆترە مێوەکەش. ئەوەندەی پێ نەچوو کە کۆترە مێوەکە گەڕاوە ســـەری و بە دندووک خەریکی داوەکە بوو. ڕاوچی چاوەڕێ بوو ئەویش پێوە بێ. هەتا ئاخری پێوە نەبوو هیچ، ئەویشی ڕزگار کرد و پێکەوە هەڵفڕین.

" ' 'دوای ئەوە ڕاوچییەکە هاتەوە، داو و تەپکەکەی ڕێکوپێک کردەوە و دیســـان چوو خۆی مات داوە. ماوەیەکی پێ چوو مەلەکان دیســـان یەکیەک و دوودوو هاتنەوە دەوری تەپکەکە، وەک جاری پێشـوو دوو کۆترەکەش هاتنەوە. ئەم جارە بە ڕێکەوت قاچی مێوەکە بە داوێکەوە بوو. ئەویش لە تاوان دەســـتی کرد بە پڕژەپرژ و پەلەقاژە، دیســـان تەواوی مەلەکان هەڵفڕین. تەنانەت نێرەکەشـــی. بەڵام نێرەکە کە هەڵفڕی، یەکجاری ڕۆیشـــت و ئاوڕی لە مێوەکەی نەداوە. ڕاوچی چوو کۆترە مێوەکەی گرت و کوشتی. خانم لە تاوان لە خەوەکە ڕاپەڕی و گوتی: 'پیاوانیش هەموو ئاوان و خێریان بۆ ژنان بە نێوچاوانەوە نییە.'
' کاتێک پیرێژنە هۆکاری لەپیاوبێزاربوونەکەی خانمی بۆ تاجولملووک و وەزیر گێڕاوە، تاجولملووک بە پیرێژنەی گوت: 'دایە، ئەگەر بۆ تاقە جارێکیش بێ، تەنانەت لەسەر ئەوە بە کوشـتیش چم، دەمەوێ ببینم. ئەتۆ فێڵێک ساز کە چاوێکم پێی بکەوێ.' پیرێژن گوتی: 'لە خوار کۆشـــکەکەیەوە باخێکی لێیە، لە مانگدا دوو جار دەچێتەوە ئەوێ بۆ ســـەیران و دە

ڕۆژی پێ دەچێ. ئێستا کاتێتی بچێتە سەیران. هەر کە ئەو بچێتە باخ، ئەمن پێت ڕادەگەیێنم هەتا بچییە باخ و ببینی. بەڵام لە باخ مەیە دەرێ، بەڵکوو بتبینێ و گیرۆدەی جوانی و قۆزییەکەت بێ. کار لە دڵی بکەی. چونکە خۆشەویستی گەورەترین ئامرازی پێکگەیشتنە.' ئیدی تاجولملووک و عەزیز هەستان پیرێژنیان هەتا ماڵێ بردەوە و ماڵەکەیان پێشانی پیرێژن دا.

" 'دوای ئەوە تاجولملووک بە عەزیزی گوت: 'براکەم، ئەوەی دەبوو ببێ بۆ ئەوەی لەگەڵ خانمی‌دنیا ئاشنا بین، بوو. لەمەو بەدوا ئیدی من پێویستیم بە دووکان و شت نییە و پێشکەشی تۆی دەکەم.' دوای ئەوە پێکەوە دانیشتن و دەستیان کرد بە قسەکردن و باسی هەموو شتێکیان دەکرد. تاجولملووک لەبارەی بەسەرهاتی سەیر و سەمەرەی عەزیزەوەی پرسی و، ئەویش هەموو شتێکی بۆ گێڕاوە.

" 'ئینجا هەستان چوون بۆ لای وەزیر و پرسیان: 'چ بکەین؟' وەزیر گوتی: 'هەستن با بچین بۆ باخ.' ئیدی جلوبەرگی شکۆداریان لە بەر کرد و لەگەڵ سێ دانە لە کۆیلەکانیان بەرەو باخی خانم وەڕێ کەوتن. سەیریان کرد، باخێکە لە گوێن باخی بەهەشت و بگرە خۆشتریش. باخەوانێکی پیر لە بەردەرگە دانیشتووە. سڵاویان لە باخەوانەکە کرد و باخەوانەکە سڵاوی ئەستاندنەوە. وەزیر سەد دیناری زێڕی دا بە باخەوانەکە و گوتی: 'بەو زێڕانە خواردنمان بۆ بکڕە، ئێمە غەریبین و دەمانەوێ کەمێک لەو باخەدا بحەسێینەوە. باخەوانەکە دینارەکانی وەرگرت و پێی گوتن: 'ئێوە بچنە نێو باخەکەوە، دەگەڕێن، دادەنیشن، چۆنتان پێ خۆشە وا بکەن. ئێستا منیش دەچم خواردنتان بۆ دێنم و دێمەوە.' ئەوەی گوت و باخەوانەکە چوو بۆ بازاڕ. وەزیر و تاجولملووک و عەزیزیش چوونە نێو باخەکەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو باخەوانەکە گەڕاوە و کاوڕێکی برژاوی هێنابوو. ئەوان خواردنەکەیان خوارد و دەستیان شوشت و دانیشتن دەستیان بە قسە کرد. وەزیر بە باخەوانەکەی گوت: 'گەورەم ئەو باخە هی خۆتە یان بە ئیجارەت گرتووە؟' باخەوانەکە گوتی: 'ئەو باخە هی خانمی‌دنیای کچی پاشایە.' وەزیر گوتی: 'مانگانە چەندت مووچە دەداتێ؟' باخەوانەکە گوتی: 'مانگێ دینارێکم دەداتێ.'

" 'وەزیر لە باخدا زۆر گەڕا و سەیری کرد، دیتی لەنێو باخەکەدا خانوویەکی تێدایە، بەڵام تۆزێک کۆنە. وەزیر بە باخەوانی گوت: 'مامە گیان، دەمەوێ لێرە کارێک بکەم هەمیشە یادم بکەی.' باخەوانەکە گوتی: 'چ دەکەی؟' وەزیر گوتی: 'جارێ ئەو سێ‌سەد دینارەم لێ وەرگرە. دوایە پێت دەڵێم.' باخەوان لە خۆشیان گوتی: 'هەرچی دەکەی، بیکە.' زێڕەکانی دا بە باخەوان و گوتی: 'لێرەدا شوێنەواری خێر و بەرەکەت دادەمەزرێنم.' ئینجا لە باخ چوونە دەرێ و چوونەوە مزڵەکەیان و ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر لە ڕاوێژ و تەگبیردا بوون.

" 'کە ڕۆژ بووەوە، وەزیر وەستای دیوار و نەققاشی پەیدا کرد و هەموو پێداویستییەکی بۆ ساز کردن و هێنانی بۆ باخ و پێی گوتن چ بکەن. کۆشکیان ڕێکوپێک و سپی کردەوە و بە ڕەنگی جۆراوجۆر ڕازاندیانەوە. بەردی لاجوەردی و ئاوی زێڕی بۆ هێنان و بە نەققاشی گوت: 'لەسەر ئەو هەیوانە وێنەی ڕاوچییەک بکێشەوە کە تەپکەیەکی ناوەتەوە و کۆترێکی مێوەیش بە داوی تەپکەکەوە بووە.' کاتێک نەققاش ئەوانەی کێشاوە، وەزیر گوتی: 'لە لایەکی دیکەشەوە وێنەی تەپکە و ڕاوچییەکە بکێشەوە کە شەمێنێکیش خەریکە بە چەقۆیەک کۆترە مێیەکە سەر دەبڕێ. ڕووبەڕووی ئەویش وێنەی باشوویەکیش بکێشەوە کە کۆترە نێرەکەی ڕاو کردووە و هەردووک چنگی لە لەشی بردووەتە خوارێ.'

" 'نەققاش ئەوانەی هەموو کێشاوە. دوای ئەوە، وەزیر مالاوای لە باخەوان کرد و لە باخ هاتە دەرێ و چووەوە مزڵەکەی خۆی. ئیدی دانیشتن و لە هەموو بارێکەوە قسەیان کرد. تاجولملووک بە عەزیزی گوت: 'براکەم، هێندێکم شێعر بۆ بخوێنەوە بەشکو ژەنگ و ژاڵی دڵم بشواتەوە و تۆزێک مێشکم ئاسوودە بێ.' وا بوو، عەزیز وە جۆش هاتوو دەستی کرد بە گۆرانی و ئەو بەیتانەی بۆ خوێندەوە:

ئەو شادیبەخشە کێ بوو ناوی دلبەری هێنا
لەو بەختەڵبارانەدا ڕێژنە بارانی هێنا
پاشای وڵاتی خۆم بووم بە ڕێز و ڕوومەتەوە
ئەوین لە خشتەمی برد، هات کۆیلایەتی هێنا
بە شانازی دەزانم کۆیلەی ئەو نازدارە بم
ئەوینی ئەو نازدارە هیوا و ئومێدی هێنا

" 'کاتێک عەزیز شێعرەکەی تەواو بوو، تاجولملووک سەری لەو ڕەوانبێژی و دەنگخۆشیەی عەزیز سوور ما و، گوتی: 'بژی، بەشێک لە خەمەکانمت ڕەواند. ئەگەر هی دیکەش دەزانی، بەو دەنگە خۆشەت بۆم بڵێ.' عەزیز ئەو چەند بەیتەشی گوت:

لەگەڵ خەڵکی لێوبەبزە، لەگەڵ ئەو مۆڕ بووم
بە لایدا تیژ تێدەپەڕیم وەک ئەسپی تۆڕ بووم
بەختەوەری میوانێک بوو ڕام نەگرت ڕۆیشت
هەنگێکی سەر لێ شێواو بوو دام نەکرد ڕۆیشت
بەختەوەری دارێک بوو خۆی لەماڵم ڕوابوو
دەرم کێشا لە ڕیشەوە، ماڵم خرابوو

" 'ئەوان بەو جۆرە خەریکی شـــیعر خوێندنەوە و دەردیدڵ بوون. پیرێژنەش لە ماڵێ دانیشـــتبوو هاتوچۆی خانمیشـــی نەدەکرد. هەتا ڕۆژێک خانم بیری باخی کرد. چونکە قەت بێ پیرێژنەکە نەچووبووە دەرێ، خزمەتکارێکی نـاردە شـــوێن پیرێژنە و بـانگی کرد و دڵخۆشی داوە و ئاشتی کردەوە و پێی گوت: 'وەرەزم، بیری باخم کردووە. دەڵێم بچمە ناو ئەو گوڵ و گیا و ســـەوزاییە تۆزێک دڵم بکرێتەوە.' پیرێژنە گوتی: 'فەرمانتە، بەڵام دەبێ هەتا ماڵێ بچم جلەکانم بگۆڕم.' خانم گوتی: 'بچۆ، بەڵام زوو وەرەوە.' پیرێژن لە لای خانم هـاتە دەرێ و خۆی گەیـانـدە مـاڵی تـاجولملووک. بە تـاجولملووکی گوت: 'خێرا خۆت بڕازێنەوە و، بڕۆ باخ و لەوێ خۆت حەشـــار بدە.' پاشـــان لەنێوان خۆی و تاجولملووکدا نهێنییەکی دانا و ڕۆیشـــتەوە بۆ لای خانمیدنیا. دوایی وەزیر و عەزیز هەســـتان جلی ئاوریشم و دیبایان لە بەر تاجولملووک کرد و پشتێنەی ڕازاوە بە زێڕ و زیو و گەوهەری کانیان لە قەدی بەسـت. دوای ئەوە بەرەو باخ ڕۆیشـتن و گەیشـتنە بەر دەرگای باخەکە. باخەوانەکە لەوێ دانیشتبوو. کاتێک تاجولملووکی دیت، لە بەری هەستا و کوڕنۆشی برد و بەرەو پیری چوو. دەرکی باخی بۆ کردەوە و گوتی: 'فەرموون بچنە نێو باخ و ســـەیران بکەن.' بـاخەوان نەشـــیدەزانی کە کچی پـاشـــاش هەر لەو ڕۆژەدا دێ بۆ بـاخ. ئیدی تـاجولملووک چووە نێو بـاخەکەوە. ئەوەنـدەی پێ نەچوو کە دەنگەدەنگی کەنیز و خزمەتکارەکان هات. دوای ئەوە کەنیز و پێشخزمەتەکان لە دەرکی تایبەتەوە هاتنە ژوورێ. باخەوان کە ئەوانی دیت، خۆی گەیاندە تاجولملووک و گوتی: 'چ بکەین؟ ئەوە کچی پاشاش هات!' تاجولملووک گوتی: 'ئەتۆ خەمت نەبێ، ئەمن لەو پشـت دارانەوە خۆم دەشـارمەوە.' ئیدی باخەوانەکە یارمەتی دا لە کوێ خۆی وەشێرێ و بۆخۆی ڕۆیشتە ئەو لاوە.

" 'کە کچی پاشـــا و کەنیزەکانی لەگەڵ پیرێژنەکە هاتنە نێو باخەکەوە، پیرێژنە لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر ئەو کەنیز و خزمەتکارانە لێرە بن، ئەوە چمان بۆ ناکرێ و بە ئامانج ناگەین.' ئیدی بە کچی پاشـــای گوت: 'خانمەکەم، خۆ پێویســـتیت بەو کەنیز و خزمەتکارانە نییە، هەتا ئەوان لێرە بن ئەتۆ چاک ناحەســـێیەوە. ئەوە بۆخۆشـــم لە خزمەتتدام. پێیان بڵێ بگەڕێنەوە.'

" 'خانمیدنیا گوتی: 'ڕاســـت دەکەی.' ئیدی ئەوانی ناردەوە و بۆخۆی ئارامئارام بە لەنجە و لار دەڕۆیشت و سەیری دەکرد. تاجولملووکیش بە دزییەوە سەیری ئەو هەمووە جوانی و دەلالی و ڕێکوپێکییەی ئەو پەریڕووەی دەکرد و دەیگوت:

ســـەرمەســـت بە نێو بـاخی گوڵانـدا هـات
جـریـوەی مەل لەنـێـو گـوڵـزارا هـات
مەلـی نـێـو چـیـمەن قـریـوە قـریـویـان بـوو
دیـتـیـان بە لەنـجە لەو لاڕا وا هـات

" 'پیرێژنه ئەو پەریڕوخسارەی سەرقاڵی قسەوباس کرد و ڕۆیشتن ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ئەو کۆشکەی کە وەزیر فەرمانی دابوو نەققاشی بکەن. چوونە نێو کۆشکەکەوە. خانم چاوی لە وێنەی مەل و ڕاوچی و تەپکە و کۆترەکان کرد و گوتی: 'سوبحانەڵڵا، ئەوە ڕاسـت ئەو خەونەیە کە من دیومە.' ئیدی گوتی: 'دایە گیان، چاو لەو وێنانە بکە، ئەمن هەمیشە پیاوانم سەرکۆنە دەکرد و لێیان بێزار بووم. جوان چاو لێ کە، ڕاوچییەکە هەردووک کۆترە نێر و مێیەکەی گرتووە، نێرەکەی ڕزگاری بووە. ویستوویەتی بگەڕێتەوە سەر کۆترە مێوەکە و ڕزگاری بکا، کەچی لەو جەنگەیەدا شەهێنێک هاتووە و پڕی داوەتێ و چنگی لێ گیر کردووە.'

" 'پەریڕوخسار یەکەیەکەی ئەو وێنانەی پێشانی پیرێژنە دەدا و ئەو قسانەی بۆ دەکرد. بەڵام پیرێژنە خۆی لە گێلی دەدا و هەر بە قسەوە خافڵاندی هەتا بردییە نیزیک ئەو شوێنەی کە تاجولملووک خۆی لێ مات دابوو. کە نیزیکتر بوونە، پیرێژن بە ئاماژە تاجولملووکی تێگەیاند کە بەرەو دیمەنەکانی کۆشک بێ. کەمێک ڕۆیشتن لە پڕدا خانمیدنیا چاوی لەو لایە کرد و تاجولملووکی دیت. بە دیتنی واقی وڕ ما و سەری لەو هەمووە جوانی و قۆزیەی سووڕ ما و بە پیرێژنەی گوت: 'دایەی دڵسۆزم!

ئەوە کێیە وا بە ڕۆینی دڵـــــی ئێمەش دەبا؟
بەرەو کام لا سەفەر دەکا، بڵێی ئێمەش نەبا؟

" 'پیرێژن گوتی: 'نازانم کێیە، بەڵام دەبێ شازادە بێ.' ئیدی خانمیدنیا نوقمی سەیری جوانی و ڕێکوپێکی بەژن و باڵای ئەو گوڵڕووە بوو. هۆشی لەسەر خۆی نەما و حەز و تاسە بەسەریدا زاڵ بوو، بە پیرێژنەی گوت: ' دایە، ئەو کوڕە زۆر جوان و قۆزە.'

زۆر لە مێژ ساڵ بوو بڕیارم دابـــوو دڵ بە کەس نەدەم
دڵم بڕیارمی شکاند و دەڵـــێ خـــۆم بڕیار دەدەم
دین و دنیای من فـــیدای ئەو قەد و باڵا جوانەی بێ
پێی بڵێن بمبا لەگەڵ خۆی دەنا دنیا شـێت دەبێ

" 'پیرێژنەش گوتی: 'خانمەکەم، ڕاستە. ئەمنیش تا ئێستا کەسی ئەوەندە جوانم نەدیوە!' ئیدی پیرێژنە تاجولملووکی ئاگادار کردەوە بڕواتەوە مزڵەکەی خۆی. تاجولملووک هەر بە دم سەیر و چاوگێڕانی ناو باخدا ڕۆیشت و ماڵاوای لە باخەوانەکە کرد و ڕۆیشتەوە. بەڵام گڕی ئەڤین و خۆشەویستی لە دەروونیدا کڵپەی سەند و دڵی پڕ کرد لە خۆشی و نیگەرانی

و دڵەڕاوکێ. چووەوە هەموو ڕووداوەکەی بۆ وەزیر و عەزیز گێڕاوە هەتا ئەو شـــوێنەی کە پیرێژنە ئاماژەی کرد بڕواتە دەرێ. ئەوان گوتیان: 'ئەگەر بە ســـەلاحی تۆی نەزانیبایە، پیرێژن نەیدەگوت بڕۆ دەرێ.' تاجولملووک و وەزیر و عەزیز کاریان بێرە گەیشـــت. بەڵام خانمیدنیا، کچی پاشـــا، ئەڤین بە ســـەریدا زاڵ بوو. خۆشـــەویســـتی گەشـــەی کرد و بە پیرێژنەی گوت: 'ئەو مانگڕوومم لە تۆ دەوێ.' پیرێژنە گوتی: 'پەنا بە خودا لە دەســـت وەسوەسـەی شـەیتان. ئەتۆ پیاوانت خۆش نەدەویست، ئەوە چۆناوچۆن بوو بە دیتنی ئەو لاوە ئاوا گۆڕای؟ بەڵام بە خودا قەسەم جگە لە تۆی جوان و دەلال کەس شیاوی ئەوە نییە شـوو بەو کوڕە بکا.' کچی پاشـا بە پیرێژنەی گوت: 'دایە گیان، کارێک بکە پێک بگەین. بە خودا هەزار دیناری زێڕ و خەلاتێکت دەدەمێ کە بای هەزار دینار بێ. ئەگەر بە یەکمان نەگەیەنی، ئەمن دڵم دەتۆقێ.' پیرێژن گوتی: 'ئەتۆ بڕۆ کۆشـــکەکەی خۆت، ئەمن هەوڵی خۆم دەدەم.'

ئەگەر پێویست بێ بچم بۆ لای هـــــــــــــارووت و مارووت
جـادووی دنـیـایە دەکەم تـا دەیـهـێـنـم لەگەڵ خـۆم

" 'خانمیدنیا گەڕاوە کۆشـــکەکەی خۆی و پیرێژن بە پەلە خۆی گەیاندە تاجولملووک. کە تاجولملووک چاوی بە پیرێژنە کەوت، لە بەری هەســتا و بەرەو پیری هات و پیرێژنەی لە پەنای خۆی دانا. پیرێژنە گوتی: 'خۆشحاڵ بە کە فێڵ و کەڵەکەکەمان کاری خۆی کرد و بە ئـامـانجی گەیـانـدین.' ئیدی هەموو ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. تـاجولملووک گوتی: 'چ ڕۆژێکتان داناوە یەکتر ببینین؟' پیرێژن گوتی: 'ســـبەینێ ڕۆژی دیمانەتانە.' تاجولملووک هەزار دیناری زێڕ و خەلاتێکی بایی هەزار دیناری لەجێوە دا بە پیرێژنە. پیرێژنە وەریگرتن و گەڕاوە بۆ لای خانمیدنیا. خانم پێی گوت: 'ها مەلی سلێمان، خەبەری سەبا؟ دایە باسی خۆشـەویسـتەکەمم بۆ بکە.' پیرێژن گوتی: 'ماڵەکەیانم دیتەوە، سـبەینێ دەیهێنمە ئێرە لای تۆ.'

" 'خانم خۆشـــحاڵ بوو، هەزار دیناری زێڕ و خەلاتێکیشـــی دایە بایی هەزار دینار بوو. پیرێژن خۆشـــحاڵ بوو و ئەوانەشـــی وەرگرتن و گەڕاوە ماڵەکەی خۆی. شـــەو لە ماڵێ حەســـــاوە و ڕۆژی کردەوە. بەیـانی زوو وەدەر کەوت و چوو بۆ لای تـاجولملووک. جلوبەرگی ژنانی لە بەری تاجولملووک کرد و چارشێوێکی بەسـەریدا دا. پێی گوت: 'ئارام ئارام بەدوای مندا وەرە و پەلە مەکە. هەر کەسـیش قسـەی لەگەڵ کردی، وەڵامی مەدەوە.' کە جوان ئەوانەی فێری تـاجولملووک کرد، لە مـاڵێ هـاتنە دەرێ. تـاجولملووک بە جلکی ژنانەوە بەدوای پیرێژنەدا ڕۆیشـــت هەتا گەیشـــتنە دەرکی کۆشـــک. پیرێژن لەپێشـــەوە و تاجولملووک بەدوایدا چوونە نێو کۆشـکەوە. دەرگاکانیان کردنەوە و بە دالاناندا ڕۆیشـــتن

هەتا لە حەوت دەرگایان ڕەد بوون. کە گەیشتنە دەرگای هەشتەم، پیرێژن بە تاجولملووکی گوت: 'بەسەر خۆتدا زاڵ بە و سەرت لێ نەشێوێ. کە من قاوم کردی و گوتم: 'کەنیز وەرە ژووری،' ئیدی ماتڵ مەبە و زوو وەرە ژووری. کە لە نێوکۆکە[1] هاتییە ژووری، چاو لە دەستی چەپ کە، هەیوانێکی لێیە. پێنج دەرگا بژمێرە و لە دەرگای شەشەمەوە وەرە ژووری. گراوەکەت لەوێیە. تاجولملووک گوتی: 'ئەتۆ دەچیتە کوێ؟' پیرێژن گوتی: 'ناچم بۆ هیچ کوێ، بەڵام ئەمن ڕەنگە لەپشت پەردەیەکەوە قسەت لەگەڵ بکەم، لەدوای تۆوە دەبم.' ئیدی پیرێژن ڕۆیشت و تاجولملووک بەدوایدا هەتا گەیشتنە ئەو شوێنەی پەردەداری گەورە لەوێ بوو. پەردەدار کە دیتی کەنیزێک بەدوای پیرێژنەوەیە، گوتی: 'ئەو کەنیزە چ کارێکی هەیە؟' پیرێژن گوتی: 'ئەوە خانمی‌دنیا بیستوویە کە ئەو کەنیزە زۆر هونەرمەند و دەستڕەنگینە، بە تەمایە بیکڕێ.' پەردەدار بە پیرێژنەی گوت: 'ئەمن کەنیزی هونەمەند و بێهونەر ناناسم، هەتا نەیپشکنم ناهێڵم بچێتە ژووری، هەر وەک پاشا فەرموویەتی.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. نێوکۆ: دالانێکە کە دیوی دیکەی دێتەوە سەر.

# کە شەوی سەد و سی و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، 'پەردەدار بە پیرێژنەی گوت: 'ئەمن کەنیزی هونەمەند و بێهونەر ناناسـم، هەتا نەیپشـکنم ناهێڵم بچێتە ژووری، هەر وەک پاشـا فەرموویەتی.' ئیدی پیرێژن توورە بوو، بە پەردەداری گوت: 'ئەمن ئەتۆم بە پیاوێکی بەئەدەب و ئاقڵ دەزانی. ئەگەر دەزانی حاڵت تێک چووە، ئەوە بە خانم ڕادەگەیێنم کە کێشە بۆ کەنیزەکان درووست دەکا.' ئەو جـار پیرێژنە گـازی تـاجولملووکی کرد و گوتی: 'هۆی کەنیزەکە دا وەرە.' ئیـدی تـاجولملووک گورج و ئـازا چووە نێوکۆکەوە بە جۆرێک پەردەدار فریا نەکەوت قســـەی لەگەڵ بکا. دوای ئەوە تاجولملووک بە دەســـتی چەپەوە پێنج دەرگای ژمارد و لە دەرکی شـــەشـــەمەوە چووە ژووری. کە چوو، خانمیدنیا چاوەڕێیان بوو. کە خانم تاجولملووکی دی، ناســـییەوە. لەڕێوە ئامێزی بۆ کردەوە و یەکتریان لە باوەش گرت. پاش ماوەیەک پیرێژنیش لەولاوە کەنیزێکی دیکەی لە جیاتی تاجولملووک لە کۆشک بردە دەرێ و بۆخۆی گەڕاوە. خـانم بە پیرێژنەی گوت: 'دایە، بۆ خۆت دەرکەوانییەکەی بکە.' ئیـدی ئەو دوو مانگڕووە هەتا بەیان هەر خەریکی ڕاموسـین و ماچومووچ بوون و لە باوەشـی یەکتردا ڕۆژیان کردەوە. دوایی خانمیدنیا دەرگای لەسـەر تاجولملووک داخسـت و بۆخۆی چووە دیوێکی دیکە و بەپێی ڕۆژانی دیکە کەنیزەکان لێی کۆ بوونەوە و باس و خواس و قســەی لەگەڵ کردن و ئینجا گوتی: 'ئێوە بڕۆن. پێم خۆشـە بە تەنیا بم.' ئەوان ڕۆیشـتن و ئەویش هاتەوە لای تاجولملووک و دەســـتیان کردەوە بە خواردن و خواردنەوە و ماچومووچ و ڕابواردن. بەو شێوە هەتا مانگێک ڕایانبوارد.

" 'بەڵام وەزیر و عەزیز لەو مـاوەیەدا کە تـاجولملووک چووە لای خـانمیدنیـا و هەر نەهـاتەوە، نیگەران بوون و گوتیـان: 'بە خودا تـازە نـایەتەوە دەرێ و لەوێدا تیـا دەچێ.' وەزیر بە عەزیزی گوت: 'ڕۆڵە گیان، تووشـی کێشـە بووین. ئەگەر ئێمە زوو نەچینەوە لای بابی تاجولملووک و ئاگاداری نەکەینەوە، دوایە سـەرکۆنەمان دەکا و تووشـی سـزا دەبین.' ئیدی خۆیان سـاز کرد و گەڕانەوە بەرەو وڵاتی سـلێمانپاشـا. شـەو و ڕۆژ لە ڕێدا بوون هەتا گەیشـــتنەوە شـــارەکەی خۆیان و پاشـــایان ئاگادار کردەوە کە لەو ڕۆژەوەی تاجولملووک چووەتە کۆشکی کچی پاشا هیچ هەواڵێکی نییە. سلێمانپاشا قیامەتی هاتە بەر چاو و زۆر پەشـــیمان بووەوە. فەرمانی دا جاڕچی لە وڵاتدا جاڕی جیهاد لێ دەن. پاش ماوەیەک ســـوپایەکی زۆر لە دەرەوەی شـــار کۆ بووەوە و خێوەتیان هەڵدا. پاشـــا لە هۆبەکەی خۆیدا دانیشت هەتا سوپای شارە دوور و نیزیکەکانیش بگاتێ. وا بوو سوپایەکی بە قەد ئەستێرەی ئاسمان بۆ هێنانەوە و دیتنەوەی کوڕەکەی وەڕێ کەوت.

" 'تاجولملووک و خانمی‌دنیاش هەتا شەش مانگان بەو جۆرە پێکەوە بوون. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ خۆشەویستی و ئەڤینیان بۆ یەکتر زیاتر دەبوو. تاجولملووک ئەوەندەی چووە دڵییەوە و متمانەی پێ کرد، هەموو نهێنییەکی درکاند و بە خانمی‌دنیای گوت: 'خۆشەویستی دڵم، ئەمن لە مێژە لە لای تۆ ماومەوە و ڕۆژ لە ڕۆژ خۆشترم دەوێی و ئاوا لێت تێر نابم.' خانم گوتی: 'سۆمای چاوم، ئەی چی دیکەت دەوێ؟ ئەگەر بێجگە لە ماچ و رامووسین و لەباوەشگرتن تەمایەکی دیکەشت هەیە، تازە ئەتۆ هی منی و منیش خۆم بە هی تۆ دەزانم. چیت پێ خۆشە بیکە.' تاجولملووک گوتی: 'نا، باسی ئەوە ناکەم. مەبەستم شتێکی دیکە بوو کە پێت بڵێم. ئەویش ئەوەیە پێم خۆشە بزانی من بازرگان‌زادە نیم. من شازادەم و ناوی بابی من سلێمان‌پاشایە. بابم وەزیری ناردە لای بابت بۆ خوازبێنی تۆ بۆ من. کاتێک بە تۆیان ڕاگەیاندبوو، ئەتۆ ڕازی نەبووی.' ئیدی لەوێڕا هەمووی بەسەرهاتەکەی هەتا کۆتای بۆ خانمی‌دنیا گێڕاوە و گوتی: 'ئێستا دەمهەوێ بچمەوە لای بابم و هەتا بابم خوازبێنیکەر بنێرێتەوە لای بابت و داوات بکەنەوە، بەو شێوە هەردوولا ئاسوودە بین.' کە خانمی‌دنیا ئەوەی بیست، پێی باش بوو و زۆریش خۆشحاڵ بوو. دوای ئەوە شەویان بەو خەیاڵەوە بەڕێ کرد و لەو بیرەدا هاوڕا بوون. بە ڕێکەوت بە پێچەوانەی شەوانی دیکەوە، ئەو شەوە خەویان لێ کەوت و هەتا تاوهەڵاتی بەیانی وەخەبەر نەهاتن. وا بوو تازە شەهرمان‌پاشا چووبووە دیوەخانی سەڵتەنەت و دانیشتبوو. دەستوپێوەندەکانی دەوڵەت خەریکی کاروبار بوون. کە گەورەی زێڕینگەران هات و مجریەکی[1] بە دەستەوە بوو. مجرییەکەی لەپێش پاشا دانا و کردییەوە. ملوانکەیەکی تێدا بوو کە تەواوی بە زێڕ و زیو و خشڵی گرانبای ڕازابووەوە، نرخەکەی هەزار دینار زیاتر بوو. پاشا کە ئەوەی دیت، زۆری پێ جوان بوو. پەردەداری گەورەی [ئەو پەردەدارەی لەگەڵ پیرێژنەکە لێیان بوو بە کێشە] بانگ کرد و پێی گوت: 'کافوور، ئەو ملوانکەیەی بەرە بۆ خانمی‌دنیا.' پەردەدار ملوانکەکەی وەرگرت و چوو بۆ کۆشکی کچی پاشا. چووە بەردەرکی دیوەکەی خانم و سەیری کرد ئەوە دەرگاکە داخراوە و پیرێژنیش لە بەردەرگاکە خەوی لێ کەوتووە. پەردەدار گازی کردە پیرێژنەکە و لێی پرسی: 'ئەوە چۆنە هەتا ئێستا هەر خەوتووی؟' پیرێژن کە گوێی لە دەنگی پەردەدار بوو، ترسا و خەجڵا، بە پەلەپرووزە گوتی: 'لەسەرخۆ، ئەوە دەچم کلیل دێنم.' ئیدی لە دەرگاکە هاتە دەرێ و هەڵات، پەردەدار لەو کارەی پیرێژن وە گومان کەوت. هەر بۆیە دەرگاکەی لە ڕێسمە برد و چووە ژوورێ. کە چووە ژوو، سەیری کرد ئەوە کچی پاشا لەگەڵ تاجولملووکدا خەوتوون و لە باوەشی یەکتردان. سەری سووڕ ما و ویستی بگەڕێتەوە لای پاشا کە خانم بەئاگا هات. کە پەردەداری دیت، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و گوتی: 'بەڕێز کافوور، لێمان خۆش بە و مەیدرکێنە.' پەردەدار

---

[1] مجری: سندووقێکی بچکۆلەیە کە شتی بەنرخی تیا هەڵدەگرن.

گوتی: 'ئەمن ناتوانم هیچ شتێک لە پاشا بشارمەوە.' ئیدی پەردەدار دەرگای لەسەر داخستن و گەڕاوە بۆ لای پاشا. پاشا پرسی: 'ملوانکەکەت دا بە خانمی‌دنیا؟' پەردەدار گوتی: 'ئەو ملوانکەیەم لێ وەرگرە، ئەمن ناتوانم هیچ شتێک لە تۆ بشارمەوە.' پاشا گوتی: 'بڵێ بزانم چ بووە؟' پەردەدار گوتی: 'قوربان خانمی‌دنیا لەگەڵ گەنجێکی زۆر جوان و خانەدان لە خەوگەدا خەوتبوو.' پاشا فەرمانی دا بچن بیانهێنن. کە خانم و تاجولملووکیان هێنان، پێی گوتن: 'ئەوە چ کارێکە کردووتانە؟' ئیدی تووڕە بوو ویستی لە تاجولملووک بدا. خانمی‌دنیا خۆی وە بەر دا و نەیهێشت، بە باوکی گوت: 'لەپێشدا من بکوژە.' ئیدی پاڵێکی پێوە نا و بە خزمەتکارەکانی گوت: 'ئەوەی بەرنەوە بۆ کۆشکەکەی خۆی.' دوای ئەوە ڕووی لە تاجولملووک کرد و گوتی: 'گڵاو، ئەتۆ کێی و خەڵکی کوێی و کوڕی کێی؟ چۆناوچۆن ڕێت بە خۆت داوە کاری ئاوا بکەی؟' تاجولملووک گوتی: 'ئەگەر من بکوژی، بۆ خۆت تێدا دەچی و بەڵا و نەهاتی بەسەر وڵاتەکەتدا دێ و کاول دەبێ.' پاشا گوتی: 'لەبەر چی تێدا دەچم و وڵاتم کاول دەبێ و پەشیمان دەبمەوە؟' تاجولملووک گوتی: 'ئەمن کوڕی سلێمان‌پاشام. ئەوەندەی پێ ناچی سوارە و پیادەی دەگاتە سەرت.' کاتێک شەهرمان‌پاشا گوێی لە قسەکەی ئەو بوو، ویستی نەیکوژێ و بیخاتە بەندیخانەوە، هەتا ڕاست و دروستی قسەکەی ڕوون دەبێتەوە. وەزیری شەهرمان‌پاشا گوتی: 'بە بڕوای من وا باشە بیکوژی و وە درەنگی نەخەی، چونکە ئەو گڵاوە ڕێی بە خۆی داوە کاری ئاوا لەگەڵ ئێوەدا بکات.' ئیدی فەرمانی بە میرغەزەب دا بیکوژێ. میرغەزەب شیری لێ هەڵکێشا. بەڵام پاشا پێی خۆش نەبوو بیکوژێ، لەگەڵ یەک‌بەیەکی دەستوپێوەندەکانی ڕاوێژی دەکرد. وەزیر گوتی: 'گەورەم، کوا ئەوە پێویستی بە ڕاوێژە؟' پاشا تووڕە بوو، فەرمانی دا بیکوژن. میرغەزەب شیری لێ ڕاست کردەوە کە سەری لێ کاتەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و سی و شەشم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'میرغەزەب شیری هەڵکێشا و ویستی سەری تاجولملووک لە جەستەی کاتەوە کە لە پڕدا بوو بە هات و هاوار و دەنگی زووڕنا و کەڕەنا و حیلەی ئەسپ شاری پڕ کرد. خەڵک دووکان و بازاڕیان داخست. پاشا بە میرغەزەبی گوت: 'پەلە مەکە.' ئینجا ناردی بزانێ چ باسە. پیاوەکەی چوو، هاتەوە و گوتی: 'پاشا، سوپایەک لە ئەستێرەی ئاسمان و خیزی بێروون پتر بە پرتاو ئەسپیان تاو داوە و بەرە و ئێرە دێن. بەڵام بۆم دەرنەکەوت چ باسە.' پاشا ترسی لێ پەیدا بوو و لە وەزیر پرسی: 'مەگەر لە لایەن ئێمەوە سوپایەک بۆ بەربەرەکانی ئامادە نەکراوە؟' هێشتا پاشا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە پەردەدارەکان هاتن و ڕاسپاردەی سوپاکەشیان لەگەڵ بوو، یەکێک لەوان وەزیری پاشا بوو. لەپێشدا ئەو سڵاوی کرد. پاشا لە بەریان هەستا و هێنانییە پەنا خۆیان و هۆی هاتنەکەیانی لێ پرسین. وەزیر هەستا چووە پێشەوە و وەڵامی داوە و گوتی: 'پاشا، ئەو پاشایەی ئێستا هاتووەتە ئەو وڵاتە، لەگەڵ پاشاکانی دیکە جیاوازی هەیە و وەک و ئەوان نییە.' شەهرمانپاشا گوتی: ' بە خێر بێ، کام پاشایە؟' وەزیر گوتی: 'سلێمانپاشای دەداگەر و دەست و دڵکراوە و خاوەنی وەڵاتی پان و بەرینی سفاهانە. هۆی هاتنەکەی ئەوەیە، کوڕەکەی لەو شارەی ئێوە دایە و هاتووە بە دوایدا. ئەگەر ئەو ساغ و سلامەت بێ، ئەوە ڕێز و حورمەتت لێ دەگرێ. ئەگەر کوڕەکەی شتێکی لێ هاتبێ یان نەمابێ، ئەوە سەر و ماڵ و وڵاتتان تێدا دەچێ. ئەوە بوو پەیامی پاشامان کە عەرزم کردی. ئیتر تەواو.'

" 'کاتێک پاشا ئەو پەیامەی بیست، لە ترسان پەشۆکا. وە دڵەڕاوکێ کەوت و بە دەستوپێوەندەکانی گوت: 'بڕۆن بە شوێن شازادەدا بگەڕێن و هەواڵەکەیم بۆ بێننەوە.' بەڵام شازادە لەژێر هەڕەشەی شمشێری میرغەزەبدا دەلەرزی. لە پڕدا یەکێک لە ڕاسپاردەکان چاوی بە شازادە کەوت کە دەست و لاقیان شەکەت دابوو و لە شوێنی کوشتن چۆکیان پێ دادابوو. لەڕێوە چوو خۆی لە بەر پێیدا خست و کوڕنۆشی بۆ برد و ڕاسپاردەکانی دیکەش هەموویان کوڕنۆشیان بۆ برد و دەست و قاچیان کردەوە و دەست و قاچیان ماچ کرد. تاجولملووک کە چاوی هەڵێنا، وەزیری بابی و عەزیزی بازرگانی ناسییەوە، لە خۆشیان بێهۆش بوو. شەهرمانپاشا واقی وڕ ما و لە ترسان حەپەسا. کاتێک زانی ئەو سوپایە لەبەر ئەو گەنجە هاتووە، زۆر ترسا و هەستا چوو سەری ماچ کرد و گریا و گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەتۆ چاو لە من مەکە و لەبەر پیرییەکەشم بێ لێم خۆش بە. ئەو وڵاتەم کاول مەکە.' ئیدی تاجولملووک هەستا و دەستی ماچ کرد و گوتی: 'ئەتۆ لە هیچ مەترسە. تۆ لە جێی باوکی منی. بەڵام خودا نەکا کەس دەست بۆ خۆشەویستی من،

خانمیدنیا، بەرێ.' پاشا گوتی: 'بەرێزم، مەترسە. کەس ناتوانێ قامکی بۆ بەرێ و لە خێر و خۆشیدا دەبێ.'

" 'بەو جۆرە شەهرمانپاشا زۆر داوای لێ بووردنی لە تاجولملووک کرد و رێزی لە وەزیری سلێمانپاشا گرت و لە بەری هەڵدەخوێند و بەڵێنی دیاری و خەلاتی زۆری پێ دا هەتا لە لای سلێمانپاشا باسی هیچ نەکا. دوای ئەوە دەستووری دا هەتا گەورە گەورەکانی دەربار تاجولملووک بەرنە گەرماو و جلوبەرگی دیبا و زێرینی پاشایانەی لە بەر کەن. گەورەکان فەرمانیان بەجێ هێنا و تاجولملووکیان بردە گەرماو و هێنایانەوە مەجلیسەکە. دوای ئەوە تاجولملووک دانیشت و بەسەرهاتی خۆی بۆ وەزیری بابی و عەزیز گێراوە. ئەوانیش گوتیان: 'لەو ماوەیەدا ئێمەش چووینەوە لای سلێمانپاشا و ئاگادارمان کردەوە کە کوڕەکەت چووەتە نێو کۆشکی کچی شەهرمانپاشا و نەهاتووەتە دەرێ و نازانین چی بەسەر هاتووە. باوکت کە ئەو قسانەی لە ئێمە بیست، دەمودەست فەرمانی دا سوپا ئامادە بوو. بەرەو ئێرە هاتین. وا بوو شوکور هاتنی ئێمە بووە مایەی خێر و خۆشی و شادمانی.' تاجولملووک گوتی: 'جا دیداری ئێوە هەر مایەی خێر و خۆشی بووە.' ئەوان لەوێ بۆخۆیان خەریکی قسە و وتووێژ بوون کە شەهرمانپاشا هەستا چووە کۆشکی کچەکەی. سەیری کرد ئەوە کچەکەی لە تاوی تاجولملووک خەریکە دەگری و شیرێکی سەروبەن کردووە، دەسکەکەی لەسەر زەوی و نووکەکەی لەسەر سینگی خۆی داناوە خەریکە خۆی بکوژێ. دەیگوت: 'لەدوای تاجولملووک من ژیانم بۆ چییە؟' کاتێک پاشا ئەوی ئاوا دیت، هەرای کرد و گوتی: 'کچی خۆم، نەکەی! بەزەییت بە بابت و خەڵکی شارەکەتدا بێ. کارێک مەکە سەری بابت بە فەتەرات چێ.' ئیدی چووە پێشێ و لە چۆنییەتی کارەکە ئاگاداری کردەوە و پێی گوت: 'ئەو خۆشەویستەی تۆ کوڕی سلێمانپاشایە. بە تەمایە زەماوەندت لەگەڵ بکا و تۆشم لێ مارە کرد.' خانمیدنیا بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'بابە، پێم نەگوتی ئەو کوڕە شازادەیە؟ ئێستا دەڵێی چی؟ بڵێم بەو دارەی بەردەرگاوە هەڵتواسن؟' بابی گوتی: 'ئەمن ئەوە تێچووی پەروەردەتم بە تۆ بەخشی و، ئەتۆش لە من خۆش بە.' خانم گوتی: 'باشە، بچۆ تاجولملووکم بۆ بێنە.' پاشا بە گوێی کرد و هەڵات چوو تاجولملووکی هێنایە لای خانم.

" 'کاتێک خانم ئەوی دیت، لە لای بابی لە ئامێزی گرت و گوتی: 'ئەمن لە تاوی تۆ دڵم تۆقی.' ئینجا ڕووی لە بابی کرد و گوتی: 'گوڵی ئاوا حەیف نییە بکوژرێ؟!'

" 'شەهرمانپاشا لە دیوەکە هاتە دەرێ و دەرگاکانی لەسەر پێوە دان و چووە لای وەزیری بابی تاجولملووک و پێی گوت: 'سلێمانپاشا ئاگادار کەوە کە ئەوە کوڕەکەی ساغ و سەلامەتە و خەریکی خۆشی و ڕابواردنی خۆیەتی.' ئینجا شەهرمانپاشا فەرمانی دا خواردن و میوە و شیرینیان بۆ یەکبەیەکی سوپاکەی سلێمانپاشا نارد. پاشان دیاری

شایانەی لە ئەسپ و یەستر و کەنیز و کۆیلەی بۆ سلێمانپاشا نارد. دوای ماوەیەک لەگەڵ گەورە گەورەکانی ولات چوون بۆ دیداری سلێمانپاشا و گەیشتنە نزیک شار. کاتێک سلێمانپاشا زانی هاتوون، بەرەو پیریانەوە چوو. شەهرمانپاشای لە ئامێز گرت و لەسەر تەختەکەی لە پەنا خۆی دانا و قسەیان کرد هەتا خواردنیان بۆ هێنان. ئەوەندەی پێ نەچوو کە تاجولملووکیش هات. بابی تاجولملووک هەستا و کورەکەی لە باوەش گرت و لە پەنا خۆی داینا و زۆریان قسە کرد. ئینجا سلێمانپاشا بە شەهرمانپاشای گوت: 'پێم خۆشە لێرە لە بەر چاوی ئەو خەڵکە لێکیان مارە ببرین.' شەهرمانپاشا گوتی: 'زۆر باشە، با قازی و شایەد بێن.' قازی هات و لەسەر کاغەز مارەبرینەکەیان نووسی و کارەکەیان تەواو کرد. خەڵکەکە دەستیان کرد بە شای و شادی.

" 'تاجولملووک بە بابی گوت: 'بابە، عەزیزی بازرگان پیاوێکی زۆر گەورە و بەڕێزە و لەو گەشتەدا پشت و پەنای من بووە و یارمەتی زۆری داوم تا بە ئاوات بگەم. ئێستا ئەوە دوو ساڵە لە شار و ولاتی خۆی دوورە و پێم خۆشە کالا و شتوومەکێکی زۆری بازرگانی لەگەڵ خەین و بەڕێی کەینەوە، ولاتەکەشیان نیزیکە.' سلێمانپاشا گوتی: 'باشە وا دەکەین.' ئیتر سەد باریان کالا و شتی گرانبای بۆ ئامادە کرد. تاجولملووک ڕووی لە عەزیز کرد و گوتی: 'برا گیان، ئەوانەمان وەک دیاری لێ وەربگرە.' ئەویش پەسەندی کرد. ئینجا یەکتریان لە باوەش گرت و مالاواییان لە یەکدی کرد. عەزیز کوڕنۆشی بۆ تاجولملووک برد و لاقی سلێمانپاشای ماچ کرد و سوار بوو. تاجولملووکیش سوار بوو هەتا فرسەنگێک پێکەوە ڕۆیشتن. ئیدی عەزیز سوێندی خوارد کە دەبێ بگەڕێتەوە و گوتی: 'ئەگەر لەبەر دایکم نەبا، قەت نەمدەتوانی تۆ بەجێ بلێم. بەلام تکایە بێهەواڵم مەکە و نامە و پەیامم بۆ بنێرە.' ئەوەی گوت و دواین مالاواییان لە یەک کرد و بەرە و شارەکەی خۆی کەوتە ڕێ. گەیشتەوە ماڵی خۆیان کە چووە ژوورێ، سەیری کرد ئەوە دایکی لە حەوشەی خۆیان قەبرێکی هەڵکەندووە و بە سەریدا دەگری و دەبارێنێ و سەر و بسکی خۆی دەڕنێتەوە و ئەو شێعرەی دەڵێ:

چەرخی گەردوون شەرم ناکەی بەبێ وی
دەڕوێنی تۆ گوڵ و گیای جوانی کێوی؟!
بە قین و ڕق دەستێنی گیانی گەنجان
بە پیریش خۆت خەریکی کاری لاوی؟!

" 'دوای ئەوە ئاهێکی جەرگبڕی هەڵکێشا و ئەو شێعرەشی گوت:

پاش کۆچی بێوادەی گەنجان گوڵ نامێنێ

دوای کۆچی گوڵ، بولبول له گوڵزار ناخوێنێ
کۆچی کرد ئەو نەمامە ون بوو نەما
خۆڵ دەکا بای زریان بەسەر چاوما

" 'هێشتا شیعرەکەی تەواو نەکردبوو کە عەزیز وەژوور کەوت. کە عەزیزی دیت، هەستا و باوەشی پێدا کرد و سەری بە سینگییەوە نا و بووراوە. پاش ئیستێک، دوای ئەوەی عەزیز ئاوی بۆ هێنا و پێیدا هەڵپرژاند، وە خۆ هاتەوە و دیسان باوەشی پێدا کردەوە، بە دەم گریانەوە پرسی ئەوە لە کوێ بووی هەناسەکەم. عەزیز بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە و پێشی گوت کە تاجولملووک سەد باری ئاوریشم و دیبا و کاڵای گرانبای بە دیاری داوەتێ. دایکی دڵی خۆش و کەیفی ساز بووەوە. عەزیز لە لای دایکی دەژیا و سەری لەو کارە سووڕ ما بوو کە ئەو ژنەتیوە ئەو بەڵایەی بە سەری هێنابوو. با عەزیز لێرە بەجێ بهێڵین و بچینەوە لای تاجولملووک.

" 'تاجولملووکیان لە پاڵ خانمیدنیا کرد و بوون بە ژن و مێرد. دوای ئەوە شەهرمانپاشا دیاریەکی زۆری بۆ سلێمانپاشا و تاجولملووک و خانمیدنیا نارد و ئیدی ئەوان گەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆیان. شەهرمانپاشایش ڕێگای سێ ڕۆژەڕێی بەڕێ کردن. ئینجا سلێمانپاشا سوێندی لێ خوارد کە دەبێ بگەڕێتەوە. شەهرمانپاشا ماڵاوایی یەکجاری لێ کردن و گەڕاوە. تاجولملووکیش لەگەڵ بابی و ژنەکەی ڕۆیشتن ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە نیزیک شارەکەی خۆیان. شاریان بۆ ڕازاندنەوە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و سی و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'سلێمانپاشا لەگەڵ کوڕەکەی و بووکەکەی ڕۆیشتن ڕۆیشتن هەتا لە شارەکەی خۆیان نیزیک بوونەوە. شاریان بۆ ڕازاندنەوە؛ ئەوانیش هاتنە نێو شارەوە. پاشا لە سەر تەختی پاشایەتی دانیشت و تاجولملووکیش لە لای ڕاوەستا. سوپا و مسکێنی بە دەهەندەیی خۆی خۆشحاڵ کرد. دیسان جێژنی بۆ گرتنەوە و کەلوپەلی جێژن ڕازاوە و ئاهەنگێکی خۆشیان بۆ بەڕێوە بردن. تاجولملووک چووەوە پەردە و ئیدی خەریکی خۆشی و ڕابواردن و خۆشگوزەرانی خۆی بوو.'

### درێژەی بەسەرهاتی تاجولملووک

"کاتێک وەزیر دەندان چیرۆکەکەی هەتا ئێرە گێڕاوە، زەوئولمەکان پێی گوت: 'شتی وەک تۆ دەبێ هاونشینی پاشا بێ. پاشان گوتی: 'وەزیری بەڕێز، ئەوە چوار ساڵە لەو ولاتەین و بە دەست گەمارۆدانی قوستەنتەنییەوە لە ناڕەحەتی داین، شەو و ڕۆژ خەریکی کوشت و کوشتارین، سوپاکەشمان حەزیان لێیە بگەڕێنەوە و بیری ولاتیان کردووە و جاڕز بوون، با ڕای ئەوانی دیکەش وەرگرین.' هەر بۆیە زەوئولمەکانپاشا فەرماندە بەهرام و ڕۆستەم و ترکاشی بانگ کردن. کە هاتن، پێی گوتن: 'ئێمە لە مێژ ساڵە لێرەین و بە ئاوات نەگەیشتووین، مەبەستی ئێمەش ئەستاندنەوەی تۆڵەی نوعمانپاشا بوو کە ئەوە شەرکانی براشم کوژرا و دەردەکەمان بوو بە دوو. هۆکاری تەواوی ئەو بەلاو نەهاتییەشمان ئەو پیرێژنە کلکەنەفتینە بوو. کە لەپێشدا نوعمانپاشای لەنێو ولاتی خۆماندا کوشت و پاشان شازادە سەفیەشی بردە دەرێ. ئەوە هەر بە فێڵ براکەشمی کوشت. ئەمن سوێندی گەورەم خواردووە کە تۆڵەی بابم و براکەم بستێنمەوە. ئێوە دەڵێن چی؟' ئیدی فەرماندەکانی سوپا سەریان داخست و وەلامەکەیان بۆ وەزیر بەجێ هێشت. وەزیر گورج چووە بەرەوە و کوڕنۆشی برد، گوتی: 'پاشای سەردەم، بە بڕوای من بڕۆینەوە باشترە و مانەوەمان لەوە زیاتر بە چاک نازانم. پێم باشە بڕۆینەوە و ماوەیەک سوپا بحەسێتەوە. پاشان ئەگەر بە پێویستت زانی، بۆ شەڕی بتپەرستان دێینەوە.' پاشا گوتی: 'باشە با وا بێ، دیارە سوپاکە بیری کەسوکار و ژن و منداڵیان دەکەن و ئەمنیش پێم خۆشە چاوێکم بە کانەماکانی کوڕم و قەزافەکانی برازام بکەوێ.'

"کە سوپا گوێیان لەو هەواڵە خۆشە بوو، هەموو خۆشحاڵ بوون و نزای خێریان بۆ وەزیر دەندان کرد. زەوئولمەکانپاشا فەرمووی: 'جاڕ بدەن سوپا خۆی بۆ گەڕانەوە ساز بکا.' سوپا لە ماوەی سێ ڕۆژدا خۆی ئامادە کرد و زوڕنا و کەڕەنای کۆچ لێ درا، دەهۆڵ

کوترا و ئالا و درۆشمەکان هەڵدران. وەزیر دەندان سەرقەتاری سوپا و زەوئولمەکانپاشا و پەردەدار لە نێوەڕاستی سوپا. سوپا پۆلپۆل دەڕۆیشت و وەک دەریا شەپۆلی دەدا و بەرەو پێش دەبزووت. شەو و ڕۆژ بەردەوام ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە شاری بەغدا. خەڵک تۆزی خەم و ماتەمیان لەسەر لا چوو و گەشانەوە. فەرماندە و گەورەکان چوونەوە ماڵی خۆیان و پاشاش چووەوە کۆشکەکەی خۆی بۆ لای کانەماکانی کوڕی کە ئێستا تەمەنی ببووە حەوتساڵان. پاشا حەساوە، چوو بۆ گەرماو. کە لە گەرماو هاتە دەرێ، یەکسەر چووە سەر تەختی دەسەڵات و ناردی بەدوای وەزیر دەنداندا. فەرماندە و پەردەدارانیش هاتن. هەر لەو کاتەشدا ناردی بەشوێن توونوانی هاوڕێی دێرینیدا. کە توونوان هات، پاشا لە بەری هەستا و لە پەنا خۆی داینا. زەوئولمەکان زۆری باسی گەورەیی و پیاوەتییەکانی توونوانی بۆ وەزیر دەندان کرد.

"ئیدی توونوان لە بەرچاوی وەزیر پلە و پایەی چووە سەرێ. ئەوەندەی لە پڵاو و شلەی جۆراوجۆر خواردبوو، ملی وەک ملی فیلی لێ هاتبوو. پاشای نەناسییەوە. پاشا ڕووی تێ کرد و بە ڕوویەکی زۆر خۆشەوە دواندی و قسەی لەگەڵ کرد و بە خێر هاتنی کرد و گوتی: 'ئاوا زوو ئێمەت لە بیر چووەوە؟' توونوان کە جوان سەرنجی دایە، پاشای ناسییەوە و هەستا و گوتی: 'هاوڕێی خۆشەویست، ئەوە چۆناوچۆن بووی بە سوڵتان؟ پاشا پێکەنی و وەزیر دەندان هاتە پێشێ و باسی هەموو شتێکی بۆ کرد. پێشی گوت: 'پاشا هاوڕێ و نیزیکی تۆ بووە و ئێستا ئەوە پاشایە و هەموو شتێک و هەموو کارێکی لە دەستدایە. جا تۆ هەرچییەکت دەوێ، داوا بکە با بۆت جێبەجێ بکا و ئاواتت وەدی بێنێ. ئەگەر بە من بێ، جگە لە پلەوپایەی مەزن هیچی دیکەت لێی نەوێ، چونکە تۆ زۆرت گەورەیی لە حەقی ئەودا کردووە.' توونوان گوتی: 'ئەمن لەوە دەترسم داوای شتێکی لێ بکەم، پێی نەدرێ یان بۆی نەکرێ.' وەزیر گوتی: 'تۆ چیت بوێ ئەو درێغ ناکا.' توونوان گوتی: 'بە خودا دەڵێم ئەوەی لە دڵمدایە پێی بڵێم و لە کۆڵێشی نەبمەوە هەتا نەمداتێ.' وەزیر گوتی: 'تۆ دڵنیا بە ئەگەر بەڕێوبەرایەتی دیمشقیشت بوێ، دەتداتێ و دەست بە ڕووتەوە نانێ و دەتکا بە والی ئەوێ.' ئیدی توونوان لەڕێوە هەستا و پاشا ئاماژەی کرد دانیشێتەوە. توونوان گوتی: 'پەنا بە خوا! تازە ئەو ڕۆژانە نەما کە ئێمە هاونشینی یەک بووین.' پاشا گوتی: 'پلەوپایەی ئێستات لە لای من لە جارانیش زیاترە و ئەو ڕۆژانە قەت لە بیر ناچنەوە. هیچ شتێکیش نەگۆڕاوە و هەر براگەورەکەی جارانی. تۆ بوویتە هۆی ڕزگاری من. بە خوا تۆ داوای هەر شتێک لە من بکەی، بۆت دابین دەکەم. ئەگەر نیوەی وڵاتەکەشمت بوێ، دەتکەمە هاوبەشی خۆم. ئیدی هەرچییەکت گەرەکە بێژە.' توونوان گوتی: 'لەوە دەترسم کە تۆ نەتوانی بمدەیەی.' پاشا تووڕە بوو و گوتی: 'ئەوەی لە دڵتدایە بیڵێ.' توونوان گوتی: 'داوات لێ دەکەم بۆم بنووسی و بمکەی بە گەورەی تەواوی

توونوانچییەکانی شـاری قودس.' پاشـا و دانیشـتووان پێکەنین. پاشـا گوتی: 'شـتی تر داوا بکە.' توونوان گوتی: 'نەمگوت ئەمن لەوە دەترسـم کە داوای شـتێک بکەم نەمدەیەی یان نەتوانی بمدەیەی.' وەزیر لە بنەوە هەر ئاماژەی بۆ دەکرد و ئەویش هەر جارەی شـتێکی دەگوت بۆ وێنە دەیگوت: 'پێم خۆشـە بمکا بە سـەرۆکی خۆڵڕێژەکانی شـاری قودس.' خەڵکەکەش پێدەکەنین. وەزیر لێی تووڕە بوو. بە وەزیری گوت: 'ئەتۆ چکارەی لە من تووڕە دەبی؟ مەگەر بۆ خۆت نەتگوت داوای شتی گەورە لە پاشا بکە؟' دوای ئەوە گوتی: 'لێم گەڕێن بچمەوە شـار و وڵاتەکەی خۆم.' پاشـا زانی پێی خۆشـە گاڵتە و جەفەنگ بکا. کەمێک مـات بوو، ئەو جـار گوتی: 'داوای گەورە گەورە بکە.' توونوان گوتی: 'والییەتی دیمشـقم دەوێ.' ئیدی ڕێککەوتنامەی دەسـەڵاتداریتی دیمشـقیان بە ناوی ئەوەوە نووسـی. پاشـا بە وەزیر دەندانی گوت: 'تۆ دەبێ لەگەڵی بچی بۆ دیمشـق و لەوسـەرەوە ئەگەر هاتیتەوە، قەزافەکانی برازاشـم لەگەڵ خۆت بێنە.' ئیدی وەزیر بە گوێی کرد و خۆی سـاز کرد لەگەڵ توونوان بچێ بۆ سـەفەر. زەوئولمەکانپاشـا بە دەسـتوپێوەند و گەورە گەورەکانی گوت: 'ئەوەی منی خۆش دەوێ، دیاری چاک بدا بە توونوان.' توونوانیشـی ناو نا 'سـولتان زەبەلکان' و نازناوی 'موجاهید'ی لێ نا. مانگێکی پێ چوو هەتا کاروباری سـولتان زەبەلکان ئامادە بوو. ئینجا سـولتان زەبەلکان لەگەڵ وەزیر چوون بۆ ماڵاوایکردن لە پاشـا. پاشـا لە بەری هەسـتا و لە باوەشـی گرت و دوای ئەوە فەرمووی: 'کەرەسـتە و ئامرازی جیهادی بۆ ئامادە بکەن.' کەمێکی ڕێوشـوێنی بەڕێوەبەرایەتی و دادپەروەری فێر کرد. ئینجا ماڵاوایی لە پاشـا کرد و گەڕاوە. ئەو کۆیلە و دیاریانەی کە دەسـتوپێوەند و گەورەکـانی دەوڵەت بۆیـان هێنـا بوو، لەسـەر یەک نزیکەی پێنجهەزار کۆیلە دەبوون، هەمووی لەگەڵ سـوار بوون. پەردەدار و فەرمـاندەی دەیلەم و بەهرام و ڕۆسـتەمی فەرماندەی تورکان و فەرماندە ترکاش بۆ بەڕێکردنی موجاهید سـوار بوون و هەتا سـێ ڕۆژەڕێ لەگەڵی چوون.

"دوای ئەوە ئەوان گەڕانەوە بۆ بەغدا و سـولتان زەبەلکان و وەزیر ڕۆیشـتن ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنەوە دیمشـق. خەڵکی دیمشـق ئاگادار بوون کە زەوئولمەکانپاشـا سـولتانی تازەی بۆ دیشـمق ناردووە کە ناوی سـولتان زەبەلکانە و نازناوی موجاهیدە. کە خەڵکی دیمشق بیستیان، سولتان گەیشتووەتە نیزیک دیمشق، بەرەو پیری چوون و پێشوازیان لێ کرد. سولتان چووە دیمشقەوە و لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. وەزیر دەندان ڕاوەستا و ئەرک و کار و ڕاسپاردە پێویستەکانی بۆ شـی کردەوە. پاشـان فەرماندە و بەرپرس و گەورە گەورەکان یەکیەک دەهاتن، کورنۆشـیان دەبرد و دەسـتیان ماچ دەکرد و دۆعای خێریان بۆ دەکرد. سـولتان زەبەلکانیش بە ڕووی خۆشـەوە دەیدواندن و خەڵاتی دەکردن. دەرکی خەزێنەی کردەوە و سوپای خەنی کرد.

"دوایی تەدارەکی ناردنی قەزافەکانی کچی شەرکانپاشای بۆ بەغدا ساز کرد. فەرمانی دا کەژاوەیان بۆ چێ کرد و بە ئاوریشم و دیبا دایانپۆشی. ماڵێکی زۆری دا بە وەزیر دەندان کە وەزیر دەندان وەرینەگرت و گوتی: 'جارێ تۆ سەرەتای کاری دەسەڵاتداریتە و کارت پێی دەبێ.'

"کاتێک وەزیر ساز بوو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، سوڵتان زەبەلکان خانم قەزافەکانی سوار کرد و لەنێو کەژاوەدا داینا. دە کەنیزیشی بۆ خزمەتگوزاری لەگەڵ نارد. پاشا بۆخۆشی سوار بوو بچێ بەڕێیان بکا.

"سوڵتان زەبەلکان دوای بەڕێکردنیان گەڕاوە، سوپا و مسکێنی خەنی کردن و دیاری دانێ. ئەو جار دەستی کرد بە خۆتەیارکردن و چەک و پێداویستییەکی زۆری کۆ کردەوە، خۆی بۆ شەڕ و جیهاد ئامادە کرد. هەمیشە چاوەڕێی فەرمانی زەوئولمەکانپاشا بوو.

"وەزیر دەندانیش قەزافەکانی برد و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە بەغدا. کەسێکی ناردە لای پاشا و ئاگاداری کردەوە کە ئەوە دەگەنەوە. زەوئولمەکانپاشا بۆ پێشوازی و بە پیرەوەچوونی وەزیر، لە شار هاتە دەرێ. وەزیر کاتێک پاشای دیت، ویستی لە ئەسپەکە بێتە خوارێ، بەڵام پاشا سوێندی خوارد نابێ دابەزێ. ئیدی هەر بە سواری چووە لای پاشا. پاشا هەواڵی سوڵتان زەبەلکانی پرسی. وەزیر هەواڵی سڵامەتی سوڵتانی پێ ڕاگەیاند و پێشی گوت کە قەزافەکانیشی هێناوەتەوە. پاشا خۆشحاڵ بوو و بە وەزیری گوت: 'سێ ڕۆژ بحەسێوە و پاشان وەرەوە لای خۆم.' وەزیر بە گوێی کرد و چووەوە ماڵەکەی خۆی. پاشاش چووەوە کۆشکەکەی خۆی بۆ لای کچی براکەی کە هەشتساڵی تەمەن بوو. کە پاشا ئەوی دیت خۆشحاڵ بوو. ئینجا شەرکانی وەبیر هاتەوە و نارەحەت بوو. جلی زێڕین و گرانبایی لە بەر کرد. فەرمانی دا کە ئەویش لەگەڵ کانەماکانی ئامۆزای پێکەوە لە شوێنێک ڕایانبێنن و پەروەردەیان بکەن. قەزافەکان زۆر ژیر و بەکار و بەهزر و بیر بوو. بەڵام کانەماکان خاوەنی ڕەوشتی بەرز بوو، کەچی لە بەڕێوەبردنی کارەکانیدا کەمترخەم بوو. وا بوو هەر کام لەوان تەمەنیان بووە دەساڵ. قەزافەکان لەگەڵ ئامۆزاکەی سوار دەبوون دەچوونە دەشتودەر و ڕاهێنانی شمشێربازی و زەرگهاویشتنیان دەکرد هەتا فێر بوون. تەمەنیان بوو بە دوازدە ساڵ. دوای ئەوە پاشا خۆی بۆ شەڕ ساز کرد و چەک و تفاقی شەڕی ئامادە کرد. وەزیر دەندانی بانگ کرد و پێی گوت: 'بە تەمام کوڕەکەی خۆم بکەم بە پاشا و بۆ خۆم بڕۆم بۆ شەڕ. تۆ چی دەڵێی؟' وەزیر دەندان کوڕنۆشی برد و پێچکەی تەختی پاشایەتی ماچ کرد و گوتی: 'ئەوەی بە زەینی موبارەکت گەیوە شتێکی جوانە، بەڵام لەبەر دوو هۆ من بە چاکی نازانم: یەکیان لەبەر ئەوەیە شازادە منداڵکارە، دووەمیشیان لەبەر ئەوەیە هەرکەس کوڕەکەی لە جێی خۆی دادەنێ تەمەنی درێژ نابێ.' پاشا گوتی: 'وەزیر، ئێمە ئەو بە پەردەدار دەسپێرین. پەردەداریش لە خۆمانە و ئەوە

زاوامانه و بۆخۆی وەک برایەک وایە.' وەزیر گوتی: 'دەی باشە چۆن جەنابت پێت باشە با وا بێ.'

"پاشا رایسپارد پەردەدار و گەورە گەورەکانی دەوڵەت هاتن و کۆ بوونەوە. پێی گوتن: 'هەر وەک دەزانن، کانەماکانی کوڕم گەورە بووە و لە شـەڕ و تیرهاوێژی و دژمنبەزێنیدا تای نییە. هەر بۆیە ئەو دەکەم بە پاشـــای ئێوە و پەردەداریش دەکەم بە وەزیری. بە پەردەداریشـــی گوت: 'تۆش و تەواوی ئامادەبووان شـــایەد بن ئەوە قەزافەکانی برازام لە کانەماکانی کوڕم مارە کرد.' ئیدی هەرچی دڵ بخوازێ دای بە کوڕەکەی. پاشـــان هەســـتا چوو بۆ لای نوزهەتوززەمانی خوشـــکی. ئەویشـــی لەو زەمـاوەنـدە ئـاگـادار کردەوە. نوزهەتوززەمان خۆشحاڵ بوو گوتی: 'هەردووکیان منداڵی خۆمن.'

"ئینجا زەوئولمەکان گوتی: 'خوشـکم، من بەشـی خۆم ژیاوم و تەمەنی خۆم کردووە و لە کوڕەکەشم پشت ئەستوورم، بەڵام ئەویش و دایکیشی و قەزافەکانیش بە تۆ دەسپێرم.' ئیدی زەوئولمەکان، کانەماکان و قەزافەکانی بە پەردەدار و نوزهەتوززەمان سـپاردن هەتا نەخۆش کەوت و لە جێدا کەوت. خەڵـک پێی وا بوو پەردەدار وڵات بەڕێوە دەبـا. هەتـا ســـاڵێک بەو شـــێوە بوو. دوای ئەوە زەوئولمەکان کوڕەکەی خۆی بانگ کردە لای وەزیر دەندان و پێی گوت: 'ئەو وەزیرە دوای من وەک باوکی تۆ وایە و لە جێی منە. کوڕی من، هەر ئەوەندەت لە بیر بێ من بەم زووانە کۆچ دەکەم و لەم دنیایە نامێنم. بەڵام داخێکم هەر لە دڵدایە. هیوادارم تۆ ئەو داخەم لە ســــەر دڵ لا بەی.' شـــازادە گوتی: 'ئەو داخە چییە؟' زەوئولمەکان گوتی: 'ئەوە من دەمرم و تۆڵەی نوعمانپاشـــای باپیرت و شـــەرکانپاشـــای مامتم بۆ نەســـێنرایەوە. ئەگەر توانیت، خودا یار بێ، ســـەندنەوەی تۆڵەی ئەوانت لە بیر نەچێ. بەڵام زۆر وریای فڕوفێڵی زاتوددەوایی پیرێژن بە و گوێڕایەڵی وەزیر دەندان بە کە ئەو کۆڵەکەی ئەم وڵاتەیە.' شازادە گوتی: 'ئیشەڵڵا پێچەوانەی فەرمانی پاشا ناجووڵێمەوە.' دوای ئەوە نەخۆشی بەسەر پاشادا زاڵ بوو. دەسەڵاتی وڵات بە دەست پەردەدارەوە بوو. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ پاشا نارەحەتتر دەبوو هەتا چوار ساڵ هەموو کاروبارێکی وڵات بە دەست پەردەدارەوە بوو، خەڵک و ســـوپا زۆری لێ ڕازی بوون. ئەوە لە باســـی زەئولمەکان و پەردەدار.

"بەڵام کانەماکان هیچ کارێکی نەبوو جگە لە ئەســـپســـواری و زەرگهاویشـــتن. لەگەڵ قەزافەکانی ئامۆزای کە دەچوونە دەرێ بۆ دەشـــت و دەر، هەتا شـــەو نەدەهاتنەوە. کە دەهاتنەوە، قەزافەکان دەچووەوە لای دایکی و کانەماکانیش دەچووە ماڵێ و سەیری دەکرد ئەوە دایکی لەپشت سەری بابی دانیشتووە و دەگری. شەوانە هەڵدەستاوە و سەری دەدا. دیســـان بەیانی کە ڕۆژ دەبووەوە، شـــازادە لەگەڵ کچە مامەکەی دەچوونەوە دەرێ. زەوئولمەکان نەخۆشییەکەی زۆری خایاند، هەر بۆیە دەگریا و ئەو شێعرەی گوت:

هــاوار خەڵکینە لە دەســـــت جەور و لەتمی زەمــانە
لە دەست فـــــــــــــــرۆفیڵی ئەو بێبەزە و بێ ئامانە
هێنـد بە ڕق و قینە لێم، دەڵێی بێئەمریم کردووە
کـاتی شــــادیم تیژ دەڕوا، کـاتی خەمیش خەوتووە

"کە شــێعرەکەی تەواو کرد، ســەری وە باڵنجەکە کرد و خەوی لێ کەوت. لە خەونیدا دیتی کەســێک پێی دەڵێ: 'مزگێنیم دەیە کوڕەکەت تەواوی دنیا دەگرێ و دەیخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە.' زەوئولمەکان لە خۆشـیدا خەبەری بووەوە. چەند ڕۆژ دوای ئەو خەونە کۆچی دوایی کرد و چاوی لێک نا. خەڵکی تووشــی پەرۆشــی و خەمباریەکی وەها کرد کە گۆیا منداڵی ناو بێشـکە لە تاوی ژێر نەبووەتەوە. ماوەیەک بەســەر کۆچی ئەودا تێ پەڕی، وردەوردە لەبیر چووەوە و وەک ئەوەی زەوئولمەکان قەت نەبوو بێ، کانەماکانیان لەسـەر کار لا برد.

"کاتێک دایکی کانەماکان ئەوەی بیســتەوە، چووە لای پەردەدار، ســەیری کرد ئەوە لە سەر تەختی دەسەلات دانیشتووە. ئیدی هاتەوە لای نوزهەتوززەمان و گوتی: 'خودا دەست بە گەورەییتانەوە بگرێ و قەت لێ نەکەون و ئالای دەســەلاتتان شــەکاوە بێ. تۆ بە چاوی خۆت دەتدی و بە گوێی خۆت دەتبیست کە پاشـا چەندی ئێمە بە لاوە گرنگ و ئازیز بوو. چەندی ماڵ و ســامان وەک ڕەحمەت بەســەر ئێمەدا دەڕشــت. ئێسـتا چەرخی چەپگەرد ڕووی لێ وەرگێڕاوین و ئێمە لێ کەوتووین، هانام بۆ هێناوی یارمەتیمان بدەی و ئاگات لێمان بێ.' ئیدی فرمێسکەکانی بە سەر گۆنایدا هاتنە خوارێ.

کــوا هەڵــۆ ڕازی دەبــێ لە کەلاکــی کەر بــخــوا
ئەو کە لە لـوتکەی چیـا گۆشــــتی کەو بە فـیز دەخـوا
نەداری و دەمبەپـووشــــی تـووشــــی کـاری وات دەکـا
چەنـد ڕەنـد و ســـەربڵێنـد بی لـووتـت لە بەردی دەدا

"کاتێک نۆزهەتوززەمان گوێی لە قســـەکانی بوو، زەئولمەکانی بیر هـاتەوە و دایکی کانەماکانی لە باوەش گرت و دڵخۆشــی داوە و گوتی: 'ئێســتا ئێمە داراین و ئێوە نەدارن. ئەوەی کە ســەرم نەداوی، دەترســم دڵت لێم ئێشــا بێ و ئەگەر شــتێکت بۆ بنێرم تۆ بە دەسـگیرۆی دانێی، ئەوە لە کاتێکدایە ئەوەی ئێمە هەمانە و نیمانە لە مێردەکەی تۆوە پێمان گەیوە.' ئیدی جلوبەرگی شکۆداری لە بەر کرد و لە لای کۆشکەکەی خۆیەوە شوێنێکی بۆ ئامادە کرد. کانەماکان و دایکی بووژانەوە و جلی پاشـایانەی کردە بەر شـازادە و کەنیزی

بۆ خزمەتکردنی تەرخان کرد.

"نوزهەتوززەمان لە لای مێردەکەی باســـی هەڵسوکەوت و ئاکار و ژیانی براژنەکەی کرد و گریا. پەردەدار گوتی: 'ئەگەر دەتەوێ سەیری ژیانی دوارۆژی خۆت بکەی، لە چاوی خەڵکەوە چاوی لێ بکە.' ئیدی بە نوزهەتوززەمانی گوت: 'ڕێزی براژنت بگرە و ئاگات لێی بێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# كە شەوی سەد و سی و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مێردی نوزهەتوززەمان گوتی: 'ئاگات لە براژنت بێ و نەهێڵی کەمی بێنی.' نوزهەتوززەمان و دایکی کانەماکان بەو شێوە رایان دەبوارد.

"کانەماکان و قەزافەکانی ئامۆزای ببوونە پازدە ســـاڵ. قەزافەکان کچێکی شـــۆخ و باڵابەرز و قەدباریک و ســـمت و پەلوپووزی بەرچاو بوو، رووگەش و بەفرین بوو، جوانێکی بێ هاوتا بوو هەر وەک شاعیر دەڵێ:

بەژن و بـــاڵا رێـــکوپـــێـــک چـــنـــاراســـــــا هەڵـــچـــووە
کـــوڵـــمەکـــانـــی ســـــــوور و ئـــاڵ دمـــیـــان وێ نەکەوتـــووە
مەمـــــکقـــوت و بـــــزۆزە، قەدبـــــاریـــــک و چـــــاوهەڵـــــۆ
کە دێ دەڕوا بە رێـــدا، هەر چـــاوە و دوای کەوتـــووە

'کانەماکانیش کوڕێکی جوانچاک و قۆز، ئازایەتی لە ســـــیمایدا دیار بوو، خەڵک کە دەیاندی لەبەر جوانییەکەی واقیان وڕ دەما، هەتا خەتی ڕیشــی دەوری مانگی ڕووخســاری دا کە لەم بارەوە شاعیر دەڵێ:

خۆشەویستم مـــــــــــووی ڕدێنت چ لە جـــــــــــــوانی تۆ کەم ناکا
ڕووت بەهـــار و مووت وەنەوشـــــە، جوانی تۆ ســـــەد هێنـــدە دەکـــا

"بە ڕێکەوت ڕۆژی جەژن قەزافەکـان چووە دەرێ ســــــەری مـاڵە خزم و کەس بـدا. کەنیزگەل وەک ئەســـــتێرە لەدەوری مانگ خەرمانەیان دابوو و لە ڕاســــت و چەپیەوە دەڕۆیشـــــتن. تیشـــکی داویشـــتە گەڕەک و کۆڵانەکان و دڵی پیر و لاوی دەهێنایە لەرزە. کانەماکان هەر بەدەوریدا دەهات و دەچوو، ئەو شێعرەی گوت:

لەو ڕۆژەوە ڕۆیشـــــتـــووی مەیـــلـــی مـــنـــت نـــاوە
شـــــەهـــیـــدی ڕێـــی ئەویـــنـــم ڕووحـــم لە لا نەمـــاوە
دایمە لە لـووتـکەدا بـووین، نەبـووە شـــــا و کـۆیـلەیەتـی
کـۆیـلـەتـم ئەوڕۆکە مـن، شـــــایـیـم خســـــتـووەتە لاوە

'کاتێک قەزافەکان ئەو بەیتانەی بیست، تووڕە بوو. سەرکۆنەی کرد و قەسەی پێ گوت و هەڕەشەی لێ کرد. ئیدی کانەماکانیش زۆر نارەحەت بوو و گەڕاوە. قەزافەکانیش گەڕاوە

کۆشک و چوو لە لای دایکی شکایەتی لە کانەماکان کرد.

"دایکی گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ئەو باوکی نەماوە و قسـەیەکی خراپیشـی پێ نەگوتووی و مەبەستێکی خراپیشی نەبووە. نەچی لە لای کەس باسی بکەی و سوڵتان ببیستێتەوە. شتی وا ببێ، ناوی لەسەر زەوی دەسڕێتەوە و دەیکوژێ.' ئیدی ئەوینی کانەماکان و قەزافەکان بوو بە شەوچەرەی هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەیەک و ببووە وێردی زمانی ژنان. کانەماکان زۆر خەمبار و دڵبەخەم بوو و نەیدەتوانی خۆی ڕاگرێ، دەیویست بە هەر شێوەیەک بێ بیدرکێنێ و بێزاری خۆی لەو بێدەنگی و دوورەپەرێزیە دەربڕێ. بەڵام دەترسا قەزافەکان توورە بێ. هەر بۆیە ئەو شێعرەی گوت:

ئەمن عەودالی جوانێکم لە نێو گیان و دڵمدایە
بە دایـم ها لە بەرچاوم کەچی نایێتە ڕەدایە
ئەوەندەم تاسە کردووە، تاس بە سەرمدا هاتووە
کانی ئاوی حەیاتەکەم، ڕیشەی دڵم وشک بووە

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و سی و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، کاتێک دەســەڵاتی بەغدا کەوتە دەســت پەردەدار، پەردەداریان بە ساسان‌شا ناودێر کرد. ساسان‌شا ئاگاداری ئەوینی کانەماکان بۆ قەزافەکان بووەوە. هاتە لای نوزهەتوززەمان گوتی: 'پێم خۆش نییە ئەو کوڕ و کچە پێکەوە لە شــوێنێک بن، هەر بۆیە لەو بارەوە نیگەرانم. ئێستا کانەماکانی برازات پیاوێکە و ژنان بە دەست پیاوانەوە لە ئەماندا نین. وا چاکە نەهێڵین وێک کەون و لێکیان هەڵاوێرین.'

"نوزهەتوززەمان گوتی: 'پاشــا، قســەکەی تۆ جوانە.' کە ڕۆژ بووەوە، کانەماکان وەک ڕۆژان هاتە لای نوزهەتوززەمانی پووری و ســڵاوی کرد. پووری گوتی: 'لە مێژە بە تەمام قســەیەکت پێ بڵێم، ئێســتا کاتییەتی.' کانەماکان گوتی: 'بیڵێ بزانم چییە؟' نوزهەتوززەمان گوتی: 'پاشــا بە خۆشــەویســتی تۆ بۆ قەزافەکانی زانیوە و گوتوویەتی کە نەهێڵم یەکتر ببینن. کارێکیشــت پێی بوو لەپشــت پەردەوە پێی بڵێ و نابێ بیبینی.' کانەماکان کە ئەو وتەیەی بیست، هیچی نەگوت و لەڕێوە گەڕاوە لای دایکی و قسەکانی پووری بۆ گێڕاوە.

"دایکی گوتی: 'هەمووی خەتای خۆت بوو، هیچت تێدا ڕاناوەستێ و چیرۆکی ئەوینی تۆ بووەتە وێردی زمانی خەڵک. چۆن تۆ نانی ئەوانیش دەخۆی و خۆ لە کچەکەشــیان خۆش دەکەی؟' کــانەمــاکــان گوتی: 'دەمەوێ بیهێنم و زەمــاوەنــدی لەگەڵ بکەم. ڕاســـتە ئەوان ســەرپەرەســتی دەکەن بەڵام ئەو ئامۆزامە و من بۆ ئەو لە پێشــترم تا خەڵکی دیکە.' دایکی گوتی: 'ئەو قســانە مەکە، نەکا ســاســان‌شــا بیبیســتێتەوە و تووشــی چارەڕەشــی ببین. ئەو پاروەوە نانەشــمان لێ دەبڕن و شــاربەدەرمان دەکەن. ئیدی لێمان بقەومێ و لە برســـان بمرین.' کانەماکان کە ئەو قســـانەی لە دایکی بیســـت، ئەوەندەی دی ناڕەحەت بوو و ئەو شێعرەی گوت:

کــوا هەرزەکــاری عــاشـــق ئــامــۆژگــاری دەبــیســـــتێ
وەک ئەســـپی تۆڕ باڵ دەگرێ بە هیچ کەســـێ ناوێســـتێ
تـــا ڕۆژێ ڕۆژم نەبــوو، دڵــم هــیـــچ دەنــگــی نەبــوو
ئێســـــتـــا دڵـم تــێ گەیــوە، وەک مـنــاڵ دەگــرێ گــوڕوو
قـــــــــــــــــەت دەمێ تێناپەڕێ تۆ لە یادمدا نەبی
ئاخـــــــر چ بکەم لە خـــــــــەیاڵ، تۆ لە ژینمدا نەبی
دەڵـێـن دڵ ئــاگــای لە دڵە، مـنـیـش بـۆتـۆ دەســـــووتـێـم
چــۆن دڵــت دێ ڕێ بــدەی لە دووری تــۆ هەڵــقــرچــێــم

"دوای ئەوەی شـــیعرەکەی تەواو بوو، بە دایکی گوت: 'من تازە لە لای پوورم و ئەوان نابم و ئێرە بۆ من نابێ. هەڵدەســـتم دەچم لە دەرەوەی شـــار لەگەڵ کەلاوەنشـــین و شـــت دەژیم.' ئەوەی گوت و لە کۆشـــک چووە دەرێ. قســـەکەی خۆی بردە ســـەر. بەڵام دایکی بەردەوام هاتوچۆی ماڵی ساسان‌شـای دەکرد و بژیوی ڕۆژانەی لێ وەردەگرتن. ڕۆژێک قەزافەکـان لەگەڵ دایکی کـانەمـاکـان بە یەکەوە بوون. قەزافەکـان لە ئـامۆژنی پرســـی: 'کوڕەکەت چۆنە؟' دایکی کـانەمـاکـان گوتی: 'جـا چۆن بێ؟ وەڵا ئەوینی تۆ بە جـارێک ســـەرگەردان و ماڵوێران و چاوبەگریانی کردووە.' ئیدی قەزافەکان دەســـتی کردە گریان و گوتی: 'بە خوا خۆ من لەبەر ئەوە لێی دوور نەکەوتوومەتەوە کە خۆشم نەوێت، بەڵکو هەر لە ترســـــی دووزمان و نەتەویان . دەنا منیش ئەوم هەزار هێندە خۆش دەوێ. هەمووی خەتای زمانی خۆیشـــی بوو کە خۆی پێ ڕانەگیرا و دنیای تێکەیاند، دەنا ســـوڵتانیش ئەوی ئاوا بێبەری نەدەکرد و لێکیان هەڵنەدەواردین. دیســـان هیوادارم ئەو هەلاواردنە ببێتە هۆی پێکگەیشتنمان.' ئیدی ئەسرینەکانی هاتنە خوارێ و ئەو شێعرەی گوت:

ئەو دووری و مەیـنەتەمـان، دەڕوا و نـامـێـنـێ ڕۆژێ
هەوری ڕەحـمەت دایـدەدا و تـیـنـوێـتـی دەشـــکـێ ڕۆژێ
پشـــت بە خۆشـــی و ناخۆشـــی دنیا نەبەســـتی باشـــە
گـــــــــــەرچی دەوامی زۆر بێ، ئاخری ڕادەبرێ ڕۆژێ

"دایکی کانەماکان زۆری دوعا بۆ کرد و لە لای ئەو ڕۆیشـــت و چوو هەمووی بۆ کوڕەکەی گێڕاوە. کانەماکان کەیفی ســـــاز بوو گوتی: 'من ئەو لەگەڵ دووهەزار حۆری بەهەشت ناگۆڕمەوە.' ئیدی ئەو دوو بەیتە شێعرەی خوێندەوە:

گـوڵـخـونـچەیەکـی هـێ نەپشـــکـووتـووی
هـێـشـــتـا بەرچـاوی بەدکـار نەکەوتـووی
حـۆری لە بەهەشـــت کە تـۆ بـبـیـنـن
خـۆ دەدەن حەشـــار کـز دادەمـێـنـن

"دوای ئەوە ماوەیەکی زۆری پێ چوو کانەماکان هەر وا لە ئاوری خۆشـــەویســـتی و دووری ئەودا دەســـووتا هەتا تەمەنی بوو بە حەڤدە ســـاڵ. هێندێک شـــەو هەر خەوی لێ نەدەکەوت و هەر بیری دەکردەوە کە خۆ من جگە لە هەژاری، عەیبی دیکەم نییە بۆ دەبێ ئاوام لێ بێ و بە مرادم نەگەم؟ وا چاکە لەو شارە دوور کەومەوە با ئەویش تامی دووری بچێژێ. ئیدی هەر لەو جۆرە خەیاڵانەی دەکردەوە و ئەو شێعرەی گوت:

دەڕۆم ئـــازیـــم ســـــەرم هەڵـــدەگـــرم
ڕێگەی دەشـــــت و دەر، چۆڵ و هەرد دەگرم

یــــان لەگەڵ بەخــــتــــم دەگەڕێـــمەوە
یــــان بە یـــادی تــۆ ســــەردەنـــێـمەوە

"دوای ئەوە کانەماکان بە پێپەتی و بە توێی کراسـێکی بێقۆڵ و لەتە نانێکی ســێ ڕۆژ لەوەو پێشـەوە، لە کۆشـک وەدەر کەوت. بەو شـەوە تاریکە هەر ڕۆی ڕۆی هەتا گەیشـتە دەروازەی شـــاری بەغدا. ڕاوەســـتا، کە دەرگایان کردەوە، یەکەم کەس کە چووە دەرێ کانەماکان بوو، ئەو ڕۆژە هەر لە دەشت و دەر و شاخ و کێو سووڕاوە. کە بوو بە شـەو، دایکی زۆری بۆ گەڕا نەیدیتەوە. دنیای لە بەرچاو تاریک بوو، خەو و خواردنی لێ حەرام بوو. هەتـا دە ڕۆژ هەر چـاوەڕێی بوو. هیچ هەواڵێکی نەبوو. بەردەوام دەگریـا و دەکوڕووزاوە و دەیگوت: 'ڕۆڵە گیان، چۆن منت خســتە خەم و دەرد و کەســـەرەوە و لە وڵاتی غەریبی بێ پشتیوان بەجێت هێشتم؟! ئاخر ئێستا من لەکوێ بۆت بگەڕێم و سەر بە کوێدا کەم؟! لە کام شـار بتبینمەوە؟' فرمێسکەکانی بەسـەر گۆنایدا ڕیزیان دەبەست و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

بــێ بــزەی ڕووت ســـــۆمـــای چـــاوم
شـــــەوی دەیـــــجـــــوورە هەنــــاوم
خەفەت بەربـــیـــنـــگـــمـــی گـــرتـــووە
پشـــــووی بـــۆ ژیـــن نەهـــێشــــتـــووە
ڕۆنــــدک یەکیەک دێـــنە خـــــوارێ
هەر وەک بــــارانـــــی بەهـــــارێ
بەبـــێ تـــۆ ژیـــن چـــۆڵســــــتـــانە
جـــێـــگەی دێـــو و درنـــــجــــانە
نــــانـــا نـــاژیـــم تـــازە بـــێ تـــۆ
لە هەر کـــوێ بـــێ دێـــم بـــۆ لای تـــۆ

"شـــەو و ڕۆژ دەگریا و دەناڵا و دەکوڕووزاوە و بە کوڕەکەیدا هەڵدەگوت. وا بوو لە شـــاردا دەنگی دابووەوە، خەڵک هەموو دەیـانگوت: 'زەوئولمەکـان لەکوێی هەتـا ببینێ کانەماکان چۆنی لێ قەوماوە و پەڕیوەی هەندەران بووە؟' ئیدی وا بوو ســـاســـانشـــا هەواڵەکەی بیستەوە."
لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و چلەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، گەورە گەورەکانی ولات ساسانشایان لە ڕووداوی کانەماکان ئاگادار کردەوە و پێیان گوت: 'ئەو کوڕی پاشای ئێمەیە و نەوەی نوعمانپاشاە. بیستوومانە کە سەری خۆی هەڵگرتووە و ڕۆیشتووە بۆ هەندەران.' کە ساسانشا ئەو هەواڵەی بیست، یادی ئەو چاکانەی کردەوە کە زەوئولمەکانپاشا لەگەڵ ئەوی کردبوو. هەر بۆیە فەرمانی دا بکەونە پێوشوێنی و بیبیننەوە. فەرمانی دا فەرماندە ترکاش بە سەد سوارەوە بەدوایدا بگەڕێ. دوای دوو ڕۆژ فەرماندە ترکاش گەڕاوە و نەیدۆزیبووە. ساسانشا زۆر نارەحەت و خەمبار بوو، بانگی دایکی کانەماکانی کرد و دڵخۆشی داوە.

"کانەماکانیش کە لە بەغدا چووە دەرێ، سێ ڕۆژان بە تاقی تەنیا لە دەشت و دەر سووڕاوە و تووشی سوارێک یا پیادەیەک نەبوو، لە برساندا گیای دەخوارد. ڕۆژی چوارەم ڕێی کەوتە شوێنێکی سەرسەوز و خۆش و یادی شارەکەی بابی کرد و ئەو شێعرەی گوت:

به تەمایە ڕۆژگار تا بمێنی
ساتێکی خۆش بە من ڕەوا نەبینی
چەرخی گەردوون کە خۆی حەجمینی نییە
بسووڕێنێ سەرم هەتا دەسووڕێ

"کە شێعرەکەی تەواو کرد، کەمێکی گیا خوارد و هەستا دەسنوێژی گرت و نوێژەکەی کرد. لەوێ دانیشت بحەسێتەوە. وا بوو بە شەو و تازە لەوێ ماوە. شەو تەواو دەرنگ ببوو، خەوی لێ نەدەکەوت کە لە پڕدا گوێی لە دەنگی کەسێک بوو، ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

خۆشە وەرزی بەهاران خەڵک لەگەڵ یاری جوان
دەنێژن دەرد و خەم و دەچێژن خۆشی ژیان
منی هەژار، منی نەدار، دەربەدەر و دوورەوڵات
لە جێی باوەشی خۆشی یار، وا پەرێوەم لە هەندەران

"کاتێک کانەماکان گوێی لەو شێعرە بوو، بە جارێک ئاوری تێ بەر بوو، خەم و پەژارە بەسەریدا ڕژا و برینی کولاوە و دەستی کرد بە شین و گریان. پاش ئیستێک هەستا وە

شوێن دەنگەکە کەوت. کەسی نەدیتەوە. خەوی زڕا و لەو شوێنەی لێی بوو داگەڕا خواریێ و چووە قەراخ چۆمێک، دیسان گوێی لە دەنگەکە بوو، ئەو شێعرەی دەگوت:

من کۆیلەی بسکلوولێکی ئاوریشمیم
دڵم پڕ لە قەف و پێچە وەکوو میم
تا کەی دەبێ هەڵوەدا بم منی ژار؟
تا کەی دەبێ ئاوا هەڵکەم بەبێ یار؟
خەیاڵی ئەو بۆتە خورد و خۆراکم
بێ یادی ئەو جەستەیەکی کەلاکم
ئەو دڵە پڕ لە خوێنەم کارێک دەکا
فرمێسکی خوێن لە دوو دیدەم سەر بکا

"کاتێک کانەماکان ئەو شێعرەی بیست، هێشتا ئەو کەسەی نەدیتبوو زانی ئەوەش ئەویندارە و لە ئەوینەکەی دابڕاوە و پەڕیوە بووە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'دەبێ خاوەنی ئەو دەنگە بدۆزمەوە تۆزێک دەردەدڵ بکەین. بزانم چ بووە وا دڵپڕە.' ئیدی بانگی کرد و گوتی: 'هۆی هاوڕێی شەوی تاریک! وەرە بزانم ئەوە چ بووە؟ بەشکو بتوانم یارمەتیت بدەم و هاوبەشی ماتەمت بم.' خاوەنی دەنگەکە کە گوێی لە دەنگی کانەماکان بوو، وەڵامی داوە: 'ئەی ئەو کەسەی گوێت لە دەنگی من بووە! جارێ پێم بڵێ ئەتۆ مرۆڤی یا جنۆکەی؟ پێش ئەوەی بکوژرێی وەڵامم دەوە. ئەوە بیست ڕۆژە لەو دەشت و دەرەم نە کەسم دیوە و نەگوێم لە دەنگی کەس بووە. ئەگەر جنۆکەی بە سلامەتی بە ڕێی خۆتدا بڕۆ. ئەگەر مرۆڤیشی تا سبەینێ ڕاوەستە.' ئیدی کانەماکان تا بەری بەیان لەو شوێنە ماوە و نەچوو بۆ لای. کە ڕۆژ بووەوە و تاو هەڵات، سەیری کرد ئەوە پیاوێکی ڕەوەندەیە. کانەماکان چووە بەرەوە و سڵاوی لێ کرد. کابرای ڕەوەندە وەڵامی سڵاوی داوە. بەڵام چونکە بە منداڵی زانی و جلوبەرگی شڕۆڵی لە بەردا بوو، بە سووکی چاو لێ کرد و بە کانەماکانی گوت: 'گەنجۆ، لە کام هۆزی عەرەبی و لەبەر چی بەو شەوە تاریکە هاتوویە دەرێ؟ ئەوە کاری هەموو کەس نییە و بە ئازا و بوێران دەکرێ. دوێ شەو گوێم لە چەند قسەیەکی شاعیرانە و مەزنانەت گرت. ئێستا وا کەوتوویتە داوی منەوە و دیلی، بەڵام من لەبەر منداڵیت لێت خۆش دەبم و دەتکەمە خزمەتکاری خۆم.' کاتێک کانەماکان گوێی لەو قسانەی بوو کە دوای ئەو شێعرە بە سۆزانەوە کردنی، زانی کە بە چاوی سووک سەیری دەکا. ئیدی بە نەرمی بە ڕەوەندەکەی گوت: 'ئەی گەورەی عەرەب، تۆ کارت بە منداڵکاری من نەدابێ و منیش حازرم بۆ خزمەتکاریت. باسی سەربهوردەی ئەو دڵەی خۆتم بۆ بکە کە بۆچی ڕێگای دەشتودەرت گرتووەتە بەر و ڕووت کردووەتە شێعر و شاعیری؟'

"ڕەوەندە گوتی: 'گەنجۆ، من سـەباحی کوڕی ڕەماحی کوڕی هیمامم کە یەک لە هۆزە عەرەبەکانی شامە. ئامۆزایەکم هەیە ناوی نەجمە، دیتنی ئارام و قەرار لە مرۆڤ هەڵدەگرێ و پێکەنینی شـێت و شـەیدای دەکا. کاتێک بابم مرد، مامم، واتە بابی نەجمە، باڵی بەسـەر کێشام و پەروەردەی کردم. کاتێک گەورە بووم و زانیان هەژارم، کچەکەیان لێ شاردمەوە. ئەمن سـەرۆک هۆز و گەورە گەورەکانی هۆز و خێڵگەلی عەرەبم ناردە خوازبێنی کچە مامەکەم. مامم پێی عەیب بوو، لەبەر ئەوان قەبووڵی کرد. بەڵام بڕیار درا پەنجا ئەسـپ و پەنجا وشـتر و دە غولام و دە کەنیز و پەنجا بار گەنم و پەنجا بار جۆم لێ بسـتێنن. هەر مەبەسـتی ئەوە بوو مارەییەکەی ئەوەندە زۆر کا کە بۆم نەدرێ. هەر بۆیە من لە شـام وەدەر کەوتم و بەرەو عێراق هاتم. بیست ڕۆژە لە بێرووندام جگە لە تۆ کەسم نەدیوە. بە تەمام بچم بۆ بەغدا هەر کە بازرگانێکی دەوڵەمەند لە بەغدا هاتە دەرێ وەدوای بکەوم و لە شـوێنێک هەڵکوتمە سـەری و پیاوەکانی بکوژم و ماڵەکەی لێ بسـتێنم. وشـترەکانی بە بارەوە بەرم. ئێسـتا پێم بڵێ ئەتۆ کێی؟' گوتی: 'بەسـەرهاتی منیش وەک هی تۆ وایە. بەڵام دەرد و خەمی من لە دەرد و خەمی تۆ زیاترە و کارەکەم قورسـترە، چونکە کچە مامی من کچی پاشایە و بەو شتانەی تۆ گوتت جێبەجێ نابێ و پێی پێمل نابێ.' سەباح گوتی: 'ڕەنگە تۆ تەواو نەبی، یان ئەوین شـێتی کردووی، دەنا چۆن کچە مامی تۆ شـازادە دەبێ؟ ئەمن هیچ هێمایەکی پاشـایانە لە تۆدا نابینم و پێم وایە لە سـوالکەرێک زیاتر نی.' کانەماکان گوتی: 'کاکە، لەو ڕۆژگارەدا ئەو شتانە سەیر نییە.'

ڕۆژگـارە، جـارێ پەسـت و جـارێ مەزنـت دەکـا
جـارێ بەرز و پـیـرۆز، جـارێ قـێـزەونـت دەکـا

" 'ئەگەر دەتەوێ من بناسـی، من کانەماکانی کوڕی زەوئولمەکانپاشـای کوڕی نوعمانپاشـای پاشـای بەغدا و خوراسـانم. ڕۆژگار ئاوای لێ کردووم و دەسـەڵاتی داوەتە دەسـت ساسـانشـا. من بە شـەو لە بەغدا وەدەر کەوتووم هەتا کەس نەمناسـێتەوە. ئەوە بیست ڕۆژە من لە دەشتودەردا دەسووڕێمەوە و جگە لە تۆ کەسم نەدیوە ـمنیش وەک تۆ.'

"کاتێک سـەباح بەسـەرهاتی کانەماکانی بیسـت، لە خۆشـیان هاواری کرد و گوتی: 'بە خودا من بە ئاواتی خۆم گەیشـتم. ئەمن بارمتە و دەسـتکەوتێکی لە تۆ باشـترم وەگیر ناکەوێ. مادام تۆ لە نەوەی پاشاکان بی، هەرچەند ئێستا لە جلوبەرگی سوالکەریشدا بی، هەر ئاوا بێخاوەن و بەڕەڵا ناکرێی؛ دێن بە شوێنتدا و دەتدۆزنەوە. ئەگەر بزانن تۆ بە منی، ناچار دەبن باجێکی زۆرم دەنێ. هەر بۆیە قۆڵبەسـتت دەکەم و دەتبەم.' شـازادە گوتی: 'برای عەرەبم، ئاوا مەکە کارێکی باش نییە، ڕێی دوژمنکاری مەگرە بەر. کەس من بە زێڕ

و زیو لە تۆ ناکرێ. با ببین بە هاوڕێ و لە وڵاتی عێراق بڕۆینە دەرێ و بە دنیادا بگەڕێین. بەشـــکو بەشـــی مارەییەکەمان وەگیر کەوێ و بە ئامۆزاکانمان بگەین.' کە ســـەباح ئەو قســـەیەی بیســـت، تووڕە بوو، ســـوور بووەوە و گوتی: 'خوێڕی، ئەو جار ئاوام وەڵام دەدەیەوە؟ دەستت بێنە با بتبەستمەوە هەتا وەبەر شەپم نەداوی.' کانەماکان بزەیەکی هاتێ و گوتی: 'لەبەر چی قۆڵبەســـتم دەکەی؟ مەگەر تۆ خۆت بە ئازا و جوامێر نازانی و لە تانە و ســـەرکۆنەی عەرەب ناترســـی. وا گەنجێک لە خۆڕایی بە دیل دەگری، لە کاتێکدا قەت لە گۆڕەپانی شـــەڕدا ڕووبەڕووی نەبوویتەوە و نازانی هونەرمەندە یان بێهونەرە؟' ســـەباح پێکەنی و گوتی: 'پێم ســـەیرە بەو تەمەنەوە ئەو قســـە زلانە دەکەی! ئەوە قســـانە هی پاڵەوانانە.' کانەماکان گوتی: 'جوامێری لەوەدایە کە تۆ چەک لەولاوە دانێی و جلوبەرگی زیادی دانێی و پێکەوە زۆران بگرین. هەرکەس ئەوی دیکەی بە زەویدا دا، بیکا بە کۆیلەی خۆی.' سەباح پێکەنی و گوتی: 'پێم وایە ئەجەلەت هاتووە.' ئیدی چەکەکەی لەو لاوە دانا و ئاتەگ و شتی تێ هاویشت و بەرەو کانەماکان هات. ئاوقای یەک بوون. ڕەوەندە سەیری کرد، کانەماکان قاچەکانی وەک دوو کێو چەقیون، ئیدی زانی کە ناتوانێ بەرەنگاری بێ و ملەی لەگەڵ بکا. لە کارەکەی خۆی پەشـــیمان بووەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خۆزگە بە چەک کوشتبام.' ئیدی کانەماکان گرتی و وای ڕێکگوشی خەریک بوو تێکی شکێنێ. هاواری کرد: 'کوڕە گەنجۆ بۆ خاتری خودا بەرمدە مردم!' کانەماکان هەڵیگرت و ویســـتی بیهاوێتە ناو چەمەکەوە. کە ڕەوەندە هـاواری لێ بەرز بووەوە: 'گەنجۆ، ئەوە چم لەگەڵ دەکەی؟!' کانەماکان گوتی: 'دەمەوێ لەو چەمەت هاوم هەتا بتگەیێنێتە دیجلە. دیجلە بتدبا بۆ چەمی عیســـا. چەمی عیســـا بتبا بۆ فورات و فوراتیش بتباتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت تا هۆز و خزمانت تۆ ببینن و بزانن چ پاڵەوانێکی.' ئیدی ســـەباح لە بەری پاڕاوە و گوتی: 'تۆو گیانی کچە مامەکەت ئەو کارەم لەگەڵ مەکە.' ئیدی کانەماکان داینا سەر زەوی.

"کە ڕەوەندە لە دەست کانەماکان ڕزگاری بوو، چوو بە لای شمشیر و مەتاڵەکەیەوە و لە دڵی خۆیدا بیری دەکردەوە کە هێرشـــی بکاتە ســـەر یان نا. کانەماکان زانی لە بیری چیدایە و پێی گوت: 'کە دەســـتت دا شـــیر و مەتاڵەکە، زانیم بە تەمای چیت، چونکە بۆت دەرکەوت لە زۆرنبازیدا شـارەزا نیت. بەڵام ئەگەر شـیرت پێ بێ ســـەرکەوتوو دەبی و بە ئاواتت دەگەی. ئێستا من ئەو دەرفەتەشت دەدەمێ با لەسـەر دڵت نەبێ بە داخ. کەوایە تۆ ئەو مەتاڵەم دەیە و بە شـیرەکە هێرشـم بۆ بێنە. یان تۆ من دەکوژی، یان من تۆ دەکوژم.' ڕەوەندە مەتاڵەکەی دایە و بە شـــیرەوە پەلاماری دا. هەر ڕەوەندە شـــیری داهێنایە و کانەماکان مەتاڵی وەبەر دا. کانەماکان نەیدەهێشـــت هیچ ئازارێکی پێ بگا و بەرپەرچی هەموو هێرشـــەکانی دەداوە. بەڵام هیچیشـــی پێ نەبوو شـــەڕی پێ بکا. ڕەوەندە ئەوەندەی شـــیر هەڵســـووڕاند و دایهێنایەوە، کە تەواو لە شـــان و پێل ببوو. کانەماکان زانی هێزی لە

بەردا نەماوە و تەواو باسک و شانی ماندوو بووە، هێرشی کردە سەری و گرتی و پشتەوقەفار خستی، بە قایشی شمشێرەکەی دەستی بەست. دوایی لاقی گرت و ڕایکێشا هەتا قەراخ چەمەکە. سەباح گوتی: 'تاقانەی ڕۆژگار و ئازای زەمانە، ئەوە بە تەمای چ بکەی؟!' کانەماکان گوتی: 'پێم نەگوتی بە چەمەکەدا دەتنێرمەوە بۆ لای هۆز و خزمانی خۆت، هەتا لەوە زیاتر چاوەڕوانت نەبن؟ با ئەو ئامۆزایەشت ئەوەندە لەسەر تۆ ڕانەوەستێ.' ئیدی سەباح دەستی کردە گریان و گوتی: 'گەورەی گەورانی جیهان! کاری وا مەکە و من بە کۆیلەی خۆت دانێ.' ئینجا فرمێسکی هاتە خوارێ و ئەو شێعرەی گوت:

داری خراپە قەت بەر ناهێنێ
ئەگەر بەر بێنێ خراپە دێنێ
ئینسانی خراپ ناحەسێتەوە
بچێتە هەر کوێ دەیبینێتەوە

""کانەماکان بەزەیی پێیدا هات و پەیمانی لەگەڵ بەست کە هاوڕێی دڵسۆزی بێ. ئینجا ئازادی کرد. ڕەوەندە ویستی دەستی کانەماکان ماچ کا، بەڵام شازادە ڕێی نەدا. ئیدی ڕەوەندە هەستا و سەری توورەکەکەی کردەوە و سێ کولێرەی جۆی دەرهێنا. لەپێش کانەماکانی دانا. دانیشتن و نانیان خوارد. دوایی دەسنوێژیان گرت و نوێژیان کرد. ئینجا زۆریان باسی ڕۆژگار و نەهامەتییەکانیان کرد. کانەماکان بە ڕەوەندەی گوت: 'بە تەمای بۆ کوێ بچی؟ ڕەوەندە گوتی: 'دەچم بۆ بەغدا و لەوێ دەمێنمەوە هەتا مارەیی پەیدا دەکەم.' کانەماکان گوتی: 'ئەوە تۆ و ئەوەش ڕێگای بەغدا.'

"ئیدی ڕەوەندە ماڵاوایی لێ کرد و ڕێگای بەغدای گرتە بەر. کانەماکان لە دڵی خۆیدا گوتی: 'چۆن لە ڕووم بێ ئاوا بچمەوە؟ بە خوا قەت وا ناگەڕێمەوە.' ئیدی چوو لە قەراخ چۆم دەسنوێژی گرت و نوێژی کرد. دوای ئەوە سەری لەسەر سووژدە هەڵنەگرت و لە بەر خودای خۆی پاڕاوە: 'ئەی بارێنەری دڵۆپەی باران! ئەی ڕۆزیدەری کرمی نێو دار و بەردی ڕەق! داوات لێ دەکەم بە گەورەیی خۆت ڕسقم بدە.' ئیدی سەری هەڵێنا. نەیدەزانی بۆ کام لا بچێ. دانیشتبوو چاوی لەملا و لەولا دەکرد، لە پڕدا سوارێک پەیدا بوو کە دەستەجڵەوی بۆ ئەسپەکەی شل کردبوو بە پەرتاو دەیئاژووت. کانەماکان لە جێی خۆی دانیشت و پاش ماوەیەک سوارەکە بە هەناسەبڕکێ گەیشتێ. برینێکی قووڵی لە جەستەیدا بوو، فرمێسکەکانی دادەبارین، بە کانەماکانی گوت: 'گەورەی عەرەب، فریام کەوە و هاوڕێیەتیم بکە، دڵنیا بە هاوڕێی وەک منت وەگیر ناکەوێ. کەمێکم ئاو دەیە، هەرچەند ئاو بۆ برینداریش باش نییە.' گوتیشی ئەگەر مام، ئەوەندەت دەدەمێ بێنیازت دەکەم، ئەگەر مردیشم ئەوە ئەو چاکەیەکت کردووە و لە لای خودا ون نابێ.' ئەسپێکی لەژێردا بوو

قـاچەكـانی لە دوو كۆڵەكەی بەردی مەڕمەڕ دەچوون، بە جۆرێـک هەركەس چـاوی پێی دەكەوت، سەری سووڕ دەما. كانەماكان كە چاوی پێی كەوت، گوتی: 'پێم وا نییە لە تەواوی دنیادا ئەسپێكی ئاوا هەبێ.' "ئیدی كانەماكان سوارەكەی لەسەر ئەسپەكە داگرت و كەمێكی ئاو دایە و ئینجا ڕاوەسـتا تۆزێک پشـووی بێتەوە بەر. ئەو جار لێی پرسـی: 'كێ ئاوای لێ كردووی؟' سـوارەكە گوتی: 'ڕاوەسـتە، هەمووت بۆ دەگێڕمەوە.' كەمێک مات بوو، گوتی: 'ئەمن كارم ئەسپدزینە و نێوم 'غەسان'ـە. لە لای ئافریدوونپاشا ناوبانگی ئەو ئەسپەم بیستبوو. بەو ئەسپە دەڵێن 'قاتوول' و نازناوی 'مەجنوون'ـە. ئەمن هەر لەبەر ئەو ئەسپە چووم بۆ قوسـتەنتەنییە. هەمیشـە چاوم بەسـەریەوە بوو. لە پڕدا پیرێژنێک وەدەر كەوت، ئەو پیرێژنە لای ڕۆمییەكـان زۆر جێی ڕێزە و پێی دەڵێن زاتوددەوایی. ئەو ئەسـپە بەو پیرێژنە بوو. دە دانە خزمەتكاریان دانابوو خزمەتی ئەو ئەسـپە بكەن. پیرێژنە دەهات بۆ بەغدا بۆ لای سـاسـانشـا، داوای ئاشـتی لێ بكا. لە تاوی ئەسـپەكە منیش بە دوایاندا هاتم. هەر چەند دەسـتم بە ئەسـپەكە ڕانەدەگەیشـت، چونكە خزمەتكارەكانی هەر چاوەدێریان دەكرد و ئاگایان لێی بوو. هەر ئەوان هاتن و منیش دوورونیزیک بە دوایاندا هاتم، هەتا گەیشـتینە ئەو شـوێنە. ئەمن لەوە دەترسـام بچنە ناو بەغداوە و نەتوانم ئەسـپەكە بێنمەوە دەرێ. هەر لە بیری ئەوەدا بووم چ بكەم و چۆن ئەسـپەكە بڕفێنم. كەچی لەو جەنگەیەدا تۆز و خۆڵێک بەری ئاسـمانی گرت. كە گەیشـتنێ و تۆز نیشـتەوە، سـەیرم كرد پەنجا سـواری چالاک وەدەر كەوتن. ئەو سـوارانە چەتە و ڕێگر بوون. پێشـیان بە كاروانان دەگرت. سەرۆكەكەیان ناوی گەوهەرداش بوو—دەتگوت شێرە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆكی ئەمشـەویش كۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

## كە شەوی سەد و چل و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو سوارە بریندارە بە کانەماکانی گوت: 'گەوهەرداش و سوارەکانی دەوری پیرێژنەیان دا، ئەوەندەی پێ نەچوو پیرێژنە و دە کەســــەکەیان قۆڵبەســـت کرد و ئەســـــپەکەیان لێ ســــەندن. ئەمن لە بەر خۆمەوە گوتم: 'تازە ڕەنجبەبا بووم و بە ئاواتم نەگەیشتم.' دوایە خۆم مات کرد تا بزانم کارەکە بە کوێ دەگا. چاوم لێ بوو کە پیرێژن بە گریان بە گەوهەرداشــی گوت: 'ئازا و پاڵەوانی فارس، ئەتۆ ئەو ئەســپەمان لێ دەســتێنی، ئەی چی لە پیرێژن و خزمەتکارەکانی دەکەی؟' ئیدی بە زمانی لووس و قســــەی خۆش و پاڕانەوە کارێکی کرد گەوهەرداش ئەوانی ئازاد کرد، بەڵام ئەســــپەکەی هەر نەدانەوە. گەوهەرداش و سوارەکانی هاتن و ئەمنیش بە دوایاندا هاتم و چاوەڕێی هەلێک بووم، هەتا دەرفەتم لێ هێنا و سواری ئەسپەکە بووم. هەر کە ڕکێفم لێ دا، زانیان و دەوریان دام وە بەر تیر و سەرەنێزەیان دام. ئەمن لەسەر ئەسپەکە بووم و ئەسپەکە لە جێی من بە دەست و لاق شـــەڕی دەکرد. هەتا منی ڕزگار کرد. بەڵام لەو شــــەڕ و بگرە و بەردەیەدا برینێکی زۆرم تێ بوو. سێ شــەو و ڕۆژ بەبێ ئەوەی هیچ بخۆم لەســەر پشــتی ئەو ئەســپە بووم. هێزم لە بەردا نەمــابوو. وا بوو ئەتۆ گەورەییت لەگەڵ کردم. هەر چەنــد ڕووتی، بەڵام شـــــوێنەواری گەورەیت تێدا دەبینم. پێم بڵێ کێی؟' کانەماکان گوتی: 'پێم دەڵێن کانەماکانی کوڕی زەوئولمەکانی کوڕی نوعمان پاشـــــا. بابم مرد و من بێ باب مامەوە. دوای بابم کەسێکی پلەنەزم بوو بە سوڵتانی بەغدا.' ئیدی کانەماکان بەسەرهاتی خۆی لە سـەرەتاوە تا ئەو کاتە بۆ گێڕاوە. کابرای بریندار زگی پێی سووتا و گوتی: 'ئەتۆ خاوەنی ڕەچەڵەکێکی گەورەی. لە تەوێڵتدا نووسـراوە کە تۆ دەسـت بەسـەر تەواوی دنیادا دەگری. ئەگەر بتوانی من بخەیە سەر ئەسپەکە و بۆ خۆشت سوار بی و من بگەیەنیتەوە شوێنەکەی خۆم، سەر بڵیندی دنیا دەبی و لە ڕۆژی پەســـڵانیش پاداشـــی چاکەت دەدرێتەوە، چونکە من بۆ خۆم ناتوانم خۆم لەسەر ئەسپەکەم بگرم. ئەگەر لە ڕێگاشدا مردم، ئەو ئەسپە بۆ خۆت. چونکە بۆ تۆ بێ لە هەموو کەس چاکترە.' کانەمـاکان گوتی: 'ئەگەر بە کۆڵیش بێ دەتبەمەوە و ئەگەر گیانم لە دەســـــت خۆمدابایە، نیوەی گیانیشـــــم دەدایتێ. چون منداڵی بنەماڵەیەکم پشتیوانی هەژاران و لێقەوماوانە.' ئیدی ویستی لەسـەر ئەسپەکەی دانێ، کابرا بریندارەکە گوتی: 'کەمێک ڕاوەسـتە.' هەردووک چاوی لێک نا دەسـتەکانی کردنەوە و شـایەدوومانی هێنا. خۆی بۆ مردن ئامادە کرد و ئەو شێعرەی گوت:

حەیــف کە لە دوای ئــێــمەش ڕۆژگـــار
دەڕوێنــێ گوڵ و گیــا و ســــەوزەی بەهــار
چــیــهـــا بەفــرانــبـــار و خـــاکەلــێــوە

دێـن، ئـێـمەش گـڵ و خـۆڵـیـن لەو نـێـوە
ئەوانەی ئێســـتـا لە هیـچ کوێ دیـار نیـن
پێ دەنێنە ســـەر جەســـتەی مە[1]ی خۆڵین
دڵ بەو دنـیـا کـاتـیـیە مەبەســـتـن
پـاڵەوانـان بە دەســـتـیـیەوە پەســـتـن

'کە شـــیعرەکەی تەواو کرد، زاری کردەوە و هاواری کرد و گیانی دەر چوو. ئیدی کانەماکان هەر لەوێ ناشتی و لغاوی ئەسپەکەی گرت. سەیری کرد ئەسپی ئاوا لە تەویلەی ســـاســـانشـــایشـــدا وەگیر ناکەوێ. دوای ئەو کاروانێکی بازرگانان هات و ئەوەی دوای دیارنەمانی ئەو لە بەغدا رووی دابوو، هەموویان بۆ گێڕاوە. باســـی کێشـــەی نێوان وەزیر دەندان و ساسانشایان بۆ کرد کە وەزیر دەندان لەگەڵ نیوەی سوپاکەی لەژێر دەسەڵاتی ساسانشا چوونە دەرێ و دەڵێن: 'ئێمە جگە لە کانەماکان پاشایەتی کەسمان ناوێ.' وەزیر دەندان لەگەڵ ئەو برە ســـوپایەی لەگەڵییەتی هەســـتاوە چووە بۆ کۆمەڵە دوورگەی هیند و بەربەر و وڵاتی سوودان. لەوێ سوپایەکی بە قەد ئەستێرەی ئاسمان و خیزی بێروونی کۆ کردووەتەوە و بە تەمایە بگەڕێتەوە بەغدا و لەگەڵ دژمنی خۆی بەشـــەڕ بێ. ســـوێندی خواردووە هەتا کانەماکان نەخاتە ســـەر تەخت، شـــیرەکەی لە کالانەکەی نەنێتەوە.' بازرگانەکان گوتیان: 'کاتێک ساسانشا زانی ئەوە گەورە و بچووک چاویان لە کانەماکانە. ناڕەحەت و خەمبار بوو. دەرکی خەزێنەی کردەوە و زێڕ و زیوێکی زۆری بەســـەر گەورە گەورەکـانـدا بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی کـانەمـاکـان ببیننەوە و بیبەنەوە لای ئەو. هەتـا خۆشـەویستی نیشـان بدا و قەرەبووی بێمەیلییەکەی بکاتەوە و بیکا بە فەرماندەی سـوپا.' کە کانەماکان ئەو هەواڵەی لە بازرگانەکان بیست، سـواری ئەسـپەکەی بوو و بەرەو بەغدا تاوی دا.

"لەو جەنگەیەدا کە ســـاســـانشـــا تووشـــی ســـەرگەردانی ببوو، هەواڵی هاتنەوەی کانەماکانیانی بیســت، تەواوی ســوپای لەگەڵ گەورە گەورەکانی بەغدای نارده پێشـــوازی. ڕاســـپاردەکان چاویان پێی کەوت و لەپێشـــییەوە بە پێیان هەتا کۆشـــک ڕۆیشـــتن. پیاوانی کۆشـــک هەواڵی هاتنەوەی کانەماکانیان دا بە دایکی. دایکی هات و تەوێڵی ماچ کرد و لە ئامێزی گرت. کانەماکان گوتی: 'دایە، هەتا لای ساسانشا دەچم، چونکە ئەو چاکەی زۆری بۆ من بووە. بەڵام پیاوانی دەربار زووتر چووبوونە لای ســـاســـانشـــا و زۆریان پەســـنی ئەسپەکە و سوارەکەی کردبوو. ئیدی پاشاش هەستا هات بۆ لای کانەماکان و سڵاوی لێ کرد. کاتێک کانەماکان چاوی بە پاشـا کەوت لەبەری هەسـتا و چوو دەسـت و قاچی ماچ

١. مە: ئێمە.

کرد و ئەسپەکەی کێشا پێشێ و بە دیاری دایێ. پاشا دەستخۆشی لێ کرد و گوتی کە ئەو ماوەیەی ئەو دیار نەبووە، چەندە نارەحەت بوون و سـپاسـی خودای کرد کە سـاغ و سلامەتە.

"دوای ئەوە چاوی لە ئەسپەکە کرد و ناسییەوە کە ئەوە قاتوولە و نازناوی مەجنوونە. ئەو ساڵەی کە شەرکانپاشا کوژرا، ئەو ئەسپەی لە ڕۆم دیتبوو. پاشا بە کانەماکانی گوت: 'ئەگەر ئەو ساڵە ئەو ئەسپەیان بە هەزار ئەسپ بفرۆشتبا، زەوئولمەکانی باوکت دەیکڕی. بەڵام ئێستا شوکر بۆ خودا بە تۆ گەیشت و بەڕاستیش هەر شایانی تۆیە. من ئەو دیاریەتم قەبووڵ کرد و هەر بە خۆتی دەبەخشـمەوە.' ئیدی فەرمانی دا خەلاتیان بۆ هێنا و ئەسـپگەلێکی زۆری دایە و لە کۆشـکی گەورەدا ماڵێکی بۆ کۆک و تەیار کرد. ماڵ و سـامانێکی لە ژمارنەهاتووی دایە. گەورەیی و شـادمانی ڕووی لە کانەماکان کرد و پاشـا زۆری لەگەڵ چاک بوو و ڕێزی لێ دەگرت، چونکە لە داهاتووی کاری وەزیر دەندان دەترسا.

"بەو جۆرە کانەماکان لە چارەڕەشـی و نەگبەتی ڕزگاری بوو. بە دڵخۆشـی هەسـتا چووە لای دایکی و پرسیاری کچە مامەکەی کرد. دایکی گوتی: 'ڕۆڵە گیان، دووری تۆ منی لە خەڵک دوور خستبووەوە و سەرقاڵی کردبووم.' گوتی: 'دایە، هەستە بچۆ لای بەشکو بە دیدارێک دڵم ئارام کاتەوە.' دایکی گوتی: 'تەماع پیاو سووک دەکا. لەو قسانە گەڕێ، چونکە کێشـەت بۆ سـاز دەکا. منیش ناچم بۆ لای و قسـەی لەگەڵ ناکەم.' کە دایکی ئەو قسـانەی کرد، گوتی: 'لەو کەسـەی ئەو ئەسپەی دزیبوو، بیسـتم کە پیرێژنێک بە ناوی زاتوددەوایی هاتووە بۆ ئەو وڵاتە و بە تەمایە بێتە بەغدا. ئەو پیرێژنە هەر ئەو پیرێژنەیە کە باپیرم و مامی منی کوشـتووە. دەبێ هەر بیکوژم و تۆڵەی ئەوانی لێ بسـتێنم و ئەو پەڕۆ شـینەی لەسەر شانی بنەماڵەکەمان دادرم.' دایکی پێی گوت جارێ تۆ بحەسێوە. دوایە بۆخۆی چوو بۆ لای پیرێژنێکی جادووگەر بە ناوی سـەعدانە. باسـی خۆی و قەزافەکانی بۆ کرد و تکای لێ کرد بچێتە لای قەزافەکان و قسـەی لەگەڵ بکا، بەشـکو ئەوە خوایە لەگەڵ کانەماکان دڵنەرم بێ. پیرێژنە چووە لای قەزافەکان و کەمێکی دواند و دڵی نەرم کرد و گەڕاوە. کە هاتەوە گوتی: 'قەزافەکان سلاوی لێ دەکردی و گوتی: 'نیوەشەو دێم.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و چل و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، پیرێژن گەڕاوە لای کانەماکان و پێی گوت: 'قەزافەکان ســـڵاوی دەگەیاندی و گفتی دا نیوەشەو بێتە ژوانت. ئیدی کانەماکان دڵی بە گفتی ئامۆزاکەی خۆش بوو. کە بوو بە نیوەشـەو، قەزافەکان هات و ئەوی لە خەو هەسـتاند و سـەرکۆنەی کرد و گوتی: 'چۆن دەڵێی ئەویندارم و، ئـاواش خەوت لێ دەکەوێ؟' کە کـانەمـاکـان خەبەری بووەوە، گوتی: 'بە خوا هەر لەبەر ئەوە خەوتووم تۆ بێیە خەونم.' ئیدی قەزافەکان یاری و دەستبازی لەگەڵ دەکرد و شێعری ئاوای بۆ دەخوێندەوە:

ئەڤـیـنـدار و حەســـــاوە، بەفـر و هەتـاون
چـاوی ئەڤینـداران دایم، ســـوور و پڕ ئـاون
ئەڤینـدار کوانێ دەتوانێ ســـاتێ بســـرەوێ
ســـرەوتن و ژیـانی چی، بێ وی چی نـاوێ

"ئیدی کانەماکان تەریق بووەوە، یەکتریان لە ئامێز گرت و دەمیان بە دەمی یەکەوە نا هەتا بەری بەیانی. دوایی کانەماکان زۆر گریا و ئەو شێعرەی گوت:

بەشی خۆم وەرگرت لە ژین، دوێنێ شەوێ

لە بەر دەســـــتم بـوو ئەوەی دڵ دەیـهەوێ
بســـکی ئـاڵابـوو لە ئەســـتۆم، یـارەکەم
دەســـتم ئـاڵابـوو لەســـتۆی دڵـدارەکەم
دەنــگــی ئەڵــڵاهــوئەکــبەر لەو دەمەدا
خەریـکە ئـیـنســـان لە ئـیســـلام لا بـدا

'کە شێعرەکەی تەواو کرد قەزافەکان، مالاوایی لێ کرد و گەڕاوە بۆ کۆشکەکەی خۆی. لە لای هێندێک لە کەنیزەکان باسی ئەو شەوەی کرد و کەنیزەکانیش چوون ئەو هەواڵەیان دا بە ســاســانشــا و ئەویان لە کاری ئەو کوڕ و کچە ئاگادار کردەوە. پاشــا هات بۆ لای قەزافەکان و شــیری لێ هەڵکێشــا هەتا ســەری لە لەشـــی جوێ کاتەوە. لە ناکاو نوزهەتوززەمان گەیشـــتێ و گوتی: 'دەســـت ڕاگرە و کارت پێی نەبێ. ئەگەر کارێکی وا بکەی، ئەوە هەواڵەکەی لەنێو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە و تەواوی خەڵک سەرکۆنەت دەکەن کە کانەماکان خاوەن ڕەوشـــتی بەرزە و پاکداوێنە و کارێکی وای نەکردووە لێی بە ئیراد

بگیرێ. ئەتو پەلە مەکە. چونکە لەنێو خەڵکدا بڵاو بووەتەوە کە وەزیر دەندان ســـوپایەکی زۆری کۆ کردووەتەوە کە بە تەمایە کانەماکان بکا بە پاشا. ڕۆژی ئەوە نییە.'

"ســاســانشــا گوتی: 'ناچارم پەندێکی بەســەر بێنم و لە چاڵێکی هاوێم کە قەت نەتوانێ بێتەوە دەر. من هەر لەبەر ئەوە ئەو پێشــوازیەم لێ کرد هەتا لە لای خەڵکی بەغدا نەبێ بە پــاڵەوان. جــا ئەوە زۆر زوو بۆت دەردەکەوێ کە کــارەکــان بە کوێ دەگەن.' ئیــدی نوزهەتوززەمانی بەجێ هێشـــت و وەدەر کەوت و خەریکی کاروباری وڵات بوو. ئەوە ساسانشا.

"بەڵام کانەمـاکـان ڕۆژێکی دیکە چوو بۆ لای دایکی و گوتی: 'دایە، بە تەمـام ڕێگە لە کاروانچیان بگرم و تاڵانیان بکەم، مەڕ و ماڵاتیان لێ بســتێنم و کۆیلە و کەنیز کۆ کەمەوە و ماڵێکی زۆر بەســـەر یەکەوە بنێم. ئەو دەم بچم داوای قەزافەکان بکەم.' دایکی گوتی: 'ڕۆڵە گیان، ماڵی خەڵک بێخاوەن نییە و خەڵک وەک شــێر پارێزگاری لە ماڵ و ســـامانی خۆی دەکا و پلنگت بۆ ڕاو دەکا.' کانەماکان گوتی: 'تازە لەو هەڵوێستەی گرتوومە پاشگەز نابمەوە هەتا بە ئاواتم نەگەم.' دوای ئەوە پیرێژنی ناردە لای قەزافەکان و پێی ڕاگەیاند کە دەڕوا بۆ سـەفەر هەتا مارەیییەکی شـایانی ئەو نەهێنمەوە نایەمەوە. بە پیرێژنەشـی گوت کە بە مسۆگەری دەبێ وەڵامەکەی ئەویشم بۆ بێنیتەوە. وا بوو پیرێژن چوو وەڵاکەشی هێناوە و گوتی: 'قەزافەکان لە نیوەشـــەودا دێ بۆ لات.' ئیدی کانەماکان هەتا نیوەشـــەو هەر نەخەوت و چاوەڕێ بوو. وا بوو لە پڕدا تیشـکی سـیمای یار دیوەکەی ڕووناک کرد و بە کانەماکانی گوت: 'ڕۆحم فیدات بێ ئەوە هەتا ئێستا چاوەڕێی منی؟' ئیدی کانەماکان هەستا و گوتی:

مەرهەمـــــــــــــی دەرد و هاودەمی ژیانم
بە کـــــــــــــــۆچت دیســان مەدە ئازارم
هــۆی حەســـــانەوەی ڕووحــی شــــەکەتـم
بــێ تــۆ مــن جەســـــتەیەکـی شــــەکەتـم
ژیـــان بەبـــێ تـــو بـــۆ مـــن مەحـــاڵە
تـــۆم نەبـــێ هەنـــگـــویـــن بە زارم تـــاڵە
بـــیـــری کـــۆچ مەکە تـــکـــات لـــێ دەکەم
تـــازە قەت بەبـــێ بـــوونـــت هەڵـــنـــاکەم

"ئیدی پێی گوت کە بە تەمایە چ بکا. قەزافەکان دەسـتی کرد بە گریان. کانەماکان گوتی: 'ئامۆزا، مەگری. هیوادارم خودا ئەو جوداییە بکاتە مـایەی پێکگەیشـــتنمـان.' دوای ئەوە

کانەماکان هەڵوێستی گرت سەفەرەکەی بکا، ئیدی ماڵاوایی لە قەزافەکان کرد و چووە لای دایکی بۆ ماڵاوای و شیری لە قەدی دا. لە کۆشک وەدەر کەوت. سواری ئەسپەکەی بوو بە کۆڵان و گەڕەکەکانی شاردا ڕۆیشت هەتا گەیشتە دەروازەی شار. بە ڕێکەوت لە پڕدا تووشی سەباحی کوڕی ڕەماحی هاوڕێی بوو کە لە دەرەوەی شار ڕاوەستابوو. سەباح کە ئەوی دیت، ئاوزەنگییەکەی ماچ کرد و دوعای خێری بۆ کرد، لێی پرسی: 'براکەم، ئەوە ئەو ئەسپ و شتانەت لە کوێ بوو، لە کاتێکدا من جگە لە شمشێرەکەم هیچی دیکەم نییە؟' کانەماکان گوتی: 'دوای ئەوەی تۆ لە من جیا بوویتەوە، ئەو بەختە ڕووی لە من کرد. ئەرێ با شتێکت پێ بڵێم: دەتوانی دڵتم لێ پاک کەیتەوە و لەگەڵ من بێی و پەیمانی برایەتیم بدەیتێ؟' ڕەوەندە گوتی: 'گەورەم، قەسەم بە خودا بە دڵ بیری تۆم دەکرد.' ئیدی شیرەکەی لە قەدی دا و توورەکەکەی بە شانیدا کرد و لەپێش ئەسپەکەوە ڕۆیشت هەتا چوار ڕۆژان هەر وا ڕۆیشتن و ئاسکیان ڕاو کرد و خواردیان و ئاوی سارد و خۆشی کانیاوەکانیان خواردەوە. ڕۆژی پێنجەم کە هەر وا دەڕۆیشتن، لە بەر گردێک لەوەڕگەیەکی لێ بوو، پڕ پڕ بوو لە وشتر و مەڕ و ماڵات. کە ئەوەندە زۆر بوون، دەرزیت هەڵاویشتبا نەدەکەوتە سەر زەوی. کانەماکان بە دیتنی ئەو هەموو مەڕ و ماڵات و پاتاڵە خۆشحاڵ بوو. تەماع گرتی کە بە تاڵانیان ببا. بە ڕەوەندەی گوت: 'دەبێ ئەو ماڵە بەرین. ڕەنگە کاری من و تۆ جێبەجێ بکا.'

سەباح گوتی: 'گەورەم، ئەوانە خاوەنی زۆریان هەیە و هەمووشیان ئازا و کەڵەوەکێش و شەڕکەرن. ئەگەر بێتوو خۆمان تووشی ئەو کارە مەترسیدارە بکەین، ئەستەمە گیان دەربەرین.' کانەماکان پێکەنی و زانی کوڕی ڕۆژی وا نییە. ئەوی بەجێ هێشت و بۆخۆی چوو بۆ تاڵان و ئەو شیعرەشی خوێندەوە:

کەسێک کە تەمای کاری وا دەگرێ
ژیان و مردن لە بەر چاو ناگرێ
یا ئازایانە کاری خۆی دەکا
یا لە ڕێی ئامانج گیانی خۆی دەدا

"پاشان چووە پێشی و ئاژەڵەکانی وەپێش خۆی دا. لە پڕدا کۆمەڵێک پیاو بە شیر و تیرەوە بۆی هاتن. ئەوەی لە پێشیانەوە دەهات پیاوێکی ئازا و بەجەرگی شەڕکەری تورک بوو. هێرشی کردە سەر کانەماکان و هەرای کردێ و گوتی: 'هەتیو، ئەو ماڵە بۆ کوێ دەبەی؟ دەزانی ئەو ماڵە هی کێیە؟ ئەگەر بزانی قەت ناوێری کاری وا بکەی. ئەوە هی هۆزی ڕۆمییانە کە ئازا و پاڵەوانی جیهانن. سەد سوارن کە مل بۆ هیچ پاشا و پاشایەک دانانەوێنن. ئەسپێکیان لێ دزراوە، دەڵێن سوێندمان خواردووە هەتا ئەو ئەسپە نەستێنینەوە

لێرە نارۆینەوە.' کانەماکان کە ئەوەی بیســـت، هەرای کردنێ و پێی گوتن: 'ئەوە هەر ئەو ئەسپەیە کە بۆی دەگەڕێن، وەرن بمکوژن. دەی هەمووتان بۆم وەرن.' ئینجا قاتوولی دەنگ دا و ڕکێفی لێ دا. قاتوول وەک دێو ڕووی تێ کردن و لە یەکەم هەڵمەتدا ســـوارێکی لێ کوشـــتن. ئینجا ڕووی لە دووەمی و ســـێیەمی و چوارەمی کرد و لەســـەر زەوی پاکی کردنەوە. ئیدی ئەوانی دیکە ترسان. کانەماکان ڕووی تێ کردن و گوتی: 'زۆڵینە، ئەو ماڵاتە لێ خوڕن دەنا شیرەکەم بە خوێنتان سوور دەکەم.'

"وا بوو ئەوانیش لە ترســـان ماڵاتەکەیان لێ خوڕی، ئەوەندەی توانیان لە ڕێگەدا یەکیەک و دوودوو هەڵاتن. سەباح کە ئەوەی دیت، خۆشحاڵ بوو. لە گردەکە هاتە خوارێ و هەرای کرد. کە لە پڕدا تۆز و خۆڵێک لە دوور بەری ئاســـمان گرت، کە هاتنە بەرەوە سەد سواری وەک شێری بێشەڵان وەدەر کەوتن. کە سەباح ئەوانی دی، هەڵاتەوە بۆ سەر گردەکە. لەوێوە سەیری شەڕەکەی دەکرد و دەیگوت: 'ئەمن پیاوی ئەو گۆڕەپانە نیم. ئەمن لە کایە و گۆڵمەزدا ســـوارچاکی چاکم.' دوای ئەوە ســـەد ســـوار کانەماکانیان گەمارۆ دا. سوارێک هاتە پێشەوە و لێی پرسی: 'ئەو ئاژەڵانە بۆ کوێ دەبەی؟' کانەماکان گوتی: 'وەرە پێشێ پێت دەڵێم، دیارە سواری چاکی، لەگەڵ هەرکەس ململانێ بکەی بەسەریدا زاڵ دەبی و شێر تێک دەشکێنی.' ئەو سوارە نێوی گەوهەرداش بوو، سەرکردەی سەد سوار بوو. کاتێک کانەماکانی دیت وەک شـێر دەنەڕێنێ و لە جوانیشـدا دەڵێی گراوەکەیەتی، کەوتەوە بیر و خەیاڵی ئەو. گراوەکەی ناوی فاتێن بوو. فاتێن ڕوخساری وەک خۆر دەبریسکاوە و خەڵک سـەریان لە چاڵی چەنەگەی سوور مابوو. لاوەکە لە یادی گراوەکەیدا ئەو شێعرەی گوت:

قەد و بـــــــــاڵای، قەد و بـــــــــاڵا نییە سەلوی چەمەنە  
دەمـــوچـاوی خـڕ و گەش، گـوڵـێـکـی جـوانـی دەمەنە  
کە بزەی دێتە ســـەر لێو، هەنگوین لە دەمییەوە دەتکێ  
چەنـد خۆشـــە تێر بمژی، ئەو جێی شـــیلەی لێوە دەتکێ  
مەرجی مژینی لێوی، ســـەخت و دژوار و ئەســـتەمە  
ســـەر دەکەوم دەزانـم هەرچەنـدە ڕژد و هەڵەمە[1]'

'فاتێن لەگەڵ ئەو هەمووە جوانییەیدا، ئەوەندە ئازا و چالاک و نەترس بوو، تەواوی پاڵەوان و ئازا و بەهێزەکانی هۆز و خزم و ناســـیاو لە ترســـانی حەجمینیان نەبوو. نەیاندەوێرا خۆیانی لێ دەن. ســـوێندی خواردبوو شـــوو بە کەســـێک بکا کە لە ململانێدا

١. هەڵەم: شاخ و زەردومایەکی یەکجار سەخت و ناخۆش بۆ سەرکەوتن.

دەرەقەتی بێ. گەوهەرداشیش یەکێک لەو کەسانە بوو کە خۆشی دەویست و بە تەما بوو بنێرێتە خوازبێنی. بەڵام گەوهەرداش کاتێک بیستییەوە بە بابی گوتووە کە شوو بە کەسێک دەکان لە گۆڕەپانی ململانێدا بەســـەریدا زاڵ بێ، نەیوێرا بەرەنگاری کچە بێتەوە. ترســـا دەرەقەتی نەیە و ئابڕوو و حەیای بچێ. هەرچەند هاوڕێکانی گوتیان: 'ئەتۆ زۆر زۆر جوانچاکی و کاتێک ئەو کچە ڕووبەڕووت بێتەوە، جوانییەکەت ئەوەندەی کار تێ دەکا، هێزی ئەوەی لێ دەبڕێ کە بەرەنگارت بێتەوە. ئیدی تۆ بەســـەریدا زاڵ دەبی، چونکە ژنان لە ئاست جوانی پیاواندا زۆر زوو خۆیان دەدۆڕێنن. بێ ئاکام بوو.'

"گەوهەرداش گوێی بەو قسانە نەبزووت و نەیوێرا ململانێی لەگەڵ بکا. هەمیشە خۆی لێ دەبوارد و نەیدەویســـت بەرەنگاری ببێتەوە. هەتا ئەو ڕۆژە کە لەگەڵ کانەماکان ڕووبەڕوو بووەوە، وای زانی کانەماکان گراوەکەی خۆیەتی. ئیدی چووە پێشێ گوتی: 'ئای فاتێن، ئەوە هاتووی هێزی خۆت نیشـــان من بدەی؟ لەو ئەســـپە وەرە خوارێ با تۆزێک وتووێژ بکەین و دوو قســـەی خۆش بکەین. ئەمن ڕێم لە ســـوارچاک و ئازا و چالاکان گرتووە، ئەو ماڵەم کۆ کردووەتەوە هەتا لە ڕێی تۆدا خەرجی بکەم، ئەتۆش من بە مێردی خۆت قەبووڵ بکەی تا کچی پاشـــاکان بکەمە کەنیزت و خزمەتت بکەن. ئاخر لەو ناوچەیە کەسی تێدا نییە شان لە شانی تۆ بدا.'

"کاتێک کانەماکان ئەو قسانەی بیست، گوتی: 'ئەرێ تۆ دەزانی دەڵێی چی، فاتێن کێیە؟ ئەو هەڵیتوپەڵیتانە وەلا نێ و خۆت بۆ زەبری شـــیرم ئامادە بکە، ئێســـتا لە خوێندا دەتگەوزێنم.' کانەماکان خولێکی بە ئەســـپەکەی دا. ڕکێفی لێ دا و هەڵیســـتاندە ســـەر پاشـــووان و نەڕاندی و داوای ڕکابەری کرد. گەوهەرداش زانی کە ئەو ســـوارێکی یەکجار ئازا و بەجەرگە و خراپی بۆ چووە، ڕووی لە ســـوارەکانی خۆی کرد و گوتی: 'دا یەکتان بۆی بچنە پێشـــێ و تامی شـــمشـــێر و چێژی نێزەی تێبگەیەنن.' ئینجا ئەدهەم ناوێک بۆی چووە پێشـــێ و ماوەیەک هەڵســـووڕا و لە مەیدانەکەدا هات و چوو هەتا لە پڕدا کانەماکان دەرفەتی لێ هێنا و بە شـــیرێک لە تەپڵی ســـەری دا. ســـوارە وەک وشـــتر هۆڕاندی و لە ئەســـپەکەی کەوتە خوارێ. دوایی ســـوارێکی دیکە هێرشـــی هێنا و بۆی چووە مەیدانەوە. ئەویش وەک ئەوەی دیکە یەک دوو هەڕوگیفی لە خۆی دا و بە دەردی ئەو چوو. سێیەمین و چوارەمین و پێنجەمینیش هەر وا. ئیتر بە تێکڕای هێرشیان هێنا و شەڕ بڵێسەی سەند و گەرم بوو. ئەوەندەی پێ نەچوو، کانەماکان هەموویانی کردە قوربانی شـــیر و ڕمب. گەوهەرداش کە ئەوەی دیت، لە گیانی خۆی ترسا و زانی کەسێکی نەترس و بێ هاوتایە. هەر بۆیە بە کانەماکانی گوت: 'قەیناکا من لە خوێنی هاوڕێکانم خۆش دەبم. هەرچییەکیشت دەوێ لەگەڵ خۆتدا ببیە.' کانەماکان گوتی: 'سپاس بۆ ئەو هەمووە گەورەی و دەهەندەییەت. بەڵام تۆ لەو قســـانە گەڕێ و لە بیر دەربازبوونی خۆتدابە.' کە وای گوت، گەوهەرداش

تووڕه بوو، گوتی: 'ئاگات له دمت بێ. دەزانی دەڵێی چی؟! ئەگەر منت ناسیبا قەت لەو قسانەت نەدەکرد. ئەمن شێری بێشەی دلێری، گەوهەرداشی کوڕی سامریم کە هێرش دەکەمە سەر خەڵک و ڕێ بە ڕێبواران دەگرم و بازرگانان تاڵان دەکەم. هەر ئەو ئەسپەی لەژێر تۆ دایە، هی من بوو. ئێستا دەمهەوێ بزانم ئەوە چۆناوچۆن کەوتووەتە دەست تۆ؟' کانەماکان گوتی: 'ئەو ئەسپە هی زاتوددەوایی بکوژی نوعمانپاشای باپیرم و شەرکانپاشای ماممە کە زاتوددەوایی پێی دەچوو بۆ لای ساسانشا.' گەوهەرداش گوتی: 'بۆ ئەتۆ کێی؟' گوتی: 'من کانەماکانی کوڕی زەوئولمەکانی کوڕی نوعمانپاشام.' گەوهەرداش کە ئەوەی بیست گوتی: 'بە ئازایەتی و خوێنشیرینییەکەتدا لەوە دەچێ ڕاست بکەی. بەڵام مەترسە و بە ئاسوودەی بڕۆ، چونکە بابت پیاوێکی خاوەن چاکە و چاکەپیشە بوو.' کانەماکان گوتی: 'گوێلک، بەو قسانە لە بەرچاوی من گەورە نابی.' ئیدی گەوهەرداش تووڕه بوو، هێرشی کردە سەر کانەماکان و تێک بەربوون. بە گورز وایان لێک دەدا، سەیر. دەنگی زەبری گورزەکان وا بوو دەتگوت ئاسمان دەڕووخێ. دوایی بە ڕمب و نێزە کەوتنە گیانی یەکتر. گەوهەرداش نێزەیەکی تێ گرت. کانەماکان گورج دانەوی و نێزەکە نەیگرت. ئینجا کانەماکان نێزەیەکی لە سینگی گەوهەرداش گرت کە نێزەکە لە بڕبڕەی پشتی هاتە دەرێ. ئیتر کانەماکان فەرمانی بە غولامەکان دا مەڕ و ماڵات و پاتاڵیان کۆ کردەوە و ڕایان دان.

"لەو جەنگەیەدا سەباحی کوڕی ڕەماح لەسەر گردەکە هاتە خوارێ و سەری گەوهەرداشی بڕی. کانەماکان پێکەنی و گوتی: 'ئەوە چی دەکەی، سەباح؟ من وام دەزانی تۆ شەڕکەرێکی زۆر لێ هاتوو و نەترسی.' سەباح گوتی: 'گەورەم، ئەو کۆیلەیەی خۆت لە دەسکەوت بێبەش مەکە؛ بەشکو بە کچە مامەکەم بگەم.' کانەماکان گوتی: 'من لەو دەسکەوتە بەشت دەدەم، بەڵام تۆ چاودێری ئەو ماڵات و غولام و شتە بکە.' کانەماکان بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ. "کاتێک لە بەغدا نیزیک بوونەوە، سوپای بەغدا ئاگاداری هاتنەوەی کانەماکان و هێنانی ئەو گشتە دەسکەوتە بوون و سەری گەوهەرداشیان بەسەر نێزەی سەباحەوە دیت. بازرگانەکان سەری گەوهەرداشیان ناسییەوە و خۆشحاڵ بوون لەوەی کە خودا خەڵکی لە دەست ئەو ڕزگار کرد و دەستخۆشیان لە کانەماکان کرد. خەڵکی بەغدا کانەماکانیان لە ڕووداوەکانی وەزیر دەندان و ساسانشا ئاگادار کردەوە. ئیدی ماڵەکەیان لێ خوڕی هەتا بەردەرگای کۆشک و سەری گەوهەرداشی بە زەویدا دا. ئەسپ و وشترێکی زۆر بە دیاری دا بە گەورە گەورەکانی بەغدا. خەڵکی بەغدا زۆر هۆگری ئەو بوون. پاشان ڕووی لە سەباح کرد و پلە و پایەی بەرز کردەوە. دوای ئەوە هەستا چوو بۆ لای دایکی و ئەوەی لەو گەشتەدا تووشی ببوو یان بە سەری هاتبوو، بۆ دایکی گێڕاوە. ساسانپاشاش ئاگای لە هەموو شتێک بوو. ئیدی ساسانشا هەستا چووە دیوێکی تایبەت

و چۆڵەوە و ڕاوێژکار و پیاوماقوڵانی خۆی بانگ کردن و گوتی: 'دەمەوێ باسی نهێنییەکی خۆمتان بۆ بکەم. ئێوە ئاگادار بن کانەماکان دەبێتە هۆی تێداچوونی من. خۆ ئاگاداری ئەوە هەن کە ئەو گەوهەرداشی کوشتووە. هەرچەندە هۆزگەلێکی زۆری تورک و کوردی لەگەڵ بوو. ئاگاداری ئەوەش هەن کە وەزیر دەندان کردوویەتی و دەیکا و ئەو چاکەیەی منی لە بیر کرد و بێبەڵێن بوو. بیستوومە کە سوپایەکی زۆری کۆ کردووەتەوە و بە تەمایە کانەماکان لە جێی من بکاتە پاشا. ئەگەر ئەویش ببێتە پاشا، ناچار دەبێ من بکوژێ.' کە گەورە گەورەکانی ئامادەبوو لەو کۆڕەدا گوێیان لەو قسەیە بوو، گوتیان: 'پاشای مەزن، ئێمە دەزانین ئەو پەروەردەی دەستی تۆیە، ئاگاداریشین کە تۆ ئەوت پەروەدە کردووە، بۆیە چووین بۆ لای دەنا هەر لە ژێر ئەمر و فەرمانی تۆ داین کەس لەژێر فەرمانی تۆ ناچێتە دەرێ. ئێستاش ئەگەر بتەوێ بیکوژی، ئێمە دەیکوژین. ئەگەر پێت خۆشە دووری خەیتەوە، دووری دەخەینەوە.'

"کاتێک پاشا قسەکانی ئەوانی بیست، گوتی: 'کوشتنەکەی باشترە، بەڵام دەبێ لەپێشدا لەگەڵ ئێوە پەیمانێک دابنێم و بەڵێنتان لێ بستێنم.' ئەوان سوێندیان خوارد و لە نێو خۆیاندا پەیمانیان بەست. پاشا زۆری ڕێز لێ گرتن و بەڵێنی زێڕ وماڵێکی زۆری پێ دان. دوای ئەوە هەستا و هاتەوە ماڵێ و قەزافەکانی لەو پەیمانە ئاگادار کردەوە. قەزافەکان زۆر نارەحەت بوو، سەعدانەی پیرێژنی بانگ کرد هەتا بینێرێ بۆ لای کانەفەکان و ئاگاداری کاتەوە کە پاشا بە تەمایە چ بکا. ئیدی پیرێژنە چوو بۆ لای کانەماکان و سڵاوی لێ کرد. کانەماکان بە دیتنی پیرێژنە خۆشحاڵ بوو. پیرێژنە هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند. کە کانەماکان بەوەی زانی، بە پیرێژنەی گوت: 'سڵاوی ئامۆزاکەم بگەیەنە و پێشی بڵێ ملکی خۆیەتی، خودا کێی پێ باش بێ دەیداتە دەستی، با ئەو نیگەران نەبێ. شاعیر لێرە جوانی گوتووە کە دەڵێ:

ڕێکخەری کاران، کاران ڕێک دەخا
چۆنی پێ خۆش بێ، ئاوای لێ دەکا
من کۆیلە و بەندە و فەرمانبەرداریم
ئەو چی پێ باش بێ، گوێ بە فەرمانیم
کەسێک لە نەبوون شتێ بێنێتە بوون
ئەگەر پێی خۆش بێ، دەیکا سەرنگوون
پشت بەو دەبەستم، حەقم بستێنێ
شا نەبێ شێر بێ، تێکی دەشکێنێ

"ئیدی پیرێژنە گەڕاوە و وەڵامەکەی کانەماکانی بۆ کچە مامەکەی گێڕاوە.

"دوای ئەوە ساسان شا چاوەڕوان بوو هەر کاتێک کە کانەماکان ویستی لە شار بچێتە دەرێ، چەند ســـوارێک بۆ کوشـــتنی دانێ. بە ڕێکەوت کانەماکان بۆ ڕاو چووە دەرێ و سەباحی ڕەوەندەشی لەگەڵ خۆی برد، چونکە شەو و ڕۆژ لێی دوور نەدەکەوتەوە. وا بوو کانەماکان دە دانە ئاســـکی ڕاو کرد، لەنێو ئاســـکەکاندا دەنکێکی چاوڕەشـــیان تێدا بوو، بە چەپ و ڕاســـتدا دەیڕوانی. کانەماکان ئەوی بەڕەڵا کرد. ســـەباحی ڕەوەندە گوتی: 'ئەوە بۆ ئەوەت بەڕەڵا کرد؟' کانەماکان پێکەنی و ئەوانی دیکەشـــی بەڕەڵا کرد و بە ســـەباحی گوت: 'بەرەڵاکردنی ئاســـکێکی کە بەچکەی هەیە، کارێکی جوامێرانە و ئازایانەیە. ئەو مامزە کە ئاوا چاوەچاوی دەکرد، بەچکەی هەبوو. بۆیە منیش بەرەڵام کرد. ئەوەی دیکەشـــم هەر لەبەر ئەو بەرەڵا کرد.' سەباح گوتی: 'ئەمنیش ئازاد کە با بچمە لای بێچووەکانم.' کانەماکان پێکەنی و قونە ڕمبێکی لێ دا. کەچی ئەو بە زەویدا کەوت و وەک مار لە خۆی ئاڵا. هێشـــتا ئەو هەڵنەستابووەوە تەپوتۆزێک پەیدا بوو، کۆمەڵێک سوارچاکی ئازا و چالاک بوون. گوایە پاشـــا بیســـتبوویەوە، کانەماکان چووەتە ڕاو. ئەویش فەرماندەیەکی دەیلەمیەکان کە ناوی جامیع بوو، لەگەڵ بیست سواری ئازا و نەترس ناردبوو تا کانەماکان بکوژن. زێڕ و ماڵێکی زۆریشـــی دابوویێ. کە نیزیک بوونەوە و هێرشـــیان کردە ســـەر کانەماکان، ئەویش دەســـتی لێ کردنەوە و هەموویانی کوشت. لەو جەنگەیەدا ساسان‌شا بە سواری گەیشتێ و سەیری کرد ئەوە هەموو ســـوارەکان کوژراون. ترســـا و گەڕاوە. خەڵکی ئەو ناوچەیە کە زانیان، گرتیان و توند بەستیانەوە.

"دوای ئەوە کانەماکان لەگەڵ ســـەباحی ڕەوەندە ڕۆیشـــتن. هەر وا دەڕۆیشـــتن لە ڕێگەدا گەنجێکیان دیت لە بەردەرگایەک ڕاوەستابوو. کانەماکان سڵاوی لێ کرد. گەنجەکە وەڵامی ســـڵاوەکەی ســـەندەوە. دوای ئەوە چووە ژوورێ، پاش ئیســـتێک هاتەوە دەرێ. دوو قاپی لەگەڵ خۆیدا هێنا. یەکیان شـــیر بوو، ئەوەی دیکەیان گۆش و شـــت بوو. کاســـەکەی لەپێش دانان و تکای لێ کردن بخۆن. کانەماکان نەیخوارد. لاوەکە گوتی: 'ئەوە بۆ ناخۆی؟' گوتی: 'بەڵێنم داوە' لاوەکە پرســـی: 'بۆ بەڵێنت داوە نەخۆی؟' وەڵامی داوە: 'ساســـان‌شـــا وڵاتەکەی لێ داگیر کردووم. ئەو وڵاتە هی باوک و باپیری من بووە. کە باوکم مرد، من منداڵ بووم. منی لە دەســـەڵات خســـت و بۆخۆی لە جێگاکەی من دانیشـــت. ئیدی منیش بەڵێنم داوە هەتا تۆڵەی خۆم لە نەیـــارم نەکەمەوە، نـــانی کەس نـــاخۆم.' گەنجەکە گوتی: 'مزگێنیم دەیە، بەڵێنەکەت بردۆتە سەر. ئەوە دژمنەکەت لە بەندداییە. بەڵام پێم وایە جارێ زووە بۆ مردن.' کـــانەمـــاکـــان گوتی: 'لەکوێ لە بەنـــدداییە؟' لاوەکە گوتی: 'لەنێو ئەو گومەزە بڵنـــدەدایە.' کانەماکان ســـەیری کرد ئەوە هەر خەڵکە دەچێتە ژوورێ بە چەپۆک پێیدا دەدەن و تف و لەعنەتی دەکەن.

"کانەماکان چووە نیزیک دیوەکە و چاوێکی لێ کرد و گەڕاوە خواردنەکە بخوا. کەمێکی

شـیر و شـت خوارد، بەلام گۆشـتەکەی لە پەڕۆیەدا هەڵگرت کە خوانی لەسـەر خوارد و دانیشـت هەتا شـەو تەواو درەنگ بوو. لاوە خاوەنماڵەکە خەوی لێ کەوت. ئینجا هەسـتا چوو بۆ لای گومەزەکە، سەگەل لە دەوری گومەزەکە پاسیان دەکرد و دەوەڕین. کە چووە پێشـتر سـەگێک بۆی هات خێرا پلە گۆشـتێکی بۆ هاویشـت بەو جۆرە هەر سـەگ هات و کەمێکی گۆشت بۆ هاویشت تا هەمووی بێدەنگ کردن. هەتا گەیشتە بەر دەرگای دیوەکە و چووە لای ساسان شا. دەستی لەسەر سەری دانا. ساسان بەدەنگێکی بەرز گوتی: 'کێی؟' کانەماکان گوتی: 'کانەماکانم، هەر ئەوەی ئێوارە ویسـتت بیکوژی و خودا تۆڵەی منی لێ کردیتەوە. وڵاتی باوک و باپیرمت لێ داگیر کردم و، تێرت نەخوارد ویسـتت بشـمکوژی؟' ساسـان‌شـا بە درۆ سـوێندی خوارد کە نەیویسـتووە بیکوژێ و ئەو قسـەیەی بیسـتووتە درۆیە. کانەمـاکـان لێی خۆش بوو، گوتی: 'بەدوای مندا وەرە.' گوتی: 'هێزی پێم نییە و ناتوانم بڕۆم.' ئیدی کانەماکان لە پاشکۆی خۆی سواری کرد و هەتا بەری بەیانی ڕۆیشتن. لەگەڵ ڕۆژ دیاری دا، نوێژەکەیان کرد و ڕۆیشـتن هەتا گەیشـتنە باخێک لەوێ دانیشـتن و دەستیان کرد بە قسەکردن. لە کۆتایدا کانەماکان لێی پرسی: 'گلەیت لە من ماوە؟' ساسان گوتی: 'نا وەڵلا.' ئیتر ڕێک کەوتن بگەڕێنەوە بۆ بەغدا. سـەباحی ڕەوەندە گوتی: 'ئەمن لەپێشـدا دەچمەوە خەڵک ئاگادار دەکەمەوە و مزگێنی هاتنەوەتانیان دەدەمێ.' ئەویان ناردەوە. سەباحیش چوو ژن و پیاوی ئاگادار کردەوە و مژدەی دانێ. خەڵکیش بە دەف و شمشاڵ و زوڕناوە هاتنە پێشوازیان و قەزافەکانیش وەک مانگ لە شـەوی تاریکدا وەدەر کەوت و درەوشـاوە. کانەماکان ئەوی دیت. هەردووکیان کە چاویان بە یەک کەوت، ئەوەندی دیکە شـەیدای یەک بوون. چاویان تێک بڕی بوو. لە شـاردا باس هەر باسـی ئازایەتی و جوامێری و خوێنشـیرنی کانەماکان بوو. دەیانگوت: 'ئێمە جگە کانەماکان پاشایەکمان نییە.'

"ساسان‌شا چووەوە لای نوزهەتوززەمان. نوزهەتوززەمان گوتی: 'لەنێو شار باس هەر باس و تاریفی کانەماکانە و بە شان و باهۆ و جوامێری و ئازایەتیدا هەڵدەڵێن.' پاشا گوتی: 'بیسـتن کوا وەک دیتنە. من بە چاوی خۆم دیتوومە و لەگەڵی بووم. ئەوەی جوامێری و ئازایەتی و نەترسـی بێ لەو کوڕەدا نەمدیتووە. خەڵک هەر ئەوەندە شـتێکیان کەوتە سـەر زار، ئیدی بە چاولێکەری هەر دەیڵێن و دەیڵێنەوە. لە خۆڕا تاریفی دەکەن. ئێستا لە شـاردا نـاوی دەرکردووە و لە دڵی خەڵکـدا جێی کردووەتەوە. وەزیر دەنـدانی هۆقەبـازی خەیانەتکاریش سـوپایەکی لەڕادەبەدەری لە شـارەکان کۆ کردووەتەوە بۆ پشـتیوانی لەو. ئێسـتا من چۆن دوای ماوەیەک پاشـایەتی ببمە ژێردەسـتی هەتیوێک؟' نوزهەتوززەمان گوتی: 'ئێستا بە تەمای چی بکەی؟' گوتی: 'هەڵوێستم گرتووە، بیکوژم. هەتا وەزیر دەندان بێ هیوا بێ و جگە لە من کەسـی دیکە شـک نەبا شـیاوی پاشـایەتی بێ. پاشـان ناچار

قەبووڵی بکا لە ژێر فەرمانی مندا بێ.' نوزهەتوززەمان گوتی: 'فێڵ لەگەڵ خەڵکی دیکەش باش نییە. چۆن تۆ دەتوانی لەگەڵ خزم و کەسـدا وا بکەی؟! وا چاکە قەزافەکانی لێ مارەکەی و بیدەیتێ و ئەو قسەیەی پێشینیان لە بەرچاو گری کە دەڵێن:

ئەوەی بە چـاکە دەکـرێ قەت بە شـیـر نەکـراوە
پشـت لە خـراپە بـکە و ئـاوڕێـک بـدەرەوە دواوە
کـێـوی بە تـونـد و تـیـژی، بەرەو نەیـاریـان دەڕۆن
مرۆڤی ژیر بە قسـەی خۆش، بەرد دەکـا بە مێووڕۆن
چـاکە کـاران لە نـێـو خەڵـک ڕێـز و ڕوومەتـیـان هەیە
ئەوەی خـائـیـن و پـیـسـە، هەمـیشـە لە دواوەیە

"سـاسـانشـا کە لە پەیامی شـیعرەکە گەیشـت، تووڕە بوو هەسـتا و گوتی: 'ئەگەر نەمزانیبا بۆ گاڵتە ئەو قسەیە دەکەی، دەمکوشتی.' نوزهەتوززەمان گوتی: 'چونکە تۆ لە من تووڕە بووی، منیش گاڵتەم لەگەڵ کرد.' ئیدی هەستا و سەر و دەستی پاشای ماچ کرد و گوتی: 'فکری چاکە، زوو کە با پێکەوە پیلانێکی بۆ داڕێژین و بیکوژین.' کە ساسانشا ئەو قسـەیەی لە نوزهەتوززەمان بیسـت، دڵی خۆش بوو. گوتی: 'خێرا فێڵێک ببینەوە و لەو نارەحەتییە ڕزگارم کە. من هیچ فێڵ و دەهۆیەکم بە زەیندا نایە.' نوزهەتوززەمان گوتی: 'خەمت نەبێ زوو ڕێگایەکی بۆ دەدۆزمەوە و دەیکوژم.' سـاسـانشـا گوتی: 'چۆن دەیکوژی؟' گوتی: 'کەنیزێک هەیە بە ناوی 'باکوون،' بەو دەڵێم. ئەو بۆخۆی خوای فرۆفێڵە.'

"ئەو کەنیزە پیس و گلاوترین پیرێژنی ڕۆژگار بوو، زاتێکی ناپاکی هەبوو. کانەماکان و قەزافەکان ئەو پەروەردەی کردبوون. کانەماکان زۆر هۆگری ئەو بوو، تەنانەت لەژێر پێی ئەودا دەخەوت.

"کاتێک سـاسـانشـا ئەوەی بیسـت، ئەو بیرۆکەیەی زۆر بەدڵ بوو. فەرمانی دا ئەو کەنیزەیان هێنا و شـتەکەیان بۆ گێڕاوە و ئەویش قەبووڵی کرد. ڕازی بوو نەخشـەکە جێبەجێ بکا. گوتی: 'بەڵام من خەنجەرێکم دەوێ کە دەمەکەی بە ژەهر ئاو درابێ هەتا زووتر کاری تێ بکا.' پاشـا پێی گوت: 'ئافەرین' و خێرا خەنجەرەیان بۆ پەیدا کرد و هێنایان. ئەو کەنیزە چیرۆک و بەسەرهاتی سەیر و سەمەرەی زۆری لەو بارەوە بیستبوو. ئیدی دەسـتی دا خەنجەر و لە ماڵ چووە دەرێ و کەوتە بیری چۆنکوشـتنی کانەماکان. هەتا هاتە لای کانەماکان کە چاوەڕێی دیداری قەزافەکان بوو. سـەیری کرد ئەوە پیرێژن وەدەر کەوت و لە بەر خۆیە دەڵێ: 'سـەردەمی دووری تەواو بوو، کاتی پێکگەیشـتن نیزیک بووەتەوە و ئیدی دووری و جودای بەسـە.' کە کانەماکان ئەو قسـەیەی بیسـت، پێی گوت:

'پێم بڵێ، قەزافەکـان چۆنە؟' بـاکوونی گڵاو گوتی: 'جـا چۆن بێ، ئەوە لە تـاوی تۆ دڵی دەتۆقێ. ناوی تۆ بووەتە وێردی زمانی.' کانەماکان جلەکانی بەری بە خەڵات دایە و بەڵێنی زێڕ و ماڵیشی دایە. ئەو گڵاوە گوتی: 'ئەمشەو من لە لای تۆ دەخەوم و هێندێک چیرۆک و بەســـەرهاتی ئەویندارێت بۆ دەگێڕمەوە.' کانەماکان گوتی: 'چیرۆکێکی وام بۆ بگێڕەوە خەم لە دڵمدا نەهێڵێ و خۆشحاڵم بکا.' باکوون دانیشت و خەنجەرەکەش لە باخەڵیدا بوو. گوتی: 'ئەو قسە و چیرۆکە خۆشەی بە تەمام بۆت بگێڕمەوە، ئەمەیە:

## چیرۆکی ئەو عاشقەی حەشیشی کێشابوو

" 'پیاوێک بوو زۆر جوانپەرست بوو. هەمیشــە بە دوای جوانانەوە بوو. ماڵی بۆ خەرج دەکردن هەتا وای لێ هات هیچی نەما و تەنگی پێ هەڵچنرا. لە بازارەکاندا دەســـووڕاوە بۆ ئەوەی شـــتێک پەیدا بکا، پێی بژی و نەمرێ. ڕۆژێک لە پڕدا بزمارێک لە قامکی ڕاچوو، خوێنی لێ هات. خوێنەکەی ســـڕی و بە پەڕۆیەک بەســـتی. دوای ئەوە هەســـتا چوو بۆ گەرماو. جلەکانی داکەند و چووە ژوورێ و لە پەنا حەوزی ئاوە گەرمەکەوە دانیشت. هەر ئاوی بە سەری دا کرد هەتا وای لێ هات پێی نارەحەت بوو.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سەد و چل و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'ئەو کابرایە ئەوەندەی ئاوی گەرم بە سەریدا کرد هەتا حاڵی تێک چوو. ئیدی هاتە لای ئاوە ساردەکە. کەسی لێ نەبوو. کەمێکی حەشیش دیتەوە لە پەنایەکدا لە زاری هاویشت و قووتی دا. حەشیش کاری لە مێشکی کرد. لەسەر ئەو بەردانە دەتلاوە و لای وا بوو کە مامۆستای دەللاکەکان خەریکە دایدەماڵێ و دوو کۆیلەش لەسەر سەری ڕاوەستاون. یەکیان جامێکی بە دەستەوەیە و یەکیشان کیسە و لفکە و شتی پێیە.

" 'کە ئەوانەی دیت، لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەوانە بە هەڵە لەدەوری من کۆ بوونەتەوە.' ئیدی پێکەنی و لاقی ڕاکێشا. دوایی لای وا بوو، دەللاک پێی دەڵێ: 'گەورەم، کاتێتی بڕۆیتە دەر.' ئیدی پێکەنی و گوتی: 'مەشەڵڵا لەو حەشیشە.' دوای ئەوە دەللاکەکە هەستا و دەستی گرت و فۆتەیەکی حەریری ڕەشی لەناو قەدی بەست و کۆیلەکان بە قاپ و جامەوە بەدوایدا هاتن هەتا بردیانە دیوێکی دیکەوە و بوخور لەسەر ئاور بوو، لە هەموو جۆرە میوە و بۆنێکیشی لێ داندرابوو. کاڵەکێکیان بۆ قاش کرد. لەسەر کورسییەکی ئاونووسیان دانا. دەللاک دەستی کرد بە شوشتنی و کۆیلەکانیش ئاویان پێدا دەکرد. دوای ئەوە جوان شێلایان و پاشان بە تەنیا لەو دیوە بەجێیان هێشت و هاتنە دەرێ.

" 'کاتێک بە هۆی کاریگەری بەنگەکەوە خەیاڵی بێرە گەیشت، هەستا و فۆتەکەی لە خۆی کردەوە و ئەوەندە پێکەنی هەتا کەوت. دوای ئەوە لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەوە چۆناوچۆنە وەک وەزیر دەڕواننە من و ناوم دێنن یان پێیانگوتم مەولانا ساحیب؟ ڕەنگە ئێستا لێیان تێک چوو بێ و وەک ئەوان هاتبمە بەر چاویان. دوایی دەمناسنەوە چ بەڕەڵایەکم و بەر شەق و زللەم دەدەن.' ئینجا هەستا چووە ناو ئاوە گەرمەکەوە و هاتە دەرێ، وای هاتە بەرچاو کۆیلە گچکە و خەسێنراوەکان هاتوونە لای و بوخچەیەکیان بۆ هێناوە سێ فۆتەی حەریری تێدایە. یەکیان لە سەری بەست و یەکیان بە شانیدا دا و سێیەمینیان لە ناوقەدی بەست. خەساوەکان کەوشیان هێنا و کەوشی لە پێ کرد. خەساو و کۆیلەکان دەستیان گرت و هێنایانە دەرێ. ئەویش بەردەوام بزەی لەسەر لێو بوو. لەسەر سەکۆی گەرماوەکە کە فەرشی شایانەیان بۆ ڕاخستبوو، دانیشت. کۆیلەکان تێی ئاڵان و دەستیان کرد بە شێلانی هەتا خەوی لێ کەوت. لە خەونیدا کچێکی لە باوەشدا بوو، ماچی دەکرد و لەنێو لینگیدا دانیشتبوو. سیرەتی خستە سەر لەپی دەستی و کچەی کێشا پێشێ و سواری سەری بوو کە لە ناکاو بانگیان کرد: 'هەستە بەنگی هیچوپووچ! ئەوە بۆ بەو نیوەڕۆیە تۆ هەر خەوتووی.' کە چاوی هەڵێنا لە نێوەڕاستی حەوزی ئاوە ساردەکەدا بوو بەبێ فۆتە و کێری ڕەپ ببوو. خەڵک تێی ئاڵا بوون و پێی پێدەکەنین. ئیدی زانی

تەواوی ئەوانە هەر خەون و خەیاڵ و کاری بەنگەکە بووە. نارەحەت بوو. خەڵک پێیان گوت: 'بەنگی گلاو، تۆ شـــەرم ناکەی ئاوا خەوتووی؟' ئیدی ئەوەندەیان بە زللە و چەپۆک لێ دا هەتا تەواوی گیانی سوور هەڵگەڕا. لە برسانیش خەریک بوو بمرێ.'

"کانەماکان کە ئەو چیرۆکەی بیست، ئەوەندە پێکەنی خەریک بوو بە پشتدا بکەوێ. بە باکوونی گوت: 'دایە، چیرۆکێکی خۆش بوو. من چیرۆکی ئاوام نەبیستبوو. ئەی بێجگە لەوە هی دیکەش دەزانی؟' کەنیزە پیرە گوتی: 'بەڵێ، دەزانم.'

"ئەم جارە چیرۆکی غەوارە و گەپجارە ناوازەکانی بۆ گێڕاوە هەتا کانەماکان خەوی لێ کەوت. کەنیزە لە خوار ئەوەوە دانیشتبوو کە شەو خەریک بوو لە نیوە لا بدا. کەنیزەکە لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئێستا دەرفەتی چاکە.' هەستا و خەنجەری دەرهێنا و ویستی بیکوژێ کە دایکی کانەماکان لە پڕدا پەیدا بوو. کە باکوون ئەوی دیت، لە بەری هەســـتا و بە پیرییەوە چوو. ترسا و دەستی کرد بە لەرزین گۆیا تایەتی. کە دایکی کانەماکان ئەوی ئاوا دیت، پێی سـەیر بوو و خێرا هەڵیساند. کە بە ئاگا هات، دایکی لەپشـت سـەری بوو. هۆی هاتنەکەی دایکیشـــی ئەوە بوو کە قەزافەکان بیســـتوویەتی ڕێک کەوتوون لەســـەر ئەوەی کانەماکان بکوژن. ئیدی بە دایکی گوتبوو: 'فریا کەوە، پێش ئەوەی باکوون کوڕەکەت بکوژێ خۆتی بگەیەنی.' دایک هەڵدێ و خۆی دەگەیێنێ. کە گەیشتێ لەو جەگەیەدا کانەماکان خەوتبوو، باکوونیش بە تەما بوو بیکوژێ. ئیدی دایکی هەڵیســـاند، کانەماکان گوتی: 'کاتێکی باش هاتی، ئەوە دایە باکوونیش لێرەیە.' ئیدی ڕووی لە باکوون کرد و گوتی: 'ئەگەر چیرۆکێکی خۆشـــتر دەزانی، بۆمان بیگێڕەوە.' باکوون گوتی: 'ئەو چیرۆکەی بۆم گوتی لە کوێ و ئەوەی قەرارە بیڵێم لە کوێ؟! ئەوەی بۆتان دەڵێم زۆر لەوە خۆشـتر و بە تامترە. بەڵام لە کاتێکی دیکەدا دەیگێڕمەوە.' ئیدی باکوون هەســـتا بڕوا، بە تەما نەبوو ڕزگاری بێ، چونکە دەیزانی دایکی کانەماکان بە زۆر شـــت دەزانێ. هەر بۆیە ماڵاوای لە کانەماکان کرد و ڕۆیشت.

"ئینجا دایکی کانەماکان گوتی: 'ئەمشـــەو شـــەوێکی پیرۆزە، چونکە خوا تۆی لە مردن ڕزگار کرد.' ئیدی گەلاڵەی کوشتنەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتای بۆ گێڕاوە. کانەماکان گوتی: 'ئەوەی خوا نەیکوژێ، بە کەس نـامرێ. بەڵام وا چاکە ئێمە لەنێو دژمنـانـدا نەمێنینەوە و بڕۆینە دەرێ.' هەر بۆیە کە ڕۆژ بووەوە، کانەماکان لە شـــار چووە دەرێ و چوو خۆی گەیاندە وەزیر دەندان.

"دوای ئەوە کێشە کەوتە نێوان ساسان‌شا و نوزهەتوززەمان و ئەویش لە شار وەدەر کەوت و چووە لای ئەوان. بەدوای ئەودا گەورە گەورەکانی وڵات تەواوی لە شـــار چوونە دەرێ و چوونە پاڵ وەزیر دەندان و ئەوان.

"پاشان کۆ بوونەوە و ڕاوڕاوێژیان کرد و هەموویان هاتنە سەر ئەو باوەڕەی بەسەر ڕۆمییاندا دەن و تۆڵەی خوێنی نوعمانپاشا و شەرکانپاشا بکەنەوە.

"وا بوو چوون بۆ شەڕی ڕۆمییان و دوای هێندێک بەسەرهات کە ڕەنگە زۆر درێژە بکێشێ، موسوڵمانان بە دەستی زومرانپاشا، پاشای ڕۆم، بە دیل گیران. ڕۆژێکی بەیانییەکەی زومرانپاشا فەرمانی دا هەتا کانەماکان و وەزیر دەندان و هاوڕێکانی بێنن. کە ئەوانیان هێنا، زومرانپاشا ئەوانی لە پەنا خۆی دانان و بە فەرمانی ئەو لەو سەر بۆ ئەو سەر سفرە ڕاخرا و خواردەمەنیان دانا. ئامادەبووان خواردنیان خوارد. لە کوژران ڕزگاریان بوو. لەپێشدا بە یەکتریان دەگوت: 'بۆیە ئێمەی کۆ کردووەتەوە تا بمانکوژێ.'

"ئینجا پاشا گوتی: 'خەونێکم دیوە کە بۆ ڕاهیبەکانم گێڕاوە، گوتیان: 'جگە لە وەزیر دەندان، کەس ناتوانێ لێکی داتەوە.' وەزیر دەندان گوتی: 'ئەی پاشای جیهان، خێر دەبێ ئیشەڵڵا. بفەرموو لە خزمەتتدام.' پاشا گوتی: 'لە خەونمدا بوو لە چاڵێکدا بووم و تاقمێک خەریکی ئازاری من بوون. ویستم هەستم. کە هەستام، کەوتمەوە و نەمدەتوانی لەو چاڵە بێمە دەرێ. دوای ئەوە چاوم گێڕا لەو چاڵەدا پشتێنەیەکی زێڕینم دیت. دەستم کێشا پشتێنەکەم هەگرت، دیتم دوو دانەن. بەدوای یەکدا دوو پشتێنەکەم بەست. دیتم لە ناکاو بوون بە یەک. وەزیر، ئەوە بوو خەونەکەم.'

"وەزیر دەندان گوتی: 'شای شایان، ئاگادار بە کە تۆ بە دیداری برایەک، برازایەک، ئامۆزایەک یان کەسێک لە خزم و کەسانت کە لە خوێن و گۆشتی تۆیە، شاد دەبی.'

"کاتێک پاشا ئەوەی بیست، چاوێکی لە کانەماکان و نوزهەتوززەمان و قەزافەکان و وەزیر دەندان و دیلەکانی دیکەی کە لەگەڵیان بوون، کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر من ئەوانە بکوژم، ڕۆحیەی سوپاکەیان تێک دەشکێ و من زۆر زوو دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم و وڵاتەکەشم لە دەست دەرناچێ. ئیدی هەر کە ئەو بیرەی بە مێشکدا هات، فەرمانی دا میرغەزەب هات. ئەمری بە میرغەزەب کرد کانەماکان بکوژێ. لەو جەنگەیەدا دایەنی پاشا هات و گوتی: 'پاشای جیهان، ئەوە بە تەمای چی بکەی؟' گوتی: 'بە تام ئەو دیلانە بکوژم و سەرەکەیان فڕێ دەدەم بۆ هاوڕێکانیان. دوای ئەوە بە سوپاوە هێرش بکەمە سەریان. ئەوەی کوشتمان دەکوژرێ و ئەوەی هەڵاتیش هەڵدێ. ئەوە دوایین شەڕی نێوانی ئێمە و موسوڵمانان دەبێ. دوای ئەوە زوو دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان هەتا لەمەو دوا شتی وا لە وڵاتەکەمدا ڕوو نەدا.' کە ئەوەی بیست، ڕووی لەو کرد و بە زمانی ڕۆمییان پێی گوت: 'چۆن ڕێ بە خۆت دەدەی برازا و خوشک و خوشکەزای خۆت بکوژی؟' کە پاشا ئەو قسەیەی لە دایەنەکەی بیست، زۆر توورە بوو، ڕووی تێ کرد و گوتی: 'گڵاو، تۆ بە منت نەگوت کە دایکی تۆ کوژراوە و بابی تۆیان دەرمانخوارد کردووە و زێڕێکیشت

دامێ گوتت ئەوە هی باوکی تۆ بوو؟ بۆ جوان ڕاستییەکەم پێ ناڵێی؟'

"دایەنەکە گوتی: 'ئەوەی تا ئێستا پێم گوتووی هەمووی ڕاست بووە، بەڵام کارەکەی ئێمە تۆزێک پێچاوپێچە. ناوی من مەرجانەیە و ناوی دایکی تۆ شازادە ئەبریزەیە کە خاوەن جوانی و ڕەوشتبەرزی و ئازایەتی بوو. باوکی تۆ نوعمانپاشاە، پاشای بەغدا و خوراسان بوو کە کوڕەکەی خۆی لەگەڵ ئەو وەزیر دەندانەدا ناردبوو بۆ شەڕ. براکەی تۆ، شەرکانپاشا، لە سوپا دادەبڕێ و ڕێی دەکەوێتە کۆشکی دایکی تۆ، واتە شازادە ئەبریزە. ئێمە کەنیزەکان لەگەڵ دایکت لە شوێنێکی چۆڵ خەریک بووین زۆرانمان دەگرت. شەرکانپاشا لەو جەنگەیەدا هات و لەگەڵ دایکت زۆرانیان گرت. چونکە سیمایەکی جوان و ئازایەتییەکی بەرچاوی هەبوو، توانی بەسەر دایکتدا زاڵ بێ. ئیدی دایکت پێنج ڕۆژان لە کۆشکەکەی خۆی میوانداری کرد. زاتوددەوایی پیرەژن باوکی دایکت، واتە پاشا حەردووبی ئاگادار کردەوە. دایکت لەسەر دەستی شەرکان بوو بە موسوڵمان و شەرکانی ئەوی لەگەڵ خۆی برد بۆ شاری بەغدا. من و ڕێحانە و چەند کەنیزی دیکەش لەگەڵی چووین. هەموومان بووینە موسوڵمان. کاتێک نوعمانپاشای باوکی تۆ شازادە ئەبریزی دیت، عاشقی بوو. شەوێکی دەچێتە لای و بە تۆ دووگیان دەبێ. دایکت سێ دانە گەوهەری هەبوو کە پێشکەشی پاشای کردن. پاشا یەکیانی دا بە نوزهەتوززەمان و یەکی دا بە زەوئولمەکان و سێیەمیشی دا بە شەرکانی برات. شازادە ئەبریز ئەو گەوهەرەی لە شەرکان وەرگرت و لە لای خۆی ڕایگرت. کاتێک شازادە ویستی منداڵەکەی ببێ، واتە تۆ، بیری خزم و کەسانی دەکرد و لە لای من درکاندی. من کۆیلەیەکی ڕەشم پەیدا کرد و ئاگادارم کرد کە بە تەمای چین و بەڵێنی زێڕ و ماڵێکی زۆرم پێ دا. هەتا لەو سەفەرەدا لەگەڵمان بێ و بەڕێمان کا. ئەو کۆیلەیە ناوی غەزبان بوو، ڕازی بوو لەگەڵمان بێ. وا بوو لە شار هاتینە دەرێ و هەڵاتین. کاتێک گەیشتینە وڵاتی ڕۆم. کاتی لەدایکبوونی تۆ هات و دایکت ژانی هاتێ. لە ئەسپەکان دابەزین. لەو جەنگەیەدا غوڵامە زەوقی هەستا و چووە دەستەی دایکت و داوای لێ کرد. ئیدی دایکت بە هەموو هێزی خۆی بە سەریدا قیژاند و لەبەر ناڕەحەتی دەلەرزی بەو گوشارە تۆ لە دایک بووی. لەو کاتەشدا تۆزوخۆڵێکی زۆر بەری ئاسمانی گرت. کۆیلەکە لە کوشتنی خۆی دەترسا، هەڵیکێشا شیر و دایکتی کوشت و هەڵات. کە ئەو هەڵات و سوارەکان گەیشتنێ و تۆز و خۆڵ نیشتەوە، باوەگەورەی تۆ، حەردووبپاشا پاشای ڕۆم، گەیشتێ. کە نیزیک بووەوە، کچەکەی خۆی لەوێ بە کوژراوی دیت. زۆر ناڕەحەت بوو. هۆی هاتنەدەری شازادەی لە شار و هۆی کوژرانەکەی لە من پرسی. من ڕووداوەکەم لە سەرەتاوە تا کۆتای بۆ حەردووبپاشا گێڕاوە و پێم گوت هۆی دژمنایەتی ڕۆمییان و موسوڵمانان لە سەر ئەوەیە. دوای ئەوە دایکی تۆمان هێناوە لە کۆشکدا ناشتمان. منیش تۆم هەڵگرتەوە و گەورەم کردی. ئەو گەوهەرەی بە دایکت بو، بە

ملی تۆمدا کرد. کە تۆ گەورە بووی، ئیدی بوار نەبوو لەو ڕاستیانە ئاگادارت کەمەوە. چونکە ئەگەر ئەمن تۆم ئاگادار کردباوە، ئەوە لەنێوان ئێوەدا دەبوو بە شەڕ. باپیریشت پێی گوتبووم کە جارێ لە لای تۆ باسی نەکەم. وا بوو من نەمتوانی هەتا ئێستا ئەو بابەتەت بەو شێوەیە لەگەڵ باس بکەم. پاشای جیهان، ئەوەی پێویست بوو گوتم. ئێستا فەرمان فەرمانی تۆیە.'

"دیلەکان تەواوی ئەو قسانەیان بیست. ئینجا نوزهەتوززەمان یەک بە خۆی هاواری کرد و گوتی: 'یانی ئەو زومرانپاشاە لە بابەوە برای منە و کوڕی شازادە ئەبریزی کچی حەردووبپاشایە؟! ئەمن ئەو کەنیزە مەرجانە دەناسم.' کە زومرانپاشا ئەوەی بیست، سەری سووڕ ما و نوزهەتوززەمانی بانگ کردە لای خۆی. کە دیتی خوێنی برایەتی قڵپەی کرد و ڕووداوەکەی لێ پرسی.

"نوزهەتوززەمانیش تەواوی ئەو بەسەرهاتانەی بۆ گێڕاوە. قسەکانی ئەو لەگەڵ قسەکانی مەرجانە چ جیاوازیەکیان نەبوو. هەر بۆیە باوەڕی کرد کە پاشا خەڵکی عێراق و باوکیشی نوعمانپاشاە. گورج هەستا و دەستی نوزهەتوززەمانی خوشکی کردەوە و ماچی کرد. نوزهەتوززەمان دەستی کردە گریان و پاشاش بە گریانەکەی ئەو دەستی کردە گریان. ئیدی هەستا و دانەدانە دیلەکانی بانگ کردنە پێشێ و دەستی کردنەوە. لەو جەنگەیەدا مەرجانە چاوی بە یەکێک لە گەوهەرەکان کەوت کە لە لای کانەماکان بوو. ئیدی هاواری کرد و بە زومرانپاشای گوت: 'کوڕی خۆم، ئەوە بۆ پاڵپشتی ڕاستی قسەکانم نیشانەیەکی دیکەش پەیدا بوو. ئەو بازوبەندەی کە بە باسکی ئەو لاوەوەیە یەکێک لەو سێ گەوهەرەیە کە یەکیانیشم لە ملی تۆ کردبوو.'

"مەرجانە داوای لە کانەماکان کرد هەتا گەوهەرەکەی بداتێ. کانەماکان گەوهەرەکەی دایە. مەرجانە هەردوو گەوهەرەکەی لە پەنا یەک ڕاگرتن و نیشانی زومرانپاشای دان. گەوهەرەکان بە ڕاستی تای یەک بوون و ئەوەش ئەوەندەی دی ڕاستی قسەکەی مەرجانەی سەلماند. ئیدی پاشا زانی کە ئەو گەنجە، واتە کانەماکان، برازای خۆیەتی. ئیدی وەزیر دەندانی لە ئامێز گرت و تەوێڵی کانەماکانیشی ماچ کرد.

"ئەوە بوو دەستیان کرد بە تەپڵکوتان و گۆرانی و شادی و شمشاڵ لێدان. سوپای عێراق و شام ئاگایان لەو شای و شادییەی ڕۆمییەکان بوو. گورج سوار بوون و پاشا زەبەلکانیش سوار بوو و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'خۆزگە بمزانیبا هۆی ئەو شای و شادییەی سوپای ڕۆمی و فەرەنگیان چییە.' ئیدی عێراقی و شامییەکان خۆیان بۆ شەڕ ساز کرد و بۆ بەربەرەکانی وەڕێ کەوتن. زومرانپاشا زانی ئەوە سوپای عێراق و شام دێن بۆ شەڕ و ئاگایان لەو کەینوبەینە نییە. بە قەزافەکانی کچی نوزهەتوززەمانی خوشکی گوت کە

خێرا بچن سوپای عێراق و شام لەو بابەتە ئاگادار کاتەوە. قەزافەکان بە خۆشحاڵییەوە ڕۆیشت هەتا گەیشتە لای پاشا زەبەلکان و شتەکەی بۆ گێڕاوە. هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتاییەکەی بۆ شی کردەوە و ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو و خەمی لە دڵدا نەما.

"ئیدی قەزافەکان لەنواوە و پاشا زەبەلکان و گەورەکانی عێراق و شام لەدواوە هاتن هەتا گەیشتنە بارەگای زومرانپاشا. کە چوونە ناو بارەگاوە، سەیریان کرد ئەوە زومرانپاشا لەگەڵ برازاکەی خۆی و وەزیر دەندان دانیشتووە لە بارەی کاروباری پاشا زەبەلکانەوە ڕاوێژ دەکەن. هەمووشیان لەسەر ئەوە کۆکن کە دیمشق هەر وەک جاران بە پاشا زەبەلکان بسپێرن و بۆ خۆشیان بچن بۆ عێراق. ئیدی پاشا زەبەلکانیان لەگەڵ سوپاکەی ناردەوە بۆ دیمشق.

"ئەوان تەواوی سوپاکەیان یەک خست و زومرانپاشا و کانەماکانشا پێکەوە گوتیان: 'دڵی ئێمە ئەو کاتە دەحەسێتەوە و ڕقمان دەنیشێتەوە کە تۆڵەی خۆمان لە پیرێژنی کلکەنەفتینە، زاتوددەوایی، بکەینەوە.' دوای ئەوە وەڕێ کەوتن. کانەماکانشا بە دیداری مامی خۆی، زومرانپاشا، شاد بوو. نزای خێری بۆ مەرجانە دەکرد کە ئەوانی پێک ناساند. ئیدی ڕۆیشتن ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ئاخی وڵاتی عێراق. پەردەداری مەزن، ساسانشا، ئاگاداری هاتنەکەیان کرا. بە پێشوازیانەوە هات و دەستی زومرانپاشای ماچ کرد. پاشا خەڵاتی کرد. ئیدی زومرانپاشا لەسەر تەخت دانیشت و کانەماکانشای لە پەنا خۆی دانا. کانەماکان بە زومرانپاشای مامی گوت: 'ئەم وڵاتە جگە لە تۆ کەس شایانی ئەوە نییە بەسەریدا ڕابگا.' زومرانپاشا گوتی: 'خودا نەکا من تەماع لە وڵاتی تۆ بکەم!' لەو کاتەدا وەزیر دەندان گوتی: 'وا چاکە هەردووکتان پاشا بن و هەر ڕۆژەی یەکتان فەرمانڕەوا بن.' قسەکەی وەزیریان لا پەسند بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە شەوی سەد و چل و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەوان بە پێشنیاری وەزیر ڕازی بوون پێکەوە لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشن. جەژن و شادمانیان کرد و خەڵک و سوپا لێیان ڕازی و سپاسگوزار بوون. کانەماکانشا زەماوەندی کرد و شەوانە لەگەڵ ئامۆزاکەی ڕایاندەبوارد. پاش ماوەیەکی زۆر درەنگانێک تۆزێک هەستا. لە لایەن بازرگانەکانەوە کەسێک هات، هاواری کرد و گوتی: 'پاشای زەمان، چۆن دەبێ ماڵ و سامانی ئێمە لە وڵاتی کافران پارێزراو بێ، بەڵام لە وڵاتی موسوڵمانان بە تاڵانی بەرن؟' زومرانپاشا گوتی: 'پێم بڵێ چی بووە؟' بازرگان گوتی: 'من بیست ساڵە بە مەبەستی بازرگانی لە وڵات دوور کەوتوومەوە و لە وڵاتاندا دەگەڕێم. من دوو کتێبم لە دیمشقەوە هێناون کە شەرکانپاشا نووسیونی، هۆی نووسینی ئەو کتێبەش ئەوە بوو کە من کەنیزێکم بە دیاری دابوویە. ئێستا کە هاتوومە ئێرە، سەد بارم کاڵای هیندی هێناوە بۆ بەغدا. عەرەب و کورد پێکەوە هێرشیان کردە سەرمان و پیاوەکانیان کوشتین و ماڵەکەیان بە تاڵان برد. ئەوە بوو ئەو نسکۆیەی بە سەرمان هات.' ئیدی بازرگانەکە دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە و داوای یارمەتی کرد.

"زومرانپاشا و کانەماکانشا زگیان پێی سووتا، بە سەد سوارەوە کە هەر سوارێک بارتەقای هەزار سوار بووۆ بۆیان وەدەر کەوتن. بازرگان بۆ ڕێنوێنی پێشیان کەوت. ئەو ڕۆژ و شەویش هەتا لای بەیانی ڕۆیشتن. گەیشتنە دەشتێکی خۆش و سەرسەوز، سەیریان کرد ئەوە دزان لەو دەشتەدا بڵاو بوونەوە و کاڵا و شتومەکی بازرگانەکەشیان بڵاو کردووەوە. ئیدی بە سەد سوارەوە دەوریان دان و زومرانپاشا و کانەماکانشا هێرشیان کردنێ. ئەوەندەی نەخایاند هەموویان قۆڵبەست کردن. سێ سەد کەس لە چەتەی کورد و عەرەب بوون. ئینجا ماڵی بازرگانەکەیان هەموو سەندەوە و ڕێگرەکانیشیان قۆڵبەست کردن و بردیانن بۆ بەغدا.

"لە بەغدا زومرانپاشا و کانەماکانشا لەسەر تەخت دانیشتن و دزەکانیان هێنان و لێیان پرسین: 'سەرکردەکەتان کێیە؟' ئەوانیش گوتیان: 'سێ کەس ئێمەی لەو دەوروبەرە کۆ کردووەتەوە.' پێیان گوتن: 'ئەو سێ کەسەمان پێ بناسێنن.' وا بوو سێ کەسەکەیان پێ ناساندن. ئەوانیش سێ کەسەکەیان گرت و ئەوانی دیکەیان بەڕەڵا کرد. ماڵی بازرگانەکەشیان داوە. ئینجا بازرگانەکە دوو کتێبی دەرهێنا: یەکیان بە دەسنووسی شەرکان و ئەوی دیکەیان بە هی نوزهەتوززەمان. هەر ئەو بازرگانە نوزهەتوززەمانی کڕی بوو و دابووی بە شەرکانپاشا. کانەماکانشا دەسنووسی شەرکانپاشای مامی ناسییەوە و بەسەرهاتی نوزهەتوززەمانی پووری بیست. ئەو نووسراوەیەی کە نوزهەتوززەمان

نووسـیبووی و دابووی بە بازرگانەکە، هەڵیگرت و بردی بۆ لای نوزهەتوززەمان و باسـی بازرگانەکەی بۆ گێڕاوە. نوزهەتوززەمان دەسنووسی خۆی دی و بازرگانەکەی ناسییەوە. ئەوی بە زومرانپاشـــا و کانەماکانشـــا ســـپارد کە ئاگایان لێی بێ و ڕێزی لێ بگیرێ. ئەوانیش میوانداریەکی باشیان لێ کرد و زۆریان شت بۆ نارد و کۆیلەیان بۆ خزمەتکردنی تەرخان کرد. بازرگان زۆر خۆشـــحاڵ بوو، ســـێ ڕۆژ لەوێ ماوە. دوای ئەوە داوای کرد ڕێی بدەن بڕواتەوە بۆ شارەکەی خۆی. ئەوانیش بەڕێیان کردەوە.

"دوای ئەو پاشـاکان فەرمانیان دا سـێ سـەرکردەی دزەکان بێنن و لێیان بپرسـنەوە. یەکێک لەوان هاتە پێشـــێ و گوتی: 'ئەمن پیاوێکی ڕەوەندەم و کارم ئەوە بوو کە منداڵ و کیژی جوان و دەلالم دەدزی و دەمبرد بە بازرگانانم دەفرۆشـــتەوە. ماوەیەکی زۆر ئەوە کاری من بوو هەتا لەگەڵ ئەو دوو خوانەناسـە ئاشـنا بووم. لات و لوتمان کۆ کردنەوە و ڕێگامان بە بازرگانان دەگرت.' پاشـاکان پێیانگوت: 'ئەگەر لەو منداڵ و کچدزینە چیرۆکێکی سـەیر و خۆشت لە بیرە، بۆمان بگێڕەوە.' ڕەوەندە گوتی: 'پاشـایان، سـەیرترین شـتێک کە من دیومە لەو ماوەیەدا ئەوە بوو کە بیسـت و دوو سـاڵ لەمەو بەر لە بەیتولموقەددەس کچێکم دزی زۆر زۆر جوان بوو، بەڵام جلوبەرگێکی شـڕ و کۆنی لە بەردا بوو، عەبا کۆنێکیشـی بە سـەریدا دابوو. ئەمن ئاگام لێ بوو لە کاروانسـەرا هاتە دەرێ و وەداوی کەوتم و بە هەر فێڵێک بوو ڕفاندم. سـواری وشـترم کرد. بە تەما بووم بیبەمە بێروون بۆ لای ژن و منداڵەکانی خۆم لەوێ وشـتر بلەوەڕێنێ و شـیاکە کۆ کاتەوە. ئەو کچە دەگریا، سەیر دەگریا، منیش لێی چوومە پێشێ و لێم دا و بردم بۆ شاری دیمشق. بازرگانێک دیتی و سـەری لە ڕەوانبێژی و قسـەزانییەکەی سـووڕ ما و ویسـتی لێم بکڕێ. ئەمن نرخەکەیم بردە سـەرێ هەتا وای لێ هات بە سـەدهەزار دینار پێم فرۆشـت. دوای ئەوە بیسـتمەوە بازرگانە جلوبەرگی شـکۆداری لەبەر کردووە و بە دیاری دابووی بە پاشـای دیمشـق. پاشـاش دوو بەرابەری نرخەکەی دابووەوە بە بازرگانەکە. بە گیانی خۆم پاشـاش ئەو کەنیزەی هەرزان وەگیر کەوتووە.'

"پاشاکان ئەو چیرۆکەیان زۆر پێ سەیر بوو. نوزهەتوززەمان کە ئەو بەسەرهاتەی لە ڕەوەندە بیسـت، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو. قیژاندی و دەسـتی کرد بە گریان و بە زومرانپاشـای برای گوت: 'ئەو گلاوە ئەو کەسـەیە کە لە بەیتولموقەددەس منی بە فێڵ دزی.' ئیدی نوزهەتوززەمان ئەوەی کە لەو غەریبییەدا هەر لە برسـییەتی و قامچیلێدان و بێڕێزی و توقاندنەوە کە بەسـەری هێنابوو، هەمووی بۆ گێڕانەوە و گوتی: 'خوێنی ئەو گلاوە بۆ من حەلاڵە.'

"ئیدی شـیری دەرکێشـا و بۆی چوو کە لە پڕدا هاواری کرد و گوتی: 'پاشـای جیهان! مەهێڵن بمکوژێ، چونکە چیرۆکی سـەیری دیکەی ڕۆژگارم پێیە بۆتان دەگێڕمەوە.' ئیدی

کانەماکان بە نوزهەتوززەمانی گوت: 'پووریێ، دەستی لێ ڕاگرە با چیرۆکەکەی بگێڕێتەوە، دوای چی لێ دەکەی بیکە.' نوزهەتوززەمان گەڕاوە. ئیدی پاشـــا بە ڕەوەنـدەی گوت: 'چیرۆکەکەت بگێڕەوە.' ڕەوەندە گوتی: 'بەڕێزان، پاشـایانی جیهان، ئەگەر چیرۆکەکەم زۆر خۆش بوو، لێم خۆش بن.' پاشایان بەڵێنیان پێ دا.

## چیرۆکی خیانەتی عەرەبێکی دەشتەکی

"ڕەوەندە دەستی کرد بە گێرانەوەی بەسەرهاتەکە و گوتی: 'پاشـایانی بەڕێز، ماوەیەک لەمەو بەر شـــەوێک خەوم زڕا و شـــەو لە بەرچاوم وا درێژ بووەوە پێم وا بوو تازە ڕۆژ نابێتەوە. کاتێک ڕۆژ بووەوە، شیرم لە قەدم دا و نێزەشم بە دەستەوە گرت و سوار بووم. ڕۆیشـتم بەرەو ڕاوگە بۆ ڕاو. لە ڕێگادا تووشـی تاقمێک بووم. پرسـیان بۆ کوێ دەچی؟ منیش پێم گوتن. ئەوانیش گوتیان: 'ئێمەش هاوسـەفەری تۆین.' ئیدی هەموومان بە یەکەوە ڕۆیشـتین. لە پڕدا مروشـترێکمان دیت. کەوتینە سـەری و ئەویش ڕای کرد. هەر بەدوایدا هەڵاتین هەتا بوو بە نیوەڕۆ و مروشـــترەکە ئێمەی بردە دەشـــت و بێروونێکی وشـــک و برینگ و بێ ئاوەوە. کە جگە لە فیشـــکە و هووشـــەی مار و دەنگی جنۆکان و گرمە و هاواری دێوان گوێت لە هیچی دیکەی نەدەبوو. کە گەیشـتینە ئەو شـوێنە، مروشـترەکەمان لێ ون بوو. ئێســـتاش نەمانزانی هەڵفڕی بۆ ئاســـمان یان زەوی قووتی دا. ئیدی ئێمەش ســـەری ئەســـپەکانمان وەرســـووڕاند بگەڕێنەوە، ســـەیرمان کرد بەو گەرمایە ناتوانین بگەڕێینەوە. هەوا ئێجگـار گەرم بوو. تینوویێتی بینەقـاقـای گرتبووین. ئەســـپەکـانمـان نەیاندەتوانی بڕۆن. دەســـتمان لە خۆمان شـــوشـــت و گوتمان دەمرین. وا بوو لە ناکاو لە دوور دار و ســـەوزاییەکمان هاتە بەرچاو. کە چووینە پێشـــێ، مێرگ و ســـەوزایەکی زۆر بەرین و خۆش بوو، تاوڵێک هەڵدرابوو، ئەســـپێک لە قەراخ تاوڵەکە بەســـترابووەوە. ئێمە دوای لێقەومـان و هیوابڕاوی بووژاینەوە و هیوامـان هـاتەوە بەر. ئەســـپەکـانمـان بەرەو تاوڵەکە تاو دا و ڕوومان لە ســـەوزەڵانەکە کرد. ئەمن لەپێش هاوڕێکانمەوە ڕۆیشـتم هەتا گەیشتمە ئەوێ، لەسەر کانییەک ڕاوەستام و ئاوم خواردەوە و ئەسپەکەم ئاو دا. گەوجێتی من کارێکی پێ کردم بچمە نزیک تاوڵەکە.

" 'کە چوومە پێشـــێ، لاوێکی ســـادەم دیت وەک مانگ دەدرەوشـــاوە و کچێکیش وەک نەمامی ســـەڵوو لە پەنای ڕاوەســـتابوو. ســـڵاوم لە لاوەکە کرد و ئەویش وەڵامی دامەوە. گوتم: 'برای عەرەبم، پێم بڵێ تۆ کێی و ئەو ســـیما گەلاوێژە کێیە لە پەنـاتە؟' گەنجەکە کەمێک سەری داخست. کە سەری بەرز کردەوە، گوتی: 'ئەتۆ پێم بڵێ کێی و ئەو سوارانە کێن لەگەڵتن؟' گوتم: 'حەممادی کوڕی فەرازیم کە لەنێو عەرەبدا بە بارتەقای پێنجســـەد

ســــوارم دادەنێن. ئێمە لە ماڵێ بە مەبەســــتی ڕاو هاتینە دەرێ. توونییەتی ئێمەی هێنا بەردەرگای ئەو خێوەتە بەشکو چۆڕێک ئاو پەیدا کەین.'

" 'کە لاوەکە ئەوەی لە من بیســــت، بەو پەریپەیکەرەی گوت کەمێکم ئاو بۆ بێنێ و خواردنیش هەرچی هەبوو بیهێنێ. ئیدی کچە وەک کەو بە لەنجە ڕۆیشــــت. کەمێکی پێ چوو. دوایە هاتەوە بە دەستێک قاپێکی زیوینی پڕ لە ئاو و بە دەستەکەی دیکەشی دەفرێکی پێ بوو، دەفرەکە کەمێک خورما و شیر و گۆشتی ئاسکی لەسەر بوو. ئەمن لە تاوی کچە هۆشی خواردنی خواردن و شتم نەما. بێ ئەوەی بە خۆم بێ، گوتم:

ئــاوری تــۆ بــۆ خــرمــانــی غەریــبــان
ئەی خــاوەنــی ئەوەی کە پێی دەڵێن جوان
تــۆ بــڵــێــی چــی؟ خــودا ئــاوای بەش داوی
خـــــــــــــاوەنی دڵگیری و دەلالی و جوانی

" 'دوایە ئەو شێعرەشم گوت:

خەنەیە ئەو نــیــنــۆکەی ڕەنــگــانــدووە
یــا ڕشـــتــوویە خــوێن و وای لــێ هــاتــووە
ئەو ئەویــنــدارەی خــۆی بــڕیــاری داوە
خــوێــنــی بــڕژێ بە دەســـتــی ئەو گــراوە
نــاحەقــی نەبــووە جــوانــی وام نەدیــوە
دەلالــیــکە لە بەهەشـــت هەڵــفــڕیــوە
تەمەنــیــکە لە شـــتــێــکــی وا دەگەڕێــم
لەدەوری ئەو بەژن و بــالایەت گەڕێــم

" 'دوای ئەوە خواردنەکەم خوارد و ئاوم خواردەوە، بە لاوەکەم گوت: 'گەورەی عەرەب، ئەمن ئەوەی بوو پێم گوتی، پێم خۆشــە تۆش باســی خۆتم بۆ بکەی.' لاوەکە گوتی: 'ئەو کیژە خوشـکی منە.' گوتم: 'بە خۆشـی ئەو کچەم دەیە، دەنا تۆ دەکوژم و ئەویش دەبەم و دەڕۆم.' لاوەکە ماوەیەک سـەری داخسـت و بیری کردەوە، دوای ئەوە سـەری هەڵێنا، پێی گوتم: 'ئەتۆ گوتت کە سوارێکی بێهاوتا و ئازا و نەترسی. جا ئەگەر وا بێ، ئاوا من بکوژی و خوشـکم بەری و بڕۆی، ناوت دەزڕێ و ئەو پەڵە نەنگە هەتاهەتایە لە ناوچاوت لا ناچێ. ئەگەر زۆر ئازا و جوامێری، ڕوخسەتم بدە، منیش بچم چەک و شتەکەم بێنم، شیر لە قەدم دەم، ڕمب بە دەستمەوە بگرم و سواری ئەسپەکەم بم. ئەو دەم من و تۆ پێکەوە لێکی دەر

دەکەین. ئەگەر من بە سەر تۆدا زاڵ بووم، ئەوە هەموو سوارەکانیشت دەکوژم و ئەگەر ئێوە بەسەر مندا زاڵ بوون، ئەوە من بکوژن و کچەش بە دەسکەوت بەرن.' کە قسەکەی ئەوم بیست، گوتم: 'ئەوە کارێکی زۆر دادوەرانەیە، وا نەبێ کارێکی شیاو نییە.'

" 'ئیدی سەری ئەسپەکەم وەرسووڕاند و لە کاتێکدا لە تاوی کچە هەر شێت ببووم، گەڕامەوە لای هاوڕێکانم. کە چوومەوە، لای ئەوان باسی جوانی و دەلالی ئەو کوڕ و کچەم بۆ کردن، هەروەها باسی بوێری و نەترسی ئەو لاوەشم کرد، گوتم دڵێ بەرەنگاری هەزار سوار دەبمەوە. هەرچی لەنێو تاوڵەکەدا دیتم، بۆم باس کردن. گوتم: 'ئەگەر ئەو لاوە ئەوەندە ئازا و بوێر نەبا و لە خۆی ڕانەدیبا، لەو دەشتە نەدەژیا، بەڵام پەیمانتان لەگەڵ دەبەستم هەرکەس بتوانێ ئەو گەنجە بکوژێ، خوشکەکەی بۆ ئەو دەبێ.' هەموو هاوڕێکانم بەو بڕیارە ڕازی بوون، خۆیان کۆ کردەوە و دەستیان دا کەرەسەی شەڕ و سوار بوون و چوون بۆ لای لاوەکە. سەیرم کرد ئەوە لاوەکەش خۆی تەیار کردووە و سواری ئەسپەکەی بووە. چاوم لێ بوو خوشکی باوەشی بە ئاوزەنگی براکەیدا کردووە و وا دەگری بەرچاوکەکەی تەڕ کردبوو. نیگەرانی براکەی بوو، ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تا دەتوانی نەبەز و ئازا بە
ترسنۆکی پەستییە وریا بە
ئەوەی ئازا و نەترس و بوێرە
سەر بڵیندە لە نێو خەڵک، شێرە
دەڕواتە پێش و ناپرینگێتەوە
تا تاقیان مابێ ناگەڕێتەوە

" 'کە ئەو شێعرەی لە خوشکەکەی بیست، دەستی کرد بە گریان، زۆر گریا و سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاند بۆ لای خوشکەکەی و لە وەڵامدا ئەو شێعرە خوێندەوە:

شەڕی هێند قورس بووە، غەوغا وەک ڕۆژی مەحشەر
قەزا و قەدەریش تێیدا بە ساخی نەچووەتە دەر
نەترسانە ویستوومە بە ڕمب هێرشیان کەمێ
ڕمب لە دەستم ئالاوە و گوتوویە ناچمە شەڕێ
گوتوومە ڕمبی خوێڕی تۆ بۆ شەڕ چێ کراوی
ڕاست بەوە با بزانم لە چی دوژمن ترساوی

"کە شێعرەکەی تەواو بوو بە خوشکی گوت: 'ئەگەر من کوژرام، ئەتۆ مەهێڵە کەس

دەستی بتگاتێ.' کچە گوتی: 'خودا نەکا من تۆ بە کوژراوی ببینم و کەسێک دەستم بەسەردا بگرێ.' لەو جەنگەیەدا لاوەکە دەستی دەرهێنا و پەچەکەی لەسەر سیمای خوشکی لا دا و تەوێڵی ماچ کرد. کە ڕوخساری دەرکەوت، توومەز هەتاو لەژێر هەور هاتووەتە دەرێ. کە تەوێڵی ماچ کرد، ماڵاوایی لە خوشکی کرد و ڕووی لە ئێمە کرد و گوتی: 'ئەگەر میوانن، میوانداریتان دەکەم، ئەگەر بە تەمای خوشکیشمن، ئەوە یەکیەک وەرنە پێشێ بزانم چیتان پێ دەکرێ.' لەڕێوە سوارێک ڕۆیشتە مەیدانەوە. ئەو لاوە لێی پرسی: 'ناوی خۆت و ناوی بابتم پێ بڵێ، چونکە سوێندم خواردووە، هەرکەس ناوی لەگەڵ ناوی من و ناوی باوکی لەگەڵ ناوی باوکم یەک بێ، نایکوژم.' سوارەکە گوتی: 'ناوی من بیلالە.' لاوەکە بەو شێعرە وەڵامی داوە:

دایکم ناوی منی نا بکوژی تۆ
چارەنووس کردمییە، ئیزرائیلی تۆ
سەرت هێناوە، تازە نایبەیتەوە
دەبرژێنم دڵی دایکت لە سوێی تۆ

" 'ئیدی هێرشیان کردە سەر یەک، لاوەکە ڕمبێکی وای لە سینگیدا، نووکی ڕمبەکە لە پشتی هاتەوە دەرێ و مرد. دوای ئەو یەکی دیکە هاتە مەیدانەوە. لاوەکە پێی گوت:

ئەگەر گۆی زەوی بۆم بێتە مەیدان
خۆ ناگرێ لە بەر دوو گورزی گران
شەپرزەی دەکەم تێکی دەگلێنم
لمبۆزی فیزی بۆ لە خوێن دێنم

" 'دوای ئەوە لاوەکە مۆڵەتی نەدایە و لەڕێوە لە خوێنی گەوزاند. داوای شەڕکەرێکی دیکەی کرد. سوارێک هاتە گۆڕەپانەوە. هەر لەڕێوە ڕمبێکی هاویشتێ و لەسەر زینەکەی فڕێی دایە خوارێ. سوارێکی دیکە هات بۆ شەڕ. گەنجەکە بۆی چوو، پەلاماری یەکتریان دا، دوو هەڵمەتی کردێ و بۆی نەهات، بەلام لە هەڵمەتی سێیەمدا سوارەی تێک گلاند. بەو شێوەیە هەر دە سوارەکە چوونە بەرەوە و کوژران، سەیرم کرد ئەوە تەواوی هاوڕێکانم کوژران. لە دڵە خۆمدا گوتم: 'ئەگەر بۆی بچمە پێشێ، ڕزگارم نابێ. ئەگەر هەڵیشبێم، دوایە گەپچار و تەواوی هۆزەکانی عەرەب سەرکۆنەم دەکەن.' ئیدی لاوەکە دەرفەتی نەدامێ و دەستی کێشا و لەسەر زینەکە هەڵیگرتم و فڕێی دامە سەر زەوی. هەڵیکێشا شیر ویستی بمکوژێ، ئەمن باوەشم بە لاقیدا کرد و تکام لێ کرد. وەک چۆلەکە هەڵیگرتم. ئەو کچە لە

خۆشـــی ئازایەتی براکەی خەریک بوو باڵ بگرێ. ئیدی هات و تەوێڵی براکەی ماچ کرد. لاوەکە منی دا بە خوشـکی و پێی گوت: 'ئەوەی بە تۆ دەسـپێرم، ئاگات لێی بێ، چونکە لە پەنای ئێمەدایە.'

" 'کچە هات و ئاتەگی منی گرت و وەک سەگێکی تۆپیو ڕاکێشێ، ئاوا ڕایکێشام. دوایی چوو جلی شەڕی لە بەر براکەی داکەند و لەسەر تەختێکی چێکراو لە شفرە داینیشاند. پێی گوت: 'خودا بتپارێزێ، ڕووسـوووری دنیات بکا و لە بەلا بەدوورت خاتەوە.' لاوەکەش لە وەلامدا ئەو شێعرەی خوێندەوە:

خـوشـــکم شـــاد بـژی بە دڵـێکی پـاک
هـیـچ تـرســـت نەبـێ لە بەرەی نـاپـاک
هەرکەس تەمـاع بـکـا لە نـامـووســـی تـۆ
خــوێـنــی دەڕێــژم دەیــکەم ڕەنــجەڕۆ
خۆ ناگرن جـــــەردە و ڕێـــــگران لە بەرم
هــیــچ خەمـــت نەبـــێ لەبەرت مـــرم

"کاتێک ئەو شێعرەم بیست، سەرم لە کاری خۆم سـووڕ ما و چاوێکم لە خۆم کرد و خۆم ســـەرکۆنە کرد. دوای ئەوە چاوێکم لە کیژە ڕوومانگە کرد و لە دڵە خۆمدا گوتم: 'هۆکاری تەواوی ئەو خوێنڕشـتن و چارەڕەشـیانە ئەو ڕوومانگە بوو.' ئیدی واقم وڕما لە و هەموو جوانییەی و ڕۆندکم هاتنە خوارێ و ئەو شێعرەم خوێندەوە:

هەر خــوێـنە دەڕژێ بە تـیـری مــژۆڵـت
هەڵـدەواســـری دڵ بە داوی بســـکـت
بـــاران کە هەتـــا بـــبـــارێ
ئەو خــوێــنە ڕژاوەی پـێ دانـاشـــارێ

" 'دوای ئەوە کچە خواردنی بۆ براکەی هێنا و منیشـیان بانگ کردە پێشـێ. دڵم خۆش بوو کە نامکوژن. کە براکەی خواردنەکەی خوارد، گۆزەڵەیەکی مەی هێنا. لاوەکە دەسـتی کرد بە مەیخواردنەوە، خواردییەوە خواردییەوە هەتا مەست بوو، کوڵمەی سـووڕ هەڵگەڕا. ئینجا ڕووی لە من کرد و گوتی: 'هۆو حەممـاد، من عەببـادی کوڕی تەمیمی کوڕی سەعلەبەم. خودا ژیانێکی تازەی بە تۆ داوە.' ئینجا پیاڵەیەک مەی دا بە من. کە خواردمەوە، پیاڵەی دووەم و ســـێیەم و چوارەمی دامێ و هەمووم خواردەوە. بووە هاوپیاڵەی من و ســـوێندی دام کە خەیانەتی پێ نەکەم. ئەمن هەزار و پێنجســـەد ســـوێندم خوارد کە قەت خەیانەتی لێ نەکەم و هاوڕێی بم. ئیدی لەو کاتەدا بە خوشـــکی گوت کە دە دەســـت جلی ئاوریشـــمینم بۆ بێنێ. هەر ئەو جلەی لە بەرمدایە یەکێک لەوانە. وشـــترێک لە باشـــترین

وشترەکانیش بۆ من بێنێ. گوتی: 'ئەسپێکی شێشی بدەیە.' ئەمن سێ ڕۆژ لە لای ئەوان مامەوە. ڕۆژی چوارەم گوتی: 'حەمماد براکەم، دەمەوێ کەمێک بخەوم با بحەسێمەوە و ئێستا لە تۆ ئەرخەیانم، ئەگەر هاتوو دیتت ئەوە دەستەیەک سوار بەرەو ئێرە دێن، مەترسە. ئەوانە لە هۆزی کوڕی تەغلیبن. بە تەمان لەگەڵ من بەشەڕ بێن.' ئیدی شیرەکەی لەبن سەری نا و خەوی لێ کەوت. خولیای کوشتنی بە زەینمدا هات. زۆر بە لەز هەستام شیرەکەم لەبن سەری دەرهێنا و هەر بە شیرەکەی خۆی سەریم لە جەستەی جیا کردەوە. کە خوشکەکەی زانی، خۆی بەسەر براکەیدا دا و یەخەی خۆی دادڕی و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هەیرۆ هەیرۆیە، شین و ڕۆڕۆیە
قورم وەسەر کەن وا برارۆیە
سوارچاکی سواران، چالاکی دەوران
کوشتوویە نامەرد ڕووناکیڕۆیە
بەجەرگ و ئازا، نەبەزی زمان
خوێنی ڕژا و چوو، پاڵەوانڕۆیە
کاکە بۆ کردت باوەڕ بەو گڵاوە
ڕۆژی خوێڕییە، قارەمانڕۆیە

" 'کە شێعرەکەی تەواو بوو، ڕووی لە من کرد و گوتی: 'گڵاو، بۆچی ئەو برایەمت کوشت و خەیانەتت لێ کرد؟ ئەو بە تەما بوو دیاری و تویشەیەکی زۆرت لەگەڵ بخات و بتنێرێتەوە ماڵی خۆت. هەروەها ویستی سەری ئەم مانگە منیشت لێ مارە بکات.' ئیدی ئەو کچە دەستی دا شیرەکە و دەسکی شیرەکەی لەسەر زەوی دانا و سینگی بەسەر شیرەکەدا دا و نووکی شیرەکە لەپشتی هاتە دەرێ. لە جێوە مرد. ئەمن زۆر نارەحەت و پەشیمان بوومەوە، بەڵام پەشیمانی سوودی نەبوو. ناچار هەستام بە تاوڵەکەدا گەڕام و ئەوەی بە کێش سووک و بە نرخ گرانبای بوو لەگەڵ خۆم بردم و ڕۆیشتم. تەنانەت ئەوەندە بە پەلە بووم ئاوڕێکم لە هاوڕێکانیشم نەداوە و هیچیشیانم نەناشت. ئەو کچ و کوڕەشم نەناشت. ئەو چیرۆکە زۆر لە چیرۆکی ئەو کچەش سەیرتر بوو کە لە بەیتولموقەددەس دزیم.' نوزهەتوززەمان کە گوێی لەو بەسەرهاتەش بوو، ئەوەندەی دیکە ڕقی هەستا و دنیای لە بەرچاو تاریک بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و چل و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، نوزهەتوززەمان کە قسەکانی ڕەوەندەی بیست، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو. هەستا هەڵیکێشا شیر و ڕەوەندەی کوشت. ئامادەبووان گوتیان: 'ئەوە بۆ وا بە پەلە بووی لە کوشتنی؟' نوزهەتوززەمان گوتی: 'سپاس بۆ خوا کە من هەر زیندوو بووم هەتا بە دەستی خۆم تۆڵەی خۆم لێ کردەوە'. دوای ئەوە گوتی: 'لاقی بگرن ڕایکێشن بیخەنە بەر دەمی سەگەل.'

"دوای ئەوە ڕوویان لە دوو سەرچەتەکەی دیکە کرد. یەکیان کۆیلەیەک بوو. ناوەکەیان پرسی و گوتیان: 'ئیدی هەر چی بووە ڕاستییەکەی بڵێ.' کۆیلە گوتی: 'ناوی من غەزبانە.' ئیدی بەسەرهاتی خۆی گێڕاوە کە چی بەسەر شازادە ئەبریزی کچی حەردووبپاشادا هێناوە. هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو کە زومرانپاشا هەڵیکێشا شیر و کوشتی و گوتی: 'سپاس بۆ خودا نەمردم و تۆڵەی دایکم کردەوە.' پاشان ڕوویان لە سەرچەتەی سێیەم کرد و گوتیان: 'تۆش بەسەرهاتی خۆت بگێڕەوە.' ئەو هەر ئەو وشترەوانەی خەڵکی بەیتولموقەددەس بوو کە بە کرێیان گرت تا بە وشترەکەی زەوئولمەکان بەرێتە نەخۆشخانەی دیمشق، ئەویش هاویشتبوویە نێو توونی گەرماوەوە. ئیدی بەسەرهاتی خۆی لەگەڵ زەوئولمەکانپاشا لە سەرەتاوە تا کۆتای گێڕاوە. کە گێڕانەوەکەی تەواو بوو، کانەماکانشاش هەڵیکێشا شیر و وشتروانی کوشت و گوتی: 'سپاس بۆ خوا کە نەمردم و تۆڵەی باوکم لەو ناپاکە کردەوە. من ئەو بەسەرهاتەم لە زمان زەوئولمەکانی باوکمەوە بیستبوو.' ئیدی پاشاکان گوتیان: 'هەنووکە ئاواتێکمان جگە لە تۆپاندنی زاتوددەوایی جادووگەر نەماوە کە هۆکاری تەواوی ئەو ڕۆژڕەشی و چارەڕەشیانەیە. کێ دەتوانێ بیهێنێتە ئێرە تا تۆڵەی خوێنی باپیر و مامانی لێ بکەینەوە و ئەو پەڵەیەی بە ناوچاوی بنەماڵەی نوعمانەوە لای بەین؟' زومرانپاشا گوتی: 'هەر دەبێ بۆ خۆم بیهێنمە ئێرە.' خێرا نامەیەکی نووسی و ناردی بۆ پیرێژنە. لە نامەکەدا نووسیبووی: 'وڵاتی دیمشق و موسڵ و عێراق لەژێر دەستی خۆماندان و سوپای موسوڵمانان تێک شکاوە و پاشاکانیان قۆڵبەست کراون. پێم خۆشە لەگەڵ شازادە سەفیەی کچی ئافریدوونپاشا و هەرکەس لە گەورە گەورەکانی مەسیحیان پێت خۆشە بیهێنە و وەرە بۆ لای من. پێویست ناکا سوپا بێنی، وڵات ئەمن و ئەمانە. تەواوی شارەکان لە بەردەستی خۆماندان.'

"کاتێک نامەکە گەیشتە دەست پیرێژنە و خەتی زومرانپاشای دیت، خۆشحاڵ بوو. لەڕێوە خۆی بۆ سەفەر ساز کرد و شازادە سەفیەی دایکی نوزهەتوززەمان و تاقمێکی دیکەی لە گەورە گەورەکان لەگەڵ خۆی هێنا و وەڕێ کەوتن. هاتن هەتا گەیشتنە بەغدا.

کەسێکیان لە پێشەوە نارد تا پاشا ئاگادار کاتەوە.

"زومرانپاشـــا گوتی: 'وا چاکە جلوبەرگی فرەنگیان لە بەر کەین، ئینجا بەرەو پیریان بچین. هەتا لە شـــەڕی ئەو پارێزراو بین و شـک نەکا.' ئیدی جلوبەرگی فەرەنگیان لە بەر کرد. قەزافەکان گوتی: 'ئەگەر نەمناسیبان، دەمگوت ئەوە سوپای فەرەنگە.'

"ئینجا زومرانپاشـا بە هەزار سـوارەوە پێش کەوت بۆ پێشـوازی پیرێژن. کە چاویان پێک کەوت، زومرانپاشا لە ئەسپەکە دابەزی. کە پیرێژن ئەوی دیت، ناسییەوە و لە ئامێزی گرت. زومرانپاشا مستێکی لە کەلەکەی پیرێژن دا، چی وای نەمابوو تێکی بشکێنێ. پیرێژن گوتی: 'ئەوە چ بوو؟' هێشـتا قسـەکەی تەواو نەببوو کە کانەماکانشـا و وزیر دەندان و سوارەکانیان دەوری پیرێژن و هاوڕێکانیان دا. گرتیانن و بردیاننەوە بۆ بەغدا. زومرانپاشا گوتی: 'شار برازێننە و شای و شادی وەڕێ خەن.' ئینجا پیرێژنەیان هێنا دەرێ و کڵاوێکی شیاکاوی و تەرساویان لەسەر کرد و بەنێو شاردا گێڕایان. جارچیش لەپێشیدا جاڕی دەدا کە ئەوەیە پاداشی ئەوەی پاشا و کوڕی پاشا بکوژێ. دوایە لە داریان دا. پاشان لاشەکەیان دوولەت کرد و لە دەروازەی شـــار هەڵیانواســـی. هاوڕێکانی کە ئەوەیان دی، هەموویان بوونە موســـوڵمان. وەزیر دەندان بە نووســـەری تایبەتی پادشـــای گوت: 'ئەو ڕووداوە بنووســـەوە با ببێ بە پەند بۆ بەرەی داهاتوو.' دوای ئەوە پاشـــاکان و وەزیر دەندان و دارودەستەکەیان لە خێر و خۆشیدا ژیان هەتا تێکدەری خۆشی لێکی بڵاو کردن."

## که شەوی سەد و چل و شەشەم هاتەوە

### چیرۆکی ئاژەڵەکان

شەهریارشا بە شەهرزادی گوت: "پێم خۆشە چیرۆکی باڵندە و پەلەوەرم بۆ بگێڕییەوە." شەهرزاد گوتی: "باشە، بە دڵ و بە گیان.

"خاوەنشکۆ، سەردەمانی زوو تاوسێک لەگەڵ مێیەکەی خۆی، لە قەراخ دەریا دەژیان. ئەو شوێنە پڕ بوو لە ئاژەڵی دڕندە و کێوی. بەڵام دار و درەختێکی زۆریشی لێ بوو. شەوانە لە ترسان دەچوونە سەر ئەو دار و دەرختانە. هەمیشەش لە بیر ئەوەدا بوون بچنە شوێنێکی دیکە، هەتا وا بوو ڕێیان کەوتە دوورگەیەکی سەرسەوز و پڕ لە ئاو و لەوەڕ. لەوێ لە میوە و شتی ئەو دوورگەیە دەیانخوارد و لە کانییەکانیشی ئاویان دەخواردەوە. ڕۆژێکیان مراوییەک بە هەڵەداوان و پەلەپرووزە هاتە سەر ئەو دارەی تاوسەکانی لێ نیشتبوو، لەوێ هەڵنیشت و ماوەیەک مات بوو تا پشووی هاتەوە سەرخۆ. تاوس زانی کە ئەو مراوییە قسەیەکی پێیە. ئیدی لێی پرسی: 'ئەوە چ بووە دەڵێی ڕاویان ناوی؟' مراوی گوتی: 'لە ترسی بەرەی مرۆ حەجمینم نییە. کورە دەخیلتان بم خۆ لە مرۆ مەدەن.' تاوس گوتی: 'ئێستا کە هاتوویە لای ئێمە، خەمت نەبێ و مەترسە.' مراوی گوتی: 'سپاس بۆ خوا کە بە دیتنی ئێوە ترس و نیگەرانیم نەما. من بە هیوای ئێوە هاتوومە ئێرە.'

"کە مراوییەکە وای گوت، تاوسە مێوەکە هاتە پێشێ و چاکوخۆشی لەگەڵ کرد و پێی گوت: 'مەترسە، ئێرە جێی ترس نییە. مرۆڤ دەستی ناگاتە ئێرە، چونکە ئێمە لە دوورگەیەکین لە نێوەڕاستی دەریادایە. مرۆڤ قەت ناتوانێ بێتە ئێرە و دەستی بمانگاتێ. هەر بۆیە ئەرخەیان بە و بۆمان بگێڕەوە مرۆڤەکان چیان لێ کردووی؟' مراوی گوتی: 'تاوس، من تەمەنێکە لێرە بێخەم و بە ئاسوودەی ژیاوم و هیچ گیروگرفت و ناخۆشییەکم نەبووە. شەوێکیان خەونم بە مرۆڤەوە دیت قسەی لەگەڵ دەکردم و منیش قسەم لەگەڵ دەکرد. دەنگێک پێی گوتم: 'مراوی، وریا بە خۆ لە مرۆڤ بپارێزە! فریوی نەخۆی، ئەو تەواوی گیانی فێڵ و کەڵەکە، هەر وەک دەڵێن:

سەراسەر ژینی نارێکی و ڕەنگە
کێ پیتۆل و زرینگە لای دەبەنگە

" 'لە بیرت نەچێ ئەو مرۆڤە بە فێڵ ماسی لە دەریا دەردەکێشێ، مەلانی ئاسمان بە داو دەگرێ و فیل دێنێتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. هیچ شتێک لە ئاست فڕوفێڵی ئەو دەرنابا.

ئاژەڵی کێوی بە دەسـتییەوە سـەرگەردانن.' من بە ترس و لەرزەوە خەبەرم بووەوە. لەو دەمەوە من حەجمینم نییە. دەڵێم نەکا بکەومە داوییەوە. ئەو ڕۆژە هەتا ئێواری هێزم لە بەردا نەبوو، نەمدەتوانی لە جێی خۆم ببزووم. هەتا زۆرم بۆ هات و بۆ پەیداکردنی بژیوێک وەدەر کەوتم، بەڵام زۆر بە سڵەوە دەڕۆیشـتم. وا بوو گەیشـتمە کێوێک، بەچکە شـێرێکی زەردم لە بەر زارکی ئەشـــکەوتێک دیت. ئەویش کە منی دیت، ســـەری لەو ڕەنگانەی من سوورِ مابوو. ئەوەندەی پێ جوان بوو، بانگی کردم و گوتی: 'وەرە پێشـێ.' چوومە پێشـێ. لێی پرسیم: 'ناوت چییە؟ لە چ نەژادێکی؟' گوتم: 'ناوی من مراوییە و لە نەژادی پەلەوەرم.' گوتم: 'ئەی تۆ بۆ لێرە دانیشـتووی؟' بەچکە شـێر گوتی: 'لەبەر ئەوەی چەند ڕۆژێکە بابم هەر باسـی مرۆڤ دەکا و دەڵێ وریا بە خۆتی لە قەرە نەدەی و منی ترسـاندووە. وا بوو ئەمشــەو خەونم پێوە دیت.' ئیدی خەونەکەی بۆ گێرامەوە. زۆر وەک خەونەکەی من دەچوو. منیش کە قسەکانی بەچکە شێرەکەم بیست، پێم گوت: 'شێری بەڕێز، من پەنام بۆ تۆ هێنا هەتا مرۆڤ بکوژی، چونکە زۆری لێ دەترسـم. ئێستا کە تۆ لێی دەترسـی، ترسی من چەند بەرابەر بوو. تۆ کە پاشـای ئاژەڵانی، بۆ دەبێ لە مرۆڤ بترســـی؟' ئیدی بەچکە شـێرم هاندا بۆ کوشـتنی مرۆڤەکان هەتا وای لێ هات لە جێی خۆی هەسـتا و کلکی ڕەپ کرد و ڕۆیشـت و ڕۆیشـت، منیش ئەوە لەگەڵی دەڕۆیشـتم، هەتا تەپوتۆزێکمان لێ وە دیار کەوت. کە هاتە پێش، ســـەیرمان کرد کەرێکە؛ جارێک وێرغە دەکا و جارێک غار دەدا و جارێ دەگەوزێ. کە بەچکە شێرەکە ئەوی دیت، قاوی کرد. کەرەکە بە گوناحی هاتە پێشێ. بەچکە شێرەکە لێی پرسی: 'لە کام نەژادی و بۆ هاتوویە ئێرە؟' وەڵامی داوە: 'شازادە، من لە نەژادی کەرم و لە ترسی مرۆڤ هاتوومە ئێرە.' بەچکە شێر لێی پرسی: 'یانی دەترسی بتکوژێ؟' کەرە گوتی: 'نا پاشـا، من لەوە ناترســم. لەوە دەترســم بمگرێ و ســوارم بێ. چونکە شـتێکیان هەیە پێی دەڵێن کورتان، لەســەر پشـتمی دادەنێ و شـتێکیشـە پێی دەڵێن تەنگە لە بەر زگمی توند دەکەن و کورتانەکەی پێ قایم دەکەن. شـــتێکی دیکەشـــیان هەیە پاڵووی پێ دەڵێن کە ئەویش دەخەنە بن کلم و دێتەوە لە لای کەلەکەم بە کورتانەکەوە دەلکێ. یەکی دیکەیان هەیە پێی دەڵێن لغاو لە دەممی دەکەن. دارێکیان پێیە ئاسنێکی تیژیان تێ چەقاندووە کە هەر بە حاڵ خاو بڕۆم یان تاقەتی شـــتێکم نەبێ، تێمی دەژەنن. کاری تاقەتپڕووکێنم پێ دەکەن. ســەرســمێک بدەم، قســەم پێ دەڵێن. کە دەزەڕێنم، جوێنم پێ دەدەن. کە تەمەنم چووە ســـەرێ و تاقەتی زۆر کارم نەما، دەمدەن بە ئاوکێش ئاوم پێ دەکێشـــن. ئیدی ئاوا هەتا دەمرم هەر لە چەرمەســـەری و چارەڕەشـــیدا دەبێ بژیم. کە مردیشـــم دەمخەنە ســـەر پرزەوپاڵ[1] تا ســـەگان بمخۆن. شـازادە، دڵی کێ بە قەد دڵی من بریندارە و بە قەد من خەمبارە؟' مراوی گوتی: 'تاوس، من کاتێک قســـەکانی کەرەکەم

---

١. پرزەوپاڵ: زبلوزاڵ، شتی فڕێدراو و بە کەڵک نەهاتوو.

بیســـت، له ترســـی مرۆڤ گیانم کەوته لەرزین و به بەچکه شـــێرەکەم گوت: 'شـــازادە، گوێدرێژەکه ڕاســـت دەکا. قســـەکانی ئەو ئەوەندەی دیکه منیان ترســـاند.' بەچکه شـــێر به کەرەکەی گوت: 'بۆ کوێ دەچی؟' گوتی: 'کاتێک تاو هەڵدەهات، مرۆڤێکم دیت؛ له ترســـی ئەو هەڵدێم بەشکو شوێنێک بدۆزمه خۆمی تیا حەشار بدەم و ڕزگارم بێ.' کەرەکه خەریک بوو قســـەی بۆ بەچکه شـــێرەکه دەکرد و دەیویســـت مالاوایی لێ بکا که تۆزێکی دیکه له دوور هەستا. که کەره قیژاندی و ئاماژەی بۆ تۆزەکه کرد و لووشکەیەکی توندی هاویشت و دەرپەڕی. ئەوەندەی پێ نەچوو لەنێو تۆزەکەوە ئەســـپێک وەدەر کەوت. ئەســـپێکی وا که شاعیر له پەسنیدا دەڵێ:

ئەســـــپـێـکـی زەمـــانـــبـڕی درێـــژپشـــــوو
کـــــــه دەتـــبـــاته زەمـــانـــی دانەهـــاتـــوو

" 'ئەسپەکه به غار هات هەتا گەیشـته لای بێچووه شـێرەکه و ڕاوەسـتا. شـێرەکه پێی گوت: 'ئاژەڵی زەلام، تۆ چیت و لەو دەشـــته پان و بەرینەدا بۆ هەڵدێی؟' ئەســـپەکه گوتی: 'ناوم ئەسـپه و له دەسـت مرۆڤ ڕام کردووە.' بێچووه شـێرەکه پێی سـەیر بوو و گوتی: 'قســـەی وا مەکه؛ بۆ تۆ شـــوورەیە. تۆ بەو قەڵافەتەوە چۆن له ترســـی مرۆڤ هەڵدێی؟ من بەو چکۆلەییەمەوە به تەمام ئەگەر بێتوو مرۆڤ ببینم، پەلاماری دەمێ و تێکی بشـــکێنم. گۆشـــتەکەی بخۆم و ترســـی ئەو مراوییه بڕەوێنم. نەهێڵم له ولاتی خۆی دوور کەوێتەوە. بەڵام ئێستا تۆ هاتی و بەو قسانه دڵی منت سارد کردەوە و پەشیمانت کردمەوە. جا چۆن مرۆڤ دەتوانێ بەســـەر ئاژەڵێکی گەورەی وەک تۆدا زاڵ بێ و لەو قەڵافەته بەرز و بڵندەی تۆ نەترسێ له کاتێکدا ئەگەر تۆ ئێشتیات بێ دەتوانی به لەقەیەک بیکوژی؟!' ئەسپەکه بەو قسەیه پێکەنی و گوتی: 'شازادە، قەت شتی وا نابێ که من بەسەر ئەودا زاڵ بم. تۆ چاوت له پانی و درێژی و بەرزی و بڵندی من نەبێ. مرۆڤ لەبەر زۆرزانی شـــتێکی دروســـت کردووه پابەندی پێ دەڵێن که له دەســـت و لاقی منی دەکەن. یەکی دیکەش به ســـەرمدا دەکەن و به گوڵمێخ دەمبەســـتنەوە. وەک له دار درابم ئاوا ڕادەوەستم. نه دەتوانم درێژ بم و نه بخەوم. هەر کاتێک دەیەوێ سـوارم بێ، دوو ئاسـنی دروست کردووە که ئاوزەنگیان پێ دەڵێن، بۆ ئەوە بتوانێ پێمدا هەڵگەڕێ و سـوارم بێ، لاقی لەنێو دەنێ. شـتێکیش لەسـەر پشـــتم دادەنێ بۆ ئەوەی جێ قونی خۆش بێ، پێی دەڵێن زین و به دوو تەنگه له بەرزگمی توند دەکا. لغاوی ئاســـنیش له دەمم دەکا. کاتێک ســـواری پشـــتم دەبێ، لغاو به دەســـتەوە دەگرێ و له من دەخوڕێ و ڕام دەدا. به لاقەکـــانی که لەنێو ئـــاوزەنگییەکه دایه له تەنیشـــتەکانم دەدا تا توند بڕۆم. جاری وایه خوێن له تەنیشـــتەکانم دێ. شـــازادە، هەر لێم مەپرسه که به دەست مرۆڤەوە چیم بەسەر دێ و چەنده ئازار دەچێژم. کاتێکیش پیر دەبم

و ناتوانم چاک هەڵێم و هێزی ڕێگەڕۆینم نامێنێ، ئەو دەم بە ئاشەوانم دەفرۆشن. ئیدی دەبێ شەو و ڕۆژ ئاش بگێڕم هەتا لە پێ دەکەوم. ئیتر بە بۆنگدەرم[١] دەفرۆشن. ئەویش دەمکوژێ و کەوڵم دەکا و کلکم دەدا بە کەوساز بۆ دروست کردنی کەو و بێژنگ و شتی وا.'

"کە بەچکە شێر گوێی لە قسەکانی ئەسپ بوو، مات و تووڕە بوو، لە ئەسپەکەی پرسی: 'کەی لە دەستی مرۆڤ ڕات کردووە؟' گوتی: 'نیوەڕۆ بوو هەڵاتم. ئەویش کەوتە سەرم.' بەچکە شێر و ئەسپ خەریک بوون قسەیان دەکرد کە تەپوتۆزێک لە دوور هەستا لەنێو تەپوتۆزەکەوە وشترێک دەرکەوت. بە کاڕەکاڕ و پێکوتە هات هەتا گەیشتە لای ئێمە. چونکە وشترەکە لە بەرچاوی بەچکە شێرەکە گەورەتر و زەلامتر بوو، وای زانی مرۆڤە، ویستی هەڕای کاتێ و هەڵیدڕێ. من گوتم: 'شازادە، ئەوە مرۆڤ نییە و وشترە. وا دیارە لە دەست مرۆڤ ڕای کردووە.' تاوس، من هەتا ئەو دوو قسەیەم لەگەڵ بەچکە شێرەکە کرد، وشتر گەیشتێ و سڵاوی لە بەچکە شێرەکە کرد. بەچکە شێرە وەڵامی سڵاوی وشترەکەی داوە و گوتی: 'ئەوە چۆنە هاتووی بۆ ئێرە؟' وشتر گوتی: 'لە دەست مرۆڤ هەڵاتووم و بێزاری کردووم.' بەچکە شێر گوتی: 'تۆ بەو قەڵاتەوە چۆن دەڵێی مرۆڤ بێزاری کردووم لە کاتێکدا دەتوانی بە لەقەیەک بیکوژی؟' وشتر گوتی: 'شازادە، مردن نەبێ هیچ شتێک بە مرۆڤ ناوێرێ.' ئەو شتێک لە لووتی من دەکا و هەوسارم لە سەر دەکا و لغاوم دەکا و بە منداڵێکم دەسپێرێ. ئەو منداڵە من بەو بەرزییەوە دەبا، باری قورسم لێ دەنێن و دەمبەن بۆ سەفەری دووروودرێژ. کاری زۆر دژوارم پێ دەکەن. کاتێکیش پیر بووم، پتەشیان بۆ لێدەم، ڕامناگرن و دەمفرۆشن بە قەساب. ئەویش دەمکوژێتەوە و گوشتەکەم دەچێتە بەردەستی چێشتلێنەر و پێستەکەشم بە بۆنگدەر دەفرۆشن. هەر لێم مەپرسە مرۆڤ چ پەندێکم بەسەر دێنێ و چ دەردێکم دەداتێ.' بەچکە شێر گوتی: 'کەنگێ لە دەست مرۆڤ ڕات کرد؟' وشتر گوتی: 'ئێستێکە لێی هەڵبڕاوم و ئەو بەدوامەوە بوو؛ دەیویست بمگرێتەوە. شازادە، لێم گەڕێ با هەڵێم بۆ ئەو بێروون و شتە.' بەچکە شێر گوتی: 'وشتر، کەمێک ڕاوەستە با بزانی چۆنی هەڵدەدڕم و چۆن گۆشتەکەی دەخۆم و ئێسکەکانی تێک دەشکێنم و خوێنەکەی دەخۆمەوە.' وشتر گوتی: 'سوڵتانزادە، من خەمی تۆمە، دەترسم شتێکت لێ بکا. چونکە ئەو فێڵ و کەڵەکی دنیای لەبن سەر دایە. وەک دەڵێن:

چەوسێنەر و دڵڕەق و خۆ پەرستە مرۆڤ
خۆی نەبێ گشت شتێکی بەلاوە پەستە مرۆڤ
تۆ برسی بیت و تووونی، نەخۆش و کەلەلا
کاری جێبەجێ بێ دەڵێ ئەلحەمدولیللا

---

١. بۆنگدەر: بۆنگچی. هەڵاڵدەر. دەباخ. دەباغ.

" 'هێشتا وشتر شێعرەکەی تەواو نەکردبوو کە تاپۆیەک دەرکەوت. کاتێ هاتە پێشێ، پیاوێکی کورتە باڵای کزەڵۆکە بوو. توربێنێکی بە شانەوە بوو، کەلوپەلی دارتاشی تێ خستبوو، هەشت تەختەی دارینیشی لە کۆڵی قایم کردبوو. دەستی چەند منداڵی خوار و ژووری گرتبوو. هەر وا هاتن هەتا گەیشتنە بەچکە شێرەکە. تاوس، من کە چاوم پێی کەوت، لە ترسان خەریک بوو بێهۆش بم. بەڵام بەچکە شێرەکە کە دیتی، هەستا و چووە پێشێ. کە بەچکە شێرە نیزیک بووەوە، دارتاش پێکەنی و بە زمانێکی خۆش گوتی: 'پاشای مەزن، خودا شێوت پیرۆز بکا و هێز و بوێریت زیاتر بکا. فریام کەوە لەو بەڵایەی بۆم هاتووەتە پێشێ داڵدەم بدە و لە دەست ئەو ستەمکارەی ستەمی لێ کردووم ڕزگارم بکە. چونکە جگە لە تۆ کەسم نییە فریام کەوێ.' ئیدی ئەو دارتاشە لەبەردەم بێچووە شێرەکە وێستا و دەستی کرد بە گریان و پاڕانەوە و لاڵانەوە و سکاڵای کرد. کە بێچووە شێرەکە گریان و سکاڵای ئەوی دیت، گوتی: 'من پەنات دەدەم. پێم بڵێ لە چی ترساوی و ئەوەی ستەمی لێ کردووی کێیە؟ چونکە من تا ئێستا کەسم نەدیوە وەک تۆ جوان قسە بکا و ئاوا جوان بێ. پیشەت چییە؟' دارتاش گوتی: 'گەورەی ئاژەڵانی کێوی، من دارتاشم. ئەو شتەی ستەمی لێ کردووم، مرۆڤە. هەر ئەو بەیانییە دێتە لای تۆ.' کە بەچکە شێرەکە ئەو قسەیەی بیست، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو. ئیدی نەڕاندی و هاواری کرد و ئاور لە چاوی دەباری، گوتی: 'قەسەم بە خوا هەتا بەیان ناخەوم و ناچمە لای بابیشم، هەر چاوەڕێی دەبم هەتا بە ئاوات دەگەم!' ئینجا بەچکە شێرەکە رووی لە دارتاش کرد و لێی پرسی: 'هەنگاوەکانی تۆ زۆر کورتن و من بە جوامێری خۆم دڵی تۆ ناشکێنم. بەڵام من نیگەرانی ئەوەم کە تۆ چۆن لەگەڵ ئەو ئاژەڵە کێویانە دەردەچی؟ پێم بڵێ بە تەمای بچیتە کوێ؟' دارتاش گوتی: 'دەچمە لای پڵنگی وەزیری بابت. چونکە ئەو زانیوییە کە مرۆڤ هاتووەتە ئەو ناوچەیە، ترسی لێ نیشتووە و منی ڕاسپاردووە بچم خانوویەکی بۆ ساز کەم. هەتا مرۆڤەکان دەستیان پێی ڕانەگا. کە داواکاریەکەی ئەوم پێ گەیشت، ئیدی منیش ئەو تەختە و شتەم هەڵگرت و وەڕێ کەوتم.' کە بەچکە شێرەکە قسەی دارتاشەکەی بیست، ئیرەیی بە پڵنگەکە برد و بە دارتاشەکەی گوت: 'دەبێ پێش ئەوەی خانوو بۆ پڵنگ درووست کەی، بۆ منی درووست کەی. دوای ئەوەی کارەکەی منت کرد، بچۆ بۆ ئەویش درووست کە.' دارتاش کە ئەوەی بیست، گوتی: 'سەرکردەی ئاژەڵان، من ناتوانم جارێ بۆ تۆ درووست کەم هەتا هی پڵنگ درووست نەکەم، چونکە بەڵێنم پێ داوە. دوایە دێمەوە بۆ تۆش درووست دەکەم هەتا تۆ لە دژمنت بپارێزێ.' بەچکە شێر گوتی: 'بە خوا ناهێڵم لێرە بڕۆی هەتا بەو تەختانە خانوویەک بۆ من چێ نەکەی.' ئیدی بەچکە شێرەکە ویستی کایەی لەگەڵ بکا، ئامبازی بوو، چەپۆکێکی لە سینگی دا. دارتاش پشتەوقەفار بوو. بەچکە شێرەکە

پێکەنی، پێی گوت: 'تۆ ئاوا بێهێزی، ئەگەر لە مرۆڤ بشترسی جێی خۆیەتی.' دارتاش بەو قسەیە تێک چوو، بەڵام وە سەر خۆی نەهێنا. ئینجا دارتاش دانیشت و ڕووی لە بەچکە شێرەکە کرد و پێکەنی و گوتی: 'باشە ئێستا بۆ تۆی دروست دەکەم.' ئیدی تەختەکانی ڕاست و چەپ کردن و لێکی دان و بە بزمار قایمی کردن. لە هەموو لایەکەوە کونی تێ کردن. دەرگایەکی بۆ هێشتەوە و بە بەچکە شێری گوت: 'وەرە بچۆ ژووری.' بەچکە شێر چووە ژووری و جێگاکەی کەمێک تەنگ بوو، تەواو جێی نەدەبووەوە. کلکی هەر لە دەرێ بوو. بەچکە شێرەکە گوتی: 'تەنگە.' ویستی بێتەوە دەرێ، بەڵام دارتاش گوتی: 'مەیە دەرێ جێت دەبێ. کەمێک خۆت کۆ کەوە.' یارمەتی دا و بە زۆر پاڵی پێوە نا و کلکیشی چووە ژووری و دەرگاکەی لەسەر داخست. گورج تەختەی بە دەرکەکەیەوە نا و بزمارڕێژی کرد. بەچکە شێر هەر هاواری دارتاشی دەکرد: 'ئەو خانووە زۆر تەنگە، ئەوە چییە بۆت دروست کردووم؟ لێم گەڕێ با بێمە دەرێ.' دارتاش گوتی: 'حەیبەحەی، تۆ قەت نایەیتە دەر.' ئیدی دارتاش پێکەنی و گوتی: 'من تازە تۆم بەند کردووە. تۆ پیسترین ئاژەڵی هۆڤیت[1].' بەچکە شێر گوتی: 'براکەم، ئەو قسانە چییە، شتی وا چۆن دەبێ؟' دارتاش بە بەچکە شێری گوت: 'ئەوەی لێی دەترسای، بە سەرت هات. لەگەڵ چارەنووس هیچت پێ ناکرێ.' تاوس، کاتێک دارتاشەکە وای گوت، بەچکە شێرەکە زانی ئەوە مرۆڤە کە لە خەودا دیبووی و بابیشی باسی بۆ کردبوو. منیش ئەوە هەر چاوم لێیە بزانم چی لە بەچکە شێرەکە دەکا. تاوس، چاوم لێ بوو کە لە نزیک ئەو قەفەسەی بۆ شێرەکەی دروست کردبوو، چاڵێکی هەڵکەند. قەفەسەکەی لە چاڵەکە هاویشت و ئاوردوو و چرپی خستە سەری و ئاوری دا. ئیدی من وا ترسام، ئەوە دوو ڕۆژە لە ترسی مرۆڤ یەکتەکان هەر دەفڕم هەتا گەیشتمە ئێرە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. هۆڤی: وەحشی.

## که شەوی سەد و چل و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، تاوس که ئەو بەسەرهاتەی له مراوی بیست، واقی وڕ ما و گوتی: 'مراوی، تۆ له دەست مرۆڤ ڕزگارت بووە، چونکه تۆ له دوورگەیەکی له دوورگەکەلی ناو دەریا که مرۆڤ دەستی پێی ڕاناگا. هەر له لای ئێمه بمێنەوە بەشکو خودا بمانپارێزێ.' مراوی گوتی: 'له دەست قەزا و قەدەر ناتوانی دەرببەی. دەترسم شتێکمان بەسەر بێ.' تاوس گوتی: 'له لای ئێمه بمێنەوە. ئەوەی بەسەر ئێمه هات با بەسەر تۆش بێ. تۆش وەک ئێمه.' تاوس هەر لەو قسانەی بۆ مراوی دەکرد هەتا مراوی به تاوسی گوت: 'خۆزگه دەتزانی چەنده نارەحەتم، خۆ ئەگەر ئێوەم لێره نەدیتبا، لێره لام نەدەدا.' تاوس گوتی: 'ئەگەر شتێک له چارەی ئێمه نووسرابێ، ئەوە پێی دەگەین و ئەگەر بڕیاریش بێ بمرین، ئەوە دەرچوونمان ئاستەمە. هەر کەس هەتا ڕۆزی خۆی نەخوا و ڕۆژی خۆی نەیە، نامرێ.' لەو قسانەدا بوون له دوور تەپوتۆزێک هەستا. مراوی و تاوس خەریک بوو دڵیان بتۆقێ. که تۆزەکه نیشتەوە و هاته بەرەوە، ئاسکێک وەدەر کەوت. مراوی و تاوس ترسەکەیان ڕەوی و هێور بوونەوە. تاوس به مراوی گوت: 'ئەوەی لێی ترساین، ئاسکه. ئەوە خەریکه دێ. لەو ناترسین، چونکه ئەو گیا و گەڵای دار دەخوا.' تاوس قسەکەی تەواو نەکردبوو که ئاسکەکه گەیشتێ و ویستی لەبن سێبەری ئەو داره بحەسێتەوە. که تاوس و مراوی دیت، سڵاوی لێ کردن و گوتی: 'من ئەمڕۆ هاتوومه ئەو دوورگەیە، جێگای خۆش و سەرسەوزترم لێره نەدیوە.' ئیدی داوای له تاوس و مراوی کرد هاوڕێیەتی بکەن. کاتێک تاوس و مراوی سۆز و خۆشەویستی ئەویان دیت، ڕازی بوون هاوڕێیەتی بکەن. سوێندی هاوسۆزی و دۆستایەتیان بۆ یەک خوارد. ئیتر خەوگه و شوێنی خواردن و خواردنەوەیان یەک بوو. به دڵێکی ئاسوودەوە دەژیان. هەتا ئەوەی ڕۆژێک پاپۆڕێک لاڕێ دەبێ و ڕوو لەو دوورگەیە دەکا. خەڵکەکه له پاپۆڕەکه دابەزین و له دوورگەکەدا بڵاو بوونەوە. ئاسک و تاوس و مراویان به یەکەوە دیت، بۆیان چوون. ئاسکەکه دەرپەڕی و تاوس هەڵفڕی و مراوی بەجێ ما، کەمێک ئەوبەرەوبەری کرد و گرتیان. دەستی کرد به هەراوهوریا و دەیگوت: 'ڕاکردنم له دەست قەزا و قەدەر کەڵکی نەبوو.' ئیدی مراویان برده نێو پاپۆڕەکه. تاوس که ئاگای له بەسەرهاتی مراوی بوو، کۆچی کرد و له دوورگەکه ڕۆیشت و دوور کەوتەوە. گوتی: 'کەس نازانێ چی لێ بەسەر دێ. ئەگەر ئەو پاپۆڕه نەبایە، من و مراوی قەت لێک دانەدەبڕاین، چونکه هاوڕێیەکی پاک بوو.' دوای ئەوە تاوس چوو ئاسکی دیتەوە و سڵاوی لێ کرد و سپاسی خودای کرد که سڵامەت بوو. ئاسکەکه هەواڵی مراویەکەی لێ پرسی. تاوس گوتی: 'کەوتە دەست دژمن. منیش لێره بێزار بووم.' پاشان دەستی کرد به گریان بۆ مراویەکه و ئەو شێعرەی گوت:

بــێ تــۆ ژیــان لەو دوورگەیە تــاڵ و ئەســـــتەمە
نــاتــوانــم لــێــرە بــژیــم، پــڕ لە ئــێــش و خەمە
ســـــەرم هەڵــدەگــرم و دەڕۆم بــۆ وڵاتــێــکــی دوور
بە خەیــاڵــی تــۆوە دەژیــم، دیــتــنەوەت ئەســـــتەمە

"ئیدی ئاسکەکەش نارەحەت بوو، پاشان ئاسکەکە تاوسەکەی لە سەفەرەکەی پەژیوان کردەوە. هەردووکیان لەو دوورگەیە مانەوە و خەریکی خواردن و خواردنەوەی خۆیان بوون، بەڵام خەمی مراویشیان لە دڵدا بوو. ئاسکەکە بە تاوسی گوت: 'دەزانی هەر کە ئەو مرۆڤانە لە پاپۆڕەکە دابەزین، بوونە هۆی هەڵبڕانی ئێمە و تێداچوونی مراویش. کە وایە خۆتیان لێ بپارێزە و لێیان کەمترخەم مەب، هەموو گیانیان فێڵە.' تاوس گوتی: 'من لێم ڕوونە هۆی تێداچوونی ئەو جگە دووری و دابڕانی لە ســـــپاســـــگوزاری خوا، هیچی دی نەبوو. من پێم گوت لەوەی کە تۆ ســـپاســـگوزاری بۆ خوا دەرنابڕی، نیگەرانم شـــتێکت بۆ بێتە ڕێ. چونکە هەموو بەدیهاتووەکانی پەروەردگار ســـــپاســـــگوزاری بۆ خوا دەردەبڕن. هەرکەس لە یادی ئەو غافڵ بێ، تووشـــی بەڵایەک دەبێ.' کە ئاســـکەکە قســـەکانی تاوســـی بیست، گوتی: 'خوا ڕووسوورت کا.' ئیدی خەریکی سپاسگوزاری خودا بوو، زۆری سپاس کرد. وەک دەڵێن سپاسگوزاری ئاسک ئەوەیە: ' سبحان الدّیان ذي الجبروت و السّلطان.'[1]"

"دەشـــگێڕنەوە یەکێک لە خواناســـان لەنێو کۆمەڵە شـــاخێکدا خەریکی خواپەرســـتی بوو. لەو کێوەدا جووتێک کۆتری لێ بوو، ئەو خواناسە ڕۆزییەکەی خۆی دەکردە دوو بەشەوە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. پاکە پاداشدەرەوەی بەهێز و مەزن.

## کە شەوی سەد و چل و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەو خواناسە بژیوەکەی خۆی دەکردە دوو بەشەوە. نیوەی بۆخۆی دەیخوارد و نیوەی دەدا بە کۆترەکان. دوایی بۆ زۆربوونی وەچەی کۆتر دەپاڕاوە. ئەو کۆترانە جگە لەو کێوەی ئەو خواناسەی لێ بوو، لە هیچ کوێی دیکە هێلانەیان نەبوو. هۆی کۆبوونەوەی زۆری ئەو کۆترانە لە لای خواناس، سـپاسـگوزاری زۆری کۆترەکان بوو. کۆترەکان ئاوا یادی خودایان دەکرد: 'سبحان خالق الخلق و قاسم الرزق و باني السموات و باسط الارضين.'[1] دوای ئەوە ئەو جووتە کۆترە لەگەڵ بێچووەکانیان بە دڵی خۆش ژیان هەتا خواناس مرد. کۆترەکان بڵاو بوونەوە بە شار و کێوەکاندا و لەملا و لەولا گیرسانەوە.

### چیرۆکی شوان و فریشتە

"دەگێڕنەوە لەنێو کێوێکدا شـوانێکی داوێنپاک و ژیر و باوەڕدار چەند سـەر مەڕێکی بوو، دەیلەوەڕاندن و خۆراک و پۆشاکیشی هەر لەسەر شیر و خوری ئەو مەڕانە بوو. ئەو کێو و دارستانە لەوەڕگەی چاکی لێ بوو، بەڵام ئاژەڵی دڕندەشی هەبوو. کەچی کاریان بە شوان و مەڕەکانییەوە نەبوو. شوانەش هەمیشە بەبێ ترس و نیگەرانی لەو ناوەدا دەژیا و خەمی کاروباری دنیای نەبوو، چونکە ئەو بەختەوەر بوو، هەر حەزی لە خواپەرستی بوو.

"بە ڕێکەوت تووشی نەخۆشییەکی سەخت بوو، چووە نێو ئەشکەوتێکی ئەو کێوەوە. مەڕەکانی بۆخۆیان بەیانی دەچوونە لەوەڕ و ئێواران دەهاتنەوە شـوێنی خۆیان. خودا ویستی شوانەکە تاقی کاتەوە و بزانێ چەند لێبوردە و لەسەرخۆیە. فریشتەیەکی لە شێوەی ژنێکی جواندا ناردە لای شوانەکە. فریشتە چوو لە پەنای دانیشت.

"کە شـوانە ئەو ژنەی دی لە لای دانیشـتووە، گیانی کەوتە لەرزین. پێی گوت: 'ئەوە چۆنە تۆ هاتووی بۆ لای من؟ خۆ تۆ کارت بە من نییە و هیچ دۆستایەتیەکیش لەنێوانماندا نەبووە؟' فریشـتە گوتی: 'گەنجۆ، بۆ ئاوا بێهەسـتی؟ ئەی من بەو هەمووە جوانی و بۆنخۆشیەمەوە بۆ هاتوومە لای تۆ؟ تۆ لە لای خۆی پیاوی و هەستی پیاوانەت هەیە، چۆن بۆ هاتوومە لای تۆ؟ یانی تۆ نازانی؟ هاتووم هاونشـینت بم. بۆ دەبێ نەیەم؟ من بە دڵ و ئارەزووی خۆم هاتوومە لات و حەزم لێتە. خۆ کەسمان لێ دیار نیە، دەمەوێ لە و شاخ و کێوە هاوژینت بم. ئەگەر تۆ دەسـتم لەگەڵ تێکەڵ کەی، نەخۆشـیەکەشـت چاک دەبێ و دەبووژێیەوە. ئەگەر جـارێـک ئـاوێتەی من بی، ئەودەم دەزانی کە ئەو تەمەنەی ئـاوا

---

١. پاکە ئافرێنەری ئافرێنراوەکان و دابەشکەری ڕۆزی و ڕاگری ئاسمانەکان و ڕاخەری زەوییەکان.

ڕاتبردووە هەمووی بە فیرۆ چووە. لەبەر خۆت دەڵێم، وەرە با جووت بین.' شـــوانە گوتی: 'بەڕەڵای فێڵاوی، لاچۆ. لێرە دوور کەوەوە. هەســـــتە بڕۆ دەرەوە. هەرکەس خۆ لە تۆ دا، قیامەتی دەچێ. هەرکەس ڕێگای پەســـــڵان بگرێتەبەر، دەبێ لە تۆ دوور کەوێتەوە. تۆ ئەو کەسەی یەکەمین و دوایەمینت فریو دا. ڕۆژڕەش ئەو کەسەیە فریوی قسەی تۆ بخوا.'

"فریشــــە گوتی: 'لاڕێ، ڕووم تێکە و چاو لەو جوانییەم بکە و بیر لەو دەرفەتە بکەوە، هەلی وات قەت بۆ هەڵناکەوێ. چاو لە ڕابردووانی خۆت بکە. زانایانی پێشــوو ســـەرەڕای ئەوەی لە تۆ ژیرتر بوون و ئەزموونیان لە تۆ زیاتر بوو، دیسـان بەو شێوەیەی تۆ خۆیان لە نیزیکی ژنان نەبواردووە. بگرە زۆریشیان حەز لە ژنان بووە. ئەو کارە هیچ زیانیشی بۆ دین و دنیایان نەبووە. تۆش دەســـت لەو بیرە هەڵگرە تا دواڕۆژێکی باشـــت بێ.' شـــوانە گوتی: 'ئەوەی تۆ دەیڵێی، من پێم خۆش نییە و وەڵام نـاوە. چونکە تۆ کەڵەکبـاز و هەڵخەڵەتێنەری و بۆ ئەوەی نابێ باوەڕ بە بەڵێنت بکرێ، چونکە هیچ نابێتە ســـەر. بە ڕواڵەت خۆت چاک نیشـــان دەدەی و چاکەکاران هەڵدەخەڵەتێنی و ڕایاندەکێشـــی بۆ لای خۆت، دوایەش پەشـــیمان دەبنەوە. لە کۆڵ من بەوە، دەزانم بۆ ئەوەی خەڵک لە خشـــتە بەری، خۆت چاک پیشان دەدەی.'

"ئینجا شوانە عەباکەی بەسەر سەریدا دا و دەستی کرد بە وێرد و یادی خودا. فریشتە کە زانی زۆر لەسـەر باوەڕی خۆی سوورە، هەستا لە دیوەکەی هاتە دەرێ و ڕۆیشـتەوە بۆ ئاسمان.

"لە داوێنی ئەو کێوانە و نیزیک شـــوانەکە دێیەکی لێ بوو. لەو دێیەدا پیاوێکی چاک و لەخواترسـی لێ بوو. شـەوێکی لە خەونیدا دەنگێک لە نادیارەوە پێی گوت کە فڵانە شـوێن پیاوێکی عابیدی لێیە بچۆ بۆ لای و لەژێر فەرمانی ئەودا بژی. کە ڕۆژ بووەوە، خواناس هەســـتا بچێ بۆ لای، لە ڕێگە گەرما تەوژمی بۆ هێنا. چوو لەبن دارێک کە لە لای کانییەک بوو، دانیشـت. ویسـتی لەبن سـێبەرەکە تاوێک بحەسـێتەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو هێندێک باڵندە و ئاژەڵ هاتن لە کانییەکە ئاو بخۆنەوە. کە ئەویان دیت لەوێ دانیشتووە، سڵەمینەوە و گەڕانەوە. ئیدی زۆری پێ ناخۆش بوو، زۆری ســـەرکۆنەی خۆی کرد کە بووەتە هۆی لەئاوبوونی ئەو پەلەوەر و ئاژەڵانە. گوتی: 'جا ئیســـتا ڕۆژی قیامەت چی وەڵامی خودا بدەمەوە، وا لەبەر حەسانەوەی خۆم ئەو بێزمانانەم لە ئاو کرد؟! بڵێی ڕۆژی تۆڵە کە وەک دەڵێن تۆڵەی بزنی شـــاخدار لە بزنی کۆڵە دەســـتێندرێتەوە، چی لە من بکەن؟!' ئینجا فرمێسکەکانی هاتنە خوارێ و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

تێکۆشـــە لە ژیـنـدا هەتـاکوو دەمـــــری
پاک و ســـادق بی با ڕێـــــزت بـــــگرن

به جۆرێک بژی کە ڕۆژێ مـــــــردی
لە تـاوت بمرن نەک جــــــێژن بگـرن

"دوای ئەوە هەستا و بەدەم گریان و ناڕحەتییەوە ڕۆیشت هەتا گەیشتە لای شوانەکە و سڵاوی لێ کرد. ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی داوە و یەکتریان لە ئامێز گرت. پاش ئیستێک لێی پرسـی: 'ئەوە چۆن بوو هاتییە ئێرە؟! خۆ قەت هیچ مرۆڤێک نایەتە لای من؟! خواناس گوتی: 'لە خەونمدا کەسێک ناونیشانی شوێنەکەی تۆی دامێ؛ فەرمووی کە بێم بۆ لای تۆ. من بە فەرمانی ئەو هاتووم بۆ لای تۆ.' شـــوانە دڵخۆش بوو کە بە ســـاغ و ســـلامەتی گەیشـتووەتە لای ئەو. ئیدی پێکەوە لەنێو ئەو شـاخەدا هەمیشـە خەریکی خواپەرسـتی و پاڕانەوە بوون. هەر لە شیر و گۆشت و خوری ئەو مەڕانە کەڵکیان وەردەگرت. بەبێ ماڵ و منداڵ بوون هەتا بە پلەی یەقین بگەن."

شەهریارشا گوتی: "ئەی شەهرزاد، من ئەوە بوومە هەبیس[1] و دەست لە کوشتنی ژنان و کچان هەڵدەگرم و پەشـــیمان بوومەوە و ئەو کارە نەشـــیاوە دووپات ناکەمەوە، بەڵام ئەگەر دەزانی، چیرۆکی باڵندەم بۆ بڵێ."

### چیرۆکی مراوی و کیسەڵ

شـــەهرزاد گوتی: "خاوەنشـــکۆ، بیســـتوومە ڕۆژێک مەلێک لە مەلە ئاویەکان هەڵفڕی و چووە بەرزایی، لەو ســـەرەوە بەردێکی لەنێو ئاودا دی، هاتە خوارێ و لەســـەر بەردەکە نیشـتەوە. سـەیری کرد ئاوەکە تەرمێکی هێنا و لە پەنا بەردەکە گیرسـاوە. ئەو مەلە چووە پێشێ و جوان سـەیری کرد. دیتی ئەوە تەرمی مرۆڤە و جێ دەمی شیر و ڕمبی لەسـەرە. بە خۆی گوت: 'ئەو کوژراوە بەدفەڕ و ناجســـن و ســـتەمکار بووە؛ تاقمێک تێی ئاڵاون و کوشـــتوویانە و لە دەســـتی ڕزگاریان بووە.' مراوی هەر ئاوا بە واقوڕماویەوە ســـەیری دەکرد کە لە پڕدا سـیسـارکەکەچەڵە و داڵاش دەوریان دا. مراوی کە ئەوەی دی، ترسـا و گوتی: 'من بۆ ئێرە نایم.' ئیدی هەڵفڕی چوو گەڕا شـوێنێک ببینێتەوە و لێی نیشـتەجێ بێ، هەتا ئەو تەرمە لەوێ لا دەچێ. هۆڤی و باڵندەکان لەوێ دوور دەکەونەوە. ئەو مەلە هەر فڕی هەتا چوو لەسەر دارێک لەنێو چەمەکە نیشتەوە و لە خەم و ماتەمی ناوچەکەی خۆیدا دەژیـا. لە بەر خۆیەوە دەیگوت: 'خەم دایمە بووە بە هەواڵی من و بۆ هەر کوێ دەچم لەگەڵمە. من لە شـــوێنەکەی خۆم ئاســـوودە بووم. کە تەرمەکەم دیت دڵخۆش بووم کە بژیوی منە و خودا بۆی ناردووم، بەڵام دوای شادییەکەم بوو بە خەم و دڵخۆشیەکەم بوو

---

١. پیاوی تەرکەدنیا، زاهید.

بە ماتەم. ئیدی وا بوو ئەو درندە و باڵندانە هاتن و لێیان ســـەندم و منیان لێ بێبەش کرد. بۆیە هەســـت دەکەم، هیچ هیوایەک لەو دنیایەدا بۆ من نەما تا تێیدا بمێنمەوە. بەڵام ژیران فریوی ئەو ناخۆن و هەر کەس گوێ بداتە ئەو دنیایە و پشـــتی پێ ببەســـتێ، لە دنیادا بە گەوجی دەژی و هەتا دەمرێ هاورێکانی خۆڵی بەســـەردا دەکەن. بۆ بوێران و ئازایان هیچ شـــتێک هێندەی لەســـەرخۆی لەهەمبەر گیروگرفتەکانی ژیاندا چاک نییە.' مراوی هەر لەو بیرانەدا بوو کە کیسەڵێکی نێر لە ئاوەکە هاتە دەرێ و لێی نزیک بووەوە و سڵاوی لێ کرد و گوتی: 'گەورەم، ئەوە چۆنە لە وڵاتەکەی خۆت دوور کەوتوویتەوە؟' گوتی: 'دژمنان هاتنە ئەوێ و کەسی ژێر چاوی بە دژمن هەڵنایە، هەر وەک شاعیر دەڵێ:

ئەو کـــات کە مـــرۆ لە زەوی نەبـــوون
گیـــانلەبەر گشـــتیـــان هـــاورێی یەکتر بوون
مـــــــــــــرۆڤ بە زەویـــــــا بڵاو بوونەوە
گیـــانـداریـــان گشـــــت لێـــک جیـــا کردەوە
بـــاڵـــنـــدە بەرەو بەرزایـــی فـــــــــڕی
مـــاســـــیش بە کزی بۆ نێو ئـــاو خوشـــی
ڕەچەڵەکـــێـــک هـــات هەر وەکـــوو خـــێـــوی
قـــڕیـــان خســـــتە نـــاو گـــیـــانـــداری زەوی
مەلیـــان لە ئـــاســـــمـــان هـــــــێنـــایە خوارێ
مـــاســـــیـــان لە دەریـــا دەرکـــێشـــــا دەرێ

"ئیدی کیسەڵەکە گوتی: 'ئەگەر وایە، من لێت دوور ناکەومەوە و خۆم لە خزمەتتدا دەبم. چونکە گوتوویـــانە هیچ خەم و مەینەتێک بە قەد خەم و مەینەتی دوورەوڵاتی و غەریبی ناخۆش نییە. تەنیا شـــتێک، مرۆڤە گەورەکان هێور دەکاتەوە و خەمیان لە ســـەر ســـووک دەکا، خۆڕاگریە و پاشانیش هاورێیەتی لەگەڵ کەسانی پاک و ڕاستە. هیوادارم قسەکەمت بە لاوە پەســـــند بێ و منیش بتوانم خزمەتکارێکی باش بم بۆت.' کە مراویەکە گوێی لە قسەکانی کیسەڵەکە بوو، پێی گوت: 'ڕاست دەکەی، من لە دووری وڵات و جیابوونەوە لە هـــاورێکـــانم، دەڵێی دڵم تۆقی و خەریکە گیـــانم دەرچێ. ژیران دەبێ کـــاتێـــک لە خەم و نارەحەتی دان، لەگەڵ هاورێی باش و بەئەمەک باســـــی بکەن و داوای یارمەتیان لێ بکەن. خۆڕاگر بن لە بەرانبەر گیر و گرفتەکاندا و نەهێڵن نیگەرانی و دڵەڕاوکێ هەناوی بکوڵێ.' کیســـــەڵ گوتی: 'ئەرێ، خۆ لە نیگەرانی و ترس و دڵەڕاوکێ بپارێزە، چونکە خۆشـــــی و ئاســـــوودەییت تێدا دەکوژێ و جوامێریت لەنێو دەبا.' مراوی گوتی: 'من هەمیشـــــە لە کارەساتی سرووشتی تۆقیوم.'

"کیســەڵەکە کە گوێی لەو قســەی بوو، چووە پێش و ناوچەوانی ماچ کرد و پێی گوت: 'هەمیشــە کۆمەڵی مەل و پەلەوەر ڕاوێژ بە تۆ دەکەن و تۆش دڵخۆشــیان دەدەیەوە. ئەی چۆنە بۆ خۆت نارەحەت و ماتەمباری؟'

"پاشــان مراوی هەڵفڕی چووەوە شــوێنەکەی خۆی کە ســەیری کرد نە تەرمەکە لەوێ مابوو نە سیســارکە و داڵاشــەکان، یەک دوو ئێسکی تەرمەکە نەبێ. لەڕێوە گەڕاوە بۆ لای کیســەڵەکە هەتا بۆی بگێڕێتەوە کە کەســی لێ نەماوە. ئیدی گەڕاوە بۆ لای و گوتی: 'نە تەرمەکە ماوە و نە سیســارەکەکەچەڵ و داڵاش و شتەکە، دەمەوێ بگەڕێمەوە شــوێنەکەی خۆم، بۆ لای هاوڕێ و ناســیاوەکانی خۆم، چونکە ژیران ناتوانن دوور لە وڵاتی خۆیان هەڵکەن.' کیســەڵەکەش لەگەڵی چوو. لەوێ ســەیری کرد چشــتێکی وای نەدی جێی ترس و نیگەرانی بێ. مراوی چاوی ڕوون بووەوە و ئەو شێعرەی گوت:

شــــوکوری خــودا، نەمــردیــن و دیــتمــان
دڵــخــۆش بــوویــن بە دیــداری ئــازیــزان
لە بەر نــــــــــوا[1] بە خۆشــی ڕامان نەبوارد
تا نەمــانچێشــــت ڕۆژگەلێکی گەرم و ســــارد

"دوای ئەوە لەگەڵ کیســەڵەکە لەو دوورگەیە بە خێر و خۆشــی دەژیان و هەتا لە پڕدا چارەنووس شــەهێنێکی برســی بە گژ مراویدا کرد و هەر بە حەواوە تێکی شــکاند و پچڕپچڕی کرد. چونکە کاتی مردنی هاتبوو، خۆپاراســتن ســوودی نەبوو. بەڵام هۆی ســەرەکی کەمترخەمی مراویەکە ئەوە بوو کە لە یادی خودا غافڵ بوو. دەڵێن مراوی ئاوا یادی خودا دەکاتەوە: 'سُبحانَ رَبّنا فیما قَدَّرَ و دَبّرَ سُبحانَ رَبّنا فیما أغنی و أفقَر.'[2] "

پاشــا گوتی: "شــەهرزاد، بەو چیرۆکە زیاتر بەرەو خواپەرســتی و خۆپارێزیت بردم. ئەگەر شتێکی دیکەش دەزانی لەسەر ئاژەڵە کێویەکان، بیگێڕەوە."

### چیرۆکی ڕێوی و گورگ

شــەهرزاد گوتی: "خاوەنشــکۆ، دەگێڕنەوە ڕێوییەک و گورگێک پێکەوە هاوماڵ بوون و ماوەیەکی زۆر بوو پێکەوە دەژیان، گورگ ستەمی لە ڕێوییەکە دەکرد و ئەویش هەر داوای

١. نوا: پەناگە. شوێنێک لە بەر هەیوان کە تاو و باران تێی ناکا.
٢. پاکە پەروەردگاری ئێمە لەو شــتەی دیاری دەکا و دایدەنێ. پاکە خودای ئێمە لە بە هەژارهێشــتنەوە و داراکردن.

لێ دەکرد جوامێرانە و بە ویژدانەوە لەگەڵی بژی. پێی دەگوت: 'ئەگەر تۆ دەست لە ستەم هەڵنەگری و مافی هاوڕێیەتی لە بەرچاو نەگری، بۆی هەیە خوا مرۆڤێکت بۆ بە گژدا بکا. مرۆڤ هەموو گیانی فڕۆفیلە و باڵندە لە ئاسمان و ماسی لەنێو دەریادا ڕاو دەکا. ئەو بەردە گەورانە لە شاخەکان لەتوکوت دەکا و دەیانباتە شارەکان. تکایە تۆش ویژدانت بێ و ستەمکاری مەکە، با دواڕۆژێکی باشت بێ!' گورگ گوێی بە قسەکانی نەدا و لێی تووڕە بوو، گوتی: 'تۆ قسە لە کاری گەورەکاندا مەکە.' ئینجا زللەیەکی لە ڕێوی دا، ڕێوی بێهۆش کەوت. کە وە هۆش هاتەوە، بە ڕووی گورگەکەدا پێکەنی و داوای لێبوردنی لێ کرد و ئەو شێعرەی بۆ گوت:

هەڵەیەکی کرد هاوڕێیەکی تۆ
نابێ بە هەڵە جوابی بدەیتۆ
کە هات و داوای لێبووردنی کرد
دەبێ ببووری ئەتۆش دەستوبرد
ماقوولان دەڵێن: بەخشین باشترە
تامی بەخشین لە تۆڵە پترە

"کە گورگەکە گوێی لەو شێعرە بوو، لێی خۆش بوو و گوتی: 'لەمەو دوا ئەو قسەیەی قازانجی بۆت نەبێ مەیکە، ئەوەی دڵیشت خۆش نەکا،مەیبیستە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و چل و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، گورگ بە ڕێوی گوت: ' قسـەیەک قازانجی بۆت نەبێ مەیکە، ئەوەی دڵیشـت خۆش نەکا مەیبیسـتە.' ڕێوی گوتی: 'ئامۆژگاریەکەتم بیسـت و تازە قەت لە دژی ویسـتی تۆ کارێک ناکەم، چونکە زانایان گوتوویانە: 'هەتا لێت نەپرسـن، وەڵام مەدەوە. تا بانگهێشـتت نەکەن، مەچۆ بۆ هیچ شـوێنێ. کارێک کە قازانجی بۆت نییە، وەلای نێ. ئامۆژگاری ستەمکاران مەکە، چونکە لە وەڵامی ئامۆژگاریەکەتدا ستەمت لێ دەکەن.'

"گورگ کە وتەکانی ڕێوی بیسـت، بەڕواڵەت پێکەنی، بەڵام ڕقی لێ هەڵگرت و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ناچارم ئەو ڕێویلەیە بکوژم.' بەڵام ڕێوی لەبەرابەر ئەو هەموو سـتەمەی گورگدا دانی بە خۆیدا دەگرت و بە خۆی دەگوت: 'هەرکەس خراپە لەگەڵ خەڵک بکا، خراپەی دێتەوە ڕێ و هەرکەس نەزان بێ، پەشیمان دەبێتەوە. ئەوەی سڵ دەکا، سلامەتە. ویژدان ڕەوشـتی گەورانە و ئەدەب باشـترین دەسـکەوتە. کەوایە وا باشـە من لەگەڵ ئەو ستەمکارە هەڵکەم و گوێی نەدەمێ، چونکە ئاخری پەندێکی بەسـەر دێ.' دوای ئەوە ڕێوی بە گورگی گوت: 'ئەگەر بەندەیەک تۆبە بکا و نەچێتەوە سـەر گوناهەکەی، خودا تۆبەکەی لێ قەبووڵ دەکا و لێی خۆش دەبێ. من بەندەیەکی لاواز و بێدەرەتانم، هەڵەیەکم کردووە و ئامۆژگاریەکی تۆم کردووە، ئەگەر بزانی ئەو زللەیەت چەندە ئێشـا، بۆ خۆت لێم خۆش دەبی. هەرچەند ئەو زللەیە زۆریش ئێشـا، بەڵام من گلەیەکم نییە، چونکە بە قازانجی خۆمە و لە دواڕۆژدا شـتی لێ فێر دەبم. بیسـتوومە دەڵێن: 'زللەی پەروەردە لە سـەرەتاوە تاڵە، بەڵام لە ئـاخریدا لە هەنگوینیش شـیرینترە.' ' گورگ گوتی: 'ئەوە لێت خۆش بووم و چاوپۆشیم لەو هەڵەیەت کرد، بەڵام لە بیرت نەچێ تووڕەم نەکەی و دان بە کۆیلەیی خۆتدا بنێ.'

"ڕێوی زۆری تاریف کرد و دۆعای بۆ کرد. بەڵام هەمیشـە لێی هەراسـان بوو. هەتا ڕۆژێک ڕێوی بەرەو ڕەزێک دەڕۆیشت کە لە دیواری باخەکەدا کونێکی دیت. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بە خوا قسەی تێدا نییە کە ئەو کونە لە خۆڕا نییە و فێڵێکی لەپشتە. دووریلێکردنی خێری پێوەیە، چونکە گوتوویانە: 'هەرکەس کونێک لە زەویدا ببینێ و خۆی لێ نەبوێرێ و لاقی تێ خا، بە دەسـتی خۆی خۆی تیا دەبا.' لە مێژە دەڵێن: 'هێندێک باخەوان کۆتەرەی[١] ڕێوییەک دەخەنە نێو ڕەزەکانیانەوە و کەمێک ترێی لەپێش دادەنێن هەتا ڕێوی دیکە ئەو ببینن و فریو بخۆن، بچنە ناو ڕەزەکەوە و بە تەڵەوە بن.' من سـوور دەزانم کە کونی ئەو دیوارە کەڵەکێکی لەپشتە. گوتووشیانە: 'دووریکردن بەشێکی وریاییە.' وا چاکە بە سڵەوە

١. کۆتەرەی ڕێوی: کەولی ڕێوییە پڕی دەکەن لە کا و شتی وا.

بچم لەپشتەوە چاوێک لەوبەری کونەکە بکەم بزانم چ باسە. دەبێ وریا بم نەکەومە داوەوە.' وا بوو ڕۆیشت هێدی هێدی لە دیوارەکە چووە پێشێ و بە سڵ و ترسەوە چاوێکی لێ کرد. چاڵێکی گەورەی دیت کە خاوەنی ڕەزەکە بۆ گرتنی ئاژەڵی کێوی هەڵیکەندبوو و پەردەیەکی ناسکیشی بەسەردا دابوو. لەڕێوە کشاوە دواوە و گوتی: 'سپاس بۆ خوا کە منی ترساند و بووە هۆی ڕزگاری من. ئاواتەخوازم کە دژمنی گیانی من، گورگی گلاو، تێکەوێ هەتا بۆ خۆم لەو ڕەزەدا بە ئاسوودەی و بە تاقی تەنیا بم.' دوای ئەوە سەری ڕاوەشاند و لە خۆشیان قاقا پێکەنی، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە گوتی:

خۆش دەبێ گورگی ناپاک لەو قوڵکەدا ببینم
میوەی شادی لە باخی بەختەوەریمدا بچنم
سەرەوبن لەو قوڵکەدا زیندەبەچاڵی بکەم
بەدەوری باخدا بێخەم تیر بای باڵی خۆم بدەم
جا بە کوێری دوژمنان هێشوو لێ بکەمەوە
کام هێشوو گەیوە و جوانە بۆ بێچوومی بەرمەوە

"کە شێعرەکەی تەواو کرد، هەڵات بۆ لای گورگە و پێی گوت: 'خوا کاری تۆی ئاسان کرد و ڕەزێکی بێدەردیسەری بە قسمەت کردی. ئەوەش هەر لە بەختی تۆیە. نۆشی گیانت بێ ئەو دەسکەوت و ڕۆزییە.' گورگ گوتی: 'ئەوە باخی ئاوا لە کوێ دەست دەکەوێ؟' ڕێوی گوتی: 'ڕەزێکم دیتووەتەوە خاوەنەکەی مردووە. بەوێدا ڕۆیشتم و میوەی جۆراجۆرم بە دارەکانەوە دی.' گورگ باوەڕی بە ڕێوییەکە کرد و تەماع گرتی. گورج هەستان بەرەو کونی دیوارەکە هاتن. ڕێوییەکە ڕاوەستا و بە گورگەی گوت: 'بچۆ نێو ڕەزەکەوە.' ئیدی گورگە ڕووی لە باخەکە کرد و چووە پێشێ، ویستی لە کونی دیوارەکەوە بچێتە ژوورێ، هەر کە لاقێکی خستە ئەوبەری، کەوتە چاڵەکەوە. ڕێوی ئەو شێعرەی بۆ گوت:

ئەوە هەمووی تەماعە وا خەڵک دەخاتە داو
تووشی حەرامت دەکا و ژیانت دەکا گلاو

"دوای ئەوە بە دڵخۆشییەوە ئەو شێعرەشی لەسەر خوێندەوە:

سپاس بۆ ئەو خودایە! چیم لێی ویست وەدی هێنا
لەڕێی بەختەوەریدا کەم و کەسریم نەهێنا
تۆڵەی ئەو هەموو زوڵمەی لە مام گورگ کردەوە

"ئینجا کەمێک چووە پێشــێ و ســەیری کرد ئەوە گورگ پەشــیمانە و دەگری. ڕێویش دەستی کرد بە گریان. گورگ سـەری هەڵێنا و گوتی: 'ئەوە خەمی منتە و بۆ من دەگریت؟' ڕێوی گوتی: 'بەو کەســـەی تۆی لەو چاڵە خســـتووە! لە تاوی تۆ ناگریم، بەڵکوو بۆ ئەوە دەگریم تۆ لەو چاڵەشدا هێشتا هەر ماوی. ئەو داخە دەمکوژێ تۆ بۆ زووتر نەکەوتیتە ئەو چاڵەوە؟ ئەگەر پێش ئەوەی من لەگەڵ تۆ ئاشــنا بم بکەوتبایە ئەو چاڵەوە، من هەمیشــە لە ئاسوودەیدا دەژیام.'

"گورگە پێی گوت: 'ناپاک! برۆ بە دایکم بڵێ کە من کەوتوومەتە ئەم چاڵەوە. بەشـــکو بیرێکم بۆ بکاتەوە.' ڕێوی گوتی: 'تۆ لەبەر تەماع و چاوچنۆکیت لەو چاڵە دایت. تازە ڕێی دەربازبوونت نییە. ئاخر گورگی گەوج، مەگەر نەتبیستووە کە دەڵێن: 'هەرکەس بیر لە ئاکام و داهـاتووی کـارەکـانی نەکـاتەوە لە داوی ڕۆژگـار بەدوور نـابێ و ئەگەری پێوەبوون و تێداچوونی زۆرە.' گورگ بە ڕێوی گوت: 'تۆ دەتگوت خۆشــم دەوێی. باسـی خۆشـەویستی و هاوڕێیەتیت دەکرد و سـامت لێ دەکردم. ئێسـتا بە خراپە وەڵامی خراپەکانی من مەدەوە، هەرکەس بەتوانا بێ و لە بێهێزان و داماوان خۆش بێ، خواش لێی خۆش دەبێ، هەر وەک شاعیر گوتوویەتی:

که دەســـــتــت ڕۆی قــورس و گــران بە
بە زیــپــک و زاکــوون و دلــۆڤــان بە
لەگەڵ ئەوە وا ئـــــازاری دەدای
لــێ بــبــووره تــۆ ئەگەر کە ئــازای
خــۆی لە نــاو خــۆیــدا تــریــق دەبــێــتەوە
ڕابــردووی گــڵاوی کە بــیــر دێــتەوە
ئــیــتــر لەمەودوا ئەبــێــتە بەردەت
ئەبــێــتە غــوڵام و نــۆکەر و کــۆیــلەت

"ڕێوی گوتی: 'ئاخر دڕندەی نەزان و گەوجی کێوی، مەگەر ئەو هەموو ستەم و زۆر و فیز و خۆبەزلزانییەی خۆتت لەبیر چووەتەوە؟ لە یادت نەماوە دڵی کەســت ڕا نەدەگرت و بەزەییت بە ژێردەســتانی خۆتدا نەدەهات، ئێســتا وا بە من دەڵێی؟! چۆن ئەو ئامۆژگاریەی شاعیر لە بیر بکەم کە دەڵێ:

هەرچەنــد گەورەیــی زۆر بــاشـــە ئــامــان

نەکەی بـــریـــنـــی خەڵــکـــازار دەرمـــان
بـــــــــــــــــزانە ئەوەی ڕەحم بە مار دەکا
زوڵـــمــێـــکە لە خەڵـــکـــی دیـــکەی دەکــا

"گورگ گوتی: 'گەورەم، بە کرداری خراپی خۆم لەگەڵم مەجووڵێوە و لێم خۆشـــە بە، چونکە لێبووردەیی پیشـــەی گەورانە. چاکەش باشـــترین توێشـــووی ڕۆژی پەســـڵانە، لەو بارەوە شاعیر دەڵێ:

خـــــــــــــێر و خۆشـــی دەبینن لە ژیـــان
ئەو کەسانەی باشن لەگەڵ ژێـــــــــــــردەستان

"ئیـدی بەردەوام گورگ لە بەر ڕێوی دەپـاڕاوە و دەکڕووزاوە و داوای لێ دەکرد ڕزگاری بکا. کەچی ڕێوی پێی دەگوت: 'ناجسـنی فێڵاوی، تازە دەست لە خۆت بشـۆ و بە تەمـای ڕزگـاربوون مەبە، چونکە ئەوە ئـاکـامی کـارە خراپەکـانی خۆتە.' ڕێوی هەر لەو قسانەی دەکرد و پێدەکەنی و ئینجا ئەو شێعرەی گوت:

ئەگەر دەتوانی بـــــــــکووژی، بـــــــــکووژە ئێستا
ســـێڵاوێک کە وڵاتی داگرت تازە هــــــــــــەســـتا
پـــێـش ئەوەی کەمـــانـــدار کەمـــان بـــکـــێشـــێـــتەوە
نەیـــارت وا بە تـــیـــر بـــدروو، هەڵـــنەســـــتـــێـــتەوە

"ئیدی گورگ بە ڕێوی گوت: 'ئـاخر بـاشـــترینی درندەکان، من چـاوەڕوانی چـاکە و یـارمەتیم لە تۆ بوو، نەمـدەزانی کە تۆ لەو چـاڵەدا بەجێم دێڵی و کـارت پێم نـابێ.' ئیدی دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی گوت:

چـــی دەبـــێ بە گەورەیـــی خـــۆت ئـــاورێـــک بـــدەیـــتەوە،
گـرێـیەک لە دەســـــــت و پـێـی لـێـقەومـــاوێـک بـکەیـتەوە؟

"ڕێوی گوتی: 'ئـاخر دژمنی نەزان، ئەوە چۆنـاوچۆنە دوای ئەو هەموو ســـتەم و زەبروزەنگە ئێستا ئاوا خۆت فەقیر کردووە و دەستت کردووە بە پاڕانەوە و لاڵانەوە؟! من کە ببوومە هاونشینی تۆ، لە ترس و سـامی تۆ بوو نەک لەبەر ئەوەی حەزم لە دیدارت بێ و خۆشم ویستبێتی. ئێستا سپاس بۆ خودا کە تووشی ئەو پەندە بووی و ئاوات بە سـەر

هات. مەگەر نەتبیستووە کە شاعیر دەڵێ:

هەر کەس باوەڕی بە زوڵم و ستەم بێ
ڕۆژێک کەلەبچەی لە دەست توند دەبێ
بەدڵی ئەو دەبێ ڕۆژگار بەینێ
بەڵام ڕۆژێک دێ تەختی وەرگەڕێ

"ئیدی گورگ بە ڕێوی گوت: 'ئەی جوامێری کێویان و لێ بووردەترینی ئاژەڵ، بە زمانێکی دژمنانە لەگەڵم مەدوێ و بە ڕقەوە چاوم لێ مەکە. ڕێز لەو دۆستایەتییە چەندین‌ساڵەیە بگرە و پێش ئەوەی ڕۆژی لێپرسینەوە بێ هەستە بیرێ بۆ ڕزگارکردنی من بکەوە. هەستە کەندرێک بێنە، سەرێکی لەو دارە بەستە و سەرێکی بۆ من بەردەوە بەشکو بتوانم پێیدا هەڵگەڕێم و ڕزگارم بێ. کە ڕزگارم بێ، تەواوی ئەو ماڵەی هەمە هەمووی دەدەم بە تۆ.' ڕێوی گوتی: 'تازە ڕزگاری تۆ ئەستەمە. قەت داوا لە من مەکە ڕزگارت بکەم، لە خۆڕا لە سەریشی مەڕۆ. بیر لەو هەموو کارە خراپانەی خۆت بکەوە، ئەو هەموو فڕوفێڵ و نەخشانەی بۆ منت داڕشتبوون وە بیر خۆت بێنەوە. هێشتا لەکوێتە؟ ئەوە بەردبارانیشت دەکەن. تازە لێت ڕوون بێ لەم دنیایە دەڕۆی. لەم دنیا پڕ لە چەرمەسەری و بەدبەختییە ڕزگارت دەبێ و کۆچ دەکەی. دوای تۆپینت دەچیتە دۆزەخ.' گورگ گوتی: 'گەورەم، دڵت لە ژەنگ و ژاڵ پاک کەوە. لە بیر خۆتی بەرەوە با هەر برادەرەکەی جاران بین. ئەوەش بزانە هەرکەس کەسێک لە تیداچوون ڕزگار بکا، وەک ئەوە وایە کەسێکی زیندوو کردبێتەوە. هەرکەس کەسێکیش زیندوو کاتەوە، وەک ئەوە وایە خەڵکی تەواوی دنیای زیندوو کردبێتەوە. دوای خراپە مەکەوە، چونکە زانایان و ژیران خراپەیان خۆش نەویستووە و فەرمانی دوورکەوتنەوە لە خراپەیان داوە. هیچ خراپەیەکیش لەوە خراپتر نییە کە من لەو چاڵەدا لە مەترسی مردندا بم و تۆش جارێ کای کۆن بە با بکەی. بشتوانی کارێک بۆ ڕزگارکردنم بکەی و نەشیکەی.' ڕێوی گوتی: 'ناحەزی هەڵەوەڕی ناجسن، من تۆم لەو خۆ چاکنیشاندانی ڕواڵەتی و گڵاوی دەروونییەتدا هەر وەک ئەو بازە دێتە بەرچاوم کە چی لە کەوەکە کرد.' گورگ گوتی: 'چی لێ کرد؟ ئا بۆم بگێڕەوە.'

### چیرۆکی باز و کەو

"ڕێوی گوتی: 'ڕۆژێک چووم بۆ ڕەزێک کەمێک ترێ بخۆم. بازێکم دیت هێرشی کردە سەر کەوێک و ویستی بیگرێ. کەوە هەڵفڕی، هەڵاتە نێو هێلانەکەیەوە و خۆی شاردەوە. بازەکەش دوای کەوت و چووە بەردەرکی کونەکەی و قاوی لێ کرد: 'ئەی نەفام! کاتێک

تۆم لەو دەشـــتە بە برســـیەتی دیت، بەزەیم پێتدا هات و چووم کەمێکم دانەوێڵە بۆ کۆ کردیەوە و بۆم هێنای. کەچی تۆ هەر کە منت دی خۆت شاردەوە. پێم سەیر بوو! نەمزانی بۆ هەڵاتی؟! هەستە وەرە دەرێ ئەو دانەوێڵە لێ وەرگرە بیخۆ.'

" 'کاتێک کەوەکە گوێی لە وتەی بازەکە بوو، باوەڕی کرد و لە هێلانەکەی هاتە دەرێ. لەڕێوە بازەکە هەڵمەتی دایە و توند چنگی پێدا گرت. کەوەکە بە بازەکەی گوت: 'ئەوە بوو دڵســـۆزی و یارمەتییەکەت؟! ئەوەیە ئەو دانەیەی بۆت هێناوم؟! بۆ درۆت لەگەڵ کردم؟! هیوادارم ئەو گۆشـــتەی من لە هەناوتدا ببێ بە ژەهر.' کە بازەکە کەوەکەی خوارد، لەڕێوە هەموو باڵ و پەڕی هەڵوەری و مندار بووەوە.'

"دوای ئەوە ڕێوی بە گورگی گوت: 'هەرکەس چاڵ بۆ خەڵک هەڵکەنێ، ئەوەندە ناخایەنێ خۆی تێ دەکەوێ. تۆش لە ســـەرەتاوە پیلان و بەرنامەت بۆ من بوو. وا شـــوکور ئەوە بۆ خۆت پێوە بووی.' گورگ گوتی: 'ئەو قســـە و باســـانە وەلا نێ و ئەوندە کارە خراپەکانم بە چاودا مەدەوە. هەر ئەوەی کە لەو چاڵە کەوتم و ئەو ئازارەم چێشـــت، بۆ حەوت پشـــتم بەسمە. ئێستا دژمنەکەشکم زگی پێم دەسووتێ. هەستە و ڕێگایەک ببینەوە و ڕزگارم کە، چونکە ناڕەحەتی کەسێکی پاک بۆ کەسێکی پاکی دیکە هۆی ئازارە. ئێستا دەزانم تۆش بە منەوە نـاڕەحەتی. هەســـتە خێرا بیرێکم بۆ بکەوە. هەرچی بێ تۆش هـاوڕێی منی و بە ناڕەحەتی من ناڕەحەتی. هەســـتە با ناڕەحەت نەبی. دەڵێن هاوڕێی چاک لە برا چاکترە. تۆش برایەتی بکە و ڕزگارم بکە. ئەگەر تۆ بە هانامەوە بێی و ڕزگارم بکەی، لە ماڵی دنیا خەنیت دەکەم. فێری فێڵ و کەڵەکی دیکەت دەکەم، وا بێ خێر و بەرەکەتی پێوە بێ. ترێ و میوەیەکی زیاترت دەســـت کەوێ.' ڕێوی پێکەنی و گوتی: 'زانایان قســـەی چەند جوانیان کردووە.' گورگ گوتی: 'زانایان چیان گوتووە؟' ڕێوی گوتی: 'زانایان گوتوویانە: 'هەرکەس قەڵافەتی زل و دڵێکی پیسی هەبێ، ئاوەزی[1] کەمە.' تۆم ئاوا دێتە بەرچاو. نەفام، ئەوەی تۆ دەیڵێی کە ناڕەحەتی کەســـێکی پاک بۆ کەســـێکی پاکی دیکە هۆی ئازارە، ڕاســـتە، بەڵام تۆ گەوجییەکەت لەوەدایە کە دوای ئەو هەمووە ناپاکییەی لەگەڵ منت کردووە، خۆت پێ پاکە! ئەوەی کە دەڵێی فێری فێڵ و کەڵەکی وام دەکەی کە چۆن بچمە نێو ڕەز و باخەوە، جێی ســـەرســـووڕمانە، چونکە ئەگەر بۆ خۆت کەمێک زیرەک بای و فێڵێکت زانیبا، ئاوا لە چاڵ نەدەکەوتی، یان ئێســـتا فێڵێکت دەدۆزییەوە و خۆتت پێ ڕزگار دەکرد پێش ئەوەی فێری منی کەی. تۆم وەک کەســـێک دێتە بەرچاو کە بۆخۆی نەخۆش بێ و خەڵک تیمار بکا.' گورگ کە قســـەکانی ڕێوی بیســـت، زانی کە چاکەی لە دەســـت نایە. ئیدی دەســـتی کرد بە گریان و گوتی: 'هەتا ئێســـتا لە غەفڵەتدا بووم. ئەگەر بێتوو خوا لەو چاڵە ڕزگارم بکا، تۆبە دەکەم. تازە بێهێز و لاوازتر لە خۆم ئازار نادەم. جاوێک لەبەر دەکەم و دەچمە نێو ئەو

---

[1]. ئاوەز: عەقڵ.

کێوانە و خۆ لە دڕندەگەل نادەم. خەریکی خێر و خێرات دەبم و یارمەتی هەژاران دەدەم. لە ترسی خوا هەمیشە چاو بە گریان دەبم.' لەو جەنگەیەدا دەستی کرد بە شین و گریان. ئەوەندە گریا هەتا ڕێوی زگی پێی سووتا و ڕەحمی بۆی بزووت. دڵی بە تۆبەکردنەکەی خۆش بوو. لەڕێوە هەستا و چوو لەسەر لێواری چاڵەکە دانیشت و کلکی شۆڕ کردەوە. گورگە هەستا و دەستی بە کلکی ڕێوییەکەوە گرت و ڕێویش لە چاڵەکە کەوت. ئینجا گورگ گوتی: 'ئەوە بۆ بەزەییت بە مندا نەدەهات و ئاوا پێداگریت دەکرد و سەرکۆنەت دەکردم لە کاتێکدا من هاوڕێی تۆ بووم؟! سپاس بۆ خوا ئەوە تۆش لە چاڵ کەوتی و زوو پاداشی ئەو کردەوەیەی خۆتت دیتەوە. هەر وەک زانایان دەڵێن: 'هەرکەس کەسێک لەبەر خواردنی شیری سەگ سەرکۆنە بکان، بە زووترین کات بۆ خۆشی تووشی خواردنی شیری سەگ دەبێ.' دوای ئەوە گورگ ئەو شێعرەی گوت:

بۆ دانەنیشتی لە جێی خۆت ڕێوی
ئەو دەردەت دامێ و سزاکەشیت دی
با بزانن خەڵک کە چی بەسەر دێ
ئەو زاڵمەی بۆ خەڵک چاڵ هەڵدەکەنێ
گلەیی لە کێ دەکا ئەو کەسەی
خۆڵی بەدبەختی دەکاتە سەری خۆی؟

"دوای ئەوە بە ڕێوی گوت: 'ناچارم دەبێ خێرا تۆ بکوژم، پێش ئەوەی تۆ من بە کوژراوی ببینی.' ڕێوی بە خۆی گوت: 'تازە من لەگەڵ ئەو زاڵمە تێکەوتووم و دەبێ هەر فێڵێک کە لە دەستم بێ بەکاری بێنم هەر وەک گوتوویانە: 'پاشەکەوتی فرمێسکی چاو بۆ ڕۆژی سۆزدارییە.' ئەگەر کڵاوێک لەسەر ئەو ستمکارە نەکەم، تێدا دەچم.'

مێرووله ئەگەر لە قاپێکی خز و لووس کەوێ
کاری هێز و شت نییە، فریادڕەسێکی دەوێ

"ئیدی ڕێوی بە گورگی گوت: 'بۆ کوشتنی من پەلە مەکە، چونکە پەژیوان دەبیتەوە. ئەگەر دەرفەتم بدەیتێ شتێکت پێ بڵێم و گوێم لێ بگری، سلامەتی منیش و تۆش لەوەدا دەبێ. ئەگەر بشمکوژی هیچ قازانجێکت پێ ناگا و هەردووکمان لێرەدا دەمرین.' گورگ گوتی: 'ئاخر گڵاوی فێڵاوی، ئەوە چییە وا خێری منیش و تۆشی تێدایە؟! دەرفەتی چیت لە من دەوێ؟ دەتەوێ چ بکەی؟' ڕێوی گوتی: 'من دەمەوێ تۆ خراپەم لەگەڵ نەکەی و پاداشی چاکەم بدەیتەوە، چونکە ئاگام لێ بوو تۆ تۆبەت کرد و لە کرداری ڕابردووی خۆت

پەشیمان بوویتەوە و خەریک بووی تۆبەت دەکرد لەوەی کە هاوڕێیانی خۆت ئازار بدەی. گوێم لێ بوو سوێندت دەخوارد کە ئەگەر بێتوو لەو چاڵە ڕزگارت بێ، تازە ترێ و میوەی شیرین نەخۆی و بەپارێز و لەخواترس بی و نینۆکت بکەی و کەڵبەت بشکێنی و چاو لە بەر بکەیت. تێکۆشی لە خودا نیزیک بیتەوە. کە ئەوانەم بیست، منیش باوەڕم پێ کردی و بەزەیم پێتدا هات. هەر چەند هەوڵم دەدا تێدا بچی، بەڵام کە تۆبە و بەڵێنییەکانی تۆم بیست، پێم وا بوو ئەرکی منە تۆ لەو چاڵە ڕزگار بکەم. ئیدی وا بوو کلکم شۆڕ کردەوە تا تۆ بیگری و بێیتە دەرێ. ئیدی تۆ بەو هێز و توانایەت کە بووت بە ئارامی کلکمت نەگرت، بێیتە سەرێ، بەڵکو بە هەموو هێزی خۆت بە جۆرێک کلکمت کێشا خەریک بوو گیانم دەرچێ. هەر بۆیە منیش دەستم سست بوو، کەوتمە نێو چاڵەکە و ئیستا ئەوە ناتوانین خۆمان ڕزگار بکەین. بەڵام دەبێ دوای چوونە دەر لەو چاڵە، بەڵێنی خۆت بەریتە سەر بۆ ئەوەی بتوانم لەگەڵت هاوڕێ بم.' گورگ گوتی: 'ئەوە چییە کە ئەگەر بێتوو بە قسەت بکەم لێرە ڕزگارمان دەبێ؟' ڕێوی گوتی: 'تۆ ڕاستە ڕاوەستە، من دەچمە سەر پشتی تۆ و دەڕۆمە دەرێ، ئەو دەم دەچم کەندرێک، گوریسێک، شتێک دێنم بۆت شۆڕ دەکەمەوە پێیدا وەرە دەرێ.' گورگ گوتی: 'من باوەڕم بە قسەی تۆ نییە، چونکە زانایان گوتوویانە: 'هەرکەس باوەڕ بە خوێڕی بکا، فریوی خواردووە. هەر کەس ئەزموونکراوێک ئەزموون بکاتەوە، تووشی پەشیمانی دەبێ.' شاعیر لەو بارەوە دەڵێ:

تاقیم کردوویەوە و دەزانم کێی، باشت دەناسم
هەتا کەسێک تاقی نەکەیەوە، مەڵێ دەیناسم

"ڕێوی گوتی: 'ڕەشبینی لە هەر حاڵێکدا بێ هەر خراپە و گەشبینی کارێکی جوامێرانەیە. وا باشترە بیر لە ڕێگای ڕزگاربوون بکەینەوە، چونکە ڕزگاربوونی من و تۆ لەوە چاکترە هەردووکمان لێرەدا بمرین. بیری خراپ مەکەوە، چونکە ئەگەر تۆ ڕەشبین بی و لە من بەدگومان بی و باوەڕت پێم نەبێ، دوو شت دێتە گۆڕێ یان شتێک دێنم تۆ پێیدا سەر دەکەوی و ڕزگارت دەبێ یان درۆت لەگەڵ دەکەم و بۆ خۆم ڕزگارم دەبێ و تۆش لێرەدا بەجێ دێڵم. کە دیارە ئەوەی دووەمیان قەت ڕوو نادا، چونکە یەک، من قەت لە ترسی لێپرسینەوەی دواڕۆژ ناوێرم کاری وا بکەم، دەزانم تۆڵەی ئەو کارە ناپاکەم لێ دەکرێتەوە. کەوایە خۆم چارەڕەش ناکەم. لەو بارەوە دەڵێن: 'ئەمەکداری جوان و ناپاکی دزێوە.' وا چاکە تۆ پشت بە من ببەستی، چونکە من مامۆستای ئەو کارانەم. ئیستا زوو لە بیر چارەیەکدا بە کە ئەوەندەمان کات بە دەستەوە نەماوە تا درێژدادڕی بکەین.' گورگ گوتی: 'هەرچەندە من باوەڕم بە تۆ نییە، بەڵام دەزانم تۆ گوێت لە تۆبەی من بوو وا بە تەما بووی یارمەتیم بدەی. منیش بە قسەت دەکەم. ئەگەر فڕوفێڵێکت لەبن سەردا بێ، ئەوە هەر

ئەو فڕوفێڵە سەری خۆشت دەخوا.'

"ئیدی گورگەکە لەنێو چاڵەکەدا ڕاست ڕاوەستا و ڕێوی چووە سەر شانی. هەرچەند کەمێکی مابوو، بەلام بە هەر چۆنێک بوو چنگی لە زەوی گیر کرد و هاتە دەرێ. گورگ گوتی: 'هاوڕێی دڵسۆز، منت لە بیر نەچێ و زوو فریام کەوە.' ڕێوی قاقایەکی کێشا و گوتی: 'نەزان، ئەوە بزۆزی و قۆشمەی خۆم بوو کردمییە دیلی تۆ. کاتێک تۆبەی تۆم بیست، خۆشحاڵ بووم و دەستم کرد بە سەما و هەڵپەڕکێ و کلکم خستە نێو قوڵکەکەوە و تۆ کلکمت گرت و کێشاتمە خوارێ. وا بوو خوا ڕەحمی پێ کردم و لە دەست تۆ ڕزگارم بوو. ئێستا چۆن من بمەوێ تۆ نەمری لە کاتێکدا تۆ لە خێڵی شەیتانی؟! دوێنێ شەو لە خەونمدا بوو لە شایی تۆدا هەڵدەپەڕیم. خەونەکەم بۆ خەونلێکدەرەوان گێڕاوە، گوتیان کە تۆ دەکەوییە تەنگەژەوە و زوو ڕزگارت دەبێ. گیرکردنی من لە دەست تۆدا و ڕزگار بوونم، ڕاست لێکدانەوەی ئەوە خەونە بوو. نەفام، بزانە من دژمنی تۆم و تۆ لەبەر بێعەقڵی داوای یارمەتی لە من دەکەی. زانایان گوتوویانە: 'حەسانەوەی خەڵک لە گرەوی مەرگی بەدکاراندایە، پاک بوونەوەی زەویش لە تێداچوونی ئەواندایە.' من لەوە دەترسم ئەگەر بێتوو لەگەڵت نەرم بم، تووشی بەدبەختی و ڕۆژڕەشی بم، دەنا هەوڵم دەدا ڕزگارت کەم.' کە گورگ گوێی لە ڕێوی بوو، سەری زمانی خۆی گەزت."

لێرەدا سپای تاریکی کەوتە پاشەکشە و ڕۆژ دیاری دا. شەهرزادیش درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# کە بوو بە شەوی سەد و پەنجایەم

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، کە گورگ ســـەری زمانی خۆی گەزت، بە خۆبەکەمگرییەوە زۆر کزۆلانە بە ڕێوی گوت: 'خێڵی ڕێوی زمانخۆشـــترین و خوێنشـــیرینترین ئاژەڵی کێوین و زۆرتان حەز لە گاڵتە و جەفەنگ و یارییە. دەزانم ئەو قسانەش هەر بە گەمە دەکەیت، بەڵام ئەوەش بزانە هەموو کاتێک کاتی گەمە و شۆخی نییە.'

"ڕێوی گوتی: 'گاڵتە سنووریکی هەیە، ئاقڵان ئەو سنووره دەناسن. پێت وا نەبێ دوای ئەوەی لە دەست کەسێکی وەک تۆی ستەمکار ڕزگام بێ، دیسان فریوی تۆ بخۆم.' گورگ گوتی: 'وا باشـــە بۆ ڕزگاری من هەوڵ بدەی، چونکە ئێمە دۆســـت و برادەری ڕۆژێک و دووان نین. ئەگەر تۆ من ڕزگار بکەی، منیش ناچارم پاداشـــێکی باشـــت بدەمەوە.' ڕێوی گوتی: 'زانایان گوتوویانە: 'لەگەڵ بەدکاران مەبنە هاوڕێ، چونکە هاوڕێی بەدکار تۆش تووشـــی بەدکاری دەکا. لەگەڵ بەخیل مەبنە هاوڕێ، چونکە ئەگەر چاکەت لێ ببینێ، پشـــتگوێی دەخا و ئەگەر خاڵێکی لاوازت لێ ببینێ، زەقی دەکاتەوە.' دیســـان لە شـــوێنێکی دیکەدا گوتوویانە: 'هەر شـــتێک چارەیەکی هەیە جگە لە مردن کە هیچ ڕێگەچارەی نییە. هەموو شـــتێک دەتوانی لە خۆت دوور خەیەوە جگە لە قەزا و قەدەر.' بەڵام ئەوەی کە تۆ دەڵێی پاداشـــی چاکت دەدەمەوە، لێرەدا تۆم وەک ئەو مارە دێتە بەرچاو کە لە دەســـت مارگرەکە هەلات. ڕۆژێک پیاوێک دیتی ئەوە مارێک زۆر توند ڕا دەکا. پیاوەکە لێی پرســـی: 'ئەوە چ بووە وا بە پەڕتاو ڕا دەکەی؟! چیت بەدواوەیە؟' مارەکە گوتی: 'لە ترســـی مارگر هەڵدێم. ئەگەر بێتوو تۆ پەنام بدەی و بمشارییەوە، خەلاتێکی باشت دەکەم.' کابرا بە تەمای خەلاتێکی باش مارەی هەڵگرت و لە گیرفانی نا. کە مارگرەکە هات و تێپەڕی. مارەکە ترسی نەما و ئاسوودە بوو. پیاوەکە گوتی: 'ئەوجار نۆرەی خەلاتەکەی منە چیم دەدەیەی، ئەوە من تۆم لەو مەترســـییە ڕزگار کرد؟' مارەکە گوتی: 'پێم بڵێ بە کوێتەوە دەم، چونکە پاداشـی من هەر ئەوەیە؟' ئیدی مارەکە وای بە کابراوە دا کە لەڕێوە تووکی سـەری وەری و کوشـــتی. نەفام، بەســـەرهاتی من و تۆش وەک ئەو مارە و ئەو کابرایە وایە. مەگەر تۆ نەتبیستووە دەڵێن:

چـــاکەکـــردن لەگەڵ خـــراپـــکـــاران
پەشـــــیـــمـــانـــی بەدواوەیە، یـــاران

"دوای ئەوە گورگ گوتی: 'ئەی ڕەوانبێژترینی گیان لەبەران و دەنگۆشی بێهاوتا، مەگەر تۆ نازانی من چۆن دەتوانم بەســەر مرۆڤەکاندا زاڵ بم؟! هێرش دەکەمە سـەر قەلاکانیان و

ڕەزەکانیان لێ تێک دەدەم. تۆ لە فەرمانی من دەرمەچۆ و وەکوو کۆیلەکان لەبەرابەر خاوەنەکانیان گوێبەفەرمان بە. ڕێوی گوتی: 'گەوجی نەفام، لەسەر ئەو حاڵەشدا وام فەرمان بەسەردا دەدەی دەڵێی من کۆیلەی تۆم! باشە شوکوور ئەوەندەی نەماوە بەردبارانت کەن و هەموو گیانت بشکێنن.'

"دوای ئەوە ڕێوی چوو لەسەر گردۆڵکەیەک هەستا سەر پاشووان، دەستی کرد بە واقەواق و سەرنجی خاوەنی ڕەزەکەی ڕاکێشا بۆ لای خۆی. بەدوای ئەوەدا خەڵک ڕژانە ناو باخەوە. ڕێوییەکە هەر لەوێ بوو کە خەڵکەکە گەیشتنە لای چاڵەکە و ڕێوی دەرباز بوو. خاوەنی باخ و خەڵکەکە گورگەکەیان لەنێو چاڵەکەدا دیت. ئیدی بە دار و بەرد تێی گژانێ و هەتا کوشتیان هەر لێیان دا. ئینجا گەڕانەوە. ڕێویش دوای ئەوان گەڕاوە سەر چاڵەکە و گورگەکەی بە تۆپیوی دیت. لە خۆشیاندا کلکی ڕادەوەشاند و ئەو شێعرەی گوت:

هەزار شوکور وا بە یارمەتی خوا
فەوتا و تێداچوو نەگبەتی نەما
ئەوەی لە بیری فەوتاندندا بوو
خودا فەوتاندی و ئیتر تێداچوو
قوڵکە هەڵکەنی بۆ خەڵکی دیکە
خۆت تێ دەکەوی چاو و گوێ وەکە

"دوای ئەوە ڕێوی بێ ڕکەبەر لەنێو ڕەزەدا دەهات و دەچوو.

ئەوجار چیرۆکێکی دیکەش لە بارەی مشک و سمۆڕەوە دەگێڕنەوە کە ئەویش ئاوایە، دەگێڕنەوە:

# چیرۆکی مشک و سمۆره

"مشکێک و سمۆرەیەک لە ماڵی پیاوێکی هەژاردا هێلانەیان کردبوو. بە ڕێکەوت یەکێک لە هاوڕێکانی ئەو خاوەنماڵە نەخۆش کەوت. نۆشـدار گوتبووی: 'دەبێ کونجی پاکراوی بۆ بێنن.' ئەویش کەمێکی کونجی دا بەو پیاوە هەژارە هەتا پاکی بکا. ئەو پیاوە نەخۆشـەش کونجییەکەی دا بە خێزانی هەتـا بۆی پـاک بکـا. دوای ئەوەی توێکڵەکەی لێ کردەوە. بە ڕێکەوت سـمۆرە چاوی پێی کەوت و ئەو ڕۆژە هەر لەو کونجییەی کێشـاوە هەتا هیچی وای لێ نەهێشـتەوە. کە ژنە هـات و دیتی ئەوە کونجییەکە کەم بووەتەوە، لە نزیـک کونجییەکە خۆی مات دا هەتا بزانێ بۆ کەمی کردووە. وا بوو سـمۆرە هاتەوە بۆ بردنی کونجی دیکە. ژنەکەی دیت لەوێ دانیشـتووە. زانی ئەوە لەوێ دانیشـتووە ئاگای لە کونجییەکەیە. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەو کارە دوارۆژێکی باشـی نییە، دەبێ کارێک بکەم کارە خراپەکانی پێشووشمی پێ ڕاست کەمەوە.'

"ئیدی چوو کونجییەکانی هێلانەکەی خۆی هێنـاوە جێی خۆی. کە ژنەکە ئەوەی ئـاوا دیت، گوتی: 'کەمبوونەی کونجییەکە کاری ئەو سـمۆرەیە نییە. ئەوە یەکی دیکە بردوویەتی و ئەو دەیهێنێتەوە، زیانییەکە هی ئەو نییە. ئەوە چاکەمان لەگەڵ دەکا و وەڵامی چاکە دەبێ هەر چاکە بێ. بەڵام من دەبێ هەر لێرە بم هەتا بۆم دەردەکەوێ چی ئەو کونجییە دەبا.' سمۆرە زانی کە ئەو ژنە لە دڵی خۆیدا دەڵێ چی. ئیدی هەستا چوو بۆ لای مشکەکە و پێی گوت: 'خوشکێ، هەرکەسێک دڵی دراوسێ ڕانەگرێ، لە هاوڕێیەتیشی نابێ ئەرخەیان بێ.' مشـک گوتی: 'بەڵێ خوشـکێ وایە، بەڵام لەبەر چی وا دەڵێی؟' سـمۆرە گوتی: 'خاوەنی مـاڵەکەمـان کونجی هێنـاوە. خۆی و خێزانەکەی لێیـان خواردووە و تێر بوون، ئەوەی دیکەشیان لەوێ داناوە. تەواوی گیانلەبەران لێیان خواردووە، تۆش بچۆ بەشی خۆت بێنە تا تەواوە نەبووە.'

"مشکە بەو هەواڵە دڵخۆش بوو، سەمای کرد، هەڵبەزی و بە کلکی خۆی کایەی کرد و بە تەمای کونجی فریوی خوارد. خێرا هەسـتا و لە ماڵەکەی خۆی هاتە دەرێ. کونجییە پاککراوەکەی دیت کە لەبەر سـپیان وەک خۆر دەبریسـکاوە، ژنەش بۆ چـاوەدێری دانیشـتبوو. ئیدی مشـکەش بیری لە ئەکامی کارەکەی نەکردەوە و خۆی پێ نەگیرا. خۆی هاویشـتە نێو کونجییەکە و ویسـتی لێی بخوا. ئەو ژنە بە دارێکەوە بۆی هات و دارێکی گەیاندێ و سـەری شـکاند و تۆپاندی. هۆی بە کوشـتچوونی تەماع و بیرنەکردنەوە لە ئاکامی کار بوو."

شەهریارشا گوتی: 'شەهرزاد، چیرۆکەکەت زۆر خۆش بوو. ئەگەر چیرۆکێک لە بارەی

بردنەســـەری پەیمانی هاوڕێیەتییەوە دەزانی، بیڵێ." شـــەهرزاد گوتی: "بەڵێ پاشـــام، بیستوومە...

### چیرۆکی قشقەڕە و پشیلە

"قشــقەڕەیەک و پشــیلەیەک پێکەوە هەڤاڵ بوون. بە ڕێکەوت هەردووکیان لەبن دارێک بوون کە پڵنگێک لەولاو هات بۆ لای ئەوان، هەتا نەگەیشـــتێ ئەوان ئاگایان لێی نەبوو. کە پڵنگەکە لێیان نیزیک بووەوە، قشـقەڕەکە هەڵفڕییە سـەر دارەکە و پشـیلەی فەقیریش لەوێ سەرگەردان بوو. لە پەنایەک خۆی مەڵاس دا. بە قشقەڕەی گوت: 'هاوڕێی بەوەفا، بیرێ بۆ منیش بکەوە.' قشــقەڕە پێی گوت: 'کاتێک نەهامەتییەک دێتە خوارێ، پێویســتە یارمەتی لە هاوڕێیان وەرگیرێ و ئەوانیش دەبێ یارمەتی بدەن. وەک دەڵێن:

هـــاوڕێـــیەک هـــاوڕێـــیە و بە کـــارت دێ
لە خۆشـــی و ناخـــــــــــۆشـــی لەگەڵت بێ
هـــاوڕێیەک هـــاوڕێی خۆشـــی و خواردن بێ
ڕۆژی تــــــــــــەنگـانە قەت لە لات نـابێ

"بە ڕێکەوت شوانێک لە نزیک ئەو دارە بوو، کە سەگی پاسی زۆر دڕ و ئازای پێ بوو. قشقەڕە چووە نیزیک سـەگەکان. بۆ ئەوەی بە تەماعیان خا، بە پێ دەڕۆی. سـەگەکان بۆی چوون بیگرن، ئەویش دەسـتی کرد بە باڵەفڕە هەر ئەوەندە نەتوانن بیگرن. سـەگەکان کە دیتان، وایان زانی ناتوانێ چاک هەڵفڕێ. بە تەمای گرتنی کەوتنە سـەری. ئەویش بە لاق و بە باڵ دەسـتی کرد بە هەڵاتن هەتا سـەگەکان هەموو بەدوایدا هاتن. بەو فێڵە سـەگەکانی هەتا نزیک دارەکە برد کە سـەگەکان لەوێ چاویان بە پڵنگەکە کەوت، قشـقەڕەیان لە بیر چووەوە و کەوتنە سـەر پڵنگەکە. قشـقەڕەکەش فڕییە سـەر دارەکە و پشـیلەکەش خۆی دەرباز کرد. بەو جۆرە قشـقەڕە هاوڕێکەی لەو مەترسـییە ڕزگار کرد. پاشـای ئازیز، ئەو چیرۆکەم بۆیە بۆ گوتی کە هـاوکاری و هـاوڕێیەتی پـاک دەتوانی مرۆڤ لە گیروگرفت ڕزگار بکا. هەروەها لە بارەی چیرۆکی ڕێوی و قەلەڕەشەوە دەگێڕنەوە:

### چیرۆکی ڕێوی و قەلەڕەشە

"ڕێوییەک لە کێوێک کولانەی هەبوو. هەرچەند بەچکەی دەبوو، لە برســـان هەموویانی دەخوارن. لە لووتکەی ئەو کێوەش قەلەڕەشـــەیەک هێلانەی هەبوو. ڕێوی ویســـتی لەگەڵ

قەلەڕەشـــەكە نێوانیان خۆش بێ و ببنە هەواڵ و لەو تەنیاییە ڕزگاری بێ. بۆ پەیداكردنی بژیو یارمەتیدەری یەكتر بن. ئیدی لە قەلەڕەشـەكە چووە پێشـێ تا ڕادەیەک كە گوێیان لە دەنگی یەكتر بێ. سـڵاوی لە قەلەكە كرد و گوتی: 'ئەرێ دراوسـێ، دەزانی دراوسـێ زۆری حەق بەسـەر دراوسـێوە هەیە. تۆش هاوسـێی منی و حەقێكی زۆرت بەسـەرمەوە هەیە و ئەركیشـە. بە تایبەت كە خۆشـەویسـتی تۆ لەنێو دڵی مندا جێگای تایبەتی هەیە. هەر ئەو خۆشەویستییەت بۆتە هۆی ئەوەی سۆزی تایبەتم بۆت هەبێ. تۆ دەڵێی چی؟' قەلەڕەشەكە گوتی: 'وەڵڵا قسـەی ڕاسـت خۆشـە. هەرچەند دەكەم باوەڕ ناكەم، ئەوەی بە زمان دەیڵێی، لە دڵیشـــدا هەر ئەوە بێ. دەترسـم بە ڕواڵەت برا و لە ڕاسـتیشـدا دژمنم بی. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی كە دەكرێ من بژیوی تۆ بم، دۆسـتایەتی ئێمە ڕێی ئاقڵ نییە. نازانم بۆ تۆ داوای شـتێک دەكەی كە جێبەجێ نابێ. تۆ لە ڕەچەڵەكی دڕندەی و من لە ڕەچەڵەكی باڵندە. برایەتی ئێمە سـەر ناگرێ.' ڕێوی گوتی: 'مەبەسـتی من لەو دۆسـتایەتی و برادەرییە ئەوەیە كە لە كارەكانماندا هاوكاری و یاریدەدەری یەكتر بین و لە كارەسـاتەكاندا فریادرەسـی یەكتر بین. هەردوو لامان لەو دۆسـتایەتییە قازانج بكەین. من چیرۆكێک لە بارەی پاكی و ڕاسـتییەوە دەزانم، ئەگەر پێت خۆش بێ بۆت دەگێڕمەوە.' قەلەڕەشـەكە گوتی: 'بیگێڕەوە با ئامانجەكەی تۆم بۆ ڕوون بێتەوە.'

"ڕێوی گوتی: 'هاوڕێی بەڕێزم، لە بارەی كێچ و مشـكەوە چیرۆكێک دەزانم كە پاكی و ڕاسـتی ئامانج و مەبەسـتەكەی من دەسـەلمێنێ.' قەلەڕەشـەكە گوتی: 'دا بیگێڕەوە بزانین چییە؟'

## چیرۆكی مشک و كێچ

ڕێوی گوتی: 'مشـكێک لە ماڵی بازرگانێكی دەوڵەمەندا هێلانەی هەبوو. شـەوێک كێچێک چووە خەوگەی بازرگانەوە. جەسـتەیەكی نەرمی وەگیر كەوت و ئەویش زۆر تینوو بوو. خوێنەكەی هەڵمژی. بازرگان ناڕەحەت بوو، هەسـتا دانیشـت. بانگی خزمەتكارەكانی كرد. خزمەتكارەكان گەیشـتنێ و قۆڵیان لێ هەڵماڵی و دەسـتیان كرد بە گەڕان بە دوای كێچدا. كە كێچەكە ئەوەی زانی، خێرا دەرچوو، ڕێی كەوتە نێو هێلانەی مشكەكەوە. چووە ژوورێ و مشـەكە چاوی پێی كەوت و گوتی: 'ئەوە بۆ هاتوویتە ئێرە؟ كێچەكە گوتی: 'لە ترسـی گیانم پەنام بۆ ئێرە هێناوە. دەبێ داڵدەم بدەی. دەنا تەماعم لە ماڵی تۆ نەكردووە و خراپەیەكم لێ نابینی.' كە مشكەكە قسەی كێچەكەی بیست ...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆكی ئەمشـەویش كۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆكەكەی هەڵگرت بۆ شەوێكی دیكە.

## كە شەوى سەد و پەنجا و يەكەم هاتەوە

گوتى: "خاوەنشكۆ، 'مشكەكە كاتێك قسەى كێچەكەى بيست، گوتى: 'جا ئەگەر وەك تۆ دەڵێى ئاوايە، لێرە مات بە و خەمى هيچ شـتێكت نەبێ. هەتا بۆ خۆم لێرە بم، ناهێڵم هيچت بۆ بێتە پێشـــێ. نەچى بير لەوە بكەيتەوە كە تەواوى خوێنى بازرگانەكەت هەڵنەمژيوە و خەمى بۆ بخۆى. دەبێ ڕازى بى بە بەشى خۆت، بيستووتە دەڵێن:

ئەو كەســـەى ڕازى نەبــێ بە بەشـــــى خــۆى لە ژيــنــا
قەت قەت نــاحەســـێــتەوە، دەمــرێ لە ئــێــرەيــيــدا

" 'كێچ گوتى: 'خوشــكێ، ئامۆژگارييەكەتم بيســت و بە گوێت دەكەم. قەت لە قســەت دەرناچم هەتا ئەتۆ ئاوا بۆ من دڵسۆز بيت.' مشك گوتى: 'ڕاستى سۆزى تۆ ماناى نييەتى پاكە.' ئيدى پەيمانى خوشــكايەتى و دڵســۆزيان بەســت. كێچ شــەوانە دەچووە خەوگەى بازرگان و بە ڕۆژدا دەهاتەوە ماڵى مشــكە. ڕۆژێكيان بازرگان هاتەوە ماڵێ و زێڕێكى زۆرى لەگەڵ خۆى هێنابووەوە. بە زێڕەوە ئەوبەرەوبەرى دەكرد و دەنگيان دەهات. كە مشكەكە دەنگى زێڕەكانى بيست، سەرى لە كونكەى هێنا دەرێ و تێى ڕوانى هەتا سەرى لەسەر پشتييەكە دانا و خەوى لێ كەوت. ئينجا مشكە بە كێچەكەى گوت: 'دەتوانى بيرێك بكەيەوە كەمێك لەو زێڕانە بەرين و بە ئاواتمان بگەين؟' كێچ گوتى: 'دەبێ شـتێكت بوێ لە تواناتدا بێ. بەڵام ئەگەر لاواز و بێهێز بى، ئەوە پێوەش دەبى و بە ئاواتەكەشـــت ناگەى. وەك ئەو چۆلەكەى كە دەچێ دانەكەى هەڵـدەگرێتەوە و بە داوەكەوە دەبێ و ڕاوچى دەيگرێ. ئەو دۆزەى ئەوان چ جياوازييەكى لەگەڵ دۆزى ئێمە نييە. چونكە نە تۆ هێزى ئەوەت هەيە زێڕەكان هەڵگرى و لە ماڵێ بيانهێنيتە دەر و نە منيش دەتوانم دەنكێك لەوانە هەڵگرم.' مشـــك گوتى: 'من لە ماڵەكەى خۆمدا حەفتا كونم دروســـت كردووە. لە هەر كامەيانەوە پێم خۆش بێ دێمە دەرێ. بۆ پاشەكەوتكردنى شت شوێنى زۆر قايم و تايبەتيم هەيە. ئەگەر تۆ كارێك بكەى بازرگان بچێتە دەر، من كارى خۆم دەكەم و دەيانهێنم.' كێچ گوتى: 'ئەمن هەوڵى خۆم دەدەم، بازرگان بەرمە دەرێ.' ئيدى كێچەكە چووە ناو جێگەكەى بازرگانەوە دەســـتى كرد بە پێوەدانى، نە جێيەك نە دوو جێ، ئەوەندەى پێوە دا هەتا بازرگانى ناچار كرد هەستا و دەستى كرد بە پشكنينى خۆى. كێچە بە لەز خۆى شاردەوە. بازرگان زۆر گەڕا هيچى نەديتەوە، ئيدى بە لايەكەى ديكەدا نووســـتەوە. كێچە كە زانى ديســـان وەركەوتووەتەوە، هاتەوە جەســـتەى و لە جارى پێشـــووى خراپتر پێوە دا. هەتا دواييەكەى بازرگان خەوەكەى زڕا و لە جێگاكەى هاتە دەرێ. كێچەكە ئاواش يەك دوو

جاری پێوەی دا. بازرگان ناچار لە ژوور هاتە دەر و لەسەر سەکۆکەی بەر دیوەکەی خەوت. خەڵک بازرگانیان دی لەوێ خەوتووە و هەر یەکەی قسەیەکیان دەکرد.'

### درێژەی چیرۆکی ڕێوی و قەلەڕەشە

"دوای ئەوە ڕێوی بە قەلەڕەشەکەی گوت: 'ئەی گیانلەبەری ژیر و وریا، من ئەو چیرۆکەم بۆیە بۆ گێڕایەوە هەتا بزانی ئەگەر بێتوو چاکەم لەگەڵ بکەیت، منیش وەڵامی چاکەکەت بە چاکە دەدەمەوە. هەر وەک چۆن کیچەکە وەڵامی چاکەی مشکەکەی ئاوا چاک داوە.' قەلەڕەشە گوتی: 'ڕێوی، تۆ تەواوی گیانت فێڵ و کەڵەکە و کەسی فێڵاوی کەس ناتوانێ باوەڕی پێ بکا. کەسێک لەسەر گفت نەبێ و پەیمانشکێن بێ، بۆ ئەوە نابێ بیهێنیتە پەنا دەستی خۆتەوە و لەگەڵی ببی بە هاوڕێ. کارێکی باش نییە. هەر ئەم ماوە بیستم تۆ هاوڕێی دێرین و لە مێژینەی خۆت، مام گورگت خاپاندووە و سەریت بە فەتەرات داوە. سەرەڕای ئەوەی کە ئەو هاوڕەگەزی خۆت بووە و هەردووکتان دڕندەی کێوین و لە مێژە هاودەم و هاوڕازی یەکترن. دەی تۆ لەگەڵ هاوڕێ و هاوڕەگەزی خۆت ئاوا بکەی، بڵێی لەگەڵ من چ بکەی؟! ئەو کارەی من و تۆ وەک و نەقڵی شەهێنەکە و گیانلەبەرە لاواز و بێهێزەکان وایە.' ڕێوی گوتی: 'جا شەهێن چی لەوان کردووە؟'

### چیرۆکی شەهێن و باڵندەکان

"قەلەڕەشە گوتی: 'دەگێڕنەوە شەهێنێک بوو ناجسن و زۆردار.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سەد و پەنجا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، قەلەڕەشــە گوتی: 'دەگێڕنەوە شــەهێنێک بوو ناجســن و زۆردار. تەواوی باڵندە و پەلەوەرەکان لێی دەترســـــان و کەس نەبوو گلەیی لە دەســـــتی نەبێ و ستەمی لێ نەکردبێ. هەتا وای لێ هات شەهێنەکە بەرەو کزی و لاوازی چوو، ڕاوی چاکی پێ نەدەکرا و برسی و بێهێز بوو. ئیتر بڕیاری دا ئەوەندە سەرەڕۆ و دوورەپەرێز نەبێ و وە خەڵکی کەوێ. کە دەچووە نێو باڵندەکان، هەموو هەڵدەفڕین. ئەو بێهێز و باڵشـــــکاو و پەککەوتەیەی دەمانەوە، دەیگرتن و دەیخواردن.

" 'کورتی کەمەوە، دوای ئەو هەمووە خۆڕانان و بەرزەفڕییەی، بۆ پەیدا کردنی بژیوی ژیانی ڕووی لە فێڵ و کەڵک و خوێڕیگەری کردبوو. ڕێوی تۆ ئەگەر هێز و تین و گوڕت بایە، لە بیر فێڵ و کەڵەکدا نەدەبووی. من گومانم لەوەدا نییە کە دۆســـتایەتی و هاوڕێیەتی تۆ شـــــتێکی تێدایە، منیش کەســــێک نیم فریوی تۆ بخۆم و لەگەڵ تۆ ببمە هاوڕێ. لەبەر ئەوەی خوا باڵ و پەڕی بەهێز و چاوی بەحوکمی وای داومێ کە نەیداوە بە کەســـی دیکە. دوورەپەرێزی لە خەڵکیشـــــی داومێ. ئەوەش بزانە هەرکەس چاو لە گیانلەبەری لە خۆی بەهێز و تواناتر بکا، تووشــی ڕەنج و کوێرەوەری دەبێ. تەنانەت جاری واشــە تێدا دەچێ. بەڵام ڕێوی، من نیگەرانی تۆم، چونکە دەتەوێ وەک لە هی لە خۆت بە هێز و تواناتر بچی. ئاوا تۆ وەک چۆلەکەکەت لێ دێ.'

"ڕێوی گوتی: 'چۆلەکەی چی؟ دا بۆم بیگێڕەوە بزانم چۆلەکەکە چی لێ هات.'

### چیرۆکی چۆلەکە و هەڵۆ

"قەلەڕەشە گوتی: 'ڕۆژێک چۆلەکەیەک چاوی لێ بوو هەڵۆیەک لە ئاسمانەوە ڕۆ بووە کاوڕێک[1] و هەڵیگرت. چۆلەکە کە ئەوەی دیت، باڵی فش کردەوە و چنگی قرژ کرد و گوتی: 'جــا من چیم لە هەڵۆ کەمترە؟! من دەنکێکی گەورەتریش هەڵــدەگرم. ئەویش ڕۆ بووە بەرانێکی گەورە کە تیســکی[2] بســـتێک دەبوو. هەر کە چۆلەکەکە چنگی لە تووکی پشـــتی بەرانەکە گیر کرد تەواوی لە چنگ و پەلی ئالا. ویســـتی هەڵفڕێ نەیتوانی، وەک بە داوەوە بوو بێ گیری کرد. دەســـتی کرد بە باڵەپرژە. شــوانەکە چاوی لێ بوو هات و چۆلەکەکەی گرت و بردییەوە بۆ منداڵەکانی. ئەوانیش پەتێکیان لە لاقی کرد و بوو بە گەپچاڕی دەستی

---

١. کاوڕ: بەرخی لەشیربڕاو و دووساڵە.

٢. تیسک: مووی مەڕ.

منداڵان. یەکێک لە منداڵەکان لە بابی پرســـی: 'بابە، باشـــە بۆ بە تووکی بەرانەکەوە بوو؟' بـابی گوتی: 'چونکە چۆلەکەکە خۆی زۆر بە زل زانی و لە بیری چووەوە کە چۆلەکەیە.' ئیدی ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە. دوایە گوتی: 'ڕۆڵە، هەرکەســـەی دەبێ خۆی و ڕادەی و تواناییەکانی خۆی بزانێ و چاو لە هی دیکە نەکا، دەنا ئاوا تێدا دەچێ.' تۆش ڕێوی، دەست هەڵگرە بچۆ بە لای کاری خۆتەوە، با سەرت بە فەتەرات نەچێ.'

"ڕێوی کە زانی قەلەڕەشـــە هاوڕێیەتی ناکا، مات بوو. لە داخان هەر ددانەچیرەی بوو. کاتێک قەلەڕەشــەکە ئاگای لە گریان و ناڕەحەتی و ددانەچیرەی ڕێوی بوو، پرســی: 'چییە ئەوە بوا دەکەی؟' ئەویش گوتی: 'لەبەر ئەوەی تۆم لە خۆم فێڵاویتر و زۆرزانتر دیـت.' ئەوەی گوت و گەڕاوە بۆ شوێنەکەی خۆی."

ئیدی شـــەهریارشـــا گوتی: "چەند چیرۆکێکی خۆش بوو! ئەگەر هی دیکەش دەزانی، بیڵێ."

### چیرۆکی ژیشک و قومری

شـەهرزاد گوتی: "دەگێڕنەوە، ژیشـکێک لە پەنا دارێک ماڵی کردبوو. جووتێک قومریش لەســەر دارەکە هێلانەیان هەبوو، بۆخۆیان خەریکی خۆشـی و ڕابواردن بوون. ژیشـک لە دڵی خۆیدا گوتی: 'قومرییەکان بۆخۆیان لە میوەی دارەکە دەخۆن و منیش لێی بێبەشـــم. دەبێ منیش بیرێک بکەمەوە.' ئیدی هێنای لەبن دارەکە لە پەنا ماڵەکەی خۆی مزگەوتێکی دروسـت کرد و دەسـتی کرد بە عیبادەت. قومرییەکان چاویان لێ بوو کە ژیشـک شـەو و ڕۆژ خەریکی عیبادەتە. یەکێک لە قومرییەکان لێی پرســی: 'ئەوە چەند ســاڵە ئاوا خەریکی خواپەرستیت؟' ژیشک گوتی: 'سێ ساڵە خەریکی خواپەرستیم.' قومری گوتی: 'ئەی بە چی بەڕێ دەچی؟' گوتی: 'ئەگەر شــتێک لە دارەکە بەر بێتەوە، پێی ڕازیم.' قومری گوتی: 'ئەی پۆشاکت؟' ژیشک گوتی: 'ئەو دڕووە زەقانە جلوبەرگی منن.' قومری گوتی: 'چۆنە لەو بن دارە ماڵت چێ کردووە و نەچوویتە شــوێنێکی تر؟' ژیشـــک گوتی: 'لە گوێڕێ ماڵم چێ کردووە هەتـا لاڕێکـان ڕێنوێنی کەم و نەزان فێری زانســـت بکەم.' قومری گوتی: 'من نەمدەزانی تۆ ئاوای. ئێسـتا کە ناسـیومی، خۆشـم دەوێی و قسـەکانتم پێ خۆش.' ژیشـک گوتی: 'لەوە دەترسـم کە قسـە و کردەوەی تۆ یەک نەگرنەوە و وەک کابرای وەرزێڕت لێ بێ. کـابرای وەرزێڕ لە کـاتی تۆوچـانـدنـدا کەمتەرخەمی کردبوو، گوتبووی: 'تـازە کـاتی تۆوچاندن بەســـەر چووە. دوایە لە کاتی دروێنەدا خەرمانی خەڵک دەبینێ و پەشـــیمان دەبێتەوە و لە تاوان فجە دەکا و دەمرێ.' قومری گوتی: 'من دەبێ چی بکەم بۆ ئەوەی لە خۆشـییەکانی دنیا دابڕێم و ڕوو لە خوداپەرسـتی بکەم؟' ژیشـک گوتی: 'تێشـووی ڕۆژی

قیامەتت ســـاز کە. بە ڕۆزی خۆت ڕازی بە و ئیرەیی بە خەڵکی دیکە مەبە.' قومری گوتی: 'ئەوە چۆن دەکریّ؟' ژیشک گوتی: 'تۆ دەبیّ لەو دارە بەشی ساڵێک میوە لیّ کەیەوە و لەو بن دارە هێلانەیەک چیّ کە و میوەکانت لەویّ دانیّ و بۆ خۆت خەریکی نوێژ و ڕۆژوو و خواپەرستی خۆت بە.' قومری گوتی: 'خودا پاداشتی خێرت بداتەوە وا ڕۆژی پەسلانت بیر هێنامەوە و منت خســتەوە ســەر ڕێی ڕاســت.' ئینجا قومرییەکان پێکەوە دەســتیان کرد بە لێکردنەوەی میوەی دارەکە و بەریانداوە خواریّ هەتا هەموویان لیّ کردەوە. ژیشـــک بە دیتنی ئەو هەمووە میوەیە خۆشـــحاڵ بوو، هەموو میوەکەی بردە ماڵەکەی خۆیەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'قومرییەکان هەر کات پێویستیان بە یارمەتی هەبیّ، بە من دەڵێن و لەبەر هەبیسی و نوێژ و ڕۆژووەکەم باوەڕم پیّ دەکەن و لێم نیزیک دەبنەوە. ئەو دەم دەیانگرم و دەیانخۆم و ئێرەش بە تەواوی دەبێتە هی من. ئەو میوەیەی بەریش دەبێتەوە بەشـــم دەکا.'

"قومرییەکان کە میوەکەیان هەموو لیّ کردەوە ،بۆخۆیـان هـاتنە خواریّ و چوونە بن دارەکە. ژیشـک میوەکانی هەموو بردبووە نێو ماڵەکەی خۆیەوە. ئەوان شـوێنەوارێکیان لە میوەکان نەدیت. بە ژیشـکیان گوت: 'پیاوی خودا و ڕێنیشـاندەری ئێمە، خۆ میوەکان یەک دەنکیشـیان دیار نییە.' ژیشـــک گوتی: 'ڕەنگە با بردبنی، بەڵام ئێوە نیگەران مەبن. ئەوەی ددان بدا، نانیش دەدا. خوا تا ســـەر بدا ڕۆزیش دەدا. ئیدی ژیشـــک هەر بەو قســـانە ئامۆژگاری دەکردن و تەرکەدنیای و خواپەرستی خۆیشی پێشان دەدا. هەتا ئەوان فریوی ئەویان خوارد و چوونە ماڵەکەیەوە. ژیشک دەرگەکەی لەسەر داخستن و ددانی لیّ سوون. کاتێک قومرییەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەو و هەڵیخەڵەتاندوون، پێیانگوت: 'ئەو قســـانە لە کویّ و ئەو کردەوەیە لە کویّ؟ مەگەر نەتزانیوە خودا فریادڕەسی لێقەوماوانە؟ وریا بە خۆ لە فروفێڵ و خراپکاری بپارێزە تا ئەو پەندەت بەســـەر نەیە وا بەســـەر ئەوانە هات کە کەڵەکیان لە بازرگانەکە دا.' ژیشـــک گوتی: 'چۆنیان بازرگان هەڵفریواند؟' قومری گوتی: 'دەگێڕنەوە بازرگانێک لە شاری سیند ماڵێکی زۆری هەبوو. کاتێک لەویّ کاڵا و شتی کڕی و ویستی بچیّ بۆ شـارێکی دیکە، دوو پیاویش یەکی کەمێکیان شت کڕی و وەک بازرگان لەگەڵ بازرگانەکە کەوتن. لە ڕێگە کاتێک دوای بڕینی ڕێگایەکی زۆر ویســـتیان وچانێک بدەن، ئەو دوو کەســـە کە بە فێڵ لەگەڵی هاتبوون، یەکیان گرت و ماڵەکەیان لە بازرگان ســـەند و ڕووتیان کرد. چونکە ئەوانە هەردووکیان کەڵەکباز بوون، هەرکەســـەی لە بەر خۆیەوە لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: 'ئەگەر بێتوو ئەوەی دیکە بکوژم، ئەوا هەموو ماڵەکە بۆ من دەبیّ و بۆ هەتاهەتایە دەوڵەمەند دەبم.' وا بوو لە کاتی فراوێندا هەردووکیان بە دزی ئەوی دیکە دەرمانیان لە چێشـــتی ئەوی دیکە کرد. کاتێک نانیان خوارد، هەرکەســـەی لە لایەک کەوت و مرد. بازرگانیش کە ماڵەکەیان لیّ سەندبوو، دوور و نیزیک هەر بەدوایانەوە

بوو. کاتێک گەیشتە سەریان، سەیری کرد ئەوە هەردووکیان مردوون. کە دیتنی، زانی چ باسە، هەر بۆیە تەواوی ماڵەکەی خۆی و ئەوانیشی برد و بە ساغ و سڵامەتی درێژەی بە سەفەرەکەی دا و ڕۆیشت.' "

کاتێک شەهرزاد چیرۆکەکەی بێرە گەیاند، شەهریارشا گوتی: "شەهرزاد، زۆر شتت بیر هێنامەوە. ئەگەر شتی دیکەش لەو بارەوە دەزانی، بیگێڕەوە."

## چیرۆکی مەیموون و دز

شەهرزاد گوتی: "بیستوومە پیاوێکی دز مەیموونێکی هەبوو. قەت نەدەچوو بۆ بازاڕ، ئەگەر چووبا خێرێکی[1] زۆری دەکرد. بە ڕێکەوت کابرایەک بوخچەیەکی جلوبەرگی درواوی بە شانیدا دابوو. لەنێو بازاڕدا دەیگێڕا بیفرۆشێ. ماوەیەک لە بازاڕدا سووڕاوە و کڕیاری نەبوو. لە سووچێک دانیشت، کەمێک بحەسێتەوە. پیاوە دزەی کە مەیموونی هەبوو، تووشی بوو. سەیری کرد کابرایەک دانیشتووە و بوخچەیەکیشی لە پێشە. هێنای مەیموونەی لە پێشیدا وە سەما خست هەتا سەیری کا و بخافڵێ. ئینجا بە پەنایەکدا بوخچەکەی لێ شاردەوە و پاشان مەیموونەی برد و ڕۆیشت. کابرای کوتاڵفرۆش سەیری کرد بوخچەکەی نەماوە. هەستا دوای بوخچەکەی کەوت. دزەش بە لایەکی دیکەدا گەڕاوە، چوو بوخچەکەی کە شاردبوویەوە، هەڵیگرت و بردی لە شوێنێکی چۆڵ کردییەوە. چاوی لە جلەکان کرد. ئینجا هێنای ئەوانی خستە بوخچەیەکی دیکە و بردنی بۆ بازاڕێکی دیکە. کڕیار لێی کۆ بوونەوە. لەگەڵیان ڕێک کەوت کە بوخچەکە نەکەنەوە. پیاوێک بوخچەکەی بە نرخێکی هەرزان و هەر بەو ڕێککەوتنە کڕی و بردی بۆ لای ژنەکەی. ژنەکەی گوتی: 'ئەوە چییە؟' پیاوە گوتی: 'ئەوە بوخچەیەک جلوبەرگی گرانبایە کە بە نرخێکی هەرزان کڕیومن و بە گران دەیفرۆشمەوە.' ژنەکەی پێی گوت: 'گەوجە، چۆن شتی ئاوا باش بە نرخێکی هەرزان دەفرۆشن؟ مەگەر دزیبێتیان. ئەی نەتبیستووە ئەگەر کەسێک شتێک بکڕێ و بە چاوی خۆی نەیبینێ، تووشی زەرەر دەبێ؟ ئەو کارەی ئەو وەک و کاری جۆلاکە وایە.' پیاوە گوتی: 'جۆلای چی، ژنەکە؟'

## چیرۆکی جۆلا

"ژنە گوتی: 'جۆلایەک بوو، هەمیشە کاری دەکرد و زۆر بە دژواری پێداویستی ژیانی دابین دەکرد. وا بوو پیاوێکی دەوڵەمەند میوانییەکی ساز کرد و خەڵکی بانگهێشت کرد.

---

١. خێر: سوود. قازانج.

کابرای جۆلاشـی بانگ کرد. سـەیری کرد هەرکەس جلی شـکۆداری لە بەردایە، خواردنی خۆش و جۆراوجۆری لە پێش دادەنێن و خانەخوێ ڕێزی زیاتری لێ دەگرێ.

" 'جۆلا گوتی: 'ئەگەر من پیشـەیەکی دیکە ڕەچاو بکەم و داهاتێکی زیاترم بێ، ماڵ و سـامانێکی باشـترم بۆ کۆ دەبێتەوە و دەوڵەمەند دەبم. جلی شـکۆدار لە بەر دەکەم. بەو جۆرە پلە و پایەم دەچێتە سـەرێ لە بەرچاوی خەڵک ماقووڵتر دەبم. دوای ئەوە سـەیری ئەو نمایشکارانەی کرد کە دەچوونە شوێنێکی بەرز و لەو سەرەوە سەرمەقولاتیان لێ دەدا و دەکەوتنە زەوی و هەڵدەسـتانەوە و زێڕ و زێوێکی باشـیان لە خەڵک وەردەگرت. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'وەڵا منیش دەچم وا دەکەم با دەوڵەمەند بم.' ئەویش هەسـتا و چووە ئەو سەرە و لەوێرا خۆی فڕێ دا. کەوتە خوارێ و ملی شکا و مرد.'

## درێژەی چیرۆکی مەیموون و دز

" 'من بۆیە ئەو چیرۆکەم بۆ گێڕایەوە هەتا تەماع نەتگرێ و کارێکی نەشـیاو نەکەی.' مێردی ئەو ژنە گوتی: 'واش نییە بڵێی هەموو زانایەک لەبەر زانسـتەکەی لە بەڵای ڕۆژگار بە دوور بێ و هەر نەزانێکیش لەبەر نەزانییەکەی تووشی کێشە بێ. من زۆر مارگرم دیوە کە زۆریش شـارەزای مارگرتن بووە و ماریش پێوەی داو و مردووە. هی دیکەشـم دیوە هەر نەیانزانیوە شێوازی مارگرتن چۆنیشە، کەچی ماری چاکیشیان گرتووە.'

"کورتی کەینەوە، ئەو پیاوە سەرپێچی ژنەکەی کرد. بوخچەکەی کڕی، هەر بەو شێوازە شـتی دزێتی بە نرخێکی هەرزان دەکڕی. هەتا ڕۆژێک بەو تاوانە داڕۆغە گرتی و ماڵوێران بوو.

## چیرۆکی چۆلەکە و تاوس

"دیسـان دەگێڕنەوە، لە سـەردەمانی زوودا چۆلەکەیەک بوو هەموو ڕۆژێک دەهاتە لای تاوس. شـای مەلان هەموو بەیانیان لەپێش هەموو کەسدا دەهات و شـەویش دوای هەموو کەس دەڕۆیشـتەوە. بە ڕێکەوت وا بوو کۆمەڵێک لە باڵندەکان لەسـەر کێوێکی بەرز گرد بوونەوە و پێکەوە گوتیان: 'ئێمە زۆر بووین و جیاوازی بۆچوون زۆر بووە و وا چاکە لەنێو خۆماندا پاشـایەک هەڵبژێرین چاودێری کارەکانمان بکا و ناکۆکیەکانمان چارە بکا.' لەو کاتەدا چۆلەکە بەوێدا هات و پێشـنیاری کرد تاوس بکەن بە پاشـا. ئەوانیش تاوسـیان وەک پاشای خۆیان هەڵبژارد. تاوسیش گەورەیی لەگەڵ کرد و چۆلەکەی کرد بە وەزیر.

"ڕۆژێک چۆلەکە دیار نەبوو، پاشا بۆی نیگەران بوو. زۆری چاوەڕێ بوو. کە چۆلەکەکە

هات، تاوس لێی پرسی: 'هۆی چ بوو وا درەنگ هاتی؟' چۆلەکە گوتی: 'شتێکم دی زۆری لێ ترسام.' تاوس گوتی: 'چی بوو وا لێی ترسای؟ چۆلەکە گوتی: 'پیاوێکم دی لە بەر هێلانەکەی من داوی نابووەوە و بۆخۆی چووبوو لەو لاوە خۆی مات دابوو. منیش دانیشتم و چاوم لێ کرد، بزانم دواجار چی دەکا. لە پڕدا قولینگێکم دیت هات و لەسەر داوەکە هەڵنیشت، خەریک بوو دانەکەی خوارد و پێوە بوو، هاواری لێ بڵند بوو. ڕاوچی گەیشتە سەری و گرتی. من بە دیتنی ئەو دیمەنە زۆر ترسام. بۆیە دیار نەبووم. لەمە بەدوا ناتوانم لەو هێلانەیەدا بم؛ زۆر لەو داوە دەترسم.' تاوس پێی گوت: 'لە شوێنەکەی خۆت مەڕۆ، بچی بۆ هەر کوێ، ئەوەی لە چارەت نووسراوە هەر ئەوە دەبێ.' چۆلەکە قسەکەی پەسەند کرد و بە گوێی کرد. بەڵام هەمیشە هەر دەترسا. هەتا ڕۆژێک ڕاوەستابوو دوو چۆلەکە پێکەوە بە شەڕ هاتن. چۆلەکە بە خۆی گوت: 'چۆن من وەزیری پاشا بم و ئەو چۆلەکانە لێرە لە لای من پێکەوە بە شەڕێن؟ ئەوە ئەرکی منە دەبێ پێکیان بێنم.' ئیدی لێیان نیزیک بووەوە، لە پڕدا ڕاوچی تەپکەی وەرسووڕاند و تەواوی چۆلەکەکان پێوە بوون و وەبن کەوتن.

"ڕاوچی هەستا ئەوی گرت و دای بە هاوڕێکەی و پێی گوت: 'جوانی ڕاگرە و ئاگات لێی بێ، ئەوەیان لە هەموو چۆلەکەکان قەڵەوترە.' وەزیر بە خۆی گوت: 'ئەوەی لێی دەترسام بەسەرم هات. تازە خۆلەداروبەرددان سوودی نییە و لە دەست چارەنووس ناتوانم دەرباز بم.' "

کە شەهرزاد ئەو چیرۆکەی بۆ پاشا گێڕاوە، پاشا گوتی: "شەهرزاد، لەو چیرۆکانەم هەر بۆ بگێڕەوە." شەهرزاد گوتی: "ئەگەر پاشا گیانم لێ نەستێنێ، ئیشەڵلا شەوێکی دیکە چیرۆکێکی زۆر خۆشترت بۆ دەگێڕمەوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و پەنجا و سێیەم هاتەوە

## چیرۆکی عەلی کوڕی بەکار و شەمسوننەهار

گوتی: "خاوەنشکۆ، سەردەمانی زوو لە دەورانی خەلیفە هاروونە ڕەشیددا بازرگانێک کوڕێکی هەبوو ناوی ئەبوولحەسەن عەلی کوڕی تاهیر بوو. ئەو بازرگانە دەوڵەمەندێکی تێروتەسەل و ڕووخۆش بوو. هەرکەس دیتبای پێی خۆش بوو قسەی لەگەڵ بکا. ئەو بەبێ پرسی خەلیفە دەچووە ماڵەکەیان و ژن و کەنیزگەلی خەلیفە ئەویان خۆش دەویست. لەگەڵ خەلیفە دادەنیشت و شێعری بۆ دەخوێندەوە و چیرۆکی خۆش خۆشی بۆ دەگوت. بەڵام پیشەی کڕین و فرۆشتن و بازرگانی بوو. لە دووکانی کوڕێکی گەنج لە وەچەی پاشایانی عەجەم کە ناوی عەلی کوڕی بەکار بوو کاری دەکرد و دووکانەکەی بۆ بەڕێوە دەبرد. ئەو لاوە کوڕێکی جوانچاکی بەقەلافەت و سەر و ڕووخۆش بوو. بە ڕێکەوت ئەو کوڕە ڕۆژێک لەگەڵ هێندێک لە گەورە گەورەکان دانیشتبوو قسەی دەکرد. لە پڕدا دە کەنیزی ڕوومانگ وەدەر کەوتن. لەنێو ئەو کەنیزانەدا کچێکیان تێدا بوو، چارشێوی مووسڵی بەسەرە بوو و زوننارێ ئاوریشمی بارانی لە قەدی بەستبوو. لە سەر یەسترێک بوو کە زینەکەی ڕازاوە و ئاوزەنگیکەی زێڕ بوو. ڕێکوپێکی و جوانییەی وا بوو، وەک شاعیر دەڵێ:

بەرزە باڵا و جوانە سیـــــــــمای ئەو بوتە کشمیرییە
هەر وەکوو سەلوە بۆ بەرزی، هەیڤێکی نـــــــووورانییە
دڵ لە نەرمیدا حەریرە و سینە تـــــــــورت و گۆشتنە
ئای لەبەر ئەو هەموو شـــۆخی و خوێنشـــیرنی و دەلالییە

"کە کچەکان گەیشتنە دووکانی ئەبوولحەسەن، ئەو مانگە درەوشاوە لە یەسترەکەی دابەزی و چووە دووکانی ئەبوولحەسەن و سـڵاوی لێ کرد. ئەبوولحەسەن وەڵامی سڵاوەکەی داوە. کاتێک عەلی کوڕی بەکار ئەوی دیت، هۆش و گۆشی چوو، تاقەتی نەما. ویستی هەستێ، کچە پێی گوت: 'دانیشە، ئەوە بۆ کاتێک ئێمە دێین، تۆ دەتەوێ بڕۆی؟!' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'خانم، بە خوا لەبەر ئەو شتەی دیومە هەڵدێم. ئاخر شاعیر گوتوویە:

چاوت بگرە دەتەوێ گیرۆدە نەبی
تیــــــــــری ئەوین مەتاڵی ئاسنینی دەوێ

"کیژە کە ئەوەی بیست، بزەی هاتێ و بە ئەبوولحەسەنی گوت: 'ئەو لاوە ناوی چییە و خەڵکی کام شارە؟' ئەبوولحەسەن گوتی: 'ئەو کوڕە نامۆیە و ناوی عەلی کوڕی بەکارە. کوڕە پاشایەکی عەجەمە. ڕاگرتنی دڵی غەریبان لەسەر هەموو کەس فەرزە.' کچە گوتی: 'کە وایە هەر کات کەنیزم نارد، ئەو کوڕەم بۆ بنێرە.' ئیدی کچە هەستا و ڕۆیشت.

"عەلی کوڕی بەکار لەوێ دانیشتبوو، هۆشی لەسەر خۆی نەمابوو. نەیدەزانی دەڵێ چی. ماوەیەکی پێ چوو، کەنیزی ئەو گوڵڕوخسارە هات بۆ لای ئەبوولحەسەن و پێی گوتی: 'خانم گوتی تۆ و ئەو لاوە وەرن بۆ ئێرە.' ئیدی ئەبوولحەسەن هەستا و لەگەڵ عەلی کوڕی بەکار بەرەو کۆشکی هاڕوونەڕڕەشید وەڕێ کەوتن. کەنیزەکە ئەوانی بردە نێو کۆشکەوە و لە دیوێکدا داینان. سفرەیان ڕاخست. خواردنیان خوارد و دەستیان شوشت. هەر ئەو کەنیزە ئەوانی بردە دیوێکی دیکە کە فەرشی ئاوریشم و دیبای پڕ کرابووەوە. بە زێڕ و زیوەری جوان ڕازابووەوە. وا بوو ئەوان لەگەڵ کەنیزە دانیشتبوون کە لە ناکاو دە کەنیزی ئەستێرەتەوێڵ کە چاو پێیان بە شەوارە دەکەوت و ئاوەز لە کەللەی مرۆڤ دەپەڕی، پەیدا بوون. دوای ئەوان دە کەنیزی مانگڕوخسار و حۆریئاسا کە عوود و دەف و چەنگیان بە دەستەوە بوو پەیدا بوون. دەستیان کرد بە عوود و دەف و چەنگلێدان. شێعرێکی زۆریان خوێندەوە. ئینجا دە کەنیز کە هەر کامیان شاجوانی ڕۆژگاری خۆیان، هەڵخڕێنەری دڵی عابیدی لە خودا ترس بوون، وەژوور کەوتن و لەنێو درەگەکە ڕاوەستان. لە دوای ئەوان دە کەنیز کە لەوانی پێشوو جوانتر و دڵگیرتر بوون، جلوبەرگی شکۆداریان لە بەردا بوو، ئەوانیش هاتن و لەنێو درگەکە ڕاوەستان. پاش ئەوان دیسان بیست کەنیزی دیکە کە لەنێو ئەواندا کچێکی تێدا بوو، وەک مانگ لەنێو ئەستێراندا دەدرەوشاوە، هاتن. ناوی ئەو کچە شەمسوننەهار بوو. شەمسوننەهار بە لەنجەولار هات و لەسەر کورسی دانیشت.

"عەلی کوڕی بەکار کە ئەوەی دیت، بە ئەبوولحەسەنی گوت: 'مەمنوونت دەبم، پێی بڵێ ئەو کۆڕ و ئاهەنگە بۆ چییە؟' ئیدی دەستی کرد بە گریان و پرسی: 'نێوی ئەو کچە چییە؟' ئەبوولحەسەن گوتی: 'ئەرخەیان بە دڵی ئەو کچە تۆی گرتووە و بە تەمایە زەماوەندت لەگەڵ بکا. ناوی شەمسوننەهارە و یەکێک لە کەسە تایبەتەکانی دەرباری هاڕوونەڕڕەشیدە. ئێرەش کۆشکی خەلافەتە.' دوای ئەوە شەمسوننەهار دانیشت و چاوی لە عەلی کوڕی بەکار بڕی و هۆگری جوانی و قۆزییەکەی بوو. عەلی کوڕی بەکاریش چاوی لە سەر ئە هەموو جوانی و دەلالییەی شەمسوننەهار هەڵنەدەگرت. هەردووکیان بە داوی ئەڤینی یەکەوە ببوون. شەمسوننەهار بە کەنیزەکانی گوت: 'هەرکەسەی لەسەر جێی خۆی دانیشێ.' ئەوان دانیشتن و شەمسوننەهار پێی گوتن: 'گۆرانی بڵێن.' یەکێک لە کەنیزەکان تاری عوودەکەی توند کرد و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

کەسێک سەلوی نەدیوە، با بڕوانێ ئەوەتا
پەپوولەی سپی نەدیوە، با چاوێ لێرە بکا
کاتی بەهارە ئێستا، مانگی خاکەلێوەیە
با بڕۆن بۆ دەشتودەر، بەهاری من لێرەیە
سرووشت ڕازاوەتەوە، خەملیوە دەشت و بژوێن
گەر یارم بچێتە دەر، گوڵی دەکەوێتە شوێن

"عەلی کوڕی بەکار دڵی خۆش و کەیفی ساز بوو، بە کەنیزەکەی گوت: 'لەو جۆرە شێعرانە یەک-دوویەکی دیکەشمان بۆ بڵێ.' کەنیزەکە تارەکانی عوودەکەی توند کردەوە و ئەو بەیتانەشی گوت:

دار گوڵی کرد و بولبولان مەست بوون
یاران سەرخۆش و دژمنان پەست بوون
لە ژێر پێی مەستان سەوزە پێشێل بوو
هێند سەرخۆش و مەست لەویا تخێڵ بوو
عارف و عەوام هەموو پێکەوە
پیالە بە پیالە مەی دەخۆنەوە

"کە کەنیزەکە شێعرەکەی تەواو کرد، شەمسوننەهار بە کەنیزێکی دیکەی گوت: 'دەی تۆش بیڵێ.' ئیدی کچە دڵی خۆش بوو، چەنگەکەی لێدا و ئەو بەیتانەی گوت:

وا بنچک هەموو خۆی لە گوڵ داوە
بولبول سەرمەستە و کەوتووە لەو لاوە
خێوەت لە دەرێ هەڵدەن، چونکە با
فەرشی دیبای چیمەنی هێناوە
ساقی بە لەنجە هاتوچۆیەتی
هۆشی مەینۆشی لەبن هێناوە

"کاتێک شەمسوننەهار خوێندنەوەی ئەو کەنیزەی دیت، باوێشکێکی هاتێ و بە خۆشحاڵییەوە کەنیزێکی دیکەی بانگ کرد. ئەو کەنیزەش دوو بەیتی خوێندەوە:

بۆنی خۆشـــی گوڵ و جریوەی مەل دێ
خۆشـــە ئێســـتاکە هەســـتی بچی بۆ دێ
کـــارمـــان بە بـــاخ و بـــاخـــات نەداوە
تـــۆ لە هەر کـــوێ بـــی، ئـــێـمە دێـــنە وێ

"دوای ئەوە، عەلی کوڕی بەکار بە کەنیزێکی گوت، کە لە لای ئەوەوە دانیشتبوو: 'تۆش شتێکمان بۆ بڵێ.' کەنیزە عوودەکەی هەڵگرت و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ســـەردەمێـک بەهـار کە گوڵ شـــین دەبوو
ســـەوزە دەیرەنگاند دەشـــت و دەر هەموو
لەگەڵ مـــنـــدالان وە دەر دەکەوتـــیـــن
ئـیـتـر شـــەو و ڕۆژ خـۆ نەدەســـرەوتـین
شـــیرازیش ئەودەم خۆی بەهەشـــتێک بوو
چـاوی مـرۆڤ قەت لـێـی تـێـر نەدەبـوو

"کە شـــێعرەکە تەواو بوو، ئەســـرین بە گۆنای عەلی کوڕی بەکاردا هاتە خوارێ. کە شەمسوننەهار گریانکەی ئەوی دیت، ئاوری خۆشەویستی گرتی و سۆز و ئەڤین قەراری لێ بڕی. لەڕێوە لەسەر کورسییەکەی هەستا و هاتە لای عەلی کوڕی بەکار و لە باوەشی گرت. ئەویش دەســـتی لە نێوقەدی شـــەمســـوننەهار کرد و هەردووکیان بە لادا کەوتن. دەســـبەجێ کەنیزەکان هەڵیانگرتن و بردیاننە دیوێکی دیکە و ئەوەندەیان گوڵاو پێدا هەڵپرژاندن و بەدەوریاندا هاتن هەتا وە هۆش هاتنەوە. شەمسوننەهار بە ئەبوولحەسەنی بازرگانی گوت: 'من هەر ئەوەندەم لە خوا دەوێ نەمرم هەتا وەڵامی ئەو چاکەیەی تۆ دەدەمەوە.' دوای ئەوە شەمسوننەهار ڕووی کردە عەلی کوڕی بەکار و گوتی: 'سەروەرم، تۆ ئەوەندە بزانە کە حەز و سۆز و خۆشەویستی من بۆ تۆ دە هێندەی تۆیە بۆ من، بەڵام ئێمە جگە لە ئارامی و ڕاوەستان هیچمان لە دەست نایە.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'خانم، من و تۆ ئاســـتەمە بە یەک بگەین، ئاوری ئەڤینی تۆ لە هەناومدا مەحاڵە دامرکێتەوە. خۆشەویستی تۆ تازە لە دڵی من ناچێتە دەرێ مەگەر گیانم دەرچێ، جا لە جەستەم بچێتە دەرێ.' هەرکە ئەوەی گوت، فرمێسکی هاتە خوارێ. شەمسوننەهار لەگەڵ گریانەکەی ئەو دەستی کرد بە گریان. ئەبوولحەسەن گوتی: 'بە خوا من سەرم لە کاری ئێوە سووڕ ماوە و گێژ بووم. جا ئێوە بۆ پێکگەیشتن ئەو شـین و گریانە بکەن، ئەی لە دابڕاندا چ دەکەن؟! ئێستا کاتی گریان نییە و کاتی خۆشی و شادییە.'

"شەمسوننەهار ئاماژەی بۆ کەنیزێک کرد، چووە دەرێ. کە هاتەوە چەند خزمەتکارێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە یەکی مەجۆعمەیەکی زێڕ و زێوی پڕ لە خواردەمەنیان لەسەر دەست بوو، مەجۆعمەکانیان بە ڕیز چنی. شەمسوننەهار هەر پاروویەکی دەخوارد و پاروویەکیشی لە زاری عەلی کوڕی بەکار دەنا، هەتا تێر بوون. مەجۆعمەکانیان کۆ کردەوە. ئینجا دەستیان شوشت و خۆیان بە گولاو بۆنخۆش کرد. دوای ئەوە تەشتێکیان هێنا لە بەردی عەقیق پڕ بوو لە بادەی ترێ. شەمسوننەهار دە کەنیزی خزمەتکردن و دەی دیکەیشی بۆ ئاهەنگگێڕان گل دانەوە. بە کەنیزەکانی دیکەی گوت: 'بڕۆنەوە.' بە کەنیزە عوودژەنەکانی گوت عوود بژەنن. یەکێک لە کەنیزەکان دەستی دا عوودێک و تارەکانی توند کردەوە و بەدەم عوودلێدانەوە ئەو شێعرەشی خوێندەوە:

خۆتی لێ بادە و بخۆوە بادە
ملی خەفەتت بەو بادە بادە
بە گوڵگەڵ نەخشێنراوە ئەو ناوە
چڵەگیا سەریان پێکەوە ناوە
ئاسک لەو ناوە جرپوجۆپێتی
جریوەی دێ بولبول ئەوڕۆ ڕۆژێتی

"کە شێعرەکە تەواو بوو، شەمسوننەهار هەستا، پیاڵەیەکی بۆ خۆی تێ کرد و پیاڵەیەکیشی دا بە عەلی کوڕی بەکار. عەلی کوڕی بەکار بادەکەی خواردەوە و پیاڵەکەی داوە بە شەمسوننەهار. شەمسوننەهار پیاڵەکەی پڕ کردەوە و دای بە ئەبوولحەسەن. ئەبوولحەسەنیش خواردییەوە. دوای ئەوە شەمسوننەهار عوودێکی هەڵگرت و گوتی: 'ئەو بە پیاڵە شەرابی من شێعر نالێ، ئەمن دەیلێم.' ئیدی تارەکانی عوودەکەی توند کردنەوە و ئەو شێعرەی گوت:

ڕۆژی جێژن لە جێی هەڵکردنی عوود
بخۆرەوە بادە و بۆمان لێ دە عوود
سەرخۆشم کە تۆ بەو دەنگە ئاسمانییەت
زۆرم پێ خۆشترە لە دەنگی داوود

"عەلی کوڕی بەکار و ئەبوولحەسەن کە گوێیان لە دەنگی شەمسوننەهار بوو، کاریان لە خۆشحاڵی تێپەڕی و دەستیان کرد بە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی. وا بوو لەو جەنگەیەدا کەنیزێک هاتە ژوورێ، وەک شەقشەقە دەلەرزی، گوتی: 'خانم، خەلیفە لەگەڵ عەفیف و

مەسروور ئەوە گەیشتنە بەردەرگا.' کە دانیشتووان قسەی کەنیزەکەیان بیست، خەریک بوو هەموویان دڵیان بتوقێ، بەڵام شەمسوننەهار پێکەنی و گوتی: 'مەترسن.'

"بە کەنیزەکەی گوت: 'بە خەلیفە بڵێ کەمێک ڕاوەستێ.' ئەوجا فەرمووی: 'دەرکی دیوەکە لەسەر ئامادەبووان پێوە دەن و پەردەکان دادەنەوە و دەرکی کۆشکیش داخەن.' شەمسوننەهار بۆخۆی هاتە نێو باخەوە و لەسەر کورسی دانیشت. کەنیزێک هەر وا قاچی دادەماڵی و ئەوانی دیکەش گەڕانەوە و چوونەوە مزڵەکانی خۆیان. ئینجا مەسرووری میرغەزەب بە بیست غوڵامی شیربەدەستەوە گەیشتن و سڵاویان لە شەمسوننەهار کرد. شەمسوننەهار گوتی: 'ئەوە بۆچی هاتوون؟' گوتیان: 'خەلیفە سڵاوی دەگەیاندی و تامەزرۆی دیداری تۆیە. خەلیفە ئەمڕۆ بەزمێکی شادی هەیە و پێی خۆشە تۆ لەو بەزمەدا بیت. تۆ دێی بۆ لای خەلیفە، یان ئەو بێ بۆ لای تۆ؟' شەمسوننەهار کە فەرمانی خەلیفەی بیست، هەستا و کڕنۆشی برد. لەڕێوە بانگی کەنیزەکانی کرد. خزمەتکارێکی نارده لای خەلیفە و پێی ڕاگەیاند: 'پاش ماوەیەکی دیکە شوێنەکە بۆ هاتنی خەلیفە ئامادە دەکەم و چاوەڕێی دەبم تەشریفی بێنێ.' خزمەتکارکە چووە لای خەلیفە و پەیامەکەی پێ ڕاگەیاند.

"شەمسوننەهاریش لەولاوە هەستا چووە لای عەلی کوڕی بەکاری دڵداری و لە ئامێزی گرت و ماڵاوایی لێ کرد. عەلی کوڕی بەکار دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'ئەو ماڵاواییە چییە؟ خۆ بە خوا من بەبێ تۆ گیانم دەرچێ و دەمرم.' شەمسوننەهار گوتی: 'بە خوا جگە لە من کەس نامرێ، هەر بینا نهێنی من ئاشکرا بوو و کوشتیانم. بە تایبەت ئەمشەو بەڵێنم بە خەلیفە داوە. هەر بۆیە دەکەومە مەترسییەکی گەورەوە، چونکە بەو هەموو خەمەی لە جودابوونەوە لەگەڵ تۆ دێتە سەر دڵم، چۆن دەتوانم شێعر و گۆرانی بۆ بڵێم؟ بە چ دڵێکەوە لەگەڵی دانیشم؟ چۆن خۆم خۆشحاڵ پیشان بدەم؟ و بە چ زمانێک قسەی لەگەڵ بکەم لە کاتێکدا چاوم لە شوێنە خاڵییەکەی تۆیە؟ چۆن حەزم بچێتەوە شەراب و لە گەرووم بچێتە خوارێ، ئەتۆش لەوێ نەبی؟' ئەبوولحەسەن بە شەمسوننەهاری گوت: 'کەمێک بەسەر خۆتدا زاڵ بە و لەسەرخۆ بە. ئەمشەو مەهێڵە پێتەوە دیار بێ.'

"ئەوان هەر وا خەریکی قسەکردن بوون کە کەنیزێک هات و گوتی: 'خانم، پیاوەکانی خەلیفە گەیشتن.' ئیدی شەمسوننەهار هەستا و بە کەنیزەکەی گوت: 'ئەبوولحەسەن و هاوڕێکەی بەرە ئەو هەیوانەی ڕوو بەخەڵکەکەیە و با لەوێ بن هەتا هەوا تاریک دەبێ، ئەو دەم بە فێڵێک بیانبە دەرێ.' کەنیزەکە ئەوانی بردە ئەوێ و دەرگاکەی لەسەر داخستن. ئەوانیش دانیشتبوون چاویان لەنێو باخەکە دەکرد هەتا وا بوو خەلیفە هات و سەد کەسی شیربەدەست لەپێشییەوە و بیست کەنیزی حۆریئاسا شانەوشانی دەڕۆیشتن. کەنیزەکان هەموو جلی شکۆداریان لە بەردا و تاجی ڕازاوە بە زێڕ و زیو لە سەردا بوو. هەریەکەی مۆمێکی هەڵکراویشی بە دەستەوە بوو.

"شەمسوننەهار هەستا و لەگەڵ کەنیزەکانی چوو بە پێشوازی خەلیفەوە و ڕووبەڕووی کوڕنۆشیان برد و لەگەڵی گەڕانەوە. هەتا خەلیفە لەسەر کورسی دانیشت و خزمەتکار و کەنیزەکانی لەدەوری ڕیزیان بەست. مۆمەکان هەموو داگیرسان و دەف و چەنگ و عوودیشیان لێ ئامادە بوو. ئەوجا خەلیفە هێندێکیانی ناردەوە و بە هێندێکیانیشی گوت دانیشن. شەمسوننەهار لەسەر کورسییەک لە پەنا خەلیفە دانیشت و لەگەڵ خەلیفە دەستیان کرد بە قسەکردن. ئەبوولحەسەن و عەلی کوڕی بەکار تەواوی ئەوانەیان لێ دیار بوو و دەیانڕوانییە ئەو شوێنە، تەنانەت قسەکانیشیان دەبیست. بەڵام خەلیفە ئەوانی نەدەدی.

"دوای ئەوە خەلیفە لەگەڵ شەمسوننەهار دەستی کرد بە گاڵتە و جەفەنگ و دەستبازی، ئەوەندەشیان مۆم هەڵکردبوو بەو نیوەشەوە دەگوت ڕۆژی ڕووناکە. دوای ئەوە ساقییەکان پیاڵە مەیان بە دەستەوە گرت. ئەبوولحەسەن گوتی: 'تا ئێستا دەفری ئاوا گرانبایم نەدیتووە، ئەوانە جۆرە گەوهەرێکن کە من ناوەکەیانم نەبیستووە. هەر دەڵێی خەون دەبینم.'

"عەلی کوڕی بەکار لەو کاتەوەی لە شەمسوننەهار جوێ ببووەوە، لەو لاوە کەوتبوو. هۆشێکی وای نەبوو. کە کەمێک هاتەوە سەر خۆی، چاوی لە کوڕەکەیان کرد، بە ئەبوولحەسەنی گوت: 'کاکە، لەوە دەترسم خەلیفە چاو لە لای ئێمە بکا و بزانێ ئێمە لێرەین. من زیاتر خەمی تۆمە، دەنا دەزانم من هەر بە هیلاک دەچم. ئاخری ئەڤین سەرم دەخوا. لە خوا داواکارم لەو گرفتە ڕزگارمان بێ.'

"بەو جۆرە ئەبوولحەسەن و عەلی کوڕی بەکار لەوێوە چاویان لێ دەکردن. هەتا خەلیفە ڕووی لە کەنیزێک کرد و گوتی: 'هۆی دڵتەڕ، ئەگەر گۆرانییەکی خۆشت ئامادە کردووە هەستە بیڵێ.' کیژ دەنگی هەڵێنا و ئەو شێعرەی گوت:

ڕووت داپۆشە مانگی ماڵی
عەقڵت لە کەللە داماڵی
کوێرت کرد بە سیحری جوانی
چاوانی ژیری و زانایی
زۆر حەز دەکەم هاودەمت بم
ڕوو لەکوێ کەم، شایانت بم
پێم خۆش نییە وەکەس کەوم،
بەس لە پەنای تۆ وەرکەوم

"کە شەمسوننەهار ئەوە شێعرەی بیست، لەسەر کورسییەکەی کەوتە خوارێ و بێهۆش

بوو. کەنیزەکان گەیشـــتنێ و هەڵیانگرتەوە. هەر کە عەلی کوڕی بەکاریش ئەوی دیت وای لێ هات، ئەویش بە لادا هات و لە هۆش خۆی چوو. ئەبوولحەســـەن گوتی: 'ســـوبحانەڵلا، قەدەر ئەڤینی لەنێو ئەو دوانەدا بەش کردووە.'

"کەنیزێک کە ئەوانی هێنابووە ئەوێ، هاتە لایان و بە ئەبوولحەســـەنی گوت: 'هەســـتن وەرنە خوارێ لێمان قەوما، دەترسم هەموو شتێک ئاشکرا بێ.' ئەبوولحەسەن گوتی: 'ئەو کوڕە چۆن دەتوانێ لەگەڵ من بێ؟ خۆ ئەوە هێزی ئەژنۆی نییە هەستێتە سەر پێ.' ئیدی کەنیزەکە گوڵاوی هێنا و بەســـەریدا هەڵپرژاند و وە هۆشـــی هێناوە. ئەبوولحەســـەن و کەنیزەکە عەلیان هەڵگرت و لە هەیوانەکە هێنایانە خوارێ. کە کەمێک ڕۆیشـــتن، کەنیزە بە دەرگایەکی بچووکی ئاســـندا ئەوانی بەڕێ کردە دەرێ و گەیشـــتنە ســـەکۆیەکی ســـەر ڕووبارەکە و ڕزگاریان بوو. ئینجا بەلەمێک هات، کەسێکی لەسەر بوو. کەنیزە بانگی کرد و پێی گوت: 'ئەوانەم بۆ بگەیێنە وشـــکایی.' کە ئەوان لەوێ چوونە دەرێ و ســـواری بەلەمەکە بوون، عەلی کوڕی بەکار چاوی لە باخ و هەیوانەکە دەکرد و دەگریا. دوای ئەوە کەنیزەکە بە بەلەمەوانەکەی گوت: 'خێراکەن.' بەلەمەوانەکە بەلەمەکەی توند ئاژۆت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و پەنجا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــــکۆ، بەلەمەوان بە پەلە ئەوانی پەڕاندەوە وشـــکایی. لەوێ کەنیزەکە مـالاوای لێ کردن و گوتی: 'هەرچەنـدە لە بەرم گرانە لێتـا دابڕێم، بەلام من هەر دەتوانم هەتا ئێرە دوور کەومەوە.' کە کەنیزەکە گەڕاوە، عەلی کوڕی بەکار لەوێ کەوت و هێزی هەستانەوەی نەما. ئەبوولحەسەن گوتی: 'هەستە، ئێرە جێی دانیشتن نییە. ئێرە پڕە لە دز و زۆڵ.' ئیـدی عەلی کوڕی بەکـار هەســـتـا و وردەوردە وەڕێ کەوت. هێزی نەبوو، ئەبوولحەســەن لەوبەر چۆمی دیجلە دۆسـت و برادەری هەبوو. چوونە ماڵی یەکێک لەوان کە بـاوەڕی پێی بوو. لە دەرگایـان دا. ئەو هـاوڕێیەیـان خێرا هـات دەرگـای کردەوە و کە ئەوانی دیت، سلاوی کرد و بردنییە ژووری و دەستیان کرد بە قسەکردن. پرسی: 'لەکوێ بوون؟ ئەبوولحەســەن گوتی: 'لەگەڵ کەسـێک سـەودایەکەم بووە. ئێسـتا دەیەوێ ماڵەکەم بەرێ و هەڵێ. من ناچار ئەمشـەو لەبەر ئەوە هاتمە دەرێ و ئەو هاوڕێیەی خۆشـم لەگەڵ خۆم هێنا. کەچی ئەو پیاوە خۆی لێ شاردوومەوە و نەمدیەوە و هەر وا گەڕاینەوە. چونکە درەنگیشــە، نەماندەتوانی بگەڕێینەوە، جگە لێرە هیچ کوێی دیکەشــمان شـک نەدەبرد. ئیتر هاتینە ئێرە.' ئیدی ماڵی ئاوەدان بێ تا بەیانی لەوێ مانەوە.

"کە ڕۆژ بووەوە، لەوێ چوونە دەرێ و ڕۆیشتن هەتا گەیشتنەوە ماڵی ئەبوولحەسەن. عەلی کوڕی بەکاریشــــی بردە ژووری و کەمێک لەوێ خەوتن. کە خەبەریـان بووەوە، ئەبوولحەســــەن بە خزمەتکارەکـانی گوت: 'فەرشــــی گرانبـای ڕاخەن.' خزمەتکـارەکـان ڕایانخسـت. عەلی کوڕی بەکار کە بە خەبەر هات، داوای ئاوی کرد دەسـتنوێژی شـوشـت. تەواوی ئەو نوێژانەی کە لەو شـەو و ڕۆژدا چووبوون، هەموویانی گێڕاوە. ئەبوولحەسـەن چووە پێشێ و گوتی: 'گەورەم، وا چاکە ئەمشەو لە لام بمێنییەوە و پێکەوە کەمێک گاڵتە و گەپ و شۆخی بکەین، بەشکو تۆزێکیش خەمت سووک بێ.'

"عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'کاکە گیان، چی دەکەی بیکە، بەلام تازە من داوی ئەڤین لە دەست و پێم ئالاوە و ڕزگاربوونم ئەستەمە.'

"ئیدی ئەبوولحەســــەن خزمەتکار و دەوروبەریانی کۆ کردەوە و ناردی بە شـــوێن مۆسـیقار و گۆرانیبێژدا. ئیتر ئەو ڕۆژە هەتا شــەو هەر خەریکی عەیش و نۆش و بەزم و شـای و خواردنەوە بوون. ئەوجا مۆمەکانیان هەڵکردن و دەسـتیان کرد بە مەیخواردنەوە. بە گشتی زۆر خۆشـیان ڕادەبوارد. پاشـان کەنیزێک دەسـتی دا عوودێک و ئەو شـێعرەی گوت:

چ وەرزی بـــــــــــــەهار، چ وەرزی پاییز
مادام من دوور بم لە یــــــــــــــاری ئازیز
ڕەنــگــم هەر زەردە و لــێــوم بە بــارە
بەشـــــم لە ژیــنــدا، خەمە و پەژارە

"هەر کە عەلی کوڕی بەکار شـێعری کەنیزەکەی بیســت، بە لادا کەوت و بێهۆش بوو. هەتا کازیوەی بەیانی نەهاتەوە ســەر خۆی. ئەبوولحەســەن دەســتی لێ شــوشــت. کە تاو هەلات، عەلی کوڕی بەکـار وە هۆش هـاتەوە و ویســـتی بڕواتەوە بۆ مـاڵەکەی خۆی. ئەبوولحەسەن ترسا لە ماڵەکەی ئەو شتێکی لێ بێ، هەر بۆیە پێشی نەگرت. خزمەتکارەکان ولاخێکیان بۆ هێنا و عەلی کوڕی بەکاریان سـوار کرد. ئەبوولحەسـەنیش لەگەڵی چوو هەتا بردییەوە ماڵێ. کە گەیشتنەوە ماڵەکەی خۆی، ئەبوولحەسـەن سـپاسـی خودای کرد کە لەو گێژاوە ڕزگاری بوو. ئیدی دڵخۆشـی داوە و هانی دا بەسـەر خۆیدا زاڵ بێ. کەچی ئەو لە تـاوان دەســـەڵاتی خۆی نەبوو هەر خۆی هەڵـدەگلۆفی و داخمورۆی بوو. وا بوو ئەبوولحەسەن مالاوای لێ کرد و بەجێی هێشت."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و پەنجا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەبوولحەســـەن کە ویســـتی بڕوا، عەلی کوڕی بەکار پێی گوت: 'براکەم، ئەگەر شتێک بوو، ئاگادارم کەوە.' ئەبوولحەسەن گوتی: 'بەسەر چاو.' دوای ئەوە ئەبوولحەســەن هەســتا و چوو بۆ دووکان. دووکانی کردەوە و چاوەڕێی شــەمســوننەهار بوو. ئەو ڕۆژە هیچ هەواڵێک نەبوو. شــەو لە ماڵە خۆیان بوو. بەیانی هەســتا چوو بۆ ماڵی عەلی بەکار کەچی ســـــەیری کرد ئەوە لە جێدا کەوتووە و چەند کەس لە هاوڕێکانی و حەکیم لە لای دانیشــتوون و حەکیم شــواری[1] دەگرت. هەر کەســـەی شــتێکی دەگوت. کە ئەبوولحەســـــەن چووە ژوورێ و عەلی کوڕی بەکـار ئەوی دیـت، بزەیەکی هــاتێ. ئەبوولحەســەن ســڵاوی لێ کرد و هەواڵی پرســی. لەپشــت ســەری دانیشــت هەتا خەڵکەکە ڕۆیشـــتن. ئینجا ئەبوولحەســـەن گوتی: 'ئەوە بۆ وات کردووە؟' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'براکەم، دوورکەوتنە لەو پەریڕووە دەردێکی دامێ، نەخۆشـــی خســـتم و هەواڵی نەخۆشـــییەکەم بڵاو بووەتەوە و هــاوڕێکانم هــاتوون بۆ دیمــانەم. لەوە گەڕێ، پێم بڵێ کەنیزەکەی شــەمســوننەهارت نەهاتووە؟ هیچ هەواڵێکت لێیان هەیە؟' ئەبوولحەســەن گوتی: 'لەو کاتەوەی لە قەراخ دیجلە لێک هەڵبڕاوین، ئیدی نەمدیوەتەوە و هیچ هەواڵێکیشــم لێیان نییە.' ئیدی پێی گوت: 'برا، خۆت ســووک مەکە و دەســت لەو شــین و گریانە هەڵگرە.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'کاکە گیان، بە خوا بە دەســت خۆم نییە.' هەناســەیەکی هەڵکێشــا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ســـــووکـی چــی کــاکە گەر ئەوم نەبــێ
کـوا مـن گـوێـم لە قســـەی ئەم و ئەو دەبێ
مـن ئەوم نەبێ ســـــووکـی و قـورســـێـتـی
بە کــاری چــیــم دێ، کــاکە بەســـــێـتـی
ئەو ئــاو و نــانە ئەو قــورســـــایــیە
گەر ئەوم نەبــێ، ژیــن کــۆتــایــیە

"کە شێعرەکە تەواو بوو، گوتی: 'تووشی کێشەیەک بووم کە تا ئێستا شتی وام نەدیوە و تەنیا بە مردن ڕزگارم دەبێ.' ئەبوولحەســـەن گوتی: 'هێمن بە. بەشــکوم خوا بە ئاواتت بگەیێنێ.' دوای ئەوە ئەبوولحەســـەن لەوێ هاتە دەرێ و چوو دووکانی کردەوە. ماوەیەک بوو دانیشــتبوو کە کەنیزەکە هات و ســڵاو لە ئەبوولحەســەن کرد. ئەبوولحەســەن وەڵامی

---

١. شوار: پێدانی ڕەگ، نبض.

سڵاوەکەی داوە و سەیری کرد کەنیزەکە کەمێک مات و پەشێوە. هەواڵی شەمسوننەهاری لێ پرســـی. کەنیزەکە گوتی: 'پێت دەڵێم، تۆ جارێ پێم بڵێ عەلی کوڕی بەکار چۆنە؟' ئەبوولحەســەن باســی وەزعی عەلی کوڕی بەکاری بۆ گێڕاوە. کەنیزەکە پێی ســەیر بوو. زۆری بۆی بە داخ بوو و ئاخێکی هەڵکێشـــا. دوایە گوتی: 'خانمەکەی منیش حاڵی لەو خراپترە، کـاتێـک ئێوە لە بەلەمەکە دابەزین و من گەڕامەوە، زۆر نیگەرانی ئێوە بووم، دەمگوت بە سلامەتی ناگەنەوە. وا بوو کە چوومەوە لای شەمسوننەهار، سەیرم کرد ئەوە بێهۆش کەوتووە و نە قسە دەکا نە وەڵام دەداتەوە. خەلیفە لە لای دانیشتبوو. نەشیدەزانی چی ڕووی داوە و چی بەســەر هاتووە. هەتا نیوەشــەو هیچ هۆشــی نەبوو. کە وە هۆش هاتەوە، خەلیفە لێی پرســی: 'ئەوە بۆ وات لێهات؟' شـەمسـوننەهار گوێی لە قسـەی خەلیفە بوو، هەستا قاچی خەلیفەی ماچ کرد و دانیشت و گوتی: 'خوا بە قوربانی تۆم کا، بە هەڵمی چێشـــتەکە ســـەرم لە گێژەوە هات و بوورامەوە. جا نازانم چیم لێ دێ.' خەلیفە گوتی: 'شـەمسـوننەهار، چیت خواردبوو؟' شـەمسـوننەهار گوتی: 'شـتێکی ئەوەندە ناجۆرم خوارد کە قەت نەمخواردبوو.'

"دوای ئەوە شــەمســـوننەهار داوای مەی کرد. کە مەیەکەی خواردەوە، منی بانگ کردە لای خۆی، سووکێک باسی ئێوەی لێ پرسیم. منیش ئەو شێعرەی کە عەلی کوڕی بەکار لە بەلەمەکەدا بۆی گوتم، بۆم گوتەوە. ئەویش ئاخێکی هەڵکێشا و مات بوو. پاشـان خەلیفە بە کەنیزێکی گوت کە گۆرانی بڵێ. کەنیزە ئەم شێعرەی بە گۆرانی گوت:

خــۆزگە ئەو یــارە چەلەنــگەی وا مــن کــوژراوی ئەوم،
بێـتوو بە لامــدا تێپەڕێ من زینــدووی بـــــــۆنی ئەوم
ئەو بەجێـی هێشــــتم، بەجێهێشــــتنی کـاری من نـیـیە
چـونـکە دڵـی مـن وەکـوو دڵـی ئەو لە ئـاســـــن نـیـیـە

" 'کە شەمسوننەهار ئەو شێعرەی بیست، تەواو تێک چوو.' "

لێرەدا کاتی بانگی بەیانی بوو. شەهرزاد کۆتایی بە بەشەچیرۆکی ئەوشەویش هێنا.

## که شەوی سەد و پەنجا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کەنیزی شەمسوننەهار بە ئەبوولحەسەنی گوت: 'کە شەمسوننەهار شێعرەکەی بیست، بوورایەوە. من خێرا خۆم گەیاندێ، گولاوم بەسەردا هەڵپرژاند، تۆزێک چاکتر بوو. گوتم: 'خانم، تۆ گیانی خۆشەویستەکەت خۆت سووک مەکە و بەسەر خۆتدا زاڵ بە.' شەمسوننەهار گوتی: 'خۆ لە مردن زیاتر نییە، پێم خۆشە بمرم و ڕزگارم بێ.' ئێمە لەو قسانەدا بووین کە کەنیزێکی دیکە ئەو شێعرەی خوێندەوە:

پیشەم گریان و هەنیسک و ماتەمە ئەمشەو
نە خۆم پێ دەگیرێ و نە هۆشم لامە ئەمشەو
دوێشەوێ کە بە خەبەر بووم خۆشم ڕابوارد
ئەوە تۆڵەی ڕابواردنی دوێشەومە ئەمشەو

" 'کە کەنیزەکە شێعرەکەی خوێندەوە، شەمسوننەهار تێک چووەوە. خەلیفە بە پەرۆشەوە هاتەوە لای. فەرمانی دا مەیەکەیان لا برد. کەنیزەکان هەر کەسەی چووەوە شوێنی خۆی. خەلیفە هەتا بەیانی هەر لە لای شەمسوننەهار ماوە. کە ڕۆژ بووەوە، ناردی و حەکیم و نۆشداریان هێنا سەر بۆ دەرمان و چارەی شەمسوننەهار. نۆژدارەکە نەیدەزانی نەخۆشی ئەوینێتی.

" 'لەو ماوەیەدا ئەوە کاری ئێمە بوو. هۆی درەنگ هاتنەکەشم بۆ لای ئێوە هەر ئەوە بوو. ئێستا دەستەیەک لە لای ئەو دانیشتوون. ئەویش منی ناردە لای ئێوە هەتا هەواڵی عەلی کوڕی بەکاری بۆ بەرمەوە.' کە ئەبوولحەسەن ئەو قسانەی لە بارەی شەمسوننەهارەوە بیست، سەری سووڕ ما و پێی گوت: 'هەواڵی عەلی کوڕی بەکار تا ڕادەیەک هەر ئەوە بوو کە پێم گوتی. تۆ بگەڕێوە بۆ لای خانم و بڵێ عەلی حاڵی ئاوایە و تا دەتوانی لەسەرخۆ بە و هەوڵ بدە نهێنی بپارێزی و شتەکەت لێ ئاشکرا نەبێ. پێشی بڵێ من دەزانم کارەکەی ئەوان کارێکی سەختە و پێویستی بە پرس و ڕاوێژ و وردبوونەوە هەیە.' ئیدی کەنیزەکە دۆعای خێری بۆ ئەبوولحەسەن کرد و گەڕاوە.

"ئەبوولحەسەن تا نوێژی شێوان لە دووکان ماوە. دوایی هەستا و شتەکانی کۆ کردەوە و دووکانی داخست. هات بۆ ماڵی عەلی کوڕی بەکار و لە دەرگای دا. خزمەتکارەکان هاتن دەرگایان کردەوە و ئەبوولحەسەنیان بردە ژوورێ. کە عەلی کوڕی بەکار ئەوی دیت، بزەی هاتێ و بە هاتنی خۆشحاڵ بوو. پێی گوت: 'نەهاتنی ئەمڕۆی تۆ بە جارێک نارەحەتی کردم و بیرم دەکردی. من پێم خۆشە هەمیشە لە خزمەتتدا بم و تەنانەت بە قوربانت بم.' ئەبوولحەسەن گوتی: 'تۆ قسەی وا مەکە، چونکە ئەگەر من هەزار گیانم بێ، هەمووی بە قوربانی تۆ دەکەم. ئەمڕۆ کەنیزەکەی شەمسوننەهار هاتە لام و گوتی: 'ئەوەی کە نەهاتم

هیچ نەبووە، تەنیا ئەوە نەبێ، خەلیفە هەر لە لای شەمسوننەهار ماوەتەوە و بوار نەبووە بێم.' هەواڵی خانمی بۆ هێنایین. ئیدی ئەوەی کەنیزەکە گێڕابوویەوە، هەمووی بۆ عەلی کوڕی بەکار گێڕاوە.

"عەلی کوڕی بەکار ئەوەندەی دی ناڕەحەت بوو. دەستی کرد بە گریان. دوای ئەوە چاوی لە ئەبوولحەسەن کرد و گوتی: 'بۆ خاتری خودا یارمەتیم بدە و لەو گێروگرفتەی تێی کەوتووم بەجێم مەهێڵە. هەر ئەمشەو لە لام بمێنەوە.' ئەبوولحەسەن داواکەی بەجێ هێنا و ئەو شەوە لە لای عەلی کوڕی بەکار ماوە. زۆریان قسەکرد و هەر جارەی باسی شتێکیان دەکرد. ئاخری عەلی کوڕی بەکار دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی گوت:

که مێرووییەک قسە بکا و گەر موویەک بە ڕێدا بڕوا
من ئەو مێرووییەم کە دەدوێ و ئەو موویەم بە ڕێدا دەڕوا
لە تاوی زولفی مسکین و قەدی باریکی وەک و موو
جەستەم بە قەد نسێی موویە و دڵم وەکوو چاوی مێروو
گەر شەو و ڕۆژ لەگەڵ موودا و لەگەڵ مێرووودا بژیم من
نە موو و نە مێروو پێم وا قەت چ هەست ناکەن کە دەژیم من

"کە عەلی کوڕی بەکار شێعرەکەی تەواو کرد، ئاخێکی هەڵکێشا و لە خۆ چوو. ئیدی ئەبوولحەسەن وای زانی هەر بە یەکجاری مرد. چونکە هەتا تاوهەڵاتی بەیانی وە هۆش خۆی نەهاتەوە. کە تاو هەڵات و وە هۆش خۆی هاتەوە، ئەبوولحەسەن لە لای دانیشتبوو. کەمێکیان قسە کرد. پاش ماوەیەک کە چاکتر بوو ئەبوولحەسەن هەستا چوو بۆ دووکان. دووکانی کردەوە و کەنیزەکە هات و سڵاوی کرد. ئەبوولحەسەن وەڵامی سڵاوەکەی داوە. دوای ئەوە سڵاوی شەمسوننەهاری پێ گەیاندن و هەواڵی عەلی کوڕی بەکاری پرسی. ئەبوولحەسەن گوتی: 'خانم، هەر لێی مەپرسە، باسی دەرد و خەمی ئەو مەکە، داماوە لە تاوان نە شەو خەوی هەیە و نە ڕۆژ. ئەوەندە دڵتەنگ و پەرێشانە بە جارێک وشک بووە.'

"کەنیزەکەش گوتی: 'خانمەکەم، شەمسوننەهار زۆری سڵاوی بۆ تۆ و عەلی کوڕی بەکار هەبوو. نامەیەکیشی بۆ ئەو نووسیوە، حاڵی لە حاڵی عەلی کوڕی بەکار خراپترە. گوتیشی هەتا وەڵامی نامەکەی بۆ نەبەمەوە، نەچمەوە. دەبێ تۆ من بەریە لای عەلی کوڕی بەکار هەتا بۆخۆم وەڵامی نامەکەم لەو وەرگرمەوە.' ئەبوولحەسەن دووکانی داخست و لەگەڵ کەنیزەکە چوو بۆ ماڵی عەلی کوڕی بەکار. کە گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی عەلی، کەنیزەکەی لە بەردەرگا ڕاگرت و بۆخۆی چووە ژووری."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و پەنجا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، ئەبوولحەســـەن کەنیزەکەی لە بەردەرگا ڕاگرت و بۆخۆی چووە ژووریٚ. کە عەلی کوڕی بەکار دیتی، خۆشحاڵ بوو. ئەبوولحەسەن گوتی: 'شەمسوننەهار بە کەنیزەکەی خۆیدا نامەیەکی بۆ ناردووی، ســـڵاوی گەیاندووی و داوای لێبووردنی کردووە کە نەیتوانیوە بێ. کەنیزەکە لە بەردەرگا وێســـتاوە. دەفەرمووی پێی بڵێم بێتە ژووریٚ؟' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'بابێتە ژووریٚ.' ئەبوولحەســـەن چوو کەنیزەکەی هێنا ژووریٚ. کاتێک عەلی کوڕی بەکار ئەوی دیت، خۆشـــحاڵ بوو. کەنیزە نامەکەی دەرهێنا و دای بە عەلی کوڕی بەکار. عەلی نامەکەی وەرگرت، ماچی کرد و خوێندییەوە و دای بە ئەبوولحەسەن. ئەبوولحەسەن ئەو شێعرەی تێدا دیت:

خاوەنشکۆ، گیانی من فـــیدای گـــــــیان و سەرت بیٚ
لەو ڕۆژە لێم دووری، خـــــــــــــەریکە گیانم دەرچیٚ
خەو و خـــــــــواردنی من کە وەک ژەهری مارە بیٚ تۆ
خەو و خواردنـت لە هەر کوێیە نۆشـــی گیـانـت بیٚ

"دوای ئەوە نووســـیبووی کە کورتەیەک لە بارودۆخم ئەوەیە: 'چاوەیلێکم هەیە بێخەو دڵێکیش تژی لە خەم. هەناوێکیش ماندووی دابڕان و پڕ ئاوری ســـووتێنەری دووری. دوو لێوم هەیە هاودەمی ناڵە و هاوار وەک ئەوەی من لە ئەوین چیٚ کرابم و دەبیٚ بەشـــم هەر خەم و پەژارە و ژان بیٚ. بەردەوام نەخۆشـــی ڕووم تیٚ دەکا و گڕ و حەزی ئەوین هەڵمدەقرچێنیٚ، هەر وەک شاعیر دەڵیٚ:

ئـــــەرخـــــەوانـــــە ڕووی دەلال و دڵـبەرت
زەعــفەرانـــــە ڕووی مـنـی ســـەوداســـەرت
ئـارەزوومـــــە ســـوور و گـــــەش بی تۆ، گوڵم
بـا بســــووتـێـنـیٚ گـڕی عـیشـــقـت دڵـم
خـــۆزگە دەمــدیـتــی بە دەم قــاقــاوە دێــی
شـــــۆخ و شـــەنـگ و لـیٚ بە بـزە واوە دێـی

" 'ئەوەندە بزانە ئەو هات و هاوارەم گڕی ئەو کێشـەیەم دانامرکێنێتەوە، بەڵام ناسـاغان ســـەبر و قەراریان نامێنیٚ و تەنیا بۆ ئارامکردنەوەی هەناوی خۆیان نامە دەنووســـن و خۆیانی پیٚ فریو دەدەن. بە هیوای پێکگەیشتن دڵخۆشی خۆم دەدەمەوە. هەر وەک شاعیر

دەڵێ:

مــن بە هــیــوای گەیشـــــتــن بە تــۆ زیــنــدووم
دەنــا دووریــت ســــەد ڕێــی مەرگــم دەخــاتە بەر

"ئەبوولحەســەن گوتی: 'کە نامەکەم خوێندەوە قســەکانی ئەو ئەوەندەی دیکە ناڕەحەتی منیان زیاتر کرد و واتاکەیان جەرگمیان ســـووتاند. دوای ئەوە نامەکەم دا بە کەنیزەکە.' عەلی کوڕی بەکار بە کەنیزەکەی گوت: 'ســـــڵاوی خانم بگەیەنە و ئەو لە بارودۆخی من ئاگادار کەوە.' دوایە دەســـــتی کرد بە گریان. کەنیزەکەش بە گریانەوەماڵاوایی لە عەلی کوڕی بەکار کرد و لەگەڵ ئەبوولحەسەن ڕۆیشتە دەرێ. ئەبوولحەسەن کەنیزەکەی بەڕێ کرد و بۆخۆی گەڕاوە بۆ دووکان."

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هــات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سەد و پەنجا و هەشتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، ئەبوولحەسەن کەنیزەکەی بەڕێ کرد و بۆخۆی گەڕاوە بۆ دووکان. بە دڵێکی پڕ لە خەم و ماتەم دانیشت. ئەو ڕۆژە و شەوەکەشی هەر سەری لەو کارە سووڕ مابوو. بۆ ڕۆژی دوایە چوو بۆ لای عەلی کوڕی بەکار. ئەوەندە لەوێ دانیشت هەتا دانیشتووان ڕۆیشتن و دەوری چۆڵ بوو. ئەوجا هەواڵی پرسی. عەلی کوڕی بەکار دەستی کرد بە داد و ناڵە لە دەست دەرد و ئازاری خۆشەویستی و ئەو شێعرەی گوت:

ئەو جوورە کە من شەیدا بووم، عاشقەیل
مەجنوون قەت نەبوو گیرۆدەی ڕووی لەیل
خەفەت لە ناخما لانەی کرووە
چی وە پی بکەم جێی خۆی گرتووە
دەردی دڵداری باسی ناکرێ
دڵ بەهێز نەبێ بەرگە ناگرێ؟

"ئەبوولحەسەن گوتی: 'من کەسی وەک تۆم نەدیوە لە خۆشەویستیدا. جا ئەوە خۆشەویستەکەت لەگەڵت زۆر بە بەزەیی و دلۆڤانە، خۆ ئەگەر دڵڕەق و نەبان و دوورەپەرێز با، چیت دەکرد؟'

"ئەبوولحەسەن گێڕاوییەتەوە کە ئیدی بە گوێی قسەکەی منی کرد و دەستی لەو ناڵە و گریان و کرووزانەوەیە هەڵگرت و دوعای بە خێریشی بۆ من کرد. ئەمن هاوڕێیەکم بوو ئاگای لەو کارەی من و عەلی کوڕی بەکار هەبوو. ئیدی جگە لەو کەسی دیکە بە هیچی نەدەزانی. ڕۆژێک ئەو هەواڵی عەلی کوڕی بەکار و شەمسوننەهاری لە من پرسی. گوتم: 'وەڵا ئەوان لە ئەوین و خۆشەویستی و دڵداریدا نوقم بوون. بەڵام من شتێکم بە زەین گەیشتووە بزانم تۆ دەڵێی چی؟' هاوڕێکەی ئەبوولحەسەن گوتی: 'ئەو کارە چییە؟' ئەبوولحەسەن گوتی: 'من پیاوێکی بەناوبانگم و لەگەڵ ژنان و پیاوانی دەربار سەودا و مامەڵە دەکەم، لەوە دەترسم ئەو نهێنییە ئاشکرا بێت و لەو نێوەدا تێدا بچم و ماڵەکەشم دەستی بەسەردا بگیرێ. دەڵێم ماڵەکەم کۆ کەمەوە و بڕۆم بۆ بەسرە و ماوەیەک لەوێ بمێنمەوە هەتا بزانم کارەکەی ئەوان بە کوێ دەگا، چونکە ئەوان دەستیان کردووە بە نامەگۆڕینەوە و کەنیزێک نامە و هەواڵ لەنێوانیاندا دێنێ و دەبا. دەترسم ئەو لەو هاتوچۆیە وەڕەس بێت و شتەکە بدرکێنێ و بڵاو ببێتەوە. ئیدی ئەو دەم تازە ڕزگاربوونی من ئاستەمە.' هاوڕێکەی ئەبوولحەسەن گوتی: 'من ئەو کارەم بیستبووەوە. ئەو کارە

کارێکی جێی مەترسییە و پیاوی ژیر دەبێ خۆ لەو جۆرە کارانە بپارێزێ، خۆی بە دوور بگرێ لە شەڕی ئەو جۆرە کارە ئابڕووبەرانە. ئەو بیرەی کردووتەتەوە زۆر باشە.' ئەبوولحەسەن گورج گەڕاوە ماڵەکەی. کەلوپەل و شتەکەی کۆ کردنەوە و ساز بوو بۆ سەفەر. دوای سێ ڕۆژ بەرەو بەسرە کەوتە ڕێ. پێش ئەوەی بڕوا، هاوڕێکەی چوو بۆ ماڵی ئەبوولحەسەن، کەچی لە ماڵ نەمابوو. لە دراوسێکانی پرسی، گوێتان: 'چووە بۆ بەسرە و زوو دێتەوە.' ئەو پیاوە سەری لە کاری ئەبوولحەسەن سووڕ ما و بۆخۆشی نەیدەزانی چ بکا و بچێ بۆ کام لا. گوتی: 'خۆزگە لە ئەبوولحەسەن جوێ نەدەبوومەوە.' دوای ئەوە چوو بۆ ماڵی عەلی کوڕی بەکار. کە چوو بۆ ئەوێ، بە خزمەتکارەکانی گوت: 'ڕوخسەتی هاتنەژوورەوەم بۆ وەرگرن.' خزمەتکارەکان پرسیان کرد و بردیانە ژوورێ. سەیری کرد ئەوە عەلی کوڕی بەکار لە جێدا کەوتووە. سڵاوی لێ کرد و عەلی وەڵامی سڵاوەکەی داوە. دوای ئەوە پیاوەکە پێی گوت: 'نێوانی من و ئەبوولحەسەن زۆر خۆش بوو. من هەموو شتێکم لە لای ئەو دەگوت و هیچم لێ نەدەشاردەوە. قەت لە یەکتر جوێ نەدەبووینەوە. کەچی من کارێکم بۆ هاتە پێشێ و سێ ڕۆژان لێک بێئاگا بووین. دوای ئەو سێ ڕۆژە کە چووم بۆ دووکانەکەی، لە دووکان نەبوو. چوومە ماڵەکەی، لە ماڵ نەبوو. هەواڵیم لە دراوسێکانی پرسی، گوتیان: 'وەڵا چووە بۆ سەفەر.' دەشمزانی ئێوە نێوانتان زۆر خۆشە، هاتم گوتم بزانم تۆ هەواڵێکی نازانی؟' کە عەلی کوڕی بەکار ئەو هەواڵەی بیست، ڕەنگی تێک چوو. کەوتە نیگەرانییەوە، گوتی: 'هەتا نەتگوت، من بەو هەواڵەم نەزانی بوو. ئەگەر وەک تۆ دەڵێی ئاوا بێ، وەڵا من بەدبەخت و چارەڕەش بووم، کێشەیەکی زۆرم بۆ ساز دەبێ.' ئیدی دەستی کرد بە گریان و ئەو شیعرەی گوت:

به دڵخوازی خـــــــۆی نەگا، ئەوەی دڵان لێک دەکا
خۆشی نەبینێ، هەرکەس کاری وا نەشیـــــــاو بکا
مەلی دڵ گیانی دەرچوو لە ســـــــووچی تەنیاییدا
وەک بولبولی نــاو قەفەس هەر لە بیر جووتەکەیــدا

"دوای ئەوە چوو لە فکرەوە و ماوەیەکی باش بێدەنگ بوو. ئینجا سەری بەرز کردەوە و بە خزمەتکارەکەی گوت: 'بچۆ بۆ ماڵی ئەبوولحەسەن بزانە چووە بۆ چ شارێک.' خزمەتکارە ڕۆیشت و ماوەیەکی پێ چوو. کە هاتەوە، بە عەلی کوڕی بەکاری گوت: 'هەواڵی ئەبوولحەسەنم پرسی، گوتیان: 'چووە بۆ بەسرە.' بەڵام کەنیزێکم لە دەرکی ماڵی ئەبوولحەسەن دیت کە ئەو منی ناسی، بەڵام من ئەوم نەناسی. لە منی پرسی: 'تۆ نۆکەری عەلی کوڕی بەکاری؟' گوتم: 'بەڵێ.' کەنیزەکە گوتی: 'من نامەیەکم لە لایەن دڵۆڤانترین کەسەوە پێیە، بۆ عەلی کوڕی بەکارم هێناوە.' ئیدی ئەو کەنیزە لەگەڵ من هات و ئێستاش

لە بەردەرگایە. عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'دا بیهێنە ژووریٚ.' نۆکەرەکەی چووە دەریٚ و کەنیزەکەی هێنا ژووریٚ. ئەو پیاوەی کە لە لای عەلی کوڕی بەکار بوو چاوێکی لە کەنیزەکە کرد. ئەوی زۆر جوان و لەبەردڵان هاتە بەرچاو. کەنیزەکە هاتە پێشیٚ و سڵاوی لە عەلی کوڕی بەکار کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پیٚ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و پەنجا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشــکۆ، کەنیزەکە هاتە لای عەلی کوڕی بەکار و ســڵاوی کرد. بە ســرتە شــتێکی پێ گوت و دوای ئەوە ماڵاوایی کرد و گەڕاوە. ئەو پیاوەی لە لای عەلی کوڕی بەکار دانیشتبوو پیشـەی گەوهەرفرۆشـی بوو. کە کەنیزەکە ڕۆیشـت، گەوهەرفرۆشـەکە بە دەرفەتی زانی قسـە لەگەڵ عەلی کوڕی بەکار بکا. هەر بۆیە بە عەلی کوڕی بەکاری گوت: 'پێم وا بێ لەنێوان دارولخەلافە و تۆدا شـتێک لە ئارادایە و سـەودایەک لە گۆڕێدایە.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'ئەوە لەکوێوە زانیوتە؟' گەوهەرفرۆش گوتی: 'من ئەو کەنیزە دەناسـم. ئەوە کەنیزی شــەمســوننەهارە و ماوەیەک لەوەو پێش هاتە لام و نامەیەکی هێنابوو ملوانکەیەکی ڕازاوە بە زێڕ و زیوی دەویســت و منیش ملوانکەیەکی گرانبایيم بۆ نارد.' کاتێک عەلی کوڕی بەکار ئەو گوتەی بیســت، ترسـا و نیگەرانی کوشـتنی خۆی بوو بەڵام وەســەر خۆی نەهێنا و بە گەوهەرفرۆشــەکەی گوت: 'کاکە، تۆ خودا تۆ شــەمســوننەهار لەکوێوە دەناســی؟' گەوهەرفرۆش گوتی: 'نیگەران مەبە و لە من مەترســە.' ئیدی عەلی کوڕی بەکار بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕاوە و گوتی: 'کاکە، بە خودا مەبەست لە شاردنەوەی شتەکە ئەوەیە مرۆڤ دەترسێ کە دۆست و ئاشنایان شتەکەت لێ بڵاو کەنەوە و قایمکار نەبن.' گەوهەرفرۆش بە عەلی کوڕی بەکاری گوت: 'من ئەوەندەم تۆ خۆش دەوێ، گوتم ئێســتا کە ئەبوولحەســەن لە ماڵ نییە، لە جیاتی ئەو بچم ســەرێکی بدەم و کەمێکی لە لا دانیشــم و پێکەوە بڕێک قســە بکەین با وەڕەز نەبێ. ئێســتاش تۆ هیچ نیگەران مەبە و وا بزانە برای خۆت لێرەیە.' عەلی کوڕی بەکار سوپاسی کرد و ئەو شێعرەی بۆ گوت:

دڵـم زۆر تەنـگە و فـرمـێســـکـم زاردڕاوە[1]
کوا دڵم ڕادەگرێ نــــهێنی شــــاراوە
بە دڵم گوت: 'خۆ لە داوی ئــــەوین مەدە'
گوێی نەدامێ، بـا هەڵـکـا لەنێـو ئەو بەنـدە

"دوای ئەوە بە گەوهەرفرۆشـی گوت: 'تێگەیشـتی ئەو کەنیزە بە سـرتە چی پێ گوتم؟' گەوهەرفرۆش گوتی: 'ناوەڵڵا.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'ئەو پێی وا بوو کە ئەبوولحەسەن بە قســە و پێشــنیاری من چووە بۆ بەســرە هەتا چی دی نامە و پەیامم بۆ نەهێنێ. من ســوێندم خوارد کە شــتی وا هەر نەبووە. کەچی باوەڕی پێ نەکردم و هەر بەو باوەڕەوە چووەوە بۆ لای خانم، چونکە ئەو کەنیزە بۆخۆشــی ئەبوولحەســەنی خۆش دەویســت.'

١. فرمێسکم زاردڕاوە: فرمێسکەکەم نهێنی دڵم ئاشکرا دەکا.

گەوهەرفرۆشـەکە گوتی: 'براکەم، ئیشـەڵلا یارمەتیت دەدەم بە ئاواتت بگەیت.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'جا چی لێ بکەم؟ وەک ئاسکی سرک وایە دەردەپەڕێ.' گەوهەرفرۆش گوتی: 'دەبێ کارێکت بۆ بکەم و هەوڵ بدەم پێکتان بگەیەنم، بێ ئەوەی شتەکەت لێ ئاشکرا بێ و زیانێکت پێ بگا.' پاشـــان مۆڵەتی هاتنەوەی لە عەلی کوڕی بەکار وەرگرت. عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'برا گیان، تکات لێ دەکەم کەس نەزانێ!' دەستی کرد بە گریان. گەوهەرفرۆش ئاورێکی داوە و ماڵاوایی لێ کرد."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سەد و شەستەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، گەوهەرفرۆش مالاوایی لە عەلی کوڕی بەکار کرد و گەڕاوە. نەیدەزانی چی بکا و چۆن یارمەتی عەلی کوڕی بەکار بدا. هەر وا دەڕۆیشت و بیری لە کارەکانی عەلی دەکردەوە، لەپڕدا تووشی کوتە کاغەزێک بوو. کاغەزەکەی هەڵگرتەوە و ناوەرۆکەکەی خوێندەوە. سەیری کرد لە کەسێکەوەیە بۆ خۆشەویستەکەی. ئەو شێعرەشی تێدا نووسرابوو:

مەپێکە دڵم بە تیری دووری
چون بەرگە ناگرێ نەیما سەبووری
داوی عیشقت وا دەست و پێمی بەست
کەوتووم لە سوێیان، بێهێز وەکوو مەست
وەکوو نامۆیەک ڕووت وەرمەگێڕە
چیرۆکی عیشقم لە بۆ وەگێڕە

"دوای شێعرەکە نووسیبووی: 'گەورەم هۆکاری بڕینی پێوەندییەکەت و نەناردنی نامە و پەیامەکەتم نەزانی. ئەگەر دەتەوێ ئازارم بدەی، من دەمەوێ ئارامیت پێ ببەخشم. ئەگەر سۆزت بۆم کەمبووەتەوە، ئەوە سۆزی من دوو هێندە بووە.'

بە گیانی خۆشەویستیمان پەیمانم نەشکاندووە
دابڕای لێم لەگەڵ کەس پەیمانی دیم نەبەستووە

"گەوهەرفرۆش کاغەزەکەی دەخوێندە کە سەیری کرد لەو لاوە کەنیزێک دێ و هەر چاوی بە عەرزەکەدا دەگێڕا. کە کاغەزەکەی لە دەست ئەودا دیت، گوتی: 'گەورەم، ئەو کاغەزە هی من بوو لێم کەوت.' گەوهەرفرۆش وەڵامی نەداوە و ڕۆیشت. کەنیزەکە دوای کەوت هەتا گەیشتەوە ماڵی خۆیان و چووە ژوورێ. کەنیزەکەش بەدوایدا چووە ژوورێ و بە گەوهەرفرۆشەکەی گوت: 'گەورەم، ئەو کاغەزەم دەوە. هی من بوو لێم کەوتبوو.' گەوهەرفرۆش ڕووی لە کەنیزەکە کرد و گوتی: 'کەنیزەکە، مەترسە و نیگەران مەبە. هەر ڕاستییەکەم پێ بڵێ و بۆم بگێڕەوە چی بووە. من لە لای کەس باسی ناکەم. هیچ مەترسە و لە بارەی کاری خانمەکەتەوە ئاگادارم کەوە، بەشکو منیش بتوانم کارێکی بۆ بکەم. بۆی هەیە کارێکی زۆر سەخت و گران بە لای منەوە ئاسان بێ.' کەنیزەکە کە قسەکانی ئەوی بیست، گوتی: 'بۆت دەیگێڕمەوە بەڵام تۆ خودا لە لای هیچ کەس باسی مەکە. پێم وایە

کارێک تۆش دەســـتت تێیدا بێ، باش دەردێ. من دڵم لە تۆ دەحەســـێتەوە، هەموو ڕاستییەکەت پێ دەڵێم.' ئیدی هەرچی بوو لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەمووی بۆ گێڕاوە.

"گەوهەرفرۆش گوتی: 'هەموویت بە ڕاســـتی پێ گوتم، منیش ئاگاداری هەموو شـــتێک هەم.' دوای ئەوە گەوهەرفرۆشیش هەرچی لەگەڵ عەلی کوڕی بەکار گوتبوویان و باسیان کردبوو هەمووی بۆ گێڕاوە. کەنیزەکە کە ئەوەی بیست، خۆشحاڵ بوو. ئیدی لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە نامەکە بگەیەننە دەست عەلی کوڕی بەکار. لەوێ هەرچی بکرێ و بگوترێ و هەر وەڵامێکی کە لەوی ببیســـتێ، لە پێشـــدا بێ بۆ گەوهەرفرۆشـــی بگێڕێتەوە و دوایی بچێتەوە لای شـــەمســـوننەهار. ئیدی کەنیزەکە کاغەزەکەی لێ وەرگرت چوو بۆ لای عەلی کوڕی بەکار. کە چوو چاوەڕێی بوو. کاغەزەکەی دایە. عەلی کوڕی بەکار نامەکەی خوێندەوە و وەڵامەکەی بۆ نووســـی و دایەوە دەســـت کەنیزەکە. کەنیزە گەڕاوە بۆ لای گەوهەرفرۆشـــەکە. گەوهەرفرۆشـــەکە مۆرەکەی لێ کردەوە و نامەکەی خوێندەوە کە تێیدا نووسرابوو:

بوتەکەم، دووریـــــــت تەمەنمی بەرەو کوتایی بردووە
چاوەڕوانی حەسانەوەی لە دڵمدا نەهـــــــــــێشتووە
لە تـاوانـت ســـەرگەردانم ئـارامـی لە ژیـانـم بـڕا
من ناســـرەوم تا بۆم دێنێ هەواڵی تۆ، پەیکی ســـەبا

"دوای ئەوە نووســـیبووی: 'خۆ خەتایەک لە منەوە ڕووی نەداوە. نە ئازارم داویت و نە بێ گفت و بەڵێن بووم. نە لە خۆشـــەویســـتیت دابڕاوم. هەمیشـــە لەگەڵ خەمی دووریت دەستەملان بووم. جگە لەوەی تۆ ویستووتە، نەمویستووە. قەسەم بە خودا جگە لە گەیشتن بە تۆ هیچ ئاواتی دی بە دڵما نەهاتووە. ئەوینی خۆم شـــاردووەتەوە، هەرچەند خەم و دەردی ئەو ئەوینە ویشـــک و بێزەوق و نەخۆش خســـتووم. ئەوەیە بارودۆخ و حاڵی من. تەواو.'

"کاتێک گەوهەرفرۆش کاغەزەکەی خوێندەوە و زانی چ باسە، گریا. ئینجا کەنیزە گوتی: 'لێرە مەچۆ دەرێ هەتا بزانم بە هەر فێڵێک بێ تۆ و خانم پێک نەناســـێنم و دیدارێکتان بۆ ساز ناکەم.'

"کەنیزە چووەوە بۆ لای خـانمەکەی. گەوهەرفرۆش بە نیگەرانی و دڵەڕاوکێ ڕۆژی کردەوە. کە ڕۆژ بووەوە، هەستا و نوێژی بەیانی کرد و دانیشت. چاوەڕێی کەنیزە بوو. وا بوو لە پڕدا کەنیزە بە دڵخۆشـی هات. گەوهەرفرۆش لێی پرسـی: 'چ باســە؟' کەنیزە گوتی: 'من لێرەوە چووم بۆ لای خـانم و نووســـراوەکەی عەلی کوڕی بەکـارم دایە. کە

نووسراوەکەی خوێندەوە و زانی ئەبوولحەسەن ڕۆیشتووە، زۆری خەم بوو. گوتم: 'خانم، بۆ ڕۆیشتنی ئەبوولحەسەن نارەحەت مەبە، کارەکەمان پەکی ناکەوێ. کەسێکی دیکەم دیوەتەوە لەویش چاکترە و هاوکاریمان دەکا. پیاوێکی خانەدانە و ڕازدارە. هەرچی لەنێوان تۆ و ئەبوولحەسەندا بووە هەمووم بۆ گێڕاوە. باسی دیدارەکەی تۆ و عەلی کوڕی بەکارم بۆ کرد. گوتیشم نامەکەم لێ ون ببوو ئاوام دیوەتەوە. ئێستا خانمەکەم پێی خۆشە بتبینێ و قسەت لەگەڵ بکا. دەبێ لەگەڵم بێی بچین بۆ لای خانم.' گەوهەرفرۆش کە ئەو قسانەی لە کەنیزەکە بیست، واقی وڕ ما، چونکە دەیزانی چوون بۆ لای شەمسوننەهار کارێکی سووک و ئاسان نییە و مەترسی ئێجگار زۆرە. بە کەنیزەکەی گوت: 'خوشکی من، من کوڕە مسکێنم و لەگەڵ ئەبوولحەسەن جیاوازیم هەیە. ئەو پیاوێکی بە قەدر و بە ناوبانگە و هاتوچۆی ماڵی خەلیفە دەکا و ماڵی خەلیفە هەموو پێویستیان بەو هەبوو. من کە قسەم لەگەڵ ئەبوولحەسەن دەکرد، سامم لێ دەکرد و دەلەرزیم. من قەت ناتوانم و ناوێرم قاچ بخەمە ماڵی خەلیفەوە. پێی بڵێ ئەگەر خانم دەیەوێ من ببینێ، ئەوە لە دەرەوەی کۆشک لە شوێنێکی دوور با یەکتر ببینین. وا بێ لە کۆشکی خەلیفە دوور بێ.'

"بە کورتی، گەوهەرفرۆش نەیدەوێرا پێ بخاتە ناو کۆشک و ماڵی خەلیفەوە. کەنیزەش هەر دڵخۆشی دەداوە و وورەی وەبەر دەنا و پێی دەگوت: 'غیرەتت بێ و لە هیچ مەترسە.' گەوهەرفرۆش ئەوەندە دەترسا، هەر کە ویستی ڕازی بێ و بچێ، تەواوی گیانی کەوتە لەرزین و خەریک بوو چۆکی شل بێ. کەنیزەکە کە ئەوی ئاوا دیت، گوتی: 'دەی باشە ئەگەر تۆ ئەوەندە دەترسی و لەبەرت گرانە، من خانم دێنم بۆ لای تۆ. بەڵام تۆ لە ماڵەکەی خۆت مەچۆ دەر.' کەنیزەکە ئەوەی گوت و ڕۆیشت. دوای ماوەیەک گەڕاوە و بە گەوهەرفرۆشی گوت: 'نەکا ئێرە کەنیز و غولام و شتی لێ بێ؟!' گەوهەرفرۆش گوتی: 'جگە لە کەنیزێکی ڕەشی پیر، کەسی دیکەی لێ نییە.' ئیدی کەنیزی شەمسوننەهار هەستا و کەنیزە پیرەکەی بردە دیوێکی دیکە و دەرگاکەی لەسەر داخست. بۆخۆی ڕۆیشت شەمسوننەهاری لەگەڵ خۆیدا هێنا و هاتەوە. ماڵی پڕ کرد لە بۆنی میسک و عەنبەر و گوڵاو. گەوهەرفرۆش کە چاوی بەو کەوت، لەبەری هەستا. شەمسوننەهار دانیشت و ماوەیەک هیچی نەگوت هەتا حەساوە. دوایی پەچەی لە سەری لادا. گەوهەرفرۆش وای زانی لە ماڵەکەیدا خۆر هەڵاتووە. شەمسوننەهار بە کەنیزەکەی گوت: 'ئەوەیە ئەو پیاوەی باست دەکرد؟' کەنیزە گوتی: 'بەڵێ.' شەمسوننەهار ڕووی لە گەوهەرفرۆش کرد، چاکوخۆشی لەگەڵ کرد. گەوهەرفرۆش سوپاسی کرد و نزای خێری بۆ کرد. شەمسوننەهار گوتی: 'تۆ کارێکت کرد من بێمە ئێرە هەتا ئاگاداری ڕاز و نهێنی نێوانی ئێمە بی. ئێستا پێم بڵێ تۆ چۆناوچۆن بەو کار و پەیوەندییەی نێوان ئێمەت زانی؟' گەوهەرفرۆش لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی هەموو شتێکی بۆ گێڕاوە. شەمسوننەهار بۆ

ڕۆیشـــتنی ئەبوولحەســـەن زۆر ناڕەحەت بوو. بە گەوهەرفرۆشـــی گوت: 'کاکی برا، تۆ ئەوەنده بزانە کە ڕۆحی مرۆڤەکان پێکەوە بە هۆی بەزەیی و ســـۆز و دلۆڤانییەوە لە پێوەندی دان. هیچ پێوەندییەک بەبێ پێکەوەدوان و وتوویژ جێبەجێ نابێ و هیچ ئاوات و نیازێکیش بەبێ هەوڵ و تێکۆشان نایەتە دی. کەس بەبێ ماندوو بوون پێ ناگا.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشكۆ، شەمسوننەهار گوتی: 'هیچ كەس بێ هەوڵ و تێكۆشـان بە ئامانج ناگا. جگە لە جوامێران كار بە كەسـی دیكە جێبەجێ نابێ. جا ئەوە من تۆم لە هەموو شـتەكان ئاگادار كردەوە. ئێسـتا پاراسـتن و دركاندنی ڕازی ئێمە لە دەسـت تۆدایە. ئەوەندەش بزانە ئەو كەنیزە زۆر ڕازدارە، هەر بۆیەشە لە لای من پلە و پایەی باشی هەیە. كارە گەورە و گرینگەكان هەر بەو دەسـپێرم. تۆش تەواو پشـت بەو ببەسـتە و هەموو شتێكی بۆ باس بكە و لێی نیگەران مەبە. ئەو كەنیزە هەواڵ و بابەتەكانی نێوان من و عەلی كوڕی بەكار دێنێ و دەبا، تۆ لەنێوان ئەواندا كارئاسـانییان بۆ بكە. هەر كار و گرێیەك بكەوێتە كارتەوە كە ناشكەوێ، ئەو كەنیزە دەیكاتەوە.' ئەو قسانەی كرد و هەستا ڕۆیشت. گەوهەرفرۆش هەتا بەردەرگای بەڕێی كرد. ئینجا گەوهەرفرۆش گەڕاوە و لە جێگەی خۆی دانیشـتەوە چووە بیری جوانی، ڕێكوپێكی، ژیری، ئەدەب، قسـەزانی، گفتخۆشـی و خوێنشـیرینی شـەمسـوننەهارەوە تا ماوەیەكی باش بیری لێ كردەوە تا دواجار ئارام بووەوە. داوای خواردنی كرد. كەمێكی شـت خوارد و جلەكانی لە بەر كرد، چوو بۆ ماڵی عەلی كوڕی بەكار. سـەیری كرد ئەوە لە جێدایە. عەلی كە ئەوی دیت، گوتی: 'ئەوە بۆ وا دەرەنگ هـاتی و منت نیگەرانتر كرد.' ئیدی بە خزمەتكـارەكـانی گوت: 'بچنە دەرێ' و دەرگاكەی داخست. ئەوجا بە گەوهەرفرۆشی گوت: 'بە خودا لەو ڕۆژەوە لێرە ڕۆیشتووی، من خەو و خواردنم لێ حەرام بووە. سـەرم لە خۆم سـووڕ ماوە بۆ ئاوا ئارامم لێ هەڵگیراوە! ئەبوولحەسەن هاوڕێ و هاودەمم بوو. ئەو كەنیزەی دەناسی.' كە گەوهەرفرۆش قسـەكانی كوڕی بەكاری بیسـت، پێكەنی. كوڕی بەكار بە پێكەنینەكەی ئەو نارەحەت بوو دەستی كرد بە گریان و ئەو شێعرەی گوت:

سـكاڵای ئـەو دڵـە ئـەڤیندارەم  
دەبـێ بـەرمـە لای دڵبـریـنـدارێ،  
چـونـكـە دەزانم دەردەدار نـەبێ  
چـارم نـاكـا هـیـچ لـۆمـەم لـێ دەگـرێ

"كە گەوهەرفرۆش سەیری كرد عەلی گریا، تەواوی ئەو شتانەی هەتا كۆتایی بۆ گێڕاوە كە لەنێوان ئەو و كەنیزەكە هاتە پێشـێ. ئەو جەنگەیەی ئەو قسـەكانی بۆ دەگێڕاوە، عەلی ورد گوێی دابوویە. جارجار سـەر گۆنای سـوور دەبووەوە و نەرمە بزەیەكی شـاراوەی دەهاتە سـەر لێو و هێز و گوڕی دەهاتەوە بەر. جارجاریش وێك دەهات و تێك دەچوو. كە

گەوهەرفرۆش قسەکانی تەواو گێراوە، عەلی دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'کاکە، چ بکەم؟ بە خودا من دەمرم. خۆزگە هەر بمرم. من بەرگەی ئەو هەمووە خەمە ناگرم. هیوادارم تۆ برایانە بیرێکم بۆ بکەیتەوە و منیش لە قســـەت دەرنەچم.' گەوهەرفرۆش گوتی: 'براکەم، ئاگری ئەو دڵەی تۆ دانامرکێ مەگەر پێک بگەن و ئاوێتە بن. ئەویش ئێرە مەترســـیدارە و بۆ ئەوە نابێ. دەبێ بێن بچنە ماڵی دراوسێیەکی ئێمە لەوێ دانیشن و دەردی دڵ و قسە و باسی خۆتان بکەن، بەشکو سوکناییتان بێتێ.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'تۆ بۆخۆت چۆنت پێ باشـــە ئاوا بکە.' گەوهەرفرۆش گوتی: 'ئەو شـــەوە لە لای علی کوڕی بەکار مامەوە و کەمێکم چیرۆکی دڵداری بۆ گێڕاوە هەتا ڕۆژ بووەوە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و شەست و دووەم داهات

گوتی: "خاوەنشکۆ، گەوهەرفرۆش گوتی: 'ئەو شەوە لە لای عەلی کوڕی بەکار مامەوە و چیرۆکی دڵداریم بۆ گێراوە هەتا ڕۆژ بووەوە و گوێم لە دەردی دڵی ڕاگرت. بەیانی هەســـتام نوێژم کرد و ماڵاواییم لێ کرد و هاتمەوە ماڵی خۆمان. لای قاوەڵتی کەنیزەکە هات و سڵاوی کرد. وەڵامی سڵاوەکەییم داوە و بۆم گێراوە کە شەو لە لای عەلی کوڕی بەکار بووم. کەنیزەکە پێی گوتم: 'خەلیفە تازە لە لای خانم ڕۆیوەتەوە و شـوێنەکەش زۆر ئەمن و لاپەڕە، لە هەموو جێیەک باشترە.' ئەمنیش گوتم: 'قسەکەی تۆ ڕاستە، بەڵام ماڵی ئێوە وەک ماڵی من نییە، چونکە ماڵەکەی من ئەمنتر و چۆڵترە و کەس نایە.' کەنیزەکە گوتی: 'قســـەی تۆش ڕاســـتە. من دەچمەوە لای خانم، بۆچوونی جەنابیشـــتی لەگەڵ باس دەکەم بزانم ئەو دەڵێ چی.' کەنیزەکە ڕۆیشـــت و چوو بۆ لای خانم و بۆچوونی منی پێ ڕاگەیاند. ئەویش پێی باش ببوو. ئیدی کەنیزەکە هاتەوە و پێی گوتم کە خانم پێشنیارەکەی تۆی لا پەسندە.

" 'کەنیزەکە هەنبانەیەکی زێڕ دەرهێنا و گوتی: 'خانم ســـڵاوی دەگەیاندی و گوتی ئەو زێڕانە هەڵگرێ و میوانداری ئێمەی پێ بکا.' من ســـوێندم خوارد کە ئەو زێڕانە وەرناگرم، بۆخۆم میوانداریتان دەکەم. کەنیزەکە زێڕەکانی هەڵگرتەوە و بردنییەوە بۆ خانم. منیش دوای ڕۆیشتنی کەنیزەکە هەستام چووم ئەو خانووە چۆڵەی لای ماڵەکەی خۆمم ئاوەدان کردەوە و فەرشی باشم تێدا ڕاخست و کەلوپەلی نوقرە و چینیم بۆ برد و تەواو ئاوەدانم کردەوە. پێداویســـتی خواردن و خواردنەوەم لە هەموو چەشنێک بۆ برد. ماڵێکی ئامادە لە چەشنی ماڵی شا. کە کەنیزەکە هاتەوە هەموو شتێک ساز و تەیار بوو سەری سووڕ ما. فەرمانی دا بچم عەلی کوڕی بەکاریش بێنم. گوتم: 'ئیدی ئەوەیان کاری خۆتە.'

" 'وا بوو کەنیزە بۆخۆی چوو عەلی کوڕی بەکاری هێنا. کە عەلی کوڕی بەکار هات، بۆخۆم چووم بۆ پێشوازی و بەخێرهاتنم کرد و لە شوێنێکی شیاو دامنا. بۆنی جۆراجۆرم لە دەفری بلووریدا لەپێش دانا و لە پەنای دانیشتم و دەستم کرد بە قسەکردن. کەنیزیش چووەوە و دوای نوێژی خەوتنان لەگەڵ شـەمسـوننەهار و دوو کەنیزی دیکە هاتنەوە. کە عەلی کوڕی بەکاری دیت و ئەویش چاوی بەو کەوت، هەردووکیان بێهۆش کەوتن. ماوەیەک هەر وا بێهۆش بوون. کە وە هۆش هاتنەوە، دەســـتیان کرد بە دەردی دڵ و قســەوباسی خۆیان. پاش بەینێک لێم پرسین: 'نان دانێم؟' گوتیان: 'ئەگەر زەحمەت نەبێ.' ئیدی نانمان دانا و خورا و دەستیان شۆرد. ئەوانم بردە دیوێکی دیکە و بادەشم بۆ دانان. بادەیان خواردەوە و سەرخۆش بوون.

" 'شـــەمســـوننەهار پێی گوتم: 'دەســـت خۆش، هەموو شـــتێک تەواوە. ئەگەر دەکرێ عوودێک بێنی.' هەستام عوودم بۆ هێنان. شەمسوننەهار دەستی دا عوودەکە و سیمەکانی توند کردەوە و دەستی پێ کرد و ئەو شێعرەی بە گۆرانی گوت:

چ خـــــۆشـه لەگەڵ هاوڕێیان لەنـــــــــــێو نوالاندا
ڕووح و گیـان ســـــوکنـایی دێتێ لە چوونە دەردا
کۆوە بن لەدەوری یەکتر دوور لە بەخیــــــــــــلان
هەڵڕێژی دەرد و خەمی دڵ لە ســـــەرخـــــــۆشـــیدا

" 'ئاوەز لە ئاست ئەو گۆرانییە دادەما و چی وای نەمابوو هەموو لە خۆشیان هەستنە ســـەما. دوای ئەوە گەڕێکی دیکەیان مەی خواردەوە. ئینجا کەنیزەکە عوودەکەی هەڵگرت و تێلەکانی توند کردەوە و بە گۆرانی ئەو شێعرەی گوت:

ئەوشـــــەو بە ڕاســـــتـی شـــــەومـان ڕوونـاکە
دوو دڵ پـــێـک گەیـــون شـــــەوێـکـی پـاکە
بـــای بەهـــار دێـــت و گـــوڵ دەبـــزوێـــنـــێ
خـــۆشـــــی بە لـــێشــــاو بـــۆ دڵـمـان دێـــنـــێ
ئەو شـــــــنەبــایە بـــۆنـــی زۆر خـــۆشـــــە
بـــۆی هەنـــاســــەتە یـــا بـــۆی وەنەوشـــــە

"گەوهەرفرۆش گوتبووی: 'ئەوانم لەوێ بەجێ هێشـــت و بۆخۆم چووم لە شـــوێنێکی دیکە هەتا بەیانی خەوتم. بەیانی هەســـتام دەســـنوێژم شـــۆرد و قاوەم خواردەوە. هەر کە ویســـتم بچمەوە لای ئەوان، یەکێک لە هاوسـێکانمان هات و گوتی: 'ئەوە دوێشـــەو لە ماڵی ئێوە چی بوو؟' من گوتم: 'بۆ چی بووە؟ تۆ چیت دی؟' هـاوســـێکەمـان گوتی: 'ڕۆژێـک لەپێشدا دزان چووبوون ماڵی دراوسـێیەکیان تاڵان کردبوو و خۆشیان کوشتبوو. دوێنێش کە تۆیـان دیبوو فەڕش و کەلوپەل دەگوێزییەوە ئەو مـاڵە، ئیـدی شـــەو چوون تەواوی میوانەکانیان کوشتووە و شتەکانیان تاڵان کردووە.'

"گەوهەرفرۆش دەگێڕێتەوە کە من ویستم هەستم ،هێزی پێم نەبوو. لەگەڵ هاوسێکەمان چووینە ئەو ماڵە. ســـەیرم کرد ئەوە خانوویەکی چۆڵوهۆڵ هیچی تێدا نەماوە. ســـەرم لەو کارە دەرنەدەچوو. گوتم: 'بۆ شـــتەکان نارەحەت نیم، هەرچەند زۆربەیانم بە ئەمـانەت وەرگرتبوو چونکە ئەگەر خاوەنی شـــتەکان بزانێ کە ماڵەکەم تاڵان کراوە و هیچم نەماوە، ئەویش لێم خۆش دەبێ. من نیگەرانی عەلی کوڕی بەکار و شـەمسوننەهارم کە ئەگەر بێتو

ئاشکرا بێ، من بە مسۆگەری دەکوژرێم.' دوایی ڕووی لە دراوسێکەیان کرد و گوتی: 'تۆ هاوسێی و لە برا فەرزتری و پارێزەری منی. ڕێنوێنیم کە چ بکەم لەو بەلایە ڕزگارم بێ؟' ئەو کابرایە گوتی: 'بە بڕوای من وا چاکە تۆ پەلە نەکەی، چونکە هاتوونە ماڵەکەی تۆ و شتی تۆیان دزیوە. ئەو دزانە چەند کەسیان لە بنەماڵەی خەلیفە کوشتووە، نۆبەداری ماڵەکەشیان کوشتووە. ئەوە پیاوەکانی دارۆغە کون بە کون لێیان دەگەڕێن، بەشکو بیانبیننەوە. تۆ بچۆوە ماڵەکەی خۆت و چاوەڕێ بە بزانە چ دەبێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و شەست و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، گەوهەرفرۆش کە ئەو قسانەی لەو هاوسێیەیان بیست، گەڕاوە ماڵەکەی خۆی و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەبوولحەسەن لە ڕۆژێکی ئاوا دەترسا بۆیە ڕۆیشت بۆ بەسرە و ئێستا من تووشی ئەو گۆنگەڵە[1] بووم.' ئیدی وردەوردە دزرانی کەلوپەلی ماڵی گەوهەرفرۆش بە گوێی هەمووان گەیشتەوە. خەڵک لە هەموو لایەکەوە دەهاتن بۆ لای، دەستەیەک دڵخۆشییان دەداوە و دەستەیەک سەرکۆنەیان دەکرد. گەوهەرفرۆش لەبەر خەم و نارەحەتی دڵی هیچ شتێکی نەدەبرد. نە هیچی دەخوارد و نە هیچی دەخواردەوە.

"ڕۆژێک هەر وا مات و مەلوول دانیشتبوو یەکێک لە خزمەتکارەکانی هات و گوتی: 'کەسێک لە بەردەرگا وێستاوە کاری بە تۆیە و منیش نایناسم.' گەوهەرفرۆش هاتە دەرێ و سڵاوی لە کابرا کرد، نەشیناسی. ئەو پیاوە بە گەوهەرفرۆشی گوت: 'من کارێکم بە تۆیە و دەمەوێ قسەیکەت لەگەڵ بکەم.'

"گەوهەرفرۆش بردییە ژوورێ، پرسی: 'چییە؟' پیاوەکە گوتی: 'تەواوی شتەکانی تۆ لە لای منە، ئەگەر شتێکیشت پێ بڵێم، خەمت لە دڵدا نامێنێ. بەڵام ناتوانم لێرە پێت بڵێم، دەبێ بچینە شوێنێکی دیکە.' ئیدی ئەو پیاوە منی هەر لەو کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان و لەو گەڕەک بۆ ئەو گەڕەک برد؛ هەتا گەیشتینە سەر چەمی دیجلە. بانگی بەلەمێکی کرد و سواری بووین و چووینە ئەوبەری چۆم. لەوێ دابەزیین. ئەو پیاوە دەستی منی گرت و بردمییە گەڕەکێک کە تا ئێستا قەت ڕێم نەکەوتبووە ئەو گەڕەکە، منی بردە بەردەرگای ماڵێک و دەرگای کردەوە و چووینە ژوورێ. لەو دیوەوە دەرگای بە قفڵی ئاسن داخست. ئیدی منی بە داڵاناندا برد هەتا گەیشتینە لای دە کەسی دیکە کە لەوە دەچوو ئەو دە کەسە هەموویان پێکەوە برا بن، چونکە هەر دەیان لە یەکتری دەچوون. کە چووینە لای ئەوان، پیاوەکە سڵاوی لێ کردن. ئەوانیش وەڵامی سڵاوەکەیان داوە و فەرمووی منیشیان کرد کە دانیشم. منیش دانیشتم. ئەوەندەم نارەحەتی دیبوو کە تەواو بێهێز ببووم، سەرم لە گێژەوە هات و بە لادا کەوتم.

"ئیدی گوڵاویان پێدا هەڵپرژاندم و شەراب و خواردنیان دامێ و بووژامەوە. کە زانیان هاتوومەوە سەرخۆ، گوتیان: 'ئێمە دەناسی؟' گوتم: 'ناوەڵڵا، قەت ئێوەم نەدیوە و ئەو پیاوەی منیشی هێنایە ئێرە، ئەویش ناناسم.' گوتیان: 'تۆ ڕاست و ڕەوان بۆمان بگێڕەوە چیت کردووە و چیت بەسەر هاتووە، بەڵام ڕاستی بڵێ و خوار مەڕۆ.' گوتم: 'ئەوەی بەسەر من هاتووە شتێکی زۆر سەیر و سەرسووڕهێنەرە. جا نازانم ئێوە ئاگاتان لە کاری

---

١. گۆنگەڵ: گرفت و نارەحەتی. کێشە.

من هەیە یان نا؟' ئەوانیش گوتیان: 'بەڵێ، ئێمە ئەو کەسانەین کە کەلوپەلی ماڵەکەی تۆمان لەگەڵ ئەو هاوڕێیەت و ئەو کیژەی کە گۆرانی دەڵێ، بردووە. چونکە هەستمان کرد ئەوانە کەسانێکی گەورە و خانەدانن لە شوێنێک دامانناو و قسەمان لەگەڵ کردن.' پێم گوتن: 'ئەو هاوڕێیەی من و ئەو کیژە لەکوێن؟' ئەوان ئاماژەیان بە کونجێکی ماڵەکە کرد. گوتیان: 'ئەوەتان لەو سووچەدان. بەڵام کاکە بە خودا ئێمە هیچ ڕازێکی ئەوانمان باس نەکرد و بڵاومان نەکردووەتەوە. لەو کاتەوەش کە ئەوانمان هێناوە، هەر هەواڵیشمان نەپرسیون. هەر بۆیە نەشمان کوشتوون. جا ئێستا تۆ پێمان بڵێ ئەوانە چ شتێکیان لەبن سەردایە و نهێنی ئەو دووانە چییە؟ مەترسن، چونکە ئێوە لای ئێمە پارێزراون.'

"گەوهەرفرۆش دەڵێ: 'کاتێک ئەو قسەیەم بیست، خەریک بوو لە ترسان دڵم بتۆقێ. پێم گوتن: 'جوامێری و پیاوەتی لە لای ئێوە نەبێ لە هیچ کوێ نییە. جا ئەگەر شتێک هەبێ، هەر شیاوی ئەوەیە، ئێوەی لێی ئاگادار بن و ئێوە لە ڕەوتی ڕووداوەکەدا بن.' بەو شێوەیە زۆرم پێدا هەڵگوتن و وام نیشان دا کە گێڕانەوەی ڕاستی چاکترە لە شاردنەوە و نەدرکاندنی نهێنی.

" 'ئەوجا هەرچی بوو هەمووم بۆ گێڕانەوە. کە بەسەرهاتەکەیان بیست، چوون عەلی کوڕی بەکار و شەمسوننەهاریان هێنا و گوتیان: 'ئەوەش عەلی کوڕی بەکار و ئەوەش شەمسوننەهار.' داوای لێ بووردنیان لە من کرد و پێیان گوتم کە ئەو کەلوپەلانەی لە ماڵی ئێوەش هێناومانن هەندێکیان لێ شکاون و خراپ بوون، ئەوەی دیکەشتان دەدەینەوە. ئیدی گفتیان دا خۆیان شتەکانم بۆ بێننەوە و شتەکانی دیکەشم بۆ پەیدا کەن و بۆم بێننەوە. ئیدی ئێمە لە ماڵەکە هاتینە دەرێ.

" 'من ئاوا ڕزگارم بوو. بەڵام عەلی کوڕی بەکار و شەمسوننەهار لە ترسان خەریک بوو گیانیان دەرچێ. لێم پرسین: 'ئەی کەنیزەکانی دیکە چییان لێ هات؟' گوتیان: 'ئێمە هیچ هەواڵێکمان لێیان نییە.' ئیدی هەموومان پێکەوە هاتین هەتا ئەو شوێنەی بەلەمەکەی لێ بوو. ئێمەیان سوار کرد و گەیاندیانینەوە ئەوبەری دیجلە. لە بەلەمەکە دابەزیین. هێشتا دانەنیشتبووین کە چەند سوارێک دەوریان داین. ئەو کەسانەی لەگەڵ ئێمە لە بەلەمەکەدا بوون، گەڕانەوە سواری بەلەمەکە بوون و ئاژۆتیان. من و عەلی کوڕی بەکار و شەمسوننەهار لەوێ ماینەوە.

" 'نە هێزی ڕۆیشتنمان هەبوو نە هی دانیشتن. سوارەکان پێیان گوتین: 'ئێوە خەڵکی کوێن و لەکوێوە دێن؟ لاڵ بووین نەمان دەزانی بڵێین چی، هەتا ئاخری من گوتم: 'من ئەوانەم نەدەناسی کە لەگەڵمان بوون، ئێمەیان گرتبوو گۆرانییان بۆ بڵێین.' ئینجا چاوێکیان لە شەمسوننەهار و عەلی کوڕی بەکار کرد و گوتیان: 'درۆ دەکەی. ڕاستییەکەمان پێ بڵێن

ئێوە کێن؟ خەڵکی کوێن و ماڵەکەتان لەکوێوەیە.' گەوهەرفرۆش دەڵێ: 'نەمزانی چی بڵێم. شـــەمســـوننەهار چووە لای ســـەرکردەکەیان و قســـەیەکی لەگەڵ کرد. ســـەرکردەکە لە ئەسپەکەی دابەزی و شـەمسوننەهاری سـواری ئەسپەکە کرد و لغاوی ئەسپەکەی گرت. عەلی کوڕی بەکار و منیشیان سوار کرد. سەرکردەی سوارەکان ئێمەی برد هەتا لە قەراخ دیجلە گەیشـــتینە شـــوێنێک. ســـەرکردە گازی مەلەوانەکانی کرد و چەند کەســـیان هاتن. سەرکردەکە ئێمەی سواری بەلەمێک کرد و خۆشی سواری بەلەمێکی دیکە بوو. بەلەمەکان هەر وا ڕۆیشتن هەتا گەیشتینە کۆشکی خەلیفە. ئێمە ئەوەندە دەترساین، خۆمان بۆ مردن ساز کردبوو. ئینجا سەرکردەی سوارەکان شەمسوننەهاری بردەوە کۆشک و تاقمێکیش لە ســـوارەکان لەگەڵ ئێمە هاتن هەتا ئێمەیان گەیاندەوە ماڵی عەلی کوڕی بەکار. کە ئێمە گەیشـــتینەوە، ماڵاواییان لێ کردین و خۆیان گەڕانەوە. بەڵام ئێمە ئەوەندە ترســـا بووین، هێزی پێمان نەبوو کە لە جێی خۆمان هەســـتین. نەماندەزانی شـــەوە یان ڕۆژە. بەو جۆرە ماینەوە هەتا بوو بە شـــەو. عەلی کوڕی بەکار لە هۆش خۆی چوو. ژن و پیاو بەســـەریدا دەگریان. ئیدی ئەو وەک مردوو درێژ ببوو. بە منیان دەگوت: 'پێمان بڵێ چیت لەو کوڕە کردووە؟ بۆمان بگێڕەوە.' گوتم: 'من هیچم لێ نەکردووە و لە خۆڕا گومانی خراپتان لە من نەبێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و شەست و چوارەم هاتەوە

شـــەهرزاد گوتی: "خاوەنشـــکۆ، گەوهەرفرۆش پێی گوتن: ' من ســـەرکۆنە مەکەن و با خۆی بە ئـاگـا بێتەوە، بۆتـان دەگێڕێتەوە چی بووە.' دوایە لێیـان توورە بووم و منیش هەڕەشـــەم لێ کردن لە خۆڕا بوختان نەکەن. لەو مشـــتومڕەدا بووین، عەلی کوڕی بەکار جووڵەجوولی تێ کەوت. خزم و کەسەکەی خۆشحاڵ بوون و گولاویان پێدا هەڵپرژاند. کە وە هۆش هاتەوە، لێیان پرسی: 'ئەوە چی بووە؟ بۆ وات لێ هات؟' ئەویش قســـەی دەکرد، بەڵام باش توانای قســـەکردنی نەبوو. ویســـتم بێمە دەرێ، خزمەکانی نەیانهێشـــت. عەلی ئاماژەی بۆ کردن کە ڕێم لێ نەگرن. ئیدی ڕێیان دام.

" 'من هاتمە دەرێ و چوومەوە ماڵەکەی خۆم. کە گەیشـتمەوە ماڵێ، خزم و کەسـەکەم کە منیان دیت، بەســـــەر خۆیاندا دەدا. بە ئاماژە تێمگەیاندن کە ئارام بن و هەراوهوریا نەکەن. ئەوان بێدەنگ بوون. ئیدی ماندوو و شەکەت چوومە جێگاوە و هەتا سبەینێ بەیانی وەک مردوو درێژ بووم. کە بەیانی خەبەرم بووەوە، ســـــەیرم کرد خێزانم و منداڵەکانم لەدەورم کۆ بوونەتەوە، دەڵێن: 'بڵێی چ بەلایەکی بەســـەر هاتبێ؟!' ئیدی داوای مەیم کرد و بۆیان هێنام. کەمێکم خواردەوە، هاتمەوە ســـەرخۆ. هەواڵی ئەو شـــتانەم پرســـی کە لێیان دزیبووم. گوتم: 'هیچیان نەهێناوەتەوە؟' گوتیان: 'هێندێک لە شـتەکان کەسـێک هێنابوویەوە لە بەردەرگا دایناوبوو و ڕۆیشـتبوو. ئێمە ئەو کەســەمان نەدیت. کەمێک ئاســایی بوومەوە. دوو ڕۆژان لە ماڵ نەچوومە دەر. هێزی هەســـــتانم نەبوو. کە تۆزێک هێزم هاتەوە بەر و توانیم بڕۆم، هەستام چوومە گەرماو. هەر دڵم لە لای عەلی کوڕی بەکار و شەمسوننەهار بوو. هیچ هەواڵێکم لێیان نەبوو. نەشـــمدەتوانی بچم بۆ لای عەلی کوڕی بەکار. خۆشـــم لە ماڵەوە لە ترســـان حەجمینم نەبوو. دوای ئەوە، ئیدی تۆبەم کرد کە تازە کاری ئاوا نەکەم. ســوپاســی خوام کرد کە ئەم جارەش بە ســلامەتی ڕزگارم بوو. کە ماوەیەکی پێ چوو بە دڵمدا هات ســەرێکی ئەولا بدەم. کە ویستم بچم، ژنێکم دیت لە بەر دەرگا ڕاوەستابوو. کە جوان تێی ڕامام، کەنیزەکەی شـــــەمســـــوننەهار بوو. ئەوم ناســـــی و بە پەلە ڕۆیشـــــتم. کەنیزەکەش دوام کەوت. ترســـم ڕێ نیشـت. ئەوەندەی تەماشــام دەکرد. ترســەکەم زیاتر دەبوو. ئەویش بەردەوام بانگی دەکردم: 'مەڕۆ، کارێکم پێتە، قســـــەیەکت پێ دەڵێم.' منیش ئاوڕم لێ نەدەداوە هەر دەڕۆیشـــتم هەتا لە شـــوێنێکی چۆڵ گەیشـــتمە مزگەوتێک. گوتی: 'مەترســـــە. لا دە مزگەوت شـــتێکت پێ دەڵێم.' چوومە مزگەتەکە و دوو ڕەکات نوێژی ســـــوننەتم کرد. دوای ئەوە بە کەنیزەکەم گوت: 'چیت لە من دەوێ؟' ئەو چاکوخۆشـــــی لەگەڵ کردم و گوتی: 'چۆنی؟ و چیت بەســـــەر هاتووە؟' بەســـــەرهاتی خۆم و عەلی کوڕی بەکارم بۆ گێڕاوە و لێم پرســـی: 'هەواڵی لای ئێوە؟' کەنیزەکە گوتی: 'من کە چاوم لێ بوو

دزەکان دەرگاکەی ئێوەیان شــکاند و چوونە ژوور، ترســام و وام زانی لە لایەن خەلیفەوە هاتوون کە ئێمە و شەمسوننەهار بگرن، ئیدی لەگەڵ دوو کەنیزی دیکە هەڵاتینە سەربان و بە پشــتەوەدا لە شــوێنێکی بڵندەوە خۆمان شــۆڕ کردەوە و هەڵاتینە کۆشــک و لەوێ لە قوژبنێک خۆمان مات دا، هەتا تاریک بوو. دەرگا چکۆڵەکەی لای دیجلەم کردەوە و بانگی ئەو بەلەمەوانەم کرد کە ئەو شــــەوە ئێمەی هێنا. پێم گوت: 'هەواڵی خانمم نییە. ســـواری بەلەمەکەم کە بزانین نــابیینینەوە.' ئیــدی مەلەوانەکە ســـــواری کردم و بە نێو دیجلەدا ســــووڕاینەوە هەتا تەواو شــــەو دەرنگ بوو. لە دوور چاوم لێ بوو بەلەمێک بەرەو دەریچەکەی کۆشـــک دەچوو پیاوێکیش دەیئاژۆت. کە ورد تێی ڕامام، پیاوێکی دیکەم دی لەگەڵ ژنێک کە ژنە درێژ ببوو دیار بوو بێهۆشـە. هەر وا دەڕۆیشــتن هەتا گەیشــتنە قەراخ ئاوەکە. کە دابەزین، سەیرم کرد شەمسوننەهارە. منیش لە بەلەمەکە دابەزیم. کە ئەوم دیت، لە خۆشیان خەریک بوو شێت بم، ئاخر من دەستم لەو شۆردبوو.' "

لێرەدا بوو، مــاوەی چیرۆکی ئەمشــــەویش کۆتــایی پێ هــات و شــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و شەست و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کەنیزەکە بە گەوهەرفرۆشی گوت: 'لە بەلەمەکە دابەزیم و چووم بۆ لای شەمسوننەهار. لە خۆشیانیش خەریک بوو شێت بم، ئاخر من دەستم لەو شۆردبوو. کە چوومە پێشێ، گوتی: 'هەزار دینار بدە بەو کابرایەی کە منی هێناوەتە ئێرە.'

" 'ئیدی ئەوجار من و ئەو کەنیزە ئەومان هەڵگرت و بردمانەوە خەوگەکەی خۆی. ئەو شەوەی بە ناڕەحەتی بردە سەر. بەیانییش فەرمانی دا کە کەس نەچێتە لای و هەتا شەو هەر مات و پەرێشـــان بوو. ڕۆژی دوایی کەمێک چاکتر بوو. لە بەرچاوی من دەتگوت لە قەبریان دەرهێناوەتەوە، شێوەی مردووی دەدا. ئەوجا هێنام گوڵاوم بەسەردا هەڵپرژاند و جلوبەرگەکەیم بۆ گۆڕی. دەســـت و قاچیم بۆ شـــۆرد و خواردنم لەپێش دانا و کەمێکم دەرخوارد دا. تۆزێک بووژاوە و هاتەوە ســەرخۆ. گوتم: 'خانم، تۆ خودا بۆ ئاگات لە خۆت نییە و بەزەییت بە خۆتدا نایە؟ خۆ خەریک بوو تێدا بچی.'

" 'شەمسوننەهار گوتی: 'کەنیزەکەم، بە خودا مردن بۆ من زۆر خۆشترە لەو پەندەی بەســـەرم هاتووە.' گوتم: 'تازە حەتمەن دەکوژرێم.' کاتێک کە دزەکان ئێمەیان لە ماڵی گەوهەرفرۆش بردە دەرێ، لە منیان پرســـی: 'تۆ کێی و چ کارەی؟' گوتم: 'لەو کەنیزە گۆرانیبێژ و مۆسیقارانەم.' باوەڕیان پێ کردم، دوایی لە عەلی کوڕی بەکاریان پرسی: 'تۆ کێی و چکارەی؟ گوتی: 'منیش کوڕە کەنیزم.' ئێمەیان گرت و بردیانینە شوێنەکەی خۆیان. لەوێ کاتێک جلولەرگی شکۆداری ئێمە و ملوانکەی ڕازاوە بە زێڕ و زیویان دی، سەریان لەو کارەی من ســـووڕ ما و گوتیان: 'کەنیزی مۆســـیقار و ملوانکەی ئاوایان نەگوتووە! ڕاســـتییەکەمان پێ بڵێ.' لە دڵی خۆمدا گوتم: 'حەتمەن لەبەر ئەو ملوانکە زێڕ و زیوانە دەمکوژن.' ئیدی هیچم نەگوت. ئەوجار ڕوویان لە عەلی کوڕی بەکار کرد و گوتیان: 'باشە تۆ ڕاســـتییەکەی بڵێ، خەڵکی کوێی؟ ڕواڵەتت لە کەنیززادە ناچێ.' عەلی کوڕی بەکاریش بێدەنگ بوو هیچی نەگوت. بەو شێوە ئێمە هەر دەگریاین و هیچیشمان نەدەدرکاند. خوای بەبەزەیی دڵی دزەکانی نەرم کرد و لەگەڵمان زۆر بە باشی هەڵسوکەوتیان کرد و گوتیان: 'خـاوەنی ئەو مـاڵەی ئێوە لەوێ بوون، کێیە؟' ئێمەش گوتمـان کە خـاونمـاڵەکە فلان گەوهەرفرۆشـە. یەکیان گوتی: 'من چاکی دەناســم و ماڵەکەشــیان دەزانم. ئێســتا دەچم دەیهێنم.' ئیدی دزەکان منیان لە شـوێنێک و عەلی کوڕی بەکاریشـیان لە شـوێنێکی دیکە ڕاگرت و پێیان گوتین: 'مەترسن و بە ئاسوودەیی دانیشن کەس کاری بە ئێوە نییە، لە لای کەسیش باسی ناکرێ، بێخەم بن.'

" 'چوون بەدوای گەوهەرفرۆشـــدا و هێنایانە لای ئێمە و بەســـەرهاتەکەی ئێمەیان بۆ گێڕاوە. دوای ئەوە یەکێک لە دزەکـان چوو بەلەمێکی هێنـا و ئێمەیـان ســـواری کرد و بردیانینە ئەوبەری چەم دایاناین و ڕۆیشــتن. کە ئەوان ڕۆیشــتن، تاقیمێک لە ســوارەکانی داروغە هاتن و گوتیان: 'ئێوە کێن؟' من لەگەڵ سـەرکردەی سـوارەکان قسـەم کرد و گوتم: 'من شەمسوننەهاری کەنیزی تایبەتی خەلیفەم. دوێنێ شەو چووم بۆ دیداری یەکێک لە ژنە وەزیرەکان، کەچی دزان گرتیانم و هێنایانمە ئێرە. ئێســـتا کە ئێوەیان دیت، هەڵاتن.' کاتێک سـەرکردەی سـواران گوێی لە قسـەکانی من بوو لە ئەسـپەکەی دابەزی و منی سـوار کرد. گەوهەرفرۆش و عەلی کوڕی بەکاریشیان سوار کرد. ئێستا لە تاوی ئەوان ئەوە ئاورم تێ بەر دەبێ. هەســـتە بچۆ بۆ لای گەوهەرفرۆش و ســـڵاوی بگەیەنێ و هەواڵی عەلی کوڕی بەکاریش بپرسـە.' من سـەرکۆنەم کرد و ترسـم وەبەر نا. کەچی ئەو بەسـەرمدا قیژاندی و لێم توورە بوو. ئێســـتا من لە لای ئەوەوە هاتووم هەتا هەواڵی عەلی کوڕی بەکارت لێ بپرسم. تکاشت لێ دەکەم کەمێک زێڕم لێ وەرگری، چونکە بەشێک لەو ماڵەت بە ئەمانەت وەرگرتبوو کە هەمووی تێدا چوو؛ ئەتۆ دەبێ بیـانـدەیتەوە.' پـاشـــــان گوتی: 'هەر لێرە ڕاوەستە ئێستا دێمەوە لات.' ' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، کەنیزەکە گوتی: 'لێرە ڕاوەستە ئێستا دێمەوە لات.' کەنیزەکە کە ڕۆیشت و هاتەوە، ماڵێکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنا و دای بە گەوهەرفرۆش و گوتی: 'گەورەم، لەکوێ بتبینمەوە؟' گەوهەرفرۆش گێڕاویتەوە کە بە کەنیزەکەم گوت: 'بە خانم بڵێ هەر ئێستا دەچمەوە ماڵەکەی خۆم و لەبەر ئەو ئەگەر لەوە زیاتریشم بۆ بێتەوە پێشێ، ڕێگەیەک دەبینمەوە کە تۆ و عەلی کوڕی بەکار پێک بگەیەنم.'

" 'ئیدی کچە ماڵاوایی کرد و ڕۆیشت. منیش ماڵەکەم هەڵگرت و هێنانەمەوە ژماردم پێنج هەزار دینار بوو. ماڵی هەر کەسم لە لا بوو بۆم بردەوە یان بۆم کڕییەوە. دوایی دەستوپێوەندەکانم لەگەڵ خۆمدا برد و چوومەوە ئەو ماڵەی کە دزان تالانیان کردبوو. وەستا و دارتاشم برد و ماڵەکەم لە جاران جوانتر چاک کردەوە و ئەو داخ و ئازارەم لەسەر دڵم سڕییەوە. ئینجا چوومە ماڵی عەلی کوڕی بەکار. کە چوومە ئەوێ، یەکێک لە نۆکەرەکانی بە پیریمەوە هات و گوتی: 'تەواوی غوڵامەکانی ئاغام بەدواتەوەن و لە تۆ دەگەڕێن. ئاغام بەڵێنی داوە هەرکەس تۆ ببینێتەوە، ئازادی دەکا. ئاغام جارێک وە هۆش دێتەوە، جارێک بێهۆش دەبێتەوە. هەتا وە هۆش دێتەوە، ناوی تۆی لەسەر زمانە و دەڵێ: 'دەبێ ئەگەر بۆ ئێستێکیش بێ بیهێننە لای من و چاوێکم پێی بکەوێ.' '

"گەوهەرفرۆش گێڕاویتەوە کە لەگەڵ ئەو کۆیلەیە چوومە لای عەلی کوڕی بەکار. سەیرم کرد توانای قسەکردنی نییە، لە پەنای دانیشتم. چاوی کردەوە. کە منی دیت، گریا و چاکوچۆنی لەگەڵ کردم. ئیدی دەستیم گرت و هەڵم ستاند. باوەشم پێدا کرد و بە خۆمەوە گوشیم. ئینجا ئەو گوتی: 'کاکە گیان، دەزانی لەوەتی تۆم لێ ون بووە، توانای دانیشتنیشم نییە؟ سوپاس بۆ خودا دیسان چاوم بە تۆ کەوتەوە!'

"گەوهەرفرۆش گوتی: 'هەڵم ستاند و چەند هەنگاوێک هێنام و بردم و پیاسەیەکم پێ کرد. جلەکانیم گۆڕی و بادەم دەرخوارد دا. کەمێک هاتەوە سەر خۆ. ئەوەی لە کەنیزەکەم بیستبوو بۆم گێڕاوە. دەنگی غوڵامەکانی دا دەوری چۆڵ کەن. دوایی پێی گوتم: 'کاکە گیان، دیتت چمان بەسەر هات؟!' ئیدی داوای لێ بووردنی لێم کرد و هەواڵی پرسیم. من ئەوەی بەسەرم هاتبوو هەمووم بۆ گێڕاوە. ئیدی پێی سەیر بوو بە کۆیلەکانی گوت کە ئەو شت و ئەو شت بێنن. ئیدی خزمەتکارەکان فەرشی گرانبایی و دەفری زێڕین و زیوینی ئاوا و ئاوایان هێنا. زۆر لەوە زیاتر کە لە ماڵەکەی من دزرابوو دایانمەوە. ئەوانەم ناردەوە ماڵەکەی خۆم و بۆخۆم ئەو شەوە لە لای ئەو مامەوە. کە ڕۆژ بووەوە و هەوا ڕووناک بوو هەستاین. پێی گوتم: 'ئەوە بزانە هەر شتێک ئامانج و کۆتاییەکی هەیە، ئامانجی

ئەوینیش یا مردنە یا بەدیهاتنە. بەڵام من لە مردنەکە نیزیکترم. خۆزگە زووتر دەمردم و ئەوەی بەسەرمان هات، بەسەرمان نەدەهات. ئەگەر ڕەحمی خودا نەبایە، سووک و ڕسوا دەبووین. ئێستا نازانم چار چییە و دەبێ چ بکەین. چۆن ڕزگارمان دەبێ؟ ئەگەر بمویرابایە و ترسی خوراِم نەبایە، خۆمم دەکوشت. براکەم، من لە مەڵێک دەچم کە لە قەفەسدا بێ، هەر بینا مردم و گیانم دەرچوو. جا نازانم کەی ڕزگارم دەبێ!' ئیدی ئەو شێعرەی گوت و دەستی کرد بە گریان:

دڵم بچووک چوو دەمی یار
جەسەم باریک چوو قەدی یار
عاشق بین کەی بەو جوورەسە
هاکا مردن بڕەسە
یارەگەم بەلایێ دڵ بێ
بەلایێ وە گیان سەنەدی

"کە شێعرەکەی تەواو کرد، گەوهەرفرۆش پێی گوت: 'گەورەم، دەڵێم بچمەوە ماڵەکەی خۆم نەوەک کەنیزەکە بێت و هەواڵێک بێنێ.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'بەڵام زوو وەرەوە. ئەگەر هەواڵێک بوو پێم ڕاگەیەنە.'

"گەوهەرفرۆش گوتوویەتی: 'من ماڵاوایيم لێ کرد و هاتمەوە ماڵی خۆم. هێشتا دانەنیشتبووم کەنیزەکە بە شین و گریانەوە پەیدا بوو. گوتم: 'ئەوە چ بووە؟ بۆ ئاوا دەکەیت؟' گوتی گەورەم ئەوەی لێی دەترساین بەسەرمان هات. دوێنێ کە لە لای تۆ ڕۆیشتم و چوومەوە، سەیرم کرد شەمسوننەهار ڕقی لە یەکێک لەو کەنیزانەی کە ئەو شەوە لەگەڵمان بوو هەستاوە و فەرمانی داوە بیرازی[1] کەن. ئەویش لە ترسان هەڵاتووە. یەکێک لە دەرکەوانەکان گرتوویەتی، ویستوویە بیهێنێتەوە لای خانم. ئەویش هەرچی بووە هەمووی بۆ گێڕاوەتەوە و قسەکە بە گوێی خەلیفە گەیوەتەوە. ئەویش فەرمانی داوە شەمسوننەهار بە هەموو ماڵەکەیەوە بەرنەوە کۆشکی خەلیفە. بیست چاوەدێری داناوە و من هێشتا نەمدیتووە. نازانم ڕوو لەکوێ بکەم و چ بکەم! چونکە ئەو کەسی لە من جێی متمانەتری نییە.' ' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

١. بیراز کردن: تەنبێکردن، لێدان و ئازاردان.

## کە شەوی سەد و شەست و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ کەنیزەکە گوتی: 'کەســـی لە من جێی متمانەتری نییە. تۆش زوو خۆت بگەیەنە عەلی کوڕی بەکار با ئاگادار بێ. ئەگەر هاتوو پەردە لەســـەر کارەکەیان لا درا، با زوو خۆمان دەرباز بکەین.' گەوهەرفرۆش گوتی: 'من بەو هەواڵە تەواو تاســـام و دنیام لە بەرچاو تاریک بوو.' کەنیزەکە ویستی بگەڕێتەوە، پێم گوت: 'ئەی چ بکەین؟' گوتی: 'چار هەر ئەوەیە تۆ ئەگەر هاوڕێی عەلی کوڕی بەکاری و دەتەوێ ڕزگاری کەی، هەستە بچۆ بۆ لای و لەو بابەتەوە ئاگاداری کەوە و منیش دەچمەوە ســـەروگوێیەک ئاو دەدەم بزانم دنیا چ باسە.'

" 'ئیدی کەنیزەکە ماڵاوایی کرد و ڕۆیشـت. منیش هەســتام هاتمە دەرێ و بەرەو ماڵی عەلی کوڕی بەکار چووم. کە چووم، سـەیرم کرد ئەوە دڵخۆشـی خۆی دەداتەوە و باسـی ئەگەری پێکگەیشـــتن دەکـا و خەریکی خەیـاڵپڵاوی خۆیەتی. کە منی دیـت وا بە پەلە گەڕاومەتەوە لای، گوتی: 'ئەوە چۆنە وا زوو گەڕایتەوە؟' گوتم: 'دەســـت لەو خەیاڵپڵاوە هەڵگرە و ئەو کەفوکوڵە وەلا نێ. شـــتێکمان بۆ هاتووەتە پێشـــێ کە ئەگەری تێداچوونی سـەر و ماڵت لە گۆڕێدایە.' کە ئەوەی بیست، ڕەنگی تێک چوو. ترسـی ڕێ نیشت و گوتی: 'کاکە، چی بووە؟ بۆم بگێڕەوە.' گەوهەرفرۆشـەکە ئەوەی لە کەنیزەکەی بیستبوو هەمووی بۆ گێڕاوە. دواجار گوتم: 'ئەگەر بێتو تۆ هەتا شـــەو لەو ماڵەدا بمێنیتەوە، قســـەی تێدا نییە دەکوژرێی.' کە وام گوت، عەلی کوڕی بەکار بێهۆش بوو. خەریک بوو بشـمرێ. ماوەیەکی بـاش بێهۆش بوو.' ئەوجـا بە گەوهەرفرۆشـــی گوت: 'براکەم، چ بکەین و چـار چییە؟' گەوهەرفرۆش گێڕاویەتەوە کە پێم گوت: 'چـار ئەوەیە ئەوەنـدەی بۆت دێ لە مـاڵەکەت هەڵگری و لەگەڵ کۆیلەکانت بچین بۆ شارێکی دیکە.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'زۆر باشە، بە چاوان.' ئیدی هەسـتا هەر بە لادا دەهات و سـەری لە کاری خۆی سـووڕ مابوو. دوایی ئەوەندەی هەڵدەگیرا ماڵیان هەڵگرت و لە سێ وشـتریان دا. بۆخۆشـی سـواری ئەسـپەکەی بوو. داوای لێ بووردنی لە دەسـتوپێوەندەکانی کرد. بە دزییەوە لە شـــار هاتینە دەرێ و ئەو ڕۆژە هەتا شـەو و شـەویش هەتا بەیانی هەر ڕۆیشـتین. ئینجا لامان دا و بارەکانمان خست و وشترەکانمان بەستەوە و لێی خەوتین. مەمنا ئەوەندە ماندوو و شـەکەت بووین، کەمتەرخەمیمان کرد. دزان دەوریـان داین و کۆیلەکـانیـان کوشـــت و تـاڵانیـان کردین. ئێمەشیان لەوێ بە شپرزەیی بەجێ هێشت. ئیدی بەیانی هەستاین وەڕێ کەوتین، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە شارێک و ڕوومان لە مزگەوتی ئەو شارە کرد. شەو بوو گەیشتینە ئەوێ، لە پەنا مزگەوتەکە بە ڕووتی خەوتین هەتا بەیانی. سـبەینێکەش کە شـەو بووەوە، چووینە نێو مزگەوتەکە و بێ نان و ئاو لە مزگەوتەکەدا خەوتین.

" 'که ڕۆژ بووەوە، نوێژی بەیانیمان کرد و دانیشـــتبووین، پیاوێک هاتە ژووریٚ و سڵاوی کرد و دوو ڕەکات نوێژی سوننەتی کرد. ئینجا ڕووی لە ئێمە کرد و گوتی: 'کاکە، ئێوە غەوارەن؟' گوتمان: 'بەڵێ، دزان ڕێیان پێ گرتین و ڕووتیان کردین و ئێمەش ڕوومان لێرە کرد و کەسیش ناناسین.' ئەو پیاوە گوتی: 'ئەگەر پێتان خۆشە، وەرن دەچینە ماڵی ئێمە.' ' گەوهەرفرۆش دەگێڕێتەوە، دەڵێ: 'من بە عەلی کوڕی بەکارم گوت: 'هەستە با بچینە ماڵی ئەو کابرایە با لە دەست دوو شت ڕزگارمان بێ: یەکیان، نەوەک کەسێکی دیکە بێ و ئێمە بەو حاڵەوە ببینێ، ئابڕوومان دەچێ. دوومیان، ئەوەیە ئێمە لێرە غەوارەین و هەر دەبێ بچینە جێیەک و کەسیش ناناسین.' عەلی کوڕی بەکار گوتی: 'چۆنت پێ چاکە وا بکە. من هیچ ناڵێم.' ئیدی ئەو پیاوە دیسان گوتی: 'کاکە، هەستن با بڕۆین.' گەوهەرفرۆش گوتی: 'زۆر باشە ماڵت ئاوەدان بێ.'

"ئەو کابرایە لە جلەکانی خۆی دوو تیکەی داکەند و دای بە ئێمە، خۆمانی پێ داپۆشین، دڵخۆشـی داینەوە. ئێمە هەسـتاین و وە دوای کەوتین. ئەو کابرایە لە دەرگای دا. خزمەتکارێکی منداڵ دەرگای کردەوە. پیاوە چووە ژووریٚ و ئێمەش بەدوایدا چووینە ژووریٚ. کابرا بوخچەیەکی جلوبەرگ لەپێش داناین و خۆمان پۆشتە کرد. دانیشتبووین، کەنیزێک سفرەی خواردەمەنی لەپێش ڕاخستین. کەمێکمان خوارد و کشاینەوە. سفرەکەیان کۆ کردەوە. هەر لەوێ بووین هەتا بوو بە شەو. عەلی کوڕی بەکار دەستی کرد بە گریان و کڕووزانەوە و بە گەوهەرفرۆشی گوت: 'من دەزانم لێرە دەمرم، وەسییەت بێ کە مردم بچۆوە بۆ لای دایکم با بێتە سەر گۆڕم و شینم بۆ بگێڕێ. پێشی بڵێ بۆ کۆچی من خۆڕاگر بێ و دان بە خۆیدا بگرێ.'

"کە ئەو قسانەی کرد، بێهۆش کەوت. کە وە هۆش هاتەوە، گوێی لە دەنگی کیژێک بوو کە لە دوور دەهات و دەلالاوە و شـێعری دەخوێندەوە. ئیدی عەلی کوڕی بەکار گوێی دابووە کچەکە، جارێک وە هۆش دەهاتەوە و جارێک بێهۆش دەبووەوە. جارێک دەگریا و جارێک دەیناڵاند. دەنگی کچەکە بڵندتر بوو ئەو شێعرەی دەگوت:

پشتەکەم کۆمی خەمە، خەمی کـۆچی یار
گەمارۆی دڵـی داوم لەشـکری ئـازار
ئێستا کە هەناوم دەکـولێ وەک گڕکان
سـۆمای چاوم لێڵ بووە و ژینم ڕەش و تار

"کە عەلی گوێی لەو شـێعرەی ئەو کچە بوو هـاوارێکی کرد و گیـانی دەرچوو. گەوهەرفرۆش گوتی: 'کاتێک دیتم عەلی کوڕی بەکار مرد، ئەوم بە خاوەنماڵەکە سـپارد و

گوتم: 'ئەوە دەچمەوە بەغدا و دایک و کەس‌وکارەکەی ئاگادار دەکەمەوە با بێن بۆ ئەسپەردەکرنی.'

" 'پاشـــان هاتمەوە ماڵێ و جلەکانم گۆڕی و چوومە ماڵی عەلی کوڕی بەکار. کە کۆیلەکانی عەلی منیان دی، لێم کۆ بوونەوە و هەواڵی عەلیان لێ پرســـیم. گوتم: 'لە دایکی عەلی ڕوخسەتم بۆ بخوازن، دەچمە لای دەبێ ببینم.' پێیان گوت، ڕوخسەتی دام و چوومە لای. ســـڵاوم لێ کرد و گوتم: 'خوا هەر کارێکی پێ خۆش بێ، دەیکا و کەس ناتوانێ لە دەســـت قەزاوقەدەر ڕزگاری بێ. هیچ گیانلەبەرێک بەبێ ئەمری خودا نامرێ، دەبێ هەمووشمان ملکەچی ویستی خودا بین.'

"دایکی عەلی بە قسەکانی مندا زانی کوڕەکەی مردووە. دەستی کرد بە گریان و شین و ڕۆڕۆ. ئینجا بە گریانەوە گوتی: 'تۆ ئەو خودایە پێم بڵێ کوڕەکەم چی بەسەر هاتووە؟' من لەبەر گریان و هەنسک وەڵامم پێ نەدەدراوە. کە منی دی ئەوەندە ناڕەحەت بووم، ئەویش گریان ئەوکی گرت و بێهۆش کەوت. کە وە هۆش هاتەوە، گوتی: 'کوڕەکەم چۆن مرد؟' گوتم: 'خوا پاداشی خێرت بداتەوە.' ئیدی تەواوی بەسەرهاتەکەم لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بۆ گێڕاوە. گوتی: 'وەسییەتێک، شتێکی نەکرد؟' گوتم: 'بەڵێ، وەسییەتی کرد.'

" 'ئیدی وەســـییەتەکەیم بۆ گێڕاوە و پێم گوت کە کەمێ پەلە بکەن بچن بیهێننەوە. کە ئەوەم بە دایکی گوت، بووڕایەوە. دوای ئیستێک هاتەوە سەرخۆ، هەستان خۆیان ساز کرد و کەوتنە ڕێ. منیش بە دڵێکی پڕ لە خەم و خەفەتەوە بەرەو ماڵەکەی خۆم کەوتمە ڕێ. خەریک بووم بە دم فکروخەیاڵەوە دەڕۆیشـــتم و بیرم لە چارەی عەلی کوڕی بەکار دەکردەوە کە لەپڕدا ژنێک توند دەستی گرتم.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتایی پێ هات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و شەست و هەشتەم هاتەوە

شـــەهرزاد گوتی: خاوەنشـــکۆ، گەوهەرفرۆش گوتی: 'لەپڕدا ژنێک دەســـتی گرتم. که سەرنجم دایە، کەنیزەکەی شەمسوننەهار بوو. بەڵام زۆر شێواو و ئاڵۆز بوو. که یەکترمان ناســـییەوە، هەردووکمان دەســـتمان کرد بە گریان هەتا ماڵێ هاتینەوە. پێم گوت: 'دەزانی عەلی کوڕی بەکار چی بەســـەر هات؟' گوتی: 'ناوەڵڵا.' ئیدی هەموویم بۆ گێڕاوە و هەواڵی خانمەکەیم پرسـی. گوتی: 'خەلیفە گوێی بە قسـەی کەس نەبزووت و کردەوەکانی ئەوی بە خراپ لێک نەداوە. پێی گوت: 'شەمسوننەهار، تۆ لە لای من زۆر بەڕێز و ئازیزی و نامەوێ تۆ بیزار بکەم.' ئیدی دوای ئەوە کۆشـــکێکی بۆ چێ کرد و دیوێکی گەورەی بە فەرشـــی ئاوریشـــم و دیبا بۆ پڕ فەرش کرد. لەو ڕۆژەوە شـــەمســـوننەهار لە لای خەلیفە پلەوپایەی چووە ســـەرێ. ڕۆژێک بە ڕێکەوت بەپێی دابی خۆیان وەک جاران دانیشـتن بۆ خواردنەوە، دەســـتوپێوەندە نیزیکەکانی خەلیفەش لەوێ بوون. لەو جەنگەیەدا خەلیفە کەنیزێکی بانگ کرد، فەرمووی بۆمان بڵێ. کەنیزە عوودەکەی دەست دایە و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

هەڵـــــــــــگرتووە لە زەینمدا وێنەی برۆی مانـــــــگڕوخسارێک
لە خەیـاڵ گوڵڕوخســـــارێکـدام بـاڵای ڕێکە وەک چنـارێـک
لە شوێنێک کە چاوکەژاڵان بە چاوان تیـــــــر دەهـــــــــــــاوێژن
بە لاتەوە سەیـــــــــــر نەبێ ڕۆژێ ســــــــــــەدان کەس بنێژن
کە مـن مـردم دڵـنـیـا بـن دارمەیـتەکەم داری ســـــەلـوە
ئەخە مـن مـردووی کەســـێکـم بـاڵاڕێـک وەک داری ســـەلوە

"کە شـــەمســـوننەهار گوێی لەو شـــێعرە بوو خۆی پێ نەگیرا و بە لادا هات و کەوت. خەلیفە پیاڵەکەی فڕێ دا و خۆی گەیاندێ، لە باوەشـــی گرت و هاواری کرد. کەنیزەکانیش هاواریان کرد. خەلیفە کە دەستی دایە، سەیری کرد شەمسوننەهار مردووە. ئیدی لە تاوان وەک شێتی لێ هات و دەستووری دا عوود و دەف و چەنگ و کووپە مەییان شکاند. بوو بە شـین و شـەپۆڕ. شـەمسـوننەهاریان لە دیوێکدا دانا. خەلیفە خۆی هەتا بەیانی لەسـەری بوو. فەرمووی بیشـۆن و کفن و دفنی کەن و بینێژن. خۆی مات و مەلوول دانیشـت و لە هیچ شتێکی نەکۆڵییەوە و هیچ پرسیارێکی نەکرد.

"دوای ئەوە کچەکە بە گەوهەرفرۆشـــی گوت: 'تۆ خودا ئەگەر تەرمەکەی عەلی کوڕی بەکاریان هێنا دەرێ بیبەن بینێژن، منیش ئاگادار کەوە با بێم.' گەوهەرفرۆش بە کەنیزەکەی گوت: 'من دەتوانم بچم بۆ هەموو جێیەک، بەڵام دەســـتم بە تۆ ڕاناگا.' کەنیزەکە گوتی:

’کاتێک شــەمســوننەهار مرد، خەلیفە تەواوی کەنیزەکانی خۆی ئازاد کرد. منیش یەکێک لە ئازادکراوەکانم. من لە نزیک گومەزەکەی نیشـــتەجێم و گۆڕەکەی ئەویش لە فلان جێیە.‘ ئیدی هەستاین و لەگەڵ ئەو چووین بۆ ئەو شوێنە و سەری گۆڕی شەمسوننەهارمان دا و دوای کاری خۆمان کەوتین و بەردەوام چاوەڕێی هێنانەوەی تەرمی عەلی کوڕی بەکاریش بووین. هەتا دواجار تەرمەکەیان هێناوە. خەڵکێکی زۆری بەغدا بە پێشـــوازییەوە لە شـــار چووبوونە دەرێ. من ئەو کەنیزەم دی لەپێشـــەوە لەنێو ژنـانـدا بوو. لە هەموو کەس نارەحەتتر بوو. تا ئێستا لە بەغدا نەمدیبوو ئەوەندە ڕێز لە تەرمێک بگیرێ و دەوری ئاپۆڕە بێ.

" ’ئیدی بەو شـــێوە بەو پەڕی ڕێز و حورمەتەوە تەرمەکەمان هێنا گۆڕســـتان و بە خاکمان سپارد. من بەردەوام دەچووم بۆ سەردانی ئەویش و شەمسوننەهاریش.‘ "

شـــەهرزاد گوتی: "منیش هەر ئەوەندەم پێ بڕا. بەڵام چیرۆکی پاشـــا هەر چەند ئەو چیرۆکە زۆر خۆش بوو بەڵام هێشتا وەک بەسەر هاتی شەهرمانپاشا نایەتەوە."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و شەست و نۆیەم هاتەوە

**بەسەرهاتی شەهرمانپاشا و قەمەروززەمان**

گوتی: "خاوەنشکۆ، سەردەمانی زوو پاشایەک هەبوو 'شەهرمانپاشا'ـیان پێ دەگوت. سوپایەکی زەبەلاحی هەبوو. پیر و پەککەوتە بوو بەڵام منداڵ و شتی نەبوو. چەند ساڵێک هەر بیری لە خۆی و چارەنووسی وڵاتەکەی دەکردەوە کە دوای خۆی دەبێ چی لێ بێ. هەر بۆیە مات و مەلوول بوو. ڕۆژێک لە لای وەزیرەکەی باسی ئەو گرفتەی کرد و نیگەرانی خۆی لەو بابەتەوە دەربڕی. گوتی: 'من لەوە دەترسم بمرم و وڵاتەکەم دوای خۆم پرش و بڵاو بێ، چونکە کوڕم نییە کە پاش خۆم بەڕێوەی بەرێ.' وەزیر بە پاشای گوت: 'پشت بە خودا ببەستە، خودا گەورەیە. هەستە دەستنوێژ هەڵگرە و دوو ڕکات نوێژ بکە. پاشان بە دڵێکی پاکەوە نییەتی لێ بێنە جا لەگەڵ ژنەکەت جووت بە. هیوادارم بە ئاواتت بگەی.'

"پاشا ئەوەی وەزیر گوتبووی، هەمووی بە گوێ کرد. شاژن هەر ئەو شەوە دووگیان بوو. کە نۆ مانگ تێپەڕی، منداڵێکی نێرینەی جوانچاکی بوو. وەک شاعیر دەڵێ:

هێندی داوە بە دەستەوە[1]، وەکوو گوڵ هێنی کردووە[2]
لە جیاتی شیر دەڵێی دایکی شەکری لە زاری کردووە

"ناویان نا قەمروززەمان و پاشا کەیفی پێی ساز بوو. حەوت شەو و ڕۆژان شاریان ڕازاندەوە و تەپڵی شادی لێ درا. شیری مەمکی خانمێکی شەنگ و شەپاڵیان دا بە منداڵەکە و لە ناز و نیعمەتدا گەورەیان کرد هەتا تەمەنی بوو بە پێنج ساڵ. پاشا زۆری خۆش دەویست، پێی خۆش بوو شەو و ڕۆژ لە لای ئەو بێ. بەو شێوەیە چەند ساڵێک تێپەڕی.

"پاشا ئەوەندەی کوڕەکەی خۆش دەویست و بۆی نیگەران بوو ڕۆژێک وەزیری بانگ کرد و گوتی: 'وەزیر، من زۆر نیگەرانی کاروباری دنیام. پێم خۆشە هەتا ماوم ژنێک بۆ قەمەروززەمان بێنم و شایی و زەماوەندی بۆ ساز کەم.'

"وەزیر گوتی: 'پاشام، زەماوەند یەکێک لە سوننەتەکانی پێغەمبەرە و ئەگەر بە تەمای ئەو بکەیتە دەمڕاستی خۆت، ئەوە کارێکی زۆر بەجێیە.' ئیدی شەهرمانپاشا داوای

---

١. بەدەستەوەدانی کوڕپە: واتە زۆر خەریکی پەروەدەی منداڵ بوون، بۆ ئەوە زووتر پێ بگرێ و جەستەی خۆ بگرێ.

٢. هێن کردن: پەروەردە کردن.

قەمەروززەمانی کرد. شازادە هات، شەرمی دەکرد و سەری داخستبوو. پاشا گوتی: 'ڕۆڵە گیان، بە تەمام بتکەم بە جێگر و دەمڕاستی خۆم و خۆشحاڵت کەم.' قەمەروززەمان خێرا هەستی کرد و زانی بە تەمای چییە. گوتی: 'بابە، من پێویستیم بە ژن نییە. حەزم لە ڕەگەزی ژن نییە. کتێبێکم لەسەر مەکر و فڕوفێڵی ژنان خوێندووەتەوە و ئایەت و فەرموودەی زۆرم لە بارەی جادووگەرییەوە دیوە. هەر لەسەر درۆ و دەلەسەی ژنان شاعیر دەڵێ:

گەر بە ژن هەڵبلێی تۆ، ئابڕووی خۆت بردووە
سەگێکی باش جێگەی سەد ژنی چاکی گرتووە
ژن و ئەژدیها بۆ ژین جێی مەترسییە
ئەو شوێنەی ئەو دووەی لێیە، پڕ بەڵا و نەهاتییە

"دوای ئەوە گوتی: 'بابە، ئەگەر من پیاڵەیەک ژەهر بخۆمەوە، هێشتا ژن ناهێنم.' کاتێک شەهرمانپاشا ئەو قسەیەی لە قەمەروززەمان بیست. دنیای لە بەرچاو تاریک بوو بە پێملنەبوونی کوڕەکەی مات و خەمبار بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و حەفتایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شەهرمانپاشا کە قەمەروززەمان بە گوێی نەکرد، مات و مەلوول بوو. بەڵام ئەوەندەشی خۆش دەویست لەبەر ئەوە لێی دووپات نەکردەوە. وەسەر خۆشی نەهێنا و بێ ئەوەی لێی قەڵس بێ، دڵخۆشی داوە و بە ڕێزەوە دواندی. قەمەروززەمان ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ جوان و جوانتر دەبوو. شەهرمانپاشا ساڵێکی لەسەر ڕاوەستا. لەو ماوەیەدا قەمەروززەمان لە جوانی و ڕەوانبێژیدا تەواو پێگەیشتبوو. ئەوەی دەیدی نوقمی تەماشای دەبوو. عاشقان پەچە و ڕووبەندیان دەخزا خوارێ. شاعیران ئاوا باسی جوانی و دەلالی و قۆزییەکەی دەکەن:

کوڕ نییە مانگە لە پەیکەری مرۆدا
نێرگزی خەوتوون لە ژێر کەبری برۆدا
مەلی دڵ سەوداسەری داری بەرزی بەژنێتی
چۆن بکا چێ هێلانە، لە ناو ئەو لک و پۆدا
زیرەکی و سوارچاکی، زیپک و زاکوونی
وێنەی نییە و تاقە، لە دونیای ئەوڕۆدا

"کە ساڵ نوێ بووەوە، شەهرمانپاشا قەمەروززەمانی بانگ کرد و پێی گوت: 'ڕۆڵە، تۆ گوێ نادەیە قسەی من.' قەمەروززەمان لەڕێوە کەوتە سەر زەوی و کڕنۆشی برد و لە ترس و شەرمدا تەواو تێک چوو گوتی: 'بابە، چۆن من گوێ نادەمە قەسەی تۆ لە کاتێکدا خودا فەرمانی کردووە بێفەرمانی و بێقسەیی دایک و باب نەکرێ؟!'

"ئیدی شەهرمانپاشا گوتی: 'من بە تەمام ژنت بۆ بێنم. ئەوەندە ژیانم لەگەڵ تۆ ماوە دڵخۆش بم و پێش ئەوەی بمرم بتکەم بە پاشای وڵاتەکەم.'

"کە قەمەروززەمان ئەو قسەیەی لە بابی بیست، ماوەیک هەر سەری داخست. پاشان گوتی: 'بابە، من ئەو کارە ناکەم ئەگەر پێویست بێ جامێک ژەهر بخۆمەوە. هەرچەندە بەگوێکردنی باب بۆ منداڵ فەرزە، بەڵام تکات لێ دەکەم تۆ ئەو خودایە لە لای من باسی ژنهێنان مەکە. وا بیر مەکەوە کە هەتا من ماوم ژن دێنم. ئەوەندەم لە کتێبەکاندا لەسەر ژنان خوێندووەتەوە و لە پیاوانم بیستووە کە مەکر و کوورەی ژنان چ بەڵایەکی بەسەر هێناون، من دەستم لە ژنهێنان شۆردووە.'

"کە ئەو وەڵامەی لە کوڕەکەی بیست، هەرچەندە زۆر تێک چوو بەڵام لەبەر

خۆشەویستی هیچی پێ نەگوت و ڕێزی لێنا و دیاری دایە. کە کوڕەکە بڵاوەی کرد و خەڵکەکە ڕۆیشتن، شەهرمانپاشا بە وەزیرەکەی گوت: 'وەزیر...' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و هەفتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شەهرمانپاشا بە جیا بە وەزیری گوت: 'وەزیر، پێم بڵێ من لەگەڵ قەمەروززەمان بڵێم چی؟ من ڕاوێژم لەگەڵ تۆ کرد ژنی بۆ بێنم، تۆش بە باشت زانی پێی بڵێم. ئێستاش ئەوە ئەو مل نادا. جا دەڵێی پێت باشە چ بکەین؟ پێم بڵێ.' وەزیر گوتی: 'گەورەم، وام پێ باشە ئەمساڵیش دەرفەتی بدەیتێ. بەڵام ساڵی داهاتوو کە ویستت لەو بارەوە قسەی لەگەڵ بکەی، بە شێوەیەکی فەرمی و لە دیوان لە هەنتەشی[1] وەزیرەکاندا ڕووی لێ بنێ، بەشکو ڕووی ئەوان بیگرێ و نەتوانێ سەرپێچی بکا.'

"پاشا ئەو پێشنیارەی ئەوی پێ باش بوو. ساڵێکی دیکەش لەسەری ڕاوەستا. قەمەروززەمان ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ جوانتر و ژیر و تەواوتر دەبوو. لە کوورەی ڕۆژگاردا قاڵتر ببوو تەمەنی لە بیست نیزیک ببووەوە و تەواو گەنجێکی پێگەیشتوو و تێگەیشتوو بوو. بە جۆرێک کە مرۆڤ سەری لە ژیری سووڕ دەما تا ئەو جێیەی کە شاعیر دەڵێ:

لێوە یان گوڵی سوورە پشکووتووە لە سەر ڕۆمای
ئەو گوڵەی نەخشاندوویە دەوری مرواری سیمای
ورشەی هەنیەی دێ لە دووڕا، ماڵی دڵ ڕووناک دەکا
تیری برژانگی بەدوویدا دڵ دێ و لە خوێنی وەر دەدا

"دوای ئەوە شەهرمانپاشا ڕاوەستا هەتا یەکەم ڕۆژی ساڵی تازە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

---

[1] هەنتەش: حزوور.

## که شەوی سەد و حەفتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، کە ڕۆژی جەژنی سەری ساڵی تازە هاتەوە، وەزیر و فەرماندە و پەردەدار و دەستوپێوەندەکانی حوکوومەت و سوپا لە بارەگای پاشا کۆبوونەوە. لەو جەنگەیەدا شەهرمانپاشا بانگی قەمەروززەمانی کرد. کە هاتە هەنتەشی بابی، سێ جار پێچکەی کورسی دەسەڵاتی بابی ماچ کرد و کڕنۆشی بۆ برد. ئینجا دەستی لەسەر سنگی دانا و ڕووبەڕووی بابی ڕاوەستا. بابی گوتی: 'کوڕی خۆم، ئەمجارە بۆیە لە هەنتەشی ئەو خەڵکەدا تۆم بانگ کردووە هەتا فەرمانێکت پێ بدەم، تۆش بۆت نەبێ سەرپێچی بکەی. ئەویش ئەوەیە کە تۆ دەبێ ژن بێنی. بۆخۆشم کچی یەکێک لە پاشاکانت بۆ مارە دەکەم هەتا خۆم ماوم و نەمردووم. هەلومەرجی خۆشیت بۆ دابین بکەم بەو جۆرەی دڵم بحەسێتەوە و خۆشحاڵ بم.' قەمەروززەمان کە ئەوەی بیست، ماوەیەک سەری داخست و بێدەنگ بوو. دوای ئەوە سەری هەڵێنا، بەڵام کەللەی پڕ بوو لە باوفیشی هەرزەکاری. بە بابی گوت: 'بابە، ئەوە چەند جارم پێ گوتی من پێم خۆشە بە خراپترین و ناحەزترین شێوە بکوژرێم، بەڵام ژن نەهێنم. تۆ پیاوێکی پیر و گەوجی، ئەوە چەند جاری دیکەت پێ گوتم و وەڵامم نەدایتەوە، کەچی دیسان داوام لێ دەکەیتەوە ژن بێنم!' دوای ئەوە قەمەروززەمان تووڕە بوو وەک شێر نەڕاندی و گوتی: 'دە بەسە.' پاشا کە کوڕەکەی لە هەنتەشی ئەو هەموو کەسە پایەدار و سوپایی و گەورە گەورەیەدا ئاوای کرد، زۆر تەریق بووەوە. دوای ئەوە کەوتەوە بیری کە پاشایەکە و خاوەنی سەڵتەنەتێکە و شکۆیەکی هەیە، ئیدی ڕاشکاوانە زۆر بە تووڕەیی و ڕاشکاوانە هەڕەشەی لە قەمەروززەمان کرد. فەرمانی بە دەست و پێوەندەکەی دا کە بیگرن و قۆڵبەستی کەن. گرتیان و قۆڵبەستیان کرد و لە بەردەمی پاشا دایان نا. قەمەروززەمان سەری داخستبوو لە ترسان بێ یان پەشیمانی، هەموو گیانی ببوو بە ئارەقە. لەو جەنگەیەدا شەهرمانپاشا قسەی پێ گوت و گوتی: 'زۆڵی بێڕەوشت! ئەوە کار گەیوەتە جێیەک کە لە هەنتەشی ئەو خەڵکدا ئاوا جوابەجەنگیم لەگەڵ بکەی؟ خەتای خۆشت نییە، هی ئەوەیە باش بار نەهاتووی.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و حەفتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شەهرمانپاشا بە کوڕەکەی خۆی گوت: 'تا ئێستا وایان بار نەهێناوی و نازانی ئەو شێوە هەڵسوکەوتەی تۆ کردت، ئەگەر مسکینێک ئاوای کردبا چی لێ دەکرا.' دوای ئەوە بە پیاوەکانی گوت: 'بیبەن لە یەکێک لە بورجەکانی قەڵا بەندی بکەن.' پیاوەکان چوون یەکێک لە بورجەکانیان ماڵی و خاوێنیان کردەوە و فەرش و مافووری دیبایان تێدا ڕاخست و پشتییان لێ دانا و مۆم و قەندیلیان هەڵکرد ـ ئەو شوێنە زۆر تاریک بوو. دوای ئەوە قەمەروززەمانیان بردە ئەوێ و خزمەتکاریکیان بۆ خزمەتکردنی لە بەردەرگای بورجەکە دانا. قەمەروززەمان چووە سەر تەختەکە. بەڵام مات و مەلووڵ و دڵتەنگ بوو. خۆی سەرکۆنە دەکرد و لەو شێوە هەڵسوکەتەی کە لەگەڵ بابی کردبووی پەشیمان ببووەوە. دیارە پەشیمانیش سوودی نەبوو. دەیگوت: 'خودا ژنان بە نەفرەت کا. خۆزگە بە قسەی بابم دەکرد و ژنم دێنا، چونکە ژنهێنان لە زیندان ئاسانترە.' کورتی کەینەوە، قەمەروززەمان ئاوای لێ بەسەر هات.

"شەهرمانپاشا ئەو ڕۆژە هەتا شەو هەر لەسەر تەختەکەی خۆی دانیشت. دوای ئەوە وەزیری بانگ کرد و دووبەدوو پێی گوت: 'وەزیر، تۆ بوویتە هۆی ئەوەی ئەو کێشەیە بکەوێتە نێوان من و قەمەروززەمانەوە، چونکە پێشنیاری تۆ بوو. ئێستا ئەو کارە چ خێرێکی تێدایە؟' وەزیر گوتی: 'گەورەم، پازدە ڕۆژ با قەمەروززەمان لە بەندیخانە بێ، دوایی بیهێنەوە و دیسان پێی بڵێ دەبێ ژن بێنێ. ئەم جارە ئیدی قەت سەرپێچی ناکا.'

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## کە شەوی سەد و حەفتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، وەزیر کە گوتی: 'ئەم جارە ئیدی قەت دژایەتی ناکا،' پاشا قەبووڵی کرد و ئەو شـــەوە خەوت، بەڵام دڵی هەر لە لای قەمەروززەمان بوو؛ ئەوی زۆر خۆش دەویست و لەو زیاتر کوڕی دیکەی نەبوو. شـەهرمانپاشـا خوویەکی هەبوو کە شـەوانە هەتا دەسـتی نەخستبا ژێر سـەری قەمەروززەمانەوە خەوی لێ نەدەکەوت. ئەو شـەوە وا بوو کە پاشـا بە هەزار خەم و ناڕەحەتی و نیگەرانییەوە خەوت و لە خەویشـدا زۆری ئەو شـانەوشـان کرد. دەتگوت لەسـەر سـکڵ خەوتووە و هەر لە زیندەخەودا بوو. بەردەوام فرمێسکی بە چاوەوە بوو و دەگریا و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

قسەیەکی خۆشی پـــــــــــیری کەنعانم من بیستووە
دووری یـار کـارێـک نـاکـا بـکرێ بـڵـێی چـی کـردووە
خوتبەخوێنی شـــار کە بـاســی ســامی قیـامەت بکـا
ســــــووکە ئـامـاژێکە مەلا بە دەردی دووری دەکـا

دیسان گوتی:

شـــەوی دووری! بـۆچـی پـێـت وایە نـابـڕیـتەوە
ڕۆژگـــار بەو زەبـــر و زەنـــگەوە دەبـــڕێـــتەوە؟

"شەهرمانپاشا ئەوە حاڵی بوو.

"بەڵام قەمەروززەمان کە بوو بە شەو خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا. کەمێکی خوارد و دەسـتی کرد بە سـەرکۆنەی خۆی کە بۆچی ئاوا ناحەز لەگەڵ بابیدا جووڵاوەتەوە. خۆی دەکردە بەردەنگی خۆی و دەیگوت: 'مەگەر تۆ نەتدەزانی زمان چەندی زیان بۆ مرۆڤ هەیە و هەر زمانە سەری خەڵک بە با دەدا؟' بەردەوام قسەی بە خۆی دەگوت و سەرکۆنەی خۆی دەکرد تا ئەو جێیەی لە پەشیمانیدا دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی گوت:

ئەی زووبـان تـۆ هەم ئـاگـری و هەم خەرمـان
هەتا کـــەی بەر دەدەی تـــۆ گڕ لـــە ســـەرمان
بێڕەوشت، تـــەنیا زەڕی بـــۆ خـــــــۆی نییە
بـــەر دەدا گـــڕ ئـــەو لـــە ئـــەخـــلاقی جیـــــهـان

"دوای ئەوە داوای ئاوی کرد. دەستنوێژی شۆرد و نوێژی شێوان و خەوتنانی کرد و دانیشت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و حەفتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان نوێژی شێوان و خەوتنانی کرد و لەسەر تەختەکەی دانیشت. دەستی کرد بە قورئان خوێندنەوە. هەتا سوورەتەکانی بەقەرە و ئالی عیمران و یاسین و رەحمان و تەبارەک و مەعووزەتەینی تەواو کرد و زۆر دۆعای دیکەی کرد و لە خودا پاڕاوە. ئینجا لەسەر تەختەکەی کە ڕاخەری ئەتڵەس و ئاوریشمیان پێدا دابوو کراس و شتکەی داکەند و تەنیا بە کراسێکی کەتانەوە کە جەمسەرەکانی بە داوی زێڕ داگیرابووەوە، خەوت. دەتگوت مانگی چاردەیە.

"ئیدی پۆپەشمینێکی ئاوریشمی بەسەر خۆیدا کێشا و خەوت. مۆمێک لە خوار قاچیەوە و مۆمێکیش لەپشت سەریەوە هەڵکرابوون. زۆر بە هێمنی خەوی لێ کەوتبوو. هەتا سێیەکی شەو تێپەڕی، ئەو نەیدەزانی کە زانای پێوار چی بۆ ئەو دیاری کردووە. بە ڕێکەوت ئەو شوێنە شوێنێکی زۆر کۆن و دێرینە بوو. زۆر لە مێژ ساڵ بوو کەس هاتوچۆی ئەوێی نەکردبوو. لەو شوێنە چاڵێکی لێ بوو کە جنۆکەیەکی تێدا بوو لە وەچەی شەیتان. ئەو جنۆکەیە ناوی مەیموونە و کچی دەمەریاتپاشا لە هۆزی جان بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و حەفتا و شەشەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مەیموونە کچی دەمەریاتپاشای هۆزی جان بوو. کە قەمەروززەمان هەتا سێیەکی شەو خەوی لێ نەکەوت، ئینجا مەیموونە هەستا لە چاڵەکە بێتە دەرێ و بەرەو ئاسمان بچێ بۆ ئەوەی دەنگوباسی ئەوێ بزانێ. لە هاتنەدەردا کە گەیشتە لێواری چاڵەکە، سەیری کرد بە پێچەوانەی شەوانی پێشوو تیشکێک ناو بورجەکەی ڕووناک کردووە. ئەو جنۆکە لە مێژ بوو لەو چاڵەدا ئاکنجی[1] بوو. لە بەر خۆیەوە گوتی: 'تا ئێستا من بە بیرم نایە شتی وای لێ بووبێ. با بزانم ئەوە چییە.' ئیدی کەوتە پێوشوێنی و بەرەو ڕووناکییەکە چوو سەیری کرد کەتێک[2] لەوێیە و کەسێک لە ڕەگەزی مرۆڤ لەسەری خەوتووە. چاوی لێ کرد ئەوە مۆمێک لەپشت سەری و مۆمێکیش لە خوار قاچییەوە دەگرێن. مەیموونە ئەو شتانەی پێ سەیر بوو. باڵەکانی وێک هێنا و بە ئەسپایی چووە پێشێ هەتا گەیشتە کن کەتەکەی قەمەروززەمان. سووکێک پۆپەشمینەکەی لەسەر هەڵداوە. چاوی لێ کرد. سەری لەو هەمووە جوانییەی سوور ما. ماوەیەکی باش هەر ئاوا نوقمی تەماشای بوو. کە لێی ورد بووەوە، دیتی تیشکی ڕوخساری لە تیشکی مۆمەکە زیاترە، وەک شاعیر دەڵێ:

ڕوویەک کە بە ڕۆژی ڕوون پەچەی لا بدا
تیشک داوێ وەک ئەستێرە لە شەوی تاریکدا

"وای لێ هات جنۆکەکە هۆشی لە لای خۆی و ئەقڵ لە کەللەیدا نەما. بەردەوام چاوی لە کوڵمی سوور و چاوی ڕەش و برۆی کەوانی ئەو بڕیبوو. لە بەر خۆشییەوە ئەو شێعرەی دەخوێندەوە:

گەنجۆ پێم بڵێ تۆ چی نەکا مانگی ئاسمانی
بەو کەشخەیی و جوانییەت دڵی ژیرانی دەرفێنی
بەو زولفە هەستهەژێنە و بۆنخۆشە زنجیرییەت
بەو برژانگە ڕەشانە و تیراسا خوێناوییەت
پێستت گوڵپەرکی ناسکە، کاکۆڵ میسکی خوتەنی
دڵ هەر بە دیتنی تۆ بە جارێ دەبێ خەنی

---

١. ئاکنجی بوو: نیشتەجێ بوو.

٢. کەت: تەختی خەو. کە بۆ دانیشتنیش کەڵکی لێ وەردەگرن.

"مەیموونە کە ئەو جوانییەی قەمەروززەمانی دیت، ڕاوەستـــتا و زۆری ئافەرین بۆ ئافرێنەرەکەی نارد و دانی بە گەورەییدا نا. لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بە خودا قەت من ئەوە ئازار نادەم و ناهێڵم کەســیش ئازاری بدا. ئەگەر خراپەیەکیشـــی کردبێ، من خۆمی بەخت دەکەم. چونکە ئەو جوانە هەر شـایانی ئەوەیە کە خەڵک ڕیزڕیز بێن سـەیری بکەن و یادی گەورەیی خودا بکەنەوە. نـازانم دایـک و بـابی ئەو کوڕە چۆن توانیویـانە ڕازی بن کە کوڕەکەیان لە شــوێنێکی ئاوا ســامناکدا بە تاقی تەنیا بێ؟! ئەگەر لەو جەنگەیەدا یەکێک لە دێوەکان بێ، حەتمەن لەنێوی دەبا. دوای ئەوە جنۆکەکە خۆی پێ ڕانەگیرا و دەمی برد و تەوێڵی قەمەروززەمانی ماچ کرد. پۆپەشــمینەکەی پێدا داوە و داپۆشـــی و خۆی بەرە و ئاسمان هەڵکشا. لە بورجی کۆشک چووە دەرێ و بەرەو ئاسمان ڕۆیشت و ڕۆیشت هەتا لە ئاســـمانی یەکەم نیزیک بووەوە. لە ناکاو گوێی لە باڵندەیەک بوو بۆ لای دەنگەکەی ڕوانی، سـەیری کرد دەنگی باڵی درنجێکە بە ناوی دەهەنێش. مەیموونە وەک هەڵۆ گەیشتە ســەری. کە دەهەنێش مەیموونەی دیت، ناســییەوە کە کچی پاشــای جنۆکانە. لە ترســان تەواوی گیانی کەوتە لەرزە و پەنای بۆ برد و گوتی: 'بیکە بۆ خاتری ناوی تەلیســـمی پیرۆزکراو و ڕێزلێگیراو کە لە ماڵی ســولێمانی پێغەبەر لەســەر دیوار چێ کراوە، بەزەییت پێمدا بێ و ئازارم مەدە!' کە مەیموونە ئاوای دیت، بەزەیی پێیدا هات و گوتی: 'ســوێندێکی گەورەت دام، بەڵام بەریشـت نادەم هەتا پێم نەڵێی بەو شــەوە لەکوێوە دێیتەوە؟' دەهەنێش گوتی: 'خانمەکەم، چیت لێ بشـــارمەوە؟ لەو دوورگانەڕا دێمەوە کە کەوتوونەتە ئەوپەڕی وڵاتی چینەوە. ئەوشــەو شـتێکی ســەیرم دیوە بۆت دەگێڕمەوە. ئەگەر زانیت ڕاسـتت پێ دەڵێم، ئەوە ئـازادم کە. وە دوای کـاری خۆم دەکەوم و دێرێکم بۆ بنووســـە کە ئەمن ئازادکراوی تۆم با هیچ کەس لە ڕەگەزی جنۆکان لە ئاسمان و زەوی و دەریاکاندا نەتوانێ ڕێم پێ بگرێ.' مەیموونە گوتی: 'دەهەنێش، ئەوەی دیوتە پێم بڵێ و خۆ لە درۆ بپارێزە. بە وێنەی ســولێمانی پێغەمبەر قەســـەم، ئەگەر بێتو درۆ بکەی، تەواوی باڵت هەڵدەقەنمەوە و پێسـتی سـەرت دەکەم و تەواوی ئێسکەکانت دەشـکێنم.' دەهەنێشـی کوڕی شـەمورشـی تەیار گوتی: 'خانمەکەم، ئەگەر درۆم کرد، چت پێ خۆشە لێم بکە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە..

## که شەوی سەد و حەفتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، دەهەنێش گوتی: 'من ئەوشـــەو لە دوورگەگەلی چینەوە کە ملکی غەیوورپاشایە و خاوەنی دوورگەیل و دەریاگەل و کۆشکە حەوتەوانەکانە، هاتوومە دەرێ. لەو ولاتە غەیوورپاشـــا کیژکی هەیە کە خودا لەو دنیایەدا کەســـی لەو چاکتر درووســـت نەکردووە و من نازانم چۆنی پەســـن بکەم. ئەگەر بمهەوێ چۆنە ئاوای تاریف بکەم، وەلا ئەوە زمانم ئاریکاریم ناکا و ناتوانێ. ئەمن لە پەسنیدا کەمی دێنم، بەلام شاعیر لە بارەیەوە دەلێ:

پـێـلـی ئەگـریـجە و بســـکەکەی دەریـات وەبـیـر دێـنـێـتەوە
تـروســـکەی قـژە خـاوەکەی وەک مـانـگ دەتـلاوێـنـێـتەوە
کولمەکـانی گولۆکی ســـوور، دمی هێنـد چووکە دیـار نییە
خـالـی لا لـێـو پـاســـەوانـی، قـوتـووی پـڕ لە مـرواریـیە
بـزە وەک ڕووبەنـدێکی جوان، هەموو ڕووخســـاری گـرتـووە
هەرچی خوێنشـــیرنی دونیـایە لە ســـیمـایـدا جێی گرتووە
تەوێـل و لاجـانـگ و مـلـی، بە زمـان هەر نـاکـرێ بـاســـی
بە دیـتـنـی بە گـیـان و دڵ ڕازی ببـی بە قـوربـانـی

"کە دەهەنێشی کوڕی شەهمورش ئاوا پەسنی سیمای جوانی کچی غەیوورپاشای کرد، دوای ئەوە گوتی: 'ئەمن لەوە زیاتر نازانم هیچی دیکە لە بارەیەوە بلێم، چونکە جوانی ئەو بەو جۆرە قســـانە ناگوترێ. بەلام باوکی ئەو کچە پاشـــایەکی زۆردار و ملهوڕە، نەترس و خوێنخۆرە. شەو و ڕۆژ لە دەشتودەر و شاخ و کێو و بێروون و دەریاکاندا دەسووڕێتەوە و لە هیچ شـتێک سـڵ ناکا. سـوپایەکی زەبەلاحی هەیە. جگە لەو شـارە ئاوەدانانەی لەژێر دەســـەلاتیدایە، دەسـتی بەسـەر تەواوی دوورگە و دەریا و کۆشـکە حەوتەوانەکاندا دەڕوا. ناوی غەیوورپاشایە و کچەکەی ئێجگار خۆش دەوێ. ئەوەندەی خۆش دەوێ ماڵی تەواوی پاشـــاکان بۆ ئەو کۆ دەکاتەوە، کۆشـــکی حەوتەوانەشـــی بۆ ئەو چێ کردووە کە هەر کۆشـــکەی لە گەوهەرێکی جیا ســـاز کراوە. کۆشـــکی یەکەم لە بلوورە، دووەم ڕوخام و سێیەم لە ئاسنی چینی، چوارەم لە بەردی جەزعی یەمانی، پێنجەم لە زێو شەشەم لە زێڕی سوور و حەوتەمیش جەواهێرە. لەو کۆشکانەشدا فەرشی گرانبایی وەک ئاوریشم و شتی وای تێدا ڕاخستوون، دەفرەکانی ئەو کۆشکانە هەموو لە زێڕ و زیو و شتی پاشایانەن. بە کچەکەی گوتووە: 'هەر ماوەیەی لە یەکێک لە کۆشکەکان بە و بخۆت ڕایبوێرە. لە درێژایی

ساڵدا هەر لەنێو ئەو کۆشکانەدا خەریکی عەیش و نۆشی خۆت بە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، 'کچە تەواوی ساڵەکەی لە خۆشی و شادیدا ڕادەبوارد. ئەو کیژە ناوی بێدوور بوو. دوای ئەوەی پەسن و تاریفی ئەو کەنیشکە لە وڵاتاندا دەنگی داوە و پاشاکان بیستیانەوە، لە هەموو لایەکەوە کەیخودا و دەمڕاستیان دەنارده خوازبێنی. ئەو کچە تکای کەسی قەبووڵ نەدەکرد و دەیگوت: 'مێرد ناکەم.' بە باوکی دەگوت: 'من مێرد ناکەم، لەبەر ئەوەی دەمهەوێ دەسەڵاتداری بکەم و ناتوانم بچمە ژێر دەسەڵاتی هیچ پیاوێکەوە.' هەرچی ئەو لەو شتە نەبانتر دەبوو داواکارەکانی پێداگرتر دەبوون. دوای ئەوە پاشاگەلێکی زۆر دیارییان بۆ بابی نارد و نامەیەکی زۆریان نووسی و داوای بێدووریان کرد. بابیشی هەموو جارێ قسەی لەگەڵ کیژەکەی دەکرد. ئەویش وەڵامی بابی نەدەداوە هەتا وای لێ هات توورە بوو و بە بابی گوت: 'ئەگەر ئەم کەرەتە باسی ئەو شتەم لەگەڵ بکەی، شیرێک دێنم دەسکەکەی لەسەر زەوی دادەنێم و خۆم بە دەمەکەیدا دەدەم و لەسەر دڵمی دەبەمە خوارێ با لە بڕبڕەی پشتم بێتەوە دەرێ.' کاتێک بابی ئەو قسانەی لە شازادە بیست، زکی بە کچەکەی سووتا و ترسا خۆی بکوژێ.

" 'ئاوا بوو پاشا سەری لە کاری کچەکەی سوور ما و کەوتە بیرەوە کە چی جوابی داواکارەکانی بداتەوە. بە شازادە بێدووری گوت: 'ئەگەر ناتهەوێ مێرد بکەی، هاتوچۆش مەکە، با خەڵک ئەوەندەت نەبینن. لە کۆشکەکەی خۆت مەیە دەرێ.' پاشا لە ژوورێی کرد و لە بەرچاوی خەڵکی لا برد. دە دانە پیرێژنی تەرخان کرد بەدەورییەوە بن و ئاگایان لێی بێ لە کۆشک نەیەتە دەرێ، وای پێشان دا ڕقی لە کچەکەی هەستاوە.

" 'کەیخودا و دەمڕاستانی پاشای وڵاتەکان کە هاتبوون بۆ داواکاری بێدوور، هەمووی جواب کردن و ناردنییەوە نامەیەکیشی بۆ نووسین کە کچەکەی لەسەری داوە[1] و ئەوە لە ژووریدا بە زنجیر بەستوومانەتەوە و لە بەرچاوی خەڵکمان لا بردووە.' دوای ئەوە دەهەنێشی دێو بە مەیموونەی جنۆکەی گوت: 'خانمەکەم، ئەمن هەموو شەوێک دەچم بۆ ئەوێ تێر سەیری جوانییەکەی دەکەم و لە خەودا ماچێکی دەکەم. ئەوەندەم خۆش دەوێ ناهێڵم کەس ئازاری بدا. خانم، تۆ خودا لەگەڵم وەرە چاو لەو هەمووە جوانی و دەلالییەی بکە. پاشان ئەگەر پێت خۆش بوو بیرازم بکە، دەنا لێم خۆش بە، چونکە دەسەڵات بە خۆتە.' مەیموون بە قسەکانی پێکەنی، تفی لێ کرد و گوتی: 'ئەو کچەی کە تۆ دەڵێی، بە نینۆکێکی قرتاوی واشتاکەی[2] من نابێ. ئەگەر تۆ ئەوەی من ببینی، هەموو شتێکت لە بیر

---

١. لەسەری داوە: شێت بووە.

٢. واشتا: گراو. خۆشەویست.

دەچێتەوە و بیری کەس ناکەی. ئەمن وام زانی ئەتۆ هەواڵێکی زۆر ســـەیر و تازەت پێیە. مەلعوون، ئەوشـەو من کوڕێکم دیت ئەگەر تۆ لە خەویشـدا ببینی مەسـت دەبی و لیکاوت دێتە خوارێ.' دەهەنێش گوتی: 'خانم، ئەو کوڕە لە کوێنەیە و ناوی چییە؟' مەیموونە گوتی: 'دەهەنێش، بەسەرهاتی ئەو کوڕەش وەک ئەو گراوەی تۆ وایە. ئەویش باوکی چەندین جار داوای لێ کردووە ژن بێنێ. وەلامی بـاوکی نەداوەتەوە و ئەویش لێی قەڵس بووە و لە بورجەکەی مندا بەندی کردووە. ئەوشـــەو کە دەهاتمە دەرێ دیتم.' دەهەنێش گوتی: 'خانم، ئەو کوڕەم پێشـــان بدە بزانم ئەو لە شـــازادە بێدووری گراوی من جوانترە یان نا. ئەمن دڵنیام لەو دنیایە ژنی هێندە دەلالی تێدا نییە.' مەیموونە گوتی: 'ئەمن دوای لێکۆڵینەوە بۆم دەرکەوتووە کە شتی وەک واشتای من جوان و دەلال لە دنیادا هەر نییە.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، مەیموونە بە دەهەنێشی گوت: 'واشتای من لە جیهاندا تای نییە. ئەتۆ شێتی کە گراوی خۆت دێنیە ئاستی گراوی من؟' دەهەنێش گوتی: 'خانم، تۆ خودا لە بەرت دەپاڕێمەوە، وەرە با بچین ئەو گراوەی من ببینە و منیش لەگەڵت دێم واشتاکەی تۆ دەبینم.' مەیموونە گوتی: 'گڵاو وادارم دەکەی بێم! بەڵام لەپێشدا ئێمە مەرجێک دادەنێین. ئەگەر واشتای تۆ کە ئەو هەمووەی تاریف دەکەی شەنگ و شەپاڵتر بوو ئەوە تۆ بردووتەتەوە. ئەگەر هی من جوانتر بوو ئەوە من بردوومەتەوە.' دەهەنێش گوتی: 'خانم، زۆر باشە. قەبووڵمە ئەوە مەرجمان بێ. وەرە با بچین بۆ دوورگەکان.' مەیموونە گوتی : 'شوێنی واشتای من نزیکترە، چونکە ئەو هەر لەو بنەوەیە کە ئێمە لێی ڕاوەستاوین. ئەتۆ لەگەڵم وەرە با بچین واشتای من ببینە. دوایە منیش لەگەڵت دێم گراوی تۆ ببینم.' دەهەنێش گوتی: 'بەسەر چاو با بڕۆین.' ئیدی سەرەوخوار بوونەوە و لەسەر بورجەکە نیشتنەوە. چوونە ژوورێ. مەیموونە جنۆکەکەی لە لای تەختەکە ڕاگرت و بۆخۆی بە ئەسپایی پۆپەشمینەکەی لەسەر قەمەروززەمان لا دا. ڕووی مانگی تیشکی هاویشت. مەیموونە بە دەهەنێشی گوت: 'گڵاو بڕوانە با ئیدی لە خۆڕا قسەی قۆڕ نەکەی.' دەهەنێش ماوەیەکی چاک ورد تێی ڕووانی، ئەوجا سەرێکی لەقاند و بە مەیموونەی گوت: 'خانم، بڵێم چی؟! بە خودا ئەو دەلالییەی کە کچ هەیەتی، کوڕ نییەتی. بەڵام دیسان جوانی و شەنگی و شەپاڵی ئەو واشتایەی تۆ زۆر شێوەی گراوەکەی من دەدا. هەر دەڵێی سێوێکن و کراون بە دوو لەتەوە.' کە مەیموونە ئەو قسەیەی لە زاری ئەو بیست، دنیای لە بەرچاو تاریک بوو ئەوەندە توورە بوو لە داخان شاپەڕێکی لە سەری دەهەنێش دا. خەریک بوو گیانی دەرچێ، ئینجا بە دەهەنێشی گوت: 'بە تیشکی جوانی ئەو لاوە! هەر ئێستا دەتنێرم دەبێ بچی ئەو گراوەی خۆت بێنی لە پەنا یەک دایاندەنێین بزانین کامیان جوانترە. با ئیتر خاس لە خراو و جوان لە ناحەز جیا بکەیتەوە. هەستە گڵاو ئەگەر هەر ئێستا نەچی، ئەوە گڕێکت داوێمێ و دەتسووتێنم. لەتوکوتت دەکەم و هەر لەتەی دەیهاوێمە دەشت و بێروونێک، تا ئەوەی دەبیستێتەوە و دەتبینێ، پەندت لێ وەرگێ و سەرپێچی نەکا.' دەهەنێش گوتی: 'خانم، بە قسەت دەکەم و دەچم، بەڵام دەزانم گراوی من لەبەردڵترە.' ئەوجا دەهەنێش دەرفڕی و مەیموونەش بەدوایدا فڕی. ماوەیەک ون بوون. دوای ئەوە هەر ئەو کچەیان بە کراسێکی یەکسەرەوە کە قەراخەکانی بە داوی زێڕین داگیرابووەوە، هێنا. لەسەر قۆڵەکانی بە داوی زێڕ ئەو شێعرانە نووسرابوو:

گوڵ شانازی دەکا بێت و شێوەی سیمای جوانت بدا
بۆ ئەوەی لە بەژنت هاڵی گوڵە لاولاو شاباش دەدا

چناراسا هەڵکشاوی، دەستی بەدکارت ناگاتێ
لە نێو گوڵزارا نەماوی بولبول ئەی چۆنت بگاتێ
لە خەون و خەیاڵیشدا تۆ هێند بەرزی جێت نابێتەوە
چارەڕەشە ئەو کەسەی وا لە عیشقتدا دەتلێتەوە

"دوایی ئەو کچەیان هێنا لە پەنا قەمەروززەماندا دایان نا."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و هەشتایەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مەیموونە و دەهەنێش ئەو کچە حۆراسایەیان هێنا و لە پەنا قەمەروززەماندا درێژیان کرد و پۆپەشمینیان لەسەر لا دان. سەیریان کرد ئەوەندە وەک یەک دەچن دەڵێی خوشک و برا یان ئامۆزان، هەردووکیان فیتنەگێڕ و دڵهەژێنی ڕۆژگارن. وەک شاعیر دەڵێ:

دوو پەریڕووی جوان و ڕێکوپێک و چناری
ڕوویان پشکووتووە مینا خونچەی بەهاری
لە جوانیدا ملەیانە کەشخە و دەلالن
کوڵمەیان سێوە لاسوورە، دمیان هەناری
تیشکی ڕوویان هەیڤاسایە نەرمە نیگایان
سڕک و ناسک و ڕەوەکن چو ئاسکی بناری

"دەهەنێش بە مەیموونەی گوت: 'گراوی من پەسندترە.' مەیموونە گوتی: 'ناوەڵا. واشتای من پەسندترە. دەهەنێش، ئەو هەمووە جوانی و تەکووزی و ڕێکییەی خۆشەویستی من نابینی؟! گوێ ڕاگرە هەتا لە پەسنی واشتاکەم شێعرێکت بۆ بڵێم. ئەتۆش ئەگەر ڕاست دەکەی، لە پەسنی گراوەکەتدا وەک من شێعرێکی پێدا هەڵبڵێ. ئەوجا مەیموونە ماچێکی قەمەروززەمانی کرد و ئەو شێعرەی گوت:

بسک و زولفت کە عەنبەرینە گوڵ ڕوخسار
ماڵمت ڕووناک کردووە بە تیشکت ئەی یار
دوومات گوڵزار و قەد و باڵات سەلوی ڕێک
لەسەر ئەو سەلوە ڕێکەشت، ڕەزای دڵدار
دایدەپۆشی بەو قژە زێڕین و خاوەت
تا وەشێری ئەو گشتە جوانیە لە ئەغیار
بسکی ڕەشت هەر تاڵێکی تاتارێکە
ئەگەر هەبێ لە گۆی زەویدا یەک تاتار

"کاتێک دەهەنێش ئەو شێعرەی مەیموونەی لە پەسنی قەمەروززەماندا بیست، واقی وڕ ما و کەیفی ساز بوو."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و هەشتا و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، که دەهەنێش شێعرەکەی مەیموونەی بیست، واقی وڕ ما و کەیفی ساز بوو. گوتی: 'ئەتۆ سەرەڕای ئەوەی گیانت لەسەر ئەو واشتا ڕوومانگە بوو ئەو شێعرە هەستبزوێنەت گوت، منیش دەبێ تێکۆشم شێعرێک ساز کەم:

بالات سەلو و زوڵفی سونبولت سێبەری سۆسەنی ڕووت
ئێرەیی دیتێ بە دنیا، جەننەت لە جوانی و شەوقی ڕووت
ئاڵقەئاڵقەی زوڵفی لوولت پەرێشانە لە سەر شانت
هەر ئاڵقەیەکت داوێکە بۆ گرتنی عاشقانت
بە داوی کەزییەتەوە بوون هەزاران عاشقی وەک من
بۆ لای تۆ درێژ کراوە دەسی هانای سەدی وەک من
ئەڤیندارانی سەرگەردان هەموو پیر و فەرتووت دەکەی
بەو داوەی تۆ دەینێیەوە، گشتیان فیدای عیشقت دەکەی

"که شێعرەکەی دەهەنێش تەواو بوو مەیموونە گوتی: 'بژی دەهەنێش، بەلام پێم بڵێ کامیان پەسندترە؟' دەهەنێش گوتی: 'خانمەکەم، گراوی من لە هی تۆ پەسندترە.' مەیموونە گوتی: 'گلاو درۆ دەکەی! هی من لە هی تۆ پەسندترە.'

"ئەوان هەر وا دەمەقرەیان بوو هەتا وای لێ هات مەیموونە بەسەریدا نەڕاند و لێی توورە بوو. دەهەنێش داینەواند و ئارامئارام بە مەیموونەی گوت: 'با کەسێکی دیکە داوەریمان بکا و قسەی تێدا بکات. بە ڕاستی سەلماندنی زۆر ئەستمە، چونکە هەر کەسەی هی خۆی پێ جوانە. با کەسێکی بە ویژدان، وا بێ جێی باوەڕی هەردووکمان بێ، بڵێ کامیان پەسندترە.' مەیموونە گوتی: 'بیرێکی چاکە، وا دەکەین.' ئینجا قاچێکی لە زەوی دا و جنۆکەیەک هاتە دەرێ. چاوی داقڵەشابوو. حەوت شاخ و چوار پرچی هەبوو. دەستەکانی کورت و نینۆکەکانی وەک نینۆکی شێر بوون. قاچەکانی وەک قاچی فیل دەچوون. که جنۆکەکە هاتە دەرێ و مەیموونەی دیت، خێرا لە بەر پێیدا کەوت، کڕنۆشی بۆ برد و دەستەونەزەر ڕاوەستا و بە مەیموونەی گوت: 'خانمەکەم، کچی پاشای جنۆکان، چ کارێکت بە من بوو؟' مەیموونە گوتی: 'قشقش، دەمهەوێ لەنێوان من و ئەو گلاوەدا داوەری بکەی.' ئیدی مەیموونە ڕووداوەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ قشقش گێراوە. قشقش چاوێکی لە کچە و کوڕە کرد. سەیری کرد، دەست لە ملان خەوتوون و لە جوانی و لەباریدا وەک یەکن و لە خوێنشیرینی و دڵڕفێنیدا هاوتان.

"قشقش سەری لەو هەموو شەنگ و شەپاڵییەی ئەوان سوورِ ما. ماوەیەک زۆر تێیان راما و ئینجا ئەو شێعرەی گوت:

ئـــای لە جـــوانـــی ئەو پەریـــرِووە دەلالانە
ئەوەی هەســـــتە ورِە لە ئـاســـــت ئەو جـوانـانە
کـاســـــیـان کـردووم هەرچـی بـڵـێـم لە خـۆرِایە
ئەوەی جـوانـیە لای هەردووکـیـان وەک یەک وایە

"دوای ئەوە قشقش رووی کردە مەیموونە و دەهەنێش و پێی گوتن: 'بە خودا ناکرێ بڵێی ئەمیان لەویان جوانترە. ئەو دووانە لە جوانی و رێکوپێکیدا وەک یەکن، بەڵام من شـــتێکی دیکە دەڵێم. دەڵێم هەر کام لەوانە بەبێ ئەوەی دیکە وەخەبەر بێنین با ئەوی دیکە ببینێ. هەر کامیان زیاتر بەوی دیکە سەرسام بوو ئەوە ئەو لەبەرابەر ئەوی دیدا کەمترە.' مەیموونە گوتی: 'ئەوە فکری چاک و ژیرانەیە. ئەمن بەو حوکمە رازیم.' دەهەنێش گوتی: 'مـنـیش بەو حـوکـمە رازیـم.' لەو جەنـگەیەدا دەهەنـێـش بـوو بە کـێـچـێـک و بە قەمەروززەمانییەوەی دا."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و هەشتا و دووەم هاتەوە

گوتی: "خـاوەنشـــکۆ، دەهەنێش بوو بە کێچێـک و بە قەمەروززەمـانییەوە دا. قەمەروززەمان ئەوەندەی ئێش پێگەییشت، خەبەری بووەوە و لە جێگاکەیدا ئەوشانەوشانی کرد، کە سـەیری کرد، ئەوە کەسـێک لەگەڵی خەوتووە هەناسـەی لە میسـک و عەنبەر بۆنخۆشتر و لەشی لە ئاوریشم نەرمترە. قەمەروززەمان لەجێوە هەستا دانیشت و چاوی لەو کەسـە کرد کە لە پەنـایەوە خەوتبوو. سـەیری کرد ئەوە کچێکە دەڵێی زێرە دەدرەوشـێتەوە، دوو مەمکی مینا تۆپەڵە شـفرە لە بەرۆکی هاتبوونە دەرێ. سـەروبسـکی خاو و ئاوریشمی بۆنخۆش و دوو چاوی ڕشتوو بە کلی سوبحان و خاڵی ڕووی کە دڵان دەهەژێنێ و وەک شاعیر دەڵێ:

جەستەیەکی دڵستـــــێن و سیمایەکی دڵڕفێن
ناسـکێکی سـڕک و ئاسـکـــاسا و چەلەنگێکی دڵهەژێن
دووما و ددانی بلـــوورین قۆڵ و بازن سپی و سۆڵ
بســک پێلی و برۆکەوانی، ڕووح دەبەن چـاو و مژۆڵ

"کاتێک قەمەروززەمان شـازادە بێدووری کچی غەیوورپاشـای بەو هەموو جوانی و دڵبەرییەوە دیت، سـەیری کرد کراسـێکی یەکسـەرەی لەبەردایە کە پەراوێزەکانی بە داوی زێڕ پەراوێزچنی کراون و دەرپێشـی لە پێدا نییە. ملوانکەیکی ڕازاوە بە زێڕ و زیو و جەواهیراتی جۆراجۆر لە ملدایە.

"قەمەروززەمان شـەیدای بوو هەوەس چاوی عەقڵی بەست و دەستی بۆ برد. دوگمەی کراسـەکەی ترازاند. پێسـتێکی وەک کافووری سـپی وەدەر کەوت. کە چاوی لە سـینگ و مەمکی کرد، ئەوەندەی دی دڵی چووە سـەری و ویسـتی وەخەبەری بێنێ. شـازادە بێدوور وە خەبەر نەهات، چونکە دەهەنێش ئەوی بردبووە خەوێکی قووڵەوە. قەمەروززەمان هەر دەستی پێدا دێنا و ڕایدەژاند. پێی دەگوت: 'خۆشەویستەکەم، هەستە و بمبینە بزانە کێت لە لایە. ئەمن قەمەروززەمانم.' شـازادە خانم وە خەبەر نەهات و نەجووڵاوە. قەمەروززەمان ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: 'پێم وایە بابم هەر دەیهەویست ئەو کیژە ڕووگەشەم بۆ بێنێ. ئەمن لەبەر گەوجی خۆم قەبووڵم نەدەکرد و سێ ساڵ لە تەمەنم هەر وا بە فیڕۆ چوو. ئەگەر خودا ڕاست بێنێ و ڕۆژ بێتەوە، بە بابم دەڵێم ئەو کیژەم بۆ بێنێ.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتـایی پێ هـات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

# که شەوی سەد و هەشتا و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، قەمەروززەمان لە دڵی خۆیدا گوتی: 'بە بابم دەڵێم ئەو کیژەم بۆ بێنێ. ناهێڵم ڕۆژ لە نیوە تێپەڕێ دەبێ پێی بگەم و لە باخی جوانییەکەی گوڵی ئاوات بچنم.' دوای ئەوە ئیشتیای چووە ماچی شازادە بێدوور.

"مەیموونەی جنۆکە دڵی وە لێدان کەوت و تەریق بووەوە. بەڵام دەهەنێش لە خۆشـیان خەریک بوو هەڵفڕێ. ئیدی قەمەروززەمان ویسـتی دەمی ماچ کا. کەچی شـەرمی لە خودا کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: 'ئەگەر خۆم ڕاگرم باشـترە. ڕەنگە ئەو کاتەی باوکم لێم توورە بوو منی بەند کرد، دوای ئەوە ئەو کچەی ناردبێتە لای من هەتا لە لام بخەوێ و من تاقی کاتەوە. پێشـی گوتووە کە ئەگەر قاویشـی کردی، خۆت شـلوێ[1] مەکە و هەرچی کرد بۆم بگێڕەوە. ڕەنگیشـە باوکم لە سـووچێکەوە ڕاوەسـتابێ و منی لێ دیارە بێ و من ئەوم لێ دیار نەبێ. هەرچی لەگەڵ ئەو کچەدا بیکەم، ئەو ئاگای لێ بێ و بەیانی سـەرکۆنەم دەکا و دەڵێ: 'ئەی بۆ دەتگوت من پێویستیم بە ژن نییە، کەچی ئەو کچەشت ئاوا لە ئامێز دەگرت؟' کەوایە هەر وا باشـترە خۆی تێنەگەیەنم و لێی نیزیک نەبمەوە. دەسـتی لێ نەدەم و چاوی لێ نەکەم با لە لای بابم ئابڕووم نەچێ. بەڵام ئاخر دەبێ شتێکمان لەنێواندا بێ ـشتێکی لێ بسـتێنم هەتا وەک یادگارێک لە لام بێ.' ئینجا کلکەوانەکەی لە قامکی دەرهێنا. نقیمی کلکەوانەکە لە گەوهەری گرانبایی بوو و ئەو شێعرانەی لەنێودا نەخش کرابوو:

سـوێندم خواردووە بە کاکۆڵی ئەو کوڕە
هەر وەفادار بم بە ئەڤینی ئەو کوڕە
ئەمن کە لەسەر گفتوبڵێنی خۆم بووم،
ڕۆژگار شـێواندی چارەنووسی ئەو کوڕە

"کاتێک قەمەروززەمان ئەنگوسـتیلەکەی لە قامکی ئەو کچە دەرهێنا و لە دەسـتی خۆی کرد، ئینجا پشـتی لە شـازادە کرد و لێی خەوت. کە مەیموونە ئەوەی دیت، دڵی خۆش بوو. بە دەهەنێش و قشقشی گوت: 'دیتتان خۆشەویستەکەی من چۆن بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. نە لە ئامێز گرت و نە ماچی کرد. ئەوەندە داوێنپاک بوو تەنانەت دەستیشی لێ نەدا، بەڵکوو پشتیشی تێ کرد و خەوت؟! ئەوانە نیشانەی داوێنپاکی و جوامێربوونی ئەون.' دەهەنێش و قشقش گوتیان: 'بەڵێ، ڕەوشـت و ئاکاری بەرزی ئەومان دیت کە سـەرچاوەی هەموو چاکەکانە.'

---

١. خۆت شلوێ مەکە: وەسەر خۆت مەهێنە، وای نیشان دە هەر لەگەڵ تۆشیان نییە.

"دوای ئەوە مەیموونە چووە بیچمی کێچێکەوە و خزایە نێو جلەکانی شازادە بێدوورەوە. ڕۆیشت ڕۆیشت هەتا گەیشتە پووز و بەلەکی، لەوێشەوە هەڵگەڕا هەتا گەیشتە ڕانەکانی و لەوێشەوە هەڵکشا تا گەیشتە ناوکی و بە ناوکییەوە دا. شازادەی داماوی لە خەو هەستاند و چاوی هەڵێنا. ئینجا هەستا سەر قوون و قیت دانیشت. سەیری کرد کوڕێکی وەک مانگی چاردە لە پەنای خەوتووە، لە جوانی و ڕێکوپێکیدا جۆرێکە کە شاعیر دەڵێ:

خەوتـووە و لەســـەر ڕووی ســـپی و گەشـــی
چەنـــدە جـــوانە ســـەر و ڕیشـــی ڕەشـــی
ڕووی وەکوو گـــــــــــــــوڵی مێلاقە گەشە
بۆنی کـــــــاکـــــــــــۆڵی میسکاسا خوەشـە

"کاتێک شازادە بێدوور قەمەروززەمانی دیت، شەیدای جوانییەکەی و گیرۆدەی خەت و خاڵی بوو. ئیتر لە تاوان هۆش و گۆشی نەما."

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و هەشتا و چوارەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـكۆ، شـازادە بە دیتنی قەمەروززەمان هۆش و گۆشـی نەما، بە خۆی گوت: 'ئەو كوڕە مانگڕوخسـارە كێیە هاتووە لە پاڵ من خزاوە؟!' لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەی ڕۆ! چۆنم ئابڕوو دەچێ ئەگەر پێم بزانن!' ئەوجا چاوی لە چاوە جوانەكانی و برۆ كەوانییەكانی كرد و سەرنجی ئەو سیما دڵڕفێن و شیرینەی دا. كە ئەو هەمووە جوانی و دەلالی و خەت و خاڵەی دیت، لە ڕێوە گیرۆدەی داوی ئەڤینی بوو. بە خۆی گوت: 'ئەو كوڕە هێندە جوانە، دەڵێی ڕۆژە. بە خودا ئەوە دڵم لە سوێیانی دەتۆقێ. خۆشەویستی ئەو كوڕە ئابڕووم پێ ناهێڵێ. ئەگەر بمزانیبا ئەو كەسـەی داوای منی دەكرد ئەو كوڕەیە، قەت بێقسەیی بابم نەدەكرد. مێردم پێ دەكرد و ژیان لەگەڵ ئەو گوڵەم بۆ خۆم مسۆگەر دەكرد. بە ئاواتی دڵم دەگەیشتم.'

"شازادە بێدوور چاوی لە ڕوخساری گەشی قەمەروززەمان كرد و گوتی: 'گەورە و خۆشەویستی دڵ و سۆمای دوو چاوم! لە خەو ڕابە تێر بنواڕە سیمای جوانم.' ئیدی دەستی درێژ كرد و كەمێكی ڕاژاند. ئیدی شازادە بە هەردوو دەستی جووڵاندییەوە و پێی گوت: 'تۆ گیانی من لە خەو هەستە و چاوێك لە سەر و بسك و لاجانگم بكە، ماچی گۆنام بكە و دەست لەسەر كەمەر و ناوكم دابنێ و هەتا بەیانی دەستبازی و گەمەم لەگەڵدا بكە.' قەمەروززەمان متەقی لێ نەهات و سەری هەڵنەهێنا.

"ئیدی شازادە بێدوور گوتی: 'ئەوە لەبەر قۆزی و كەشخەییەكەت لە خۆت دەرچووی؟ ئەتۆ ئەگەر باخی گوڵی، ئەمن چیمەنی یاسـەمینم، تۆ ئەگەر كەشـخە و قۆزی، ئەمنیش شـەنگ و شـەپاڵم. پێت گوتراوە كە ڕوو لە من وەرگێڕی؟ یان ئەو بابە پیرە گلاوەم گوتوویە نـابێ لەگەڵم بـدوێی؟' قەمەروززەمـان چـاوی نەكردەوە. جـار لەگەڵ جـار خۆشەویستی قەمەروززەمان لە دڵیدا زیاتر چەكەرەی دەكرد. پتر لە دڵیدا جێی دەكردەوە. بە پەرۆشەوە چاوی تێ بڕیبوو. شازادە زۆر ناڕەحەت بوو گیانی وە لەرزین كەوت و بە قەمەروززەمانی گوت: 'گەورەم، شێتت كردم، وەڵامم بدەوە و لەگەڵم بدوێ.' شازادە هەر لەو قسانەی دەكرد و قەمەروززەمانیش لە خەوی شیریندا بوو. هیچ وەڵامێكی نەدەداوە. ئیدی شـازادە بێدوور دڵتەنگ و ناڕەحەت بوو و گوتی: 'بۆ ئەوەندە لەخۆباییت؟' ئینجا دەسـتی قەمەروززەمانی گرت و كلكەوانەكەی خۆی لە دەسـتی ئەودا دیت. لە خۆشـیان قیژاندی و بە ناز و كرێشمەوە گوتی: 'بە خودا تۆ خۆشەویست و ئەڤینداری منی و منت خۆش دەوێ، بەڵام نازم بەسـەردا دەكەی. چونكە ئەتۆ هاتووی لە پاڵ من خزاوی، خودا دەزانێ چت كردووە!' ئیدی زیپی كراسەكەی قەمەروززەمانی كردەوە و سەری بردە پێشێ

و ئەوکی ماچ کرد. سەیری کرد ژێرشاڵواری لە پێدا نییە. ئیدی دەستی لە بن کراسەکەیەوە بردە خوارێ و بە لاق و لەتەریدا هێنا. لەڕێوە ڕەنگی پەڕی و وە دڵەکوتە کەوت. دوای ئەوە ئەنگوستیلەکەی قەمەروززەمانی لە ئەنگوستی خۆی کرد و دەست و دەمی قەمەروززەمانی ماچ کرد. ئینجا پێیدا هات هیچ شوێنێکی قەمەروززەمان نەما شازادە ماچی نەکا. دوای ئەوە ئەوی بە سینگییەوە گوشی و دەستێکی خستە ژێر سەری و دەستێکیشی لە ئەستۆی کرد و لە پاڵیدا خەوت."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و هەشتا و پێنجەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــــکۆ، شـــــازادە بێدوور قەمەروززەمانی لە ئامێز گرت و خەوت. کە مەیموونە ئەوەی دیت، پێی خۆش بوو و بە دەهەنێشـی گوت: 'گلاو دیتت کە گراوەکەی تۆ چۆناوچۆن شەیدای واشتاکەی من بووە و واشتاکەی منیش چەند بە پۆز و نازەوە لەگەڵ گراوەکەی تۆدا جوولاوە؟! قسـەی تێدا نییە کە واشـتاکەی من لە هی تۆ پەسـندترە. بەلام ئەمن لێت خۆش دەبم.' ئیدی ئازادینامەیەکی بۆ نووسـی و بە قشقشـی گوت: 'یارمەتی دەهەنێش بدە و گراوەکەی هەڵگرن ببیەنەوە بۆ جێگاکەی خۆی. چونکە ئەوەندەی شـەو نەماوە.'

"ئیدی دەهەنێش و قشقش هەسـتان چوون شـازادە بێدووریان هەڵگرت و هەڵفڕین. گەیاندیانەوە و لە شوێنەکەی خۆی دایاننناوە.

"مەیموونەی جنۆکە لە پەنا سـەری قەمەروززەمان دانیشـتبوو تێی دەڕوانی هەتا بوولێڵەی بەیـانی. مەیـموونە چـوو بە لای کـاری خـۆیەوە. هەر کە ڕۆژ بـووەوە، قەمەروززەمان خەبەری بووەوە و هەسـتا و چاوێکی لەملا و ئەولای خۆی کرد. کچەکە لەوێ نەمابوو! گوتی: 'ئەوە کاری کەس نییە جگە لە بابم. ئەویش بۆ ئەوەی من هان بدا لەگەڵ ئەو کەنیشکەدا زەماوەند بکەم. زانی من بە قسـەی ناکەم، بێ ئەوەی من بزانم، ئەو کیژەی ناردووەتە لای من هەتا زەماوەندم لە بەر شـیرین بێ.' ئینجا گازی کردە ئەو خزمەتکارەی کە لە دالانەکە خەوتبوو گوتی: 'هەسـتە گلاو.' پێشـخزمەتەکە لە ترسـان ڕاپەڕی و چوو ئاوی دەسـتنوێژی بۆ هێنا. قەمەروززەمان هەسـتا چووە ئاودەسـت و هاتەوە دەسـتنوێژی شـۆرد و نوێژی بەیانی کرد و کەمێکی یادی خودا کرد. دوای ئەوە بە خزمەتکارەکەی گوت: 'گلاو پێم بڵێ کێ هات ئەو کچەی برد؟' خزمەتکارەکە گوتی: 'کامە کچ؟! کچی چی؟' قەمەروززەمـان گوتی: 'ئەو کچەی ئەوشـەو لە لای من خەوتبوو.' خزمەتکارەکە گوتی: 'لای تۆ کچی لێ نەبوو. ئەو کچە لە کوێوە هات؟ خۆ من هەر لەپشـت ئەو دەرگایە خەوتبووم؟ گەورەم، بە خودا لە لای تۆ نە ژنی لێ بووە نە پیاو!'

"قەمەروززەمان گوتی: 'هەی نۆکەری پیس، درۆ دەکەی! ئەتۆ وات لێ هات درۆ لەگەڵ من بکەی و فریوم بدەی؟! ڕاسـتی بڵێ، ئەو کچەی ئەوشـەو لەگەڵ من خەوتبوو چی لێ هات؟' غولامەکە ترسـی ڕێ نیشـت و گوتی: 'گەورەم، قەسـەم بە خودا ئەمن نە کچم لێرە دیوە و نە کوڕ.' قەمەروززەمان ڕقی لە کۆیلەکەی هەستا و ناوقەدی گرت و خستی و لاقی لەسـەر ملی دانا و گوشـاری دا هەتا بێهۆش بوو. دوایی بە گوریسـێک بەسـتییەوە و ڕۆیهێشـتە ناو چالاوێک هەتا گەیشتە ئاوەکە. یەک دوو جاری لە ئاوەکە هەڵکێشا و هێنایە

دەرەوە. کۆیلە دەسـتی کرد بە گریان و لالانەوە و پاڕانەوە کە لە چاڵاوەکە دەریبهێنێتەوە. قەمەروززەمان گوتی: 'گلاو قەسـەم بە خودا ئەو جار لەو چاڵاوە دەرتناهێنمەوە هەتا لە ڕووداوی ئەو کچە ئاگادارم نەکەیەوە و پێم نەڵێی کێ لێرەی لا برد.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشـەویش کۆتایی پێ هات و شـەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشسکۆ، خزمەتکارەکە بە قەمەروززەمانی گوت: 'خاوەندار، ئەتۆ من لەو چاڵە دەربێنەوە هەتا هەموو راستییەکت پێ بڵێم.' قەمەروززەمان لە چاڵەکە دەریهێناوە، بە رێکەوت زستانیش بوو. کۆیلە ئەوەندە لەملا و لەولای چاڵاوەکە درابوو هەموو گیانی دێشا و جلوبەرگەکەشی تەڕتەڕ ببوو وەک داربی بەدەم باوە لە سەرمان دەلەرزی. گوتی: 'گەورەم، لێم گەڕێ بچمە دەرێ ئەو جلانەم دادەکەنم، دەیانگوشم و لە بەر هەتاو هەڵیاندەخەم وشک بنەوە و لە بەریان دەکەمەوە و خێرا دێمەوە بەسەرهاتی ئەو کچەت بۆ دەگێڕمەوە.' گوتی: 'ئەی کۆیلەی گڵاو ئەگەر تۆ ئاوا مەرگت بە چاوی خۆت نەدیبایە، قەت ئامادە نەدەبووی راستی بڵێی. ئێستا برۆ کارەکانت جێبەجێ بکە و وەرەوە بەسەرهاتەکەم بۆ بگێڕەوە. بەڵام زۆرت پێ نەچێ.'

"کۆیلەی خزمەتکار هەرکە هاتە دەرێ، یەکسەر هەتا کۆشک هەڵات و خۆی گەیاندە شەهرمانپاشا. سەیری کرد پاشا لەگەڵ وەزیر دانیشتووە و لەبارەی قەمەروززەمانەوە راوێژ دەکەن. گوێی لێ بوو کە پاشا بە وەزیری دەگوت: 'دوێ شەو ئەوەندەم خەمی قەمەروززەمان بوو خەوم لێ نەکەوتووە. لەوە دەترسم لەو قەڵایەدا شتێکی بەسەر بێ. بەندکردنی لەو قەڵایەدا بە باش نازانم.' وەزیر گوتی: 'مەترسە، بە خودا هیچی لێ نایە. ئەتۆ مانگێک لەوێدا بەندی کە، با فیزی کەم بێتەوە.'

"لە کورتی بیبڕینەوە، پاشا و وەزیر خەریکی راوێژ و وتووێژ بوون کە کۆیلەکە بەو حاڵەوە لێیان وەژوور کەوت و بە پاشای گوت: 'پاشام، کوڕەکەت شێت بووە' و پێی گوت کە ئاوا و ئاوای لێ کردووە و 'دەڵێ کە دوێشەو کچێک لە لای خەوتووە و ئێستا لێرە نەماوە دەبێ تۆ پێم بڵێی چی لێ هات و کێ بردی.'

"کاتێک شەهرمانپاشا ئەو قسەیەی لە کۆیلەکە بیست، دەستی کرد بە هاتوهاوار و شین و رۆ و لە وەزیر تووڕە بوو پێی گوت: 'ئەو پەندە هەموو تۆ بەسەرت هێنام. هەستە برۆ بزانە چی بەسەر هاتووە و خێرا ئاگادارم کەوە.'

"لەرێوە وەزیر راستەوە بوو لەگەڵ کۆیلەکە چوو بۆ قەڵا. تاو هەڵاتبوو گەیشتە لای قەمەروززەمان، سەیری کرد لەسەر تەختەکەی دانیشتووە و قورئان دەخوێنێتەوە. وەزیر سڵاوی لێ کرد و لە پەنای دانیشت و گوتی: 'گەورەم، ئەو کۆیلە گڵاوە هات قسەیەکی کرد کە زۆر نیگەران بووین و پاشاش تووڕە بوو.'

"قەمەروززەمان گوتی: 'وەزیر، کۆیلەکە چی پێ گوتن کە نارەحەت و نیگەرانی کردن؟'

وەزیر گوتی: 'ئەو هەتیوە زۆر بە ناحەزی باسی شتێکی لەبارەی تۆوە کرد کە من ناتوانم بیلێم. بەڵام شوکری خودا وا دیارە تۆ سەلامەتی، هۆش و گۆشت لە جێی خۆیەتی و کێشەت نییە. ئەتۆ قەت کاری خراپت نەکردووە و نایکەی.' قەمەروززەمان گوتی: 'وەزیر، دەڵێم چی گوتن؟' وەزیر گوتی: 'خزمەتکارکە گێڕایەوە کە ئەتۆ گوتووتە دوێ شەو کەنیشکێک لە پەنا من خەوتووە! جا ئەوە قسەی تۆیە یان نا؟' کە قەمەروززەمان ئەوەی لە وەزیر بیست، ئەوەندەی دیش تووڕە بوو بە وەزیری گوت: 'ئەوە بۆم دەرکەوت کە تۆ ئەوەت فێری ئەو کۆیلەیە کردووە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و هەشتا و حەوتەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان گوتی: 'ئەوە بۆم دەرکەوت کە ئێوە فێرتان کردووە، پێتان گوتووە کە ئەو بۆم نەگێڕێتەوە ئەو کچەی دوێ شـــەو لە لای من خەوتبوو چی لێ هاتووە. وەزیر، ئەتۆ پیاوێکی ژیر و زانا و دنیادیتووی، پێم بڵێ ئەو کچەی دوێنێ شـەو لە لام خەوتبوو کچی کێ بوو چووە بۆ کوێ؟ لێم ڕوونە کە ئێوە ناردبووتانە لای من هەتا ئەوشـەو لە لای من بخەوێ. ئەمن ئەوشـەو هەتا بەیانی لەگەڵی بووم، کەچی بەیانی کە لە خەو هەستام، لە جێگاکەدا نەمابوو. ئەتۆ ڕاستییەکەم پێ بڵێ ئەو کچە ئێستا لە کوێیە؟'

"وەزیر گوتی: 'قەمەروززەمان، بە خودا قەسەم کە ئێمە هیچ کەسمان نەناردووەتە لای تۆ و لەو دیوە داخراوەدا تەنیا تۆی تێدا بووی و خزمەتکارەکەش لەپشت دەرگاکەوە بووە. نە کچ هاتووەتە لای تۆ و نە کوڕ. وەرەوە سەر خۆت و ئەو دوودڵی و دڵەڕاوکێیە لە دڵت دەرهاوێ. ئەو قسانەش مەکە.'

"قەمەروززەمـان گوتی: 'وەزیر، من ئەو کیژەم دەوێتەوە. چاوڕەش و پەریپەیکەر و گوڵڕوخســـار بوو. دوێ شـــەو هەتا بەیانی لە ئامێزمدا بوو.' وەزیر ســـەری لە وتەکانی قەمەروززەمان ســـووڕ ما و گوتی: 'کچەکەت هەر لە خەوندا دیت یان بە ئاگاییش دیتت؟' قەمەروززەمـان گوتی: 'پیری خەرفـاو تۆ پێت وایە من قســـە دەپەڕێنم؟ بە خودا بە ئاگابوونەوە دیومە و زۆربەی ئەوشـــەو هەســـتاوم و لەگەڵ ئەو ڕامبواردووە. هەتا لای بەیانی هەر دانیشتووم چاوم لەو هەموو جوانی و دەلالی و شەنگییەی ئەو کردووە. دەزانم ئێوە ئەوتان ناردووە هەتا قسەم لەگەڵ نەکا و خۆی لە خەو بدا. ئیدی هەتا بەیانی لە پەنای خەوتم و بەیانی کە لە خەو هەستام، لێرە لە جێیەکەدا نەمابوو.'

"وەزیر گوتی: 'گەورەم، ڕەنگە خەونی ئاڵۆزت دیبێ، خواردنی شـەو کاری تێ کردووی و شـــەیتان تووشـــی خەون و خەیاڵی کردووی.' قەمەروززەمان بە وەزیری گوت: 'ئاخر شێخی گڵاو ئەتۆ بۆ گاڵتە بە من دەکەی؟ ئەوە لە کاتێکدا کۆیلەکە دیویەتی و گوتی: 'ئەگەر هاتمەوە بۆت دەگێڕمەوە چی بەسـەر هات.' ' وەزیر گوتی: 'خۆتم لێ شـێت مەکە، قسـەی جوان بکە. کچێکی ئـاوا جوان لەکوێوە دێ بۆ ئەو کەلاوەیە؟' قەمەروززەمـان یەخەی وەزیری گرت و لەسەر تەختەکەی هێنایە خوارێ و بە مست و پێلەقە تێی بەربوو.

"وەزیر کە زانی بە مســـت و پێلەقە دەیکوژێ، بە خۆی گوت: 'کاتێک کۆیلەیەک بە درۆیەک خۆی لە دەست ئەو شێتە ڕزگار دەکا، بۆ منیش بە درۆیەک خۆم ڕزگار نەکەم؟!'

"ئیدی بە قەمەروززەمانی گوت: 'گەورەم، ئەمن تاوانبار نیم، بابت لە منی ویست باسی

ئەو کچە لای تۆ بشـارینەوە، بەڵام من پیاوێکی پیری بێهێزم و بەرگەی ئەو ئازارانە ناگرم. لەوە زیـاتر لێم مەدە. کەمێکم مۆڵەت دە بـا بـابەتی ئەو کیژەت بۆ ڕوون کەمەوە.' دەمودەسـت قەمەروززەمان دەسـتی لە لێدانی هەڵگرت و گوتی: 'بۆ پێش ئەوەی لێت بدەم ڕاسـتی ئەو کەنیشـکەت پێ نەدەگوتم؟' ئێسـتا هەسـتە و بۆم بگێڕەوە کە کێ ئەو مانگڕووەی هێنابووە لای من و هەنووکە لە کوێنەیە؟ ئەگەر بابیشـم، شـەهرمانپاشـا بەو کارانە دەیهەوێ تـاقیم کـاتەوە کە ڕازیم ژنم بۆ بێنێ یـان نـا، ئەوە پێی بڵێ ئەمن ڕازیم. ئەگەریش مەبەسـتی ئەوە بووە ئەو کچەم پیشـان بدا و دوایە لێم بشـارێتەوە هەتا تەواو بیری لێ دەکەمەوە و ئـارەزووی دەکەم، ئەوە پێی بڵێ کە من تەواو بێقەراری ئەوم و تاقەتی ئەوەم نییە لەوە زیاتر لێی دوور کەومەوە و جگە لەویش هیچ کیژێکی دیکەم ناوێ. زوو هەستە بچۆ بە بابم بڵێ خێرا ژنم بۆ بێنێ و گورج وەرەوە بۆ لای خۆم و هەواڵەکەم دەوە.'

"وەزیر هەسـتا و یەکسـەر ڕۆیشـت هەتا دیوەخانی شـەهرمانپاشـا هەڵات. لە ڕاسـتیدا وەزیر بە تەمای ڕزگاربوون نەبوو "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، وەزیر هەتا گەیشتەوە کۆشک و دیوەخانی شەهرمانپاشا هەر هەلات. پاشا گوتی: 'وەزیر، ئەوە چۆنە ئاوا پەریشان و شلەژاوی؟!' وەزیر بە پاشای گوت: 'مزگێنیم دەیە، هەواڵی خۆشم پێیە' پاشا گوتی: 'مزگێنی چیت دەمێ؟ پێم بڵێ چی بووە؟' وەزیر گوتی: 'مزگێنی ئەوەی کە قەمەروززەمانی کوڕت شێت بووە.'

"کاتێک پاشا ئەو قسەیەی بیست، ئاسمان لە بەرچاوی ڕەش و تاریک بوو. بە وەزیری گوت: 'بۆم بگێڕەوە بۆ دەڵێی شێت بووە؟' وەزیر چۆنی قەمەروززەمان دیبوو بۆی گێڕاوە. پاشا بە وەزیری گوت: 'ئەمنیش مزگێنییەکت دەمێ، دڵنیا بە منیش تۆ دەکوژم چونکە تۆ بوویە هۆی شێتبوونی کوڕەکەم. من ئەو کارانەم بە پێشنیار و ڕاوێژی تۆ کرد. بە خودا ئەگەر ئەو کوڕەم شتێکی لێ بێ، دەتکەمە پەندی زەمانە و لە بەرچاوی خەڵک پیاڵە ژەهرت دەرخوارد دەدەم.' ئیدی پاشا هەستا و لەگەڵ وەزیر چوون بۆ بورجەکە. کاتێک چوونە لای قەمەروززەمان، لە دوورەوە قەمەروززەمان لە بەریان هەستا و لە تەختەکەی هاتە خوارێ و دەستی بابی ماچ کرد و بەرانبەری سەری داخست. ماوەیەکی زۆر ئاوا ڕووبەڕووی وێستا. دوای ئەوە سەری هەڵێنا و فرمێسکەکانی هاتنە خوارێ و ئەو شێعری شاعیری خوێندەوە:

لەو کاتەی دنیا دنیایە تا دەوری ئەو پاشایە
هەڵە کاری مسکین و بەخشینیش هی پاشایە

"لەو جەنگەیەدا پاشا هەستا و کوڕەی لە ئامێز گرت و تەوێڵی ماچ کرد. لە پەنا خۆی لەسەر تەختەکە داینا و بە تووڕەییەوە چاوێکی لە وەزیر کرد و گوتی: 'وەزیری نەفام، چۆن ڕێت بە خۆت دەدا ئاوا لەبارەی کوڕەکەی منەوە قسە بکەی و شتی وات بڵێی کە منت تووشی ترس و نیگەرانی کرد؟' دوای ئەوە ڕووی لە قەمەروززەمان کرد و گوتی: 'کوڕم، ئەوڕۆ چ ڕۆژێکە؟' گوتی: 'پاشام، ئەوڕۆ شەممەیە و سبەینێ یەکشەممەیە و دووسبەی دووشەممەیە و سێ سبەی سێشەممەیە و چوار سبەی چوارشەممەیە و پێنج سبەی پێنجشەممەیە و دوای ئەو هەینییە.' پاشا گوتی: 'سوپاس بۆ خودا کە ساغ و سلامەتی. پێم بڵێ ئەو مانگە بە عەرەبی چی پێ دەڵێن؟' قەمەروززەمان گوتی: 'ئەو مانگە زولقەعیدەیە، دوای ئەو زولحەججەیە و محەڕڕەم و سەفەر و ڕەبیعولئەووەل و ڕەبیعولئاخیر و جەمادیلئەووەل و جەمادیلئاخیر و ڕەجەب و شەعبان و ڕەمەزان و شەوال.' شەهرمانپاشا تەواو خۆشحاڵ بووەوە و تفێکی لە وەزیر کرد. کە بۆچی پێت وا

بوو کوڕەکەم شێت بووە، لە کاتێکدا بۆخۆت شێتێکی زۆر پەستی. وەزیر سەرێکی لەقاند، ویستی شتێک بڵێ، بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی: 'جارێ با بزانم چ دەبێ.'

"ئینجا پاشا بە قەمەروززەمانی گوت: 'کوڕم، ئەرێ ئەوە چۆناوچۆن بوو لە لای وەزیر و خزمەتکارەکەت گوتبووت کە دوێ شەو لەگەڵ کچێکی زۆر جوان و دەلالدا خەوتبووی؟ ئێستا بۆم بگێڕەوە کە ئەو کچە کێیە و خەڵکی کوێیە؟'

"قەمەروززەمان بە قسەکەی پاشا پێکەنی و گوتی: 'بابە، تۆ خودا بەسە ئیدی تاقەتم نەماوە. لەوەی زیاتر قسەم لەگەڵ مەکەن، چونکە بەو قسانەتان نارەحەتم دەکەن. ئەوەندە بزانە کە من ڕازیم ژنم بۆ بێنن. بەو مەرجەی هەر ئەو کیژەی کە دوێ شەو لە لام بوو بۆم بێنن.' شەهرمانپاشا گوتی: 'کوڕم، نێوی خودا بێنە و فوویەک لە خۆت و دەوروبەرت بکە.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و هەشتا و نۆیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، شەهرمانپاشا گوتی: 'کورِم، نێوی خودا بێنە و فوویەک لە خۆت و دەوربەرت بکە. هەتا ئاوەزت نەشێوێ. ئەوەی کە پێت وایە ئەمن کچێکم ناردووەتە لای تۆ و دوایی بە قسـەی من بردوویانەتە دەرەوە، شـتی وا قەت نەبووە و قەسـەم بە خودا من هەر ئاگام لە شـــتی وا نەبووە. بەلام تۆ خودا پێم بڵێ ئەوە خەون و خەیاڵێکی ئاڵۆزە یان شـــەو بە خەیاڵی ژنهێنان و شـــتی واوە خەوتووی و بیرت بەوەوە قاڵ بووە و هەر لەوەشـــەوە ئەو خەون و خیاڵەت بۆ دروسـت بووە یان نا؟ حەک ئەو زەماوەندە بە زیاد نەبێ وا ئەتۆ بەو خەیاڵەوە بخەوی و شـــەو خەون بە کچێکەوە ببینی و پاشـــان وا بزانی ئەوە راســـتییە! کورِم، ئەوانە هەموو زیندەخەونن.' قەمەروززەمان گوتی: 'لەو قســـەیەی گەرِێ و ســـوێندم بە خودا بۆ بخۆ کە ئەتۆ خەبەرت لەو کچە و لە شـوێنی ئەو کچە نییە.' ئیدی پاشا پێی گوت: 'بە خودای مووسا و برایم قەسەم کە ئەمن هیچ هەواڵێکم لەو کچە و لە شـوێنی ئەو کچە نییە.' قەمەروززەمان گوتی: 'بابە، ئێسـتا با بەڵگەیەکت پیشـان بدەم کە بۆت دەرکەوێ کە ئەوەی من دیتوومە بە ئاگاییەوە بووە نەک خەون.' "

لێرەدا بوو، مـاوەی چیرۆکی ئەمشـــەویش کۆتـایی پێ هـات و شـــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان بە شەهرمانپاشای گوت: 'باوکە، با ئەمن شتێکت لێ پرسم بۆ ئەوەی بزانی کە ئەوەی من دیومە لە ئاگاییدا بووە نەک لە خەوندا، ئەویش ئەوەیە کە مەگەر تا ئێستا شتی وا بووە کە کەسێک لە خەوندا خەریکی کوشت و کوشتار بێ و کاتێک بە ئاگا هات شیرێکی خوێناوی بە دەستەوە بێ؟' شەهرمانپاشا گوتی: 'ناوەڵلا کورم، قەت شتی وا ڕووی نەداوە.'

"قەمەروززەمان گوتی: 'بابە، کەوایە با ئەمن تۆ ئاگادار کەمەوە کە چیم بەسەر هاتووە. ئەویش ئەوەیە کە دوێنێ شەو لە نیوەشەودا خەبەرم بووەوە سەیرم کرد ئەوە کچێکی جوان وەک ڕۆژ کە چاو لە بەری هەڵنایە لە جێگاکمدا لە پەنام خەوتووە، کە سیما و بەژن و باڵای زۆر وەک خۆم دەچوو. ئەمن ئەوم لە باوەش گرت و ئەنگوستیلەکەیم لە دەستی دەرهێنا و لە قامکی خۆم کرد. ئەمن وام زانی کە تۆ ئەوت ناردووەتە لای من و بۆخۆت لە شوێنێک خۆت مات داوە هەتا بزانی ئەمن چۆنی لەگەڵ دەجووڵێمەوە و چی لێ دەکەم. ئەمنیش شەرمم لە تۆ کرد و دەمیشیم ماچ نەکرد. چونکە گوتم نەکا تۆ من تاقی کەیەوە و دەتهەوێ من هان بدەی ژن بێنم. کەچی کاتێک ڕۆژ بووەوە و لە خەو ڕابووم، سەیرم کرد هیچ هەواڵێک لە کیژەکە نەبوو. چۆن ئەو شتە درۆ دەبێ. لە کاتێکدا ئەنگوستیلەکەی ئەو لە قامکی مندایە. ئەگەر وا نەبایە، دەمگوت ڕەنگە خەون بێ.' ئیدی قەمەروززەمان ئەنگوستیلەکەی دا بە شەهرمانپاشا و گوتی: 'پاشا، چاوی لێ کە بزانە چەندە دێنێ و بایی چەندەیە؟' شەهرمانپاشا ئەنگوستیلەکەی وەرگرت و چاوێکی لەملا و لەولای کرد. بە قەمەروززەمانی گوت: 'کورم، چیرۆکی ئەو ئەنگوستیلەیە دوور و درێژە و ئەوەی بەسەر تۆ هاتووە، کارێکی گەورە و گرانە. پێشم وا نییە ئەوە کاری کەس بێ جگە لەو وەزیرە بێبیرەی ئێمە. بەڵام ڕۆڵە گیان، تۆ خودا بەسەر خۆتدا زاڵ بە، بەشکو ئەوە خودایە لەو ڕێگەوە خەم و خەفتت لە دڵی دەرهاوێ، وەکوو دەڵێن:

گەر باخەوان حەزی لە دیداری گوڵە
دەشی بیژێ ئێشی دڕکیشیم بە دڵە
تۆ کە شەیدای کەزیەی جوانی ئەو کیژە بووی
ڕێگەت سەخت و هەڵەمە لێت نەیە بۆڵە

" 'بەڵام کورم، ئەوە تازە زانیم کە لەسەری نەداوی و تێکەڵت نەکردووە. ئەو خەمەش بەرۆکت بەر نادا مەگین بە ڕەحمی خودا نەبێ.' قەمەروززەمان گوتی: 'باوکە، تکات لێ

دەکەم ئەو کیژەم بۆ پەیدا کە و زوو بۆم بێنە، دەنا لە تاوانی شێت دەبم.' ئیدی قەمەروززەمان کەف و کوڵی ئەوین هەڵیگرت و ئەو شێعرەی بۆ باوکی گوت:

هاوڕێ و خۆشەویستانم بۆم بێنن نازەنینم
یارەکەم بتی چینە حەز دەکەم زوو بیبینم
گەر گوتی: 'جارێ نایەم، وادە بێ کاتێکی تر'
لێتان سوور و عەیان بێ نایبینم جارێکی تر

"قەمەروززەمان کە ئەو شێعرەی خوێندەوە، بە خۆبەکەمگرییەوە و بە گریان و لالانەوەوە ڕووی لە بابی کرد."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## كە شەوی سەد و نەوەد و یەکەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، قەمەروززەمان ڕۆندکی ڕشت و ئەو شێعرەی گوت:

تۆ کە قەت تووشـــی شــتی وا نەبووی قەیدی نییە
بنـازی بە هێزی شــــان و شــکۆشـــت ئیرادی نییە
تیشـــکی ئەڤینی ئەو دڵبەرە وا ژینمی بە بـا دا
گەر بێتو ئاوا ڕوو لە هەر کەس کـا عەوداڵی دەکـا

"کاتێک قەمەروززەمان شێعرەکەی تەواو کرد، وەزیر بە پاشای گوت: 'شـای شـایان، هەتا کەی لە لای قەمەروززەمان دادەنیشـــی و لە کاروباری وڵات و ســـوپا بێئاگا دەبی. هاتوو بە هۆی کەمتەرخەمی تۆوە کاروباری وڵات تووشـــی گرفت بێ. پیاوی ژیر لەنێو چەند دانە کێشــە ئەوەیان چارەســەر دەکا کە پێویســترە. ئێســتا بە بڕوای من وا چاکە قەمەروززەمان لێرە بەرینە دەرێ و لە کۆشـــک ڕوو بە دەریا دیوێکی بۆ تەرخان بکەن. بۆخۆشت شەو و ڕۆژ لە لای بە. لە حەوتوودا دوو ڕۆژیش بۆ دانیشتن لەگەڵ فەرماندە و وەزیران و پەردەدار و گەورەکانی دەربار تەرخان بکە و پیاوەکانی دەوڵەت و ســـوپا و مسکێنان بانگ کە لای خۆت و کاروباری وڵاتیان پێ بسپێرە. ئەتۆش پێداویستییەکانیان بۆ دابین بکە و کێشــەکانیان چارەســەر بکە. هەتا خودا بە گەورەیی خۆی فریات دەکەوێ و گرفت و خەمەکانت چارەســەر دەکا. گەورەم، کارەســات و ڕووداوەکانی ڕۆژگار بە کەم مەگرە و لە ئاست ژێردەستەکانت کەمترخەم مەبە. وەک شاعیر دەڵێ:

گەورەم، نەچی لە ئاســت گەل و وڵاتدا بێخەم بی
تـۆ گەورەی گەل و هـۆزی، دەبـێ دایم بەخەم بـی
ژێر دەســتە هەژارەکـان چـاویـان لە دەســتی تۆیە
نـابێ لە بیرت بچێ وڵات، وڵاتی تـۆی

"پاشــا بۆچوونەکەی ئەوی پێ باش بوو. لەڕێوە هەســتا و فەرمانی دا قەمەروززەمان لەو شوێنە بەرنە دەرێ و لە کۆشک دیوێکی ڕوو بە دەریای بۆ ساز کەن.

"بەدوای ئەوەدا خزمەتکارەکان فەرشـــی ئاوریشـــمینیان لە دیوێکی ڕوو بە دەریا لە کۆشـــکدا ڕاخســـت و دیوارەکانیان بە قوماشـــی دیبا داپۆشـــی و پەردەی ڕازاوە بە جەواهێراتیان هەڵواســـی. قەمەروززەمان چووە ناوی، بەڵام لەبەر دەردی ئەوین نەخۆش

کەوت. هێندە نارەحەت بوو خەو و خۆراکی نەبوو. بەردەوام لە خەیاڵی خۆشەویستەکەیدا بوو. ڕەنگی زەرد و جەستەی لەڕ و لاواز ببوو. شەهرمانپاشای بابی لەپشت سەری بە خەمباری دانیشت و لە حەوتوودا دوو ڕۆژی شەممە و دووشەممەی لەگەڵ بەرپرسانی حوکوومەتی و سوپا و دەربار لە کۆشکدا کۆ دەبووەوە و لە بابەت کاروبارییان لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکردن و ئەگەر گرفتێک یان کێشەیەکیان هەبا بە دەنگیانەوە دەچوو. هەتا نوێژی شێوان خەریکی کاری بەڕێوەبەری دەبوو. دوایی دەگەڕاوە لای قەمەروززەمان و ڕۆژەکانی دیکە بە لای ئەوەوە دادەنیشت. شەو و ڕۆژ لێی جودا نەدەبووەوە. ماوەیەک بەو شێوەیە بوو.

"کورتی کەینەوە، قەمەروززەمان و شەهرمانپاشا لەو دۆخەدا بوون. شازادە بێدووری کچی غەیوورپاشاش جنۆکەکان هەڵیانگرت و بردیانەوە خەوگەکەی خۆی دایاننا، کە گەیشتنەوە ئەوەندەی لە شەو نەمابوو. کە بوو بە ڕۆژ، شازادە بێدوور خەبەری بووەوە، چاوێکی لەو شان و شانی خۆی کرد. واشتاکەی لە پاڵ خۆیدا نەدیت. نیگەران بوو پێی ئاوەزی شل بوو. یەکبەخۆی قیژاندی. لەجێوە کەنیزەکان و دایەگەلی لە خەو ڕابوون و هاتنە لای. ئەوەی گەورەی هەموویان بوو چووە پێشێ و گوتی: 'خانمەکەم چی بووە؟!' شازادە گوتی: 'ئەوە خۆشەویستەکەم لە کوێیە؟' گوتیان: 'خۆشەویستی چی، مەبەستت کێیە؟' شازادە بێدوور تووڕە بوو. گوتی: 'کڵاوینە،ئەو گەنجە کەشخەیەی کە ئەوشەو هەتا بەیانی لەگەڵم خەوتبوو چی لێ هات و لەکوێیە؟' دایەنە گەورەکە کە ئەوەی لە شازادە بیست، ترسا و پێی وا بوو دەستیان لێ وەشاندووە و گوتی: 'شازادە بێدوور، ئەو دەڵێی چی، ئەیرۆ ئەو قسانە چین؟' شازادە بێدوور گوتی: 'ئەی جادووگەری گڵاو ئەو کوڕە قۆز و چاوڕەش و برۆکەوانەی کە ئەوشەو هەتا بەیانی لەگەڵ مندا دەستەملان بوو چی لێ هات و چوو بۆ کوێ؟' دایەن گوتی: 'خانمەکەم، بە خودا قەسەم کە من نە کوڕم دیوە و نە کەسی دیکە. تکات لێ دەکەم گاڵتەی ئاوامان لەگەڵ مەکە و بەو قسانە بە کوشتمان مەدە. ئەگەری هەیە ئەو گاڵتەیەی تۆ بە گوێی غەیوورپاشا بگەیەنن. ئەو دەم ئیدی ئێمە لە دەستی ڕزگارمان نابێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشەویش کۆتایی پێ هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و نەوەد و دووەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشـــکۆ، دایەن گوتی: 'با گاڵتەش بێ، هاتوو ئەو قســـەیە بە گوێی پاشـــا بگاتەوە تازە ڕزگاربوونمان ئەستەمە. ئەو دەم سەری ئێمە تێدا دەچێ.' شازادە بێدوور بە دایەنی گوت: 'بە خودا ئەوشـــەو کوڕێکی جوانچاک و برۆکەوانی و کەشـــخە لەگەڵم لە جێگاکەدا خەوتبوو.' دایەن گوتی: 'خانمەکەم، ئەوە تۆ شـێت بووی قسـەی وا دەکەی؟!' لەو دەمەدا شازادە چاوێکی لە ئەنگوستی کرد، سەیری کرد ئەنگوستیلەکەی قەمەروززەمانی لە قامکدایە و ئەنگوســـتیلەکەی خۆی لە قامکیدا نەماوە. بە دایەنەکەی گوت: 'ئاخر گڵاو بۆ لە خۆڕا ســـوێندی درۆ دەخۆی و دەڵێی کەس لێرە نەخەوتووە؟!' دایەن گوتی: 'بە خودا کە درۆم لەگەڵ نەکردووی!' شـــازادە بێدوور تووڕە بوو شـــیرێکی لە لا بوو دەســـتی دایە و دایەنی کوشت. ئینجا کۆیلە و خزمەتکارەکان دەستیان کرد بە شین و ڕۆڕۆ. چوون بۆ لای باوکی و شـــتەکەیان بۆ گێڕاوە. غەیووڕپاشـــا گورج هات بۆ لای کچەکەی و پێی گوت: 'کچەکەم، ئەوە چ بووە؟!' شـازادە گوتی: 'بابە، پێم بڵێن ئەو کوڕە مانگسـیمایە لەکوێیە وا دوێنێ شـــەو لە باوەشـــی مندا خەوتبوو؟' ئەو قســـەیەی کرد و وەک شـــێت چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد. دوای ئەوە یەخەی کراسـەکەی هەتا خوارێ دادڕی. کە باوکی کچە ئەوەی دیت، بە خزمەتکار و کەنیزەکانی گوت: 'بیگرن و زنجیری لە دەست و پێی کەن؛ لە دیوێکی کۆشـــکدا بەندی کەن.' شـــازادە بێدوور ئاوای لێ بەســـەر هات. بەڵام باوکی کە ئەوەی دیت، دنیای لە بەرچاو تەنگ و تاریک بوو. مەمنا زۆری خۆش دەویســـت، نەیتوانی کەمتەرخەم بێ و بانگی ئەســـتێرەناســـان و حەکیمانی کرد و پێی گوتن: 'هەرکەس ئەو کچەی من لەو حاڵە ڕزگار بکا، ئەمن کچەکەی خۆمی لێ مارە دەکەم و نیوەی وڵاتەکەشمی دەدەمێ. هەرکەسیش نەتوانێ چاکی کاتەوە، ئەوە دەیکوژم و سەریشی لە کۆشکی کچەکەم هەڵدەواسم.'

"وا بوو هەرکەس دەچوو چاکی کاتەوە، بۆی چاک نەدەبووەوە و پاشـــا دەیکوشـــت و سـەرەکەی لە کۆشـکی کچەکەی هەڵدەواسـی. ئیدی بەردەوام ئەوە کاری بوو. هەتا وای لێ هات چل کەس لە پێناوی ئەو کچەدا کوژران. حەکیمان بە دەســـت ئەو کچەوە گیریان خواردبوو و نەیاندەتوانی چاکی کەنەوە. شازادەش هەر دەهات بەژنی ئەوینی باڵای دەکرد و هەڵدەچوو. بەردەوام ئەسرینی دەڕشت و ئەو شێعرەی دەگوتەوە:

هێمای بەهەشـــتی، نەورۆز و بەهـــــــــــــاری ڕازاوە
خێـــــــــــــــر و فەڕ و خۆشـــیتان هێناوە بۆ ئەو ناوە
بـــای بەهـــــــــــار ڕێبـوارێـکە، جـیـهـان ئـاوەدان دەکـا

کێـــــو و شــاخ و دەر و دەشــت گشــتی گوڵوەشــان دەکا
ســـــروەی فـــێــنـکــی بەهــاری کە گــراوەکەمــت دیــت
حــاڵــی زارم بــبــیــنە و بــۆی بــگــێـڕەوە چــیــت دیــت
خۆ بەنێـــــــــــــــــــــو کەزییەیدا بـــــــکە و بۆ دڵم بگەڕێ
لەنێـــــــو ئــاڵقەی پرچیـــــــدا ون نەبی، ورد بگەڕێ

"کە شـــێعرەکە تەواو بوو دەســـتی کرد بە گریان. هەتا وای لێ هـات تەواو گوڵی ڕوخساری ژاکا. تا سێ ساڵ ئەوە حاڵی بوو. شازادە بێدوور برایەکی شیری هەبوو ناوی مەرزوان بوو کە هەمیشە دەچوو بۆ سەفەری دوور دوور. لەو ماوەیەدا کە شازادە بێدوور ئەو کارەساتەی بۆ هاتبووە پێشێ، ئەو لە ماڵ نەبوو و چووبووە سـەفەر. مەرزوان ئەوی زۆر زۆر خۆش دەویست و لە خوشک و برایەکەی دایک و بابی زیاتر. کە لە سەفەرەکەی هاتەوە، لەپێشدا چووە لای دایکی و هەواڵی شازادە بێدووری خوشکی پرسی. دایکی گوتی: 'ئای ڕۆڵە گیان، بێدووری خوشکت شێت بووە و ئەوە سێ ساڵە زنجیریان لە دەست و پێ و ملی کردووە و لە دیوێکیان کردووە. حەکیم و نۆژدارانیش نەیانتوانیوە چاری بکەن.' کە مەرزوان ئەوەی بیســـت، گوتی: 'دایە، دەبێ بچم بۆ لای و حەتمەن ببینم. بەشـــکو بزانم نەخۆشییەکەی چییە و ڕێگەچارەیەکی بۆ ببینمەوە.' دایکی گوتی: 'دەبێ ببینی، بەڵام جارێ ڕاوەستە هەتا بەیانی بیرێکت بۆ بکەمەوە.' ئیدی دایکی مەرزوان چوو بۆ کۆشـک و لەگەڵ خزمەتکاری دەرکی کۆشـــک دانیشـــت و دیارییەکی دایە و پێی گوت: 'ئەمن کچێکم هەیە لەگەڵ شـازادە بێدوور پەروەردە کراوە و ئێستا بە مێردم داوە. کە شـازادە ئاوای لێ هات، دڵی بۆی نارەحەتە و پێی خۆشە چاوی پێی بکەوێ. ئێستا تکات لێ دەکەم ڕێی بکە با بچێ چاوێکی پێی بکەوێ و کەمێکی لە لا دانیشێ و زوو بێتەوە دەرێ و مەهێڵە کەسیش بزانێ.'

"خزمەتکارەکە گوتی: 'ئێســـتا نابێ. ئەو کارە دەبێ شـــەو کە وڵات تاریک بوو و پاشـــا هـاتە لای کچەکەی و هـاتەوە دەرێ، ئەو دەم ئەتۆ لەگەڵ کچەکەت وەرە.' ئیدی پیرێژنە دەســـتی خزمەتکارەکەی ماچ کرد و گەڕاوە بۆ ماڵەکەی خۆی. کە کاتی شـــێو هات و دنیا پەردەی ڕەشـــی بەســـەردا کێشـــرا. لەڕێوە پیرێژن هەســـتا و جلوبەرگی ژنانەی لە بەر مەرزوان کرد و بە پەلە چوون بۆ لای خزمەتکـارەکە. کە چوون، پاشـــــا چووبووە لای کچەکەی و هاتبووە دەرێ. کە خزمەتکارەکە پیرێژنەی دیت، لە بەری هەستا و گوتی: 'بچنە ژوورەوە، بەڵام زۆرتان پێ نەچێ.' ئیدی پیرێژنە مەرزوانی بردە ژوورێ. شـــــازادە ئەوی ناسییەوە و گوتی: 'براکەم، ئەوە لەکوێی وا لێت بێ هەواڵ بووین؟' مەرزوان گوتی: 'ڕاستە، بەڵام خودا ئەو جاریش بە سـلامەتی هێنامیەوە. بە تەمام دیسـان بچمەوە بۆ سـەفەر. ئەرێ ئەوە هـاتم گوتم بزانم چیت لێ بەســـــەر هـاتووە. زۆرم پێ نـاخۆش بوو گوتیـان زۆر

ناڕەحەتە. بەشکو دەردەکەت بزانم و دەرمانەکەیت بۆ پەیدا بکەم.' شازادە گوتی: 'براکەم، ئەتۆش وەکوو ئەوانی تر وا دەزانی کە من شێت بووم؟ نە بە خودا من شێت نەبووم.' ئەوەی گوت و دەستی کرد بە گریان و ئەو شێعرەی بۆ گوت:

ڕەنگی ڕوخسارم چیرۆکی ئەو دڵە شەیدایەمە
کەس نییە بیخوێنێتەوە بۆیە گریان کارمە
زۆرم هاو کرد و گریانم، گوێگرێکم هەر نەبوو
خوێنەر و گوێگر لە بۆ ئەو دڵەم هەر پەیدا نەبوو

"مەرزوان زانی کە شازادە ئەویندارە، ئیدی گوتی: 'چی بووە؟ هەمووم بۆ بگێڕەوە. بەشکو خودا کارەکە وا ڕێک بخا و کارێکم لە دەست بێ.' "

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەو شەویش کۆتایی هات و شەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.

## که شەوی سەد و نەوەد و سێیەم هاتەوە

گوتی: "خاوەنشکۆ، مەرزوان بە خانمی گوت: 'هاتوو خودا بە دەستییەوە دام و توانیم یارمەتییەکت بدەم و ڕزگارت بکەم.' شازادە بێدوور گوتی: 'براکەم، ڕووداوەکەی من ئاوا بوو: شەوێک لە لای نیوەشەودا خەبەرم بووەوە. تەمەشا دەکەم ئەوە لاوێک لە پەنام خەوتووە. هەتا بڵێی جوانچاک و ڕێکوپێک و لەبەردڵان. دەتوانم بڵێم تا ئێستا کەس شتی ئاوای نەدیوە و کێ زمانەوانی چاکە ناتوانێ پەسنی بکا. گەنجە وای خەو لێ کەوتبوو بۆم هەڵنەستا. گوتم ڕەنگە بە ئانقەست خۆی لە خەو کردبێت و بابم ناردبێتیە لام، بۆ ئەوەی تاقیم کاتەوە یان ڕازیم بکا، مێرد بە کەسێک بکەم و مێردکردنم بەلاوە شیرین بکا. چونکە هەتا ئێستا دەیان کەس لە پاشاکانی دەوروبەر ناردوویانەتە خوازبێنیم و بابم گوتوویە مێردیان پێ بکەم و من قەبووڵم نەکردووە. هەر لەبەر ئەوە گوتم ڕەنگە باوکم ناردبێتی. بەیانی کە خەبەرم بووەوە، سەیرم کرد ئەنگوستیلەی ئەو لە جیاتی هی خۆم لە ئەنگوستی مندایە.

"براکەم، ئەوە بوو بەسەرهاتی من و ئێستا من لە سۆێی ئەو لاوە دڵرفێنە خەو و خۆراکم نییە. کارم بووەتەوە گریان و شیوەن.' ئێنجا ڕۆندک لە چاوانی هاتە خوارێ و ئەو شێعرەی خوێندەوە:

ڕووی ڕۆژینی ئەوم ئەو ڕۆژە کە دیت
پەردەی بێتاقەتییان لە ڕوومدا نەدیت
پێم وا بوو کار هەر بە ئاوەز دەکرێ
عەقڵ تێکەڵی کرد ئەڤینی کە دیت
ناکرێ بسووتێیت و دووکەڵت نەبێ
ڕەنگی زەردت هاوار دەکا کە تۆ چییت
دەبێ بە ئاهی ناخمدا بڵێن کە
ئەوە زامی ئەڤینە وای لێ کردوویت

"دوای ئەوە بێدوور خانم بە مەرزوانی گوت: 'براکەم، بزانە چم بۆ دەکەی و چۆناوچۆن بیرێکم بۆ دەکەیەوە؟' مەرزوان سەری داخستبوو سەری سووڕ مابوو و نەیدەزانی دەبێ چی بکا. دوایی سەری هەڵێنا و بە شازادەی گوت: 'ئەوەی بە سەرت هاتووە هەمووی ڕاستە و وا بووە و قسەی تێدا نییە، بەلام ئەمن لە بیر ئەو کوڕەدام و سەرم سووڕ ماوە! بە چاوان تەواوی شار و وڵاتەکانی بەدوادا دەگەڕێم و هەتوانی برینی ئەو دڵەت دەبینمەوە.

بەشــکو گرێی کاری تۆ بە دەســتی من بکرێتەوە. ئیدی تۆ نیگەران و پەرێشــان مەبە.'
مەرزوان ئەوەی پێ گوت و هەســتا مالاوایی لێ کرد و لەوێ هاتە دەرێ. شــازادەش ئەو شێعرەی گوت:

له مــالاوایــیـدا دەبــێ دڵــێـکــی وەک بەردت هەبــێ
ئەو ڕۆژەی کەژاوە دەڕوا، دەبــێ تــاقەتــی چــاکــت بــــێ
کــاتێ ڕۆیشـــتیت ئیتر من، چـاوم بەرپێی خۆمی نەدیت
وەک شــەوێکی ئەنگوســـتەچـاو چرا لە بەرچـاو لابەریـت
بێتــــو ڕێ دەم تکەی فرمێســـکی چـاوانم بڕژێنە خوار
دەبــێ بە قــوڕ نــغــرۆ دەبــن دەرنــاچــن کــاروان و ڕێــبــوار

"دوای ئەوە مەرزوان چووەوە ماڵی خۆیان و ئەو شــەوە لەوێ ماوە. کە ڕۆژ بووەوە، خۆی ســاز کرد بۆ ســەفەر و وەڕێ کەوت. بەردەوام لە شــارێکەوە بۆ شــارێکی دیکە و لە دوورگەیەکەوە بۆ دوورگەیەکی دیکە. دەچووە هەر شار و هەر شوێنێک هەواڵی شێتبوونی شازادە بێدووری کچی غەیوورپاشای دەبیست. هەتا دوای مانگێک گەیشتە شارێک کە بەو شــارەیان دەگوت 'تەیرەب.' مەرزوان لەو شــارە لە خەڵکی دەپرســی بەشــکم دەرمانێکی بۆ ببینێتەوە. دوای ئەوە بیســتییەوە کە قەمەروززەمانی کوڕی شــەهرمانپاشــاش تووشــی لە سەری داوە و شێت بووە. کە مەرزوان ئەو قسەیەی لە خەڵک بیست، پرسیاری لە خەڵک کرد: 'قەمەروززەمان لە کام شــارە؟ لەوێوە هەتا ئەم شــارە چەندە دوورە و دەبێ چەند مانگ بە ڕێوە بێ؟' گوتیان: 'ئەو شــوێنەی قەمەروززەمان لە دوورگەگەلی خالیدانە و لە ڕێی دەریاوە بە مانگێک دەتوانی بیگەیتێ و لە ڕێی وشکانیشەوە شەش مانگت پێ دەچێ.'

"مەرزوان ســـواری کەشـــتییەک بوو دەچوو بۆ دوورگەگەلی خالیدان. بای دڵخواز هەڵیکرد و لە مـاوەی مـانگێکدا لە دوورگەگەلی خـالیـدان نیزیـک بوونەوە و گەیشــتنە دەوروبەری شــار. لەوەدا بوون کە دانیشــتووانی نێو کەشــتییەکە دابەزن و بچنە قەراخ ئاوەکە، لەو جەنگەیەدا بایەکی توند هات و چارۆکەکەی دڕاند و کەشتییەکەی هەڵگێڕاوە."

لێرەدا بوو، ماوەی چیرۆکی ئەمشــەویش کۆتایی هات. شــەهرزاد درێژەی چیرۆکەکەی هەڵگرت بۆ شەوێکی دیکە.